# تەفسیری قورئانی بەرزو بڵێز

بەرگی چوارەم

تەفسیری سوورەتی (المائدة)

عەلی باپیر

# پێناسەی کتێب

ناوی کتێـــــب : تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز.

نـووســـەر: عەلـی باپـیـر.

نەخشەسازیی ناوەوە: عزالدين محمد عمر.

نۆرەو ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٥ ك– ٢٠١٤ز.

تـــیـراژ : ٢٠٠ دانە.

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٧)ی ساڵی (٢٠١٢)ی پێ دراوە

# پێشەکی ئەم تەفسیرە بەگشتی

الحَمْدُ للّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُهُ، وَنَسْتَغْفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِنْ شُرُورِ أَنْفُسِنَا، وَمِنْ سَيِئَاتِ أَعْمَالِنَا، مَنْ يَهْدِه اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضلِلْ فَلا هَادِيَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَن لا إِلَهَ إلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٖ وَٰحِدَةٖ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالٗا كَثِيرٗا وَنِسَآءٗۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبٗا ﴿١﴾ ﴾ النساء، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب.

أمَّا بَعْدُ: فإنَّ أَصدَقَ الحَدِيث كَلامُ اللهِ وَخَيْرَ الهَدِي هدْيُ مُحَمَّد ﷺ وَشرَّ الأُمُورِ مُحْدَثَاتُها، وَكُلَّ مُحدَثَةٍ بِدْعَة، وَكُلُ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ، وَكُلَّ ضَلالَةٍ فِي النَّار[1].

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكان!

هیچ گومانی تێدانیە - بۆ مرۆڤی بڕوادار - كە ئەو تەمەنەی لە خزمەت دوایین كتێبی خوا (قورئان)دا بەسەردەبرێ، جا بە هەر شێوەیەك لە شێوەكانی لە خزمەتدابووندا بێ؛ خوێندنەوە، تێفكرینو ڕامان، فێركردن، كارپێكردن ... هتد، بەباشترین جێگرتن جێگا دەگرێو خاوەنەكەی لە دنیاو دواڕۆژدا لێی بەهرەمەندە.

---

١) ئەوە پێی دەگوترێ: (خطبة الحاجة) كە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی فێردەكرد پێش هەر قسەیەكی گرنگ بیڵێن، وەك وتاری جومعەو داخوازییكردن (خِطْبَة)و .. هتد، وە ئەم وتارە هەركام لە: الترمذي: (١١٠٥)، والنسائي: (١١٠٤)، وابن ماجه: (١٨٩٢) وأحمد: (٣٧٢٠)، وطبراني: (٢٤١٤) هێناویانەو (مسلم)یش بەشێكی هێناوە.

منیش کە - وەك باسکردنی چاکەی خوا (التحدّث بنعمة الله) دەیخەمەڕوو- لەوەتی فامم کردۆتەوە، خوای بەبەزەییو بەخشەر چاکەی لەگەڵ کردوومو، بە فەرمایشتی بەرزو بێ وێنەی خۆیەوە سەرگەرمی کردوومو، بەر لە تەمەنی بیست ساڵیی‌یەوە هیدایەتی داوم، کە قورئانی بەڕێزو پێز لەبەر بکەمو، سەرقاڵیی خوێندنەوەی تەفسیرەکانی قورئانو تێوەڕامانی ئایەتە پڕ بەرەکەتەکانیو، لێوردبوونەوەیان بم.

هەر بۆیەش تێکڕای کتێبو نامیلکەو وتارو دەرسەکانم، کەمو زۆر لەبەر ڕۆشنایی قورئان دابوون، کە دیارە هەر ئەمەش شتێکی سروشتییە؛ ئاخر ئایا ئیسلام بێجگە لە قورئان پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەویش هەر ڕوونکردنەوەی قورئانو چۆنیەتی جێبەجێکردنو کارپێکردنیەتی، شتێکی دیکەیە؟! بێگومان نەخێر.

ئنجا لەمێژ ساڵیش بوو کە براو خوشکانێکی دڵسۆزی نزیكو ئاشنام، داوایان لێدەکردم کە دەست بکەم بە دانانی تەفسیرو لێکدانەوەیەکی قورئان، هەتا لە ڕەمەزانی ساڵی (١٤٢٨)دا هاتە دڵمەوە، کە ناوی خوای لێبهێنمو دەست بەو کارە گەورەو گرنگە بکەم، بەڵکو وردە وردە بەپێی بوارو دەرفەت، هەرساڵە هەندێکی لێ ئەنجام بدەم، لەگەڵ سەرقاڵیی زۆرو جۆراو جۆریشدا، هەتا دەرفەتێکی وام بۆ دەڕەخسێ کە بتوانم خێرایی تێدا بکەمو خۆمی بۆ یەکلایی (متفرِّغ) بکەمەوەو، خوا پشتیوان بێ تەواوی بکەم، ئەگەر تەمەن بەبەریەوە مابێ.

سەرچاوەی دانانی ئەم تەفسیرو لێکدانەوەیەشــم وێڕای سەرنجدانی زۆربەی ئەو تەفسیرانەی کە باونو دەستم پێیان گەیشتوە، بریتیە لە وردبوونەوەو تێوەڕامانی خۆم لە خودی قورئان، چونکە بێگومان قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە: (القرآن يُفَسِّر بَعضُهُ بَعْضَاً)، پاشان سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ، چونکە پێغەمبەری خواش ڕوونکەرەوە (مُبَيِّن)ی قورئانە، وەك خوا ﷻ فەرموویەتی:

﴿... وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾النحل،

واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو خۆشیان بیربکەنەوە.

ئومێدیشم وایە - بە یارمەتی خوای بەخشەر ﷻ - شایستەیی ئەوەم هەبێ تەفسیرو لێکدانەوەیەکی وا بۆ قورئان پێشکەش بە مسوڵمانانی کوردستان بکەم،

کە لە قورئـــان بوەشـــێتەوەو مایـەی بـەهرەو سوودی خوێنـەران بـێ، بەتایبــەتیش کە زیـاتر لـە سـی (٣٠) سـاڵە لەگـەڵ قورئـانی بـەرزو مـەزنو تەفسیـــرەکانیو کتێبـەکانی سـوننەتدا خـەریکمو دەیـان کتێـبو بەرهــەمی جۆراوجــۆرم لــە زۆربـەی بوارەکـانی زانســتەکانی شـەریعەتدا پێشـکەش کردوون.

شایانی باسیشە کە ئەو بیستو دوو مـانگ زینـدانیی کرانـەم لەلایـەن ئـەمریکاوە - لـە (٢٠٠٣/٧/١٠ تــاکو: ٢٠٠٥/٤/٢٨) - دەرفــەتێکی گــەورەو گــرنگ بــوو، بــۆ زیــاتر پێــدا قووڵـبوونەوەی کتێبـی خـوا تبـارك و تعالـی، وە بۆ پەیـدابوونی تێگەیشــتنی تایبــەت لـەبارەی زۆرێـك لـە ئایەتــەکانی‌یـەوە، ئـەم ڕاســتییەش لـە کتێبــی: (الإسـلام کما یتجلّـی فـي کتـاب الله تعالـی)دا زۆر دەروشــاوەتەوە[1]، بــەڵام هەڵبەتــە نـاڵــێمو هیچکەسـیش بـۆی نیـە بڵــێ: کــە ئــەم تەفسیرەی مــن تێروتــەواوە، چــونکە وێــڕای ســنووردار‌بوونی توانــاو بڕســتم لــە بەرانبــەر کتێبــی لــە هــەموو ڕوویێکــەوە ڕەهـا (مطلق)و بێسـنوور (لا محدود)ی خـوادا، نەشـم ویستووە کـە زۆر بەمـلاولادا بچـمو بچمــە نێـو هەنـدێك وردەکــارییەوە، کــە یــان مــن تێیــدا پسپۆڕو شــارەزا نــیم، یـان خوێنــەر پێویســتی پێـی نیــە، لـە کاتێکـدا دەیــەوێ لـە قورئـان تێبگـاتو بزانـێ خـوا (تبارك وتعـالی) ڕاستەوخۆ چی پـێ فـەرمووە؟!

ئنجا هـەر لێرەشـەوە بـە پێویستی دەزانم پـڕ بـە دڵ سوپاسـی ئـەو بـرا گەنجە ڕووح سـووكو گـورجو گـۆڵو دڵسـۆزە بکـەم (حـەمزە نـەکرد نـاوی بهێـنم)، کـە هەڵسـا بــە نووســـینەوەو هێنـــانە ســـەر کاغــەزو، پاشـان تـایپکردنو دوایـی پێداچــوونەوەو هەڵەگـیـــریی، ســـەرجــەم ئــەم زنجیــرە دەرســە، کــە لــە ئەســلّدا لــە شـێوەی وتـار (محاضـرة)دا پێشـکەش کـراون، هـەروەها هەڵسـا بـە (تخـریج)ی سـەرجەم دەقـەکانی سوننەت، لـە سەرچاوە متمانـە پێکراوەکانـەوەو، ڕەحمـەتو ماندووبوونێکــی زۆری بـە ســـەرجەم بەرگـەکانی ئـەم تەفسیـــرە کێشــاوە، خــوا بـە باشتــرین شــێوە پاداشتی

---

١) ئەو کتێبە کە ئێسـتا لەژێر چاپدایە لە بـەیرووتو ئومێد وایە بـەم زووانـە بکەوێتـە بـەر دیدی خوێنـەران، سـەرجەم هەشـت بـەرگو زیـاتر لـە سـێ هـەزار (٣٠٠٠) لاپەڕەیـەو، هـەوڵـم داوە بەگشـتی تێیدا باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسـلام بکەمو، تاکە سەرچاوەشـم قورئـان بـووە، وێـڕای دەقەکانی سـوننەت، کە لە هۆش (ذاکرة)دا بووون.

بداتەوەو، هەر صاڵحو ساغو سەلامەتو سەربەرزبێ[1]، لە خوای بەرزو بێهاوتاش داواکارم ئەو جۆرە گەنجو لاوانە لە کوڕانو کچان لەنێو گەلەکەماندا زۆر بکات.

شایانی باسیشە کە ئێمە لەم تەفسیرەماندا باسی بەش (جزء)ەکانی قورئانو دابەشکردنەکانی دیکەی وەك: - (حزب) - ناکەین، چونکە هەر سوورەتێك بۆخۆی شتێکی سەربەخۆیەو سەرجەم ئایەتەکانی وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە پەیوەستنو، ئاشکراشە کە دابەشکرانی سەرجەم قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء) و شەست (٦٠) (حزب)، شتێکە لەلایەن زانایانەوە کراوە، بۆ ئاسانکاریی خوێندنی قورئان، دیارە ئێمە لە دابەشکردنی بەرگەکانی ئەم تەفسیرەشدا دیسان حیساب بۆ بەشەکان (أجزاء)ی ناکەینو بە گوێرەی سوورەتەکان بەرگەکانی دیاری دەکەین.

دوا قسەشم ئەوەیە کە:

ئەم تەفسیرە - وەك پێشتر گوتمان - لە ئەسڵدا بەشێوەی دەرسو وتار پێشکەش کراوە، بەڵام دواتر خۆم دووجار بە وردیی پێیدا چوومەوەو بەپێی پێویست دەستکاریم کردوە، دیارە هەموو دەرسێکیش بەناوی خواو ستایشی خوا ﷻ دەستی پێکردوە، بەڵام ئێمە لە سەرەتای دەرسەکانەوە ئەوانەمان لابردوە، بۆ زۆر دووبارە نەبوونەوەو، ئەو (خطبة الحاجة)یەی لە سەرەتای ئەم پێشەکییەوە هاتوە، لەجیاتی سەرەتای سەرجەم دەرسەکانە.

سُبْحَانَ رَبِّكَ رَبِّ الْعِزَّةِ عَمَّا يَصِفُونَ، وَسَلَامٌ عَلَى الْمُرْسَلِينَ، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ.

دووشەممە ٢٥ رجب ١٤٣٢

٢٠١١/٦/٢٧ هەولێر

---

١) ئەو برا دڵسۆزە ئێستاش پاش سوورەتی (المائدة)، سەرگەرمی سوورەتی (الأنعام)ەو عەزمیشی جەزم کردوە، کە ئەگەر تەمەنمان بەردەوام بێ، هەتا کۆتایی ئەم تەفسیرە سەرگەرمی کارەکەی بێ.

# پێشەکی ئەم بەرگە



الحَمـد للّه رَبّ العَالـمين وَصَـلاته و سـلامه و بركاتـه علـى عبـده مُحَمَّـد وآلِـهِ السـائرين على دربـه .

خوێنـەرانی بەڕێـز !

سـوپاس و سـتایش بـۆ خـوای بـەرزی مـەزن، کـە دوای هـەرسـێك سـوورەتی بەپێـزی فاتیحـەو بەقـەرەو ئالـی عیمـران، یارمەتیـی دایـن سـوورەتی پـڕ فـەرو بەرەکـەتی نیسائیـش تەفسیـر بکەیـن.

شایانی باسیشە کە ئێمە لە تەفسیـرکردنی سـوورەتی (المـائدة)یـش دا هـەر لەسـەر هەمان نەخشەو بەرنامەی کە لە سەرەتای ئـەم تەفسیـرەوە ڕامـان گەیانـدوە، بـەردەوام بووییـن و هەوڵیشـمان داوە لـەم بەرگـەدا لـەو تێبینـی و پێشـنیارانەی خوێنـەرانی سـەنگیـن و شیـرین کە لەسـەر بـەرگی یەکـەم و دووەمـی ئـەم تەفسیـرە، خستبوویاننـە ڕوو، بەهرەمەند بیـن و هیواداریشیـن خوێنـەرە خۆشـەویسـتەکان بـەردەوام لـە تێبینـی و سەرنجەکانی خۆیان لە هەر ڕوویێکەوە بن، بێبەشـمان نەکەن، چونکە فەرمایشتی بەرزو بەپێـزی خـوای بـێوێنـەو تـاك، هەتا خزمەتی بکرێ هەر کەمەو، هەمـوو شـتێکی باشـی شـایستـەیە، ئەوەنـدەی لەتوانـادا هەبـێ و بلوێ.

هیواداریشـم سـەرجەم خۆشـك و برایانـی مسوڵـمانی بەهـرەمەند لـەم تەفسیـرە، دوعـامان بـۆ بکـەن بـۆ هیـدایەت و بەرچـاو ڕوونیـی زیـاتـرو، بـەردەوام بـوونیش هـەتا تەواوکردنی تەفسیـرکردنی تێـکڕای سوورەتە موبارەکەکانی قورئانـی بەرزو بەپێز.

سبحانـك اللّهم وبحمدك أشهـد أن لا اله الاّ أنت أستغفرك وأتوب إليـك

١٠ ی ڕەجـەبی ١٤٣٤ ك

٢٠ ی مایسی ٢٠١٣ ز

هـەولـێر

# پێناسەی سوورەتی (المائدة) و نێوەڕۆکەکەی



بەڕێـزان!

خـوا یـاریێ هــەوڵدەدەین بەرلــەوەی ڕاسـتەوخۆ بچـینە سـەر تەفسیــرکردنی ئـەم سوورەتە موبارەکە پێناسەیەکی بکەین، پێگەو گرنگیی و پلەو پایەی بخەینەڕوو، پاشان خاڵە هاوبەش و وێکچووەکانی لەگەڵ سوورەتی (النساء)دا، وە خاڵە جیاوازەکانیشـیان دەخەینــەڕوو.

پاشـان سـەردێڕو نێوەڕۆکی بابەتـەکانی لـە دوو توێـی بیسـتو پێـنج (٢٥) دەرسـدا دەخەینەڕوو:

وشـەی (الـمائدة) کە دیارە ئەم سوورەتە بـەوەوە نـاونراوە، واتـە: سفرەو خـوان، کە ئــەویش بەسـەرهاتێکی هەیــە دوایــی دەیگــەینێ، کــە کورتەکــەی ئەوەیــە کاتێــك حەوارییـەکانی عیسـا ﵇، خـوا لـێیان ڕازی بـێ، داوا لـە عیسـا ﵇ دەکـەن سـفرەو خوانێکـیان لـە ئاسـمانەوە بـۆ دابەزێنــێ، ئـەویش داوا لـە خـوای پـەروەردگار دەکـات، خواش ﷻ دەفـەرموێ: باشـە مـن ئـەو سـفرەو خوانـە دادەبـەزێنم، بـەڵام لەمـەودوا هـەر کەسێك بێبـڕوابـێ، بە شێوەیەك سزای دەدەم، هیچ کەسـم لە جیهـانیی یـان بـەو شـێوەیە سـزا نەدابێ، جا لەبەر ئەوەی ئەو بەسەرهاتە بەسـەرهاتێکی زۆر سـەرنج ڕاکێشــە، ئـەم سوورەتە بەو بەسەرهاتەوە ناونراوە.

دیارە سوورەتی (الـمائدة) بە پێی ڕیزبەنـدیی سـوورەتەکانی (مُصْحَف) پێنجـەمین سوورەتە، بەم شـێوەیە: (الفاتِحة، البقرة، آل عمران، النساء، المائدة)، بـەڵام لـە ڕووی کاتی دابەزێنرانیـەوە لـە دوادوای تەمـەنی پێغەمبـەردا ﷺ دابـەزیوە، واتـە: لـە کۆتـایی دابەزینـی قورئـان دایە، بەڵکو وەك دوایی باسـی دەکەین، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: کۆتـا سـوورەتە کــە لــە قورئـان دابـەزێنراوە، واتـە: دوای ئـەوە ڕەنگــە ئایــەتی دیکـە دابــەزیبن، بــەڵام هــیچ ســوورەتێك بــە تەواویــی لــە دوای ســوورەتی (الــمائدة)

دانەبەزێنراوە، ئەوە لەسەر ڕای زۆر لە زانایان، وە چەند دەقێكی سوننەت هەن كە پێگەو پایەی بەرزی سوورەتی (المائدة)مان بۆ دەردەخەن:

یەكەم: ﴿عَنْ جُبَيْرِ بْنِ نُفَيْرٍ قَالَ: حَجَجْتُ فَدَخَلْتُ عَلَى عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، فَقَالَتْ لِي: يَا جُبَيْرُ! هَلْ تَقْرَأُ الْمائدة؟ فَقُلْتُ: نَعَمْ، فَقَالَتْ: أَمَا إِنَّهَا آخِرُ سُورَةٍ نَزَلَتْ، فَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَلَالٍ فَاسْتَحِلُّوهُ، وَمَا وَجَدْتُمْ فِيهَا مِنْ حَرَامٍ فَحَرِّمُوهُ﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٢٥٥٨٨)، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكبرى) بِرقم: (١١١٣٨)، وَابْنُ الْمُنذر، والحَاكِمُ برقم: (٣٢١٠) وَصَحَّحَهُ، وَابْنُ مَرْدَوية والبَيْهَقِيُّ، تعليق شعيب الأرنؤوط: إِسنادُهُ صَحِيحٌ رِجالُهُ ثِقَات، رِجَال الصَّحيح)، واتە: جوبەیری كوڕی نوفەیر (دیارە یەكێك بووە لە زانایانی تابعین، واتە: دوای جیلی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ) دەڵێ: حەجم كرد لە حەجەكەمدا چوومە لای عائیشە دایكی ئیمانداران خوا لێی ڕازی بێ (دیارە لە پشت پەردەوە قسەی لەگەڵدا كردوە) پێی گوتم: ئەی جوبەیر! سوورەتی مائیدەت خوێندۆتەوە، یان دەیخوێنی؟ گوتم: بەڵێ، گوتی: ئاگاداربە! كۆتا سوورەتە دابەزیبێ، بۆیە هەرشتێكی تێدایەو بە حەڵاڵی داناوە ئێوەش بە حەڵاڵی دابنێن‌و پێوەی پابەندبن، وە هەر شتێكی قەدەغە كردوە بە قەدەغەی دابنێن‌و پێوەی پابەندبن.

دووەم: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ آخِرَ سُورَةٍ نَزَلَتْ سُورَةُ الْمائدة والفَتْح﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٦٦٤٣)، والحَاكِمُ برقم: (٣٢١١) وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشيخينِ وَلَمْ يخرجاه، ووافقه الذهبي في التلخيص)، واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەمر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: كۆتا سوورەت لە قورئان دابەزیبێ سوورەتی (المائدة)یە، لەگەڵ سوورەتی (الفتح).

سێیەم: ﴿عَنْ أَسْمَاءَ بِنْتِ يَزِيدَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: إِنِّي لَآخِذَةٌ بِزِمَامِ الْعَضْبَاءِ نَاقَةِ رَسُولِ اللهِ ﷺ، إِذْ أُنْزِلَتْ عَلَيْهِ الْمائدة كُلُّهَا، فَكَادَتْ مِنْ ثِقَلِهَا تَدُقُّ بِعَضُدِ النَّاقَةِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٢٧٦١٦)، تَعليق شعيب الأرنؤوط: حَسَنٌ لِغَيْرِهِ، وَالطَّبَرانيُّ في (الكبير) برقم: (٤٤٨)، وَالبَيهَقيّ}، واتە: ئەسمائی كچی یەزید خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: من جڵەوی (الْعَضْبَاء)م گرتبوو {(عَضْبَاء) ناو، یاخود نازناوی حوشترێك بوو، كە پێغەمبەر ﷺ سواری بووە، عەرەب عادەتیان وابووە، هەر

ولاخێکی سـواری ناوێکیان لێناوە، جا ئەگەر گوێدرێژ بووبێ، ئەگەر هێسـتـر بووبێ، ئەگەر حوشـتـر بووبێ، ئەگەر ئەسـپ بـووبێ، دەڵـێ: مـن جڵەوەکـەیم گرتبـوو}، کاتێك کە سوورەتی (المـائدة) هاتە خوار هەمووی پێکەوە، لەبەر قورسایی خەریك بوو لاقی حوشترەکە بشکێ لەبن پێغەمبەردا ﷺ، (کاتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ وەحـی بۆ هاتووە قورسایی زۆری گەیشتۆتە سەر، دیارە کە سواری ولاخیش بووبێ لەگەڵ خۆشیدا ولاخەکەشی قورس کردوە) وە لە ڕیوایەتی دیکـەدا هـاتوە دەڵـێ: پێغەمبەر ﷺ دابەزی، وە پۆشـاکێکمان بەسەر دادا، تا وەحییەکە تەواو بوو.

چـوارەم: ﴿عَنْ ضَمْرَةَ بْنِ حَبِيبٍ وَعَطِيَّةَ بْنِ قَيْسٍ قَالا: إِنَّ سُورَةَ المائدة مِن آخِرِ القُرْآنِ تَنْزِيلاً، فَأَحِلُّوا حَلالَهَا وَحَرِّمُوا حَرَامَهَا﴾[1]، واتە: (ضَمْرَةَ بْنِ حَبِيبٍ وَعَطِيَّةَ بْنِ قَيْسٍ﴾، {کە دیارە تابیعیین بۆیە ئەم دەقە بە (مُرْسَل) دادەنرێ، وە هەر دەقێك کـە هـاوەڵان گێڕابێتیانـەوە لـە پێغەمبـەرەوە ﷺ، ئـەوە بـە فـەرموودە (حَدیث) دادەنرێ، جا ئەو کاتە بە پێی پلـەکەی یان (حَسَن)ە، یـان (صَحیح)، کـە ئـەو کاتـە حوکمەکەی جیـایە} ئـەو دوو نەفـەرە دەڵێن: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی سوورەتی (المـائدة) کۆتا سـوورەتە لە قورئان دابەزێنرابێ، بۆیـە هەرچی حـەلاڵێکی تێدایە پێوەی پابەندبن‌و بە حەلاڵی دابنێن، وە هەرچی قەدەغەیـەکی تێدایـە پێـوەی پابەندبن‌و بە قەدەغەی دابنێن.

پێنجەم: هەروەهـا لە (حَسَنَ البَصرِي) گێڕدراوەتەوە کە گوتوویـەتی: {لَيْسَ فِي هَذِهِ السُّورَةِ مَنسُوخٌ}، واتە: ئەم سوورەتە هیچ ئایەتی تێدانین کە نەسخ کـرابن.

هەروەها (أَبي مَيْسَرَة) ئەویش لە زانایانی تابیعینە، وەك (حَسَن البَصرِي) ڕەحمەتی خوایان لـێ بێ، ئەویش گوتوویەتی: (فِيهَا ثَمَانِي عَشرة فَرِيضَةَ، ولَيْسَ فِيهَا مَنْسُوخٌ)، واتە: هـەژدە (١٨) شتی تێدا فەرزکراون، وە هیچ ئایەتی تێدانین مەنسـووخ بن.

دیارە حوکمـە شـەرعییەکانی کـە لـەم سوورەتەدا هـەن زیـاترن لـە هـەژدە، لەوانەیـە مەبەستی پێ هـەژدە بابـەتی سـەرەکی بـێ، ئـەم دەقانـەش (جمـال الـدّين القَـاسمي) لـە (محاسن التأويل: ج٦، ص١٤) هێنـاونی.

١) فتح القدير للشوكاني ج٢، ص٥.

# خاڵە هـــاوبەشەكانی یان وێكچووەكانی نێوان سوورەتی (المـــائدة)و سوورەتی (النســـاء)



١– سـوورەتی (الـمائدة)ش وەك سـوورەتی (النسـاء) ژمارەیـەكی زۆر یاسـای شـەرعیی گرتوونە خۆی، كە زیاتر لە سەد (١٠٠) یاسای شەرعیی تێدا هەن، كە ڕاستەوخۆ ئایەتەكان دەیانگەیەنن، وە دیارە زانایانیش بە شێوازی هەڵهێنجانی خۆیان، زیاتر لەو ژمارەیەشیان لێ هەڵهێنجاون، بەڵكو (إِبْنُ العَرَبِي) كە یەكێكە لە زانایانی مالیكی مەزهەب لە كتێبەكەی خۆی (أحكام القرآن)دا دەڵێ: زیاتر لە هەزار (١٠٠٠) حوكمی شەرعیی لە سوورەتی (الـمائدة) هەڵدەهێنجرێ، وە دیارە سوورەتی (النساء)یش كە پێشتر باسمان كردوە، ژمارەیەكی زۆر یاسای شەرعیی تێدان.

٢– خاڵێكی دیكەی هاوبەشیان ئەوەیە كە هەردووكیان باس و خواسێكی زۆری جوولەكەو نەصرانیی یەكانیان تێدا هەن، هەم سوورەتی (النساء) كە پێشتر تەفسیرمان كرد، هەم سوورەتی (الـمائدة)ش، زۆر باسی جوولەكەو نەصرانیی یەكان دەكەن، خوای پەروەردگار سەرزەنشتو سەركۆنەیان دەكات، باسی كەموكوڕییەكانیان دەكات، باسی هەڵەكانیان دەكات، باسی هەڵوێستە خراپەكانیان دەكات.

٣– خاڵێكی دیكەی هاوبەشیان ئەوەیە كە هەردووكیان باسی مونافیقو دڵ نەخۆشەكانیان تێدا كراوە، كەسانێك بوون كە لە نێو مسوڵمانان خۆیان بە مسوڵمان پێشانداوە، بەڵام لە واقیعدا كافر بوون، ئەوە بە مونافیقی داناون، یاخود مسوڵمان بوون، بەڵام ئیمانەكەیان تەواو نەبووە، ئەوە بە دڵ نەخۆشی لە قەڵەم داون، ئنجا لە هەردوو سوورەتەكانی (النساء)و (الـمائدة)دا زۆر باسی مونافیقەكانو دڵ نەخۆشەكانیش كراوە.

٤– خاڵێكی دیكەی هاوبەشیان ئەوەیە كە لە هەردووكیاندا ڕێنمایی مسوڵمانان كراوە بۆ چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ خاوەن كتێبەكانو، وە لەگەڵ مونافیقەكانو، وە لەگەڵ

هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیشدا، کە دیارە ئەو کاتە ئەو سێ کۆمەڵە بوو ون: موونافیق، خاوەن کتێب، کە جوولەکەو نەصرانیی یەکان بوون، لەگەڵ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، ئنجا لە سوورەتی (النساء)و لە سوورەتی (المائدة)شدا لە چەند شوێنێکدا مسوڵمانان ئاراستە کراون ئامۆژگاریی کراون کە چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو سێ جۆرە خەڵکەدا بکەن.

٥- خاڵێکی دیکەی هاوبەشیان ئەوەیە کە لە هەردووکیاندا داکۆکیی کراوە کە مسوڵمانان دەبێ بە دادگەریی و بە ئینصاف لەگەڵ غەیری خۆیاندا مامەڵە بکەن، وە هەوڵبدەن دادگەریی بچەسپێنن لەگەڵ نەیارەکانیانداو لەبەر ئەوەی کە کافرو بێبڕوان، تووشی نادادگەریی و بێ ئینصافیی نەبن، چونکە مسوڵمان دەبێ دادگەربێ لەگەڵ مسوڵمان و نامسوڵماندا.

٦- خاڵێکی دیکەی هاوبەشیان ئەوەیە کە لە هەردووکیاندا باسی جەنگو جیهادو فیداکاریی لە پێناوی خوادا کراوە، دیارە لە سوورەتی (النساء)دا زیاتر، وە لە سوورەتی (المائدة)شدا لە چەند شوێنێکدا ئاماژە کراوە بە جەنگو جیهاد لەپێناو خوادا.

٧- خاڵێکی دیکەی هاوبەشیان ئەوەیە کە لە هەردووکیاندا ڕستەی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! زۆر دووبارە بۆتەوە، لە سوورەتی (النساء)دا، یازدە (١١)جار، وە لە سوورەتی (المائدة)دا، شازدە (١٦) جار ئەم ڕستە موبارەکە دووبارە بۆتەوە.

# پێناسەی دەرسەکانی سوورەتی (المائدة)



ئێمە سوورەتی (المائدة)مان دابەشکردوە بۆ بیستو پێنج دەرس، ئنجا واباشە پێش ئەوەی بچینە سەر دەرسەکان، چاوێك بە کۆی ئەو دەرسانەدا بخشێنین، بۆئەوەی نەخشەی ئەو سەدو بیست ئایەتەی سوورەتی (المائدة)مان لەبەرچاوبێ کە باسی چی دەکەن؟ وە چەند بابەتیان تێدا باسکراون بە شێوەی سەرەکی؟!

دەرسی یەکەم: لە سوورەتی (المائدة) لە ئایەتی ژمارە (١ - ٥) دەگرێتە خۆی، دیارە جگە لە (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ) کە لە سەرەتای هەموو سوورەتێکە، بێجگە لە سوورەتی (التوبة)، ئەو پێنج ئایەتە باسی پابەندیی ئیمانداران دەکەن بە گرێ بەستەکانەوە، بە پەیمانەکانیانەوە، وە پاشان باسی پاراستنی دروشمەکانی دینداریی، وە خۆپاراستن لە خواردنە پیسو زیان بەخشەکانی وەك: مردارو خوێنو گۆشتی بەرازو، ئەو شتەی کە بۆ غەیری خوا سەربڕابێو ... هتد، وە حەڵاڵ بوونی خواردنە خۆشو بە سوودەکان، وە ڕەوایی هاوسەرگیریی لەگەڵ ئافرەتانی پاکی بڕوادار، وە ئافرەتی پاکی خاوەن کتێبەکان، وە خۆ دوورگرتن لە داوێن پیسیی، دەکەن.

دەرسی دووەم: دوو ئایەتمان بۆ تەرخان کردوون، ئایەتەکانی ژمارە (٦ - ٧) کە خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٦)دا باسی دەستنوێژ دەکات، وە یەکەمین ئایەتە کە لە قورئاندا تەرخان کرابێ بۆ باسی دەستنوێژ گرتن، وە باسی تەیەمموم دەکات، کە ئەگەر ئینسان ئاوی دەست نەکەوت بۆ دەستنوێژ تەیەمموم بکات، وە پاشان باسی خۆشۆردن دەکات لە لەش پیسیی، وە ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت، دیسان باسی تەیەمموم دەکات، وەك بە دیل بۆ خۆشۆردن، وە لە هەموو قورئاندا تەنیا ئەم ئایەتە باسی دەستنوێژو تەیەمموم دەکات، وە تەیەمموم چ وەك بەدیل بۆ دەستنوێژ، چ وەك بەدیل بۆ خۆشۆردن، جگە لە ئایەتی ژمارە (٤٢)ی سوورەتی (النساء) کە باسی خۆشۆردنو تەیەممومی دەکردو پێشتر تەفسیرمان کردوە،

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٧)دا خوای پـەروەردگار بـە ئیمانـداران دەفـەرموێ: یـادی ئەو پەیمانــە بكــەن كە لەگەڵ خوادا بەستوویانە.

دەرسی سێیەم: چوار ئایەتـەكانی: (٨ - ١١) دەگرێتـە خـۆی، كـە خـوای پەروەردگــار لـەو ئایەتانــەدا فــەرمان بــە ئیمانــداران دەكـات كــە دادگــەربن، وە شـایەدیی بـدەن بـە دادگـەریی، وە چاكەی خـوا لەسـەر خۆیـان یـاد بكەنـەوە، كـە سـەلامەتی كـردوون‌و دڵنیــای كردوون لە مەترسـی دوژمنان.

دەرسی چوارەم: سێ ئایەتەكانی: (١٢ - ١٤) دەگرێتە خۆی، كە باسـی ئـەزموونی شكسـت خواردووی جوولەكـەو نەصـرانیی یـەكان دەكـەن، لـە بـواری پابەنـدیی بـە پـەیمانی خــواوە كــە چــۆن پــەیمانیان بــە خــوا ﷻ داوە، دوایــی پەیمانەكــەیان شــكاندووە، نـەیانتوانیوە بـەو بـەڵێن‌و پەیمانـەوە پابەنـدبن، كـە دیـارە خـوا ﷻ زۆرجـار باسـی كەموكــوورِیی‌و پــەیمان شــكێنیی‌و لاســاریی جوولەكـەو نەصـرانیی یـەكان دەكـات، بۆئەوەی بۆ مســوڵمانان ببنـە جێگـەی پەنـدو عیبــرەت‌و دەرسـیان لــێ وەربگـرن، هەروەهـا بۆئـەوەی كـە ئـەوانیش بناسـن چ مـاڵـێك بـوون، وە كــاتی خـۆی چییــان كــردوە؟

دەرسی پێنجــەم: پێـنج ئایەتەكـانی: (١٥ - ١٩) دەگرێتــە خـۆی، كـە خـوا تێیانـدا بـانگی خاوەن كتێبەكان دەكات بۆ ئیسـلامەتیی كە ئیمان بێنن‌و بێنە نێو ئیسـلامەوە، وە پاشـان سەرزەنشـتیان دەكـات لەسـەر بیــروڕای ئەفســانەیی‌و هەڵبەســتــراویان، بـە تایبەت نەصــرانیی یەكان.

دەرسی شەشــەم: حـەوت ئایەتـەكانی: (٢٠ - ٢٦) دەگرێتـە خـۆی، كـە باسـی بەسـەرهاتی مووسـا ﷺ دەكەن، كە وەك گوتم سـێ بە سەرهات لە سوورەتی (الـمـائـدة)دا هـەن، یــەكێك لــە بەســەرهاتەكان بەســەرهاتی مووســاو گەلەكەیــەتی، كــە مووسـا ﷺ فەرمان دەكات بە گەلەكەی خۆی، (بەنی ئیسرائیل) تا بچنە یەكێك لە شـارەكانەوە، جا توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: فـلان شـارە، یـان فیسار شـارەیە، گـرنگ ئەوەیـە شارێك بووە لە شـام، مووسا ﷺ دوای ئـەوەی خـوا بـەنی ئیسرائیلی لـە میسـر لـە چـنگی فیرعــەون رزگـار كـرد، وە ئـەوانیش هـاتوون بـۆ شـام بـۆ دەشـتی (سـینا) فەرمانیان پێ دەكات، بچنـە شارێكەوە، ئەوانیش سـەرپێچیی دەكەن، وە بڕوبیـانوی

زۆر دێننەوە، تا سەرەنجام دەڵێن: ﴿ فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾، واتە: ئەی مووسا! تۆو پەروەردگارت بچن بجەنگن ئێمەش لێرە دانیشتووین، هەر کاتێك ئێوە شەڕەکەتان تەواو کرد ئێمەش دێین، ئنجا لەسەر ئەوە خوای دادگەر سزای بەنی ئیسڕائیل دەدات، وە (٤٠) ساڵ بە سەرگەردانیی لە دەشتو بیابانی (سینا)دا دەمێننەوە، وەك دوایی باسی دەکەین.

**دەرسی حەوتەم:** پێنج ئایەتەکانی: (٢٧ - ٣١) دەگرێتە خۆی، کە بەسەرهاتی دووەم لە سوورەتی (المائدة)دا باس دەکەن، کە بریتییە لە بەسەرهاتی هەردوو کوڕەکەی ئادەم، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ ﴾، بەسەرهاتی دوو کوڕەکەی ئادەمیان بەسەردا بخوێنەوە، کە زۆر لە توێژەرەوان بە (قابیل وهابیل) ناویان دەبەن، کوڕە خراپەکە ناوی (قابیل)ە، چاکەکەشیان ناوی (هابیل)ە.

**دەرسی هەشتەم:** سێ ئایەتەکانی: (٣٢ - ٣٤) دەگرێتە خۆی، کە باسی حیکمەتی سزای قەتڵی بە ناهەق دەکەن، حیکمەتی چییە خوای پەروەردگار ئەو سزایەی بۆ قەتڵی بە ناهەق داناوە؟! وە پاشان باسی سزای ڕێگریی، ئەوانەی کە ڕێگریی دەکەن، وە باسی تۆبە وەرگرتن لە پەشێمان بووەوانی ڕێگریی کاران دەکەن.

**دەرسی نۆیەم:** شەش ئایەتەکانی: (٣٥ - ٤٠) دەگرێتە خۆی، کە باسی پارێز لە خوا ﷻ کردن، وە هۆکار بۆ لای خوا پەیداکردن، وە جەنگو جیهاد لە پێناوی خواداو، پاشان سزای سەختی کافران لە قیامەت، وە دوایی باسی سزای دزیی دەکەن، وە پاشان باسی کەسانێك کە لە دزیی پەشێمان دەبنەوە، کە خوای بە بەزەیی لەگەڵیان میهرەبانو لێبووردەیە.

**دەرسی دەیەم:** سێ ئایەتەکانی: (٤١ - ٤٣) دەگرێتە خۆی، کە ئاگادارکردنەوەی پێغەمبەر ﷺو موسوڵمانانە لە پیلانی جوولەکەو مونافیقەکان، وە چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ جوولەکەکانو مونافیقەکاندا، بەتایبەت پێغەمبەری خوا ﷺ، وەك سەرۆکی دەوڵەتی ئیسلامیی، کە دەبێ چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا بکات؟

دەرسی یازدەیەم: چوار ئایەتەكانی: (٤٤ - ٤٧) دەگرێتە خۆی، باسی نێردراانی هەر كام لە تەوراتو ئینجیلو فەرزكردنی كار پێكردنیان دەكات، وە پێویست كردنی، سزای قەتڵ، وە سزای كەسێك كە لووتی كەسێك دەبڕێ، گوێی دەبڕێ، ددانی دەشكێنێ، بریندار دەكات، باسی ئەوە دەكات، وە باسی ئەوە دەكات كە هەر كەسێك حوكم نەكات بە كتێبی خواو بەوەی كە خوا ناردوویەتە خوار، چ بەنسبەت ئوممەتانی پێشوو، چ بەنسبەت ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ، ئەوە ئەو جۆرە كەسانە بە كافر لە هەندێ حاڵەتدا، وە بە زاڵم لە هەندێ حاڵەتدا، وە بە فاسق لە هەندێ حاڵەتدا، ناوزەد دەكرێن، یاخود بە ئیعتیباری بڕوا نەبوونیان بە حوكمی خوا، بە كافر لە قەڵەم دەدرێن، وە بە ئیعتیباری پابەند نەبوونیان بە شەریعەتەوەو بەزایەدانی هەقی خەڵك، بە زاڵم لە قەڵەم دەدرێن، وە بە ئیعتیباری ئەوە كە لە زاتی خۆیاندا سەرپێچیی دەكەن، بە فاسیقو لاڕێ لە قەڵەم دەدرێن، كە دوایی بە درێژیی باسی ئەو ئایەتانە دەكەین، وە مشتومڕی زانایان دەربارەی چۆنیەتی تەفسیركردنیان باس دەكەین.

دەرسی دوازدەیەم: سێ ئایەتەكانی: (٤٨ - ٥٠) دەگرێتە خۆی، باسی حوكم كردن بە قورئان، وە شوێن نەكەوتنی ئارەزووی ئەموئەو، وە سەرپشككردنی خەڵك لە نێوان حوكمی خوای پەروەردگارو، حوكمی نەفامیی دا، كە خوا ڕایدەگەیەنێ تەنیا دوو جۆرە حوكم هەن، دوو جۆرە بەرنامە هەن: بەرنامەو حوكمی خوا، وە بەرنامەو حوكمی نەفامیی، واتە: غەیری حوكمی خوا كە لە ئیسلام قورئانو سوننەتدا بەرجەستەیە، ئەوەی دیكە هەمووی بە نەفامیی لە قەڵەم دەدرێ.

دەرسی سێزدەیەم: سێ ئایەتەكانی: (٥١ - ٥٣) دەگرێتە خۆی، باسی مەسەلەیەكی گەورەو گرنگ لە ژیانی مسوڵمانان دەكات، كە قەدەغەبوونی بەدۆستایەتیی گرتنیانە لەگەڵ جوولەكەو نەصرانیی یەكاندا، كە حەرامە مسوڵمانان جوولەكەو نەصرانیی یەكان، بە دۆست بگرن، خۆشیان بوێن، لەگەڵیان بن، پشتیوانییان لێ بكەن، بە سەركەوتنیان دڵ خۆش بن، بە شكستیان دڵ ناخۆش بن، وە خوا ڕایدەگەیەنێ كە ئەوانەی خێرایی دەكەن لە دۆستایەتیی كردنی جوولەكەو نەصرانیی یەكاندا، كەسانی دڵنەخۆشن، وە ئەگەر مونافیقیش نەبن، بەلای كەمەوە نیشانەی پرسیار لەسەر ئیمانو مسوڵمانەتییان هەیە.

دەرسی چواردەیەم: سێ ئایەتەکانی: (٥٤ - ٥٦) دەگرێتە خۆی، باسی هەڵگەڕانەوەی مسوڵمانان دەکات لە ئیسلام، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾، وە باسی ئەوە دەکات ئەوانەی کە لە دینی خوا هەڵدەگەڕێنەوە، خوا یەکی پێیان ناکەوێ‌و منەتی پێ نیە، وە لە جیاتی وان کەسانێکی دیکە دێنێ، کە کۆمەڵێك سیفەتی بەرجەستەو گەورەیان تێدا بەیان دەکات: ئەوان خوایان خۆشدەوێ، خوا خۆشی دەوێن، لەگەڵ ئیماندارانـدا نەرم‌و نیانن، لەگەڵ کافراندا توندن، لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن‌و لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن، وە پاشان باسی دۆستایەتیی گرتنی ئیمانداران دەکات، کە تەنیا دۆستایەتی لەگەڵ خوادا دەگرن، پاشان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ وە لەگەڵ ئیمانداراندا.

دەرسی پازدەیەم: دە ئایەتەکانی: (٥٧ - ٦٦) دەگرێتە خۆی، کە باسی هەڵوێستی ناحەزانەی خاوەن کتێبەکان بە تایبەت جوولەکەکان دەکات، لە بەرانبەر ئیسلام‌و مسوڵماناندا، وە خوا سەرزەنشتیان دەکات، وە هانیان دەدا کە واز لە خراپەو لە دوژمنایەتییان بۆ ئیسلام‌و مسوڵمانان بێنن، وە بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، وە بگەڕێنەوە بۆ پابەندیی بە کۆتا شەریعەتی خواوە کە ئیسلامە.

دەرسی شازدەیەم: پێنج ئایەتەکانی: (٦٧ - ٧١) دەگرێتە خۆی، باسی ڕاسپێردرانی پێغەمبەر ﷺ دەکات، کە خوا ڕای دەسپێرێ، بە خاوەن کتێبەکان بەگشتی، وە جوولەکەکان بە تایبەت ڕابگەیەنێ، کە ئەگەر بێت‌و ئیمان بە ئیسلام نەهێنن، ئەوە ئەو شەریعەت‌و بەرنامەیەی کە لەسەرینی، کە جوولەکایەتییە، یان نەصرانییەتە، بۆیان حیساب ناکرێ، وە پاشان باسی سەرزەنشت کردنیان دەکات، لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە درۆ دادەنێن، وە هەوڵدەدەن بۆ کوشتنیان، وەك کوشتووشیانن، کە مەبەست پێی پێغەمبەرانی پێش ئیسلامە.

دەرسی حەڤدەیەم: پێنج ئایەتەکانی: (٧٢ - ٧٦) دەگرێتە خۆی، باسی سەرلێشێوانی نەصرانیی یەکان دەکات، پاشان دەرخستنی حەقیقەتی عیساو دایکی، صەلاتو

سەلامی خوا لەسەر عیسا بێ‌و، خوا لە مەریەم ڕازی بێ، کە عیسا عليه السلام پێغەمبەرێکی خوا بووەو دایکیشی صیددیقەیەك بووەو ئیمانداریکی زۆر چاك بووە، بۆیەش وا دەفەرموێ، چونکە نەصرانیی یەکان عیساو دایکی بە دوو پەرستراو، یاخود لەگەڵ خوای پەروەردگاردا بە سێ بەش لە خوا لە قەڵەمیان دەدەن، بۆیە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ﴾، بێگومان ئەوانەی کە گوتیان: خوا یەکێکە لە سێیەکان کافر بوون (دووەکانی دیکە کێ‌و کێن؟ عیساو دایکی، یاخود عیساو روح لقودس کە مەبەستیان پێ جبریلە) وە باسی ئامۆژگاریی کردنیان دەکات بە گەڕانەوە بۆ ئەوەی کە تەنیا خوا بپەرستن‌و بەندایەتیی بەس بۆ خوا بکەن، چونکە هەر خوا شایستەی بەندایەتیی بۆ کرانە.

دەرسی هەژدەم: دە ئایەتەکانی: (٧٧ - ٨٦) دەگرێتە خۆی، کە باسی سەرزەنشتکردنی خاوەن کتێبەکانە بەگشتی، لەسەر ڕۆچوونیان لە دیندارییانداو لەسەر تێپەڕاندنیان، وە پاشان نەفرین لێکرانیان لەسەر زمانی داوود عليه السلام‌و لەسەر زمانی عیسا عليه السلام، بە هۆی هەڵنەستانیانەوە بە ئەرکی فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، وە پاشان بە هۆی دۆستایەتیی گرتنیان لەگەڵ کافراندا، وە دوایش خوا سبحانه وتعالى لەو ئایەتانەدا باسی دوژمنایەتیی سەرسەختی جوولەکەو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان دەکات، وە بە پێچەوانەشەوە باسی هەڵوێستی نەرمی هەندێك لە نەصرانییەکان دەکات، کە لە بەرانبەر ئیسلامدا هەڵوێستیان نەرمترە، بە هۆی ئەو هەڵوێست نەرمییەشەوە کە زۆریان لێ مسوڵمان بوون، لە سەردەمی پێغەمبەریشدا صلى الله عليه وسلم وە لە قۆناغەکانی دیکەش‌و ئێستاش، بەڵام جوولەکە بە دەگمەن وایە لێیان مسوڵمان ببن، ئەوەی کە خوا فەرموویەتی، هەر لەو کاتەوە کە فەرموویەتی تا ئێستاشدا هەر وایە: ﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقۡرَبَهُم مَّوَدَّةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰ﴾، واتە: تۆ دەبینی سەرسەختترین دوژمنی ئیمانداران، جوولەکەکان‌و هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانن،

جوولەکەکان ئەوە دیارە کێن؟ هاوبەش بۆ خوا دانەرەکانیش هەموو ئەوانەن کە بت دەپەرستن، ئنجا خوا دەفەرموێ: وە دەبینی ئەوانەی کە گوتیان: ئێمە نەصرانیین لە هەموویان هەلۆیستیان نەرمترە، واتە: بەگشتی، هەڵبەتە خوای پەروەردگار کە مەدحیان دەکات بە هەلۆیست نەرمیی، زیاتر مەبەستی پێ ئەوانەیە کە ئیمان دێنن، وە دێنە نێو ئیسلامەوە.

<u>دەرسی نۆزدەیەم:</u> سێ ئایەتەکانی: (٨٧ - ٨٩) دەگرێتە خۆی، باسی حەرام نەکردنی شتی خۆش و بە تام و لەزەت و سوود بەخش بۆ مسولمانان دەکات و دەفەرموێ: شتی خۆش و سوودبەخش لە خۆتان قەدەغە مەکەن، وە پاشان ئاگاداریان دەکاتەوە کە سنوورەکانی خوا نەشکێنن، وە دواییش باسی کەفارەتی سوێندی ڕاستەقینە دەکات، وە باسی سوێندی پووچ، (لَغو) دەکات، ئەو سوێندەی کە بەسەر زار دادێ بێ ئەوەی کە ئینسان دڵی لەسەر بچەسپێنێ، کە ئەوە کەفارەتی ناوێ.

<u>دەرسی بیستەم:</u> چوار ئایەتەکانی: (٩٠ - ٩٣) دەگرێتە خۆی، باسی قەدەغەبوونی خواردنەوەی مەی، (خَمْر)، وە پاشان قومارو صەنەمەکان وە زەلەمەکان، دەکەن، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾، کە لێرەدا لە سوورەتی (المائدة) کۆتا حوکم و بڕیاری خوا دەربارەی قەدەغە کردنی شەراب و قومار هاتۆتە خوار، بەلام دیارە پێشتریش خوای کاربەجێ باسی حەرامی بت پەرستیی و حەرامی پەرستنی صەنەمەکانی کردوە، بەلکو ئەوە بناغەی عەقیدەی ئیسلام و خوا بەیەك گرتنە، بەلام لێرەدا خوا بۆیە شەراب و قومار لەگەڵ واندا باسی دەکات تاکو بیخاتەڕوو کە وەك چۆن بتپەرستیی حەرام و قەدەغەیە، شەراب و قوماریش بە هەمان شێوە وەك ئەوان پیسن، (الأزلام)یش کۆی (زَلَم)ە، کە بە داروچکەیەکی گچکەیەکی گوتوە کە شتیان پێ دابەشکردوە و جۆرێك بووە لە قومار، کە ئێستا پێی دەلێن: (یانسیب)، ئنجا لەم ئایەتانەدا خوای بالادەست زۆر بە ڕۆشنیی کۆتا بڕیاری خۆی دەربارەی قەدەغە بوونی شەراب و قومار دەخاتە ڕوو، کە پێشتریش خوای پەروەردگار باسی قەدەغەبوونیانی کردوە، بەلام لێرەدا کۆتا بڕیار

لەوبارەوە دراوە، وە ئەو ڕاستییەش ڕوون دەکاتەوە کە کەسانێك لە ڕابردوودا شەڕابیان خواردۆتەوەو قوماریان کردوە، یاخود گوناهیان کردوە، ئەوەی پێشێیان لەسەر حیساب ناکرێ، مادام ئەو کاتە قەدەغە نەبووبێ.

دەرسی بیستو یەکەم: حەوت ئایەتەکانی: (٩٤ - ١٠٠) دەگرێتە خۆی، باسی ڕاونەکردنی مسوڵمانان لە کاتی ئیحرام بە حەجو عومرەدا دەکات، کاتێك کە ئیحرام دەبەستن بە حەجو عومرە، دروست نیە ڕاو بکەن، وە پاشان باسی دروشمەکان دەکات، وە چەند ڕاستییەکی گرنگ دەربارەی پاراستنی دروشمەکانی دینداریی‌و خوا پەرستیی کە کەعبەو مانگە حەرامەکان‌و قوربانییەکانن، دەخاتەڕوو، ئنجا خۆپاراستن لە ڕاوکردن لە ئەرزی حەرەمدا، واتە: بێئەوەی کە ئینسان لە ئیحرامیش دابێ کە چووە سنووری حەرەمی مەککەوە، نابێ ڕاو بکات، وە باسی ئەو قوربانیانە دەکات کە لە کاتی حەجو عومرەدا سەردەبڕدرێن، وە ئەو کەسانەی کە ڕوو لەو شوێنە پیرۆزانە دەکەن، کە دەبێ حورمەتیان بگیرێ، باسی ئەوانەی دەکات.

دەرسی بیستو دووەم: چوار ئایەتەکانی: (١٠١ - ١٠٤) دەگرێتە خۆی، باسی قەدەغە بوونی پرسیاری بێجێ دەکات، دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسْـَٔلُواْ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ... ﴾، واتە: ئەی ئیماندارینە! دەربارەی هەندێ شت مەپرسن کە ئەگەر بۆتان دەربکەوێ پێتان ناخۆشە، یاخود خەفەتی پێ دەخۆن، یان بۆتان خراپە، کە وەك دوایی باسی دەکەین، خوا زۆر پێی ناخۆشە خەڵك شت زۆر هەڵکۆڵن، چونکە لە ئەنجامی زۆر هەڵکۆڵین‌و زۆر پرسیار کردنیاندا، بازنەو پانتایی قەدەغە کراوەکان فراوان دەبێ، وە خوای پەروەردگاریش ئەوەی پێ ناخۆشە، کە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە، وەك هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەوە بووە کە پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك دەفەرموێ: خوا حەجی لەسەر فەرز کردوون، یەکێك دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا! هەموو ساڵێك؟ سێ جاران دووبارەی دەکاتەوە، پێغەمبەری خوا ﷺ جاری چوارەم دەفەرموێ: ئەگەر گوتبام بەڵێ، لەسەرتان فەرز دەبوو، نەشتان دەتوانی، شتێك کە بۆ خۆم باسی ناکەم لێم

مەپرسن، هەڵیمەکوڵن، خوا فەرموویەتی: حەجتان لەسەر فەرزە، واتە: لە تەمەندا، تۆ بۆ دەپرسی: ئایا هەموو ساڵێك؟! خۆ ئەگەر خوای بە بەزەیی لە هەموو ساڵێك جارێك فەرزی كردبایە، خەڵك بۆی نەدەكراو ئەركێكی دەخستە سەر شانیان كە قورس بوو، ئنجا خوا باسی قەدەغە بوونی چەند جۆرە ئاژەڵێك دەكات كە دەفەرموێ: ﴿ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾، كە ئەمانە چوار جۆرە ئاژەڵ بوون، موشریكەكان هەر لە خۆڕا ناویان لێ ناون و گوتوویانە: ئەوانە قەدەغەیە باریان لێ بكرێ، قەدەغەن گۆشتیان بخورێو... هتد.

دەرسی بیستو سێیەم: چوار ئایەتەكانی (١٠٥ - ١٠٨) دەگرێتە خۆی، باس لەوە دەكات كە ئیمانداران دەبێ لە خۆیان وریابن، واتە: پابەندبن بە شەریعەتەوە، ئەگەر ئەوان لە خۆیان وریابن، دوژمنانیان زیانیان لێ نادەن، وە پاشان باسی چۆنیەتی شایەدگرتنیان دەكات لە كاتێكدا كە مردنیان دەگاتە سەر، لە كاتی سەرەمەرگدا، چۆن شایەد بگرن بۆ وەصیەت، یاخود كە بە سەفەر دەچن.

دەرسی بیستو چوارەم: حەوت ئایەتەكانی (١٠٩ - ١١٥) دەگرێتە خۆی، خوای پەروەردگار چەند ڕاستییەك لەبارەی عیسا ﷺ، وە لە بارەی دایكی یەوە دەخاتە ڕوو، وە كە خوا بە عیسا ﷺ دەفەرموێ: ئەی عیسا ! یاد بكەوە كە ئەوەم بۆ كردی، ئەوەم بۆ كردی، ئەوەم بۆ كردی، وە بە فەرمانی من ئەوەت دەكرد، ئەوەت دەكرد، ئەوەت دەكرد، مردووت زیندوو دەكردەوە، وە لە قوڕ باڵندەت دروست دەكردو فووت پێدا دەكرد، ئنجا هەواڵت پێ دەدان كە چ خواردنێكیان خواردوە، واتە: شتی نادیارت پێ دەگوتن، ئەوانە بۆچی خوای پەروەردگار دەیانخاتە ڕوو؟ تاكو نەصرانییەكانی پێ سەرزەنشت بكات، كە نەصرانیی یەكان دەیانگوت: عیسا ﷺ كوڕی خوایە، چونكە ئەو شتانەی كردوە! خوای پەروەردگار بە بیری عیسا ﷺیان دێنێتەوەو دەفەرموێ: ئەی عیسا! ئەوەم بۆ كردی، ئەوەم بۆ كردی، ئەوەم بۆ كردی و من ئەو توانایەم پێدای كەواتە: ئەو شتانەت كە كردوون بە توانای خۆت نەبووە، من بۆم كردووی وەك موعجیزەیەك بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆت، كەچی نەصرانییەكان ئەو شتانە هەموویان دەگێڕنەوە

بۆ عیسا ﷺ، ئەوە دەکەنە بە پاساوی ئەوە کە عیسا ﷺ بکەن بە خواو پەرستراوی خۆیان، خوای پاك‌و بێگەرد لێرەدا سەرزەنشتی نەصرانیی یەکان دەکات کە ئەوانە کۆمەڵێك موعجیزە بوون، وەکو چۆن خوای پەروەردگار موعجیزەی بە هەموو پێغەمبەران داوە، کۆمەڵێك موعجیزەشی بە عیسا ﷺ داون، بۆ ئیسپاتی پێغەمبەرایەتیی خۆی، کەواتە: نابێ ئەوانە بکرێنە پاساوی ئەوە کە بەندایەتیی بۆ عیسا ﷺ بکرێ، وە لە ریزی پێغەمبەران جیابکرێتەوە، وە لە ئاستی بەندایەتیی بۆ خوا بەرزتر بکرێتەوەو ببرێتە ریزی خوای پەروەردگارەوە! وە پاشان هەر لەو ئایەتانەدا باسی دابەزینی ئەو سفرەو خوانە دەکرێ کە ئەم سوورەتە بەو ناوەوە ناونراوە، کە بەسەرهاتێکی زۆر سەرسوڕهێنەرە: سفرەو خوانێك کە لە ئاسمانی بێتە خوارێ، خواردنی لەسەر بێ، (کە زۆربەی زانایان دەڵێن: خواردنەکە ماسی بووە، کە ئەوە لە ئینجیلەکانیشدا هاتوە)، وە خەڵکێکی زۆر بە سەدان کەس لەو سفرەو خوانە بخوات، کەچی هەروەك خۆشی بێ، خوانێك نانی لەسەر بێ‌و ماسی لەسەر بێ‌و لە ئاسمانەوە بێتە خوار، شتێکی زۆر عەجایب بووە، دیارە کە ئەوەش لەبەر ئەوە بووە کە حەوارییەکان برسییان بووە، لەوکاتەداو هیچیان دەست نەکەوتوە، وە پاساویشیان ئەوە بووە، کە گوتوویانە: بۆئەوەی زیاتر دڵنیابین کە تۆ پێغەمبەری خوای، وە وەك نیشانەیەك بێ، وە ئەو رۆژەش دەکەینە رۆژێکی جەژن‌و خۆشیی بۆ خۆمان، عیساش ﷺ، داوا لە خوای پەروەردگار دەکات‌و خوای بەخشەریش دەفەرموێ: باشە دایدەبەزێنم، بەڵام هەرکامێك لەوان کە ئەو سفرەو خوانە دەبینێ‌و لێی دەخوا، ئەگەر لەمەودوا بێبڕوا بێ، بە جۆرێك سزای دەدەم، کەسم لە دنیا ئاوا سزا نەدابێ.

<u>دەرسی بیست‌و پێنجەم‌و کۆتایی</u>: پێنج ئایەتەکانی (١١٦ - ١٢٠) دەگرێتە خۆی، باسی وتووێژێکی نێوان خوا ﷻ‌و عیسا ﷺ دەکات، لە قیامەتدا، وەك خوا لە ئایەتی (١١٦)دا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ

لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥۚ تَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِي وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِي نَفْسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾﴾، واتە: کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم! ئایا تۆ بە خەڵکت گوتوە خۆمو دایکم بکەنە پەرستراو لەگەڵ خوا، یان لە جیاتی خوا؟! عیساش ﷺ دەفەرموێ: پاکیی بۆ تۆ، بۆم نیە شتێك بڵێم کە هەق نەبێ، هیچم پێ نەگوتوون مەگەر ئەوەی تۆ پێت فەرمووم، کە: خوا بپەرستن، پەروەردگاری منیشو ئێوەشە، هەر ئەوەم پێ گوتوونو غەیری ئەوەم پێ نەگوتوون، کەواتە: هەرچی کە نەصرانییەکان لە دوای من گوتوویانە کە عیسا کوڕی خوایەو، عیسا پەرستراوەو، عیسا خوایەو، عیسا چی کردووەو چی کردوە، بە شانو شەوکەتی خۆی کردوویەتی، ئەوە هەمووی زیادەی خۆیانەو بۆخۆیان هەڵیانبەستوە، ئاوا خوای پەروەردگار وتووێژ لەگەڵ عیسا ﷺ دەکات لە قیامەتدا، بەڵام جارێ پێش قیامەت خوای زاناو توانا بۆ ئێمەی گێڕاوەتەوە، بۆچی؟ بۆ ئەوەی کە نەصرانییەکانی پێ سەرزەنشت بکات، کە لە قیامەتێ ئاوا عیسا حاشاتان لێ دەکات لەو ئەفسانەیەی کە هێناوتانە نێو دینو شەریعەتی نەصرانییەتەوە، کە شتێکە خۆتان زیادتان کردوە، ئەگەرنا عیساش یەکێك بووە لە پێغەمبەرانی خوا، نە کوڕی خوایەو، نە هیچ پەیوەندییەکی دیکەی تایبەتی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەبووە، تەنیا ئەوەندەیە کە عیسا ﷺ خوا وەك موعجیزەیەك بەبێ باب خوڵقاندوویەتیو ڕووحەکەی یەکسەر بەبەر دایکیدا کردوە، بێئەوەی کە بە شێوەی نوطفەی بابی بچێتە مندالّدانی دایکیەوە، عیسا ﷺ بەو شێوەیە دروست بووەو هەر ئەوەندە جیاوازییەی هەیەو ئەوەش پاساوی ئەوە نیە، بڵێن: کوڕی خوایە، یاخود نیسبەتێکی تایبەتی لەگەڵ خوای بێوێنەدا هەیە، بەڵێ لە قیامەتدا خوای بەرزو مەزن نەصرانیی یەکان بەو شێوەیە بە درۆ دەخاتەوە، لە کاتێکدا کە هەموو بەشەر کۆبوونەتەوە بۆئەوەی کە بۆیان دەرکەوێ، کە نەصرانییەکان بە هەڵەداچوون، ئنجا هەڵبەتە ئەوە لە قیامەتدا دەردەکەوێ، بەڵام خوای پەروەردگار لێرەدا بۆیە بەیانی دەکات، تاکو دەری بخات بۆ نەصرانییەکان کە عیسا دەپەرستن، کە لە قیامەتێ ئاوا شەرمەزار دەبن، وە ئاوا بێ قسە دەبن،

وە ئاوا عیسا ﵇ ئەو عیسایەی کە دەیپەرستن بە ناهەق، ئاوا بەرائەتیان لێ دەکاو حاشایان لێ دەکات، وە ئەویش بەندایەتیی خۆی بۆ خوای بێ هاوەڵ دووپات دەکاتەوە.

ئەمە کۆتایی ئەم دەرسەمان بوو کە ویستم تیشکێك بخەمە سەر سوورەتی (المائدة)، وە بابەتەکانی‌و، چۆنیەتی دابەشبونی بابەتەکانی بۆ ئەو بیست‌و پێنج دەرسە، کە خوا پشتیوان بێ، ئەو دەرسانە بە ڕیز پێیاندا دەچین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یەکەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی: (١ تاکو ٥) دەگرێتە خۆی، لەم پێنج ئایەتەدا سەرەتا خوا ﷻ بۆ یەکەم جار لە سووڕەتی (المائدة)دا بە ناوونیشانی ئیمان، مسوڵمانان دەدوێنێ، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بانگی ئیمانداران دەکات، کە دیارە ئەم ڕستەیە لە سووڕەتی (المائدة) شازدە (١٦) جار دووبارە بۆتەوە، وە خوا بە ئیمانداران دەفەرموێ: پەیمان و گرێبەستەکان بە تەواویی جێبەجێ بکەن، پاشان ڕێگرییان لێ دەکات لە شکاندنی حورمەتی دروشمەکانی دینداریی بە گشتی، بە تایبەتی دروشمەکانی حەج و عومرە، وە ڕێیان لێ دەگرێ لە هاوکاریی یەکدی کردن لەسەر گوناهو دەستدرێژیی، دوای ئەوەی کە فەرمانیان پێ دەکات بەوە کە هاوکاریی یەکدی بکەن، لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی، ئنجا دوایی بە ڕوونیی قەدەغەکراوەکانیان پێ ڕادەگەیەنێ، کە یازدە جۆرن: مرداره‌وه‌بوو، خوێن و گۆشتی بەرازو بۆ غەیری خوا سەربڕاوو ... هتد، وە باسی تەواوکردنی ئایین، کە مەبەست پێی ئیسلامە، وە تەواوکردنی نیعمەتی خۆی، وە هەڵبژاردنی ئیسلام بە تاکە بەرنامەی ژیان بۆ مرۆڤەکان، دەکات، وە پاشان باسی خواردنی ناچاریی دەکات، لەو شتانەی کە قەدەغەکراون، کەسێك کە تێبگیرێ و ناچاربێ، دروستە بایی ئەوەندەی کە لە مەرگ دەرباز بێ، لێیان بخوات.

ئنجا دێتە سەر باسی وەڵامدانەوەی پرسیاری ئەوە کە: چ جۆرێك لە جۆرەکانی خواردن حەڵاڵە؟ خوای کاربەجێ دەفەرموێ: هەر شتێك کە خۆش و سوودبەخش بێ، وە هەروەها ئەو نێچیرانەی کە ڕاو دەکرێن، حەڵاڵن، پاشان باسی حەڵاڵیی خواردنە خۆش و بە سوودەکان دەکات، وە لە کۆتاییدا باسی حەڵاڵیی هێنانی ژنانی پاکیزەی ئیمان‌دار، وە ژنانی پاکیزەو داوێن پاکی خاوەن کتێبەکان، دەکات، وە باسی خۆ دوور گرتن لە زیناو داوێنپیسیی ئاشکراو پەنهان دەکات.

## بسم اللهِ الرَّحمَن الرَّحيم

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ
عَلَيۡكُمۡ غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ وَأَنتُمۡ حُرُمٌۗ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ (١) يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا
تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ
يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن
صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْۘ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ وَلَا تَعَاوَنُواْ
عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ (٢) حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ
وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ
أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ
ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ
دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ
غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٣) يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ
ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُۖ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ
عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ (٤) ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ
ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ
ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ
غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي
ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ (٥)﴾.

# مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((بـە نـاوی خـوای بـە بـەزەیی بەخشـندە، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! پـەیمانو گرێبەستەکان بە تـەواویی جێبـەجێ بکـەن، ئاژەڵە چوار پێیـەکانتان بۆ حـەڵاڵ کـراون جگە لەوەی (لەمەودوا) بەسـەرتاندا دەخوێنرێتەوەو هەڵداوێـردرێ، (بەڵام) لـە کاتێکدا کـە لـە ئیحـرامدان نێچـیران بـۆ خۆتـان حـەڵاڵ مەکـەن، خـوا چـۆنی بـوێ (وە بـە بەرژەوەنـدیی بزانـێ) بڕیـار دەدات ﴿١﴾ ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! دروشــمەکانی (ئاییــنی) خــوا مەشــکێنن، هەروەهــا مانگــە (جــەنگ تێــدا) قەدەغــەکراوەکانو قوربانییــە بــێ نیشــانەکانو، قوربانییــە نیشــانەدارکراوەکانو، ئەوانــەی کــە بەمەبەسـتی وەدەسـتهێنانی بەخشـشو ڕەزامەندیی خوا ڕوو دەکـەنە مزگـەوتی حـەرام (حورمەتیان بپارێزن)، وە هەرکات ئیحرامتان شـکاند (بۆتـان ڕەوایە) ڕاووشـکـار بکەن، وە با ڕقلێبوونەوەتان لە کەسانێك بەهـۆی ئـەوەوە کە ڕێگرییـان لێکـردن لـە (چـوون) بۆ مزگەوتی حەرام، واتـان لـێ نەکات سنوورشکێنیی بکەن، وە هاوکـاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکـەو پارێزکارییو، هاوکـاریی یەکدی مەکــەن لەسەر گونـاهو دەستدرێژیــی، وە پارێز لـە خــوا بکــەن، بێگومـان خـوا سـزای تونـدە ﴿٢﴾ مـردارو، خوێنو، گۆشـتی بـەرازو، سـەربڕاو بـۆ جگـە لـە خـواو، خنکـاوو، (مـرداری) لێــدراوو، هەڵـدێراوو، قـۆچ لێدراوو، لەلایەن دڕندەوە خوراو جگـە لـەوەی سـەرتانبـڕیوە (چـەقۆی فریاکــەوتوە)، وە ئــەوەی کە لەسەر بت سـەربڕاوەو، ئەوە بە هۆی زەلەمەکانەوە دابەشـی دەکـەن، کە ئەوەتــان مایـەی لـە ڕێ دەرچـوونە، هـەموو ئەمانەتــان لــێ قەدەغـەکراون، ئـەمڕۆ ئــەوانەی بێبــڕوان لــە (زەفــەر پێبــردنی) دینەکـەتان نائومێـد بـوون، بۆیــە لـەوان مەترسـنو بەس لە من بترسن، ئەمڕۆ ئایینەکـەتانم بـۆ تەواوکـردنو، چاکـەی خۆمم بەتەواویـی لەگـەڵ کردنو، ئیسـلامم بە بەرنامـە بۆ پەسـند کـردن، ئنجـا هـەر کـەس بەهــۆی برسـیـەتییەوە ناچــار بـوو بێئـــەوەی مەیلــی گونـاه (و خـواردنی حــەڕام بکـات)، ئـەوە بێگـومان خوا لـێبـوردەی میهرەبانــە ﴿٣﴾ لێــت دەپرسـن: چییــان بـۆ حــەڵاڵ کــراوە؟

بڵـێ: خواردنـە خـۆشو سـوودبەخشـەکانتان بـۆ حــەڵاڵ کـراون، وە (نێچــیری) ئـەو (سـەگو پەڕەوەر)انەی کە فێـری ڕاویـان دەکــەن، لــەو زانیارییـەی (ڕاووشکار) کـە خـوا

فێری كردوون، فێریان دەكەن (و ڕایان دەهێنن)، دەجا لەو (نێچیر)ەی كە بۆتان دەگرن، بخۆن‌و ناوی خوای لەسەر بێنن، وە پارێز لە خوا بكەن، بەڕاستی خوا لێپرسینەوەی خێرایە ﴿٤﴾ ئەمڕۆ خواردنە خۆش‌و سوودبەخشەكانتان بۆ حەڵاڵ كراون، هەروەها خواردنی ئەوانەی كتێبیان پێدراوە، بۆتان حەڵاڵەو خواردنی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە، وە (هێنانی) ئافرەتە پاكیزەكانی ئیمانداره‌كان‌و ئافرەتە پاكیزەكانی ئەوانەی پێش ئێوە كتێبیان پێدراوە، بۆتان حەڵاڵە، هەركات مارەیی یەكانیانتان پێدان، ئێوەش خۆپارێزبن نە بە ئاشكرا زینا بكەن‌و نە بە پەنهانییش دۆستان (ی زینا لەگەڵ كردن) بگرن، هەر كەسێكیش كوفر بە ئیمان بكات، ئەوە كردەوەكەی هەڵوەشاوەتەوەو لە دوارۆژدا لە زیانباران ﴿٥﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَوۡفُواْ ): (وَفَّى بعَهْدِهِ يَفي وَفاءً وَأوفَى: إذَا تَمَّمَ العَهْدَ وَلَمْ يَنقُضْ حِفْظَهُ)، (أَوفُوا) واتە: وەفا بكەنو جێبەجێ بكەن، چونكە (وَفَّى بعَهْدِهِ يَفي وَفاءً وَأوفَى) بە مانای پەیمانەكەی جێبەجێ كرد، دێ، جا ئەگەر پەیمانی جێبەجێ كردو تەواوی كردو كارەكەی بردە سەر، هەڵیئەوەشاندەوە، دەگوترێ: (وَفَّى بعَهْدِهِ).

(بِٱلۡعُقُودِ ): (عُقُود) كۆی (عَقْد)ە، (عَقْد) واتە: پەیمان، وە بە مانای گرێبەستیش دێ، وە لە ئەسڵی زماندا (عَقْد) واتە: گرێدانی دوو لای شتێك.

(بَهِيمَةُ): (البَهِيمَةُ: مَا لا نُطقَ لَهُ، وَذَلِكَ لِمَا فِي صَوْتِهِ مِنَ الإِبْهَام، وَفي العُرْفِ بِمَا عَدَا السِّبَاعِ وَالطَّيْر)، واتە: (بَهِيمَة) هەر شتێكە كە قسەی نەبێ، لە كوردەواریی خۆماندا دەڵێن: ئاژەڵ، یان چوارپێ، یان بەستە زمان، لەبەر ئەوە كە خەڵك لە دەنگەكەی ناگات، چونكە (إبْهَام) واتە: شتێك كە ئینسان لێی حاڵی نەبێ، وە لە عورف دا بە جگە لە دڕندەو پەلەوەر دەگوترێ.

(ٱلۡأَنۡعَٰمِ ): بە چوار جۆرە ئاژەڵ دەگوترێ، (الأَنْعَامُ: هِيَ الإبلُ وَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ وَالْمَعِز)، (أَنْعَامُ) بە حوشترو ڕەشەوڵاخو مەڕو بزن دەگوترێ.

(حُرُمٌ): دوو واتای هەن: (أَنْتُم دَاخِلُونَ فِي الحَرَم)، واتە: لە نێو ئەرزی حەڕام دان، یاخود (أَنتُم مُحرِمُون)، واتە: ئێوە ئیحرامتان بەستوە، ئیحرام بەستن بە حەج یان بە عومرە، (الحرَام: الـمَمْنوعُ عَقْلاً أو شَرْعَاً) حەڕام هەر شتێكە كە بە عەقڵ، یان بە شەرع قەدەغە بێ، واتە: بۆ ئینسان دروست نەبێ كە بەكاری بێنێ.

(لَا تُحِلُّواْ ): واتە: حەڵاڵ مەكەن، یاخود بە ڕەوای مەزانن، (أَصْلُ الحَلِّ: حَلُّ العُقْدَةِ، وَحَلَّ الشَّيءِ حَلالاً) وشەی: (حَلّ) لە ئەسڵدا واتە: كردنەوە، دەگوترێ: (حَلَّ العُقْدَةَ) واتە: گرێیەكەی كردەوە، دەڵێ: (حَلال) بۆیە پێی دەگوترێ حەڵاڵ،

وەك بڵـێی گرێـی حــەڕامی لێكــراوەتەوە، وە دەشـگوترێ: (حَـلّ الشَّـيءُ) واتـە: شـتەكە حـەڵاڵ بوو.

(شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ): (شَعَائِر) كـۆی (شَـعيرَة)يـە، واتـە: دروشـم، بۆچـی دروشـمەكانی حـەجو عومرە، یان دروشـمەكانی خواپەرستیی نـاونراون (شَعيرَة)؟ (وَسُمِّيَ بِذَلِكَ؛ لأَنَّهَا تُشْعَرُ أَي: تُعَلَّمُ بأَنْ تُدْمَى بشَعِيرَةٍ) لەبەرئەوە كە نیشـانەدار دەكرێن، بەتایبـەتی ئەو قوربانییـانەی كە بۆ حەج دەبردرێن، ئەگەر حوشتـربن دوونگەكـەیان برینـدار دەكرێن، واتە: نیشانەدار دەكرێ كە ئەو ئاژەڵـە دەبردرێ بۆ سـەربڕین.

(ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ ): مـانگی حـەڕام، كە لێرەدا مەبەسـت پێـی جینسـی مـانگی حەڕامـە، وە مانگە حەڕامەكـان چوارن: (ذُو القِعْدَةِ، ذُو الحِجَّةِ، مُحَرَّمُ، رَجَبُ)، ئـەم چوار مانگـە جـەنگ تێداكرانیـان تێـدا قەدەغـە كـراوە، مانـای دەسـتپێشـخەریی بـۆ جـەنگ، ئەگــەرنا ئەگــەر لـەو مانگـەدا ئـەهلی كـوفر شـەڕ بـە مســوڵمانان بفرۆشــن، قەدەغەنیە لەسـەریان، كە ئەوانیش بەرگریـی لە خۆیـان بكـەن.

(ٱلۡهَدۡيَ ): تاكەكەی (الـهَدِيَّة)یە، وشـەی (هَدِيَّة) واتـە: خـەڵات، بـەڵام لێـرەدا مەبەســت پێـی ئـەو ئاژەڵەیـە بـە دیـاریی دەبـردرێ، كـە لـە ئـەرزی حــەڕامدا بەبۆنــەی حەجـەوە سـەربـبڕدرێ.

(ٱلۡقَلَـٰٓئِدَ ): لە (قَلْد)ەوە هـاتوە، (القَلْدُ: الفَتْلُ) (قَلْد) بـە مانــای هۆنینــەوە دێ، بـە مانــای شــتێك بچــنرێ، بۆیـە گوتــراوە: (القِـلادَة المَفتُولَـة) (قِلادَة) گـەردن بەندێكـە دەچـنرێ، یـان دەهۆنرێتــەوە، (قَلائِـد)یـش كـۆی (قِلادَة)یـە، مەبەسـت لێـرەدا ئـەو حوشـتـرو ئاژەڵانــەن كە گەردن بەندیــان لـە مـل دەكــرێ بۆئــەوەی دیـاربێ، كە ئەوانـە دەبردرێــن بۆ خـوا سـەرببـڕدرێن، بە بۆنـەی حەجـەوە.

(يَجۡرِمَنَّكُمۡ ): (أَي: وَلا يَحْمِلَنَّكُمْ)، واتە: با واتان لێنەكات، (إِجْتَرَمَ: إكْتَسَبَ)، (إِجْتَرَمَ) واتە: وەدەسـتی هێنـا.

(شَنَـَٔانُ ): (شَـنَئْتُهُ: تَقذرَّتُهُ بغضَـاً لَـهُ، شـانِئَـكَ: مُبْغِضُـكَ)، (شَـنَئَان) بـە مانــای ڕق لـێ هەڵسـان دێ، دەڵـێ: (شَنَئْتُهُ) واتە: ڕقم لـێـی هەڵسـا، ڕقم لەو شـتە هەڵسـاوە،

خوا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾الكوثر، واتە: بێگومان ئەو کەسەی تۆ دەبوغزێنێ دوابڕاوە، چونکە موشریکەکان دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ یەکێ لە کوڕەکانی وەفاتی کرد، گوتیان: موحەممەد بێ پاشەوارە، دوابڕاوە، خوای پەروەردگاریش دڵی پێغەمبەری ﷺ دایەوە، فەرمووی: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾الكوثر، واتە: بێگومان ئەو کەسەی تۆ دەبوغزێنێ دوابڕاوە، بێخێرە.

(وَٱلْمُنْخَنِقَةُ ): (أَي التِي خُنِقَتْ حَتّى مَاتَتْ)، ئەو ئاژەڵەیە کە دەخنکێنرێ هەتا دەمرێ، یاخود بۆخۆی دەمرێ، سەری لە شتێکدا عاسێ دەبێ، یان لە ئاودا دەخنکێ، گرنگ ئەوەیە هەر ئاژەڵێك بە هەر شتێك بخنکێ، پێی دەگوترێ: (مُنْخَنِقَة)، وە بە مردار لە قەڵەم دەدرێ.

(وَٱلْمَوْقُوذَةُ ): (المَقْتولَة بضَرْب)، واتە: (مَوقُوذَة) ئاژەڵێکە لە ئەنجامی ئەوەی کە لێی دەدرێ مردار دەبێ، بێئەوەی کە بریندار بکرێ، بەڵام ئەگەر بە تیرو تفەنگو ئەوانە بریندار بکرێ، یان وەك نێچیر بکوژرێ، ئەو کاتە حەڵاڵە، مادام خوێنی لێ بێ.

(وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ ): (الرَّدَى: الهَلاك، والتَردِّي: التَعرّضُ لِلْهَلاك)، (رَدى) بە مانای فەوتان دێ، (تَرَدِّي) بە مانای خۆفەوتاندن دێ، یاخود ئینسان خۆی بخاتە حاڵەتی فەوتانەوە، کە لێرەدا مەبەست پێی ئاژەڵێکە کە هەڵدەدێرێ لە بەرزاییەکەوە، وە مردار دەبێ، ئەوەش گۆشتەکەی قەدەغەیە.

(وَٱلنَّطِيحَةُ ): (النَّطِيحَةُ: مَا نُطِحَ مِنَ الأَغْنَامِ فَمَاتَ)، (نَطِيحَةُ) لەسەر وەزنی (فعيل)ە و بە مانای (مَفعول)ە، ئەو ئاژەڵەیە کە ئاژەڵێکی دیکە قۆچی تێهەڵداو لە ئەنجامی ئەوەدا بمرێ، کە دیارە ئەوەش بە مردار لە قەڵەم دەدرێ.

(وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ ): ئەوەی کە دڕندە خواردوویەتی، دڕندە لە ئاژەڵان وەك: گورگ، شێر، پڵنگ، کەمتیار، چەقەڵ ....، هەموو ئەوانەی کە دڕندەنو ددانیان تیژەو

گۆشت خۆرن، ئەوانە بەشێك لە ئاژەڵێك بخۆن و بە هۆیەوە مرداربێ، ئەوە گۆشتەكەی ناخورێ، وە زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەگەر بەشێكی لێ بخواو نەتوانێ بژیێ بەو بەشەی كە ماوە، ئەگەر چەقۆشی پێرا بگات، ئەوە دیسان بە مردار لە قەڵەم دەدرێ.

(**مَا ذَكَّيْتُمْ**): واتە: سەرتان بڕیوە، (ذَكَتِ النَّارُ تَذْكُو: إتَّقَدَتْ وَأَضَاءَتْ، وذَكَّيْتُ الشَّاةَ: ذَبَحْتُها) ئاگرێك خۆش دەكرێ دەگوترێ: (ذَكَتِ النَّارُ) واتە: ئاگرەكە خۆش بوو، لە ئەسڵدا وشەی: (ذَكَت) لەوەوە هاتوە كە ئاژەڵێك سەربڕدرێ، دەمارەكانی كە خوێنبەرن، وە بۆڕی هەناسەو بۆڕی خواردنی هەڵبڕدرێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (ذَكَاة) واتە: سەربڕین.

(**النُّصُبِ**): (جَمْعُ نَصِيبٍ، وَهُوَ الْحِجَارَةُ تُنْصَبُ عَلَى الشَّئِ، وَكَانَ لِلْعَرَبِ حِجَارَةٌ تَعْبُدُهَا وَتَذْبَحُ عَلَيْهَا) (نُصب) كۆی (نَصيب)ە، عەرەب لە سەردەمی نەفامییدا عادەتیان وابوو چەند بەردێكیان دادەنا دەیانپەرستن و حەیوانیان لەسەر سەردەبڕین، وە خوێنەكەشیان تێهەڵدەسوون، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەو ئاژەڵانەی لەسەر ئەو بەردانە سەر دەبڕدرێن و خوێنەكەیان لەوێ هەڵدەسوورێ، ئەوەش هەر بۆ غەیری خوا سەر بڕاون و دروست نیە گۆشتەكەیان بخورێ.

(**بِالْأَزْلَامِ**): (جَمْعُ زَلَمْ، السَّهْمُ الَّذِي لاريشَ فيهِ) (أزلام) كۆی (زَلَم)ە، ئەو تیرەی كە پەڕەكەی پشتەوەی پێوەنیە، پشتەكەی پێوەنیە، بۆئەوەی كە پێی بڕوا، واتە: دارێكی ڕاست، كە پێیانگوتوە: (زَلَم) وەك یانسیب كاتی خۆی بەكاریان هێناوە.

(**غَيْرَ مُتَجَانِفٍ**): واتە: مەیل نەكات بۆ لای گوناح، واتە: مەبەستی ئەوە نەبێ بە ئارەزووەوە لەو شتە بخوات، بەڵكو ناچاربێ لە مردارەوەبوو، یان لە گۆشتی بەراز، یان لە خوێن، یان لەو شتەی كە بۆ غەیری خوا سەربڕاوە، بە ناچاریی لێی بخوات، نەك بە ئارەزووەوە، بە پێخۆشبوونەوە، مادام مەبەستی ئەوەبێ كە پێی لە مەرگ دەرباز بێ، ئەوە بۆی هەیە بخوات.

(ٱلطَّيِّبَٰتُ ): كۆی (طَيِّبة)یە، (أَصلُ الطيِّبِ: مَا تَستَلِذُّهُ الحوَاسُّ، ومَا تَستَلِذُّهُ النَّفس، وفي الشَّرْعِ: مَا كَانَ مُتَنَاوَلاً مِنْ حَيْثُ مَا يَجُوزُ) واتە: ئەسڵی (طَيِّب) هەر شتێكە كە هەستەكان چێژی لێوەرگرن، وە نەفسی ئینسان چێژی لێوەربگرێ، وە (طَيِّب) لەڕووی شەرعەوە هەر شتێكە كە شەرع ڕێبدابێ ئەو شتە وەربگیرێو بەكاربهێنرێ، هەرچەندە لە بەكارهێنانی قورئاندا وشەی: (طَيِّب) بە مانای حەڵاڵ نیە، چونكە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ﴾، ئەمڕۆ (طَيِّب) بۆ ئێوە حەڵاڵ كراوە، جا ئەگەر (طَيِّب) بە مانای حەڵاڵ بێ، دەبێ بڵێی: (أُحِلَّ لَكُم الحلال) حەڵاڵتان بۆ حەڵاڵ كراوە، كە ئەوەش تەعبیرێكی نارێكە، بەڵكو (طَيِّب) واتە: شتێكی خۆشو بەتامو سوودبەخش.

(ٱلۡجَوَارِحِ ): (جَمْعُ جَارِحَة: لأَنَّهَا تَجْرَحُ، أَو تُكسِبُ. وَكَذَلِكَ الأَعْضَاء سُميت جَوَارِح..)، (جَوَارِح) كۆی (جَارِحَة)یە، وشەی: (جَوَارِح) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای ئەندامەكان بەكاردێ، چونكە ئەندامەكان شتیان پێدەكرێ، بۆ وێنە: بە دەستو پێو چاو... هتد، دەگوترێ: (جَارِحَة) لەبەرئەوە كە بەو ئەندامانە ئینسان شت دەكات، كردەوەكان ئەنجام دەدات، بەڵام لەم ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ ﴾، (جَوَارِح) لێرەدا بە مانای ئەو ژیاندارانە دێ كە ڕاویان پێدەكرێ، ئەو دڕندەو پەرەوەرانەی كە ڕاویان پێدەكرێ، جا سەگە، تاژییە، پڵینگو گورگە ڕاهێنراون بۆ ڕاوكردن، یاخود بازو باشوو و ئەوانە ... هتد.

(مُكَلِّبِينَ ): واتە: فێریان دەكەن، چونكە (التَكْلِيب: التَعْلِيمُ)، (تَكْلِيب) بە مانای فێركردن دێ، واتە: ئەو ئاژەڵەی كە بەكاردەهێنرێ، ئەو پەرەوەرەی كە بەكاردەهێنرێ بۆ ڕاو، وەختێك كە فێری دەكەی فێركردنەكەی پێی دەگوترێ: (تَكْلِيب) واتە: فێری ڕاوكردن، مەشق پێكردن، (مُكَلّبِين: جَمْعُ مُكَلِّب، مُعَلِّمُ الكَلْبِ الصَّيْد)، (مُكَلِّبِين) كۆی (مُكَلِّب)ە، واتە: ئەو كەسەی كە سەگ فێری ڕاو دەكات.

(وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ ): کۆی (مُحْصَنَة)ەیە، واتە: ئافرەتانی پاکیزە، ئافرەتانی پارێـزراو، ئنجا ئایا ئـەوە لەچی ڕاهـاتوە؟ لـە (حِصْـنَ)ەوە هاتوە، (حِصْنَ) بـە مانـای قـەڵا دێ، (الحِصْن: جَمْعُهُ حصُون)، (حِصْنَ) تاکە، کۆیەکەی (حصُون)ە، قەڵا هەرکەسێك بچێتە نێوی دەپـارێزرێ، ئنجا ئافرەتێك کە خۆی دەپارێزێ لـە گونـاح و هەڵـەو پەڵـە، وەك بڵێـی خـۆی کـردوە بـە قـەڵایەك کە کـەس زەفەری پێنابات، بۆیە دەڵێ: (المُحْصَنَاتُ: العَفِیفَاتُ) واتـە: ئافرەتانی پاکیـزەو داوێن پاك، هەروەها لـە زاراوی قورئانـدا وشـەی: (مُحْصَـنَات) جارێ وایـە بـۆ ئافرەتـانی هاوســەرداریش بەکـاردێ، لەبەرئەوەی ئافرەتێکـیش کە ماڵ و مێردی هەبـێ، مەزەنـدەی گونـاهی لـێ دوورترە.

(أُجُورَهُنَّ): کۆی (أَجْر)ە، کە لێـرەدا (أَجْـر) بـە مانـای (مَهْر) دێ، واتـە: مارەیی، وە لە قورئاندا بە زۆری (أُجُـور) بە مانای (مَهُـور) دێ، واتە: مارەییەکـان.

(مُحۡصِنِينَ ): ئەگەر ئافرەتێك داوێن پـاك بـێ، پێـی دەگوترێ: (مُحْصَـنَة)، وە پیـاوی داوێن پاکیش پێی دەگوترێ: (مُحْصِن)، واتە: خۆپارێز، (عَفِیف) پیاوێکە کە خۆی دەپارێزێ لە داوێنپیسیی، دیارە بۆ ئافرەتیش دەگونجێ بشخوێنرێتەوە (مُحْصِنَات) ئافرەتانێـك کـە خـۆ دەپـارێزن، بـەڵام دەشـگونجێ بخوێندرێتـەوە (مُحْصَـنَات) ئافرەتانێك کە دەپـارێزرێن، بـەڵام بـۆ پیـاو زیـاتر (مُحْصِن) بـەکاردێ، ئنجا ئایا بۆچـی بـەو شـێوەیە دەخوێنرێتـەوە؟ چـونکە لـە مەسـەلەی داوێنپیسییـدا پیـاو دەستپێشـخەرەو زیاتر دەوری بکـەر (فَاعِل) دەبینـێ.

(غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ ): واتە: بە ئاشکرا زینـا ناکەن، وشـەی: (سَفَحَ الدَّمَ) واتـە: خوێنی ڕشـت، (سَفَـحَ الـمَاء) ئاوەکـەی ڕشـت، (السِّفاحُ: الزِّنـا لأَنَّ الْمَقصُودَ مِنْـهُ سَفْحُ الـماءِ فَقَط) (سِفَاح) واتـە: زینـاکردن، چونکـە ئـەو کەسـەی کە زینـا دەکات، تەنیـا مەبەستی پێی ئەوەیە کە ئارەزووی جینسیـی خۆی تێر بکـات، مەبەسـتی ئەوەنیـە کە منـداڵی ببـێ و، هاوسەرگیـریی بکات بـە شـێوەیەکی حـەڵاڵ و ماڵ و حاڵی هـەبێ.

(**أَخْدَانٍ** ): (جَمْعُ خِدْن، أَي الْمُصَاحِبِ، وَأَكْثَرُ ذَلِكَ يُسْتَعْمَلُ فِيمَن يُصَاحَبُ بشَهْوَةٍ، يُقَالُ: خِدْنُ الْمَرأَةِ وَخَدِينُهَا، وَيَسْتَوي فيهِ الـمُذكَرُ وَالـمُؤنث)، واتـه: (أَخْدَان) كـۆی (خِدْن)ە، (خِدْن) كەسێكە كە بە پەنهانیی زینای لەگەڵدا بكرێ، جا بـە مانـای هاوەڵ دێ، بـەڵام زیـاتر بـۆ ئـەوە بـەكاردێ كـە بـە ئارەزووەوە هاوەڵایـەتیی لەگـەڵ بكـرێ، واتـە: بـە پـەنهانیی زینـای لەگـەڵ بكـرێ، وشـەی: (خِدْن) كـە بـە (أَخْدَان) كۆدەكرێتــەوە، بۆ پیـاویش‌و بۆ ئافرەتیش بەكـاردێ، چ ئافرەتێك كـە بـە پـەنهانیی زینـا بكـات، چ پیاوێـك بـە پـەنهانیی زینـا بكـات، هـەردووكیان پێیـان دەگــوترێ: (خِدْن)، وە بە كۆمەڵیش پێیــان دەگوترێ: (أَخْدَان).

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەكان

١) هـۆی هاتنــە خـوارەوەی ئـەم ڕســتە قورئانییـەی كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ ﴾، لــەوبارەوە دوو بەســەرهات گێـڕدراونەوە:

أ- {عَنْ عِكْرِمَةَ قَالَ: قَدِمَ الحُطَمُ بْنُ هِندٍ البَكْرِي الْمَدِينَةَ فِي عِيرٍ لَهُ يَحْمِلُ طَعَاماً فَبَاعَهُ ثُمَّ دَخَلَ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَبَايَعَهُ وَأَسْلَمَ، فَلَمَّا وَلَّى خَارِجاً نَظَرَ إِلَيْهِ، فَقَالَ: لِمَنْ عِنْدَهُ لَقَدْ دَخَلَ عَلَيَّ بِوَجْهٍ فَاجِرٍ وَوَلَّى بِقَفَا غَادِرٍ، فَلَمَّا قَدِمَ الْيَمَامَةَ ارْتَدّ عَنِ الإِسْلَامِ وَخَرَجَ فِي عِيرٍ لَهُ يَحْمِلُ الطَّعَامَ فِي ذِي الْقَعدَةِ يُرِيدُ مَكَّةَ، فَلَمَّا سَمِعَ بِهِ أَصْحَابُ النَّبِيِّ ﷺ تَهَيأَ لِلْخُرُوجِ إِلَيْهِ نَفَرٌ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ وَالأَنْصَارِ لِيَقتطعوهُ فِي عِيرِهِ فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ ﴾، الآيَةَ، فَانْتَهَى الْقَوْمُ} (أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ برقم: (١٠٩٦٢)، مُرسلاً، والسيوطي: (٣٨١) والواحدي عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ)، واتـە: عیكرەمـە ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ (یەكێكـە لـە زانایـانی تـابیعین) دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: (الحُطَمُ بْنُ هِندٍ البَكْرِي) هاتـە مەدینـە كاروانێكی پـێ بـوو، خواردنی پـێ بـوو، خواردنەكەی فرۆشت، دوایـی چـوو بـۆ لای پێغەمبـەر ﷺ و بەیعـەتی پێـداو مسـوڵمان بـوو، كاتێـك چـووە دەرێ و ڕۆیشـت، پێغەمبـەری خـوا ﷺ تەماشـای كـردو، ئەوانـەی كـە لـە دەوری بـوون (هاوەڵان لـە خزمەتی بـوون) پێـی فـەرموون: ئـەو كابرایـە بـە ڕووێكـی تاوانبارانـە هاتـە لامو بـە پشـتە ملـێكی پـەیمان شـكێنانە چـۆوە دەرێ، (واتـە: ڕاسـتی نـەكرد كـە خـۆی بـە مسـوڵمان پێشـاندا، دوایـیش مسـوڵمانەتییەكەی هەڵدەوەشـێنێتەوە، دیـارە خـوای پـەروەردگار پـێ ڕاگەیانـدوە، ئەگـەرنا پێغـەمبەر ﷺ غـەیبی نەزانیـوە، یـان بـە فیراسەتێك كە تێیدا دڵنیـا بووە، وای فەرمووە) ئنجا كاتێك چۆوە بـۆ یەمامـە (ئـەو كابرایـە) لـە ئیسـلام هەڵگەڕایـەوە، وە جارێـك بـە كاروانێكـەوە هـات دیسـان خواردنی پـێ بـوو لـە مـانگی (ذِي الْقِعْدَةِ)دا، {واتـە: لـەو مانگەدا كـە حـەجی تێدا

دەكرێو جەنگیشیی تێدا قەدەغەیە، هات بەرەو مەككە دیارە ئەو كاتە پێغەمبەر ﷺ تەشریفی لە مەككە بووە} كاتێك هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بیستیان ئەو كابرایە كاتی خۆی هاتوە مسوڵمان بووەو دوایی هەڵگەڕاوەتەوە، كۆمەڵێكیان خۆیان بۆ سازكرد لە كۆچكەرانو لە پشتیوانان بچن تاكو كاروانەكەی لێ بستێننو لە كاروانەكەی دایبڕن، بەڵام خوا ﷻ ئەم ئایەتەی نارده خوارێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ ... ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دروشمەكانی خوا حەڵاڵ مەكەن، واتە: دەستدرێژیی یان بۆ مەكەن، وە قوربانییەكان كە نیشانەدار نین، وە ئەوانەشی كە نیشانەدارن، وە ئەوانەشی كە بەرەو مزگەوتی حەرام دێن، بە حیسابی خۆیان داوای بەخششو ڕەزامەندیی خوا دەكەن، دەستدرێژیی یان مەكەنە سەرێ، (فَانْتَهَى الْقَوْم) ئەوانیش وازیان هێنا، واتە: نەچوون بۆئەوەی كە زیانی پێ بگەیەنن.

ب- {عَنْ زَيْدِ بْنِ أَسْلَمَ قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِالْحُدَيْبِيَةِ وَأَصْحَابُهُ حِيْنَ صَدَّهُمُ الْمُشْرِكُونَ عَنِ الْبَيْتِ وَقَدِ اشْتَدَّ ذَلِكَ عَلَيْهِمْ، فَمَرَّ بِهِمْ أُنَاسٌ مِنَ الْمُشْرِكِينَ مِنْ أَهْلِ الْمَشْرِقِ، يُرِيدُونَ الْعُمْرَةَ، فَقَالَ أَصْحَابُ رَسُولِ اللهِ ﷺ: نَصُدُّ هَؤُلاءِ كَمَا صَدُّوا أَصْحَابَنَا، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ﴾، الآيَة} (أَخْرَجَهُ السِّيوطِي عَنْ إِبْنُ أَبِي حَاتِم: (٣٨٣)، وَفَتْحُ الْقَدِير لِلشَّوكَانِي بِرَقم: (٧٩٦)، وَالوَاحِدِي بِرَقم: (٣٨٠))، واتە: زەیدی كوڕی ئەسلەم (كە ئەویش یەكێكە لە زانایانی تابیعین) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺو هاوەڵە بەڕێزەكانی كاتێك لە حودەیبییە بوون، ئەو كاتەی كە هاوبەش بۆ خوادانەرەكان گێڕایاننەوە لەوەی كە بچن بۆ زیارەتی مزگەوتی حەرام، (مەشهوورە كە لە ساڵی شەشەمی كۆچی دا بوو) ئەوانیش بەوە زۆر قەڵس بوون، لەو كاتەدا كۆمەڵێك خەڵكی هاوبەش بۆ خوا دانەر كە لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوون، دەیانویست بچن بۆ مزگەوتی حەرام بە مەبەستی ئەنجامدانی عومرە، هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گوتیان: ئێمەش ڕێ لەوانە دەگرینو ناهێڵین بچن، وەك چۆن ڕەفیقە موشریكەكانی ئێمە، (واتە: قەومەكەی ئێمە كە قوڕەیشن) ڕێیان نەدا ئێمە بچین بۆ زیارەتی مزگەوتی حەرام، ئێمەش ڕێ

لەوانە دەگرین، ئەوانەش هەر موشریکن، بەڵام خوا ﷻ ئەم ڕستە قورئانییەی ناردە خوارێ: ﴿ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ ﴾، واتە: با ڕق هەڵسانتان لە کۆمەڵێك کە ئێوەیان گێڕاوەتەوە لە مزگەوتی حەرامو نەیانهێشتوە بچن عومرە بکەن، واتان لێنەکات کە ئێوەش ڕێگە بگرن لەوان، واتە: نەك لە خودی ئەوانەی کە ڕێیان لە ئێوە گرتوە، بەڵام لە کۆمەڵە موشریکێکی دیکە کە لە شوێنێکدانو هەموویان یەك قەومن.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییەی کە دەفەرمویَ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡ ...﴿٤﴾ ﴾، پرسیارت لێ دەکەن چییان بۆ حەلاڵ کراوە؟ لەوبارەشەوە دوو گێڕدراونەوە هەن:

أ- {عَنْ أَبِي رَافِعٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيّ ﷺ أَمَرَهُ بِقَتْلِ الْكِلاَبِ فِي النَّاسِ فَقَالُوا: يَا رَسُولَ اللهِ! مَاذَا يَحِلُّ لَنَا مِنْ هَذِهِ الأُمَّةِ الَّتِي أَمَرْتَ بِقَتْلِهَا؟ فَسَكَتَ النَّبِيّ ﷺ فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡ ...﴿٤﴾ ﴾} (أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ بِرقم: (١١١٣٨)، وَابْنُ الْمُنذِرِ، وَابْنُ أَبِي حَاتِم، والطَّبَرَانِيُّ فِي (الكبير) برقم: (٩٧١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٣٢١٢) وهو صحيح الإسناد، ووافقه الذهبي، وَالبَيْهَقِيُّ)، واتە: ئەبو ڕافیع دەگێڕێتەوە (کە یەکێکە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکرد کە بچێ ئەو سەگانەی کە لەنێو خەڵکیدان بیانکوژێ، (واتە: سەگی ماڵیی)، خەڵکەکە گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەم ئوممەتەی کە فەرمانت پێکردوە بیانکوژین، (واتە: ئوممەتی سەگ، کۆمەڵی سەگ) ئایا ئێمە چیمان بۆ حەلاڵە لەنێو واندا؟ (واتە: بۆمان هەیە لە چیدا بەکاریان بێنین؟) پێغەمبەر ﷺ هیچی نەفەرموو، بێدەنگ بوو، (چونکە دیارە لەلای ڕوون نەبووە، ئایا سەگ بۆ چ حەلاڵە بەکاربهێنرێ؟) هەتا خوای زاڵی پایەدار ئەم ئایەتەی ناردە خوار ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡ ...﴿٤﴾ ﴾، پرسیارت لێ دەکەن چییان بۆ حەلاڵ کراوە؟ ﴿ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ ﴾، بڵێ:

خواردنـە خۆش‌و بە تام‌و بە سوودەكانتان بۆ حەڵاڵ كراون، وە نێچیری ئەو سەگانەش كە فێری ڕاویان دەكەن، وە نێچیرتان بۆ دەگرن، ئەویشتان بۆ حەڵاڵە.

كەواتە: سەگی ڕاو، سەگ كە بۆ ڕاو بەكاردەهێنرێ، دروستە ڕابگیرێ، جا دوایی لە فەرمایشتەكانی پێغەمبەردا ﷺ هەیە كە سەگ بۆ پاسەوانی مەڕو ئاژەڵ‌و، بۆ پاسەوانی‌و كشتوكاڵ‌و ئەوانە دروستە بەكاربهێنرێ، هەروەها سەگ بۆ پاسەوانی ئینسانیش بەكاردەهێنرێ، كابرا كە صاحێب دوژمنە لە خۆی دەترسێ، دروستە سەگ بەكاربێنێ.

ب- {عَن سَعيدُ بنُ جُبَيْرٍ: أَنَّ عَدِيّ بْنِ حَاتِم، وَزَيْدِ بْنِ المُهَلْهِلِ الطائيين سأَلا رَسُولَ اللّهِ ﷺ، فَقَالا: يَا رَسُولَ اللّه! إنّا قَومٌ نَصِيدُ بالكِلابِ، والبزاةِ، فماذا يَحِلُّ لَنَا مِنْهَا؟ فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَة} (أخْرَجَهُ الطّبَرِي برقم: (١١٦)، وَفَتْحُ القَدِير للشّوكَاني برقم: (٨١٦)، وَالسِّيوطِي عَنْ إِبْنُ أَبِي حَاتِم: (٣٨٣))، واتە: سەعیدی كوڕی جوبەیر (كە یەكێكە لە زانایانی تابیعین) دەڵێ: هەر كام لە عەدیی كوڕی حاتیم‌و زەیدی كوڕی موهەلهیل كە هەردووكیان طائیین، (واتە: لە هۆزی طائیین) پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئێمە كۆمەڵێكین، خەڵكێكین بە سەگ ڕاو دەكەین، وە بە بازیش ڕاو دەكەین (هەم سەگان بەكاردێنین‌و هەم بازان بەكاردێنین بۆ ڕاو) ئایا ڕەوایە یان نا؟ خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: ﴿قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ﴾، (جَوَارِح) پێشتریش باسمان كرد، كۆی (جَارِحَة)یە، (جَارِحَة) هەر شتێكە كە ڕاوی پێ بكرێ، چ پەلەوەر بێ، چ ئاژەڵ بێ، ئاژەڵ وەك: سەگ‌و تاژیی‌و پڵنگ‌و شێرو گورگ‌و هەر دڕندەیەكی دیكە، كە لە شوێنانی دیكە هەن، مادام كەویی بكرێ‌و ڕاوی پێ بكرێ‌و بزانێ ڕاو بكات، ئەوە دروستە نێچیرەكەی بخورێ، هەروەها پەلەوەریش بە هەمان شێوە.

## مانـای گـشـــتـی ئایەتەکـــان

دیارە ئێمە پێشتر باسمان کرد کە سوورەتی (المائدة) ژمارەیەکی زۆر یاسای شەرعیی تێدان، من هەروا سەرپێییەك تەماشام کرد، زیاتر لە سەد (١٠٠) حوکمی شەرعیی تێدایە کە ڕاستەوخۆ ئایەتەکان دەیانگەیەنن، وە سوورەتی (المائدة) زۆرترین جار وشەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ی تێیدا دووبارە بۆتەوە لەنێو هەموو سوورەتە مەدەنییەکانداو شازدە (١٦) جار دووبارەبۆتەوە، وە بە زۆریی وایە کە خوا ﷻ وشەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ی بەکارهێناوە، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! حەڵاڵو حەرامو، ئەمرو نەهی بە مسوڵمانان ڕادەگەیەنێ، ئەم سوورەتەش ژمارەیەکی زۆر یاسای شەرعی تێدا هەن، بۆیە پێویستی کردوە خوا ﷻ شازدە جار بانگی ئیمانداران بکات و بە نازناوی ئیمان بێداریان بکاتەوەو بفەرمویٚ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بۆ ئەوەی ئەوان گوێ قوڵاخ بن، چونکە وەك عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس دەڵێ: هەر کاتێك خوا ﷻ فەرمووی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، باش گوێ بگرە، یان حەڵاڵێکە پێت ڕادەگەیەنێ بیکە، یان حەرامێکە پێت ڕادەگەیەنێ مەیکە، یان ئەمرێك کە پێت دەفەرموێ: ئەنجامی بدە، یان قەدەغەیەکەو دەبێ خۆی لێ بە دوور بگری.

جا ئەم سوورەتە موبارەکە ئاوا دەست پێدەکات: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، جارێکی دیکەش باسمان کردوە، کە دەڵێی: ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، دەبێ سێ واتا لە مێشکی خۆتدا ئامادە بکەی، چونکە ﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴾، بە ناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، واتە: دەستپێکردنم بۆ ئەم کارە کە قورئان خوێندنە، نوێژ کردنە، هەر کارێکە کە دەکرێ، نان خواردنە، کارو کەسابەتە، دەستپێکردنم بەو کارەم، بە ناوی خوای بە

بەزەیی و بەخشندەیە، یاخود بە ناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە دەست بەو کارە دەکەم، جا ئەمە یانی چی؟ سێ واتا دەبێ لە مێشکی خۆتدا ئامادە بکەی:

یەکەم: ئەو کارەم دەکەم، بۆ ئەوە کە خوا لێم ڕازی بێ و پاداشتی لەسەر وەربگرم، وە پێی لە خوا نزیك ببمەوە.

دووەم: ئەو کارە ئەنجام دەدەم، بە پێی شەرعیی خوا.

سێیەم: ئەو کارە ئەنجام دەدەم، بە یارمەتی خوا، بە هاوکاریی خوا، نەك بە شان و شەوکەتی خۆم.

خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! یانی چی؟ یانی ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ! ئەوە ماناکەیەتی، بەڵام پێویست ناکات هەمووجار خوا ﷻ بفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ بكل ما يَجبُ الإيمان به﴾، بەڵکو کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! واتە: بە هەموو ئەو شتانەی پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، کە لە شوێنەکانی دیکە ئیمان پێ هێنراوەکان (مَا يُؤمَن بِهِ)، ڕوون کراونەوە، بۆیە پێویست ناکات خوای پەروەردگار هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، هەموو جارێ باسیان بکات، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ﴿ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ ﴾، پەیمانەکان جێبەجێ بکەن بە تەواویی، گرێبەست و پەیمانەکان جێبەجێ بکەن و ئەنجامیان بدەن، مەبەست لە پەیمانەکان چییە؟ دوایی باسی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا، بەڵام لێرەدا خوای زانا بە کورتیی وا دەفەرموێ، چونکە لەسەر ڕای زۆرێك لە زانایان هەرچی حەڵاڵ و حەرامە، ئەمرو نەهییە، هەرچی خوا فەرزی کردوە، یان هەرچی خوا قەدەغەی کردوە، هەمووی پەیمانی خوایەو، لە گەردنی ئێمەو لە ئەستۆی ئێمە دایە، دەبێ جێبەجێی بکەین، مادام تۆ دەڵێی من شایەدیی دەدەم کە بێجگە لە خوا هیچ پەرستراونین، وە شایەدیی دەدەم کە موحەممەد ﷺ ڕەوانەکراوی خوایە، کەواتە: هەرچی ئەو موحەممەدە ﷺ، لەو تاکە پەرستراوەو، لەو تاکە پەروەردگارو بەدیهێنەرەوە هێناویەتی، تۆ پەیمانێکە بە خوات داوە، مادام دەڵێی: تەنیا ئەو بە پەرستراوو بە پەروەردگاری

خۆم دەزانم، وە موحەممەد ﷺ بە ڕەوانەکراوی خوا دەزانم، ئەوە پەیمانە بە خوا داوتە کە پابەندبی بەو حەڵاڵو حەرامانەوە، پابەندبی بەو یاسا شەرعییانەوە، دەشگونجێ مەبەست پێی مانایەکی تایبەت بێ، واتە: ئەو پەیمانانەی کە بە خوا دەیاندەن و، ئەو پەیمانانەی لەنێو خۆتان دەیاندەن و، ئەو پەیمانانەی لەگەڵ خۆتان دەیاندەن، هەر سێ جۆرەکان جێبەجێ بکەن، کە دوایی ڕوونتر باسی دەکەین، ئەو سێ جۆرە پەیمانە چۆنن؟ ئەوجار دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾، ئاژەڵە چوار پێیەکانتان بۆ حەڵاڵ کراون، ﴿بَهِيمَةُ﴾، هەر ئاژەڵێکە کە چوار پێ بێ، ئنجا بۆچی بە ئاژەڵی چوارپێ دەگوترێ ﴿بَهِيمَةُ﴾؟ چونکە دەنگێکی نیە خەڵك لێی حاڵی بێ، (إِبْهَام) واتە: شتێك کە لێی حاڵی نەبی، لەبەرئەوەی ئاژەڵ دەنگی هەیە، بەڵام دەنگەکەی مەفهووم نیە، زانراونیەو تێی ناگەی، بۆیە پێی دەگوترێ: ﴿بَهِيمَةُ﴾، ئنجا ئایا ئاژەڵە چوار پێیەکان چیو چین؟ زۆربەی زانایان ئەگەر نەڵێین هەموویان دەڵێن: چوار جۆرن (الأَنْعَامُ: هِيَ الإِبلُ وَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ وَالْمَعِز)، (أَنْعَامُ) بە حوشترو ڕەشەوڵاخ (واتە: مانگاو گا)و مەڕ (واتە: ئاژەڵی سپی واتە: مەڕو بەرانو بەچکەکانیشیان)و بزن (واتە: بزنو نێرییو بەچکەکانیشیان)، ئەوانەتان بۆ حەڵاڵکراون ﴿إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾، جگە لەوەی بەسەرتان دەخوێنرێتەوە لە ئایەتی ژمارە سێی هەر ئەم سوورەتەدا، کە یازدە (١١) جۆرن هەڵاوێردراون، ئەو یازدە (١١) جۆرە حەڵاڵ نین، سوود لە گۆشتەکەیان ببینرێ ﴿غَيْرَ مُحِلِّي ٱلصَّيْدِ وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾، نێچیر بۆخۆتان حەلاڵ مەکەن، لە کاتێکدا کە ئێوە لە ئیحرام دان و ئیحرامتان بەستوە بە حەج، یان بە عومرە، یان بە هەردووکیان وێکڕا، یاخود لە کاتێکدا کە ئێوە لەنێو سنووری ئەرزی حەرام دان، لەنێو سنووری حەرەمدا بۆتان نیە ڕاو بکەن، ﴿وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾، هەردوو واتاکەی هەیە، واتە: لەنێو سنووری حەرەم دان، یاخود ئێوە لە حاڵەتی ئیحرام دان، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ﴾، بێگومان خوا ئەوەی بیەوێ بڕیاری لەسەر دەدات، ئنجا ئایا خوا چی دەوێ؟ بێگومان هەموو ئەو شتانەی دەوێ کە خێرو بەرژەوەندیی دنیاو دواڕۆژی

ئێمـەیان تێدایە، چونکە خوا کاربەجێیـە، وە خـوا ئەوپـەڕی حیکمـەتو ڕەحمـەتو بەزەیی هـەیە.

ئنجـا بـۆ جـاری دووەم خـوا دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتان هێناوە! ئنجـا بابـەتێکی دیکـەمان پـێ دەفەرموێ، چونکە هیچ جارێك خـوای کاربـەجێ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، بـەکارناهێنێ مەگـەر شـتێکی دیکـەی نوێمـان پـێ بفەرموێ، لێرەشدا کۆمەڵێك حوکمی دیکەی شـەرعییمان پـێ دەفەرموێ، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! بـە هـەموو ئـەو شتانەی پێویستە ئیمانیـان پـێ بهێنـرێ، ﴿لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ ﴾، دروشـــمەکانی خـوا حـەڵاڵ مەکـەن، یـانی چـی؟ واتـە: بۆخۆتـان ڕەوای مەکـەن کە دەست درێژییان بکەنە سەرىٚو زیانیان پـێ بگەیـەنن، حورمـەتیان بشکێنن، دروشـمەکانی خـوا چین؟ دروشـمەکانی خـوا هەموو ئـەو شـتانەن کە دینـداریی یـان تێدا بەرجەسـتە دەبـێ، مزگـەوت دروشـمی خوایـە، بانگ دروشـمی خوایە، مەناسیکی حـەجو عومرە دروشـمی خوان، هەموو ئەو شـتانەی کە دینداریی یان تێدا دەردەکەوێ، مانگـی ڕەمـەزان دروشمـی خوایـە، لـە ڕەمەزانـدا نابـێ شـت بخـۆی، ئەگـەر کـابرا پاسـاویشـی هـەبێو نەخۆشـیش بـێ، یاخـود ڕێبواریش بـێو بـەڕۆژووش نەبـێ، بـەڵام بـا لەبەرچـاوی خەڵـك شـت نەخـوات، ئـەوە حورمـەتی ئـەو مانگـەیە، بەڵـێ دروشمەکانی خـوا، هەموو ئـەو شتانەن کـە دینـی خوایـان تێدا دەردەکەوێو نیشـانەی ئـەوەن کـە ئـەو خەڵکـە مسـوڵمانە، ئنجا هەنـدێك لـەو دروشمانـەمان بـۆ بـاس دەکاتو دەفـــــەرموێ: ﴿وَلَا ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَلَا ٱلۡهَدۡيَ وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗا ﴾، چوار لـەو دروشمانـەمان بەتایبـەت بـۆ بـاس دەکات، ئەگـەرنا کـە دەفـەرموێ: ﴿لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ ﴾، دروشمـەکانی خـوا مەشـکێنن، ئـەم چوارەش دەگرێتەوە، بـەڵام ئـەوە لـە زمـانی عەرەبیـدا پێـی دەگوتـرێ (ذِكـرُ الخَـاصِ بَعْـدَ العَـام) واتـە: باسـکردنی تایبـەت دوای باسـکردنی گشـتی، وەك لـە سـوورەتی (البقـرة)دا خـــوای پەروەردگـــار دەفـــەرموێ: ﴿ مَن كَانَ عَدُوّٗا لِّلَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ

﴿وَرُسُلِهِۦ وَجِبۡرِيلَ وَمِيكَىٰلَ فَإِنَّ ٱللَّهَ عَدُوٌّ لِّلۡكَٰفِرِينَ ۝٩٨﴾، واتە: ئەوانەی كە دوژمنایەتیی خواو فریشتەكانیو پێغەمبەرەكانیو جبریلو میكال دەكەن، خۆ (جبریلو میكال)یش هەردوو فریشتەن، ئەوەی كە كوفر دەكات بە مەلائیكەت، كوفریش دەكات بە جبریلو میكال، بەڵام بە تایبەتی باسیان دەكات، لەبەر ئەوەی پایەو پێگەیەكی تایبەتییان هەیە، ئنجا دەفەرمویٚ: مانگە حەرامەكان حەلاڵ مەكەن، مانگە حەرامەكان كامانەن؟ چوار مانگن (ذُو الْقِعْدَةِ، وَذُو الْحِجَّةِ، مُحَرَّمُ، وَرَجَبٌ) ئەو چوار مانگە جەنگیان تێدا قەدەغە كراوە، نابێ مسوڵمانان دەستپێشخەریی جەنگ بن لەو چوار مانگەدا، ئەدی ئەگەر كافر هێرشیان كردە سەر مسوڵمانان؟ ئەوە ئەو كاتە مانای ئەوەنیە حورمەتی مانگەكانیان شكاندوە، چونكە خۆ ئەگەر شەڕ بەری دەرگای پێگرتی دەبێ بیكەی، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا بە درێژیی باسی ئەو مەسەلەیەمان كردوە، لەو شوێنەدا كە دەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞ ...۝٢١٧﴾، لەوێدا بە تەفصیل باسمان كردوە، كەواتە: دەستپێشخەریی جەنگ لەسەر مسوڵمانان قەدەغەیە لەو چوار مانگەدا، بەڵام بەرگریی لەخۆكردن، نا، ﴿وَلَا ٱلۡهَدۡيَ﴾، (الهَدِي) ئەو ئاژەڵەیە كە بە دیاری دەبردرێ بە بۆنەی حەجەوە سەرببڕدرێ، ﴿وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ﴾، (قَلائِد) كۆی (قِلادَة)یە، (قِلاد) ئەو گەردن بەندەیە كە بەتایبەتی لە ملی حوشتر دەكرێ، ئەگەر لە ملی مەڕو بزنو ڕەشەوڵاخیش بكرێ هەرواى پێ دەگوترێ، واتە: ئەو ئاژەڵانە كە گەردن بەندیان لە مل كراوەو نیشانەدار كراون، كە ئەوانە دەبردرێن بە موناسەبەی حەجەوە، سەردەبڕدرێن، بكرێنە قوربانیی ئەوانەش حورمەتیان مەشكێنن، ﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ﴾، واتە: (قاصِدین) ئەوانەش كە بەرەو بەیتی حەرام دەچن بەرەو ماڵی حەرام، ماڵی حەرام، واتە: ئەو شوێنەی كە حەرامە تێیدا گوناح بكرێ، حەرامە تێیدا ناشەرعیی بكرێ، ئنجا خۆ ناشەرعیی لە هەموو شوێنێك هەر حەرامە، بەڵام لەوێ حەرامترە، وە گوناحو تاوانو سەرپێچیی سزایان لە ئەرزی حەرەمدا بەتایبەتو لە مزگەوتی حەرەمدا بەتایبەتی تر زۆر زیاترە، وەك چۆن نوێژێك بە

سـەد هەزار نوێژە، گوناحێکیش دیارە لەوێ سزاکەی زیاترە، جا ئەوانەی کە بەرەو بەیتی حەرەم دێن، چی دەکەن؟ ﴿يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَانًا ﴾، لە پەروەردگاریانەوە بەخشش و ڕەزامەندیی داوا دەکەن بەو مەبەستە دێن، جا دەگونجێ ئەمە مەبەستی پێی تەنیا مسولمانان بێ، وە دەشگونجێ مەبەستی پێی مسولمان و نامسولمان بێ، واتە: هەر کەسێك کە بەو مەبەستە دەچێ، ئێوە دەستدرێژیی مەکەنە سەریان، دیارە ئێمە دوایی باس دەکەین، کە دوایی خوای پەروەردگار لە سوورەتی (التوبة)دا ئایەتێکی دابەزاند، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا...﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! موشریکەکان پیسن، (واتە: پیسی مەعنەویی) با لە دوای ئەمساڵیانەوە توخنی مزگەوتی حەرام نەکەون، بەڵام ڕێگرتن لە موشریکەکان کە بچن بۆ مزگەوتی حەرەم جیایە، وە دەستدرێژیی کردنە سەریان و دەستدرێژیی کردنە سەر ئەو قوربانییانەی کە دەیانبەن، جیایە، ﴿ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْ ﴾، واتە: وە هەرکاتێ ئیحرامتان شکاند، (مُحْرِم) واتە: ئیحرام بەستوو (حَلال) واتە: کەسێك کە ئیحرامی شکاندوە، هەر کاتێك ئیحرامتان شکاند ﴿ فَٱصْطَادُواْ ﴾، ڕاو بکەن، ئایا فەرزە هەر کەسێك ئیحرامی شکاند ڕاوێ بکات؟ چ ئیحرامی بە حەج بەستبوو، دوایی تەواوی کرد، چ ئیحرامی بە عومرە بەستبوو، عومرەکەی تەواو کرد، فەرزە لەسەری ڕاوێ بکات؟ نەخێر، ئەوە لێرەدا زانایانی (أصول الفقه) دەڵێن: (الأَمْرَ بَعْدَ الْحَظْرِ يُفِيدُ الإِبَاحَةِ) واتە: فەرمان کردن دوای قەدەغەکردنی شتێك، ڕەوابوون دەگەیەنێ نەك پێویست بوون، واتە: بۆتان هەیە، تا ئێستا لێتان قەدەغە بوو ڕاو بکەن، مادام لە ئیحرامدا بوون، لەمەودوا مادام ئیحرامتان شکاند، بۆتان هەیە ڕاو بکەن، بەڵام فەرز نییە لەسەریان ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ ٱلْمَسْجِدِ ٱلْحَرَامِ أَن تَعْتَدُواْ ﴾، وە با ڕق هەڵسانتان لە کەسانێك کە ئێوەیان لە مزگەوتی حەرام گێڕایەوەو نەیانهێشت بچن عومرە بکەن، {لە ساڵی شەشەمی کۆچیدا}، واتان لێ نەکات کە دەستدرێژیی بکەنە سەریان، ڕق هەڵسانتان لەوان با ئێوە تووشی

هەڵـەو ناشـەرعیی نـەکات، ئەگـەر ئـەوان خراپـەیان لەگـەڵ ئێـوەدا کـردوە، ئێـوە وامەکەن، ئەگەر ئەوان گوناهیان کردوە لەگـەڵ ئێـوەدا، ئێـوە وا مەکـەن مسوڵمان دەبـێ جیابـێ، ئەوە مەبەست پێی ئەوەیە کە لە ساڵی شـەشەمی کۆچیـدا پێغـەمبەر ﷺ بـە خۆیو هەزارو چوار سـەد لـە هاوەڵانی بـەڕێزی چوون بـەرەو مەککە کە بچن عـومرە بکـەن، کافرەکـانی مەککـە ڕێیـان پـێ گـرتن، سـەرەنجام ئـەوە بـوو کـە صـوڵحی حودەیبییەی لێکەوتەوەو ئەو ساڵە نەچوون، ئنجا بۆ سـاڵی دوایـی، پێـی گـوترا: (عُمْـرَةُ القَضَـاء)، واتـە: عومرەیـەك کـە گێڕدرایـەوە، وەك مـن لـە کتێبـی (پوختـەی ژیاننامـەی پێغەمبەری خـوا ﷺ)دا باسـم کـردوە، وە لـە کتێبـەکانی ژیاننامـەی پێغەمبـەردا هـاتوە، چـوون ئـەو عومرەیـان گێڕایـەوە لـە ساڵی حەوتەمـدا، ئنجا خـوا دەفـەرموێ: بـا ڕق هەڵسانتان لەوان کە ئێوەیان لە مزگەوتی حەرام گێڕایەوە، ئەو کارەیان واتان لـێ نەکات، ئێوەش دەسـتدرێژیی بکەنە سەر ئەوان، بـە هـەر شـێوەیەك لـە شـێوەکانی دەسـتدرێژیی بێ ﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ﴾، وە لەنێو خۆشـتانیشـداو لەگەڵ ئەوانیشدا لەسەر هـەر شـتێك کـە چاکەکارییەو پارێزکارییـە، هاوکـاریی یەکـدی بکـەن ﴿ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ ﴾، وە هاوکاریی یەکدی مەکەن، لەسەر گونـاهو دەسـتدرێژیی ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾، وە پارێـز لە خوا بکەن، بێگومان خوا سـزای تونـدە، واتـە: سـزای تونـدە بـۆ هـەر کەسـێك کـە ئـەو فەرمانـەی خـوای پـەروەردگار دەشکێنـێ، وە دەستدرێژیی دەکاتە سەر دینـی خوا، ئنجـا خوای پـەروەردگار بۆمـان باسـی ئـەوە دەکات کـە بـەڵێنی دا باسـی بکـات، وەك پێشـتر فـەرمووی: ﴿ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ﴾، جگـە لـەوەی بەسـەرتاندا دەخوێنرێتـەوە، ئەوە لێتـان قەدەغەیـە، ئەگـەرنا ئاژەڵـە چوارپێیەکـانتان بـۆ حەڵاڵـن، جگـە لـەوەی بەسـەرتان دەخوێنرێتـەوە، واتـە: هـەر لـەو ئـاژەڵە چـوارپێیانە، یـازدە حاڵەتیـان بەسـەر دادێـن کـە قەدەغەیـە بـۆ ئێـوە سـوود لـە گۆشـتەکەیان وەربگـرن، ئەوانـەش یـازدە حاڵەتەکـەن، دەفـەرموێ: ﴿ حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ﴾، لێتان قەدەغە کراوە:

١) ﴿ ٱلۡمَيۡتَةُ ﴾، مردار.

٢) ﴿وَٱلدَّمُ﴾، خوێن.

٣) ﴿وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ﴾، گۆشتی بەراز.

٤) ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾، وە هەرشتێك بۆ جگە لە خوا دەنگی پێ بەرز کراوەتەوە، واتە: سەربڕاوەو ناوی غەیری خوای لەسەر هاتوە.

٥) ﴿وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ﴾، خنكێنراو.

٦) ﴿وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ﴾، لێدراو، لێی بدرێ تاکو مردار دەبێ.

٧) ﴿وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ﴾، هەڵدێراو، لە شوێنێکی بەرز هەڵدێرێ.

٨) ﴿وَٱلنَّطِيحَةُ﴾، قۆچ لێدراو، قۆچی لێ بدرێ تا مردار دەبێ.

٩) ﴿وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ﴾، وە ئەوەی کە دڕندە دەیخوا، گورگە، کەمتیارە، پڵنگە، شێرە، ورچە، بەشێکی لێ دەخواتو ئەوی دیکە دەمێنێتەوە ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ﴾، جگە لەوەی کە سەری دەبڕنو جگە لەوەی چەقۆی فریا دەکەوێ، کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین.

١٠) ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾، وە لێتان قەدەغە کراوە ئەوەی کە لەسەر (ٱلنُّصُبِ) واتە: لەسەر ئەو بەردانەی کە دانراونو چەقێنراون، لەسەر ئەو بەردانە سەردەبڕدرێن، وە خوێنەکەی لە بەردەکان هەڵدەسورێ.

١١) ﴿وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِ﴾، وە لێتان قەدەغە کراوە ئەو گۆشتانەی کە بە زەلەمەکان، بە یانسیب دابەشیان دەکەن، (الأزلام) کۆی (زَلَم)ە، (زَلَم) بریتیە لە تیرێك کە پەڕەکەی دوایی پێوەنەبێ بۆ ئەوەی بڕوا، چونکە نایانەوێ بیهاوێن، واتە: شێوەی لوولە دارێك بووە، کە لە تەفسیرەکاندا باسی دەکات، دەڵێ: سێ لوولە داری بچووك بوون، یەکێکیان لەسەری نووسراوە: پەروەردگارم فەرمانی پێ کردووم، یەکێکیان لەسەری نووسراوە: پەروەردگارم ڕێی لێ گرتووم، وە

یەکێکیان هیچی لەسەر نەنووسراوە، جا کەسێك ویستبێتی شتێك بکات، بۆ وێنە: گۆشتیان بەش کردوە، بەوە دابەشیان کردوە، توورەکەیەك کە ئەو سێ داروچکەیەی تێدا دەبوون، کابرا دەستی تێوەرداوەو یەکێکی ڕاکێشاوە، ئنجا ئەگەر ئەوە بووبێ کە نووسراوە: پەروەردگارم فەرمانی پێ کردووم، گوتوویەتی: ئەوە بەشە گۆشتێکت کەوت، وە ئەگەر ئەوەی دیکە بووبێ کە نووسراوە: پەروەردگارم ڕێی لێ گرتووم، گوتوویانە: کاکە تۆ نات کەوێ، وە ئەگەر ئەوی سێیەمیان بووبێ، کە هیچی لەسەر نیە، دووبارەیان کردۆتەوە، وەك ئێستا پێی دەڵێن: یانسیب، ئنجا هەرشتێك بە یانسیب دابەش بکرێ، ئەوە قەدەغەیە ﴿ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ ﴾، ئا ئەوەتان لە ڕێ دەرچوونە، واتە: ئەوەی کە بە یانسیب دابەش بکرێ بەشێوەی قومار، یاخود هەموو ئەو شتانە، کە لەڕاستیدا وا باشترە مەبەست هەموویان بێ، واتە: هەر کەسێك لە هەر کامێك لەوانە بخوات، ئەوە لە ڕێ دەرچوونەو پێی گوناهبار دەبێ.

ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ ﴾، ئەمڕۆ ئەوانەی بێبڕوان لە دینەکەی ئێوە نائومێد بوون، واتە: نائومێد بوون کە زەفەر بە دینەکەی ئێوە بەرنو چرای دینەکەتان بکوژێننەوە، یاخود نائومێد بوون لەوەی کە جارێکی دیکە بگەڕێنەوە بۆ بەکارهێنانی مردارەوە بووو خوێنو گۆشتی بەرازو بۆ جگە لە خوا سەربڕاوو ئەو شتانە، چونکە تازە ئەو ئیسلامە چەسپیوەو دەبێ خەڵك شتی پاك بخوات، ئنجا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ﴾، لەوان مەترسێن، یانی: لە کافرەکان مەترسێنو تەنیا لە من بترسێن ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ﴾، ئا ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆ تەواو کردن، واتە: یاسا شەرعییەکان هەموویان دابەزێنران، حەڵاڵو حەرامەکان هەموویان دیاریی کراون، ئەمرو نەهییەکان هەموویان دیاریی کراون، پێشتر دینەکە بەنسبەت قۆناغی پێشەوە تەواو بوو، بەڵام بەنسبەت قۆناغی کۆتایی تەواو نەبووە، بۆیە دەفەرموێ: ئەمڕۆ بە تەواوی دینەکەتان تەواو بوو، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە ئەمڕۆ دینەکەتانم بۆ وا لێکردوون کە هەیبەتو هەیمەنەو دەسەڵاتی هەبێ، ﴿ وَأَتۡمَمۡتُ

﴿ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي ﴾، وە چاکەی خۆم لەسەر ئێوە تەواو کرد، ﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾، وە ئیسلامیشم بە بەرنامە بۆ پەسند کردوون، کەواتە: تەنیا ئیسلام بەرنامەی پەسند کراوی منە بۆ ئێوە، ئەوی دیکە هەمووی لای من ڕەت کرایەوە، ئنجا خوا ﷻ دوای ئەوە دێتە سەر خواردنە قەدەغەکراوەکان و دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ ﴾، هەر کەسێك ناچاربوو لە برسیەتیدا بەبێ ئەوەی مەبەستی پێ گوناح بێ و ئارەزووی گوناح کردنی هەبێ و، هەر ئارەزووی بێ لە گۆشتی بەراز بخوات، یان لە مردارەوە بوو، یان خوێن بخوات، واتە: خواردنەکەی لە ڕووی ئارەزووەوە نەبوو، بەڵکو ناچار بووە، ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، بێگومان خوا لێبووردەی بە بەزەیی یە، یانی: گوناهبار نابێ کە لە کاتی ناچارییدا لەوانە بەکاربێنێ، بایی ئەوەندەی کە نەمرێ و لە مەرگ ڕزگاری بێ.

ئنجا دیارە پرسیاریان لە پێغەمبەر ﷺ کردوە، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، گوتوویانە: چیمان بۆ حەڵاڵە؟ وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ ﴾، پرسیارت لێ دەکەن: چییان بۆ حەڵاڵە؟ دیارە پرسیارەکە دەربارەی جۆرەکانی گۆشت بووە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ﴾، پێیان بفەرموو: خواردنە خۆش و بەتام و بە سوودەکانتان بۆ حەڵاڵ کراون، دیارە (طَيِّبات) کۆی (طَيِّبَة)ە، (طَيِّبَة)ش هەر شتێکە کە خۆش و بەتام و بەلەزەت بێ و، نەفسی ئینسان ئارەزووی بۆ بچێ و سوودبەخشیش بێ، واتە: بە قازانجی جەستە تەواو بێ، ئەگەرنا کەسێك کە ئارەزووی بۆ شەراب و مردارو بۆ گۆشتی بەرازو بۆ شتێکی خراپ دەچێ، ئەوە لەڕاستیدا ناتوانێ بڵێ: ئەوە لە (طَيِّبَات)ە، چونکە ئارەزووت بۆی دەچێ، بەڵام زیانی هەیەو، مادام زیانی هەیە بۆ جەستە لە (طَيِّبَات) نیە، بۆیە حەڵاڵیش نیە، ئنجا وشەی: (طَيِّبَات) ماناکەی گشتییە، بەڵام لێرەدا زیاتر مەبەست پێی ئەو ئاژەڵانەن کە گۆشتیان دەخورێ، ئنجا جۆرێکی دیکەی حەڵاڵ دەخاتەڕوو، ﴿ وَمَا عَلَّمۡتُم مِّنَ ٱلۡجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ ﴾، واتە: ئەو نێچیرگرانەش کە فێریان دەکەن، فێری

ڕاویــان دەکـەن، بۆیـەش دەڵــێم: نێچیــرگر تاکــو هـەم چـوار پـێش بگرێتــەوە، واتـە: سەگو تـاژیی‌و پڵـنگ‌و ئەوانـە، هـەم پەلـەوەرەکانیش بگرێتـــەوە، وەك بـازو باشـــوو... هتـد، هەرچـەندە لـە کـوردەواریی ئێمەشـــدا پەلـەوەران کەمتــر بـەکاردێن‌و بـە زۆری تــاژیی‌و ســەگ‌و ئەوانـە بـەکاردێن، ئەگـەرنا چـەند جـۆرە پەلـەوەرێکیش هـەن کـە بـۆ ڕاووشــکار بەکــاردێن، جا خـوا دەفــەرموێ: نێچیــری نێچیــرگرانیش بـۆ ئێـوە حەڵاڵـە، بەڵام بە مەرجێك فێریان بکەن‌و مەشقیان پـێ بکـەن، ئەگـەرنا ســەگێك کـە نێچیرەکەی بۆخـۆی بگـرێ‌و لـێی بخوات، ئـەوە نێچیرەکەی حـەڵاڵ نیـە، بۆچـی؟ چونکە بـۆ خـۆی گرتوویەتی‌و لـێی خواردوە، بۆیـە دەبـێ فێـری ڕاو بکـرێ، ئنجا کـە فێـر کـرا، ئـەو کاتـە ڕەنگـە لـە کـاتی گرتنیــدا برینــداری بکــات، وە بریندارکردنەکــەی ئەگـەر بەهۆیـــەوە مردار بـێ، ئەوە بریندارکردنەکەی بە ســەربڕان حیســابە، مـادام ســەگی ڕاوی بــێ، یـان پەلـەوەری ڕاوی بــێ، بـەڵام ئەگــەر بـۆ خـۆی لێـی خـوارد، هـەتا تێـر دەبـێ، مانـای وایـە بۆخۆی گرتوویـەتی‌و ئەو کـاتە بە نێچیـرگر لەقەڵـەم نادرێ، بۆیە ئەو نێچیرەی کە ئـەو جۆرە درندانە دەیگرن حەڵاڵ نیە، جا دەفـەرموێ: ﴿ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ ﴾، لـەوەی کە خـوا فێـری کـردوون، فێریـان دەکـەن، واتـە: ڕایـان دێـنن، مەشـقیان پێدەکـەن لەسـەر ڕاوکردن، ﴿ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ ﴾، وە بخۆن لـەوەی کـە بـۆ ئێوەیـان گــرتوە، ئـەدی ئەگەر بۆخۆیانیان گرتبوو؟ ئەگەر بۆخۆیانیان گرت‌و لێیـان خوارد، مانای وایە بۆخۆیـان گرتوویانەو حـەڵاڵ نیە لێی بخـۆن.

ئنجـا دەفـەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ﴾، وە نـاوی خواشـی لەسـەر بێـنن، یـانی: نــاوی خــوای لەســـەر بێنـــن لـە کـاتی خواردنیـــدا، یـان نـاوی خـوای لەســەر بێـنن لـە کاتێکـدا کە ئەو نێچیـرگرە دەنێرن، سـەگە، تاژییـە، بـازە، کـاتێك تێـی بـەردەدەی لـەو نێچیـرە، لەو کاتەدا (بِسْمِ اللَّه)ی لـێ بکـەن، ئـەوەش تەفصــیلاتێکی هەیـە دوایی باسـی دەکەین، ئەگەرنا ناوی خـوا هێنـان لەسـەر خـواردن هـەر هەیـە، بـەڵام نـاوی خـوا هێنـان لەسەر خواردن سوننەتە، بەس ئەمەیان زۆربەی زانایان دەڵێن: فەرزە، وەك دوایـی باسـی دەکـەین ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، وە پارێــز لـە خـوا بکــەن ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ﴾، بێگومـان خوا لێپرسینەوەی زۆر خێرایە.

ئنجا خوا ﷻ لە ئایەتی ژمارە (٥)دا جارێکی دیکە دووبارەی دەکاتەوەو دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ﴾، ئەمڕۆ شتە پاكو چاكو سوودبەخشەكان، بۆ ئێوە حەڵاڵ كراون، بۆیەش دووبارەی دەكاتەوە، یانی: ئەوەی چاكو سوودبەخش نەبێو بە تامو بەكەڵك نەبێ، قەدەغەیە، مەبەستێكی دیكەشی ئەوەیە كە شتە بەتامو خۆشو سوودبەخشەكان، لەخۆتان قەدەغە مەكەن، ﴿ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ ﴾، وە خواردنی ئەوانەش كە كتێبیان پێدراوە بۆ ئێوە حەڵاڵە، ئنجا ئایا خواردنەكەیان مەبەست پێی چییە؟ مەبەست پێی نانە؟ یان مەبەست پێی برنجو فاسۆلیاو دانەوێڵەیە؟ یان مەبەست پێی میوەو سەوزەیە؟ بێگومان ئەوانە هەر حەڵاڵن هی ئەهلی كیتاب، یان هی هەر كەسێكی دیكەبن، كەواتە: نەخێر، مەبەست پێی گۆشتە لێرەدا، واتە: سەربڕاوی ئەوانەی كە كتێبیان پێدراوە، بۆ ئێوە حەڵاڵە، ئەدی ئەوانەی كە كتێبیان پێ نەدراوە؟ بێگومان سەربڕاویان حەڵاڵ نیە، چونكە ناوی خوای لەسەر ناهێنن، یان ناوی غەیری خوای لەسەر دێنن ﴿ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡ ﴾، خواردنی ئێوەشو گۆشتی ئێوەش بۆ وان حەڵاڵە ﴿ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ﴾، وە ئافرەتانی پاكیزەی ئیمانداریش بۆ ئێوە حەڵاڵن، هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بكەن، ئەدی ئەگەر پاكیزە نەبن، داوێن پاك نەبن؟ مانای وایە ئەوە حەرامە، وەك دوایی باسی دەكەین بە تەفصیلێ، ﴿ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ ﴾، وە ئافرەتانی پاكیزەی ئەوانەی كتێبیان پێدراوە لە پێش ئێوەدا، ئەو ئافرەتانەش حەڵاڵن، واتە: ئافرەتی جوولەكەو نەصرانیی با لەسەر دینی خۆشیان بن، بۆ ئێوە حەڵاڵن هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بكەن، ئەدی غەیری خاوەن كتێبەكان، واتە: موشریكەكانو بت پەرستەكانو كافرەكان؟ بێگومان ئەوانە حەڵاڵ نین، ﴿ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ ﴾، هەر كاتێك مارەییەكانیانتان پێدان، ئنجا ئایا مەرجە مارەییەكەی تەسلیم بكرێ ئەوجار بگوازرێتەوە؟

یاخود هاوسەرگیریی لەگەڵدا بكرێ؟ نەخێر مەرج نیە، بەڵام دەبێ بڕیار بدرێو مارەییەكەی بۆ دیاریی بكرێ، ﴿ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖ ﴾، ئێوە دەبێ خۆ پاك ڕاگر بن، لە بەرانبەر داوێن پیسیی دا، (مُحصين) واتە: خۆ پاك

ڕاگـــران، ﴿غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖ﴾، زینـا نەکـەن بـە ئاشـکرا، وە هەروەها بـە پەنهـانییش زینـا نەکەن، چونکـە دەڵـێ: (مُسافِح) ئەوەیـە کـە ئـاوی خـۆی دەڕێـژێو هـەر ژنێکـی خراپـی لـێ هەڵبکـەوێ زینـای لەگـەڵ دەکـات، ﴿وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖ﴾، ئەوانـەن کـە بەتایبـەت لەگـەڵ هەندێك ئافرەتانـدا بـە پـەنهانیی زینایان لەگەڵدا دەکەن، واتە: زینـای ئاشکراو زینـای پـەنهان، یان زینـای بەگشـتی هـەر کەسـێك لێی هەڵکەوت زینـای لەگـەڵدا بکات، وە زینای تایبـەت، ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ﴾، هـەر کەسـێکیش کـوفر بـە ئیمـان بکـات، ئـەوە کردەوەکـەی هەڵوەشـاوەتەوە، بـا ئیمانیشـی بووبـێ، کـە کوفـری کـرد بـە ئیمـان، کردەوەکـەی هەڵوەشاوەتەوە ﴿وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴾، وە لە دواڕۆژدا لە زیانباراننە، بەڵام بە مەرجێك لەسـەر کوفر بمـرێ، ئەدی کەسـێك هەڵگەڕاوەتـەوە، دوایی دووبارە مسوڵمان دەبێتـەوەو دەمـرێ، ئایـا کردەوەکـەی هەڵدەوەشـێتەوە؟ نـەء، چـونکە لـە سـوورەتی (البقـرة)دا خوای پەروەردگار بۆمان ڕوون دەکاتەوەو دەفـەرموێ: ﴿وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِ ٢١٧﴾، کەواتـە: کەسێك کـە هەڵـگەڕاوەتەوەو دوایـی بـە کـافریی دەمـرێ، زایـە دەبـن، ئـەدی ئەگـەر دوای ئـەوە کـە هەڵگەڕاوەتـەوە، دووبـارە مسـوڵمان بـۆوە، ئایـا کردەوەکـانی هەڵناوەشـێنەوە؟ دوایـی لـەوبارەوە دەدوێـین، ئنجـا کـە دەفـەرموێ: ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾، یـەکێك بـۆی هـەیە بڵـێ: جا چۆن کـوفر بـە ئیمـان دەکـرێ؟ وەڵامەکـەی ئەوەیە واتـە: کوفر بکا بەو شـتانەی کە ئیمانیـان پـێ دەهێنـرێ، یـانی (وَمَنْ يكفر بِما يُؤمَنُ بِهِ)، واتە: کوفر بکات بەو شتانەی کە ئیمـانیان پـێ دەهێنـرێ، ئنجـا ئیمان بـە خـوا دەهێنـرێ، بـە فریشـتەکان دەهێنـرێ، بـە کتێبەکـان، بـە ڕۆژی دوایـی، بـە پێغـەمبەران، وە ئیمـان دەهێنـرێ بـە حـەڵاڵو حـەڕامی خـوا، وە ئیمـان دەهێنـرێ بـە حوکمـە شـەرعییەکان، هەر کەسـێك کوفر بە هەر کـام لەوانە بکات، ئـەوە کـافر دەبـێ، وە کردەوەکانی هەڵدەوەشـێنەوە، ئەگەر بە کافریی بمرێ، وە لە دواڕۆژدا لە زیـانبارانە.

## چـەند مەسـەلـەیـەکی گرنـگ

**مەسـەلەی یەکـەم:** کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! پەیمانـەکان بـە تـەواوی جێبـەجێ بکـەن، وشـەی (عُقُود) کـۆی (عَقْد)ە، (عَقْد)یش واتـە: گرێبەسـت، یـان بـە مانـای بەڵـێن‌و پەیمـان دێ، عەبدوڵڵای کوڕی عـەبباس خـوا لـە خـۆی‌و بـابی ڕازی بـێ، گوتوویـەتی: (أَوفُوا بالعُقُـود: يَعـني بالعُهُـود مَـا أَحَلَّ اللّه وَمَـا حَـرَّمَ وَمَـا فَـرَضَ وَمَـا حَـدَّ فِي القُـرْآنِ كُـلِّه لاتَغـدروا ولا تَنكِثـوا)[1]، واتـە: مەبەسـتی خـوای پـەروەردگار لـە (عقـود) کـە دەفەرموێ: پەیمانەکـان، یـان گرێبەسـتەکان جێبـەجێ بکـەن، مەبەسـتی هـەموو ئـەو شـتانەیە کـە خـوا حـەڵاڵی کـردوون، یـان قەدەغـەی کـردوون، یـان پێویسـتی کردوون، یاخود ئەو سنوورانەی کە داینـاون لـە قورئانـدا، وە کـە دەفـەرموێ: پـەیمان مەشـکێنن‌و خیانـەت‌و غـەدر مەکـەن، مەبەسـت لـە (عُقُـود) هەموو ئـەو شـتانەن کـە خوای پەروەردگار لە قورئاندا بەیانی کردوون، لـە حـەڵاڵ‌و حـەرام‌و، ئـەو شـتانە کـە مسـوڵمانانی پێـوە پابەند کردوون.

وە (الزمخشري) لە تەفسیرەکەی خۆیـدا دەڵـێ: (والظَّاهرُ أَنَّهَا عُقُود اللّهِ عَلَيْهِم فِـي دينـهِ مِـن تَحليـل حَـلالِهِ وَتَحـريم حَرَامِـهِ)[2] واتـە: وا دیـارە کـە مەبەسـت لـە (عُقُود) ئەو پەیمان‌و گرێبەستانەن کە خوا لە دینی خۆیدا لەسـەر ئیمانـدارانی فـەرز کردوون، لە شتێکدا کە بۆی حەڵاڵ کردوون، وە لە شـتێکدا کە لێی قەدەغـە کـردوون، واتە: پابەندبن بە حەڵاڵ‌و حەرامی خواوە.

بـەڵام وا پێدەچـێ ئـەو ڕایـە ڕاسـتتربێ کـە دەڵـێ: مەبەسـت لـە (عُقُود) کـە خـوا دەفەرموێ: پابەندبن، یاخود گرێبەستەکان‌و پەیمانـەکان جێبـەجێ بکـەن، مەبەسـت پـێـی سـێ شـتە:

١) محاسن التأويل: ج٦، ص٨.
٢) تفسير الكشاف: ج٦، ص٨.

١- ئەو پەیمانانەی كە لەگەڵ خوادا دەیانبەستن، یان ئەو پەیمانانەی كە خوای پەروەردگار لەگەڵیدا بەستوون، جێبەجێیان بكەن.

٢- ئەو پەیمانو بەڵێنانەی كە لە نێوان خۆتاندا دەیاندەن، واتە: لە هەڵسوكەوتو مامەڵەی نێوان خۆتاندا، جا كڕینو فرۆشتنە، مەسەلەی هاوسەرگیریی یە، شتی سیاسیو كۆمەڵایەتییە، هەرچی هەیە.

٣- ئەو بەڵێنو پەیمانانەی كە ئینسان لەسەر خۆی دەیاندا، كە مەبەست پێیان (نَذْر)ە، واتە: شتێك كە ئینسان لەسەر خۆی پێویستی دەكاتو بەڵێن دەدات جێبەجێی بكات، یان ئەگەر (نَذْر)یش نەبێ، دەڵێ: بەڵێن بێ وادەكەم، پەیمان دەدەم وادەكەم، مادام شتەكە شەرعیی بێ، پێویستە ئینسان جێبەجێی بكات.

كەواتە: مەبەست لە (عُقُود) هەموو ئەو بەڵێنو پەیمانانەن كە ئینسان بە خوایان دەدا، یان خەڵك لەنێوان خۆیاندا دەیاندەن، یان ئەو بەڵێنەی ئینسان لە زاتی خۆیدا لەنێوان خۆیو خوادا دەیدات.

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ ﴾، واتە: چوار پێی ئاژەڵەكانتان بۆ حەڵاڵ كراون، پێشتر باسمان كرد كە چوار پێی ئاژەڵەكان مەبەست پێیان چوار جۆرە ئاژەڵە، زۆربەی زانایان ئەگەر نەڵێین هەموویان دەڵێن: چوار جۆرن، (الأَنْعَامُ: هِيَ الإِبِلُ وَالْبَقَرُ وَالْغَنَمُ وَالْمَعِز)، (أَنْعَامُ) بە حوشترو ڕەشەوڵاخو مەڕو بزن دەگوترێ.

چونكە وشەی: (نَعم) كە بەكارهێنراوە تەنیا حوشتر دەگرێتەوە، بەڵام (أَنْعَام) وێڕای حوشتر، گاو مانگا، مەڕو بزنو، بەرانو نێرییش دەگرێتەوە، بەڵگەمان لەسەر ئەوەش ئەم ئایەتانەن لە سووڕەتی (الأنعام)دا كە خوا دەفەرموێ:

﴿ وَمِنَ ٱلْأَنْعَٰمِ حَمُولَةً وَفَرْشًا ۚ كُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَٰنِ ۚ إِنَّهُۥ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٤٢﴾ ثَمَٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ۖ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ نَبِّـُٔونِى بِعِلْمٍ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٤٣﴾ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ۗ قُلْ

ءَآلذَّكَرَيْنِ حَرَّمَ أَمِ ٱلْأُنثَيَيْنِ أَمَّا ٱشْتَمَلَتْ عَلَيْهِ أَرْحَامُ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۖ أَمْ كُنتُمْ شُهَدَآءَ إِذْ وَصَّىٰكُمُ ٱللَّهُ بِهَـٰذَا ۚ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا لِّيُضِلَّ ٱلنَّاسَ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٤٤﴾ ﴾، واتە: (خوا) لە ئەنعام بۆی خولقاندوون باربەرو ئەوەی كە وەك فەرش رابخرێ (كە مەبەست پێی حەیوانی وردە، مەڕو بزنو... هتد) ئنجا لەوەی كە خوا ڕزقی داون بخۆنو بە دوای هەنگاوەكانی شەیتان مەكەون، ئەو دوژمنێكی ئاشكرایە بۆ ئێوە، (دوایی ئەو ئەنعامەمان بۆ سەر ژمێر دەكات)، دەفەرمویّ: ﴿ ثَمَـٰنِيَةَ أَزْوَٰجٍ ﴾، هەشت جووتن، واتە: چوار نێرو چوار مێ، ﴿ مِّنَ ٱلضَّأْنِ ٱثْنَيْنِ ﴾، لە مەڕێ دوو، (مەڕ، واتە: لە حەیوانی سپی، لە نێرو مێیەك، كە كوردەواریی ئێمە مێیەكە مەڕی پێ دەڵێن، نێرەكەشی بەرانی پێ دەڵێن) ﴿ وَمِنَ ٱلْمَعْزِ ٱثْنَيْنِ ﴾، وە (المعز) مەبەست پێی حەیوانی ڕەشە، كە لە كوردەواریی دا مێیەكەی (بزن)و نێرەكەش (نێریی) پێ دەڵێن، ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلْإِبِلِ ٱثْنَيْنِ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ﴾، وەك حوشتر دوو، واتە: جووتێك، نێرو مێیەك كە بە عەرەبی (نَاقَة و جَمَل) یان پێ دەڵێن، (نَاقَة) بۆ مێیەكەیە، (جَمَل)یش بۆ نێرەكەیە، بەلام لەبەرئەوەی لەنێو كوردەوارییدا نەبووە، بۆیە ئێمە بۆ نێرو مێ هەر دەڵێین: حوشتر، یان وشتر، ﴿ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ ٱثْنَيْنِ ﴾، وە لە ڕەشەوڵاخیش دووان، كە (مانگا) مێیەكەیەتی، وە (گا) نێرەكەیەتی، كەواتە: وشەی (الأنعام) ئەو چوار جۆرە ئاژەڵە دەگرێتەوە، جا ئەو چوار جۆرە، چ ماڵیی بن، چ كێویی بن، هەموویان دەگرێتەوە، لەوبارەوە ئەم دەقە لە پێغەمبەری خوا ﷺ گێڕدراوەتەوە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه قَالَ: نَهَى رَسُولُ اللهِ ﷺ عَنْ كُلِّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ، وَعَنْ كُلِّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦١٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٨٠٥)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢٣٤) واللَّفْظُ لَهُ، وَالطَّبَرَانِي في (الكبير) برقم: (١٢٩٩٤) وصَحَّحَهُ أَحْمَد شَاكِر، وَصَحَّحَهُ الألباني) واتە: عەبدوڵلای كوڕی

عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ قەدەغەی كردوە (خواردنی) هەر خاوەن كەڵبەیەك لە دڕندەكان، وە هەر خاوەن چڕنووكێك لە پەلەوەران.

مانای وایە دەبێ جگە لە ئاژەڵی دڕندەو كەڵبەدارو پەرەوری چڕنووكدار تێكڕای ئاژەڵو پەرەوور هەمووی حەڵاڵ بێ، بۆیەش زۆرێك لە زانایان وەك من لە تەفسیری سوورەتی (البقرة)دا باسم كردوە، دەڵێن: هەرچەندە لێرەدا خوا ﷻ تەنیا باسی ئەو چوارە دەكات: حوشتر، ڕەشەوڵاخ، مەڕ، بزن، بەڵام ئەوە لەبەر ئەوەی كە زیاتر ئەو جۆرە ئاژەڵانە لە نێو خەڵكدا هەن، ئەگەرنا خوا هەموو جۆرە ئاژەڵەكانی دیكەی ڕەوا كردوون، بە مەرجێك دڕندە نەبنو ئاژەڵ بن، وە ئەگەر پەلەوەر بن، خاوەن چڕنووك نەبن، واتە: گۆشت خۆر نەبن، چونكە ئاژەڵی دڕندە ئەوەیە كە گۆشت دەخوا، وە پەلەوەری خاوەن چڕنووكو دڕندە ئەوەیە كە گۆشت دەخوات، واتە: ئەوانەی كە گۆشت خۆر نەبن، هەموویان حەڵاڵو ڕەوان[1].

**مەسەلەی سێیەم**: كە دەفەرمویّ: ﴿إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾، جگە لەوەی كە بەسەرتاندا دەخوێندرێتەوە، كە پێشتریش باسمان كرد، مەبەست پێی ئەوەیە كە لە ئایەتی ژمارە (٣)دا، دوایی خوا ﷻ باسی دەكات، كە یازدە (١١) جۆرە ئاژەڵ قەدەغەیە، گۆشتیان بخوریّ، دیارە ئەو یازدە جۆرەش دەچنە نێو ئەو چوار جۆرانەی كە لە سوورەتی (البقرة)شدا هاتوون، لە سوورەتی (الأنعام)یشدا هاتوون، وە لە سوورەتی (النحل)یشدا هاتوون، وە لە سوورەتی (البقرة)دا قسەمان لەوبارەوە كردوەو دواییش لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا قسەی لیّ دەكەین، ئنجا ئایا بۆچی خوا فەرموویەتی: ئەو یازدە جۆرە قەدەغەنو غەیری وان هەمووی ئاژەڵانی حەڵاڵن؟ چونكە عەرەبەكان عادەتیان وابووە، هەر لە خۆوە ناوێكیان لە ئاژەڵێك دەناو، دەیانگوت: حەرامە، بۆ وێنە: لە ئایەتی (١٠٣) هەر سوورەتی (المائدة)دا خوای پەنهانزان دەفەرمویّ: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا

---

١) لە تەفسیری سوورەتی (الأنعام)دا باسێكی تێرو تەسەلمان لەوبارەوە كردوە.

سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٠٣﴾ ﴾، (بَحِيرَة)و (سَائِبَة)و (وَصِيلة)و (حَام)، چوار جۆرە ئاژەڵ بوون، بەتایبەت لە نێو حوشتردا، کە عەرەبەکان هەر لەخۆوە ئەو ناوانەیان لێ نابوون و دەیانگوت: ئەوانە قەدەغەیە گۆشتیان بخورێ، وە نابێ باریشیان لێبنرێ، هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا، خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَجَعَلُواْ لِلَّهِ مِمَّا ذَرَأَ مِنَ ٱلۡحَرۡثِ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ نَصِيبٗا فَقَالُواْ هَٰذَا لِلَّهِ بِزَعۡمِهِمۡ وَهَٰذَا لِشُرَكَآئِنَاۖ فَمَا كَانَ لِشُرَكَآئِهِمۡ فَلَا يَصِلُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَمَا كَانَ لِلَّهِ فَهُوَ يَصِلُ إِلَىٰ شُرَكَآئِهِمۡۗ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ ﴿١٣٦﴾ ﴾، واتە: وە بۆ خوا بەشێکیان دانابوو، لەوەی کە دروستی کردووە لە کشتوکاڵ و لە ئاژەڵەکان، بەشێکیان بۆ خوا دانابوو، جا خوا ﷻ دوای ئەوەی بەهەڵەیان دادەنێ، هەر لە سوورەتی (الأنعام) ئایەتی ژمارە (١٤٠)دا دەفەرموێ:

﴿ قَدۡ خَسِرَ ٱلَّذِينَ قَتَلُوٓاْ أَوۡلَٰدَهُمۡ سَفَهَۢا بِغَيۡرِ عِلۡمٖ وَحَرَّمُواْ مَا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ٱفۡتِرَآءً عَلَى ٱللَّهِ...﴿١٤٠﴾ ﴾، واتە: بێگومان زەرەرمەندن ئەوانەی کە منداڵەکانی خۆیان بە نەفامیی و بەبێ زانیاریی دەکوشت و، وە ئەو شتانەی کە خوا پێیدابوون، بە درۆ هەڵبەستن بە ناوی خواوە لە خۆیانیان قەدەغە دەکرد.

کەواتە: بۆیە خوا ﷻ لێرەدا دەفەرموێ: جگە لەو یازدە (١١) جۆرە کە ئەو تەفصیلەکەیەتی و، دەچنە نێو چوار جۆر، وەك دوایی باسی دەکەین، ئەوی دیکە هەمووی حەڵاڵە، واتە: ئەو شتانەی کە لە خۆوە قەدەغەیان دەکەن، ئەوانە قەدەغەنین و لەڕاستییدا بە نەزانیی و نەفامیی خۆتان، ئەو شتانەتان لە خۆتان قەدەغە کردووە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ غَيۡرَ مُحِلِّي ٱلصَّيۡدِ وَأَنتُمۡ حُرُمٌ ﴾، واتە: نابێ نێچیر بۆخۆتان حەڵاڵ بکەن، لە کاتێکدا کە ئێوە لە ئیحرامدان و ئیحرامتان بەستوە، یاخود لە کاتێکدا کە ئێوە لەسەر زەمینی حەرامدان، واتە: لە نێو بازنەی حەرەم دان،

وشـەی: ﴿ وَأَنتُمۡ حُرُمٌ ﴾، هـەردووکی دەگرێتـەوە، یـانی: (وأَنـتُمْ مُحرِمـون) ئێـوە ئیحرامتـان بەسـتوە، کـە ئینسـان ئیحـرام بـە حـەج دەبەسـتێ، یـان بـە عـومرە دەبەستێ، ڕاوکردنـی لـێ قەدەغەیـە، ئـەوە واتایـەکی، یاخود ﴿ وَأَنتُمۡ حُرُمٌ ﴾، یـانی: (وأَنـتُمْ دَاخلـونَ فـي الحـرم) ئێـوە لـە نێـو بازنـەی حـەرەم دان، لـە کاتێکـدا ئینسـان لەنێو بازنەی حەرەم دا دەبێ، دیسان ڕاووشکاری لـێ قەدەغەیـە، یا لـە ئیحرامیشـدا نەبـێ، کـە داخیلـی سـنووری حـەرەم بـووی، حـەرەمی مەککـە، ڕاووشـکارت لـێ قەدەغەیـە، ئنجا ئەگـەر مەبەسـت پێـی حاڵـەتی ئیحـرام بەسـتن بـێ، ئـەوە تـەنیا نێچیـری وشکانیی قەدەغەیـە، لـە کەسـێك کـە ئیحـرامی بەسـتوە، واتـە: کەسێك کە ئیحـرام بە حەج دەبەستێ، یان بـە عـومرە دەبەسـتێ، لەسـەری قەدەغەیە کـە ڕاوی هەر جۆرە نێچیـرێك بکات، لە وشکانیدا ﴿ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ ﴾، بـەڵام ڕاوکردنـی نێچیـری دەریـا کە ماسییە، نەهەنگە، هەموو ئـەو ژیاندارانـەی کـە لـە دەریـادا دەژیـن ئەوانـە ڕەوان، یا ئەو کەسـەی ئیحرامیشی بەسـتبێ، بـە بەڵـگـەی ئایـەتی (٩٦)ی (الـمـائـدة) کـە دەفـەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَحۡرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِۖ وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ٩٦ ﴾، واتـە: بۆتـان ڕەوا کـراوە، بۆتـان حـەڵاڵ کـراوە، نێچیـری دەریـاو خـواردنی دەریـا، ئـەوەی کـە ڕاوی دەکەن، ئەوەشی کـە دەریا هەڵیـدەداتە دەرێ، بـەبێ ئـەوەی کـە ڕاوی بکـەن، ﴿ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِ ﴾، ئـەوە بـەهرە وەرگرتنێکـی کەمـە بـۆ ئێـوەو بـۆ ڕێبـواران ﴿ وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗا ﴾، وە لێتـان قەدەغـە کـراوە نێچیـریی وشـکانیی هەتا لە ئیحـرام دابن.

کەواتە: ڕاووشکار لە وشکانییدا تـەنیا لـە کەسێك کـە ئیحرامـی بـە حـەجو عـومرە بەسـتوە، قەدەغەیـە، ئەگـەرنا گریمـان کەسـێك بـە نێـو دەریـادا دێو ئیحرامیشـی بەسـتوە، بـۆی هەیـە ڕاو بکـات بـە ئیحرامـەوە، بـەڵام ئەگـەر مەبەسـت لـە: ﴿ وَأَنتُمۡ حُرُمٌ ﴾، واتە: ئێـوە لـە نێـو بازنـەی حـەرەم دان، ئـەو کاتـە دیارە ڕاوکردنـی نێچیری

دەریایی‌و وشکانیی هەردووکیان قەدەغەن، لە نێو خاکی حەرەم دا، واتە: گریمان ئەگەر لەوێ حەوزی ماسی هەبێ، رووبارێك هەبێ، لە سنووری حەرەمدا، دروست نیە ڕاو بكرێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** دەربارەی ئەم ئایەتەی یەکەم، زۆر لە تەفسیرەکان ئەوە بەسەرهاتەیان هێناوە[1] کە (النقاش) یەکێکە لە زانایان دەگێڕێتەوە، دەڵێ: هاوەڵەکانی فەیلەسووف (کندي) ڕۆژێك پێی دەڵێن: (أَيُّهَا الحَكِيمُ! اعمَلْ لَنَا مِثْلَ هَذَا القُرْآن، فَقَالَ: نَعَمْ، أَعْمَلُ مِثلَ بَعضِهِ، فَاحتَجَبَ أَياماً كَثيرة، ثُمَّ خَرَجَ فَقَالَ: وَاللهِ مَا أَقدِرُ، وَلا يُطِيقُ هَذَا أَحَدٌ، إِنِّي فَتَحْتُ الْمُصْحَفَ فَخَرَجَت سُورَةَ المائدة، فَنَظَرْتُ فَإِذَا هُوَ قَدْ نَطَقَ بالوَفاءِ، وَنَهَى عَنِ النَّكثِ، وَحَلَّل تَحليلاً عَاماً، ثُمَّ استَثْنَى بَعْدَ استثنَاءٍ، ثُمَّ أَخْبَرَ عَن قُدْرَتِهِ وَحكمتِهِ فِي سَطرين، وَلا يَقدِرُ أَحَدٌ أَن يَأتِي بِهَذَا)، واتە: ئەی فەیلەسووف! ئەی حەکیم! وەك ئەم قورئانە شتێکمان بۆ دابنێ، (تۆ پیاوێکی زۆر شارەزاو فەیلەسووفو عەللامەی)، گوتی: باشە، وەك هەندێ لە قورئانتان بۆ دادەنێم، چەند ڕۆژێکی زۆر لە ژوورەوە مایەوەو خۆی پەنهان کرد لە شوێنێکی چۆڵ، دوایی هاتەدەرێ‌و گوتی: وەڵڵاهی ناتوانم، وە هیچ کەسیش ئەوە ناتوانێ، (وەك قورئان بێنێ، یانی شتێکی وەك قورئان، جا بۆیان ڕوون دەکاتەوەو دەڵێ:) من موصحەفم کردەوە تەماشام کرد، (واتە: تەماشای قورئانم کرد) سوورەتی (المائدة) هاتە بەرچاوم، تەماشام کرد خوا لە دوو دێڕاندا فەرمان دەکات بە جێبەجێکردنی پەیمان‌و، قەدەغەی دەکات کە پەیمان بشکێنرێ، دوایی بە شێوەیەکی گشتی ئەو شتانەی کە چاکن‌و سوودبەخشن حەڵاڵیان دەکات، دوایی هەندێ شتیان لێ جیا دەکاتەوە، دوایی لەو شتە جیاکراوانەش شتی دیکە جیا دەکاتەوە، دوایی هەواڵ دەدات بەوەی کە بۆخۆی لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، وە کاربەجێیە، بۆیە هیچ کەسێك ناتوانێ شتی وا بێنێ!

جا ئەو (كندي)یە بەپێی ئەوە دەبێ نامسوڵمان بووبێ، بەڵام دیارە دان بەوە دادەنێ کە هیچ کەس ناتوانێ ئایەتێکی وەك قورئانیش بێنێ، چونکە ئەوە ئایەتی ژمارە یەکە کە (کندي) ئاماژەی پێکردوە، دیارە وەك چۆن ئێستا کەسانێك هەن

---

١) فتح القدير للشوكاني: ج٢، ص٧.

کە تانە لە قورئان دەدەن، وە خەیاڵ پڵاوی وا دەکەن کە دەتوانن ڕەخنە لە قورئان بگرن، کاتی خۆیشی ئەوە هەر بووە، بەڵام ئەم قورئانە، وەك خۆی هەرماوەو لە ڕاستییدا تا ئێستا هیچ کەسێك نەیتوانیوە ڕەخنەیەکی بەجێ لە قورئان بگرێ، بەڵام هەیە لە قورئان تێناگاتو بە نەزانیی خۆی بە نێو دەکەوێ، ئەو ئایەتە بۆ وایە؟ چۆن وا دەبێ؟ ئەوە بۆ وابوو؟ کە گرفتەکەی ئەوەیە تێینەگەیشتوە، وەك عەرەب دەڵێن: (النَّاسُ أَعْدَاءُ مَا جَهِلُوا)، واتە: خەڵك دژی شتێکن کە پێی نائاشنان، زۆر کەس کە لەوبارەوە شت دەنووسن، من جاروبار هەندێك لەو کتێبانە تەماشا دەکەم، لە کوردەواریی خۆشماندا هەندێك شت لەوبارەوە نووسراوە، بەڵام لەڕاستییدا بۆ کەسێك کە شارەزابێ، شارەزای زمانی عەرەبی بێ، شارەزای ڕەوانبێژیی عەرەبی بێ، شارەزای قورئان بێ، هەر کەمێك شارەزابێ، کاتێك تەماشای ئەوڕەخنانە بکات کە ئاراستەی قورئان کراون، بالآیی و گەورەیی قورئانی زیاتر بۆ دەردەکەوێ، بەڵام هەندێ کەس هەیە، وەك گوتم، نەزان و نەشارەزان، وەك عەرەب، دەڵێن: (ئینسانی نەخۆش، ئاوی شیرینی بە زاری تاڵە)! ئاو شیرینە، بەڵام کابرای نەخۆش کە دەیخواتەوە بە زاری تاڵە، بەتایبەت ئەوەی نەخۆشی گرانەتاو مەلاریای هەبێ، بۆیە زۆر کەس هەقی بە ناهەق دەکەوێتە بەرچاو، لەبەرئەوەی بۆخۆی میزاجەکەی تەواونیەو تێی نەگەیشتوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ ﴾، واتە: بێگومان خوا ﷻ بەو شێوەیەی کە دەیەوێ بڕیار دەدات، حوکم دەکات، یەکێك لێرەدا ڕەنگە بپرسێ: ئایا ئەوە چۆنە، بۆچی خوا خۆی وا دەفەرموێ؟ ئایا ئەگەر یەکێك لە ئێمە بڵێ: وەڵلاهی بۆخۆم چۆنم پێخۆشە، وا بڕیار دەدەم، ئەو قسەیە ڕاستە، یان هەڵەیە؟ بێگومان هەڵەیە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر ئینسان چۆنی پێخۆشە وا بڕیار بدات، جاری وایە ستەمو خراپەی پێخۆشە، بەڵام خوا کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ ﴾، مانایەکەی جیاوازە لەوەی کە مرۆڤێك بیڵێ، بۆیە ئەو کەسەی کە خوای پەروەردگار لەسەر خۆی قیاس دەکات زۆر هەڵەیە، چونکە بەس مرۆڤ عەقڵی ڕووت نیەو نەفسو ئارەزووشی هەیە، ئنجا ئایا کێ ئەو قسەیەی کردوە؟ دیارە

فیـرعەون وایگوتـوە، وەك خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فِرۡعَوۡنُ مَآ أُرِيكُمۡ إِلَّا مَآ أَرَىٰ وَمَآ أَهۡدِيكُمۡ إِلَّا سَبِيلَ ٱلرَّشَادِ ﴿٢٩﴾ ﴾، واتە: وە فیـرعەون گوتی: مـن هـەر ئـەوەتان پـێ دەڵـێم کە خـۆم بە چـاکی دەزانم، وە ئـەوەی مـن دەیڵـێم هـەمووی ڕاسـتە، خـوای زانـاش وەك تـانە دان لە فیرعەون ئەو قسەیەی لـێ دەگێڕێتەوە، بۆچـی؟ چونکە فیرعەون ئەگەر چۆنی پـێخۆشە، وای بڕیاردا، زوڵمی پـێخۆشە، خراپەی پـێخۆشە، جەهلی پـێخۆشە، بەڵام خوا ﷻ خوایە، خوا ئەوەی پـێخۆشەو بڕیاری لەسەر دەدات کە هەق‌و ڕاستە، خوا هەرچاکەی پـێ چاکە، خوا هەر ڕاستیی پـێ چاکە، خوای دادگەر بە هەڵـەدا ناچـێ‌و خاوەنی ئارەزوو نیە، وە پاکـیی بۆ خوا، خاوەنی نـەزانیی نیە، زانیاریی بـێ سنووری هەیە، حیکمەتی بـێ سنووری هەیە، ڕەحمـەتی بـێ سـنووری هەیە، عیززەتی بـێ سـنووری هەیە، وە بـێ نیـازیی بـێ سنووری هەیەو، پێویسـتیی بە هیچ کەس نیەو پێویسـتیی بـەوە نیە کە زوڵم بکات، کەواتە: ئـەوە کە خـوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ مَا يُرِيدُ ﴾، بێگـومان خوا چی بـوێ وا بڕیـار دەدات، دەبێ بزانیـن بۆچـی ئەوە بـۆ خـوا ﷻ شـیاوە؟ ئـەوە ئەگەر کەسێکی دیکە، بڵـێ: مـن چۆنـم پـێخۆشـە وا حـوکم دەکـەم، ئـەوە دیـارە سەری لە فیـرعەونایەتییـەوە دەردەچـێ، ئنجا بەڵـگەمان لەسـەر ئـەوە کە خـوا ﷻ جگـە لـە خێـرو چاکـەو ئاسانیی‌و ڕاستیی بۆ بەنـدەکانی بڕیـار نـادات، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییـە؟ چەنـد بەڵگەیەك لەوبارەوە دێنیـن:

**بەڵـگـەی یەکـەم:** خـوا ﷻ لـە سـوورەتی (البقـرة) ئایـەتی (١٨٥)دا دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلۡيُسۡرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلۡعُسۡرَ ...﴿١٨٥﴾ ﴾، واتە: خوا ئاسـانیی بۆتـان دەوێ‌و قورسـیی‌و زەحمـەتی بۆتـان نـاوێ، کەواتـە: خـوا ئـەوەی بڕیـاری دەدات، هەمووی ئاسـانییە بۆ ئێمە.

**بەڵگـەی دووەم:** خـوا ﷻ لـە سوورەتی (الأنعام) ئایـەتی ژمـارە (١١٥)دا دەفەرموێ: ﴿ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدۡقٗا وَعَدۡلٗاۚ ﴿١١٥﴾ ﴾، واتە: وشـەکانی پـەروەردگارت تـەواویان کردوە لەڕاستییداو لە دادگەرییـدا، وشـەکانی خـوا (واتـە: قورئـان) دوو بەشـە: یـان هـەواڵە، یـان بڕیـارو حوکمـە، هەواڵـەکانی هـەموویان تـەواویان کـردوە

لەڕاستیدا، وە بڕیارەكانیشی هەموویان دادگەرن و لە دادگەرییدا تەواویان كردوە، ئنجا قسەیەك ئەگەر هەواڵ بێ ڕاست بێ و بێ پێچ و پەنابێ، وە ئەگەر حوكم و بڕیار بێ، دادگەرانە بێ، مانای وایە كەموكوڕیی ڕووی تێ ناكات.

**بەڵگەی سێیەم:** خوا ﷻ لە سوورەتی (النحل) ئایەتی (٨٩)دا دەفەرموێ: ﴿ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾، وە كتێبمان بۆ سەر تۆ ناردوە (ئەی موحەممەد ﷺ!) ڕوونكەرەوەیە بۆ هەموو شتێك، واتە: ڕوونكەرەوەیە بۆ هەموو شتێك كە ئێوە پێویستتانە، یان عەقڵتان نایگاتێ، ئەگەرنا یەكێك بۆی هەیە، بڵێ: ئەدی بۆچی خوا ﷻ ڕوونی نەكردۆتەوە، فڕۆكە چۆن دروست بكەین؟ كەشتی چۆن دروست بكەین؟ كۆمپیوتەر چۆن دروست بكەین؟ ڕاستە خوا ئەوەی ڕوون نەكردۆتەوە، لەبەر ئەوەی ئەوانە لە مەودای عەقڵی ئینسان دان، خوا ئەو شتانەی ڕوون كردۆتەوە لە قورئاندا كە عەقڵی ئینسان نایانگاتێ، بەڵام ئەوەی كە لەبەردەستی ئینسان دایەو، ئینسان لە ئەنجامی بیركردنەوەی خۆی و تێڕامانی خۆی و، ئەزموونی خۆیدا دەتوانێ بیانكات، ئەوە پێویست ناكات خوای پەروەردگار ئەو شتانە فێری ئینسان بكات، كە بۆخۆی دەتوانێ بیانكات، بەڵام خوا ﷻ ئەو شتانەی فێری ئینسان كردوون لە قورئاندا، كە ئینسان عەقڵی پێیان ناشكێ و دەركیان پێ ناكات.

جا خوای كاربەجێ لێرەدا دەفەرموێ: كتێبمان بۆ سەر تۆ ناردۆتە خوار، هەموو شتێك ڕوون دەكاتەوە، وە ڕێنمایی و بەزەیی و موژدەیە بۆ مسوڵمانان، كەواتە: ئەوەی لە قورئاندا هەیە هەمووی ئاوایە ڕێنمایی و بەزەیی و موژدەیە.

**مەسەلەی حەوتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دروشمەكانی خوا حەڵاڵ مەكەن، واتە: بۆ خۆتانیان ڕەوا مەكەن، كە دەستدرێژییان بكەنە سەری، بێ حورمەتییان پێ بكەن، (شعائر) كۆی (شَعيرَة)یە، واتە: دروشم (شِعَار) دروشمەو (شَعِيرَة)ش دروشمە، بەڵام دروشمی چی؟ دروشمی دینداریی، دروشمی مسوڵمانەتی، هەروەك (مَشَاعِر)یش

كـــۆی (مَشْـعَر)ە، ﴿ ...عِنـدَ ٱلْمَشْـعَرِ ٱلْحَرَامِ ...﴿١٩٨﴾ ﴾البقـــرة، (مَشَــاعِر) و (شَعَائِر)یش هـەردووكیان بـە مانـای دروشـمەكانی دینداریی‌و مسـولْمانەتیین، ئـەوە بەگشــتی، یــاخود دروشــمەكانی حـــەج‌و عـومرە بەتایبــەت، یــاخود بــە مانــای فـەڕزەكانی خوا، یان بـە مانـای حورمەتـەكانی خـوا، واتـە: ئـەو شـتانەی كـە خـوای پەروەردگار ڕێزی لێنـاون، دەبێ تۆ بیـانپارێزیی‌و حورمـەتیان نەشـكێنی، خـوا ﷻ لــە ســووڕەتی (الحــج)دا دەفــەرموێ: ﴿ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ ﴾، هەر كەسێك دروشـمەكانی خـوا بـە گـەورە بگـرێ‌و ڕێزیان بگـرێ‌و بێ حورمـەتییان پـێ نـەكات، ئـەوە ئـەو بـە گـەورە گرتنـەی دروشـمەكانی خـوا، لـە پارێزكـاریی دڵانەوەیـە، دڵێك پارێزكاریی تێدابێ بەرانبـەر بـە خـواو دروشـمەكانی خـوا، ڕێزیان لـێ دەنێ‌و بە گەورەیان دەگرێ، وە دەسـتدرێژییان ناكـاتە سـەر.

**مەسـەلەی هەشـتەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِّن رَّبِّهِمْ وَرِضْوَٰنًا ﴾، چوار (٤) شـتی باس كردوون:

١- ﴿ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ ﴾، واتـە: مـانگی حـەڕام، مـانگی قەدەغـە، ئایـا چ مانگێــك جەنگی تێدا قەدەغـە كراوە؟ كە لێرەدا ﴿ ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ ﴾، جینسە، واتـە: جینسـی مـانگی حـەڕام، چـونكە مانگــە حەڕامـەكان (الأشـهر الحـُرُم) واتـە: جـەنگ تێـدا قەدەغـە كراوەكـان، چـوارن: (ذُو الْقِعْـدَةِ ، وَذُو الْحِجَّـةِ ، مُحَـرَّمُ)، بــە دوای یەكـدا (رَجَب)یـش بـە جیـا، ئـەو چوار مانگـە جـەنگیان تێـدا قەدەغـەكراوە واتـە: جـەنگی دەست پێشـخەرانە، نـەك جەنگی بەرگریی كارانە، لەسەر مسولْمانان قەدەغەیە لـەم چوار مانگـەدا دەستپێشـخەری جـەنگ بن، لەگـەڵ غەیری خۆیـاندا.

٢- ﴿ ٱلْهَدْىَ ﴾، كـۆی (هدیـة)یـە، (هدیـة) ئـەو ئاژەڵەیـە كـە دەبـردرێ بـۆ (مینـا) بۆئـەوەی كە وەك دروشـمێكی حەج‌و عومرە، یاخود عومرە سـەربـبڕدرێ.

٣- ﴿ ٱلْقَلَٰٓئِدَ ﴾، كـۆی (قِلادَة)یــە، ملوانكـە، یــان گەردنبەنــد یــان مەبەسـت پێـی (الـمُقلَّدات) واتە: ئەوانەی كە گـەردن بەندیــان لـەمل كـراوە، جــا ئـەوە عادەتێك

بووە ئێستاش هەر هەیە، کەسێك دەیەوێ بچێ حوشترێك سەرببڕێ بیکاتە قوربانیی، یان مانگایەك، یان ڕەشە وڵاخێك، یان مەڕێك، یان بزنێك، گەردن بەندیان لە ملی کردووە لە گەڵای درەختی سەوز، یان هەرجۆرە گەردن بەندێکیان لە مل کردووە، بۆ ئەوەی دیار بێ کە ئەو ئاژەڵە دەبردرێ سەرببڕدرێو بکرێتە قوربانیی، بۆئەوەی ئەگەر خەڵك بینی دەستدرێژیی نەکەنە سەرێ.

٤- ﴿ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾، ئەوانەی کە ڕوو دەکەنە بەیتی حەرام، ڕوو دەکەنە مزگەوتی حەرام، بۆ ئەوەی لەوێ فەرزەکانی حەج، یاخود عومرە، یاخود هەردووکیان جێبەجێ بکەن، ئنجا لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ئەی ئیمانداریینە! دروشمەکانی خوا حەڵاڵ مەکەن واتە: دەستدرێژییان مەکەنە سەرێ، وە دوایی چوار لەو دروشمانە بەجیا باس دەکات، کە (الأشهر الحرام) مانگە حەرامەکانو قوربانییەکان ﴿ الهدي ﴾ و ئاژەڵە نیشانەدار کراوەکان ﴿ ٱلْقَلَٰٓئِدَ ﴾ و ئەوانەن کە ڕوو دەکەنە بەیتی حەرام ﴿ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾، مەبەست لە حەڵاڵکردنیان، حورمەت شکاندنیانو زیان پێگەیاندنیانە، وە بەنسبەت چوار مانگەکانەوە، مەبەست جەنگ تێداکردنیانە، جا لێرەدا دوو مەسەلە دێنە پێش، کە توێژەرەوانی قورئان زۆر مشتومڕیان لەسەریان بووە:

١) حوکمی مانگە حەرامەکان، ئەو چوار مانگە کە جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە، حوکمیان چییە؟

٢) دەستدرێژیی نەکردن بۆ سەر: ﴿ ٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ وَءَآمِّينَ وَٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾، کە لێرەدا دەفەرموێ: دەستیان بۆ درێژ مەکەن، چۆن لەگەڵ ئەو ئایەتەی ژمارەی (٢٨)ی سوورەتی (التوبة) بیگونجێنین، کە لەوێ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَا ...﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پیسن، با لە دوای ئەم ساڵەوە توخنی مزگەوتی حەرام نەکەون، ئەم ئایەتەی سوورەتی (المائدة) دەفەرموێ: دەستدرێژیی مەکەنە سەر ئەوانە، لەوێش

دەفەرموێ: با موشریکەکان لە دوای ئەم ساڵەوە نزیکی مزگەوتی حەرام نەکەون، ئێمەش بڕوامان بەوە نیە هیچ ئایەتێك (منسوخ) بێ، ئەدی چۆن پێکەوە دەگونجێن؟! ئەوە زانایان لێیان بۆتە گرفتێکی زۆر گەورە، وە مشتومڕی زۆریان لەسەری بووە، کە ئێستا باسی دەکەین:

**بەنسبەت ئیشکالی یەکەم:**

حوکمی چوار مانگە جەنگ تێدا قەدەغەکراوەکان ﴿ ٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ ﴾، کە وەکو گوتمان (ذُو الْقِعْدَةِ ، وَذُو الْحِجَّةِ ، مُحَرَّمُ، ورَجَب)ن، ئێمە لە ئایەتی ژمارە (٢١٧)ی سووڕەتی (البقرة)دا لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرە (تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز) لە لاپەڕە (٨٨١ - ٨٩٠) بە تەفصیلْ باسمان کردوە، چونکە لێرەش زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەم حوکمە، کە جەنگ کردن لەو چوار مانگانەدا قەدەغەیە، نەسخ کراوەتەوە، بەڵام ئێمە دەڵێین: نەخێر لەڕاستییدا وانیە، چونکە هیچ ئایەتێك لە قورئاندا نەسخ نەبۆتەوە، بەڵکو مەبەست لە جەنگکردنێك کە لەو چوار مانگەدا قەدەغەیە، جەنگکردنی دەستپێشخەرانەیە، جەنگکردنی هێرشبەرانە (الحرب الهجُومية)، بەڵام جەنگی بەرگرییکارانە، هەموو دەمێ ڕەوایە، وە ئەگەر تەماشای پێغەمبەریش ﷺ بکەین، هیچ جەنگێکی دەستپێشخەرانەی لەو چوار مانگەدا نەکردوەو، ئەو جەنگانەی کە کردوونی هەمووی جەنگی بەرگرییکارانە بوون، واتە: ڕای زۆربەی زانایان ڕاست نیە، کە قەدەغەبوونی دەستپێکردنی جەنگیان لەو چوار مانگەدا بە (منسوخ) داناوە، چونکە لەڕاستییدا پێغەمبەر ﷺ لەو چوار مانگەدا جەنگی هەردەست پێ نەکردوە، تاکو نەسخ بووبێتەوە، بەڵکو ئەو چوار مانگە حوکمیان هەر لەجێی خۆیەتی کە جەنگ تێداکردنیان قەدەغەیە، کە جەنگی دەستپێشخەرییانەیە، نەك جەنگی بەرگرییکارانە (الحرب الدفاعية).

ئنجا با لەوبارەوە گوێ لە (ابن القيِّم) بگرین ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە کتێبی (زاد المعاد في هدي خير العباد) کە (محاسن التأويل)[1] لێی

---

١) ج٦، ص١٤ -١٥.

خواستۆتە، (إِبْنُ القَيم) ئەو مەسەلەیە زۆر جوان ڕوون دەكاتەوە، دەڵێ: (إذ لَمْ يُحفظ عن النَّبيّ ﷺ أنه غزا فِي الشَّهْرِ الحَرَام، ولا أغار فيهِ، ولا بَعَثَ فيهِ سريَّةً، وَقَدْ عيَّرَ الـمُشْرِكُون الـمُسْلِمِين بقتالهم فِي أوّل رَجَب في قصّة العلاء بن الحَضْرَمِي، فَقَالُوا: استحلَّ مُحَمَّدٌ الشَّهْرَ الحَرام، وَأَنْزَلَ اللهُ في ذَلِكَ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۚ...﴿٢١٧﴾ ﴾البقرة، وَلَمْ يثبُت نسخُ هَذَا بنَص يجبُ المَصيرُ إليه، ولا أجمعت الأمَّةُ عَلَى نَسْخِهِ، وَقَد استُدِلَّ عَلَى تَحريم القِتَال فِي الأَشْهُر الحُرُم بقولِهِ تَعَالَى: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ...﴿٥﴾ ﴾التوبة، ولا حُجَّة فِي هَذا، لأنَّ الأَشْهُر الحُرُم هَاهُنا هِي أَشْهُر التسيير الأَربعة الّتِي سيَّر اللّه فيهَا المُشْرِكِين في الأَرْض يَأمَنُون فِيهَا، وَكَان أوّلها يَوْمَ الحَجّ الأَكبَر عاشر ذي الحِجَّة، وآخِرُها عَاشِر ربيع الآخر).

واتە: لە پێغەمبەری خواوە ﷺ نەگێڕدراوەتەوە كە لەم مانگە حەرامانەدا جەنگی كردبێ، یاخود پەلاماری كۆمەڵێكی دابێ، یاخود سرییەیەكی ناردبێ، (واتە: بەشێك لە سوپای ناردبێ) وە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان ڕەخنەیان لە مسوڵمانان گرت لەبەرئەوەی كە لە سەرەتای مانگی ڕەجەبدا، وەك لە بەسەرهاتەكەی (العلاء بن الحضرمي) {كە لە سووڕەتی (البقرة)دا باسمان كرد، مەفرەزەیەكی مسوڵمان ڕێیان بە كاروانێك گرت، وە نەفەرێكیان كوشتو دووانیان لێ بە دیل گرتن و كاروانەكەیان گرت، نەیانزانی كەوتوونە نێو مانگی ڕەجەبەوە، وایانزانی ئەوان هەر لە مانگی حەڵاڵ دان، دیارە سەری مانگی بووە} ، لەوبارەوە كافرەكان ڕەخنەیان لە مسوڵمانان گرت، وە گوتیان: موحەممەد مانگی حەرامی حەڵاڵ كردوە، خوای بەرز لەوبارەوە ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوار لە سووڕەتی (البقرة) كە دەفەرمووێ: ﴿ يَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهۡرِ ٱلۡحَرَامِ قِتَالٖ فِيهِۖ قُلۡ قِتَالٞ فِيهِ كَبِيرٞۚ...﴿٢١٧﴾ ﴾، پرسیارت لێ دەكەن دەربارەی

مانگە حەرامەکان، جەنگ تێدا کردنیان چۆنە؟ بفەرموو: جەنگ تێداکردنیان گەورەیە، (واتە: گوناهێکی گەورەیە) وە هیچ دەقێك نەچەسپاوە کە ناچاربین بیهێنین، بڵێین: ئەو دەقە ئەم ئایەتەی نەسخ کردۆتەوە، هەروەها یەکدەنگیی ئۆممەتیشی لەسەر نیە (لەسەر نەسخ)، ئنجا هەندێکی دیکە کە گوتوویانە: جەنگکردن لە مانگە قەدەغەکراوەکاندا حەرامە، بە قسەی خوای بەرز بەڵگەیان هێناوەتەوە، کە لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖ ...﴿٥﴾ ﴾، واتە: ئەگەر مانگە حەرامەکان تەواو بوون، ئەوە هاوبەش بۆ خوادانەرەکان بکوژن و کەمینیان بۆ دابنێن و دەوریان بگرن ... هتد.

{(ابن القیِّم) دەڵێ:} لەڕاستییدا بەڵگە هێنانەوە بەو ئایەتە ڕاست نیە، چونکە مەبەست لەو چوار مانگە، چوار مانگە جەنگ تێدا قەدەغەکراوەکان نین، بەڵکو ئەو چوار مانگەن کە خوای بەرز مۆڵەتی دا بە موشریکەکان کە هەتا چوار مانگان مۆڵەتە ئەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا هەبوو، وە هەموو جاڕێ پەیمانەکانیان دەشکاند فەرمووی: چوار مانگ مۆڵەتە، بیری لێ بکەنەوە، ئایا پابەند دەبن بە پەیمانەکانەوە، یان مسوڵمان دەبن، یان ئامادەی جەنگ دەبن کە لە سەرەتای سوورەتی (التوبة) خوای دادگەر دەفەرموێ: ﴿ بَرَآءَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦٓ إِلَى ٱلَّذِينَ عَٰهَدتُّم مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴿١﴾ فَسِيحُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ ...﴿٢﴾ ﴾، واتە: بە زەوی دا بڕۆن چوار مانگ، واتە: چوار مانگ مۆڵەتە، کەواتە: ئەو چوار مانگە جیان لەو چوار مانگەی دیکە.

{بۆیە وردبوونەوە لە قورئانێ زۆر پێویستە، زۆر لە توێژەرەوانی قورئان پێیان وابووە ئەو چوار مانگەی کە لە سوورەتی (التوبة)دا باسکراون، هەر ئەو چوار مانگە حەرامانەن کە جەنگیان تێدا قەدەغە کراوە، کە لەڕاستیدا وانیەو ئەو چوار مانگەی سەرەتای سوورەتی (التوبة) واتە: چوار مانگ مۆڵەتە بۆ ئەو

موشریكانەی پەیمانیان هەیە لەگەڵ مسولْمانان، تاكو موراجەعەی خۆیان بكەنەوە، یان پابەندبن بە پەیمانەكانەوە، یان مسولْمان بن، یان ئامادەی جەنگ بن، ئنجا ئەگەر نە مسولْمان بنو نە پەیمانەكانیش بپارێزن، مانای وایە ئەهلی ئیسلام جەنگیان لەگەڵدا دەكات}، ئنجا دەڵێ: (لأَنَّ الأَشْهُرَ الحُرُم هَاهُنا هِيَ أَشْهُرُ التسيير الأَربعَة الَّتِي سيَّرَ اللهُ فِيهَا الـمُشْرِكِين فِي الأَرْض يَأمَنُون فِيهَا، وَكَانَ أَوَّلَها يَوْمَ الحَجِّ الأَكْبَرِ عَاشِرَ ذِي الحِجَّة، وآخِرُها عَاشِر ربيع الآخر)، واتە: مەبەست لەو چوار مانگە حەرامە لێرەدا ئەو چوار مانگە حەرامەیە كە خوا هاوبەش بۆ خوادانەرەكانی لە زەویدا بەرەڵلا كردو ئازادی پێدان، كە دڵنیابن تا چوار مانگان، (تا دوایی بۆخۆیان تەكلیفی خۆیان رۆشن بكەنەوە)، وە ئەو چوار مانگەش سەرەتایەكەیان بریتی بووە لە رۆژی حەجی گەورە، ﴿ ... يَوْمَ ٱلْحَجِّ ٱلْأَكْبَرِ ... ﴿٣﴾ ﴾ التوبة، (لە ساڵی دەیەمی كۆچیی دا، كە پێغەمبەر ﷺ حەجیماڵئاوایی كردو یەكەم حەجو دوا حەجی بوو، ئەوانی دیكە كە كردوونی عومرە بوون)، واتە: رۆژی (١٠)ی (ذي الحِجَّة)، ئنجا دوایی (محرم، صفر، رَبيع الأول) هەتا دە (١٠)ی مانگی (ربيع الثاني).

**بەنسبەت ئیشكالی دووەم:**

كە چۆن ئەم ئایەتە دەفەرموێ: ﴿ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَـٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾، لەوێ دەفەرموێ: دروشمەكانی خوا رەوا مەكەن بۆخۆتان، وە مانگە قەدەغە كراوەكان، وە ئەو قوربانییانەی دەهێنرێنو نیشانەدار كراون، وە ئەو قوربانییانەی دەهێنرێنو گەردن بەندیان لەمل كراوەو، ئەوانەی كە روو دەكەنە مزگەوتی حەرام، دەست درێژییان مەكەنە سەر، بەڵام لە ئایەتی (٢٨)ی سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ ... إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا ... ﴿٢٨﴾ ﴾، بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان پیسن، (واتە: پیسی مەعنەویی، ئەگەرنا بابایەكی كافر تۆ دەستی لێ بدەی، پێویست ناكات دەستت گلاو بكەیەوە، واتە:

عەقیدەیەکیان هەڵگرتووەو بیرو بڕوایەکیان هەڵگرتوە، کە پووچو هەڵەیەو دان ناهێنێ بە پەروەردگارێتیی‌و بەدیهێنەرێتیی‌و پەرستراوێتیی خوای بێهاوتاو، بە پێغەمبەرایەتیی موحەممەد ﷺو بە بەرنامەیەتیی ئیسلامدا بۆ ژیان، ئەوانە پیسیی مەعنەویین، بۆیە) بۆیان نیە لە دوای ئەم ساڵە، کە ساڵی نۆی کۆچیی بوو، بێن توخنی مزگەوتی حەرام بکەون.

(ابن کثیر) لە تەفسیرەکەی خۆی ئەوە بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ (ساڵی نۆیەم) بۆ خۆی نەچوو بۆ حەج‌و ئەبوبەکری صیددیقی نارد، وە کردی بە ئەمیری حەج، دوایی چەند ئایەتێکی بۆ هاتنەخوارو عەلی کوڕی ئەبی طالیبی نارد، گوتی: بچۆ تۆ ئەو ئایەتانە بخوێنەوە، عەرەب عادەتیان وابوو کەسێك پەیامێکی هەبووایە دەبووایە خزمێکی ئەو کەسە پەیامەکە بگەیەنێ، (کە شیعە ئەم مەسەلەیان کردوە بە شتێکی زۆر گەورە بۆ تانەدان لە ئەبوبەکری خوا لێی ڕازی بێ) ئنجا کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب خوا لێی ڕازی بێ چوو بۆ لای ئەبوبەکر، ئەبوبەکر گوتی: (أَمير أَوْ مَأمُور؟) واتە: فەرماندەی یان فەرمانبەر؟ (قَالَ: بَلْ مَأمُور) گوتی: بەڵکو فەرمانبەرم‌و تۆ ئەمیری حەجی، بەلام پێغەمبەر ﷺ هەندێك ئایەتی بۆ هاتوونە خوارو لەبەرئەوەی بۆخۆت دەزانی عادەتی عەرەبان وایە دەبێ خزمێکی ئەو کەسە پەیام بە خەڵك ڕابگەیەنێ، من ئایەتەکانیان بۆ دەخوێنمەوە، بەلام تۆ ئەمیری حەجی، ئایەتەکانیش، ئەمە یەکێکیان بوو: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَـٰذَا...﴿٢٨﴾ ﴾ التوبة، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بێگومان هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان پیسن، لە دوای ئەم ساڵەوە نابێ توخنی مزگەوتی حەرام بکەون، واتە: ساڵێکی دیکە نابێ حەج بکەن، بۆچی؟ لەوبارەوە ئەم دەقە هەیە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: إِنَّ الْمُشْرِكِينَ كَانُوا يَطُوفُونَ بِالْبَيْتِ فَيَقُولُونَ: لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لاَ شَرِيكَ لَكَ، فَيَقُولُ النَّبِيُّ ﷺ: «قَطْ قَطْ»، فَيَقُولُونَ: إِلاَّ شَرِيكاً هُوَ لَكَ تَمْلِكُهُ وَمَا مَلَكَ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرَانِي فِي (الكبير) برقم: (١٢٨٨٣)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: هاوبەش بۆ خوادانەرەکان (کە

هەندێکیان ڕووت بوون) طەوافیان بە دەوری کەعبەدا دەکردو، دەیانگوت: (لَبَّيْكَ لَبَّيْكَ لا شَرِيكَ لَكَ)، پێغەمبەری خواش دەیفەرموو: هەرگیز هەرگیز هاوبەشی نیە، دوایی ئەوەشیان بۆ زیاد دەکردو دەیانگوت: (إلاَّ شَرِيكاً هُوَ لَكَ تَمْلِكُهُ وَمَا مَلَكَ) خوایە هیچ شەریکت نیە، بەس شەریکێك نەبێ، ئەویش خۆی و هەرچی هەیەتی ئەویش موڵکی تۆیە!

ئنجا سەرباری ئەو شیركو ئەفسانەیە، بە دەوری کەعبەش دا بە ڕووتیی طەوافیان دەکرد، ئافرەتیان بە ڕووتیی طەوافی دەکرد، پیاویان بە ڕووتیی طەوافی دەکرد، وە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ صَلَاتُهُمْ عِندَ ٱلْبَيْتِ إِلَّا مُكَآءً وَتَصْدِيَةً ۚ فَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ بِمَا كُنتُمْ تَكْفُرُونَ ﴿٣٥﴾ ﴾ الأنفال، نوێژەکەیان لە دەوری بەیت هەر بریتیی بوو لە فیکەکێشان و چەپڵەلێدان، کە دیارە ئەوەش گاڵتەو فشەقیاتەو لەگەڵ جددیەتیی خواپەرستیی دا کە مسوڵمانان دەیکەن ناگونجێ، لەبەرئەوە نەدەگونجا بێن، ئنجا کە ئایەتەکان خوێندرانەوەو موشریکەکان تەبلیغ کران کە بۆ ساڵی دادێ کە ساڵی دەیەمە، وە پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی حەجی ماڵئاوایی دەکات، نابێ هاوبەشدانەرەکان بێن بۆ دەوری کەعبە، هەڵبەتە ئەو حەجەش دوایی ناوی لێنرا حەجی ماڵئاوایی، چونکە خۆ نەیاندەزانی دوا حەجە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ بیکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ ئاماژەی پێدا، فەرمووی: ﴿لَعَلِّي لاَ أَلْقَاكُمْ بَعْدَ عَامِي هَذَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (١٤٥٩٣)، وَابْنُ مَاجَه بِرقم: (٣٠٢٣)، وَالدَّارِمِيُّ بِرقم: (٢٢٧)، وَالطَّبرانيُّ فِي (الكبير) بِرقم: (٧٧٧) قال حسين سليم أسد: إسنادُهُ حَسَنٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (الإرواء) بِرقم: (١٠٧٤)}، واتە: ڕەنگە لە دوای ئەم ساڵەوە پێتان نەگەمەوە، واتە: ئاماژەیەك دەکات کە کۆچی دوایی دەکات، ئنجا ئایا ئەو دوو ئایەتە چۆن پێکەوەیان بگونجێنین؟

زانایان لێیان بۆتە ئیشکالێکی گەورەو بە ناچاریی - هەرچەندە پێشتر گوتوویانە: (المائدة) هیچ نەسخی تێدانیە! - ئایەتەکەی (التوبة)یان بە (ناسخ)ی ئەوەی (المائدة) داناوە! وە ئەوانەش کە گوتوویانە: (المائدة) نەسخی تێدانیە، یان قورئان هیچ نەسخی تێدانیە، خۆیان ناچار بینیوە کە بڵێن:

مەبەست لە: ﴿ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾، تەنیا مسـوڵمانانن‌و هەروەها ﴿ الهَدِي والقَلاَئِدَ ﴾یش تەنیا هی مسـوڵمانانن!

وە لەڕاسـتیدا منیش بۆخۆم چەند ڕۆژێك بیـرم لەو مەسەلەیە کردەوە، وە زیاتر لە سـێ، تەفسـیریشـم لەلان، تەماشـای هەموویانم کرد، هەتا سـەرەنجام بەمجـۆرە ئیشـکالەکەم بۆ چارەسـەر بوو:

جارێ ناگونجێ بڵـێین: ئایـەتی دووەمـی (المائدة) مەنسـووخە، هەمووی یان هەندێکی، چونکـە ئەو ئایـەتە، دە (١٠) فەرمانی گەورەو گـرنگ‌و بنـەڕەتی تێدان، کە هیچ کامیـان ناگونجێ نەسخ ببنـەوە، کە ئەمـانـەن:

١/ ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێنـاوە! دروشـمەکانی خوا حەڵاڵ مەکەن‌و بێحورمـەتییان پـێ مەکەن، کە بێگومان ناگونجێ ئەوە نەسخ بێتـەوە.

٢/ ﴿ وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ ﴾، وە مـانگی حـەڕام کـە جـەنگی تێـدا قەدەغـە کـراوە حەڵاڵی مەکەن، کە جەنگی تێدا بکەن، کە پێشتر گوتمان: بـە چ مەفهوومێـك؟ جەنگی دەستپێشخەرییانە، نەك جەنگی بەرگرییکارانە.

٣/ ﴿ وَلَا ٱلْهَدْىَ ﴾، وە قوربانییـەکان کـە دەهێنـرێن بـۆ مزگـەوتی حـەڕام دەسـتدرێژییان مەکەنـە سـەر، ئەووەش دیسـان ناگونجـێ بگـوترێ: ئـەوە نەسـخ بۆتـەوەو بۆمـان هەیـە دەسـتدرێژیی بکەینـە سـەر قوربانییـەکانی حـەج‌و عومرە.

٤/ ﴿ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ ﴾، وە ئـەو قوربانییانـەی گـەردن بەنـدیان لـە مـل دەکـرێ، نیشـانەدار دەکرێن، دەسـتدرێژییان مەکەنـە سەرێ، ئـەمیش ناگونجـێ نەسـخ بکرێتـەوە.

٥/ ﴿ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾، وە ئەوانـەی ڕوو دەکەنـە مـاڵی حـەڕام، دەست درێژییـان مەکەنـە سـەرێ، ئـەمیش ناگونجـێ بڵێین: نەسخ بۆتـەوەو بۆمـان

هەیە دەستدرێژییان بکەینە سەرێ، کابرا بۆ حەج هاتوە تۆش بۆت هەبێ بیکوژی! نەخێر.

٦/ ﴿ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْ ﴾، وە ئەگەر ئیحرامتان شکاند ڕاوێ بکەن، ئەوەش ناگونجێ نەسخ بووبێتەوە، چونکە ئێستاش هەر وایە، کە ئیحرامت شکاند بۆت هەیە ڕاووشکار بکەی.

٧/ ﴿ وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ أَن تَعۡتَدُواْ ﴾ وە با کەسانێك کە ئێوەیان لە مزگەوتی حەرام گێڕاوەتەوەو نەیانهێشتوە بچن عومرە بکەن، لە ساڵی شەشەمی کۆچیی دا، کە صوڵحی حودەیبییەی لێکەوتەوە، ئەوە واتان لێ نەکات ئێوەش دەستدرێژیی بکەنە سەروان، ئایا دەستدرێژیی کردنە سەر خەڵك دروستە، با ئەوانیش غەڵەتیان کردبێ، دەبێ ئێمە وەك خەڵك غەڵەتێ بکەین؟ نەخێر، ئەگەر هەقێکمان لەسەریەتی لەڕێی شەرعییەوە هەقەکەی لێ وەردەگرینەوە، کەسێك نەفەرێکی لە تۆ کوشتوە، تۆ بۆت نیە یەکسەر بە ڕەشەکوژی نەفەرێك بکوژیەوە، بەڵکو دەبێ بێنی بزانی کێ کوشتوویەتی؟ یان تۆڵە لەو نەفەرە کە قاتڵە، بکەیەوە، یاخود خوێنی لێ وەربگرێ، یان عەفوو، ئەمما بڵێی: ئەو قەومە نەفەرێکیان لە ئێمە کوشتوە، ئێمەش نەفەرێکیان لێ دەکوژین، یان ئەوان زینایان کردوە لەگەڵ ئافرەتێکی ئێمەدا، دەبێ ئێمەش بچین زینا لەگەڵ یەکێکیان بکەین، ئەوە نابێ.

٨/ ﴿ وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰ ﴾، وە هاوکاریی یەکدی بکەن لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاریی، ئەوەش ناگونجێ نەسخ بێتەوە، هاوکارییکردن لەگەڵ یەکدی بۆ چاکەکاریی و پارێزکاریی شتێکی چەسپاوە.

٩/ ﴿ وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ ﴾، وە هاوکاریی یەکدی مەکەن لەسەر گوناهو دەستدرێژیی، ئەوەش ناگونجێ نەسخ بێتەوە، ئێستاش هەر دروست نیە هاوکاری یەکدی بکرێ لەسەر گوناهو دەستدرێژیی.

١٠/ ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ﴾، پارێز لە خوا بکەن، خوا سزای توندە، تەقوا لە خواش نابێ نەسخ بێتەوە.

جا هەندێك لە زانایان دەڵێن: ڕستەکانی ئایەتەکەو حوکمەکانی هەموو نەسخ نەبوونەوە، بەس یەکێکیان نەسخ بۆتەوە، ﴿ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾، بەس ئەوەندەی، یان هەندێکیان دەڵێن: ئەو سێیە: ﴿ وَلَا ٱلْهَدْىَ وَلَا ٱلْقَلَٰٓئِدَ وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ ﴾.

ئێمەش دەڵێین: ناگونجێ لە ئایەتێکدا تەنیا سێ وشە نەسخ بووبنەوە!

هەندێکی دیکەش وا چارەسەریان کردوە، کە گوتوویانە: ئەوە لەگەڵ مسوڵمانانیەتی واتە: مسوڵمانانێك کە دێن قوربانییان پێیە، ئنجا قوربانییەکان چ نیشانەدار نەکرابن و کە (هدي) پێ دەگوترێ، یان نیشانەدار کرابن، گەردن بەندیان لە مل دابێ کە (قلائد)ی پێ دەگوترێ، وە خۆشیان کە ڕوو دەکەنە مزگەوتی حەرام، ئەو مسوڵمانانە دەستدرێژییان مەکەنە سەرێ.

بەڵام ئێمە دەڵێین: ڕواڵەتی ئایەتو سیاقی ئایەتەکە وا نایەتە بەرچاو کە تەنیا مەبەستی پێی مسوڵمانان بێ، بەڵکو مەبەست پێی هەموو ئەوانەیە کە ڕوو دەکەنە بەیتی حەرام.

ئنجا چۆنیەتی لاچوونی ئیشکالەکەش ئەوەیە - کە لە هیچ کام لە تەفسیرەکاندا نەمبینیوە-، کە بڵێین:

ئایەتەکەی سوورەتی (التوبة) ئەگەر تەماشا بکەین چی دەفەرموێ؟ چونکە نەسخ لە کاتێکدا پەیدادەبێ کە ئایەتەکان تێکبگیرێن لە هەموو ڕوویێکەوە، بەڵام وەختێك کە تێکنەگیرێن، یاخود بواری پێکەوە گونجانیان هەبێ، پێویست ناکات بڵێی ئەویان ئەوی دیکەی نەسخ کردۆتەوە، ئەگەر تەماشای ئایەتەکەی سوورەتی (التوبة) بکەین خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ فَلَا يَقْرَبُواْ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ بَعْدَ عَامِهِمْ هَٰذَاۚ وَإِنْ خِفْتُمْ

عَيۡلَةٗ فَسَوۡفَ يُغۡنِيكُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦٓ إِن شَآءَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ حَكِيمٞ ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتاأان هێناوە! بێگومان هاوبەش بۆ خوادانەرەکان پیسن، با لە دوای ئەم ساڵەوە توخنی مزگەوتی حەرام نەکەون، وە ئەگەر لە ئاتاجییش ترسان (کە ئەوان دەهاتنو بازرگانییان دەکرد) خوا لە بەخششی خۆی دەوڵەمەندو بێ نیازتان دەکات، بێگومان خوا زانای کاربەجێیە. ئەم ئایەتەی سوورەتی (التوبة) تەنیا دەفەرموێ: ڕێ مەدەن هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان لە مزگەوتی حەرام نزیك بکەونەوە.

وە ئایەتەکەی سوورەتی (المائدة)ش دەفەرموێ: دروشمەکانی خوا حەڵاڵ مەکەنو دەستدرێژیی مەکەنە سەر قوربانییەکان، وە دەستدرێژیی مەکەنە سەر ئەوانەی دێن بۆ مزگەوتی حەرام، جا ئەوە چ تێکگیرانێکیان تێدا هەیە؟!

دەفەرموێ: مەهێڵن کافرەکان بچن بۆ مزگەوتی حەرام، بەڵام دەستدرێژییش مەکەنە سەر قوربانییەکەیانو، دەستدرێژیی مەکەنە سەر خۆشیان، یانی: ئایەتەکەی سوورەتی (التوبة) بەس دەفەرموێ: مەهێڵن کافرەکان نزیکی مزگەوتی حەرام بکەون، نافەرموێ: بیانکوژن، هەتا بگوترێ: ئەوەی دیکەی نەسخ کردۆتەوە، کە دەفەرموێ: دەستدرێژییان مەکەنە سەرێ، بەڵکو بەس دەفەرموێ: ڕێگرییان لێ بکەن، کەواتە: هیچ تێکگیرانێك لە نێوانیاندا نیە، تا بگوترێ: یەکێکیان ئەوی دیکەی نەسخ کردۆتەوە.

چونکە مسوڵمانان لەلایەکەوە فەرمانیان پێکراوە کە نەهێڵن کافرەکان توخنی مزگەوتی حەرام بکەونو، لەلایەکی دیکەشەوە پێیان گوتراوە: دەستدرێژیی مەکەنە سەر ئەو کەسانەی بە مەبەستی حەجو عومرە دێنو زیان بە قوربانییەکان مەگەیەنن.

وە هەندێکیان گوتوویانە: ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿ ... يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ ... ﴿٢﴾ ﴾، بەخششو ڕەزامەندیی پەروەردگاریان داوا دەکەن، بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە ئەوانەی بەو شێوەیە وەسفیان دەکات، مسوڵمانن.

بـەڵام ئێمـە دەڵـێـین:

نەخێر، وانیـە، چونکە نامسـوڵمانانیش بەخشـشی خـواو ڕەزامەنـدیی خـوا داوا دەکــەن، مــەرج نیــە هــەر مســـوڵمان وابــن، بــەڵام هــی کــافران قبــووڵ نــاکرێ، لەبەرئەوەی لەڕێیەکی ڕاستو شـەرعییەوە نیە، دەنا ئـەوانیش بـە خـەیاڵی خۆیـان هەر دەیانـەوێ خوا لە خۆیان ڕازی بکەنو بەهەشـتی خـواش داوا دەکەن، کەواتـە: بەم شێوەیە ئەو ئیشکالە یاخود ئەو تێکگیـرانە ڕواڵەتییە چارەسەر دەبێ.

**مەســـەلەی نۆیــــەم:** کــە خــوای بێوێنــە لــە ئایــەتی دووەمــی ســوورەتی (الـمـائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْ ﴾، وە هـەرکاتێك ئیحرامتـان شـکاند، ڕاووشـکار بکەن، پێشـتریش باسمان کرد، ئەوە لە کاتێکـدایە کە ئینسـان لـە ئیحـرام دایــە، واتە: کاتێك ئیحرامتان بە حەج، یان بە عومرە بەسـتوە، ڕاوکردنتان لـێ قەدەغەیـە، دیـارە مەبەسـت پێـی ڕاوکـردن لـە وشـکانییە، ئەویـش لەبەرئـەوەی لـە سـنووری حــەرەم دایــە، بۆیــە لـێیــان قەدەغەیــە، لێــرەدا کــە خــوا دەفــەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْ ﴾، وە هەرکــاتێك حــەڵاڵ بــوون، ئیحرامتـان شـکاند، ڕاو بکــەن، هــەموو زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگن، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱصۡطَادُواْ ﴾، هەرچـەندە فـەرمان (أمـر)ە، چـونکە دەفـەرموێ: ڕاوبکـەن، بـەڵام ئـەو فەرمانـە بـۆ ڕێ پێـدان (إباحة)یە، نەك بۆ پێویسـت بوون (وجوب)، واتـە: فــەرز نیــە لەســەر حاجییــەکان، وە لەسـەر عومرەکەرەکـان، کـە ئیحرامیـان شـکاند ڕاوبکــەن، تـاکو بگــوترێ: ئـەوە خوای بەرزو مەزن فەرموویـەتی: ئەگـەر ئیحرامتـان شـکاند، ڕاوبکـەن، چونکە ئێمـە بنچینەیەکی (أصـول الفقـه)مـان هەیـە، دەڵـێ: (الأَمْرَ بَعْدَ الْحَظْرِ يُفِيدُ الإِبَاحَةِ) واتــە: فەرمــان کــردن دوای قەدەغــەکردنی شــتێك، ڕەوابــوون دەگەیەنــێ، نــەك پێویسـت بوون، واتە: بۆتان هەیە، تا ئێسـتا لێتـان قەدەغـە بـوو ڕاو بکـەن، مـادام لـە ئیحرامدا بـوون، لەمـەودوا مـادام ئیحرامتـان شـکاند، بۆتـان هەیـە ڕاو بکـەن، بـەڵام فەرز نیە لەسـەرتان، هـەر بۆیـەش بـەبێ زانیـاریی (أصول الفقه) ئینسـان ناتوانـێ یاسـا شـەرعییەکان لـە قورئـانو سـوننەت وەربگــرێو هەڵـهێنجێ، ئـەوەی کـە بـە

ڕوالـّـەت تەماشــای ئـەو ڕســتەیە: ﴿ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُواْ ﴾ بكـات، دەڵـێ: ئـەوە مانای وایە ڕاوكردن فـەرزە، یانی هەرچی حاجییـە، هەرچـی عـومرە چییـە، لـەوێ كە عومرەیـان تـەواو كـردو حـەجیان تـەواو كـرد، دەبـێ دەسـت بـە ڕاوكـردن بكـەن، بەپێی ئەم ئایەتـە، بەڵام نـا، ئـەوە زانایان تێیدەگـەن، دەڵـێن: ئـەو فەرمانـە بـۆ ڕێ پێدانـە، واتـە: بۆتـان هەیـە ڕاوبكــەن، بـەڵام مولـزەم نـین بـەوەی كـە هـەر دەبـێ ڕاوبكـەن.

**مەسەلەی دەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُواْ ﴾، پێشـتریش باسـمان كـرد، كـە لـە سـاڵی شەشـەمی كۆچییدا پێغەمبەری خوا ﷺ خۆیو هـەزارو چوارسـەد لـە هــاوەڵانی بەڕێكـەوتن چــوون بــەرەو مەككــە، بۆئــەوەی عــومرە جێبــەجێ بكــەن، هــاوبەش بــۆ خوادانــەرەكانیش لــە مەككــە ڕێیــان پێگــرتن لــە شــوێنێك كــە پێــی دەگــوترێ: (الْحُدَيْبِيَـة)، وە سـەرەنجام صـولحو ڕێككـەوتنێكیان كـرد كـە ئـەو سـاڵە، (سـاڵی شـەشـەمی كۆچیی) بگـەڕێنەوەو عـومرە نەكـەنو سـاڵی ئاینـدە، (سـاڵی حەوتـەم)، بچـن ئەو عومرەیە بكـەن، جا لە هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ڕسـتەیەدا باسـمان كـرد، كاتێك كـە لـە (الْحُدَيْبِيَـة) بـوون كۆمـەڵێك لـە موشـریكەكان لـە ڕۆژهەڵاتـەوە هاتوون، واتـە: خـەڵكی غـەیری مەككـە بـوون، ویسـتوویانە بچـن عـومرە بكـەن لـە مەككـە، هەندێك لە هاوەڵان خـوا لێیان ڕازی بێ، خۆیان ئامـادە كـردوە بچـن ڕێیـان لـێ بگـرن، وە شـەڕیان لەگـەڵ بكـەن، خـوای دادگـەر ئـەم ڕسـتە قورئـانییەی ناردۆتـە خـوارێ: ﴿ وَلاَ يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُواْ ﴾، وە بـا ڕق لـێبوونەوەنتان لـە كۆمەڵـێك كـە ئێوەیـان گێڕاوەتەوە لە مزگەوتی حەرامو ڕێیـان لێگرتـوون، واتـان لێنەكـات ئێـوەش ڕێ لە كۆمەڵێكـی دیكـە بگـرن، وە دەسـتدرێژیی بكەنـە سـەریان، ئنجـا ئایـا ئـەوە چـی لێوەردەگیـرێ؟ ئـەوەی لێوەردەگیـرێ كـە مسـوڵمانان دەبـێ بـە ڕەوشـتو بـەهای بـەرزەوە لەگـەڵ غـەیری خۆیانـدا مامەڵـە بكـەن، نـەك ئەگـەر ئـەوان جنێویـان

پێگوتن، مسوڵمانانیش جنێویان پێ بڵێنەوە، وە ئەگەر ئەوان جۆرێك لە دەستدرێژیی یان کردە سەریان، دەستدرێژییان بکەنەوە سەر، بەڵێ مسوڵمانان لە بەرانبەر دەستدرێژیی و ستەمی ئەهلی کوفردا ئەوانیش بۆیان هەیە بەرپەرچیان بدەنەوە، بەڵام لە سنووری شەرعدا، نەك ئەوان چییان لەگەڵ کردن، ئەوانیش هەمان شتیان لەگەڵدا بکەنەوە، بۆ وێنە: کە ئەوان مسوڵمانێکیان بە ناهەق کوشت، ئەوانیش بچن غەیری بکوژەکە بە ناهەق بکوژنەوە، یان ئەگەر ئەوان تەعدای ناموسیان لە ئافرەتێك کرد، ئەوانیش بچن تەعدای ناموس لە ئافرەتێکیان بکەنەوە، یان ئەگەر ئەوان شتێکی خراپ، یان قسەیەکی خراپو ناشەرعییان پێگوتن، بۆ وێنە: بوختانی داوێنپیسیی یان بۆ کردن، ئەوانیش بچن وایان پێ بڵێنەوە، ئەوانە دروست نین، بەڵکو مسوڵمان دەبێ پابەندبێ بە بەهای بەرزو ڕەوشتی بەرزەوە، وە بە یاساکانی شەریعەتەوە، با بەرانبەرەکانیش ستەمو دەستدرێژیی بکەن، بۆیان هەیە داوای هەقی خۆیان بکەنەوە لە ڕێی شەرعییەوە، بەڵام مەرج نیە بە شێوەی دەستدرێژیی، جا خوا ﷻ دەفەرموێ: با ڕق هەڵسانتان لە کۆمەڵێك کە ئێوەیان گێڕاوەتەوە لە مزگەوتی حەرامو ڕێیان لێگرتوون، واتان لێنەکات ئێوەش دەستدرێژیی بکەنە سەر کۆمەڵێکی دیکە، لەوبارەشەوە ئەم فەرمایشتە هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿أَدِّ الأَمَانَةَ إِلَى مَنِ ائْتَمَنَكَ وَلاَ تَخُنْ مَنْ خَانَكَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٥٣٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٦٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٢٩٦) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شَرْطِ مُسْلِم، وَوَافَقَهُ الذَّهبي، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: کەسێك کە تۆی بە ئەمیندار داناوە، سپاردەکەی بدەوە، وە خیانەت لە کەسێك مەکە کە خیانەتی لە تۆ کردوە، تۆ سپاردەت لەلای کەسێك داناوە، ئەو بزری کردوە، ئەگەر سبەینێ ئەویش سپاردەیەکی لە لای تۆ دانا، تۆش ئەمانەتەکەی بزر نەکەی، بڵێی: تۆڵە بە تۆڵە! ئەگەر ئەو ئەمانەتی تۆی بزر کردوە، بۆت هەیە لە ڕێی شەرعییەوە، لە ڕێی یاساییەوە دەعوای لەسەر تۆمار بکەی و هەقی خۆت وەربگریەوە، بەڵام بۆت نیە ئەو خیانەتی کردوە، تۆش خیانەت بکەی، ئەگەر ئەو خیانەت لە خۆی دەووەشێنێتەوە تۆ نابێ لە خۆتی بووەشێنیەوە، بەڵکو دەبێ ئەو هەقەی خۆت بە شێوەیەکی دیکە وەربگریەوە، هەروەها لە فەرمایشتێکی

دیکەیدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿لا ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٨٦٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٣٤١)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (١١٥٧٦) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه، وَقَالَ شُعيب الأرنؤوط: حَديثٌ حَسَنٌ}، واتە: زیان لێدان ڕاستەوخۆ، زیان لێدان لە بەرانبەر زیاندا لە ئیسلامدا نیە، واتە: بۆت نیە بە بێ دەستدرێژیی لایەنی بەرانبەر زیانی لێبدەی، وە بۆشت نیە لە بەرانبەر زیان لێدانی ئەودا زیانی لێبدەیەوە، بەڵكو دەبێ داوای هەقی خۆت بكەیەوە، ئنجا ئەوەش زۆر جێی سەرنجە، یانی: خوا ﷻ بە مسوڵمانان دەفەرموێ: ئەگەر خەڵك لەگەڵ ئێوەدا ستەمی كرد، شتی خراپی كرد، خیانەتی كرد، دەستدرێژیی كرد، ئێوە بۆتان نیە وابكەن، چونكە مسوڵمانن، وە دەبێ بە بەها بەرزەكانو ڕەوشتە بەرزەكانەوە پابەندبن، ئەگەر ئەوان خراپەو غەدرو زوڵمو دەستدرێژیی لە خۆیان دەوەشێننەوە، ئێوە نابێ لە خۆتانی بوەشێننەوە، ئەوە بۆیە زۆر جەختی لەسەر دەكەمەوە، چونكە ئەو ئایەتەی سوورەتی (البقرة) كە دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ﴿١٩٤﴾﴾، دەبێ بزانین سیاقەكەی جیایە لەم سیاقەی ئێرە، چونكە لەو سیاقەی سوورەتی (البقرة)دا مەبەست پێی شەڕ پێفرۆشتنو ڕێگرتنە، واتە: كەسێك شەڕی پێفرۆشتی تۆش بۆت هەیە بەرپەرچی بدەیەوە، كەسێك ڕێی پێگرتی، تۆش بۆت هەیە ئەو پەرچە لە ڕێی خۆت لابەری، بەڵام كەسێك ناشەرعییەكی لەگەڵ تۆدا كرد، تۆش هەمان خیانەتی لێبكەیەوە!! ئەوە نابێ، بەڵكو دەبێ داوای هەقی خۆت بكەی بە شێوەیەكی شەرعیی.

**مەسەلەی یازدەیەم**: كە دەفەرموێ: ﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ﴾، وە هاوكاریی یەكدی بكەن لەسەر چاكەكاریی‌و پارێزكاریی، وشەی: (تَعَاوُن) لەسەر كێشی (تَفَاعُل)ە، بۆ بەشداریی كردنی دوولایەن، یاخود زیاتر، دەگوترێ: (تَقَاتُلوا) واتە: دوولایەن، یاخود زیاتر یەكدیان كوشت، پێكەوە بەشەڕ هاتن، (تَعَاوَنوا) واتە: پێكەوە هاوكارییان كرد، هەركامێكیان (عَون) بوو بۆ ئەوەی دیكە، دیارە لێرەدا خوا ﷻ ئەوەی بە كرداری فەرمان (فِعل الأَمر) هێناوە، وتە: فەرزە ئێوە

هاوکاریی بکەن، لەگەڵ کێدا؟ بەپێی سیاقی ئایەتەکە دەردەکەوێ کە دەبێ لەگەڵ مسوڵمانو نامسوڵماندا هاوکاریی بکرێ، چونکە ئایەتەکە باسی چۆنیەتی مامەڵەکردنی مسوڵمانان لەگەڵ نامسوڵماناندا دەکات، دەفەرموێ: هاوکاریی لەگەڵ خەڵکدا بکەن، لەگەڵ بەرانبەرەکانتاندا، چ مسوڵمان بن، چ نامسوڵمان، لەسەر هەر شتێك کە چاکەکارییە، وە پارێزکاریی یە.

جا با بزانین (البِـرّ والتَقوى) یانی چی؟ وشەی: (بِـرّ) زانایان ئاوا پێناسەیان کردوە، دەڵێن: (البِرُّ: كُلُّ مَا فِيهِ نَفْعُ النَّاسِ) هەر شتێك سوودی بۆ خەڵك هەبێ، پێی دەگوترێ: (بِـرّ)، بۆیە من بە چاکەکارییم مانا کردوە، وە دەشگونجێ مەبەست لە وشەی: (بِرّ) کردەوە باشەکان بن، وە مەبەست لە وشەی: (تَقوى)ش خۆپاراستن بێ لە کردەوە خراپەکان، ﴿وَتَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْبِرِّ وَٱلتَّقْوَىٰ﴾، واتە: هاوکاریی یەکدی بکەن بۆ هەموو کردەوەیەکی باش، وە هاوکاریی یەکدی بکەن بۆ خۆپاراستن لە هەموو کردەوەیەکی خراپ، دەشگونجێ بڵێین: (بِـر) واتە: ئەو شتانەی کە بۆ خەڵك باشن، سوودبەخشن، (تَقوى)ش واتە: ئەنجامدانی هەر شتێك کە جێگای ڕەزامەندیی خوای پەروەردگارە، ئنجا ئەم ئایەتە زۆر شتی لێ وەردەگیرێ:

یەکێك لەوانە: لەسەر مسوڵمانان پێویستە هەر کارێك پێویستی بە هەرەوەزیی بوو، پێویستی بە هاوکاریی نێوخۆیان هەبوو، پێویستی بەوە هەبوو کە بۆی کۆببنەوە، بۆ وێنە: ڕێکخراوێکی مەدەنیی، یاخود ڕێکخراوێکی سیاسی ... هتد، بەپێی ئەم ئایەتە مادام کارو پرۆژەی ئیسلامیی، یاخود فەرمان بە چاکەکردنو ڕێ لە خراپە گرتن، یاخود جێبەجێکردنی یاساکانی شەریعەتو بەرگریی کردن لە ئیسلامو مسوڵمانان پەکی لەسەر کەوتبێ، ئەوانە هەموویان دەبنە فەرز، چونکە فەرزە مسوڵمانان کۆبن، وە ناشتوانن کۆبن، هەتا بەرنامەو پرۆژەیەکیان نەبێ، وە هەتا تەباو هاوکار نەبنو ڕێكوپێك نەبن لە نێوان خۆیاندا، بۆیە ئەو شتانەی باسمان کردن لەوکاتانە هەموویان دەبنە فەرز، چونکە بنچینەیەکی شەرعییمان هەیە دەڵێ (مَا لاَ يَتِمُّ الْوَاجِبُ إِلاَّ بِهِ فَهُوَ وَاجِبٌ)، واتە: هەر شتێك فەرزێك بەبێ ئەو جێبەجێ نەکرێ، ئەویش دەبێتە فەرز، بۆ

وێنە: خوای پەروەردگـار دەفەرموێ: نوێژ بکـەن، نوێژیش پێویستی بە دەستنوێژە، چونکـە بەبێ دەسـتنوێژ نوێژ ناکرێ، کەواتە: دەستنوێژەکەش دەبێتـە فـەرز، ئنجا دەسـتنوێژیش پێویسـتی بـە تـارەتگرتن دەکات، بۆیـە تـارەتگرتنیش دەبێتـە فـەرز، هەروەهـا نوێژکردن پێویسـتی بە بەرگو پۆشاکی پاك هەیـە، بۆیـە: ئـەویش دەبێتـە فەرز... هتـد، یاخود زانایان بنچینەیەکـی دیکـەیان دانـاوە، دەڵـێ: (الأَمْرُ بِالشَّيْءِ أَمْرٌ بِهِ وبِمَا لا يَتِمُّ إِلاَّ بِهِ)، واتە: فەرمان کردن بە شتێك فەرمانە بە خودی ئەو شتە، وە بـە هەرشـتێکی دیکـەش کـە ئـەو شـتە بەبێ ئـەو جێبـەجێ نـاکرێ، وەك پێشتر وێنـەم هێنایـەوە لەسـەر نوێـژ، نوێـژکردن بـە دەسـتنوێژ، دەسـتنوێژ بـەبێ تـارەت، تـارەت بـەبێ خۆپاککردنـەوە، ئنجـا نوێـژ بـەبێ ڕاوەسـتان لـە شـوێنی پـاك، پاشـان ڕووکردنـە ڕووگـە (قِبلَـة)، بـەبێ ئاگـاداربوون لـە کـاتی بـوونی نوێـژ، ئەوانـە هـەموویان پێویسـت دەبن، چونکـە نوێژ بـەبێ ئەوانە نابـێ، هەروەهـا چـەندان شـتی دیکـەش کـە شـەرعزانان باسـیان کـردوون، بۆیـە هاوکـاریی کـردنو دەسـتبارگرتنی مسـوڵمانان لـەنێوان خۆیانـدا فـەرزە، وە خـوای پەروەردگـاریش لـە سوورەتی (آل عمران) دەفەرموێ: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾﴾، واتـە: بـا لـە ئێـوەدا کۆمەڵـێك هـەبن کـە بانگـەواز دەکـەن بـۆ چاکـەو، فـەرمان بـە شـتە پەسندەکان دەکەنو، ڕێ لە شتە ناپەسندەکان دەگـرن، وە هەر ئەوانەش سەرفرازن.

ئنجـا پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا پێناسەی (بِر)ی کردوە، کە پێناسەیەکی زۆر جوان دەکات، بۆ چاکـەکاریی، دەفـەرمـوێ: ﴿الْبِرُّ مَا اطْمَأَنَّ إِلَيْهِ الْقَلْبُ، وَالإِثْمُ مَا حَاكَ فِي النَّفْسِ وَتَرَدَّدَ فِي الصَّدْرِ، وَإِنْ أَفْتَاكَ النَّاسُ وَأَفْتَوْكَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٨٠٣٠)، وَالطَّبَرَانِـيُّ بـرقم: (٤٠٣)، وَحَسَّـنَهُ الألبـاني فـي (صـحيح الترغيـب والترهيب) بـرقم: (١٧٣٤)}، واتە: چاکەکاریی هـەر شـتێکە کـە دڵـت پێـی ئارامبـێ، {واتە: دڵـت پێی خۆشـبێ، وە دەروونـت پێی مورتـاحو ئارامگرتوو بـێ}، گونـاهیش (بـە پێچەوانەوە) هـەر شـتێك لـە دڵـتدا بێتـو بچـێو پێـی ناموڕتـاح بـێ، وە لـە سـینەتدا لەرەلـەری بێ، هەرچـەندە خـەڵکیش فـەتوات بـۆ بـدەنو فـەتوات بـۆ بـدەن، واتە: ئینسـان دڵی خۆی زۆرجـار بکات بە پێوەرو بیکـات بـە تـەرازوو هـەر شـتێك

دڵـت پێـی موڕتـاح بـوو، بـا بـزانـێ ڕەوایـە، بـەڵام دڵـی کەسێکی ئیمانـدار، وە هـەر شـتێك لێی لە گومـان دابووی، لێی لـەلەرەلـەر دابووی، دڵت پێی موڕتاح نەبوو، ئـەوە نـاڕەوایـە، جاری وایـە شـتێك بە ڕواڵەتی شـەرع ڕەوایە، بـەڵام ئـەو کەسـە دەزانـێ کە ڕەوا نیـە.

بۆیە پێغەمبـەری خوا ﷺ لە فەرمایشـتێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا أَنَا بَشَـرٌ وَإِنَّهُ يَـأْتِينِي الْخَصْمُ، فَلَعَلَّ بَعْضَهُمْ أَنْ يَكُونَ أَبْلَغَ مِنْ بَعْضٍ، فَأَحْسَبُ أَنَّهُ صَادِقٌ فَأَقْضِي لَـهُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَـهُ بِحَقِّ مُسْلِمٍ فَإِنَّمَا هِيَ قِطْعَةٌ مِنَ النَّارِ، فَلْيَحْمِلْهَا أَوْ يَـذَرْهَا﴾ {رَوَاهُ الْبُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٤٥٨)، وَمُسْـلِم بـرقم: (٤٤٤٨)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٣٥٨٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٤٠١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٣١٧)، عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهَا}، واتە: بێگومان منیش مرۆڤـم، ئنجـا جاری وایە کەسانێکی ناکۆك دێنـە لام بـۆ کێشـەیـەك (کـە لـە نێوانیانـە) لەوانەیـە یـەکێکیان قسـەی فەسیح تـرو زمـانی ڕەوانتـربێ، لـە یـەکیان و منـیش وا دەزنم ڕاسـت دەکاتو هەقی پێـدەدەم، کە ئـەوە هـەقی مسـوڵمانێکی دیکەیـە، بـەڵام بێگومـان ئـەوە پارچـەیەکە لـە ئاگـر، جـا بـا هەڵیبگـرێ، یاخود وازی لـێبێنـێ.

کەواتـە: کاتێـك پێغـەمبـەر ﷺ وەك قـازی بڕیارێـك دەدات، مـەرج نیـە لـە لای خوای دادگەر بەو شێوەیە بێ، بەڵکو ئـەو بـە ڕواڵەت وای لـێ حاڵی بـووەو، ئەگەر دوایی زانرا کە هەقی تێدا نەپێکراوە، نابێتە پابەندکەر (مُلْزِم).

کەواتە: ئینسـان دەبێ وریـابـێ، هەنـدێ شـت هەیـە وەك گوتم بەپێـی ڕواڵەتی شەرع لەوانەیە تـۆ بتوانـی بەدەستی بخەی، بـەڵام دەشـزانی کە هەقت نیـە، دەبێ ئاگات لـێ بێ، وەك کوردەواریی خۆمـان دەڵـێن: (فێـڵ لە خـوا ناکـرێ!).

هەروەهـا لەوبـارەوە، واتە: دەربارەی پێناسـەکردنی چاکـەکاریی (بِـرّ) پێغـەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: ﴿الْبِرُّ: حُسْنُ الْخُلُقِ، وَالإِثْمُ: مَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ، وَكَرِهْتَ أَنْ يَعْلَمَـهُ النَّـاسُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٧٦٦٨)، وَالبُخَـارِيُّ فـي (الأدب الـمفرد) برقم: (٢٩٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤٦٣)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٢٣٨٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (٢١٧٢) وَقَالَ: صَحيح الإِسنَاد، عَنِ النَّوَّاسِ بْنِ سَمْعَانَ)، واتـە: چاکەکاریی بریتیە لە ڕەوشتی جوان، گوناهیش هەر شتێکە لـە دڵتدا بێتو بچێ

جێگیر نەبێ لە دڵتدا، وە پێشت ناخۆشبێ خەڵك بیزانێ، هەر شتێك پێت ناخۆشبوو خەڵك بیزانێ، دیارە ئەوە گوناهە، كوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (ئەوەی پاكە بێ باكە)، ئەگەر تۆ پاك بووی، واتە: شتێك بە شەرعیی دەزانیو دەیكەی، پێت ئاساییە خەڵكیش پێی بزانێ، بەڵام شتێك كە لە خەڵكت شاردەوە، دیارە ئەو ماستە بێ موو نیەو گومانت لێی هەیە.

**مەسەلەی دوازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَعَاوَنُوا۟ عَلَى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ ﴾، واتە: هاوكاریی یەكدی مەكەن لەسەر گوناحو دەستدرێژیی، ﴿ ٱلْإِثْمِ ﴾، بریتیە لە گوناهێك كە لە نێوانی خۆتو خوادا دەیكەی، وە ﴿ وَٱلْعُدْوَٰنِ ﴾، بریتیە لە گوناهێك كە لەگەڵ خەڵكیدا دەیكەی، واتە: دەستدرێژیی، چونكە گوناهەكان دوو بەشن: بەشێكیان (حَقُّ الله)یە، واتە: مافی خوا، وە بەشێكیان (حَقّ النَّاس)ە، واتە: مافی خەڵك، هەڵبەتە هەندێكیشیان مافی خواو مافی خەڵكیشیان پێوەیە، وەك زۆر لە گوناهەكان دوو سەریان هەیە، بەڵام شەریعەت مافی خەڵكی تێدا زاڵ كردوون، بۆ وێنە: قەتڵ هەم مافی خوای تێدایە، هەم مافی خەڵكی، بەڵام خوای كاربەجێ مافی خەڵكی تێدا زیاتر كردوە، ئەگەر خەڵك لە هەقەكەی خۆی خۆشبوو، ئەوە خوای میهرەبانیش لێی خۆش دەبێ، بەڵام هەندێ گوناح هەن تەنیا هەقی خوای پەروەردگارن، بۆ وێنە: مەیخۆریی، قوماركردن، ئەوانە هەقی خوای باڵادەستنو دەبێ ئینسان لە بەینی خۆیو خوادا تۆبە بكات، وە هەندێكیشیان وەك گوتمان هەقی بەندەكانن، ئنجا لەوبارەوە ئەم فەرمایشتە هەیە: ﴿عَنْ أَبِي أُمَامَةَ ﷛، يَقُولُ: سَأَلَ رَجُلٌ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: مَا الإِثْمُ؟ فَقَالَ: إِذَا حَاكَ فِي نَفْسِكَ شَيءٌ فَدَعْهُ. قَالَ: فَمَا الإِيْمَانُ؟ قَالَ: مَنْ سَرَّتْهُ حَسَنَتُهُ، وَسَاءَتْهُ سَيِّئَتُهُ فَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٢٥٣) قَالَ الْمُنذِرِي: إِسنَادُهُ صَحِيح، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٧٦)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٠٤٧) وَقَالَ: صَحِيحُ الإِسنَاد، وَوَافَقَهُ الذَّهَبِي، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٧٥٣٩) وَقَالَ الهَيْثَمِيُّ: رِجالُهُ رِجَالُ الصَحيح}، واتە: ئەبی ئومامە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوا ﷺ كرد، دەربارەی گوناح، گوتی گوناح چییە؟ فەرمووی: هەر شتێكە كە

لە دڵـتدا بێو پێی مورتـاح نەبی، وازی لێبێنــە، ئـەوە دیـارە گوناهــە، گوتــی: ئـەدی ئیمــان چییە؟ (واتـە: لێـرەدا ئـەو هاوەڵـە بـەڕێزە مەبەسـتی ئـەوە بـووە کـە ئایا لـە مەســەلەی چاکەکردنو خراپەکردنــدا ئیمـان چ دەورێـك دەبینـێ؟ نـەك مەبەسـتی ئـەوەبوو بـێ کـە پێناســەی خـودی ئیمـانی بـۆ بکـات) پێغەمبـەری خــوا ﷺ پێـی فەرموو: هەر کەسێك بـە چاکەکــەی دڵخۆش بـوو، وە بـە خراپەکــەی دڵ نارەحـەت بـوو، ئــەوە ئیمانــدارە، بێگومـان ئــەوە تـەرازوو پێـوەرێکی زۆر وردە، یــانی: ئەگـەر ئینسـان کارێکی چـاکی کـرد، وە بـەو کـارە چاکەی ئـەنجامی داوە دڵـی خۆشــبوو، وە کارێکی خراپ لە دەستی ڕوویـدا، گونـاحو هـەڵەیەکـی کـرد، پێـی دڵنــارەحەت بـوو، ئەوە دیـارە ئیمانی هەیـە، وە ئیمـانەکەی وای لێـدەکـات، بـە چـاکە دڵخــۆش بــێو بە خراپــە دڵنـاخۆش بێ، بەڵام ئەوەی کە ئیمانی نەبێ خوای پەنهـانزان دەفـەرموێ: ﴿يَفۡرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ ﴿١٨٨﴾﴾ آل عمـران، واتــە: گوناهــانیش دەکــەنو پێشـی دڵخۆشــن، نـەتانبینیوە، کەسـی وا هەیـە زینــا دەکـات، قـەتڵ دەکـات، شــەراب دەخـوات، قومـار دەکــات، دزیــیو ڕێگریـی دەکـاتو خۆشـی پـێ هەڵدەکێشــێ لـە مەجلیســان!! وەك ئەوەی شـتێکی زۆر گەورەی کردبـێ، بـەڵام ئینسـانی ئیمانـدار ئەگـەر گوناهێکیشــی کـرد، شــەرمێ دەکـات باسـی بکــات، شــەرم لـە خـوای پەروەردگــارو لـە خەڵکــیش دەکـات، وە خـۆی بـە خـراپو گوناهبـار دەزانــێ، وە پێشـی ناخۆشـە، هـەروەها بـە چاکەکەشی دڵخۆشــە.

ئـەم ڕســتە قورئانییــەش کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ﴾، واتـە: هاوکـاریی یەکـدی مەکـەن لەســەر گونــاحو دەســتدرێژیی، ئـەمیش زۆر شـتی لێوەردەگیرێ، یەکێك لەوانـە، ئەوەیە کە قەدەغەیـە لەسـەر مسـوڵمانان بەشــداریی لە حیزبێك، ڕێکخراوێك، کۆمەڵێك، کۆڕو مەجلیسـێکدا بکەن کـە گونــاهی تێدایــەو، دەسـتدرێژیی تێدایـەو، خراپـەی تێدایـە چونکــە خـوا دەفەرموێ: هاوکاریی یەکدی مەکـەن لەســەر گونــاحو دەســتدرێژیی، هەڵبەتــە بوونــە ئەنــدامی ئینســانیش لــە حیزبێکــدا کـە دژی ئیســلامەو گونــاحو تــاوانو ناشــەرعیی دەکـەن، جۆرێکـە لـە هاوکــارییو ناوەکـەی دەچێتــە نێـو ناویــان، لەگـەڵیان کۆبوونــەوە دەکـات، دەچـێ تەگبیــر دەکـاو پـیلان دادەنـێو ئابوونـە دەدات، ئنجا بـەرگرییان لێـدەکات لەگـەڵیان

دەبێ، ئەوانەش هەموویان هاوكارییین، خوای دادگەریش دەفەرموێ: هاوكاریی یەكدی مەكەن لەسەر گوناحو دەستدرێژیی، كە بەو پێیە مسوڵمانانێكی زۆر گوناهبارن، وە هەروەهاو زۆرجار مسوڵمانانێك لە نێو رێكخراوێك دان، لە نێو رێكخراوێكی مەدەنی، یان سیاسیی دان، یاخود لە كۆڕو مەجلیسێكدا دادەنیشن، كە گوناحو تاوانی تێدا دەكرێ، كۆڕێك دەبەسترێ بۆ شاعیرێك، دەست بە شیعر گوتن دەكاتو قسە بە خوا دەڵێ، قسە بە ئیسلام دەڵێ، قسە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێ، ئەویش لەوێ دانیشتووەو گوێی بۆ تەپ كردووە! ئنجا مەلایە، شێخە، گەنجێكە، هەرچی هەیە، هەموویان گوناهبارن، چونكە خوای پەنهانزان دەفەرموێ:

﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ﴾ النساء، واتە: لە كتێبدا بۆتان دابەزێنراوە (مەبەست پێی ئایەتی (٦٨)ە لە سوورەتی ئەنعام، كە لەوێشدا خوای كاربەجێ باسی هەمان مەسەلە دەكات) كە ئەگەر بیستتان لە كۆڕێكدا، لە مەجلیسێكدا ئایەتەكانی خوا كوفریان پێدەكراو گاڵتەیان پێدەكرا، بەشدارییان مەكەن، (واتە: دامەنیشن لەو كۆڕو مەجلیسەدا) هەتا خەڵكەكە دەچنە نێو باسو بابەتێكی دیكەوە، وە ئەگەر بەشداریی بكەن، ئەوە ئێوەش وەك وانن، (واتە: هەمان حوكمی ئەوانتان هەیە) وە خوا كافرانو مونافیقەكان لە دۆزەخدا بەیەكەوە كۆدەكاتەوە.

**مەسەلەی سێزدەیەم:** ئنجا خوای بەرزو بێ وێنە دێتە سەر ئایەتی سێیەمو ئاوا دەست پێدەكات، دەفەرموێ: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ۚ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ باسی یازدە (١١) جۆرە ئاژەڵ دەكاتو دەفەرموێ: ئەوانەتان هەموو لێ قەدەغەن، ئێمە لە بەرگی یەكەمی ئەم تەفسیرەدا لە ئایەتی (١٧٣)ی

سوورەتی (البقرة)دا بە تەفصیلْ باسی ئەو چوارەمان كرد: (مردارەوەبوو، خوێن، گۆشتی بەراز، سەربڕاو بۆ غەیری خوا، یان ناوی غەیری خوا لەسەر هێنراو لەكاتی سەربڕیندا)[1]، لێرەدا خوای پەروەردگار ئەو چوارانە باس دەكاتەوەو حەوت جۆرە ئاژەڵی دیكەش باس دەكات، كە هەموویان دەبن بە یازدە (١١) جۆرە ئاژەڵ، ئنجا كە لە ئایەتی یەكەمدا فەرمووی: ﴿أُحِلَّتۡ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلۡأَنۡعَٰمِ إِلَّا مَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ﴾، ئاژەڵە چوار پێیەكانتان بۆ حەڵاڵ كراون، جگە لەوەی بەسەرتاندا دەخوێنرێتەوە، ئەوەی كە بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە مەبەست پێی ئێرەیە، لێرەدا یازدە (١١) جۆری بەسەردا خوێندووینەوە، كە لەڕاستیدا ئەو یازدە جۆرە دەچنەوە نێو چوار جۆرەكان، بەڵام خوای پەروەردگار تەفصیلی پێداون، بۆ ئەوەی كە خەڵك تەواو بەرچاوی ڕوون بێ، نەوەك شتێك مردار نەبێ‌و بە مرداری لێ حاڵی بن، یاخود حەرام بێ بە حەڵاڵی لێ حاڵی بن، یان بە پێچەوانەوە، ئەو یازدە جۆرەش ئەمانەن:

١- ﴿ٱلۡمَيۡتَةُ﴾، واتە: مردارەوەبوو، هەر ئاژەڵێكە كە بمرێ‌و چەقۆی پێ ڕانەگات.

٢- ﴿وَٱلدَّمُ﴾، واتە: خوێن، مەبەست پێی خوێنی ڕژاوە، چونكە لە سوورەتی (الأنعام)دا خوا دەفەرمووێ: ﴿أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا ﴿١٤٥﴾﴾، خوێنی ڕژاو، بۆچی وادەڵێین؟ چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ: الْحُوتُ وَالْجَرَّادُ، وَدَمَانِ: الكَبِدُ وَالطِّحَالُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٧٢٣)، الدارقطني برقم: (٤٦٨٧)، وَابْنُ مَاجَه برقم: (٣٣١٤)، عَنْ ابنِ عُمَرَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١١١٨)}، واتە: دوو مردارمان بۆ حەڵاڵن: ماسی‌و كوللە (كە سەرنابڕدرێن با بشمرن حەڵاڵن، مەگەر بۆگەن بووبن، یان لەڕووی تەندروستیی‌و پزیشكییەوە زیانیان هەبێ)، وە دوو خوێنیش: جگەرو سپڵ (ئەوانیش لەڕاستیدا جۆرێكن لە خوێن، بەڵام دیارە پێكهاتەكەیان جیایە، لە خوێنی ئاسایی).

---

١) بەڵام باسی تێرو تەسەل لەو بارەیەوە لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەدا هاتوە، لە كاتی تەفسیركردنی ئایەتی (١٤٥) لە سوورەتی (الأنعام)دا.

بۆیـە لـە سـوورەتی (الأنعـام)دا خـوا دەفـەرموێ: ﴿ أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا ﴿١٤٥﴾ ﴾، خـوێنی ڕژاو، هەروەهـا ئـەو خوێنەشـی کـە لـە نێـو ڕەگـی گۆشـت دایـەو لەگـەڵ ئێسـقان تێکـەڵ دەبـێ، ئەوەش دیارە چاوپۆشیی لـێدراوە.

٣- ﴿ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ ﴾، گۆشتی بەراز.

٤- ﴿ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ﴾، ئـەوەی بـۆ غـەیری خـوا سـەربڕاوە، واتـە: نـاوی غەیـری خوای لەسـەر هـاتوە.

ئـەوە چـوار، ئـەوانی دیکـە پێنجیـان دەچـنەوە نێـو مردارەوەبـوو، کـە بریـتیـن لـە:

٥- ﴿ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ ﴾، واتە: خنکێنراو، ئاژەڵـێك کە دەخنکێنـرێ، ئنجا مـەڕە، بزنـە، حوشترە، گایە، مانگایە، گامێشـە، کە هەموو ئەوانە ئەگـەر خنکـێنران، جـا بە غاز خنکێنران، لە ئاوێـدا خنکێنـران، بەخۆیـان ملیان بـە پەتێکـەوەبوو... هتد، بە هـەر شـێوەیەك لە شـێوەکان خنکێنران، ئەویش دیـارە مردارە.

٦- ﴿ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ ﴾، یانی: (الْمَضْـروبَة)، واتـە: لێدراو، ئاژەڵێك بـە دار لـێی بدەی، یان بە بەرد لێـی بدەی تا دەمرێ، ئەوەش بە مـردار لە قەڵەم دەدرێ.

٧- ﴿ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ ﴾، واتـە: هەڵـدێراو، ئاژەڵـێك لـە چیـاییەك دەبـێ، لـە شـوێنێکی بـەرز دەبـێ، بـە هـەر شـێوەیە بـێ، هەڵدێـرێ، وە بـە هـۆی هەڵدێرانەکـەیەوە دەمـرێ، ئەویش دیسـان بە مردار حیسـابە.

٨- ﴿ وَٱلنَّطِيحَةُ ﴾، واتە: قـۆچ لێدراو، ئاژەڵـێك قـۆچ لە ئاژەڵـێکی دیکـە بـدات، جـا گایە، مانگـایە، مـەڕە، بزنـە، نێـریی یـە، بەرانـە... هتـد، هـەرچی هەیـە، گرنگ ئەوەیە بە هۆی قۆچ لێـدرانەوە بمرێ، ئـەوەش بـە مـردار لەقەڵەم دەدرێو گۆشـتی ناخـورێ.

٩- ﴿ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ ﴾، واتە: ئەوەی کە دڕندە دەیخوات، جا ئەو دڕندەیە، گورگە، کەمتیارە، شێرە، پڵنگە، ورچە، کە بەشێکی لێ دەخوات، یاخود پارووپەکی لێ دەخواتو دوایی دەمرێ، ئەویش هەر بە مردار لەقەڵەم دەدرێ.

**ئەوانە هەر پێنجیان، پێنج جۆری مردارن، ئەوەی دەمێنێتەوە دووی کۆتایی یە:**

١٠- ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ ﴾، واتە: ئەوەی کە لەسەر بتو صەنەم، یاخود بەردی چەقێنراو سەردەبڕدرێ، کە دوایی باسی دەکەم یانی چی؟

١١- ﴿ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ﴾، واتە: ئەوە کە بە یانسیب بەش دەکرێ، ئەوانەش هەردووکیان دەچنەوە نێو ئەوەی کە بۆ غەیری خوا سەردەبڕدرێن، کەواتە: هەموویان هەر ئەو چوار جۆرەن.

**ئنجا ئایا حیکمەتی قەدەغەبوونی ئەو یازدە جۆرە ئاژەڵە چییە؟**

ئەوەیە کە لە ڕووی ماددییەوە پیسن، خوێنەکەیان لە بەدەن نەچۆتە دەرێ، کە شێوەکانی مردار هەموویان وان، وە خوێنیش کۆمەڵێك نەخۆشیی پێوەیە، یاخود لە ڕووی مەعنەوییەوە پیسن، چونکە ناوی خوایان لەسەر نەهێنراوە، واتە: پیسییەکەیان یان ماددیی، یان مەعنەوییە، یاخود هەم ماددیی و هەم مەعنەویی، هەردوو هۆیەکەی تێدا کۆدەبنەوە.

<u>**مەسەلەی چواردەیەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ ﴾، مەگەر ئەوەی سەرتان بڕیوە، (ذكاة)، واتە: سەربڕین، ئنجا ئێمە لە سێ خاڵاندا چەمکی ئەم ڕستەیە ڕوون دەکەینەوەو باسی سەربڕین دەکەین:

# باسێك لەبارەی سەربڕین (ذبح)ی ژیاندارانەوە

١) لێرەدا توێژەرەوانی قورئان دوو ڕایان هەن دەربارەی ئەم ڕستە موبارەكە: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾:

أ/ هەندێكیان دەڵێن: ئەو (إستثناء)ە، (إستثناء مُتَّصِل)ە، واتە: هەڵاوێردراو (مُستثنى) لە جینسی لێهەڵاوێردراو (مُستثنى منه)ە، یانی: پێنج جۆرە مردار، كە هەر یەكەیان بە شێوەیەك لە شێوەكان مردار دەبن، حەرامن مەگەر ئەوەی كە سەرتانبڕیوە، واتە: هەركام لەو پێنجانە ئەگەر چەقۆی فریا كەوتبوو، تیغی فریا كەوت، حەڵاڵە، ﴿وَٱلْمُنْخَنِقَةُ وَٱلْمَوْقُوذَةُ وَٱلْمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ﴾، واتە: هەركامیان ژیانی تێدا مابوو، كە سەربڕاو لینگە فرتەیەكی كرد، ئەوە حەڵاڵە.

ب/ هەندێكی دیكە دەڵێن: نەخێر، ئەو (إستثناء)ە، (إستثناء)ێكی (مُنْقَطِع)ە، (الإستثناء المُنْقَطِع)یش ئەوەیە كە هەڵاوێردراوەكە لە جینسی ئەو شتە نەبێ كە لێی هەڵداوێردرێ، واتە: (مُستثنى) لە جینسی (مُستَثنى مِنْهُ) نیەو لە یەك جیابن، واتە: لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ﴾، یانی ئەوانە هەموویان حەرامن، بەڵام ئەوەی كە سەری ببڕن حەڵاڵە، دیارە ئەو كاتە حوكمەكەی بە تەواویی دەگۆڕێ، چۆن؟

بۆ وێنە: ئاژەڵێك لەبەر خنكێنران بە عاستەم چەقۆی فریا دەكەوێ، یاخود هەڵێردراوەو چەقۆی فریا دەكەوێ، یاخود دڕندە لێی خواردووەو چەقۆی فریا دەكەوێ، پێش ئەوەی ژیانەكەی دەربچێ، یاخود قۆچی لێدراوە... هتد، بەپێی مانا لێكدانەوەی یەكەم بێ، ئەگەر (إستثناء)ەكە لە جۆری (الإستثناء المتصل)بێ، ئەوانە هەموویان حەڵاڵن، وە بەپێی مانا لێكدانەوەی دووەم بێ،

ئەگەر (إستثناء)ەكە (إستثناء مُنْقَطِع)بێ، ئەوانە حەرامن.

٢) ئنجا سەربڕین پێناسەی چۆنە لە شەرعدا؟

شەوكانیی لە تەفسیری خۆی (فتح القدیر)[1] ئەم پێناسەیەی هێناوە، دەڵێ: (والتَذكِيةُ فِي الشَّرْعِ: عِبَارَةٌ عَنْ إِنْهَارِ الدَّمِ وَفَرْيِ الأَوْدَاجِ فِي الْمَذْبُوحِ، وَالنحْرِ فِي الْمَنْحُورِ، وَالعَقرِ فِي غَيْرِ الْمَقْدُورِ، مَقْرُونًا بِالقَصْدِ لِلَّهِ وَذكرِ اسْمِهِ عَلَيْهِ) واتە: سەربڕین لە شەرعدا بریتییە لە خوێن لێهێنانی ئەو ئاژەڵە كە سەردەبڕدرێ، وە بڕینی دەمارەكانی (واتە: ئەو دەمارانەی كە لە دەوروبەری ملن‌و خوێن دێنن‌و دەبەن) لە ئاژەڵێكدا كە سەردەبڕدرێ، یاخود (نَحر) دەكرێ، {نەحر: هەر بەمانای سەربڕین دێ، بەڵام بۆ حوشتر بەكاردەهێنرێ، وە (ذَبح): بۆ ڕەشە وڵاخو ئاژەڵی وردو پەلەوەرو ئەوانە بەكاردێ}، وە هەروەها لاق بڕین‌و خوێن لێهێنان لە ئاژەڵێكدا كە دەستەڵاتت بەسەری دانییە، {نێچیرێك ڕاو دەكەی، تیری لێدەدەی، چەقۆی تێدەگری، یاخود حوشترێك شێت بووە لە خەڵك، یان گایەك كە بۆیان ناگیرێ، چۆنی سەربڕن؟ تیغێكی لێدەدەن، یان تفەنگێكی لێدەدەن، ئەوانە هەموویان مادام خوێنی لێ بێ، بە سەربڕین لەقەڵەم دەدرێن} بە مەرجێك ئەو سەربڕینە، وە ئەو بریندارکردنە، هاوكاتبێ لەگەڵ ئەوە كە ناوی خوای لەسەر بهێنرێ.

هەڵبەتە هەندێكیش دەڵێن: ناوی خوا لەسەر هێنان سوننەتە، وە هەندێكیش دەڵێن: فەرزە، بەڵام كەسێك بە ئانقەست ناوی خوای لەسەر نەهێنێ، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان ئەو شتە حەڵاڵ نیە بخورێ، چونكە بەئانقەست ناوی خوای لەسەر نەهێناوە، بەڵام ئەگەر بە لەبیرچوون بێ، زۆربەی زانایان بە ڕەوای دەزانن.

شایانی باسیشە باسی تێروتەسەلمان لەبارەی چۆنیەتی سەربڕین‌و حوكمی ناوی خوا لەسەر هێنانی سەربڕاوەوە لە بەرگی پێنجەمی ئەم تەفسیرەدا كردوە، لە كاتی تەفسیركردنی ئایەتەكانی (١١٨) و (١٢١) لە سوورەتی (الأنعام)دا.

٣) ئنجا دەربارەی ئامێری سەربڕین، كە ئایا دەبێ چۆن بێ؟

---

١) ج٢، ص١٤.

دیسان زانایان ئەوەشیان باس کردوە، شەوکانیی دەڵێ: زۆربەی زانایان دەڵێن: (كُلُّ مَا أَنْهَرَ الدَّمَ وَفَرِيَ الأَوْدَاجَ فَهُوَ آلَةٌ لِلذَّكَاةِ مَا خَلا السِّنَ وَالعَظْم)، واتە: هەر شتێك خوێنی لێ بێنێ، وە دەمارەكان ببڕێ، ئەوە ئامێرە بۆ سەربڕین، جگە لە ددانو نینۆك. ئەویش لەبەرئەوەی فەرموودەی (صحیح)ی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە هەیە، دەفەرمووێ: ﴿مَا أَنْهَرَ الدَّمَ، وَذُكِرَ اسْمُ اللّٰهِ، فَكُلْ لَيْسَ السِّنَّ وَالظُّفُرَ، وَسَأُحَدِّثُكَ أَمَّا السِّنُّ فَعَظْمٌ، وَأَمَّا الظُّفُرُ فَمُدَى الْحَبَشَةِ﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١٥٨٤٤)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٢٤٨٨)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٩٦٨)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٤٩١)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٤٤٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣١٧٨)، عَنْ رَافِعِ بْنِ خَدِيجٍ رضي الله عنه) واتە: هەر شتێك خوێن بێنێ لە ئاژەڵەكە، وە ناوی خواشی لەسەر بهێنری، بیخۆن، جگە لە ددانو نینۆك، وە ئێستا ئەوەتان بۆ ڕووندەكەمەوە: هەرچی ددانە بە ئێسقان لە قەڵەم دەدرێ، وە هەرچی نینۆكیشە ئەوە چەقۆی حەبەشییەكانە. (الْمُدَى: جَمْعُ مُدْيَةَ وَهِيَ الشَّفْرَةُ الكَبِيرَة) (مُدى) كۆی (مُدْيَة)یە، بریتییە لە چەقۆی گەورە.

**مەسەلەی پازدەیەم**: كە دەفەرمووێ: ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾، واتە: ئەوەی كە لەسەر بتو صەنەم، یاخود (نُصُب) سەردەبڕدرێ، ئێستا ئەوە ڕوون دەكەینەوە، كە مەبەست لە (نُصُب) چییە؟ (النُّصُبُ وَالنُّصْبُ، إمَا جَمْعٌ وَاحِدُهُ نِصَابٌ، كَكُتُب وَكِتَاب، أَو مُفْرد جَمْعُهُ أَنْصَاب، كَعُنُقٌ وَأَعنَاق، وقُفلُ وأقفَال، أَو جَمْعُ نَصِيبٍ، كَمَا قَالَ الرَّاغِبِ الأَصفَهَانِيُّ)، واتە: (نُصُب) یان كۆیە تاكەكەی بریتییە لە (نِصَابٌ)، وەك: (كُتُب وَكِتَاب)، (كُتُب) واتە: كتێبەكان، (كِتَاب) واتە: یەك كتێب، یاخود هەر بۆخۆی (نُصُب) تاكە، بەڵام بە چی كۆدەكرێتەوە؟ بە (أَنصَاب)، (والأزلَام والأنصَاب)، وە (عُنُقُ والأَعنَاق)، (قُفلُ والأقفَال)، یاخود (نُصُب) كۆی (نَصِيب)ە، وەك ڕاغیبی ئەسفەهانیی گوتوویەتی.

وە خاوەنی (محاسن التأويل)[1] دەڵێ: (وَفي القَامُوسِ وشَرحِهِ: النُّصُبُ، كُلُّ مَا نُصِبَ وَجُعِلَ عَلَماً وَكُلّ ما نُصِبَ فَعُبِدَ مِن دونِ اللّٰهِ تَعَالَى، والأَنصَابُ حِجَارَةٌ

---

١) محاسن التأويل ج:٦، ص ٣٩، ٤٠.

كَانَت حَوْلَ الكَعْبَةِ تُنْصَبُ فَيُهَلُّ عَلَيها وَيُذْبَحُ لِغَير اللهِ تَعَالى، وَقالَ القُتَيْبي: النُّصُبُ صَنَمٌ أَو حَجَرٌ، وَكَانَتِ الْجاهِلِيَّةِ تَنصِبُهُ وَتَذبَحُ عِنْدَهُ فَيَحمرُ بالدَّمِ وَمِنْهُ حَديث أبي ذَرٍ في إسلامهِ، كَمَا وَرَدَ في صَحيح مُسْلِم[1]: خَرَرْتُ مَغْشِيًّا عَلَيَّ ثُمَّ ارْتَفَعْتُ حِينَ ارْتَفَعْتُ كَأَنِّي نُصُبٌ أَحْمَرُ)، (جمال الدين القاسمي) دەڵێ: لە قامووس لە شەرحەكەیدا هاتوە، (نُصُب) هەر شتێكە كە بچەقێنرێ، (وەك بەردێك)، وە بكرێ بە نیشانە، وە هەر شتێك دابنرێو بپەرسترێ، كە ئەوان عادەتیان وابوو لە دەوروبەری كەعبە دایاندەنان‌و {عەرەبە بتپەرستەكان دوو جۆرە بتو صەنەمیان هەبوون، جۆرێكیان لەسەر شێوەی ئینسان، یان لەسەر شێوەی باڵندە دروستیان دەكرد، جۆرێكیشیان هیچ شێوەی نەبوو، هەر بەردێك بوو، دایان نابوو}، دەچوون ئاژەڵیان لە لایان سەردەبرین، دوایی خوێنەكەیان تێ هەڵدەسوون‌و سووریان دەكردن، بۆیە (قتیبی) دەڵێ: (نصب) صەنەمێكە، یاخود بەردێكە لە سەردەمی خەڵكی نەفامییدا دایان دەنا، دەیانچەقاند وە ئاژەڵیان لەلای سەردەبڕی، دوایی خوێنەكەیان تێ هەڵدەسوو و بە خوێن سوور دەچوو، وەك لە بەسەرهاتی ئەبو زەڕدا خوا لێی رازی بێ هاتوە كە بەسەرهاتی مسوڵمانبوونی خۆی دەگێڕێتەوە، لە سیاقی گێڕانەوەی بەسەرهاتەكەیدا دەڵێ: (خَرَرْتُ مَغْشِيًّا عَلَيَّ ثُمَّ ارْتَفَعْتُ حِينَ ارْتَفَعْتُ كَأَنِّي نُصُبٌ أَحْمَرُ) {باسی خۆی دەكات كە ئایەتی خوێندۆتەوە دوای كافرەكان زۆریان لێداوە، دەڵێ:} هێندەیان لێدام لە پەو ڕووكەوتم‌و لە هۆشی خۆم چووم، دوایی هەڵسامەوە وەك بەردی بە خوێن سووركراوم لێ هاتبوو، هێندەیان لێدام، هەموو لەشم لە خوێندا شەلاڵ بوو بوو، ئەوە لە صەحیحی موسلیمدا هاتوە.

كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾، یانی ئەو شتەی كە لەلای بەردێك، لە لای بتێك سەردەبڕدرێ‌و خوێنەكەشی لەو بتە یان بەردە هەڵدەسوورێ، ئەوەش دیارە خواردنی قەدەغەیە.

**مەسەلەی شازدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَسْتَقْسِمُوا۟ بِٱلْأَزْلَٰمِ﴾، واتە: ئەو

---

١) صَحيح مُسْلِم رقم: (١٣٢).

گۆشتەی کە دابەش بکەن بە (الأزلام) زەلەمەکان، (زَلَم) یان (زُلَم)، بە (الأزلام) کۆ دەبێتەوە، پێشتر باسمان کرد کە دارێك، تیرێکە، بەڵام نووکەکەی پێوە نیە، وە پەڕەکەشی پێوە نیە بۆ ئەوەی پێی بڕوا، بەکاریان دەهێنا بۆ دابەشکردنی شت، (٣) سێ بوون:

یەکێکیان لەسەری نووسرابوو (أَمَرَنِي رَبّي)، یەکێکیان لەسەری نووسرابوو (نَهَانِي رَبّي)، یەکێکیشیان هیچی لەسەر نەنووسرابوو، ئنجا کە گۆشتیان بەش دەکرد، یان لەسەر شتێك گرەویان دەکرد، بۆ وێنە: لەسەر ئاژەڵێك، ئاژەڵێکیان سەردەبڕی و دابەشیان دەکرد لەنێوان کۆمەڵە خەڵکێکدا دەچوونە لای کاهینێك، ئەو سێ دارەی دەکردنە توورەکەیەکەوەو دەیشەڵەقاندن، یەکێکی دەردەهێنا، ئەگەر لەسەری نووسرابا (أَمَرَنِي رَبّي) واتە: پەروەردگارم فەرمانی پێکردووم، دەیگوت: تۆ بردووتەوە، وە ئەگەر ئەوەی دیکەیان بووایەو لەسەری نووسرابا (نَهَانِي رَبّي) واتە: پەروەردگارم ڕێی لێگرتووم، دەیگوت: دۆڕاندت، وە ئەگەر ئەوەی سێیەمیان باو هیچی لەسەرنەبا، دەیگوت: دەبێ دووبارەی بکەمەوە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِ﴾ (الأزلام) واتە: زەلەمەکان، ئەو سێ دارە بوون، کە بەو شێوەیە شتیان پێ دابەش کردوون، وەك چۆن ئێستا دەڵێن: یانسیب، کە ئەویش حەرامە، کاتی خۆی بەو شێوە سادەیە کردوویانەو، ئێستا دیارە چەندان شێوەی ئاڵۆزی وەرگرتوون، بەپێی تەکنۆلۆجیای ئەم ڕۆژگارو سەردەمە کە هەموویان حەرامن، مادام بەو شێوەیە بێ و بێتەوە سەر بەختو شانس، کەواتە: ﴿وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِ﴾، (أَي: طَلَبُ القَسْمِ وَالحُكْمُ بِهَا) واتە: بە هۆی ئەو زەلەمانەوە دابەشکردنەکە بکرێ، (الأَزهَري) دەڵێ: (هُوَ طَلَبُ مَعرِفَةُ مَا قُسِمَ لَهُ مِنَ الخَيْرِ والشَّرِ ممَّا لَمْ يُقسَمُ لَهُ بِواسِطَةِ ضَرْبِ القِدَاح)(محاسن التأويل: ج٦، ص٤٠) دەڵێ: بریتیە لەوە کە تۆ بتەوێ بزانی لە خێرو شەڕ چیت بۆ دابەش کراوە، وە چیت بۆ دابەش نەکراوە، بە هۆی (قِدَاح)ەوە، کە کۆی (قِدْح)ە، وە ئەو دارەیە کە باسم کرد.

ئنجا لەبارەی (الأزلام)ەوە ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ هەیە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا دَخَلَ الكَعبَةَ أَبَى أَنْ يَدْخُلَ الْبَيْتَ وَجَدَ إِبْرَاهِيمَ

وَإِسْمَاعِيلَ مُصَوَّرِين وَفِي أَيْدِيهِمَا الأَزْلاَمُ، فَقَالَ: رَسُولُ اللهِ ﷺ: «قَاتَلَهُمُ اللهُ! وَاللهِ لَقَدْ عَلِمُوا مَا اسْتَقْسَمَا بِهَا قَطُّ» ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٠٩٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٦٤)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٢٩٢٠)}، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ کاتێك چووە نێو کەعبە (واتە: لە ساڵی هەشتەمی کۆچیی دا) کە چووە نێو کەعبە، ئامادە نەبوو بچێتە نێو بەیتی حەرام، چونکە ئیبراهیم‌و ئیسماعیلی بینی وێنەیان کێشرابوو لەسەر دیواری کەعبە، ئەزلامیان بەدەستەوە بوون، (واتە: ئەو سێ دارە)، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: خوا بیانکوژێ، (واتە: خوا هاوبەش بۆ خوادانەرەکان بکوژێ) سوێند بە خوا ئەوان دەزانن کە ئیبراهیم‌و ئیسماعیل هەرگیز شتیان بەو زەلەمانە دابەش نەکردوە! {چونکە حەرامە}، ئینجا ئەم ڕستە قورئانییە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قومارو، ئەستێرە گرتنەوەو ئەوەی پێی دەگوترێ (رَمَل) کە لەسەر لم خەت دەکێشن، وە قاوەگرتنەوەو لەپەدەست خوێندنەوەو (عیافة) واتە: باڵندە هەڵفڕاندن‌و (طيرة) واتە: ڕەشبینیی کەسێك پڕمی یان نەپڕمی، هەموو ئەوانە قەدەغەن‌و نابێ هیچ حیسابێکیان لەسەر بکرێ، لەو بارەشەوە فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ زۆرن، بۆ وێنە:

یەکەم: ﴿عَنْ قَطَنِ بْنِ قَبِيصَةَ عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «الْعِيَافَةُ وَالطَّرْقُ وَالطِّيَرَةُ مِنَ الْجِبْتِ» ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٦٢٢)، وَالطَّبَرَانيُّ برقم: (٩٤١)، وَالنَّسَائِيُّ في الكبرى برقم: (١١١٠٨)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (١٦٢٩٢)}، واتە: (قَطَنِ بْنِ قَبِيصَةَ) لە باوبیەوە دەگێڕێتەوە کە گوێی لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە فەرموویەتی: بێگومان باڵندە هەڵفڕاندن، (وَالطَّرْقُ) واتە: لەسەر زەوی خەت کێشان یان لەسەر لم، (وَالطِّيَرَةُ) وە ڕەشبینیی {بە هۆی پڕمینەوە، یان بە هۆی ئەوەوە کە شتێك بکەی بە نیشانە ئەگەر فلانکەس هات، ئەگەر ئافرەت هات، ئەگەر سەگێکی ڕەشت بینی، ئەگەر پشیلە هات، کە لە نێو هەندێ کۆمەڵگایاندا ئەو شتانەیان هەن}، ئەوانە لە (جِبْت)ن.

(جِبْت) یانی: بت پەرستیی، یان جۆرێکە لە بت پەرستی، بۆچی؟ چونکە تۆ دەتەوێ بەهۆی ئەو شتانەوە نادیار بزانی، نادیاریش هەر خوا دەیزانێ،

خـــوای بـــەرز دەفـــەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُ...(٦٥) ﴾النمل، واتـە: بلّێ نادیار لـە ئاسـمانەكانو زەویـدا جگـە لـە خـوا كـەس نایزانــێ.

ئنجـا ئایـا (عیافـة) چـۆنە؟ ئەوانـە ئەگـەر ویسـتبایان سـەفەرێك بكـەن، مامەڵەیـەك بكـەن، شـتێك بكـەن، چۆن بـزانن بیكـەن یـان نەیكـەن؟ دەچـوونە سـەر هێـلانەی باڵندەیـەك، كۆتربـا، كەوبـا، هـەر باڵـندەیەك بـا، هـەڵیان دەفرانـد، ئنجـا ئەگــەر بـە لای ڕاسـتدا فڕیبـایە، دەیـانگوت: (تیـامنوا)، واتـە: بەرەكەتـە، مـادام بـە لای ڕاسـتدا ڕۆیشـتوە، وە ئەگـەر بـە لای چـەپدا ڕۆیشـت بووایـە، دەیانگــوت: (تَشَـاءَموا) نەگبەتـە، دیـارە ئێسـتا قـاوە گرتنـەوە هەیـە، لەپەدەسـت خوێندنەوە هەیە، لەسەر لمو زەوی خەت كێشـانو شت هەیە، كـە مـەرج نیـە لـە نێو كوردەواریی خۆمانـدا ئەو شـتانە هـەبن، بـەڵام لـەنێو هەندێ گەلـی دیكـەدا هەن، ئەم قورئـانەش بۆ هـەموو گەلان هـاتوە.

دووەم: هـەروەها هـەر لەوبـارەوە، ئـەم فەرموودەیـەش هەیــە: ﴿عَـنْ بَعْـض أزوَاجِ النَّبِـيِّ ﷺ رَضِيَ اللهُ عَنْهُن، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: «مَنْ أتَـى عَرَّافاً فَسَأَلَهُ عنْ شَيْءٍ فَصَدَّقَهُ، لَمْ تُقْبَلْ لَهُ صَلَاةٌ أرْبَعِينَ يَوماً» ﴾ {أخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٥٧٨٢)}، واتـە: یــەكێك لــە هاوســەرانی بــەڕێزی پێغــەمبەر ﷺ خــوا لێیــان ڕازی بــێ لــە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتـەوە كە فەرموویـەتی: هـەر كەسێك بچـێ بـۆ لای فاڵچییەك (عَرَّافاً) (ئـەوەی ئیـددیعای ئـەوە دەكات كـە دەزانـێ سـبەینـێ، چـی ڕوودەدات، تـۆ چیــت لێــدێ، ئـەو شتە بكــەی باشــە، یـان خراپـە؟) وە پرسـیاری شــتێكی لــێ بكاتو بڕواشـی پـێ بكـات، ئـەوە نوێـژی چل ڕۆژی لــێ وەرناگیــرێ. بگـرە هـەر چـاكە كە یەكجاری كافریش نابـێ، چونكە لەڕاستیدا هەر كەسێك پێی وابـێ كە غـەیری خـوا غـەیب دەزانــێ، ئـەوە مانـای وایـە هاوبەشـی بـۆ خـوا دانــاوە، خـوا دەفـەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُ...(٦٥) ﴾النمل، واتە: بلّێ ئەوانـەی لـە ئاسـمانەكانو زەویـدان هیچـیان نادیــار نـازانن، جگــە لـە خـوا، تـۆ پێت وابـێ پیرەژنێـك، قاوەگرەوەیـەك، فاڵچـییەك، غـەیب دەزانـێ! مانـای

وایە سیفەتی خوات بۆ وی دانـاوەو ئـەوەش شیـركە، بـەلاٌم وا دیارە بـەس نوێـژی چل ڕۆژی لـێ وەرناگیـرێو ئەوە سـزاكەیەتی.

سـێیەم: هەر لـەوبارەوە ئـەم فەرموودەیـەش هەیـە: ﴿عَن أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: لاَ عَدْوَى وَلاَ طِيَرَةَ، وَيُعْجِبُنِي الْفَأْلُ، قَالُوا: وَمَا الْفَأْلُ قَالَ: كَلِمَةٌ طَيِّبَةٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٢٠٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٧٦)، عَنْ أبي هُرَيْرَة، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٢٢٤)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٣٩١٦)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٦١٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحيحٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٥٣٧)}، واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغـەمبەری خـوا ﷺ فـەرمووی: نەخۆشـی گرتنـەوە نیـە، ڕەش بینیـیو گـەش بینیـی نیـە، (بـە هـۆی باڵنـدەوە بـە هـۆی پـژمینو وێنەكانیانـەوە)، وە سەرسـامم بـە (فـأل) گوتیـان: (فـأل) چییـە؟ فـەرمووی: قسـەیەكی باشـە.

جا ئەوەتـان دەبـێ تۆزێك بـۆ شـی بكەمـەوە: كە دەفـەرموێ: (لاَ عَدْوَى) واتـە: نەخۆشـی گرتنـەوە نیـە، یـانی چـی؟ چونكە هـەر پێغەمبـەری خـوا ﷺ بۆخـۆی فەرموویـەتی: ﴿فِرَّ مِنَ الْمَجْذُومِ فِرَارَكَ مِنَ الأَسَدِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٧٢٠)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح}، واتە: لە گـەڕ ڕابكە وەك چۆن لە شـێر ڕادەكەی، ئەگەر شـێرت بـۆ بـێ ڕاناكـەی بۆئـەوەی نەتخـوا؟ ئـاوا خـۆت لە كەسـی گـەڕ دووربگـرە، (جُذام) گـەڕیی، گولـیی نەخۆشـییەكی پیسـی كوشـندەیە، ئێستا لەم سـەردەمو ڕۆژگـارەدا نیە، كەواتـە: كە دەفەرموێ: لێـی ڕابكـە! مانـای وایـە، لێـی دەگریەوە، لـەوێ وا دەفەرموێ، لێرەش وا دەفـەرموێ! بۆیـە ئەگـەر فەرمایشـتەكانی پێغـەمبەر ﷺ هـەر بـە سـەركێڵـیی تەماشـا بكـرێن هەندێكـیان تێكـدەگـیـرێن، بەلاٌم كە لێیـان وردبینـەوە ئەوجـار تێدەگـەین كە ئـەو فەرمایشـتانە تێكناگیرێن، پێغەمبەری خوا لە لایـەك دەفەرموێ: لە چـنگ گەڕ ڕابكـە، چونكە ئەگەر لە گـەڕ ڕابكـەی هـەر نەخۆشـییەكی دیكـەش مرۆڤ بیگرێتـەوەو درم بـێ دەبـێ لـەویش ڕابكـەی، بە قیاس لەسـەر ئـەو، لەوێـش دەفەرموێ لـێ گرتنـەوە نیـە، ئنجـا ئایـا ئەوە چۆنـە؟

زانایـان دەڵـێن: پێغەمبـەر ﷺ مەبەسـتی ئـەوە بـوو كـە ئـەو نەخۆشـییە بەبـێ

ئیرادەی خوا نەقڵ نابێ، لە نەخۆشەكەوە بۆ ساغەكە، چونكە كە پێغەمبەر ﷺ ئاوای فەرموو، گوتیان: ئەدی ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بۆچی حوشترێك خرو (جرب) دەیگرێ (خروو جۆرە دەردێكە تووشی حوشتر دەبێ)، دوایی ئەوانی دیكە لێی دەگرنەوە؟ فەرمووی: ئەدی كێ حوشتری یەكەمی تووشی ئەو نەخۆشیی خرووە كردوە؟ مانای وایە بەبێ ئیرادەی خوا نایگرێتەوە، مەبەستی پێ ئەوە بووە، ئەگەرنا هەر پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكدا دەفەرموێ: ﴿لاَ يُورِدَنَّ مُمْرِضٌ عَلَى مُصِحٍّ﴾ (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٢٥٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٧٧٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٧٥٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٩١١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٥٤١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١١٥) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ)، واتە: با حوشتری ساغ لەگەڵ هی نەخۆش تێكەڵ نەكرێ، بۆئەوەی لێی نەگرێتەوە، كەواتە: فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ دەبێ لێیان وردبینەوە، كە دەفەرموێ لێی ناگرێتەوە، واتە: بەبێ ئیرادەی خوا لێی ناگرێتەوە، پێت وابێ ئەو حوشترە هەر بۆخۆی ئەوەی دیكە تووش دەكات، یان میكرۆبەكە هەر لەخۆڕا تووشی دەبێ، ئەگەر خوا نەیەوێ تووش نابێ، بەڵام سوننەتی خوا وایە كە ساغو نەخۆش، نەخۆشی درم (مُعدي) لێك دەگرنەوە، كەواتە: تۆ دەبێ ڕەچاوی ئەوە بكەی كە هی ساغ لەگەڵ هی نەخۆش تێكەڵ نەكرێ، وە ئینسانی ساغ لەگەڵ ئینسانی نەخۆش، ئەو جۆرە نەخۆشیانەی دەگرنەوە، نەخۆشییەك كە ناگرێتەوە، بۆ وێنە: سەرەتانە، ئەو نەخۆشییانەی كە درم نینو نەقڵ نابن، لە كەسێكەوە بۆ كەسێكی دیكە، ئەوە خۆ لێپاراستنیان ناوێ.

ئەدی مەبەستی لە (فأل) چییە؟ مەبەستی لە گەشبینییە، پێغەمبەر ﷺ جاری وا هەبوو دەچوو بۆ شوێنێك كەسێكی دەبینی دەیفەرموو: ناوت چییە؟ پێی خۆش بوو ئەگەر گوتبای ناوم (رباح)ە، واتە: قازانج كردن، یان ناوم (یسار)ە، واتە: ئاسانیی، دەیفەروو: خوا سوودتان پێدەگەیەنێ، یان ئیشەكەتان بۆ ئاسان دەكات، بەڵام پێی ناخۆش بوو ئەگەر كەسێك ناوێكی خراپی بووبایە واتە: ناوێك كە مانایەكی خراپ بگەیەنێ، وە جاری وا هەبوو كە پێغەمبەر ﷺ هەندێ كەس ناوێكی هەبووایە مانای خراپی گەیاندبایە، ناوەكەی دەگۆڕی بە ناوێكی ئاسایی، بۆ وێنە: (بَرَّة) واتە: چاكەكار، ناوی ئافرەتانە، دوو سێ جار گۆڕیویەتی بۆ

(زەینەب)، وە هەروەها ناوی (عاصیة)ی گۆڕیوە بۆ (جمیلة)، (عاصیة) واتە: گوناهبار، (جمیلة)ش، واتە: جوان.

(إبن تیمیة) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (والعَرَّافُ اسْم لِلْكَاهِنِ والـمُنَجِّمِ والرَّمَالِ ونَحوهِم مِمَّنْ يَتَكَلَّمُ فِي مَعْرِفَةِ الأمُور بِهذِهِ الطرق)[1] پێناسەیەکی باشی (عراف) دەکات، دەڵێ: عەڕراف ناوە بۆ کاهین، (کاهین واتە: فاڵچیو کتێب گرەوە) ئەستێرەگرەوە، (ئێستا لە گۆڤارو ڕۆژنامەکاندا شت دەنووسن، ئەوە بەپێی ئەستێرەی فلان ئاوا دەبێو هەر کەسێك سەفەرێ بکات، وای لێ دێت، هەمووی درۆو دەلەسەیە، هیچی ئەسڵو ئەساسی نیە) وە لە گرەوەو (رمّال)، وە وێنەیان ئەوانەی کە قسە دەکەن دەربارەی زانینی نادیار (غیب) لەو ڕێیانەوە وشەی (عراف) هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، ئەدی ئینسانی مسوڵمان کە بیەوێ بزانێ کارێك بکات، یان نەیکات، چیمان هەیە؟ (الإستخارة)مان هەیە، واتە: ڕاوێژکردن بە خوا، پرس کردن بە خوا، کە خوایە تۆ ئەو شتەت پێ چاکە بیکەم، یان پێت خراپە نەیکەم؟ جا (الإستخارة) چۆنە؟ بەم شێوەیە: ﴿عَنْ جَابِرٍ رضي الله عنه قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُعَلِّمُنَا الإسْتِخَارَةَ فِي الأُمُورِ كَمَا يُعَلِّمُنَا السُّورَةَ مِنَ الْقُرْآنِ، يَقُولُ: إِذَا هَمَّ أَحَدُكُمْ بِالأَمْرِ، فَلْيَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ مِنْ غَيْرِ الفَرِيضَةِ، ثُمَّ لِيقل: اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ، وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ، وأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ العَظِيْمِ، فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلا أَقْدِرُ، وَتَعْلَمُ وَلا أَعْلَمُ، وَأَنْتَ عَلاَّمُ الْغُيُوبِ، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ خَيْرٌ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، أَوْ قَالَ: عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ، فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي، ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ، وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي، (أَوْ قَالَ): عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ؛ فَاصْرِفْهُ عَنِّي، وَاصْرِفْنِي عَنْهُ، وَاقْدُرْ لِي الخَيْرَ حَيْثُ كَانَ، ثُمَّ أَرْضِنِي بِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٢٠٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (١١٦٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٤٨٠)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٣٢٥٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٣٨٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٨٧)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري}، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ (کە هەردووکیان هاوەڵ بوون) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ

١) محاسن التأويل: ج٦، ص٤٣.

ئیستیخارەی لە ئیشوكاردا فێر دەكردین وەك چۆن سوورەتێكی لە قورئان فێر دەكردین، دەیفەموو: هەركامێك لە ئێوە ویستی كارێك بكات، (بەلام دیار نەبوو چاكە، یان خراپە، ئەمما كە شتەكە دیاربێ، بۆ وێنە: دەچی بۆ نوێژی جومعە، پێویست ناكات ئیستیخارەی بۆ بكەی، مانگی رەمەزان دێ، پێویست ناكات ئیستیخارەی بۆ بكەی، یان دەچی بۆ حەج، پێویست ناكات ئیستیخارەی بۆ بكەی، سەردانی نەخۆشێك دەكەی، ئەوانە ئیستیخارەیان ناوێ، چونكە ئەوانە خێرەكەیان دیارە، بەلام سەوداو مامەڵەیەك دەكەی، دەتەوێ ژنێ بینی، دەتەوێ مامەڵەیەك بكەیو لەگەڵ كەسێك تێكەڵ بی، یان سەفەرێك دەكەی، نازانی بچی، نەچی، خێرە شەرە؟ ئیستیخارە بۆ ئەو جۆرە كارانەیە)، با دوو ركات بكات جگە لە نوێژی فەرز، (واتە: نوێژی فەرز نەبێ كە نوێژی بەیانی بێ، یان نوێژی نیوەرۆ، بەڵكو با دوو ركاتی سوننەت بەتایبەت بۆ ئەو مەبەستە بكات) دوایی بڵێ: ئەی خوایە! من بە زانیاریی خۆت داوای چاكەت لێ دەكەم، وە بە دەستەڵاتی خۆت داوای توانات لێ دەكەم، وە لە بەخششی مەزنی خۆت داوات لێ دەكەم، چونكە تۆ دەتوانیو، من ناتوانم، وە تۆ دەزانیو من نازانم، وە تۆ زانای هەموو نهێنیەكانی، ئەی خوایە! ئەگەر دەزانی ئەم كارەم (وە لەو كاتەدا ناوی كارەكەی دێنی بۆ وێنە: دەڵێ: ئەم سەفەرەم، ئەم سەودایەم، ئەم بازرگانییەم)، بۆ من چاكە، بۆ دینمو بۆ دنیامو بۆ ژیانمو بۆ دوارۆژم، یاخود فەرمووی: ژیانی زوو تێپەڕمو دواییم، ئەوە بۆمی بڕیار بدەو بۆم ئاسان بكە، وە دوایی بەرەكەتی بۆ من تێبخە، وە ئەگەر دەزانی ئەو كارە بۆ دینمو دنیام، وە بۆ ژیانو گوزەرانم، وە بۆ سەرەنجامی كارم خراپە، ئەوە منی لێ لابدەو ئەویش لە من لابدە، وە پاشان هەر خێرو چاكەیەك كە بۆخۆت پێت باشە بۆم بڕیار بدەو منیشی پێ ڕازی بكە. كەواتە: مسوڵمانان بۆ كردنو نەكردنی هەر كارێك ئیستیخارەیان هەیەو ئەو شتانەی دیكە هەموویان هی نامسوڵمانانو شتی پووچو ئەفسانەییشن.

<u>**مەسەلەی حەقدەیەم:**</u> كە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكُمْ فِسْقٌ ﴾، ئا ئەوەتان فیسقە، (فِسق) واتە: لە ڕێی دەرچوون، یانی مایەی فاسیق بوونە، كە ئینسان وەختێك فاسیق دەبێ شایەدیی لێ وەرناگیرێ، وە ئینسان بە گوناهی گەورە نەبێ فاسیق

نابێ، گوناهی گەورەش هەر گوناهێكە كە سزای دنیایی لەسەربێ، یاخود هەڕەشەی قیامەتیی لەسەربێ، وەك پێشتریش باسمان كردوە، دەگونجێ لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌ﴾، مەبەستی پێی ئەوەبێ كە هەر كەسێك لەو یازدە (١١) جۆرە گۆشتە كە قەدەغە كراون، بخوات، ئەوە (فیسق)ەو، گوناهبارییەو، لە ڕێ دەرچوونە، وە دەشگونجێ مەبەستی ئەوەی دوایيان بێ، كە دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌ﴾، كە شت دابەش دەكەن بە هۆی زەلەمەكانەوە، ئەوەتان (فسق)ە، بۆچی؟ چونكە ئەوە لەڕاستیدا جۆرێكە لە هەوڵدان بۆ زانیاری غەیب لە ڕێیەكی ناشەرعییەوە، كە ئەوەش ئینسانی پێ فاسیق دەبێ، وە سزایەكەی گەورەترە لە گوناهەكانی دی، وەك خواردنی گۆشتی بەرازو مردارەوەبوو و خوێنو سەربڕاو بۆ غەیری خوا، لەوانەش گەورەترە بۆچی؟ چونكە ئەوە زیان بە عەقیدە دەگەیەنێو پێچەوانەی خوا بەیەكگرتن (توحید)ە.

**مەسەلەی هەژدەیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ﴾، ئەم ڕستەیە كە لە ئایەتی سێی سووڕەتی (المائدة) دایە، واتە: ئەمڕۆ ئەوانەی بێبڕوان لە ئایینەكەی ئێوە نائومێد بوون، لێيان مەترسێنو لە من بترسێن، كە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ﴾، واتە: ئەمڕۆ، بەڵام مەبەستی لە یەك ڕۆژی تایبەت نیە، بڵێ: ئەم ڕۆژە، واتە: ڕۆژێكی دیاریكراو، هەرچەندە ئەو ڕۆژە ڕۆژی ڕاوەستان بووە لە عەرەفاتو ڕۆژی جومعەش بووە، كە پێغەمبەر ﷺ وتارێكی بە گشتی داوە بۆ مسوڵمانان كە لە خزمەتیدا حەجیان كردوە، كە هەندێك دەڵێن: لەو كاتەدا ژمارەی هاوەڵانی بەڕێز سەد هەزار كەس بووە، هەندێك دەڵێن: سەدو بیست هەزار كەس بووە، بەڵام مەبەستم وشەی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ﴾ە، كە بە مانای لەم ڕۆژگارەدا، لەم ماوە زەمەنییەدا دێ، ئیدی مەرج نیە تەنیا ڕۆژێكی گرتبێتەوە، واتە: لەو ماوەیەدا، ئەو ماوەیە كە ئایەتەكانی تێدا هاتوونە خوارێ،

ئەوانەی بێبڕوان لە ئایینەکەی ئێوە نائومێد بوون، کە دەفەرموێ: ﴿ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ ﴾، ئەویش دوو واتای هەن:

أ/ واتە: نائومێدبوون کە هەڵیبوەشێننەوە، وە بگەڕێنەوە بۆ خواردنی ئەو شتانەی کە قەدەغەکراون، ئەو شتانەی پیسن، وەك: خوێنو مردارەوەبووو، گۆشتی بەرازو ... هتد، ئەوە واتایەکی، یانی: ئەمڕۆ ئەو ئایینو بەرنامەیەی ئێوە، ئەو حەڵاڵو حەرامەی ئێوە کە خوا ﷻ بۆی دیاریکردوون، وا چەسپیوە جارێکی دیکە بە ئەهلی کوفر هەڵناوەشێتەوە.

ب/ واتایەکی دیکەی ئەوەیە: کە ئەوانە نائومێد بوون لەوەی کە بەسەر دینەکەتاندا زاڵ بن، وە ئەو ئیسلامە کە خوا ﷻ ناردوویەتە خوار چەسپیوەو ناتوانن بەسەریدا زاڵ بن، واتە: ناتوانن بەسەر مسوڵمانانو بەسەر قەوارە سیاسییەکەیاندا زاڵ ببن، لەبەرئەوەی کە دەسەڵاتێکی تەواوی پەیداکردوە، وە دەشگونجێ هەردوو واتایەکە لە یەك کاتدا مەبەست بن.

**مەسەلەی نۆزدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ﴾، دیسان خوای پەروەردگار وشەی: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ ﴾، واتە: ئەمڕۆ، دووبارە دەکاتەوە، بە مانای لەو ماوە زەمەنییەدا، ئنجا خوا سێ شتان دەفەرموێ:

یەکەم: ئایینەکەتانم بۆ تەواو کردن.

دووەم: نیعمەتی خۆمم لەسەرتان تەواو کردوە.

سێیەم: وە ئیسلامیشم بۆ بە بەرنامە پەسند کردوون.

کەواتە: سێ شتن، تەواوکردنی ئایین، تەواوکردنی نیعمەت، وە هەڵبژاردنی ئیسلام بە بەرنامە، سەرەتا دەڵێین: ئەم ئایەتە وەك لە پێناسەی ئەم سوورەتەشدا باسمان کرد، بگرە هەندێ دەڵێن: سوورەتەکەش هەمووی، بەڵام ڕەنگە ئەگەر هەموو سوورەتەکەش نەبووبێ، ئەم ئایەتەو زۆر لە ئایەتەکانی سووڕەتی

(المائدة) لە ڕۆژی ڕاوەستان لە عەرەفات وە لە ساڵی دەیەمی کۆچیی دا کە پێغەمبەر ﷺ یەکەمین و دوایەمین حەجی کرد هاتوونە خوار، کە حەجەکەیان ناولێنا (حجة الوداع)، واتە: حەجی ماڵئاوایی، کە دیارە ئەو کاتە ئەو ناوەی لێ نەنراوە، بەڵکو دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ ناوی لێنراوە حەجی ماڵئاوایی، چونکە ئەو کاتە نەیانزانیوە کە ماڵئاوایی لە دنیایی دەکات، بەڵام پێغەمبەر ﷺ لە وتارەکەیدا ئاماژەیەکی پێداوە، ﴿لَعَلِّي لاَ أَلْقَاكُمْ بَعْدَ عَامِي هَذَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٥٩٣)، وَابْنُ مَاجَه برقم: (٣٠٢٣)، وَالدَّارمِيُّ برقم: (٢٢٧)، وَالطَّبرانيُّ فِي (الكبير) برقم: (٧٧٧)، قَالَ حسين سليم أسد: إسناده حسن، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: ڕەنگە لە دوای ئەم ساڵەوە پێتان نەگەمەوە، واتە: ئاماژەیەك دەكات كە كۆچی دوایی دەكات، جا لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە: ﴿عَنْ طَارِقِ بْنِ شِهَابٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ مِنَ الْيَهُودِ إِلَى عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ آيَةً فِي كِتَابِكُمْ لَوْ عَلَيْنَا مَعْشَرَ الْيَهُودِ، نَزَلَتْ لاتَّخَذْنَا ذَلِكَ الْيَوْمَ عِيدًا، قَالَ: وَأَيُّ آيَةٍ هِيَ؟ قَالَ: قَوْلُهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾، قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ وَاللهِ إِنِّي لأَعْلَمُ الْيَوْمَ الَّذِي نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ وَالسَّاعَةَ الَّتِي نَزَلَتْ فِيهَا عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ: عَشِيَّةَ عَرَفَةَ فِي يَوْمِ الْجُمُعَةِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٤٤١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٤٣) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٠١٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٨٥)}، واتە: طاریقی کوڕی شیهاب دەڵێ: پیاوێك لە جوولەكەكان هاتە لای عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، (کە ئەو کاتە دیارە گەورەی ئیمانداران و خەلیفەی مسوڵمانان بووە)، گوتی: ئەی گەورەی ئیمانداران! ئێوە ئایەتێك دەخوێننەوە لە كتێبەكەتاندا، كە ئەگەر بۆ سەر ئێمەی جوولەكە هاتبایە خوار، ئەو ڕۆژەمان دەكردە جەژن، پێی گوت: كامە ئایەتە؟ گوتی: ئەو قسەیەی خوا كە دەفەرموێ: ئەمڕۆ ئایینەكەتانم بۆ تەواوكردن و چاكەی خۆم بە تەواویی لەگەڵ كردن، وە ئیسلامم بۆ بە بەرنامە پەسند كردوون، عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: سوێند بە خوا من ئەو ڕۆژە دەزانم كە ئەو ئایەتە دابەزییە سەر پێغەمبەر ﷺ: وە ئەو سەعاتەش كە تێیدا دابەزییە سەر

پێغەمبەری خوا ﷺ، ئێوارەی رۆژی عەرەفە لە رۆژی جومعەدا بوو {کە ئەوان دەڵێن: (عَشيَّة) واتە: دوای نیوەڕۆ، بۆ زانیارییتان (بُكرةً وَعَشيَّة) کە (بُكرَةً) پێش نیوەڕۆیە، مەرج نیە ئیللا بەیانییەکەی بێ، (عَشيَّة)یەش دوای نیوەڕۆیە، یانی کاتێك خۆر لە نێوەڕاستی ئاسمان لادەدا عەرەب پێی دەڵێن: (عَشيَّة) مەرج نیە، ئیللا کەوتبێتە لای عیشایە، چونکە راوەستان لە عەرەفات لە دوای نیوەڕۆیە تاکو رۆژ ئاوا دەبێ}.

## وردبوونەوەیەك لە رستەی (ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ...)

ئنجا با تۆزێ لەو سێ وشەیە وردبینەوە، کە دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾، یانی چی؟ زانایان سێ واتایان لێداونەوە، کە دەگونجێ هەرسێکیان لە یەك کاتدا مەبەست بن:

مانای یەکەمی: واتە: تەواوکردنی یاساکانی و فەرزەکانی بە شێوەیەك کە لە دوای وی هیچ حوکم و یاسایەکی دیکە، هیچ حەڵاڵ و حەرامی دیکە دانەبەزن، لەوبارەوە عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لە خۆی و بابی رازی بێ، دەڵێ: (لَمْ يَنزِلْ بَعْدَ هَذِهِ الآيةَ حَلالٌ وَلا حَرَامٌ) واتە: لە دوای ئەم ئایەتە هیچ ئایەتی دیکە دانەبەزیوون کە باسی حەڵاڵ و حەرامیان تێدابێ، ئەوە واتایەکی.

مانای دووەمی: واتە: لەوەو دوا شوێنەکانی حەج تێداکردن بۆ مسوڵمانان تەرخان دەکرێن، چۆڵ دەبن، وە تەنیا پێغەمبەری خوا ﷺ و مسوڵمانان حەج دەکەن، واتە: ئەو شوێنانەی کە مەناسیکی حەجیان تێدا دەکرێن، چونکە پێشتر هاوبەش بۆ خوادانەرەکانیش بەشداریی مسوڵمانانیان دەکرد لە حەجدا، بەڵام دوایی خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوار: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ فَلَا يَقۡرَبُواْ ٱلۡمَسۡجِدَ ٱلۡحَرَامَ بَعۡدَ عَامِهِمۡ هَٰذَا...﴿٢٨﴾﴾ التوبة، واتە: ئەی ئیمانداریینە! بێگومان موشریکەکان پیسن، (واتە: لە رووی

مەعنەوییەوە پیسن) لەم ساڵ بە دواوە نابێ توخنی مزگەوتی حەڕام بکەون، وەك پێشتر باسمان کرد.

مانای سێیەمی: واتە: خوا ﷻ دوژمنی لە کۆڵ کردوونەوە، وە وایکردوە کە مسوڵمانان بالآدەست بن، وەك چۆن پادشایەك، دەستەڵاتدارێك دەڵێ: (اليَوْمَ كَمُلَ لَنَا المُلْكُ) واتە: ئەمڕۆ دەستەڵاتو حوكمڕانیی ئێمە تەواو بووە، ئەوە كاتێك دەستەڵاتی بەسەر هەموو شوێنێكدا هەبێ، كەواتە: دەگونجێ مەبەست لە تەواو كردنی ئەوەبێ، وە دەشگونجێ مەبەست پێی هەرسێكیان بێ بەیەكەوە، ئنجا یەكێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا لە پێش ئەو ڕۆژەو ئەو كاتەدا، یانی پێش ئەوەی ئەم ئایەتە دابەزێ، دینی خوا ناتەواو بووە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾، ئەمڕۆ بەرنامەو ئایینەكەتانم بۆ تەواو كردوون، ئایا پێشی ناتەواو بووە؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: كە بە نسبەت پێشی تەواو بووە، بەڵام بە نسبەت كۆتا قۆناغی تەواو نەبووەو ماویەتی، بەڵام بە نسبەت قۆناغی خۆیەوە تەواو بووە، واتە: لە هەر كام لە قۆناغەكاندا كە دینداریی كراوە، تەواو بووە، ئەو دینداریییەی كە كراوە تەواو بووە، چونكە لێرەدا مەبەست ئەوەیە كە ئایا ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی كە شەهید بوون پێش ماڵئاوایی (حَجَّةُ الوَدَاعِ)و وەفاتیان فەرمووە، ئایا لەبەر ئەوەی دینەكە تەواو نەكراوە، دینداریییەكەیان ناتەواو بووە؟ بێگومان نەخێر، چونكە خوای بەرز تا ئەو كاتە بۆ وێنە: جەنگی بەدر، تەنیا ئەوەندە ئایەتەی ناردوونە خوار، وە مادام مسوڵمانان بەو ئایەتانەوە پابەند بوونو بەو حوكمانەوە پابەند بوون، كەواتە: دینداریییەكەیان تەواو بووە، بە نسبەت سەردەمی خۆیانەوە، وە بە نسبەت دوای خۆیانەوە كە موكەللەف نەكراون، چونكە جارێ ئەو ئایەتانە نەهاتوونە خوارێ، ئەو حوكمانە نەهاتوونە خوارێ، دیسان دینداریییەكەیان بە ناتەواو دانانرێ، واتە: چ بە نسبەت دوای خۆیانەوەو، چ بە نسبەت سەردەمی خۆشیانەوە، دینداریییەكەیان بە تەواو دادەنرێ.

ئنجا بەنسبەت ئەو ڕستەیەوە كە دەفەرموێ: ﴿وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي﴾، ئەویش دیسان سێ واتای لێوەردەگیرێن:

مانـای یەكـەمی/ واتـە: دیـنو شـــەریعەتم بـۆ تـەواو كـردوون، بـە تـەواویی حـەڵاڵو حەرامـەكان هـەموو دابـەزێنراون، كـە دیـارە هـیچ نیعمـەتێكیش لـە نیعمـەتی ئیسـلام گـەورەتر نیـە، یـانی: كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي ﴾، واتـە: مەبەست پێی نیعمەتی ئیسلامە، كە شـەریعەت تـەواو بـووەو یاساو حوكمەكـان هەموویـان دابەزیوون.

مانـای دووەمـی/ ئیسـلام تـەواو باڵادەسـت بـووەو مەككـە ئـازاد كـراوە، دەسـتەڵاتی ئیسلام هەموو شـوێنەكانی گرتۆتەوە، واتە: نیوە دوورگەی عەرەبی.

مانـای سـێیەمی/ ئـەو بەڵێنـەی كـە خـوا پێـی داون كـە لـە سـوورەتی (البقـرة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلِأُتِمَّ نِعۡمَتِي عَلَيۡكُمۡ ١٥٠ ﴾، بۆ ئەوەی چاكـەی خـۆم لەسەر ئێوە تـەواو بكـەم، ئـەو بەڵـێنەی بـۆ هێناونـە دی، وە ئـەو نیعمـەتو چـاكەیەی بەسـەردا تـەواوكردوون كە بریتـی بـووە، لـەوەی بۆخۆیان لەسەر پێی خۆیان بووەسـتنو خـاوەنی بڕیـاری خۆیـان بـن، لـە ژێـر هەیمەنـەو دەسـتەڵاتی كەسـدا نەبـنو، ئەو ناوچـانە هەموویـان بخـەنە ژێر ڕكێفی ئیسـلامەوە.

وە بەنسبەت ئـەو ڕسـتەیەوە كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا ﴾، ئـەویش زانایـان ئاوایـان لێكداوەتـەوە، (إخْتَرته لكُم من بينَ الأديَان والإسلام كَانَ مَرضـياً للّٰهِ مُنذ القـدم ولكن الـمعنيَّ بِهِ فـي الآيـة الصـفة التي هو بها اليوم وهي نهاية الكمال والبلـوغ به أقصى الدرجـات)، واتە: لە نێـو بەرنامەكانـدا ئیسـلامم بـۆ هەڵبژاردوون، ئیسلامیش لەوەو پێش هەر جێگـەی ڕەزامەنـدیی خـواو پەسـند كـراو بووە لە لای خوا، بەڵام ئەدی مەبەسـت چییە كە دەفەرموێ: لـەو ڕۆژەدا ئیسـلامم بە بەرنامە بۆ پەسند كردوون؟ واتە: بەو سیفەتەی ئێسـتا لـە سەریەتی كە هەموو شــەریعەت دابــەزیوە، هــەموو حــەڵاڵو حەرامــەكان، هــەموو ئــەمرو نەهییــەكان دابەزیون، بەو سیفەتە بە تـەواویی جێگای ڕەزامەنـدیی خوایـە، واتـە: هـەر كەسـێك بەو سیفەتە ئیسـلام وەربگـرێو قبـووڵی بكـاتو پێـوەی پابەنـدبێ، ئـەوە مانـای وایـە دینێكـی تــەواوو پەســندكراوەو گەیشــتۆتە لووتكــەی پەســندیی لــە لای خــوای پــەروەردگار، وە هەڵبــژاردووەو تەبــەننیی كــردوە، لەوبــارەوەش ئــەم فەرموودەیــە

هەیـــە: ﴿عَـنْ جَـابِر بْـنِ عَبْـدِ اللهِ رضي الله عنه يَقُـولُ: سَـمِعْتُ رَسُـول اللهِ ﷺ يَقُـولُ: قَـالَ جبريـلُ (عَلَيْـهِ السَّـلاَم) يَقُـولُ: قَـالَ اللهُ تَعَـالَى: هَـذَا دِيـن ارتضـيتهُ لِنَفْسِـي وَلَـنْ يُصْلِحهُ إلاَّ السَّخَاءُ وَحُسْنُ الْخُلُقِ ألا فَأَكرِمُوهُ بِهِمَا مَا صَحِبْتُمُوهُ﴾ {أَخْرَجَهُ البَغَوي في تَفسيره، وَالطَّبَرَاني في (الأوسط) عن جابر، وبمعناه أيضاً عن عِمْرَان بْـنِ حُصَـين، وَذَكَـرَهُ الْمُنـذِرِي بصيغَة التضعيف في الترغيب والترهيب، وقال الـهيثمي: "رواه الطبراني، وفيه عمرو بن الحصين العقيلي، وهو متروك في (مجمع الزوائد)، وَقَال الألباني: باطل، (سلسلة الأحاديث الضعيفة) برقم: (٣٣١٧)}[١]، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: جبریل سەلامی لەسەر فەرموویەتی: خوای بەرز دەفەرمویٚ: ئەم دینەم بۆخۆم پەسند کردووەو هیچ شتێك شایستەی ئەم دینە نیە جگە لە سەخاوەتو ڕەوشتی بەرزو جوان، ئنجا ئێوە ڕێزی ئەم دینە بگرن، بە سەخاوەتو بە ڕەوشتی بەرزو جوان، هەتا هاوڕای بن و لەگەڵی دابن، واتە: ئەم دینە، ئەم ئیسلامەتییە، تەنیا سەخاوەتی لەگەڵ دەگونجێو ڕەوشتی بەرزو جوانی لەگەڵ دەگونجێ، کە سەخاوەتیش یەکێکە لە ڕەوشتە جوانەکان، بۆیە هەتا خۆتان بە مسوڵمان دابنێن، سەخی بن و ڕەوشت بەرزو جوان بن، بەوە ڕێز لە دینەکەتان دەنێن، واتە: چرووکیی و ڕەوشت دزێویی و ناقۆڵایی دینەکەتان ناشیرین دەکەن، وە ئەوە دەکاتە بێڕێزیی بەرانبەر بەو دینە کە خۆت بە شوێنکەوتووی دەزانی، کە پێچەوانەی ئەوەی دین فەرمانی پێدەکات لە تۆدا هەیە لە سیفەتی خراپ.

## وەڵامی پرسیارێکی گرنگ

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە کە خوا دەفەرموێ: دینم تەواو کردووە، نیعمەتی خۆم بە تەواویی بەسەردا ڕشتوون، وە ئیسلامم بە بەرنامە بۆ پەسند کردوون، باشە کوا خۆ ئەو ئایەتانەی کە لە قورئاندا هەن کە شەش هەزارو

١) ئەگەر لە ڕووی سەنەدیشەوە بێهێز بێ، بەڵام مانایەکەی ڕاستو بێ گرێیە، بۆیە هێشتمەوە.

دوو سەدو سیو شەش ئایەتن، وە فەرمایشتەكانی پێغەمبەر ﷺ، سنووردارن، ئنجا ئایا لە حاڵێكدا كە ئایەتەكانو فەرمایشتەكان سنووردارن، چۆن دەگونجێ یاساو بەرنامەو چارەسەری هەموو ئەو گرفتو كێشانە، لەو ئایەتو لەو فەرمایشتە سنووردارو ژمێردراوانە بهێندرێنە دەرێ؟ واتە: ئایەتەكان سنووردارنو ژمێردراون، بەڵام ڕووداوەكان بێ سنوورن، گرفتو كێشەكان بێ سنوورن، ئەو ئایەتە سنووردارانەو ئەو فەرمایشتە ژمێردراوانە چۆن فریای ئەو هەموو گۆڕانكارییو بەسەرهاتو شتانە دەكەون كە یاسای جۆراوجۆریان دەوێن؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: خوای كاربەجێ دینەكەی واداناوە كۆمەڵێكی زۆر یاسای تێدان، كە ئایەتو فەرمایشتەكان دەقیان لەسەر دەكەن، وە كۆمەڵێكی زۆریش یاسایان لێ هەڵدەهێنجرێن لە ڕێی قیاسەوە، وە لە ڕێی ئیجماعەوەو لەڕێی ئەو بنچینە شەرعییانەی وەك: (العـرف)و (الإسْتِصْحَابُ)و (الإسْتِحْسَانُ)و (الـمَصْلَحَة الـمُرسَلَة)و... هتد، كەواتە: قورئانو سوننەت بەشی هەموو بەشەریەت دەكەن، نەك تەنیا بە دەقی ئایەت، بەڵكو بەو هەڵهێنجرانی یاساو بنچینانەش كە لێیان هەڵدەهێنجرێن، بۆیەش زانایان ژمارەیەكی زۆر بنچینەیان دەرهێناون، كە پێیان دەگوترێ: (القَوَاعِدَ الشَّرْعِيَّة)، ئنجا ئەوانیش دیسان دوو جۆرن: (القَوَاعِدِ الفِقْهِية)، (القَوَاعِدِ الأصولية) كە دیارە هەر بنچینەیەكی شەرعیی دەگونجێ كۆمەڵێكی زۆر كێشەو گرفتی پێ چارەسەر بكرێن، وە دەگونجێ زۆر یاساو بڕیاری لێ دەربهێنرێن.

**مەسەلەی بیستەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، یەكێك بۆی هەیە بڵێ: باشە خوای بەرز لە نێو باسی حەڵاڵو حەرامی گۆشتو خواردنەكاندا، ئەوە چۆنە ئەو ئایەتەی هێناوە: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ ﴾ چونكە دوایی دێتەوە سەر باسی پێشێ، دەفەرموێ: ﴿ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، یانی: ئەو سێ ڕستەیەی

پێشەوە، وەك بڵێی بابەتێکی نەگونجاوبن لەگەڵ ئەو بابەتەدا کە باس دەکرێ، چونکە دوایی دێتەوە سەر باسی پێشێ‌و دەفەرموێ: هەر کەسێك لە برسێتییدا تێکگیراو ناچار بوو بێئەوەی مەبەستی پێ گوناهباریی بێ‌و بێئەوەی ئارەزووی خواردنی حەرامی هەبێ، ئەوە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، واتە: بۆی هەیە لەو یازدە جۆرە گۆشتەی کە باسمان کردن بخوات، کە لە ئەسڵدا لێی قەدەغەن، بەڵام ئەگەر لێیان نەخوات لە برسان بمرێ، جا بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە دەڵێین: هۆی بوونی ئەو سێ ڕستە لەم شوێنەدا ئەوەیە: کە خوای زاناو شارەزا دەیەوێ تێمانبگەیەنێ کە ئەو دینە تەواوە نوقتەی لەسەر پێت داناوەو بێگومان گرنگترین شتیش لە ژیانی بەشەردا بریتییە لە خواردن‌و خواردنەوەو حەڵاڵ‌و حەرام، حەڵاڵ‌و حەرام بە گشتی‌و خواردن‌و خواردنەوە بەتایبەت، چونکە ئەوە گرنگترین شتە لە ژیانی ئینساندا، ئینسان بەبێ خواردن‌و خواردنەوە ناژی، ئنجا مەسەلەی گۆشت‌و مامەڵەکردن لەگەڵ ئاژەڵ‌و پەرەوردا کە بەشی سەرەکی خواردن‌و خۆراك پێکدێنن، مەسەلەیەکی زۆر گرنگە، بۆیە خوا ﷻ خستوویەتە نێو ئەو ڕستەیە کە باسی تەواویی دین، وە تەواوی نیعمەتی خۆی، وە هەڵبژاردنی ئیسلام بە بەرنامەی خۆی دەکات، بۆیەش خستوویەتە نێو ئەوانەوە، تاکو بزانین کاتێك ئێمە بە تەواویی بە دوای ئیسلام دەکەوین، کە پابەندبین بە هەموو حەڵاڵ‌و حەرامەکانییەوە، چ لە بواری خواردن‌و خواردنەوەدا کە گرنگترین شتە لە ژیانی ئینساندا، وە چ لە بوارەکانی دیکەدا، وە باسی هاوسەرگیرییش دەکات، چونکە ئینسان بە دوو شتان ژیانی بەردەوام دەبێ، بە خواردن‌و خواردنەوە، پاشان بە هاوسەرگیریی، کە ئەوەی دووەمیان بۆ ئەوەیە کە ئینسان وەچەو نەوەی بەردەوام بێ، بۆیە خوا ﷻ ئەو سێ ڕستەیەی خستۆتە نێوان ئەو بابەتەوە، ئنجا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، هەر کەسێك تێگیراو ناچار بوو (مخمصة: واتە: برسێتی، أخمص: کەسێکە کە زگی بە پشتییەوە نووسابێتەوە لە برسان)، بێئەوەی کە ئارەزووی چووبێتە گۆشتی بەرازو بیکاتە بیانوو، یان کەیفی چووبێتە مردارەوە بوو، یان کەیفی چووبێتە خوێن، یان کەیفی چووبێتە خواردنی سەربڕاو بۆ غەیری خوا، کە هەر ئارەزووی لێ بێ‌و برسیەتی بکاتە بیانوو، نەخێر، بەڵکو هەر بە

جیددیی برسی بێو ئەگەر لێشی نەخوات بمرێ، ئەوە ئەگەر لە هەركام لەو یازدە جۆرانە بخوات، مادام تێگیرابێو ناچاربووبێ، خوا لەگەڵی لێبوردەو بە بەزەیی یە، ئنجا لەوبارەوە ئەم دوو فەرموودە هەن:

فەرمایشتی یەكەم: ﴿عَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ إِنَّ اَللّٰهَ يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَمَا يَكْرَهُ أَنْ تُؤْتَى مَعْصِيَتُهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٥٨٦٦)، اِبْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٩٥٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٧٤٢)، وَصَحَّحَهُ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء الغليل) برقم: (٥٦٤)}، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عومەر خوا لێیان رازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: بێگومان خوا حەز دەكات مۆڵەتی لێوەربگیرێن، وەك چۆن خوا پێی ناخۆشە سەرپێچیی بكرێ، بۆیە زانایان دەڵێن: دینداریی تەواوو تەقوا لەوەدا نیە كە ئینسان هەمیشە ئەوە بكات كە زەحمەتە، بۆ وێنە: كەسێك زۆر نەخۆشە، رۆژوونەگرتن مۆڵەتێكە كە خوا پێی داوە، كەچی بڵێ: نەخێر هەر بەڕۆژوو دەبم، چونكە تەقوا وایە!! نا مەرج نیە، یان كەسێك لە سەفەریە، سەفەرەكەی وایە كە ئەگەر رۆژوو نەشكێنێ، زۆر تووشی نارەحەتیی دەبێ، یاخود ئەو ئەركەی كە لەسەر شانیەتی لەو سەفەرەدا بۆی ئەنجام نادرێ، ئایا تەقوا وایە هەر بەڕۆژوو بێ؟ نا، بەڵكو تەقوا وایە بیشكێنێ، جارێك پێغەمبەری خوا ﷺ رەمەزان بوو لە سەفەرێكدا هەموو بەڕۆژوو بوون، دوایی فەرمووی: ئاوم بۆ بێنن، ئاویان بۆ هێنا، ئاوەكەی خواردەوە لەبەرچاوی هەمووان، بۆئەوەی بزانن بەڕۆژوو نیە، دوایی هەندێكیان هەر بەڕۆژوو بوون، هەواڵیان پێدا گوتیان: ئەوانە هەر رۆژوویان نەشكاندوەو زۆریش هیلاك بوو ون، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿أُولَئِكَ الْعُصَاةُ أُولَئِكَ الْعُصَاةُ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ (٢٦٠٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٧١٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٢٦٣)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٢٠١٩) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٧٠٦)، عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتە: ئەوانە سەرپێچیی كارن، ئەوانە سەرپێچیی كارن، جارێكی دیكە لە سەفەرێكی دیكەدا دیارە رەمەزان نەبووە، هاوەڵان هەندێكیان بەڕۆژوو بوون، هەندێكیان بەڕۆژوو نەبوون، بەڵام رۆژووی سوننەت، ئەوانەی كە بەڕۆژوو نەبوون سێبەریان سازكرد بۆ ئەوانی دیكەو خواردنیان سازكردو ئیشو خزمەتی ئەوانی دیكەشیان كرد، چونكە ئەوانەی كە بەڕۆژوو بوون دیاربوو زۆر هیلاك بوون، تینوو بوون، زۆر گەرما بوو،

پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿ذَهَبَ الْمُفْطِرُونَ الْيَوْمَ بِالأَجْرِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بـرقم: (٢٨٩٠)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٢٦١٧)، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (٢٢٨٣)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٣٥٥٩) عَن أَنَسٍ ﷺ}، واتـە: ئـەمڕۆ ئەوانـەی بـێ ڕۆژوو بـوون، پاداشـتەکە هـەمووی بـۆ ئـەوان بـوو، واتـە: خێریـان زیـاتر گەیشـتێ لـە بەڕۆژووەکـان، چونکە خزمەتی وانیشیان کرد، مرۆڤ کە بەڕۆژوو بوو خزمەتی خۆشـی پـێ نـاکرێ لـە تینـوان، ئنجا لـە ڕاسـتیدا ئـەم مەسـەلەیە زۆر گرنگـە، زۆرجـار مسـولْمانان وادەزانـن ئیلـلا دەبـێ لای زەحمـەت بگـرن، پێیـان وایـە تەقـوا ئەوەیـە کـە لای زەحمـەتی بگـرن! نـەخێر، مـەرج نیـە، خـوا پێـی خۆشـە مۆڵەتەکانیشی لـێ وەربگیرێن، بـەڵکو جاری وایـە مۆڵەت وەرگرتنەکە پێویسـت دەبـێ، ئەگەر فەرزێك پـەکی لەسـەر بکـەوێ، بـۆ وێنـە: کـابرا دەچـێ بـۆ جـەنگ‌و بەڕۆژووشـە، ئەگـەر ڕۆژووەکـەی نەشـکێنـێ، جەنگەکـەی بـۆ نـاکرێ‌و دوژمـن زەفـەری پـێ دەبـات، ئـەوە لەسـەری فـەرزە بیشـکێنـێ، بۆچـی؟ چونکـە لـەو حاڵەتەدا جەنگ بردنەوەکە خێرترە لەڕۆژوو تەواو کردنەکە، ئەگەر جەنگـەکە بەرێتـەوە، هـەموو مسـولْمانان قـازانج دەکـەن، بـەڵام ئەگـەر ڕۆژووەکـەی تـەواو بکـات، بەس بۆ خۆی قازانجی کردوە، وە ڕەنگە بە هۆی تـەواوکردنی ڕۆژووەکەی خۆیـەوە زەرەر بـە مسـولْمانان بگـاتو، مسـولْمانان تـێ بشـکێن، وە ئەگـەر هەموویان بەڕۆژووبن پەکیان دەکەوێ، بەڵـێ دەبێ ئینسان چاك لە دین تێبگـات ئەوجـار دەتوانـێ بـە شێوەیەکی ڕاست پێوەی پابەندبـێ، بـەڵام ئـەوە هـەر بـە وشکە تەقوایی نابـێ، کەسی وا هەیـە یـەك ئایـەت دێنـێ، یـەك حـەدیس دێنـێ‌و تەنیـا ئاگـای لەیـەك لایـەن هەیـە، بـۆ وێنـە بـەس ئاگـای لـە ڕۆژووەکـە هەیـە، نەخێـر، دەبێ ئاگـات لە هەموو لایەنەکان هـەبێ.

فەرمایشتی دووەم: ﴿عَنْ اِبْنِ عُمَرَ ﷺ سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: مَنْ لَمْ يَقْبَلْ رُخْصَةَ اللهِ كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الإِثْمِ مِثْلَ جِبَالِ عَرَفَةَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بـرقم: (٥٣٩٢)، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسـناده ضـعيف، وَضَـعَّفَهُ الألبـاني فـي (السلسـلة الضـعيفة) رقـم: (١٩٤٩)}[1]، واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عومـەر خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: گـوێم لـێبوو پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەیفـەرموو: هـەر

١) ئەمیش ماناکەی ڕاسـتو تەواوە هەرچـەندە سـەنەدەکەی بێهـێزە.

کەسێك مۆڵەتی خوا وەرنەگرێ، هێندەی گوناح دەگاتێ بە قەد کێوی عەرەفات، ئەوە وا پێدەچێ لەگەڵ ئەو حاڵەتە بێ، کە من باسم کرد، کەسێك فەرزێکی گەورەی کەوتۆتە سەر شانو بە ڕۆژووشە، ئەگەر ڕۆژووەکەی تەواو بکات فەرزەکەی بۆ جێبەجێ ناکرێ، جا جەنگو جیهادە، کارو کەسابەتو ڕزقی حەڵاڵ پەیداکردنە بۆ ماڵو خێزان ... هتد، کە مەبەستم زیاتر ڕۆژووی سوننەت لەو حاڵەتەدا ئەگەر کەسێك مۆڵەتی خوا وەرنەگرێ، کە ئەرکێکی گەورەی شەرعیی پەکی لەسەری کەوتووە، وە بەبێ شکاندنی ڕۆژووەکانیش جێبەجێ ناکرێ، لەو حاڵەتەدا ئەگەر کابرا هەر نەیشکێنێ، ئەوە بە قەد کێوی عەرەفات گوناهی کەوتۆتە سەر شانی، با وا نەزانێ خێری زۆری گەیوەتێ.

وە بە نسبەت ئەو ڕستەیەوە کە دەفەرموێ: ﴿غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ﴾، لە سوورەتی (البقرة) دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ﴾، وە لە شوێنێکی دیکەشدا دەفەرموێ: ﴿غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ﴾، ئنجا ئەمە یانی چی؟ ﴿غَيۡرَ بَاغٖ﴾، واتە: ئارەزووی خواردنی نەبێو مەبەستی خواردن نەبێ ﴿وَلَا عَادٖ﴾، واتە: لە ئەندازەی پێویست تێنەپەڕێنێ، ئنجا خوا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ﴾، هەردووکی کۆکردوونەوە، مەیل نەکات بەلای گوناهدا، چ بە هۆی ئەوەوە کە ئارەزووی خواردنی حەرامی هەبێ، وە چ بە هۆی ئەوەوە کە تێیپەڕێنێ لەو ئەندازەی کە پەکی لەسەر کەوتوە، یانی: کە بە چوار پێنج پاروو لە مردنێ دەرباز دەبێ، نەچێ هەنگلانی لەسەر دابنێو تێر بخوات، یان بە ژەمێك دەربازی دەبێ، با نەچێ سێ ژەمانی لێبخوات، با تێنەپەڕێنێ با مۆڵەتیش بێ، وە با لەڕووی ئارەزووەو ڕەغبەتیشەوە لێی نەخوات، بەڵکو لە ڕووی ناچارییو پێویستی پێ بوونی تەواوەوە، لێی بخوات.

**مەسەلەی بیستو یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يَسۡـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمۡۖ قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ﴾، پرسیارت لێ دەکەن چییان بۆ حەڵاڵ کراوە؟ بفەرموو: شتە

خۆش و بەتام و بەسوودەکانتان بۆ حەڵاڵ کراون.

خوشك و برایانی خۆشەویست !

شەریعەت هەموو ئەو شتانەی کە خۆش و بە تامن، بەڵام بە سوودن، حەڵاڵی کردوون، وە هەموو ئەو شتانەی کە پیس و خراپ و زیانبەخشن، قەدەغەی کردوون، وەك فەرموویەتی: ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ...﴿١٥٧﴾﴾ الأعراف، هیچ شتێك نیە ئیسلام قەدەغەی کردبێ، پیس و زیان بەخش نەبێ، وە هیچ شتێك نیە ئیسلام حەڵاڵی کردبێ، چاك و سوودبەخش نەبێ، ئەوە بنچینەیە کە لێی بکۆڵنەوە، ئاوا دەردەچێ، لە سوورەتی (الأعراف) ئایەتی ژمارە (١٥٧)دا خوای پەروەردگار لە پێناسەی پێغەمبەردا ﷺ دەفەرموێ: ﴿...وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ...﴿١٥٧﴾﴾، واتە: هەرچی سوودبەخش و بەتام و خۆشە، بۆیان حەڵاڵ دەکات، وە هەرچی زیانبەخش و پیس و خراپە، لێیان قەدەغە دەکات، ئەگەر تەماشا بکەی هەموو ڕێپێدراوەکان لە شەریعەتدا چاك و سوودبەخشن، وە هەموو قەدەغەکراوەکان پیس و زیانبەخشن، جا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: وشەی (طَيِّبَات) واتە: حەڵاڵەکان، بەڵام ئەوە هەڵەیە، بۆچی؟ چونکە ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ﴾، ئەگەر مەبەست پێی حەڵاڵ بێ، یانی: (يُحِلُّ لَهُمُ الحَلال) حەڵاڵەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات، کە دیارە حەڵاڵ هەر حەڵاڵە، نا (طَيِّبَات) هەر وشەی (طَيِّب) لە زمانی عەرەبیدا، یانی: شتی خۆش، دەگوترێ: (صَوْتٌ طَيِّبَ) دەنگی خۆش، دەگوترێ: (رِيحٌ طَيِّبَ) بۆنی خۆش، دەگوترێ: (طَعَامُ طَيِّبَ) خواردنی خۆش، دەگوترێ: (أَرضُ طَيِّبَة) ئەرزێکی بە پیت، دەگوترێ: (شَخْصٌ طَيِّبَ) ئینسانێکی پاك و چاك، خوا فەرموویەتی: (الطَيِّبَاتُ للطَيِّبِين)، واتە: ئافرەتانی پاك و چاك بۆ پیاوانی پاك و چاکن.

**مەسەلەی بیست و دووەم:** دێتە سەر باسی ئەوە کە ئایا ئەو شتانەی پاك و چاك و سوودبەخشن لە خواردنەکان، چین؟ دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ﴾،

واتە: بڵێ: خواردنە چاكو خۆشەكانتان بۆ حەڵاڵ كراون، كەواتە: هەرچی لە ڕووی پزیشكییەوە، لە ڕووی زانستییەوە دەركەوت سوودبەخشەو بۆ مرۆڤ باشە، ئەوە ئاوی لێ مەخۆوەو حەڵاڵە، وە هەرچی دەركەوت كە زیانبەخشە، ئەوە دیارە كە حەرامە، بۆچی؟ چونكە خوای كاربەجێ لێرەدا بەگشتی فەرموویەتی: ﴿قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ﴾، بەڵام لە شوێنی دیكە باسی (خَبَائث)یش دەكات، دەفەرموێ: ﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ﴾، واتە: وە شتە خراپو زیانبەخشەكانیان لێ قەدەغە دەكات، ئنجا یەكێك لەو شتانەی كە سوودبەخشنو باشن، بریتیە لە گۆشتی نێچیری ڕاوكراو، بۆیە دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ ﴾، واتە: وە نێچیری ئەو نێچیرگرانەی كە فێرتان كردوون، بۆتان حەڵاڵ كراوە، لە حاڵێكدا لەوەی كە خوا فێری كردوون فێریان دەكەن، ئایا ئەمە مەبەست پێی چییە؟ لێرەدا زانایان دەڵێن: ﴿وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ ﴾، ڕاوكراو، نێچیری ئەو نێچیرگرانە، {نێچیرگر مەبەست پێی چ ئاژەڵ بێ، وەك: سەگو تاژیو پڵنگو شێرو گورگو...هتد، چ پەلەوەر بێ، وەك: باز، باشوو، خەرتەل، داڵاش... هتد، ئەگەر ئینسان مەشقیان پێ بكاتو فێری ڕاویان بكات، ئەگەر نێچیر بگرن، ئەو نێچیرە حەڵاڵە، واتە: هەر ئاژەڵو باڵندەیەك كە گۆشت خۆرە، ئەگەر ئینسان توانی تەعلیمی بداو مەشقی پێ بكات، كە نێچیری بۆ بگرێ نێچیرەكەی حەڵاڵە} خوا دەفەرموێ: نێچیری ئەوانەی كە فێرە ڕاوتان كردوون (مُكَلِّبِينَ) یانی: (مُعَلِّمِينَ) فێرە ڕاوتان كردوون، مەشقتان پێ كردوون، نێچیرەكانیان حەڵاڵن، وشەی (جَوَارِح) كۆی (جَارِحَة)یە، دیارە بە ئەندامەكانیش دەگوترێ: (جَوَارِح)، دەستو گوێو چاوو لاق هەركامێكیان پێی دەگوترێ (جَارِحَة) لەبەرئەوەی كە بەو دەستو لاقو چاوو زمانو ... هتد كردەوە ئەنجام دەدرێن، چونكە (جَارِحَة) بە مانای (كَاسِب) دێ، واتە: وەدەستهێنەر، وەك زانایان گوتوویانە: (الجَوارِحُ: الكواسِبُ مِن سِّباع البَهَائِمُ

والطَّير) (جَـوَارِح)، واتــە: نێچــيرگرەكان، لــە درِنـــدەی ئــاژەڵان، وە لــە درِنــدەی باڵـندانیش ئـەو باڵـندانەی کـە دەتـوانن ڕاو بکـەنو غەیـری خۆیـان دەخـۆن، گۆشتخـۆرن، (كَالْكَلْبِ والفَهْدِ والعُقَابِ والصّقرِ والبَازِي والشَّاهِين، لأنَّهَا تجرَحُ لأَهْلِهَا: أي تكسبُ لَهُمْ الوَاحِدَةَ جَارِحَة) وەك سەگو پڵنگو هەڵۆو باشـوو و باز، چونکە نێچیـر دەگرن بـۆ ئـەو نێچیـرگرانەی ڕاویان بۆ دەکەن، بەڵگەی قورئـانیش لەسەر ئـەوە کـە (جـرح) بـە مانـای (کسـب)ە، ئەوەیـە کـە خـوای پـەروەردگار لـە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ وَيَعْلَمُ مَا جَرَحْتُم بِٱلنَّهَارِ ﴿٦٠﴾ ﴾، خـوا دەزانـێ لـە ڕۆژگـاردا چیتان وەدەست هێنـاوە، (مَاجَرَحتُم يعني: كَسَبتُم)، (جارِح) واتـە: (كاسب) وەدەسـتهێنەر، (جوارِح) واتـە: ئـەو ئـاژەڵو پەرەوەرانـەی کـە بـۆ ڕاوکـردن بەکاردەهێنرێن، ئنجا ئەم ئایـەتە موبارەکە چەند شـتێکی لـێ وەردەگیـرێن:

یەکـەم: لـێی وەردەگیرێ کە ئـاژەڵو پەرەوەریش زانیارییان هـەیە، چونکـە خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ ﴾، ئـەو نێچیرگرانەی فێرتـان کـردوون، مـادام فێـرکراون، دیـارە عیلمیشـیان بـۆ پەیـدابووە، کـە بریتیـە لـە عیلمـی ڕاوکـردن.

دووەم: وە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە زانیاریی ئەگەر لـە سـەگێکیش دابـێ، ئەگەر لە بازو باشوویەکیش دابـێ، ئەگەر لە پڵنگو شێریکیش دابـێ، زانیـاریی پلـەی ئەو ئاژەڵو پەلەوەرە بەرزدەکاتەوە، ئایا ئەگەر سەگێك هەر لەخۆڕا نێچیـرێك بگرێ، حەڵاڵە، یـان حەرامـە؟ حەرامـە! بێگومـان ئـەدی ئەگـەر سـەگێك تـەعلیم درابـێو فێـری ڕاو کرابـێ، نێچیـر بگـرێ حەڵاڵـە؟ بەڵـێ حەڵاڵـە، بـە هـۆی عیلمەکەیـەوە نێچیـرەکەشی حەڵاڵـە، بـەڵام مـادام عیلمـی نـەبێو مەشـقی پـێ نـەکرابێو ڕانـەهێنرابێ، نێچیـرەکەشـی نـاخورێ، ئـەوەش لەبـەر پلـەو پایـەی زانسـتو شـارەزایی کـە زانسـت لـە ئاژەڵانیشـدا فەرق بـە نێچیرەکەیان دەکات، دیـارە کـە دەفـەرموێ:(مُكَلِّبِين) واتـە: (مُعَلِّمِين) (التكليب) واتـە: (التعليم) فێرکـردن، بەڵام مەبەسـت پێی فێری ڕاوکردنە.

دەربـارەی ڕاوكردنیش پێویسـتـە سـێ مەسـەلە بزانـین:

یەكـەم/ زۆربـەی هـەرە زۆری زانایان ڕایـان وایـە هـەر ژیـانداریك، فێـری ڕاوكـردن ببـێ، چ ئاژەڵ بـێ، چ پەڕەوەر، ئـەوە نێچیـرەكەی دەخـورێ، بـەڵام هەندێكیشـیان گوتوویانـە: تـەنیا سـەگ نێچیـرەكەی دەخـورێ، چونكـە خـوای بـێ هاوتـا دەفـەرموێ: (مُكَلِّبين) دەڵـێن: ئـەوەش لـە (كَلب)ەوە هـاتوە، بـەڵام لەڕاسـتیدا قسـەی زۆربـەی زانایـان ڕاسـتە، چـونكە خـوا وشـەی (جَوارِح)ی بەكـارهێناوە دەفەرموێ: ﴿وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ﴾، كەواتە: هەر شـتێك نێچیـر بریندار بكـات و بیگرێ بـۆ خاوەنەكـەی چ پـەڕەوەر بـێ، چ ئـاژەڵ، ئنجا سەگە، پڵـنگە، گورگە، ... هتد، هەرچی هەیە، مادام تەعلیم درابـێ، نێچیرەكەی دەخورێ.

دووەم/ زانایان لە پێناسەكردنی ئەو ئاژەڵـە، یاخود ئـەو پـەڕەوەرەی كـە ڕاوی پـێ دەكـرێ گوتوویانـە: (اتبـاعُ الصَّـید بإرسَـالِ صَاحِبِهِ وینزجـر بزَجـرهِ وینصـرف بدعائـهِ وَیُمْسِـكُ عَلَیْهِ الصَّیْد وَلایأكُل مِنْهُ)[١]، واتـە: بریتیـە لـەوەی كـە بـە قسـەی خاوەنەكـەی، بـە دوای نێچیـر بكـەوێ، وە بـە قسـەی خاوەنەكـەی وازی لـێبێنـێ، وە بـە قسـەی خاوەنەكـەی بـۆ وی بیگـرێ و لێشـی نـەخوات، كەواتـە: كەسێك كە تاژییەكـی هەیـە، یان بازێكـی هەیـەو لـە نێچیری بـەردەدا، بـەڵام تـا پێیگەیشـت نیوەی خوارد بـوو، ئـەوە دیـارە بـۆ ئـەوی نـەگرتوەو نێچیـرگر نیـە، چـونكە ئەگـەر نێچیـرگربێ برینـداری دەكـات، وە جـاری وایـە بـەهۆی برینداركردنەكەیـەوە ڕەنگـە ئـەو نێچیـرە بشـمرێ، كـە ئـەو كاتـە برینداركردنەكەی بە سـەربڕین دادەنرێ، بەڵام ئەگەر لـێی بخـوات مانای وایـە بۆ ئەوی نەگرتـوەو بۆخۆی گرتوویەتیو ئەو پێناسـەیەی بەسـەردا ناچەسـپێ.

سـێیەم/ زۆربەی زانایان ڕایـان وایە كە ئاژەڵو پەلەوەری ڕاوكـەر، ئەگـەر بەبـێ ئاگـاداری خاوەنیـان ڕاوی نێچیـر بكـەن، حـەڵاڵ نیـە بخـورێ، واتـە: كەسـێك تاژییـەكی هەیـە لـە خـۆڕا لـە كەروێشـكێك بـەر دەبـێ، ئایا خـاوەنەكەی بـۆی هەیـە لێی بخوات؟ زۆربـەیان دەڵـێن: بـۆی نیـە لێـی بخوات، هەندێكیشـیان كە

---

١) محاسن التأویل: ج٦، ص٦٠.

(الحَسَن البَصْرِي والزُّهري وَرَبيعَة ومَالِك والشافِعي في القديم)ن، دەڵێن: دروستە لێی بخوات، مادام لە ئەسڵدا ئەو ئاژەڵە نێچیرگرە فێری ڕاو بێ، با خاوەنەکەشی ئاگای لێ نەبووبێ، لە مامزێك بەربووە، لە کەروێشکێك بەربووە، یاخود بازەکەی کۆترێکی گرتووە، کەوێکی گرتووە، با خاوەنەکەشی ئاگای لێ نەبووبێ، مادام لە ئەسڵدا تەعلیم درابێ، دروستە لێی بخوات، کە منیش پێموایە قسەی ئەمانیش ڕاستە، ئنجا شەوکانیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆی (فتح القدير)دا، بەرپەرچی ئەمانەی دووەم دەداتەوەو دەڵێ: خوا دەفەرموێ: ﴿ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ ﴾، لەوە بخۆن کە بۆیان گرتوون، بەڵام من پێموایە شەوکانیی نەیپێکاوە، چونکە دەگونجێ ئەو نێچیرگرە نێچیرەکەش بگرێ بۆ خاوەنی، بێئەوەی ئەویش ناردبێتی، ئەو نەیناردوە، بەڵام دەگونجێ نێچیر بۆ خاوەنەکەشی بگرێو لێشی نەخوات، ئنجا کە لێی نەخوارد، مانای وایە بۆ وی گرتوویەتی، وە ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە دروستە ئاژەڵو پەلەوەرێك کە دەگونجێ فێری ڕاو بکرێن، لێیان بدرێ، چونکە ئەگەر لێیان نەدرێ، یان ئەگەر برسی نەکرێن، یان سزا نەدرێن، فێری ڕاو نابن، لەبەرئەوە ئەو ڕەفتارانە لەگەڵیان دروستن، چونکە ئازاردانی ئاژەڵ حەرامە، کە لە خۆڕا ئازاری بدەی، بەڵام بە مەبەستی ئەوەی فێری ڕاوی بکەی، دروستە، هەڵبەتە نەك وای لێبدەی لەبەر دەستتدا مرداربێتەوە، بەڵام دروستە بایی ئەوەندە کە فێرببێ چۆن لێی نەخوات؟ یان چۆن بچێ بۆ نێچیرو نێچیرەکەی بگرێ؟ بایی ئەوەندە ئازار بدرێ، دروستە.

**مەسەلەی بیستو سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ﴾، واتە: ئەو نێچیرانەی بۆ ئێوەیان دەگرن، لێیان بخۆن، وە ناوی خواشیان لەسەر بێنن، لێرەدا دوو شت بە مەرج گیراون، بۆ ئەوە کە دروست بێ ئینسان لە نێچیری ئەو نێچیرگرانە بخوات:

یەکـەم: دەبێ ئەو نێچیـرەیان بـۆ خاوەنەکەیان گرتبـێ، دووەم: دەبـێ نـاوی خوایـان لەسـەر بێـنن، جا دیـارە زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان دەڵـێن: نـاوی خـوا لەسـەر هێنانەکـە دەبێ پێشـێ بـێ، واتـە: کـە ئـەو نێچیـرگرە لـەو نێچیـرە بـەردەدا، ئینجا کە تاژییـە، سـەگە، گورگـە، پڵنگە، هەرچـی هەیـە، بـازە، باشـوویە، کە تێـی بەردەدا بڵێ: (بِسمِ اللّه) بە ناوی خواو ناوی خوای لەسەر بێنێ، بەنسبەت مەرجی یەکەمیـان: هەموو زانایان یاخـود زۆربـەیان لەسـەر ئـەوە یـەك دەنگـن، کـە ئەگەر نێچیـرگرەکە ئـەوەی کـە ڕاو دەکات، ئەگەر لێـی بخوات، مانـای وایـە بۆخـۆی گرتوویـەتی نـەك بـۆ خاوەنەکـەی، بۆیـە دروسـت نیـە لێـی بخـوات، ئەوکـاتە دەبـێ بـۆ وی لـێی گـەڕێ، بـەڵام دەبـێ بشـزانین زانایـان دەڵـێن: لـێ خواردنێك زیانی هەیە، کە پاش گرتنـی بـێ، واتـە: دوای ئـەوەی کـە گرتوویـەتیو لەبەردەسـتیدایە، وردە وردە لێی بخـوات، ئـەوە مانـای وایـە بۆخـۆی گرتوویـەتی، بەڵام لە کاتی گرتنیدا قەپاڵـتەیەکی لێبداو گازێکی لـێ بگـرێ، ئەگەر وانـەبێ بـۆی ناگیـرێ، یان ئەگـەر چـڕنووکێکی لێبـداو لێـی بپچـڕێ، ئـەوەش لـە پـێش گرتنیدا زیانی نیە، چونکە دیارە بە مەبەستی ئەوە بووە کە بیگـرێ، بـەڵام دوای ئەوەی کە دەیگرێ لەبەردەستی خۆی دادەنـێ، لێی بخوات، ئـەوە دیـارە بـۆ خـۆی گرتوویـەتیو بـۆ خاوەنەکـەی نـەگرتووەو دروسـت نیـە لێـی بخـوات، چـونکە ئایەتەکـە دەفـەرموێ: ﴿فَكُلُواْ مِمَّآ أَمۡسَكۡنَ عَلَيۡكُمۡ﴾، ئەوانـەی کـە بـۆ ئێوەیـان گرتوون بۆتان هەیـە لـێی بخـۆن.

# چوار ڕای زانایان لەبارەی (بسم اللە) کردنەوە لەسەر نێچیر



بەنسبەت دووەمیشیان: (بِسمِ اللّٰه)ی کردن لە نێچیر، ئەوە چوار ڕای زانایانی تێدا هەن، کە دیارە ئێمە ڕای چوارەممان پێ پەسندە:

١/ هەندێکیان دەڵێن: مەبەست لەوەیە لە کاتی لێ خواردنیدا ناوی خوای لێ بێنن، ئەوە نێچیرەکە ڕاوکراوەو هاتۆتە بەردەستی، سەری دەبڕیٚو دەیبرژێنی، جا لەکاتی خواردنیدا بڵێ: (بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) لەوکاتەدا، بەڵام لەڕاستیدا وەك شەوکانیی دەڵێ: ئەو قسەیە ڕاست نیە، چونکە ئایەتەکە لە باسی ڕاوکردنیدا دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ﴾، لە کاتی ڕاوکردنیدا ناوی خوای لەسەر بێنن، نافەرموێ: لە کاتی نان خواردنیدا، ناوی خوای لەسەر بێنن، چونکە لە کاتی خواردندا ناوی خوا لەسەر هێنان فەرز نیەو لەسەر ڕای زۆربەی زانایان سوننەتە، وەك پێغەمبەر ﷺ بە یەکێك لە هاوەڵانی فەرموو: ﴿يَا غُلاَمُ سَمِّ اللّٰه، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٣٧٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٣٧٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٢٣٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢٦٧)، وَالنَّسائِيُّ في (الكبرى) برقم: (٦٧٥٩)}، واتە: ڕۆڵە گیان! ناوی خوا بێنەو لە پێش خۆتەوە بخۆو، بە دەستی ڕاستت بخۆ، کە ئەوە بۆ خۆراك خواردنێیە وە ئەوە سوننەتە، ئەدی کەسێك (بِسْمِ اللّٰهِ)ی لە خۆراك خواردنی نەکرد؟ ئەوە گوناهبار نیەو تەنیا سوننەتێکی تەرك کردوە، بەڵام ئەوی دیکەیان پێویستە، کەواتە: ئەو ڕایە ڕاست نیە.

٢- هەندێکیان دەڵێن: ناوی خوا هێنان لە کاتی ناردنی نێچیرگرەکەدا مەرجی حەڵاڵ بوونی نێچیرەکەیە، دەڵێن: ئەگەر ناوی خوای لەسەر نەهێنی، ئەگەر نێچیریش بگرێ حەڵاڵ نیە، کە دیارە ئێمە ئەو ڕایەشمان پێ ڕاست نیە.

٣- هەندێکیان دەڵێن: ناوی خوا لەسەر هێنان، لە کاتێکدایە کە لە نێچیرەکەی بەردەداو ئەوەش سوننەتە.

٤- ئەم رایەمان پێ راستە، کە دەڵێ: ناوی خوا لەسەر هێنان فەرزە، بەڵام بۆ کەسێك کە لە بیری بێ، واتە: کاتێك بابای ڕاوچی تاژییەکەی تێبەردەدا، بازەکەی تێبەردەدا، فەرزە، بڵێ: (بِسْمِ اللهِ) بەڵام ئەگەر لەبیری چوو بەوە خواردنەکەی حەرام نابێ، وە لەڕاستیدا ئەوەی چوارەمیان زیاتر دەچێتە عەقڵەوە، چونکە جاری وایە ڕاوچی لە گەرمەی ڕاوێدا ناوی خوا هێنانی لەبیر نابێ، بۆیەش دەڵێین: فەرزە، چونکە کە فەرمان (أَمْر) لە قورئاندا دێ، ئێمە لە خۆمانەوە بۆمان نیە بڵێین: سوننەتەو دەبێ بەڵگەیەك لەوبارەوە هەبێ، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿ وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِ ﴾، ناوی خوای لەسەر بێنن، دیارە وشەی: ﴿ وَٱذۡكُرُواْ ﴾، فەرمان (أمر)ەو، ئەمیش فەرز بوون دەگەیەنێ، بەڵام بۆ کەسێك کە لەبیری بێ، ئەگەر لەبیری چوو، ئەوە خواردنی گۆشتەکەی لێ قەدەغە نابێ، وە دەشگونجێ بڵێین: سوننەتە، بەڵام بە هەر حاڵ ئەو ڕایەی چوارەم پێم وایە بەهێزترە، چونکە صیغەی ئەمر کە لە قورئاندا هاتوە، واجب بوون دەگەیەنێ، مەگەر نیشانەیەك هەبێ کە لەوە لایبدات، بۆ ڕەوایی، یاخود بۆ بە پەسندو سوننەت دانان، کە لێرەدا ئەوە نیە.

ئنجا لەوبارەوە فەرمووودە زۆرن، یەکێك لەو فەرموودانە: ﴿عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ ﷺ عَنْ صَيْدِ المِعْرَاضِ؟ قَالَ: مَا أَصَابَ بِحَدِّهِ فَكُلْ، وَمَا أَصَابَ بِعَرْضِهِ فَهُوَ وَقِيذٌ، وَسَأَلْتُهُ عَنْ صَيْدِ الكَلْبِ؟ فَقَالَ: مَا أَمْسَكَ عَلَيْكَ فَكُلْ، فَإِنَّ أَخْذَ الكَلْبِ ذَكَاةٌ، وَإِنْ وَجَدْتَ مَعَ كَلْبِكَ أَوْ كِلَابِكَ كَلْبًا غَيْرَهُ فَخَشِيتَ أَنْ يَكُونَ أَخَذَهُ مَعَهُ، وَقَدْ قَتَلَهُ فَلَا تَأْكُلْ، فَإِنَّمَا ذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ عَلَى كَلْبِكَ وَلَمْ تَذْكُرْهُ عَلَى غَيْرِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٥٤٧٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٩٥١) وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٤٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٦٥)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٢٧٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢١٥)}، واتە: عەدیی کوڕی حاتەم خوا لێی ڕازی بێ (کە بە حاتەمی طائیی بەناوبانگەو زۆر سەخی بووە، کوڕێکی هەبوو نەصرانیی بوو، دوایی بووە مسوڵمان) دەڵێ: پرسیارم لە پێغەمبەر ﷺ کرد: دەربارەی شتێك کە

بە تیر (مِعْرَاضِ) ڕاو دەکرێ حوکمی چۆنە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوەی کە بە تیژییەکەی دەگیرێ لێی بخۆ، (واتە: مادام بریندار بکاو خوێنی لێ بێنێ لێی بخۆ) بەڵام ئەوەی بە پانایییەکەی دەگیرێ لێی مەخۆ، (واتە: ئەگەر مرداربێتەوە، مەبەستی ئەوەیە ئەگەر بیکوژێ، یانی: ئەگەر لێیدابێ‌و خوێنی لێ هاتبێ، ئەوە خوێن لێ‌هاتنەکەی لە شوێنی سەربڕینیەتی، جا خوێنەکەی لە هەر شوێنێك هاتبێ، بەڵام ئەگەر خوێنی لێ نەهێنابێ‌و مرداری کردبێتەوە، ئەوە بە مردار لە قەڵەم دەدرێ) چونکە (وَقِيذ)ە، {واتە: ئەگەر نێچیرەکە لە ئەنجامی لێدراندا مردبێ، ئەوە لێی مەخۆ}، وە پرسیارم لێکرد دەربارەی نێچیرێك کە بە سەگ‌و تاژیی دەگیرێ؟ فەرمووی: هەر نێچیرێك بۆ تۆی گرتبوو، لێی بخۆ، چونکە گرتنی سەگ سەربڕینە بۆ نێچیر، {گرتنی واتە: بریندارکردنی، تاژیی‌و سەگ کە نێچیر دەگرێ، کەرویشکە، مامزە کە دیگرێ خوێنی لێ دێنێ، ئەوە لە جێی سەربڕینێیە با دوایی چەقۆشی پێڕانەگات، کە ڕەنگە زۆربەی خەڵکی وانەزانن، وە پێیان وابێ حەتمەن دەبێ چەقۆی بگاتێ، نا، مادام خوێنی لێ هێنابێ، خوێن لێ‌هێنانەکەی لەجێی سەربڕینێیە، ئەوە دەقی حەدیسە ﴿فَإِنَّ أَخْذَ الْكَلْبِ ذَكَاةٌ﴾، گاز لێگرتنی سەگ سەربڕینە بۆ ئەو نێچیرە}، بەڵام ئەگەر لەگەڵ سەگەکەتدا، یان لەگەڵ سەگەکاندا، سەگی نەفەرێکی دیکەش هات، یان تاژیی نەفەرێکی دیکەش بەشداریی کردبوو، وە مەترسیی ئەوەت هەبوو کە لەگەڵیدا گازی لەو نێچیرە گرتبێ‌و کوژرابێ، ئەوە لێی مەخۆ، چونکە تۆ ناوی خوات لەسەر سەگەکەی خۆت هێناوە، بەڵام لەسەر سەگی غەیری خۆت ناوی خوات نەهێناوە، ئەمەش ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ناوی خوا هێنان لەسەر ئەو نێچیرگرە، فەرزە.

هەروەها لەوبارەوە ئەم ڕیوایەتەش هەیە: ﴿عَنْ عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رضي الله عنه قَالَ: سَأَلْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ قُلْتُ: إِنَّا قَوْمٌ نَتَصَيَّدُ بِهَذِهِ الْكِلاَبِ، فَقَالَ: إِذَا أَرْسَلْتَ كِلاَبَكَ الْمُعَلَّمَةَ، وَذَكَرْتَ اسْمَ اللهِ فَكُلْ مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكَ، إِلاَّ أَنْ يَأْكُلَ الْكَلْبُ، فَلاَ تَأْكُلْ، فَإِنِّي أَخَافُ أَنْ يَكُونَ إِنَّمَا أَمْسَكَ عَلَى نَفْسِهِ، وَإِنْ خَالَطَهَا كَلْبٌ مِنْ غَيْرِهَا فَلاَ تَأْكُلْ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (١٨٢٩٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٤٨٧)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٩٥٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٨٤٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٧٠)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٢٦٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٢٠٨)}، واتە: عەدیی کوڕی حاتیم خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ:

پرسیارم لە پێغەمبەری خوا ﷺ کرد، گوتم: ئێمە خەڵکێکین بەم سەگو تاژیی(و نێچیر)گرانە ڕاوێ دەکەین، (واتە: ئەوە چۆنە کەنگێ نێچیرەکە بخۆین؟ کەنگێ نەیخۆین؟) فەرمووی: ئەگەر سەگەکانی خۆت کە فێری ڕاوت کردوون، ناردتن و ناوی خوات لەسەر هێنان {(بِسْمِ الله)ت لێکردن} لە نێچیرەکەیان بخۆ، لەوەی کە بۆتۆیان گرتوە، مەگەر سەگەکە لێی بخوات، ئەگەر سەگەکە لە نێچیرەکەی خوارد دەترسم کە بۆخۆی گرتبێتی، لەبەرئەوە لێی مەخۆ، هەروەها ئەگەر سەگی غەیری خۆشت بەشداری تێدا کرد، دیسان لێی مەخۆ.

**مەسەلەی بیست و چوارەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُ ﴾، دیارە ئەوەی پێشێ فەرمووی: ﴿ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُ ﴾، لێرەدا دووبارەی دەکاتەوە، ﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَـٰتُ ﴾، ئەمڕۆ شتە خۆش و بە تام و سوودبەخشەکانتان بۆ حەڵاڵ کراون، ئایا بۆچی دووبارە کراوەتەوە؟ بە مسوٚگەریی هەر شتێك لە قورئاندا کە دووبارە دەبێتەوە، هەر لە خۆوە نیەو حەتمەن حیکمەتێکی گەورە، یان چەندان حیکمەتی تێدان، کەواتە: با هەوڵبدەین حیکمەتی ئەو مەسەلەیەش لێرەدا بزانین:

یەکەم/ بۆ ئەوەی بە بیانووی دنیا بە کەمگرتنەوە ئەو شتانەی کە پاك و چاك و سوودبەخشن لە خۆیانیان قەدەغە نەکەن، بەتایبەتی گۆشت، وەك خوا ﷻ هەر لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرمویٚ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَـٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! شتە خۆش و بە تامەکان کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوون لە خۆتانیان قەدەغە مەکەن، وە دەستدرێژیی مەکەن و سنوورشکێنی مەکەن، چونکە بێگومان خوا سنوورشکێنانی خۆشناوێن. دوایی دەگەینە تەفسیری ئەم ئایەتە، کە لەبەرچی هاتە خوار؟ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ڕۆژێك بە لای مێرگو ئاوێکدا تێپەڕین، گوتیان: با لێرە دایکوتین و هەر لێرەبین بۆ خۆمان، وە هەندێکیان گوتیان: با خۆمان بخەسێنین و پێویستیمان

بە ئافرەتان نەبێو بۆ خۆمان تەرکی دنیا بکەین، دوایی گوتیان: بابچینەوە پرسێك بە پێغەمبەر ﷺ بکەین داخۆ ڕای چییە؟ ئیدی کە چوونەوە، پرسیان پێکرد، خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی نارده خوار، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! شتە خۆشو بەتامەکان کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوون لە خۆتانیان قەدەغە مەکەن، (ئنجا گۆشتە، ئافرەتە، خواردنە، شتی شیرینە .. هتد)، وە سنوورشکێنیی مەکەن، کەواتە: شتی خۆشو بەتامو سوودبەخش لە خۆت قەدەغە بکەی بە بیانووی ئەوە کە خوا لە خۆت ڕازی دەکەی، مانای ئەوەیە تۆ سنوور شکێنییت کردوە، کەواتە: دنیا بە کەمگرتنو بە تەقوا بوون پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە، شتی خۆش لە خۆت قەدەغە بکەی، بەلام زێدەڕۆیی تێدا مەکە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ خُذُواْ زِينَتَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١﴾ الأعراف، زۆر لە مسوڵمانان وا دەزانن، بەوە لە خوا نزیك دەبنەوە کە شتی حەڵاڵ لە خۆیان حەرام بکەن، شتی خۆش نەخۆنو شتی خۆش بەکارنەهێنن، پێغەمبەر ﷺ شتی وای نەکردوە، ئافرەتیشی هێناونو، خواردنی خۆشیشی ئەگەر لێهەڵکەوتبێ خواردوویەتی، شتی شیرینیشی خواردوە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُحِبُّ الْحَلْوَاءَ وَالْعَسَلَ﴾ {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٥٤٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٦٦٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٣١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣٢٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٢٥٤)}، واتە: عائیشە (خوا لێی ڕازی بێ) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ حەلواو هەنگوینی پێ خۆش بووە، هەروەها گۆشتیشی پێ خۆشبووە، هەرکاتێك لێی هەڵکەوتبێ لێی خواردوە، بەلام ئەگەر لێشی هەڵنەکەوتبێ نەیکردوە بە خەم، جاری وابووە چەند ڕۆژان نانی نەخواردوە، بە خورماو بە ئاو قەناعەتی کردوە، ئامانجی خواردن نەبووە، بەلام دژی خواردنی خۆشیش نەبووە، ئا ئەوە ڕاستە شەرعە، هەڵبەتە وەك من لە کتێبی (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)دا لە باسی تەزکیەی نەفسو خۆڕاهێنانو مەشق لەسەرخۆکردنم کردوە، دەگونجێ ئینسان جار جار هەندێك خواردن لەخۆی بگرێتەوە، بەلام نەك لەخۆی قەدەغە بکات، وە ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە ئەگەر مرۆڤ نەخۆشی

وەك زەختو شەكرەی بیرو پارێـزێ بكـاتو هەندێ شـت نـەخوا، مانـای وانیـە ئەوە لەخۆی قەدەغە كردوە.

دووەم/ هەروەها بۆئەوەی كە مسولمانان بە بیانووی حەڵاڵ بوونی شتی خۆشو بەسوودەوە، بەرەو شتی خراپو پیسو زیانبەخشیش نەڕۆن، وە سنوورشكێنیی نەكەن، بۆیە خوای كاربەجێ دەفەرمویێ: ﴿ ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ﴾، بۆئەوەی كە ئەوانەی بە بیانووی زوهدو دنیا بەكەمگرتنەوە شتی خۆش لەخۆیان قەدەغە دەكەن، كە بزانن ئەوەش خراپە، ئەوانەش كە لە حەڵاڵ تێدەپەڕێنن بەرەو حەڕام دەچن، بزانن كە نەخێر بەس ئەو شتانەی كە سوودبەخشو خۆشو بەتامن، حەڵاڵن، وە ئەو شتانەی كە پیسو زیانبەخشن قەدەغەو حەڕامن، وە خوا هیچ شتێكی قەدەغە نەكردوە كە پیسو زیانبەخش نەبێ.

**مەسەلەی بیستو پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ ﴾، خواردنی ئەوانەی كتێبیان پێدراوە حەڵاڵە بۆ ئێوە، لێرەدا مەبەست لە خواردن چییە؟ زانایان دوو رایان هەیە:

١) هەندێكیان گوتوویانە: (طَعام) واتە: هەموو جۆرەكانی خواردن، جا نان بێ، دانەوێڵە بێ، میوە بێ، سەوزە بێ، گۆشت بێ، هەمووی دەگرێتەوە، با هی ئەهلی كیتابیش بێ، با هی جوولەكەشو نەصرانییەكانیش بێ، یانی: با ئەوانیش سازیان كردبێ، بۆ مسولمانان حەڵاڵە، چونكە ڕەنگە ئەوكاتە مسولمانان زۆر هەستیارییان بووبێ بە خواردنیان، لەبەرئەوەی ئەهلی كوفرن، بۆیە خوای پەروەردگار بۆی ڕوونكردوونەوە، كە نەخێر خواردنی وان ( واتە: هی خاوەن كتێبەكان) بۆ ئێوە حەڵاڵە، ئەی مسولمانینە!

٢) هەندێكی دیكە گوتوویانە: نەخێر لێرەدا مەبەست لە (طَعام) تەنیا سەربڕاوە، واتە: گۆشت، دەڵێن: چونكە مسولمانان زانیویانە كە دانەوێڵەو میوەو سەوزەو...هتد، هی هەر كەس بێ حەڵاڵە، مادام لە ڕێیەكی حەڕامەوە دەستی نەكەوتبێ، هەر كەسێك سازی كردبێ هەر حەڵاڵە، بەڵام ئیشكالیان هەبووە لە

گۆشتدا، لەبەرئەوەی خوا ﷻ باسی ئەوەی کردوە، کە هەر شتێك بە ناوی غەیری خواوە سەربڕدرێ حەرامە، ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ...﴿١٢١﴾ ﴾الأنعام، واتە: هەرشتێك ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێ لێی مەخۆن، چونکە ئەوە گوناهبارییەو لە ڕێ لادانە، ئەوان ئیشکالیان لە گۆشتدا هەبووە، بۆیە دەڵێن: لێرەدا مەبەست لە (طَعَام) گۆشتە، هەڵبەتە هەردوو واتاکانیش دەگونجێن، چونکە خوای زاناو شارەزا دەیتوانی لە جیاتی وشەی (طعَام) بفەرموێ: (وَلُحُومُ الّذينَ أوتوا الكتاب) یان (وَذَبائحُ الّذينَ أوتوا الكتاب) بێگومان مسوڵمانی واش هەبوودو هەیە کە پێی وابێ نانی دەستیشیان حەرامە! وە هی وایە ڕەنگە پێی وابێ میوەشیان لەدەست وەربگرێ هەر حەرامە! بەلاّم خوای پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە کە نەخێر ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، هەموو جۆرە خواردنێکیان بۆ ئێوە حەلاّڵە، بە گۆشتیشەوە، وە ئەوانەی کتێبیان پێنەدراوە، گۆشتیان حەرامە، بەلاّم شتی دیکەیان حەلاّڵە، بتپەرستێکە، موشریکێکە دەعوەتت دەکات مادام گۆشت نەبێ، ئەوی دیکەیان حەلاّڵە، نانە، میوەیە، برنجە، نیسکە، نۆکە، هەموو ئەو شتانە حەلاّڵن، ئنجا لێرەدا ئیشکالێك دروست بووە لەلایەن هەندێك لە توێژەرەوانی قورئانەوە، ئەویش ئەوەیە: کە ئایا ئەگەر زانرا خاوەن کتێبەکان (بِسْمِ اللّهِ) ناکەن لەسەر سەربڕاو، یاخود ناوی غەیری خوای لەسەر دێنن، ئەگەر کابرا بۆی ساغ بۆوە کە ناوی عیسای لەسەر دێنن، یان ناوی مەریەمی لەسەر دێنن، یاخود جوولەکە ناوی عوزێری لەسەر دێنن، ئایا حەلاّڵە بیخوات؟ زانایان لەوبارەوە ڕاجیایی یان هەیە:

هەندێك گوتوویانە: دروستە.

وە هەندێکی دیکە گوتوویانە: دروست نیە.

وە من پێموایە ڕای دووەم ڕاستە، تۆ ئەگەر دڵنیابی ناوی غەیری خوای لەسەر هاتوە نابێ بیخۆی، بۆچی؟ چونکە خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ وَإِنَّهُ لَفِسْقٌ ...﴿١٢١﴾ ﴾الأنعام، واتە: هەرشتێك

ناوی خوای لەسەر نەهاتبێ، (واتە: ناوی غەیری خوای لەسەر هاتبێ) لێی مەخۆن، ئەگەرنا ئەگەر خاوەن كتێبێك وەك چۆن مسوڵمانێك لەبیری دەچێ، لەبیری چوو ناوی خوای لەسەر بێنێ، بۆ وێنە: كاتێك مریشكێك سەردەبڕێ، یان مەڕێك، بەرانێك، گایەك، حوشترێك سەردەبڕێ ناوی خوای لەسەر نەهێنێ و لەبیری بچێ، ئایا دەخورێ یان ناخورێ؟ زۆربەی زانایان دەڵێن: مادام بە هۆی لەبیرچوونەوەوە بێ دەخورێ، بەڵام ئەگەر بە ئانقەست بڵێ: ناوی خوای لەسەر ناهێنم، ئەوكاتە زۆر لە زانایان دەڵێن قەدەغە دەبێ، با مسوڵمانیش بێ، ئنجا دیارە ئەگەر نامسوڵمانیش بێ لەبیری بچێ ناوی خوای لەسەر بێنێ، مانای وایە هەر هەمان حوكمی هەیە، بەڵام ئەگەر ناوی غەیری خوای لەسەر بێنێ، قەدەغەیە، بخورێ، یاخود بە ئانقەست ناوی خوای لەسەر نەهێنێ، ئەوكاتە ئیشكالەكە لەوێدا دەبێ، كەواتە: كە ئێمە دڵنیابووین خاوەن كتێبێك كە جوولەكەیە، یان نەصرانیی یە، ناوی غەیری خوای لەسەر سەر بڕاوەكەی هێناوە، ئەوكاتە بۆمان نیە لێی بخۆین، بەڵام ئەگەر نەمانزانی كە ناوی خوای لەسەر هاتوە یان نەهاتوە، ئەسڵەكەی ئەوەیە: كە ڕەوایە بخورێ، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ ﴾، خواردنی ئەوانەی كتێبیان پێدراوە حەڵاڵە بۆ ئێوە، دیارە لە كاتێكدا خوای پەروەردگار وایفەرمووە كە زانیویشیەتی كە ئەوان لە كاتی سەربڕیندا چی دەڵێن و ناوی چی لەسەر دەهێنن، كەواتە: مادام فەرموویەتی: حەڵاڵە، حەڵاڵە، بەڵام ئەگەر دڵنیابووی ناوی غەیری خوای لەسەر هێناوە ئەو كاتە حەرامە.

**مەسـەلەی بیسـتو شـەشـەم:**

# باسێک لەبارەی شیان و نەشیانی ئافرەتی داوێنپاکەوە بە پیاوی داوێنپیس

کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ ... ﴾، وە ئافرەتـانی پاکـیزەی ئیمانـدار بـۆ ئێـوە حـەڵاڵن کـە هاوسـەرگیریان لەگەڵـدا بکـەن، بـۆ زانیاریتـان (مُحْصَنات) کۆی (مُحْصَنَة)یە، (حِصْن) واتە: قەڵا، (مُحْصَن) یانی: قاییم کـراو، پارێزراو، (حِصْن) بۆچی پێی دەگوترێ (حِصْن)؟ چونکە هەر کەسێك بچێتە نێو قەڵاوە دەپارێزرێ، (مُحْصَنَة)ش ئافرەتێکە کە پارێزراوە، پاکیزەیـە، دەشگونجـێ بخوێنرێتـەوە (مُحْصِنَات) واتە: خۆ پارێزەران، ئنجا ئەگەر (مُحْصَنَة) بـێ ئـەوە (إسم مَفعول)ە، وە ئەگـەر (مُحْصِنَة) بـێ ئـەوە (إسم فاعِل)ە، واتـە: ئەوانـەی خۆیـان پاراسـتوە، یان ئەوانەی پارێزراون، گرنگ ئەوەیە لێرەدا ئـەم ئایەتـە ئـەوە دەگەیەنێ کە دروست نیە پیاوی داوێن پاك (عفیف)، ئافرەتی ناپاك بێنێ، ئافرەتی داوێنپیسو زیناکەر بێنـێ، هەروەها بە پێچەوانەشـەوە دروست نیە ئافرەتی پاك شـوو بکـات بـە پیـاوی ناپـاكو داوێنپـیس، دیـارە ئایـەتی ژمـارە (٣) سـوورەتی (النـور)یش هەمان مەبەسـت زۆر بە ڕاشکاویی دەگەیەنـێ، کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٣ ﴾، جا قورئان هەندێکی هەندێکی لێکدەداتەوەو ڕووندەکاتەوە، بۆیە لە هەر شـوێنێك ئایەتێکت بینی چاك تێینەگەیشـتی، چاك لە واتاکەی حاڵی نەبـووی، یـاخود ئیشـکالێك، یـاخود تەمومـژێکی لەسـەر بـوو، تەماشـا بکـە ئایـەتی دیکـە لـەوبارەوە چـی هـاتوە، بیانهێنـە، ماناکـەت بـۆ ڕۆشـن دەبێتـەوە، لێـرەدا کـە خـوا دەفەرموێ: ئافرەتانی پاکیزەی ئیماندار بۆ ئێوە حەڵاڵ کراون، چونکە دەفەرموێ:

﴿ ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴿٥﴾ ﴾، یانی: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ ﴾یش، بۆ ئێوە حەڵاڵ كراون، عەطفە بۆ سەر ﴿ أُحِلَّ لَكُمُ ﴾، وەك چەمكی پێچەوانەی وایە كە ئافرەتانی ناپاكیزە حەڵاڵ نین و نابێ هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بكەن، ئێمە چۆن ئەوەمان بۆ ڕۆشن دەبێتەوە؟ لە ئایەتی ژمارە (٣)ی سووڕەتی (النور)دا كە دەفەرموێ: پیاوی زیناكەر تەنیا ئافرەتی زیناكەرو ئافرەتی هاوبەش بۆ خوادانەر دێنێ، ئافرەتی زیناكەریش تەنیا پیاوی زیناكەرو هاوبەش بۆ خوادانەر مارەی دەكات، وە ئەوە لە ئیمانداران قەدەغەكراوە، ﴿ ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ ﴾ النور، كەواتە: قەدەغەیە لە پیاوی ئیماندارو پاك ئافرەتێكی داوێنپیس بێنێ، وە هەروەها قەدەغەیە ئافرەتێكی پاكیی ئیماندار شوو بە پیاوێكی داوێنپیس بكات، مادام بزانێ داوێنپیسەو لەسەر داوێنپیسیی بەردەوامە، بەڵام كەسێك بزانن پێشتر داوێنپیسیی كردووە، دوایی تۆبەی كردووەو گەڕاوەتەوەو وازی لە گوناح هێناوە، ئەوكاتە دروستە، جا پیاوەكە بێ، یان ئافرەتەكە بێ، ئنجا ئەو ئایەتەی سووڕەتی (النور) ئەوەشی لێوەردەگیرێ، كە دیسان وەك باسمان كرد، پیاوی زیناكەریش ئافرەتی پاكیزەو (عفیفة)ی پێ ناشێ و نابێ لێی مارە بكرێ، دیارە زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە، وە زۆربەیان نیكاحی ئافرەتی زیناكەر لە پیاوی پاكو، ئافرەتی پاك لە پیاوی زیناكەر بە دروست دەزانن، واتە: پێچەوانەی ئەوەی كە ئێمە گوتوومانە، بەڵام بەشێكیان كە ئیمام ئەحمەدیشیان لە نێودا هەیە دەڵێن: دروست نیە، نە پیاوی داوێن پاك ئافرەتی ناپاك بێنێ، نە ئافرەتی پاك شوو بە پیاوی ناپاك بكات، كەمێكیان وا دەڵێن، بەڵام زۆربەیان دەڵێن: دروستە.

وە من پێموایە ئەو ڕایە ڕاستە كە دەڵێ: ئافرەتی پاك بە پیاوی زیناكەر ناشێ، هەروەها پیاوی پاكیش بە ئافرەتی زیناكەر ناشێ، واتە: نابێ لێك مارە بكرێن، لەبەر چەند بەڵگەیەك:

یەکەم/ ڕستەی: ﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ﴾، ئافرەتانی پاك لە ئیمانداران، واتە: تەنیا ئەوانەتان بۆ حەڵاڵ کراوە، ئەوە زۆر ڕوونو ڕاشکاوە، کە بەس ئافرەتانی پاك حەڵاڵن کە ئینسان هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکات، ئەدی ئافرەتانی ناپاك؟ چەمکی پێچەوانەی (مَفهُوم المُخالفة)ەکەی ئاوایە، کە ئافرەتانی ناپاك کە (مُحْصَنَات) نەبنو پاکیزە نەبن، دروست نیە هاوسەرگیرییان لەگەڵدا بکرێت، هەڵبەتە وشەی (مُحْصَنَات) لە قورئاندا کە بەکاردێ بە سێ واتا بەکاردەهێنرێ: (عفیفات)، (متزوجات)، (حرائر) واتە: دەکرێ ئەو وشەیە بە مانای ئافرەتانی داوێن پاك، یان ئافرەتانی هاوسەردار، یان ئافرەتانی ئازاد بێ، واتە: پێچەوانەی کۆیلە، بەڵام لێرەدا نە (متزوجات)، نە (حرائر)، ناگونجێ بڵێین: مانای (مُحْصَنَات)ە، بەڵکو دەبێ بڵێین: (مُحْصَنَات) واتە: (عفیفات) ئافرەتی داوێن پاك.

دووەم/ لە ئایەتی ژمارە (٣) سووڕەتی (النور)دا خوا زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی دەفەرمویێ: پیاوی زیناکەر جگە لە ئافرەتی زیناکەرو، هاوبەش بۆ خوا دانەر ناهێنێ، وە ئافرەتی زیناکەر مارەی ناکاتو نایهێنێ هاوسەرگیریی لەگەڵدا ناکات، جگە لە پیاوی زیناکەرو هاوبەش بۆ خوا دانەر، وە ئەوە لە ئیمانداران قەدەغە کراوە، ئیدی لەوە ڕوونو ڕاشکاوتر دەبێ چی بێ، کە خوای پەروەردگار دەفەرمویێ: ﴿... وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ۝٣﴾ النور، ئەوە لە ئیمانداران قەدەغە کراوە.

ئنجا لەوبارەوە (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە کتێبەکەی خۆی (تیسیر الکریم الرحمن في تفسیر کلام المنان)دا لەوبارەوە دەڵێ: (وَهَذَا دَلِيلٌ صَرِيح عَلَى تَحْرِيم نِكَاحِ الزَّانِيَةِ حَتَّى تَتُوبَ، وَكَذَلِكَ إِنْكَاحُ الزَّانِي حَتَّى يَتُوبَ، فَإِنْ مُقَارَنَةَ الزَّوْجِ لِزَوْجَتِهِ، وَالزوجةِ لِزَوْجِهَا، أَشَدُّ الإِقتَرانَاتِ والإزدواجَاتِ، وَقَدْ قَالَ تَعَالَى: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ۝٢٢﴾ الصافات، أي: قُرَنَاءَهُمْ)[1] دوای ئەوەی کە ئەم ئایەتە دێنێ لە سووڕەتی (النور)دا دەڵێ: وە

١) ص ٥٦١.

ئەوە بەڵگەیەکی ڕاشکاوە لەسەر قەدەغەبوونی مارەکردنی ئافرەتی زیناکەر بۆ پیاوی پاك، هەتا تۆبە دەکات، هەروەها مارە لێ برینی (واتە: مارە برینی) ئافرەتێکی پاك لە پیاوێکی زیناکەر، هەتا تۆبە دەکات، چونکە پێکەوە جووتبوونی مێرد لەگەڵ ژنیی‌و ژن لەگەڵ مێردیدا (پێکەوە بوونیان‌و هاوسەرگیرییان) بەهێزترین جۆری پێکەوە بوون‌و بەهێزترین جۆری جووتبوونە، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ وَمَا كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ﴿٢٢﴾﴾ الصافات، واتە: ئەوانەی ستەمکارن‌و ئەوانەی لەگەڵیان دابوون‌و جووتیان بوون (مەرج نیە لێرە مەبەست پێی هاوسەرەکانیان بێ، واتە: پێکەوە بوون) پێکەوە حەشریان بکەن بۆ دۆزەخ، کەواتە: دروست نیە پیاوێکی پاك ئافرەتێکی ناپاك بێنێ، یان بە پێچەوانەوە.

سێیەم: ئێمە چەند دەقێکی سوننەتمان هەن کە نوقتە دەخەنە سەر پێیت لێرەدا، بەڵام بۆ زانیارییتان زۆرجار شەرعزانان‌و زانایان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، لە ژێر کاریگەریی‌و زەختی واقیع دا فەتوا دەردەکەن، وە زۆر ناگەڕێنەوە بۆ فەرمایشتەکان‌و ئایەتەکان، زانایەك ڕوو بە ڕووی واقیعێك بۆتەوە، تەماشا دەکات ئەو خەڵکە زۆری داوێنپیسی دەکات، ڕەنگە خۆی ناچار ببینێ چاوپۆشیی لەو مەرجە بکات، ئنجا بێگومان ئیسپاتی زینا زەحمەتەو ناشکرێ بڵێ: بیستوومە فلانکەس داوێنپیسە، یان ڕەنگە داوێنپیس بێ.

کە ئەوە دوایی کێشەی لێ پەیدادەبێ، بۆیە زیاتر لە ژێر زەختی واقیعدا ئەو فتوایە دراوە، ئەگەرنا ئایەتەکان زۆر ڕوونن، وە فەرمایشتەکانیش زۆر ڕوونن، ئەمەش سێ نموونەی دەقەکانی سوننەت لەوبارەوە:

فەرموودەی یەکەم: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو، رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَجُلاً مِنَ الْمُسْلِمِينَ اسْتَأْذَنَ رَسُولَ اللهِ ﷺ فِي امْرَأَةٍ يُقَالُ لَهَا: أُمُّ مَهْزُولٍ كَانَتْ تُسَافِحُ، وَتَشْتَرِطُ لَهُ أَنْ تُنْفِقَ عَلَيْهِ، فَقَرَأَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٌ...﴿٣﴾﴾ النور﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٨٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٧٨٥) ووافقه الذهبي، وَصَحَّحَهُ، وَقَالَ شعيب

الأرنؤوط: حَدِيثٌ حَسَنٌ}، واتە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك لە مسوڵمانان مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا ﷺ وەرگرت کە ئافرەتێك بێنێ کە پێیان دەگوت: (أُمُّ مَهْزُولٍ) کە عادەتی وابوو بە ئاشکرا زینای دەکردو دەشیکردە مەرج لەسەر ئەو کەسەی کە زینای لەگەڵ دەکات کە نەفەقەی بکێشێ، ئەو پیاوە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگام دەدەی ئەو ئافرەتە مارە بکەم؟ پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: ﴿ٱلزَّانِي لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوۡ مُشۡرِكَةٗ وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ...﴿٣﴾﴾، واتە: ئافرەتی زیناکەر مەگەر پیاوی داوێنپیس، یاخود پیاوی هاوبەش بۆ خوا دانەر مارەی بکات، ئەگەرنا دروست نیە، ئیدی وازی لێ هێنا، کەواتە: ئایەتەکە دیارە مەبەستەکەی چییە؟

فەرموودەی دووەم: ﴿عَنْ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ مَرْثَدَ بْنَ أَبِي مَرْثَدٍ الْغَنَوِيَّ كَانَ يَحْمِلُ الأُسَارَى بِمَكَّةَ، وَكَانَ بِمَكَّةَ بَغِيٌّ يُقَالُ لَهَا: عَنَاقٌ وَكَانَتْ صَدِيقَتَهُ، قَالَ: فَجِئْتُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَنْكِحُ عَنَاقَ؟ قَالَ: فَسَكَتَ عَنِّي، فَنَزَلَتْ: ﴿وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ...﴿٣﴾﴾، فَدَعَانِي فَقَرَأَهَا عَلَيَّ وَقَالَ: «لاَ تَنْكِحْهَا»﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٢٠٥٣)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣١٧٧)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٣٢٢٨)، وَالحَاكِمُ بِرقم: (٢٧٨٥) وَصَحَّحَهُ، وَقَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە کە مەرثەدی کوڕی ئەبی مەرثەدی غەنەویی کە دیلەکانی لە مەککە دەفڕاند لە چنگی کافرەکان، (ئەو مسوڵمانانەی کە دیلیان کردبوون دەیفڕاندن دەیهێنان بۆ مەدینە عادەتی وابووە، پیاوێکی ئازابووە) لە مەککەش ئافرەتێکی داوێنپیس هەبوو، پێیان دەگوت: (عَناق) دۆستی بوو، {واتە: لە سەردەمی نەفامیی دا دۆستی بووە، زینای لەگەڵدا کردوە، ئەگەرنا دوایی کە مسوڵمان بووە، نا}، دەڵێ: چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! ئایا عەناق بێنم؟! پێغەمبەر ﷺ بێدەنگ بوو، هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارێ: ﴿وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوۡ مُشۡرِكٞۚ...﴿٣﴾﴾ النور،

واتە: ئافرەتی زیناکـەر مەگـەر پیـاوی زینـاکـەر یـان هاوبـەش بـۆ خـوا دانـەر، ئەگـەرنا مـارەی ناکـات، پێغەمبـەر ﷺ بـانگی کـردمو ئایەتەکـەی بەسـەردا خوێندمەوەو فەرمووی: مارەی مەکـە، (لێی گەڕێ بە کەڵکی تۆ نایـەت).

فـەرموودەی سـێیەم: ﴿عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اَللهِ ﷺ لاَيَنْكِحُ اَلزَّانِي اَلْمَجْلُودُ إِلاَّ مِثْلَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بـرقم: (٨٢٨٣)، وَأَبُو دَاوُدَ بـرقم: (٢٠٥٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (٢٧٨٥) صَحِيح الإِسْنَادِ، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتـە: ئـەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بـێ، دەڵێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: پیـاوێکی زینـاکەری جەڵـدە لێدراو، (قامچی لـێدراو)، وێنەی خـۆی نەبـێ مارە ناکـات، خـوا لەبارەی سزای زینـاوە فەرموویـەتی: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ وَلَا تَأۡخُذۡكُم بِهِمَا رَأۡفَةٞ فِي دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۖ وَلۡيَشۡهَدۡ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٢﴾ النور، واتە: پیاوی زیناکەرو ئـافرەتی زیناکـەر هـەردووکیان یـەکی سـەد قامچییان لـێ بـدەن، پیاوێـك لەسـەر زینـا قامچیی لـێ درابـێ، مەگـەر ئـافرەتێکی وەك خـۆی، ئەگـەرنا دروسـت نیـە مـارەی بکـا، واتـە: ئـافرەتیش کـە زینـای کردبـێو، سـەد قامچیـی لـێ درابـێ، ئـەوە لێکدەوەشـێنەوە، بـەڵام پیـاوێکی زیناکـەر لەگـەڵ ئـافرەتی پاکیـزەو پـاك، لێـك ناوەشـێنەوە.

دیارە ئەو مەسـەلەیە زۆر گرنگە بۆیـە تۆزێك لەسـەری ڕۆیشـتم، شـایانی باسـە ئەو زانایانەش کە ڕایان وایە: دروسـتە پیـاوی پـاك ژنـی زیناکـەرو، پیـاوی زیناکـەر ژنـی پـاك بێنـێ، ئـەوانیش بەڵـگە دێننـەوەو دەسـتەو ئـەژنۆ دانەنیشـتوون، کـە بـە ڕای من بەڵگـەکانیان جێی قەناعـەت نین.

ئەو شتانەی ئەوان بە بەڵگـەیان دێننـەوە:

فـەرموودەی یەکـەم: پێغەمبـەر ﷺ فەرموویـەتی: ﴿أَلاَ وَاسْتَوصُوا بالنِّسَاءِ خَيْراً، فَإِنَّمَا هُنَّ عَوَانٍ عِنْدَكُمْ، لَيْسَ تَمْلِكُونَ مِنْهُنَّ شَيْئاً غَيْرَ ذلِكَ إِلاَّ أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ، فَإِنْ فَعَلْنَ فَاهْجُرُوهُنَّ فِي المَضَاجِعِ، وَاضْرِبُوهُنَّ ضَرباً غَيْرَ مُبَرِّحٍ، فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلا تَبْغُوا عَلَيهِنَّ سَبِيلاً﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١١٦٣)

وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكبرى) برقم: (٤١٠٠)، عَنْ عَمرِو بْنِ الأَحوصِ الجُشَمي ﷺ، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: {پێغەمبەری خوا ئەوەی لە (حَجَّةِ الوَدَاعِ)دا فەرمووە، بەڵام با بزانین ئەم فەرمایشتە ئەوەی لێوەردەگیرێ، كە ئەوان دەیڵێن؟} پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویٚ: من بە داكۆكییكردنەوە ئامۆژگارییتان دەكەم دەربارەی ئافرەتان لەگەڵیان چاك بن، چونكە ئەوان لەبەردەستی ئێوەدان، دەتوانن كە بچنە لایان، (واتە: لەگەڵیان جووتبن)، وە جگە لە لەگەڵ جووتبوون هیچ مافێكی دیكەتان لەسەریان نیە، بیانچەوسێننەوە {كە دیارە لەگەڵ جووتبوون ئەویش كە مافی پیاوە لەسەر ژن، مافی ژنیشە لەسەر پیاو، كە لە ڕووی جینسییەوە یەكدی تێر بكەن بۆئەوەی لە گوناح پارێزراو بن} مەگەر گوناهێكی ئاشكرا بكەن، ئەگەر گوناهێكی ئاشكرایان كرد، پشتیان تێبكەنو لەگەڵیان مەخەون، وە لێیان بدەن، بەڵام لێدانێكی وانا برینداریان بكەن، شوێنیان بشكێنن، ئنجا ئەگەر دوای ئەوە بە قسەیان كردن، ئەوە بیانوویان پێ مەگرن.

دیارە من فەرموودەی دووەمیش دێنمەوە، دوایی دێمەوە سەری، كە ئایا ئەوە بە بەڵگەی ئەوە دەشێ كە ئافرەتو پیاوی پاكوپیس لێك مارە بكرێن؟!

فەرموودەی دووەم: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ ﷺ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ إِنَّ امْرَأَتِي لاَ تَمْنَعُ يَدَ لاَمِسٍ، قَالَ: «غَرِّبْهَا»، قَالَ أَخَافُ أَنْ تَتْبَعَهَا نَفْسِي، قَالَ: «فَاسْتَمْتِعْ بِهَا»﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٠٥١)، وَالنَّسَائيُّ برقم: (٣٤٦٤) صَحِيح الإِسْنَاد، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: ژنەكەم دەستی كەس ناگێڕێتەوە، فەرمووی: دەری بكەو لێی دووربكەوەو وازی لێ بێنە، گوتی: دەترسم نەفسم بە دوای بكەویٚ؟! فەرمووی: دە هەر لەلای خۆت بیهێڵەوەو سوودی لێ ببینە.

بەر لەوەی بێینە سەر ئەسڵی مەبەست دەڵێم: من زۆرم پێ ناخۆشە كە زانایەك لە كتێبێكدا، فەرمایشتێكی پێغەمبەر ﷺ دێنێو لێشی حاڵی نەبووە، ئنجا حوكمێكی غەڵەتی لێ هەڵدەهێنجێ، ئنجا ئەو حوكمە كە بە هەڵە لەو حەدیسە هەڵهێنجراوەو قسەی پێغەمبەر ﷺ نیە، ڕەنگە خەڵك دوایی وا بزانن پێغەمبەر

ﷺ وایفەرمووە!!

من زۆر زۆر بەوە قەڵسم، بۆیە پێموایە باشترین بەرگریی کردن لە پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ وەك خۆی مەبەستی بووە، ئاوا لێیان حاڵی بین، کە هیچ کات پێغەمبەر ﷺ شتێکی نەفەرمووە، کە لەگەڵ ئایەتی قورئاندا دژ بوەستێ، یان لەگەڵ عەقڵی سەلیمدا دژ بوەستێ، یان لەگەڵ عیلم دا دژ بوەستێ، یان لەگەڵ واقیعدا دژ بوەستێ، وە هەر شتێك کە وابوو لێی بکەونە گومانەوە، یان دەبێ مانایەکی ڕاستی لێ وەربگرین، یان دەبێ بڵێین: ئەوە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺ نیە، ئنجا لێرەدا با تەماشا بکەین:

فەرمایشتەکەی یەکەم کە دەفەرموێ: ئامۆژگارییتان دەکەم لەگەڵ ئافرەتاندا باش بن، وە جگە لە مافی سەرجێی کردنو، لەگەڵ جووتبوونیان هەقێکی دیکەتان لەسەریان نیە، مەگەر فاحیشەیەکی ئاشکرا بکەن، بۆ زانیارییتان وشەی (فاحشة مبینة) لە قورئاندا تەنیا لە سێ شوێندا هاتوە، وە من بە دوای مانای ڕیشەیی ئەو وشەیە کەوتووم، لە قورئاندا لەبەرئەوەی کە لە سوورەتی (الأحزاب)دا دەربارەی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ هاتوە، منیش زۆر بە هەستیاریی تەماشای ئەو وشەیەم کرد، داخۆ مەبەست پێی چییە؟ وە سەرەنجام بۆم دەرکەوت وشەی (فاحشة) لە قورئاندا بە تەنیاو بەبێ وشەی (مُبيِّنة) بەو گوناهانە دەگوترێ کە پەیوەندیان بە لایەنی جینسیەوە هەیە، با بزانین چۆن؟

١- خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّٰتِي يَأۡتِينَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مِن نِّسَآئِكُمۡ ... ﴿١٥﴾ ﴾ النساء، واتە: ئەو ئافرەتانەتان کە فاحیشە دەکەن، کە لێرەدا مەبەست پێی خۆ لە یەکدی خشاندنی ئافرەتانە کە (مُساحقة)ی پێدەگوترێ.

٢- وە خوا لە شوێنێکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلُوطًا إِذۡ قَالَ لِقَوۡمِهِۦٓ أَتَأۡتُونَ ٱلۡفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنۡ أَحَدٖ مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ ﴾ الأعراف، واتە: لووط کاتێك بە گەلەکەی گوت: ئایا گوناهێکی دزێو دەکەن کە هیچکەس لە جیهانییان بۆ کردنی پێشتان نەکەوتوە؟ لێرەشدا مەبەست پێی نێربازییە.

٣- وە بە مانای زیناو داوێنپیسیش هاتوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَىٰٓ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ ﴾الإسراء، واتە: وە توخنی زینا مەكەون چونكە فاحیشەیەو ڕێیەكی زۆر خراپە.

٤- وە بە مانای بڵاوكردنەوەی قسەی خراپ لە ڕووی جینسییەوە بەتایبەت بوختانو تۆمەتباركردن بە داوێنپیسیی دێ، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ الَّذِينَ يُحِبُّونَ أَن تَشِيعَ الْفَٰحِشَةُ فِي الَّذِينَ ءَامَنُوا لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ فِي الدُّنْيَا وَالْءَاخِرَةِ ...﴿١٩﴾ ﴾ النور، واتە: بێگومان ئەوانەی حەزدەكەن كە فاحیشە بە نێو بڕواداراندا بڵاوبێتەوە، ئازارێكی بە ئێشیان لە دنیاو دوارۆژدا هەیە..

كە بە پێی سیاقی ئایەتەكان بۆمان دەردەكەوێ مەبەست لێرەدا لە (فَاحِشَة) بوختانو تۆمەتی داوێنپیسیی یە...

بەڵام ئایا وشەی: (فَاحِشَة مُبَيِّنَة)ش وەك (فَاحِشَة) هەر هەمان مانای هەیەو بە مانای زینا دێ؟!

من زۆر لەو وشەیەم كۆڵیەوە، چونكە وەك گوتم لە سوورەتی (الأحزاب)دا خوای بەرز دەربارەی خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا النَّبِيُّ قُل لِّأَزْوَٰجِكَ إِن كُنتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَوٰةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحًا جَمِيلًا ﴿٢٨﴾ ﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر! بە هاوسەرەكانت بڵێ: ئەگەر ژیانی دنیاو جوانیی دنیاتان دەوێ، وەرن با سەرو دیارییتان بدەمێو بە شێوازێكی جوان دەستتان لێ هەڵبگرم، دیارە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەو ئایەتەكانی دواییشی ئەوەبوو خێزانەكانی پێغەمبەر ﷺ داوایان لێكرد كە نەفەقەیان بۆ زیاد بكاتو ژیانیان خۆش بكات لە ڕووی گوزەرانەوە پێغەمبەریش ﷺ توانای نەبوو وە ئەگەر توانیباشی بۆی نەدەگونجا، چونكە سەرمەشقی هەموو مسوڵمانانەو ناگونجێ ژیانو گوزەرانێكی خۆشگوزەرانانەی هەبێ، ئنجا لەو سیاقەدا دەفەرموێ:

﴿يَٰنِسَآءَ النَّبِيِّ مَن يَأْتِ مِنكُنَّ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ يُضَٰعَفْ لَهَا الْعَذَابُ ضِعْفَيْنِ

﴿وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ٣٠ وَمَن يَقْنُتْ مِنكُنَّ لِلَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَتَعْمَلْ صَٰلِحًا نُّؤْتِهَآ أَجْرَهَا مَرَّتَيْنِ وَأَعْتَدْنَا لَهَا رِزْقًا كَرِيمًا ٣١﴾ الأحزاب، واتە: ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر! ﷺ هەرکامێك لە ئێوە فاحیشەیەکی ئاشکرا بکات، ئەوە سزای بۆ دووچەندان دەکرێتەوە، ئەوەش لە لای خوا ئاسانە، وە هەر کامێکتان فەرمانبەرو ملکەچیی خواو پێغەمبەرەکەی بێ و کردەوەی باش بکات، دووجار پاداشتی دەدەینەوە، وە بژیوێکی پڕ پێزو ڕێزمان بۆ داناوە.

ئنجا بەداخەوە کە تەماشای تەفسیرەکان دەکەین، دەبینین هەموویان دەڵێن: وشەی: (فاحشة مبيِّنة) بە مانای زینا دێ، وە بە مانای یاخیبوونی ژنیش دێ لە مێرد، بەڵام لەڕاستیدا وانیە، چونکە ناگونجێ هاوسەرانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ تووشی ئەو گوناهە ببن، وەك خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿...وَٱلطَّيِّبَٰتُ لِلطَّيِّبِينَ وَٱلطَّيِّبُونَ لِلطَّيِّبَٰتِ... ٢٦﴾ النور، پاشان وشەی (فاحشة) بە مانای زینایە، بەڵام (فاحشة مبيِّنة) لەبەرئەوەی لە ئایەتەکەی سوورەتی (الأحزاب)دا بەراورد کراوە لەگەڵ ملکەچیی و گوێڕایەڵییدا؟ ناگونجێ بەو مانایە بێ، خوا دەفەرموێ: هەرکامێك لە ئێوە (فاحشة مبيِّنة) بکات، سزایەکەی بۆ چەند قات دەکرێتەوە، وە هەر کامێك لە ئێوە فەرمانبەر بێ و ملکەچ بێ بۆ خواو پێغەمبەری خوا، پاداشتی دوو قاتە، ئنجا ملکەچیی پێچەوانەی چییە؟ بێگومان پێچەوانەی یاخیبوونە، کەواتە: ئەگەر یاخیی بێ، سزای دووچەندانە، وە ئەگەر بە قسەی پێغەمبەر ﷺ بکاو گوێڕایەڵ بێ، دیسان هەر وایەو پاداشتەکەی دوو بەرانبەرە ئنجا موناسەبەتەکەش هەر ئەوە بوو، کە ئەوان گوتیان: دەبێ نەفەقەمان بۆ زیاد بکەی پێغەمبەریش ﷺ لە توانای دا نەبوو، موناسەبەتەکە هەر ئەوە بووەو[1] باسی زینا لە گۆڕێدا نەبوو، بەڵکو باسی یاخی بوون بوو،

---

١) بۆ هۆی هاتنەخوارەوەی ئەو دوو ئایەتەی (٢٨ و ٢٩)ی (الأحزاب) بڕوانە (صحيح البخاري): ٢٤٦٨، ٥١٩١، وە (صحيح مسلم): ١٤٧٨و ١٤٧٩، کە ئەم تەعبیرە هاتوە: (فضحك رسولَ الله و قال: هُنَّ حولي كما ترى؛ يَسألْنني النفقة).

هەروەها بڕوانە : (الإستيعاب في بيان الأسباب)، ج ٣، ص: ٩٥-١٠٢، نووسینی: سليم بن عيد الهلالي و محمد بن موسى آل نصر.

ئەوان لە قسەی پێغەمبەر ﷺ دەرچوون‌و سەرپێچییان کردووەو مانیان گرتوە، گوتوویانە: دەبێ نەفەقەمان بۆ زیاد بکەی، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: من ناتوانم لەوە زیاتر نەفەقەو مەسرەفتان بۆ پەیدا بکەم‌و دەبێ وەك خەڵكی سادە بژین، نەك وەك خەڵكێكی خۆشگوزەران، دیارە ئەگەر توانیباشی هەر نەیدەكرد، خوای كاربەجێش بەراورد دەكات لە نێوان ئەو دووانەدا، واتە: لە نێوان یاخیی بوون‌و سەرپێچیی كردن، وە ملكەچ بوون‌و فەرمانبەریی دا.

ئنجا ئێمە دەڵێین: زیناكردن پێویست ناكات وەسفی (مُبَيِّنَة)ی بخرێتە سەرێ، چونكە زینا بۆ خۆی هەر ئاشكرایەو گوناهێكی ناقۆڵاو دزێوو خراپە، كەواتە: (فاحشة مبيِّنة) لە بەكارهێنانی قورئاندا كە لە سوورەتەكانی: (النساء و الأحزاب و الطلاق)دا هاتوە، مەبەست پێی یاخیی بوون (نشوز)ی ژنە لە مێرد.

فەرموودەی دووەمیان: كە دەڵێ پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ، گوتی: {إِنَّ امْرَأَتِي لاَ تَمْنَعُ يَدَ لاَمِسٍ}، واتە: ژنەكەم دەستی كەس ناگێڕێتەوە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: لێی دووربكەوەو تەڵاقی بدە، گوتی: دەترسم دوایی دڵم بەلایدا بچێ، (دیارە پێی جوان بووە) فەرمووی: مادام وایە هەر بیهێڵەوە لەلای خۆت، ئنجا ئایا ئەوە دەگونجێ؟! چونكە هەندێك ئاوا لێكیانداوەتەوە: {لاَ تَمْنَعُ يَدَ لاَمِسٍ}، واتە: هەرچی داوای زینای لێ بكات لەگەڵیدا دەكات، ئایا دەگونجێ پێغەمبەر ﷺ بۆ پیاوێكی وا بڵێ: {غَرِّبْهَا} یانی: تەڵاقی بدە، بەڵام دوایی كابرا بڵێ: نەفسم هەر بەدوایدا دەچێ، ئەویش بفەرموێ: باشە بیهێڵەوە لە لای خۆت؟! نەخێر، هەرگیز شتی وا لە پێغەمبەر ﷺ ناوەشێتەوە، ئەدی لێرەدا مەبەست پێی چییە؟!

ئێمە دەڵێین: یان هەر سەنەدەكەی تەواونییەو فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ نیە، یان ئەوەتا {لاَ تَمْنَعُ يَدَ لاَمِسٍ} واتە: دەستی كەس ناگێڕێتەوەو دەست بازیی دەكات لەگەڵ خەڵك، قسەی سوحبەت‌و گاڵتە لەگەڵ خەڵك زیاد لە پێویست دەكات، مەبەستی پێی ئەوەیە، چونكە بە ئاشكرا نەیگوتوە زینا دەكات، دەڵێ: {لاَ تَمْنَعُ يَدَ لاَمِسٍ} هەندێ ئافرەت هەیە دەست لە شانی پیاوان دەدات، پیاوان دەست لە شانی دەدەن، قسەیان لەگەڵدا دەكات، لە پیاوان دەچێتە پێشێ، وەك بڵێی زۆر لەگەڵیاندا تێكەڵ دەبێ، ئەو جۆرە ئافرەتەش مەزەندەی ئەوەی لێ دەكرێ كە تووشی خراپە ببێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: مادام وایە وازی لێ بێنە، گوتی: ئاخر نەفسم بەلایدا دەڕوا، فەرمووی: مادام وایە لەلای خۆت بیهێڵەوە، جا

هەندێك شت پێغەمبەر ﷺ جاری وایە فەرموویەتی، بەڵام ڕاویەکە تەنیا ئەو ڕستەیەی هێناوە، کە مەبەستی بووە، ئەگەرنا پێغەمبەری خوا ﷺ حەتمەن پێشی فەرمووە: کە ئامۆژگاریشی بکات، دەستبازیی لەگەڵ پیاوان نەکاتو، لەگەڵ پیاواندا هێندە قسان نەکاتو، لێیان نەچێتە پێشێ، بەڵام بە تەئکید مەبەست ئەوە نەبووە، کابرا بڵێ: ئەو خێزانەی من هەرچی داوای خراپەی لێ بکات، لەگەڵیدا دەکات، ئەویش بفەرموێ: لە لای خۆتی بهێڵەوە، هەرگیز شتی وا نابێ، هەرگیز ئەوە لە پێغەمبەری خوا ﷺ ناوەشێتەوە، وەك لەم فەرمایشتەدا بە ڕوونی دەردەکەوێ: ﴿عَنْ عَمّار بْنِ يَاسِر رَضِيَ اللَّه عَنْهُ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ قَالَ: ثَلَاثَةٌ لا يَدخُلُونَ الجَنَّةَ (أبداً): الدَّيُّوث مِنَ الرِّجَال، والرَّجُلَةُ مِنَ النِّسَاءِ، وَمُدْمِنُ الخَمْرِ، فَقَالُوا: يَا رَسُول اللَّه! أما مُدمِن الخَمْرِ فَقَد عَرَفْنَاهُ، فَمَا الدِيوث مِنَ الرِّجَال؟ قَالَ: "الَّذِي لا يُبَالِي مَنْ دَخَلَ عَلَى أَهْلِهِ" قُلْنَا: فَالرَّجُلَةُ مِنَ النِّسَاءِ؟ قَالَ: "الَّتِي تَشَبَّهُ بالرِّجَالِ"﴾ {رَوَاهُ البيهقي برقم: (١٠٨٠٠)، وَحَسَّنَهُ الألباني في صحيح الترغيب والترهيب رقم: (٢٣٦٧)}.

واتە: سێ جۆرە کەس هەرگیز ناچنە بەهەشت: پیاوی بە تەنگ ناموسەوە نەبوو، وە ژنی سەر پیاوانە، وە مەیخۆری بەردەوام، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا! مەیخۆری بەردەوام دەناسین، بەڵام پیاوی (دَیُّوث) کێیە؟ فەرمووی ئەو کەسەی دەربەست نیە کێ لە خێزانی وەژوور دەکەوێ، گوتمان: ئەدی ژنی سەرپیاوانە؟ فەرمووی: ئەوەی کە خۆی بە پیاوان دەچوێنێ.

**مەسەلەی بیستو حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾، وە ئافرەتانی پاکیزە لەوانەی پێش ئێوە کتێبیان پێ دراوە، دیارە لێرەدا مەبەست لەوانەی کتێبیان پێ دراوە، بە پلەی یەکەم جوولەکەو نەصرانییەکانن، بەڵکو زۆر لە زانایان دەڵێن: تەنیا ئەو دووانەن، واتە: ئافرەتی جوولەکە، وە ئافرەتی نەصرانیی بە پیاوی مسوڵمان دەشێ کە هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکات، وە کە پێی دەشێ نەك دوایی کە هات حەتمەن ببێتە مسوڵمان ئەوجار پێی بشێ، نەخێر، بەڵکو هەر لەسەر جوولەکایەتیی خۆی، یان لەسەر نەصرانییەتی خۆی بمێنێتەوە، دەگونجێ هاوسەری ئەو پیاوە مسوڵمانە بێ، شایانی باسە کە

زۆربەی زۆری زانایان مارەكردنی ئافرەتی خاوەن كتێبیان بەڕەوا زانیوە، بەڵام من نازانم بۆچی هێندێكیان بە ڕەوایان نەزانیوە، وەختێك خوای پەروەردگار بە ڕوونو ڕاشكاویی بفەرموێ: ﴿وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾، وە ئافرەتانی پاكیزەی خاوەن كتێبەكان كە لە پێش ئێوەدا كتێبیان پێدراوە، بۆتان حەڵاڵن، نەدەبوو هیچ كەس قسەی تێدا بكات، بەڵام بە هەرحاڵ هەندێ لە زانایان هەندێ شتیان گوتوە كە جێی پرسیارە! جاری وایە یەكیان هەستیار بووە بەرانبەر بە حاڵەتێك، یان بەرانبەر بە وەزعێكی سیاسیی، كە كاتی خۆی لەگەڵ جوولەكەكاندا شەڕ بووە، یان لەگەڵ نەصرانییەكاندا، گوتوویانە: چۆن دەبێ ئافرەتی وان بێنین؟! بەڵێ دەگونجێ وەك بەرژەوەندیی گشتیو، بەرژەوەندیی سیاسیی حوكمڕان بڵێ: نابێ بهێنرێن، بەڵام ناگونجێ بڵێ: حەرامە، وەك لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە هەیە، حوزەیفەی كوڕی یەمان خوا لێی ڕازی بێ، ئافرەتێكی هێنابوو جوولەكە بوو، یان نەصرانیی بوو، عومەر خوا لێی ڕازی بێ هەواڵی بۆ نارد، گوتی: تەڵاقی بدە، گوتی بۆچی، ئایا حەڵاڵ نییە؟! گوتی: با حەڵاڵە، بەڵام دەترسم تۆ ئەوە بێنیو مسوڵمانانیش ئافرەتی جوولەكەو نەصرانییەكان بێنن، سەرەنجام ئافرەتی مسوڵمانان بمێننەوەو ببنە قەیرەو كەس نەیانهێنێ، لەبەرئەوەی ئافرەتی ڕۆمەكان جوانترنو بەرچاوترن، مسوڵمانان ڕوویكەنە ئەوانو ئافرەتانی مسوڵمان بمێننەوە، لەبەرئەوە گوتوویەتی تەڵاقی بدە، نەك لەبەر ئەوەی كە حەڵاڵ نییە، ئنجا خوای كاربەجێ لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَنكِحُواْ ٱلۡمُشۡرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤۡمِنَّۚ ...٢٢١﴾، واتە: ئافرەتانی هاوبەش بۆ خوا دانەر مەهێنن تاكو ئیمان دێنن، لەوێ وا دەفەرموێ، كەچی لێرەش دەفەرموێ: ئافرەتانی پاكیزەی كە لە پێش ئێوەدا كتێبیان پێ دراوە، بۆ ئێوە حەڵاڵن، ئەوە چۆنە، ئایا تێكناگیرێن؟! زانایان ئاوا چارەسەریان كردوە دەڵێن: خوای كاربەجێ موشریكەكانی بە جیا باسكردوون، وە خاوەن كتێبەكانیشی بە جیا باسكردوون، بۆ وێنە: لە سووڕەتی (البَيِّنة)دا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ٦﴾،

واتــە: بێگومــان ئەوانــەی بێبــڕوان لــە خــاوەن کتێبەکــانو لــە هــاوبەش بــۆ خوادانەرەکـان، لـە ئـاگری دۆزەخـدا بـە هەمیشـەیی دەمێننـەوە، ئەوانـە خـراپترین زیندەوەرن، کەواتە: خوا ئەهلـی کیتـابی بـەجیا باسکردوونو هاوبەشـدانەرانیشـی بـە جیـا باسـکردوون، بۆیـە کـە لـەوێ دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَنكِحُوا۟ ٱلْمُشْرِكَٰتِ حَتَّىٰ يُؤْمِنَّ ...﴿٢٢١﴾﴾، واتـە: ئافرەتـانی هــاوبەش بــۆ خوادانــەر مــەهێنن، هــەتا ئیمـان نــەهێنن، ئافرەتـانی هاوبــەش بـۆ خوادانـەر شـتێکن، وە ئافرەتـانی خــاوەن کتێـب شـتێکی دیکـەن.

هەندێکیشیان گوتوویانە: ئەم ئایەتـەی سووڕەتـی (الـمائدة) ئایەتەکـەی سووڕەتی (البقـرة) کـە دەفـەرموێ: ئافرەتـانی موشـریك مـەهێنن، تایبـەت (تخصـیص) دەکـات، واتە: تەنیا ئافرەتـانی هاوبەشـدانەری بت پەرست مەهێنـن، بـەڵام ئافرەتــانی دیکە کە شــەریك بۆ خوا پەیدا دەکـەن مادام خاوەن کـتێب بـن، قـەیناکات، دیارە ئـەوەش لـە حاڵێکـدا ئافرەتـانی خـاوەن کتێبـیش بـە موشـریك لـە قەڵـەم بـدرێن، چـونکە ئـەوانیش دەڵێن: عـوزەیر کـوڕی خوایـەو عیسا کـوڕی خوایـەو، هاوبـەش بـۆ خـوا دادەنێن، ئنجا ئەگەر بە موشریکیش لە قەڵەم بدرێن، دەڵێن: ئـەو موشـریکانەی کە بڕوایـان بـە کتێبـی ئاسمانیی هەیـە، ئافرەتانیـان حەڵاڵە هاوسـەرگیریی یـان لەگەڵـدا بکرێ، بەڵام ئافرەتێکی هاوبەشدانەر کە بڕوای بە کتێبی ئاسمانیی نیەو بت پەرستە بۆ پیاوی مسـوڵمان حەڵاڵ نیـە، بـەڵام دیارە ئەگـەر ئـافرەتی خـاوەن کتێـب زیناکـەر بـێ، دیسـان دروسـت نیـە، پیـاوی مسـوڵمان هاوسـەرگیـریی لەگەڵـدا بکـات، چونکــە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلزَّانِى لَا يَنكِحُ إِلَّا زَانِيَةً أَوْ مُشْرِكَةً وَٱلزَّانِيَةُ لَا يَنكِحُهَآ إِلَّا زَانٍ أَوْ مُشْرِكٌ ۚ وَحُرِّمَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾﴾ النـور، واتـە: پیـاوی زیناکـەر تـەنیا ئـافرەتی زیناکـەرو هاوبەشـدانەر دەهێنـێ، هەروەها دەفـەرموێ: ﴿وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ﴾، (مُحْصَنات) واتـە: (عفیفـات) ئافرەتـانی پـاکیزە لەوانـەی پێش ئێوە کتێبیـان پـێ دراوە، یـەکێك بـۆی هەیـە بڵـێ: ئـەدی ئەگـەر ئـەو ئــافرەتە کاتی خۆی زیناکار بووبـێ؟ چـونکە ئێسـتا دەڵێن: ڕۆژئـاوا کچیان لـە دوای تەمـەنی پـازدەو شـازدە ســاڵییو بگـرە جاری وایــە لـە پـێش ئەوەشــدا کـچ نـامێننو زینـا

دەکەن، بەڵکو دەڵێن: ئەگەر کەسێك کچێکی هەبێ گەیشتبێتە تەمەنی هەژدەو نۆزدەساڵیی‌و زینای نەکردبێ، دەیبات بۆ لای دکتۆرێکی دەروونناس‌و دەڵێ: کچەکەم نەخۆشە، چونکە تا ئێستا دۆستێکی نیەو زینای نەکردوە! هەر بە جیددیی دەڵێن: کچێکی وا پێویستی بەوە هەیە پێشانی دکتۆرێکی بدەن کە تاکو ئێستا چۆنە هاوەڵێکی نیەو لەگەڵ کەسدا ڕای نەبواردوە؟! دەڵێ: دیارە کچەکەم نەخۆشی دەروونیی هەیە، کەواتە: ئایا مسوڵمانانێك کە لەوێ ژن دێنن، تەگبیریان چییە؟!

دیارە زانایان هەندێکیان دەڵێن: هەر ئافرەتێك زینای کردبێ، لە هی خاوەن کتێبەکان، پیاوی مسوڵمان بۆی نیە مارەی بکات، بەڵکو دەڵێن: هی مسوڵمانیش ئەگەر زینای کردبێ، با تۆبەش بکات، هەر دروست نیە، پیاوێکی داوێن پاك مارەی بکات.

بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: چ هی مسوڵمان، چ هی نامسوڵمان، ئەگەر زیناشی کردبێ، ئەگەر زانرا تۆبەی کردووە، ئێستا پاکیزەیەو چاکەو، وە ئێستا پابەندە بە شەریعەتەوە، ئەوە دروستە هاوسەرگیریی لەگەڵدا بکرێ، وە ئەم ڕایەش لە ڕاستییەوە نزیکترە، وە لەوبارەشەوە جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: {نَتَزَوَّجُ نساء أهل الكتاب ولا يتزوجون نسائنا} (أَخْرَجَهُ عَبْدُالرَّزَاق برقم: (٢٦٥٦))، واتە: ژنانی خاوەن کتێبان دێنین، بەڵام ئەوان ئافرەتی ئێمە ناهێنن، وە یەکدەنگیی زانایانیشی لەسەرە کە ئافرەتی مسوڵمان بە پیاوی جوولەکەو نەصرانیی ناشێ‌و پێش ئەوەش بە پیاوی بت پەرست ناشێ.

**مەسەلەی بیست‌و هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾، (أُجُور) کۆی (أَجْر)ە، (أَجْر) واتە: کرێ، بەڵام لێرەدا بە مانای مارەیی دێ، واتە: (مهُورهُنَّ)، ئەگەر مارەییەکانتان پێدان، چونکە لێرەدا ئەوە بۆ هەموویان دەچێتەوە: ئافرەتانی پاکیزەی ئیماندارو ئافرەتانی پاکیزەی خاوەن کتێب، واتە: ئەگەر هێناتان‌و مارەییەکانتان پێیان دان بۆ ئێوە حەڵاڵن، ئنجا لێرەدا یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە ئایا ئەگەر مارەییەکەی تەسلیم نەکات دروست نیە بیگوازێتەوە؟

هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن كە: با، ئەدی لێرەدا مەبەستی پێی چییە؟ وەڵام: یانی دەبێ مارەییەكەی بۆ بڕیاردابێ لە دڵی خۆیداو عەزمی جەزم كردبێ كە مارەییەكەی بداتێ، ئنجا ئەگەر عەزمی جەزم كرد، با مارەییەكەشی تەسلیم نەكردبێ، بۆی حەڵاڵە، ئەدی پیاوێك ئافرەتێكی هێناو لەسەر دوو سەد (٢٠٠) مسقاڵ زێڕ مارەی كردبوو، بەڵام عەزمی جەزم نەكرد بوو یەك مسقاڵیشی بداتێ، ئایا ئەوە حوكمی چۆنە؟ دەڵێین: بێگومان ئەو كەسە گوناهبارە، بۆچی؟ چونكە عەزمی جەزم كردوە، كە مارەییەكەی نەداتێ، ئنجا كە عەزمی جەزم كرد لەسەر پێنەدانی مارەییەكەی مانای وایە بۆی بە گوناه لە قەڵەم دەدرێ‌و خیانەتی لەو ئافرەتە كردوە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە كە دروستە ئەگەر مارەییەكەش تەسلیمی ئافرەتەكە نەكرێ، بیگوازێتەوە، ئایەتی (٢٣٦) لە سوورەتی (البقرة)یە، كە دەفەرموێ: ﴿ لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ ٱلنِّسَآءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا۟ لَهُنَّ فَرِيضَةً ...﴿٢٣٦﴾ ﴾، واتە: گوناهتان ناگاتێ ئافرەتان تەڵاق بدەن، بە مەرجێك دەستتان نەیانگەیاندبێتێ، واتە: نەتانگواستبنەوەو نەچووبنە لایان، وە مارەییتان بۆ دانەنابن، كەواتە: دروستە ئینسان ئافرەت مارە بكات، بەبێ ئەوەی مارەیی بۆ دابنێ، وە دروستیشە بشیگوازێتەوە، پێش ئەوەی مارەییەكەی تەسلیم بكات، بەڵام قەرزە لەسەری‌و لە ئەستۆی دایە.

**مەسەلەی بیستو نۆیەم :** كە دەفەرموێ: ﴿ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ ﴾، وە نەبێ هەر پیاوان چاو بۆ ئافرەتانی عەفیفەو پاك بگێڕن، بەڵكو پیاویش دەبێ داوێن پاك بێ‌و نەبە ئاشكرا نەبە پەنهان داوێن پیسی نەكات، ئەگەر بیەوێ ئافرەتێكی داوێنپاك بێنێ ﴿ مُحْصِنِينَ ﴾، واتە: خۆ پارێز ﴿ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ ﴾، واتە: ئەوانەی كە ئاوی خۆیان نارێژن لەگەڵ هەر ئافرەتێك كە پێی گەیشتن زینای لەگەڵدا بكەن، ﴿ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ ﴾، واتە: دۆستی پەنهان ناگرن، (مسافح) كەسێكە لەگەڵ هەركەسێك بۆی رێك كەوت، زینا بكات (أَخْدَان) كە كۆی (خِدْن)ە، واتە: دۆستی تایبەتی كە زینای لەگەڵ بكات، چ پیاو چ

ئافرەت، دیارە ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر دروست نەبوونی نیكاحی ئافرەتی پاكیزە لە پیاوی زیناكەر، وەك پێشتر هێنامان، بەڵام پیاوەكە ئەگەر زیناشی كردبێ، بەڵام دوایی تۆبە بكات و بگەڕێتەوە لای خوا، وەك چۆن بە نسبەت ئافرەتەكەشەوە هەر وایە، ئەوكاتە دیارە دروستە كە بیهێنێ، لەوبارەشەوە ئەم شوێنەوارە هەیە: ﴿عَنِ الحَسَنِ قَالَ: قَالَ عُمَرُ بنُ الخَطَّابِ: لَقَدْ هَمَمْتُ أَنْ لا أَدَعَ أَحَداً أَصَابَ فَاحِشَةً فِي الإِسلامِ أَنْ يَتَزَوَّجَ مُحْصَنَةً! فَقَالَ لَهُ أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ: يَا أَمِيرَ الْمُؤمِنِينَ، الشِّركُ أَعْظَمُ مِنْ ذَلِكَ، وَقَدْ يُقْبَلُ مِنْهُ إِذَا تَابَ!﴾ {رَوَاهُ إبْنُ جَرِيرٍ برقم: ١١٢٦٧﴾[1]، ئیبنو جەریر لە حەسەنی بەصریییەوە هێناویەتی، كە عومەری كوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: ویستم هەر پیاوێك زینای كردبێ، ڕێگەی پێنەدەم ئافرەتی پاك و پاكیزە مارە بكات، با تۆبەشی كردبێ، ئوبەی كوڕی كەعب (كە یەكێكە لە هاوەڵان و زۆر شارەزا بووە)، گوتی: ئەی فەرماندەی بڕواداران! شەریك بۆ خوا پەیدا كردن گەورەترە لە زینا كردن، كە تۆبەشی كرد لێی قبووڵ دەكرێ، واتە: وەكو چۆن كابرایەكی كافر كە مسوڵمان بوو لێی قبووڵ دەكرێ و شیرك و كوفرەكەی لە كۆڵ دەبێتەوە، زیناكەرێكیش كە زینای كردوە، ئەگەر تۆبەی كردو گەڕایەوە، گوناهەكەی لە كۆڵ دەبێتەوە، كەواتە: دروستە ئافرەتی ئیماندار بێنێ، دیارە عومەریش خوا لێی ڕازی بێ نەیگوتوە بڕیار دەدەم، گوتوویەتی: خەریك بوو بڕیار بدەم، واتە هێندە بە داوێنپیسی قەڵس بووە، گوتوویەتی: ویستم شتێكی وابكەم، بەڵام ئوبەی كوڕی كەعب گوتی: ئەوە مەكە، چونكە ئەوە ڕەوانیە، هەڵبەتە وەكو پێشتر گوتمان مەبەست لە (مسافحین) (المجاهرین بالزنا)یە، واتە: ئەوانەی كە بە ئاشكرا زینا دەكەن، یاخود لەگەڵ هەر كەسێكدا بۆیان ڕێككەوت، داوێنپیسی دەكەن (الَّذِينَ يَفْعَلُونَ الزِّنَى مَعَ كُلِّ مَنِ اتَّفَقَتْ مَعَهُ) ﴿مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ﴾، یانی: (المُسِرِّين بالزنی) واتە: ئەوانەی كە بە پەنهانیی زینا دەكەن، یاخود ئەوانەی كە (الَّذِينَ يَزنُونَ مَعَ العَشِيقَاتِ) ئەوانەی كە زینا دەكەن لەگەڵ ئافرەتانێكی تایبەتدا كە لەگەڵیاندا ڕێك كەوتوون، كەواتە: ئایەتەكە دەفەرموێ: ئێوە دەبێ پاك بن ئەی پیاوینە! نە بە ئاشكرا زینا بكەن، نە بە پەنهانیی، نە بە گشتی هەر كەسێكی بۆتان ڕێككەوت زینای لەگەڵدا بكەن،

---

١) بڕوانە: محاسن التأويل: ج٦، ص٩٢.

نە بەتایبەتی لەگەڵ ئافرەتێکی دیاریکـراودا.

**مەسـەلەی سـێیەمو کۆتـایی:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾، هـەر کەسێك کـوفر بـە ئیمـان بکـات، ئـەوە بێگومان کردەوەکەی هەڵوەشـاوەتەوە، لێرەدا ئیمـان چاوگ (مصدر)ەو مەبەست پێی ئەو شتەیە کە ئیمانی پـێ دەهێنرێ، هەر کەسێك کوفـر بکات بەو شـتەی کـە ئیمانی پـێ دەهێنـرێ، جا ئـەو شـتەی ئیمـانی پـێ دەهێنـرێ چییە؟ خـوای بـێ وێنـەیە، فریشـتەکانن، کتێبەکـانن، پێغەمبەرانن، ڕۆژی دوایـی یـە، هـەر کەسـێك کـوفر بکـات بـە خـواو بـە فریشـتەکانیو بـە کتێبەکـانیو بـە پێغەمبـەرانییو بـە ڕۆژی دوایـی، یـاخود بـە یـەکێکیان، ئـەوە کردەوەکـانی هەڵدەوەشـێنەوە، واتـە: بـا مسـوڵمان بـێو کـردەوەی باشـی کردبـێ، ئەگـەر کـوفری کـرد، کردەوەکـانی هەڵدەوەشـێنەوە، وە دەشـگونجێ مەبەسـت لـەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ﴾، ئەوەبێ کە کوفر بکات بـە یاسـاکانی ئیسـلام، چونکە یاسـاکانی ئیسـلام بەرجەسـتەکەری ئیمـانن، ئیمـان لەوانـدا بەرجەسـتە دەبـێ، کـە قەناعـەتی پێیـان بـێو پێیانـەوە پابەندبـێ، یـەکێك لێـرەدا بـۆی هەیـە بڵـێ: باشـە ئەگـەر کەسـێك ئیمـانی هەیـەو هەڵگەڕایـەوە، بـەڵام دوایـی مسـوڵمان بـووەوە، ئایـا کردەوەکـانی هـەموو هەڵوەشـاونەوە؟ بـۆ وێنـە: هـەموو ڕۆژووەکـانی دەبـێ بگرێتـەوەو هـەموو نوێژەکان دەبـێ بکاتەوەو، حەجی کردبـێ، دەبـێ حەجەکەی بکـاتەوە، زانایـان دوو ڕایـان هـەن:

هەنـدێکیان دەڵـێن: هـەر کەسـێك هەڵبگەڕێتـەوە، کردەوەکـانی هـەموو هەڵدەوەشێنەوە، وە بۆ دوایی قـەرزدارە.

بـەڵام هەنـدێکیان دەڵـێن: نـەخێر، کـە هەڵگەڕایـەوە کردەوەکـانی هەڵدەواسـرێن، ئەگـەر ئیمانی هێنایـەوە، هـەر لەجـێی خۆیـان، بـەڵام ئەگـەر ئیمـانی نەهێنایـەوەو لەسـەر کـوفر مـرد، ئەوکاتـە کردەوەکـانی هەڵدەوەشـێنەوە، وە ئـەو ڕایـەش ڕاسـتە، چونکـە ئـەوە دەقـی ئایـەتی لەسـەرە خـوا لـە سـوورەتی (البقـرة) کـە لـەوێ بـە

تەفصیلێ باسمان کردوە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ ۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٢١٧﴾﴾البقرة، واتە: وە هەر کامێك لە ئێوە لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوەو بە کافریی بمرێ، ئا ئەوانە کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوە لە دنیاو لە دوارۆژدا، وە ئەوانە هاوەڵی دۆزەخن، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، کەواتە: کەسێك لەسەر کوفر بمرێ، کردەوەکانی هەڵوەشاونەوە، ئەدی ئەگەر لەسەر کوفر نەمرد، کەسێك هەڵگەڕایەوەو دوایی ئیمانی هێنایەوە، ئەوە کردەوەکانی هەڵناوەشێنەوە، ئەوەش دیارە دەقی ئایەتی لەسەرە، وە هەر ئەوەش زیاتر لە ڕەحمەتو بەزەیی بێسنووری خوای پەروەردگار چاوەڕێ دەکرێ.

خوای بە بەزەیی بە لوتفو کەرەمی خۆی سەرەنجاممان خێر بکات، وە بەبێ ئیمانی نەمانمرێنێ، بەڵکو بە ئیمانی تەواوەوە بچینەوە خزمەتی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دووەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لەم دەرسـەماندا ئایەتـەکانی (٦ و ٧) تەفسیر دەکـەین، لـەم دوو ئایەتـەدا خـوا ﷻ لـە ئایەتی یەکەمیاندا باسی دەستنوێژ گرتن‌و، خۆشۆردن، وە لە کاتی نـەبوونی ئاویشـدا بـۆ دەسـتنوێژو خۆشـۆردن باسـی تەیـەمموم دەکـات، پاشـان باسـی حیکمـەتی دەسـتنوێژو خۆشۆردن‌و تەیەممومیش دەکات، کە بریتییە لەوەی مسـوڵمانان پاکـببنەوە، هەم پاکیی ڕواڵەتیی، هەم پاکی مەعنـەویی، وە شـایانی باسـە ئـەم ئایـەتی ژمـارە (٦)ە، لـە سـوورەتی (المـائدة)، تاکە ئایەتێکە بە تایبەت باسی دەسـتنوێژو خۆشـۆردن‌و تەیـەمموم پێکـەوە بکـات، ئایەتی ژمارە (٤٣)مان هەیە لە سـوورەتی (النِسـاء)دا لەوێشـدا خـوای کاربـەجێ، باسی خۆشۆردن‌و تەیەمموم دەکات، بەڵام لەم ئایەتەدا باسی دەستنوێژو خۆشـۆردن بـە ئاو، وە ئەگەر ئـاو نەبوو بۆ هەر کام لـە دەستنوێژو خۆشـۆردن لـە جیاتیـان تەیـەمموم بکـرێ دەکات، وە ئەم ئایەتە زانایان زۆر گرنگییان پێداوە، لە هەنـدێ لـە تەفسـیرەکاندا دەیـان لاپـەڕەیان لەسـەر نووسـیوە، وە (إبنُ العَرَبِي) لـە کـتێبی (أحكام القُرآن)ەکـەی خۆیدا باسی کـردوە، دەڵـێ: زانایان گوتوویانـە: هـەزار حـوکمی شـەرعیی لـەم ئـایەتە وەردەگیرێ، وە دەڵـێ: هاوەڵانی ئێمە (واتە: مالیکییەکان) لە شاری بەغـداد دانیشـتوون نەیانتوانیوە هەزار یاسـا، بەڵام هەشـت سەد حوکمی شـەرعییان لـەم ئایەتـە دەرهێنـاوە، وە لـە ئایـەتی دووەمـدا خـوای بـەرزو مـەزن بـە بـڕواداران دەفـەرموێ: پەیمانەکـەی یـاد بکەنەوە، ئەو پەیمانە پتەوەی کە لەگەڵیـدا بەسـتوویانە، پـارێزی لـێ بکـەن، وە بشـزانن کە خوا نهێنییەکانی نێو دڵ‌و دەروونیشـیان دەزانـێ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ
إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا
فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ
ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم
مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ
نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦ وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ
وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ
بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٧ ﴾

# مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! هـەر کـات بـۆ نوێـژ هەڵسـان، ڕووتـان بشـۆن، وە هەردووك دەستیشـتان هەتا ئانیشـکان، (بشـۆن) وە دەسـتی تـەڕ بەسـەرتاندا بێـنن، وە لاقەکانیشـتان بشۆن هەتا دوو گوێزینگەکان، وە ئەگەر لـەش پـیس بـوون، خۆتـان پـاك بکەنـەوە (بـە هـۆی خۆشـۆردنەوە)، وە ئەگـەر نـەخۆش بـوون، یـان لـە سـەفەربوون، یـان یەکێکـتان لە شوێنی نزم (ی تارەت تێـداگرتن) هاتـەوە، یـان دەسـتتان گەیانـدە ژنـان، وە ئاویشـتان چـنگ نەکـەوت، ئـەوە ڕوو بکەنـە ڕووی پـاکی زەوی و پـاش دەسـتپێداهێنانی، دەست بە ڕووتان و دەستەکانتاندا بێنن، خوا نـایەوێ هیچ سـەغڵەتییەکتان بخاتـە سـەر، بـەڵکو دەیـەوێ پاکتـان بکـاتەوەو چـاکەی خۆیتـان لەسـەر تـەواو بکـات، بـەڵکو سـوپاسگوزاریی بکـەن ﴿٦﴾ وە چاکـەی خـوا بەسـەر خۆتانـەوە یادبکـەنەوەو ئـەو پەیمانەی کە لەگەڵی بەستن کـە گوتتـان: بیسـتمان و فەرمانبەریمان کـرد، وە پـارێز لـە خوا بکـەن، بێگومان خـوا بـە (نهێنـی یـە) خاوەن سـینەکان زانایە ﴿٧﴾)).

# شـیکردنــەوەی هــەندێـك لە وشـــەكان

(وُجُوهَكُمْ ): (وُجُـوه) كـۆی (وَجْـه)ە، (الوَجْـهُ: مَـا يُواجِهُـكَ مِـنَ الـرَّأسِ، أَوَّلُ مَـا يَستَقْبِلُكَ)، (وَجْه) لەسەری ئینساندا ئەوەیە كە ڕووبەڕووی تۆیە، یان پێشـەوەی سـەری ئینسان پێی دەگوترێ (وَجه)، واتە: ڕوو، بە كوردی ئێمە دەڵێین: دەمو چاو، وە دەشـڵێین: (ڕوو).

(ٱلْمَرَافِقِ ): (جَمعُ مِرْفَق، تَوْصِيلُ الذِّراعِ فِي العَضُدِ) دەڵێ: (الْمَرافِق) كۆی (مِرفَق)ە، (مِرفَق) بـە كـوردی واتــە: ئانیشـك، دەڵــێ: بـە یـەك گەیەنـەری باسـكو قۆڵــە، پێكـیان دەگـەیەنـێ، پێی دەگوتـرێ: ئانیشـك.

(ٱلْكَعْبَيْنِ ): دوو (كَعْـب)ە، واتــە: (مُثنَـى)ی (كَعْـب)ە، (الكَعْـب: العَظْـمُ الَّـذِي عِنْـدَ مُلتَقَى القَدَمِ وَالسَّاقِ)، (كَعْب) ئەو جومگەیەیـە كـە پـێو لاق بەیـەك دەگەیـەنێ، كـە هـەموو پێیـەك دوو گـوێزینگی هـەن، گـوێزینگی دەرێو هـی ژووری، گـوێزینگ تۆزێـك خـڕە، بۆیـەش پێـی دەگوترێ (كَعْب) كـە (مُثنّـى)یەكـەی (كَعبين)ە، وە كچۆڵــە كـە تـازە مـەمك دەكـات، پێـی دەگوترێ: (إمْرَأَة كَـاعِب) واتـە: ئـافرەتێكی تـازە مەمك كـردوو.

(جُنُبًا ): (جُنُب) واتە: لەش پیس، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی لـەش پیســیی گەورەیـە، واتــە: جەنابـەتی لەسـەر بـێ، دەڵێ: (أجنبـتم جُنُبـاً: أَي أَصَابَتْكُم الجَنَابَةُ وَسُمِّيَتْ بِذَلِكَ لِكَونِها سَبَبَاً لِتَجَنُّبِ الصَّلاَةِ) بۆچی بە ئینسـانی لـــەش پـیس (واتــە: بـێ دەســتنوێژیی گـەورە) دەگـوترێ: (جُنُب)؟ چونكە كەســێك كـە بـێ دەســتنوێژیی گەورەی لەســەر بـێ، كـە پێـی دەگوتــرێ: (الحَـدَثُ الأَكْبَـر)، واتـە: لـەش پیســی گەورە، بۆی نیـە نوێـژ بكات، هەڵبەتـە بـە هـۆی بـێ دەسـتنوێژیی گچكەشـەوە هـەر نوێـژ نـاكرێ، بـەڵام بـە هـۆی بـێ دەسـتنوێژیی گـەورەوە نوێـژ نـاكرێ، نابـێ بچـیە مزگەوت، وە نابێ قوڕئـان بخوێنــێ، نابــێ طەواف بكـەی، كۆمەڵێك شت لە ئینسـان قەدەغـە دەكـرێن، واتــە: لـەو حاڵەتـەی لـەش پیســیدا ئینســان لـە زۆرێـك لـە طاعەتەكان دوور دەكەوێتــەوە.

(ٱلۡغَآئِطِ ): لە زمانی عەرەبیدا (غَائِط) واتە: شوێنی نزم، جا کاتی خۆی دیارە سەر ئاو، ئاودەستو شت نەبووە، چوون لە شوێنی نزم تارەتیان گرتوە، ئێستاش لە هەندێك شوێنان وا دەکەن، لە شوێنی نزمو پەنهان پێویستیی جێبەجێ خۆیان دەکەن، ئەسڵی خۆی (غَائِط) واتە: شوێنی نزم، بەڵام دوایی بە عەینی تارەتگرتنیش گوتراوە: (یتغوط)، واتە: تارەت دەگرێ، دوایی هەر بە عەینی پاشەڕۆکەکەی ئینسانیش دەگوترێ: (غَائِط)، دەڵێ: (الغَائِطُ: الْمنخفضُ الواسِعُ مِنَ الأَرْضِ كِنَايَةٌ عَنِ التَبَرُّزِ والبِرازُ نَفْسُهُ) شوێنی فرەوانی نزم، وە کینایەیە لە فڕێدانی پاشەڕۆك، واتە: تارەت گرتن، وە بە عەینی پاشەڕۆکەکەش دەگوترێ: (غَائِط) هەرچەندە لە ئەسڵی زماندا مانایەکەی وا نیە، جا بۆ زانیارییتان لە قورئاندا ئەو شتانەی کە جوان نیە لە مەجلیسێ ناویان بهێنرێ، هیچیان خوا ﷻ بە زەقی ناوی نەهێناون، بۆ وێنە: لێرەدا بۆ تارەت گرتن، دەفەرموێ: ئەگەر یەکێکتان لە شوێنی نزم هاتەوە، لەسەر ئاوێ هاتەوە، نافەرموێ: چوو فلان شتەی کرد! یان بۆ پێکەوە جووت بوونی پیاوو ئافرەت، دەفەرموێ: ﴿لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ المائدة، دەستتان گەیاندە ئافرەتان، یان دەفەرموێ: ﴿أَفۡضَىٰ بَعۡضُكُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ ٢١﴾ النساء، هەندێکتان چوونە لای هەندێکتان، یان ﴿مِّن قَبۡلِ أَن يَتَمَآسَّا ٤﴾ المجادلة، پێش ئەوەی دەستیان بگاتە یەك، کە مەبەستی پێی جیماعە، بەڵام خوا بە کینایە دەیفەرموێ، ئنجا ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە مسوڵمانانیش دەبێ لەبەرو مەجلیسیاندا، ئەو شتانەی کە جوان نیە بە ناوی زەقی خۆیان ناو بهێندرێن، نابێ ناوی زەقی خۆیان لێ هەڵبدرێ.

(لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ): (اللَّمْسُ إدْرَاكٌ بظَاهِرِ البَشْرَة، وَيُكْنَى بهِ وَبِالْملامَسَةِ عَنِ الجِماعِ)، (لَمْس وَمَسّ) واتە: پێست بە پێست بکەوێ، بەڵام وشەی (لَمْس) یان وشەی (مَسّ) لەگەڵ وشەی (مُلامَسَة) بە (كِناية) لە زمانی عەرەبیدا بە کوردی دەبێتەوە دەبەرڕاهاوێشتن، واتە: لە پەناوە پێی بڵێی، نەك بە ڕاشکاویی، (كِناية) لە چی؟ لە پێکەوە جووتبوونی پیاوو ئافرەت، خوای پەروەردگار وشەی (لامَسْتُم)ی بۆ

بەکارهێناوە، ﴿أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، واتە: دەستتان گەیاندە ئافرەتان، کە مەبەست پێی ئەوەیە لەگەڵیان جووت بوون.

(فَتَيَمَّمُواْ): وشەی (تَيَمَّم) واتە: (قَصَدَ) دەڵێ: (يَمَّمْتُ كَذَا، وَتَيَمَّمتُهُ: قَصَدتُهُ)، (يَمَّمتُ كَذَا) بەرەو فلان شتە چووم، (وَتَيَمَّمْتُهُ قَصَدتُهُ) واتە: کردم بە ئامانج، کە بەرەو لای بچم، کە دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾، بڕۆن بەرەو زەوییەکی پاك، بڕۆن بەرەو ڕووی زەوی پاك، واتە: ئەوە لە جیاتی ئاو بەکاربێنن، وەکو بە دیل بۆ ئاو، کەواتە: وشەی (تَيَمّم) کە ئێستا ئێمە وادەزانین بە مانای بەکارهێنانی گڵە، لەڕاستیدا وانیە لە ئەسڵی زمان دا.

(صَعِيدٗا طَيِّبٗا): (صَعيد) هەندێکیان بە گڵیان لێك داوەتەوە، خۆڵ، خۆڵێك کە تۆزی هەبێ غوباری هەبێ، بەڵام زۆریان بە ڕووی زەویان لێك داوەتەوە، جا ئەوە زۆری شت لەسەر بینا دەکرێ، دوایی بە تەفصیلی باسی دەکەین، ئەگەر مەبەست لە (صعيد) ﴿صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾، واتە: گڵێکی پاك، ئەگەر مەبەست گڵ بێ (تَيَمّم) تەنیا بە گڵ دەکرێ، بەڵام ئەگەر مەبەست ڕووی زەوی بێ کە ئەو مانایە ڕاستە، وە بەڵگەی زۆرم لەسەر هێناوەتەوە، ئەوە مانای وایە بە هەموو شتێك لەسەر ڕووی زەوی (تَيَمّم) دەکرێ، وە لەڕاستیدا هەر ئەو ڕایەش ڕاستە، کەسێك لە نێو بەفر بێ، وە من بۆخۆم لە نێو بەفر بووم، دەستت ناگاتە گڵ، جاری وایە مەترو نیوێك بەفر باریوە، مەترو نیوێك بەفرێ لابەرە، ئنجا دوایی سێ مەتریش هەڵیقەنە هەر ناگاتە گڵ، لەوانەیە عەرزەکە تەڕ بێ، یان لە بەستەڵەك، لە چیایە، لە بیابان، هەر گڵی لێ نیە، جا هەندێك لە شەرعزانان ڕەحمەتی خوایان لێ بێ گوتوویانە: نا، حەتمەن دەبێ گڵێك بێ تۆزی هەبێ، یەکێك لەوانە ئیمام شافیعییە، وا پێدەچێ لە شوێنێك بوو بێ گڵی زۆر لێ بوو بێ، ئێستا دنیا زۆر فرەوانە، شوێنی وا هەیە هەر ناگەیە گڵ، هەمووی شاخو چیایە، هەمووی لەو بیابانە، یان هەمووی بەفرو بەستەڵەکە، تەماشا بکەن!
خوای زاناوشارەزا چ وشەیەکی بەکارهێناوە، دەفەرموێ: ﴿صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾، ڕووی

پاكی زەوی، ئەگەر فەرموویای: (تُرَاب) هەر گڵی دەگرتەوە، خەڵك تووشی سەغڵەتیی دەبوون.

(**حَرَجٍ**): (الضَّيْقُ أَو الإِثْمُ، وَهُوَ فِي الأَصْلِ مُجتَمَعُ الشَّيْئَيْنِ)، (حَرَج) بە مانای سەغڵەتیی و تەنگیی دێ، بە مانای گوناهیش دێ، لە ئەسڵدا بە مانای دوو شت کە پێکدەگەن، جا نێو قەدەکەیان تەسکەو هێندە تەنگ دەبێ دەبێتە تەنگەبەر، ئەوە پێی دەگوترێ: (حَرَج)، کە دەفەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾، خوا نایەوێ هیچ سەغڵەتییتان لەسەر دابنێ و تووشی سەغڵەتیتان بکات.

(**وَمِيثَٰقَهُ**): (المِيثَاقُ: عَقْدٌ مُؤَكَّدٌ بِيَمِينٍ وَعَهْد)، (المِيثَاق) پەیمانێکە جەختی لەسەر کراوەتەوە، بە هۆی سوێند لەسەر خواردن و پەیمان لەسەر دانەوە، واتە: دەست خستنە نێو دەستی یەکدی.

## هـۆی هاتنـه خـوارەوەی ئایـەتـەکان

هـۆی هاتنـه خـوارەوەی ئـەم ئایەتـه موبارەکـەی کـه دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦﴾، دوو شـت گێڕدراوەنـەوە:

أ/ «عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، سَقَطَتْ قِلادَةٌ لِي بِالْبَيْدَاءِ، وَنَحْنُ دَاخِلُونَ الْمَدِينَةَ، فَأَنَاخَ النَّبِيُّ ﷺ وَنَزَلَ فَثَنَى رَأْسَهُ فِي حَجْرِي، رَاقِدًا أَقْبَلَ أَبُو بَكْرٍ فَلَكَزَنِي لَكْزَةً شَدِيدَةً، وَقَالَ: حَبَسْتِ النَّاسَ فِي قِلادَةٍ؟! ثُمَّ إِنَّ النَّبِيَّ ﷺ اسْتَيْقَظَ وَحَضَرَتِ الصُّبْحُ فَالْتُمِسَ الْمَاءُ، فَلَمْ يُوجَدْ فَنَزَلَتْ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ...﴾، فَقَالَ أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ: لَقَدْ بَارَكَ اللهُ لِلنَّاسِ فِيكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ» {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرَقْمِ: (٤٣٣٢)}، واتە: دایكمان عائیشـه خوا لـێی ڕازی بـێ، (دیـارە لـه یـەكێك لـه جەنگەكانـدا كـه چوون، یـان سـەفەرێك بـووە)، دەڵـێ: گـەردن بەنـدێكم (ملوانكەیـەكم) لـێكەوتبوو لـه بیـابان، لـه كاتێكـدا ئێمـه بـەرەو مەدینـه دەگەڕاینەوە، (كه ملوانكەكەی لـێكەوتوە، ڕەنگـه لەسەر ئاو لـێی كـەوتبێ، یـان لـه نێو كەژاوەكه لێی كەوتبێته خوارێ، سـەرنج بدەن! پێغەمبەری خـوا ﷺ چـەند بـه لوتف بووە، لەگەڵ ماڵو خێزانی خۆیدا) ئەو سـوپایەی هەموو ڕاگرتو فـەرمووی: ڕاوەسـتن، وە لە شـوێنێك بارگەو بنەیان خسـت، بۆئەوەی ئەو ملوانكەو گەردن بەنده بدۆزنـەوە، ئنجا دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دابـەزی، وە سـەری بـه كۆشـی مـن كـرد، سـەرخەوێك

بشکێنێ، (دیارە هاوەڵان گەڕاون تاکو ئەو ملوانکەیە بدۆزنەوە) ئەبوبەکر هات، (واتە: بابی عائیشە خوا لێیان ڕازی بێ) مستێکی توندی لێدام (لَكْزَة: ئەوەیە بە پانایی دەستی، یاخود بە مستێکی توند لە کەسێك بدەی)، وە پێی گوتم: خەڵکت لەسەر ملوانکەیەك ڕاگرتوە؟! (ئنجا لەبەرئەوەی سەری پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕانم بوو، (لە ڕیوایەتی دیکەدا عائیشە دەڵێ: ئەبوبەکر خۆشی دەپاراست لەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ خەبەر بکاتەوە، لە ڕیوایەتی دیکەدا دەڵێ: منیش لەبەرئەوە نەبا سەری پێغەمبەر ﷺ لەسەر ڕانم بوو هێندەم ئازار پێ گەیشت هەڵدەستام)، دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ خەبەری بووەوە، وە نوێژی بەیانیش بوو، (دیارە شەو بووە ئیسراحەتیان کردوە)، گەڕان بۆ ئاوێ ئاویان چنگ نەکەوت، وە ئەم ئایەتە هاتە خواری: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ ... لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژێ، کە هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن: واتە: ئەگەر لە خەوێ هەڵسان بۆ نوێژێ.

جا دەڵێ: (أُسَيْدُ بْنُ حُضَيْرٍ کە (یەکێکە لە هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر ﷺ پیاوێکی بەرجەستەی ئەنصارییەکانە)، گوتی: (لَقَدْ بَارَكَ اللهُ لِلنَّاسِ فِيكُمْ يَا آلَ أَبِي بَكْرٍ)، واتە: بەڕاستی خوا بەرەکەتی خستۆتە خەڵکیەوە بە هۆی ئێوەوە ئەی بنەماڵەی ئەبوبەکر! بە هۆی ئەو گرفتەی دایکمان عائیشەوە، خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوارێ، کە ئەگەر ئاوت چنگ نەکەوت، چ بۆ خۆشۆردن، چ بۆ دەستنوێژ گرتن، بۆتان هەیە تەیەمموم بکەن، واتە: دەست بە ڕووی زەویدا بێنن.

ب/ ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ الزُّبَيْرِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عَائِشَةَ رضِيَ اللهُ عَنْهَا، قَالَتْ: لَمَّا كَانَ مِنْ أَمْرِ عِقْدِي مَا كَانَ، قَالَ أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا، فَخَرَجْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي غَزْوَةٍ أُخْرَى فَسَقَطَ أَيْضًا عِقْدِي حَتَّى حَبَسَ النَّاس الْتِمَاسُهُ، فَقَالَ لِي أَبُو بَكْرٍ يَا بُنَيَّةُ فِي كُلِّ سَفْرَةٍ تَكُونِينَ عَنَاءً وَبَلاءً على النَّاس، فَأَنْزَلَ اللهُ الرُّخْصَةَ في التَّيَمُّمِ، فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ: وَاللهِ يَا بُنَيَّةُ إِنَّكِ لَمُبَارَكَةٌ﴾{أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٣٨٤) تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح وهذا إسناد حسن، والطَّبَراني، والسيوطي في لُباب النقول في أسباب النزول برقم: (٣٩١)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر خوا لە

خۆی‌و بابی ڕازی بێ دەگێڕێتـەوە، دەڵـێ: دایکمــان عائیشــە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: ئەو ملوانکەیەم کە لـە جەنگـێکی پێشـتردا لــێ کەوتبوو، وە بوختانچییەکان ئـەوەی گوتیــان گوتیــان، بـەڵام جارێکــی دیکـە لەگـەڵ پێغەمبــەری خـوادا ﷺ بـۆ جـەنگێکی دیکــە چــووم، (پێغەمبــەری خـوا عـادەتی وابـوو بـۆ جەنگـەکان قورعـەی لـە نێـوان خێزانەکانی دا دەکرد، کامیان قورعەی بۆ دەرچووبا، لەگەڵ خـۆی دەیبــرد، وە زۆر لـە هــاوەڵانی دیکــەش هاوســەری خۆیــان لەگــەڵ بــوو، نــان‌و چێشــتیان بــۆ لــێ‌دەنان، برینــداریان دەرمــان دەکــردن، خزمــەتیان دەکــردن ...، وە جــاری وایــە بەشــداریی جەنگیشـیان کردوون، دەڵێ) دیسـان لەو جەنگەی دیکەشـدا ملوانکەیەکم لــێ کەوت، وە بە هۆی ئەوەوە خەڵك ڕاوەستان‌و پێغەمبـەر ﷺ ســوپاکەی ڕاگـرت، (دیـارە دەبـێ ئەو ملـوانکـەیە قیمـەتی بــووبێ‌و، ویســتوویانە بـۆی بدۆزنــەوە) ئـەبو بـەکر پێـی گوتـم: (واتە: بابی عائیشــە) کچی خـۆم لـە هەموو سـەفەراندا تـۆ هـەر دەبیـە مایـەی نارەحەتیی‌و گرفتاریی بۆ خـەڵکی، (پێـی نـاخۆش بـووە کە بـە هـۆی کچەکەیەوە ئـەو سوپایە ڕابوەستێ‌و ئەزیەت ببینن، نەیزانیوە خوای پەروەردگار حیکمەتێکی گـەورەی خستۆتە نێو ئەو ئیشـەوە) خوای پـەروەردگاریش مۆڵەتی تەیـەمومی نـاردە خـوارێ، دوایــی ئەبوبــەکر پێــی گـوتم: وەڵــڵاهی ڕۆڵــە، کچــی خـۆم تـۆ دیــارە ئــافرەتێکی موبــارەکی، بە هۆی ئەو گرفتەی تۆوە خوای بـە بەزەیــی ئـەو مۆڵـەت‌و ڕوخصـەتەی بـۆ مســوڵمانان نــاردە خـوار، کـە ئەگـەر ئاویـان دەسـت نەکـەوت بـۆ دەسـت نوێـژو خۆشـۆردن تەیەمموم بەکاربێنن.

# مانـــای گـشـــتی ئایەتەکـــان

خوا ﷻ لەم سوورەتەدا، بۆ جاری سـێیەم، تـا ئێسـتا دوو جاری فـەرمووە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، جارێکیـان فـەرمووی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ بِٱلْعُقُودِ ﴾، لـە ئایـەتی یەکەمـدا، لـە ئایـەتی دووەمـدا فـەرمووی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحِلُّواْ شَعَـٰٓئِرَ ٱللَّهِ ﴾، یەکەمیان فەرمووی ئەی ئیمانداریـنـە! پەیمانەکان بـە تـەواویی جێبـەجێ بکـەن، لـە ئایـەتی دووەمـدا دەفـەرموێ: ئـەی ئیمانداریـنـە! دروشمـەکانی خـوا مەشـکێنن، بـێ حورمەتییان پـێ مەکەن، ئنجا بۆ جاری سێیەم دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! هـەر کات بـۆ نوێـژێ هەڵسـان.. وەك لە سوورەتی (البقرة)شدا باسم کردوە، هەندێ کەس ڕەخنـەی ئـەوەیان لـە قورئـان گرتـوە ئـەو چاوەڕوانییەیـان لـە قورئـان هەیـە، کـە لـە کتێبێـك کـە بەشـەر دایدەنـێ هەیـانە، کە لەو شوێنەدا باسی دەستنوێژ دەکات، هەر باسی دەسـتنوێژێ دەکات، وە لـەو شوێنەدا کە باسی خۆ شـۆردنە، هەر باسی ئەوە دەکات، وە لەو شوێنەدا کە باسی حەڵاڵ‌و حەرام دەکات هەر باسی ئەوە دەکات، وە لەو شوێنەدا کە باسی هاوسەرگیریی دەکات، هەر باسی ئـەوە دەکات، لـەو شـوێنەدا کـە باسی جـەنگ‌و ئاشـتی دەکات هـەر باسـی ئـەوە دەکـات، بـەڵام لـە قورئانـدا ئـەو بابەتانـە هـەموویان تێکەڵـن، بەڵـێ هەنـدێك بـە هـۆی ئەوەوە ڕەخنەیان لە قورئـان گرتوە، بەڵام بێگومان ئەوە حیکمەتـی زۆر گەورەی تێدایـە، ئەویش ئەوەیە کە خـوای کاربـەجێ دینـی بـۆ ڕێکخسـتنی ژیـن نـاردوەو ئـەم قورئانـەش کتێبی ژیـانە، ژیانیش وانیە کە لەو کاتەدا نوێـژ دەبێ، هەر خـەریکی نوێـژ بـی، یـان لـە ڕەمەزاندا هەر ڕۆژوو بگـری‌و هیچی دیکە نەکـەی، نـەخێر، بەڵـکو تـۆ بـەڕۆژووی کارو کەسـابەتیش دەکـەی‌و، صـیلەی ڕەحمـیش جێبـەجێ دەکـەی‌و، سـەردانیش دەکـەی‌و، مـردووش بـە خـاك دەسـپێری، کاری فیکرییش دەکـەی، کاری سیاسییش دەکەی، ژیـان هەمووی تێکەڵە، ژیان وانیە ئەگەر شتێکت کرد هیچی دیکە نەکەی، لەسەر نان خـواردن جاری وایـە میوانێکـت دێ سـەلامێ دەکات، یـان لەسـەر نـان خـواردنێ، گرفتێـك دێتـە پێشـێ دەبـێ چارەسـەری بکـەی، تەلەفۆنێکـت بـۆ دێ، ... هتـد، ئنجـا بۆیـە خـوا ﷻ

بابەتەکانی قورئـانی تێکەڵ کردوون، چونکە ژیانیش وایە، لێـرەش خـوا ﷻ دوای ئـەوەی کە باسی ئەو بابەتانەی پێشووی کرد، ئنجا دەفەرموێ: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! هـەرکات بـۆ نوێـژ هەڵسـان دەمو چـاوتان بشـۆنو ... هتـد، ئنجا لێـرەدا توێـژەرەوانی قورئان لەبارەی ڕستەی: ﴿ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، ئەگەر بۆ نوێژی هەڵسـان، دوو ڕایـان هەن:

١) هەندێکیان گوتوویانە: واتە: کە لە خەوێ هەڵسان بۆ نوێـژێ.

٢) هەنـدێکیان گوتوویانـە: واتـە: ئەگـەر بـۆ نوێـژێ هەڵسان کـە دەسـتنوێژتان نەبـوو، بۆچـی وایانـگوتـووە؟ چـونکە ئەگـەر ئینسـان دەسـتنوێژی هـەبێ کـە بـۆ نوێـژێ هەڵدەسـتێ، لەسـەری فـەرز نیـە دەستنوێژێ بگـرێ، دەسـتنوێژی هەیـە! وەك دوایـی باسـی دەکـەین، بۆیـە گوتوویانـە کەواتـە: لێـرەدا مەبەسـت ئەوەیـە، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! ئەگـەر دەسـتنوێژتان نـەبوو و بـۆ نوێـژێ هەڵسـان، واتـە: ئەگـەر ویسـتتان نوێـژێ بکـەن، دەسـتنوێژێ بگـرن: دەمو چـاوتان بشـۆنو دەسـتەکانتان بشۆنو مەسحی سەر بکـەنو پێیەکانتان بشۆن.

٣) دەشـتوانین بڵـێین: خـوا ﷻ بەگشـتی بـە ئیمانـداری فـەرمووە، ئەگـەر بـۆ نوێـژێ هەڵسـان، ئنجـا ئـەوەی لـە خـەوێ هەڵسـاوەو دەسـتنوێژی پێشـتر شـۆردوە، یـانی: دەسـتنوێژی هەیـە، بـەڵام سـوننەتە دەستنوێژەکەی بگرێتـەوە، یـان ئـەوەی هـەر دەستنوێژی نیەو لەسەری فەرزە دەستنوێژێ بگرێ، هەموویان هەر دەگرێتـەوە.

هەروەها لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، واتە: ئەگەر ویسـتتان هەڵسـن بـۆ نوێـژێ، بۆچـی؟ چـونکە تـۆ کـە دەسـتنوێژت نـەبێ، یەکسـەر بـۆ نوێـژێ هەڵناسـتی، بەڵکو دەچی دەستنوێژ دەگری، واتە: یەکسـەر بۆ نوێژێ هەڵناسـتی، بـەڵکو ئەگەر ویسـتت نوێژێ بکەی، دەبێ دەسـتنوێژ بگـری، نـەك یەکسـەر هەڵسـی بـۆ نوێـژێ، چونکە ئەگەر قامەت کرا، تۆ بە فریـای دەسـتنوێژێ ناکـەوی، ئـاوا توێـژەرەوانی قورئـان زۆر بە وردیی تەماشـای وشەکانی قورئان دەکەن، ئنجا ئایا چۆن دەسـتنوێژێ بگـرن؟ باسی چوار شـتان دەکات:

١- ﴿فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ﴾، دەمو چاوتان بشۆن (وجُوە) كۆی (وَجه)ە، (وَجه) واتە: ڕوو، دەمو چاو.

٢- ﴿وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ﴾، دەستەكانیشتان بشۆن تا ئانیشكان.

٣- ﴿وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ﴾، دەستی تەڕیش بە سەرتاندا بێنن.

٤- ﴿وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾، پێیەكانیشتان بشۆن هەتا هەردوو گوێزینگـان.

هەڵبەتە دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا بە درێژی باسی دەكەین، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوای زاناو شارەزا چوار ئەندامی باس كردوون: دەمو چاوو (ڕوو)، هەردوو دەست، سەر هەردوو لاق، (پێیەكان)، هەموو توێژەرەوانی قورئان لەگەڵ ئەوەدان كە (إلى) لە ﴿وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ﴾، بە مانای (مَعَ) دێ، چونكە (إلى) واتە: هەتا، ئنجا ئەگەر بفەرموێ: دەستتان بشۆن تا ئانیشكێ، مانای ئەوەیە ئانیشكی لەگەڵ نەبێ، بەڵام لێرەدا (إلى) بە مانای (مَعَ)یە، واتە: لەگەڵ ئانیشكان، هەروەها لە شۆردنی پێیەكانیشدا ﴿وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾، (إلى) واتە: (مَعَ الكَعْبَيْنِ) لەگەڵ دوو گوێزینگەكان، ئنجا ئایا (إلى) بە مانای (مَعَ) هاتوە لە قورئاندا؟! بەڵێ، وەك خوا لە سوورەتی (النِساء) لە ئایەتی (٢)دا لە باسی خواردنی ماڵی هەتیواندا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَهُمۡ إِلَىٰٓ أَمۡوَٰلِكُمۡ ۝٢﴾، واتە: ماڵی هەتیوان لەگەڵ ماڵی خۆتاندا مەخۆن، واتە: مەیخەنە گەڵ ماڵەكەتانو بیخۆن، كەواتە: (إلى) بە مانای (مَعَ) دێ، یانی: (مَعَ أَمْوَالِكُم) لە زمانی عەرەبیدا جاری وایە ئەو پیتانە هەندێكیان لە شوێنی هەندێكیان دادەنیشن، لەبەر حیكمەتێك، كە لێرەدا دەفەرموێ: دەمو چاوتان بشۆن، ئەوە دیارە سنووری دەموچاو كوێیە، كە لەو شوێنەوە كە تووكی سەر تەواو دەبێ هەتاكو كۆتایی چەناگە، ئەوە پێی دەگوترێ دەموچاو بە باری درێژییدا، وە بە باری پانییشدا لە گوێوە تا گوێ، ئەوە ڕوو (وَجْه)و دەبێ ئەوەندە بشۆرێ، ئەدی دەست كوێیە؟ لە نینۆكەوە تاكو دەگاتە هەنگڵ پێی دەگوترێ دەست، بەڵام چونكە

خـوا فەرموویەتی: ﴿إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾، لەگەڵ ئانیشــکان، کەواتــە: لـەو لای ئانیشــکەوە فـەرز نیــە، بـەڵام تـۆزێکی دیکـەش لـەو لای ئانیشــك بـێ، وەك لـە ســوننەتدا هـاتوە باشترە، ئـەوە ئـەو کاتـە دەسـتو پێـیو دەمو چاوی ئیمانـداران درەوشـاوەو سـپیو بـازوو دەبێ (غُراً مُحَجَّلِيْن)، ئنجا ﴿وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ﴾، دەسـتی تـەڕ بەسـەری خۆتانـدا بێنن، ئایا چـەندی؟ بـە پێـی ڕواڵـەتی ئایەتەکـە هـەمووی دەگرێتـەوە، بـەڵام هەنـدێکیان گوتوویانە: بەشـێکیشــی تـەڕ بـێ هـەر تـەواوە، بـەڵام کە تەماشـای دەقەکـانی ســوننەت دەکەین، پێغەمبەر ﷺ بـە هـەردووك دەســتی مەسـحی سـەری کـردوە، ئنجـا شــۆردنی پێیـەکانیش لەگـەڵ گوێزینگانـدا، دیـارە (أَرْجُل) کـۆی (رِجل)ە، (رِجل) واتـە: لاق، ئـەدی بۆچی بـۆ نەیفـەرمووە: (أَقْدَامَكُم)؟ چـونکە بەشـێك لـە لاق (ساق)یـش دەبـێ بشــۆرێ لەگـەڵ گوێزینگەکانــداو، ئەگـەر فـەرمووبای: (قَدَم) تـەنیا پێیــەو گـوێزینگی لەگـەڵ نەدەکـەوتن، بۆیــە فەرموویــەتی: ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾، وە پێیەکانیشـتان بشــۆن لەگـەڵ گوێزینگـەکان، ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْ﴾، وە ئەگـەر لـەش پـیس بوون، خۆتـان پاك بکەنـەوە، واتـە: خۆتــان بشــۆن، ئەگـەر ئاوتـان دەست بکـەوێ مـادام لەش پیسییتان لەســەر بێ، دەبـێ خۆتـان بشـۆن، ئنجـا دەتـوانن نوێـژ بکـەنو دەتـوانن طـاعەت بکەن.

ئنجــا دێتــە ســەر باســی ئــەوە ئایــا ئەگــەر ئــاو نــەبوو؟ دەفـەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾ وە ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون، ﴿أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾، یان بە سـەفەر چوون، ﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾، یان یەکێکتان لە شوێنی نزم هاتەوە، واتە: تارەتی گرتبوو ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، یــاخود لەگــەڵ ژنانــدا جــووت بــوون، هەنــدێکیش دەڵــێن: ﴿لَٰمَسْتُمُ﴾، بـە مانـای (لَمَستُم) یـانی: دەســتتان لــێدابوون، دێ، بـەڵام لەڕاســتیدا ئــەوە مانایـەکی بێهێـزە، وە بەڵـگەیەکی وای لەســەر نیـە، چـونکە (مُلامَسَــة) لەسـەر وەزنی (مُفَاعَلَـة)یە بۆ بەشـداریی دووانە، یـانی: پیاوێك دەسـت لـە ژنەکـەی دەداو ئـەو ئاگـای لــێ نیـە کـە دەسـتی پێـی کـەوتوە، یـان ئافرەتەکـە دەسـت لـە پیاوەکــەی دەدا،

بۆئەوەی پێی بزانی، ئەوە چەمکی (مُلامَسَة) نایگرێتەوە، بەڵام (جِماع) بە هەردووکیان نەبێ ناکرێ، بە هاوکاریی هەردووکیانە، جگە لەوەش هەر (مُلامَسَة) بە خۆشی لە زمانی عەرەبیدا زیاتر بە مانای پێکەوە جووت بوونی ژنو پیاو دێ، ئنجا کە دەفەرموێ: ئەگەر نەخۆش بوون، یان لەسەفەر بوون، واتە: کە نەخۆش بوون، نەخۆشییەکی وا کە نەتانەدەتوانی ئاوێ بەکاربێنن بۆ دەستنوێژو خۆشۆردن، دەنا جاری وا هەیە مرۆڤ نەخۆشە، بەڵام دەتوانێ ئاوێ بەکاربێنێ، ئەوە نایگرێتەوە، بەڵکو نەخۆشییەکی وا کە ڕێی بەکارهێنانی ئاوی لێ بگرێ، چ بۆ دەستنوێژ، چ بۆ غوسل.

وە لە سەفەر بوون، واتە: لە سەفەر بوونو ئاوتان چنگ نەکەوت، دەنا مرۆڤ با لە سەفەریش بێ، بەڵام ئەگەر ئاوی چنگ بکەوێ، خۆ هەتا ئاو هەبێ تەیەمموم بەتاڵە، ﴿ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ ﴾، یاخود یەکێك لە ئێوە لە تارەت گرتن هاتەوە ﴿ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾، یاخود دەستتان گەیاندە ژنانو لەگەڵیان جووت بوون ﴿ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ ﴾، لە هەر کام لەو چوار حاڵەتەدا ئاوتان چنگ نەکەوت، چی بکەن؟ ﴿ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ ﴾، ڕوو بکەنە ڕووی پاکی زەویو دەست بە ڕووی زەویدا بێننو دوایی بە دەمو چاوتانیدا بێنن، وە بەدەستتانی دابێنن، ئنجا ئەو (مِّنۡهُ)ش وەك دوایی باسی دەکەین، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان بە بەڵگەی ئەوەیان داناوە کە دەبێ شتێك هەبێ لەوە بە دەستو بە دەمو چاوتەوە بنووسێ، بۆیە گوتوویانە: دەبێ گڵ بێو تۆزی هەبێ، بەڵام نا، ئێمە دەڵێین، کە دەفەرموێ: (مِّنۡهُ ) ئەو (مِنَ)ە، (مِن)ی بەشێك (تَبعيضِي) نیە، تاکو مەرج بێ هەندێك لە تۆزو غوبارەکەی بە دەمو چاوتو بە دەستتەوە بنووسێ، بەڵکو ئەو (مِن)ە، بۆ دەست پێکردن (إبتِدَاء)ە، واتە: دەست بگەیەننە ڕووی زەوی دەستی پێدا بێنو، دەست بە دەمو چاوو بە دەستتاندا بێنن، کە دیارە ئەوە گەلێك وردەکاریی هەیە، لە مەسەلە گرنگەکاندا تیشکی دەخەینە سەر.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾، خوا نایەوێ هیچ سەغڵەتییەكتان بخاتە سەرێ، بۆیە بواری داون لە جیاتی ئاو هەم بۆ دەستنوێژ، هەم بۆ خۆشۆردن، تەیەمموم بكەن، چونكە نایەوێ سەغڵەتتان بكات، كەسێك لە شوێنێكە لەشی پیس بووە، ئاویشی چنگ ناكەوێ، نوێژیش بووە، یان دەبێ نوێژەكەی بچێ، یان دەبێ بە لەش پیسی نوێژەكەی بكات، بەڵام نەخێر، بۆی هەیە تەیەمموم بكات، وە ئەمە بەڵگەشە لەسەر ئەوەی كە گوتمان: ﴿صَعِيدٗا﴾، واتە: ڕووی زەوی، ئەگەر ڕووی زەوی بە بەفر داپۆشرابوو، دەست بە بەفرێدا بێنە، وە ئەگەر بەستەڵەك بوو، لەو شوێنانە كە هەموو دنیا بەستەڵەكە، دەست بە ڕووی زەویدا بێنە، ئەگەر بەهار بوو سەوزاییو گیا بوو، هیچی لێ نەبوو، دەست بە گیادا بێنە، وە ئەگەر لم بوو، دەست بە لمەكەدا بێنە، وە ئەگەر لە چیا بووی، بەس بەردی لێ بوو، كە چیاو چۆڵ بەس بەردو زیخە، گڵی لێ نیە، دەست بە بەردەكاندا بێنە، ئاوا ئەم ڕستە قورئانییە: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾، كاتێك دێتە دی، كە تۆ بۆت هەبێ دەست بە هەموو شتێكدا بێنی، هەرچی لەسەر ڕووی زەوییە، واتە: مەبەست لە: (صَعِيد) ڕووی زەوی بێ، نەك تەنیا گڵ بێ، گڵ لە كوێ پەیدا بكەی، لە بیابان گڵی هەر لێ نیە؟ زۆربەی دنیاش بیابانەو چیاو چۆڵەو بەستەڵەكە، چونكە لە هەموو شوێنان گڵ دەست ناكەوێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾، بەڵكو خوا دەیەوێ پاكتان بكاتەوە، نایەوێ سەغڵەتتان بكات، بەڵكو دەیەوێ پاكتان بكاتەوە، ﴿وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ﴾، وە بۆئەوەی چاكەی خۆی لەسەر ئێوە تەواو بكات، ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾، بەڵكو سوپاسگوزاربن، لە ئەنجامی ئەوەدا ئینسان هەست بە نیعمەتو چاكەكانی خوا دەكات، سوپاسی خوا دەكاتو سیفەتی سوپاسگوزاریی تێدا دێتە دی، خوای پەروەردگاریش دەیەوێ ئاوا دینداریتان بۆ ئاسان بكات، وە كارێك بكات كە بە هۆی ئەو دیندارییەوە پاك ببنەوە، بۆ نوێژو طاعەت، لەجیاتی غوسڵو دەستنوێژو بە تەیەمموم پاك ببنەوە، وە چاكەی خۆیتان لەسەر تەواو بكات، تاكو سەرەنجام ئێوەش سوپاسگوزاریی بۆ خوا ئەنجام بدەن.

ئنجـا لـە ئایـەتی دووەمـدا دەفـەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾، وە چاکەی خوا یاد بکەنەوە لەسەر خۆتان، کام چاکەیە؟ زانایان دەڵێن: ﴿نِعۡمَةَ ٱللَّهِ﴾، لێرەدا جینسی نیعمەتی مەبەستە، نیعمەتی ئیمانو ئیسلام، نیعمەتی ئەو نوێژو دەستنوێژو پاكو خاوێنییە کە لە ئیسلامدا هەیە، ئەو هەموو نیعمەتانەی کە لە ژیانی ئێمەدا هەن، ئەو هەموو ڕزقو ڕۆزییو میوەیە، وە نیعمەتی لەش ساغییو نیعمەتی ماڵو منداڵ، ئنجا نیعمەتی ئەو هێمنییو ئاسایشە، وە نیعمەتی هەواو نیعمەتی تیشکی خۆرو، نیعمەتی ئاوو، نیعمەتی بارانو ... هتد، نیعمەتەکانی خوا بە گشتی، وەك خوا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآ ﴿٣٤﴾﴾ إبراهيم، واتە: ئەگەر بتانەوێ نیعمەتی خوا بژمێرن، بۆتان سەرژمێر ناکرێن، کەواتە: یادی چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە بکەنەوە، ﴿وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ﴾، وە یادی ئەو پەیمانەش بکەنەوە کە لەگەڵیدا بەستوون، پەیمانێکی پتەوی لەگەڵتاندا بەست، یادی ئەو پەیمانەش بکەنەوەو لەبیرتان نەچێ، کە ئێوە بەندەی خوان، پەیمانی خواتان لە ئەستۆدایە، ئەو پەیمانە چییە؟ هەندێکیان گوتوویانە: مەبەست لەو پەیمانەیە کە بۆ جاری دووەم لە عەقەبە لە نێوان پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزیدا بەستراوە، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، چونکە ئەو پەیمانە حەفتاو دوو پیاو بوون، لەگەڵ سێ ئافرەتیش، ئەوە حەفتاو پێنج، کەچی لێرەدا خوای بەرزو مەزن لەگەڵ هەموو ئیمانداراندا قسە دەکات، کەواتە: چۆن دەگونجێ ئەو پەیمانە کە تەنیا حەفتاو پێنج کەس بەستوویانە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ لێرەدا خوای پەروەردگار بفەرموێ: هەمووتان یادی بکەنەوە؟! وە هەندێکیان دەڵێن: مەبەست پێی ئەو پەیمانەیە کە لە ژێر درەختی (رِضوَان)دا بەسترا، کە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ رَضِيَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ يُبَايِعُونَكَ تَحۡتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيۡهِمۡ وَأَثَٰبَهُمۡ فَتۡحٗا قَرِيبٗا ﴿١٨﴾﴾ الفتح، واتە: خوا لەو ئیماندارانە ڕازی بوو کە پەیمانیان پێدای لە ژێر درەختەکەدا، بەڵام ئەو پەیمانەش هەزارو چوار سەد لە هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەستیان، کەچی لێرەدا خوا بەگشتی دەفەرموێ، یادی

پەیمانەکەم بکەنەوە! بۆیە وا پێدەچێ مەبەست لەو پەیمانە شتێکی دیکە بێ، ئەویش ئەوەیە کە هەرکام لە ئیمانداران بە حوکمی ئیمانەکەی پەیمانی لەگەڵ خوا بەستوە کە بەندەی خوا بێو، فەرمانبەریی بکاتو گوێی بۆ بگرێو پابەندی بەرنامەکەی بێ.

پاشان بە حوکمی ئەو فیطرەتەی کە خوا ئێمەی لەسەر خوڵقاندوە، هەموو ئینسانێك خواناسە، وە بەڵگە عەقڵییەکانو بەڵگە نەقڵییەکان هەموویان ئینسان پابەند دەکەن بەوەی کە بەندایەتیی بۆ خوا بکات، وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەو چەمكو واتا فراوانانە بێ، چونکە ئەوانە هەموو ئیماندارن دەگرنەوە، ﴿ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا ﴾، کاتێك گوتتان، گوێمان لێ بوو، گوێڕایەڵین، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴾، وە پارێز لە خوا بکەن بێگومان خوا بە خاوەنی سینەکان ئاگادارە، خاوەنی سینەکان یانی چی؟ یانی: ئەو نهێنییانەی کەوا لە سینەکاندا پەنهان بوون، هەرچەندە لە ئەسڵدا سینەکان خاوەنی نهێنییەکانن، بەڵام خوای پەروەردگار نهێنییەکانی کردوە بە خاوەنی سینەکان، لەبەرئەوەی هێندە پەنهانن، جگە لە خوا کەس بەو نهێنییانە نازانێ، کێ بە نییەتی کێ دەزانێ؟! بێجگە لە خوا کەس ناتوانێ دڵی کەس بخوێنێتەوە، کەواتە: پارێز لەو خوایە بکەن، کە نێو دڵیشتان دەخوێنێتەوەو نهێنییەکانی دڵیشتان دەبینێ، وە ئاگاتان لە خۆتان بێو سەرپێچیی لێ نەکەن.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾، لێرەدا مەبەست لە: (کاتێك کە هەڵسان بۆ نوێژێ)، یانی: کاتێك ویستتان هەڵسن بۆ نوێژێ، چونکە: ئایا دەگونجێ ئەگەر بانگدرا، یان قامەت کراو هەڵسی بۆ نوێژێو یەکسەر نوێژێ بکەی، یان یەکسەر دەستنوێژێ بگری، جاری وایە دەبینی ئاو لەوێ نییە؟ نەخێر، کەواتە: لێرەدا مەبەست ئاوایە (إِذَا أَرَدْتُم القِيَامَ إِلى الصَّلَاة) ئەگەر ویستتان هەڵسن بۆ نوێژێ، دەستنوێژ بگرن، حازر بن، بۆئەوەی دوایی لەسەر یەکدی ڕانەوەستن بۆ دەستنوێژ گرتن)، کەواتە: ئەگەر ویستتان هەڵسن بۆ نوێژێ، دەستنوێژێ بگرن، چونکە ئەو کاتەی تۆ هەڵدەستی بۆ نوێژێ، دەستنوێژت بۆ ناگیرێو فریای نوێژەکەت ناکەوی، کەواتە: لێرەدا وشەیەك (تَقْدِير) دەکرێ کە سیاقەکە دەلالەتی لەسەر دەکات، وە بۆ زانیارییتان لە قورئاندا زۆرجاران وشەیەك باس ناکرێ، لەبەرئەوەی سیاقەکەی دەیگەیەنێ، ئنجا لەو ڕستە قورئانییەدا هەرچەندە لێرەدا خوا بەگشتی دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾، ئەی ئیماندارینە! ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژێ، واتە: ئەگەر ویستتان هەڵسن بۆ نوێژێ، هەرچەند بەگشتی فەرمان بە ئیمانداران دەکات کە دەستنوێژ بگرن، بەڵام مەبەست پێی ئەوانەیە کە دەستنوێژیان نییە، واتە: (الْمُحْدِثِين) واتە: ئەوانەی بێدەستنوێژن، ئنجا بێدەستنوێژیی گچکە، (الحَدَثُ الأَصْغَر)، چ بێدەستنوێژیی گەورە (الحَدَثُ الأَكْبَر)، کە پێشی دەگوترێ: (الجِنَابَة) واتە: لەش پیسیی، ئنجا ئایا بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە کە تەنیا لەسەر ئەوانە فەرزە دەستنوێژ بگرن، چونکە ئایەتەکە بەگشتی فەرزی دەکات:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ﴾، کەواتە: فەرزە

دەموچاو بشۆی، هەردوو دەستت بشۆی لەگەڵ ئانیشكان، وە مەسحی سەر بكەی، واتە: دەستی تەڕ بەسەرتدا بێنی، وە پێیەكانیشت بشۆی لەگەڵ گوێزینگەكان، جا ئایا ئەوە لەسەر هەموو كەس فەرزە، هەر كە نوێژ بوو، هەموو كەس بچێ دەستنوێژ بگرێ؟ نەخێر تەنیا لەسەر ئەوانە فەرزە كە بێدەستنوێژن، بەڵگەشمان سوننەتی پێغەمبەرە كە سوننەتی پێغەمبەر ﷺ زۆرجاران قورئان ڕوون دەكاتەوە، دەنا ئەگەر بە پێی ڕواڵەتی ئایەتەكە بێ، وەك هەندێكیان گوتوویانە: لەسەر هەموو كەس فەرزە، دەستنوێژی هەبێ و نەبێ، دەبێ دەستنوێژ بگرێتەوە، بەڵام كە تەماشای سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەكەین، بۆمان دەردەكەوێ كە ئەو تێگەیشتنە لە ئایەتەكە تێگەیشتنێكی ڕووكەشییەو تێگەیشتنی ڕاستەقینە ئەوەیە كە مەبەست پێی ئەوانەیە كە دەستنوێژیان نیە، ئەوان لەسەریان فەرزە دەستنوێژ بگرنەوە، ئەدی ئەگەر كەسێك دەستنوێژی هەبێ؟ بۆ وان بەس پەسندو سوننەتە، كەواتە: ئەگەر بڵێین: ﴿ فَٱغۡسِلُواْ ﴾، بۆ واجب بوونە، ئەوە تەنیا بێدەستنوێژەكان دەگرێتەوە، بەڵام ئەگەر بڵێین: مەبەست پێی سوننەتە، ئەو كاتە بە دەستوێژەكانیش دەگرێتەوە، واتە: بۆ ئەوانیش سوننەتە دەستنوێژەكانیان تازە بكەنەوە، ئەوە لەسەر ڕای بەشێك لە زانایان، وە هەندێكیان دەڵێن: سوننەتیش نیە.

یەكێك لە فەرمایشتەكان: ﴿عَنْ بُرَيْدَةَ رضي الله عنه، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ: يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ الْفَتْحِ، تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى خُفَّيْهِ، وَصَلَّى الصَّلَوَاتِ بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، فَقَالَ: لَهُ عُمَرُ يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّكَ فَعَلْتَ شَيْئًا لَمْ تَكُنْ تَفْعَلُهُ؟! قَالَ: «إِنِّي عَمْدًا فَعَلْتُ يَا عُمَرُ»﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٠٢٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٧٧)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (١٧١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٦١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٣٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٧٠٨)}، واتە: بورەیدە (كە یەكێكە لە هاوەڵان) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ عادەتی وابوو لە كاتی هەموو دەستنوێژاندا دەستنوێژی دەگرتەوە، (واتە: دەستنوێژی هەبووایە، یان نەیبووایە) لە ڕۆژی فەتحدا (واتە: ئازادكردنی مەككە) دەستنوێژی گرت، وە دەستی تەڕی بەسەر دوو خوففەكەی داهێنا، (خوفف، واتە: گۆرەوی چەرم، واتە: خوففی لەپێ كردبوون، وە پێشتر دەستنوێژی گرتبوو، دیارە جووە تارەتی گرتوەو دەستنوێژی گرتوەو دەموچاوی شۆردنو دەستی شۆردوون، وە مەسحی سەری كردوەو، دەستی تەڕیشی بەسەر دوو خوففەكەی داهێناوە)، وە

هەموو نوێژەکانی بە یەك دەستنوێژ کردن، {دیارە دەبێ نوێژی بەیانی بووبێ، کە ئەو هاوەڵە بینیویەتی کە بۆ نوێژی بەیانی دەستنوێژی گرتوە، نوێژی نیوەڕۆو عەسرو شێوانو خەوتنانیشی بەو دەستنوێژە کردوە}، عومەر پێی گوت: ئەی پێغەمبەری خوا! تۆ شتێکت کرد، کە پێشتر وات نەکردوە، (واتە: هەر پێنج نوێژەکانت بەیەك دەستنوێژ کردنو دەستنوێژت تازە نەکردەوە)، گوتی: بە ئەنقەست وامکرد، ئەی عومەر! کە بێگومان حیکمەتو ئامانجەکەیشی ئەوەبووە، ئەگەر کەسێك نەیتوانی بۆ هەموو نوێژە فەرزەکان دەستنوێژێ تازە بکاتەوە، ئەوە پێغەمبەری خوا ﷺ وایکردوە، دیارە مەرج نیە هەر ئەو جارەش وای کردبێ، جاری دیکەش هەبووە کە پێغەمبەر ﷺ دەستنوێژی تازە نەکردۆتەوە، بەلاَم ئەگەر بشگونجێ تازەی بکەیەوە باشترە.

کەواتە: دەستنوێژگرتن بۆ هەر نوێژێك ئەگەر ئینسان دەستنوێژی نەبێ فەرزە، وە ئەگەر دەستنوێژی هەبێ سوننەتە، هەر لەوبارەوە ئەم فەرمایشتەش هەیە: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يَتَوَضَّأُ عِنْدَ كُلِّ صَلاةٍ، قُلْتُ: كَيْفَ كُنْتُمْ تَصْنَعُونَ؟ قَالَ: كُنَّا نُصَلِّي الصَّلَوَاتِ كُلَّهَا بِوُضُوءٍ وَاحِدٍ، وفي رواية: (يُجْزِئُ أَحَدَنَا الْوُضُوءُ مَا لَمْ يُحْدِثْ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٢٣٦٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢١٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٦٠)}، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە (دیارە یەکێك لە تابیعین لێی دەگێڕێتەوە) دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ عادەتی وابوو لە کاتی هەموو نوێژەکاندا دەستنوێژی دەگرت، ئەو کەسە کە لە ئەنەس دەگێڕێتەوە دەڵێ: بە ئەنەسم گوت: ئەدی ئێوە چیتان دەکرد؟ (ئێوەش بۆ هەموو نوێژان دەستنوێژتان دەگرتەوە) گوتی: (واتە: ئەنەس گوتی:) ئێمە هەموو نوێژەکانمان بە یەك دەستنوێژ دەکرد، ئەگەر دەستنوێژمان نەشکابایە، لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: یەکێك لە ئێمە یەك دەستنوێژی بەس بوو بۆ هەموو فەرزەکانی، ئەگەر دەستنوێژی نەشکابووایە.

کەواتە: ئێستا بۆمان دەرکەوت کە خوا دەفەرموێ: دەستنوێژ بگرن، واتە: بۆ کەسێك کە دەستنوێژی نەبێ لەسەری فەرزە، وە وەك گوتم، دەشگونجێ بڵێین: ئەوە ڕووی لە هەموو ئیماندارانە، بۆ ئەوانەی دەستنوێژیان نیە، فەرزە دەستنوێژ بگرن، ئەوانەش کە دەستنوێژیان هەیە، سوننەتە، واتە: بۆ ئەوان پەسندەو

چاکە، دیارە ئەویش دیسان لە حاڵێکدا کە مرۆڤ تووشی مەشەققەت نەبێ و، ئاوەکە کەم نەبێ، وە بەشی خەڵکی دیکە نەبێ و، نوێژی خەڵکی دیکە تاخیر نەکات، بەڵام کەسێك دەستنوێژی هەیەو دەچێ بۆ زیادە دەستنوێژ دەگرێتەوەو لە هەقی خەڵکی دیکە دەفەوتێنێ، ئەوە لە جیاتی ئەوەی خێری بگاتێ، ڕەنگە گوناهی بگاتێ، ئینسان دەبێ هۆشیارو بە سەلیقە بێ، سوننەت وەختێك ببێتە هۆی ڕێگرتن لە واجبی کەسێکی دیکە، یاخود سوننەتێك ببێتە هۆی ئەوەی خێرێکت لە دەست بدات، کە پاداشتی لە هی سوننەتەکە پتربێ، ئەو کاتە لەسەر سوننەتەکەت قەرزار دەبیەوە!!

**<u>مەسەلەی دووەم</u>:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو جۆرەکانی نوێژ پەکیان لەسەر دەستنوێژ کەوتوە، چونکە وشەی (الصلاة) (ال)ی جینسی لەسەرە، کەواتە: جینسی نوێژ پێویستی بە دەستنوێژ هەیە، نوێژی فەرز بێ، نوێژی سوننەت بێ، نوێژی جەنازە بێ، نوێژی مانگ گیران بێ، نوێژی خۆرگیران، نوێژی بارانە، نوێژی سڵاوکردن لە مزگەوت (تَحیة المَسجد)ە، هەموو جۆرەکانی نوێژ، بەڵکو لەسەر ڕای زۆر لە زانایان سەجدەی شوکرو سەجدەی قورئان خوێندنیش پێویستییان بە دەستنوێژە، وە بەبێ دەستنوێژ دروست نین، بێدەستنوێژیی گەورە ئەوە هەر هیچ، بەبێ دەستنوێژیی گچکەش دروست نین، ئنجا لەبەرئەوە کە ﴿ فَٱغۡسِلُواْ ﴾، وە ئەوانی دیکەش ﴿ وَٱمۡسَحُواْ ﴾، بۆ فەرمانن، وە فەرمانیش بۆ فەرزبوونە: (الأَمْرُ يَدُلُّ عَلَى الوجُوب) فەرمان پێویست بوون دەگەیەنێ، بۆیە ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ: کە دەستنوێژ مەرج و فەرزە بۆ نوێژ، واتە: بەبێ دەستنوێژ نوێژ دروست نیە بکرێ، بۆ کەسێك کە ئاوی چنگ بکەوێ، ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت تەیەمموم دەکات، تەیەممومیش وەك دوایی باسی دەکەین، خوای کاربەجێ بە شێوەیەك دایناوە بەپێی شەریعەت (قورئان و سوننەت) کە هیچ کەس لە هیچ شوێنێك پەکی ناکەوێ، بەڵام هەندێ لە مەزهەبەکان وایان بەرتەسك و گچکە کردۆتەوە، کە مرۆڤ لە زۆر شوێنان پەکی دەکەوێ و تووشی سەغڵەتیی دەبێ، بۆیە هەمیشە کە دەگەڕێینەوە بۆ شەریعەت، بۆ قورئان و سوننەت دەبینین، دین ئاسانە، بەڵام کە دەچینە نێو قسەی زانایانەوە،

زۆریان ئالۆزییو پێچو مێچی زۆریان تێخستوەو، مسولمانەتیی لەسەر خەڵکی بە زەحمەت خراوە، ئەگەرنا بۆ وێنە: کەسێك لە سجنە، (کە من بۆخۆم ئەو ئەزموونەم هەیە لە زیندانی ئەمریکییەکاندا) لە سجن ڕێگات پێ نادەن دەستنوێژ بگری، ئاوت چنگ ناکەوێ، زۆرجار ئاوی خواردنیشت بەتەواویی نادەنێ، چ جای دەستنوێژی پێبگری! باشە لەو کاتەدا چۆن نوێژێ بکەی؟ گڵ لە کوێ بێنی؟ هەمووی کۆنکرێت یان کاشییە، ئەو خۆڵەی ئیمام شافیعیی دەڵێ، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، دەبێ تۆزی لێ هەڵسێ لە کوێی بێنێ؟ بەڵام بە پێی ئایەتەکە بێ کە دەفەرموێ: ﴿فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا﴾، ڕوو بکەنە ڕووی زەوی، ئەو کۆنکرێتو کاشییە ڕووی زەوییە، یان دەرو دیوار دەستی پێدا دێنێو تەیەمومی خۆت دەکەی، ئنجا با بیکەینە پێوەر: کاتێك تەماشای سەماحەتی شەریعەت دەکەین، ئەو کاتە هەر ڕاو بۆچوونێك لە سەماحەتو فراوانیی شەریعەت دوورکەوتبێتەوە، بۆمان دەردەکەوێ کە خاوەنەکەی نەیپێکاوە.

<u>**مەسەلەی سێیەم**</u>: زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە دەستنوێژ پێش دابەزینی ئەم ئایەتەش هەر هەبووە، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە سوورەتی (المائدة) زۆر لە زانایان دەڵێن: لە (حَجَّةُ الوداع)دا دابەزیوە، واتە: ساڵی (١٠)ی کۆچی، باسی دەستنوێژیش لەوێدا کراوە، ئنجا ئەگەر گریمان ئەو ئایەتەی باسی دەستنوێژێ دەکات، لەو کاتەشدا دانەبەزیبێو پێشتریش دابەزیبێ، گرنگ ئەوەیە سوورەتی (المائدة) هەمووی لە دوای صولحی حودەیبییە دابەزیوە، دوای ساڵی شەشەمی کۆچی، باشە ئایا تا ساڵی شەشی کۆچی مسولمانان چۆنیان نوێژ کردوە، ئایا بەبێ دەستنوێژیی کردوویانە؟ دەستنوێژیان چۆن بووە، چۆن نەبووە؟! ئەو پرسیارە دروست دەبێ، زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن دەڵێن: دەستنوێژ پێش دابەزینی ئەم ئایەتەش هەر هەبووە، واتە: بە نیوەڕۆکی ئەم ئایەتە ئیش کراوە، بەڵام دوایی ئایەتەکە دابەزێندراوە، ئەگەرنا هەر لە مەککەوەو هەر لەو کاتەوە کە نوێژ فەرز کراوە لەسەر پێغەمبەرمان ﷺ بە دەستنوێژەوە نوێژی کردوە، بەڵگەمان چییە؟ بەڵگەمان ئەم دەقانەن:

یەکەم: ﴿رَوَى ابْنُ إِسْحَاقَ وَغيْرُهُ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ لَمَّا فَرَضَ اللهُ سُبْحَانَهُ عَلَيْهِ الصَّلاةَ لَيْلَةَ الإِسْرَاءِ وَنَزَلَ جِبْرِيلُ ظُهْرَ ذَلِكَ الْيَوْمِ لِيُصَلِّيَ بِهِ فَغَمَزَ الأَرْضَ بِعَقِبِهِ، فَأَنْبَعَتْ مَاءً، وَتَوَضَّأَ مُعَلِّمًا لَهُ، وَتَوَضَّأَ هُوَ مَعَهُ، وَصَلَّى، فَصَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ﴾[1] ئیبنو ئیسحاق‌و غەیری ویش گێڕاویانەتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك خوای پاك نوێژی لەسەر فەرز کرد لە شەوی شەوڕۆدا جبریل نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە (کە پێغەمبەر ﷺ شەوەکەی چوو بۆ شەوڕۆیی‌و بەرزبوونەوە"الإسراء والمعراج"و دوایی هاتەوە) دابەزی بۆئەوەی نوێژی پێبکات، وە جبریل پاژنە پێی لە زەویداو ئاوی هەڵقوڵاند، وە جبریل خۆی دەستنوێژی گرت پێغەمبەری ﷺ فێرکرد، کە ئاوا دەستنوێژ بگری، پێغەمبەری خواش دەستنوێژی لەگەڵ گرت، وە جبریل نوێژی کرد، پێغەمبەریش ﷺ نوێژی کرد، وەك ئەو یاخود لەگەڵ ئەو.

جا (إبْنُ العَرَبِي) دەڵێ: (وَهَذَا صَحِيحٌ وَإِنْ كَانَ لَمْ يَرْوِهِ أَهْلُ الصَّحِيحِ) ئەم دەقە ڕاستە (صحيح)ە هەرچەندە ئەوانەی دەقە ڕاستەکانیان گێڕاوەتەوە نەشیان گێڕابێتەوە، بەڵام ئەم دەقە لە ڕووی سەنەدەکەیەوە ڕاستە، کەواتە: پێش دابەزینی قورئان باسی دەستنوێژ لە سوننەتدا هەبووە، وە فەرزیش بووە، چونکە دەستنوێژ مەرجی نوێژە.

دووەم: ئنجا هەر لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە کە (حاکم) کە زانایەکی فەرموودەناسی شارەزایە، لە کتێبەکەی خۆیدا بە ناوی (الـمُستَدرَك على الصَحيحين) واتە: ئەو فەرمایشتانەی بوخاریی‌و موسلیم نەیانگێڕاونەوەو فەرامۆشیان کردوون، یان لە بیریان چوون، ئەو لەو کتێبەی خۆیدا هێناونی، لەو بارەوە ئەم دەقەی هێناوە: ﴿عَن إبنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِنَّ الْمَلأَ مِنْ قُرَيْشٍ اجْتَمَعُوا فِي الحِجْرِ فَتَعَاقَدُوا بِاللاَّتِ وَالْعُزَّى وَمَنَاةَ الثَّالِثَةِ الأُخْرَى وَنَائِلَةَ وَإِسَافٍ لَوْ قَدْ رَأَيْنَا مُحَمَّدًا لَقَدْ قُمْنَا إِلَيْهِ قِيَامَ رَجُلٍ وَاحِدٍ فَلَمْ نُفَارِقْهُ حَتَّى نَقْتُلَهُ فَأَقْبَلَتْ ابْنَتُهُ فَاطِمَةُ رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهَا تَبْكِي حَتَّى دَخَلَتْ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَتْ: هَؤُلاءِ الْمَلأُ مِنْ قُرَيْشٍ قَدْ تَعَاقَدُوا عَلَيْكَ لَوْ قَدْ رَأَوْكَ

١) أَحْكام القرآن لابن العَرَبي، ج٢، ص٤٧.

لَقَدْ قَامُوا إِلَيْكَ فَقَتَلُوكَ فَلَيْسَ مِنْهُمْ رَجُلٌ إِلاَّ قَدْ عَرَفَ نَصِيبَهُ مِنْ دَمِكَ، فَقَالَ: يَا بُنَيَّةُ! أَرِينِي وَضُوءاً فَتَوَضَّأَ، ثُمَّ دَخَلَ عَلَيْهِمْ الْمَسْجِدَ، فَلَمَّا رَأَوْهُ قَالُوا هَا هُوَ ذَا وَخَفَضُوا أَبْصَارَهُمْ، وَسَقَطَتْ أَذْقَانُهُمْ فِي صُدُورِهِمْ، وَعُقِرُوا فِي مَجَالِسِهِمْ فَلَمْ يَرْفَعُوا إِلَيْهِ بَصَرًا وَلَمْ يَقُمْ إِلَيْهِ أَحَدٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٧٦٢) قال الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن رجاله ثقات رجال الصحيح إلا أن في يحيى بن سليم كلاما يحطه عن رتبة الصحيح، وَالحاكم برقم: (٥٨٣)، تعليق الذهبي في التلخيص: صحيح}، واته: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: زلە زلانی قوڕەیش لە حیجر (حجر إسماعيل)دا کۆبوونەوەو سوێندیان بە لاتو عوززاو مەناتو ئیسافو نائیلە خواردو پەیمانیاندا، کە ئەگەر موحەممەدمان بینی وەك یەك پیاو بۆی هەڵدەستینو لێی ناگەڕێین هەتا دەیکوژین، فاطیمەی کچی خوا لێی ڕازی بێ، چووە لای پێغەمبەر ﷺ بە گریانەوە گوتی: ئەوانە، زلەزلەکانی قوڕەیش کۆبونەتەوەو پەیمانیان داوە کە بۆت هەڵسنو بتکوژن بە شێوەیەك کە هەرکامێکیان بەشێك خوێنی تۆی بکەوێتە سەر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: کچی خۆم! ئاوی دەستنوێژم بۆ بێنن، وە دەستنوێژی گرت، پاشان لێیان چووە مزگەوت، کاتێك بینیان گوتیان: ئەها ئەوەتا! بەڵام چاویان نزم کردو سەریان نەوی کرد لە شوێنی خۆیان نەجووڵانو تەماشایان نەکرد، وە هیچ کامیان بۆی هەڵنەستان.

دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ وەك لێی گێڕدراوەتەوە ﴿عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ إِذَا حَزَبَهُ أَمْرٌ صَلَّى﴾ {رَوَاهُ أَبُو دَاوُد برقم: (١٣١٩)، وَحَسَّنَهُ الأَلباني في (صحيح سُنَن أَبِي دَاوُد)}، واته: (حُذَيْفَة) خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئیشێك نارەحەتی کردبایە گرفتێکی هەبایە، پەنای دەبردە بەر پاڕانەوە، یان نوێژی دەکرد، دیارە کە فەرموویەتی: دەستنوێژ دەگرم، ویستوویەتی دووعا بکات، یان دوو ڕکات نوێژ بکات، پەنا بەرێتە بەر خوا لە شەڕی ئەوانەی کە بە تەمابوون بیکوژن.

**مەسەلەی چوارەم:** دیسان کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾، وەك پێشتریش گوتم، واته: (إِذَا أَرَدْتُم القِيَامَ إِلى الصَّلاَة) ئەگەر ویستتان هەڵسن بۆ

نوێژێ، ئەمە ئەوەشی لێ وەردەگیرێ کە نیەت پێویستە بۆ دەستنوێژ، واتە: دەبێ بە نیازی دەستنوێژگرتن مرۆڤ دەموچاوی بشواو دەستەکانی بشواو مەسحی سەری بکاو پێیەکانی بشوا، ئەدی ئەگەر نیەتی دەستنوێژی نەبوو، نیەتی غوسڵی نەبوو، سەروبن لە حەوزێیان هاوێشت، ئایا دەستنوێژەکەی دەگیرێ؟ غوسڵەکەی لێ دەردەچێ؟ نەخێر، دەبێ نیەتی هەبێ، چونکە وەك گوتم: زانایان هەموویان دەڵێن: لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾، واتە: (إِذَا أَرَدْتُم القِيَامَ إِلى الصَّلاَة) ئەگەر ویستتان بۆ نوێژێ هەڵسن، ئیرادەش واتە: نیەت، شایانی باسیشە هەرکام لە:

(مالیك و شافیعیی) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، دەڵێن: دەستنوێژ بە بێ نیەت واتە: بەبێ نیازو مەبەستی نێو دڵ دروست نیە، بەس لێتان تێکنەچێ، نیەتی دەستنوێژ ئەوە نیە کە بڵێی: نیەتم ئەوەیە دەستنوێژێ دەگرم، چونکە نیەت بۆ نوێژو دەستنوێژو ڕۆژوو و بۆ هەرچی عیبادەتە غەیری حەج و عومرە، هەر ئەوەیە کە لە دڵدا هەیە، بەڵام نیەتی حەج و عومرە وێڕای نیازی نێو دڵ بە زاریش دەهێنرێ، دەڵێ: (لَبَيْكَ اللَّهُمَّ حَجَّةً، لَبَيْكَ اللَّهُمَّ عُمْرَةً) بە زار دەگوترێ: دەبێ لە دڵیشدا هەر هەبێ، بەڵام نیەتی عیبادەتەکانی دیکە هەمووی تەنیا لە دڵدایە، وە سوننەتیش نیە بە زار بگوترێ، بەڵام ئەگەر کەسێکیش بە زار نیەتەکەی گوت واتە: گۆ (تلفظ)ی پێکرد، ناڵێین دروست نیە، بەڵام دەڵێین: پێچەوانەی سوننەتەو نیەت هەر ئەوەیە کە لە دڵدایە، ئنجا:

(مالیك و شافیعیی) دەڵێن: دەستنوێژیش پێویستی بەو نیازەو مەبەستە هەیە لە دڵدا.

هەندێکیشیان کە (ئەبو حەنیفەو ئەوزاعیی)یان لە نێودان دەڵێن: نیەتی دەستنوێژ پێویست نیە، لە دڵیدا هەبێ، بەڵام پێم سەیرە وایان گوتبێ، چونکە ئینسان کە دەچێ دەموچاوی دەشواو دەستانی دەشواو مەسحی سەری دەکاو پێیەکانی دەشوا، دیارە نیەتەکەی هەر هەیە، ئیدی نازانم مەبەستیان پێ چی بووە کە گوتوویانە: پێویستی پێی نیە، چونکە هیچ کەسێك هەتا ئامانجێکی نەبێ پاڵنەرو هاندەرێکی نەبێ، ناچێ کارێك بکات، کێ هەر لە خۆوە دەچێ: سێ

جاران دەموچـاوی بشـواو، دەستەكانی بشـوات هەتا ئەولای ئانیشـكان، پاشان مەسـحی سـەری بكـاو پێیـەكانی بشـوات، بێـئـەوەی نیـەتێكی هـەبێ؟! بێگومـان بـەبێ نیــازو مەبەست ئینسان هیچ كارێك ناكـات، بۆیـە لەڕاسـتیدا هـەر ئـەو قسـەیە ڕاسـتە كە نیـەت بۆ دەسـتنوێژ فەرزە.

**مەسـألەی پێنجـەم:** خـوا كـە دەفـەرموێ: ﴿ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ ﴾، دیـارە ئـەوە (فعل)ی (أمـر)ە، واتە: دەمو چاوتـان بشـۆن، ڕووتان بشۆن، زانایان لەوبـارەوە كە ئایا شۆردن (غَسْل) تـەنیا بـە ئـاو پێداكردن (صَبُّ الـماء) یـان (سَكْبُ الـماء) دێتـە دی، یاخود پێویسـتە وێـڕای ئـاو پێداكردن دەستیشـی پێدا بهێنـرێ، كـە بـە عەرەبـی پێی دەگوترێ: (دلـك)؟ هەندێكیان پێیان وایە كە تەنیا ئاو بە دەموچاوت دابكـەی، ئـاو بـە دەسـتانتدا بكـەی‌و، مەسـحی سـەرت بكـەی‌و، ئـاو بـە پێیـەكانت دابكــەی، دەسـتنوێژەكەت تەواوە.

هەندێكیش دەڵـێن: نەخێر، دەبـێ دەسـتیشـی پێدا بهێنرێ.

منیش وای بۆ دەچـم ڕای ئەوانە بەهێزتر بـێ، كە دەڵێن: پێویستە دەستیشـی پێدا بهـێنرێ، لەبەرچـی؟ ئایـا ئەگـەر ئینسـان بـەرگێكی خـۆی بشـوا تـەنیا ئـاوی پێدادەكـات؟ نـەخێر، بـەڵكو هەڵیشـی دەگوشـێ‌و دەستیشـی پێـدادێنێ، كەواتـە: لەڕاسـتییدا شـۆردن (غسل) بریتیـە لـە ئـاو پێداكردن وێـڕای دەست پێداهێنان، چـونكە ئەگـەر تـەنیا ئـاو پێـداكردن مەبەسـت بووایـە، دەیفـەرموو: (فَصُبّوا عَلَى وجُـوهِكُم الْمَـاءَ)، یــان (فَاسكِبوا) ئــاوی پێــدا بكــەن، بــەڵام فەرموویــەتی: ﴿ فَٱغۡسِلُواْ ﴾، واتە: بیشۆن، شۆردنیش ئەوەیە كە ئاویشی پێدا بكەی‌و دەسـتیشی پێدا بێنـی.

**مەسـألەی شـەشـەم:** كە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ ﴾، ﴿ وُجُوهَكُمۡ ﴾، واتـە: ڕووەكانتـان، دەمو چاوەكانتــان (وُجُـوه) كـۆی (وَجْـه)ە، (وَجْه) بریتیـە لـەوەی كەسـێك بەرەو ڕووت بێ، كوێی دیارە لەسەری، ئەوە پێی دەگوترێ (وَجْه) واتـە: (مَا يُواجِهُـكَ مِنَ الـرَّأسِ) واتـە: لەسـەری ئینسـان كاتێـك كـە كەسێك بـەرەو ڕووی تـۆ

ڕادەوەستێ، ئەوەی کە دیارە لەسەری، چونکە (وَجْه) بەشێکە لەسەر، ئەوە پێی دەگوترێ: (وَجْه)، دەربارەی سنووری (وَجْه)یش چونکە پێویستییمان پێیەتی کە بیزانین خوا کە دەفەرموێ: (وَجْه)تان بشۆن، دەبێ ئەوەی (وَجْه)ە بشۆرێ، سنووری (ڕوو)ش لە پێشە سەرەوە ئەو شوێنەی کە کۆتایی مووی لێدێ لەسەر کۆتاییەکەی هەتاکو کۆتایی چەناگە، ئەوە بە باری درێژیی دا، وە بە باری پانییی دا لە گوێوە تا گوێ، ئەوە (وَجْه)ە، بۆیەش دەبێ ئەوە ورد بکرێتەوە، چونکە خوا دەفەرموێ: ڕووەکانتان بشۆن کەواتە: ئەوەی کە بە ڕوو لە قەڵەم دەدرێ بۆ دەستنوێژ دەبێ بشۆرێ، ئەدی ئەگەر بەسەر لە قەڵەم درا، دیارە شۆردنی لەسەر نیە، با لەوبارەوە نموونەیەك بێنینەوە، ئایا گوێیەکان لە سنووری (وَجْه)دان، یان لە سنووری سەر دان؟ زانایان لەو بارەوە مشتومڕیان هەیەو ڕاجیان:

هەندێکیان گوتوویانە: لە سنووری ڕوو دان، کەواتە: دەبێ بشۆرێن.

هەندێکیان گوتوویانە: نەخێر، لە سنووری سەر دان، کەواتە: شۆردنی هەردوو گوێیەکان فەرزنیە، بەڵکو بەس دەستی تەڕ پێداهێنان (مسح) فەرزە، یان سوننەتە، کە زیاتر ئەو ڕایەش بەهێزترە سوننەت بێ، کەواتە: ئەو ڕایەی دووەم ڕاستە، کە گوێ لە سنووری دەمو چاودا نیە، بەڵگەمان چییە؟ بەڵگەمان ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ لە کاتی دەستنوێژدا گوێیەکانی خۆی نەشۆردوە، بەڵکو دەستی تەڕی پێداهێناون، ئەگەر لە سنووری دەموچاو دابان، خوا دەفەرموێ: دەموچاوتان بشۆن، مادام نەیشۆردوون، دیارە لە سنووری ڕوودا نین، یەکێك لەو دەقانە:

یەکەم/ ﴿عَنْ الْمِقْدَامِ بْنِ مَعْدِ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَوَضَّأَ فَمَسَحَ بِرَأْسِهِ وَأُذُنَيْهِ ظَاهِرَهُمَا وَبَاطِنَهُمَا﴾ {أَخْرَجَهُ إِبْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٤٤٢)، وَ صَحَّحَهُ الألباني في (صحيح إبنُ مَاجَه) برقم: (٣٥٦)}، واتە: میقدادی کوڕی مەعد خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت، مەسحی سەری کرد، (واتە: دەستی تەڕی بە سەری خۆی داهێنا)، وە مەسحی گوێیەکانیشی کرد، هەردوو گوێیەکەی دیوی نێوەوەیانو دیوی دەرێیان، (وا پێدەچێ دیوی نێوەوەی بە دوو پەنجە گچکەکانیو، دیوی دەرەوەی بە دوو پەنجە گەورەکانی مەسح کردبێ).

دووەم/ ﴿عَنْ الرُّبَيِّعِ بِنْتِ مُعَوِّذِ ابْنِ عَفْرَاءَ أَنَّهَا رَأَتْ النَّبِيَّ ﷺ يَتَوَضَّأُ قَالَتْ: مَسَحَ

رَأْسَهُ وَمَسَحَ مَا أَقْبَلَ مِنْهُ وَمَا أَدْبَرَ وَصُدْغَيْهِ وَأُذُنَيْهِ مَرَّةً وَاحِدَةً﴾{أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ بـرقم: (٣٤)، قـال الشـيخ الألبـاني: حَسَنُ الإِسْنَاد}، واتـە: ڕوبـەییعی كچـی موعەوویز (یەكێكە لە هاوەڵە ئافرەتەكان) خوا لـێی ڕازی بـێ، پێغەمبەری خوای ﷺ بینیوە دەستنوێژی گرتوە، دەڵێ: مەسـحی سەری خۆی كـرد، (واتـە: دەستی تـەڕی بەسـەری داهێنـا)، پێشـەوەی سـەریو دواوەی سـەری یـەك جـار، هـەروەها هەردوولا جاینگـیو گوێیەكانیشـی، {واتە: دەستی تـەڕی بـە پـێش گوێیەكانیشـی داهێنـاوە (صُدْغ) ئەوەیە كە لە پەنای گوێیـە، بە كوردی لاجاینگـی پێدەڵـێن، كە هەر بە گوێوەیـە}.

كەواتـە: بـەم دوو دەقـە دەردەكـەوێ كـە پێغـەمبەر ﷺ گوێیـەكانی نەشـۆردوە، بەڵـكو دەستی تـەڕی پێداهێنـاون، دەستی تـەڕ پێـداهێنانیش فـەرزی سەرە، نـەك فەرزی دەموچـاو، بۆیە دوو گوێیەكان لە سنووری دەمو چاودانین.

**مەسـەلەی حەوتـەم:** كـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾، وە هەردوو دەسـتەكانیشتان بشۆن تـاكو ئانیشـكان، لـە زمـانی عەرەبیـدا لـە شـانەوە هـەتا نینـۆك پێـی دەگـوترێ دەسـت، (اليَدُ: مِنَ الـمَنْكِب إلـى الظفر)، ئەدی بۆچی ئێمە بۆ دەستنوێژی هەمووی ناشۆرین؟ لەبەرئەوەی خوا دیاریی كردوە، دەفـەرموێ: ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾، دەستەكانیشـتان بشـۆن تـا ئانیشـكان، ئانیشـك جومگەیەكە كە قۆڵو باسـك پێك دەگەیـەنێ، باسك بـە عـەرەبی (ساعِد)ی پێدەڵـێن، قۆڵـیش بـە عـەرەبی (عَضُـد)ی پێـدەڵێن، ئـەوەی دەكەوێتـە نێـوان قـۆڵو باسك، ئەو جومگەیـە پێی دەگوترێ (مِرفَقْ)، كە كۆیەكـەی (مَرافِقْ)ە.

جا زانـایان لەوبـارەوە كە ئایا ئانیشـك فـەرزە بشـۆررێ، یـان نـا؟ ڕاجیایی یـان هەیە، هەرچەندە پێشتریش ئاماژەیەكمان پێدا، زۆربـەیان دەڵێن: فـەرزی ئانیشكیش شـۆردنە، بـەڵام ئیشـكالەكەیان لـەوەدا بـۆ دروسـت بـووە، كـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾، دەستەكانیشـتان بشـۆن هـەتا ئانیشـكان؟ چـونكە (إلـى)ی بەكارهێنـاوەو نەیفـەرموە: (مَعَ الْمَرَافِقِ) لەگـەڵ ئانیشـكەكان، هەروەهـا

هـی پێیـەکانیش فەرموویـەتی: ﴿إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾، نەیفـەرمووە: (مَعَ الكَعْبَيْنِ) لەگـەڵ گوێزینگـان، ئیشـکالەکە لـەوەدا دروسـت بـووە، بـەڵام سـوننەتی کردەیـی پێغەمبـەر ﷺ پێشـانی ئێمـەی دەدات کـە هەمیشـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئانیشکەکانی شۆردوون، وە گوێزینگەکانیشـی لەگەڵ پێیەکانـدا شـۆردوون، کەواتـە: لـێرەدا بۆیـە زانایـان گوتوویانـە: هەرچـەندە (إلـى لِبلـوغ الغَـايـة)، واتـە: (إلـى) بـۆ گەیشـتنە بە شوێنێك، بۆ وێنە: تۆ دەڵـێی: (سَافرْتُ مِن أربيل إلـى السليمَانِيَة) لـە هەولێرەوە چوومە سلێمانی، کەواتە: لـەوێ سـەفەرەکەت کۆتایی پێ هـاتوە، کە خـوا دەفـەرموێ: دەسـتتان بشـۆن هەتـا ئانیشـك، دەبـێ لـە ئانیشـك کۆتـایی پـێ بـێو ئانیشکی لەگەڵـدا نەبـێ، بەڵام نا، زانایان دەڵـێن: لێـرەدا (إلـى) بـە مانـای (مَعَ)یـە، واتـە: لەگـەڵ، ئنجا ئایـا لـە قورئانـدا شتی وامـان هەیـە؟ بەڵـێ، لـە سـوورەتی (النسـاء)دا خوا دەربارەی مامەڵەکـردن لەگەڵ مـاڵی هەتیوانـدا دەفـەرموێ: ﴿وَءَاتُواْ ٱلْيَتَٰمَىٰٓ أَمْوَٰلَهُمْۖ وَلَا تَتَبَدَّلُواْ ٱلْخَبِيثَ بِٱلطَّيِّبِۖ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَهُمْ إِلَىٰٓ أَمْوَٰلِكُمْۚ إِنَّهُۥ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا ﴿٢﴾﴾، واتە: وە ماڵو سامانەکانی هەتیوان بدەن بـە خۆیـانو، پـیس بـە پاك مەگۆڕن (خراپی خۆتـان بە چاکی ئەوان مەگـۆڕن)، وە مـاڵی ئـەوان لەگـەڵ هـی خۆتـان مەخۆن، بە ڕاستیی ئەوە گوناهێکی زلە.

{(إلـى) لێرەدا بە مانای (مَعَ)یە یانی: مـاڵی ئـەوان لەگـەڵ مـاڵی خۆتـان مـەخۆن}، ئنجا (إلـى) هەرچەندە لە ئەسڵدا بە مانای (تاکو)یە، بـەڵام لێـرەدا یـانی: مـاڵی ئـەوان مـەهێنن لەگـەڵ مـاڵی خۆتـانو هـەردووکیان پێکـەوە بخـۆن، کەواتـە: کـە دەفـەرموێ: ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾، واتـە: دەسـتەکانتان بشـۆن هەتـا دەگـاتە ئانیشـکەکانو ئەوانیشیان لەگەڵ بشۆن.

هەندێکیشـیان دەڵێن: (إلـى) هـەر لەسـەر واتـای خۆیـەتی، بـە مانـای گەیشـتن بـە شوێنێکە، بەڵام دەڵێن: (الحَـدُّ إذا كَانَ مِنْ جِنْسِ المَحدّدِ دَخَلَ فِيهِ)، سنوورێك کـە دیـاریی دەکـرێ، ئەگـەر لـە جینسـی دیـاریی کراوەکـە بـێ، ئـەویش دەچـێتە گەڵـی، لەوبارەوە وێنـەیەك دێننـەوە: ئەگەر یەکێك بڵـێ: (بِعْتُكَ هَذَا الفَـدَّانِ مِنْ هَاهُنـا

إِلـى هَاهُنـا)، (فَدّان) ڕووبەرێکـە لـە زەوی {لـە (الـمعجم الوسیط)دا دەڵـێ: (الفَدَّان مِقْدَارُ مِنَ الأَرْض الزراعيـةِ تَختَلفُ مِسَاحَتهُ في البـلاد العربية من بلَـدٍ إلـى بلـد و مساحته في مصر ( ٣/١ ٣٣٣) قصبة مربَّعة، أو (٤٢٠٠) متر مربّع بتقريب الكسر، ج فَدَادين)[1]، واتـە: فـەددان ئەندازەیەکە لـە زەوی کشـتوکاڵیی، پانتاییەکەی لە وڵاتانی عەرەبی لە شـوێنێکەوە بۆ شوێنێك جیاوازە، لە میصردا سێسەدو سیو سێو یەك لەسەر سێی قەسەبەیەکی چوار گۆشـەیە، یاخود چـوار هـەزارو دوو سـەد (٤٢٠٠) مـەتری چوارگۆشـەیە، کـە بـە (فـدادین) کـۆ دەکرێتەوە} ئەگەر کەسێك بڵـێ: ئەو دۆنمە تا ئەو دۆنمەم پێ فرۆشـتی، یان ئـەو فەددانە، تـا ئەو فەددانەم پێ فرۆشـتی، مانـای وایە هەمووی دەچێتە نێوی، بـەڵام ئەگەر بڵـێ: (بعتُكَ هَـذِهِ الأَرْضُ مِنْ هَذِهِ الشَّـجَرَةَ إلى هَذِهِ الشَّـجَرَةَ) ئـەم زەویـەم پێفرۆشـتی لـەم درەختـەوە تـا ئـەو درەختـە، دیـارە درەختەکـەی دووەم ناکەوێتـە زەویەکـەوە، بۆچـی؟ لـە حاڵـەتی یەکەمـدا کـە دەفـەرموێ: (مِنْ هَاهُـنَـا إِلى هَاهُـنـا) لێـرەوە تـا ئێـرە، زەویەکـە هـەمووی یـەك جینسـە، بـەڵام لـە حـاڵەتی دووەمـدا درەختەکە لە جینسـی زەویەکـە نیـە، بۆیـە ئـەو درەختـە ناکەوێتـە سـنووری ئـەو زەوییـەوە، چونکە زۆر جار خەڵك لەسەر نێوانو سێوان دەبێتە کێشەیان، فرۆشیار دەڵـێ: لـەم درەختـە تـا ئـەو درەختـەم پـێ فرۆشـتووی، ئایـا ئـەو درەختـەی دووەم دەکەوێتـە نێـو سـنووری زەوییەکـەوە؟ نـەخێر نایکـەوێتـێ، چونکە درەختەکـە لـە جینسـی زەوییەکـەی نیـەو جیـایە، بـەڵام ئەگـەر بڵـێ: لێـرەوە تـا ئێـرە، یـانی دوو شـوێنان دیـاری بکـات، ئـەوە هـەر دوو شـوێنەکان دەکەونـە سـنووری ئـەو زەوییـەوە، بۆیـە کـە خـوا دەفەرمـوێ: ﴿إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ﴾، لەبەرئـەوەی (مِرفَقْ)یـش هـەر لـە جینسـی دەستەکەیە، واتـە: بەشـێکە لـە دەسـت، کەواتـە: ئانیشـکیش دەکەوێتـە نێـو حوکمی شـۆردنەوەو دەبـێ ئەویش بشـۆرێ.

ئنجا لەوبارەوە ئەم دەقە هەیـە: ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اَللّهِ رَضِيَ اَللّهُ عَنْهُمَا، كَانَ اَلنَّبِيَّ ﷺ إِذَا تَوَضَّأَ أَدَارَ اَلْمَاءَ عَلَى مُرْفَقَيْهِ﴾ {أَخْرَجَـهُ اَلدَّارَقُطْـنِيُّ بـرقم: (١٥)، وَالبَيْهَقِيُّ في (الكُبرى) برقم: (٢٥٩)، وَالسِّيوطِي فـي (الـدور الـمنثور)، وَإبْنُ كَثِير

---

١) ص ٦٧٧.

فـي (تفسيره) والقُـرطُبي، وَإِبْنُ حَجَـر فـي (فـتح البـاري، وَصَـحَّحَهُ الألبـاني فـي (السلسـلة الصـحيحة) بـرقم: (٢٠٦٧)}، واتـە: جابـیری کـوڕی عەبدوڵـڵا خـوا لـە خۆی‌و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك دەستنوێژی دەگرت، ئاوی بە دەوری ئانیشـــکی دا هەڵدەســووڕاند، واتــە: ئــاوی بەســەر ئانیشــکەکەشی دا داکــرد، کەواتە: ئانیشکیش سنووری شـۆرینە.

هەر لـەوبارەوە ئـەم فەرمایشـتەش هەیـە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ، قَالَ: إِنِّي سَمِعْتُ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: إِنَّ أُمَّتِي يُدْعَوْنَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، غُرًّا مُحَجَّلِينَ مِنْ آثَارِ الْوُضُوءِ، فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ﴾ {أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (١٣٦)، وَمُسْـلِمٌ بـرقم: (٢٤٦)، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (١٠٤٩)}، واتـە: ئوممـەتی خـۆم بـەوە دەناسـمەوە، دەموچـــاوو دەســـتوپێ‌و بازوویـــان (شـــوێنی دەســـتنوێژیان) لـــە ڕۆژی قیامەتـــدا دەدرەوشێتەوە، سپی دەبێ، دوایی ئەبو هورەیـرە گوتوویەتی: (فَمَنِ اسْتَطَاعَ مِنْكُمْ أَنْ يُطِيلَ غُرَّتَهُ فَلْيَفْعَلْ)[١] واتـە: هـەر کامێـك لـە ئێـوە تـوانی سـپیەتی‌و درەوشـاوەیی ئەندامەکانی زیاد بکات، با زیادی بکات، واتە: بەشێکی بشوات، ئەو کاتە ئەندامـەکانی دەسـتنوێژی ئەندازەیـەکی زیاتریـان زیـاتر دەدرەوشـێتەوە لـە ڕۆژی دوایـی دا، یـانی: دەم‌و چـاوی‌و دەسـتەکانی‌و پێیـەکانی، کەواتـە: بـا تـەنیا ئەوەنـدەی فـەرزە نەیشـوا، بەڵکو واوەتریشی بەرێ، بە مەرجێك خۆی تووشی ناڕەحەتیی‌و تەکەللـوف نەکات.

دیارە لە کاتێکـدا ئینسـان لە خەو هەڵدەستێ بە تایبەت، هەروەها لە حاڵەتـەکانی دیکەشـدا بەگشـتی، پێویسـتە هەردوو دەسـتی هەتا مەچەکی بشـوات پـێش ئـەوەی ئـاو بـە دەموچـاویدا بکات، واتـە: فـەرزە، یـان بـەلای کەمـەوە سوننەتە، کـە هـەردوو دەستی تا مەچەکی بشـوا، پێشـێ کـە دەسـتنوێژی دەگـرێ، بەتایبـەتی ئەگـەر ئاوەکە لەو جۆرە ئـــاوانە بـــێ کە لـە قاپێـــك، لـە مەنجەڵـــێك بـێ‌و دەسـتی تێبخـــات، دەبێ پێشێ ئاو برژێنێتە سەر دەستی، یان قـاپێکی بچووك بەسـەر دەسـتی خۆیـدا بکـات‌و دەســـتەکانی بشــوات نــەك دەســـتی بــە پیسی تێبخـــات، لـەوبارەوە ئـەم فەرمایشـتەی پێغـــەمبەر ﷺ هـــەیـــە: ﴿إِذَا اسْتَيْقَظَ أَحَدُكُمْ مِنْ نَوْمِهِ، فَلاَ يَغْمِسْ يَدَهُ فِي

---

١) قال الشـيخ الألبـاني: وهـذه الزيـادة مدرجـة فـي الحـديث مـن كـلام أبـي هريـرة لا مـن كـلام النَّبِيِّ، بيَّن ذلك غيرُ واحدٍ من الحُفَّاظ.

الإِنَـاءِ حَتَّـى يَغْسِلَهَا ثَلاَثًـا، فَإِنَّـهُ لاَ يَـدْرِي أَيْـنَ بَاتَـتْ يَـدُهُ﴾{أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٧٤٣٢)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (١٦٠)، وَمُسْـلِمٌ بـرقم: (٦٤١)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (١٠٥)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٢٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ بـرقم: (١٦١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٩٣) عَنْ أَبي هُرَيْرَةَ ﷺ}، واتە: ئەگەر یەکێکتان لە خەو هەڵسا با دەستی نەخاتە نێو قاپ، (قاپی ئاوێ، تەشتی ئاوێ، چونکە ئەو کاتە وەك ئێستا ئاو بە بەلووعە نەبووەو ئاویان لە تەشتو مەنجەڵ کردووە دەستنوێژیان پێگرتوە)، تاکو سێ جاران هەردوو دەستی دەشوات، چونکە یەکێك لە ئێوە نازانێ دەستی لە کوێ بووە.

(واتە: دەبینی دەستی لە عەورەتی خۆی داوەو دەستی پیس بووە، با دەستی جوان بشوات، ئەوە بەتایبەت کە لە خەو هەڵدەستێ، وەکی دیکەش بەگشتی، کە دیارە بە پێی ئەم فەرمایشتە دەبێ کەسێك کە لە خەو هەڵدەستێ لەسەری فەرز بێ دەستەکانی بشوا، پێش ئەوەی کە دەستنوێژێ بگرێ، لە کاتی دەستنوێژگرتندا پێش ئەوەی ئەندامەکانی دەستنوێژی بشوات، دەبێ دەستەکانی خاوێن بکاتەوەو بشوات).

**مەسەلەی هەشتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ ﴾، وە دەستی تەڕ بە سەری خۆتاندا بێنن، ﴿ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ ﴾، واتە: دەستتان بەسەرتاندا بێنن، بەڵام بە تەئکید لێرەدا مەبەستی ئەوەیە دەستی تەڕ بەسەری خۆتاندا بێنن، نەك هەر دەست بە وشکیی، زانایان لەوبارەوە کە هۆی ئەوە چییە خوای زاناو شارەزا پیتی (ب)ی زیاد کردوە لەسەر (رُءُوسِكُمْ)و نەیفەرموە: (وَامْسَحُوا رُءُوسِكُمْ) کە دەشگونجا بفەرموێ: (وَامْسَحُوا رُءُوسَكُمْ) سەرتان مەسح بکەن، دەست بە سەرتاندا بێنن، ئەدی بۆچی فەرموویەتی: ﴿ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ ﴾، بۆ زانیارییتان لە قورئان یەك پیتیش نیە مانای خۆی نەبێ، هیچ پیتێك بە خۆڕایی نیە، جاری وا هەیە هەندێك لە شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: ئەو پیتە زیادکراوە، بۆچی زیادکراوە؟ حەتمەن دیارە مانایەکی لە ژێر دایە، ئێستا لێرەدا ئەم (ب)یە کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ ﴾، زانایان دوو واتایان لێداوەتەوە:

هەندێکیان دەڵـێن: مەبەست لـەو (ب)یـە، ئەوەیـە کـە بەشـێك لەسـەرتان دەستی تەڕی پێدابێنن، کە شافیعییەکان وا دەڵێن، هـەروەها حەنەفییـەکانیش دەڵـێن: یـەك لەسەر چواری سـەر فـەڕزە مەسـح بکـرێ، بـەڵام ئـەوانی دیکە واتـە: (مالیکـییەکانو حەنبەلییەکـان) دەڵێن: دەبـێ سـەر هـەمووی مەسـح بکـرێ، ئنجا ئـەوانی پێشـەوە دەڵـێن: ئـەو (ب)یـە بۆیـە زیـادکراوە تـاکو ئـەو مانایـە بگەیەنـێ، واتـە: بەشـێك لـە سـەرتان دەسـتی تـەڕی پێـدا بێـنن، بـەڵام ئەگـەر فـەرمووبای: (وَامْسَحُوا رُءُوسِكُمْ) دەبووایـە دەست بە هەمووی دابێنـی، بەڵام لەڕاسـتیدا ئـەو ڕایـەی دیکـە بـەهێزترە کە دەڵـێ: ئەو (ب)یە، بۆیە زیادکراوە کـە دەبـێ پـێ مەسـح کـراو (مَمْسُوحٌ بِهِ)ێك هـەبێ، شـتێك هەبـێ سەری پـێ مەسـح بکەی، ئـەویش چییـە؟ ئاوە، ئنجا ئەگەر خـوا فـەرمووبای: ﴿وَامْسَحُوا رُءُوسَكُمْ﴾، هـەر دەسـتت بەسـەری داهێنابا تـەڕیش نەبووبایە، هەر تەواو بوو، بەڵام ﴿بِرُءُوسِكُمْ﴾، واتە: دەستتان بە شتێك بکەنو بـە سـەری خۆتـانی دابێنن، کە مەبەست پێـی ئاوە، واتـە: دەسـتتان بـە ئـاو بکـەنو بـە سـەری خۆتانی دابێنن.

ئنجا لەوبارەوە کە ئایا مەسح واتـە: دەستی تـەڕ بەسـەر داهێنـان، ئایـا هـەمووی بـێ، یان بەشـێکی، وەك گوتـم: زانایان ڕاجیایی یان هەیـە:

<u>شـافیعییەکان</u> دەڵـێن: یـەك تاڵە مووش لەسـەر مەسـح بکـرێ، فەڕزەکە دێتـە دی (کە دیـارە ئـەوە شـتێکی مەحـاڵەو نازانـم بۆچی وایانگوتـوە؟! چونکە یـەك تاڵـە موو مەسح ناکرێ، هەر حەتمەن دە، پـازدە موو هەر وەبەردەکـەون).

<u>حەنەفییەکـان</u> دەڵـێن: دەبـێ یـەك لەسـەر چواری سـەر بـە لای کەمـەوە، مەسـح بکـرێ.

<u>مالیکـییەکانو حەنبەلـییەکان</u> دەڵێن: دەبـێ سەر هەمووی مەسح بکرێ.

منیش وای تێدەگەم کە سـوننەتو پەسـند بـێ هەموو سـەر، یان زۆربـەی مەسـح بکـرێ، بـەڵام فـەڕزە هەندێکـی هـەر مەسـح بکـرێ، واتـە: هەنـدێکی فـەڕزە، بـەڵام هەمووی سـوننەتە، بەڵگەکانی ڕاسـتیی ئەم ڕایـە:

یەك: ئەگەر تەماشای فەرمایشتەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەین، ئەوەیان لێوەردەگیرێ، کە پێغەمبەر ﷺ مەرج نیە، هەموو جارێ هەموو سەری مەسح کردبێ، (دەستی تەڕی بە هەمووی داهێنابێ).

دوو: لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر تۆ بڵێی (مَسَحْتُ ثَوبي) دەستم بە پۆشاکەکەم داهێنا، یان (مَسَحْتُ الجِدَارَ) دەستم بە دیوارەکە داهێنا، هیچ کەس وای لێ وەرناگرێ کە دەستی بە هەموو دیوارەکەدا هێناوە، یان دەستی بە هەموو پۆشاکەکەی داهێناوە، کەواتە: ئەو رایە ڕاسترە کە کەمێکیش لەسەر، دەستی تەڕی پێدا بهێنرێ، فەرزەکە لادەچێ، بەڵام وا باشترە دەستی تەڕ بە هەمووی دابێنێ، وەك لەم فەرموودەیەی پێغەمبەریشەوە ﷺ دیارە: ﴿عَنْ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رضي الله عنه قَالَ: تَخَلَّفَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ وَتَخَلَّفْتُ مَعَهُ، فَلَمَّا قَضَى حَاجَتَهُ، قَالَ: «أَمَعَكَ مَاءٌ»، فَأَتَيْتُهُ بِمَطْهَرَةٍ، فَغَسَلَ كَفَّيْهِ وَوَجْهَهُ، ثُمَّ ذَهَبَ يَحْسِرُ عَنْ ذِرَاعَيْهِ فَضَاقَ كُمُّ الْجُبَّةِ، فَأَخْرَجَ يَدَهُ مِنْ تَحْتِ الْجُبَّةِ، وَأَلْقَى الْجُبَّةَ عَلَى مَنْكِبَيْهِ، وَغَسَلَ ذِرَاعَيْهِ وَمَسَحَ بِنَاصِيَتِهِ، وَعَلَى الْعِمَامَةِ وَعَلَى خُفَّيْهِ، ثُمَّ رَكِبَ وَرَكِبْتُ فَانْتَهَيْنَا إِلَى الْقَوْمِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرَقم: (٥٤٦٣)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٦٣٢)}، واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ سوپا بووین، دواکەوتین لە کاروانەکە، منیش لەگەڵی دواکەوتم، دوای ئەوەی تارەتی گرت، فەرمووی: ئاوت پێیە؟ منیش (مَطْهَرَة)کەم بۆ هێنا (کە وەك مەسینەیە، ئاوی دەستنوێژی تێدایە) ئەو شتەم بۆ هێنا کە ئاوی تێدا بوو پێغەمبەر ﷺ هەردوو لەپە دەستی شۆردن، دوایی دەمو چاوی شۆرد، پاشان ویستی قۆڵی هەڵبکات، (واتە: باسکەکانی هەڵبکات)، بەڵام جوببەیەکە) قۆڵەکەی تەسك بوو هەڵنەکرا، بۆیە داینا، وە جوببەکەی بەسەر شانی دادا، ئەوجار هەردوو باسکی شۆردن، وە دوایی پێشەسەری خۆی مەسح کرد (دەستی تەڕی پێداهێنا)، وە دەستی تەڕی بەسەر مێزەرەکەشی داهێنا، دوایی دەستی تەڕی بەسەر هەردوو خوففەکەشی داهێنا (خوف واتە: گۆرێی چەرم) دوایی سواری وڵاخەکەی بوو، منیش سواربوومو گەیشتینەوە خەڵکەکە.

**مەسـەلەی نۆیـەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَرۡجُلَكُمۡ إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِ ﴾، لێرەدا زانایانی قورئـان خـوێن هەنـدێکیان بـە (وَأَرْجُلَكُمْ) خوێندوویانەتـەوەو هەندێکـیان بـە (وَأَرْجُلِكُمْ) کـە ئەگـەر (وَأَرْجُلَكُمْ) بـێ، یـانی: پێیـەکانتان بشـۆن، بـەڵام ئەگـەر (وَأَرْجُلِكُمْ) بـێ کـە ئـەو قـیرائەتەش هـاتوە، هەنـدێکیان وایـان لێکـداوەتەوە کـە مەبەسـت پێـی مەسـح کردنـی پێیەکانـە، واتـە: پێیـەکان عـەطف دەکرێنـەوە سـەر مەسـحی سـەر واتـە: (وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلِكُمْ إِلَى الكَعبَيْن) سـەرتان مەسح بکـەنو پێیەکانیشـتان مەسح بکەن، وێـرای گوێزینگان، ئایـا گـوێزینگ لـە کوێیـە؟ پـێ لە کـوێ لەگەڵ لوولاکدا پێك دەگاتەوە، ئەو دوو ئێسـقانەی کـە لـەو لاو لای پـێ دەردەچن، پێیان دەگوترێ گوێزینـگ، واتە: ئەو دوو ئێسـقانەی کە خـڕن، کە دیارە لـەولاو لان یـەکیان لـە نێـوەوە، یـەکیان لـە دیـوی دەرەوە، ئەوانـە پێیان دەگـوترێ گوێزینـگ، بەڵام شـیعە دەڵـێن: گـوێزینگ پێشـی پێیە، لای پێشـەوەی پـێ، بـەڵام لەڕاسـتییدا ئـەو لاولای پـێ گوێزینگـن، بۆچی؟ چونکە (كَاعِب) لە زمانی عەرەبیدا بە کچێك دەگوترێ کە تازە مەمك دەکات، کە لە قورئانیشـدا هاتوە، خـوا دەفەرموێ: ﴿ وَكَوَاعِبَ أَتۡرَابٗا ٣٣ ﴾ النبـأ، واتە: کچانی تازە مـەمك کـردوو، کەواتـە: (كَعْب) هـەر شـتێکە کە تۆزێك خـڕ بـێ، جا گوێزینگیش مەیلەو خـڕن، شیعەش بۆیـە وا دەڵـێن تـاکو ئـەوەیان بـۆ بچێتـە سەر کە دەڵـێن: دەبـێ پـێ مەسح بکـرێ، بـەڵام بـەپێی ئایەتەکە گوێزینگەکان دەبێ وەبەر شـۆردنـێ بکـەونو گوێزینگ سنووری شۆردنەو مەسح ناگاتە وێ، دیارە ئەو وردە کاریانە زیاتر لە کتێبە فیقهـییەکاندا هـەن، بـەڵام ئێمە لێرەدا لە قەدەر تەفسیرەکەمان تۆزێکی لـێ باس دەکـەین.

بەڵـێ ئەو وشـەیە لە قیرائەتەکاندا هـەم بە: (أَرْجُلَكُمْ) خوێندراوەتـەوە، هــەم بـە (أَرْجُلِكُمْ)یش وە هەردووکیشیان موتەواتـیرن (نـافع وإبـن عـامر وكسـائي وعاصـم) لە ڕیوایـەتی (حَفْص)دا، وە یـەعقووب لـە سێیەکان بـە (أَرْجُلَكُمْ)یـان خوێندۆتـەوە بـەڵام هەرکــام لـە (إبـن كـثير وحمـزة وأبـو عَمـر)، وە (عاصِـم) لـە ڕیوایـەتێکـی دیکەی دا بـە: (أَرْجُلِكُمْ) یـان خوێندۆتــەوە، ئنجا ئەگـەر (أَرْجُلَكُمْ)بـێ، (غسـل)ی پێدا دێتـەوە، یانی دەمو چاوتان بشـۆنو پێیەکانیشـتان بشـۆن لەگـەڵ گوێزینگـەکان، بەڵام ئەگەر (أَرْجُلِكُمْ)بێ، ئەوە وەك گوتم دەگونجێ بگەڕێتـەوە بۆ سـەر سـەر، واتـە:

سەرتان مەسح بکەن، دەستی تەڕی پێدا بێنن‌و دەستی تەڕیش بە پێیەکانتاندا بێنن، دیارە زانایانی ئیسلام دەربارەی ئەوە کە ئایا مەسحی پێیەکان دروستە، یان دروست نیە؟ چوار ڕایان هەن:

١/ هەندێکیان دەڵێن: ئینسان سەرپشکە ئایا پێیەکان بشۆرێ، یاخود مەسحیان بکات.

٢/ زۆربەی هەرە زۆریان دەڵێن: فەرزە بشۆرێن، کە هەر ئەو ڕایەش ڕاستە، وەك دوایی باسی دەکەین.

٣/ ڕایەکی دیکەش هەیە کە ڕای شیعەی دوازدە ئیمامییە، دەڵێن: دەبێ مەسح بکرێن.

٤/ ڕایەکی دیکەش هەیە دەڵێ: دەبێ مەسحیش بکرێن‌و بششۆرێن، پێشێ دەستی تەڕیان پێدا بێنی دواییش بیانشۆی.

ئەو چوار بۆچوونە هەن لەوبارەوە، بەڵام لەڕاستیدا هەر بۆچوونی شۆردنیان لە هەموویان بەهێزترە.

ئێستاش با سەرنجێکی هەرکام لەو چوار ڕایە بدەین‌و هەڵیان بسەنگێنین

**ڕای یەکەم: سەرپشك بوون بۆ مەسح‌و شۆردن:**

(الشَّوكَاني) خاوەنی کتێبی (فَتحُ القَدير) و (نيل الأوطار)ەو زانایەکی گەورەیە دەڵێ: (أبو جعفر الطَّبري) کە بە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان بەناوبانگە، ڕای وایە کە ئینسان سەرپشکە لە نێوان ئەوەدا پێیەکانی بشوات، یاخود مەسحیان بکات[1]، جا من ئەوەتان بۆیە بۆ باس دەکەم، بزانن کە (الشوكاني) لێرەدا بە هەڵەدا چووەو (طبري) کە یەکێکە لە پێشەواکانی ئیسلام، وە بە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان بەناوبانگە، تەفسیرەکەی گەورەترین تەفسیرە، وە زۆربەی تەفسیرەکانی دیکە هەر سوود لەو دەبینن، وە (طبري) سەرمەزهەب بووەو لە ڕیزی (مالیك)و (أبوحنيفة)و (شافعي)و (أحمد بن حنبل)دا بووە، شتی وایینەگوتوە، ئێستاش با سەرنجی بدەین:

---

١) فتح القدير: ج٢، ص٢٥.

ئایا (طبري) ڕای وایە ئینسان بۆی هەیە پێیەکانی مەسح بکات، یاخود بشوات، وە لەوبارەوە سەرپشکە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو هەموو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ لەسەر پێویستبوونی شۆردنی پێیەکان هەن؟ نەخێر، ئەدی (الشوكاني) بۆچی وا دەڵێ؟ من ئێستا قسەکانی (طبري) دێنمو وادیارە (الشوكاني) باش لە قسەکانی تێنەگەیشتوە، واش پێدەچێ لەوکاتەدا تەفسیرەکەی لەبەردەستدا نەبووبێ، بۆیە وایگوتوە، بەڵام (إبْنُ كَثير) وەك (جَمَال الدين القاسمي)[1] لێی خواستۆتەوە دەڵێ: (إبْنُ كَثير) باش لە قسەکەی (طبري) حاڵی بووەو دەڵێ: مەبەستی (طبري) ئەوە نیە کە ئینسان سەرپشك بێ لە نێوان ئەوەدا کە پێیەکانی بشوا یان مەسح بکات، بەڵکو گوتوویەتی: ئینسان سەرپشکە لە نێوان ئەوەدا کە پێیەکانی هەر ئاویان پێدا بکات، یان لەگەڵ ئاو پێداکردندا دەستیشیان پێدا بێنێو (دَلْك)یان بکات، ئەمەش دەقی قسەکەی (طبري)یە کە من لە تەفسیرەکەی خۆی (جامع البيان)دا[2] هێناومە، قسەکەی زۆر جوانە، دەڵێ:

{وَالصَّوَابُ مِنَ القَوْلِ عِنْدَنَا فِي ذَلِكَ، أَنَّ اللهَ عَزَّ ذِكْرُهُ أَمَرَ عمُوم مَسح الرجلَيْنِ بِالْمَاءِ فِي الوُضُوءِ، كَمَا أَمَرَ بِعمُوم مَسْحِ الوَجْهِ بِالتُّرَابِ فِي التَّيَمُّم، وَإِذَا فَعَلَ ذَلِكَ بِهِمَا الْمتوضئ، كَانَ مستحقاً اسم "مَاسِحٍ غَاسِلٍ"، لأَنَّ "غَسْلَهُمَا" إِمْرَارُ الْمَاءِ عَلَيْهِمَا أَوْ إصَابَتهُمَا بالمَاءِ، و"مَسْحَهُما"، إِمْرَارُ اليَدِ أَوْ مَا قَامَ مَقَام اليَدِ عَلَيْهِمَا فَبَيِّنٌ صَوَابُ قِرَأَة القِرَاءَتَيْنِ جَمِيعاً، أَعني النَّصْب فِي "الأَرْجُل" وَالخَفْض، لأَنَّ فِي عمُوم الرِّجْلَيْن بِمَسْحِهِمَا بِالمَاءِ غَسلهما، وَفِي إِمْرَار اليَدِ وَمَا قَامَ مَقَامَ اليَدِ عَلَيْهِمَا مَسْحُهُمَا، فوُجه صَواب قِرَاءَةِ، مَنْ قرأ ذَلِكَ نَصْباً لَمَّا فِي ذَلِكَ مِن مَعنى عمُومهمَا بِإِمْرَار المَاءِ عَلَيْهِما، وَوُجُهُ صَواب قِرَاءة مَنْ قَرأه خَفْضاً، لَمَّا فِي ذَلِكَ مِنْ إِمْرَار اليَدِ عَلَيْهِما، أو مَا قَامَ مَقَامَ اليَدِ، مَسْحاً بِهِمَا}، واتە: ڕای ڕاست لە لای ئێمەوە ئەوەیە کە خوای پایەدار فەرمانی کردوە کە هەر دوو پێیەکان ئاویان پێدا بکرێ، لە کاتی دەستنوێژدا، هەروەك چۆن فەرمانی کردوە کە لە کاتی تەیەمومدا دەست بە ڕووی زەوی دابهێنرێو، بە دەموچاوو دەستدا

١) محاسن التأويل: ج٦، ص١٠٩.
٢) ج٦، ص١٤٢، ١٤٣.

بهێندرێ، وە کاتێك کەسێك کە دەستنوێژ دەگرێ، وا بکات، ئەو کاتە مانای وایە دەگونجێ پێی بگوترێ (ماسِحٌ غاسِلٌ)، (واتە: دەست پێداهێنەرو شۆرەر) چونکە شۆردنی دوو پێیەکان ئەوەیە کە ئاویان پێدابکرێ، یاخود ئاویان وێ بکەوێ، جاری وایە کەسێك لاق لە نێو ئاوێ دەنێ، ئاوەکەیان پێدا ناکات، مەسح کردنیشیان ئەوەیە کە دەستیان پێدابێنێ، بۆیە هەردوو قیرائەتەکان ڕاستن {لێرەدا (طَبَري) دیفاع لەو دوو قیرائەتە دەکات کە (أَرْجُلِكُمْ)و (أَرْجُلَكُمْ)ن} کاتێك کە دەشۆرێن، ئەوە مانای وایە قیرائەتی (أَرْجُلَكُمْ)، هاتۆتە دیو غوسڵیان بەسەردا دێتەوە، وە کاتێك کە دەستیان پێدا دەهێنرێ لەگەڵ ئاوەکەدا ئەوە مانای وایە قیرائەتی (خَفْض) دەیگرێتەوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ﴾، واتە: دەستی تەڕ بەسەرتان دابێنن، وە دەستی تەڕ بە پێیەکانیشتان دابێنن، (بەڵام لەگەڵ شۆردنی دا، نەك هەر دەستی تەڕو هیچی دی)، کەواتە: دەبێ هەردووکیان ببن، (واتە: دەستی تەڕیشی پێ دابێنێ لەگەڵ شۆردنی، وە دەشگونجێ دەستی تەڕی پێدانەهێنێ و هەر لاقان لە ئاوێ بنێ، ئەو کاتە پێیەکان دەشۆرێن).

ئەوە ڕایەکەی (طَبَري)یە، کە شەوکانی گوتوویەتی: ئینسان سەرپشکە، ئایا دەستی تەڕیان پێدابێنێ، یاخود بیانشوات، کە لەڕاستیدا وا نیە، بەڵکو مەبەست پێی دەستی تەڕ پێداهێنانە، لەگەڵ شۆردنیدا، یاخود هەر شۆردن.

بەڵام (النّحاس) یەکێکە لە زانایان دیارە ئەو ڕایەی هەیە، دەڵێ: ئینسان کە دەستنوێژ دەگرێ، سەرپشکە لە نێوان ئەوەدا کە دەستی تەڕ بە پێیەکانی دابێنێ، یاخود بیانشوات، هەرکامێکیان بێ بۆی هەیە، کە لەڕاستیدا ڕایەکەی ڕاست نیە.

ڕای دووەم: شۆردن:

سەرجەم زانایانی ئیسلام لەسەر فەرزبوونی شۆردنی دوو پێیەکان، وە هەردوو گوێزینگەکانیش یەکدەنگن، بۆچی؟

چونکـــە وێـرای ئایەتەکـــە چـەندان فەرمایشـتی پێغەمبەریشـــمان ﷺ هـەن، یان چەندان دەقی ســوننەت کە زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی ئەوە دەگەیـەنن، کـە دەبـــێ دوو پێیەکان لەگەڵ گوێزینگەکاندا بشـۆرێن:

١) ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: تَخَلَّفَ عَنَّا رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي سَفرَةٍ فَأَدْرَكَنَا، وَقَدْ أَرْهَقَتْنَا العَصْر، فَجعَلْنَا نَتَوَضَّأُ وَنَمْسَحُ عَلَى أَرْجُلِنَا، قَالَ: فَنَادَى بِأَعْلَى صَوْتِهِ: «وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ» مَرَّتَيْنِ أَوْ ثَلاثًا﴾ {(أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (١٦٣)}، واتـە: عەبدوڵـلای کـوڕی عـەمری کـوڕی عـاص خـوا لـە خـۆیو بابی ڕازی بـێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لە ســەفەرێك لێمان دواکەوت، (دیارە دواکەوتوە بـۆ تارەتـگرتنو بـۆ دەسـتنوێژگرتن) دوایـی پێمانـگەیشـت کـە کاتێـك پێمانـگەیشـــت نوێـژی عەســـر بـوو، ئێمـــەش دەسـتنوێژمان دەگـرتو پێیەکانیشـمان مەسـح دەکرد، دەستی تـەڕمان پێدا دێنـان، پێغەمبـــەر ﷺ بـە دەنگی هـــەرە بـەرزی خـۆی بـانگی کـردو فـەرمووی: سـزای سـەخت لـە ئـاگر بـۆ ئەوانەی پاژنە پێیان ناشـــۆن، ســـزای ســـەخت لـە ئـاگر بـۆ ئـەو کەسانەی پـاژنە پێیـان ناشـــۆن، دوو جـاران وایفـەرموو، یاخـود ســێ جاران وایفـەرموو. کەواتـە: پێیەکان دەبێ بشـۆرێن.

٢) ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ قَالَ: (أَسْبِغوا الْوُضُوءَ، وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ) {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٢٥)}، واتـە: دایكمـان عائیشـــە خـوا لێـــی ڕازی بـــێ، دەڵـێ: پێغەمبـەر ﷺ فـەرمووی: دەسـتنوێژێ بەتـەواویی بشـۆن، سزای سەخت لە ئاگر بۆ ئەو کەسانەیە کە پاژنە پێیان ناشـۆن.

٣) ﴿عَنْ عُمَرَ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، أَنَّ رَجُلاً تَوَضَّأَ فَتَرَكَ مَوْضِعَ ظُفُرٍ عَلَى قَدَمِهِ فَأَبْصَرَهُ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ: (ارجِعْ فَأَحْسِنْ وُضُوءَكَ)، فَرَجَعَ ثُمَّ صَلَّى﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٢٤٣)}، واتــە: عومـەری کـوڕی خەتتـــاب خـوا لێـــی ڕازی بـــێ دەگێڕێتەوە دەڵێ: پیاوێـك دەسـتنوێژی گـرت بـە ئەنـدازەی نینۆکێـك لەسـەر پێـی خاڵێکی وشکی بەجێهێشـتبوو، (واتە: نەیشـۆردبوو)، پێغەمبـەر ﷺ پێی فەرموو: بگەڕێوە دەسـتنوێژەکەت بە چاکی بگرە، (واتـە: پێـت هـەمووی بشـۆ، کەواتـە: بـە قەد نینۆکێکیش نابـێ وشـکی بمێنـێ)، دەڵـێ: کابرا گەڕایەوە دوایی نوێـژی کـرد، ئــەوە ڕای دووەم کـە وەك گوتم هی زۆربـەی زانایانە.

## ڕای سێیەم: مەسـح كـردن:

ئەویش ڕای شیعەی ئیمامییـە، ئەگەرنا شیعەی زەیـدیی وا نـاڵێن، تـەنیا شـیعەی، دوازدە ئیمامیی، وا دەڵێن، وە كێشـەی وان ئەوەیـە دەڵێن: كەسێك كـە دەسـتنوێژ دەگـرێ، ئەگـەر پێیـەكانی بشـوا، دەسـتنوێژەكەی وەبـەر ناكـەوێ، مەگـەر مەسـحیان بكـات!! كـە مـن پێمـوایە زیـاتر مەسـەلەكە هـەر ئەوەیـە كـە پێچەوانەی جـەماوەری مسوڵمانان بجووڵێنەوە، كە بە ئەهلی سوننەت بە ناوبـانگن، زیـاتر ئـەوە پاڵنـەریانە، وەك چـۆن لـە زۆر شـتی دیكەشـدا وەك: بـانگ‌و، بـەردەمۆرەو، دەسـت نـەگرتن لـە نوێـژداو ... هتد، تەماشایان كردوە چۆن پێچەوانەی ئەهلی سـوننەتە ئاوا بكـەن، كە وەك خۆ جیاكردنەوەیەك ئەو بۆ چوونە فیقهیانەیان تەبەننیـی كـردوە، جا ئـەوان دەڵێن: كەواتـە: ناشـبێ بـە (أَرجُلَكُمْ) بخوێنرێتـەوە، دەبـێ بـە: (أَرجُلِكُمْ) بـێ، ئنـجا ئێمـە دەڵێین: باشـە ئەگـەر هـەر (أَرجُلَكُمْ) بخوێنرێتـەوە، ئـەوە باسـمان كـرد، ئەدی ئەگەر بە: (أَرجُلِكُمْ) بخوێنرێتەوە، حیكمەتەكـەی چییـە؟

(الشَّـنْقِيطي) لەوبارەوە كە ئایا بۆچی خوای كاربەجێ ئەم ئایـەتەی وانـاردوە كە بە دوو شێوە بخوێنرێتـەوە؟ لە تەفسیرەكەی خۆیدا چـەند شـتێكی جـوان دێنـێ، چوار هۆكاری باسكردوون، دەڵـێ(١):

١- (قِرَاءَةُ الجَـرِّ : إِجْمَالٌ) واتـە: مـادام بـە سـەر (نصب) خوێندرابێتـەوە، (أَرجُلَكُمْ) دەزانین كە فەرزی پێیەكان شۆردنە، بۆیـە كـە بـە: (أَرجُلِكُمْ)یـش دەخوێنرێتـەوە، ئەوە بە كورتییە، بەڵام سـوننەت ئەوەی ڕوونكردۆتەوە كە دەبێ بشـۆرێن، دیارە خوێندرانەوەشی بە ژێـر (خفض) چەند حیكمەتێكـی تێدان كە لـە خاڵەكـانی (٢و ٣و ٤)دا دەیانخەینەڕوو.

٢- (قِرَاءَةُ الخَفْضِ إِنَّمَا هِيَ لِمُجَاوَرَةِ الـمَخْفُوضِ مَعَ أَنَّهَا فِـي الأَصْلِ مَنْصُـوبَة بِدَلِيـلِ قِرَاءَةِ النَّصْـبِ)، لە زمـانی عەرەبیـیدا بنچینەیەك هەیـە، پێـی دەگـوترێ: (خَفْض الجِوَار) یـان (جَـرُّ الجِوَار) ئەگـەر وشـەیەك لـە تەنیشـت وشـەیەكەوە هاتبـێ، كە وشەكەی پێشی ئـەو ژێـر (كَسْـر)ی هەبـێ، ئـەو وشـەیەی دواى ویـش

---

١) بڕوانـە: أضواء البيان، ج١، ص ٣٣٠ –٣٣٦.

ژێر (کَسْر) پەیدادەکات، هەرچەندە لە ئەسڵدا حاڵەتە ئیعرابیەکەی (مَنْصُوب) یان (مَرفُوع)بێ، ئنجا با وێنەیەکی لە قورئان بۆ بێنینەوە: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ... وَإِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٖ مُّحِيطٖ ﴿٨٤﴾ ﴾ هود، واتە: (هوود بە قەومەکەی گوت:) من مەترسی ئەوەم لێتان هەیە لە سزایەکی دەورە دەر لە ڕۆژێکدا، جا لێرەدا وشەی: (مُحيطٍ) سیفەتی (عَذَاب)ە، (عَذَاب)یش (مَنْصُوب)ە، ئەگەر بەپێی ئەوەبێ دەبووایە ئاوا بووایە: {إنّي أخَافُ عَلَيْكُم عَذَابَ يَومٍ مُحيطاً}، کەچی دەخوێنرێتەوە (مُحيطٍ)، ئەوە پێی دەگوترێ: (جَرُّ الجِوَار)، لەبەرئەوەی وشەی: (يَومٍ) (مَجْرُور)ە، (مُحيطٍ)یش هەرچەندە سیفەتی (عَذَاب)ەو دەبێ (مَنْصُوب)بێ، ئەویش (مَجْرُور) کراوە، لەبەر دراوسێیەتی.

هەروەها هەر لە سوورەتی (هود)دا هاتوە، دەفەرموێ: ﴿ ... إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيۡكُمۡ عَذَابَ يَوۡمٍ أَلِيمٖ ﴿٢٦﴾ ﴾، کە دیسان وشەی: (أليمٍ) سیفەتی (عَذَاب)ە، نەك (يَوْم)، ئەگەر بەپێی ئەو بنچینەیە نەبووایە، دەبووایە بگوترێ: {إنّي أخَافُ عَلَيْكُم عَذَابَ يَومٍ أليماً}، کەچی دەخوێنرێتەوە (أليمٍ).

هەروەها عەرەبیش دەڵێن: (هَذَا جُحْرُ ضَبٍّ خَرِبٌ)، بەڵام ئەوان دەیخوێننەوە، (خَرِبٍ) چونکە لە دوای (ضَبّ)ەوە هاتوە، کە ئەویش ژێری هەیە، کەواتە: لەبەر ئەو بنچینەیەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ وَأَرۡجُلَكُمۡ ﴾، کە بە: (أَرجُلِكُمْ) بخوێندرێتەوە، لەبەرئەوەیە لە نزیك (رُءُوسِكُم)ە، ئەویش ژێر (کَسْر)ی هەیە، دەبێ ئەویش ژێری هەبێ، لەبەر نزیکی (جوار) ئەگەرنا لە ئەسڵدا حاڵەتە ئیعرابییەکەی (مَنْصُوب)ە، کە شۆردنی بەسەردا دێتەوە.

٣- (الْمُرَاد بمَسْحِ الرِّجلَين غَسْلهُما والعَرَب تُطلقُ الْمَسْحَ عَلَى الغَسْلِ أيضاً) واتە: مەبەست لە مەسح کردنی پێیەکان شۆردنیانە، چونکە عەرەب جاری وایە وشەی: (مَسْح) بە مانای شۆردنیش بەکاردێنن، دەڵێن: (تَمَسَّحْتُ) واتە: (تَوضَّأتُ)، وە دەڵێن: (مَسَحَ المَطَرُ الأَرْضَ: أَي غَسَلَهَا)، بارانەکە زەوییەکەی

مەســح کـرد، واتـە: شــۆردیەوە، وە دەگـوترێ: (مَسَحَ اللهُ مَا بِكَ: غَسَلَ عَنْكَ الذّنُوب والأَذَى)، خوا بیسـڕێتەوە ئەوەی لێتـە، واتـە: گوناهـەکانو دەردەکـەت لـێ لابـداتو بشــواتەوە، کەواتـە: وشـەی: (مَسْح) لـە زمـانی عەرەبـیـدا بـە مانــای (غَسْل)یش بەکـارهاتوە.

٤- (المرَادُ بقِرَاءة الجَرِّ: المَسْح، ولكن النَّبيّ بَيَّنَ أنَّ ذلِكَ لايَكُونُ إلاَّ على الخُفِّ) دەڵـێ: ئەگـەر بـە (جَر) بخـوێنرێتەوە، واتـە: بـە (أرجُلِكُمْ)، مەبەسـت لـە (مَسْح) دەست پێداهێنانــە، بەڵام پێغـەمبەری خوا ﷺ ڕوونی کردۆتـەوە کە ئەو دەسـتی تەڕ پێداهێنانە لە کاتێکدایە کە ئینسـان خوفـف (واتـە: گۆرێـی چـەرمی) لـە پـێ بن، (یان گۆرێی دیکـە)، وەختێك ئینسـان کە گـۆرێی لـە پـێ بـن، دەستی تـەڕیان پێدادێنــێ، ئەو قـیرائەتە بۆ ئەو حاڵەتـەیـە، تەماشای کـەلامی خـوای زانـاو شـارەزا بکـەن! چـەندە وردەکـاریی تێــدایە، ئەگـەر فەرمووبــای: (أَرجُلَكُمْ) پێیــەکانتان بشــۆن، ئـەو کاتـە بەڵگـەی مەسـحمان لـە کـوێ هێنابایـە؟! بـەڵام ئێسـتا هـەردوو قیرائەتـەکان هـەن، ئەگـەر پێیـەکانت ڕووت بـن، ئـەوە شـۆردنیان بەسـەر دا دێ، وە ئەگەر داپۆشـراوبن (واتـە: خوفـف یان گۆرێـت لـە پـێ بـێ) ئـەوە دەسـتی تـەڕیان بەسـەردا دێو مەسـحیان دەکـەی، قـیرائەتێك بـۆ حاڵەتــێ کـە پــێ بـە دەرەوەبـن، قـیرائەتێکیش بۆ حاڵەتــێ کە پێیـەکان داپۆشــراوبن، ئـیش هـەرگیز لـەوە باشــتر نــاکرێ، کەواتــە: ئــەوەی شـیعە دەیڵـێن: لەڕاسـتیدا قسـەیەکی زیادەیـەو هـیچ بەڵـگەیەکیشیان بەدەســتەوە نیـە، ئـنجــا ئەگـەر یـەکێك بپرســێ: باشــە ئایـا نەدەگونجـا ئـەو هـەموو مشـتومڕە لـە کـۆڵ شـیعەو ئەهلـی سـوننە بکرێتـەوەو یەکسـەر خوای کاربەجــێ لە دوای شــۆردنی دەموچاو یـان شــۆردنی دەســتەکان باسی پێیەکانیشی کردبـاو فـەرمووبای: (فَاغْسِلُوا وجُوهَكُم وَأَيدِيكُم إلى المَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرءُوسِكُم وَأَرجُلِكُمْ إِلى الكَعْبَيْنِ)، نـەدەکرا وابـێ؟ ئێمــە دەڵـێین: بـا، بەڵام ئەو تەعبیـرەی قورئان حیکمەتی تێدایە، حیکمەتەکـەش ئەوەیە: کـە خـوای کاربەجـێ مەسـحی سـەری خسـتۆتە نێوان شـۆردنی دەسـتەکانو پێیـەکان، تـاکو بزانـرێ کـە ئـەو ڕیزبەندییـە پێویسـتە ڕەچـاو بکـرێ، کـە ئـەوەش ڕای زۆربـەی زانایانە، ئایا ئەگەر کەسێك دەستنوێژی شـۆرد، یەکسـەر چوو پێیـەکانی شـۆرد،

ئنجا دەستەکانی، دوایی دەموچاوی، وەبەر دەکەوێ؟ لەسەر ڕای زۆربەی زانایان وەبەر ناکەوێ، پێویستە ڕیزبەندیی ڕەچاوبکرێ، بەم شێوەیە:

١- دەموچاوت دەشۆی.

٢- دوایی دەستەکانت دەشۆی.

٣- دوایی مەسحی سەرت دەکەی.

٤- ئنجا پێیەکانت دەشۆی.

بەڵێ خوای پەروەردگار فێرمان دەکات، بۆیە مەسحی سەری خستۆتە نێوان شۆردنی هەردوو دەستەکانو هەردوو پێیەکان، تاکو بۆ ئێمە دیاربێ کە پێویستە ئەو ڕیزبەندییە ڕەچاو بکەین، کەواتە: فەرزەکانی دەستنوێژ چیو چین؟ بەپێی ئەم ئایەتە فەرزەکانی دەستنوێژ شەشن، کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾، پێشتر باسمان کرد، یانی: (إِذا أَرَدتُمُ القيامَ إلى الصَّلاةِ) واتە: ئەگەر ویستتان هەڵسن بۆ نوێژێ، یانی نیەتتان هەبوو، کەواتە:

١) فەرزی یەکەمی دەستنوێژ بریتیە لە نیەت.

٢) فەرزی دووەمی بریتیە لە شۆردنی دەمو چاو.

٣) فەرزی سێیەمی بریتیە لە شۆردنی دەستەکان لەگەڵ ئانیشکان.

٤) فەرزی چوارەمی بریتیە لە مەسحی سەر، دەستی تەڕ بەسەر داهێنان.

٥) فەرزی پێنجەمی بریتیە لە شۆردنی پێیەکان لەگەڵ گوێزینگان.

٦) فەرزی شەشەمی بریتیە لە ڕیزبەندیی (ترتیب)و پاشو پێش پێ نەکردنیان.

ڕای چوارەم: کە دەڵێ: دەبێ پێیەکان مەسحیش بکرێنو بششۆرێن:

ئەوە مەگەر مەبەست پێی ئەوەبێ کە دەستیان پێدابهێنرێ کە پێی دەگوترێ (دَلْک) ئەگەرنا بەڵگەیەکی وام لەسەر نەدی شایانی باس بێ

**مەسـەلەی دەیـەم:** چۆنیـەتی دەستنوێژگرتن، ئایا دەستنوێژ چۆن دەگیـرێ؟ دیارە لە زۆر فەرمایشـتاندا باسـی دەسـتنوێژگرتن کـراوە، مـن یـەك فەرمایشـتم بـە نموونـە هێناوەتـەوە:

﴿أَخْرَجَ البُخَارِيُّ أَنَّ رَجُلاً قَالَ لِعَبْدِ اللهِ بْنِ زَيْدٍ: أَتَسْتَطِيعُ أَنْ تُرِيَنِي كَيْفَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَتَوَضَّأُ؟ فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ زَيْدٍ: نَعَمْ، فَدَعَا بِمَاءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى يَدَيْهِ، فَغَسَلَ مَرَّتَيْنِ، ثُمَّ مَضْمَضَ وَاسْتَنْثَرَ ثَلاثاً، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثاً، ثُمَّ غَسَلَ يَدَيْهِ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ، ثُمَّ مَسَحَ رَأْسَهُ بِيَدَيْهِ، فَأَقْبَلَ بِهِمَا وَأَدْبَرَ بَدَأَ بِمُقَدَّمِ رَأْسِهِ حَتَّى ذَهَبَ بِهِمَا إِلَى قَفَاهُ، ثُمَّ رَدَّهُمَا إِلَى الْمَكَانِ الَّذِي بَدَأَ مِنْهُ ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (١٨٤)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٥٥٤)}، واتـە: پیاوێك بـە عەبدوڵـڵای کـوڕی زەیـدی گـوت: دەتـوانی پێشـانم بـدەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەستنوێژی چۆن دەگرت؟ عەبدوڵڵای کوڕی زەیدیش گوتی: بەڵـێ، گوتی: ئاوێکم بـۆ بێنـن، ئاویـان بۆ هێنـا، دەستەکانی شـۆردن پـێش ئـەوەی دەسـتی لـە قاپەکە بـاوێ، دوو جاران دەستەکانی شۆردن، واتـە: هـەر دوو لەپـە دەسـتی، دوایـی ئـاوی لـە دەمـی وەردا، وە ئاوی لە لووتیشی وەردا، (واتە: قورگـو لووتـی خـۆی ئـاو تێوەرداو خـاوێنی کردنەوە) سـێ جاران، ئەنجـا دوایـی سـێ جاران دەمو چاوی شـۆرد، (واتە: سـێ جاران ئاوی بە دەموچاوی داکردو دەستی پێداهێنان) پاشـان دووجـار دووجـار دەسـتەکانی شۆردن، (هـەر دەسـتەی دووجـاری شـۆردوون) دوایـی دەسـتی تـەڕی بەسـەری داهێنـا، دەستی پێداهێناو دوایی هێنایەوە، هەردوو دەسـتی بـە پێشـە سـەری دەسـتی پێکـردو هەتا بردی بۆ پشتە سەریو دوایـی لـەوێ ڕاهێنانیـەوە، بـۆ ئـەو شـوێنەی کـە لێیـەوە دەستی پێکردبوو، ئەنجـا هەردوو پێیەکانی شـۆردن.

لێرەدا ئێمە پێویسـتە چەند شتێك دەربارەی دەستنوێژگرتن ڕوون بکـەینـەوە:

یەکـەم/ ئـاو لە زارو لـووت وەردان:

کە پێی دەگوتـرێ: (الْمَضْمَضَـةُ وَالإِسْتِنْشَـاق)، (الإِسْتِنْشَـاق) بریتیـە لـە ئـاو لـە لـووت وەردان، (الإِسْتِنْثَارُ) بریتیـە لـە فڕێدانـەوەی ئاوەکـە، (الْمَضْـمَضَةَ)ش ئــاو لـە دەم وەردانـە، زۆربـەی زانایـان بـە سـوننەتو هەندێکیشیان بـە فـەرزیان

دەزانن، بەڵام سوننەت بوونیان نزیکترە، وە لە زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دا باسی ئاو لە دەمو لووت وەردان کراوە، یانی: سوننەتە بەلای کەمەوە، هەندێکیش دەڵێن: فەرزە ئاو لە لووتو دەم وەربدرێ لە کاتی دەستنوێژگرتندا.

دووەم/ دەستنوێژگرتن:

بۆ شۆردنەکان دەگونجێ یەك جاربێ، وە دەگونجێ دووجار بێ، دەشگونجێ سێ جاربێ، یانی: دەگونجێ یەکجار، دووجار، سێ جار دەموچاوت بشۆری بۆ دەستو پێیەکانیش بە هەمان شێوە، لە سوننەتی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هەرسێك جۆرەکان هاتوون:

١/ ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا تَوَضَّأَ النَّبِيّ ﷺ مَرَّةً مَرَّةً﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٥٧)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ یەك جار یەك جار، دەستنوێژی گرت، واتە: (یەکجار ئەندامەکانی شۆردن، بەڵام دوایی بۆتان ڕوون دەکەمەوە، ئەو یەکجارو ئەو دووجارە دەبێ چۆن بێ)؟

٢/ ﴿عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ يَزِيدَ رضي الله عنه أَنَّ النَّبِيّ ﷺ تَوَضَّأَ مَرَّتَيْنِ مَرَّتَيْنِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٥٨)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی زەید خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دووجار دووجار ئەندامەکانی شۆردنو دەستنوێژی گرت.

٣/ ﴿عن حُمْرَانَ مَوْلَى عُثْمَانَ رضي الله عنه أَنَّهُ رَأَى عُثْمَانَ بْنَ عَفَّانَ دَعَا بِإِنَاءٍ، فَأَفْرَغَ عَلَى كَفَّيْهِ ثَلاثَ مِرَارٍ، فَغَسَلَهُمَا، ثُمَّ أَدْخَلَ يَمِينَهُ فِي الإِنَاءِ فَمَضْمَضَ وَاسْتَنْشَقَ، ثُمَّ غَسَلَ وَجْهَهُ ثَلاثًا وَيَدَيْهِ إِلَى الْمِرْفَقَيْنِ ثَلاثَ مِرَارٍ، ثُمَّ مَسَحَ بِرَأْسِهِ، ثُمَّ غَسَلَ رِجْلَيْهِ ثَلاثَ مِرَارٍ إِلَى الْكَعْبَيْنِ، ثُمَّ قَالَ، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: مَنْ تَوَضَّأَ نَحْوَ وُضُوئِي هَذَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، لا يُحَدِّثُ فِيهِمَا نَفْسَهُ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٥٩)}، واتە: حومڕان کە خزمەتکاری عوسمانی کوڕی عەففان بووە (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی عوسمانی کوڕی عەففانی بینیوە قاپێك ئاویان بۆ هێناوە (دیارە ئەویش ویستوویەتی وەك پێغەمبەر ﷺ خەڵك فێری دەستنوێژ گرتن بکات) لە

قاپەکە سێ جاران ئاوی بە دوو لەپە دەستەکانی خۆی داکردو شۆردنی، دوایی دەستی تەڕی خستنە نێو قاپە ئاوەکە، وە ئاوی لە دەمو لووتی وەردا (نەیگوتوە سێ جار، کەواتە: یەکجاریش هەر تەواوە) دوایی دەموچاوی خۆی شۆرد سێ جاران، سێ مستە ئاوی پێدا کردن، وە پاشان هەردوو دەستی خۆی شۆردن، لەگەڵ ئانیشکان سێ جاران، دوایی مەسحی سەری خۆی کرد یەکجار، (واتە: دەستی تەڕی بەسەری خۆی داهێنا) دوایی پێیەکانی خۆی شۆردن، هەتا سێ جاران لەگەڵ گوێزینگەکان، دوایی گوتی: (واتە: عوسمان گوتی:) پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: هەر کەسێك دەستنوێژێ وەك ئەم دەستنوێژەی من بگرێ (دیارە عوسمان پێغەمبەری ﷺ بینیوە کە دەستنوێژی گرتوە)، ئنجا دوو ڕکات نوێژان بکات، هیچ لەگەڵ نەفسی خۆیدا قسە نەکات، (دالغەی نەڕوات بەولاولادا، یانی دوو ڕکاتان بکات، زۆر بە ئاگا لە خۆبوونەوە، بە بیر لێکردنەوەی ئەو شتانەی کەوا دەیانڵێ)، هەرچی گوناهی ڕابردوویەتی دەپۆشرێ.

جا کوردەواریی خۆشمان شتێك دەگێڕنەوە، دەڵێن: (پێغەمبەر ﷺ جارێك فەرموویەتی: هەر کەسێك دوو ڕکات نوێژان بکات، هیچ دالغەی نەڕوات یەکێك لەو دوو بەرماڵانەی دەدەمێ، عەلی کوڕی ئەبی طالبیش گوتوویەتی: من دوو ڕکاتی وا دەکەم، فەرموویەتی: باشە، دوایی کە دوو ڕکاتەکەی کردن لەنێو نوێژەکەدا دالغەی بۆ دێ، دەبێ کام لەو دوو بەرماڵەی بداتێ؟ ئەویش بێ دالغە نوێژەکەی بۆ نەکراوە)، کە ڕاست نیە، جارێ ئەو کاتی بەرماڵ هەر نەبووە بەم شێوەیە، پاشان ئینسانیش دەتوانێ دالغەی نەڕواتو دوو ڕکات نوێژانیش بکات، نەك عەلی، زۆر کەسی دیکەش ئەگەر هەر تۆزێك ئاگای لە خۆی بێ، دەتوانێ دالغەشی نەڕواتو نوێژی خۆشی بکات، بۆیەش وا دەڵێم: چونکە خەڵك دەڵێن: جا خۆ عەلیش خوا لێی ڕازی بێ لە نوێژێدا دالغەی بۆ هاتوە، مانای وایە قەت نوێژی بێ دالغە ناکرێ، بەڵام لەڕاستییدا وانیە، مرۆڤ ئەگەر بیەوێ دەتوانێ نوێژی بێ دالغەو خەیاڵ بکات.

بەڵام لێرە لێتان تێکنەچێ! کە دەفەرموێ: یەکجار یەکجار شۆری، دەبێ بەو یەك جارە دەموچاوەکەی هەموو بشوات، وە دەبێ دەستەکانی هەموو بشوات،

وە پێیەکانیش بە هەمان شێوە، بەڵام کە بە دووجاران شۆردنەکە تەواو دەبێ، هەردوو جارەکە دەبنە فەرز، وە ئەگەر بە سێ جاران هەمووی تەڕبێ، هەر سێ جارەکە دەبنە فەرز، چونکە هەرجارەی هەندێکی لێ تەڕ کردوە، بەڵام ئەگەر بە یەکجار دەموچاوو دەستەکان لەگەڵ ئانیشكو پێیەکانیش لەگەڵ گوێزینگ تەڕ بوون، ئەوە جاری دووەمو سێیەم تەڕ کردنەوەیان دەبێتە سوننەت، وە لەڕاستیشدا دەتوانین بڵێین: یەکجاریش سوننەتە، دووجاریش سوننەتە، سێ جاریش سوننەتە[1]، ئەوەش بەپێی حاڵەتەکان دەگۆڕێ، جاری وایە ئاو کەمە سوننەتە ئاوی کەم بەکاربێنی، یەکجار دەموچاو بشۆ بەسە، خۆ نابێ تۆ سێ جار بیشۆی دوایی ئاو بۆ ڕەفیقەکەت نەمێنێتەوە، یان بۆ شتێکی گرنگتر پێویستت پێی بێ، کەسی وا هەیە بە دوو سێ جاریش ڕاناوەستێ، دەست پێدەکات سێ چوار مەسینە ئاوان سەرف دەکات، ئەوە لەڕاستیدا لە سوننەت چۆتە دەرێو خۆی تووشی ئیسراف کردن کردوە، کەواتە: ئەگەر یەکجاریش ئەندامەکانی دەستنوێژ بشۆرێن هەر سوننەتە، دووش سوننەتە، سێش سوننەتە، بە مەرجێك بە یەکجارەکە ئەو ئەندامە هەمووی بشۆرێ، بەڵام ئەگەر بە یەك جارەکە تەواو هەمووی نەشۆرێ، مانای وایە دەستنوێژەکەی تەواونیە، چونکە ڕەنگە کەسی وا هەبێ بە سێ جارانیش هەموو دەمو چاوی تەڕ نەکات، مانای وایە دەستنوێژەکەی هەر ناتەواوە.

سێیەم/ مەسحی سەر یەکجارە:

تەنیا لە هەندێك دەقاندا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ سێ جار مەسحی سەری کردوە، بەڵام لە زۆربەی فەرمایشتەکاندا هاتوە کە مەسحی سەر یەکجارە، بۆ وێنە، ئەم دەقە هەیە: ﴿مَسَحَ ﷺ رَأْسَهُ مَرَّةً﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٩٢) عَنْ عَبْدِاللّٰه بْنِ يَزِيدَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ}، واتە: پێغەمبەر ﷺ یەکجار مەسحی سەری کردوە.

---

١) لێرە مەبەستمان لە سونەت بوون، بە پێی ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ بوونە، نەك سوونەتی بەرانبەر فەرز!

## چوارەم: پێشخستنی لای ڕاستە لەسەر چەپ (تَقْدِيمِ الْيُمْنَى على الْيُسْرَى):

لەلای زۆربەی زانایان سوننەتە، لای ڕاست لە دەستنوێژگرتن پێش لای چەپ بخرێ، هەندێکیشیان بە فەرزیان داناوە، بەڵام لەڕاستییدا سوننەتبوونەکەی بەڵگەی بەهێزترە، بەڵگەی سوننەتبوونیش ئەم فەرموودەیە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ﷺ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: إِذَا لَبِسْتُمْ وَإِذَا تَوَضَّأْتُمْ فَابْدَءُوا بِأَيَامِنِكُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٨٦٣٧)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤١٤١)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (١٠٩٠)، وَابْنُ خُزَيْمَةَ بِرقم: (١٧٨) ، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط) بِرقم: (١٠٩٧) تعليق الشيخ الأرناؤوط: إسناده صحيح} ، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ئەگەر بەرگتان پۆشیی، وە ئەگەر دەستنوێژتان گرت، بە لای ڕاستتان دەست پێبکەن، کەواتە: سوننەتە بە لای ڕاست دەست پێ بکرێ، بەڵام ئەگەر کەسێك بە لای چەپ دەستی پێکرد، ناڵێین: دەستنوێژەکەی تەواونیە، بەڵکو سوننەتێکی تەرك کردوە.

### کۆتا قسەم دەربارەی دەستنوێژ گرتن:

ئایا حیکمەتی بەکارهێنانی وشەی: (الْمَرَافِقْ) بە کۆ، وە وشەی: (الْكَعْبَيْنِ) بە (مُثَنَّى) چییە؟ یانی: بۆچی بۆ ئانیشەکان خوا فەرموویەتی: ﴿وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾، (مَرافِقْ) کۆی (مِرْفَق)ە، نەیفەرموە: (إلى المِرْفَقَينِ)، کەچی بۆ گوێزینگەکان فەرموویەتی ﴿وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ﴾؟ وەڵام: لەبەرئەوەی دەست یەك ئانیشکی هەیە، بەڵام هەر پێیەك دوو گوێزینگی هەن، ئنجا ئەگەر قسەکەی شیعان ڕاست بووایە، وەك ئانیشك (مرفق)ی دەست، بە کۆ (جمع)یش باس دەکران نەك بە دووان (مثنّى) کە دەڵێن: گوێزینگ پێشی پێیە، ئەگەر وابووایە هەر پێیەك یەك گوێزینگی دەبوو، بەڵام نا، گوێزینگ بریتیە لەو ئێسقە خڕانەی لەولاو لای پێ دەردەچن، وە هەر پێیەکیش دوو گوێزینگی هەن، خوای زاناو شارەزاش بە نسبەت ئانیشکەوە دەزانێ یەك ئانیشك هەیە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿إِلَى ٱلْمَرَافِقِ﴾، واتە: ئانیشکانیشی لەگەڵ بشۆن، بەس ئەگەر فەرمووبای: (إلى الأكعَاب)، کە (كعب) پێمواية کۆیەکەی دەبێ بە (أكعاب)،

ئەگەر وای فەرمووبا، ئەوکاتە دەرنەدەکەوت، کە ئایا دەبێ هەر دوو گوێزینگ بشۆرێن، یان نا؟ بۆیە فەرموویەتی: ﴿ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ﴾، بۆ ئەوەی هەردوو گوێزینگەکانی ئەولاو لای پێ بگرێتەوە.

**مەسەلەی یازدەیەم: مەسح کردن لەسەر خوففو گۆرەوی:**

خوفف بریتیە لە پێلاوێك کە لە پێستو چەرم دروست کرابێ، گۆرەویش ئەوەیە کە غەیری چەرم بێ، کە بە عەرەبی (جَورَب)ی پێ دەڵێن: وە لە کوردییدا نەمزانیوە (خوفف) وشەیەکی تایبەتی بۆ بەکارهاتبێ، هەر (خوفف) بەکاردێنن، ئنجا سەبارەت بە مەسح کردن لەسەر خوفف یان گۆرەوی، زانایان قسەو باسی زۆریان کردوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِ ﴾، باسمان کرد کە حیکمەتی چییە هەردوو قیرائەتەکە بۆ (وأرجُلَكُم) هاتوون: (وأرجُلَكُم) کە ئەو کاتە (غَسل)ی بەسەردا دێتەوە، یانی: ﴿ فَٱغْسِلُوا۟ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُوا۟ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ ﴾، واتە: پێکانیشتان بشۆن، بەلام قیرائەتی (وأرجُلِكُم) کە پێشتر باسمان کرد، یەکێك لە حیکمەتەکانی ئەوەیە کە خوای کاربەجێ بۆیە وایداناوە ئەم وشەیە (وأرجُلِكُم) بە ژێر (کسر)یش، بخوێنرێتەوە، تاکو مەسحی لێ وەربگیرێ، واتە: دەستی تەڕ پێداهێنانی پێیەکان لە کاتێکدا کە لە نێو خوفف دان، یان لە نێو گۆرەوی دان.

ئنجا زانایان لەوبارەوە قسەو باسی زۆریان کردوەو من لە حەوت خاڵ دا بۆتان کورت دەکەمەوە بە گوشراویی، وە ئەوەی دەشینووسم هەمووی لەبەر تیشکی کتێبی (أضواء البيان)ی (الشنقيطي)دایە[1] لێکوڵینەوەیەکی باشی کردوە لەوبارەوە، دیارە منیش بە شێوەی خۆم هەندێکی لێ دادەڕێژمەوەو، جارجار بۆچوونی خۆشمی لەگەڵ دەخەم:

---

١) ج١، ص ٣٣٨، ٣٥٣.

**یەکەم: ڕەوایی مەسح لەسەر خوفف و گۆرەوی:**

ئایا کەسێك کە دەست نوێژ دەگرێ، بۆی هەیە، ئەگەر پێیەکانی لە نێو خوفف دابن، واتە: گۆرەوی چەرم، یان لە نێو گۆرەوی دابن، (کە لە بەن یان دەزوو دەچنرێ) بۆی هەیە دەستی تەڕیان پێدابێنێ لە جیاتی شۆردن؟ زانایانی ئیسلام هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن، جگە لە خەواریجو شیعەکان، کە پێیان وابووە دروست نیە لە جیاتی شۆردنی پێیەکان دەستی تەڕیان پێدا بهێنرێ، لە کاتێکدا کە لە نێو گۆرەوی‌و لە نێو خوفف دان، ئەگەرنا شیعە مەسحی پێیەکان دەکەن، بەڵام دەڵێن دەبێ مەسحی پێی ڕووت بکرێ، واتە: کە لە نێو هیچ شتێکدا نەبێ، شیعەش کە هەندێك ڕایان هەن، هەر بۆ خۆ جیاکردنەوەیان لە زۆرینەی مسوڵمانان، ئەو ڕایانە تەبەننیی دەکەن، بێئەوەی کە بەڵگەیەکی وایان بەدەستەوە هەبێ شایانی باس بێ.

(النووي) لە کتێبی (المجموع)دا کە شەرحی کتێبی (المهذَّب)ی (الشيرازي)یە، دەڵێ: (وَقَدْ نَقَلَ ابْنُ الْمُنْذِرِ فِي كِتَابِ الْإِجْمَاعِ إِجْمَاعَ الْعُلَمَاءِ عَلَى جَوَازِ الْمَسْحِ عَلَى الْخُفِّ وَيَدُلُّ عَلَيْهِ الْأَحَادِيثُ الصَّحِيحَةُ الْمُسْتَفِيضَةُ فِي حَدِيثِ مَسْحِ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْحَضَرِ وَالسَّفَرِ وَأَمْرِهِ بِذَلِكَ وَتَرْخِيصِهِ فِيهِ وَاتِّفَاقِ الصَّحَابَةِ فَمَنْ بَعْدَهُمْ عَلَيْهِ)[1]، واتە: (ابْنُ الْمُنْذِرِ) لە کتێبی (الإِجْمَاع)دا یەك دەنگیی زانایانی لەسەر دروستبوونی مەسحکردن لەسەر خوفف هێناوە، وە ئەو هەموو فەرمایشتە صەحیحانەی کە زۆرن، وە ناسراون، دەلالەتی لەسەر دەکەن کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە نیشتەجێ بووە، وە کاتێك کە لە سەفەریش بووە، مەسحی کردوە لەسەر خوفف، وە فەرمانیشی پێکردوە، وە مۆڵەتیشی داوە، وە هاوەڵانی بەڕێزیش‌و دوای هاوەڵانیش هەموو لەسەر ئەوە یەکدەگن، کە دروستە لە جیاتی شۆردنی پێیەکان، مەسحیان لەسەر بکرێ. واتە: دەستی تەڕیان پێدابهێنرێ، بە مەرجێك لە نێو خوففدابن، یان لە نێو گۆرەوی دابن، کە دوایی باسی گۆرەویش دەکەین.

---

١) أضواء البيان: ج١، ص.٣٣٨

**دووەم: ئـایـا شـۆردنی لاق باشـترە، یان مەسح لەسـەر خوفف؟**

لەوبارەوە دیسـان زانایان ڕا جیاییان هەیـە، ئەوانـەی کـە شـۆردنیان پـێ باشـتـرە، بەڵـگەیان ئەوەیــە، دەڵــێن: پێغەمبــەر ﷺ زیـاتر پێیـەکانی شـۆردوە، وە بـەردەوام بـووە لەسـەر ئـەوە لـە زۆربـەی کاتەکانـدا، هەرچـەندە زەحمەتیشی زیـاترە، کەواتـە: مادام پێغەمبەر ﷺ لەسەری بەردەوام بـووە، دیــارە ئــەوە خێری زیـاترە، وە دیارە کردەوەکـانیش ئەگـەر زەحمـەتیان زیـاتر بــێ، زەحمــەتی زیـاتریش دەبێتــە هـۆی پاداشــتی زیـاتر، وەك پێغەمبــەر ﷺ بــە دایکمـان عائیشــەی خـوا لێـی ڕازی بـێ فــەرمووە: ﴿إنّ لَــكِ مِـنَ الأَجْـرِ عَلَـى قَـدْرِ نَصَـبِكِ، أَوْ قَـالَ: نَفَقَتِـكِ﴾ {أَخْرَجَـهُ البُخَارِيُّ برقم: (١٧٨٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٧٣٣) واللَّفظ لَهُ}، واتـە: پاداشــتت بـۆ هـەیە بە ئەندازەی ماندووبوونت، یان فەرمووی: بە ئەندازەی خەرجکردنت.

دیارە بەشێکیش لە زانایان دەڵێن: مەسحکردن باشترە، یەکێك لە بەڵگەکانیشـیان ئـەم دەقــەیە: ﴿عَـنِ الْمُغِيـرَةِ بْـنِ شُـعْبَةَ ﷺ قَـالَ: أَنَّ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ مَسَـحَ عَلَـى خُفَّـيْنِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللّٰهِ أَنَسِيتَ؟ قَالَ: «كَلَّا بَلْ أَنْتَ نَسِـيتَ، بِهَذَا أَمَرَنِي رَبِّي عَزَّوَجَـلَّ»﴾ {أَخْرَجَـهُ البُخَـارِي بـرقم: (٥٧٠٤)، وَأَحْمَـد بـرقم: (١٨١٧٠)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (١٥٦)}، واتـە: موغیــرەی کـوڕی شــوعبە خـوا لێـی ڕازی بــێ، دەگێڕێتــەوە دەڵـێ: پێغـەمبەر ﷺ دەستی تەڕی بەســەر (خوففـەکانی ادا دەهێنـا لـە کـاتی دەست نوێـژدا، پـێم گـوت: ئـەی پێغەمبـەری خـوا! لەبیــرت چـوو خوففەکــانت دابنێــیو پێیـەکانت بشـۆی؟!) فەرمـووی: بەڵکو تـۆ لـەبیرت چـوو، چونکە بەمـە پـەروەردگارم (عـزّ وجـل) فـەرمانی پێکـردووم. ئنجــا کـە بفـەرموێ: خـوا فـەرمانی پـێکـردووم، مانــای وایـە ئەوە خێـرترە!

بەڵام دوای هەڵسـەنگاندنی زۆر بـۆ ئـەو مەسـەلەیە، پێمـوایە ئـەو قسـەیەی (ابْنُ تَيْمِيَة) کـە (ابْنُ القَيم) ڕەحمـەتی خـوای لێبـێ لێـوەی نـەقڵ دەکــات، قسـەیەکی ڕێکــە، (ابـْنُ تَيْمِيَة) دەڵـێ: (وَلَمْ يَكُن يَتَكَلَّفُ ضِدَّ حَالِهِ الَّتِي عَلَيْهَا قَدَمَاهُ، بَلْ إِنْ كَانَتَا فِـي الْخُـفِّ مَسَـحَ عَلَيْهِمَـا وَلَـمْ يَنْزِعْهُمَـا، وَإِنْ كَانَتَـا مَكْشُـوفَتَيْنِ، غَسَـلَ القَدَمَيْنِ، وَلَمْ يَلْبَسِ الْخُفّ لِيمْسَحَ عَلَيْهِ)[1]، واتـە: پێغەمبـەر ﷺ عـادەتی نـەبووە

١) أضواء البيان: ج١، ص٣٤٠.

پێچەوانەی حاڵەتی خۆی مامەڵە بکات، ئەگەر پێیەکانی لەنێو خوفف (و گۆرەوی) دا بووبن، مەسحی لەسەر کردوونو داینەناون بۆ ئەوەی پێیەکانی بشوات، وە ئەگەر پێیەکانیشی بە دەرەوە بووبن، لەوکاتەدا کە دەستنوێژی گرتوە، نەچووە خوفف لەپێ بکات، ئنجا مەسحی لەسەر بکات، بەڵکو شۆردوونی.

کەواتە: ئێمە ناتوانین بڵێین کامیان خێرترە، بەڵکو ئینسان چۆنی بۆ هاتە پێش، دەتوانێ وابکات، جاری وایە تۆ کە لە سەفەری، هەر لەنێو بازنەی سوننەتدایە، کە پێیەکانت مادام لەنێو گۆرەوی دان، یان لە نێو خوفف دان، ڕەنگە سەرما بێ، ئاو کەم بێ، دوایی لاقت بتەزن، وا باشترە مەسحیان لەسەر بکەی، واتە: دەستی تەڕ بە خوففەکان، یان بە گۆرەویەکان دابێنێ، بەڵام ئەگەر وانەبوو لاقت ڕووت بوون، خۆ دیارە دەبێ بیانشۆی، نەك ئەو کاتە بێی خوفف لەپێ بکەی بۆئەوەی مەسحیان بکەی، ئەم ڕایە ڕایەکی مام نێوەندیی‌و باشە.

سێیەم: ئایا مەسحکردن لەسەر خوففی دڕاو (مخرَّق) یان گۆرەوی دڕاو دروستە؟

لەوبارەشەوە زانایان ڕاجیاییان هەیە، وە بۆ زانیاریتان ئەو مەسەلانەی کە زانایان مشتو مڕو ڕاجیاییان لەسەریان دەبێ، لەبەر ئەوەیە کە دەقێکی ڕوونو بێ چەندوچوونیان لەسەر نیە، ئەگەرنا زانایان لەخۆوە حەزیان لە ڕا جیایی نەبووە! یاخود چەند دەقێك هەن هەرکامێکیان یەك لەو دەقانە هەڵدەبژێرێ، یاخود ئایەتێك، یان فەرمایشتێك چەند واتایەکی هەیە، یان هیچ دەقێکی یەکلاکەرەوە نیە، بۆیە زانایان کەوتوونەتە مشتومڕەوە، جا لەوبارەوە کە ئایا دروستە خوففێك کە دڕابێ، یان گۆرەوییەك کە دڕابێ، مەسحی لەسەر بکەی یان نا؟ زانایان ڕاجیاییان هەیە.

منیش دوای لێکۆڵینەوەی زۆر ئەو ڕایەم پێ ڕاسترە، کە هەر خوففێك، یان هەر گۆرەوییەك کە زۆر نەدڕابێ، بە شێوەیەك کە نەگونجێ پێی بڕۆی، وە بە شێوەیەك کە پێیەکانت تەواو تێدا دەرکەون، هێندە نەدڕابێ، ئەوە دروستە مەسحی لەسەر بکەی، بۆ وێنە: کونێکی تێبووە، دوو کونی تێبووە، ئەوە دروستە مەسحی لەسەر بکەی، بەڵگەشم ئەوەیە کە هاوەڵانی بەڕێز خوا لێیان ڕازی بێ،

ئەوە نیە هێندە بە ئیمکانیەت بووبن، وە بە زۆرییش لە سەفەردابوون، لەبارو سواردابوون، لە دەشتو بیاباندا بوون، لە جەنگدا بوونو خوففیشیان لەپێ کردوەو ناتوانین بڵێین: هەموو گۆرەویو خوففەکانیان نوێو تازە بووەو، کونیان تێدا نەبووەو مەسحیان لەسەر کردوون، کەواتە: خوففو گۆرەوی مەگەر زۆر دڕابێ، کە تەواو پێی تێدا دیاربێ، ئەگەرنا دروستە مەسحیان لەسەر بکرێ.

**چوارەم: ئایا مەسح لەسەر نەعلو گۆرەوی دروستە؟**

لەسەر خوفف ئەوە دیارە، وەك گوتم هەموو زانایان جگە لە شیعە، لەسەر ئەوە یەکدەنگن، هەروەها خەواریجیش کە کاتی خۆی بوو ون، لەبارەی مەسحکردن لەسەر نەعلو گۆرەویش ڕاجیایی لە نێو زانایان هەیە:

(أبو حنيفة والشافعي) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، بە دروستی نازانن، دەڵێن: نەخێر دروست نیە، لەسەر گۆرەویو نەعل مەسح بکرێ.

هەندێکیش لە زانایان بە دروستی دەزانن، چەند شتێکیش بە بەڵگە دێننەوە، کە دیارە من ڕای دووەمم پێ ڕاسترە، یەکێك لەو بەڵگانەی کە دەیانهێننەوە لەسەر ئەوە کە دروستە مەسح لەسەر نەعلو لەسەر گۆرەوی بکرێ، ئەم دەقەیە: ﴿عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رضي الله عنه أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ تَوَضَّأَ وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ وَالنَّعْلَيْنِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (١٥٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (سُنَن أبي داود)}، واتە: موغیرەی کوڕی شوعبە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنوێژی گرت وەدەستی تەڕی بە گۆرەوییەکانو بە نەعلەکانی داهێنا، (دیارە ئەو کاتە نەعلی لەپێ بووەو گۆرەویش، وە دەستی تەڕی پێدا هێنان، لەجیاتی ئەوەی بیانشوا).

(قَالَ أَبُو دَاوُدَ وَمَسَحَ عَلَى الْجَوْرَبَيْنِ عَلِيُّ بْنُ أَبِى طَالِبٍ وَابْنُ مَسْعُودٍ وَالْبَرَاءُ بْنُ عَازِبٍ وَأَنَسُ بْنُ مَالِكٍ وَأَبُو أُمَامَةَ وَسَهْلُ بْنُ سَعْدٍ وَعَمْرُو بْنُ حُرَيْثٍ وَرُوِىَ ذَلِكَ عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ وَابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُم)[1] ئەبو داوود زانایەکی فەرموودەناسی گەورەیە خاوەنی (سُنَن أبي داود)ە، دەڵێ: هەر لە کام عەلی کوڕی

---

١) الجامع لأحكام القُرآن: ج٦، ص٩٢، للقرطبي.

ئەبی طالیب، عەبدوڵلای کوڕی مەسعوود، بەرائی کوڕی عازیب، ئەنەسی کوڕی مالیك، ئەبو ئومامە، سەهلی کوڕی سەعد، عەمری کوڕی حورەیث، هەروەها لە عومەری کوڕی خەتتابو عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، خوا لە هەموویان ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە، کە مەسحیان لەسەر گۆرەوی کردوە.

دیارە ئەوانیش بە تەئکید ئەگەر پێغەمبەری خوایان ﷺ نەبینیبایە مەسحی لەسەر گۆرەوی کردوە، نەیان دەکرد، کەواتە: ڕای دروستبوونی مەسح لەسەر گۆرەوی بەهێزترە، وە بەڕاستی ئەوەش زۆرکار بۆ خەڵك ئاسان دەکات، جاری وایە سەرمایە، زستانە، ئاو کەمە، دانانی پێڵاو یان دانانی گۆرەویو ئەوانە زەحمەتە، مەسح کردن کارەکە ئاسان دەکات، وە ئەوانە هەمووی دەچنەوە نێو ئەو ئایەتە موبارەکە کە دەفەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾، واتە: خوا نایەوێ سەغڵەتتان بکات، جاری وایە ئینسان بە هۆی دانانی گۆرەویو پێڵاوەوە، تووشی سەغڵەتیی دەبێ.

پێنجەم: ماوەی مەسح کردن:

ئایا تا ماوەی چەند ئینسان بۆی هەیە مەسح لەسەر گۆرەوی بکات، یان لەسەر خوف؟ زۆربەی زانایان ڕایان وایە ئینسانی نیشتەجێ (مُقیم) کە لە ماڵی خۆیەتی، شەوو ڕۆژێك، وە باباى ڕێبوار (مُسافر) سێ شەوو سێ ڕۆژان بۆی هەیە مەسح بکات، ئەمە ڕای: (أبو حنيفة والشافعي وأحمد والثوري وأوزاعي وأبو ثور وإسحاق و أبو داود الظاهري والطَّبَري والحسن بن صالح بن حسين)، هێندێکیش کە (مالك وليث بن سعد والحسن البصري)یان لە نێودا هەن، دەڵێن: ئەوەندەی باباى ڕێبوار بیەوێ بۆی هەیە، وە کاتی دیاریکراوی نیە، واتە: ئەوەندەی بیەوێ، بۆ وێنە: دە ڕۆژ گۆرییەکان دانەنێ خوففەکان دانەنێ، بۆی هەیە.

بەڵام ڕای زۆربە ڕاستترە، وە ئەمەش یەکێکە لە بەڵگەکانیان: ﴿عَنْ صَفْوَانَ بْنَ عَسَّالِ الْمُرَادِيِّ رضي الله عنه قَالَ: أَمَرَنَا "يَعْنِي النَّبِي" أَنْ نَمْسَحَ عَلَى الْخُفَّيْنِ، إِذَا نَحْنُ أَدْخَلْنَاهُمَا عَلَى طُهْرٍ ثَلاَثاً إِذَا سَافَرْنَا، وَيَوماً ولَيْلَةً إِذَا أَقَمْنَا، وَلاَ نَخْلَعَهُمَا مِنْ بَوْلٍ، وَلاَ غَائِطٍ وَلاَ نَوْمٍ وَلاَ نَخْلَعَهُمَا إِلاَّ مِنْ جَنَابَةٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم:

(١٨١١٨)، وَالطَّبَراني برقم: (٧٣٥٢)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (١٣٢٥)، وَالدَّارقُطني برقم: (١٥) تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث المسح على الخفين منه صحيح لغيره وهذا إسناد حسن}، واته: صەفوانی کوڕی عەسسالی موڕادیی (کە یەکێکە لە هاوەڵانی بەڕێز) خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی پێکردین دەستی تەڕ بە خوففەکانماندا بێنین، بە مەرجێك پێیەکانمان بە پاکیی خستبێتە نێو خوففەکانەوە، (واتە: دەستنوێژت بووبێ کە خوففەکانت لەپێ کردبێ، یان گۆرێیەکانت لەپێ کردبێ)، ئەگەر سەفەرمان کرد، سێ شەوو سێ ڕۆژان بۆمان هەیە لە جیاتی شۆردنی پێیەکان، دەستی تەڕیان پێدا بێنین، وە شەوو ڕۆژێکیش ئەگەر لە ماڵ بووین، بەڵام بە مەرجێك نابێ خوففەکان دابنێین، نە بۆ تارەتگرتن (خۆپاککردنەوە لە میزو پیسایی)، وە نە بۆ خەوتن، مەگەر لەشمان پیسبێ، کە لەشیشت پیس بوو دەبێ خۆت بشۆی‌و ئەو کاتە دەبێ خوففەکان دابنێی، ئەگەرنا نابێ دایانبنێی، کە داتنان، ئەو کاتە لەسەر ڕای زۆربەی زانایان چیدیکە بۆت نیە مەسحیان لەسەر بکەی‌و دەبێ پێیەکانت بشۆی.

شەشەم: ئایا تەنیا پشتی خوفف مەسح دەکرێ یان بنیشی؟

گۆرەوی یان خوفف عادەت وایە پشتەکەی مەسح دەکرێ، پشتی پێ، ئنجا ئایا بنەکەشی پێویستە، یان سونەتە مەسح بکرێ؟! ئەمیش زانایان مشتومڕیان لەسەری هەیە، بەڵام زۆربەی هەرە زۆریان دەڵێن: بەس پشتی گۆرەوی‌و خوففەکە مەسح دەکرێ‌و تەنیا ئەوێ پێویستە، وە ئەوە ڕای (أبو حنيفة وأحمد والثوري وأوزاعي)یە، کە بەڵگەشیان ئەم دەقەیە: ﴿عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه قَالَ: لَوْ كَانَ الدِّينُ بِالرَّأْيِ لَكَانَ أَسْفَلُ الْخُفِّ أَوْلَى بِالْمَسْحِ مِنْ أَعْلاهُ وَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَمْسَحُ عَلَى ظَاهِرِ خُفَّيْهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٦٢)، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: عەلی کوڕی ئەبی طالیب خوا لێی ڕازی بێ، فەرموویەتی: ئەگەر دین بە عەقڵ بووایە (لێرەدا مەبەستی لە دین لایەنی عیبادەتە، کە مەرج نیە هەمووی لە عەقڵەوە بچێ، دیارە پێچەوانەی عەقڵ نیە، بەڵام مەرج نیە عەقڵ هەمووی بۆ هەزم بکرێ) بنی خوفف لە پێشتر بوو کە مەسح بکرێ لە پشتەکەی، بەڵام پێغەمبەری خوام ﷺ بینی پشتی خوففەکانی مەسح کرد.

دیـارە ئەم ڕایەش بـەهێزترە، کە هـەر پشــتی خوفف فـەرزە مەسـح بکرێ، بـەڵام ئەدی بنەکەشـی ئەگەر مەسـح بکرێ، حوکمی چۆنە؟ ئێمـە دەڵێین: بنەکـەی فـەرز نیـە، بـەڵام دروستەو ڕێشی تێدەچـێ سـوننەتیش بـێ، بـەڵام گرنگ ئەوەیـە فـەرز نیـە، مسـوڵمان بنـی خوففەکەی مەسح بکـات.

حـەوتەمو کۆتـایی: زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە دەبێ بابای مەسحکەر دەسـتنوێژی بووبـێ، کـە خوففـەکانی کردوونـە پـێ، یـاخود گۆرەوییەکانی، ئەگەرنا ئەگەر بەبێ دەستنوێژیی، یان دوای تەیەمموم کردبنیە پێی، دروست نیە مەسحیان لەسەر بکـات:

بەڵگەیان چەند دەقێکە، یەکێك لەوانـە: ﴿عَنِ الْمُغِيرَةِ بْنِ شُعْبَةَ رضي الله عنه قَالَ: كُنْتُ مَعَ النَّبِيِّ ﷺ ذَاتَ لَيْلَةٍ فِي سَفَرٍ، ... ثُمَّ أَهْوَيْتُ لأَنْزِعَ خُفَّيْهِ، فَقَالَ: دَعْهُمَا فَإِنِّي أَدْخَلْتُهُمَا طَاهِرَتَيْنِ فَمَسَحَ عَلَيْهِمَا﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٢٠٦)}، واتـە: موغـیرەی کـوڕی شـوعبە خـوا لـێی ڕازی بـێ لـە چـەند سـەفەرێك لـە خزمـەت پێغەمبەردا ﷺ بووە، لە درێژەی حەدیسـێکدا دەڵێ: لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ بـووم دەسـتنوێژی گـرت، خـوففی لـە پێـدا بـوو، داهـاتم تـا خوففەکانی لـەپێ دابکـەنم، بۆئـەوەی پێیەکـانی بشـوا، فـەرمووی: (دَعْهُمَا) لێیـانـگەڕێ (خوففـەکانم لـە پێدامەنـێ) چونکە من بە پاکیی لە پێمکردوون، واتـە: دەسـت نوێـژم هـەبوو کاتێك خوففەکانم لە پـێ کردوون، وە مەسحی لەسـەر کردن.

**مەسـەلەی دوازدەیـەم:** کـە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾، ئەگـەر لەشـتان پـیس بـوو خۆتـان پـاك بکەنـەوە، واتـە: خۆتـان بشـۆن، (راغب الأصـفهاني) دەڵـێ: (أَي: أَصَابَتْكُمْ الْجَنَابَةُ وَذَلِكَ بِإِنزَالِ الْمَاءِ أَو بِالْتِقَاءِ الخِتَانَيْن، وَقَدْ جَنُبَ وأَجْنَبَ وَاجْتَنَبَ وَتَجنَّبَ، وَسُمِّيت الْجَنَابَةُ بِذَلِكَ لِكَوْنِهَا سَبَبًا لِتَجَنّب الصَّلاةِ في حُكْم الشَّرعِ)، واتە: هەر کاتێك لەش پیسییتان بەسـەرهات، لەش پیسیی بە ئاو هاتنـەوە بەسـەر ئینسان دێ، یاخود بـەوە کە ئەنـدامی نێرینـەو مێینـەی ژنو مێـرد بـە یـەك بکـەون، بـەوە واجب دەبـێ کـە ئینسـان خـۆی بشـوا دەگوتـرێ: (جَنُبَ وأَجْنبَ وَاجْتَنَبَ وَتَجنَّبَ) هـەر چواریان بـە مانـای لـەش پیسـی

بووە، دێن، ئنجا ئایا لەش پیسیی بۆ پێی دەگوترێ (جنابة) چونکە ئینسان هەتا لەش پیس بێ، لە نوێژکردن دووردەکەوێتەوە، (اجتَنَب) یانی: لێی دوورکەوتەوە (جُنُب) یانی: دوور، لەبەرئەوەی لە طاعەت دوور دەبێ لەو کاتەدا بە ناچاریی، بۆیە وای پێ گوتراوە. کەواتە: کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمۡ جُنُبٗا فَٱطَّهَّرُواْۚ﴾، واتە: ئەگەر لەشتان پیس بوو خۆتان بشۆن، وە واجبی لەش پیسیی خۆ شۆردنە، ئەدی ئەگەر ئاو نەبوو؟ ئەوە لە مەسەلەی سێزدەیەمدا باسی دەکەین.

**<u>مەسەلەی سێزدەیەم</u>:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُم مَّرۡضَىٰٓ أَوۡ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوۡ جَآءَ أَحَدٞ مِّنكُم مِّنَ ٱلۡغَآئِطِ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە نەخۆش بوون، یان لە سەفەر بوون، یان یەکێکتان لە تارەت گرتن هاتەوە، تارەتی گرتبوو، یاخود چوونە لای ئافرەتانو لەگەڵیان جووت بوونو ئاوتان چنگ نەکەوت، ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾، روو بکەنە رووی پاکی زەوی، ﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُۚ﴾، دەستی پێدا بێنن، وە دەست بە دەمو چاوتانو بە دەستەکانتاندا بێنن، دیارە ئێمە لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتی ژمارە (٤٣)ی سوورەتی (النساء)دا کە لە بەرگی سێیەمی (٣) ئەم تەفسیرەدا هاتوە، بە درێژیی باسی ئەم رستە قورئانییەمان کردوە، وە باسی تەیەممومان کردوە، بۆیە لێرەدا زۆر بە درێژیی لەسەری ناچین، بەڵام لەبەرئەوەی کە مەسەلەی تەیەمموم خەڵك زۆر سەریان تێی دەوەستێ، بە باشی دەزانم لێرەدا لە نۆ (٩) کورتە خاڵدا هەندێ شت لەوبارەوە بنووسم، ئەوەی کە لەوبارەوەش دەینووسم، دیسان سوودم لە تەفسیری (أضواء البيان)[1] وەرگرتوە، کە زۆر بە گوشراویی‌و بە پوختیی بە شێوەی خۆم دایدەرێژمەوە، ئەوەی کە گرنگە هەموو لایەك بیزانین ئەوەیە کە:

---

١) الشنقيطي: ج١، ص٣٥٢ – ٣٧٠.

خوای بە بەزەیی دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا ﴾، ئەگەر لەشتان پیس بوو، خۆتان پاك بکەنەوە، واتە: بە ئاو خۆتان بشۆن، دوایی دەفەرمویٚ: وە ئەگەر نەخۆش بوون، یان لەسەفەر بوون، یان تارەتتان گرتبوو، لە تارەتگرتن هاتنەوە، یان لەگەڵ ژنەکانتان جووت بوون، ئاویشتان چنگ نەکەوت، واتە: بۆ دەست نوێژو بۆ غوسل ﴿ فَتَيَمَّمُوا ﴾، پێشتر باسمان کرد (يَمَّمَ) واتە: (قَصد) رووی تێکرد، (تَيَمَّموا) واتە: ڕووبکەنە ﴿ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴾، واتە: ڕووی پاکی زەوی، ﴿ فَامْسَحُوا بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم ﴾، وە دەستتان بە ڕووی زەویدا بێنن و دەستتان بە دەمو چاوتاندا بێنن و بە هەردوو دەستتاندا بێنن، ئەوە دوایی باسی دەکەین، تەیەمموم چۆنە؟

جا با بێینە سەر باسی تەیەمموم، باش باش گوێی بۆ بگرن[1]، زۆر پێویستیتان پێی دەبێ، ئەوەی بیەوێ نوێژەکانی نەچن، هەمیشە پێویستی بە تەیەمموم هەیە، کەسی وا هەیە دەڵێ: ئاخر دڵم لێی پاك نابێتەوە، نوێژ بە تەیەمموم بکەم، هەتا ئاوم چنگ نەکەوێ! نا، خوا بۆخۆی چاکتر دەزانێ و ئەو تەیەممومی داناوە، واتە: دەست بە ڕووی زەوی داهێنانی داناوە، لە جیاتی ئاو کە ئاو چنگ نەکەوت، چ بۆ دەست نوێژ، چ بۆ خۆشوۆردن، یانی: چ بۆ لابردنی بێ دەستنوێژیی گچکە، چ بۆ لابردنی بێ دەست نوێژیی گەورە، (الحَدَثِ الأصْغَر) کە بێ دەستنوێژییە، وە (الْحَدَثِ الأَكْبَر) کە لەش پیسییە، لە کتێبە فیقهییەکاندا ئەو دوو زاراوەیان بۆ بەکارهێناوە.

---

١) چونکە لە ئەسڵ بەشێوەی وانە گوتراوەتەوە، بۆیە باسی گوێگرتن کراوە.

# کورتە باسێک لەبارەی تەیەمومەوە

<u>یەکەم</u>: پێناسەی تەیەمموم: تەیەمموم چییە؟

وشەی تەیەمموم (تَیَمُّمُ) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (قَصْد) دێ، (التَیَمُّمُ: القَصْد) واتە: مەبەست، ئامانج، لە عەرەبیدا دەگوترێ: (تَیَمَّمْتُ الشَّيء: قَصَدتُهُ) ڕووم کردە ئەو شتەو ئەو شتەم کردە ئامانج، کەواتە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴾، ڕووی پاکی زەوی بە ئامانج بگرن، ڕووی تێ بکەن، ئەوە وەك ئەسڵی واتایەکەی، بەڵام لە زاراوەی شەرعدا واتایەکی دیکەی هەیە، چونکە جاری وایە وشەیەك لە قورئاندا بەکارهاتوە لەسەر ئەسڵە زمانەوانییەکەی بەکاری هێناوە، بەڵام دوایی وەك زاراوەیەکی شەرعیی بەکاردەهێنرێ، ئێستا بۆ وێنە (صَلاَة) ئێمە بۆچی بەکاری دێنین؟ دەڵێین: (الصَّلاَة: أَفْعَالٌ وَأَقْوَالٌ مُفْتَتَحَةٌ بِالتَّكْبِيرِ مُخْتَتَمَةٌ بِالتَّسْلِيمِ) نوێژ چەند قسەو کردەوەیەکە بە (اللَّهُ أَكْبَر) دەست پێ دەکەن، بە سەلامدانەوە کۆتاییان پێ دێ، ئاوا پێناسەی نوێژ دەکرێ، بەڵام لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا، وە لە بەکارهێنانی قورئاندا وشەی (الصَّلاَةِ) بە مانای پاڕانەوە هاتوە، وە (صَوْم) بە مانای خۆگرتنەوە هاتوە، (الصَّوْم الإِمْسَاك) وە (زکاة) بە مانای پاکبوونەوە دێ، (حج) بە مەنای مەبەست (قصد)، دێ، بەڵام دوایی وەك زاراوەی شەرعیی واتایەکی دیکە تایبەت وەردەگرن، بۆیە لە زاراوەی شەرعدا تەیەمموم ئاوا پێناسەکراوە: (القَصْدُ إِلَى الصعيدِ الطَيِّبِ لِمَسْحِ الوَجْهِ، وَاليَدَيْنِ مِنْهُ بِنِيَّةِ استِبَاحَةَ الصَّلاَةِ عِنْدَ عَدَمِ الْمَاءِ، أَوْ العَجز عَنْ اسْتِعمَالِهِ)[1]، واتە: تەیەمموم لە زاراوەی شەرعییدا بریتییە لە ڕووکردنە ڕووی زەوی، بۆ ئەوەی کە دەستی پێدا بهێنرێ، وە دەموچاوو هەردوو دەستەکانی پێ مەسح بکرێن، بە نیەتی ئەوە کە بوار هەبێ نوێژ بکرێ، لە کاتی نەبوونی ئاودا، یاخود ئاو هەبێ بەڵام نەتوانرێ ئاوەکە بەکاربهێنرێ، لەبەرئەوەی کە کەمەو بۆ

١) أضواء البيان: ج١، ص٣٥٧ –٣٥٨.

خواردنەوە پێویستت پێیەتیو لە شوێنێكی دووریشی، یاخود لەبەر نەخۆشیی، یان لەبەر هەر هۆیەكی دیكە.

دووەم: تەیەمموم بە چیو چی دروستە؟!

وەڵامی ئەم پرسیارە زۆر گرنگە، كە ئایا تەیەمموم بە چی دەكرێ؟ بۆ زانیاریتان مەلاكان كوردەواریی خۆمان لەبەرئەوەی كە شافیعیی مەزهەبن، وە زۆربەشیان تەنیا لە مەزهەبی ئیمام شافیعیی شارەزان، لە مەسەلەی تەیەممومو لە زۆر مەسەلەی دیكەی وەك پاكو خاوێنیدا، وەزع لە خەڵكی زۆر تەسك دەكەنەوە، لە مەسەلەی تەیەمموم‌دا دەڵێن: دەبێ گڵێك بێ تۆزی لێ هەڵسێ، ئەگەرنا تەیەمموم دروست نیە، دیارە زانایان لەوبارەوە كە ئایا تەیەمموم بەچیو چی دروستە؟ ڕاجیاییان هەیە، ئەویش بەهۆی ماناكردنیان بۆ وشەی (صَعِيد)، ئایا (صَعِيد) چییە؟

(شافعي و أحمد) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ڕایان وایە (صَعِيد) تەنیا گڵ (تُرَاب)ە، ئەویش گڵێك كە تۆز (غُبار)ی هەبێ، وە دەڵێن: وشەی (مِنْ) كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ ﴾، واتە: دەست بە دەموچاوو هەردوو دەستتانی دابێنن، ئەو (مِنْ)ە، بۆ (تَبْعِيض)ە، كەواتە: دەبێ هەندێك لەو گڵە كە تۆزەكەیەتی بە دەموچاوو بە دەستتەوە بنووسێ!

بەڵام (أبو حنيفة ومالك) ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، ڕایان وایە كە هەرچی لەسەر ڕووی زەوییە، بێجگە لە شتی پیس، وە بێجگە لە زێڕو زیوو كانزایەكان، دروستە بەكاربێ، وە دەڵێن: پیتی (مِنْ) كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ ﴾، بۆ سەرەتای مەبەستە (لإبتداء الغاية)و بۆ (تَبْعِيض) نیە، وەك: (ذهبت مِنَ العِراق إلى الشام) واتە: سەرەتای دەستپێكردنی سەفەرەكە عێراق بووە، ئنجا بێگومان وشەی (مَسح) تەنیا بە دەست لێدانی شتێك دێتە دیو مەرج نیە بەشێكی ئەو شتە دەست لێدراوە بە دەستەوە بلكێ، وەك (مسحت الثوب) یان (مسحت الحجر الأسود) كە بێگومان هیچ بەشێكی پۆشاكو بەردە ڕەشە بە دەستی بابای دەست لێدەر (ماسح)ەوە نانووسێ!

منیش پێمـوایە ڕای دووەم ڕاسـتەو هەرچـی لەسـەر ڕووی زەوییـە بـۆ تەیـەمموم پێكردن دەشێو بەكـاردێ، بەم بەڵگانەی خـوارێ:

**بەڵگــــەی یەكــــەم:** خـوای بـە بـەزەیی دەفـەرموێ: ﴿ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ﴾، سەرەتا دەڵێم: وشەو ڕستەكانی قورئان دەبێ هەموو پێكەوە پەیوەست بكرێن، ئەوجـار مانـای ڕاسـتو دروسـت بـە دەسـتەوە دەدەن، نـەك وشـەیەك لـە سیاقی خـۆی دەربیبینـیو دایـبڕی، ئەوكاتـە ڕەنگـە مانایـەكی هەڵەت بەدەسـتەوە بـدات، لێـرەدا خـوا دەفەرموێ: ڕوو بكەنـە ڕووی پـاكی زەوی، وە دەسـت بـە ڕووی پاكــی زەویـدا بێنـنو دەسـت بـە دەموچـاوو دەسـتتاندا بێنن، خـوا نایـەوێ هـیچ سـەغڵەتییەكتان بخاتە سـەرێ.

شـارەزایانی زمانی عەرەبـی دەڵێن: (النكرة في سِياقِ النَّفْيِ يدلُّ عَلَى العمُوم) واتـە: وشـەیەك بـە نەناسـراو (نَكِرَة) هاتبـێ لـە سـیاقێكدا كـە ئـەو شـتە نـەفی كرابێو حوكمەكەی لـێ لابردرابێ، بەڵگەیە لەسەر گشـتاندن، واتـە: لێـرەدا كـە خــوا دەفــەرموێ: ﴿ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ﴾، ئــەو (حَرَج)ە، (مِنْ)ی خراوەتـە سـەرێ، (حَرَج)یـش (نَكرَة)یـەو سـیاقەكە سـیاقێكی (نَفِي)یــە، واتە: خوا نایەوێ هیچ سەغڵەتییتان بخاتە سەرێ، كەواتـە: هـیچ جـۆرە سـەغڵەتییەك نابـێ لـە مەسـەلەی دەسـتنوێژو تەیـەمموم ئەوانـەدا هـەبێ، ئنجا ئێمە دەڵێین: ئایا كەسێك كە لـە بیابانێكـە بـەس لـمی لێیـە، گـڵ لە كوێ بێنـێ؟ یان كەسێك لە نێو بەفرێیە، من بۆخۆم جاری وابـووە ڕۆژێـك سـەر لەبـەر لـەنێو بەفرێـدا بـووم، گڵ لـە كـوێ بێنـێ؟ ئایا دەتـوانی دوو سـێ مـەتر زەوی هەڵقـەنی، ئنجـا دوایی بگـاتە زەوی وشـك جا تـۆزی لـێ هەڵسـێو تەیـەمموی پـێ بكـات، شـتی وا زۆر سـەغڵەتیی تێدایـە، كەسێك لـەو بەسـتەڵەكی سـەرووی دنیایە ئەوە گڵ لە كوێ بێنـێ؟ كەسێك لە دەشتو دەرێكە هەمووی سـەوزاییە، گیایە، گـڵ لە كوێ بێنـێ؟ كەواتە: لەڕاستیدا قسەكەی (أبو حنيفة ومالـك) كە دەڵێن (صَعِيد) واتە: ڕووی زەوی، واتە دەستت بەڕووی زەوییدا بێنە، جا ئەو ڕووی

زەوییە هەر چییەك بوو، دەشتو مێرگوزارو گیایە، دەستی پێدا بێنە، لەو زیخو چەوە، دەستی پێدا بێنە، شاخو چیایە، دەستی پێدا بێنە، بەفرو بەستەڵەکە، دەست بە بەفرو بەستەڵەکەدا بێنە، چونکە ئەو شتە لەسەر ڕووی زەوی هەیەو خواش دەفەرموێ: دەست بەسەر ڕووی زەویدا بێنن، گرنگ ئەوەیە پاك بێ، بەڵام ئەگەر شتی پیسی لێ بێ، دروست نیە، کەواتە: هەر ئایەتەکە بۆخۆی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە (صَعِيد) دەبێ شتێك بێ، کە لە هەموو شوێنان بە دەست هەموو خەڵکی بکەوێ، ئنجا تەنیا ڕووی زەوی بەگشتی دەست هەموو خەڵکی دەکەوێ، بەڵام گڵ وەك نموونەم پێ هێنایەوە، وە دەست هەموو خەڵکی ناکەوێ.

**بەڵگەی دووەم:** وشەی (صَعِيد) لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا بە مانای ڕووی زەوی دێ، (وَجْه الأَرْض) وە (تُراب) گڵ، بۆیە ئەویش پێی دەگوترێ (صَعِيد)، چونکە ئەویش لەسەر ڕووی زەوییەو بەشێکە لە ڕووی زەوی، بەڵام هەموو ڕووی زەوی گڵ نیە، وەك (راغب الأصفهاني) لە (مفردات ألفاظ القرآن: ص٤٨٤)دا، هەروەها (المعجم الوسيط: ص٥١٤) هەردووکیان دەڵێن: (الصَّعِيد: وَجْه الأَرْض) واتە: ڕووی زەوی، ڕووی زەوی هەر شتێکی هەیە، هەروەها شارەزایانی دیکەی زمانیش هەر وا دەڵێن، بەڵام ئەو زانایانەی دەکەونە ژێر کاریگەریی مەزهەبێکی دیاریکراو، بەپێی ئەو مەزهەبە قسە دەکەن بۆ وێنە: زانایەکی شارەزای زمان کە شافیعیی مەزهەب بێ، بۆئەوەی پێچەوانەی قسەی ئیمام شافیعیی نەجوولێتەوە، دەڵێ (صَعِيد) یانی گڵ، ئەوی دیکە ئەگەر لەسەر مەزهەبی ئیمام مالیك بێ، وەك ئیمام مالیك دەڵێ، بەڵام ئەگەر بگەڕێیەوە بۆ ئەسڵی زمان، وە بۆ ئەسڵی بابەتەکان لە زاتی خۆیاندا، پێش کاریگەریی مەزهەبەکان، مەسەلەکەت باشتر بۆ دەردەکەوێ.

**بەڵگەی سێیەم:** ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەرە ﷺ کە دەفەرموێ: ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ: «أُعْطِيتُ خَمْساً: لَمْ يُعْطَهُنَّ أَحَدٌ مِنَ الأَنْبِيَاءِ قَبْلِي: نُصِرْتُ بِالرُّعْبِ مَسِيرَةَ شَهْرٍ، وَجُعِلَتْ لِي الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا، فَأَيُّمَا رَجُلٌ مِنْ أُمَّتِي أَدْرَكَتْهُ الصَّلاةُ فَلْيُصَلِّ، وَأُحِلَّتْ لِي الْغَنَائِمِ، وَلَمْ

تَحِلَّ لأَحَدٍ قَبْلِي، وَأُعْطِيتُ الشَّفَاعَةَ، وَكَانَ النَّبِيُّ يُبْعَثُ إِلَى قَوْمِهِ خَاصَّةً، وَبُعِثْتُ إِلَى النَّاسِ عَامَّةً﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٣٥)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١١٦٣)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٤٣٢)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٦٣٩٨)}، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: پێنج شتم پێدراون لە پێش مندا نەدراون بە کەس: (یەکەم): بۆ ماوەی مانگە ڕێیەك بە هۆی ترس خرانە دڵی دوژمنەوە، بەسەر دوژمنم دا سەرکەوتووم، (دووەم): وە سەر زەوییم هەموو بۆ کراوە بە مزگەوتو بە پاککەرەوەش (لە هەر کوێیەك ئینسانی مسوڵمان نوێژ بکات دروستە) جا هەر پیاوێك لە ئۆممەتی من نوێژی گەیشتێ، یان کاتی نوێژی لێدا هات، با نوێژ بکات، (سێیەم): وە دەستکەوتەکانی جەنگم بۆ حەلاڵ کراون‌و لە پێش مندا حەلاڵ نەبوون، (چوارەم): وە شەفاعەتم پێدراوە (پێغەمبەری خوا ﷺ لە ڕۆژی دواییدا پێش هەموو پێغەمبەران شەفاعەت‌و تکا دەکات) (پێنجەم): وە پێغەمبەرانی پێش من بۆ گەلێکی تایبەت دەنێردران، بەڵام من بۆ تێکڕای خەڵکی ڕەوانەکراوم.

**بەڵگەی چوارەم:** لە هەندێك فەرموودانda وشەی (تراب) هاتوە، وشەی (تراب) گڵ، وەك لەم فەرمایشتەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: ﴿عَنْ حُذَيْفَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ: «فُضِّلْنَا عَلَى النَّاسِ بِثَلاَثٍ: جُعِلَتْ صُفُوفُنَا كَصُفُوفِ الْمَلاَئِكَةِ، وَجُعِلَتْ لَنَا الأَرْضُ كُلُّهَا مَسْجِداً، وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُوراً إِذَا لَمْ نَجِدِ الْمَاءَ»﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (١١٦٥)، وَالنَّسَائِيُّ فِي (الكُبرى) بِرقم: (٨٠٢٢)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (١٦٩٧)، وَالدَّارَقُطْنِي بِرقم: (٦٨)}، واتە: حوزەیفە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: بە سێ شتان بەسەر خەڵکدا (واتە: ئۆممەتانی دیکە) هەڵبژێردراوین: (دیارە لە شوێنی دیکەدا زیاتر دەفەرموێ، بەڵام لێرەدا سێ شت باس دەکات) (یەکەم): ڕیزەکانمان وەك ڕیزی فریشتەکان لێکراون، بە ڕیز دەوەستین (دیارە ئۆممەتانی پێش ئێمە بۆ طاعەت بە ڕیز نەوەستاون، هەر یەکە بە تەنیا بۆ خۆی طاعەتی کردوە، وە ئێستاش نابینرێ جگە لە ئۆممەتی ئیسلام ئاوا بەڕیز بوەستن، بەتایبەتی بۆ نوێژ) (دووەم): وە زەوییمان هەموو بۆ کراوە بە مزگەوت، (واتە: بۆمان هەیە لە هەر شوێنێك نوێژ بکەین، چونکە ئۆممەتانی پێشوو تەنیا لە شوێنی

تایبەتی دا، لە پەرستگاکاندا بۆیان هەبووە خواپەرستیی بکەن) (سێیەم): وە گڵی زەوییمان بۆ کراوە بە پاککەرەوە، ئەگەر ئاومان دەست نەکەوت (واتە: هەم لە جیاتی دەستنوێژ بەکاری بێنین، وە هەم لە جیاتی خۆ شۆردن).

ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەوەتا لێرەدا فەرموویەتی: ﴿وَجُعِلَتْ تُرْبَتُهَا لَنَا طَهُورًا﴾، وە گڵەکەی بۆ ئێمە گێڕراوە بە پاککەرەوەیە، کەواتە: بەس گڵە کە بە کەڵکی تەیەمموم دێ، بەڵام دەڵێین: ئەوە بەڵگە نیە لەسەر نەشیانی غەیری گڵ بۆ تەیەمموم، بۆچی؟ چونکە فەرموودەکە لە کاتی باسکردنی چاکەو منەتی خوادا ئەوە باس دەکات، لەو حاڵەتەشدا شارەزایانی زمان‌و شارەزایانی شەریعەت بەتایبەتی زانایانی (أصول الفقه) دەڵێن: چەمکی (مفهوم المخالفة) ئیعتیباری پێ ناکرێ، ئەوەش زاراوەیەکی (أصولي)یە، ڕەنگە هەمووتان لێی تێنەگەن، (مفهوم الموافقة) هەیەو (مفهوم المخالفة)ش هەیە، بۆ وێنە: خوا دەربارەی چاکە لەگەڵ دایك‌و باب دەفەرموێ: ﴿... فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ ...﴿٢٣﴾﴾ الإسراء، واتە: بە باب‌و دایکت نەڵێی ئۆف، یانی: وشەیەك نەڵێی کە پێی ناخۆش بێ، ئەدی ئەگەر زللەیان لێ بدەی؟ خۆ خوا نەیفەرمووە زللەیان لێ مەدە، دەفەرموێ: مەڵێ ئۆف، بەپێی (مفهوم الموافقة) یان (مفهوم الأولى) ئەگەر وشەیەك حەرام بێ، مانای وایە زللە لێدان حەرامترە.

ئەدی (مفهوم المخالفة) چییە؟ چەمکی پێچەوانە، کە لێرەدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: گڵەکەی بۆ ئێمە پاك کەرەوەیە، کەواتە: غەیری گڵ پاککەرەوە نیە، (مفهوم المخالفة)کەی ئەوەیە، بەڵام لێرە لەم حاڵەتەدا چونکە پێغەمبەر ﷺ باسی منەت‌و فەزڵ‌و چاکەی خوا دەکات لەسەر ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ (مفهوم المخالفة) لەو حاڵەتانەدا ئیعتیباری پێ ناکرێ، زانایانی (أصول الفقه) لەوبارەوە وایانگوتووە، بۆ وێنە لە کتێبی (مَراقي السُّعود)دا واتە: پەیژەی بەختەوەریی کتێبێکە لە بارەی (موانع اعتبار مفهوم المخالفة) ڕێگرەکانی ئیعتیبارکردن بە چەمکی پێچەوانە، کە شیعرە، دەڵێ:

أو امتنانٍ أو وِفَاقِ الواقِعِ والجَهْلُ والتأكِيدُ عِنْدَ السَّامِعِ

لە حاڵەتی ئیمتینـاندا چەمکی پێچـەوانە کاری پێناکرێ، واتـە: لـە کاتێکدا خـوای پەروەردگار باسی نیعمەتەکانی خۆی دەکات، ئەگـەر شـتێکی فـەرموو، ئـەوە چـەمکی پێچـەوانەکەی ئیشـی پێنـاکرێ، بەڵگـەمان لـەوبارەوەی چییـە؟ خـوا لـە سـوورەتی (النحـل)دا دەفـەرموێ: ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا ...﴿١٤﴾ ﴾، واتە: خـوا دەریـای بـۆ ئێـوە دەسـتەمۆ کـردوە، بـۆ ئـەوەی گۆشـتێکی تەڕو تازەی لـێ بخۆن، کە مەبەسـت پێـی گۆشـتی ماسـییە، یـان گۆشـتی ژیانـدارەکانی دیکـەی نێـو دەریایـە، بـەپێی ئەمـە بـێ، ئایـا ئەگـەر گۆشـتی ماسـی وشـك کرایـەوەو خرایـە قوتوو، یان گۆشتی ئەو ژیاندارانەی دیکە کە لـە دەریـادا دەژیـن، ئایا ئەگـەر وشـکـکرایەوەو خرایـە قوتـوو حەرامـە یـان حەڵاڵـە؟ بـە پێـی ئەمـە بـێو ئەگـەر (مفهوم المخالفة) ئیشـی پێ بکرێ، دەبێ بڵێیـ نا حەتمەن دەبـێ بـە تـەڕو تـازەیی بخـورێ، ئەگەرنا بە وشـکـکراوەییو بـە خرانـە نێـو قوتـووەوە حەرامـە، بـەڵام هـەموو زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکـدەنگن کـە گۆشـتی ماسـی دەگونجـێ هەڵبگـیرێو وشـك بکرێتـەوە، هـەروەها گۆشـتی ژیانـدارە دەریاییـەکان ئەگـەر لـە ڕووی پزیشـکی (طب)ییەوە تێکـنەچێ، دروسـتە هەڵبگیـرێو بخورێ دەڵێن: چونکە لێرەدا خـوای زانـاو شـارەزا لـە مـەقامی چاکـەو فـەزڵو منـەتی خۆیـدا باسـی دەکـات، دەفـەرموێ: (لَحْمَاً طريـاً) گۆشـتی تـەڕو تـازە، چـونکە گۆشـتی تـەڕو تـازە خۆشـترە لـە هـی قوتـوو، کەواتە: (مفهوم المخالفة) لێرەدا ئیشـی پـێناکـرێ.

<u>سـێیـەم</u>: ڕەوایـی تەیەممـوم:

باسی ئەوەمان کرد تەیەمموم بە چی دەکـرێ؟ ئـەدی ئایا تەیـەمموم ڕەوایـە، یـان نا؟ بێگومـان تەیەممـوم ڕەوایـە، وەك بە دیل بـۆ دەسـتنوێژو خۆشـۆردنیش، واتـە: بۆ لابردنی لەش پیسیی گچکەو گەورە، لـەوبارەوە زانایـان هـەموو یەکدەنگن، بـەڵام یەك شت لە عومەری کوڕی خەتتابو عەبدوڵلای کوڕی مەسـعوود خـوا لـێیان ڕازی بـێ گێڕدراوەتـەوە، هـەروەها لـە (إبـراهيم النخعـي)یـش کـە یەکێکـە لـە زانایـانی تابیعین، کە گوتوویانە: لـەش پیسـی گـەورە بـە تەیـەمموم لانـاچـێ، واتـە: دروسـت نیە دەست بەڕووی زەویدا هێنان بەکـاربێنی بۆلابردنی لەش پیسـی گەورە، ئەگــەر ئاوت چنگ کـەوت خـۆت بشـۆ، ئەگـەرنا نوێـژان ناکـەی تـاکو ئـاوت چنـگ دەکـەوێ،

ئەوان ڕایان وابووە، بەڵام نەووەوی لە كتێبی (الـمجموع)ی خۆیدا هێناویەتی لـە (ابن الصبّاغ)ەوەو لـە غـەیری ئەویشــەوە كـە عومـەرو عەبـدوڵڵای كـوڕی مەسعوودیش وازیان لەو ڕایەی خۆیان هێنـاوە، وە هاتوونە سەر ڕای زۆربەی زانایان كـە تەیـەمموم هـەموو شـتێكی پـێ دروسـتـە، واتـە: لـە جیاتی غوسـڵ‌و لـە جیـاتی دەسـتـنوێژیش، بەڵگەش لەسـەر ڕەوایـی تەیـەمموم بـۆ لابردنـی لـەش پیسـیی زۆرن، گریمان ئەگـەر ئەوەش ڕاست بێ، هەرچـەندە دەگونجـێ ئـەو ڕیوایەتـە سـەنەدەكەی بـەهێز نـەبێ، وە دەشگونجێ ڕایـەك بووبـێ لـە سـەرەتاوەو نەیانزانیبـێ فـەرموودە لـەوبارەوە هـەن، وە دوایـی گەڕابنــەوە سـەر ڕای زۆربـە خـــوا لـێیان ڕازی بـێ، بـەڵام بـە هەرحــاڵ ئێمـە كاتێـك پێغەمبــەر ﷺ شـتێك دەفـەرموێ: تــازە قسـەی هـەر كەســێك بــێ لـە بەرانبـەریدا ئیعتیباری بۆ دانـانێین، با ئەبوبەكـرو عومەریش بن خـوا لێیـان ڕازی بێ، ڕۆژێك عەبدوڵـڵای كوڕی عەببـاس خـوا لە خۆی‌و بـابی ڕازی بـێ، شـتێك باس دەكــات‌و دەڵـێ پێغەمبـــەر ﷺ وایـــفەرمووە، مەجلیســـێك دەبـێ (دیــارە دوای سـەردەمی ئەبوبەكــرو عومـەر بـووە، خـــوا لێیــان ڕازی بــێ)، یەكێـك دەڵــێ: دەنـا ئەبوبــەكرو عومــەر وایانگـوتــوە، عەبــدوڵڵاش دەڵـــێ: وەڵـڵاهی چـاكە بـەردتان بەســەردا نابــارێ، مــن دەڵـــێم پێغەمبـــەر ﷺ وایـــفەرمووە، ئێـــوەش باســـی ئەبوبەكــرو عومـەران دەكــەن!، هەرچـاكە بــەردتان بەســـەردا نابــارن، واتــە: كـە قســـەی پێغەمبـەر ﷺ هاتــە پێش كـەس مەجالــی قســـەی دیكـەی نیـە، ئەگـەر كەسێكیش قسـەیەكی كـردوە، بـا ئەبوبەكرو عومـەریش بـن، خـــوا لێیـان ڕازی بـێ، دیــارە ئاگــایان لـەو فەرمایشــتەی پێغەمبـــەر ﷺ نـەبووەو پێیـــان نەگەیشـــتوە، یاخود پێیـان وانەبووە كە پێغـەمبەر ﷺ شتی وای فەرمووە، یـان هـەر ڕیوایەتەكـە ڕاســـت نیـەو شـتی وایاننەگوتـوە، دەنـا مەعـقوول نیـە، ئەبوبـەكرو عومـەر كـە لـە هـەموو كــەس زیاتر چاكــتر بـە دوای پێغەمبـەری خوا ﷺ كەوتوون، فەرمایشـتی ئەو هـەبێ‌و ئەوانیش قسەیەكی دیكـەیان هـەبێ؟ ناگونجـێ!

## چـەند بەڵـگەیـەك لەســەر ڕەوایی تەیـەمموم بۆ لابردنی لــەش پیســـیی

١- ئێمـە كـاتی خـۆی لـە كـاتی تەفسیــركردنی ئایـەتی ژمـاری (٤٣)ی سـوورەتی (النسـاء)دا ڕوونمان كردۆتەوە كە مەبەست لـە: ﴿ أَوۡ لَٰمَسۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ ﴾، یـانی:

(جَامَعتُمُ النِّساء)، واتە: جووت بوون لەگەڵ ژنەکانتاندا، نەك دەست لێدان وە (ملامسة)، لەوێ بە مانای جیماع لەگەڵ کردن دێ، نەك بە مانای دەست لێدان. ئنجا دواییش کە باسی تەیەمموم کراوە، وەك بەدیلی غوسڵ کردن بە ئاو، کەواتە: تەیەمموم لەش پیسی (جنابة) لادەبات.

٢ - لە سوورەتی (المائدة)دا خوا بە وشەی (جنب) باسی لەش پیسی کردوە، کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ﴾، پاشان باسی خۆشۆردنو لە دواییشدا لە کاتی نەبوونی ئاودا، باسی تەیەممومیشی کردوە، کە دیارە بۆ (محدث وجُنُب)ە، واتە: ئەو کەسەی کە دەستنوێژی نیەو ئەو کەسەش کە لەشی پیسە، هەموویان دەگرێتەوە دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، تەماشا بکەن! دەفەرموێ: ئەگەر لەشتان پیس بوو، خۆتان بشۆن، وە ئەگەر نەخۆش بوون یان لە سەفەر بوون، یان یەکێکتان تارەتی گرت، یاخود چوونە لای ئافرەتان، یان ئەگەر دایبنێی، لێرەدا مەبەست لە : ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾، یانی: دەستتان لە ئافرەتاندا، ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ﴾، ئاوتان چنگ نەکەوت، تەیەمموم بکەن، ئێ باشە هی پێشێ باسی لەش پیسی کردوە، دەفەرموێ: ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ﴾، ئەگەر لەشتان پیس بوو خۆتان بشۆن... ئەگەر ئاوتان چنگ نەکەوت، تەیەمموم بکەن، کەواتە: لەڕاستیدا تەیەممومەکە بۆ لابردنی لەش پیسییشە، ئەوە زۆر ڕوونە.

٣- ئنجا لەوبارەوە ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەریش ﷺ هەن:

أ/ ﴿عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبْزَى عَنْ أَبِيهِ رضي الله عنه قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ فَقَالَ: إِنِّي أَجْنَبْتُ فَلَمْ أَجِدِ الْمَاءَ، فَقَالَ عَمَّارُ بْنُ يَاسِرٍ لِعُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ: أَمَا تَذْكُرُ أَنَّا كُنَّا فِي سَفَرٍ فَأَجْنَبْتُ أَنَا وَأَنْتَ، فَأَمَّا أَنْتَ فَلَمْ تُصَلِّ، وَأَمَّا أَنَا فَتَمَعَّكْتُ فَصَلَّيْتُ، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: «إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيكَ هَكَذَا»، فَضَرَبَ النَّبِيُّ ﷺ بِكَفَّيْهِ الأَرْضَ فَنَفَخَ

فِيهِمَا، ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨١٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٢٣)، وَالتِّرمِذيُّ برقم: (١٤٤)، وَالنسائيُّ برقم: (٣١٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٥٦٩)}، واتە: پیاوێك هات بۆلای عومەری كوڕی خەتتاب (كە دیارە ئەو كاتە حوكمڕانی مسوڵمانان بووە خوا لێی ڕازی بێ)، گوتی: من لەشم پیس بوو ئاویشم دەست نەكەوتوە، (یانی ئەگەر لەشم پیس بوو ئاوم دەست نەكەوت چی بكەم، دیارە ئاوا پرسیاری كردوە) عەمماری كوڕی یاسر (دیارە لە مەجلیسەكەدا بووە خوا لێیان ڕازی بێ) بە عومەری كوڕی خەتتابی گوت: ئایا بەبیرت نایەت جارێك منو تۆ لە سەفەر بووین، هەردووكمان لەشمان پیس بوو، تۆ نوێژت نەكرد (واتە: لەبەرئەوەی ئاوت دەست نەكەوت، خۆتی پێ بشۆی‌و دەستنوێژی پێ بگری)، بەڵام من هاتم خۆم لە خۆڵێ وەرگەوزاندو نوێژەكەم كرد (یانی: وایزانیوە كە تەیەمموم دەبێ هەموو جەستەی خۆی بە خۆڵ، بكاتو خۆی لە خۆڵێ وەرداوە) كە گەڕاینەوە بۆ پێغەمبەرم ﷺ گێڕاوە، ئەویش فەرمووی: ئەوەندەت بەس بوو كە ئاوا بكەی، پێغەمبەری خوا ﷺ دەستی بە زەوی داداو فووی لێكردو بە دەموچاوو دەستی داهێنا.

ب/ ﴿عَنْ عِمْرَانَ بْنِ حُصَيْنٍ رضي الله عنه كُنَّا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فِي سَفَرٍ، صَلَّى بِالنَّاسِ فَإِذَا هُوَ بِرَجُلٍ مُعتَزِلٍ فَقَالَ: «مَا مَنَعَكَ أَنْ تُصَلِّيَ»؟ قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ أَصَابَتْنِي جَنَابَةٌ، وَلاَ مَاءَ، فَقَالَ: «عَلَيْكَ بِالصَّعِيدِ، فَإِنَّهُ يَكْفِيكَ»﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (١٩٩١٢)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٣٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٨١٩)، وَالدَّارَمِيُّ برقم: (٧٤٣)}، واتە: عیمرانی كوڕی حوصەین خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەری خوادا ﷺ بووین، لە سەفەرێكدا نوێژی بە خەڵكی كرد، دوایی تەماشای كرد پیاوێك ڕاوەستاوەو كەناری گرتبوو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: چ شتێك ڕێی لێ گرتووی نوێژ بكەی؟ گوتی: لەش پیسییم تووش بووە، ئاویش نیە، (خۆم بشۆم)، پێغەمبەریش فەرمووی: دەست بە ڕووی زەویدا بێنە، ئەوە بۆ تۆ بەسە.

**چوارەم: ئایا یەك جار دەست لە زەوی دان (ضربة واحدة) یان دوو جار، پێویستە بۆ تەیەممووم؟**

لەوبارەشەوە زانایان ڕا جیاییان هەیە، زۆر لە شەرع زانان (الفقهاء) دەڵێن: دووجار پێویستە، بەڵام زۆربەی فەرموودەناسان (المحدثين) دەڵێن: یەك جار بەسە، وە ئەوە ڕای (عَطاء ومكحول والأوزاعي وأحمد وإسحاق وإبن المنذر)ە، کە ئەوانە زانای بەرجەستەن، منیش ڕای دووەمم پێ ڕاستە، بۆچی؟ چونکە لە فەرموودەکاندا تەنیا باسی یەك جار کراوە، بۆ وێنە: فەرموودەکەی عەممار کە پێش تۆزێك هێنامان، وە لە فەرموودەکانی دیکەش دا بەس باسی یەك جار دەکرێ، پێغەمبەر ﷺ جارێك دەستی بە زەوی داوەو بە دەموچاوو هەردووك دەستی دا هێناوە، کەواتە: ئەو دوو جارە لەڕاستیدا بەڵگەیەکی لەسەر نیە، هەرچەندە زۆبەی شەرعزانانو مەزهەبەکانیش وادەڵێن، بە هەرحاڵ ڕای ئەوانیش هەر بەڕێزەو هێندەش زەحمەت نیە مرۆڤ دووجاریش دەست بە زەوی بدات، بەڵام ئێمە دەبێ لە ڕایەکان بکۆڵینەوە داخۆ کامیان بەڵگەی بەهێزترە.

**پێنجەم: ئایا ئەندامانی تەیەممووم چیو چین؟**

عەمماری کوڕی یاسر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، وایزانیوە ئەندامی تەیەممووم ئەوەیە خۆی لە خۆڵ وەرگەوزێنێ، حەتمەن خۆشی ڕووت کردۆتەوە!! دیارە هی دیکەش هەبوون هەر وایانزانیوە، ئێستاش من جاری وایە خەڵك لێم دەپرسێ: ئەرێ مامۆستا! ئەگەر ئینسان غوسڵی لەسەربێ، دەبێ بۆ تەیەممووم خۆی لە گڵ وەرگەوزێنێ؟ زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەندامەکانی تەیەممووم ڕوو و هەردوو دەستن (الوجه واليدين)، لەوبارەوە کە ئایا دەستەکانیش هەتا ئانیشکانن، یاخود هەر هەتا مەچەکانن، ڕاجیایی یان هەیە، مەچەك (رَسْغ)یشی پێ دەڵێن، (كُوع)یشی پێ دەڵێن.

دیارە منیش دوای ئەوەی تەماشای ڕای زانایانم کردوە، بە کورتیی دەڵێم: ڕاستترین ڕا لەوبارەوە، واتە: لە بارەی تەیەمموممەوە، فەرموودەکەی عەمماری کوڕی یاسرە، خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، کە پێشتر هێناومانە کە دەڵێ: (ثُمَّ مَسَحَ بِهِمَا وَجْهَهُ وَكَفَّيْهِ)، واتە: (پاش دەست لە زەوی دان) هەردووك دەستی بە

دەموچاوو لەپە دەستەکانی داهێنان، هەروەها لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿عَن أَبِي الْجَهيمِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ الصِمَّةِ الأَنْصَارِيِّ ﷺ فَقَالَ: أَبُو الجَهْمِ أَقْبَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مِنْ نَحْوِ بِئْرِ جَمَلٍ فَلَقِيَهُ رَجُلٌ فَسَلَّمَ عَلَيْهِ فَلَمْ يَرُدَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَيْهِ، حَتَّى أَقْبَلَ عَلَى الْجِدَارِ فَمَسَحَ وَجْهَهُ وَيَدَيْهِ ثُمَّ رَدَّ عَلَيْهِ السَّلَامَ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٣٣٠)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٨٤٨)، وَأَبُو دَاوُد بِرقم: (٣٢٩)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٨٠٥)}، واتە: ئەبی جەهمی کوڕی حاریسی کوڕی صیممەی ئەنصاریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ لەلای بیری جەمەلەوە (بیرێك بووە ئەو ناوەی لێ بووە) هات، پیاوێك پێیگەیشت سەلامی لە پێغەمبەر ﷺ کرد، پێغەمبەریش ﷺ وەڵامی نەدایەوە، هەتا ڕووی کردە دیوارەکەو دەستی بە دیوارەکەدا هێناو پاشان بەدەموچاوو بە هەردوو دەستی داهێنا، ئنجا وەڵامی دایەوە.

دوایی باسی کردووە فەرموویەتی: پێمخۆش نەبوو بەبێ دەستنوێژ وەڵامی سەلامەکەت بدەمەوە، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە دیواریش تەیەمومی پێ دەکرێ، هەڵبەتە ئەوانەی شافیعیی مەزهەبن، دەڵێن: دیوارەکە گڵ بووە، بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە مادام بە ڕووی زەوی دادەنرێ هەرشتێك لەسەر ڕووی زەوی بێ، تەیەمومی پێ دەکرێ، وەك دەبینین لە هیچ کام لەم فەرموودانەدا باسی دووجار نەکراوە، بگرە فەرموودەکەی عەممار بە تەئکید دەڵێ: جارێك، کەواتە: فەرزی تەیەمموم تەنیا ڕووو هەردوو لەپە دەستن، بەرو پشتی هەردوو دەستەکان تا مەچەك، وە هەندێك دەقیش هەن بۆ زانیارییتان باسی ئانیشکیش دەکەن، دەفەرموێ: مەسحی دەموچاوی کردو دەستیشی تا ئانیشکی، بەڵام لەڕاستیدا پسپۆڕانی فەرموودە ناس مشتومڕیان لەبارەیانەوە هەیە، یانی: لەڕووی سەنەدەوە بەهێز نین، وە لەوانەیە ڕاوییەکە بۆ خۆی ئیجتیهادی کردبێ و گوتبێتی ڕەنگە ئانیشکیشی لەگەڵ دابن، بەڵام حەدیسەکەی پێغەمبەر ﷺ زۆر ڕوونو ئاشکرایە، کە هەردوو لەپە دەستن، بۆیە من ڕایەکەی (الشنقيطي)یم پێ ڕاست نیە، کە دەڵێ: (ولا يبعد ما قَالَهُ مَالِك رَحِمَهُ اللهُ مِن وجُوب الكَفّين، وَسنية الذراعين إلى الْمرفقين)(1)، واتە: وە دوور نیە ڕای مالیك

١) أضواء البيان: ج١، ص٣٦٣.

ڕاست بێ ڕەحمەتی خوای لێ بێ کە دەڵێ: مەسح کردنی هەردوو لەپە دەستان بۆ تەیەمموم فەڕزەو هەردوو مەچەکیش تا دەگاتە ئانیشك، سوننەتە.

من ئەو رایەم پێ ڕاست نیە، چونکە پێمـوایە، ڕەنگە لەبەرئەوەی (الشنقیطي) مالیکی مەزهەب بووە، بەو لایەیدا شکاندبێتەوە، ئەگەرنا مادام فەرموودەکان تەنیا باسی هەردوو لەپە دەست دەکەن، کەواتە: بەس ئەوەندە ئەندامەکانی تەیەممومن، بەڵام بە هەرحاڵ کەسێکیش بیەوێ بە قسەی ئیمامەکانی دیکەش بکات، دەتوانێ تا ئانیشکانیش، مەسح بکات، بەڵام بێگومان شوێنکەوتنی بەڵگەی بەهێز باشترە.

شەشەم: ئایا ڕیزبەندیی (ترتیب) لە تەیەمموم دا فەڕزە، یان نا؟!

لەوبارەشەوە زانایان ڕاجیاییان هەیە، بەڵام بەگوێرەی ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ﴾، واتە: دەست بە ڕووی زەویدا بێنن و بە دەموچاوو بە دەستتانیدا بێنن، کوێو کوێی باسی کردوە؟ دەموچاوو دەست، کەواتە: دەبێ پێشی دەموچاو بێ، ئنجا دەست بێ، مانای وایە ڕیزبەندیی پێویستە، هەروەها بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە لەبارەی هاتن و چوونی نێوان صەفاو مەروەدا فەرموویەتی: ﴿أَبْدَأُ بِمَا بَدَأَ اللهُ بِهِ﴾{أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٩٤١)، وَابْنُ حِبَّان برقم: (٣٩٤٤) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رضي الله عنه}، واتە: بەوە دەست پێدەکەم کە خوا دەستی پێکردوە، خوا بە چی دەستی پێکردوە؟ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلصَّفَا وَٱلۡمَرۡوَةَ مِن شَعَآئِرِ ٱللَّهِ...﴾ البقرة: ١٥٨، پێشی ناوی صەفای هێناوە، کەواتە: پێشی بچۆ سەر صەفا، ئنجا بڕۆ سەر مەروە، کەواتە: ئەمە بنچینەیەکی گشتی لێ وەردەگیرێ، مادام خوای پەروەردگار لێرەدا دەفەرموێ ﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُم مِّنۡهُ﴾، پێشی باسی ڕوو دەکات، ئنجا باسی دەستەکان دەکات، کەواتە: وا پێدەچێ کە پێشخستنی ڕوو پێویست بێ، یان بەلای کەمەوە سوننەت بێ، وەك (ابن حجر) دەڵێ: (أَكْثَرُ الْعُلَمَاءِ عَلَى تَقْدِيمِ الوجهِ مَعَ الإختلاف في وجوب ذَلِكَ وَسُنِّيتهِ)[1]، واتە: زۆربەی زانایان لەسەر ئەوەن کە ڕوو پێش هەردوو دەست بخرێ، لەوەشدا ڕاجیاییان هەیە کە ئایا واجبە

---

١) فتح الباري: ج١، ص.٣٦٤

یان سوننەتە، ئەگەر کەسێکیش دەستەکانی مەسح کردن، دوایی دەموچاوی مەسح کرد، هەر دەگونجێ، کە ئەگەر بە سوننەت دابنرێ، گوناهبار نەبووەو، ئەگەر بە واجبیش دابنرێ، تەیەممومەکەی هەر دروستە، بەڵام گوناهبار بووە، کە دەستی پێش دەموچاوان خستوون، چونکە خوای زانا ڕووی پێش دەستەکان باسکردوە.

حەوتەم: ئایا تەیەمموم لەش پیسیی (حَدَث) لادەبات، یان نا؟!

لەش پیسیی: لەش پیسیی گچکە، کە بێ دەستنوێژییە، وە لەش پیسیی گەورە کە جەنابەتە ئایا لای دەبات، یان لای نابات؟ زانایان لەوبارەوە سێ ڕایان هەن:

ڕای یەکەم دەڵێ: تەیەمموم بێ دەستنوێژیی لانابات، واتە: نە بێ دەستنوێژیی گچکە، نە هی گەورە.

ڕای دووەم دەڵێ: تەیەمموم بێ دەستنوێژیی بەیەکجاریی لا دەبات.

ڕای سێیەم دەڵێ: تەیەمموم بێ دەستنوێژیی بە شێوەیەکی کاتیی لا دەبات.

## بەڵگەکانی ڕای یەکەم:

کە دەڵێن: تەیەمموم لەش پیسیی لانابات، چەند شتێك بە بەڵگە دێننەوە، من ئەو دوو دەقەم هێناون:

١/ ﴿عَنْ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ ﷺ قَالَ: احْتَلَمْتُ فِي لَيْلَةٍ بَارِدَةٍ فِي غَزْوَةِ ذَاتِ السَّلَاسِلِ فَأَشْفَقْتُ إِنْ اغْتَسَلْتُ أَنْ أَهْلِكَ فَتَيَمَّمْتُ ثُمَّ صَلَّيْتُ بِأَصْحَابِي الصُّبْحَ، فَذَكَرُوا ذَلِكَ لِلنَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: «يَا عَمْرُو صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ» ؟! فَأَخْبَرْتُهُ بِالَّذِي مَنَعَنِي مِنَ الإِغْتِسَالِ، وَقُلْتُ إِنِّي سَمِعْتُ اللهَ يَقُولُ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾ النساء فَضَحِكَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَلَمْ يَقُلْ شَيْئًا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (١٧٨٤٥)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٣٣٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (٦٢٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: عەمری کوڕی عاص خوا لێی ڕازی بێ (دیارە فەرماندەی سەرییەیەك بووە، سەرییەش بەشێکە لە سوپایەك) دەڵێ: شەوێکی زۆر سارد ئیحتیلامم بوو (لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێن: شەیتانیی بوو، ئیحتیلام واتە: لە خەودا ڕەحەتبوون) لە جەنگی (ذَاتِ

السَّلاَسِلِ)، منیش ترسام کە ئەگەر بێتو خۆم بشۆم بفەوتێمو بمرم، بۆیە تەیەممومم کرد، وە نوێژی بەیانییشم بەو تەیەممومە بە هاوەڵەکانم کرد، (کە دیارە ئەو فەرماندەو بەرپرسیان بووە) ئەوانیش بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ گێڕایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەی عەمر! ئایا نوێژت بە هاوەڵەکانت کرد لە کاتێکدا لەش پیس بووی؟! (واتە: خۆت نەشۆرد بوو) منیش هەواڵم پێدا، کە چ شتێك ڕێی لێ گرتم خۆم بشۆم، وە گوتم: من گوێم لێ بووە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا ﴿٢٩﴾﴾النساء، واتە: خۆتان مەکوژن مسۆگەر خوا لەگەڵتان بە بەزەییە، (منیش ترسام کە ئەگەر خۆم بشۆم، خۆم بفەوتێنم)، پێغەمبەری خوا ﷺ پێکەنیو هیچی نەفەرموو، دیارە پێکەنینەکەی نیشانەی ئەوەیە پەسەندی کردووەو ڕازی بووە، ئەگەرنا دەیفەرموو: نەخێر، جارێکی دیکە ئەوە مەکەو هەڵەت کردووە، نوێژەکەشت دەبێ بگێڕیەوە، کەواتە: دروستە، ئنجا ئایا لێرەدا بۆچی ئەوەیان هێناوەتەوە؟ دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (صَلَّيْتَ بِأَصْحَابِكَ وَأَنْتَ جُنُبٌ؟) هەر ناوی لێناوە لەش پیس (جنب)، تەیەممومیشی کردوە، کەواتە: جەنابەتەکەی هەر لەسەر بووە، ئەوە ڕای یەکەمە کە دەڵێن: تەیەمموم لەش پیسیی لانابات.

ب/ بەڵگەیەکی دیکەش دێننەوە دەڵێن: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الصَّعِيدَ الطَّيِّبَ طَهُورُ الْمُسْلِمِ، وَإِنْ لَمْ يَجِدِ الْمَاءَ عَشْرَ سِنِينَ، فَإِذَا وَجَدَ الْمَاءَ فَلْيُمِسَّهُ بَشَرَتَهُ، فَإِنَّ ذَلِكَ خَيْرٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٤٠٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٣١٣)، وَالحاكم برقم: (٦٢٧) وَقَالَ: صَحِيحٌ}، واتە: ڕووی پاکی زەوی پاککەرەوەیە بۆ مسوڵمان، ئەگەر بۆ ماوەی دە (١٠) ساڵانیش ئاوی چنگ نەکەوێ، ئنجا هەرکاتێك ئاوی چنگ کەوت با خۆی بشوات، دەڵێن کەواتە: کە دەفەرموێ: هەرکاتێك ئاوی چنگ کەوت، خۆی بشوات، کەواتە: دیارە لەش پیسییەکەی هەر لەسەرە، بۆیە دەفەرموێ: با خۆی بشوات، وە ئەگەر لەش پیسییەکەی لەسەر نەمابا، نەیدەفەرموو: با خۆی بشواتو ئاو بەکاربێنێ، ئەوە بەڵگەکانی ڕای یەکەم بوون.

## بەڵگــەکــانی ڕای دووەم:

کە دەڵێن: تەیەمموم بە یەکجاریی لەش پیسـیی لادەبات، ئەوانیش چەند شـتێك بە بەڵگـە دێننـەوە:

١/ یەکـیان ئـەو فەرموودەیـە کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: ﴿جُعِلَتْ لِي الأَرْضُ مَسْجِدًا وَطَهُورًا﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٣٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١١٦٣)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٣٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٣٩٨) عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا}، واتە: سـەر زەوییم هەمووی بۆ کـراوە بە مزگەوتو بە پاککەرەوەش (لـە هەر کوێیەك ئینسـانی مسـوڵمان نوێـژ بکات دروستە)، کەواتـە: ڕووی زەوی هـەم دروسـتە نوێژی لەسەر بکرێ، هەم پاك کەرەوەشـە دەستی پێدا بێنـەو تەیـەمموم بکە، پاکت دەکاتەوە، چونکە دەفـەرموێ (وَطَهُورًا) پاککەرەوەیـە، مانـای وایـە لـەش پیسـیی دەبێ لابەرێ، ئنجا پاك دەبێتـەوە.

٢/ دووەمیان هەروەها ئەم فەرموودەیەش دێننەوە کە پێشـتر هێنامان، جا سبحان اللە! هەندێکـیان بەشـێك لـە فەرموودەکـەیان بـۆ ڕای یەکـەم کردۆتـە بەڵـگە، ئەمانیش بەشی یەکـەمی فەرموودەکە بۆ ڕای دووەم دەکەنە بەڵگە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الصَّـعِيدَ الطَّيِّـبَ طَهُـورُ المُسْـلِمِ...﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٢١٤٠٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٣١٣)، وَالحاكم برقم: (٦٢٧) وَقَالَ: صَحِيحٌ}، واتە: ڕووی پـاکی زەوی پاککەرەوەیـە بـۆ مسـوڵمان، دەڵێن: مـادام پـاك کـەرەوە بێ، دیـارە دەبـێ لـەش پیسـیی لەسـەر لابـەرێو بـێ دەسـتنوێژیشی لەسـەر لادەبـات.

## بەڵگــەکــانی ڕای سـێیەم:

من ڕای سـێیەمم پـێ ڕاسـتە، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە هـەموو بەڵـگەکان پێکەوە کۆدەکاتەوە، هەموو دەقەکان پێکەوە کۆدەکاتـەوە، ڕای سـێیەم دەڵـێ: تەیـەمموم لـەش پیسـیی بە یەکجاریی لانابات، بەڵام لەش پیسیشـی لەسـەر نیە، بەڵـکو بەشـێوەیەکی کاتیی لای دەبات، واتـە: هەتا ئاوی چنگ دەکەوێ، لـەش پیس نیـەو بـە لــەش پیس لە قەڵـەم نادرێ، بەڵام کە ئاوی چنـگ کەوت بە لەش پیس لـە قەڵەم دەدرێو دەبـێ

خۆی بشوات، کەواتە: تەیەممومەکە حاڵەتی لەش پیسییەکەی هەڵواسیوەو ئەگەر ئاوی چنگ کەوت لەش پیسە، بەڵام ئەگەر ئاوی چنگ نەکەوت، بە پاك لەقەڵەم دەدرێ، دوو بەڵگەمان لەوبارەوە هەن:

١/ ئەگەر تەیەممومی لەش پیسییەکەی نەبردبا، نوێژ دروست نەدەبوو، وە ئەگەر بڵێی: لەشی هەر پیسە، ئەدی چۆن نوێژی دەکات؟ جا چ لەش پیسیی گچکە بێ، چ هی گەورە بێ، دەبێ لای بەرێ، بەڵام ئێمە دەڵێین: بە شێوەیەکی کاتیی لای بردوە، تا ئاوی چنگ دەکەوێ.

٢/ ئەگەر یەکجاریی لای بردبایە پێویستی بە خۆشۆردن نەدەبوو، کەواتە: وانیە بڵێی لای نەبردوە، چونکە نوێژی بۆ دروستە، واش نیە بڵێی: یەکجاریی لای بردوە، چونکە دوایی دەبێ خۆی بشوات، کەواتە: ڕای ڕاستو میانجیی ئەوەیە کە بە شێوەیەکی کاتیی لای بردوە.

هەشتەم: ئایا بە تەیەممومێك دوو فەرز دەكرێن؟

ماموٚستایانی کوردەواریی خۆمان دەڵێن: بۆ هەر فەرزێك دەبێ تەیەممومێك بکەی، بەڵکو هەندێکیان دەڵێن: سوننەتیشی پێ ناکرێ، بەس یەك فەرز! هەندێکیان دەڵێن: فەرزێكو چەند سوننەتێکی پێ دەکرێن، زانایان لەوبارەوە دوو ڕان:

١) هەرچی: (حسن البصري والزهري وابن المسيب، أبو حنيفة وأحمد) لە باوترین ڕیوایەتیدا، دەڵێن: هەتا دەستنوێژ دەشکێ، چەند فەرزی بوێن دەتوانێ بیانکات، کە تەیەممومی کرد، چ بۆ دەستنوێژ، ئەگەر لە جیاتی دەستنوێژ تەیەممومی کرد، وە چ بۆ لەش پیسیی، ئەگەر لە جیاتی غوسڵ تەیەممومی کرد، چەند فەرزی بوێن دەتوانێ بیانکات، بەڵام (مالكو شافعي) دەڵێن: لە فەرزێك زیاتر نابێ پێی بکات، بەڵام ڕای یەکەم ڕاسترە، چونکە:

یەکەم: مادام تەیەممومم بەدیلی دەستنوێژو خۆ شۆردنە، هەرچی بەوان دەکرێ، بەویش دەکرێ، وە ئایەتو فەرموودەکانیش بە ڕەهایی باسیان کردوە، کە تەیەمموم بکەن لە جیاتی دەستنوێژ، وە لە جیاتی غوسڵ، وە نەیانفەرمووە: بۆ نوێژێك یان بۆ دوو نوێژان.

دووەم: ئەوانەی کە دەڵێن: بەس فەرزی پێ دەکرێ، هیچ بەڵگەیەکی قورئانو سوننەتیان بەدەستەوە نیە، ئەدی ئێمە چ بەڵگەیەکمان بەدەستەوەیە؟

بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا ﴾، واتە: ئەگەر بێ دەستنوێژ بوون، بێ دەستنوێژیی گچکە، یان گەورە، بە ڕووی پاکی زەوی تەیەمموم بکەن، ئیدی نافەرموێ: بۆ نوێژێكو بۆ دوو نوێژان بە ڕەهایی فەرموویەتی.

نۆیەمو کۆتایی: ئایا تەیەمموم وەبری لابردنی پیسیی (نجاسة) دەکەوێ؟

کەسێك پیسییەکی لەسەر بەدەنە، میزی پێوەیە، پیسایی پێوەیە، یان خوێن، ئایا تەیەمموم وەبری ئەوەش دەکەوێ، کە ئەو پیسییەش لابەرێ؟ لەوبارەشەوە زانایان ڕا جیاییان هەیە، تەنیا ئیمام ئەحمەد ڕەحمەتی خوای لێ بێ ڕای وایە کە تەیەمموم چۆن بێ دەستنوێژیی (حدث) ی گەورەو گچکە لادەبات، پیسییش لادەبات، کەسێك با لەشیشی بە میز بێ، کە تەیەممومی کرد وەك پیس نەبێ وایە، بەلام زانایانی دیکە سەرجەمیان دەڵێن: تەیەمموم پیسیی لانابات، واتە: حوکمەکەی، ئەگەرنا خودی پیسییەکە هەر لاناچێ، کەسێك میزی بە شوێنێکەوە بێ، ئەگەر تەیەممومیش بکات، هەر پێییەوەیە، کەواتە: مەبەست لە حوکمەکەیە، حوکمەکەی دەمێنێ، یان نا؟

زۆربەی زانایان دەڵێن: حوکمەکەی لاناچێو پیسییەکەش هەتا نەیشوا، یان بە بەردێك، بە شتێك، لاینەبات لاناچێ، ئنجا (الثوري والأوزاعي وأبو ثور) کە ئەوانیش هەرسێکیان پێشەوای سەر مەزهەبن، دەڵێن: دەبێ پیسییەکە بە گڵ لاببات، ئنجا نوێژەکەی بکات، قسەکەی ئیمام ئەحمەدیش بە ڕای من هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، وە بێگومان لە حاڵی ئاواشدا پێویستە بەپێی توانا پیسییەکە لاببرێ، بەڵگەمان چییە؟ بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، کەسێك لە بیابانێك لێی قەوماوە، یان منداڵێك میزی پێدا دەکات، یان میزی خۆی بە لاقی کەوتۆتەوەو ئاویشی لێ نیە بیشوا، چی بکات؟ بەپێی توانا بە گڵ، بە بەرد، بە هەرشتێك کە هەیە خۆی پاك دەکاتەوەو، وە نوێژی خۆی دەکات، وە نوێژەکەشی دروستە، وە گێڕانەوەشی

ناوێ، چونکە ﴿ لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ﴾، خوا لەسەر هیچ کەس پێویست ناکات مەگەر ئەوەندەی لە توانای دایە.

**مەسەلەی چواردەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ ﴾، واتە: خوا نایەوێ هیچ سەغڵەتییەکتان بخاتە سەر، زانایانو شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: (النكِـرَةُ فِي سِـيَاقِ النَّفْيِ يُفِيد العمُـوم) واتە: وشەیەك بە (نَكِرَة) هاتبێ لە سیاقێکدا کە ئەو شتە نەفی کرابێو حوکمەکەی لێ لابردرابێ، بەڵگەیە لەسەر گشتاندن، کەواتە: لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: خوا نایەوێ هیچ سەغڵەتییەکتان بخاتە سەرێ، یانی: بەگشتی هیچ جۆرە سەغڵەتییەك، ئنجا ئەوە زۆر جێی سەرنجە! خوا لە کوێدا وایفەرمووە؟ لێرەدا کە باسی دەستنوێژو تەیەممومو خۆشۆردنو ئەوانەیە، کەواتە: هەرشتێك خەڵکی سەغڵەت بکات خوا نەیویستوە، چونکە لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ ﴾، زانایان دەڵێن: ئەو ئیرادەیە، ئیرادەی تەشریعییە، ئیرادەی تەکوینیی نیە، یانی: خوا لە شەرعی خۆیدا هیچ شتێکی دانەناوە کە ئێوە سەغڵەت بکات، کەواتە: هەر شتێك خەڵکی تووشی سەغڵەتیی بکات، وەك ئەوەی کە دەڵێن: تەیەممموم تەنیا بە گڵ دەکرێ، کە بێگومان خەڵك تووشی سەغڵەتیی دەبێ، ئەوە خوا نەیویستوەو، لە شەرعی خوادا نیە، هەروەها هەموو ئەو شتانەی دیکە کە خەڵك تووشی سەغڵەتیی دەکەن، ئەم ئایەتە دەکرێتە پێوەر بۆیو مانای وایە ئەوە پێچەوانەی شەرعە، ئنجا دیارە ئەم ڕستە قورئانییە لە چەند شوێنێکی دیکەش لە قورئاندا هاتوە، بۆ وێنە: لە ئایەتی (١٨٥)ی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ ... يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ...﴿١٨٥﴾ ﴾، ئەویش لە کوێ وا دەفەرموێ؟ لە باسی لە کۆتایی باسی ڕۆژووگرتندا دەفەرموێ: ﴿وَمَن كَانَ مَرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ ﴾، واتە: وە ئەگەر کەسێك نەخۆش بوو، یان لە سەفەر بوو، با ئەو ڕۆژانەی بە ڕۆژوو نەبووە لە ڕۆژانی دیکە بگرێتەوە، دوایی

دەفەرموێ: ﴿... يُرِيدُ ٱللَّهُ بِكُمُ ٱلْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ ٱلْعُسْرَ ... ﴿١٨٥﴾﴾، واتە: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێو زەحمەتی بۆتان ناوێ.

سبحان الله ! خوا چەند بە تەئكید دەفەرموێ، کەچی کەسی وا هەیە دین زۆر لە خەڵکی بە زەحمەت دەخاتو پێشی وایە کە خوا وایفەرمووە، یانی بە شێوەیەك ئیسلام پێشانی خەڵك دەدات کە مایەی لێ زەحمەتکردنو نارەحەتکردنیانە، وە واشیان تێدەگەیەنێ کە ئاوا نەبێ خوا لێیان ڕازی نابێ، خوای پەروەردگاریش بۆ خۆی بە ڕوونو بە ڕاشکاویی دەفەرموێ: خوا ئاسانیی بۆتان دەوێ زەحمەتی بۆتان ناوێ، کە نەخۆشیو ڕۆژووت بۆ ناگیرێ مەیگرە، لە سەفەریێ قورسە لەسەرت، مەیگرە، ناڵێین: ڕۆژووگرتن دروست نیە لە سەفەرێ، بەڵێ دروستە ڕۆژوو بگری، هەرچەندە هەندێك لە زانایان دەڵێن: دروست نیە، بەڵام با، نەخۆشی دروستە بیگری، هەرچەندە هەندێك لە زانایان دەڵێن: سەرت بێشێ دروست نیە بەڕۆژووبی، ظاهیرییەکان وادەڵێن، بەڵام وانیە، بەڵێ ئەگەر زانیت سەغڵەت دەبی، بەڕۆژوو مەبە، دوایی بیگرەوە، خوا وای پێخۆشەو شەرعی خوای بەرز وایدەوێ، وەك خوا لە سوورەتی (الحج) ئایەتی (٧٨)دا دەفەرموێ: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلدِّينِ مِنْ حَرَجٍ ﴿٧٨﴾﴾، واتە: خوا لە دیندا هیچ سەغڵەتیی بۆ ئێوە دانەناوە، هەروەها لە سوورەتی (الروم) ئایەتی (٣٥)دا دەفەرموێ: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾، واتە: ڕووی خۆت بەرانبەر دین ڕاست ڕاگرە بە ساغیی، ئەو سروشتەی کە خوا خەڵکی لەسەر خولْقاندوە، گۆڕین نیە بۆ دروستکراوی خوا، ئەوە دینی ڕاستە، دینی ڕاست ئەوەیە کە بەپێی فیطرەتو سروشتی ساغیی ئینسانەکان بێ.

**مەسەلەی پازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾، واتە: بەڵکو خوا دەیەوێ پاکتان بکاتەوەو

چاکەی خـۆی لەسـەرتان تـەواو بکـات، بـەڵکو سوپاسـگوزاریی بکـەن، واتـە: خـوای بەبەزەیی کە دەفەرموێ: خۆتان بشـۆن، ئەگەر لەشـتان پـیس بـوو، دەسـتنوێژ بگـرن بـۆ نوێـژێ، ئنجـا ئەگـەر ئاوتـان چـنگ نەکـەوت تەیـەمموم بکـەن، ئـەو نایـەوێ سەغڵەتتان بکات، بـەڵکو دەیـەوێ پاکتـان بکـاتەوە، دەیـەوێ چاکـەی خـۆی لەسـەر ئێوە تەواو بکـات، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاربن، ئەم ڕستە موبارەکە حیکمەتو ئامانجی دەستنوێژو خۆشۆردنو تەیەمموم ڕوون دەکاتەوە، خوا دەفەرموێ: دەستنوێژ بگـرن، ئەگـەر ویسـتتان نوێـژ بکـەن، خۆتـان بشـۆن ئەگـەر لەشـتان پـیس بـوو، وە ئەگـەر ئاوتـان دەسـت نەکـەوت بـۆ دەسـتنوێژو بـۆ خۆشـۆردن، تەیـەمموم بکـەن، بۆچـی وا دەفەرموێ؟ بۆیـە وا دەفـەرموێ تاکـو پـاك بینـەوە، ئنجا کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَـٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ ﴾، خـوا دەیـەوێ پاکتـان بکاتـەوە، ئـەو پاککردنەوەیـە هـەم لایـەنی ڕواڵـەتیی دەگرێتـەوە، هـەم لایـەنی دەروونیـیش، واتـە: هـەم جەسـتەیی‌و هـەم ڕووحیـی، با تەماشای ئەم چەنـد فەرموودانـە بکـەین، کە چۆن پێغـەمبەر ﷺ باسـی پاك‌و خاوێنی دەکاتو، چ پەیوەستییەکی هەیـە بە ئیمانو موسوڵمانەتیەوە:

# حیکمەتی دەستنوێژو خۆشۆردن و تەیەمموم:

١- پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمَانِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٢٢٩٥٣)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٢٢٣)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٣٥١٧) وَقَالَ: صَحِيحٌ}، واتە: پاكو خاوێنی نیوەی ئیمانە، هەندێك لە زانایان وایان لێكداوەتەوە، كە پاكو خاوێنی هەم لایەنی ڕواڵەتیی دەگرێتەوە، هەم لایەنی دەروونییش، دەڵێن: لەبەرئەوەی كە دین دوو بەشە بەشێك ئەوەیە كە تۆ لە خراپەكان خاڵی بی: شیركو كوفرو نیفاقو ڕیاو كیبرو ئەو سیفەتە خراپانەت تێدانەبن، وە بەشی دووەم ئەوەیە تۆ بە چاكەكان بڕازێیەوە: ئیمانو تەوحیدو عیبادەتو ڕەوشتە بەرزەكان، كەواتە: خۆ پاككردنەوە لە شتی خراپ، نیوەی مسوڵمانەتییەو خۆ ڕازاندنەوەش نیوەكەی دیكەیەتی، وە دەشگونجێ وەك گوتم لێرە پاكیی ڕواڵەتیی‌و جەستەیی مەبەست بێ، وە لەڕاستییدا مسوڵمان دەبێ پاكو خاوێن بێ، دەبێ بۆن خۆش بێ، دەبێ ئاوێنەیەك بێ، پاكیی مسوڵمانەتیی‌و پاكیی ئیسلامەتیی تێدا دەربكەوێ، چڵكنو كوڵكنو بۆن ناخۆش نەبێ، كە پێغەمبەر ﷺ لە فەرموودەدا دەفەرموێ: یەكێك لە ئێوە ئەگەر لەو گیایانەی خوارد وەك سیرو پیازو توور، با توخنی مزگەوتمان نەكەوێ[1]، با لە ماڵی خۆی نوێژ بكات، نوێژی بە كۆمەڵ كە بە بیستو حەوت نوێژی دیكە هەیە، با لە قیس خۆی بدات، چونكە ئەگەر بەو بۆنە ناخۆشەوە كە بۆنی دەمی ناخۆش بێ، بێتە مزگەوتێ، مانای وایە هێندەی گوناح دەگاتێ، لەسەر خێرەكە قەردار دەبێتەوە، یانی: نوێژی بە كۆمەڵ بە بیستو حەوت پلە چاكترە لە نوێژی

---

١) ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ فِي غَزْوَةِ خَيْبَرَ: (مَنْ أَكَلَ مِنْ هذِهِ الشَّجَرَةِ يَعْنِي الثُّومَ فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا)﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٨٥١)، كتاب الأذان: باب ما جاء في الثوم النِّيِّ والبصل والكراث. ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ: (مَنْ أَكَلَ مِنْ هَذِهِ الْبَقْلَةِ الثُّوم "وَقَالَ مَرَّةً مَنْ أَكَلَ الْبَصَلَ وَالثُّومَ وَالْكُرَّاثَ" فَلاَ يَقْرَبَنَّ مَسْجِدَنَا فَإِنَّ الْمَلاَئِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ بَنُو آدَمَ)﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (١٢٨٢)، كتاب المساجد، باب نَهْيِ مَنْ أَكَلَ ثُومًا أَوْ بَصَلاً أَوْ كُرَّاثًا أَوْ نَحْوَهَا عَنْ حُضُورِ الْمَسْجِدِ}.

تاك، بەڵام دیارە گوناهی بۆنی ناخۆش لێ هاتنەکەی گەورەترە، لە خێرەکەی، ئنجا ئایا بۆنی جگەرە چی کەمترە لە بۆنی سیرو پیاز؟! هی وا هەیە جگەرە کێشە، لە پەنات ڕادەوەستێ، تا لە نوێژێ دەبیەوە پشووت سوار دەبێ، بۆن خڵتەیەکی لێ دێ! ئنجا مسوڵمانان بەداخەوە زۆرجار گوێ نادەنە پاكو خاوێنی، هی وا هەیە بۆنی دەمی دێ، بچۆ تۆزێك دەمو ددانی خۆت بشۆ بە فلچەو مەعجوون، یان بە سیواك بیشۆو خاوێنی بکەوە، وە هی وا هەیە بۆنی ناخۆشی لێ دێ، وە هەیە خۆی ناشوات، خۆتان بشۆنو بۆنی خۆش لەخۆتان بدەن، پێغەمبەر ﷺ هەمیشە خاوێن بووەو بۆنی خۆش بووە، ئێمەش دەبێ وەك پێغەمبەری خوا ﷺ بین.

٢- لە فەرموودەیەکی دیکەدا دەفەرموێ: ﴿الْوُضُوءِ شَطْرُ الإِيمَانِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٩٥٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٤٣٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٨٤٤)، وَالطَّبَرَانِيُّ في (الكبير) برقم: (٣٤٢٣) عَنْ أَبِي مَالِكٍ الأَشْعَرِيِّ رضي الله عنه قال الشيخ الألباني: صحيح}، واتە: دەستنوێژ نیوەی ئیمانە.

٣- لە فەرمودەیەکی دیکەدا هاتوە: ﴿مِفْتَاحُ الصَّلاةِ الطُّهُورُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٩٥٩)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٦١٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣) هَذَا الحَدِيث أَصَحّ شَيء في هذا الباب، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٧٥)، عَنْ عَلِيّ رضي الله عنه، وَقَالَ الشيخ الأَلبانِي: حَسَنٌ صَحِيحٌ}، واتە: کلیلی نوێژ پاكو خاوێنییە.

٤- ئنجا ئەم فەرمودەیەش دەربارەی چۆنیەتی پاکبوونەوەی ئینسانە لە گوناهەکان، بە هۆی دەستنوێژەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا تَوَضَّأَ الْعَبْدُ الْمُسْلِمُ أَوِ الْمُؤْمِنُ، فَغَسَلَ وَجْهَهُ، خَرَجَتْ مِنْ وَجْهِهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ نَظَرَ إِلَيْهَا بِعَيْنَيْهِ مَعَ الْمَاءِ، أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ أَوْ نَحْوَ هَذَا، فَإِذَا غَسَلَ يَدَيْهِ، خَرَجَتْ مِنْ يَدَيْهِ كُلُّ خَطِيئَةٍ بَطَشَتْهَا يَدَاهُ مَعَ الْمَاءِ ، أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ، فَإِذَا غَسَلَ رِجْلَيْهِ، خَرَجَتْ كُلُّ خَطِيئَةٍ مَشَتْهَا رِجْلاهُ مَعَ الْمَاءِ أَوْ مَعَ آخِرِ قَطْرِ الْمَاءِ حَتَّى يَخْرُجَ نَقِيًّا مِنَ الذُّنُوبِ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٤٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٤٣٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٠٤٠)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، ئەم فەرموودەیە موژدەیەکی زۆر خۆشی تێدایە، دەفەرموێ: هەر کاتێك بەندەی مسوڵمان یان، فەرمووی: بەندەی ئیماندار، دەستنوێژی گرت، ئەگەر دەموچاوی شۆرد ڕووی خۆی شوشت،

هەر گوناهێك كە بە چاوەكانی كردوویەتی (كە لە دەمو چاودان) لەگەڵ ئاوەكە، یاخود لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەكەدا، ئەو گوناهانە هەموویان دەڕۆن، واتە: گوناهی ڕوانین، (بەڵام ئەگەر درۆو غەیبەتو بوختانی كردبێ، بە ئاوی دەستنوێژ ناچێ، چونكە گوناهی گەورەن، دەستنوێژو غوسڵ بەس گوناهی گچكەیان پێ دەچێ)، وە ئەگەر دەستی شۆردن، هەر گوناهێك بە دەستەكانی كردوویەتی لەگەڵ ئاوەكە، یاخود لەگەڵ دوا دڵۆپی ئاوەكەدا دەڕوات، (دیسان ئەوەش مەبەست پێی گوناهی گچكەیە، بەڵام كەسێك بەو دەستە قەتڵێكی كردبێ، بڵێ: دەستنوێژێكی دەگرم، نا)، وە هەركاتێك پێیەكانی شۆردن، هەر گوناهێك بە پێیەكانی بۆیان چووە، ئەو گوناهانە لەگەڵ ئاوەكە، یاخود دوا دڵۆپی ئاوەكەدا دەڕۆن، تاكو لە گوناهان پاك دەبێتەوە، دوای دەستنوێژەكەی. واتە: لە گوناهە گچكەكان، ئەمە لە ڕووی مەعنەوییەوە، وە لە ڕووی جەستەییەوە، هەم دەستنوێژو هەم خۆشۆردنیش حیكمەتەكەیان دیارە:

### دەستنوێژ:

ئینسان چ ئەندامێكی زیاتر مەزندەی ئەوەی لێدەكرێ كە تۆزو خۆڵو میكرۆباتی لێ بنیشێ؟ ئاشكرایە دەموچاو دەستو پێیەكانو سەر، ئنجا بەهۆی دەستنوێژگرتنەوە، دەموچاوت دەشۆی، دەستەكانت دەشۆی وێڕای ئانیشكەكانت، وە پێیەكانت دەشۆی لەگەڵ گوێزینگان، وە سەریشت هەمووی مەسح دەكەی، كە ئەگەر هەر تۆزو خۆڵێكی پێوەبێ پاك دەبێتەوە، چونكە زەحمەتە سەرت هەمووی بشۆی، جاری وایە زستانەو مرۆڤ ئەگەر سەری بشوا، ڕەنگە تووشی هەڵامەتێكی خراپ بێ، كەواتە: مرۆڤ ڕۆژی پێنج جاران دەستنوێژ بشوا، هەمیشە دەموچاوو لاقو پێو سەروگوێلاكی خاوێن دەبێ، ئەوە لە ڕووە جەستەییەكەیەوە لەڕووە مەعنەوییەكەشییەوە، كاتێك ئینسان دەچێتە خزمەت خوا جل شأنە ئەوە لە كوێ كە دەستنوێژێكی تازەی گرتبێ‌و هۆشیارو بێدار بچێ لە خزمەت خوادا ڕاوەستێ، یان بە دەستنوێژێكی كۆنەوە بچێ لە خزمەتی ڕاوەستێ، بە تەئكید فەرق دەكات، وە ئەگەر دەستنوێژی نەبێ هەر دروست نیە، كەواتە: لەڕاستیدا هەم لە ڕووی مەعنەوییو، هەم لە ڕووی جەستەیی یەوە، دەستنوێژ حیكمەتەكەی دیارە.

## خۆشـۆردن: (الغــسـل):

لە ڕووی پزیشـکی (طب)ییـەوە شـارەزایان گوتوویانـە: لـەنێو جەسـتەی ئینسـانـدا، دوو ڕسـتـە دەمار هەن، ڕسـتـە دەمارێك پێیـان دەگوترێ: دەمارەكـانی (سـمپاتیك) كە ئەوان كۆئەنداماەكان توند دەكەنـەوە، ڕسـتە دەمـارێكی دیكە پێیان دەگـوترێ: (پـارا سـمپاتیك) كـە كۆئەندامـەكان شـل دەكەنـەوە، یـانی پێچـەوانەی یەكـدین، یەكـیان تونـدیان دەكاتـەوەو یـەكیان شـلـیان دەكاتـەوە، ئـنجـا لـە كاتێكـدا ئینسـان ئـاوی دێتـەوەو ئیحتیلامـی دەبـێ، یـان جیمـاع دەكـات، هاوسـەنگی نێـوان ئـەو دوو دەزگایـە تێكدەچێ، كە ئینسـان هەسـتیش دەكات لەشـی گـران‌و سـسـت دەبـێ، ئـنجا بـە هـۆی خۆشۆردنەوە ئەو حاڵەتە هاوسـەنگییە بۆ جەسـتەی دەگەڕێتـەوە، لێرەدا با شـتێكی خۆشتان بۆ بگـێڕمەوە:

دەگێڕنــەوە ڕۆژێـك مەلایـەكی كـوردەواریی خۆمـان لەگـەڵ كەسـێكی نەصـرانیی (فەلـە)، دەبێتە موناقەشـەیان، (فەلە بڕوایـان بە خۆشـۆردن نیـەو دوای جیمـاع بـە فـەرزی نـازانن، كـە ئێسـتا لـە ڕووی پزیشـكییەوە سـەلـمێنراوە ئـەوە پێویسـتـە، چونكـە كاریگـەریی لەسـەر هـەموو جەسـتە هەیـە)، نەصـرانییەكە گوتـی: باشــە ئێوەی مسـوڵمان دەڵێن: ئەگەر پیاو لەگەڵ خێزانی جووت بوو، دەبێ هەموو بـەدەنی بشـوا؟ مـەلاش دەڵـێ: بەڵـێ، فەلەكـەش دەڵـێ: جا ئـەوە غەڵەتــە، مـەلاش دەڵـێ: بۆچـی؟ فەلـە دەڵـێ: تـۆ بـارە خەیارێكـت پێیـە، خـەیارێكت لـێ دەكەوێتــە نێـو قــوڕێ، ئایـا هــەموو بـارە خەیارەكـە دەشــۆی، یـان هـەر ئـەو خـەیارە دەشـۆی كـە كەوتۆتــە نێـو قــوڕ؟ مـەلا گـوتی: هـەر ئـەوەیان دەشـۆم كـە كەوتۆتـە نێـو قـوڕێ، فەلەكـە گوتی: ئەدی بۆچی لە حـاڵەتی جیماعكردنـدا تەنیـا ئەنـدامی پـیس بـوون ناشـۆرێ‌و هــەموو جەسـتەت دەشۆی؟

مەلا گوتـی: كاكـی فەلە تێینەگەیشـتووی، گـوتی: بۆچـی؟ گـوتی: ئایـا ئـەو خـەیارە لـەو بـارە جیـادەبێتــەوە، گوتــی: بەڵــێ، گـوتی: ئـەدی كـە جیمـاعـێ دەكـەی ئـەو ئەندامەت لـە خـۆت جیادەكــەیەوە، یـان هـەر پێتەوەیــە؟ گوتــی: هــەر پێمەوەیــە، گوتـی: كەواتــە: دەبـێ جەسـتەت هەموو بشـۆی!!

ئـنجا لەڕاسـتیدا جیماعـكردن لـە ڕووی پزیشـكییشــەوە كاریگـەریی لەسـەر هـەموو بـەدەن هەیــە، بۆیە پێویسـتـە هەموو بەدەن ئاوی پـێ بكەوێ‌و بشـۆرێ، ئـنجا دیـارە

لە ڕووی مەعنەوییشەوە، ڕووحو جەستەی ئینسان بە خۆشۆردن، هۆشیاریی و چالاکیی، وە نەهێشتنی تەنبەڵیی و سستیی بۆ فەراهەم دێنێ، ئنجا یەکێ بۆی هەیە بپرسێ: باشە ئەوە خۆشۆردن بە ئاو حیکمەتەکەی دیارە، بەڵام ئەدی تەیەممومّ؟

**تەیەممووم:**

دەڵێین: لەڕاستیدا گڵ، یان ڕووی زەوی زۆرجار میکرۆب و شتی زیانبەخش لە بەین دەبات، زانایان دەڵێن خوای کاربەجێ چوار پێنج پاککەرەوەی داناون لەسەر زەوی بۆ نەهێشتنی بۆنی ناخۆش و میکرۆبات و ئەوانە:

١/ گڵ، ڕووی زەوی کە کارلێکی لەگەڵ دەکات، ئەو هەموو کەلاکە تۆپیوو شتە پیسانە دوای ماوەیەك تەماشا دەکەی نامێنن، واتە: هەر ڕووی زەوی بۆ خۆی شت پاك دەکاتەوە.

٢/ با، کە پیسیی و بۆگەنیی ڕا دەماڵێ.

٣/ تیشکی خۆر.

٤/ ئاو (باران و بەفر و تەرزە و ڕووبار و کانیاو).

ئەوانە هەموویان پاککەرەوەن، وە لە ڕووی دەروونییشەوە بە تەئکید مرۆڤ کە هەست دەکات شەرع وای داناوە کە دەست بە ڕووی زەویدا بێنێ لەجیاتی دەستنوێژ بۆی دروستە، هەست دەکات کە پاکە، وە لە خزمەت خوادا بە پاکیی ڕاوەستاوە.

**مەسەلەی شازدەیەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَا﴾، واتە: چاکەی خوا یاد بکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، وە ئەو پەیمانە پتەوەی لەگەڵیدا بەستن، کاتێك کە گوتتان بیستمان و فەرمان بەرین، لێرەدا خوا بە ئێمە دەفەرموێ: چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، نافەرموێ کام چاکە، کە بێگومان ئیسلام گەورەترین نیعمەت و چاکەیە، هەروەها لەش ساغیی چاکەیە،ماڵی حەڵاڵ چاکەیە، ماڵ و منداڵی حەڵاڵ و هێمنیی و ئاسایش و ئازادیی و ئەو هەموو بژێوو

ڕۆژییانە، هەموو ئەوانە چاکەن‌و هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، ﴿وَمِيثَـٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم بِهِۦٓ﴾، وە ئەو پەیمانە پتەوەی کە لەگەڵی بەستن، (المیثاق: عَهْدٌ مُؤكَّدٌ بيَمينٍ) پەیمانێکە بە سوێند لەسەر خواردن، یان بەدەست لە دەستی یەکدی نان، تەئکیدی لەسەر کرابێتەوە، ئایا ئەو پەیمانە چییە؟ زانایان سێ چوار ئیحتیمالیان بۆ داناون:

١- هەندێکیان دەڵێن: مەبەست پێی پەیمانی دووەمی (عَقَبَة)یە، کە پێغەمبەر ﷺ پەیمانی لە هاوەڵانی بەرێزی وەرگرت کە حەفتاو پێنج کەس بوون، حەفتاو سێ پیاوو دوو ئافرەت، کە پەیمانەکە وەك لە سیرەی (ابْنُ هِشَام)[1] دا هاتوە، هەروەها لە (البداية والنهاية)ی (إبن كثير)[2]، وە (إمام أحمد) هێناویەتی، وە (حاكم وإبن حبان) بە صەحیحیان داناوە، ئاوایە: ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللّه رَضِيَ اللّهُ عَنْهُمَا فَقُلْنَا: يَا رَسُولَ اللّهِ! نُبَايِعُكَ، قَالَ: تُبَايِعُونِي عَلَى السَّمْعِ وَالطَّاعَةِ فِي النَّشَاطِ وَالْكَسَلِ، وَالنَّفَقَةِ فِي الْعُسْرِ وَالْيُسْرِ، وَعَلَى الأَمْرِ بِالْمَعْرُوفِ وَالنَّهْيِ عَنِ الْمُنْكَرِ، وَأَنْ تَقُولُوا فِي اللّهِ لا تَخَافُونَ فِي اللّهِ لَوْمَةَ لائِمٍ، وَعَلَى أَنْ تَنْصُرُونِي فَتَمْنَعُونِي إِذَا قَدِمْتُ عَلَيْكُمْ مِمَّا تَمْنَعُونَ مِنْهُ أَنْفُسَكُمْ وَأَزْوَاجَكُمْ وَأَبْنَاءَكُمْ وَلَكُم الْجَنَّةُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (١٤٤٩٦)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٧٠١٢) وَصَحَّحَهُ كُلٌ مِن شعيب الأرنؤوط والألباني}، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە (کە پەیمانی دووەمی عەقەبە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بەسترا، حەفتاو پێنج لە پشتیوانەکان هاتن، لە ئەوس‌و خەزرەج حەفتاو سێ پیاو لەگەڵ دوو ئافرەت، بەم شێوەیە پەیمانیان بەست)، دەڵێ: گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! لەسەر چی پەیمانت لەگەڵ ببەستین؟ (مسوڵمان بووین، بەڵام لەسەر چی پەیمانت لەگەڵ دەبەستین، واتە: وەك سەرۆك وڵاتێك، بەرپرسێك، خاوەن دەستەڵاتێك) فەرمووی: پەیمانم لەگەڵ ببەستن کە گوێم بۆ بگرن‌و بە قسەم بکەن، لە کاتێکدا کە لە قالبتان خۆشەو لە کاتێکدا

---

١) ج٢، ص٢٢٨، ط دار ابن الهيثم.

٢) ج٣، ص.٢٨٤

کە لە قالبتان ناخۆشە، (واتە: لە کاتی چالاکیی‌و لە کاتی تەنبەڵیی دا)، وە لەسەر ئەوە کە ماڵی خۆتان ببەخشن لە کاتی سەغڵەتیی‌و لە کاتی ئاساییدا، (واتە: کاتێك کە تەنگ دەستن‌و لە کاتێکدا کە دەوڵەمەندن)، وە پەیمانم لەگەڵ ببەستن لەسەر فەرمان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، وە لەسەر ئەوە کە لە پێناوی خوادا قسەی هەق بکەن‌و لە لۆمەی لۆمەکاران نەترسێن، وە لەسەر ئەوە کە پشتم بگرن‌و سەرم بخەن، هەرکاتێك هاتم بۆ نێوتان {(واتە: هاتم بۆ شاری (یثرب) کە دوایی ناوی گۆڕدرا بۆ (مەدینە)} مِن بپارێزن لە هەر شتێك کە خۆتان‌و ماڵ‌و منداڵەکانتانی لێ دەپارێزن، پشتم بگرن‌و بەرگرییم لێ بکەن، وە بەهەشتتان هەبێ لە بەرانبەردا.

٢- وە هەندێك دەڵێن: مەبەست پێی ئەو پەیمانەیە کە لە ژێر درەختێکدا بەسترا، بە ناوی (شجرة الرضوان) کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿١٨﴾﴾ الفتح، پەیمانی عەقەبەش لە ساڵی سێزدە (١٣)ی پێغەمبەرایەتی دا بوو، بەڵام پەیمانی (رضوان) لە ساڵی شەشەمی کۆچییدا لە حودەیبییەدا بوو، دوای ئەوەی کە کافرەکان ڕێیان لە پێغەمبەر ﷺ‌و هاوەڵان گرت، پێغەمبەری خوا دووری هەزارو چوارسەد (١٤٠٠) جەنگاوەری لە خزمەت دابوون، بانگی کردن وەرن، پەیمانم لەگەڵ تازە بکەنەوە[1]، جا بۆیە لێرەوە دەبێ بزانین بەیعەت کردن تەنیا بۆ مسوڵمان بوون نەبووە، چونکە ئەوانە هەموو مسوڵمان بوون، چ ئەوانەی پەیمانی (عەقەبە)یان بەستوە، چ ئەوانەی پەیمانی (رضوان)یان بەستوە، بەڵام پەیمان دان بۆ تەئکیدکردنەوەی ئەوەیە کە تۆ بە قسەی ئەو بەرپرسەی خۆت دەکەی، جا خوا لە ئایەتی ژمارە (١٨)ی سووڕەتی (الفتح)دا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ رَضِىَ ٱللَّهُ عَنِ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ يُبَايِعُونَكَ تَحْتَ ٱلشَّجَرَةِ فَعَلِمَ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَنزَلَ ٱلسَّكِينَةَ عَلَيْهِمْ وَأَثَٰبَهُمْ فَتْحًا قَرِيبًا﴾،

---

٢) بڕوانە: السیرة النبویة لابن هشام، ج ٣، ص ١٦٢- ١٧٢.

واتــە: خــوا ڕازی بــوو لــەو ئیمانداراناـەی کــە پــەیمانت لەگـەڵ دەبەسـتن لـە ژێـر درەختەکەدا، (خوا) زانی چییان لە دڵدایە، ئارامیی ڕژاندە سەریان.

٣- وە هەندێك دەڵێن: مەبەسـت پێـی ئەو پەیمانەیە کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾﴾ الأعـراف، واتە: وە یاد بکـەوە کاتێك پـەروەردگارت وەچـەی ئـادەمی لـە پشتی لـە ئادەم وەرگـرت، وە پێی فەرموون: ئایا من پەروەردگارتان نیم؟ گوتیـان: با، واتـە: بەسـەر خۆیانەوە کردنی بە شایەد، هەندێك دەڵێن: مەبەست پێی ئەو پەیمانەیە

٤- وە هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی ئەو بەڵگـە عەقـڵییو شـەرعییانەن کە بەڵگەن لەسەر یەکـتایی خـواو، لەسەر ڕاسـتیی ئیسـلامو، ڕاسـتیی پێغەمبەرو ﷺ تا کـۆتایی، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿قُلِ ٱنظُرُوا۟ مَاذَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ وَمَا تُغْنِى ٱلْـَٔايَـٰتُ وَٱلنُّذُرُ عَن قَوْمٍ لَّا يُؤْمِنُونَ ﴿١٠١﴾﴾ یونـس، واتـە: بڵـێ: تەماشای ئاسـمانەکانو زەوی بکـەن، بـەڵام نیشـانەکانو ترسـاندنەکان (ئاگـادار کردنەوەکان) چ سـوودیان هەیـە بۆ کەسـانێك کە ئیمان نـاهێنن.

بـەڵام مـن ئـەو ڕایـەم پـێ ڕاسـتە کە لێرەدا مەبەست لـەو پەیمانە ئەوەیە کە هـەموو ئیمانـدارێك پـەیمانی لەگـەڵ خـوادا هـەیـە، لـەو ڕۆژەوە کـە تـۆ دەڵـێی: (أَشْـهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللهُ ، وَأَشْـهَدُ أَنَّ مُحَمَّـدًا رَسُـولُ اللهِ) پـەیمان لەگـەڵ خـوادا دەبەسـتی، کـە بێجگـە لـە خـوا کـەس بـە پەرسـتراو نەزانـی، وە بێجگـە لـە موحەممـەد ﷺ کەس بە ڕابەرو پێشەواو سـەر مەشـقی ڕەهـای خـۆت نـەزانیو، بـە دوای پێغەمبـەری خـوا بکـەویو بـە ڕێـی ئـەودا بـڕۆی، کـە ئەویـش بـە ڕێـی قورئـاندا دەڕوات، هـەموو ئیمانـدارێك پەیمـانی لەگـەڵ خـوادا هەیـە، واتـە: مەبەسـت پێـی ئـەو پەیمانەیـە، بۆیـەش وادەڵێم، چونکە خـوای پـەروەردگار لێـرەدا بەگشـتی دەفـەرموێ: ﴿وَٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَـٰقَهُ ٱلَّذِى وَاثَقَكُم

﴿بِهِۦٓ إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ﴾، وە لەگـەڵ هەمووماندیەتی، ئنجا ئەگەر بـەپێی ڕای یەکـەم بـێ، (پـەیمانی عەقەبـە) تـەنیا حـەفتاو پێـنج هاوەڵەکـەی گرتۆتـەوە، کـە ئەوکـاتە[1] ڕەنگە ژمارەیەکیشیان لێ شـەهید بـووبن! وە ئەگــەر مەبەسـت ئـەوەی ژێـر درەختــی (رضوان) بـێ، تـەنیا هــەزارو چوار سـەد کـەس دەگرێتـەوە، ئـەدی بڕوادارانی دیکـە؟ ئنجـا کـە دەفەرموێ: خوا کاتێك کـە وەچـەی ئـادەمی لـە پشـتی ئادەم وەرگرت؟! ئێمە دەڵێین: ئـەو تەعبیـرە زیاتر مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە خـوا ئینسـانەکانی وا خوڵقـاندوە وەك بڵـێی پەیمانـی لـێ وەرگرتبـن، ئەگــەرنا کــەس ئەو پەیمـانەی نایەتـەوە بیـر، کەس دێتــەوە بیری ئـەو ڕۆژەی کـە خـوای باڵادەست قسـەی لەگەڵ ڕووحی ئێمە کردبـێ؟ کـەس نایەتـەوە بیـری، کەواتــە: لێــرەدا وەك هــەندێك لـە زانایــان دەڵێن مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە خـوا ئینسـانی وا دروست کردوە، وەك پەیمانی لـێ وەرگرتبـێ، کـە تـەنیا خــوا (اللّٰه) بـە پەروەردگـاری خـۆی بزانـێ، چونکە لەسەر ئـەو فیطـرەتـە خوڵقاندوویـەتی، کەواتـە: مەبەسـت لـەوە کـە ئیمانداران پـەیمانیان لەگـەڵ خوادا هەیـە، ئەوەیە کە تەنیـا ئەو پەرسـتــراویان بــێ، پەروەردگاریان بێ، دانـەری بەرنامـەی ژیـانیان بـێ، وە تەنیـا موحەممـەد ﷺ کـە ڕەوانەکـراوی ئـەوە سـەرمەشـقی ژیـانیـان بـێ.

**مەسـەلەی حەڤدەیـەمو کۆتـایی:** کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ﴾، بێگومـان خـوا بـە خــاوەنی سـینەکان، ئاگـادارە، زانــایە، خـاوەنی سـینەکان خـۆی مەبەسـت پـێ نهێنییـەکانی نێـو سـینەکانن، بـەڵام بۆچـی دەفـەرموێ: (ذات الصُـدُور) (ذات) یـانی: (صـاحب)، خـاوەن سـینەکان، وەك بڵـێی نهێنییـەکان بووبنـە خـاوەنی ئەو سـینانە، خـوا ﷻ دەفەرموێ: من بە نێو دڵێشـتان، بە نێو سینەکانیشـتان زاناو ئاگادارم، کەواتـە: فێـڵ لە خـوا ناکرێ، ڕاستو ساغ بن، لەگـەڵ خوای خۆتـاندا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) واتە: کاتی دابەزینی سوورەتی (المائدة) کە ئەو ئایەتەی تێدایە.

# دەرسی سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا ئایەتەكانی: (٨، ٩، ١٠، ١١) دەتوێژینەوەو تەفسیر دەكەین، كە خوا ﷻ بۆ جاری چوارەمو پێنجەم لەم سوورەتەدا بە نازناوی ئیمان ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، مسوڵمانان دەدوێنێ، وە سەرەتا فەرمانیان پێدەكات بە ڕاوەستان بۆ خوا، وە شایەدیی دان بە دادگەریی، وە وریا بوون لەوەی كە لە كاردانەوەی خراپەی خەڵكی نامسوڵماناندا لە دادگەریی لابدەن، وە فەرمان پێكردنیان بە پارێزكاریی.

پاشان باسی بەڵێنی خۆی دەكات بۆ ئەو ئیماندارانەی كردەوەی باش ئەنجام دەدەنو ئیمانیان هەیە، كە لێبوردنێكو پاداشتێكی مەزنیان بداتێ، هەروەها هەڕەشەی خۆیشی بۆ بێبڕوایان دەخاتەڕوو، كە ببنە هاوەڵو خاوەنی دۆزەخ، ئنجا بۆ جاری پێنجەم بانگی مسوڵمانان دەكاتو بە نازناوی ئیمان ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، دەیاندوێنێ، پێیان دەفەرموێ: كە یادی چاكەی خوا بكەنەوە، كە لە شەڕو زیانی ناحەزانیان پاراستوونی، وە فەرمانیان پێدەكات بە پارێزكردن، وە تەنیا پشت بە خوا بەستن.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ
شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ
خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِۙ
لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٩﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُوْلَـٰٓئِكَ
أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٠﴾ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ
إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْۖ وَٱتَّقُواْ
ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی ئەوانەی بڕواتـان هێنـاوە! بـە تەواویـی بـۆ خـوا لەسـەر هـەق ڕاوەسـتاوبن، وە شـایەدیی بــە دادگەرانــە بــدەن، وە بــا ڕق لێبوونــەوەتان لــە کۆمەڵــێك پەلکێشــی نادادگەرییتـان نـەکات، دادگـەربن، ئـەوە لـە پارێزکارییـەوە نـزیکتـرە، وە پـارێز لـە خـوا بکــەن، بێگومــان خـــوا بــەوەی دەیکــەن شــارەزایە، ⁽٨⁾ خــوا بەڵــێنی لــێبوردنو پاداشـتێکی مـەزنی بـەو کەسانە داوە کە ئیمانیـان هێنـاوەو، کـردەوە باشـەکان ئەنجـام دەدەن ⁽٩⁾ وە ئەو کەسانەی بێـبڕوان‌و ئایەتـەکانمانیان بـە درۆ دانـاوە، ئەوانـە خـاوەنی (یـان هاوەڵـی) کڵـپەی ئاگری دۆزەخـن ⁽١٠⁾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێنـاوە! یـادی چاکەی خوا بەسەر خۆتـانەوە بکەنـەوە، کاتێـك کۆمـەڵێك ویسـتیان دەسـتتان بـۆ درێـژ بکــەن، ئـەویش (واتـە: خـــوا) دەسـتیانی لێتـان گێڕایــەوە، وە پـارێز لـە خـوا بکــەن، وە بـا بڕواداران تەنیـا پشـت بە خوا ببەسـتن ⁽١١⁾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ): واتە: زۆر بۆ خوا ڕابوەستن، لەسەر ڕێی ڕاست بوەستن، یاخود لەسەر هەق بوەستن، جا وشەی: (قَوَّام) صیغە موبالەغەی (قائم)ە، (قائم) واتە: ڕاوەستاو، (قَوَّام) واتە: زۆر ڕاوەستاو لەسەر هەق، دەڵێ: (قِیام بِالشَّخْص إمَّا بتسخیر أو اختیار، وَقِیَام للشيء هُوَ المُرَاعَاةُ للشيءِ والحِفظ لَهُ)، (قِیام) لە زمانی عەرەبی بە چەند شێوەیەكە، دەگوترێ: (قِیام بِالشَّخْص) واتە: كەسێك بە هۆی كەسێكەوە ڕابوەستێ، (وَقِیَام للشيء) ڕاوەستان بۆ شتێك كە بریتیە لە ڕەچاوكردنی و پارێزكاریی لێكردنی كە دەفەرموێ: ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ﴾، واتە: بۆ خواو لەبەر ڕەچاوكردنی شەریعەتی خوا ڕابوەستن لەسەر ڕاستە شەقامی خوا، واتە: لەسەر هەق.

(وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ): واتە: با واتان لێنەكاتو پەلكێشتان نەكات، لە قورئاندا لە چەند شوێنێك ئەم وشەیە هاتوە، (أَجْرَمَ، أي: سَارَ ذا جُرمِ) وەك: (أَثْمَرَ وأَلْبَنَ)، (أَثْمَرَ) واتە: میوەی دەركرد، (أَلْبَنَ) واتە: شیری پەیداكرد، دەگوترێ: (أَلْبَنَتِ البقرة) واتە: مانگایەكە شیری پەیداكرد لە گوانیدا، وە (أَجْرَمَ) واتە: جورمی پەیداكرد، ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ﴾، واتە: با پەلكێشتان نەكات بۆ گوناحو خراپە، وە وشەی (إِجْرَام) هەرچەندە لە بنەڕەتدا بۆ هەر جۆرە كردەوەو بە دەستهێنانێك بەكاردێ، بەلام بە زۆریی بۆ بەكارهێنانی كردەوەی خراپ بەكاردێ، بۆیە وشەی (مُجْرِم)یش واتە: كەسێك كە خراپەو تاوانێك دەكات.

(ٱلۡجَحِيمِ): (الجَحْمَة: شِدَّةُ تأجُّجِ النَّارِ، وَمِنْهُ الجَحِيم)، (الجَحمَة) بە كڵپەی سەوزی ئاگر دەگوترێ، كە ئاگر زۆر كڵپە دەسێنێ سەوز دەبێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (جَحمَةُ النَّار)، ئاگری دۆزەخ بۆ پێی دەگوترێ (جَحِيم)؟ چونكە ئاگرەكەی زۆر كڵپە سەندوو بەهێزە.

(أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ): واتە: دەستتان بۆ درێژ بکەن، چونکە دەڵێ: (البَسْطُ: النَّشْرُ، وبَسْطُ اليَدِ: مَدُّها)، (بَسْط) واتە: بڵاوکردنەوەو فراوانکردن، وە (بَسْطُ اليَدِ) واتە: دەستدرێژکردن.

(فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ): دەستیانی لێتان گێڕایەوە، دەڵێ: (الكَف) لە ئەسڵدا بە لەپە دەست دەگوترێ، (وَتُعورِفَ الكَفُّ بِالدَّفْعِ عَلَى أَيِّ وَجْهٍ كَانَ بِالْكَفِّ كَانَ أَوْ غَيرِها) وشەی: (كَف) لە بنەڕەتدا بە لەپە دەست دەگوترێ، بەڵام دوایی لە زمانی عەرەبیدا بەکاریان هێناوە بۆ گێڕانەوەی شتێك، (كَفَّهُ) واتە: (دفعهُ) واتە: گێڕایەوە، جا چ بە دەست بیگێڕێتەوە، چ بە لاق بیگێڕێتەوە، بە هەر شتێك بیگێڕێتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئینسان بە زۆری بە لەپە دەست شت دەگێڕێتەوە، بۆیە وشەی (كَف) واتە: (دفع)، (كَففتهُ، دفعتهُ) واتە: گێڕامەوە.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

١) هۆی هاتنه خوارەوەی ئەم ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾ ﴾:

﴿قَالَ الطَّبَرِيّ: نَزَلَتْ فِي يَهُودِ خَيْبَر، أَرَادُوا قَتْلَ النَّبِيِّ ﷺ، وَقَالَ إِبْنُ جُرَيج، قَالَ عَبْدُاللهِ بْنُ كَثير: ذَهَبَ رَسُولُ اللهِ ﷺ إِلَى يَهُود يَسْتَعِينهُمْ فِي دِيَّةٍ، فَهَمُّوا أَنْ يَقْتلُوهُ، فَذَلِكَ قَوْلُهُ: ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْۚ ٱعْدِلُواْ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴾﴾[1]،

واتە: تەبەریی دەڵێ: دەربارەی جوولەکەکانی خەیبەر هاتە خوار، کاتێك ویستیان پێغەمبەر ﷺ بکوژن، وە ئیبنو جورەیج (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی کەثیر گوتوویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ چووە بۆ لای جوولەکەکان داوای لێکردوون لە خوێنێکدا بەشداریی بکەن (خوێنێك کەوتۆتە سەر مسوڵمانان، دیارە ئەو کاتیش مسوڵمانان پەیمانیان لەگەڵ جوولەکەکانی مەدینەدا هەبوو بە (صحیفة)ی مەدینە کە دەبووایە هاوکاری یەکدی بن، چووە داوای هاوکاریی و یارمەتی لێکردوون لەو خوێن دانە، ئەوانیش ویستیان بیکوژن) ئنجا کە مسوڵمانان ئەو نیەتە خراپەی جوولەکەیان بۆ ئاشکرابوو، ویستیان تۆڵە لە جوولەکەکان بستێننەوە، خوای دادگەریش ئەم ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ... ﴾، واتە: با ڕق هەڵسانتان لە کۆمەڵێك واتان لێنەکات نادادگەریی بکەن، بەڵێ ئەوان کە ویستوویانە پێغەمبەری خوا ﷺ بکوژن، خراپەیان کردوە، بەڵام ئەوە پاساوی ئەوەنییە ئێوەش بێن بیانکوژن، بەڵکو دەبێ سزای دیکە بدرێن، ئەگەرنا لەسەر ئەوە کە بە تەمای

---

١) جامع البيان، ج٦، ص١٥٦، برقم: (١١٤٧٨).

گوناهێك بوون‌و بۆیان نەکرا، ئەوە نابێ تۆڵەی ئەو گوناهەیان لێ بسەندرێتەوە کە نەیانتوانیوە بیکەن، ئایا ئەگەر کەسێك ویستی کەسێك بکوژێ، دروستە تۆ بچی بیکوژی؟ نەخێر، بەڵام ئایا ناگونجێ هیچ جۆرە سزایەکی بدەی؟ با، بەڵام لەسەر ئەو کارە تۆڵە (قصاص)ی لەسەر پێویست نابێ.

٢) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییە کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ ۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾ ﴾:

أ- ﴿عَنْ يَزِيدِ بْنِ أَبي زِيَادٍ، قَالَ: أَنَّ النَّبيّ ﷺ خَرَجَ وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَر وَعُثْمَان وَعَلِيّ وَطَلْحَة وَعَبْدُالرَّحْمَن بْن عَوف رَضِي الله عَنْهُمْ، حَتَّى دَخَلُوا عَلى كَعْبِ بْنِ الأَشْرَف وَيَهُود بَنِي النَّضِير يَسْتَعِينُهُم فِي عَقْلِ أَصَابَهُ، فَقَالوا: نَعَمْ، اجْلِس حَتَّى نُطْعِمُكَ وَنُعْطِيكَ الَّذِي تَسْأَلُنَا، فَجَلَسَ، فَقَالَ حُيي بْنُ أَخْطَب لأَصْحَابِهِ: وَلا تَرَونَهُ أَقْرَب مِنْهُ الآنَ، اطْرَحُوا عَلَيْهِ حِجَارَةً فَاقْتُلُوهُ وَلا تَرَونَ شَرًا أَبَدًا، فَجَاءوا إِلى رَحًى عَظِيمَة لِيَطرحوها عَلَيْهِ، فَأَمْسَكَ اللهُ عَنْهَا أَيْدِيهِم حَتَّى جَاءَهُ جِبرِيل فَأَقَامَهُ مِنْ ثَمَّ، فَأَنْزَلَ اللهُ جَلَّ وَعَزَّ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ ﴾﴾[1]، واتە:

یەزیدی کوڕی ئەبی زیاد دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ چوو بۆ لای جوولەکەکان، ئەبو بەکرو عومەرو عوسمان‌و عەلی‌و طەڵحەو عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف خوا لێیان ڕازی بێ لە خزمەتی دابوون، هەتا چوونە لای کەعبی کوڕی ئەشرەف (کە سەرۆکی جوولەکەکانی خەیبەرو بەنی "قریظة" بوو)، وە یەهوودی بەنی نەضیر، پێغەمبەری خوا ﷺ داوای هاوکاریی‌و یارمەتی لێکردن بۆ خوێنێك کە کەوتبووە سەریان، (عقل‌و دیة - بە واتای خوێنبایی دێ)، جوولەکەکانیش گوتیان: بەڵێ، دانیشە، بۆئەوەی خواردنیشت بدەینێ‌و ئەوەی داواشت کردوە پێت بدەین، پێغەمبەری خوا ﷺ دانیشت، (حُيي بْنُ أَخْطَب) بە هاوەڵەکانی خۆی گوت: هیچ

---

١) جامع البيان برقم: (١١٤٨٢)، ولباب النقول في الأسباب النزول للسيوطي، برقم: (٣٩٢).

کاتێك لە ئێستا نزیکتر چنگتان ناکەوێ، (واتە: لەبەر دەستتانە) بەردێکی بەسەردا بدەن‌و بیکوژن، وە لە دوای وی هەرگیز تووشی خراپە نابنەوە، (یانی: ئەگەر موحەممەد لە کۆڵ خۆتان بکەنەوە، تازە بۆخۆتان دەکەونە خێرو خۆشیی)، ئەوانیش چوون بەرداشێکی زۆر گەورە لەوێ بوو، چوون بیهێنن‌و خلۆری بکەنەوە بەسەر پێغەمبەری خوادا ﷺ، (دیارە پێغەمبەر ﷺ لە بن دیوارێك دانیشتوە لە شوێنێك کە دووقات بووە، یان سەربانێکی بەرزی هەبووە) ئیدی خوا دەستی گرتن، وە نەیانتوانی بەرداشەکەی بەسەردا بەردەنەوە، جبریلیش هاتو لەوێ هەڵیساندو هەواڵی پێدا کە ئەوان بە تەمای پیلانێکی ئاوان، جا بەوبۆنەوە خوا (جَلَّ وَعَزَّ) ئەو ئایەتەی ناردە خوار: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ ﴾.

یەکێك بۆی هەیە بڵێ: مادام ئەو جوولەکانە بە تەمابوون دەستدرێژیی بکەنە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ: ئەی ئیماندارینە؟! وەڵامەکەی ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەری هەموو ئیماندارانە، خوا کە پێغەمبەرەکەی خۆی پاراستوە، وەك ئەوەیە هەموو ئیماندارانی پاراستبن، ئەگەر خوانەخواستە ئەو زیانی هێنابا، هەموو ئیمانداران زەرەریان دەکرد، وە هەموو ئیماندارانیش دەبێ پێغەمبەریان لە خۆیان خۆشتر بووێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوۡلَىٰ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ مِنۡ أَنفُسِهِمۡۖ ...﴿٦﴾ ﴾الأحزاب، واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیمانداران لە نەفسی خۆیان لە پێشترە، واتە: دەبێ لە خۆیانیان خۆشتر بوێ.

ب- هەروەها هەر لەوبارەوە ئەو بەسەرهاتەش گێڕدراوەتەوە، کە دەشگونجێ هەردووکیان مەبەست بن، چونکە جاری وایە دوو سێ ڕووداو ڕوویان داوە، ئایەتێك هاتۆتە خوارێ هەم ئەو ڕووداوەی پێ مەبەستە، هەم ئەو ڕووداوەشی پێ مەبەستە، وە هەم ئەوی دیکەشی پێ مەبەست بووە، ئەمەش دەقی بەسەرهاتەکەیە: ﴿عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ أَنَّ جَابِرَ بْنَ عَبْدِ اللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَخْبَرَ أَنَّهُ غَزَا مَعَ رَسُولِ اللهِ ﷺ قِبَلَ نَجْدٍ فَلَمَّا قَفَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ قَفَلَ مَعَهُ فَأَدْرَكَتْهُمْ الْقَائِلَةُ فِي وَادٍ كَثِيرِ الْعِضَاهِ، فَنَزَلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ وَتَفَرَّقَ النَّاسُ

يَسْتَظِلُّونَ بِالشَّجَرِ فَنَزَلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ تَحْتَ سَمُرَةٍ وَعَلَّقَ بِهَا سَيْفَهُ، وَنِمْنَا نَوْمَةً فَإِذَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْعُونَا وَإِذَا عِنْدَهُ أَعْرَابِيٌّ، فَقَالَ: إِنَّ هَذَا اخْتَرَطَ عَلَيَّ سَيْفِي، وَأَنَا نَائِمٌ فَاسْتَيْقَظْتُ وَهُوَ فِي يَدِهِ صَلْتاً فَقَالَ: مَنْ يَمْنَعُكَ مِنِّي؟ فَقُلْتُ: اللَّهُ ثَلاثًا، وَلَمْ يُعَاقِبْهُ وَجَلَسَ﴾[1]، واتە: جابیری کوڕی عەبدوڵلا خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو نەجد بۆ جەنگ چووین، (نەجد: واتە: سەرەوەی ڕۆژهەڵاتی نیوە دوورگەی عەرەبیی) کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ گەڕایەوە لەو جەنگە جابیریش لەگەڵی گەڕاوەتەوە، کاتی نووستنی نیوەڕۆ بوو، لە شوێنێك کە دارو درەختی زۆر بوو، (جەنگەڵستانێك بوو، بۆئەوەی هەر کەسێك بچێتە ژێر سێبەری دارێك ئیسراحەت بکات) پێغەمبەری خوا ﷺ لە ژێر سێبەری درەختێکدا دابەزی و شمشێرەکەشی بە یەکێك لە لقەکانی درەختەکە هەڵواسی، جا دەڵێ: تۆزێك خەوتین و سەرخەوێکمان شکاند، هەر ئەوەندەمان زانی پێغەمبەری خوا ﷺ وا بانگمان دەکات، (ئێمەش چووینە خزمەتی) دیتمان عەرەبێکی دەشتەکیی، (خێڵەکیی) لە لای دانیشتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو کابرایە شمشێرەکەمی هەڵکێشا، منیش خەوتبووم، کە بەئاگا هاتم شمشێرەکەی بە ڕووتی لەدەستدا بوو، (صَلْتاً: واتە: لە کالان دەری هێنابوو) سێ جاران پێی گوتم: کێ لە من دەتپارێزێ؟ گوتم: خوا، (دیارە لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا دەڵێ: شمشێرەکەی لەدەست کەوتە خوارەوە، وە لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا دەڵێ: هەرچەندە ویستوویەتی دەستی لێ بوەشێنێ، دەستی ڕەق بووەو نەیتوانیوە)، ئەوە لێرە دانیشتوە، پێغەمبەری خواش ﷺ سزای نەدا، (لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە دوایی پێغەمبەری خوا ﷺ شمشێرەکەی لە دەست دەرهێناو فەرمووی: ئەدی کێ تۆ لە من دەپارێزێ؟ ئەویش گوتوویەتی: تۆ باشترین کەسێك بە کە شمشێری بە دەستەوەیە) واتە: مەیوەشێنەوە! ئیدی سزای نەدا، جا لەوبارەوە خوا ﷻ ئەم ئایەتەی ناردۆتە خوارێ کە دەفەرموێ: ئەی بڕواداریـنە! یادی چاکەی خوا بکەنەوە لەسەر خۆتان، کە کەسانێك ویستیان دەستدرێژیی بکەنە سەرتان، بەڵام خوا دەستی ئەوانی لە ئێوە گێڕایەوە.

١) مُتَّفَقٌ عَلَيهِ: الْبُخَارِيُّ برقم: (٤١٣٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٩٤٦).

## مانـای گشـتـی ئایەتەکـان

وەك پێشتر باسمان کردوە لەم سوورەتە موبارەکەدا شازدە جار خوای پەروەردگار ڕستەی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ی، دووبارە کردۆتەوە، وە جا ئەمجارە لە ئایەتی هەشتەم دایەو، جاری چوارەمینە لەم سوورەتەدا ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، دووبارە دەبێتەوە، دیارە ئێمە باسمان کرد کە ئەم سوورەتە زۆر باسی پەیمانو گرێبەستو بەڵێن دەکات، لێرەدا خوا ﷻ دوای ئەوەی کە لە ئایەتەکانی ڕابردوودا باسی چەند یاسایەکی شەرعیی کرد، وە پاشان باسی دەستدرێژیی کرد، وە باسی خۆشۆردنی کرد، وە باسی تەیەمومی کرد بۆ ئەو کەسانەی کە ئاویان دەستناکەوێ، ئنجا باسی ئەو پەیمانەی کرد، کە ئیمانداران بیهێننەوە بیر خۆیان، کە خوا لەگەڵیدا بەستوون بە حوکمی ئیمانەکەیان، هەموو ئیمانداریك پەیمانی لەگەڵ خوا بەستوە کە بەندەی خوا بێ، ئنجا خوا ﷻ بۆ جاری چوارەم دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بۆ خوا زۆر باش بوەستن، وە بە دادگەریی شایەدیی بدەن، لە سوورەتی (النساء)یش بە شێوەیەکی دیکە ئەم ئایەتە هاتوە، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ ... ﴿١٣٥﴾﴾، لێرەش دەفەرموێ: ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِ ﴾، زۆر بە دادگەریی هەڵسن، لەبەر خوا شایەدیی بدەن، لێرەدا دەفەرموێ: زۆر بۆ خوا ڕابوەستن، بە دادگەریی شایەدیی بدەن، کە خوا پشتیوان بێ ئێمە لە مەسەلە گرنگەکان باسی دەکەین بۆچی لێرەدا وا هاتوە، وە لەوێش وا هاتوە؟ حەتمەن حیکمەتی خۆی تێدایە، گرنگ ئەوەیە لێرەدا خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بۆ خوا زۆر باش ڕاست بوەستن، واتە: لەسەر ڕاستە شەقامی ئەو بوەستن، وە بە دادگەریی شایەدیی بدەن، وە کە شایەدییتاندا، ئنجا شایەدییدانەکە بۆ مسوڵمانان بوو یان بۆ نامسوڵمانان بوو، با دادگەرانە بێ، چیتان ئاگا لێیە، وا بڵێن، وە

شایەدییەکە مەگۆڕن، ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعۡدِلُواْ﴾، وە با ڕق هەڵسانتان لە کۆمەڵێك، ئەو کۆمەڵە کافربن، یان مسوڵمان بن، دوژمن و ناحەزبن، یان نزیك و دۆست بن، چونکە بە زۆریی وایە ئینسان ڕقی لە ناحەز هەڵدەستێ، وە مسوڵمان ڕقی لە کافر هەڵدەستێ، وە دەشگونجێ مسوڵمان ڕقی لە کەسانێکی مسوڵمانیشی هەڵسێ، کە زوڵمیان لێکردوە، بۆیە مەرج نیە بە تەنیا کافران بگرێتەوە، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: با ڕق هەڵسانتان لە کەسانێك واتان لێنەکات و پەلکێشتان نەکات، بەرەو نادادگەریی ﴿ٱعۡدِلُواْ﴾، لەگەڵ دۆست و دوژمندا دادگەربن، لەگەڵ کافر و مسوڵماناندا دادگەربن، ئەگەر شایەدییتاندا، ئەگەر حوکمتان کرد، دادگەرانە شایەدیی بدەن و داوەریی بکەن، ﴿هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ﴾، دادگەریی لە پارێزکارییەوە نزیکترە، واتە: لە ئەنجامی دادگەربووندا تەقوا پەیدا دەبێ، تەقواش بەرهەمی کردەوە باشەکانە، خوای پەروەردگار باسی عیبادەت دەکات، دەفەرموێ: بۆئەوەی تەقواتان پەیدابێ، باسی ڕۆژوو دەکات، دەفەرموێ: بۆئەوەی تەقواتان پەیدابێ، باسی دادگەریی دەکات، دەفەرموێ: بۆئەوەی تەقواتان بۆ پەیدابێ، لە ئەنجامی عیبادەتدا ئینسان تەقوا بە دەست دێنێ، لە ئەنجامی ڕۆژووگرتندا کە جۆرێکە لە عیبادەت، ئینسان تەقوا وەدەست دێنێ، لە ئەنجامی خۆڕازاندنەوە بە سیفەتی دادگەریی دا، ئینسان تەقوا وەدەست دێنێ.

وەك خوا ﷻ دەربارەی عیبادەت دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُمۡ وَٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ٢١﴾البقرة، واتە: ئەی خەڵکینە! بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، ئەو خوایەی کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەشی دروست کردوە، بۆئەوەی پارێزکاربن.

دەربارەی ڕۆژووگرتن خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ١٨٣﴾البقرة، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕۆژووگرتنتان لەسەر پێویست کراوە، وەك چۆن لەسەر ئەوانی پێش ئێوەش پێویست کرابوو، بۆئەوەی پارێزکاربن، (تەقواتان پەیدابێ).

لێرەشدا دەفەرمویٚ: ﴿ أَعۡدِلُواْ هُوَ أَقۡرَبُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴾، دادگەربن ئەوە نزیکترە لە پارێزکارییەوە، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، وە پارێز لە خوا بکەن، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾، بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە، لە هەندێك شوێنان خوا وشەی (علم) بۆخۆی بەکاردێنێ دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ﴿٢٣﴾ ﴾لقمان، لێرەشدا دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ﴾، ئەو سیفەتانەی خوای بێوێنە هەرکامێکیان لەگەڵ ئەو مەبەستە کە باس دەکریٚ، گونجاون، بۆ زانینی نهێنی نێو دڵەکان سیفەتی زانیاری (علم) گونجاوترە، ناسینی کردەوەکان سیفەتی شارەزایی (خبیر) گونجاوترە، واتە: خوا بە کردەوەکان شارەزایەو بە نهێنی نێو دڵەکان، زانایە.

ئنجا خوای پەروەردگار دەیخاتە ڕوو کە بەڵێنی داوە بە ئیمانداران، ﴿ وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغۡفِرَةٞ وَأَجۡرٌ عَظِيمٞ ﴾، واتە: خوا بەڵێنی داوە بە ئیماندارانێك کە ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، بە لێبوردنێك کە شایستەیە، وە پاداشتێکی مەزن، بەڵێنی ئەوەی پێداون، واتە: ئیماندارینە! ئێوە لەبەر لێبوردنێك و پاداشتێکی مەزن کە خوا بۆی داناون، دادگەربن و دادگەریی یەکێکە لەو کردەوە باشانەی کە ئیمانەکەتان دەیانخوازێ، ئیمان هەموو کردەوەیەکی باش دەخوازێ، ئەگەر ئینسان ئیمانداربێ، دەبێ کردەوە باشەکان لە خۆیدا بێنێتە دی، سیفەتە بەرزەکان لە خۆیدا بێنێتە دی، ئیمان و زوڵم پێکەوە نەگونجاون، ئیمان و دادگەریی پێکەوە گونجاون، ئیمان و تەقوا پێکەوە گونجاون، ئەوە بە نسبەت ئیماندارانەوە، ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلۡجَحِيمِ ﴾، ئەوانەش کە بێبڕوا بوون، وە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆ داناوە، ئا ئەوانە هاوەڵانی دۆزەخن، یاخود خاوەنانی دۆزەخن، (أصحاب) کۆی (صاحب)ە، (صاحب) هەم بە مانای هاوەڵ دێ، هەم بە مانای خاوەن دێ، جا ئینسان ببێتە ڕەفیق و هاوەڵی دۆزەخ هەر خراپە، وە ببێتە خاوەنی دۆزەخ و هیچ شتێکی دیکەی نەبێ، جگە لە ئاگری دۆزەخ، هەر خراپە.

ئنجا بۆچی لێرەدا خوای زاناو شارەزا باسی سزای بێبڕوایانێك دەكات كە ئایەتەكانی بە درۆ دادەنێن؟ تاكو كەس گومان نەبات، خوا كافرانی خۆشبوێن، یان كافران سزا نەدات، هەر لەبەرئەوەی دەفەرموێ: لەگەڵ كافرانیش دادگەربن، بەڵام بۆیە وا دەفەرموێ: چونكە دادگەریی هەر لە ئەهلی ئیمان دەوەشێتەوە، وە دادگەریی بناغەی ژیانەو بەبێ دادگەریی كۆمەڵگاكان پێكەوە ناژین، كافرو مسوڵمان بە دادگەریی دەتوانن پێكەوە بژین، كە زوڵم هەبوو كۆمەڵگا تێكدەچێ، ئەوە لەبەرئەوەیە، ئەگەرنا خوای باڵادەست بڕیاری داوە: كافرەكان خاوەنی دۆزەخ بن، وە هاوەڵی دۆزەخ بن.

ئنجا لە كۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! چاكەی خوا بەسەر خۆتانەوە یادبكەنەوە، جا چاكەكانی خوا زۆرن، بەڵام لێرەدا دیاریی دەكات كە مەبەست لەو چاكەیە چییە؟ دەفەرموێ: ﴿إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡ﴾، كاتێك كە كۆمەڵێك ویستیان دەستتان بۆ درێژ بكەن، خواش دەستی گێڕانەوە، ئەگەر یەكێك بڵێ: باشە ئەوە یەك نەفەر بووە، ویستوویەتی دەستدرێژیی بكات بۆ سەر پێغەمبەری خوا ﷺ، بۆچی خوا بە كۆمەڵ دەیهێنێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لەڕاستیدا ئەو یەك نەفەرە لەوانەیە كۆمەڵێك نەفەر ناردبیان، وەك لە هۆی هاتنەخوارەوەكەشدا باسكرا، ئەگەرنا ئەو كەسە لە كوێ پەیدا بووە؟ دیارە كۆمەڵێك كافر هەبوون، چاودێریی ئەو سوپایەی پێغەمبەر ﷺیان كردووە ئەو نەفەرەیان ناردوە، بۆئەوەی پێغەمبەری خوا ﷺ بكوژێ.

ئنجا ئەو حاڵەتەش هەر یەك جار نەبووەو چەند جارێك دووبارە بۆتەوەو خەڵكانی دیكەش ویستوویانە پێغەمبەری خوا ﷺ بكوژن، واتە: لێرە وشەی (قوم) مەبەست پێی هەموویانە، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ كە حاڵەتی دیكە بووە، ئەهلی كوفر ویستوویانە، زەفەر بە مسوڵمانان بەرن، خوای پەروەردگار دەستی گێڕاونەوە، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەی دیكەدا باسكراوە، ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، وە پارێز لە خوا بكەن، وە ئیمانداران با تەنیا پشت

بە خوا ببەستن، تەماشا بكەن، لێرەدا خوای بێ هاوەڵ لە بەرانبەر پیلانی دوژمناندا هەر دەفەرمویٚ: ئەهلی تەقوابن، لە كاتێكدا لەگەڵ ئەهلی كوفردا ڕووبەڕوو دەبنەوە، هەر دەفەرمویٚ: ئەهلی تەقوابن، لە مەسەلەی حوكمو دادوەریی كردندا هەر دەفەرمویٚ: ئەهلی تەقوابن، لەڕاستیدا تەقواو پارێزكاریی دەبێ لە هەموو مەیدانەكاندا لەگەڵ ئینساندابێ، بۆئەوەی ئینسان لانەداتو كارێك نەكات لە ڕاستە ڕێی خوای كاربەجێ لابدات، بۆئەوەی هەمیشە خوای لەگەڵدابێ، وە بە دڵنیاییەوە بە ئەندازەی پارێزكار بوون، خوا لەگەڵ ئیماندارانەدا دەبێ، بۆیە تەقوا لە هەموو مەیدانەكاندا پێویستە، ئنجا كە دەفەرمویٚ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، وە پارێز لە خوا بكەن، وە ئیمانداران با تەنیا پشت بە خوا ببەستن، واتە: پشت بە هیچی دیكە نەبەستن.

یەكێك بۆی هەیە بڵێ: باشە ئەدی مادام هێز ئامادە بكەنو، پارەو سامانو ئیمكانیەتیان هەبێو، لە ڕووی ڕێكخستنی ئیدارییەوە خۆیان ڕێكبخەنو، هەوڵبدەن تا شارەزا بن لە پلانو نەخشەی جەنگییو، لە پیلانی دوژمنان، ئایا پێویست ناكات پشت بەو هۆكارانەش ببەستن؟ دەڵێین: نەخێر، چونكە ئەوانە هەموویان هۆكارن، دەبێ دەستیان پێوە بگیرێ، بەڵام تەنیا خوا دەبێ پشتی پێ ببەسترێ، دەبێ دڵ تەنیا بە خواوە پەیوەست بێ، دەستیش بە هۆكارەكانەوە بێ، كە دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا زیاتر تیشكی دەخەینە سەر.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ شُهَدَآءَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُواْ ﴾، جاری دیکەش گوتوومەو ئێستاش دەڵێم: بۆ ئەوەی لە مەبەستێك یان لە وشەیەکی قورئان تێبگەن، بڕۆن بگەڕێن لەنێو قورئاندا بزانن لە کوێی دیکە ئەو مەبەستە یان ئەو وشەیە هاتوە، هەموویان کۆبکەنەوە ماناکەتان بۆ ڕوون دەبێتەوەو زۆر شتتان بۆ دەردەکەوێ، بۆ وێنە ئێستا لەم ئایەتەی ژمارە (٨)ی سووڕەتی (المائدة)دا کە دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بۆ خوا ڕاوەستاوبن‌و بە دادگەریی شایەدیی بدەن، ئەمە وەك ئەو ئایەتەی ژمارەی (١٣٥)ی سووڕەتی (النساء)ە، کە خوا لەوێ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُواْ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓاْ أَوْ تُعْرِضُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بۆ خوا زۆر بە دادگەریی بەڕێوەبچن‌و زۆر بە دادگەریی هەڵسن، وە لەبەر خوا شایەدیی بدەن، ئەو شایەدیی دانە با لەسەر خۆشتان بێ، یاخود لەسەر بابو دایکتان‌و خزمانی نزیك بێ، یان "بابای شایەدیی بۆ دراو یان لەسەر دراو" دەوڵەمەند بێ یان هەژار بێ، خوا لە پێشترە لەو، (واتە: لەبەرئەوە کە هەژارە شایەدیی بۆ مەدەن، وە لەبەرئەوە کە دەوڵەمەندە بە ناهەق شایەدیی بۆ مەدەن، یان شایەدیی لەسەر مەدەن)، وە بە دوای ئارەزوو مەکەون لە دادگەریی لابدەن، (یاخود بۆئەوەی کە دادگەربن بە دوای ئارەزوو مەکەون)، ئەگەر شایەدییەکە بگۆڕن، یاخود پشتی تێبکەن (بیگۆڕن، یان هەر شایەدییەکە نەدەن) ئەوە بێگومان خوا بەوەی دەیکەن شارەزایە.

ئنجا ئایا بۆچی خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ﴾؟ هۆیەکەی ئەوەیە سیاقی ئایەتەکە باسی خزمو نزیکان دەکات، بۆیە با بزانرێ کە شایەدیی دانەکە دەبێ بۆ خوا بێ، چونکە ئەگەر لەبەر خوا شایەدیی بدەی، لایەنگریی خزمان ناکەی، بەڵام ئایەتەکەی سوورەتی (المائدة) لە سیاقێکدایە باسی دوژمنان دەکات، باسی ئەهلی کوفر دەکات، بۆیە پێویستە بزانرێ کە شایەدیی دانەکە دەبێ دادگەرانە بێ، ئنجا ئایا بۆچی لەگەڵ مسوڵماناندا جەخت لەسەر چاودێریی خوا دەکرێتەوە، بەڵام لەگەڵ نامسوڵماناندا جەخت لەسەر دادگەریی دەکرێتەوە؟ چونکە تۆ ناکرێ بڵێی لەبەر خوا چاکە لەگەڵ ئەو کافرەدا دەکەم، دەڵێی لەبەر خوا لەگەڵ ئەو کافرەدا دادگەر دەبم، چونکە خوا فەرمانی پێکردوە، بەڵام دەگونجێ بڵێی: لەبەر خوا شایەدیی بە هەق بدە، لەسەر مسوڵمانانو نامسوڵمانان، بێگومان ئینسان کاتێك ئەو وردەکارییانەی قورئانی بۆ دەردەکەون، وەك گوتم کە هەموو ئایەتەکان بێنێ کۆیان بکاتەوەو تەماشایان بکات، وە قورئان تەنیا کەسانێك باش تێیدەگەن کە چاك لێی وردبنەوە، بەڵام ئەوەی هەر بیخوێنێتەوەو سەرکێڵانەو سەتحییانە تەماشای ئایەتەکان بکات، بۆی دەرناکەون، بۆیە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾﴾ محمد، واتە: ئایا لە قورئانێ وردنابنەوە، یاخود دڵیان قوفڵی لێدراوە، هەمیشە لە ئەنجامی وردبوونەوەو تێڕاماندا، ئینسان نهێنییەکانی قورئانی بۆ دەردەکەون.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾، دادگەربن ئەوە لە پارێزکارییەوە نزیکترە، وشەی نزیکترە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئینسان ئەگەر دادگەریش نەبێ، نزیکە لە پارێزکارییەوە، بەڵام دادگەریی نزیکترە، چونکە (أقرب) (صیغة التفضیل)ە، (قریب، أَقْرَب) نزیك، نزیکتر، بەڵام جاری وایە مەبەست پێی (مفاضلة) نیەو مەبەست پێی ئەوەنیە کە فلان شتە لە فلان شتە نزیکترە، بەڵکو مەبەست پێی نزیکتری ڕەهایە، وەك ئەو ئایەتەی خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ

﴿فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضْعَفُ جُندًا ﴿٧٥﴾﴾ مريم، واتە: (ئەو بێباوەڕانە) هەر کاتێك ئەوەیان بینی کە هەڕەشەیان پێی لێدەکرێ، یان سزای دنیایی، یاخود ئەو کاتەی کە دنیای تێدا کۆتایی دێ، ئەو کاتە بۆیان دەردەکەوێ‌و دەزانن کێ پێگەی خراپترە، وە سەربازەکانی بێهێزترن.

لێرەدا مەبەست پێی ئەوە نیە کە پێگەی کافرەکان خراپترە، کەواتە: ئەگەر بەو واتایە بێ دەبێ بلێی پێگەی مسوڵمانانیش خراپە! بەڵام هی کافران خراپترە، یان سەربازەکانی مسوڵمانان بێهێزن، بەڵام سەربازەکانی کافرەکان بێهێزترن، نەخێر، لێرەدا مەبەست پێی زانینی باشی‌و باشترە (مفاضلة)و بەراورد نیە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە ئەو کاتە بۆیان دەردەکەوێ کە ئەوان خراپترین پێگەیان هەیە، وە خراپترین‌و بێهێزترین هێزو پشت‌و پەناشیان هەیە، هەروەها لە سوورەتی (الجن) ئایەتی (٢٤)یشدا بە هەمان شێوە کە دەفەرموێ: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ أَضْعَفُ نَاصِرًا وَأَقَلُّ عَدَدًا ﴿٢٤﴾﴾ الجن، واتە: هەتا کاتێك ئەوەیان بینی کە هەڕەشەیان پێی لێ دەکرێ، (واتە: قیامەتیان بینی)، ئەو کاتە دەزانن کێ پشتیوانەکەی بێهێزترە، وە ژمارەکەشی کەمترە، لێرەشدا دیسان واتە: کێ بێهێزترین پشتیوانی هەیە، وە کەمترین ژمارەی هەیە، کە هاوکاریی بکەن، لێرەدا مەبەست پێی بەراورد نیە، لە نێوانی ئەو دووانەدا، چونکە ئەگەر مەبەستی پێی بەراورد بێ، ئەوە ئیشکالێکی تێدا پەیدا دەبێ، کە وەك گوتم عەرەب ئەو تەعبیرەیان بەکارهێناوە، نەك مەبەستیان پێی ئەوەبێ کە هەردووکیان خراپن، بەڵام یەکیان خراپترە، وە هەردووکیان بێهێزن، بەڵام یەکیان بێهێزترە.

وە ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە بە هۆی دادگەربوونەوە مسوڵمان پارێزکار دەبێ، پێشتریش ئاماژەمان پێدا کە تەقوا بە هۆی چییەوە پەیدادەبێ؟ بە هۆی خواپەرستییەوە، بە هۆی دادگەریی یەوە، بە هۆی خۆدوورگرتن لە گوناهانەوە ... کەواتە: بە ئەندازەی هەبوونی زوڵم‌و ستەم، تەقوا لە ئینساندا کەم دەبێتەوە، وە بە ئەندازەی زیاتر پابەندبوون بە دادگەریی یەوە، ئینسان تەقوای پەیدادەبێ، لەوبارەوە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ هەیە: ﴿عَنِ النُّعْمَانِ بْنِ بَشِيرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ: تَصَدَّقَ عَلَيَّ أَبِي بِبَعْضِ مَالِهِ، فَقَالَتْ: أُمِّي

لاَ أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللهِ ﷺ، فَانْطَلَقَ أَبِي إِلَى النَّبِيِّ ﷺ لِيُشْهِدَهُ عَلَى صَدَقَتِي، فَقَالَ لَهُ رَسُولُ اللهِ ﷺ: «أَفَعَلْتَ هَذَا بِوَلَدِكَ كُلِّهِمْ»، قَالَ: لاَ، قَالَ: «اتَّقُوا اللهَ وَاعْدِلُوا فِي أَوْلاَدِكُمْ»، فَرَجَعَ أَبِي فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ﴾ {أَخْرَجَهُ: البُخَارِيُّ برقم: (٢٥٨٦)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤١٥٧)}، واتە: نوعمانی کوڕی بەشیر (یەکێکە لە هاوەڵان) خوا لێیان ڕازی بێ دەڵێ: بابم لە هەندێك لە ماڵەکەی بە دیاریی دامێ، (دیارە خوشك و برای دیکەشی هەبوون) دایکم گوتی: ڕازی نابم هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ شایەد نەبێ لەسەری، دەڵێ: بابم چووە لای پێغەمبەر ﷺ بۆئەوەی شایەد بێ لەسەر ئەو ماڵەی داویەتە من، پێغەمبەری خوا ﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو کارەت بۆ هەموو منداڵەکانت کردوە (واتە: سەرو دیارییت داونێ)؟ گوتی: نەخێر، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: پارێز لە خوا بکەن و لە نێوان منداڵەکانتان دادگەربن، (فەرق و جیایان پێ مەکەن)، لە ڕیوایەتی دیکەدا دەڵێ: دوایی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من شایەدیی نادەم لەسەر شتێك کە ستەمە، نوعمان دەڵێ: بابم هاتەوە ئەو دیارییەی پێی دابووم لێی وەرگرتمەوە.

شاهێد لێرەدا ئەوەیە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿اتَّقُوا اللهَ وَاعْدِلُوا فِي أَوْلاَدِكُمْ﴾، واتە: پارێز لە خوا بکەن و لە نێوان منداڵەکانتان دادگەربن، کەواتە: ئینسان بە ئەندازەی ئەوە کە دادگەر دەبێ، تەقوای بۆ پەیدادەبێ، وە بە پێچەوانەوە ستەم پێچەوانەی پارێزکارییە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ﴾، خوا بەڵێنی داوە بەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، کە لێبوردنێك و پاداشتێکی مەزنیان هەیە، واتە: ئیمانداران کردەوە باش دەبێ دادگەربن، وە دادگەریی یەکێکە لە سیفەت و خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی ئینسانی ئیماندار، وە دادگەریی گرنگترین کردەوەی باشیانە لە بواری مامەڵە لەگەڵ خەڵکدا، چ مسوڵمان بن، چ نامسوڵمان بن، کەواتە: ئیماندارینە! ئەگەر دەتانەوێ پەیمان و بەڵێن و مژدەی خوا بتانگرێتەوە بە لێبوردن و پاداشتی مەزن، با یەکێك لە کردەوە چاکەکانتان دادگەریی بێ لە مامەڵەکردنداو، دادگەربن لەگەڵ خەڵکدا.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِنَآ أُوْلَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴾، وە ئەوانەی بێبڕوان، وە ئایەتەکانی ئێمە بە درۆ دەزانن، ئەوانە خاوەنی دۆزەخن یان هاوەڵی دۆزەخن، لێرەشدا خوای پەنهانزان بۆیە سەرەنجامی شوومی ئەهلی کوفری باسکردوە، تاکو وا نەزانرێ کە لەبەرئەوەی خوا ﷻ دەفەرموێ: لەگەڵ کافراندا دادگەربن، ڕەنگە خوا لە کافران ڕازی بێ و گلەیی لێیان نەبێ، نەخێر، بەڵکو خوا لەبەر دوو هۆکاران دەفەرموێ: لەگەڵ کافراندا دادگەربن:

١/ ئیماندار ناگونجێ ستەمکاربێ و ناگونجێ لاروخوار بێ، بەڵکو دەبێ ڕاستو دادگەربێ، وەك گوتمان دادگەریی سیفەتێکی گرنگو بنەڕەتیی ئینسانی ئیماندارە لەگەڵ کافران و مسوڵمانان‌دا، وە مسوڵمانان ستەمیان لێ ناوەشێتەوە، بۆیە خوای بەرز دەفەرموێ: لەگەڵ کافرانیش دادگەربن، چونکە ئەگەر کافرەکەش لێی بوەشێتەوە ستەمی لێبکەی، تۆ لێت ناوەشێتەوە زوڵمی لێبکەی، وەك زۆر جار من بە خەڵکی خۆمانم گوتووە، تۆ کە دەگەیە کەسێك ڕەنگە شایستەی ئەوە نەبێ سڵاوی لێبکەی و ڕێزی لێ بگری، بەڵام ئێوە شایستەی ئەوەن و ئەوەتان لێ دەوەشێتەوە کە سڵاو بکەن و ڕێز لە خەڵك بگرن، تۆ تەماشای بەرانبەرەکەت مەکە، تەماشای خۆت بکە، چیت لێ دەوەشێتەوە بەو شێوە مامەڵە بکە، دادگەریی و ڕاستگۆیی و دەستپاکیی و سیفەتی بەرزت لێ دەوەشێتەوە، بەو سیفەتە بەرزو چاکانەی خۆت مامەڵە بکە، با بەرانبەرەکەشت شایستەی ئەوە نەبێ، وە دەشگونجێ تۆ بە هەڵەداچووبی و بەرانبەرەکەت شایستەی بێ، تۆ پێت وابێ شایستە نیە، بە هەر حاڵ ئەوە هۆکارێك بوو.

٢/ هۆکاری دووەم ئەوەیە کە سروشتی ژیانی دنیا وایە بە دادگەریی بەڕێوە دەچێ لەگەڵ کافران و مسوڵمانان‌دا، وە دادگەریی بناغەی هەڵسوکەوت و بناغەی پێکەوە ژیان و تەباییە، بە دادگەریی نەبێ ژیان تێکدەچێ، بۆیە زانایانی ئیسلام گوتوویانە: (إنَّ الملكَ يَبْقَى مَعَ الكُفْر، وَلا يَبْقَى مَعَ الظُّلْم)، واتە: دەسەڵات و حوکمڕانیی بە کوفرەوە دەمێنێتەوەو بەردەوام دەبێ، بەڵام بە ستەم و زوڵمەوە نامێنێتەوەو بەردەوام نابێ، جا تەماشای دنیا بکەن ئەو وڵاتانەی کافرن، بەڵام لە نێو خۆیاندا و بۆخۆیان باشن، بەردەوامن، بەڵام ئەو وڵاتانەی

مسولْمانان کە زوڵمو ستەم دەکەن، تێکدەچنو بەردەوام نابن، قسەکە زۆر جوانە، پادشایەکی کافر ئەگەر دادگەربێ لەگەڵ خەڵکەکەی خۆی، دەگونجێ بەردەوام بێ، بەڵام دەستەڵاتدارێکی مسولْمان یان بە ڕواڵەت مسولْمان[1] مادام زاڵم بێ بەردەوام نابێ، وە سەرەنجام خەڵك لێی ڕادەپەڕنو سەرنخوونی دەکەن وەك: (زەینولعابیدین بنو عەلیو حوسنی موبارەكو موعەممەر قەزافیو عەلی عەبدوڵلا صالحو بەشار ئەسەدیشیان بەدوادا دەچێ بەم زووانە إن شاء الله)، کەواتە: بۆیە خوای باڵادەست لێرەدا باسی سزای کافرەکان دەکات، کە خاوەنی کڵپەی دۆزەخنو هاوەڵی کڵپەی دۆزەخن، کەس وا گومان نەبات کە خوا ﷻ بۆیە دەفەرموێ لەگەڵیاندا دادگەربن، چونکە کە خۆشی دەوێن یان گلەیی لێیان نیە، نەخێر کافر هەر کافرەو خاوەنی دۆزەخە، بەڵام تۆ لێت ناوەشێتەوە زوڵم بکەی، وە سروشتی ژیانی دنیا ئەوە هەڵدەگرێ کە دەبێ دادگەریی تێدا بچەسپێ.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَن يَبْسُطُوٓاْ إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنكُمْ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! یادی چاکەی خوا بکەنەوە بەسەر خۆتانەوە، کاتێك کۆمەڵێك ویستیان دەستتان بۆ درێژ بکەنو خوا دەستی گێڕانەوە، یەکێك بۆی هەیە، بڵێ: باشە لێرەدا دەستدرێژکردنەکە بەس بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ بوو، بە پێی ئەوەی لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ: کەسانێك ویستیان دەستتان بۆ درێژ بکەن؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە: هەموو ئیمانداریکی ڕاست پێغەمبەری خوای ﷺ لە خۆی خۆشتر دەوێو لە خۆی پێی لە پێشترە، وە ئەو ئیماندارانەی کە لە خزمەتی دابوون پێیان خۆشبووە هەر هەموویان لەنێو بچن، بەس پێغەمبەر ﷺ سەلامەت بێو هیچی بەسەر نەیەت، وە ئەگەر ئەو شتێکی بەسەر هاتبایە، وەك ئەوە وابوو هەموویان شتیان بەسەر هاتبێ.

---

١) چونکە هەندێ لەو حوکمڕانە تێچووانە کوفری ڕوونو ئاشکرایان لێ بینراوەو بیستراوە، واتە: ئەوانەی لیبیاو تونس و میسرو یەمەنو سووریا.

پاشان ئێمە بنچینەیەکی (أصول الفقه)مان هەیە دەڵێ: (إِنَّ خصُوصَ السَّبَبِ لايَمْنَعُ شمُولَ المَعْنَى) واتە: تایبەتمەندبوونی هۆکاری هاتنە خوار، رێگا ناگرێ لە گشتگیریی واتایەکەی، هۆیەکەی ئەوەبووە کە کافرێك ویستوویەتی پێغەمبەر ﷺ بکوژێ، بەڵام خوای پەروەردگار لەو رووداوە حوکمێکی گشتی دەرهێناوە، چونکە زۆر جاری دیکەو زۆر مسوڵمانی دیکەش کەوتوونەتە بەر مەترسی کافرانەوەو، ویستوویانە زەفەریان پێببەنو پەلاماریان بدەن، خوای پەنهانزان ئەو چاکەیە دەخاتە بەرچاوی هەموویان، کە زۆرجار دەربازیان دەکاو چەپاڵەیان دەداو، نایەڵێ بکەونە بن دەستی کافران.

وە دەشگونجێ ئاواش وەڵام بدرێتەوە: کە لەڕاستیدا هیچ کەسێك لە مسوڵمانان نیە، وە هیچ کۆمەڵێکی مسوڵمانان نیە لە ژیانیاندا دووچاری ترسو پیلانی دوژمنان نەبنەوە، وە خوای باڵادەستیش دەربازی نەکردبن، هەمیشە ئیمانداران لەگەڵ نەخشەو پیلانی گڵاوی دوژمناندا رووبەڕوو دەبنەوە، وە خوای پەروەردگاریش دەربازیان دەکات، بەڵێ جاری واش هەیە تووشی زیانیش دێن، بەڵام زۆرجار خوا ئیمانداران سەلامەت دەکات، مەبەست پێی ئەو سەلامەتییەیە، کە ئیمانداران هەمیشە ئەو نیعمەتەیان لەبەرچاو بێت.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴾، وە با ئیمانداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، لە شوێنی دیکەدا شیمان کردۆتەوە، ئێستاش شیدەکەمەوە، وشەی (تَوَكّل) لەسەر کێش (وزن)ی (تَفَعّل)ە، لە زمانی عەرەبیدا ئەم کێشە بۆ شتێکە بە زۆر بکرێ، بە جەخت لێکردنەوە، (تَكَلّف) واتە: خۆ ئەزیەتدانو، خۆ زۆر ماندووکردن، (تَوَكّل)یش، واتە: وەکیل گرتن، خوای زانا دەفەرموێ: با ئیمانداران تەنیا خوا بە وەکیل بگرن، وەکیل بە کەسێك دەگوترێ کە تۆ دەیکەیە کار پێسپێردراوی خۆت، وەکیل واتە: کار پێسپێردراو، وەك چۆن یەکێك دەڵێ: فلان کەسم کردۆتە وەکیلی خۆم، واتە: کاری خۆم بەو سپاردووە ئەو لە جیاتی من کارەکە دەکات، ئیمانداران دەبێ کاری خۆیان بە خوا بسپێرن، بەڵام کار بە خوا سپاردن، مانای وانیە تۆ دەستبەرداری هۆکارەکان بی، بەڵکو دەبێ تۆ لە دڵەوە بە خواوە پەیوەست بی، وە کاری خۆت

حەوالّەی خوای پەروەردگار بکەی، کەواتە: (تَوَكّل) واتە: خوا کردن بە کار پێسپێردراوی خۆت، ئنجا (تَوَكّل) ئیشی دلّە، کەواتە: ئایا کەسێك کە سەفەر دەکات، هۆکارەکان وێلّ بکاتو بلّێ: پشتم بە خوا بەستوەو نانو توێشوو لەگەلّ خۆی نەبات، ولاخی پێ نەبێ، یان سەیارەی پێ نەبێ، بلّێ مادام پشتم بە خوا بەستوە، نانو توێشووم بۆ چییە؟ هۆکاری سەفەرم بۆ چییە؟ ئایا ڕاست دەکاتو تێگەیشتوەو لە مەسەلەی پشت بە خوا بەستن؟ بە دلّنیایی نەخێر، بۆچی؟ چونکە پشت بە خوا بەستن، ئیشی دلّەو قەرەبووی ئیشی دەستان ناکاتەوە، تۆ ئەوەی بە دەست پێت دەکرێ، دەبێ ئامادەی بکەی، نانو توێشووە، جلوبەرگو پێلاوە، هۆکاری گواستنەوەیە...هتد، ئنجا دەبێ بلّێی: دلّم بە خواوە پەیوەستە، بۆچی؟ چونکە جاری وایە هەموو هۆکارەکان ساز دەکەی، کەچی ڕێگرێك دێتە پێشو سەفەرەکەت بۆ ناکرێ، بۆیە لە حالّێکدا کە دلّت بە خواوە پەیوەست بووە، بلّێ: خوایە! من هەموو هۆکارەکانم ئامادە کردوون، ئەگەر تۆ بتەوێ بۆم ئاسان دەکەیو سەفەرەکەم بۆ دەکرێ، بەلاّم ئەگەر خوا نەیەوێ ڕێگرێك دێتە پێشیو نەخۆش دەکەوێو سەفەرەکەت بۆناکرێ، ترسێك دەبێ، دوژمنێك دەبێ، گۆڕانکارییەك لە کەشو هەوا دەبێ، سەفەرەکەت بۆ ناکرێ، کەواتە: (تَوَكّل) ئیشی دلّە، کە بێگومان قەرەبووی هۆکارەکان ناکاتەوە، هەرچەندە زۆرێك لە مسوولّمانان لەوە حالّی نینو پێیان وایە پشت بە خوا بەستن (تَوَكّل) قەرەبووی ئامادەکردنی هۆکارەکان دەکاتەوە، مادام پشتت بە خوا قایمە، پێویستیت بە هیچ نیە!

جاری وایە ئەگەر مسوولّمانێك دووربینییەك بکات بۆ ئەنجامدانی کارێك، ئەو جۆرە کەسانە دەلّێن: تەماشا بکەن تەوەککولی چەند بێهێزە؟! بەلاّم نەخێر ئەوە تەوەککول کەمی نیە، تەماشای ژیانی پێغەمبەر ﷺ بکەن! وەك لە ژیاننامەیدا هاتوە، نانو توێشووی ساڵێکی بۆ خێزانەکانی دادەنا، لە کاتێکدا کە لە هەموو کەسێکیش زیاتر پشتی بە خوا بەستوە، کەواتە: ئینسان دەبێ هەموو هۆکارەکان ئامادە بکات، ئنجا دلّیشی بە خوا پەیوەست بکات، جا بۆ جەنگو جیهاد دەچێ، بۆ ئاشتییە، بۆ سەفەر دەچێ، دەیەوێ کڕینو فرۆشتنو مامەلّەیەك بکات، هەر کارێك دەکات.

لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە، کە پێموایە زیاتر بەرچاوی مسوڵمانان ڕوون دەکاتەوە دەربارەی وشەی (تَوَكّل) پشت بە خوا بەستن: ﴿عَنْ عَمْرُو بْنُ أُمَيَّةَ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ، قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! أُرْسِلُ نَاقَتِي وَأَتَوَكَّلُ؟ قَالَ: أَعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيّ برقم: (٢٥١٧) عَنْ أَنْس، وَأَخْرَجَهُ ابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٣١)، وَالحَاكِمُ برقم: (٦٦١٦)، وَالبَيْهَقِي في (شعب الإيمان) برقم: (١٢١٠) قال الشيخ الألباني: حسن، قال شعيب الأرنؤوط: حديث حسن}، واتە: عەمری کوڕی ئومەییە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ! حوشترەکەم بەڕەڵاّ کەمو پشت بە خوا ببەستم؟ فەرمووی: بیبەستەوەو پشت بە خوا ببەستە.

کەواتە: پشت بە خوا بەستن بەدیل نیە بۆ بەستنەوە بە دەست، هەروەك بە دەست بەستنەوەش بەدیلی پشت بە خوا بەستن نیە، کەواتە: وێڕای دابینکردنی هۆکارەکان بە دڵیش پشتت بە خوا قایم بکە، بۆچی؟ چونکە جاری وایە بە دەستان دەیبەستیەوە، دوایی یەکێك دێو پەتەکەی لێدەکاتەوەو دەیدزێ، یان پەتەکەی دەپسێو دڕندەیەك تێی ڕۆ دێو دەیخوات، کەواتە: مەرج نیە بەستنەوە کارەکەت بۆ تەواو بکات، وە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، کە پشت بە خوا بەستن، بەدیل نیە بۆ هەوڵدانو کۆششکردنو دابینکردنی هۆکارەکان.

لە فەرمایشتێکی دیکەدا هاتوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿لَوْ أَنَّكُمْ تَتَوَكَّلُونَ عَلَى اللهِ حَقَّ تَوَكُّلِهِ لَرَزَقَكُمْ كَمَا يَرْزُقُ الطَّيْرَ تَغْدُو خِمَاصاً وَتَرُوحُ بِطَانَاً {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٠٥) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده قوي رجاله ثقات رجال الشيخين غير عبدالله بن هبيرة فمن رجال مسلم، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٤٤)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٦٤)، وَأَبُو يَعلى برقم: (٢٤٧)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧٣٠)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٨٩٤)، وَقَالَ: صَحِيحُ الإسناد، وَالبَيْهَقِي في شُعب الإيمان برقم: (١١٨٢) عَنْ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ}، واتە: ئەگەر ئێوە بەڕاستیی پشت بە خوا ببەستن، خوا ڕزقتان دەدات وەك چۆن ڕزقی باڵندە دەدات، بەیانیان بە زگی برسییەوە دەڕواتو ئێواران بە زگی تێر دێتەوە!

ئینسان ئەگەر لەو فەرمایشتە ورد نەبێتەوە، وادەزانێ پێچەوانەی ئەو قسەیە کە من گوتم، کەچی ئەو فەرمایشتە پشتگیریی قسەکەی من دەکات، بۆچی؟

ئایا خوا چۆن ڕۆزیی باڵندە دەدات؟ ئایا ئەگەر لەنێو هێلانەکەیدا نەجووڵێ، خوا ڕزقی بۆ دەبارێنێ؟ نەخێر، بە بەڵگەی ئەوە کە لە فەرمایشتەکەدا دەفەرموێ: (تَغْدُو خِمَاصًا)، جا وشەی: (خِمَاصًا) واتە: زگی بە پشتییەوە نووساوە، بە زگی بەتاڵەوە بەیانیان دەڕوات، کەواتە: ئەو باڵندە لە هێلانەکەی دەردەچێ، ئنجا دەفەرموێ: (وَتَرُوحُ بِطَانًا) واتە: ئێوارە بە زگی تێر دێتەوە، مانای وایە ئەو باڵندەیە جووڵەی کردووە ئیشی خۆی کردوە، ئەگەر لە هێلانەکەیدا دەرنەچووباو ڕاووشکاری نەکردبایە، خوا لە ئاسمانێوە ڕۆزیی نابارێنێتە نێو هێلانەکەی.

جا با بێینە سەر مەبەستی فەرموودەکە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: کەواتە ئێوەش ئەگەر وەك باڵندە پشت بە خوا ببەستن، ڕۆزیتان دەدات، بەڵام پشت بە خوا بەستن وەك هی باڵندە، کە باڵندە بەیانی دەردەچێ تا ئێوارێ ڕاووشکارێ دەکات، ئنجا ئێوارێ بە تێریی دێتەوە، بەڵام تۆ لە ماڵێ دابنیشیو بڵێی: وەك باڵندە پشتم بە خوا بەستوە، نەخێر تۆ وەك باڵندەت نەکردوە، چونکە باڵندە دەڕوات هەوڵدەدات، بەڵام تۆ هیچت نەکردوە، بۆیەش وا دەڵێم: چونکە هەندێك لە ئەهلی تەصەووف بە هەڵە ئەم فەرمایشتە مانا دەکەنو بە هەڵە تێی دەگەن، دەڵێن: تەماشا بکەن! پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئەگەر بەڕاستی پشت بە خوا ببەستن، وەك چۆن ڕزقی باڵندە دەدات، ئاوا ڕزقی ئێوەش دەدات، کە ئەوە ڕاستە، بەڵام تەماشای هەموو فەرموودەکە بکە، لە کۆتایی دا دەفەرموێ: (تَغْدُو خِمَاصًا)، بەیانیان بە زگی بەتاڵەوە دەڕوات، (وَتَرُوحُ بِطَانًا) ئێوارەش بە زگی تێر دێتەوە، جا باڵندە بۆچی بەیانیان دەچێتە دەرێ؟ بۆئەوەی لە شوێنێك ڕزقێك پەیدا بکات، کە خوا بۆی داناوەو بە تێریی بگەڕێتەوە، بەڵام بەیانی لەنێو هێلانەکەی دابنیشێ، بێگومان بەیانیش هەر برسی دەبێو ئێوارەش هەر برسی دەبێ.

بۆیە دەبێ زۆر ئاگامان لە چەمكو واتای وشەی (تَوَكّل) بێ، وە ئاگامان لە چەمکی (قَدَر) بێ، چونکە هەندێك گوتوویانە: مادام هەموو شتێك بە قەدەری خوایە، کەواتە: (تَوَكّل) هیچ لە مەسەلەکان ناگۆڕێ، وە هیچ کەلێنێك ناگرێ؟

بەڵام ئێمە دەڵێین: ئەوە ڕاست نیە، با ڕوونی بکەینەوە:

١- لە شوێنەوارێکدا هاتوە کە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: ﴿مَنْ سَرَّهُ أَنْ يَكُونَ أَقْوَى النَّاسِ فَلْيَتَوَكَّلْ عَلَى اللهِ﴾ {رَوَاهُ إبنُ جرير بسنده عن عمر بن الخطاب موقوفاً، وقال المناوي: إسناده حسن)، واتە: هەر کەسێك دەیەوێ بەهێزترین کەس بێ، با پشت بە خوا ببەستێ.

کەواتە: پشت بە خوا بەستن هێزی دڵ دەدات بە ئینسان، مەعنەوییاتی ئینسان بەرز دەکاتەوە، هەست دەکات کە خاوەنێك و کارپێسپێرراوێکی هەیە، کە ئەوە زۆر جیایە لەوەی کە تۆ هەر تەنیا دەست بە هۆکارە مادییەکانەوە بگریو هەست بە هیچ هێزو توانایەکی مەعنەویی نەکەیو، هەست بە هیچ سەرپەرشتیارو مشوورگێڕو کارسازێك نەکەی.

٢- لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە: ﴿سُئِلَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَرَأَيْتَ أَدْوِيَةً نَتَدَاوَى بِهَا وَ رُقًى نَسْتَرْقِي بِهَا، وَتُقَى نَتَّقِيهَا، هَلْ تَرُدُّ مِنْ قَدَرِ اللهِ شَيْئًا؟ قَالَ: هِيَ مِنْ قَدَرِ اللهِ﴾ {رَوَاهُ إِبْنُ مَاجَه برقم: (٣٤٣٧)، وَقَالَ الشَيخ الألباني: ضعيف، انظر رقم: (٧٤٩) في (ضعيف إبْنُ مَاجَه)}، واتە: پرسیار لە پێغەمبەری خوا کرا ﷺ، گوترا: ئایا ئەو دەرمانانەی کە ئێمە خۆمانی پێ چارەسەر دەکەین، وە هەندێك دوعا کە نەخۆشەکانمانی پێ چارەسەر دەکەین، وە هەندێك هۆکار کە خۆمانی پێ دەپارێزین، (بۆ وێنە: بەرگ پۆشین لەبەر سەرماو گەرماو، زرێ پۆشین لە کاتی جەنگدا بۆئەوەی تیرو شیر کاریگەریی نەبێ... هتد) هیچ شتێك لە قەدەری خوا دەگێڕنەوە؟ (تەماشا بکەن! چ وەڵامێکی حەکیمانەی داونەوە) فەرمووی: ئەوانەش هەموویان بەشێکن لە قەدەری خوا.

واتە: کە تۆ خۆت دەرمان دەکەی، یان پیاوێکی صالّح دوعات بۆ دەکاتو گرفتێکت بۆ چارەسەر دەبێ، هۆکارێك دەگریە بەرو لە شتێك دەپارێزرێی، بەرگی گەرم لەبەر دەکەی سەرمات نابێ، خۆت فێنکدەکەیەوە، هەتاو ناتبا، ئەوانە هەمووی لە قەدەری خوان، واتە: لە قەدەری خوا بووە تۆ زستانێ خۆت دابپۆشیو، تووشی هەڵامەتو کۆخەو سەرما نەبی، وە ئەگەر نەخۆش بووی دوعا بکەیو نەخۆشییەکەت چارەسەر بێ، هۆکارێك بگریە بەرو ئەو گرفتەت چارەسەر بێ، ئەویش هەر لە قەدەری خوایە، هەروەها ئەو کەسەش کە ئەو شتانە

ڕەچاو ناکاتو دەرمان بەکارناهێنێ بۆ نەخۆشییەکەی، قەدەری خوایە کە ئەویش بەو نەخۆشیە لەنێو بچێ، یان خراپتر ببێ، لەبەرئەوەی دەرمان بەکارناهێنێو، دوعا ناکاتو خۆی ناپارێزێ، کەواتە: پشت بە خوا بەستن لەگەڵ قەدەری خوادا یەکن، بە قەدەری خوا پشت بە خوا دەبەستی، بەڵام ئینسانی کافر پشت بە خوا نابەستێ، بۆیە هەمیشە هەست بەبێ پشتو پەنایی دەکاتو هەست بە بێکەسیی دەکات، وە بێگومان یاسا (سنة)ی خوایە هەر کەسێك پشت بە خوا ببەستێ، خوای بالادەست کاری بۆ پێکدێنێ، دڵی بەهێز دەکات، وە بۆ زانیاریتان بناغەی بەهێزیی ئینسان، دڵی ئینسانە، ئەگەر ئینسان لە ڕووی مەعنەوییەوە بەهێز بوو، کارەکانی بۆ ئاسان دەبن، بۆیە مووسا ﷺ کە خوا دەینێرێ بۆ لای فیرعەون، چوار داوایان لە خوا دەکات، کە خوا پێی دەفەرموێ: ﴿ ٱذۡهَبۡ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ ﴾طـه، واتە: بڕۆ بۆ لای فیرعەون بەڕاستی ئەو یاخی بووە، پێغەمبەر مووساش ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قَالَ رَبِّ ٱشۡرَحۡ لِي صَدۡرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرۡ لِيٓ أَمۡرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحۡلُلۡ عُقۡدَةٗ مِّن لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفۡقَهُواْ قَوۡلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجۡعَل لِّي وَزِيرٗا مِّنۡ أَهۡلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشۡدُدۡ بِهِۦٓ أَزۡرِي ﴿٣١﴾ وَأَشۡرِكۡهُ فِيٓ أَمۡرِي ﴿٣٢﴾ كَيۡ نُسَبِّحَكَ كَثِيرٗا ﴿٣٣﴾ وَنَذۡكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ ﴾طـه، واتە: گوتی: خوایە! سینەم گوشاد بکە، کارم ئاسان بکە، گرێی زمانم بکەوە، کە لە قسەم تێبگەن، وە لە کەسوکارم پاڵپشتێکم بۆ دابنێ ئەویش هاڕوونی برام بێ، پشتمی پێ بەهێز بکە، وە لە کارمدا بەشداریی بکە، بۆئەوەی زۆر تۆ بە پاك بگرین، وە زۆر یادی تۆ بکەین.

کەواتە: بناغەی سەرکەوتنی ئینسان ئەوەیە لە ڕووی مەعنەوییەوە بەهێزبێ، پێش هەموو شت مووسا ﷺ داوای چی دەکات؟ دەڵێ: سینەم فراوان بکە، ئینسانی دڵ گچکە هەر کە دوو خەمی هاتنە پێش، یەکسەر دەکەوێ، کەواتە: دەبێ سینگت فراوان بێ، ئنجا کارت ئاسان دەبێ، وە کە کارت ئاسان بوو، ئنجا زمانت دەکرێتەوە، وە کە وابووی، هاوکاری باشترت بۆ پەیدا دەبن، بەڵام ئەوەی لە زاتی خۆیدا دڵی گچکەبێو حەوسەڵەی کەم بێ، هەر لە ڕێوە بە دوو خەمان

دڵی کوێر دەبێتەوە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (فلان کەس دڵی دەڵێی شارە مێروویە، بە دڵۆپە ئاوێك وێران دەبێ)، شارە مێروو بۆ بە دوو دڵۆپە ئاوان وێران دەبێ، چونکە گچکەیە، هەر کوردەواریی خۆشمان گوتوویانە: (فلان کەس دڵی وەك دەریایە بە هیچ پڕ نابێ) جا پشت بە خوا بەستن لە ڕووی مەعنەوییەوە ئینسان بەهێز دەکات، تۆ هەست دەکەی مشوورخۆرێکت هەیە، کارسازێکت هەیە، پشتت پێی قایمە، ئەوەش هێز دەداتە دڵت، چونکە عەلمانییەکانو ماددییەکان دەڵێن: کوا پشت بە خوا بەستن، چ کەلێنێك پڕ دەکاتەوە؟ وە بێئاگان لەوە کە (توکل) لایەنی مەعنەویی‌و دەروونیی ئینسان پڕ دەکاتەوە، ئنجا من پەندێکی عەرەبیم داناوە، دەڵێم: (لا يَضْعُفُ جِسْمٌ عَمّا قَوِيتْ عَلَيْهِ الرُّوح) واتە: جەستە لە بەرانبەر ئیشێکدا لاواز نابێ، ئەگەر ڕووحەکە لە بەرانبەریدا بەهێز بێ، یانی: هەمیشە ئینسان بە ڕووح بێهێز دەبێ، ئنجا جەستەکەی بێهێز دەبێ.

دەگێڕنەوە کاتی خۆی پیاوێکی کاروانچیی هەبووە زۆر بە شان‌و شەوکەت بووە، قەدو قیافەکی زۆر بەهێزو بەرچاوی هەبووە، جارێك بە ڕێگادا دەڕوات کە وڵاخی باری پێیە، لە ناکاو وڵاخەکەی لە قووڕێ دەچەقێ، چەتەو ڕێگریش لەوێ کەمینیان داناوە، چونکە دەزانن وڵاخ لەوێ دەچەقێ، ئنجا کابرا هەر دەست دەداتە وڵاخەکەی‌و بە بارەوە لە قوڕەکەی دەردێنێ، بەڵام لەبەر خۆیەوە قسەیەکی کردو گوتی: (ئای زۆرەکە بۆ غیرەتێ)، واتە: ئای ئەو هێزو قوەتە غیرەتێکیشی لەگەڵدا بووایە!! ئنجا کابرای ڕێگر سەرەتا کە دەیبینێ ئەو وڵاخە بە بارەوە دەردێنێ‌و لەو گۆڕە دایدەنێ دەڵێ: ئەوە هی ئەوە نیە خۆمی لێبدەم، چونکە هەر دەستی بمگاتێ لە پەل‌و پۆم دەخات، بەڵام دوایی کە گوێی لەو قسەیەی دەبێ، دەڵێ: وادیارە هەر هێزەو غیرەتی لەگەڵدا نیە، هەر جەستەیەو ڕووحی لەگەڵدا نیە، بە هەر حاڵ لێی بە تەماع دەکەوێ، دەنگی دەداو دەڵێ: ڕووتبەوە! ئەویش دەڵێ: بەڵێ قوربان چیت دەوێ؟ ئیدی ڕووتی دەکاتەوە، ئنجا کابرای ڕێگر دەڵێ: ئەی بێ قەزابی ئەو قووەتەی کە تۆ هەتە، کەس ناوێرێ خۆی لێبدات، دەڵێ: ڕاستە، بەڵام حەیفێ غیرەتی لەگەڵدا نیە، کەواتە: لە حەقیقەتدا ئینسان بەس جەستە نیە، زۆرجار دەبینی ئینسانێکی کورتە باڵای بچووك بە ئینسانێکی گەورە دەوێرێ، بۆچی؟ چونکە لە ڕووی مەعنەوییەوە لەو بەهێزترە.

ئنجا ئەو ئایەتانەش بەڵگەن لەسەر ئەوە کە پشت بە خوا بەستن هێز دەداتە ئینسان، خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُلْ حَسْبِيَ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾ ﴾التوبة، واتە: ئەگەر پشتیان هەڵکرد، بڵێ: خوامان بەسە، بێجگە لەو هیچ پەرستراوی هەقو ڕەوانین، پشتم بەو بەستوە، ئەو خاوەنی بارەگای مەزنە.

هەروەها لە سووڕەتی (الطلاق)دا دەفەرموێ: ﴿ ...وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّهُۥ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُۥٓ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمْرِهِۦ ۚ قَدْ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾ ﴾، واتە: هەر کەس پارێز لە خوا بکات، خوا دەرووی خێری لێدەکاتەوە، وە بێئەوەی بۆخۆی فکری پێ بشکێ ڕۆزی دەدات، وە هەر کەس پشت بە خوا ببەستێ خوای بەسە، خوا کاری خۆی دەگەیەنێتە جێ، بەلام خوا بۆ هەر کارێك ئەندازەیەکی داناوە، وە کاتو شوێنێکی دیاریکراوی داناوە.

خوا لەو کەسانەمان بگێڕێ کە بەڕاستیی پشت بە خوا دەبەستنو دڵیان بە خواوە پەیوەستە، وە دەستیشیان بە هۆکارەکانەوەیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چوارەم

## پێناسـەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی: (١٢، ١٣، ١٤) دەتوێژینەوەو تەفسیر دەکەین، کە خوا ﷻ لەم سێ ئایەتە موبارەکەدا باسی ئەزموونی شکستخواردووی جوولەکەکانو، پاشان نەصرانییەکان دەکات لە بواری پەیمان لێوەرگرتنو بەڵێن بە خوا دان دا، لەسەر بەندایەتیی کردن بۆ خواو، طاعەتو چاکەکاریی، پاشان شکاندنی ئەو پەیمانو بەڵێنانە، وە سەرەنجام سزاو تۆڵەی دنیاییو قیامەتیی خوا عَزَّوَجَلَّ لەسەر ئەو بێپەیمانییو ئەو بەڵێن شکاندنە دەخاتە ڕوو، کە دیارە ئامانجی سەرەکییش لە خستنە ڕووی ئەو ڕاستییە، دەرسو پەند لێوەرگرتنی مسوڵمانانە، وە پاشان ناسینی ئەو دوو میللەتەیە: جوولەکەکانو نەصرانییەکان.

﴿وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ
نَقِيبٗاۖ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ
وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ
عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ فَمَن
كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٢ فَبِمَا نَقۡضِهِم
مِّيثَٰقَهُمۡ لَعَنَّٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن
مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٖ مِّنۡهُمۡ إِلَّا
قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣ وَمِنَ
ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ
بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ
يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ١٤﴾

## مانای وشــه بە وشـەی ئایەتەكــان

((وە بە دڵنیـایی یـەوە خـوا پەیمانێكـی پتـەوی لـە وەچـەی ئیســڕائیل وەرگــرت، وە دوازدە مشــوورخۆرمان لە نێودا دانان، وە خوا پێـی فـەرموون: مســۆگەر مـن لەگەڵتــانم بــە مــەرجێك نوێــژ بەرپــا بكــەنو، زەكـــات بــدەنو، ئیمـان بــە ڕەوانــەكراوانم بێـنـنو، پشـتیان بگـرنو، قـەرزی بـاش بـە خـوا بـدەن (لەبـەر خـوا هاوكـاریی هـەژارانو نـەداران بكـەن)، ئەوە دڵنیـابن خراپەكانتان لـێ دەسڕمەوەو، دەتانخەمـە نێـو چـەند باخێكــەوە كـە ڕووباریـــان بــەژێردا دەڕۆن، ئنجـــا هەركامێكتـــان دوای ئــەوە بێبـــڕوا بــێ، ئــەوە بێگومـــان ڕێـــی ڕاســـتی بـــزر كــردوە ﴿١٢﴾ ئیـــدی لـــە ســـۆنگەی هەڵوەشـــاندنەوەی پەیمانەكەیانــەوە، نــەفرینمان لێكـردنو دڵیانمــان ڕەق كـرد: وشـەكان لـە شـوێنی خۆیـان لادەدەنو دەگـۆڕن، وە بەشـێك لەوەی كە پێـی ئامۆژگـاریی كرابـوون لەبیــریان كـرد، وە بەردەوامیـش ناپاكیی دیكەیان لـێ دەبینـی، جگـە لـە كەمێكیـان، دەجا لێیــان ببــوورەو چاوپۆشییان لــێبكـە، بێگومان خوا چاكـەكارانی خــۆش دەوێـن ﴿١٣﴾ هــەروەها لەوانــەش كە گوتیــان: ئێمـە نەصــڕانیین، پــەیمانی پتەومـان وەرگــرت، بــەڵام بەشــێك لــەوەی كـە پێــــی ئامۆژگـــاریی كرابـــوون لەبیـــریان كــرد، ئیـــدی لـــە ئـــەنجامی ئـــەوەدا ئێمـــەش دوژمنایەتیــیو ڕقو كینەمـــان خســـتنە نێوان هەتـــا ڕۆژی قیـــامەت، وە لەمـەو دواش خــوا هــەواڵیان پێــدەدات بــەوەی كــە لێزانـــانەو، وردەكارییانــە (لــە كــردەوەی خــراپ) دەیانكــرد ﴿١٤﴾)).

## شـیکردنـەوەی هـەندێـك لە وشـــەکان

(**نَقِيـبًا** ): وشەی (نَقيب) ئێمە بە کوردی دەڵـێین: سەرپەرشتیار، یان مشـوورخۆر، یـان بـەرپرس، بـەڵام لـە ئەسـڵدا دەڵـێ: (النَّقْبُ فـي الحـائِطِ وَالجلْدِ كَالثَّقْبِ فـي الخَشَـبِ والنَّقِيـبُ الباحِـثُ عَـنِ القَـوْمِ وَعَـنْ أحْوَالِـهِمْ وَجَمْعُـهُ نُقَبَـاءُ) وشـــەی: (نَقیـب) لـە (نَقْـب)ەوە هـاتوە، (نَقْب) وەك چـۆن کونێـك لـە دیـوار دەکـرێ پێـی دەگوترێ: (نَقب)، بەڵام لە خشـتەو دار کە نەخشەی لەسەر دەکرێ، یان کە کون دەکـرێ پێـی دەگـوترێ: (ثَقب)، وە (نَقیب) کەسـێکە کە لـە حـاڵو بـاڵی کۆمـەڵێك بپێچێتەوەو سەرپەرشـتییان بکـات، وە (نُقَبَـاء) کۆی (نَقیـب)ە.

(**وَعَزَّرْتُمُوهُمْ** ): (التَّعزِيرُ: النُّصرَةُ مَعَ التَّعْظِيم)، واتە: (تَعزیر) بریتیـە لـە پشـتگرتن لەگـەڵ بـە گەورەگرتنـدا، (وَالتَّعزِيـرُ: ضَـرْبٌ دُونَ الحَـدِّ، وَهُـوَ تَـأْدِيبٌ) هەروەهـا (تَعزیر) بـە لێدانێـك دەگـوترێ، کـە لـە سـزا شـەرعییەکان کەمــتر بـێ، کـە بـۆ تـەمبێکردنی ئینسـانی تاوانبـارە، بـەبێ ئـەوەی کـە ئـەو سـزا شـەرعییە دیـاریی کرابـێ.

(**وَأَقْرَضْتُمُ** ): (القَـرْضُ: ضَـرْبٌ مِـنَ القَطْـعِ، وَتَقْرِضُـهُم: تَجُـوزُهُم والقَـرضُ وَمَـالٌ يُـدْفَعُ بِشَـرْطٍ رَدِّ بَـدَلِهِ) (قَـرْض) جۆرێکــە لـە بـڕین، وشـەی: (تَقرضـهُم) کـە لـە سوورەتی (الكهف)دا هاتوە، واتە: خۆر لێیـان تێدەپـەڕی ڕاسـتەوخۆ لێـی نـەدەدان، وە هەروەها (قَرْض) بە ماڵێك دەگوترێ کە بـدرێ بـە کەسـێك بـە مـەرجێك دوایـی خـودی ئەو ماڵە، یان وێنـەی ئەو ماڵە بدرێ بەو کەسەی کە پێیـداوە.

(**قَـٰسِيَةً** ): واتـە: ڕەق، (القَسْـوَةُ: غِلَـظُ القَلْـبِ، وَأَصْلُهُ مِـنْ: حَجَـرٍ قَـاسٍ، وَالْمُقَاسَـاةُ مُعَالَجَةُ ذَلِكَ)، (قَسْـوَةُ) واتە: دڵ ڕەقیـی، لە ڕیشـەشـدا عەرەب بـە بـەردێکی زۆر ڕەقو سـەخت دەڵـێن: (حَجَـرٌ قَـاسٍ) واتـە: بـەردێکی ڕەقو پتـەو (مقاساة)یـش بریتیـە لـە چارەسـەرکردنی بـەردێکی ڕەق کـە بشـکێنرێ، پێـی دەگـوترێ: (قَاسَـاهُ) واتە: ئەو بەردە ڕەقەی شـکاند.

(**حَظًّا**): (الحظُّ: النَّصِيبُ الْمُقدَّرُ، جَمْعُهُ أَحَاظٍ وأُحُظ)، (حَظّ) لە زمانی عەرەبیدا بە بەشێكی دیاریكراو دەگوترێ كە بە (أَحَاظ)و بە (أُحُظ) كۆ دەكرێتەوە.

(**خَآئِنَةٍ**): (خَائِنَة: جَمَاعَةٍ خَائِنَةٍ، وَقِيلَ رَجُلٌ خَائِنٌ، وَخَائِنَة وَقِيلَ: الخَائِنَة: مَصْدَر) وشەی (خَائِنَة) دەگونجێ بە مانای كۆمەڵێكی خیانەتكاربێ، وە دەشگونجێ پیاوێكی خائین بێ، كە زۆر ناپاكیی كردبێ، وە دەشگونجێ وشەی (خَائِنَة) لێرەدا چاوگ بێ و مەبەستی پێ ناپاكیی بێ، دیارە خیانەت پێچەوانەی ئەمانەتە، ئەمانەت واتە: سپاردە پاراستن، خیانەت واتە: ناپاكیی كردن لە سپاردەدا.

(**فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ**): واتە: لێیان ببوورە، (العَفْو هُوَ التَجَافِي عَنِ الذَّنْب) ئەوەیە كە كەسێك گوناهێك بكات و گوناهەكە نادیدە بگیرێ، (وَعَفَوْتُ عَنْهُ قَصَدْتُ إِزَالَةَ ذَنْبِهِ صَارِفًا عَنْهُ) كەسێك گوناهێك دەكات، هەڵەیەك دەكات، عەفوو كردنەكەی بریتیە لەوەی كە گوناهەكەی نادیدە بگرێ، وەك بڵێی گوناهەكەی نەكردبێ، یاخود خۆی لێ بەسەرەوە نەبات، وەك ئەوەی كە نەزانێ ئەو گوناهەی كردوە.

(**وَٱصۡفَحۡ**): (صَفْح) لەگەڵ (عَفُو) جیاوازییان چییە؟ (عَفُو) ئەوەیە كە گوناهەكە نادیدە بگری، بەڵام (صَفْح) بریتیە لەوەی كە هەر سەركۆنەشی نەكەی، (عَفُو)، ئەوەیە كە تۆ گوناهەكە ببینی، بەڵام چاوپۆشیی لێبكەی، بەڵام (صَفح) ئەوەیە كە وەك بڵێی ئەو گوناهەت هەر نەبینیبێ، دەڵێ: (صَفْحُ الشَّيءِ: عَرْضُهُ وَجَانِبُهُ، وَالصَّفْحُ: تَرْكُ التَّثْرِيبِ) (صَفْح) بریتیە لە لای شتێك، یاخود پانایی ئەو شتە، یاخود تەنیشتی، (صَفْح) بریتیە لەوەی كە تۆ سەركۆنەی كەسێك نەكەی لەسەر ئەو هەڵەیەی كە كردوویەتی.

(**فَأَغۡرَيۡنَا**): بە مانای (شَوَّقْنا) و (هَيَّجْنَا) و (أَلصَقْنا) هاتوە، ﴿ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ ﴾، واتە: دوژمنایەتیی و دڵ ڕەقییمان لە نێواندا پەیداكردن، یاخود پێمانەوە لكاندن، دەڵێ (غَرِيَ بِكَذَا، أَي لَهِجَ بِهِ وَلَصِقَ)، (غَرِيَ بِكَذَا) واتە:

زۆر بەو شتەوە سەرگەرم بوو، پێوە نووسا، (وَأَصْلُهُ مِن الغِراءِ وَهُوَ مَا يُلصَقُ بِهِ) (غِراءِ) بە صمغو کەتیرەو هەر شتێك دەگوترێ کە مرۆڤ شتێکی پێ بە شتێکی دیکەوە بنووسێنێ، (أَغْرَيتُ فُلاَنَاً بِكَذَا، أَلْهَجْتُ بِهِ)، لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێین: تێمبەردا، یاخود شتەکەم پێوە خەریك کرد، یاخود پێمەوەنووساند.

(يَصۡنَعُونَ) (الصُّنْعُ إِجَادَةُ الفِعْلِ) (صُنْع) بریتیە لەوەی هەرشتێك بە رێکیی بکرێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾، واتە: خوا هەواڵیان پێدەدا بەوەی کە زۆر بە وردەکاریی دەیانکرد، کە لێرەدا مەبەست پێی کردەوە خراپەکانیانە، هەرچەندە زۆر وردەکاریی و پەنهانییان تێدا کردبێ، بەلاَم خوا هەواڵیان پێدەدا بەوەی کە کردوویانە.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

خـوا ﷻ لە ئایەتەکانی پێشوودا کە دەیفەرموون، ڕووی دواندنی لە ئیمانداران بوو، ئنجا خـوا ﷻ باسـی ئـەزموونی جوولەکـەکانو نەصـرانییەکان دەکـات لـە پەیمـانو بەڵێندانیانـدا بە خوا، وە پاشان شـکاندنی ئەو بەڵێنو پەیمـانە، بۆئـەوەی مسـوڵمانان پەنـدی لـێ وەربگـرن، ئنجـا ئێمـە لـە سـەرەتای دەسـتپێکردنی تەفسیـرکردنی ئـەم سـوورەتە موبارەکـەوە، باسمان کـرد، کـە یەکـەم ئایـەتی ئـەم سـوورەتە باسـی پەیمـان دەکـات، دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ ﴾، بۆیـە لـە زۆر شـوێنی ئەم سوورەتەدا باسی بەڵێنو پەیمـان دەکرێ، لێـرەدا ئەمە یەکێکـە لەو شـوێنانە کە خـوا بۆمـان باسـی بـەڵێنو پەیمانێـك دەکات کـە لـە جوولەکـەکانی وەرگرتـوە، دیارە مەبەسـت لە جوولەکەکان (بَنِي إِسْرَائِيل)ە، واتە: وەچـەی ئیسـرائیل، چونکە ئیسـرائیل نازناوی پێغەمبەر (یەعقووب)ە ﷺ، کە دوازدە کـوڕی بـوو ون، یـەکێکیان یوسـف بـوو، یـەکێکی دیکـەیان بنیامین بـوو، لەگەڵ دە برایەکـەی دیکەیـان، یوسـفـو بنیـامین بە تـەنیا لـە دایکـێك بـوون، ئـەوانی دیکـەش لـە دایکێـك بـوون، هـەموویان کـوڕانی (یـەعقووب)ن، جا ئیسـرائیل نازنـاوو شـۆرەتی (یـەعقووب)ە، کـە دەفـەرموێ (بَنِي إِسْرَائِيل) ڕۆڵەکانی ئیسـرائیل، بێگومان وەچەی ئیسـرائیل، هەموو ئەوانەن بە کوڕو کچەوە کە دەچنەوە سەر یەعقووبو لە یەعقووب پەیدابوون، (یـەعقووب)یش کوڕی (ئیسـحاق)ە، (ئیسـحاق)یش کـوڕی (ئیبراهیم)ە، سـەلامی خـوا لەسـەر هەموویـان بێ، جـا لێـرەدا خـوا ﷻ بۆمـان باسی ئـەو پـەیمانو بەڵـێنە پتـەوە دەکـات کـە لـە بـەنی ئیسـرائیلی وەرگرتـوەو دەفـەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، دەفەرموێ: بێگومان خوا پەیمانێکـی پتـەوی وەرگرت لە وەچەی ئیسـرائیل، (المِيثَـاق: العَهْدُ الـمُؤَكَّدُ، العَهْدُ الـمُوَثَّقُ) پـەیمانێکی پتـەو، پـەیمانێکی داکۆکیی لەسـەر کـراوو جەخت لەسەرکراو، ئنجا ئایا پەیمانی چی لـێ وەرگـرتن؟ پـەیمانی بەندایـەتیی بـۆ خـوا کـردن، پـەیمانی پابەنـدیی بـە شـەریعەتەوە، پـەیمانی فەرمانبـەریی کـردن بـۆ پێغەمبـەرانیان (سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ)، ﴿ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗا ﴾، وە لـە نێـو بـەنی ئیسـرائیلدا دوازدە (نَقِيـب)مـان نـاردن (نَقِيـب) واتـە:

مشـووڕخۆر، بەرپـرس، بۆچـی دوازدە بـوون؟ چـونکە جوولەکەکان دوازدە تـیرە بـوون، هەر تـیرەیەك چۆتەوە سـەر یەکێك لە کوڕەکانی یەعقووب، هەر کوڕێك بەرەبابێکی لـێ کەوتۆتـەوەو تـیرەو هـۆزێکی لـێ کەوتۆتـەوە، خـوای پەروەردگـار بـۆ ڕێکخسـتنی کاروباریان، لە نێو هەرکام لەو تـیرانەدا مشـووڕخۆرێکی پەیدا کـردوە، جا ئایا ئـەوە بـە وەحـی بـووە بـۆ پێغـەمبەری سـەردەمی خۆیـان سـەلامی خـوای لەسـەر، کـە خــوا بفـەرموێ: فلاّن کـەس بکە بە (نـەقیب)ی فلاّن تیـرەو هۆز، یاخود خـوای بالاّدەسـت ئـەو صـەلاّحیەتەی بـەو پێغەمبـەرە داوە، کـە لـە نێـو هـەر تـیرەیەکدا (نـەقیب)ێك هەڵبژێرێ، هەردووکیان گونجـاون، ئنجـا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡ﴾، وە خـوا فـەرمووی: {بـەو دوازدە (نقیب)ەی فـەرموو}، مـن لەگەڵـتانم، کـە ئێـوەش سەرپەرشـتی هـەر کـام لـەو دوازدە تیـرەو هـۆزە دەکـەن، کـە بـە هـەموویان گەلـی جوولەکە پێکدێنن، بـەڵام بێگومـان لەگـەڵ بـوونی خــوا بـۆ هـیچ گەلو کۆمەڵێـك بـە گـۆترە نیـەو خـوای کاربەجـێ لەخــۆوە وە لەگــەڵ کـەس نیـە، ئنجـا کـە لێـرەدا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡ﴾، خۆ خوا لەگەڵ هـەموو دروستکراوەکانی خۆی دایە، بە زانیـاریی‌و بە دەسـەڵاتو بە ئـیرادەوە، لەگەڵ هـەمووانو دایـەو ئاگای لـە هەمووانـە هـیچ شـتێك نیـە بـەبێ ئیـرادەی خــوا بـێ‌و بچـێ، بـەڵام لێـرەدا کـە دەفەرموێ: ﴿إِنِّي مَعَكُمۡ﴾، ئـەم لەگـەڵ بوونـە لەگـەڵ بـوونێکی تایبەتــە، واتـە: لەگەڵتان دام بە پشـت گـرتن‌و هاوکـاریی کـردن‌و کـار بـۆ ئاسـان کـردن، وە سەرخسـتن، ئنجـا ئـەم لەگـەڵ بوونـە تایبەتـەی خــوا، دیــارە بـە گـۆترە نیــە، بۆیـە دەفـەرموێ:

﴿وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمۡۖ لَئِنۡ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾، وە خوا فەرمووی: من لەگەڵتـانم ئەگـەر نوێـژ بەرپـا بکـەن‌و، زەکـات بـدەن‌و، بـڕوا بێــنن بـە ڕەوانەکـراوانی مـن، وە پشـتیان بگـرن‌و ڕێزیان لـێ بگـرن، وە قەرزی بـاش بە خـوا بـدەن، (واتـە: لەبـەر خـوا هـــاوکاریی هـــەژارو نـــەداران بکـــەن)، ئەگـــەر وابکـــەن ﴿لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾، بە دڵنیایی یەوە، خراپەکانتان لـێ دەسـڕمەوە، یانـی: جگـە لـەوەی کە

لەگەڵتانم، لە دنیادا پشتتان دەگرمو هاوکارییتان دەکەم، لە دواڕۆژیشدا خراپەکانیشتان لێ دەسڕمەوە، ﴿ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، وە بە تەئکید دەتانخەمە نێو چەند باخێکەوە کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، واتە: بەهەشتەکان.

لێرەدا خوای پەروەردگار هەر بە کورتی دەفەرموێ: بەڵێنو پەیمانی لە بەنی ئیسرائیل وەرگرت، بەڵام لە سووڕەتی (البقرة)دا {وەك لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا باسمان کرد، لە ئایەتی (٨٣ و ٨٤)دا} بە تەفصیل باسی ئەو پەیمانە دەکات کە لە جوولەکەکانی وەرگرتوە، پەیمانێکی دە بڕگەیی بووە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَانًا وَذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيْتُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنكُمْ وَأَنتُم مُّعْرِضُونَ ﴿٨٣﴾ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَكُمْ لَا تَسْفِكُونَ دِمَآءَكُمْ وَلَا تُخْرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمْ ثُمَّ أَقْرَرْتُمْ وَأَنتُمْ تَشْهَدُونَ ﴿٨٤﴾ ﴾، ئەوە ئەو پەیمانە دە (١٠) بڕگەیی یە، کە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، خوا پەیمانێکی پتەوی لە وەچەی ئیسرائیل وەرگرت، قورئانیش هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە، ئجا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَمَن كَفَرَ بَعْدَ ذَٰلِكَ مِنكُمْ فَقَدْ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ﴾، هەر کامێك لە ئێوە دوای ئەوە، (واتە: دوای ئەو پەیمان لێ وەرگیرانە)، بێبڕوا بێ، ئەوە ڕێی ڕاستی ون کردوە، جا لێرەدا خوای دادگەر دەیەوێ ئەوە بخاتەوە بیری مسوڵمانان، کە کاتی خۆی پەیمانێکی ئاوای لە جوولەکەکان وەرگرت، بەڵێنو موژدەی زۆریشی پێدان، کە ئەگەر پابەندبن بەو بەڵێنو پەیمانانەوە، خوا ئەوەتان بۆ دەکاتو ئەوەتان بۆ دەکات، لە دنیادا سەرتان دەخاتو پشتتان دەگرێ، وە لە دواڕۆژیشدا گوناهەکانتان لێ دەسڕێتەوەو دەتانخاتە نێو چەند باخێکەوە، کە ڕووباریان بە ژێردا

دەڕۆن، وە ترساندنیشیو هەڕەشەشی لێكردن كە هەركامێك لە ئێوە لە دوای ئەو پەیمانە كە لێتان وەرگیراوە، بێبڕوابێ، ئەوە ڕێی ڕاستی ون كردوە، وە هەر كەسێك ڕێی ڕاستی ون كرد، هەم لە دنیادا زیانبارەو دەفەوتێو، هەم لە دواڕۆژیشدا گوناهبارەو، تووشی سزاو جەزرەبەی خوا دێ.

ئنجا لە ئایەتی دووەمدا دێتە سەر ئاكامو سەرەنجامی ئەو پەیمان لێوەرگیرانەو دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ ﴾، دیارە پەیمانەكەیان شكاندو پێوە پابەند نەبوون، خوا دەفەرموێ: جا بە هۆی هەڵوەشاندنەوەیان بۆ پەیمانەكەیان سزامان دان، خوا باسی پێنج جۆر سزا دەكا، دیارە پێشی پێنج شتی بۆ دیاری كردبوون كە ئەگەر بیانكەن: نوێژ بەرپا بكەن، زەكات بدەن، ئیمان بە پێغەمبەرانی خوا بێنن، پشتیان بگرن، وە لە پێناوی خوادا ماڵی خۆیان ببەخشن، ئەگەر ئەو پێنج شتە بكەن، ئەو بەڵێنانەیان بۆ دێنێتە دی، بەڵام لە ئەنجامی پەیمان شكاندن دا، خوا گیرۆدەی كردن بە پێنج شتەوە، واتە: پێنج جۆر سزای دان ﴿ فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ ﴾، بە هۆی پەیمان شكاندنیانەوەو هەڵوەشاندنەوەی پەیمانەكەیانەوە: ﴿ لَعَنَّٰهُمْ وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ﴾، گوناح هەندێكی هەندێكی پەلكێش دەكات، ئاگاداربن! (گوناهێكت كرد، ئەو گوناهە وات لێدەكات گوناهێكی دیكەش بكەی) هەروەك چۆن چاكەكان یەكدی پەلكێش دەكەن، چاكەیەكت كرد ئەو چاكەیە وات لێ دەكات چاكەیەكی دیكەش بكەی، كە بە ڕۆژووی بیر دەكەیەوە لەوەی كە نوێژێكیش بكەی، قورئان بخوێنی، زیكر بكەی، كە دەچیتە مزگەوتێ بیر دەكەیەوە لەوەی دوو ڕكات نوێژی سڵاو لێكردنی مزگەوت بكەی، گوێ لە قسەیەكی خێر بگری، قورئان بخوێنی، بەڵێ چاكەكان یەكدی پەلكێش دەكەنو ڕادەكێشن، خراپەكانیش یەكدی پەلكێش دەكەنو ڕادەكێشن.

لێرەشدا خوا دەفەرموێ: بە هۆی شكاندنی پەیمانەكەیانەوە، نەفرینمان لێكردن، كەواتە: هەركەسێك پەیمان بشكێنێ، وە بەر لەعنەتی خوا دەكەوێ، ئنجا ئایا

(لعن) چییە؟ (اللَّعنُ: الطَّرْدُ وَالإبْعَادُ)، (لَعْن) بریتیە لە دوورخستنەوەو دەرکردن، لێرەدا لەعنەتی خوا، واتە: دوورخستنەوە لە ڕەحمەتو بەزەیی خواو، وە لە بەخششی خوا، کەواتە: یەکەمین سزا کە خوا دانی، لەسەر ئەوەی پەیمانیان شکاندبوو، ئەوە بوو کە لە ڕەحمەتی خۆی دووری خستنەوە، وە هەر کەسێك لە ڕەحمەتی خوا دوورکەوتەوە، تووشی هەموو شتێکی خراپ دێ، بۆیە دەفەرموێ:

﴿وَجَعَلْنَا قُلُوبَهُمْ قَٰسِيَةً﴾، دووەمیان ئەوە بوو کە دڵیانمان ڕەق کرد، هەر کەسێك کە لەعنەتی خوای وەبەرکەوێ، دڵیشی ڕەق دەبێ لە بەرانبەر بەندایەتی کردن بۆ خواداو، لە بەرانبەر چاکەکردن لەگەڵ خەڵکی خوادا، دڵی ڕەقو سەخت دەبێ، ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾، بەڵایەکی دیکەشیان بەسەرهات ئەوە بوو کە وشەکانیان لە شوێنی خۆیان لادەدا، واتە: وشەکانی خواو، ئایەتەکانی (خوا)یان دەگۆڕین، جا چ گۆڕینی ڕواڵەتیی‌و بێ‌ژەیی، یانی وشەیەکیان لادابێ وشەیەکی دیکەیان لە جێی دانابێ، چ گۆڕینی مەعنەویی، واتە: وشەکان هەروەك خۆیان بوون، بەڵام مانای هەڵەیان لێداونەوە، بۆ وێنە: کەسێك ئەو ڕستە قورئانییە دەخوێنێتەوە: ﴿... وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ... ﴿١٩٥﴾﴾البقـــــرة، واتە: بەدەستی خۆتان خۆتان مەفەوتێنن، بابای گۆڕەر (محرِّف) دێنێ چۆنی مانا دەکات؟ وای مانا دەکات کە خەڵك نەچێ بۆ جەنگو جیهاد بەدەستی خۆتان خۆنەفەوتێنن، واتە: مەچۆ بۆ جەنگو جیهاد چونکە دەفەوتێی! ئەوە گۆڕینی مەعنەوویی‌ە، جا ئەو ڕستە قورئانییە لە سیاقێکدا هاتوە کە هەمووی باسی جەنگو جیهاد دەکات، کەواتە: مەعقووڵ نیە ئەم ڕستە قورئانییە بەکاربهێنرێ، بۆ گێڕانەوەی خەڵك لە جەنگو جیهادو لە فیداکاریی، چونکە ئەوە لە سیاقێکدا هاتوە لە سوورەتی (البقرة) کە هەمووی باسی جەنگو جیهاد دەکات، خوا دەفەرموێ:

﴿ٱلشَّهْرُ ٱلْحَرَامُ بِٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ وَٱلْحُرُمَٰتُ قِصَاصٌ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٩٤﴾﴾، هەتا دوایی دەفەرموێ: ﴿وَأَنفِقُوا۟ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ ۛ وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ

ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾ ﴾، لە ڕێی خوادا ماڵی خۆتان ببەخشن لە ڕێی جەنگو جیهاددا ببەخشن، وە بە دەستی خۆتان خۆ مەفەوتێنن، یانی: ئەگەر ماڵی خۆتان نەبەخشنو جیهادی ماڵیی نەكەن، دوژمن بەسەرتان زاڵ دەبێو بە دەستی خۆتان خۆ دەفەوتێنن، كەواتە: تەماشا بكەن ئایەتەكە چ دەگەیەنێ، ئەگەر لە سیاقی خۆی دەرت هێنا؟ دەگونجێ بە مانایەكی هەڵە بەكاربهێنرێ، كە خوای پەروەردگار مەبەستی نەبووە، وە لەگەڵ ئایەتەكانی دیكەی قورئانیشدا تێكدەگیرێ، جا ئەوە پێی دەگوترێ گۆڕینی مەعنەویی.

ئنجا بەڵای چوارەم كە بەسەریان هاتو گوناهی چوارەم كە كردیان لە ئەنجامی پەیمان شكاندندا: ﴿ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ﴾، بەشێك لەوەی پێی ئامۆژگاریی كرابوون لە بیریان كرد، واتە: بەشێك لە دینی خوا كە پێی ئامۆژگاریی كرابوون، بەشێك لە كتێبی خوایان فەرامۆش كرد، ﴿ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٍ مِّنْهُمْ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ﴾، وە گوناهی پێنجەمی دەرهاوێشتەی ئەو پەیمان شكاندنە، ئەوە بوو كە دەفەرموێ: بەردەوام تۆ خیانەتیان لێ دەبینی، بەردەوام ناپاكیی دەكەنو تۆ ئاگاداری ناپاكیی یەكانیان دەبی، كە لێرەدا ڕووی دواندن لە پێغەمبەر ﷺ ە، یان هەر كەسێك كە قورئان دەخوێنێتەوە، ئەی مسوڵمان! تۆ بەردەوام ناپاكیی لە جوولەكەكان دەبینی، خیانەتیان لێ دەبینی، ﴿ إِلَّا قَلِيلًا مِّنْهُمْ ﴾، جگە لە كەمێكیان، ئەو كەمانەش ئەوانەن كە مسوڵمان دەبن، یاخود ئەوانەن كە ئینصافیان هەیە، وەك زۆرجار لە ئەمریكاو لە وڵاتانی ڕۆژئاوا هەندێك لە جوولەكەكان لە دژی سیاسەتی دەوڵەتی ئیسرائیلی ئێستا خۆپیشاندان دەكەن، ئەو كاتەی كە قەوارەی جوولەكە لە غەززەی دەدا، یەكێك لە قەشە گەورەكانی جوولەكە لە بەریتانیا پاسپۆرتەكەی خۆی سووتاند، وە لە ئەمریكا خۆپیشاندانیان دەكرد، دژی سیاسەتی زایۆنی، مەبەست ئەو جۆرە كەسانەن، جا تەماشا بكەن! دینی خوا چەند بە ئینصافە جوولەكەكانیش پۆلێن دەكات، كەمێكیان كە بە ئینصافن یان ئیمان دێنن، ئەو كەسانە جیادەكاتەوە كە ئەوانە خائین نین، جا خوای دادگەر بە پێغەمبەر ﷺ وە بە هەركەسێك كە لە ڕێی پێغەمبەرەوە دەروا دەفەرموێ: ﴿ فَٱعْفُ عَنْهُمْ

﴿ وَٱصۡفَحۡ ﴾، لێیان ببوورەو چاوپۆشییان لێ بکە، (عفو) لە کوردیدا ئێمە دەڵێین: لێبوردن، لێبوردن ئەوەیە گوناهەکەی دەبینی، هەڵەکەی دەبینی، دەڵێی ئەوە هەڵەکەتە، ئەوە گوناهەکەتە، بەلام برۆ گەردنت ئازادبێ‌و ئەوە لێمبوردیو لێت ناپێچمەوەو سزات نادەم لەسەر ئەو گوناهە، بەلام (صَفْح) ئەوەیە کە گوناهەکە، یان هەڵەکە بە چاوی کابرا دانەدەیەوە، چونکە (صَفْح) لەوەوە هاتوە، واتە: لاملی تێ بکەی‌و هەڵەکەی نادیدە بگری، وەك هەر هەڵەشی نەکردبێ، ئنجا خوای لێبوردە دەفەرموێ: تۆ لەگەڵیاندا بە لێبوردەیی‌و چاوپۆشیی کردن مامەڵە بکە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێ، یانی: تەنانەت لەگەڵ ئەو خراپەکارانەشدا لێبوردن‌و چاوپۆشیی کردن هەر باشە، دیارە ئەوەیش لە کاتی خۆی‌و لە شوێنی خۆیداو لە سنووری خۆیدا، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە، چونکە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەم ڕستە قورئانییە ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡ ﴾، نەسخ بۆتەوە، بەلام پێشتر باسمان کرد لە سەرەتای سوورەتی (المائدة)وە کە زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە سوورەتی (المائدة) هیچ ئایەتێکی مەنسووخی تێدا نیە، کەواتە: ئەو قسەیە ڕاست نیە کە ئەم ڕستەیە ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡ ﴾، لێیان ببوورەو چاوپۆشیان لێ بکە! نەسخ بۆتەوە، ئەدی چۆن دەگونجێ لەگەڵ ئەوەدا کە ئەوانەی پەیمانیش دەشکێنن‌و خیانەت دەکەن، چاوپۆشییان لێبکەی؟ دوایی ڕوونی دەکەینەوە.

ئنجا لە کۆتاییدا دێتە سەر باسی خیانەت‌و پەیمان شکێنیی نەصرانییەکانیش‌و دەفەرموێ: ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ ﴾، وە لەوانەش کە گوتیان: ئێمە نەصرانیین، پەیمانێکی پتەومان لێیان وەرگرت، ئەمە ئاماژەیە بەوە کە ئەوانە ڕاست ناکەن، نەصرانیی نین، ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ ﴾، ئەوانەی خۆیان گوتیان: ئێمە نەصرانیین، واتە: هەر بە لاف لێدان‌و ئیددیعا وا دەڵێن، بەلام لەڕاستییدا نەصرانیی نین، چونکە نەصرانیی کەسێکە دینی

خوای سەرخستبێ‌و پێغەمبەرانی خوای پشت گرتبێ‌و یارمەتی دابن، کە ئەوان وانەبوون، بۆیە ئەو نازناوەیان بە ئیددیعاو بە لاف لێدان بۆ تۆمار دەکات، جا دەفەرموێ: لەوانیش پەیمانی پتەومان وەرگرت، ﴿ فَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ﴾، بەشێك لەوەی کە پێی ئامۆژگاریی کرابوون، فەرامۆشیان کردو لە بیریان بردەوە، هەمیشە هۆی پەرتەوازەبوونی میللەتان، واتە: ئەوانەی خاوەنی بەرنامەی ئاسمانیین، ئەوە بووە کە بوونەتە تاقم تاقم‌و، هەر تاقمەو دەستەیە بەشێکی ئایینەکەی گرتووەو لایەن‌و بەشەکانی دیکەی فەرامۆش کردووەو، سەرەنجام لە بەینی خۆیاندا بۆتە دەمەقاڵێ‌و مشتومڕیان‌و هەرکامێکیان بەشەکەی خۆی پێ ڕاست بووە، بەڵام ئەوەی کە دەبێتە هۆی یەکڕیزیی ئەوەیە کە هەموو دینەکە بگرێ‌و هیچی لێ فەرامۆش نەکەی، ئەو کاتە کە مرۆڤ هەمووی پێکەوە گرت‌و هەمووی تەماشا کرد: لایەنی عەقیدە، لایەنی عیبادەت، لایەنی سیاسەت، لایەنی حوکم، لایەنی جەنگ‌و جیهاد، لایەنی پەروەردە، ئەو کاتە هەر کەسێك خزمەتی هەر لایەنێك لەو لایەنانەی دینداریی بکات‌و خزمەتی هەر بەشێکی بکات، خۆشی دەوێ‌و پێیوایە کە ئەویش هاوکاریەتی هاوڕێبازیەتی. بەڵام کەسێك وابزانێ ئیسلام تەنیا لایەنی زیکرو فیکرە، لەگەڵ ئەوەدا کە لەڕووی کاری سیاسییەوە خزمەت بە ئیسلام دەکات، هەستیاری دەبێ، وە ئەوەی کەوا دەزانێ ئیسلام تەنیا جەنگ‌و جیهادە، هەر کەسێك لە ڕووی عیلمیی‌و فیکرییەوە خزمەتی ئیسلام دەکات، هەستیاریی بەرانبەری دەبێ، وە ئەوەی کە پێیوایە ئیسلام تەنیا لایەنی بانگەوازو پەروەردەیە، هەستیاریی دەبێ بەرانبەر بە مسوڵمانانی دیکە کە خزمەت بە لایەنەکانی دیکە دەکەن، بەڵام ئەگەر تۆ هەموو ئیسلامەت بینی، لە هەر قوژبنێکەوە کەسێك خزمەتی بە ئیسلام کرد، کارەکەی ئەو بە کارەکەی خۆت دەزانی، وە بەرانبەری هەستیار نابی، نەك وەك ئێستای مسوڵمانان، یەکێك تەنیا لایەنی تەزکیەو تەصەوف دەگرێ، یەکێك تەنیا لایەنی عەقیدە دەگرێ، یەکی دیکە تەنیا لایەنی بانگەواز دەگرێ، یەکێك تەنیا لایەنی جەنگ‌و جیهاد دەگرێ، سەرەنجام ئەوانە هەموو لە بەینی خۆیاندا تێکدەگیرێن، وە هەرکامێکیان ئەوەی دیکە بە هەڵە دەزانێ، کە لەڕاستیدا هەمووشیان هەڵەن‌و، ئیسلام هیچ کام لەو لایەن‌و بەشانە نیە بە تەنیا، بەڵکو هەموو ئەوانەیە بەیەکەوە، وە گەلێك لایەنی دیکەشە، ئنجا

دەفـــــــــــــەرموێ: ﴿ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، نەصرانییەكان لـە ئـەنجامی ئـەوەدا كـە بەشـێك لـەوەی كـە پێـی ئامۆژگـاریی كرابـوون فەرامۆشیان كـرد، (بـەڵام بۆمـان دەرناخـات بەشـەكە چییـە؟ بۆمـان دەرنـاخات ئـەو لایەنە چییە؟ كە فەرامۆشیان كردوە) لە ئەنجامی ئەوەدا دوژمنایـەتییو ڕقو كینـەمان لە بەینـدا پەیـدا كردن، تاكو ڕۆژی قیـامەت، كە زۆر لە توێـژەرەوان دەڵـێن: مەبەست لەو بەشـە كە فەرامۆشـیان كردوە، لایەنی یەكتاپەرسـتیی (توحید)ە، نەصـرانییەكان كـە لایـەنی خـوا بەیەكـگرتنیان لـە نەصرانییەت دەرهێنـا، لـە بـەینی خۆیانـدا نـاكۆك بـوون، وەك دوایـی باسـی دەكـەین، هـیچ پێغـەمبەرێك (علـیهم الصـلاة والسـلام) نەهـاتوە كە خەڵك بانگ نەكـات بۆ تـەنیا خـوا پەرستن، كەچی نەصرانییەكان دەڵێن: عیسـا كوڕی خوایـە، وە بەشێكە لە خـوا، وە مەریـەم بەشـێكە لە خـوا، وە (روح القدس) بەشـێكە لـە خـوا! وە لـە ئەنجـامی ئـەوەدا تووشـی جیـاوازیی زۆر بـوون، وەك دوایـی باسـی دەكـەین، چـونكە هەمووكـات شـتی ڕاسـت یەكێكـە، بـەڵام شـتی هەڵـە جـۆراو جـۆرە، (٢ + ٢ = ٤)، وەرە ئەنجامـە ڕاسـتەكە بەدەسـتەوە مەگـرە، بڵـێ: (٢ + ٢ = ٥)، ئەوەی دیكەش دەڵـێ: (٢ + ٢ = ٦) ... هتـد، بۆی هەیـە ڕەخنـەت لـێ بگرێ، ئـەوی دیكە دەڵـێ: دەكاتـە سـێ بـۆی هەیـە ڕەخنـەت لـێ بگرێ، هـەموویان ڕەخنەیـان دەبـێ بەرانبـەر بـەوی دیكـە، مـادام ئەنجامـە ڕاسـتەكە نـەگرن، كـە (٢ + ٢ = ٤)، هەمیشـە ئەنجامە هەڵەكـان پێكـەوە ناكۆكـن، بەڵام ئەنجامی ڕاسـت هـەموولا لەسـەری پێكـدێن، ئینسان كە لە ڕاسـتەكەی لاداو تووشـی هەڵـە بوو، ئەوە چ بڵـێی (٢ + ٢ = ٥)، چ بڵـێـی: (٢ + ٢ = ٣)، چ بڵـێـی (٢ + ٢ = ١٠٠٠) هـەروەك یەكـە، هـەمووی هـەر هەڵەیـە، بەڵـێ هەیانە دوورتر ڕۆیشـتوە، بەڵام هەمووی هەر هەڵەیـە، ئنجا لـە كۆتاییـدا دەفەرموێ:

﴿ وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴾، وە لەمـەودوا خـوا بـە تەئكیـد هـەواڵیان پێـدەدا بـەوەی كـە زۆر بـە وردەكـارییو بـە وەسـتایانەو لێزانـانە دەیانكـرد، واتە: لە كردەوەی خراپو ڕەفتـاری خـراپ، خـوا لەمـەودوا هەواڵیان پێـدەدا، كـە هەواڵیشـیان پێـدەدا بـۆ سـزادانو بـۆ سەرزەنشـتكردنو بۆئـەوەی كـە پێیـان بفـەرموێ: ئـەوە هەڵە نەبوو كردتـان، ئـەوە ناشـەرعیی نـەبوو؟ ئـەوە زوڵـم نەبـوو؟ ئەوە خراپـە نەبوو؟ با، دە ئەوە سـزایەكەتانەو سـزای خۆتـان بچێـژن !.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾، واتە: بێگومان خوا پەیمانی پتەوی وەرگرت لە بەنی ئیسرائیل، کە جوولەکەکانن، دیارە پەیمان وەرگرتنی خوای دادگەر لە هەر گەل و کۆمەڵێك، واتە: پابەندکردنیان بەو شەریعەتەوە کە خوا بۆی ناردوون، وە بەندایەتیی کردنیان بۆ خوا بەهۆی پابەندیی یان بەو شەریعەتەوە، کە دەفەرموێ: خوا پەیمانی لە جوولەکەکان وەرگرت، یان لە نەصرانییەکان وەرگرت، مەبەست لەو پەیمانە ئەوەیە کە خوا بەڵێن و پەیمانی لە هەموو ئەو خاوەن کتێبانە وەرگرتوە کە بەندایەتیی بۆ خوا بکەن، بە پابەندییان بەو کتێب و شەریعەتەوە کە بۆی ناردوون، ئەو پەیمانەش کە لێرە خوای زاناو شارەزا بە کورتی باسی دەکات، وەك لە مانا گشتییەکەشدا ئاماژەمان پێدا، لە ئایەتی ژمارە (٨٣)و (٨٤)ی سوورەتی (البقرة)دا بە درێژیی باسی دەکات، دەفەرموێ: ﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنكُمۡ وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ ﴿٨٣﴾ وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَكُمۡ لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ ثُمَّ أَقۡرَرۡتُمۡ وَأَنتُمۡ تَشۡهَدُونَ ﴿٨٤﴾﴾، دوایی باسی دەکات، کە چۆن پەیمانەکەیان شکاندووەو پێوە پابەند نەبوون، ئەو پەیمانە بریتییە لە (١٠) بڕگە، دیارە ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا بە تەفصیلی باسمان کردوە، (١٠) دە بڕگەکان بەم شێوەیەن:

یەکەم/ ﴿لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ﴾، بێجگە لە خوا کەسی دیکە، وە هیچ شتێکی دیکە ناپەرستن، کە بناغەی ئەو پەیمانەیە، چونکە ئەگەر تەنیا خوات پەرست،

شـتە چـاکەکانی دیکـە هەمووییـان دێنیـە دی، وە ئەگـەر خـوات نەپەرسـت، خراپەکـانی دیکـە هـەموویان بـە دوای نەپەرسـتنی خـوا، یـان بـە تـەنیا نەپەرسـتنی خوادا دێـن.

دووەم/ ﴿ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا ﴾، یەکسـەر لـە دوای خـوا پەرسـتیی، چاکـە لەگەڵ بابو دایکـتاندا بکـەن.

سێیەم/ ﴿ وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ ﴾، وە لەگـەڵ خزمانـدا چاکە بکـەن.

چوارەم/ ﴿ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ ﴾، وە لەگـەڵ هەتیوانـدا چاکە بکـەن.

پێنجەم/ ﴿ وَٱلۡمَسَٰكِينِ ﴾، وە لەگەڵ نەدارانـدا، چاکـە بکـەن.

شـەشـەم/ ﴿ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا ﴾، وە پـەیمانمان لـێ وەرگـرتن کـە دەبـێ هەمیشـە قسـەی بـاش لەگەڵ خەڵـکیدا بکـەن، مسـوڵمانان نـابـێ قسەی خـراپ بکـەن، ئەوانەی کە خۆیـان بە بەندەی خـوا دەزانـن، نابـێ قسـەی خـراپ لەگـەڵ خەڵك بکـەن.

حەوتـەم/ ﴿ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، وە نوێـژ بەرپـا بکـەن.

هەشـتەم/ ﴿ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، وە زەکات بدەن، نوێژ هەقی خوایە، زەکات هـەقی خەڵکە، خوا پەرسـتو خەڵك دۆسـت بن.

نۆیـەم/ ﴿ لَا تَسۡفِكُونَ دِمَآءَكُمۡ ﴾، وە پەیمانمان لـێ وەرگرتـن کە خوێنـی یەکـدی نارِێـژن، دەفەرمویّ: خوێنی خۆتـان نارِێـژن، ئنجا ئایا بۆچی دەفەرمویّ: خوێنـی خۆتـان، خـۆ کـەس خـوێنی خـۆی نارِێـژێ مەگـەر بـە دەگمـەن ئینسـان خـۆی بکـوژێ؟ مەبەسـتی لەوەیە کە هەرکامێك لـە مسـوڵمانان دەبـێ وەك خـۆت تەماشا بکـەیو خوێنی ئەو بە خوێنی خۆت بزانـی.

دەیـەم: ﴿ وَلَا تُخۡرِجُونَ أَنفُسَكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ ﴾، وە خۆتـان لـە مـاڵو حـاڵو نیشـتیمانی خۆتان وەدەرنانێن، دیارە کەس خۆی دەرناکات، بـەڵام کـە تـۆ برایـەکی

مسـولْمان، خوشـكێكی مسـولْمان دەردەكەی لـە مـالْو حـالْی خـۆی، لـە نیشـتیمانی خـۆی، وەك خۆتـت دەركـردبێ وایـە، دیـارە لـەوێ بـاس دەكـات، كـە دوایـی پێـوەی پابەندنـەبوون، وە خـوای پـەروەردگاریش سـزای دان، وەك چـۆن لێرەشـدا وادەفـەرموێ.

<u>**مەسـەلـەی دووەم:**</u> كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَبَعَثۡنَا مِنۡهُمُ ٱثۡنَيۡ عَشَرَ نَقِيبٗا ﴾، وە دوازدە نـەقیبمان لـەنێودا پەیـداكردنو رەوانـەكردن، (نَقِيب) واتـە: مشـووروخۆرو بەرێوەبەرو كارهەڵسـوڕێنەر، بۆ زانیاریتـان خوای كاربـەجێ باسـی دوازدە (نقیب)ی كـردوە، هـەم بـۆ جوولەكـەكان، ئـەوە لێـرەدا وە هـەروەها بـۆ نەصـرانییەكانیش لـە ئینجیلـەكاندا هاتوە، كـە عیسـا دوازدە حـەواریی هەبوون (حواري)، واتـە: هـاوەڵو دۆسـتی دڵسـۆزو مشـوورخۆری زۆر نـزیكو تایبـەت بـە ئینسـانەوە، هـەروەها پێغەمبـەر ﷺیش لە عەقەبـەدا كە پەیمـانی دووەمی لە مسـولْمانان وەرگـرت، كە حـەفتاو پێـنج كـەس بـوون لـە خـەڵكی (يَثْرِب) نوێنـەرانی هـەردووك هـۆز ئـەوس و خەزرەج دوو ئافرەتو حـەفتاو سێ پیاو بوون، پێغەمبـەر ﷺ دوازدە (نَقِيب)ی لـە نێوانیانـدا هەڵبـژارد، كەواتـە: دوازدە مشـوورخۆر: لـەنێو جوولەكـەكاندا بـوون، وە لـەنێو نەصـرانییەكاندا بـوون، وە لـەنێو مسـولْمانانیشـدا بـوون، جـا ئـەو دوازدە نەقیبـەی كـە خـوا لێـرەدا باسـیان دەكـات لـە تەفسـیرەكاندا ئـاوا بـاس دەكـات، وە لـە پەیمانی كۆنیشـدا (واتە: لە تـەوراتو ئـەو كتێبـانـەی كە لەگـەڵ تـەورات دان، پێیـان دەگـوترێ پـەیمانی كـۆن)، لەوێشـدا هـاتوە كـە مووسـا علیه السلام دوای ئـەوەی گەلـی جوولەكـە دەرباز دەكات لەدەست فیرعـەون وە لـە ڕووبـاری نیـل دەپەڕنـەوە، یـان لـە دەریـای سـوور دەپەڕنـەوە، بـەرەو شـام دێـن، بـەرەو دەشـتی (سینا) دێـن، لـەوێ بـەو دوازدە مشـوورخۆر (نَقِيب)ە، دەفەرموێ: بچن بۆ سەر زەمینی كەنعـان، (فەلەستینی ئێسـتا) بچن بزانن داخـۆ ئـەو كەسـانەی كە لـەوێن چـۆنـن؟ چونكـە خـوا بەڵێنـی پێـداوین كـە ئێمـە بچـینە سـەرزەمینی كـەنعان، (سـەرزەمینی فەڵەسـتین)و لـەوێ نیشـتەجێ بین، ئەو كاتە خوا ئەو بەڵێنەی پێداون، دیـارە ئـەو دوازدە كەسـە دەچـن بۆئەوەی بزانن داخۆ ئەوانـە چـۆنـن؟ هێزیـان چـەندە؟ دەسـتەڵاتیان چـەندە، ئەگـەر لەگەڵیـان بەشـەڕ بـێن؟ دیـارە ئەگـەر ئـەوان یەكسـەر بڵێن: ئێمـە هاتووین لێـرە

نیشتەجێ بین، بێگومان لێیان ناگەڕێن و تووشی شەڕ دەبن، بۆیە سەرەتا ئەو دوازدە كەسە دەچن، دیارە مووساش ﷺ بەپێی ئەو بەسەرهاتانە كە گێڕدراونەوە پێیان دەفەرموێ: هەر شتێكتان بینی بڵاوی مەكەنەوە، بە خۆمی بڵێن، واتە: ئەگەر دوژمنەكان دەسەڵاتیان زۆر بوو، بە توانا بوون، شەڕكەرێكی بێ ڕەزا بوون، بڵاوی مەكەنەوە بۆ ئەوەی مەعنەوییاتی خەڵكەكە نەشكێ، تەنیا بە من بڵێن، دوایی لەو دوازدەیە دەیان پەیمان دەشكێنن، تەنیا دوویان خیانەت ناكەن، شتەكە دەپارێزن، لە تەفسیرەكاندا بۆ وێنە: لە تەفسیری (الطبري)دا وەك لە كوردەواریی خۆشماندا باوە باسی (عوج) دەكات، دەڵێ: (عوج) كە بە (عاج)یش هاتوە، كابرایەك بووە لە كەنعانییەكان، كە عەمالیقەشیان پێ گوتوون، دیارە (طبري) ڕەحمەتی خوای لێ بێ زانایەكی زۆر گەورەیە، بەڵام ئەو بەسەرهاتە ئەفسانەییە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ئەو دوازدە كەسە كە چوون لە ڕێگادا تووشی (عاج) یان (عوج) بوون، كە ئەو دووازدە نەفەرەی بینی هەمووی خڕكردنەوە لەبەر پشتێندی نان، گوتی: بۆ خێزانەكەمیان دەبەمەوە، با تەماشایان بكات، ئەو بەشەرە وردیلانە، وە هەندێك دەڵێن: لە نێفۆكی خۆی نان، (واتە: ئەو شوێنەی كە بەنەخوێنی پێدا دەچێ) لەوێی هاوێشتن، ئنجا كە بردنیەوە بردنیەوە هەڵی ڕشتن بۆ هاوسەرەكەی و گوتی: ئەو دوازدە كەسە بەحیساب هاتوون شەڕ لەگەڵ ئێمە بكەن!! ئایا بیانهاڕم، پێیان لێنێم؟ خێزانەكەشی گوتی: نەء، مەیانهاڕە، لێیانگەڕێ، با بڕۆنەوە، چییان دیتوە بۆ قەومەكەیان بیگێڕنەوە، بۆئەوەی مەعنەوییاتیان بشكێ و بزانن كە ئەو خەڵكەی هاتوون شەڕیان لەگەڵ بكەن، پیاوی وەك تۆیان هەیە، دەڵێ: (عاج) ئەگەر ویستبای ماسییان بگرێ یەكسەر دەچووە نێو بەحرێ هەتا ئەژنۆی دەهات، دوایی ماسی دەردەهێنا و بە تیشكی خۆر دەیبرژاندن، ئەوە لە (تأريخ الطَّبَري)دا باسكراوە، بەڵام بێگومان ڕاست نییە، بەڵێ ڕەنگە بە كەلەش بەهێز بوون و شەڕكەرو ئازاش بووبن، واتە: خەڵكێكی نائاسایی بوون، بەڵام بەو شێوەیەش نا كە نەچێتە عەقڵی هیچ كەسێكەوە، بۆیەش لێرەدا باسمكرد تاكو كەسێك كە تەفسیری (طبري) خوێندەوە پێی وانەبێ كە ئەوە ڕیوایەتێكی ڕاستە، ئەویش هەروا بیستوویەتی و هێناویەتی ڕەحمەتی خوای لێبێ، چونكە (طبري) بۆخۆی گوتوویەتی: من هەندێك شت

دەهێنم مەرج نیە پێم ڕاست بێ، زانایان دوایی بۆخۆیان تەحقیق بکەن لێی بکۆڵنەوە، بەڵام هەرچی بیستوومە دەیهێنم بۆئەوەی زایە نەبێ، بزر نەبێ، وەك زانستێك هەبێ، بەڵام ناڵێم کامەی ڕاستەو کامەی ڕاست نیە، جا چ بەنسبەت ئەو شتانەی وەك شوێنەوار بە ناوی هاوەڵانو پێغەمبەریشەوە ﷺ گوتراون، چ بەنسبەت ئەو شتانەوە کە لە بەنی ئیسرائیل وەرگیراون، ئنجا دیارە ئەو دوازدە نەقیبەی جوولەکەکان کە لێرەدا خوا باسیان دەکا، هەموویان پەیمانیان شکاندوە، جگە لە دووانیان کە دوایی لە ئایەتەکاندا دەیگەینێ، ئەوانیش ناویان (یوشع بن نون) وە (كالب بن یوفنا) بوون، بەپێی ئەوەی کە لە کتێبەکانی ئەهلی کیتابدا هاتوە[1].

ئنجا بەنسبەت دوازدە حەوارییەکەی عیساوە ﷺ ئەوانیش هەموویان هەر ڕاست نەبوون، وەك لە ئینجیلی (یوحنّا) لە (إصحاح)ی (١٣) ئایەتی (١٠)دا هاتوە[2]: {فَقَالَ يَسُوعُ: مَنِ اغْتَسَلَ صَارَ كُلُّهُ نَقِيًّا ولايحتَاجُ إِلا لِغَسْلِ قَدَمِيهِ، وَأَنتُمْ أنقياءُ وَلَكِن لَيْسَ كُلُّكُم} واتە: عیسا گوتی: (بە دوازدە حەوارییەکانی هەر کامێك لە ئێوە خۆی شۆردبێ، خاوێن بۆتەوە، وە هیچی پێویست نیە مەگەر هەردوو پێیەکانی بشۆن (بە حیساب عیسا پێی هەر دوازدە حەوارییەکانی شۆردوون، وە بە خاولیەکیش کە لەبەر پشتێنی خۆی چەقاندوە لە ئینجیلەکاندا واهاتوە پێیەکانیشی وشك کردوونەوە، گوتوویەتی: ئێوە هەمووتان پاکن، بەڵام هەمووشتان پاك نین، ناپاکیشتان تێدا هەیە).

ئنجا لە ئینجیلی (متّی) لە (إصحاح)ی (٢٦) لە ئایەتی (١٤و ١٥و ١٦)دا هاتوە[3] ئاوا باسی یەکێکیان دەکات لە دوازدە حەوارییەکان کە خیانەتی بە عیسا کردوە، کە قورئانیش ئاماژەی بەوە کردوە، دەڵێ: {عينَدئِذٍ ذَهَبَ وَاحِدٍ مِن الأثني عَشَرَ وَهُوَ المَدَعو يَهُوذَا الأَسْخَرِيُوطِيَّ إِلى رُؤَسَاءِ الكَهَنَة، وَقَالَ: كَمْ تُعطوني، لأُسلِمَهُ إِلَيْكُمْ فَوَزَنوا لَهُ ثَلاثينَ قِطْعَة مِن الفِضَّة، وَمِنْ ذَلِك الوَقْت أَخَذَ يَهُوذَا يَتَحينُ

---

١) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر العدد، الإصحاح:١٣، (إستكشاف أرض كنعان)، الإصحاح:١٤، (تمرُّد أبناء بني إسرائيل)، ص ٢٩٨ - ٣٠٥ .

٢) الكتاب المقدس: العهد الجديد: ص٢٢١٨.

٣) الكتاب المقدس: ص.١٩٥٦

الفُرصَةَ لِتَسْلِيمه}، واتە: لەو کاتەدا یەکێك لە دوازدەکان (دوازدە حەوارییەکان، واتە دوازدە هاوەڵە تایبەتییەکانی عیسا، یان دوازدە مشوورخۆرەکانی کە لە خزمەتی دابوون) کە پێی دەگوترا (يَهُوذَا الأَسْخَرِيُوطِي) چوو بۆ لای سەرۆکەکانی کاهینەکان[1] وە پێی گوتن: چەندەم دەدەنێ عیساتان تەسلیم بکەم، شوێنەکەتان پێ بڵێم؟ ئەوانیش سی (٣٠) پارچە زیویان بۆ ژمارد، (دیارە دراوی ئەوکاتە زیو بووە) ئیدی ئەوکاتە (يَهُوذَا) لە دەرفەتێك دەگەڕا کە تەسلیمیان بکاتو پێیان بڵێ: عیسا لە فلان ماڵە، وەرن بیگرن دیارە ڕۆمەکانو جوولەکەکانیش هەردووك لایان لە عیسا دەگەڕان، ئەویش خۆیو دوازدە هاوەڵەکەی لە ماڵێکدا بوون، (يَهُوذَا) گوتی: ئەوەتا لێرەدایە، گوتیان: بچۆ زووری بزانە لە وێیە؟ ئەو چووە ژووریو خواش عیسا ﷺ بە کڵاورۆژنەدا سەرخست، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿... وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ... ﴿١٥٧﴾﴾ النساء، واتە: نەیانکوشتو هەڵیشیان نەواسی، بەڵکو وێنەی عیسایان بۆ برایە سەر یەکێکی دی، کە ئەو یەکە، هەر ئەو (يَهُوذَا)یە بوو، کە خیانەتی بە عیسا ﷺ کرد، خواش شێوەی عیسای بردە سەر وی، عیساشی بەرزکردەوە، وەك دەفەرمووێ: ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِ ... ﴿١٥٨﴾﴾ النساء، واتە: بەڵکو خوا بەرەو لای خۆی بەرزی کردەوە، هەر بە زیندوویی نەك وەك نەصرانییەکان دەڵێن، نەصرانییەکان زۆر بە غەڵەت داچوو ون، وەك لە تەفسیری ئەو ئایەتانەی لە سوورەتی (النساء)دا هاتوون، بە درێژی باسمکرد، نەصرانییەکان بە قسەی جوولەکەکان بڕوایان کرد، کە ئێستا نەصرانییەکانیش پێیان وایە عیسا گیراوەو هەڵیشواسراوەو لە داریش دراوە، بەڵام دوای سێ ڕۆژان زیندوو بۆتەوە، لە ئینجیلەکاندا واهاتوە، دەڵێ: عیسا دوای سێ ڕۆژان زیندووبۆتەوە، ئنجا خوا بەرزی کردۆتەوە[2]، کە لەڕاستیدا وانیەو عیسا ﷺ نەکەوتە بەر پەلی جوولەکەکانو ڕۆمەکان کە دەوڵەت بوون،

---

١) كهنة: جمع كاهن وهو عالم اليهود.

٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، إنجيل لوقا، الإصحاح: ٩، (يسوع يعلن عن موته وقيامه)، وە الإصحاح: ٢٤، (قيامة يسوع المسيح)، ص ٢١٠٠و ٢١٥٩ .

جوولەکەکانیش کە خۆیان بە خاوەنی دینی یەهودییەت دەزانی، وە پێیانوابوو عیسا ﷺ لە دینی یەهودییەت هەڵگەڕاوەتەوەو لای داوە، بە دڵنیایی عیسا ﷺ نەکەوتە بەردەستی ئەوان، بەڵکو خوا بەرزی کردەوە وەك بە دەقی ئایەت خوا وا دەفەرموێ: ﴿... وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾﴾ النساء، بەڵام ئەو نهێنییە تەنیا قورئان زانیویەتی، جوولەکەکانیش وایانزانیوە کە عیسایان کوشتووە، ڕۆمەکانیش هەروایان زانیوە، وە نەصرانییەکانیش وایانزانیوە عیسا ﷺ لە دار دراوە، بۆچی؟ چونکە ئەو کابرایەی کە گرتیانو دوایش شێوەی عیسا ﷺ چوو بووە سەر شێوەی وی، کتومت عیسا ﷺ بوو، کە گرتیان گوتی: من عیسا نیم، گوتیان: با هەوی، عەیب ناکەی دەترسێی! ئەدی تا ئێستا نەتگوتووە من پێغەمبەری خواو ناترسێم، عەیبە ئێستا لە مردن دەترسێی! گوتی: هەونیمو عیسا بۆ ئاسمان بەرز بۆوە، گوتیان: عەیبە ئەو درۆو دەلەسەیە مەکە تۆ هەر هەوی، دەڵێ: بەڵام عەجایب ئەوەبوو کە دەیانژماردن یازدە بوون، دەیانگوت باشە دوازدە بوون، ئێستا بۆ بوون بە یازدە؟ ئەوی دیکە چی لێ هات؟ ئەوە لێیان بوو بە مەتەڵ، بەڵام بە هەر حاڵ ئەوە نهێنییەك بوو کە دوایی قورئان ئەو نهێنییەی ئاشکرا کرد، کە لەڕاستیدا ئەوەی لە دار درا (يَهُوذَا الأَسْخَرْيُوطِي) بوو، وە ئەگەر تەماشای ئینجیلەکانیش بکەین، دەردەکەوێ: ئەوەی لە دار دراوە زۆر بێهێز بووە، بۆ وێنە: لە شوێنێکدا دەڵێ: («إِيلِي، إِيلِي، لَمَا شَبَقْتَنِي؟» أَيْ: «إِلهِي، إِلهِي، لِمَاذَا تَرَكْتَنِي؟»)[1] خوایە خوایە! بۆ وێڵت کردم، بۆ بەجێت هێشتم، دیفاعم لێ ناکەی، یان دەڵێ: خوایە ئەمجارەش دەربازم بکە با نەمرم، یانی: زۆر بە بێهێزیی دەردەکەوێ، کە ئەوە خۆ مسوڵمانێك هەر تۆزێ ئیمانداری چاکیش بێ، ئاوا ناپاڕێتەوە بۆ چەنگە خوێنێكو چوار هەناسە ژیان!! چ جای پێغەمبەرێکی پایە بەرزی وەك عیسا ﷺ، کەواتە: دیارە ئەو کەسە (يَهُوذَا الأَسْخَرْيُوطِي) بووە کە زانیویەتی کە لە دار دەدرێو خوا سزای دەدات، بۆیە وا ترساوە، کەواتە: دوازدە حەوارییەکەی عیساش هەموویان ساغ دەرنەچوو ون، بە ئیعتیرافی نەصرانییەکان خۆشیان.

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد الجديد، إنجيل متى، الإصحاح: ٢٧، (يسوع يسلم الروح)، ص ١٩٦٨.

ئنجـا بـا بـزانین دوازده نەقیبەکـەی پێغـەمبەر ﷺ چـۆن بـوون؟ دوازده نەقیبەکەی پێغەمبەری خـوا ﷺ هـەموویان ساغو ڕاستو بـە وەفـا دەرچـوون، دوای ئـەوەی ئـەو حـەفتاو پێنج کەسـە چوونە خزمـەت پێغـەمبەر ﷺ لـە سـاڵی دوازدەیەمی پێغەمبـەرایەتی دا، سـاڵێك پێش ئـەوەی پێغەمبـەر ﷺو هاوەڵانی کۆچ بکـەن بـۆ مەدینـە پێغـەمبەری خـوا ﷺ فەرمـووی: ﴿أَخْرِجُوا إِلَيَّ مِنْكُمْ اثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا، لِيَكُونُوا عَلَى قَوْمِهِمْ بِمَا فِيهِمْ﴾{أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٥٨٣٦)، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حديث قوي وهذا إسناد حَسَنٌ، سيرة ابْنُ هِشَام ج٢، ص٢٢٩، وَالطَّبَراني برقم: (١٧٤)، والذَّهَبِي في تأريخ الإسلام ج١، ص٨٥}، واتـه: دوازده (نقيب)م لەنێـو خۆتـاندا بـۆ هەڵبـژێرن بۆئـەوەی بەسـەرتانەوە سـەرپەرشـتیاربن، (دیـاره دەبێ دوازده بەرەبـاب بووبن)، ئەوانیش دوازده کۆمەڵ بـوون، گوتوویـەتی: با هەر کۆمەڵـە سەرپەرشـتیارێکتان هەبێ، خۆتان لە نێو خۆتانـدا هەڵیبـژێرنو بۆم دەستنیشـان بکەن.

ئنجا دەڵێ: دوایی پێغەمبـەر ﷺ پێی فـەرموون: ﴿أَنْتُمْ عَلَى قَوْمِكُمْ بِمَا فِيهِمْ كُفَلاءُ، كَكَفَالَةِ الْحَوَارِيِّينَ لِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، وَأَنَا كَفِيلٌ عَلَى قَوْمِي "يَعْنِي الْمُسْلِمِينَ" قَالُوا: نَعَمْ﴾[1]، واتە: ئێوه بەسەر کۆمەڵی خۆتـانەوه کەفیـل دەبـن وەك کەفالـەتی حەوارییـەکان، چـۆن لـە جیـاتی عیسـا سـەرپەرشتیاریی خەڵکەکـەیان دەکـرد، سەرپەرشـتیاریی شـوێنکەوتووانی عیسایان دەکـرد، ئێـوەش لـە جیـاتی مـن سەرپەرشـتیاریی خەڵکەکـەی خۆتـان بکـەنو بچـنەوه بـۆ مەدینـە، ئـەوه منـیش کـەفیلم بەسـەر قەومەکـەی خۆمـەوه، کۆمـەڵی خـۆی کـێن؟ بێگومـان هـەموو مسـوڵمانانن، گوتیان: بەڵێ، واتە: ئێمە ئامادەین لە جیاتی تۆ سـەرپەرشتیاریی ئـەو گـەلو کۆمەڵـەی خۆمـان بکـەین، دیـاره وەك لـە مێژووشـدا چەسـپاوه، ئـەو دوازده نەقیبـەی پێغەمبـەر ﷺ وەفـاداربوون بـە پـەیمانی خۆیانـەوەو هیچکەسـی ناسـاغو نارێکیـان تێـدا پەیـدا نەبـوو، هەڵبەتـە لێـرەدا ناڵێیـن: مووسـاو عیسـاش صـەڵاتو سـەلامی خوایـان لەسـەر بـێ، هەڵـەو سـووچیان هـەبووه، بـەڵام ئـەوه فـەزڵو ئیمتیازێکـە خـوا بـە پێغەمبـەری خاتـەمی داوه، کـە ئـەو دوازده مشـوورخۆره، هەموویان سـاغو ڕاسـت دەرچـوون، وه لەڕاسـتیدا هـاوەڵانی پێغـەمبەر ﷺ مەگەر

---

١) سيرة ابْنُ هِشَام ج٢، ص٢٢٩.

بە دەگمەن، ئەگەرنا هەموویان ئاوا ساغو ڕاست دەرچوون، بۆیە شیعەکان کە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بەو چاوە تەماشا دەکەن، کە پەیمانیان شکاندووەو خیانەتیان لە عەلی کردووەو هەڵگەڕاونەوە دوای پێغەمبەر ﷺ، کە هەندێ لە شیعەکان دەڵێن: بێجگە لە دوازدەیان هەموویان هەڵگەڕاونەوە! ئەوە درۆو دەلەسەیەکە هەر شایستەی خۆیانە، وە لەڕاستیدا لە مێژوودا هیچ کەس وەك هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ ساغو ڕاستو وەفادار نەبووە، بەڵام بێگومان هاوەڵانیش پارێزراو نەبوون لە هەڵە، وەك چۆن هەندێك لە ئەهلی سوننەتیش لە بەرانبەر ئەو تێپەڕاندنەی شیعان داو، لە بەرانبەر ئەو بیوەفاییو کورت هێنانەیاندا تێدەپەڕێننو وا تەماشای چوار خەلیفە ڕاشیدەکانو هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ دەکەن، وەك بڵێی: پارێزراو بوو ون لە هەڵە! نەخێر لە هەڵە پارێزراو نەبوونو تووشی گوناهانیش بوو ون، بەڵام بەڕاستی ڕاستترینو ساغترین کەس بوون لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ، وە لەگەڵ ئەو دینو بەرنامەیەدا کە پێغەمبەری خوا ﷺ، هێناویەتی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کەموکوڕییشیان هەبووە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مَعَكُمْ ﴾، وە خوای تاكو پاك دەفەرموێ: من لەگەڵتانم، بەڵام چ کاتێك؟ چونکە وەك پێشتریش باسمان کرد، لەگەڵ بوونی خوا بە گۆترە نیە، بە خۆڕایی خوا لەگەڵ کەس نابێ، وە بە خۆڕاییش پشتی کەس بەرنادات، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي وَعَزَّرْتُمُوهُمْ وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ﴾، ئەگەر ئەوانەتان نەکرد ئەوە لەگەڵتان نیم، وەك لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ ۖ وَإِن يَخْذُلْكُمْ فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ ...﴿١٦٠﴾ ﴾، واتە: ئەگەر خوا پشتتان بگرێ کەس بەسەرتاندا زاڵ نابێ، وە ئەگەر خوا پشتتان بەردا کەس سەرتان ناخات، کەواتە:

جاری واش هەیە خوای کاربەجێ پشتی خەڵکی بەردەدا، بەڵێ خوا پشتی کەسانێك دەگرێ کە لەگەڵ خوا ڕاستو ساغ بن، وە پشتی کەسانێکیش بەردەداو ئیهمالیان دەکات، کە لەگەڵیدا ڕاستو ساغ نەبن، وەك دەبینین خوا پێنج مەرجی داناون بۆ پشتگیریی کردنی خۆی بۆیان:

١- ﴿ أَقَمۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، نوێژ بەرپا بکەن.

٢- ﴿ وَءَاتَيۡتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ ﴾، زەکات بدەن.

٣- ﴿ وَءَامَنتُم بِرُسُلِي ﴾، ئیمان بە پێغەمبەرانی من بێنن.

٤- ﴿ وَعَزَّرۡتُمُوهُمۡ ﴾، پشتی پێغەمبەرانی خوا بگرنو بە هێزیان بکەنو سەریان بخەن.

٥- ﴿ وَأَقۡرَضۡتُمُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنًا ﴾، وە لە پێناوی خوادا ماڵی خۆتان ببەخشن، واتە: بێجگە لە زەکاتیش، چونکە یەکێك بۆی هەیە بڵێ: لەوێ باسی زەکات دەکات، دواییش باسی قەرزی چاك دەکات، قەرزی چاك بە خوا دان، مەبەست پێی بەخشینی ماڵی سوننەتە، ماڵ بەخشینی (تطوع) بێئەوەی لەسەرت فەرزبێ.

جا دەفەرموێ: کەسانێك ئەوانە بکەن، ﴿ لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَلَأُدۡخِلَنَّكُمۡ جَنَّـٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَـٰرُ ﴾، خراپەکانتان لێ دەسڕمەوەو بۆ قیامەتیش دەتانخەمە نێو باغەکانەوە، (بۆ دنیاش پشتتان دەگرمو لەگەڵتانمو هاوکارتانم).

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَـٰقَهُمۡ ﴾، لە ئەنجامی شکاندنی پەیمانەکەیاندا ﴿ لَعَنَّـٰهُمۡ وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦۚ وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ

خَآئِنَةٍ مِّنۡهُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡ ﴾، بەڕاستیی ئەمە زۆر جێی سەرنجەو زۆر جێی هەڵوەستەکردنو پەند لێ وەرگرتنە، کە پەیمان شکاندن لەگەڵ خوای بالادەستدا ئینسان پەلکێش دەکات بۆ زۆر جۆرە گوناهو هەڵەو پەڵەو کەموکوڕیی دیکە، چونکە هەر کات ئینسان بەینی لەگەڵ خوادا تێکچوو، یەکسەر سەرەو ژێر دەبێتەوە، لێرەدا دەفەرموێ: جوولەکەکان لە ئەنجامی ئەوەدا کە پەیمانەکەیان شکاند لەگەڵ خوادا، لەعنەتمان لێکردن و دڵمان ڕەق کردن، وشەکانی خوا دەگۆڕن، وە بەشێك لەوەی پێی ئامۆژگاریی کرابوون لەبیریان کرد، وە بەردەوام خیانەتیش دەکەنو ئاگاداریی خیانەتەکانیان دەبین.

کەواتە: ئینسان دەبێ لە خۆی وریابێ، کەسێ وا هەیە گوناهێکی دێتەپێش، دەڵێ جا خۆ یەك گوناهە، دوایی تۆبە دەکەم!! بەڵام ئەو گوناحکردنە زۆرجار وەك ئەوە وایە ئینسان لە شوێنێکی لێژ وەستابێ و خلیسك ببات، کە لەگەڵ پێی خلیسکا ڕەنگە خۆی پێ نەوەستێ، چونکە ئەوە نیە بڵێی دوو هەنگاو بڕوا، یان سێ هەنگاو بڕوا، دوایی خۆی بۆ بگیرێتەوە، ئێمە جارێك لە ساڵانی ١٩٨٧ و ١٩٨٨ دالە بناری قەندیل سەر دەکەوتین بەیانی بوو، بەستبووی دەمانویست تەماشای ناوچەکە بکەین، زۆر لێژ بوو، برایەکمان خلیسکا خەریك بوو هەر بڕوا، کە ئەگەر نەگیرسابایەوە خوانە خواستە هەر لە بەین دەچوو، سوپاس بۆ خوا دوایی لە نێو قەدی ڕێدا درەختێکی لێبوو، دەستی بە درەختەکە گرتو خۆی گرتەوە، ئەگەرنا دەڕۆیی تا خواری خواری، چیایەکەش شاخێکی زۆر بەرز بوو، گوناحکردنیش ئاوایە ئینسان کە خلیسکا، وەك گوتم بە زەحمەت خۆی پێ کۆنترۆڵ دەکرێ، دەڵێن: کەسێك کە شەراب دەخواتەوە، بەس پێکی یەکەم، یان قومی یەکەم کە دەخواتەوە، دوایی پێیەوە خووگر (مُعْتَاد) دەبێ، یان ئەوانەی ماددەی بێ هۆشکەر بەکاردێنن، دوایی وردە وردە گیرۆدە دەبن، هەروەها داوێنپیسیی، یان قەتڵ، دەڵێن: بابای قاتڵ هەر ئەوەندەیە نەفەرێکی کوشت، ئیدی دوایی نەفەر کوشتنی لەلا وەك ئاو خواردنەوە لێدێ، یان کەسێك کە دزیی دەکات، دەڵێن: ئەوەی یەکەم جار دزیی دەکات ئارەقە دەکاتو ڕەنگی تێکدەچێ، دوایی وردە وردە وەك لە ماڵی خۆی شت بێنێتەوە، ئاوایەو زۆر لەلای ئاسایی دەبێ، ئنجا هەموو گوناهەکان هەر ئاوان، ئینسان قابیلیەتی ئەوەی هەیە، هەم

چاكە بكات، هەم خراپە بكات، بۆ نموونە: كەسێك كە یەكەم جار بە منداڵیی نوێژ دەكات، یان ڕۆژوو دەگرێ، هەر طاعەتێك كە ئەنجام دەدات، سەرەتا پێی قورسە، دوایی زۆر ئاسانە بەلایەوە، بۆیە ئینسان دەبێ لە سەرەتاوە ئاگای لە خۆی بێ، ئەوەتا لێرەدا دەفەرموێ: دوای ئەوەی كە پەیمانیان لەگەڵ خوا شكاند، لەعنەتمان لێكردن، كەواتە: كەسێك پەیمان بشكێنێ خوا لەعنەتی لێ دەكاتو لە ڕەحمەتی خۆی دووری دەخاتەوە، دوایی دڵی ڕەق دەبێ بۆ طاعەت، ئنجا وشەكانی خوا دەگۆڕێ، ئینسان كە لە خوا دووركەوتەوە، دەیەوێ ئایەتەكان لەگەڵ لارییەكەی خۆیدا بگونجێنێ، بۆ نموونە: مەلای وامان هەیە، كە ئێستا لەگەڵ یەكێ لە حیزبە عەلمانییەكان دایە، هەوڵدەدات هەرچی ئایەتو فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ لەگەڵ وەزعە لارەكەی خۆیو حیزبە لارەكەی كە لەگەڵی دایە بیگونجێنێ، نابینن چ لە هەرێمی كوردستان، لەسەر ئاستی عێراق، وە لەسەر ئاستی دنیا ئەو زانایانەی كە لادەدەن، هەرچی ئایەتو فەرمایشتە ملی پێ دەسووڕێننو لەگەڵ وەزعە لارەكەی خۆیاندا دەیانگونجێننو تەئویلیان دەكەن، ﴿ وَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ ﴾، وە بەشێك لەوەی كە پێی ئامۆژگاریی كرابوون فەرامۆشیان كرد، لەبیر خۆیان بردەوە، كەواتە: ڕاستە گوناهەكان یەكدی پەلكێش دەكەن، وەك چۆن چاكە چاكە پەیدا دەكات، بە هەمان شێوە خراپەش خراپە پەیدا دەكات، بۆیە ئینسان دەبێ زۆر لە خۆی وریابێ، وە هیچ گوناهێك بە كەم نەگرێ، گوناهی گچكەش بە كەم نەگرێ، چونكە گوناهە گچكەكانیش دوایی وای لێدەكەن هی گەورە بكات.

(أحمد شوقي) دەربارەی ڕوانینی حەڕام (نظر) قسەیەكی زۆر جوانی هەیە، دەڵێ:

نَظْرَةٌ فَابتِسَامَةٌ فَسَلامٌ فَكَلامٌ فَمَوْعِدٌ فَلِقَاءُ

واتە: ڕوانینێكە، دوایی زەردەخەنەیەكە، پاشان سەلام كردنێكە، ئنجا قسەكردنێكە، دوایی جێی ژوان دانانێكە، لە كۆتایی دا پێككەیشتنە.

عەرەب دەڵێن: (وَمُعْظَمُ النَّارِ مِنْ مُسْتَصْغَرِ الشَّرَرِ) واتە: ئاگری زۆر لە بڵێسەیەكی بچووكەوە پەیدادەبێ، جاری وایە لە دەنكە شقارتەیەكەوە ئاگرێكی

گەورە خەڵەو خەرمانی وا دەسووتێ، گەنمو دەغڵو دانی وا دەسووتێ، لێرەواری وا دەسووتێ كە بە چەند ڕۆژ ناتوانرێ بكوژێنرێتەوە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە بابایەكی جگەرەكێش جگەرەیەك فڕێ دەدات بە ئیهمالیی! بەڵێ ئینسان دەبێ وریابێ لە گوناهانو لە گوناهی گچكەش خۆی بپارێزێ، بۆئەوەی تووشی هی گەورە نەبێ، وە ئەگەر ئینسان تووشی گوناحو هەڵەیەك بوو، زوو بگەڕێتەوە، نەك بچێتە دووی، هەرچەندە پارێز زۆر لە چارەسەر ئاسانترە، كە ئینسان خۆی بپارێزێ لە گوناهان، لەوەی تێوە بگلێو دوایی بگەڕێتەوەو خۆی چارەسەر بكات.

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، لێیان ببووره‌و چاوپۆشییان لێبكە، بێگومان خوا چاكەكارانی خۆشدەوێن، لێرەدا لەگەڵ پێغەمبەریەتی ﷺ، بە نسبەت ئەو جوولەكانەوە كە پەیمانیان شكاندو ئاوایان كردو ئاوایان كرد، دەفەرموێ: لێیان ببوورەو چاوپۆشییان لێبكە، ئایا لە چی لێیان ببوورێو چاوپۆشییان لێبكات؟ لەو هەڵەو پەلانە كە لەگەڵ مسوڵمانانیدا دەیكەن، بۆیە لێرەدا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەم ڕستە قورئانییە نەسخ كراوەیە، چونكە جوولەكەكان كە پەیمان دەشكێننو خراپە دەكەن، چۆن دەبێ پێغەمبەری خوا ﷺ لێیان ببوورێو چاوپۆشییان لێ بكات؟! لەولاشەوە لە سەرەتای سووڕەتی (المائدة) باسمان كرد كە زانایان گوتوویانە: سووڕەتی (المائدة) كۆتا سووڕەتە لە قورئان هاتبێتە خوار، وە دوا حەڵاڵو حەرام لە سووڕەتی (المائدة)دا بەیان كراون، وە هیچ ئایەتێكی تێدانییە كە نەسخ كرابێتەوە، ئایا چۆن ئەوە چارەسەر بكەین؟ من لێرەدا ئەو قسەیەی: (طبري) دێنم، كە بە پێشەوای توێژەرەوانی قورئان ناسراوە، لە تەفسیرەكەی خۆیدا ئەمەی هێناوە، دەڵێ[1]: ﴿عَنْ قَتَادَةَ: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، وَلَمْ يُؤمَر يَوْمَئِذٍ بقِتَالِهِمْ، فَأَمَرَهُ

---

١) جامع البيان: ج٦، ص١٧١، برقم: ١١٥١٦، ١١٥١٧.

اللهُ عَزَّ ذِكْرُهُ أَنْ يَعْفُو عَنْهُم وَيَصْفَحَ، ثُمَّ نَسَخَ ذَلِكَ فِي"بَرَاءَة" فَقَالَ: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾التوبة، وَالَّذِي قَالَهُ قَتَادَة غَيْرُ مَدْفُوعٍ إِمْكَانهُ، غَيْرَ أَنَ النَّاسِخَ الَّذِي لا شَكَّ فِيهِ مِنَ الأَمْرِ، هُوَ مَا كَانَ نَافِياً كُلَّ مَعَانِي خِلافِهِ الَّذِي كَانَ قَبْلَهُ، فأمَّا مَا كَانَ غَيْرَ نَافٍ جَمِيعَهُ، فَلاَ سَبِيلَ إِلى العِلْمِ بِأَنَّهُ نَاسِخ إلاَّ بِخَبَرٍ مِنَ اللهِ جَلَّ وَعَزَّ أَوْ مِنْ رَسولِهِ ﷺ، وَلَيْسَ فِي قَوْلِهِ: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ... ﴾، دلالَةٌ عَلَى الأَمْرِ بِنَفْيِ مَعَانِي الصَّفْحِ وَالعَفْوِ عَنِ اليَهُود، وَإِذ كَانَ ذَلِكَ كَذَلِكَ، وَكَانَ جَائِزاً مَعَ إِقْرَارِهِم بالصَّغَارِ وَأَدَائِهِم الْجِزيَةَ بَعْدَ القِتَالِ، الأَمرُ بِالعَفْوِ عَنْهُمْ فِي غَدْرَةٍ هَمُّوا بِهَا، أَو نَكْثَةٍ عَزَمُوا عَلَيْهَا، مَا لَمْ يَنْصِبُوا حَرباً دُونَ أَدَاء الْجِزْيَةِ، وَيَمْتَنِعُوا مِنَ الأَحْكَام اللازِمَة لهم، لَمْ يَكُنْ وَاجِباً أَنْ يُحكَمَ لِقَوْلِهِ: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ... ﴾ الآية، بِأَنَّهُ نَاسِخٌ قَوْلِهِ: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾.

واتە: لە قەتادەوە هاتوە (کە یەکێکە لە زانایانی تابعین، واتە: جیلی دوای هاوەڵان) گوتوویەتی: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، بۆیە خوا وایفەرمووە ئەو کاتە فەرمان نەکرابوو بە جەنگ کردن لەگەڵ جوولەکەکاندا، بۆیە خوای ناوبانگ بەرز فەرمانی کردوە بە پێغەمبەر ﷺ کە لێیان ببووریٚو چاوپۆشییان لێ بکات، بەڵام دوایی لە سوورەتی (براءة)دا ئەو لێبووردنو چاوپۆشییە نەسخ کرایەوە، وە خوا فەرمووی: ﴿ قَٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَلَا يُحَرِّمُونَ مَا حَرَّمَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَلَا يَدِينُونَ دِينَ ٱلۡحَقِّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حَتَّىٰ يُعۡطُواْ ٱلۡجِزۡيَةَ عَن يَدٖ وَهُمۡ صَٰغِرُونَ ٢٩ ﴾

التـوبة، واتە: لەگەڵ ئەوانەدا بجەنگن کە ئیمان بە خـواو بە ڕۆژی دوایی ناهێنـن، لـە خاوەن کتێبەکان، تاکو سـەرانە دەدەن، بە ملکـەچیی.

(طَبَري) دەڵـێ: ئەوەی قەتـادە گوتوویەتی: ناڵێین ناگونجێ، بەڵام لابەری حوکمـی پێشـێ کاتێـك دەبـێ، وە گومـانی تێدا نابـێ، ئـەوەی کـە ناسیخە تێکبگـیرێ لەگـەڵ هەموو ئەو ماناو مەبەستانەی ئەوەدا کە مەنسووخە، بەڵام کە لەگەڵ هـەموو مانـاو مەبەسـتەکانی تێکنەگـیرێ، وە هـەواڵێکمان پـێ نـەبێ لەلایـەن خـواو پێغـەمبەری خـواوە ﷺ کـە ئـەم ئایەتـەی دوایـی هاتوە لەگـەڵ ئـەوەی پێشـێ دا تێکـدەگیرێو، ئەوەی پێشـێی نەسخ کردۆتەوە (مادام لەلایـەن خـواو پێغـەمبەرەوە هەواڵێکمـان پـێ نەبـێ، وە لەگـەڵ هـەموو مەبەسـتەکانی پێشـێ تێکنەگـیرێ نـاتوانین بڵـێین: مەنسووخە) جا دەڵـێ: ئـەوە کـە خوا دەفەرموێ: ﴿ قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ... ﴾، هـیچ دەلالـەتێکی تێدانیـە کـە تێکـبگیرێ لەگـەڵ هەموو ئەو واتاو مەبەستانەدا کە لەو ڕسـتە قورئانییـەدا هـاتوون، کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، چـونکە لـە حاڵـێکدا کـە جوولەکەو نەصـرانییەکان دان بەوەدا بێنن کـە سـەرانە بـدەن بـە ملکـەچییو دوای ئـەوەی کە جەنگیان لەگەڵدا دەکرێ، جەنگەکە ڕادەگرنو دەڵێن: ئامادەین سەرانە بدەین، (ئەندازەیەك ماڵمان بدەین بە دەوڵەتی ئیسلامییو لە ژێـر سایەی دەوڵەتی ئیسـلامیدا دەمێنینـەوە)، ئـەوە کـە ئەگـەر جارێـك پـەیمانێکیان شـکاندبێ، یـاخود هەڵەیـەکیان کردبـێ، مسـوڵمانان چاوپۆشـییان لـێ بکـەنو لێیـان ببوورن، مـادام سەرانە بـدەنو ملکـەچ بـن بۆ دەوڵەتی ئیسـلامیی، ئـەو دووانـە تێکناگـیرێن. واتـە: جەنگ لەگـەڵدا کرانیان هەتا سـەرانە دەدەن، لەگەڵ چاوپۆشـیی لێکردنیاندا لەسـەر هەنـدێ هەڵەو کەموکوڕیـی تێکناگـیرێ، بـە مـەرجێك جـەنگ لەگەڵ مسـوڵماناندا نەکەن، کـە سـەنگەریان لـێ بگـرنو بڵـێن: سـەرانە نـادەین، وە لاملـییو سـەرپێچیی نەکەن لـەو یاسا شـەرعییانەی کە ڕوویان تـێ دەکەنو دەبـێ جێبەجێیـان بکـەن، مادام وا نەکەن، ئەو کاتە ڕێی تێدەچێ کە مسـوڵمانان چاوپۆشییان لـێ بکەن لە هەنـدێك هەڵـەو کەموکـوڕیی، وەك چـۆن پێغەمبـەر ﷺ چاوپۆشـیی لـە هەنـدێ هەڵـەو کەموکـوڕیی مسـوڵمانان کـردوە، ئەوانیـش هـاووڵاتینو دانیشـتووی ژێـر

سایەی دەوڵەتی ئیسلامیین، ئەگەر هەندێك هەڵەو کەموکورییشیان هەبوون، چاوپۆشییان لێ بکرێ، ئەوە پێویست ناکات بگوترێ: نەسخ بۆتەوە، بەتایبەتیش کە خوای بالادەست دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، واتە: بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن، کەواتە: لێبوردن لە خەڵك و چاوپۆشیی لێکردنیان لە هەندێك هەڵەو کەموکورییی بە مەرجێك نەگەیشتبێتە رادەی ئەوە کە دژایەتی دەوڵەتی ئیسلامیی بکەن، واتە: هەڵەی کەسیی، بۆ وێنە: کەسێك لە جوولەکەکان قسەیەکی غەڵەت دەکات، وەك ئەوەی (فنحاص) گوتی: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٌ وَنَحْنُ أَغْنِيَآءُ...﴿١٨١﴾﴾ آل عمران، وە دوای ئەوە ئەبوبەکر خوا لێی رازی بێ زللەیەکی لێدا، وەك لە سووڕەتی (آل عمران)دا باسمان کردوە[1]، دوایی پێغەمبەر ﷺ پشتگیریی ئەبوبەکری نەکرد، خوا لێی رازی بێ، هەرچەندە کابرای جوولەکە بێئەدەبییەکی گەورەی کردبوو، کە گوتی: خوا فەقیرەو ئێمە دەوڵەمەندین!! چونکە خوا دەفەرموێ: قەرزم بدەنێ، کەواتە: دیارە خوا پێویستی بە ئێمەیە، کە ئەوە بێئەدەبییەکی گەورەیە، بەلام خوای زاناو شارەزا، ئایەتی ناردە خوار: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِىٓ أَمْوَٰلِكُمْ وَأَنفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟ أَذًى كَثِيرًا ۚ وَإِن تَصْبِرُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾ آل عمران، واتە: مسۆگەرین لە ماڵو سامانتانو لە خودی خۆشتان دا تاقی دەکرێنەوە، وە لەوانەی پێش ئێوە کتێبیان پێدراوەو لەوانەش کە هاوبەشیان (بۆ خوا) پەیداکردوە، ئازاری زۆر دەبیستن، وە ئەگەر خۆڕاگربنو پارێزکاربن، ئەوە ئەو خۆڕاگریی‌و پارێزکارییە لەو کارانەیە کە (لەلایەن خواوە) جەختیان لەسەر کراوە، (یان پێویست بە بڕیاری بەهێزو ئیرادەی پتەو دەکەن)، واتە: ئەگەر سزایان نەدەن، ئەوە لەو شتانەیە کە پێویستیان بە عەزیمەت دەکات، کە ئەوە هاندانی مسوڵمانانە کە چاوپۆشیی لەو کەموکورییانەیان بکەن، با عەقیدەی غەڵەتیشیان

---

١) بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب) ج ١، ص ٣٣٩ - ٣٤٢ .

هەبێ، با قسەی بێئەدەبانەش بکەن، چاوپۆشییان لێ بکەن، بە مەرجێك شتەکەیان نەبووبێتە سەرپێچییەکی گشتی.

کەواتە: ئایەتی ژمارە (٢٩)ی سوورەتی (التوبة) لەگەڵ ئەم ڕستە قورئانییەی ئەم ئایەتەی سوورەتی (المائدة)دا تێکناگیرێن، تاکو بڵێین: ئەوەی دواییان، ئەوەی پێشێی نەسخ کردۆتەوە، کە دیارە من بۆ خۆم قەناعەتم وایە هیچ ڕستەیەك لە قورئاندا نیە نەسخ کرابێتەوە، واتە: هیچ ڕستەیەك لە قورئاندا نیە کە کاری پێ نەکرێ، وەك لە سوورەتی (البقرة)دا لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرە، بە تەفصیل باسم کردوە، بەڵگەشم لەسەر هێناوەتەوە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ فَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴾، لێرەدا پێویستە سێ شتان لەم ئایەتە موبارەکە وەربگرین:

**یەکەم:** کە دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ ﴾، واتە: ئەوانەی گوتیان: ئێمە نەصرانیین، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە لەو دەعوایەیاندا ڕاست ناکەن، وەکو تۆ بە یەکێك بڵێی: تۆش دەڵێی مسوڵمانم؟! یانی من ناڵێم هەوی، ئەگەر بڵێی: خۆ تۆش مسوڵمانی، ئەوە مانایەکە، بەڵام ئەگەر بڵێی تۆش خۆت بە مسوڵمان دەزانی؟ یان خۆ تۆش دەڵێی مسوڵمانم؟! ئەوە مانای وایە من بڕوات پێ ناکەم، کە وادەڵێی، یاخود قەناعەتم وا نیە کە تۆ مسوڵمان بی، ئنجا کە لێرەدا دەفەرمووێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ ﴾، واتە: ئەوانەی کە گوتیان: ئێمە نەصرانیین، نەیفەرمووە: (وَمِنَ النَّصَارَىٰ) بۆچی؟ چونکە وشەی (نَصَارَىٰ) کۆی (نصراني)یە، نەصرانیی، واتە: ئەوانەی کە یارمەتی خوایان داوەو پشتی دینی خوایان

گرتـووەو، پشـــتی پێغەمبــەرانیان گرتـوە، کـە ئـەوان وا نـەبوون، بۆیـە ئــەو نـاوە نێوەڕۆکـێکی وەك خـۆی لەگەڵدا نیـە.

دووەم: کـــە دەفـــەرموێ: ﴿ أَخَذْنَا مِيثَٰقَهُمْ ﴾، واتـــە: پەیمـــانێکی پتـــەومان لـەوانیش وەرگــرت، پەیمانـە پتەوەکـە پێشـتر باسـمان کـرد، واتـە: خـوا بـەڵێن‌و پـەیمانی وەرگـرتوە لـە هــەموو خـاوەن کتێبـە ئاسمانییەکان کە بەندایەتیـی بـۆ خـوا بکەن‌و، پابەنـد بن بە کتێـب‌و شـەریعەتی خواوە.

سێیەم: وە کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَنَسُواْ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ فَأَغْرَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ ﴾، ئەمـە ئـەوەی لـێ وەردەگیرێ، وەك پێشـتریش باسمان کرد، کە هەمیشـە لەبیرچوون‌و پشـتـگوێ خسـتنی بەشێك لـە دین، دەبێتـە هـۆی ناکۆکـیی‌و دووبەرەکـیی، ئەگـەر دیـن هــەمووی بگـری لەگـەڵ دینـــدارانی سـاغ‌و راسـتدا نـاکۆك نـابی، هـاوەڵانی بـەرێز خـوا لێیـان ڕازی بـێ، چونکە دەسـتیان بـە هـەموو دینـەوە گرتبـوو، لـەنێو خۆیانـدا تـەباو ڕێـك بـوون، بەڵـێ دوایـی شـەیتان زەفـەری بـــە هەنـــدێکیان بـــرد لەســـەر مەســـەلەی زەعامـــەت‌و ســـەرۆکایەتیی‌و دوژمنانیشـیان دەستیان تێخسـتن، بەڵام گرنـگ ئەوەیـە هیچیان کێشـەیان نـەبووە لەسـەر ئـەوەی ئـەو ئایەتـە ئیشـی پـێ‌دەکرێ، یـاخود ئیسلام جـەنگ و جیهـادی تێدایـەو، بـەڵام بانگەوازو پـەروەردەی تێدانیـە، سیاسـەت‌و حوکمی تێدایـە، بـەڵام عیبـادەتی تێدانیـە، یـان عیبـادەتی تێدایـە، بـەڵام لایـەنی ئـابووریی تێدانیـە، هـیچ کەسێکیان لەسەر ئەو شتانە کێشـــەو مشـتومڕیان نـەبووە، بـەڵام جیلـەکانی دوایـی لەسەر ئەوە کێشـــەو مشـتومڕیان هـەبووە، ئێسـتا مسـولمانی وا هەیـە، پێـی وایـە ئیسـلام سـیاســەتیی تێـدانیـە، یـان ئیسـلام حیزبـایەتی تێـدانیـە، یـان ئیسـلام جـەنگ‌و فیداکـاریی تێدانیـە، بـەڵکو خەڵـکێکی ناحـاڵیی‌و فەقیـرۆکەمان هەیـە، دەڵـێ: فـەرزە یـان سـوننەتە مسـولمانان هــەر پـرژو بڵاوبـن‌و، ناشـــەرعیی‌و بیدعەتـە، پێکـەوەبن، ئەگــەر پێکـەوە خڕبنــەوەو ئیشــی خۆیـان ڕێکبخـــەن‌و بەرپرسـێکیان هـەبێ‌و ئیشــی خۆیـان ڕێـك بخــەن، خراپـە!! وەك دەبیـنین لێـرەدا خوای بەرزو مەزن بۆمان باسی نەقیبـان دەکات‌و بۆمـان باسـی کۆمەڵـبوون‌و کـاری

هەرەوەزیی دەکات، کەچی مسوڵمانی فەقیرۆکەی وا هەیە دەڵێ: بیدعەتە مسوڵمانان خڕبنەوە سەر یەك، دەبێ هەر پرژو بڵاو بن‌و لێکترازاو بن، بێ خەبەر لەوە ئەو دینە گەورەیە بە کاری هەرەوەزیی‌و بە خەڵکی پێکەوە جۆشدراوو لێکبەستراو نەبێ، چۆن بەڕێوە دەچێ؟! چۆن دەگونجێ ئەم واقیعە بگۆڕدرێ‌و ئەم شەریعەتەی تێدا پیادە بکرێ؟ بەڵام بە هەرحاڵ ئەوە هەمووی لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەیە لە قورئان‌و سوننەت، کە هەر کەسێك لایەك دەگرێ، کەسێك کە ئەو لایەی گرتوە، لەگەڵ ئەوی دیکە کە لایەکی دیکەی گرتوە، تێکدەگیرێ، سۆفیی‌و سەلەفیی، ئەوی دیکەو ئەوی دیکە تێکدەگیرێن، بەڵام ئەگەر تۆ بێنی هەموو لایەنەکانی ئیسلام بگری، وەك چۆن پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی بەڕێزی دینداریان کردوە، ئاوا دینداریی بکەی، هەستیارییت بەرانبەر هیچ کەس نابێ، بەڵێ کەسێك کە زیاتر خەریکی لایەنی تەزکیەی نەفسە، بە مەرجێك پابەندبێ بە شەریعەتەوە، ئەوەش هەر کارێکی خێرە، وە ئەوی دیکە کە زیاتر خەریکی لایەنی دژایەتییکردنی بیدعەت‌و ئەو شتانەیە، کە پەیدا کراون لە بواری ئیمان‌و عیبادەتدا، ئەوێش هەر خەریکی کارێکی چاکە، کە بەشێکە لە کاری ئیسلامیی، وە ئەوی دیکە کە خەریکی جەنگ‌و جیهادە، ئەوی دیکە خەریکی لایەنی سیاسەتە، ئەوی دیکە خەریکی لایەنی کۆمەڵایەتییە ... هتد، ئینسان دەبێ دان بە هەموویاندا بێنێ، هەموویان بە هی خۆی بزانێ.

ئنجا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ ﴾، دوژمنایەتیی‌و ڕق‌و کینەمان لە نێودا پەیدا کردن، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: خوا دوژمنایەتیی‌و ناکۆکیی لە نێوان خەڵکیدا پەیدا دەکات؟

وەڵامەکەی ئەوەیە کە خوای دادگەر لێرەدا باسی هاتنە دی یاسایەکی خۆی دەکات، کە دەرەنجامەکەی خوا پەیدای نەکردوە، بەو واتایە خوای بەرز داوای کردبێ، بەڵام بۆیە پاڵی دەداتە لای خۆی، چونکە بە پێی یاسای خوا هاتۆتە دی، وەك چۆن کەسێك ژەهر دەخواتەوە، دوایی ژەهرەکە دەیکوژێ، ئەو کەسە کە ژەهرەکەی داوەتێ بۆی هەیە بڵێ: من کوشتم، هەرچەندە ڕاستەوخۆ نەیکوشتوە،

بەڵکو لە ڕێی ژەهر پێدانەوە بووە، کە ژەهرەکەش ڕەنگە بە نەفەرێکی دیکەدا بۆی ناردبێ، مەبەست ئەوەیە کە خوای کاربەجێ یاسایەکی داناوە، کە هەر کاتێك ئەهلی دین بەشێك لە دینیان فەرامۆش کرد، دژایەتیی‌و ناکۆکییان لەنێودا پەیدادەبێ، جا خوا دەفەرموێ: ئێمە پەیدامان کرد، واتە: بە پێی یاسای ئێمە پەیدابوو، نەك خوای پەروەردگار دژایەتیی‌و ناکۆکیی لە نێوانی ئەهلی دیندا پەیدا بکات، بەڵام خوا وای داناوە، هەر کاتێك خەڵك بە دینی خواوە پابەندبن، بە هەموو دینەوە پێکەوە، ئەوە تەباو کۆك‌و ڕێکدەبن، بەڵام ئەگەر هەندێکیان ئەو لایان گرت‌و هەندێکیان لایەکی دیکەیان گرت، ناکۆکییان لە بەینیدا پەیدادەبێ، ئەوەش یاسای خوایە، بۆیە خوا ئەو دەرەنجامە پاڵ دەداتە لای خۆی، ئەگەرنا خوا ناکۆکیی‌و دژایەتیی لە نێوان خەڵکدا پەیدا ناکات، دەبێ ئاوا بە وردی لە وشەکانی خوا تێبگەین، بۆ ئەوەی بەرانبەر بە خوای پەروەردگار تووشی بێئەدەبیی نەبین، بڵێین: خوای دادگەر دوژمنایەتیی‌و ناکۆکیی پەیدا دەکات، جا هەندێك لەوانەی بە حیساب ڕەخنە لە قورئان دەگرن، ڕستەیەکی ئاوا دێنن‌و هەر بە سەرکێڵیی تەماشای دەکەن، دەڵێن: تەماشا! ئەدی بۆچی دەڵێن خوا هەر چاکەی دەوێ بۆ بەندەکانی‌و خراپەی ناوێ؟! ئەدی ئەوە نیە لێرە دەفەرموێ: دوژمنایەتیی‌و ڕق‌و کینەمان لە بەیندا پەیداکردن کەواتە: خوا خەڵکی تێکبەردەدات! نەخێر، مەبەست ئەوەیە کە ئێمە گوتبوومان بە هەموو دینەوە پابەندبن، کەچی ئەوان هەندێکیان لێ فەرامۆش کردو، لە ئەنجامی ئەوەدا کە بە قسەی ئێمەیان نەکرد، ناکۆکییان لە بەیندا پەیدا بوو، بەپێی یاسای ئێمە ئەو دەرەنجامە هاتە دی.

**مەسەلەی حەوتەم‌و کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿وَسَوْفَ يُنَبِّئُهُمُ اللَّهُ بِمَا كَانُوا يَصْنَعُونَ﴾، ئەمە هەڕەشەیە: لەمەودوا خوا هەواڵیان پێدەدات بەوەی کە بە وردەکاریی دەیانکرد، ئایا جیاوازیی لە نێوان ﴿يَصْنَعُونَ و يَفْعَلُونَ و يَعْمَلُونَ و يَكْسِبُونَ﴾دا چییە؟!، جیاوازیی ورد وردیان هەن: بە زۆریی وایە وشەی (عَمَل) ئیرادەی لەگەڵ دایە، بەڵام (فعل) جاری وایە مرۆڤ ئەو شتەی ناوێ، دەشبێ، (كَسْب) ئەوەیە ئینسان بۆ خۆی بەدەستی بێنێ،

(صُنْع) ئەوەیە کە وردەکاریی تێدابێ، ناگونجێ (صنع) پاڵ بدرێتە لای ماددەی بێ ژیان، بۆ وێنە: لای دارو درەخت، بەڵکو پاڵ دەدرێتە لای ئینسان، وە پاڵ دەدرێتە لای خوای پەروەردگار ﴿... صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ... ﴿٨٨﴾﴾ النمل، واتە: ئەوە دروستکراوی خوایە، کە هەموو شتێکی بە وردیی دروست کردوە، هەروەها پاڵ دەدرێتە لای ئینسان، ئینسانیش کاتێك شتەکەی خۆی زۆر بە وردەکاریی دەکات، کارەکەی پێی دەگوترێ: (صُنع)، بەلاّم ئەگەر زۆر وردەکاریی تێدا نەبێ پێی دەگوترێ: (فعل)، وەك هەر لەم سوورەتی (المائدة)دا کە دوایی دەیگەینێ خوا بۆ جوولەکەو نەصرانییەکان، بۆ خەڵکە گشتییەکەیان (فعل) بەکاردێنێ، بەلاّم بۆ زاناکانیان (صُنع) بەکاردێنێ، بۆچی؟ چونکە زاناکان زۆر بە وردەکاریی شتەکەیان کردوە، پیلانەکان بە وردیی دادەڕێژن، بەلاّم خەڵکەکە هەر وا بە شێوەیەکی سەرکێڵیی شتەکان ئەنجام دەدەن، کەواتە: لێرەدا خوا دەیەوێ پێیان بفەرموێ: ئەو کردەوانەی کە زۆر بە پەنهانکاریی و وردەکاریی و لێزانانەوە دەیانکرد، خوا هەواڵیان پێ دەدات، بۆئەوەی کە سەرزەنشتیان بکات و سەرەنجام سزایان بدات، دوای ئەوەی کە وایان لێدەکات دان بە هەڵەکانیاندا بێنن، بۆئەوەی ئەو سزایەی کە دەیاندات بزانن کە سزایەکی پڕ بە پێستە بۆ ئەوان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پێنجەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی: (١٥، ١٦، ١٧، ١٨، ١٩) دەتوێژینەوەو تەفسیر دەکەین، کە خوا ﷻ لەم پێنج ئایەتە موبارەکەدا بانگی خاوەن کتێبەکان دەکات بەگشتی، وە پێیان ڕادەگەیەنێ کە پێغەمبەرێکی بۆ ناردوون، زۆرێك لەو شتانەی کە شاردوویاننەوە بۆیان ئاشکرا دەکات و چاوپۆشیی لە هەندێك شت دەکات، پاشان پێناسەی قورئان دەکات بە: ﴿نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ۝١٥ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ﴾، دوایی بیروبڕوایی نەصرانییەکان ڕادەگەیەنێ لەسەر بە خوا دانانی عیسا، یان بە بەشێك لە خوا دانانی سەلامی خوای لێ بێ، پاشان بەرپەرچیان دەداتەوە، بە خستنەڕووی چەند ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر، ئنجا باسی لاف لێدانی جوولەکەو نەصرانییان دەکات، بەوە کە کوڕان و خۆشەویستانی خوان و، هەڵیدەوەشێنێتەوە.

لە کۆتایی دا جارێکی دیکە بانگیان دەکات، کە هاتنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ پاش دابڕانی وەحی بووە، بۆ ماوەی شەش سەدەو دە ساڵ، کە پێشتر بەردەوام پێغەمبەرانێکیان بۆ هاتوون بۆ موژدە پێدانیان و ترساندن و ئاگادارکردنەوەیان لە سزای خوا، وە ئەمجارەش بۆ دواجار ئەوە پێغەمبەری خاتەمیان بۆ هات.

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا
كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖۚ قَدۡ جَآءَكُم
مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ١٥ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ
سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ
إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ١٦ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ
ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ
ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗاۗ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ
وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٧ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ
وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ
مِّمَّنۡ خَلَقَۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ١٨ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ
فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ
وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٩ ﴾

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی خاوەن کتێبینـەـ! ئـەوە پێغەمبەرەکـەمان هاتـە لاتـان زۆرێـك لـەوەی کە لـە کتێـب (ی خـوا کـە لەلاتانـە) دەتانشـاردەوە، بۆتـان ڕوون دەکاتـەوەو چاوپۆشـییش لـە زۆرێك دەکات (کـە پێویسـت ناکات ڕوون بکرێتـەوە)، بێگومـان ڕووناکییـەك‌و کتێبێکـی ڕۆشـنکەرەوەتان لە خواوە بۆ هـات ﴿١٥﴾ خوا ڕێنمایی کەسانێکی پێدەکات - کە شـوێن ڕەزامەندیی یەکەی دەکـەون - بـەرەو ڕێبازەکانی ئاشـتیی‌و، لە تاریکایی یـەکان بـەرەو ڕووناکیی بە ویستی خۆی دەربازیان دەکات‌و، بـەرەو ڕاستە شـەقام ڕێنمایی یان دەکات ﴿١٦﴾ بە دڵنیایی یەوە ئەوانەی گوتیـان: خوا مەسـیحی کوڕی مەریەمـە، بێبـڕوان، بڵـێ: ئایا کـێ هیچ شـتێکی لـە خواوە بەدەسـتە، ئەگـەر بیـەوێ مەسـیحی کوڕی مەریـەم‌و دایکـی‌و تێکـڕای ئەوانەی لەسـەر زەویین، لەبەیـن بـەرێ، وە مـوڵکی ئاسمانـەکان‌و زەوی‌و هەرچی کە لەنێوانیان دایـە هـی خوایـە، هەرچی بیـەوێ وە دی دێنـێ، وە خـوا لەسـەر هـەموو شـتێك بەتوانـایە ﴿١٧﴾ وە جوولەکـەو نەصـرانییەکان گوتیـان: ئێمـە کـوڕان‌و خۆشـەویستانی خواین، بڵـێ: ئـەدی بۆچی بـە هـۆی گوناهەکانتـانـەوە سـزاو ئازارتـان دەدات؟! بەڵکـو ئێوەش بەشـەرێکن وەك ئـەو خەڵکەی کە خوڵقانـدوونی، هـەر کەسێك بیـــەوێ دەیبـــووری‌و هـەر کەسـێکیش بیـــەوێ ســـزاو ئـــازاری دەدات، وە موڵـــکی ئاسـمانەکان‌و زەوی‌و ئەوەی نێوانیـان هـی خوایـەو سـەرەنجامیش هـەر بـۆ لای ویـە ﴿١٨﴾ ئـەی خـاوەن کتێبینـەـ! ئـەوە پێغەمبەرەکـەمان هاتـە لاتـان، پـاش دابڕانێکـی (هاتنـی) پێغەمبەران (ئەو ڕاسـتییانەی کـە پێویسـتتانن) بۆتـان ڕۆشـن دەکاتـەوە، نـەوەك بڵێن: هیـچ موژدەدەرو ترسـێنەرێکمان بۆ نەهـاتوە، بێگومـان ئـەوە مـوژدەدەرو ترسـێنەرتـان بۆ هـات، وە خوا لەسـەر هـەموو شـتێك بە توانـایە ﴿١٩﴾)).

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(نُورٌ ): خوای پەروەردگار قورئان بە چەند وشەیەك پێناسە دەكات، یەكێك لەوانە بریتیە لە (نور)، ئەم وشەیەش لە زمانی عەرەبیدا ئاوا پێناسە كراوە: (النُّورُ: الضُّوءُ الـمُنْتَشِرُ الَّذِي يُعِينُ عَلَى الإِبْصَارِ، وَهُوَ ضَرْبَانِ: مَعْقُولٌ، وَمَحْسُوسٌ) واتە: نوور ئەو ڕووناكییەیە كە بڵاودەبێتەوە، وە یارمەتی بینین دەدات، (كە دیارە ئێمە بە هۆی ڕووناكییەوە شت دەبینین) دیارە ڕووناكییش دوو جۆرە: ڕووناكییەكی مەعنەویی مەعقوول، كە بە عەقڵ دەرك دەكرێ، كە لێرەدا بە قورئان دەفەرموێ نوورە، واتە: نوورێكی مەعنەویی، وە نووری بەرهەستیش وەك: چراو گڵۆپو ئەو ڕووناكییانەی كە بە چاو دەبینرێن.

(ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ): مەسیح نازناوی عیسای كوڕی مەریەمە، یانی: مەسیحی كوڕی مەریەم، جا عیسا ﷺ لە قورئاندا هەمیشە پاڵدراوەتە لای دایكی، چونكە هەر دایكی هەیە، بابی نیە، مەسیح لە چییەوە هاتوە؟ مەسیح یان (فعیل)ە بە مانای (فاعل)، یان (فعیل) بە مانای (مفعول)، دەڵێ: (الـمَسِيحُ مِنَ الـمَسْحِ، بِمَعْنَى الفَاعِلِ، الذَّاهِبُ فِي الأَرْضِ، أَمْسَحَ ذَا العَاهَةِ، أَوِ الـمَمْسُوحُ بِمَعْنَى الـمَفْعُولِ: مُسِحَ مِنْهُ قُوَّةُ الشَّرِّ) یان بە مانای كەسێكە بە زەویدا دەڕواتو سیاحەت دەكات، ئەگەر مەسیح لێرەدا بە مانای (فاعل) بێ، چونكە عیسا ﷺ سیاحەتی كردووە زۆر گەڕاوە بە زەویدا بۆ بانگەوازكردنی خەڵكی بۆ لای خوا، یاخود لەبەرئەوەی كە دەستی بە خەڵكی دا هێناوەو مەسحی كردوون، كاتێك نەخۆشو نەساغ بوون هاتوونە لای، ئەویش دەستی پێداهێناوەو خوای شیفادەر شیفای بۆ ناردوون، یانیش بە مانای (مفعول)ە، كە كەسێكە شەڕو خراپەی تێدا مەسح كراوەتەوەو لابردراوە، هێزی شەڕو پاڵنەری خراپەی تێدا لابردراوە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، هیچ كەسێك نەبووە خەتەرەی گوناهی بە دڵدا نەیەت جگە لە عیسای كوڕی مەریەم، كە بە خەتەرەش بەسەر دڵی دا نەهاتوە گوناح بكات، دەڵێن ئەویش لە بەرەكەتی دووعای نەنكی،

واتە: دایکی مەریەم، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِذْ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ عِمْرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرْتُ لَكَ مَا فِي بَطْنِي مُحَرَّرًا ...﴿٣٥﴾ ﴾آل عمران، واتە: کاتێك خێزانی عیمران گوتی: پەروەردگارم! ئەوەی لە زگم دایە (کە مەریەم بوو) نەزری دەکەم بۆ تۆ، وە دوایی گوتی: ﴿ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ...﴿٣٦﴾ ﴾ آل عمران، وە خوایە! من خۆیو ئەوەشی کە لێی دەبێ، پەنای پێ بە تۆ دەگرم لە شەیتانی نەفرەت لێکراو، بۆیە شەیتان زەفەری بە عیسا ﵇ نەبردوە.

(**عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ** ): وشەی (فَتَرَة) بە مانای (إنقطاع) دێ، (فَتَرَ، يَفتُرُ)، (الفتُورُ: سُكُونٌ بَعْدَ حِدَّةٍ، وَلِيِنٌ بَعْدَ شِدَّةٍ، وَضَعْفٌ بَعْدَ قُوَّةٍ)، (فتُور) بە مانای وەستانی شتێك دێ دوای ئەوەی کە زۆر بەهێز ئەو شتە بجووڵێنری، یاخود شتێکی توندە دوایی نەرم بێتەوە، یان شتێك بەهێزبێ دوایی بێهێز بێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾، واتە: دوای دابڕانێك لە پێغەمبەران.

جا بۆ زانیاریتان درێژترین ماوەی نێوان دوو پێغەمبەران (عليهم الصَّلاة والسلام) ئەو ماوەیە بووە کە لە نێوانی عیساو موحەممەد دا بووە، صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر، ئەگەرنا دەربارەی پێغەمبەرانی دیکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ...﴿٤٤﴾ ﴾المؤمنون، واتە: پاشان پێغەمبەرانی خۆمان پەیتا پەیتا، یەك لە دوای یەك ناردوون، وە ماوەی نێوان عیساو موحەممەد (٦١٠) شەش سەدو دە ساڵ بووە، وەك دوایی تۆزێکی ڕوون دەکەینەوە.

(**بَشِيرٍ** ): (أَي: المُبَشِّر) واتە: موژدەدەر، دڵخۆشکەر، (وأَبشرتُهُ: أَخْبَرتُهُ بِسارٍّ بَسَطَ بَشَرةَ وَجْهِهِ)، (أَبشرتُهُ، بَشَّرتهُ) واتە: هەواڵو موژدەیەکی خۆشم پێدا بوو بە هۆی گەشبوونی دەموچاوی، ئینسان لە کاتێکدا کە هەواڵی خۆشی پێدەگات،

دەموچاوی گەش دەبێ، یان ڕوون دەبێ، بە پێچەوانەشەوە کاتێك هەواڵێکی ناخۆشی پێدەدرێ، دەمو چاوی تاریك دادێو لێڵ دەبێ، تەنانەت پێغەمبەری خواش ﷺ وا بووە، وە بە زۆری ئینسانی ڕاستگۆ وان، ئەوانەی کە ڕواڵەتو دەروونیان یەکە، واتە: حاڵەتی دوو فلیقانیو نیفاقیان نیە، بە خۆشیی دڵخۆش دەبن، بە ناخۆشیی دڵناخۆش دەبن، وە خۆشییو ناخۆشیی لەسەر دەموچاویان دەردەکەوێ.

(**نَذِيرٍ**): (نَذير جَمْعُهُ: نُذُر: المُنْذِر)، (نُذُر) کۆی (نَذير)ە، واتە: ئاگادارکەرەوە، ئاگادارکەرەوەکان، یاخود ترسێنەرەکان، ئنجا دەڵێ (الإِنْذَار إِخْبَارٌ فِيهِ تَخْوِيفٌ كَمَا أَنَّ التَّبْشِيرَ إِخْبَارٌ فيهِ سُرُورٌ)، (إِنْذَار) بریتیە لە هەواڵ پێدانێك کە ترسی تێدایە، هەروەك چۆن (تَبْشِير) بریتیە لە هەواڵ پێدانێك کە دڵخۆشیی تێدایە.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

خـوای پەروەردگـار هەر لەسەر باسی خاوەن کتێبەکان دەڕوا، کە دیارە وەك کاتی خۆی لە پێناسەی ئەم سوورەتە موبارەکەدا باسمان کرد، پانتاییەکی باش تەرخان کراوە بۆ وتوویژکردن لەگەڵ خاوەن کتێبەکان، لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکان، بەڵام زۆربەی جار دواندنەکان ڕوو لە جوولەکەکان دەکات، بەڵام بەگشتی ڕوو لە هەردووکیانە، لێرەدا ڕوو لە هەردووکیانە، خـوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴾، ئەی خاوەن کتێبینە! خـوا ﷻ لە قورئاندا کاتێك بیەوێ بە شێوەیەك جوولەکەو نەصرانییەکان بدوێنێ، کە حاڵەتێکی ئاسایی وەربگرێ، یاخود حاڵەتی ڕێز لێگیرانی تێدا بخوێنرێتەوە بە ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ دەیاندوێنێ، بە پێچەوانەوەش ئەگەر لە حاڵەتی سەرزەنشتو لێتووڕەبوونیاندابێ، کە باسی کەموکوڕییەکانیان دەکات بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ﴾، ئەوانەی کتێبیان پێدراوە، لێرەدا خـوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی خاوەن کتێبینە! ﴿ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، پێغەمبەری ئێمەتان بۆ هات، زۆرێك لەوەی کە لە کتێبدا دەتانشاردەوەو پەنهانتان دەکرد، بۆتان ڕوون دەکاتەوە، مەبەست پێی چییە؟ دیارە ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا هەڵوەستەیەکی درێژ لەوبارەوە دەکەین، چونکە خاوەن کتێبەکان هەم لە ڕووی عەقیدەوە، هەم لە ڕووی شەریعەتەوە، هەم لە ڕووی مامەڵە لەگەڵ پێغەمبەراندا ﷺ زۆر ڕاستییان شاردۆتەوە، وە زۆر ڕاستیی کە لە کتێبەکانی خۆیاندا هەبوون، گۆڕیوویانن، بەڵام دوایی قورئان بۆی دەرخستوون، جا ئەوەی کە دەویسترێ لەم ئایەتە موبارەکە ڕابگەیەنرێ، ئەوەیە کە خاوەن کتێبەکان واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان بەتایبەت، زۆرێك لەو ڕاستییانەی لە کتێبەکانی خۆیاندا، لە زەبوورو تەوراتو ئینجیلدا هەبوون، دیارە ئەو کتێبانە

ناویان لە قورئاندا هاتوە، بەڵام ئەوان لە پەیمانی کۆن‌و نوێدا باسی زۆر کتێبی دیکەش دەکەن، ئەوەی کە لە کتێبەکانی خۆیاندا بۆیان ڕوون کراوەتەوە، زۆربەیان شاردۆتەوە، یاخود گۆڕیویانە، قورئان هاتوە زۆرێك لەو ڕاستییانە دەخاتەڕوو، جا چ لە ڕووی عەقیدەوە، چ لە ڕووی شەریعەتەوە، چ لە ڕووی پێغەمبەرانەوە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ ﴾، چاوپۆشیی لە زۆرێکیش دەکات، واتە: زۆرێکی کە پێویست بکات ڕوونی دەکاتەوە لە قورئاندا، بەڵام زۆرێکیش کە پێویست نەکات چاوپۆشیی لێدەکات، چونکە هەندێك شتیان گۆڕیوەو شاردۆتەوە، پێویست ناکات‌و قورئان بە پێویستی نازانێ ئەو شتانە بخاتە ڕوو، لەبەر ئەوەی بەشەریەت پێویستی پێی نیە، بۆیە چاوپۆشیی لێدەکات، بۆیە تەماشا دەکەی قورئان هیچ شتێکی نا پێویستی تێدانیە، هەندێ شت کە ئەوان شاردوویانەتەوە، واتە: ئەوەی کە شاردوویانەتەوە، هەر ئەوانە نین کە قورئان دەریان دەخات، ئیدیکەش هەبوون، شاردوویانەتەوەو گۆڕیویانە، بەڵام مادام بەشەریەت پێویستی پێیان نەبێ، قورئان جارێکی دیکە دەریان ناخاتەوە: ﴿ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴾، بێگومان لە خواوە ڕووناکییەکتان بۆ هاتوە، وە کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە، دوایی باسی دەکەین، کە هەندێك لە زانایان پێیان وایە لێرەدا مەبەست لە نوور پێغەمبەرە ﷺ، وە (وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ)یش مەبەست پێی قورئانە، بەڵام من وای تێدەگەم کە هەردووکیان هەر مەبەست پێی قورئانە، لێرەدا هەر باسی قورئان دەکرێ، ئەویدیکە مەبەست پێی پێغەمبەر ﷺ بوو، ئەو پێغەمبەرە ﷺ کۆمەڵێك ڕاستی دەخاتە ڕوو کە ئەوان شاردوویاننەوە، بە هۆی چییەوە دەیانخاتەڕوو؟ بەهۆی قورئانەوە، بۆیە پێشێ باسی پێغەمبەری ﷺ کرد، ئنجا پێناسەی ئەو کتێبە دەکات دەفەرموێ: ﴿ قَدۡ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٞ ﴾، بێگومان لە خواوە ڕووناکییەکتان بۆ هاتوە، ﴿ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴾، وە کتێبێکی ڕۆشنکەرەوەیە، یاخود کتێبێکی ڕۆشنە، وشەی (مُّبِينٞ ) ئەگەر لە (بَانَ، يَبِينُ)ەوە بێ (فعل لازم)ە، (بَانَ، يَبِينُ)، واتە: دەرکەوت، دەردەکەوێ، ئەوکاتە واتە: کتێبێکی ڕۆشن، بەڵام ئەگەر لە (أبَانَ، يُبِينُ)ەوەبێ، دەگونجێ (لازم) بێ‌و دەشگونجێ (مُتَعدِّي) بێ،

واتە: دەریخست دەریدەخات، واتە: کتێبێکی ڕۆشنکەرەوە، جا دیارە کە قورئان هەم کتێبێکی ڕۆشنەو، لە ماناکانی تێدەگەی هەر کەسێك شارەزای زمانی عەرەبی بێ، بەقەدەر خۆی لە قورئان تێدەگات، هەم ڕۆشنکەرەوەشە، هەردووك لایە.

ئنجا لەسەر پێناسەی قورئان بەردەوام دەبێ و دەفەرموێ: ﴿ يَهۡدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ﴾، هەر کەسێك بە دوای ڕەزامەندیی خوا بکەوێ، خوا بە هۆی ئەو کتێبەوە بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتیی، ڕێنمایی دەکات، یانی: خوا بە هۆی قورئانەوە ڕێنمایی کەسانێك دەکات بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتیی، کە ئەو کەسانە کێن؟ ئەوانەن کە مەبەستیان وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوای پەروەردگارە، لەم ئایەتەوە بۆمان دەردەکەوێ کە کەسێك مەبەستی وەدەستهێنانی ڕەزامەندیی خوا نەبێ، لە قورئان بەهرەمەند نابێ، بۆیە زۆر کەس کە قورئان دەخوێنێتەوە، سوودی لێ نابینێ، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ جَعَلۡنَا بَيۡنَكَ وَبَيۡنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ حِجَابٗا مَّسۡتُورٗا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلۡنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ أَكِنَّةً أَن يَفۡقَهُوهُ وَفِيٓ ءَاذَانِهِمۡ وَقۡرٗاۚ وَإِذَا ذَكَرۡتَ رَبَّكَ فِي ٱلۡقُرۡءَانِ وَحۡدَهُۥ وَلَّوۡاْ عَلَىٰٓ أَدۡبَٰرِهِمۡ نُفُورٗا ﴿٤٦﴾ ﴾الإسراء، واتە: کاتێك کە قورئان دەخوێنیەوە، لە نێوانی تۆو ئەوانەدا کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نیە (واتە: بێبڕوایەکان) پەردەیەکی داپۆشراومان داناوەو دڵیانمان خستۆتە توورەکەوەو گوێیان قورسایی تێدایە، واتە: وەك کەسێك وان کە دڵی لە توورەکە دابێ و پەردەیەکی ئەستووری لە پێش چاوبێ، وە گوێشی گیرابێ، کەسێك وابێ دیارە لە هیچ شتێك حاڵی نابێ، ئەوانەش بە هۆی ئەو کوفرەوە کە لە دڵیاندا هەیە، بەهرەمەند نابن.

جا ئەوە لێتان وەصیەت بێ، ئینسان بە ئەندازەی ئیمانی لە قورئان تێدەگا، هەر کەسە بە ئەندازەی ئەوەی کە لە خوا نزیکە، لە فەرمایشتی خوا حاڵی دەبێ، بە ئەندازەی ئەوە کە ئیمانت بە خوا هەبێ، مەبەستت بێ خوا لێت ڕازی بێ، کە تەماشای کتێبەکەی دەکەی لە ڕاستییەکانی کتێبی خوا بەهرەمەند دەبێ، ﴿ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ ﴾، وە خوا بە هۆی ئەوەوە

کـە بـە دوای ڕەزامەنـدیی خـوا دەکـەون، لـە تاریکاییـەکان دەربازیـان دەکـات بـەرەو ڕووناکـایی، بۆچی تاریکـاییەکانی بە کۆ هێناون‌و ڕووناکیی بە تاك هێنـاوە؟!

لەبەرئـەوەی ئیسـلام یـەك بەرنامەیـە، وەحـی خوایـە، کـە لـە قورئـان‌و سـوننەتدا بەرجەستەیە، بەڵام تاریکاییەکان چ مەبەسـت پێی بەرنامەکان بێ، کە زۆرن: ئەوانـەی لـە ڕۆژهەڵاتـەوە هـاتوون‌و، ئەوانـەی لـە ڕۆژئـاواوە هـاتوون‌و، ئەوانـەی لێـرە سـەرهەڵدەدەن، چ مەبەسـت پێـی حاڵەتـەکانی بێ کەوتنە تاریکـیی ئینسـان بێ، لـە ڕووی بوونناسـیی، لـە ڕووی ئیمـان‌و عەقیـدەوە، لـە ڕووی ڕەوشـت‌و ئاکـار، لـە ڕووی سـیاسـی، لە ڕووی ئابووریی، لە ڕووی کۆمەڵایـەتیی ... هتـد، ئینسـان دەکەوێتـە زۆر جۆرە تاریکـییەوە، بەڵام یەك ڕۆشـناییمان هەیـەو ڕووناکیی تەنیا یەك حاڵەتی هەیـە، بەڵام تاریکاییەکان جۆراوجۆرن، بە مۆڵەتی خـوا، بـە فەرمانی خوا لە تاریکاییەکـان دەربازیـان دەکـات بـەرەو ڕۆشـنایی، ﴿ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، وە بـەرەو ڕاسـتە شـەقام ڕێنماییـان دەکـات، کەسانێك کە مەبەسـتیان وە بەدەسـتهێنانی ڕەزامەنـدیی خـوا بێ.

ئنجـا خـوا دوای پێناسـەکردنی پێغەمبـەری کۆتـایی خـۆی‌و کتێبـی کۆتـایی خـۆی، ئنجـا دێتە سـەر باسـی دەرخستنی حەقیقـەتی عەقیـدەو دینـداریی خـاوەن کتێبـەکان بـە تایبـەت نەصـرانییەکان، سـەرەتا باسـی ئـەوان دەکـات، دەفـەرموێ: ﴿ لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَۚ ﴾، بێگومـان بێبـڕوان ئەوانـەی کـە گوتیـان: خوا مەسـیحی کوڕی مەریـەمە، واتە: ئەوانە بێبـڕوان.

هەندێك لە ئەهلـی عیلـم ئەوانـەی کە زیـاتر بە پێـی دڵخواسـتی دەسـەڵاتداران قسـە دەکـەن، زۆر جـاران وشـەی کـافر بـۆ جوولەکـەو نەصـرانییەکان بـەکارناهێنن، دەڵێن: ئەوەنیـە ئـەوانیش خـوا دەناسـن، ئیمانیـان بـە خـوا هەیـە، ئیمانیـان بـە ڕۆژی دوایـی هەیـە، ئیمانیان بە پێغەمبـەران هـەیە، با ئیمانیشـیان بـە پێغەمبەری ئێمـە نەبـێ، مادام ئیمانیـان بە پێغەمبـەران هـەیە، ناگونجێ بڵێـین: کـافـرن[1]!.

---

١) هەڵبـەتە دەگونجێ وشـەی (نامسوڵمانان – غیـر المسـلمین) بۆ هاووڵاتییانی کـافر لـە جوولەکەو نەصرانیـی و غەیـری وانـیش بەکـار بهێنـرێ، بـەڵام نابـێ لـەبارەی کافربوونیانـەوە مشـتومڕ (جدال) هەبـێ .

بەڕێـزان! لەڕاسـتیدا عیلم هەبوون بە خوا جیایە لە ئیمان هەبوون، عـیلم هـەبوون بە ڕۆژی دوایی جیـایە، لە ئیمان هــەبوون پێی، عیلم هـــەبوون بـە پێغەمبـەران جیایـە لە ئیمان هەبوون بەوەی كە پێغەمبەران لەلایەن خواوە هاتوون، فەرقیان چییــە؟

ئیمان بە شـتێك ئەوەیە كە ئەو شـتەت وەك خـۆی دەرك كردبێ بـە عـەقڵ، وە بـە دڵ قبووڵت كردبێو پەسندت كردبێ، وە بە زمانیش دانی پێدابێنـیو، بە كردەوەكانیش بە پێـی ئەوە ڕەفتـار بكەی. چونكە ئیمـان دەبـێ چوار پێكـهێنەری تێـدابن، ئەوجـار پێی دەگوترێ ئیمـان، ئەگـەرنا ئایـا ئیبلیس بـە ئیمانـدار لـە قەڵەم دەدرێ، كـە قسەی لەگەڵ خوادا كـردووەو، موناقەشـەی لەگەڵ خـوادا كـردووە؟ نـەخێر، هەرچـەندە عیلمـی بـە خوا هەبووەو زانیویەتی خوا هەیـە، خـوا هەقـەو ڕاسـتە، بـەڵام ئیمـانی نـەبووە، چونكە ئیمـان بە خـوا تەنیا بریتی نیــە لە عیلم هەبوون بە خـوا، بەڵكو بریتیـە لـە: {عـیلم پـێ هـەبوون + خۆشـویسـتنو قبـووڵكردنو بـۆ ملكەچـبوون + دانپێـداهێنان بـە زمـان + جێبەجێكردن بە ئەندامەكـان}.

ئینسـان چوار هێـزی سـەرەكی هەن كە بریتیـن لـە:

١/ هێـزێك كە شـتی پـێ دەرك دەكـات، كە بریتیە لە عەقڵو هـۆش.

٢/ هێـزێك كە شتی پێ قبووڵ یان ڕەفز دەكات، كە بریتیە لە هێزی دڵو ئـیرادە.

٣/ هێـزێك كە شتی پێ دەربـڕێ، كە بریتیە لە هێـزی زمان، یان نووسـین.

٤/ هێزێكیش كە شـتی پـێ جێبـەجـێ دەكات، كـە بریتیـە لـە هێـزی ئەندامـەكانی جەستە.

ئنجـا ئیمـان پەیوەندیی بە هەر كـام لەو چـوار هێزانــەوە هەیـە.

جا لێـرەدا خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: بێگومـان ئەوانـەی كـە گوتیـان: مەسـیحی كـوڕی مەریـەم خوایـە، بێـبڕوان، ئنجا قسـەكەیان هەڵدەوەشـێنێتەوەو دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا ﴾، (ئـەی موحەممـەد ﷺ، یـان هـەر كەسـێك كـە قورئـان دەخوێنـــێ) تـۆ (بـە نەصـــڕانییەكانی ســـەردەمی خـۆت) بڵـــێ: كـــێ لـە خــواوە هـیچ

شـتێکی بەدەستە؟! ئەگەر خوا بیەوێ مەسیحی کوڕی مەریەمو دایکیشی لە بەین بەرێ ، وە ئەگەر تێکڕای ئەوانەی لەسەر زەویش دان هەمووان بفەوتێنێ، کێ هیچی پێدەکرێ؟ کەس، کەواتە: وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (هەر خوا خوایە، ئەویدی هەمووی کاو بایە)، لە بەرانبەر خوادا هیچ کەس هیچی بەدەست نیە، بۆیە ناگونجێ عیسای کوڕی مەریەم، کە مانو نەمانی بە دەستی خوایە، وە دایکیشی، وە تێکڕای ئەوانەی لەسەر زەویشن، ناگونجێ بەشێك بێ لە خوا، چونکە هیچی بە دەست نیە، خوا ئەو کەسەیە دەژیەنێو دەمرێنێ، دروست دەکاتو لە بەین دەبات، هەموو شتێکی بەدەستە.

ئنجا دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ﴾، وە موڵکی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیشیانەوە، هی خوایە، وە هەرچی بیەوێ دروستی دەکات، واتە: هەرچی هەیە خوا خاوەنیەتی، واتە: ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی دەکەوێتە نێوانیانەوە، لە دوای ئەوانەش هەر شتێکی دیکە بیەوێ دروستی دەکات، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، ئەوە خوایە جل جلالە، خوا دەبێ ئاوابێ، ئەوە پێناسەکەیەتی، ئەوە وەسفەکەیەتی، خاوەنداریێتیی هەموو شتێکی هەیە، وە هەرچی بیەوێ دروستی دەکات، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، بەلام عیسا ﷷ "بە عەقیدەی وان" بەرگریی پێ لە خۆی نەکرا، کاتێك جوولەکەو ڕۆمەکان گرتیانو لە سێدارەیاندا، بەلام ئێمە دەڵێین: لە سێدارە نەدراوە، کە بێگومان قسەکەی ئەوان ناڕاستە، وەك من لە تەفسیری ئایەتەکانی سووڕەتی (النساء)دا بە تەفصیل باسی ئەوەم کردوە، هەروەها لە ئایەتەکانی سووڕەتی (آل عمران)یش دا.

ئنجا خوای پەروەردگار باسی لاف لێدانو ئیددیعاو درۆیەکی دیکەی جوولەکەو نەصرانییەکان دەکاو هەڵیدەوەشێنێتەوە، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ ﴾، جوولەکەو نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواینو خۆشەویستانی خواین، کە دوایی ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا ڕوونی دەکەینەوە، کە

ئایا ئەو قسەیان کردوە، یان قسەیەکی دیکەیان کردوە، کە ئەوە دەگەیەنێ؟! بەس هەرچی خوا فەرموویەتی، بە تەئکید وایە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە مەبەستی خوا وەك خوا ﷻ مەبەستیەتیو ویستوویەتی ئاوا تێیبگەین، چونکە هەندێك لە زانایان دەڵێن، وە نەصرانییەکانیش دەڵێن: کوا ئێمە نەمانگوتوە ئێمە کوڕی خواین، بەس دەڵێین: عیسا کوڕی خوایە، وە جوولەکەکان نەیانگوتوە، ئێمە هەموومان کوڕی خواین، دەڵێن: بەس عوزێر کوڕی خوایە، ئەدی ئایا مسوڵمانینە ئەوەتان لە کوێ هێناوە؟ دوایی ئەوە ڕوون دەکەینەوە.

ئنجا دوای ئەوە فەرمووی: جوولەکەو نەصرانییەکان گوتیان: ئێمە کوڕانی خواینو خۆشەویستانی خواین، دەفەرموێ: ﴿قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ﴾، بڵێ: ئەدی بۆچی بە هۆی گوناهەکانتانەوە سزاتان دەدات؟ چونکە بۆ خۆیان دان بەوەدادێنن کە خوا بە هۆی گوناهەکانیانەوە سزایان دەدات، جا هەرچی جوولەکەن دەڵێن: ئێمە چەند ڕۆژێکی کەم نەبێ لە دۆزەخدا نامێنینەوە، چل ڕۆژ، بە ئەندازەی ئەو چل ڕۆژە کە باب‌و باپیرانیان گۆلکە زێڕینەیان پەرستوە، وە نەصرانییەکان دەڵێن: عیسا دەبێتە بەلاگێڕەوەو فیداکارمانو بۆیە لە خاچ دراوە، تاکو گوناهەکانی ئێمە بسڕێتەوە، گرنگ ئەوەیە جوولەکەو نەصرانیی هەردووکیان دان بەوە دا دێنن کە خوا سزایان دەدات، ئنجا خوا دەفەرموێ: ئەدی ئەگەر ئێوە کوڕانو خۆشەویستانی خوان، بۆچی خوا بە هۆی گوناهەکانتانەوە سزاتان دەدات؟! کەواتە: دان پێداهێنانتان بەوەدا کە بە هۆی گوناهەکانتانەوە سزاتان دەدات، ئەو قسەیەتان هەڵدەوەشێنێتەوە، چونکە هیچ بابێك کوڕی خۆیو خۆشەویستی خۆی سزا نادات، ﴿بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَۚ﴾، بەڵکو ئێوەش بەشەرێکنو خەڵکێکن، وەك ئەو خەڵکەی دیکە کە خوا دروستی کردوون، واتە: لەسەر چاکە پاداشتتان هەیەو، لەسەر خراپە سزاتان هەیە، نە کوڕی خوانو نە خۆشەویستی خوان، دروستکراوەکانی خوا لەگەڵ خوای بێهاوتادا هیچ نسبەتێکیان نیە، مەگەر نسبەتی بەندایەتیی، ئەگەر بۆ خوا فەرمانبەرو ملکەچ بن، خوا خۆشی دەوێنو پاداشتیان دەداتەوە، وە ئەگەر سەرپێچیی لە فەرمانی خوا بکەن، خوا ڕقی لێیان هەڵدەستێو سزایان دەدات، هەر کەسە بە پێی خۆی، ﴿يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ﴾، ئەوانەی کە خوا

دروستی كردوون، هەر كەس بیەوێ، لێی دەبووڕێ، وە هەر كەسێكیش بیەوێ، ئازارو سزای دەدات ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ﴾، وە موڵكی ئاسمانەكانو زەوی، وە ئەوەش كە دەكەوێتە نێوانیانەوە، موڵكی خوایە وە سەرەنجامیش بۆ لای خوایە، ئایا بۆچی خوای كاربەجێ ئەو ڕستەیە دووبارە دەكاتەوە؟ چونكە نەصرانییەكان ئێستاشی لەگەڵدابێ، زۆر بە داكۆكیی لەسەر كردنو جەختی لەسەر كردنەوە دەڵێن: عیسا كوڕی خوایە، خواش (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: عیسایەك بە دانپێداهێنانی خۆتان گوایە جوولەكەكان گرتوویانەو لە داریان داوەو هەڵیانواسیوە، ناگونجێ كوڕی خوابێ، وە ناگونجێ بەشێك بێ لە خوا، چونكە ئەوەی خاوەن بێ سەرەنجامیش هەر لە لای ویە، كە خوایە.

ئنجا لە كۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ﴾، ئەی خاوەن كتێبینە! ئەوە پێغەمبەری ئێمەتان بۆ لا هات، واتە: پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ بۆتان ڕوون دەكاتەوە، چییان بۆ ڕوون دەكاتەوە؟ لێرەدا بەگشتی فەرموویەتی، ﴿يُبَيِّنُ لَكُمْ﴾، واتە: هەموو ئەوەی كە پێویستە پێغەمبەری خوا ڕوونی دەكاتەوە، ﴿عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾، دوای دابڕانێك لە پێغەمبەران یانی: (عَلَى انقِطَاعٍ مِنَ الرُّسُل أو عَلَى انقِطَاع مِنَ إرسَال الرُّسُل) دوای ماوەیەك كە خوای پەروەردگار ناردنی پێغەمبەرانی ڕاگرت، ئنجا پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ هات، دیارە ئەو ڕاگرتنەی پێغەمبەرانیش بۆ ئەو ماوەیە، چەندان حیكمەتی تێدان، یەكێك لە حیكمەتەكان بریتییە لەوەی كە هەموو بەشەرییەت چاوەڕێی پێغەمبەری كۆتایی بێ، كە لە هەر چوار لای دنیاوە هەموو بەشەر چاوەڕێ بوون: جوولەكە، نەصرانیی، زەردەشتی، بوودیی، هەر هەموو چاوەڕێیان كردوە، چونكە لە كتێبەكانی خۆیاندا بینیویانە كە پێغەمبەری كۆتایی دێو پێغەمبەرانی پێش خۆی هەموو بە ڕاست دەزانێ، كتێبەكانیان بە ڕاست دەزانێ، بەڵام ئەو گۆڕانكارییو دەستكارییانەی كە لە كتێبەكاندا هەن هەموویان ڕاست دەكاتەوە، چاودێرە بەسەریانەوە، بەڵام ئەگەر خوای كاربەجێ وەك عادەتی خۆی لەو ماوەیەشدا پێغەمبەرانی پەیتا پەیتا ناردبایە، ئاوا چاوەڕێ نەدەبوون، بەڵام دوای ئەوەی (٦١٠)

شەش سەدو دە ساڵ پێغەمبەران نەهاتوون، هەموو بەشەر گوتوویانە: پێغەمبەری کۆتایی دێ.

بۆیە ئێوە تەماشا بکەن ! کە دوایی ئیسلام ئاوا بە خێرایی بڵاوبۆتەوە لەبەرچی بووە؟ لەبەر ئەوە بووە کە بەشەرییەت هەمووی چاوەڕێ بووە، زانیویانە پێغەمبەری کۆتایی دێ، بەڵام جوولەکە گوتوویانە: لە ئێمەیە، نەصرانیی پێیان وابووە عیسا دێتە خوارەوە، هەندێکی دی گوتوویانە: لە ئێمەیە، ڕەنگە عەرەب لە هەموو کەس کەمتر چاوەڕوانییان کردبێ، یان هەر چاوەڕوانییان نەکردوە، چونکە شوێنەواریی پێغەمبەرایەتییان زۆر لە نێودا کوژاوەتەوە، بەڵام سەرەنجام خوای کاربەجێ لە نێو گەلی عەرەبدا ناردی، ﴿أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖ﴾، بۆیە ئەو پێغەمبەرەمان بۆ ناردن ئەی خاوەن کتێبەکان! تاکو نەڵێن: (كَرَاهَةَ أَنْ تقولوا) یان (لِأَلاَّ تَقُولُوا) هیچ دڵخۆشکەرو ترسێنەرێکمان بۆ نەهاتوە، خوای بەرز پێغەمبەران بەو دوو وەسفە وەسف دەکات، ﴿بَشِيرٖ﴾ و ﴿نَذِيرٖ﴾، دڵخۆشکەرو ترسێنەر، یاخود موژدەپێدەرو ورياكەرەوە ﴿فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ﴾، ئەوە بە تەئكید هات بۆ لاتان هات دڵخۆشكەرێكو ترسێنەرێك، یاخود موژدەدەرێكو وریاكەرەوەیەك كە موحەممەدە ﷺ، ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ﴾، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، كەواتە: ئەی خاوەن كتێبەكان! ئێوە بیانووتان نیە، كە لەسەر كتێبە گۆڕدراوەكانی خۆتان بمێننەوە، وە شوێن پێغەمبەرانی خۆتان بكەون، كە شوێنەواری ئەوانتان ڕەش كردۆتەوەو تێكتان داوە، دوای ئەوەی خوا پێغەمبەری كۆتایی بۆ ناردن، كە هەموو ئەو پێغەمبەرانە برای ئەون، هەموویان بە ڕاست دەزانێو هەموویانی خۆشدەوێ، وە كتێبەكانیشیان بە ڕاست دەزانێ، وە هەرچی گۆڕانكارییو دەستكاریی كردووتانە لە كتێبەكانتاندا، ئەوەی پێویست بكات دەستنیشانو دیاریی دەكات.

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، كە پێشتر مانامان كرد، ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەی لێوەردەگیرێ، كە قورئان زۆر شتی ئاشكرا كردوە لەوەی كە جوولەكەو نەصرانییەكان شاردوویانەتەوە، واتە: لە كتێبەكانی خۆیاندا هەبووە، بەڵام ئەوان پەنهانیان كردوە، بۆ وێنە: سیفەتو ناونیشانەكانی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ من بۆخۆم پەیمانی كۆنو پەیمانی نوێم خوێندۆتەوە، ئێستاش لە پەیمانی كۆندا لە چەند شوێنێكدا، هەروەها لە پەیمانی نوێدا واتە: چوار ئینجیلەكان، باسی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ هەیە، بەڵام تۆزێك گۆڕیوویانە، بەڵام چەند وەسفێكیان باس كردوە، كە ئەو وەسفانە بەسەر غەیری پێغەمبەری كۆتایی موحەممەددا ﷺ ناچەسپێن، وەك من لەو كتێبەی لە (سجن)دا نووسیومە: (الإِسْلام كَمَا يَتَجَلّى فِي كِتَابِ اللّه) ئاماژەم بە هەندێك لەو شوێنانە كردوە، وە زۆر لە زانایان ئاماژەیان بەو شوێنانە كردوە، لە هەردووك پەیمانی كۆنو نوێدا.

بەڵام جگە لە سیفەتو ناونیشانەكانی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ جوولەكەو نەصرانییەكان شتی دیكەشیان شاردۆتەوە، بۆ نموونە:

# چەند نموونەیەك لە شاردنەوەی خاوەن كتێبەكان بۆ راستییەكان



<u>یەكەم/</u> لە بواری خوا ناسینو خوا بە یەككگرتن (مَعْرِفَةُ اللّٰه والتوحید):

چ جوولەكەكان، چ نەصرانییەكان كۆمەڵێك شتیان دەربارەی خوای بەرز بەرزوێنە باس كردوە، كە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ خـوادا ناگونجێ، بۆیە ئێمە دڵنیایین كە ئەوان خواناسیی ڕاستەقینەیان شاردۆتەوە، خوا بەیەكگرتنی ڕاستەقینەیان شاردۆتەوەو ئەو شتانەیان خستۆتە شوێنی، دیارە كتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس) لە هەردوو پەیمانی كۆنو پەیمانی نوێ پێكهاتوە، ئنجا پەیمانی كۆنیش بریتییە لە تەورات بە هەموو سیفرەكانیەوە، (سفر العدد، سفر الخروج، سفر التكوین ...إلخ)، هەروەها ئەو كتێبانەی دیكە، وەك زەبووری داوودو ئەوەی بۆ سولەیمان هاتوەو هەرچییەك كە لە خوارەوە هاتوە تاكو سەردەمی عیسا، هەمووی تێدایە، وە پەیمانی نوێش بریتییە لە چوار ئینجیلەكانو ئەو كتێبانەی دیكەی دوای عیسا نووسراونەوە.

هەڵبەتە جوولەكەو نەصرانییەكان هەردوو لایان پەیمانی كۆنیان تەبەننیی كردوەو بە كتێبی خۆیانی دەزانن، ئنجا با لە پەیمانی كۆندا دوو نموونە بێنینەوە:

١- لە پەیمانی كۆن لە (سفر التكوین، الإصحاح:٢، الآیة:٢)[1] ئاوا باسی خوای پەروەردگار دەكات، دەڵێ: (وَهَكَذَا إكْتَمَلَتِ السَّمَوَاتُ وَالأَرْضُ بِكُلِّ مَا فِيهَا، وَفِي الیَوم السَّابِع أَتمّ اللّٰه عَمَلَهُ الَّذِي قَامَ بِهِ، فَاستَرَاح فيهِ مِن جَمِيع مَا عَمِلَهُ..)

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، قصة الخلق، ص٩.

(سەرەتا باسی ئەوە دەکات کە خوا ڕۆژی شەممە فلان شتی دروست کرد، پاشان باسی ڕۆژی یەك شەممەو ڕۆژی دووشەممەو ڕۆژی سێ شەممەو ڕۆژی چوار شەممەو ڕۆژی پێنج شەممە دەکات، ئنجا لە دوایی دا بۆ ڕۆژی جومعە دەڵێ:) بەو شێوەیە دروستکرانی ئاسمانەکانو زەویو هەرچی تێیاندایە تەواو بوو، وە لە ڕۆژی حەوتەمدا خوا ئەو کارەی دەستی پێکردبوو تەواوی کرد، وە ئیسراحەتی کرد لە هەرچی کردبووی.

واتە: ئەوان وەك بەشەر تەماشای خوا دەکەنو وا دەزانن وەك چۆن بەشەر کە شتێك دەکات ماندوو دەبێو پێویستی بە پشوودان دەبێ، خواش ئاوایە، کە لەڕاستیدا ئەوە جۆرێکە لە جەستاندن (تجسید)ی خوا، بەڵام خوای پەروەرگار دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِى سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ ﴿٣٨﴾ ﴾ق، واتە: بەڕاستی ئاسمانەکانو زەویو ئەوەی نێوانیانمان لە ماوەی شەش ڕۆژدا دروست کرد، وە هیچ ماندووبوونێکمان نەهاتە سەرێ.

ئەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی ئەو قسەیەی جوولەکەو نەصرانییەکانە، کە بە دڵنیاییەوە، خوای پەروەردگار ماندوو نابێ بە شتەکانەوە، چونکە خوا جل جلالە ئەگەر بیەوێ شتێك بکات، هەر بفەرموێ ببە دەبێ، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَآ أَمْرُهُۥٓ إِذَآ أَرَادَ شَيْـًٔا أَن يَقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٨٢﴾ ﴾یس، واتە: بێگومان فەرمانی خوا ئاوایە، ئەگەر ویستی شتێك بکات پێی دەفەرموێ: ببە، دەبێ، کە ئەوەش ماندووبوونی تێدانیە، دیارە بۆ نزیك خستنەوە لە عەقڵی ئێمە وا دەفەرموێ، ئەگەرنا وە نەبێ خوای بەرز بە شتەکە بفەرموێ: ببە ئەویش ببێ، چونکە ئەگەر ئێمە بە شتێك بڵێین: ببە، یەکسەر ببێ، پێوەی ماندوو نابین، بۆ خوای باڵادەستیش هەر ئاوایە، نەك خوا بە شتەکە بفەرموێ: ببە، ئەویش ببێ، چونکە جارێ شتەکە بوونی نیە، تاکو فەرمانەکەی ئاڕاستە بکرێ، بەڵام ئەوە بۆ نزیك خستنەوەیە لە عەقڵی ئێمە.

٢- هەروەها لە (سفر التكوين، الإصحاح: ٣) لە باسی (سقوط الإنسان: الآيتان: ٨ و٩)دا[1]، (ثُمَّ سَمِعَ الزَّوْجَانِ صَوْتَ الرَّبِّ الإِلَهِ مَاشِياً فِي الْجَنَّةِ عِنْدَ هُبُوبِ رِيحِ

١) ص١٣، ١٤.

النَّهَارِ فَاخْتَبَئَآ مِنْ حَضْرَةِ الـرَّبِّ الإِلَهِ بَيْنَ شَجَرِ الْجَنَّةِ، فَنَادَى الـرَّبُّ الإِلَـهُ آدَمَ: «أَيْنَ أَنْـتَ؟») واتـە: دوای ئـەوەی ژنو مێردەکـە (مەبەسـت پێـی ئـادەمو حەووایـە سـەلامی خوایـان لـێ بـێ) گوێیـان لـە دەنگـی پـەروەردگاری پەرسـتراو بـوو کـە لـە بەهەشـتێ دەڕۆیـی پیاسـەی دەکـرد، لـە کاتێکـدا کـە بـای ڕۆژگـار هـەڵیکردبوو، ئەوانیش خۆیـان لە پـەروەردگار شـاردەوە لـەنێو درەختـەکانی بەهەشـتدا (خۆیـان پـەنهان کـرد بۆئـەوەی خـوا نەیانبینـێ)، پەروەردگـاری پەرسـتراو بـانگی ئـادەمی کـردو فەرمووی: لە کوێـی؟!

وەك خــوا نــەزانێ ئــادەم لــە کوێیــەو پرسـیاری لــێ بکـات! بەڵــێ جوولەکــەو نەصرانییەکان لە کتێبـە موقەددەسـەکەیاندا ئاوا باسـی خـوا دەکـەن، بۆیـە پێتـان سـەیر نەبـێ کە ئێسـتا خەڵکی ڕۆژئاوا متمانەی بـە دیـن نـەماوە، دینێك ئاوا باسـی خــوا بکـــات، خــەڵك چــۆن لەبەرچـاوی ناکــەوێ، ئــەو خوایــە پیاســە بکــات لــە بەهەشـتێ، کـە لـە درێـژەی ئایەتەکانـدا دەڵـێ: خـوا گـۆرانی دەگـوت!! پاشـان لـەنێو بەهەشت نەزانـێ ئـادەم لـە کوێیــەو نەیبینـێو بڵـێ: لـە کوێ خـۆت شــاردۆتەوە؟! ئنجـا دەڵێ: دوایـی ئـادەم وەڵامـی دەداتـەوەو دەڵـێ: خـۆم لـەنێو درەختـی بەهەشــتدا شــاردۆتەوە! خــواش پێــی دەفــەرموێ: بۆچـی خـۆت شـاردۆتەوە؟ دەڵــێ: چـونکە ڕووتـم، دەڵـێ: بۆچی ڕووتی دیـارە لە درەختەکـەت خواردوە؟! (وەك ئـەوەی خــوا نەیزانیبـێ لەو درەختـەی خـواردوە!!)

ئنجا با سەرنج بـدەین داخـۆ نەصـرانییەکان چـۆن پێناســەی خـوای تــاكو تـەنیا دەکــەن؟!

لە پەیمانی نوێ لە ئینجیلی (متـى، الإصحاح: ٣، الآيتـان: ١٦، ١٧)دا[1]، ئـاوا باسـی خـوای پاكو تـاك دەکات، دەڵێ: (فَلَمَّا تَعَمَّدَ يَسوعُ صَعِدَ مِنَ الـمَاءِ فـي الحَال، وإذا السَّمَوَات قَـد انفَتَحـت لَـهُ وَرأى رُوحَ اللهِ هَـابِطاً ونـازِلاً عَلَيْـهِ، كـأنَّـهُ حَمَامَــةٌ، وَإذَا صَوت مِنَ السَّمَوَات يَقُولُ: هَذَا هُوَ ابْني الحَبيب الَّذِي سُرِرْتُ بِهِ كُلَّ سرُورٍ) واتـە: کاتێك عیسـا لە ئاو هەڵکێشـان (تعمّد)ی کرد، (ئەوە زاراوەیەکە نەصـرانیی بـەکاری دێنـن لە جیاتی خۆشـۆردن) لە ئاوەکە هاتە دەرێ، یەکسـەر ئاسمانـەکان کرانـەوە، وە

---

١) ص١٨٧٥.

ڕووحی خوا هاتە خوارو دابەزیە سەری وەك كۆترێك، وە دەنگێك لە ئاسمانەوە هات گوتی: ئەوە ئەو كوڕە خۆشەویستەی منە، كە زۆر پێی دڵخۆش بووم، (واتە: عیسا كوڕی منە)!!

ئنجا لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس)دا[1] دەڵێ: (الشّرحُ: إنَّ تَعلِيم الثالوث مَعنَاهُ أنَّ اللّه ثَلاثَة أقَانِيم، وَلَكِنهُ وَاحِدٌ فِي الجوْهَر، وَفِي هَذَا الفَصْل نَرَى الأَقَانِيم الثلاثة، مَوْجُودين وَعَامِلِين: فاللّه الآب تَكلَّم، واللّه الإبن اعْتَمد، وَنَزَلَ اللّه الروح القُدس عَلَى يَسوع، فَاللّه وَاحِدٌ وَلَكِنَّهُ فِي نَفْس الوقت ثَلاثَة أَقانيم) شەرحی ئەو ئایەتانەی سەرێ دەكاتو ئەو شەرحە لەلایەن نەصرانییەكانەوە، دیارە تەبەننیی كراوە دەڵێ: فێركردنی (ثالوث)، (ثالوث: واتە: سێكوچكە) مانای ئەوەیە كە خوا سێ توخمە، سێ پێكهاتەیە بەلام لە هەمان كاتیشدا لە نێوەڕۆكدا یەكە، وە لەو فەسڵەدا دەبینین كە هەر سێ ئوقنوومەكان، {(أقانيم) كۆی (أُقنوم)ە، واتە: پێكهاتە، پێكهێنەر} پێكەوە كاریان كردوە، (فاللّه الآبُ تَكَلَّم) خوای باب قسەی كردوە، (واللّه الإبن اعْتَمد) وە خوای كوڕ خۆی شۆردوە، (وَنَزَلَ اللّه الروح القُدس عَلَى يَسوع)، وە خوای ڕووحی قودسیش (كە ئەوان وا پێدەچێ مەبەستیان پێی جبریل بێ) دابەزیوەتە سەر یەسووع، كەواتە: خوا یەكێكەو لە هەمان كاتیشدا سێ پێكهاتەیە، {خوا بۆخۆی، عیساش كە كوڕیەتی، وە (روح القدس)یش كە لە نێوان خواو عیسادا دێو دەچێو پەیام دێنێ، هەندێكیشیان لە جیاتی (روح القدس) دەڵێن: مەریەم، واتە: خواو عیساو مەریەم، هەردوو عەقیدەكان بوو ون} ئەوە عەقیدەی نەصرانییەكانە، دەربارەی خوا.

من جاری وابووە موناقەشەم بووە لەگەڵ قەشەو زاناكانیان پێمگوتوون: ئەوە چۆن دەگونجێ ئێوە دەڵێن: خوا یەكێكەو سێشە؟ گوتوویانە: ئەدی چۆن ئێوەش دەڵێن: خوا یەكێكەو نەوەدو نۆ (٩٩) ناویشی هەیە؟ دیارە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ١٨٠﴾ الأعراف، لە فەرمایشتێكدا دەربارەی

---

٢) ص١٨٧٥.

ناوەکانی خوا هـاتوە، کە پێغـەمبەر ﷺ فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ للهِ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِسْمًا مِائَـةً إِلاَّ وَاحِـداً، مَـنْ أَحْصَـاهَا دَخَـلَ الْجَنَّـةَ، إِنَّـهُ وِتْـرٌ يُحِـبُّ الْـوِتْرَ﴾ {رَوَاهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٥٨٥)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦٩٨٦)، عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رَضِـيَ اللّٰهُ عَنْـهُ}، واتـە: بـە دڵنیـایی خـوا نــەوەدو نـۆ نــاوی هەیـە، سـەد جگـە لـە یـەکێك، جا هـەر کەسـێك بیانژمێرێ دەچێتە بەهەشـت، بێگومان ئەو (یانـی: خوا) تاکە، تاکیشـی خۆشـدەوێ.

منیش لە وەڵامدا گوتوومە: ئـەو دوو بابەتـە زۆر لـە یـەك جیـاوازن، ئێمـە دەڵێین: خـوا یەکێکــە، بـەڵام نـەوەدو نـۆ وەسـفـو نـاوی هەیـە، کـە ناوەکـان هـەموویان یـەك حەقیقــەتن، بـەڵام ئێـوە دەڵێن: ســێ شـتن، خـوای بـاوو، خـوای کـوڕو، خـوای (روح القدس)، کە سـێ شـتی لێك جیـانو لە هەمان کاتدا یەکیشــن!! ئـەوەش لەڕاسـتیدا لە عەقـڵ دا جێـی نابێتـەوە.

دووەم: لە بواری بڕوابوون بە پێغەمبـەران (الإيمان بالأنبيـاء والرّسـل)دا:

با بزانین ئەو کتێبانـەی لـە بن دەسـتی جوولەکـەو نەصـرانییەکاندان، چۆن باسی پێغەمبـەران دەکـەنو، قورئـانیش چۆن ڕاسـتیان دەکـاتەوە؟

ئنجا زانینی ئەو ڕاسـتییە بـۆ ئێمـە زۆر گرنگـە، تاکـو بـزانین خەڵکــی ڕۆژئـاواو ئەمریکاشــەوە، بۆچــی لــە دینەکــەی خــوا هەڵگەڕاونەتــەوەو ڕوویــان کردۆتــەوە عەلـمانیەتو ڕێچکەو بەرنامـە دەسـتکردەکان؟ بۆچـی متمانـەیان بـە ئایینەکەیـان نەماوە؟ چونکە لـە ئەسڵی عەقیدەکـەیاندا لادان (إنحـراف)ێکــی زۆر سـەیر هەیــە، ئنجا با تەماشـا بکـەین، جارێ لە (الكتاب المقدس)دا کە هـەر دوو پەیمــانی کۆنو پەیمــانی نــوێ دەگرێتــە خــۆیو، جوولەکــەو نەصــڕانییش تەبەنییــان کــردوە، گونـاهی گـەورەو کـەمو کـوڕیی زۆریـان پاڵداوەتـە لای پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) کە ئێمـە پێمـان وایـە مسـوڵمانێکی عادەتیش کـە هـەر تۆزێك مسـوڵمان بــێ، ئـەو گوناهــانە ناکـات، بـەڵام ئـەوان بـە چاوێکی زۆر کـەمو سووك تەماشـای پێغەمبــەرانیان کــردوە، وە ئێمــە کــە لێــرەدا ئــەم دەقانــەی نێـو کتێبــی جوولەکـەو نەصڕانییەکان نەقڵ دەکەین، مانـای وانیە باوەڕمان پێـی بـێ، پـەنا بـە خـوا، بەڵـكو دەمانـەوێ چـەمکی ئـەو ئایەتانـە ڕوون بکەینـەوە، خـوا دەربـارەی دەسـتکاریی کرانـی

کتێبـــەکانیان فەرموویـــەتی: ﴿يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ الْكِتَابِ﴾، یـان لـە شـوێنی دیکـە فەرموویـەتی: ﴿يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ﴾النسـاء، ئنجا ئێمـە لـە کتێبـەکانیان چـەند نموونەیـەك دێنینـەوە، کـە ڕاسـتیەتی ئەم ئایەتـانەی قورئان دەسـەلمێنن:

١/ لە (سفر التكوين الإصحاح: ١٩ تا ٣٠)[1] لە باسی (خطيئة ابنتي لوط)دا ئـاوا باسـی پێغەمبـەر لـووط عليه السلام دەکـات:

(وَغَـادَرَ لُـوطٌ وَابْنَتَـاهُ بَعْـدَ ذَلِـكَ صُـوغَرَ، وَاسْـتَقَرُّوا فِـي الْجَبَـلِ لأَنَّـهُ خَـافَ أَنْ يَسْـكُنَ فِـي صُـوغَرَ، فَلَجَـأَ هُـوَ وَابْنَتَـاهُ إِلَـى كَـهْـفٍ هُنَـاك، فَقَالَـتْ الإِبْنَـةُ الْبِكْـرُ لأُخْتِهَا الصَّغِيرَةِ: إِنَّ أَبَانَا قَدْ شَاخَ وَلَيْسَ فِي الأَرْضِ رَجُلٌ يَتَزَوَّجنْا كَعَادَةِ كُلِّ النَّـاسِ، فَتَعَـالَي نَسْقِيهِ خَمْـرا وَنَضْـطَجِع مَعَـهُ فَـلا تَنْقَطِعُ ذُرِّيَّـةُ أَبِينَا فَسَـقَتَا فِـي تِلْـكَ اللَّيْلَـةِ أَبَاهُمَـا خَمْـراً، وَأَقْبَلَـتْ الإِبْنَـةُ الْكُـبْرَى وَضَـاجَعَتْ أَبَـاهَا فَلَـمْ يَعْلَمْ بِاضْـطِجَاعِهَا وَلاَ بِقِيَامِهَا ...).

واتـە: لـووطو دوو کچـەکەی دوای ئـەوەی صـوغەریان بەجێهێشـت (صـوغەر: نـاوی شـوێنێکە) وە لـە چیـا نیشـتەجێ بـوون، چونکە ترسـی لـە خـۆی هەبوو ئەگـەر لە صـوغەر نیشـتەجێ بـێ، بۆیـە خـۆیو هەردوو کچەکەی پـەنایان بـردە بەر ئەشکەوتێك لە چیا، ئنجا کچە گەورەکەی بـە خوشـکە گچکەکەی گوت: بابمان کەوتۆتـە تەمەنـەوە، لەسـەر زەویـش هـیچ پیـاوێکی دیکـە نیـە ئێمـە بێنـێو هاوسـەرگیرییمان لەگەڵـدا بکـات، وەك عـادەتی خـەڵك، وەرە بـا شـەراب (مـەی) بدەینـە بابمـان، وە لەگەڵی بخـەوین، بۆئـەوەی کـە وەچـەی بابمان نەبڕێتـەوە، لـەو شـەوەدا شـەرابیان دا بـە بابیـان، وە کچـە گەورەکـە لەگـەڵ بـابی خـەوت (واتـە: پێکـەوە جـووت بـوون) بـابی نـە بـە ڕاکشـانەکەی زانـی، نـە بـە هەڵسـانەوەکەی زانی، دوایی دەڵـێ: خوشـکە گچکەکەشـی لەگەڵی خەوت... دوایـی دەڵـێ: ئنجا ئـا بەو شـێوە هەردوو کچـەکە منداڵیان لە بابیـان بوو!

---

١) التفسير التطبيقي للكتـاب المقدس، ص٣٨.

بەڵێ خاوەن کتێبەکان ئاوا باسی پێغەمبەران دەکەن، لووط ﷺ پێغەمبەری هەڵبژێردراوی خوا، شەڕابی درابێتێو دوایی زینای کردبێ لەگەڵ دوو کچەکەی خۆیدا، بێئەوەی بەخۆی بزانێ، بەڵام بێگومان پێغەمبەران پارێزراون نەك لە زینا، بەڵکو لە شتی زۆر بچووکتریش لە زینا، هەتا لە نەزەریش کە بە ئارەزووەوە تەماشای ئافرەتیان کردبێ، خوا پاراستوونی، چ جای ئەوە لەگەڵ کچی خۆیاندا زینا بکەن!!

٢/ لە (سفر التكوين،)[١] لە باسی (نُقطة الضعف والخَطأ)دا ئاوا باسی پێغەمبەر یەعقووب ﷺ دەکات:

أ- (كَانَ يَعْتَمِدُ عَلَى إمكَانياته الشَّخْصيَّة عوضاً عَنِ الرّجُوع إلى اللّهِ طَلَباً لمعُونة إذَا وَاجه صِرَاعاً)، واتە: هەڵەو خاڵی بێهێزیی یەعقووب ئەوە بوو کە پشتی بە توانای شەخصی خۆی دەبەست، لە جیاتی ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، کاتێك کە ناکۆکییو دژایەتیی بەرەو ڕوو دەبۆوە (لە جیاتی ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، پشتی بە خۆی دەبەست).

کەواتە: تەوەککولی نەبووە بە خوای باڵادەست، خوای بەرزیش فەرموویەتی: ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾﴾ المائدة، واتە: وە پشت بە خوا ببەستن، ئەگەر ئێوە ئیماندارن، کەواتە: کەسێك ئەگەر هەر ئیمانداربێ، دەبێ پشت بە خوا ببەستێ، چ جای پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)!!

ب- (كَانَ يَمِيلُ إلى تكديس الثروةِ مِن أَجْل الثَروةِ ذَاتِهَا)، واتە: (یەعقووب) پێی خۆشبوو سەروەتو سامان وەسەر یەك بنێ، هەر لەبەر سەروەتو سامان خۆشویستن، (نەك لەبەرئەوەی پێویستیەتی، یان لەبەرئەوەی لە پێناوی خوادا سەرفی بکات).

٣/ لە (سفر التكوين)[٢] لە باسی (نُقطة الضعف والخَطأ)دا، ئاوا باسی پێغەمبەر یوسف ﷺ دەکات: (كَانَت كِبرِيَاء شَبَابه سَبَبَاً في إحْتكَاكهِ بإِخوته) واتە:

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص٧٣.

٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص٩٧.

(یوسف) شانازیی بە خۆوەکردنی لە سەردەمیی گەنجێتیی دا، هۆکاری ئەوە بوو، کە لەگەڵ برایەکانی دا تێکبگیرێ.

کە دیارە ئەوە درۆیە چونکە کاتێك برایەکانی یوسفیان خستۆتە نێو بیر، تەمەنی هێندە نەبوو و زۆر بچووكو نا باڵغ بووە، واتە: تەمەنی هێندە نەبووە، کە ئەو حاڵەتە دەروونییەی بۆ دروست بێ.

٤/ لە (سفر التكوين)[1] لە باسی (نُقطة الضعف والأخطاء)دا ئاوا باسی پێغەمبەر مووسا ﷺ دەکات:

أ- (لَم يَدخُل أَرْضَ الموعِدِ بِسَبَب عِصيانهِ لله) واتە: خاڵی یەکەمی بێهێزیی مووسا ئەوە بوو کە نەچووە سەر ئەو زەمینەی کە خوا بەڵێنی پێدا بوون، بە هۆی سەرپێچییکردنی لە فەرمانی خوا، یانی: مووسا بە قسەی خوای نەکردوە!!

ب- (لَمْ يميز عَلَى الدوام مواهب الآخَرين وَيسْتَخدمها)، واتە: (خاڵی دووەمی بێهێزیی مووسا) ئەوە بوو هیچ کاتێك نەیتوانیوە توانای بەرانبەرەکانی بناسێ، تاکو بە شێوەیەکی ڕاست بەکاری بێنێ!!

ئەوە شێوەی تێڕوانینی جوولەکەو نەصرانییەکانە بۆ پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام).

<u>سێیەم</u>: لە بواری باسکانی شەریعەت (الأحكام الشرعية)دا:

أ) خوای پەروەردگار باسی شاردنەوەی سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ دەکات لەلایەن خاوەن کتێبەکانەوە، ئەو سیفەتانەی لە کتێبەکانیاندا هەبوون، پەنهانیان کردوون و شاردوویانەتەوە، یاخود گۆڕیویانن.

خوای زاناو شارەزا هەم بۆ جوولەکەکان، هەم بۆ نەصرانییەکان لە چەند شوێنێکدا زۆر بە ڕوونیی فەرموویەتی: دەیانزانی موحەممەد پێغەمبەری خوایەو نیشانەکانیان دەزانین، بەڵام شاردیانەوە، بۆ وێنە: لە ئایەتی (٨٩)ی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿...وَكَانُواْ مِن قَبْلُ يَسْتَفْتِحُونَ عَلَى ٱلَّذِينَ

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص١٦٥.

كَفَرُوا۟ فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ ۚ فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٨٩﴾ ﴾، کە ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا، بە تەفصیلْ باسمان کردوە، دەفەرموێ: جوولەکەکان پێشتر داوایان لە خوا دەکرد بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ یاخود هەڕەشەیان لە کافرە بتپەرستەکان دەکرد، بە هاتنی پێغەمبەری کۆتایی، دەیانگوت: (لَنَقْتُلَنَّكُمْ قَتَلَ عَادٍ وَإِرَم) واتە: دەتانکوژین و لە نێوتان دەبەین، وەك چۆن قەومی عادو ئیرەم لەنێوچوون، ئێمەش ئاوا دەتان فەوتێنین، بە پشتیوانی پێغەمبەری کۆتایی، کە ئێمە ئیمانی پێ دێنین و شوێنی دەکەوین، وە لەگەڵ ئێوەدا دەجەنگین، واتە: لەگەڵ بتپەرستەکاندا، ئەوە واتایەکی، واتایەکیشی ئەوەیە ﴿يَسْتَفْتِحُونَ﴾، دەڵێ: دووعایان دەکرد، دەیانگوت: خوایە! ئێمە لێت دەپاڕێینەوە بە پێغەمبەری کۆتایی واتە: تەوەسسولی پێدەکەین، کە بەهۆی ئەوەوە سەرمان بخەی بەسەر کافرەکاندا[1]، ﴿فَلَمَّا جَآءَهُم مَّا عَرَفُوا۟ كَفَرُوا۟ بِهِۦ﴾، کاتێك ئەوەی کە دەیانزانی دەیانناسی کە پێغەمبەریی کۆتاییە (موحەممەد ﷺ) بۆیان هات، بێبڕوا بوون پێی ﴿فَلَعْنَةُ ٱللَّهِ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾، نەفرینی خوا لە بێبڕوایان.

وە هەر لە سووڕەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَـٰهُمُ ٱلْكِتَـٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ ۖ وَإِنَّ فَرِيقًا مِّنْهُمْ لَيَكْتُمُونَ ٱلْحَقَّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٤٦﴾﴾، واتە: ئەوانەی کتێبمان پێدابوون، (دیارە هەم جوولەکەو هەم نەصرانییەکان دەگرێتەوە، بەڵام بەپێی سیاقی ئایەتەکان دەزانین، کە لێرەدا مەبەست پێی جوولەکەکانن) دەیناسن (واتە: موحەممەد ﷺ)، ﴿كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ﴾، وەك چۆن کوڕەکانی خۆیان دەناسن، وە کۆمەڵێکیان هەق دەشارنەوە، کە دەشزانن هەقە.

---

١) بڕوانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج ١، ص ٣٤، کە لە کۆتایی هێنانی چەند گێڕراوەیەك دا نووسەرەکانی گوتوویانە: (قلنا: وسنده حسن – إن شاء الله - و جهالة الأسياخ لا تضر لكونهم صحابة وهم عدول، والله أعلم.

دەربـــارەی نەصـــرانییەکانیش کـــە زانیویانـــە موحەممـــەد ﷺ، پێغەمبـــەری کۆتاییـەو دێ، لە سـوورەتی (الصـف) لە ئایــەتی (٦)دا خوا دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيْكُم مُّصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَمُبَشِّرًۢا بِرَسُولٍ يَأْتِي مِنۢ بَعْدِي ٱسْمُهُۥٓ أَحْمَدُ ۖ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ قَالُوا۟ هَٰذَا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿٦﴾ ﴾، واتە: کاتێك عیسـای کوڕی مەریەم، گوتی: ئـەی وەچـەی ئیسـرائیل (واتـە: ئەی جوولەکەکان، چونکە عیسـا ﷺ بۆخـۆی جوولەکـە بووەو لە یەهـوود بـووە، وە بـە پلـەی یەکـەمیش بـۆ ئـەوان نێـردراوە، بـەڵکو هەنـدێك دەڵـێن: هـەر بـۆ جوولەکەکـان نێـردراوە، بـەڵام نەصـرانییەکان ئیددیعـا دەکـەن، کـە بـۆ هـەموو خـەڵکی دیکـەش نێـردراوە) مـن ڕەوانـەکراوی خـوام بـۆ لای ئێـوە، ئـەوەی لـە پـێش دەستی منەوەیە، بەڕاستی دەزانم، (واتە: ئەوەی لە پـێش منـدا هاتووە کە تەوراتـە، بەڕاسـتی دەزانم کـە کتێبـی خوایـە، ئنجـا کـە تـەورات بەڕاسـت بزانـێ کەواتـە: مووسـاش ﷺ بەڕاست دەزانـێ)، وە موژدەشـتان پێـی دەدەم بـە پێغەمبـەرێك لـە دوای من دێ، ناوی ئەحمەدە (ئەحمـەد واتە: سـتایش کراو، موحەممەدیـش واتـە: سـتـایشـکراو).

ئنجــا پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: ﴿لِي خَمْسَـةُ أَسْمَاءٍ: أَنَا مُحَمَّدٌ وَأَحْمَدُ، وَأَنَـا الْمَـاحِي الَّـذِي يَمْحُـو اللهُ بِي الْكُفْـرَ، وَأَنَـا الْحَاشِـرُ الَّـذِي يُحْشَـرُ النَّاسُ عَلَـى قَـدَمِي، وَأَنَـا الْعَاقِـبُ﴾{أَخْرَجَـهُ مَالِـكٌ بـرقم: (١٨٢٣)، وَأَحْمَـد بـرقم: (١٦٧٨٠)، البُخَـارِيُّ بـرقم: (٤٦١٤)، وَمُسْـلِمٌ بـرقم: (٦٠٥٨)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٢٨٤٠)، وَقَـالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسَائِيُّ فِـي (الكبرى) بـرقم: (١١٥٩٠)، وَالـدَّارَمِيُّ بـرقم: (٢٧٧٥)، وَابْنُ حِبَّـانَ بـرقم: (٦٣١٣)، وَأَخْرَجَـهُ أَيضـًا: عَنْ جُبَيْـرِ بْنِ مُطْعِمٍ عَنْ أَبِيـهِ ﷺ}، واتــە: مــن پێنــج نــاوم هــەن: مــن موحەممــەدو ئەحمــەدم، وە مــن ســڕەرەوە (مـاحي)م، کـە خـوا کوفرم پێدەسڕێتەوە، وە کۆکەرەوە (حاشـر)م کە خەڵـك لـە بەردەممـدا کۆدەکرێتەوە، وە دوامیـن (عاقب)م.

جا خوا دەفەرموێ: ﴿ فَلَمَّا جَآءَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ قَالُواْ هَٰذَا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾، ئنجا کاتێك بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە گوتیان: ئەوە جادوویەکی ئاشکرایە، بۆ زانیارییتان وەك پێشتریش ئاماژەم پێدا، لە پەیمانی کۆنو لە پەیمانی نوێدا لە چەند شوێنێکدا باسی سیفەتەکانی پێغەمبەر ﷺ کراوە، کە وەك باسمکرد زانایان دەریانخستوون، وە منیش ئەو کاتەی لە زیندانی ئەمریکییەکان بووم، لەو کتێبەدا کە نووسیومە باسمکردوە، کە ئەو وەسفانەی باسکراون، غەیری پێغەمبەر موحەممەد ﷺ بەسەر کەسی دیکەدا ناچەسپێن، هەروەها لە پەیمانی کۆندا هاتوە هەندێ لە پێغەمبەران موژدەیان داوە کە پێغەمبەرێك دێ ئاواو ئاواو ئاوایە، وەك گوتم: ئەو وەسفانەی بەسەر پێغەمبەری کۆتایی نەبێ بەسەر کەسی دیکە ناچەسپن، بۆ وێنە: دەڵێ پێغەمبەرێك دێ بانگەوازەکەی بۆ هەموو خەڵکە، سوپای دەبێ، وە بانگەوازەکەی دەگاتە نێو دورگەکانی دەریاکانیش، وە هاوەڵەکانی بەو شێوەیەن، ئنجا کە وەسفی هاوەڵانی دەکات، بەس سیفەتەکان بەسەر هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺدا دەچەسپن[1].

ب) هەروەها هەندێك لە یاساکانی شەریعەتیشیان شاردۆتەوە:

وەك خوای پەنهانزان باسی دەکات، بۆ وێنە شاردنەوەی حەددی زیناکەر، لە شەریعەتی جوولەکەدا زیناکەر دەبوایە بەردباران بکرێ، مادام ئەو پیاوە ژنی هەبووایە، ژنەکەی مابێ یان نا، یان ئەو ئافرەتە مێردی هەبووبێ، جا مێردەکەی مابێ، یان نا، لەوبارەوەش با تەماشای ئەم دەقە بکەین: ﴿عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنه قَالَ مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِيَهُودِيٍّ مُحَمَّمًا مَجْلُودًا فَدَعَاهُمْ ﷺ فَقَالَ: (هَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ)؟ قَالُوا: نَعَمْ، فَدَعَا رَجُلاً مِنْ

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر: إشعياء، الإصحاح: ٤٢، (مهمة خادم الرّب):

(هوذا عبدي الّذي أعضُدُهُ، مختاري الّذي ابتهجتْ به نفسي، وضعتُ روحي عليه ليسوس الأمم با لعدل، لا يصيحُ ولا يَصْرُخُ ولا يرفع صوتَهُ في الطريق، لا يكسر قصبةً مرضوضةً، وفتيلةً مُدَخِّنةً لا يُطفيءُ، إنما بأمانةٍ يَجْري عَدْلاً، لا تكلُّ ولا تُثَبَّطُ له هِمَّةٌ حتى يُرسِّخ العدل في الأرض، وتنتظر الجزائر شريعتَه... ها هي النبوّات السالفة تتحقّق وأخرى جديدة أُعلِنَ عنها وأُنبيءُ بها قبْل أن تحدث)، ص ١٤٣٧.

عُلَمَائِهِمْ، فَقَالَ: (أَنْشُدُكَ بِاللهِ الَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى، أَهَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ)؟ قَالَ: لاَ وَلَوْلاَ أَنَّكَ نَشَدْتَنِي بِهَذَا لَمْ أُخْبِرْكَ نَجِدُهُ الرَّجْمَ، وَلَكِنَّهُ كَثُرَ فِي أَشْرَافِنَا فَكُنَّا إِذَا أَخَذْنَا الشَّرِيفَ تَرَكْنَاهُ، وَإِذَا أَخَذْنَا الضَّعِيفَ أَقَمْنَا عَلَيْهِ الْحَدَّ، قُلْنَا: تَعَالَوْا فَلْنَجْتَمِعْ عَلَى شَيْءٍ نُقِيمُهُ عَلَى الشَّرِيفِ، وَالْوَضِيعِ فَجَعَلْنَا التَّحْمِيمَ، وَالْجَلْدَ مَكَانَ الرَّجْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ (اللَّهُمَّ! إِنِّي أَوَّلُ مَنْ أَحْيَا أَمْرَكَ إِذْ أَمَاتُوهُ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (١٨٥٤٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٧٠٠)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٤٤٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٥٨)}، واتە: جوولەکەیەکیان بە لای پێغەمبەر داهێنا، دەموچاوی ڕەش کرابوو، قامچیشیان لێدا بوو، پێغەمبەری خوا ﷺ بانگی کردن، فەرمووی: ئایا ئەمە لە کتێبەکەتاندا سزای زینایە؟ (دیارە ئەو کەسە زینای کردوە، بۆیە بەو جۆرە سزایان داوە)، گوتیان: بەڵێ، دوایی پیاوێکیانی بانگ کرد لە زاناکانیان (دیارە زانیویەتی ئەهلی ئینصافە)، فەرمووی: خوات بە گژ دادەکەم، (وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: تۆ ئەو خوایە) کە تەوراتی ناردۆتە سەر مووسا ؑ! ئایا ئەوە سزای زینایە، لە کتێبەکەتاندا؟ گوتی: نەخێر، وە ئەگەر بەو شێوەیە داوات لێ نەکردبام (واتە: ئاوا سوێندت نەدابام) هەواڵم پێنەدەدای، سزای زینا لە کتێبی ئێمەدا بریتییە لە بەردباران کردن، بەڵام دوای ئەوەی زینا لەنێو پایەدارەکانمان و خاوەن پێگەکانماندا زۆر بوو، ئەگەر یەکێك لەو پیاوە ناودارانەمان زینای کردبایە، لێی دەگەڕاین، وە ئەگەر یەکێکی بێهێزیش زینای کردبایە، سزامان دەدا، گوتمان وەرن با شتێك دابنێین بەسەر پایەدارو بێپایەدا (واتە: بەهێزو بێهێز) بیچەسپێنین، وە ڕامان هاتە سەر ئەوەی کە دەموچاویان ڕەش بکەین و قامچیان لێ بدەین، (ئنجا قامچی بووە، دار بووە، باس نەکراوە) پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەی خوایە! من یەکەم کەسم کە فەرمانی تۆی زیندووکردۆتەوە، دوای ئەوە کە مراندبوویان، وە فەرمانی پێکرد بەردبارانیان کرد.

دیارە بۆ خۆیان ڕازی بوون کە پێغەمبەر بە پێی تەوراتەکەی خۆیان، ئەو سزایەیان بەسەردا بسەپێنێ، ئەگەرنا خاوەن کتێبەکان لە بواری باری کەسیی (الأحوال الشخصية)داو لە بواری تایبەتمەندییەکانیاندا، پەیوەست نین کە ئیش بە شەریعەتی ئیسلام بکەن.

ئنجا لە تەوراتدا لە ژێر ناوونیشانی: (الأحكام في الزنى والإغتصاب)[1] دا سزای زینا بەم شێوەیە هاتوە: {وَإذَا ضَرَبْتُم رَجُلاً مضطجعاً مَعَ آمرأة مُتَزَوجَةٍ تَقتُلنهُما كِلاَهُمَا} واتە: هەر کاتێك پیاوێکتان بینی لەگەڵ ژنێك کە هاوسەردار بوو ڕاکشابوو (واتە: زینای لەگەڵ کردبوو) هەردووکیان دەکوژن، دیارە وێڕای ئەم سزایە چەندان، یاساو سزای شەرعیی دیکەشیان شاردوونەوەو دەستکارییان کردوون و گۆڕیویانن، وە قورئان ئەو شتانەی بەگشتی باسکردوون، وەك دەفەرموێ: ﴿يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا مِّمَّا كُنتُمْ تُخْفُونَ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ﴾، زۆر لەوەی لە کتێب شاردووتانەوە، قورئان ڕوونی دەکاتەوە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍ﴾، وە چاوپۆشیی لە زۆری دەکات، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە قورئان ئەوەی دەریدەخات، دەریدەخات، لەوەی کە خاوەن کتێبەکان شاردوویانەتەوە لە کتێبەکانی خۆیاندا، بەڵام بۆچی چاوپۆشیی لە زۆرێکیش دەکات و دەریناخات؟

زانایان چەند وەڵامێکیان داوەتەوە، باشترینیان ئەوەیە کە قورئان نەهاتوە باسی هەموو شتێك بکات، بەڵکو باسی ئەو شتانە دەکات کە ئینسان پێویستی پێی دەبن، لەو کاتەوە کە دابەزیوە تا لەسەر زەوی ژیانی ئینسان کۆتایی پێدێ و دەپێچرێتەوە، ئەو شتانەی کە قورئان چاوپۆشیی لێکردوون لە دەستکاریی کران و گۆڕانکاریی و شاردنەوەی خاوەن کتێبەکان و نەیخستوونە ڕوو، دیارە ئینسان پێویستی پێیان نیە، ئەوان زۆر شتیان گۆڕیوە ئەگەر هاتباو قورئان هەموو شتێکی باس کردبا، ئێستا قەبارەکەی چەندە، دەبوو بە پەنجا هێندە، کەواتە: ئەو شتانەی پشتگوێ خستوەو چاوپۆشیی لێکردوون کە پێویست ناکات باس بکرێن و ڕوونبکرێنەوە، لەبەرئەوەی ژیانی بەشەر پێویستی پێیان نیە، نەك قورئان خاتری گرتبن، خوای پەروەردگار لە گوتنی هەقدا خاتری کەس ناگرێ، وەك دەفەرموێ: ﴿... وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِى ٱلسَّبِيلَ ﴿٤﴾﴾الأحزاب، واتە: خوا هەق دەفەرموێ و بەرەو ڕێی ڕاست خەڵکی ڕێنمایی دەکات.

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر التثنية: الإصحاح: ٢٢، ص٣١٦.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴿١٥﴾ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِهِۦ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾.

## پێنج وەسفی گەورەو گرنگی قورئان بۆ پێناسەکردنی



باسمان کرد کە خوای کاربەجێ لەم ڕستە قورئانییەدا چەند وەسفو پێناسەیەك بۆ قورئان بەکاردێنێ:

١/ ﴿ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ ﴾.

٢/ ﴿ وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ﴾.

٣/ ﴿ يَهْدِى بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ ﴾.

٤/ ﴿ وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ ﴾.

٥/ ﴿ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾.

بە پێنج سیفەت قورئانی وەسف کردوە:

**یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ ﴾، توێژەرەوانی قورئان دوو هەڵوێستیان هەیە لە بەرانبەر ئەم وشەیەدا:

١- هەندێکیان دەڵێن: (نور) واتە: قورئان.

٢- هەندێکیش دەڵێن: (نور) واتە: موحەممەد ﷺ، چونکە لە سوورەتی (الأحزاب)دا خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِنَّآ أَرْسَلْنَٰكَ شَٰهِدًا وَمُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿٤٥﴾ وَدَاعِيًا إِلَى ٱللَّهِ بِإِذْنِهِۦ وَسِرَاجًا مُّنِيرًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: ئەی پێغەمبەر! تۆمان ناردوە چاودێربی، موژدەدەرو ترسێنەربی، وە بانگەوازکاربی بۆ لای خوا، بە مۆڵەتی خوا، وە چرایەکی ڕۆشنکەرەوە بی، کەواتە: دەگونجێ ناو لە پێغەمبەر ﷺ بنرێ، (نور) خوا لێرە ناوی لێناوە: (سِراجاً مُنيراً)، (سِراج) واتە: چرا، (مُنير) واتە: ڕۆشنکەرەوە، یاخود ڕۆشن، دەڵێین: لەڕاستییدا لە ڕووی زمانەوانییەوە دەگونجێ، بەڵام بە پێی سیاقی ئەم ڕستە قورئانییە بۆمان دەردەکەوێ، کە مەبەست لە (نور) لێرەدا پێغەمبەر ﷺ نیە، بەڵکو مەبەست لە (نور)و (كتاب مُبين)، وە لە هەموو وەسفەکانی دیکە، قورئانە، بۆچی؟ چونکە ئایەتەکەی پێشوو دەفەرموێ: ﴿ قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمْ كَثِيرًا ﴾، کەواتە: ئەوە باسی پێغەمبەر ﷺ کرا، ئنجا دوایی باسی قورئان دەکات.

بەڵگەی دووەممان ئەوەیە کە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴾، واتە: ڕێنماییان دەکات بەرەو ڕاستە شەقام، هەروەها دەفەرموێ: ﴿ يَهْدِي بِهِ ٱللَّهُ ﴾، بە هۆی ئەوەوە خوا ڕێنمایی دەکات، ئەگەر مەبەست پێغەمبەر ﷺو قورئان بووایە دەیفەرموو: (يَهدِي بِهِمَا اللّهُ) چونکە ئەو کاتە دەبوونە دوو، بەڵام بە دڵنیایی ئەو وەسفانە هەموویان مەبەست پێیان قورئانە، بۆیە ڕاناوەکەی بۆ یەکیانە (يَهدِي بِهِ)، نەك (بِهِمَا) بۆ هەردووکیان ناچێتەوە، بۆ یەکیان دەچێتەوە، ئەویش بریتیە لە قورئان، وە لەڕاستییدا ئەوە بەڵگەیەکی بەهێزە لەسەر ئەوە کە مەبەست لە هەرکام لە (نور)و (كتابٌ مُبين) قورئانە، بێگومان هەر شتێك خوا بیفەرموێ سەد لە سەد وایە، وە ئەو وەسفانەی قورئانیش پڕ بە پێستی قورئانن، کە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ ﴾، قورئان:

نوورو، ڕۆشناییە، بۆ عەقڵ، بۆ دڵ، بۆ ژیانی تاك، بۆ ژیانی خێزان، بۆ ژیانی کۆمەڵگا، بۆ دەوڵەت، بۆ بووناسیی، (واتە: چۆنیەتی تێڕوانینی ئینسان بۆ خوا، بۆ بوون، بۆ ئینسان) هەروەها قورئان نوورە لە ڕووی ئیمانو عەقیدەوە، لە ڕووی یاساکانی ڕێکخەری ژیانەوە، وە نوورە بۆ ڕابردوو، چونکە پێمان دەڵێ ڕابردوو چۆن هاتوە؟ وە ڕووناکییە بۆ داهاتوو ئایا چی دەگوزەرێ، وە چی دەبێ، وە نوورە بۆ ئێستاش، ئایا چی بکەین؟ وە قورئان لە ڕووی زانستییەوە نوورە، وە لە ڕووی عەقڵییەوە نوورە، وە لە ڕووی مێژوویییەوە نوورە، وە قورئان لە ڕووی دەروونناسییەوە نوورە، لە هەر ڕوویەکەوە بیگری قورئان ڕۆشناییە.

دووەم: کە دەفەرموێ: ﴿ وَكِتَٰبٞ مُّبِينٞ ﴾، وە قورئان کتێبێکی ڕۆشنیشە، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە ئەدی مادام قورئان کتێبێکی ڕۆشنە، بۆچی ئەو هەمووە زانایە قورئانیان تەفسیر کردوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین: لەڕاستییدا قورئان ڕۆشنە، واتە: هیچ کەس نیە بەشی خۆی لە قورئان تێنەگات، بەڵام هیچ کەسیش نیە بگاتە ئەوپەڕی زانایی‌و تێگەیشتن دەربارەی قورئان، وە بە دڵنیایی تەنیا بێژەری قورئان کە خوای زاناو شارەزایە، وەك پێویستو بە تەواویی دەزانێ قورئان چی تێدایە، چونکە قورئان فەرموودەی خوا (كلام الله)یە، ئەگەرنا پێغەمبەری خواش ﷺ بە تەئکید نەگەیشتوّتە ئەوپەڕی قورئان، بەو مانایە کە بە ئەندازەی ئەوەی کە خوا دەزانێ مەبەست لە فلانە ئایەتە چییەو؟ فلان ئایەت چی مەبەستە؟ بەڵکو پێغەمبەری خواش ﷺ بەقەدەر خۆی وەك بەشەرێك، وەك سەروەرو گەورەی پێغەمبەران، ئەویش بەقەدەر خۆی لە قورئان گەیشتوە، بەڵام دەربارەی زانیاریی قورئان خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَنزَلَهُ ٱلَّذِي يَعۡلَمُ ٱلسِّرَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ... ﴿٦﴾ ﴾ الفرقان، واتە: بڵێ: کەسێك قورئانی ناردۆتە خوار، کە نهێنییەکانی ئاسمانەکانو زەوی دەزانێ، نهێنی ئاسمانەکانو زەویش بەس خوا ﷻ دەیزانێ، بە بەڵگەی چی؟ خوا فەرموویەتی:

﴿ قُل لَّا يَعۡلَمُ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ٱلۡغَيۡبَ إِلَّا ٱللَّهُۚ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ

﴿٦٥﴾ النمل، واتە: بڵێ: هیچکەس نهێنی ئاسمانەکانو زەوی نازانێ جگە لە خوا ﷻ، دیارە پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا ئەوەندەی لە نادیار (غیب) زانیوە کە خوا پێی فەرمووە، بۆیە قورئان کتێبێکی ڕۆشنە، واتە: هیچکەس نیە بەشی خۆی لێی تێنەگات، بەڵام بەو مانایە نا کە هەرچی ڕاست بۆوە هەموو شتێك بزانێ لە قورئان، بەڵکو هەر کەسە بەشی خۆی لێی تێدەگات، بەڵام زاناترین کەس ناگاتە ئەوپەڕی قورئان، وە نەزانترین کەسیش کە هیچ شارەزاییەکی نەبێ، بەشی خۆی لە قورئان تێدەگات، هەر ئەوەشە کە کردوویەتی بە موعجیزە: هەر کەسە بەشی خۆی لێی تێدەگات، هیچ کەسیش ناگاتە ئەوپەڕەکەی، کە بێگومان هیچ کتێبێکی دیکە وانیە لەسەر زەوی، خەڵك یان تێیدەگات، یان تێیناگات، بەڵام قورئان ڕۆژ بەڕۆژ نهێنییەکانی دەردەکەون، وە چین (جیل)ەکانی بەشەر هەتا دێن بە دوای یەکدا وەك شەپۆلی دەریا، زیاتر نهێنییەکانی قورئان دەردەخەن، وەك خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّىٰ يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ ۗ أَوَلَمْ يَكْفِ بِرَبِّكَ أَنَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدٌ ﴿٥٣﴾﴾ فصلت، واتە: لەمەودوا نیشانەکانی خۆمانیان بۆ دەردەخەین، لە ئاسۆیەکان، (واتە: لە بوونەوەردا) وە لە خودی خۆشیاندا، بۆ ئەوەی بۆیان دەربکەوێ کە هەقە، ئایا ئەو ڕاناوە (أَنَّهُ) بۆچی دەگەڕێتەوە؟ بۆ قورئان، کەواتە: هەتا زانست بەرەو پێشەوە بچێ، نهێنییەکان زیاتر ئاشکرا دەبن، جا نهێنی کەونییو نهێنی ئینسانی، وە خەڵك زیاتر لە هەقانیەتی قورئان تێدەگات.

سێیەم: وە قورئان وەك خوا ﷻ وەسفی دەکات: ﴿يَهْدِي بِهِ اللَّهُ مَنِ اتَّبَعَ رِضْوَانَهُ سُبُلَ السَّلَامِ﴾، خوا بە هۆی قورئانەوە کەسێك ڕێنمایی دەکات کە بە دوای ڕەزامەندیی خوا بکەوێ بەرەو ڕێبازەکانی ئاشتی، کەواتە: ئینسان هەتا دڵی خۆی بۆ خوا ساغ نەکاتەوە، لە قورئان بەهرەمەند نابێ، ڕەنگە زۆر کەس کە تەماشای قورئان دەکات بڵێ: کوا قورئان چی تێدایە؟!

جارێك كابرایەكی عەلمانیی، گوتی: خـۆ مـن ڕێزم هەیـە بـۆ قورئـان، بـەڵام ئایـا سـووڕەتی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١﴾ المسـد، لـە قورئانـدا چ سوودێكی هەیـە؟ گوتم: ئێستا بوارم نیە هـەموو شـتێكت بـۆ بـاس بكـەم، بـەڵام ئەوەندە دەڵێم كە لە هەموو قورئانـدا ناوی یـەك كـافری سـەردەمی پێغەمبـەر ﷺ هاتوە، ئەویش (أَبُو لَهَب)ە، كە دیارە بـە نازناوەكـەی هاتوە، ئەگـەرنا بۆخـۆی نـاوی (عَبْـد الْعُـزَّی) بـووە، بـەڵام كونیەكـەی (أَبُـو لَهَـب) بـووە، ئـەوەش گـەورەترین حیكمـەتی تێدایـە، كـە خـوا لێـرەدا ئـەم سووڕەتەی ناردۆتـە خـوار، جـارێ ئـەوە بەرگرییە لـە پێغەمبـەر ﷺ، چونكە بـەو موناسـەبەتەوە ئـەم ئایەتـە دابـەزیوە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: صَعِدَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ذَاتَ يَوْمِ الصَّفَا، فَقَالَ: يَا صَبَاحَاهُ، قَالَ: فَاجْتَمَعَتْ إِلَيْهِ قُرَيْشٌ، فَقَالُوا لَـهُ: مَا لَـكَ؟ فَقَالَ: أَرَأَيْتُمْ لَوْ أَخْبَرْتُكُمْ أَنَّ الْعَدُوَّ مُصَبِّحُكُمْ أَوْ مُمَسِّيكُمْ أَمَا كُنْتُمْ تُصَدِّقُونِي؟ قَالُوا: بَلَى، قَالَ: فَإِنِّي نَذِيرٌ لَكُمْ بَيْنَ يَدَيْ عَذَابٍ شَدِيدٍ، فَقَالَ أَبُو لَهَبٍ: تَبًّا لَـكَ لِهَذَا دَعَوْتَنَا جَمِيعًا، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١﴾ المسـد﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٤٥٢٣)}، واتـە: عەبدوڵای كوڕی عـەبباس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ، دەڵـێ: ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ سەركەوتە سەر كێـوی صـەفاو فـەرمووی: (يَا صَبَاحَاهُ) هـۆی هـاوار! قـوڕەیش لـە دەوری كۆبوونـەوەو گوتیـان: چـی بـووە؟ فـەرمووی: ئەگـەر هەواڵتـان پـێبدەم بـەوەی كـە دوژمـن ئێـوارێ، یـاخود بـەیانی هێرشـتان دەكاتـە سـەر، بـڕوام پـێ ناكـەن؟ گوتیـان: بـا، فـەرمووی: دە مـن ترسـێنەرتانمو بۆتانهـاتووم پێتانڕابگەیـەنم كـە سزایەكی سـەخت هەیـە بـۆ ئـەو كەسانەی كە ئیمان ناهێنن، ئەبو لەهـەب (یش كە لـە نێـو خەڵكەكـە بـوو) گـوتی: دەسـتـەكانت لەنێوچـن، هـەر بـۆ ئـەوە ئێمـەت كـۆكردەوە؟ ئنجا لـە دوای ئـەو قسـەیەی ئـەبو لەهـەب، خـواش وەڵامـی دایـەوەو ئـەو سـووڕەتەی نـاردە خـوار، فـەرمووی: ﴿تَبَّتْ يَدَآ أَبِي لَهَبٍ وَتَبَّ ۝١﴾ واتـە: دەسـتەكانی ئـەبو لەهـەب بفەوتێنو فەوتاشـن، وە لە هەموو كافرەكـانی قوڕەیش خوا ﷻ تەنیـا نـاوی ئـەبو لەهـەبی هێناوە، لەگەڵ هاوسەرەكەیدا، وە باسیان دەكات كە چۆن پیلانیـان گێـڕاوە دژی پێغەمبـەر ﷺ، هەرچـەندە مامیشـی بـووە، كەواتـە: لـە ئیسـلامدا بـە هیچ

شێوەیەك خاترو خۆتر نیەو لە هەقیّدا، خاتری کەس ناگیرێ، وە هەڵاویّردران نیە، وەك دەبینین مامی پێغەمبەری خوا تووکی لێکراوەو خوا فەرموویەتی: بفەوتێ، وە فەوتاش‌و بەهیلاکیش چوو، هەروەها خێزانەکەشی.

مەبەستم ئەوەبوو کە ئینسان بە ئەندازەی ئەوە کە مەبەستی پێی خوایەو دڵی بۆ خوا ساغ دەکاتەوە، لە قورئان تێدەگات، ئایا هەر کەسێك شارەزای زمانی عەرەبی نەبێ کتێبێکی عەرەبی بدە دەست، هیچی لێ تێدەگات؟ نەخێر، ئەدی کەسێك شارەزای زمانی ئینگلیزی، فەرەنسیی، رووسیی یان چینی نەبێ کتێبێکی بەو زمانانە نووسرابێ بدە دەستی، کە پڕبێ لە زانست، پڕبێ لە حیکمەت، ئایا هیچی تێدەگات؟ نەخێر، دەجا لەڕاستییدا کەسێکیش ئیمانی نەبێ، لە قورئان بەهرەمەند نابێ، تەماشای دەکات ڕواڵەتەکەی دەبینێ، بەڵام دڵی خۆی بۆ ناکاتەوە، لێی بەهرەمەند نابێ، بۆیە خوا ﷻ لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ۝٢ ٱلَّذِينَ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡغَيۡبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ يُنفِقُونَ ۝٣ ﴾، واتە: ئەلیف، لام، میم، ئەم کتێبە ڕێنماییە بۆ پارێزکاران، ئەوانەی ئیمان بە پەنهان دێنن، وە نوێژ بەرپا دەکەن‌و لەوەی پێمان داون دەبەخشن.

کەواتە: ئەوەی کە ئیمانی نەبێ، قورئان بۆ ئەو ڕێنمایی نیە، مەبەستم لەوەنیە کە نازانێ بیخوێنێتەوە، یاخود بە ڕواڵەت لە مەبەستەکانی تێناگات، بەڵام قورئان بۆی نابێتە ڕێ پیشاندەرو ڕێنمایی، دەبێ ئینسان تەفاعولێکی ئیمانیی‌و رووحیی‌و مەعنەویی لەگەڵ قورئاندا بکات، ئەوجار لێی بەهرەمەند دەبێ.

چوارەم‌و پێنجەم: ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَيُخۡرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذۡنِهِۦ وَيَهۡدِيهِمۡ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴾، لە تاریکایی دەریاندێنێ بەرەو ڕۆشنایی، وە بەرەو ڕاستە شەقام ڕێنماییان دەکات، ئەوانە ئەو وەسفانەن کە خوای بەرز بۆ قورئان بەکاری هێناون، وە بە دڵنیایی هەمووشیان لە جێی خۆیانداو پڕ بە پێستی قورئانن.

**مەسـەلەی چـوارەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾، بێگومان ئەوانەی گوتیان: خوا مەسیحی کوڕی مەریەمە، بێبـڕوان، کەواتە: نەصـرانییەکان کافـرن، پێشتریش ئاماژەیەکم پێدا، هەنـدێك مـەلا هـەن، ئەوانەی کە لە بـەرگی پێشـەوایانی ئاییـن دان، بـەڵام سەر بـە دەسـتەڵاتن‌و بەلای دەستەڵات‌و حوکمڕانانذا دایدەشکێنن، وە پێیان خۆشـە بـە هـەوای ئـەوان قسـە بکـەن، جـاری وابـووە لەگـەڵ ئـەو جـۆرە کەسـانە ڕووبـەڕوو بوومـەوە، گوتوویانـە: مامۆسـتا! دروست نیـە بـە جوولەکـەو نەصـرانیی بلـێین: کافر، چونکە ئـەوانیش ئیمانیان بە خوا هەیـە!! بـەڵام وەك پێشـتریش گوتم: ئیمان هـەبوون جیایـە لەگـەڵ عـیلم هـەبوون بـە بـوونی خـوا، چونکە ئیبلیس بـە دڵنیـایی دەیزانـی خـوا هەیـە، فیرعەونیش بە تەئکید دەیزانی مووسا پێغەمبـەری خوایەو موعجیزەکانی لەلایـەن خـواوە پێـدراون، وەك دەفـەرموێ: ﴿ وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسْتَيْقَنَتْهَآ أَنفُسُهُمْ ظُلْمًا وَعُلُوًّا فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُفْسِدِينَ ١٤ ﴾ النمـل، واتـە: دانیـان پێدانـەهێناو لـە دەروونیشـدا یـەقینیان هـەبوو کـە ڕاسـتە، لەبـەر ئـەوەی چـاویان لـە ستەم‌و لـە خۆبەزلگرتن بـوو، نەیانـدەویسـت بـۆ پـەیامی مووسـا ملکـەچ بکـەن، چـونکە ئـەو کاتـە فیرعـەون‌و داروودەسـتەکەی ئـەو بـەزم‌و بـازاڕەی هەیانـبوو لێیـان تێکدەچـوو، کەواتە: ئەوانیش عیلمیان هەبووە بە خـواو پێغەمبەرەکەی، کەچی بـە ئیمانـداریش لـە قەڵـەم نـەدراون، کەواتـە: جوولەکـەکان‌و نەصـرانییەکان‌و ئـەوانی دیکـەش کـە عیلمیان هەیـە بە بوونی خوا، وە عیلمیان هەیـە بـە پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) بە کتێبەکان، تەنیا بەوەندە بـە ئیمانـدار لـە قەڵەم نـادرێن، لەبەرئـەوەی ئیمانیـان نیـە بـە پێغەمبـەری کۆتـایی موحەممـەد ﷺ، وە دواییـن کتێبـی خـوا سـبحانە و تعالـی، کە ئەو چـەوتی‌و لادان‌و هـەڵانەی کەوتوونە نێـو کتێبەکانیانـەوە، ڕاسـتیان دەکاتـەوەو بـڕاریان دەکـات، ئنجـا پێغەمبـەری کۆتـایی موحەممـەد ﷺ سـەرەوەری هەموو پێغەمبەرانـە، وە هـەموو پێغەمبـەران موژدەیـان بـە هاتنی داوە، ئنجا ئایا ئەگـەر موحەممـەد ﷺ ئـەو پێغەمبـەرە مـوژدە پێـدراوە نەبـێ، کـوا کـێ هاتوە، ئـەوە دوای عیسا دوو هـەزار سـاڵ زیـاتر تێپـەڕیوەو کـەس نەهـاتوە؟! بەڵـێ

کەسانی وا هەبوون بە درۆ بانگەشەی پێغەمبەرایەتییان کردوە، بەڵام هیچ نەبوونەو هەر زوو درۆیەکەیان ئاشکرا بووە، ئەو پێغەمبەرەی کە مووسا گوتوویەتی: دوای من دێو عیسا گوتوویەتیو پێغەمبەران هەموویان گوتوویانە: کوا؟ کامەیە؟ کەواتە: کەسێك کە ئیمان بە موحەممەد ﷺ ناهێنێ، وە ئیمان بە قورئان ناهێنێ، ئیمانی بە پێغەمبەرەکەی خۆشیو بە کتێبەکەی خۆیشی لێ هەڵدەوەشێتەوە، چونکە کتێبەکەیشیو پێغەمبەرەکەشی گوتوویانە: دوایی پێغەمبەری کۆتایی دێ، ئیمانی پێ بێنن، ئنجا کە ئیمانیان پێ نەهێنا، مانای وایە بڕوای بە کتێبو پێغەمبەرەکەی خۆیشی نەهێناوە.

ئنجا دیارە پێشتریش لە کتێبی پیرۆز (الكتاب المقدس) لە پەیمانی نوێ، (العهد الجديد)دا ئەم دەقەم هێناوە: (فَاللّه واحِدٌ وَلَكِنَّهُ فِي نَفْسِ الوَقْتِ ثَلاثَةُ أقانيم)، وە لە ئینجیلی (متى: الإصحاح: ٣) لە شەرحی ئایەتەکانی (١٦و ١٧)دا دەڵێ: (يَسُوع بِاعتِبَارِهِ اللّه: لإبن، يَخضَعُ طَوْعِيَةً لِلّهِ الآب)[١]، واتە: یەسووع بەو ئیعتیبارەی خوای کوڕە، ملکەچ دەکات بۆ خوای باب! ئەوەش مانای وایە کافر بوو ون، بۆیە خواش فەرموویەتی: ﴿ لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ﴾، واتە: بێگومان ئەوانەی گوتیان: خوا مەسیحی کوڕی مەریەمە، بێبڕوان.

هەروەها هەر لە ئینجیلی (متى) لە (الإصحاح:١٥، آيتان: ٥، ٦) دەڵێ: (الحَيَاةُ فِي المَسِيحِ تَعني: أَوَّلاً: الإيمانُ بِأنّهُ إِبْنُ اللّهِ، ثانياً: مخلّصَاً وَرِبا)[٢]، واتە: ژیان لە مەسیح یانی: ئیمان هێنان بەوە کە کوڕی خوایە، وە قبووڵکردنیشی بەوەی کە ئەو ڕزگارکەرەو پەروەردگارە! بە هەر حاڵ ئەگەر تەماشای ئەوە بکرێ کە پێی دەگوترێ: (الكتاب المقدس: العهد الجديد)، پەیمانی نوێ، چ چوار ئینجیلەکان، چ نامەکانی پۆڵسو ئەوانە، زۆر بە زەقی دەڵێن: خوا سێ بەشە: (الآب، الإبن، الروح القدس) واتە: بابو کوڕو گیانی پیرۆز، کە مەبەستیشیان لە گیانی پیرۆز

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس: ص.١٨٧٥

٢) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس: ص ٢٢٢٤.

جبیریلە سەلامی خوای لێبێ، دیارە من لە بەرگی دووەمی ئەم تەفسیرە، لە تەفسیرکردنی سوورەتی (آل عمران)دا، ئەم دەقەم کە لە تەفسیری (الجامع لأحكام القرآن)ی (القرطبي) وەرگرتوە، لەوێش هێناوە، کە دەڵێ: {نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ بِسَبَبِ وَفْدِ نَجْرَان حِينَ أنْكَروا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ قوله: إنَّ عِيسَى عَبدُ اللهِ وَكَلِمَتُهُ، فَقَالُوا: أَرِنَا عَبْدَاً خُلِقَ مِنْ غَيْرِ أبٍ، فَقَالَ لَهُم النَّبِيِّ ﷺ: «آدَمُ مَنْ كَانَ أَبُوهُ أَعَجِبْتُم مِن عِيسَى لَيْسَ لَهُ أَبٌ ؟ فَآدَمُ عليه السلام لَيْسَ لَهُ أَبٌ وَلاَ أُمٌّ»}[1]، واتە: ئەم ئایەتە بە هۆی شاندی نەجرانەوە هاتە خوار، کە نکوولێیان کردو ڕەخنەیان گرت لەو فەرمایشتەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرمووی: عیسا بەندەی خوایەو وشەی خوایە، (واتە: بە وشەی خوا دروست بووە)، گوتیان: بەندەیەکمان پێشان بدە، کە بەبێ باب دروست بووبێ‌و لە دایك بووبێ، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەدی بابی ئادەم کێیە؟ ئایا سەرسام دەبن بەوە کە عیسا بابی نیە، بەڵام سەرسام نابن کە ئادەم نە بابی هەیە، نە دایك؟ بۆیە خوا ئەم ئایەتە موبارەکەی ناردە خوار، کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ۝٥٩ ﴾، واتە: بێگومان وێنەی عیسا لە لای خوا، وەك وێنەی ئادەمە کە لە گڵ دروستی کردو فەرمووی: ببە، یەکسەر بوو.

واتە: ئەگەر عیسا دایکی دیارە، بەڵام بابی دیارنیە، خۆ ئادەم عليه السلام نە بابی‌و نە دایکی دیارنین، بەڵکو خوا لە گڵ دروستی کرد، عیساشی عليه السلام لە دایکی دروست کرد، ئنجا دەربارەی دروستبوونی عیسا عليه السلام خوای پەروەردگار لە سوورەتی (مریم)دا زۆر بە ڕوونی باسی دەکات، کە ڕووحی عیسا عليه السلام ڕاستەوخۆ خراوەتە نێو منداڵدانی مەریەمەوە، بەبێ بەیەکگەیشتنی پیاوو ئافرەت، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَٱذْكُرْ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَرْيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتْ مِنْ أَهْلِهَا مَكَانًا شَرْقِيًّا ۝١٦ فَٱتَّخَذَتْ مِن دُونِهِمْ حِجَابًا فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ۝١٧ قَالَتْ

---

١) الجامع لأحكام القُرآن للقُرْطُبي ج٤، ص٩٢، وأسباب النزول للسيوطي برقم: (١٩٨)، و رَوَاهُ إبْنُ أَبِي حَاتِم مُرْسَلاً.

إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا
زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا ﴿٢٠﴾ قَالَ
كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞۖ وَلِنَجۡعَلَهُۥٓ ءَايَةٗ لِّلنَّاسِ وَرَحۡمَةٗ مِّنَّاۚ وَكَانَ أَمۡرٗا
مَّقۡضِيّٗا ﴿٢١﴾ ﴾ مريم، واتە: باسی مەریەم بکە، کاتێك خۆی دوور گرت لە
کەسوکاریو لە شوێنێکی ڕۆژهەڵاتیی، ئنجا پەردەیەکی گرتەوە لە نێوان خۆیو ئەواندا (دیارە ڕۆژێك چووە خۆی بشوا، وەك عادەتی ئافرەتان دەچوونە سەر کانیو ئاو، چونکە کاتی خۆی گەرماو بەو شێوەیەی ئێستا نەبووە، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (کوڵ)، دیارە چووە کوڵێ بکات، خۆی بشوات، یان خۆیو جلو بەرگی خۆی بشوات)، ڕووحی خۆمانمان بۆ لای نارد، (واتە: جبریل، چونکە چەند ناوێکی هەیە: الروح القدس، الروح، الروح الأمین) ئنجا خۆی لێبردە سەر شێوەی بەشەرێکی تەواو (مەریەم) گوتی: من پەنا بە خوای خاوەن بەزەیی دەگرم، ئەگەر ئەهلی تەقوایو تەقوات هەیە، (وایزانیوە چووە دەستدرێژیی بکاتە سەری، چونکە لە شێوەی پیاودا بووە) (ئەویش) گوتی: من نێردراوی پەروەردگارتم، دەبێ منداڵێکی پاکت پێ ببەخشم. (بەڵام دیارە مەریەم هەر گومانی لێی هەبوو بۆیە) گوتی: جا من چۆن منداڵم دەبێ، نە هیچ بەشەرێك (بە حەڵاڵیی) دەستی گەیاندوومێ، وە بە حەرامیش داوێن پیسییم نەکردوە؟! گوتی: پەروەردگارت وای فەرمووە ئەوە لە لای منەوە ئاسانە، بۆئەوەی بیکەینە نیشانەیەك بۆ خەڵك، وە بەزەییە لە لایەنی منەوەو ئەو بڕیارە، دراوەو بڕاوەتەوە.

کەواتە: مەریەم بە دەستی خۆی نەبووە عیسای ببێ، بەڵکو لەسەری پێویست بووە، ئنجا لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: جیبریل فووی بە یەخەی کراسەکەی داکرد یان فووی بە دەمی داکردو ڕووحەکە چووە نێو منداڵدانی مەریەمەوە، گرنگ ئەوەیە ڕووحەکە دەچێتە بەری، وە دەبێتە کۆرپە، جا ئایا بە نۆ مانگو نۆ شەو بووە، وەك منداڵی دیکە، یاخود هەر ئەو کاتە یەکسەر بوویەتی؟ لێرەدا زانایان دوو ڕایان هەن:

هەندێکیان دەڵێن: ﴿فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾﴾مریـــم، واتـــە: لە سـکی دا هەڵـیگرتو چووە شوێنێکی دوور لـە خـەڵکی، ئیـدی دوایـی خـوای زانـاو شــارەزا بە تەفصــیلْ باسی چۆنیـەتی لە دایکبوونی عیسـا ﷵ دەکات، کە هـەر بـە مەلۆتکەییش کـاتـێ دایکی بردوویەتیـەوە بـۆ لای گەلەکــەی، قســەی کـردوە، باشـە مەریـەم لـەو گـۆڕەی منداڵـێك بێنێتـەوەو بڵــێ: هـی خۆمـە، کـە بـە حیســاب ئـەو خزمەتی پەرستگای کردوە، ئایا کێ بڕوای پێدەکات، کە هیچـی خراپـی نەکـردبـێ؟!

بۆیـە خـوای پەروەردگــار پێـی دەفـەرموێ: ﴿... فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِىٓ إِنِّى نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾﴾ مریـــــم، واتـــە: ئەگـەر کەست بینـی بڵـێ: مـن ڕۆژووم لەسـەر خـۆم نـەزر کـردوە، بـۆ خـوای خـاوەن بـەزەیی، ئـەمڕۆ قســە لەگەڵ کـەس ناکــەم، دیارە ئەوکــاتە عادەتیـان وابـووە، کـە ڕۆژوویـان گرتوە، لەگەڵ نەخواردنو نەخواردنەوە، قســەشیان نەکردوە، ئنجا کە دەچێتــەوە بـۆ لای گەلەکــەی، ســەریان ســووڕدەمێنـــێو دەڵـــێن: بابــت پیــاوێکی خــراپ نــەبوو، دایکیشــت خراپــەکار نــەبوو، ئــەدی ئـەو منداڵـەت لەکــوێ بــوو، ئــەی مەریــەم؟!

﴿يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾﴾ مریـــم، واتە: (دیـارە کە پێـی گوتـن مـن بەڕۆژووم قســە ناکەم) ئنجـا ئـامـاژەی بـۆ کۆرپەکــەی کـرد، ئـەوانیش گوتیـان: جا چـۆن قسە لەگەڵ منداڵێکدا بکـەین کە جـارێ لـە بێشــکە دایـە؟! ئنجـا عیسـا ﷵ دەکەوێتە قســەو لەگەڵیاندا دەدوێ: ﴿قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِى وَلَمْ يَجْعَلْنِى جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَٰنَهُۥٓ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن

فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾ ﴾ مريم، واتە: (عیسا) گوتی: من بەندەی خوام، کتێبی پێداوەو گێڕاومی بە پێغەمبەر. وە پێزداری کردووم لە هەر کوێیەك بم، وە هەتا زیندووبم ڕایسپاردووم بە نوێژکردنو زەکات دان. وە ڕایسپاردووم کە لەگەڵ دایکم دا چاکەکاربم، وە نەیگێڕاوم بە خۆسەپێنو خراپەکار. وە سەلامم لێ بێ، ڕۆژی لە دایکبوونمو، ڕۆژی مردنمو، ڕۆژی زیندووبوونەوەم. ئا ئەوە قسەی عیسای کوڕی مەریەمە، ئەو قسە هەقەی کە تێیدا لە گوماندان. ناگونجێ خوا ڕۆڵەی هەبێ "پاكیی بۆ وی" هەر کات کارێکی بوێ، بەس پێی بفەرموێ: ببە، دەبێ.

پێمباش بوو شتێکتان بۆ باس بکەم، لەوبارەوە کە عیسا ﷺ چۆن پەیدا بووە؟ کەواتە: کە بەمشێوەیە پەیدابووە، مانای وانیە کوڕی خوایە، خوای کاربەجێ عیسای بەبێ باب دروست کردوە، هەروەك ئادەمیشی بە بێ دایكو باب دروست کردوە لە گڵ، حەوواش دیارنیە چۆنی دروست کردوە؟ بەڵام وا پێدەچێ ئەویشی ڕاستەوخۆ لە گڵ دروستکردبێ، بەڵام ئەوە کە دەگوترێ: حەووا لە پەراسووی چەپی ئادەم دروست بووە، ڕاست نیە، چونکە ئەوە تەنیا لە تەوڕاتدا هاتوە، بەڵام لە قورئانو سوننەتدا شتی وا نەهاتوە، وەك من لە کتێبی: (ئافرەتو خێزان لە سایەی شەریعەتدا) باسم کردوە، هەروەها لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (١)ی (النساء)یشدا بە درێژیی باسم کردوە، واتە: بە هەر چوار شێوەکان خوای پەروەردگار خەڵکی خوڵقاندوە:

١) خەڵکی بەگشتی: بابو دایکیان دیارن.

٢) ئادەم هیچ کامیانی دیارنیەو ڕاستەوخۆ لە گڵ دروست بووە.

٣) عیسا دایکی دیارەو بابی دیار نیە.

٤) حەووا، چۆنیەتیەکەی دیار نیە.

بۆچی؟ تاکو تێمان بگەیەنی کە ئەگەر خوا بیەوێ شتێك دروست بکات، دروستی دەکات!!

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دیارە لە وەڵامی نەصرانییەکاندا کە گوتوویانە: عیسا کوڕی خوایە، پاكیی بۆ خوا ﷻ، دەفەرموێ: ﴿ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا

﴿ إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ﴾
ئەوە بەڵگەهێنانەوەی خوای پەروەردگارە، جا بۆ زانیارییتان خوای زاناو شارەزا زۆر بەڵگان دێنێتەوە لە قورئاندا، ئێمە فێر دەکات، کە ئێمەش فێربین ئەو دینو عەقیدەو مسوڵمانەتییەی خۆمان لەسەر بەڵگە بنیات بنێین، نەك لەسەر بناغەی لاساییکردنەوەو عاتیفە، بەڵكو لەسەر بناغەی بەڵگە، بۆیە لە چەند شوێنان لە قورئاندا، خوا هەم بە ئەهلی کتێبو هەم بە کافرە بتپەرستەکان، دەفەرموێ: ﴿ ... قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١ ﴾البقرة، واتە: بڵێ: بەڵگەتان بێنن، ئەگەر ڕاست دەکەن، لە سوورەتی (البقرة) بە ئەهلی کتێب دەفەرموێ: ﴿ وَقَالُواْ لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ تِلۡكَ أَمَانِيُّهُمۡۗ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١١١ ﴾، لە سوورەتی (النمل)یش بە بتپەرستەکان دەفەرموێ: ﴿ أَمَّن يَبۡدَؤُاْ ٱلۡخَلۡقَ ثُمَّ يُعِيدُهُۥ وَمَن يَرۡزُقُكُم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلۡأَرۡضِۗ أَءِلَٰهٞ مَّعَ ٱللَّهِۚ قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٦٤ ﴾، کەواتە: ئینسانێك کە ڕاستی کرد لە دەعوواکەیدا، دەبێ بەڵگەی پێ بێ، ئەگەر بەڵگەی پێنەبوو، مانای وایە ڕاست ناکات، جیاوازیی نێوان ڕاستو درۆ بەڵگەیە، جا ئەوە بۆ ئێمە دەرسێکی گەورەیە، لێرەدا خوا بەڵگە دێنێتەوە لەسەر نەصرانییەکان کە دەڵێن: عیسا کوڕی خوایە، لەبەرئەوەی بابی دیار نیە، خوای پەروەردگار لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ئادەم نە بابی دیارە، نە دایك، کەواتە: ئەگەر ئەوە بەڵگەتان بێ، قسەیەکی پووچە، ئنجا هەر ناگونجێ عیسا کوڕی خوا بێ؟ وەك دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ فَمَن يَمۡلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا إِنۡ أَرَادَ أَن يُهۡلِكَ ٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَأُمَّهُۥ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا ﴾، بڵێ: ئایا کێ لەلایەن خواوە هیچی بەدەستە، ئەگەر بیەوێ مەسیحی کوڕی مەریەمو دایکیشیو ئەوانەی کە لەسەر زەویشن هەموویان بفەوتێنێ،

کێ چی لەدەست دێ؟ کەواتە: هیچیان پشكو بەشیان لە خوایەتی دانیە، خوای بەرزیش ئەو کەسەیە کە دەژێنێو دەمرێنێ، پەیدادەکاو دەفەوتێنێ، ئەوە خوایە، سیفەتی سەرەکیی خوا ئەوەیە کە بەدیهێنەرو پەیداکەربێ، وە دەبێ مرێنەرو لەنێوبەر بێ، بەڵام غەیری خوا نە شتێکی پێ پەیدا دەکرێو، نە شتی پێ دەفەوتێنرێ، پێی خراپ دەکرێ، بەڵام پێی نافەوتێنرێ، واتە: پێی وا لێناکرێ کە نەمێنێ، ئێستا تۆ دەتوانی شتێك بسووتێنی، لە حاڵەتێکی ماددییەوە دەیگۆڕی بۆ حاڵەتێکی ماددیی دیکە، بۆ وێنە: ئاو دەیکوڵێنی، لە حاڵەتی شلیەوە بۆ حاڵەتی گازییو دەبێتە هەڵم، وە کە دەیبەستی دەگۆڕێ بۆ حاڵەتێکی دیکە، بەڵام ماددەکە هەر هەیەو نافەوتێ، لەڕاستییدا ئەوەی کە دەتوانێ شت پەیدابکات لە نەبووەو بیشیکاتەوە بە نەبوو (عدم)، بەس خوایە ﷻ، کەواتە: ئەوە بەس خوایە کە ئەوەی لەدەست دێو، خاوەندارێتی ئاسمانەکانو زەوی دەکات، بۆیە تەنیا ئەویش شایستەیی پەرستراني هەیە.

**مەسەلەی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ بَلۡ أَنتُم بَشَرٞ مِّمَّنۡ خَلَقَۚ يَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُۚ وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا بَيۡنَهُمَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴾

تویژەرەوانی قورئان لێرەدا بۆ لێکدانەوەی مانای ئەم ئایەتە تووشی جۆرێك لە ئیشکالو تەنگژە بوون، چونکە: خوای دادگەر لە سوورەتی (التوبة)دا دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ عُزَيۡرٌ ٱبۡنُ ٱللَّهِ وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِ ... ﴿٣٠﴾ ﴾، واتە: جوولەکە گوتیان: عوزێر کوڕی خوایەو نەصرانییەکانیش گوتیان: عیسا کوڕی خوایە، (پاکیی بۆ خوا)، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: جوولەکەو نەصرانییەکان گوتوویانە: ئێمە هەموومان کوڕانی خواینو خۆشەویستانی خواین، بۆیە تویژەرەوانی قورئان چەند وەڵامێکیان داوەتەوە بۆ ئەو پرسیارەو، بە چەند جۆرێك هەوڵی لابردنی ئەو ئیشکالەیان داوە:

# ئیشکالێک لەسەر رستەی:

## ﴿ ... نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ ... ﴾ و وەڵامدانەوەی

١/ هەندێکیان دەڵێن: کە جوولەکە دەڵێن: عوزێر کوڕی خوایەو نەصرانیی دەڵێن: مەسیح کوڕی خوایە، وە ئەو دوو کەسەش لەنێو جوولەکەو نەصرانیی یاندا زۆر بەڕێزن، مادام دوو بەشەر بگونجێ کوڕی خوابن، دەگونجێ بەشەرەکانی دیکەش کوڕی خوابن.

٢/ وە هەندێکیان دەڵێن: کاتی خۆی ئەوانەی گوتوویانە: ئێمە کە دەبین بە جوولەکەو دەبین بە نەصرانیی، مانای وایە ئێمە کوڕی خواین و خۆشەویستی خواین، با ئێستاش لە کتێبەکانیاندا نەبێ، چونکە لە کتێبەکانیاندا نیە، بڵێ: ئێستا نەصرانییەکان کوڕی خوان، دەڵێن: کاتی خۆی وایانگوتوە، بەڵام ئێستا لایانبردوە.

٣/ هەندێکیش دەڵێن: مەبەست لە کوڕانی خوا، خۆشەویستانی خوایە، واتە: ئەوانە گوتوویانە: ئێمە خۆشەویستی خواین، وە لەلای خوا پەسندین و هەڵبژێردراوین، جا جوولەکەکان ئەوە ناشارنەوەو ئێستاش دەڵێن: ئێمە گەلی بژاردەی خواین، (نَحْنُ شَعْبُ اللهِ الـمُخْتَار) وە لە قورئانیشدا باسی ئەو مەسەلە کراوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰبَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتِيَ ٱلَّتِيٓ أَنۡعَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ وَأَنِّي فَضَّلۡتُكُمۡ عَلَى ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٧﴾ ﴾ البقرة، ئەی وەچەی ئیسرائیل! یادی نیعمەتەکانی من بکەنەوە کە لەگەڵم کردوون، وە بەسەر جیهانییاندا هەڵمبژاردوون، کە مەبەست پێی سەردەمی خۆیەتی، لە سەردەمی خۆیاندا وەچەی ئیسرائیل ئیماندار بوون و لە هەموو خەڵکی سەردەمی خۆیان باشتر بوون، بەڵام مانای وانیە کە بە درێژایی مێژوو، وە تا دنیا بە کۆتا دێ، لە

هەموو خەڵك باشترین، شتی وانیە، بەڵام كە گوتوویانە: ئێمە كوڕانی خواین، واتە: ئێمە خۆشەویستی خواین، وە بە خۆشەویست بوون لەلای خوای پەروەردگاریش، نسبەتێكی تایبەتیمان لەگەڵ خوادا هەیە.

٤/ هەندێكیشیان دەڵێن: دەقی ئەو قسەیان نەكردوە، بەڵام لاف لێدانەكانیان خوازیاری ئەوەن، واتە: نەیانگوتوە ئێمە كوڕی خواین، نە ئێستا وا دەڵێن: نە كاتی خۆشی وایانگوتوە، بەڵام ئەو لافە لێدەدەن بۆ وێنە: جوولەكەكان گوتوویانە: ﴿ وَقَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَةً ۚ قُلۡ أَتَّخَذۡتُمۡ عِندَ ٱللَّهِ عَهۡدًا فَلَن يُخۡلِفَ ٱللَّهُ عَهۡدَهُۥٓ ۖ أَمۡ تَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ البقرة ، ﴿ قَالُوا۟ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَٰتٍ ۖ وَغَرَّهُمۡ فِى دِينِهِم مَّا كَانُوا۟ يَفۡتَرُونَ ﴿٢٤﴾ ﴾ آل عمران، چەند ڕۆژێكی كەمو ژمێردراو نەبێ ئاگرمان تووش نابێ، واتە: ئێمە هەرچەند گوناهانیش بكەین، هەرچەند خراپیش بین، تەنیا چەند ڕۆژێكی كەم دەسووتێنرێین، جا هەندێكیان گوتوویانە: حەوت ڕۆژە، هەندێكیشیان گوتوویانە: چل ڕۆژە، ئنجا ئەو لاف لێدانە، ئەگەر وابێ، ئەوە دەگەیەنێ كە دەبێ ئێوە خۆشەویستی خواین‌و نسبەتێكی تایبەتییتان لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەبێ، واتە: لاف لێدانی ئەوە كە خوا سزایان نادات، ئەوەی لێوەردەگیرێ كە دەبێ ئەوان نسبەتێكی تایبەتییان لەگەڵ خوادا هەبێ، خۆشەویستی خواین، نەصرانییەكانیش ئەوە دیارە دەڵێن: عیسا ﵇ كە لە خاچ دراوە بۆتە بەلاگێڕەوەی بەشەر، بۆ زانیارییتان نەصرانییەكان عەقیدەیان وایە كە عیسا ﵇ لە دار دراوەو هەڵواسراوە كە بە حیسابی ئەو تاقە جگەر گۆشەو تاقە كوڕی خوا بووە، وە خوا فەرموویەتی: من ئەو تاقە كوڕەی خۆم دەكەمە فیداو بەلاگێڕی هەموو ئەوانەی كە ئیمانی پێ دێنن، كە پێغەمبەری خواو كوڕی خوایەو بەشێكە لە خوا، هەر كەس ئەو ئیمانەی پێ هەبێ، ئەوە ئەو لە سێدارەدرانەی ئەو، دەبێتە هۆی سڕینەوەی هەرچی گوناهی كردوویەتی! كە بەڕاستی ئەوە شتێكی زۆر نامەتیقییە، یانی: ئێستا بابای نەصرانیی لە وڵاتانی ڕۆژئاواو لەوپەڕی دنیا گوناهان دەكات، زینا دەكات، قەتڵ دەكات، دزیی

دەکـات، بە عەقیدەی ئەفسانەیی وان، دوو هـەزار سـاڵ پـێش ئێسـتا عیسـا ﷺ لە دار دراوەو هـەڵواسراوە، تاکو ببێتە مایـەی کـەفارەتی گوناهەکـانی ئـەوان!! کە بێگـومان واش نیـە، وەك ئێمـە لـە تەفسیـرکردنی ئایەتـەکانی سـوورەتی (النسـاء)و (آل عمـران)دا ڕوونمـان کـردوەوە کـە عیسـا، لـە دار نـەدراوە، خـوا دەفـەرموێ: ﴿... وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ...﴿١٥٧﴾﴾النسـاء، واتـە: نە کوشتوویانەو نە هەڵیانواسـیوە، بەڵکو وێنەی عیسایان بۆ برایە سەر کەسـێکی دیکـەو ئـەو کەسـەیان لـە جیـاتی عیسـا ﷺ لە خاچـداوە، ئنجا بـە هەرحـاڵ عیسـا ﷺ دوو هـەزار سـاڵ لەمـەو پـێش هەڵواسـرابێ، بـۆ دەبـێ ببێتـە هـۆی سـڕینەوەی گوناهی ئێسـتای کەسـێك کە تـاوانو گوناهـان دەکات؟!!

بـۆ زانیارییتـان! ئـەو عەقیـدە ئەفسـانەییە زۆر کاریگەریشـی هـەبووە لەسـەر نەصـرانییەکان، چونکە ئەگـەر بـە پێـی ئینجیـلەکان بـێ، دەبـێ نەصـرانیی زۆر سەلامەتو ئاشتی خوازبن، چونکـە لـەو چوار ئینجیـلانەدا هـاتوە، دەڵـێ: عیسـا ﷺ فەرموویـەتی: (ئەگـەر کەسـێك زللەیـەکی لـەلای ڕاسـت دای، لای چەپیشـی بـۆ ڕاگـرە)! وە (ئەگەر کەسێك چۆغەڵەکەی لـێ سەندی، کراسـەکەشـتی بـۆ دانـێ)، وە (ئەگەر کەسێك میلێکی بە پێش خۆی دای، دوو میل لە پێشـیەوە بـڕۆ) باشە مـادام عیسـا ﷺ وای فێرکـردوون، ئـەدی بۆچی ڕۆژئـاواو ئەورووپـا، وڵاتـانی دنیـا داگیـر دەکەن؟ ئەدی ئەمریکـا بۆچی دنیـا داگیـر دەکـا؟ بەریتـانیای مەزن (عُظمـی) کـاتی خـۆی بـۆ دنیـات داگیـر کردبـوو؟ فەڕەنسـاو ئیسـپانیاو ئەڵمانیـا بـۆ دنیا پـاوان دەکەن؟ هەمووشتان خۆتـان بە نەصـرانیی دەزانـن!

بۆیە من پێمـوایە ئەو عەقیدە ئەفسـانەییە کاریگـەریی زۆری بـووە لـەوەدا بڵـێن: هەرچی بکەین قەیدێناکات مادام عیسـا ﷺ لە سێدارە دراوەو ئێمـەش نەصـرانیین‌و بـە دوای عیسـا ﷺ کـەوتووین، ئـەو بۆتـە هـۆی سـڕینەوەی گوناهەکانمـان، چاوپۆشـییمان لـێ دەکرێ، چونکە عیسـا ﷺ لە جیـاتی ئێمـە لە سێدارە دراوە، هەڵبەتـە ئـەوان بیرۆکەیـەکی دیکەشـیان هەیـە، دەڵێن: چ پیـاو چ ژنـی نەصـرانیی هەرچەندە گوناهان بکـات، کە چوو بۆ لای پاپـا، یـان بـۆ لای قەشـەو لە بـەردەمی دانـی دا بـە گوناهـەکانی خـۆی داهێنـاو گوتـی: مـن ئـەو گوناهانـەم کـردووە هەڵـەم

کردوە، ئەویش بڵێ: ئەوە من لە جیاتی خوا لێت خۆشبووم! تازە ئەوە پاك دەبێتەوە.

ئنجا بۆ ئاگاداریتان ئەو جۆرە فیکرو بیرۆکە سەیرانە هاتوونە نێو ئیسلامو مسوڵمانانیشەوە، ئێستا هەندێك لەوانەی خۆیان بە سەییدو شێخ دەزانن، پێیان وایە لەبەرئەوەی خزمی پێغەمبەرن، لە گوناهان دەبەخشرێن، جا شتێکیش دێننەوە، دەڵێن: خوا پێی فەرمووە: ئەوانەی خزمی تۆن چاکەکانیان بۆ خۆم دەبەمە بەهەشتێ، خراپەکانیشیان بە تۆ دەبەخشم، مانای وایە کەس نامێنێتەوە، ئنجا لەوبارەوە (مەلای گەورەی کۆیی) شتێکی سەیر لە تەفسیرەکەی باس دەکات، دەڵێ: ڕۆژێك بابم (مەلا عەبدوڵلا جەلی زادە) لە مەجلیسی کاك ئەحمەدی شێخ دادەنیشێ، کە پیاوێکی گەورەو زۆر چاکیش بووە، کوڕی شێخ مەعرووفی نۆدییە، شوێنکەوتووی (ڕێبازی قادری)ین، مەولەوی شاعیریش لەو مەجلیسە دەبێ، یەکێك لە سەییدەکان لەو مەجلیسەدا دەڵێ: ئێمە پیاوەکانمان هەرچی بکەن عەفوون، لە گوناهو خراپە، لەبەرئەوەی لە وەچەی پێغەمبەرانن، مەولەوییش دەڵێ: وەڵامی ئەو پرسیارەم بدەوە: هەر پیاوەکانتان عەفوون، یان ئافرەتەکانیشتان؟! کاك ئەحمەدیش تووڕە دەبێ لە خزمەکانیو دەڵێ: قسەی نەزانانەو نەفامانە بۆ دەکەن کە مەولەوی لێرە دانیشتوە؟! بۆیەش خوا ﷻ وەك بەرپەرچدانەوەی ئەو بیرە ئەفسانەیەی جوولەکەکان دەفەرموێ: ﴿قَالُواْ لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍۖ وَغَرَّهُمْ فِي دِينِهِم مَّا كَانُواْ يَفْتَرُونَ ﴿٢٤﴾﴾ آل عمران، واتە: گوتیان: ئاگر نامانگاتێ مەگەر چەند ڕۆژانێکی ژمێردراو، وە ئەوەی لە دینەکەیاندا هەڵیان دەبەست فریوی دان. بەڵێ شت هەڵبەستن لە دیندا خەڵك فریو دەدات: سەیید بەتەمای پشتێنی سەوزو، حاجی بەتەمای کەشیدەی زەردو، مەلا بە تەمای مەندیلی سەریو، ئیسلامیی بە هۆی ئەوەی ناوی ئیسلامییەو، ئەوی دیکە لەبەرئەوەی کوڕی فلانە کەسە، ئەوی دیکە لەبەرئەوەی مەلا زادەیە، یەکیان لەبەرئەوەی شێخ زادەیە، کە لە قورئاندا هیچیان بنەمایان نیە، بەڵکو پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ بَطَّأَ بِهِ عَمَلُهُ لَمْ يُسْرِعْ بِهِ نَسَبُهُ﴾ {رَوَاهُ مُسْلِم برقم: (٦٧٩٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٩٤٥)، وابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٢٥)،

وَالـدَّارَمِي بـرقم: (٣٤٤) عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ} واتـە: هـەر کەسـێك کردەوەکـەی دوای بخات، ڕەچەڵەکەکەی پێشـی ناخات، کەواتـە: دەبـێ مـرۆڤ بـە کـردەوە پـێش بکـەوێ، خوای پەروەردگاریش کە دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ ...﴿١٣﴾﴾ الحجــرات، واتـە: بـەڕێزترینتان لای خـوا پارێزکـارترینتـانه، وە دەفـەرموێ: ﴿فَإِذَا نُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَلَآ أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ ﴿١٠١﴾﴾ الـمؤمنـــون، واتــە: ئەگەر فوو بە کەڕەنـادادا کرا، لــەو ڕۆژەدا نـە ڕەچەڵەکیــان لـە نێـوان دا هەیــە، نـە کەسیش داوا لە کـەس دەکـات.

(جمال الـدين القاسـمی) خـاوەنی تەفسـیـری (محاسـن التأويـل) قسـەیەکی خـۆش دەکـات، دەڵـێ: (قَـالَ بَعْضُ شُيوخِ الصـوفِيَّةِ لِبَعْضِ الفُقَهَاءِ: أَيْنَ تَجِدُ فِي القُرْآنِ أَنَّ الحَبِيبَ لا يُعَذِّبُ حَبِيْبَهُ؟ فَلَمْ يَرُدْ عَلَيْهِ، فَتَلاَ الصَّوفِي هَذِهِ الآيَةَ: ﴿قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ﴿١٨﴾﴾ الـمائدة[1].

واتـە: یەکێـك لـە شـێخەکانی تەریقـەتی تەصـەووف بـە یـەکێك لـە شـەرعزانان دەڵـێن: لـە کوێی قورئـانـدا ئـەوە هەیـە کە خۆشـەویست خۆشەویسـتی خـۆی سـزا نادات؟ ئەویش وەڵامی نەدایـەوەو نازانـێ وەڵامـی بداتـەوە، شـێخە صـۆفییەکەش ئـەم ئایەتەی بـۆ خوێنـدەوە: ﴿قُلْ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُم ﴿١٨﴾﴾، واتـە: ئـەدی بۆچـی بــە گوناهەکانتـــان ســـزاتان دەدات، دیـــارە ئــەوان گوتوویانـــە: ئێمــە کـــوڕانو خۆشـەویسـتانی خـواین، ئـەویش دەفـەرموێ: کەواتـە ئەگـەر خۆشـەویستبان سـزای نـەدەدان، ئنجـا دیـارە ئـەو ئایەتـە بەڵـگەیە لەسـەر ئـەوە کـە خـوا هـەر کەسـێکی خۆشـویست بە گوناهەکانی سزای نادات، بـەڵام بۆچـی سـزای نـادات؟ دیارە تۆبەیـان لــێ دەکـاتو پەشـێمان دەبێتـەوە، ئەگـەرنا کـەس مـافی (ڤیتـۆ)ی نیـە لـە بەرانبـەر خـوادا، بـەڵام کەسـێك خـوا خۆشـی بـوێ، دیـارە کـە گونـاهی کـرد، تۆبـە دەکـاتو پەشێمان دەبێتەوە، ئنجا کە پەشێمان بۆوەو تۆبـەی کـرد، ئـەوە خـوای بـە بـەزەییش

---

١) ج٦، ص١٤١.

لـێی خـۆش دەبــێ، چـونکە خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿... إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾البقـرة، واتە: بێگومـان خــوا ﷻ ئەوانـەی کـە زۆر دەگـەڕێنەوە بۆ لای خـواو، ئەوانەی کـە زۆر خۆ پاك دەکەنـەوە، خۆشـیدەوێـن.

**مەسـەلەی حەوتـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ﴾، واتـە: بەڵـکو ئێـوەش بەشـەرێکن وەك باقی ئەو خەڵکـە، کە خوا دروستی کـردوون، کەواتـە: هـیچ کـەس پلـەو ئیمتیـازی لـەلای خـوا نیـە، مەگـەر بـە تـەقوا نـەبێ، وە بـە لای خـواوە نەسـەبو ڕەچــەڵەك هـیچ دەورێـك نابینــێ، ئـەوە زۆر گرنگە کـە مسـوڵمانان بـاش لـێی تێبگـەن، چـونکە وەك گـوتم: هەیـــە مەلازادەیـە، دەڵـێ: کاکـە ئێمـە ئەوەنـدە پشـتەمان مـەلا بـووە، تـۆ بڵـێی خـــوا لێمـان خـۆش نـەبێ! ئەویدیکـە دەڵـێ: ئێمـە شــێخ بـووین، ئەویدیـکە دەڵـێ: ئێمــە ســەید بـووین، یەکـی دیکــە دەڵــێ: بـابم ئەوەنــدە چــاك بووە...هتــد، نەخێــر وەك کـوردەواریی خۆمـان دەڵــێ: (کـەس بـە مەلەی بــابی ناپەڕێتــەوە) یان (کە خــۆت کۆسـەی ڕیشــی بابـت بـە تـۆ چـی)، دەبــێ بۆخۆت کردەوەت هەبـێ، وەك جارێك من لەگـەڵ مامۆسـتایەکی شـێخ کـە سـەییدیش بوو، باسی ئەو بابەتی نەسەبو ڕەچـەڵەك‌و ئەوانەمـان کـرد، پێـی گوتــم: مامۆســتا چۆن ڕەچـەڵەك ســوودی نیـە؟ ســوودی هەیـە، گوتــم: ســوودی چـی هەیـە؟ گـوتی: کەسێك خزمی پێغەمبەر ﷺ بێ، چۆن ســوودی بۆی نیــە؟ منـیش گوتــم: ئەگـەر خزمایەتیی لەگەڵ پێغەمبـەردا ﷺ سوودی هەبووایـە، لـە سـەردەمی خۆیـدا سـوودی زیاتر دەبـوو، باشــە (أَبُو طَالِب) مـامی نـەبوو؟ (أَبُو لَهَب) مـامی نـەبوو؟ گـوتی: بـا، گوتم: تۆ لە دوای هــەزارو چوار ســەد ســاڵ بە چەند پشت دەچیەوە سەری، زۆر لێـی دووركەوتوویـەوە، ئەوان لە بنــەو پاڵی خۆی بوون، کەچـی (أَبُو لهب) خـوا لەعنـەتی لــێ دەکـات، لەبەرئـەوەی لەگەڵیـدا نـەبووە، ئێمـە دەڵـێین: هـەر کەسـێك بـە دوای پێغەمبــەر ﷺ نەکـەوێ، خزمایـەتیی لەگـەڵ پێغەمبـەر ﷺ ســوودی پێناگـەیەنــێ، ئەدی کەسێك بە دوای بکەوێ‌و خزمیشــی بێ؟ بێگومان باشــە، بـەڵام بـایی ئەوەنـدی ســوودی پێدەگەیەنێ کە بە دوای دەکەوێ، نەك بایی ئەوەندە کە خزمیـەتی، بۆچـی؟ چونکە ئەگـەر وانـەبێ ئەوانـەی خزمـی پێغەمبـەر نیــن، لـە ڕۆژی قیـامەتــێ بۆیـان هــەیە بڵــێن: خــوایە! ئێمەشــت بـە خزمـی پێغەمبــەر ﷺ دروســت کردبا، تاکو

بەبێ خۆ ماندووکردن چووباینە بەهەشتێ، پاکیی بۆ خوا، ئەو کاتە خوا بەڵگەی بەدەستەوە نەدەبوو، بەڵام خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿... إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ ...﴿١٣﴾﴾الحجرات، واتە: بەرێزترینتان لە لای خوا پارێزکارترینتانە، وە پێغەمبەریش ﷺ رِوونی کردۆتەوە، کەواتە: وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (ئیمانێ بە نیسکێ مەسپێرە)، نابێ ئینسان خۆی بەو شتانە هەڵخەڵەتێنێ، وە لەڕاستیدا جوولەکەو نەصرانییەکان لێرەدا تووشی لادان بوون، وە لێرەدا تووشی لەخۆباییبوون بوون، کە پشتێنی لێ بکەنەوەو گوێ نەدەنە کردەوەی باش، ئەوەتا بە دوای پێغەمبەری کۆتایی نەکەوتوون، گوتوویانە: ئێمە تەنیا بە دوای مووسا دەکەوین، یان بە دوای عیسا دەکەوین، ئەوان شەفاعەتمان بۆ دەکەن، بەوە خۆیان هەڵخەڵەتاندوە، ئنجا ئەگەر خاوەن کتێبەکان وابڵێن‌و مسوڵمانانیش هەر کۆمەڵەیان بڵێ: خزمی فلان کەسین، یان فلان کەسین .. هتد، مانای وایە هەموو خەڵك مافی (ڤیتۆ)ی دەبێ لە بەرانبەر خوادا، ئەدی کێ پابەندبێ بە شەریعەتەوە؟ بۆیە دەبێ هەوڵبدرێ ئەو شتانە لە مێشك‌و دڵی مسوڵمانان بسڕێنەوەو تێبگەیەندرێن کە تەنیا پشت بە کردەوەی باشی خۆیان ببەستن، وە ئەگەر تەماشای هەموو قورئانیش بکەین، دەبینین خوا هەر دەفەرموێ: ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴿٨٢﴾﴾التوبة، ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿١٧﴾﴾السجدة، پاداشت‌و سزای ئەوەیە کە بە دەستیان دێناو دەیانکرد، هەرگیز نافەرموێ: لەبەرئەوەی کە خزمی فلان کەس بوو، یان لە فلان کەس نزیك بوو.

**مەسەلەی هەشتەم‌و کۆتایی**: کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا يُبَيِّنُ لَكُمۡ عَلَىٰ فَتۡرَةٖ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾، وشەی: (فَتْرَة) واتە: دابڕان‌و وەستان‌و خاوبوونەوە، وە پێغەمبەری خواش فەرموویەتی: ﴿أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِابْنِ مَرْيَمَ، وَالأَنْبِيَاءُ أَوْلادُ عَلاَّتٍ، لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٩٩٧٥)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٤٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٠٨٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٧٥)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ}، واتە: من نزیکترین کەسم لە کوڕی مەریەمەوە، وە پێغەمبەران هەموویان لە بابێکن‌و دایکیان جیایە، وە لە نێوان من‌و عیسای کوڕی مەریەم دا

هیچ پێغەمبەرێکی دیکە نەبوون، بۆیە ئەم فەرموودەیەم هێناوە، چونکە لە هەندێ لە کتێبەکانی تەفسیردا دەڵێن: لەنێو عەرەباندا دوو سێ پێغەمبەری دیکە هاتوون، خالیدی کوڕی کێی کوڕی کێ، لەڕاستییدا ئەوە وانیە، لە دوای عیسا هیچ پێغەمبەر نەهاتوون هەتا پێغەمبەری کۆتایی ﷺ هاتوە، وە ئەم حەدیسەی پێغەمبەر ﷺ دەقە لەسەر ئەوە، وێڕای ئایەتەکەش کە دەفەرموێ:

﴿ عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ ﴾، دوای دابڕانێك لە پێغەمبەران، ئەوجار موحەممەد ﷺ هاتوە، وە ماوەی نێوان پێغەمبەری کۆتایی ﷺ و عیسا ﷺ چەند ساڵ بووە؟ لە کاتی وەفاتی عیساوە ﷺ تاکو نێردرانی موحەممەد ﷺ (٥٦٠) پێنج سەدو شەست ساڵ بووە، وە ئەگەر عیسا ﷺ لە یەکی (١) زایینی لەدایك بووبێ و لە تەمەنی چل (٤٠)دا بووبێتە پێغەمبەرو لە تەمەنی پەنجا (٥٠)دا هەڵکێشرابێ بۆ ئاسمان، پێغەمبەری ئێمەش موحەممەد ﷺ لە ساڵی (٥٧١)ی زایینی لەدایك بووەو لە (٦١٠) بۆتە پێغەمبەر، پەنجا ساڵی لێدەرکە، دەبێتە (٥٦٠)، واتە: ماوەی (٥٦٠) ساڵ لە نێوان عیسا ﷺ و موحەممەددا ﷺ بووە، کە ئەوە ماوەیەکی زۆرە، وە لە نێوان هیچ دوو پێغەمبەرێکدا ئەو ماوە زۆرە نەبووە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شەشەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان حەوت ئایەت دەگرێتە خۆی، لە ئایەتی: (٢٠ تاکو ٢٦)، دیارە ئەم دەرسەمان یەکەمین بەسەرهات لەو چوار بەسەرهاتەی کە لە سوورەتی (المائدة)دا باسکراون، دەگرێتە خۆی، کە بریتیە لە فەرمانکردنی مووسا ﷺ بە گەلەکەی، واتە: وەچەی ئیسرائیل، کە بچنە نێو سەرزەمینی پیرۆزەوە، کە دواتر باسی دەکەین سەرزەمینی پیرۆز یانی: چی؟ دیارە ئەوانیش بڕوبەهانەیان هێناوەتەوەو نەچوون، وە سەرەنجام سەرپێچییان کردوە لە فەرمانی مووسا ﷺ، وە دوو کەس لە گەلەکەی مووسا ﷺ کە دوو پیاوی لەخواترس بوون، وە پشت بە خوا بەستوو بوون، وە خوا پێداو بوون، زۆر هانیان داون کە بچن‌و نەترسن، بەلاّم هەر ئامادە نەبوون بچن‌و سەرپێچییان کردوە، پاشان مووسا ﷺ سکالاّی خۆی لە لای خوای پەروەردگار کردوە، وە لێی پاڕاوەتەوە، کە لەگەڵ ئەو گەلە لاڕێ‌و لەڕێ دەرچووە لە یەکیان بترازێنێ‌و لە یەکیان جیابکاتەوە، وە سەرەنجام خوای کاربەجێ بڕیاری داوە کە دەبێ ئەو گەلە (واتە: بەنی ئیسرائیل) چل ساڵ لە بیابانی سینادا بمێننەوە، وە ئەو چل ساڵە بە سەرگەردانیی بسووڕێنەوە سەراسیمەو بن.

﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ
أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾ يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟
ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾
قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن
يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ
عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن
كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾ قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا ۖ فَٱذْهَبْ أَنتَ
وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِى وَأَخِى ۖ
فَٱفْرُقْ بَيْنَنَا وَبَيْنَ ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٥﴾ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيْهِمْ ۛ أَرْبَعِينَ سَنَةً ۛ
يَتِيهُونَ فِى ٱلْأَرْضِ ۚ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴿٢٦﴾ ﴾

# مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە یاد بکەوە! کاتێك مووسا بە گەلەکەی خۆی گوت: ئەی گەلەکەم! چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە یاد بکەنەوە، کە پێغەمبەرانێکی تێدا ڕەوانە کردوونو گێڕاونی بە پادشا، وە ئەوەی پێیداون بە هیچ کام لە جیهانییانی نەداوە ﴿٢٠﴾ ئەی گەلەکەم! بچنە سەر ئەو زەمینە پاکەوە کە خوا بۆی نووسیون، وە پاشەو پاش مەگەڕێنەوە دوا کە سەرەنجام زیانباربن ﴿٢١﴾ گوتیان: ئەی مووسا! بەڕاستی ئەو سەر زەمینە کۆمەڵێکی بە زەبرو زۆری تێدان، وە ئێمە هەرگیز نایچینێ، هەتا ئەوان لێی نەچنە دەر، ئنجا هەرکات لێی چوونە دەر، دەچینە نێوی ﴿٢٢﴾ دوو پیاو لەوانەی لە خوا دەترسن، وە خوا چاکەی لەگەڵ کردبوون، گوتیان: لە ناکاو لێیان وەژوور دەروازەی شارەکەیان بکەون، ئنجا هەرکات کتوپڕ لێیان بچنە ژوور، ئەوە بێگومان ئێوە سەرکەوتوون، وە ئەگەر لە بڕواداران تەنیا پشت بە خوا ببەستن، ﴿٢٣﴾ (گەلەکەی گوتیان: ئەی مووسا! بە دڵنیاییەوە ئێمە هەرگیز ناچینە ئەو شارەوە تاکو ئەوانی تێدابن، دەجا تۆو پەروەردگارت بچن لەگەڵیان بجەنگن، ئەوە ئێمەش لێرەدا دانیشتووینو چاوەڕێین ﴿٢٤﴾ مووسا گوتی: پەروەردگارم! تەنیا خۆمو برایەکەمم بەدەستە، دەجا لەگەڵ کۆمەڵی لاڕێیانو سەرپێچییکاران لە یەکمان جیابکەوە ﴿٢٥﴾ خوا فەرمووی: بێگومان لێیان قەدەغەیە، بۆ ماوەی چل ساڵ دەبێ لە زەویدا سەرگەردان ببن، دەجا تۆش خەفەت لە کۆمەڵی لاڕێیان مەخۆ ﴿٢٦﴾)).

## شـیكردنـەوەی هـەندێـك لە وشــەكان

(مُّلُوكًا ): كۆی (ملـك)ە، جا مانا زاراوەییەكەی واتـە: پادشا، حـوكمڕان، بـەڵام خـۆ بـەنی ئیسـرائیل تـاك تاكیـان مـەلیك نـەبوون، ڕیشــەی وشـەی مەلیـك ئـاوا هاتــوە: (الـملوكُ: جَمْـعُ الـمَلِكِ، وَالـمَلِكُ مَنْ بِيَدِهِ الـمُلْكُ، والـمُلْكُ: هُـوَ التَّصَـرفُ بالأَمْرِ وَالنَّهي في الجُمهُور)، واته: (مُلْـك) بریتیـە لـە دەســتكراوەیی لـە فـەرمان پێكردنو لـێ قەدەغەكردن لـە خـەڵكو جـەماوەردا، هـەر كەسـێك ئـەوەی بەدەست بـوو، مانـای وایـە ئـەوە مـەلیكی ئـەو خەڵـكەیە، (وَالـمِلْكُ ضَرْبَانِ: مِلْـكٌ هُـوَ التَمَلُّكُ وَالتَّوَلِّي، وَمِلْكٌ هُوَ القُوَّةُ عَلَى ذَلِكَ، تَوَلَّى أَوْ لَمْ يَتَـوَلَّ)، واتـە: (مِلْـك) بریتیـە لـە خاوەنـداریەتی شــت، جا (مِلْـك) دوو جـۆری هەیـە: یـەكیان ئەوەیـە شـتێكی هـەبێو لـەژێر دەسـتەڵاتی خۆیـدا بـێ بـە كـردەوە، ئەویدیكـە ئەوەیـە كـە شــتێكی هەبــێو دەستەڵاتیشــی هەبــێ بـا بــە كــردەوە ئـەو حوكمڕانییەشــی لەبەردەستدا نەبێ.

(ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ): واتە: سـەر زەمینی پاككراوە، چونكە دەڵێ: (التَقْدِيسُ: التَـطْهِيرُ الإلَهي الْمَذْكُور فـي قَولِهِ: ﴿وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾ الأحزاب)، (تَقْدِيس) واتـە: (تَطْهِير)، پاككردنـەوە، جا پاككردنـەوەی خـوایی هەیــە، جاری وایـە خـوا هەنـدێك كـەس پـاك دەكاتــەوە، بـۆ وێنــە: بـە (بنەماڵــە)و هاوســەرانی پێغەمبــەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ﴿٣٣﴾﴾ الأحــزاب، واتــە: دەیــەوێ بــە پاكبوونــەوە پاكتــان بكاتــەوە، جـاری واش هەیـە، شــتێك پــاك دەكرێتــەوە، نــەك خــوا پــاكی كردبێتـەوە، بـۆ وێنـە: شــوێنێك، وڵاتێـك، لـە دەســتەڵاتی كەسـێك دایـە، دوایـی كەسـێكی دیكـە دەسـتەڵات دەگرێتـە دەسـت، دەگـوترێ: دەسـتەڵات پاككرایـەوە لـە دەسـتی فلان كـەس.

(أَدْبَارِكُمْ): (أَدبَار) كۆی (دُبُر)ە، (دُبُرُ الشَّيءِ خِلاَفُ القُبُلِ)، (قُبُل) واتە: پێشــەوە، پێشی هەر شتێك، (دُبُر) واتە: پشــتەوە، (خلـف) واتە: پشــت، پـاشو پـێش، نـەك بلــێین:

وەك ئەندامێکی دیاریکراو، نا، دوایی بە مانای زاراوەیی و باو وایلێهاتوە، کە (قُبُل) و (دُبُر) بە دوو ئەندامی ئینسان بگوترێن.

(**جَبَّارِينَ**): کۆی (جَبَّار)ە، (الإجبَارُ: هُوَ الإكرَاهُ، والجَبَّارُ: المُتعالي)، (إجبار) واتە: (إكرَاه)، زۆرلێکردن، تۆبزیی لێکردن، ناچارکردن، (جَبَّار)یش کەسێکە خۆی بەرز کردبێتەوەو مل بە خەڵك کەچ بکات، وە دەستەڵاتی خۆیان بەسەردا ڕابنێ.

(**فَٱفۡرُقۡ** ): واتە: جیامان بکەوە، (الفَرْقُ يُقارِبُ الفَلْقَ، لَكِنَّ الفَلْقَ إنْشِقَاقٌ والفَرقُ إنْفِصالٌ) واتە: (فَرْق) کە بە مانای لێك جیاکردنەوەیە، لەگەڵ وشەی (فَلْق) زۆر لێك نزیکن، بەڵام (فَلْق) بریتیە لەوەی کە شتێك شەق ببێ، واتە: شتێکی ڕەق ببێتە دوو کەرت، کەرت بوون، (فَرْق)یش بریتیە لە لێك جیابوونەوە، با دەنگیشی لێوە نەیێ.

(**يَتِيهُونَ** ): واتە: سەرگەردان دەبن، سەراسیمە دەبن، (تَاهَ يَتِيهُ: إذَا تَحَيَّرَ، وَتَاهُ يَتُوُهُ، لُغَةٌ مِنْهُ)، (تَاه) واتە: سەرگەردان بوون، (يَتِيهُ) واتە: سەرگەردان دەبێ، (تَحَيَّر) واتە: سەراسیمە بوون، سەرگەردان بوو، نەیزانی بۆ کوێ دەچێ، وە (وَتَاهُ يَتُوُهُ)ش ئەویش لەهجەیەکەو ئەوەش بەکارهاتوە.

(**فَلَا تَأۡسَ** ): واتە: خەفەت مەخۆ، (الأسَى: الحزنُ، وَيُقَالُ: أَسِيْتُ عَلَيْهِ وَأَسِيْتُ لَهُ، قال تعالى: ﴿فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾)، واتە: (الأسى) یانی: خەفەت، دەگوترێ: (أَسِيْتُ عَلَيْهِ وَأَسِيْتُ لَهُ) واتە: خەفەتم بۆی خوارد، بۆی دڵتەنگ بووم، کە خوای بەرزیش دەفەرموێ: ﴿فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾، واتە: خەم مەخۆو دڵتەنگ مەبە، کە ئەو گەلە لاڕێ و دەرچووە، بە قسەت ناکەن و سەرپێچیی دەکەن.

# مانــای گـشـــتـی ئایەتەکـــــان

دیارە هەر لە درێژەی باسی خاوەن کتێبەکاندا، لێرەدا خوا بە تایبەت دەربارەی مووسا علیه السلام و گەلەکەی، واتە: بەنی ئیسرائیل دەدوێ، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾، وە یاد بکەوە، کێ یاد بکاتەوە؟ پێش هەموو کەس پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم، چونکە یەکەم کەس بووە قورئان دابەزێنراوەتە سەر دڵی موبارەکی، دوای ویش هاوەڵانی بەرێزی، ئنجا هەموو جیلەکانی ئۆممەت تا دنیا کۆتایی دێ، هەرکەسێك کە قورئان دەخوێنێتەوە، ئەم دواندنانە دەیگرنەوە، جا ئەمــە ئەوەشــی لێوەردەگیــرێ کــە پێویســتە ئێمــە لــە بەسەرهاتەکــانی قورئــان وردبینــەوەو تێیــان ڕابمێنیــنو ســەرنج بــدەین، ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ ﴾، وە یـاد بکــەنەوە کاتێــك مووســا بــە گەلەکــەی خـۆی گــوت: ئەی گەلەکــەم! یادی چاکەی خوا بەســەر خۆتانــەوە بکــەنەوە، لێــرەدا نیعمــەتی بە تاك هێنــاوە، واتــە: جینســی نیعمەتــەکانی خــوا، چاکەکــانی خــوا، چونکە بەڕاســتی خــوای بەخشــەر وەك دوایــی باســی دەکــەین، ئــەو چاکــانەی لەگــەڵ بــەنی ئیســڕائیلی کردوونو ئەو هەموو شــتانەی بــە وانــی داون، بــە هیچ گەلــێکی دیکــەی نــەداون، دیــارە هۆکارەکەیشــی ئــەوە بــووە کــە پێویســتیان پێیــان بــووە، وە خــوای پــەروەردگاریش کاربەجێیــەو شتی نابەجێ ناکــات، ئەوان لــە ســەردەمی خۆیانــدا چوار دەوریــان هەمــوو ئــــەهلی کــوفرو بتپەرســتان بــوونو، تەنیــــا خۆیــــان ئەهلــــی خـــوا بەیــــەکگرتنو خواپەرســتیی بــوون، ئنجــا لەبەرئــەوەی زەخــتو فشــاری زۆریــان لەســەر بــووە، یــان لەبــــەرئەوەی لــە ژێــر دەســتی فیــرعەوندا زۆر چەوســێنراونەوە، پێویســتییان بــە موعجیــزەی زۆرو بە دەستگرتنی خوای پەروەردگار هەبووە، لەبەر ئەو هۆیـانەو چەند هۆکــارێکی دیکەش، خــوا ئەو چاکــانەی لەگــەڵ ئــەو گەلــەدا کــردوون، گرنــگ ئەوەیــە ئەو نیعمەتــانەی خــوا سبحانه وتعالى بە گەلی ئیسـرئیلی داون، بە هیچ گەلێکی دیکــەی نــەداون، وەك مووســاش علیه السلام لێرەدا دەفـەرموێ: یـادی چاکــەی خوا بەسـەر خۆتانــەوە بکەنــەوە،

﴿إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ﴾، یاد بکەنەوە کە لە نێوتاندا پێغەمبەرانێکی پەیداکردوون، ئەمە لێی وەردەگیرێ کە دەبێ لە پێش مووسادا عليه السلام پێغەمبەرانێکی دیکە بووبن، ﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا﴾، وە گێڕاونی بە پادشاو حوکمڕان، جا توێژەرەوانی قورئان وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، دەڵێن: لێرەدا خوای بالادەست باسی کردوە کە هەندێك پێغەمبەری تێدا پەیداکردوون، بەڵام ئەدی چۆن دەفەرموێ: هەمووتانی کردە پادشا؟ واتە: لە نێوتاندا حوکمڕانی پەیداکردوون، بەڵام لەبەرئەوەی حوکمڕانییەکە بە قازانجی هەمووان بووە، وەك ئەوە وایە کە هەموویان حوکمڕان بووبن، خۆیان خاوەنی خۆیان بووبن، دوایی دەفەرموێ: ﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، وە یادی ئەوە بکەنەوە، کە خوا ئەوەی بە ئێوەی داوە، بە هیچ کەس لە جیهانییانی نەداوە، جا هەندێك مەسەلە کە لە قورئاندا هەن، لە پەیمانی کۆنیشدا هەن، بەڵام بە هەڵە تێگەیشتنی ئەو مەسەلەیە وای لە جوولەکە کردوە، کە خۆیان پێ لە هەموو خەڵکی دنیا چاکتربێ، دەڵێن: ئێمە گەلی هەڵبژاردەی خواین (نَحْنُ شَعْبُ اللهِ الْمُخْتَار)، کە لەڕاستییدا ئەو هەڵهێنجانو تێگەیشتنەیان هەڵەیە، بەڵێ ڕاستە ئەو کاتی باشترینی خەڵکی بوون، بۆیە خوا ئەو شتانەی بەوانی داون، بە کەسی دیکەی نەداون، چونکە ئەو کاتە بەس ئەوان لەسەر ڕێبازی خوا بوون، بەڵام دوای ئەوەی لایانداوە، بۆ وێنە: گەلی فەلەستین ئاوا بەو شێوەیە دەچەوسێننەوە، ستەم دەکەن، ئەوە بە تەئکید ئەو مەدحانەی خوای پەروەردگار نایانگرێتەوە، چونکە خوای دادگەر لە گۆترە نە کەسی خۆشدەوێ، نە ڕقی لە کەسیش هەڵدەستێ، کەسانێکی خۆشدەوێ کە ڕازاوەن بە سیفەتی باش، وە ڕقی لە کەسانێك هەڵدەستێ کە سیفەتی خراپیان تێدان، ئەگەر وەختی خۆی لەبەر سیفەتە باشەکانیان خۆشی ویستبوون، ئێستا کە سیفەتی خراپیان تێدان، لەبەر سیفەتە خراپەکان ڕقی لەوانو غەیری ئەوانیش هەڵدەستێ، ئنجا ئەو قسانەی مووسا وەك بڵێی زەمینە خۆشکردنێك بوون، بۆ ئەو فەرمانەی کە دەیەوێ پێیان بکات، پێش ئەوە زەمینەی بۆ خۆش کرد، فەرمووی: ئێوە گەلێکن خوا چاکەی زۆری لەگەڵدا کردوون، پێغەمبەرانی لە نێودا هەڵبژاردوون، کردوونی بە پادشاو، ئەوەی

بە ئێوەی داوە بە کەسی نەداوە، کەواتە: ئەوە زەمینە خۆشکردنە، جا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئێمە دەبێ ئەگەر ویستمان کارێك بە کەسێك بسپێرین، پێشێ زەمینەی بۆ خۆش بکەین‌و هانی بدەین، وەك چۆن کەسێك بیەوێ زەوییەك بکێڵێ پێشێ هەڵیدەوژێرێ، دوایی لە کاتی خۆیدا دەچێ دەیکێڵێ، عەرەبیش دەڵێن: (اضربِ الحَديد وَهُوَ ساخن)، واتە: کاتێك ئاسن گەرم دەبێ، ئنجا لێی بدە، چونکە کە نەرم دەبێ ئینسان دەتوانێ بیچەمێنێتەوەو شتی لێ دروست بکات، پیرەمێردی شاعیریش گوتوویەتی:

پیاوت نارد بۆ ئیش قوەتی بەرێ سەعات قورمیشی نەکەی ناگەڕێ

ئنجا فەرمانەکەیان پێدەکات، دەفەرموێ: ﴿ يَٰقَوۡمِ ٱدۡخُلُواْ ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِي كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ ﴾، ئەی گەلەکەم! بچنە سەر ئەو زەمینە پاککراوە، کە خوا بۆی نووسیون‌و بۆی بڕیار داون، ﴿وَلَا تَرۡتَدُّواْ عَلَىٰٓ أَدۡبَارِكُمۡ فَتَنقَلِبُواْ خَٰسِرِينَ ﴾، پاشاو پاش مەکشێنەوەو هەڵمەگەڕێنەوە لە ترسان، ئینسان وەختێك مەترسییەکی ڕووبەڕووبێ‌و فریا نەکەوێ بسووڕێتەوەو باداتەوە، ناچارە پاشاوپاش بگەڕێتەوە، واتە: هێندە ترساو مەبن، هێندە زراو تۆقیو مەبن، کە دەگەڵ چاوتان بە دوژمنتان کەوت، یەکسەر فریای بادانەوەش نەکەون‌و پاشاوپاش بکشێنەوە، ئەگەر وا بکەن سەرەنجام لە زیانباران دەبن، مەبەست لە: ﴿ٱلۡأَرۡضَ ٱلۡمُقَدَّسَةَ ﴾، سەرزەمینی پاککراوە، فەلەستینە، یاخود (بیت المقدس)و دەوروبەریەتی، دوایی باسی دەکەین بۆچی ناونراوە سەر زەمینی پیرۆز، پاککراوە، لەبەرئەوەی خوا بەرەکەتی زۆری تێخستوە، هەندێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست پێی پاککردنەوەی ماددیی بووە، وەك نەخۆشیی‌و دەردو بەلا کە لە هەندێ سەر زەمینان هەن، لەوێ نەبوون، شوێنێکی زۆر بە بەرەکەت بووە، ئێستاش وایە، شوێنێکی زۆر بە پێزە، ئاوو هەوایەکەی زۆر خۆشە، بەرەکەتی زۆری تێدایە لە ڕووی ماددییەوە، هەندێکیش دەڵێن: لە ڕووی مەعنەوییەوە، واتە: شوێنێك بووە کە پێغەمبەرانی لێبوو ون، هەر لە ئیبراهیمەوە، دوایی پێغەمبەرانی دیکەی بەنی ئیسرائیل لەو سەر زەمینە بوون،

یەعقـووبو کوڕەکـانیو ئەوانـەی دوای وان (عَلَيْهِم الصَّلاَةُ وَالسَّلاَم) کەواتـە: لێـرەدا مەبەست لەسەر زەمینی پیرۆز، یاخود پاککراوە، یان مەبەست پاککردنەوەی ماددییە، یان مەعنەویی، یاخود مەبەست پێی هەردووکیانـە، ئنجا مووسا پێی گوتن: بچنـەوە ئـەو سـەرزەمینەی کـە خـوا بـۆی بڕیـار داون، کـەی بـۆی بڕیـار داون؟ لەسـەر دەمـی مووسادا بۆیان بڕیار دراوە، خوا فەرموویەتی: ئـەو شـوێنەم بـۆ دیاری کـردوون، بچـن لەوێ نیشـتەجێ بن، دوای ئەوە کە لە میسـر دەربازیـان بووە، بچنـە کـوێ؟ دەبـێ لـە شوێنێك نیشـتەجێ بن، دیـارە ئەوێ چـۆڵ بـووە، یـان شـوێنی ئەوانیشـی تێدا بۆتـەوە، یـاخود لـە سـەردەمی ئیـبراهیمدا ﷺ وەك دوایـی باسـی دەکـەین لـە پەیمـانی کۆنـدا هاتوە، کە خوا بەڵـێنی بـە ئیبراهیم داوە، کـە وەچـەی تـۆ لـەو شـوێنە نیشـتەجێ بـێ، مووسـا ﷺ وایـپێگـوتـن، بزانیـن ئـەوان چـی وەڵام دەدەنـەوە؟ ﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوۡمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدۡخُلَهَا حَتَّىٰ يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴾، گوتیان ئەی مووسـا ﷺ! ئەو سـەر زەوییـە کۆمەڵـێکی زۆر سـتەمکارو خۆبەزلگـرو جەربـەزەو بـەتینو توانـای تێدایـە، وە ئێمـە بێگومـان ناچینـە سـەر ئـەو زەمینـە، تاکو ئەوان نەچنـە دەرێ، هـەرکاتێك ئـەوان چـوونە دەرێ، ئێمـە دەچیـن، وەك کوردەواریـی خۆمـان دەڵـێن: (حـازر خـۆری بـەر سـێبەرێ)، دیـارە وەڵامێکـی زۆر نارێکـیان داوەتـەوە، بـەڵام هـەموویان وانەبـوون، دوو کـەس لـەنێو بـەنی ئیسـرائیلدا واتە: دوو لە بەرپرسانو مشـوورخۆرانیان، ئەگـەرنا هـەر ئـەو دووانـە وا نەبـوون، وەك دوایی باسی دەکەین، مووسا ﷺ دوازدە کەسـی ناردوون، لە هـەر تـیرەی نەفەرێك وەك نوێنەر، کە ئەو سەر زەمینـەی بپشـکنن، بزانـن چۆنە؟ وە چییە؟ وە کـێی لێیـە؟ وە چۆن دەتوانـن بچـن نیشـتەجێ بنو، ئەگەر ئەوانەی کە لـەوێ نیشـتەجێن، لەگەڵیـان بەشەڕ بێن، ئایـا دەتوانن بەسـەریاندا زاڵ بن، یان نا؟ دوازدە کەس دەچن، دووانیـان کـە یـەکیان (یوشـع بـن نـون)و ئەویدیکـەش (کـالـب بـن یوفنـا) بـوو، لەسـەر ڕای زۆربـەی زانـایان، کە لە پـەیمانی کۆنیشـدا ناوەکانیـان هـاتوە، ئـەو دووانـە هەڵوێسـتی باشـیان دەبـێ، بەڵام دە کەسـەکەی دیکە هەڵوێسـتی خراپیـان دەبـێ، دەڵـێن: پێیـان نـاوێرین، کە دوایی بە درێـژی باسـی دەکـەین، دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ

أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ﴾، دوو پیاو لەوانەی کە دەترسێن، لە چی دەترسێن؟ لە خوا دەترسێن، لە جیاتی ئەوەی لە دوژمن بترسێن، لە خوا دەترسێن، هەر کەسێك بەڕاستی لە خوا ترسا، لە کەس ناترسێ، دڵو دەروونی پڕ دەبێ لە ترسی خواو، جێی ترسی خەڵکی دیکەی تێدا نابێتەوە.

خوێندراویشەتەوە: ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يُخَافُونَ ﴾، واتە: دوو کەس لەو گەلەی کە لە دوژمنەکانیان دەترسێنرێن، کە دیارە ئەوانە ترسیان نەچۆتە دڵ، ئاوایان گوت.

ئنجا خوا بەوە وەسفیان دەکات، دەفەرمویْ: ﴿ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُواْ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ ﴾، خوا چاکەی لەگەڵ کردبوون، بەچی چاکەی لەگەڵ کردبوون؟ بەوەی کە ئازا بوون، دڵسۆزبوون بۆ مووسا ، فەرمانبەر بوون بۆ خوا، دیارە کە دەفەرمویْ: چاکەی لەگەڵ کردوون، بە موتڵەقیی فەرموویەتی، زۆر شت دەگرێتەوە، ئەوان گوتیان: ﴿ ٱدْخُلُواْ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ ﴾، بچنە نێو دەرگاکەوە، ئەوکاتە هەر شارێك دەروازەی هەبووە، شوورەو قەڵای بەرزی هەبووە، وە دەرگاشی هەبووە، کە لەو دەرگایەوە نەبووایە کەس نەیتوانیوە بچێتە ژوورێ، چونکە لەسەر قەراغی دیوارو شوورەکانیش بورجو ئێشکگر هەبووە، بۆیە کە دەفەرمویْ: گوتیان: ﴿ ٱدْخُلُواْ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ ﴾، لێیان وەژوور دەرگاکە بکەون، واتە: بە کتوپڕی بچنە نێوی، ﴿ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ﴾، ئنجا ئەگەر چوونە ژوور دەروازەکە، ئەوە ئێوە بەسەریاندا زاڵ دەبن، ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓاْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، وە ئەگەر ئیمانداریشن، پشت بە خوا ببەستن، ئەو دوو نەفەرەش ئاوا هانیانداو پشتگیریی قسەکەی مووسایان  کرد، دووبارە خوا دەفەرمویْ: ﴿ قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا ﴾، گەلەکەی گوتیان: ئەی مووسا ! ئێمە هەرگیز

ناچینە نێو ئەو شارە، نێو ئەو سەر زەمینە، هەتا ئەوان لەوێ بن، ﴿فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ﴾، تۆو پەروەردگارت بچن لەگەڵیان بجەنگن، ئەوە ئێمە لێرە دانیشتووین، ئەگەر ئێوە لێبوونەوەو کۆتاییتان پێهێنان ئنجا ئێمەش دێین، دیارە مووسا ﷺ زۆر خەفەتی خواردوە، بۆیە ڕۆژێك پێغەمبەری خوا ﷺ شتێك دەبیستێ، دڵی زۆر پێی نارەحەت دەبێ و دەفەرموێ: ﴿رَحِمَ اللهُ مُوسَى، قَدْ أُوذِيَ بِأَكْثَرَ مِنْ هذَا فَصَبَرَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٠٨)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٤٤٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣١٥١)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٨٢٩) عَن عَبْدِاللّهِ بْنِ مَسْعُودٍ}، واتە: خوا بەزەیی بە مووسادا بێتەوە، زۆر لەوەش زیاتر ئەزیەت درا، بەڵام ئارامی گرت.

وە بۆ زانیارییتان! هەمیشە ئەوانەی بەرپرس و سەرکردەن، تووشی ئەزیەت دەبن لەگەڵ خەڵك، یان دەبێ دیکتاتۆربن و خەڵك وا لێبکەن یەك کەس قسە نەکات، یاخود دەبێ تەحەممول بکەن، کاتێك کەسێك تەعبیر دەکات لە ناخی خۆی، لە زوعفی خۆی، لە گرێ و گۆڵی خۆی، لە دەروونی نەخۆشی خۆی و، لە ئاستی خۆی، پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەو فەرمایشتەی فەرمووە، لە کاتێکدا بووە کە دەستکەوتی جەنگی دابەش کردوە، یەکێك پێیگوتوە: ﴿وَاللهِ إِنَّ هذِهِ الْقِسْمَةَ مَا عُدِلَ فِيهَا، وَمَا أُرِيدَ بِهَا وَجْهُ اللهِ﴾، واتە: بە خوا ئەم دابەشکردنە دادگەریی تێدانییەو، مەبەستیش تێیدا ڕەزامەندیی خوا نیە، وە جارێکی دی یەکێك پێیگوتوە: ﴿يَا مُحَمَّدُ اتَّقِ اللهَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٦٦٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٩٩٥) عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ}، واتە: ئەی موحەممەد لە خوا بترسێ! پارێز لە خوا بکە! دیارە پێغەمبەر ﷺ لێی تووڕە نەبووە، بەڵام پێی ناخۆش بووە لە دڵەوە، بۆیە فەرموویەتی: جا کێ لە من شایستەترە کە لە خوا بترسێ، گفتوگۆ لەگەڵ خوای پەروەردگاردا دەکەم، بێگومان مووساش صەڵاتو سەلامی خوای لەسەر، لەو کاتەدا زۆر خەفەتی خواردوە، بۆیە بە داخ و حەسرەتەوە دەڵێ: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمْلِكُ إِلَّا نَفْسِي وَأَخِي﴾، گوتی: پەروەردگارم! تەنیا خۆم و برایەکەم بەدەستە، واتە: ئەو دووەمان ئامادەین، بۆ هەموو شتێك، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئامادەنین، نەیفەرمووە: هیچ یەکێك لە خەڵکی

دیكـە ئامادەنین، چونكە ئـەوەتا دوو پیاوی دیكــەش كـە پێشـتر باسی كـردن، ئـەوانیش ئامادەبوون، بەڵام كە زۆرینەی قەومێك بۆ ئەنجامـدانی شـتێك ئامادەنـەبوون، كـە یـەكی لەسـەر زۆرینەیان كەوتبــێ‌و بـە كەمینـە نـەكرێ، مانـای وایـە بابـای سـەركردە عـوزری هەیــە كە ئەو كارەی بۆ ئەنجـام نادرێ، دیارە ئەوانیش "واتە: مووسـاو هارپوونی بـرای‌و ئەو دوو پیـاوە" بـایی ئەوەندە نەبوون، جەنگەكە بكـەن.

ئنجـا گەلەكەی سەرەڕای ئەوەی كە ڕازی نەبوون جەنگەكە بكـەن، وەك دوایـی باسـی دەكـەم، قسـەی زۆر بێتامیشــیان كـردوە، بۆیـە مووسـا ﷺ گـوتی: ﴿فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾، ئێمـەو گەلـی لادەرو لاڕێ لێـك جیابكـەوە، لادەرو لاڕێ لەچـی؟ لادەر لـە شـەریعەت، لاڕێ لـە فیطـرەت، لادەر لـە عەقـڵ‌و مـەنتیق، لـە میسـر دەركراون، خـوا فەرموویـەتی: بچـن لـە فەڵەسـتین نیشـتەجێ بـن، سـەر زەمینێكی بـە بەرەكـەت‌و ئـاوو هەوایـەكی خـۆش‌و میـوەو بـەروبوومێكی زۆر، ئێـدی خەڵـكێك كـە لەوێیـە، ئەگـەر چـاویان لـە سـتەم بـێ‌و نەهێڵـن لـەوێ نیشـتەجێ بـن، لەگەڵـیان بجەنگن، چونكـە جێی ئێوەش دەبێتــەوەو جێی ئەوانیش دەبێتــەوە، كەسانێك ملكـەچ نەكـەن بـۆ فەرمانێكـی خـوا كـە بەرژەوەنـدیی خۆیـانی تێـدایە، دیـارە لاڕێـن‌و لـە حوكمی خـواو عـەقڵ‌و شـەرع‌و فیطرەت‌و هەموو شـتێك دەرچوون، بۆیـە بەكەڵـكی ئـەوە نایـەن ئێمـە لـە نێویانـدا بمێنینــەوە، بۆیـە مووسـا ﷺ دەپاڕێتــەوە، دەڵــێ: پەروەردگــار! ئێمـەو ئـەو گەلـە لاڕێیـە لێـك بـترازێنە، دیـارە چـی دیكـە تەحەممولـی نـەماوەو گەیشـتۆتە ئەوپـەڕی، چونكــە بـەنی ئیسـرائیل هـەر ئـەو هەڵوێسـتە خراپەیــان نەبـووە، بـەڵكو زۆر هەڵوێسـتی دیكـەی خراپیـان بـوون، وە زۆر پرتـەو بۆڵەیان كـردوەو بڕوبیانووویان گرتـوە، وەك ئێمـە لـە بـەرگی یەكـەمی ئـەم تەفسـیرە لـە سـوورەتی (البقـرة)دا زۆر شـتمان بـاس كـردوە، ئنجـا خـوا بڕیـار دەدات: ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾، واتـە: خــوا ﷻ فـەرمووی: بێگومـان لێیـان قەدەغەیــە، واتـە: ئـەو گەلەی بەنی ئیسـرائیل كە پێشـتر بۆم بڕیار دابوون‌و بۆم نووسـیبوون، كە بچنــە نێـو ئـەم سـەرزەمینەو لێـی نیشــتەجێ بـن، ئـەوە ئێسـتا لێیـانم قەدەغـە كـرد، مـادام ئـەوە

هەڵوێستیانە، شایانی ئەوە نین بچنە ئەو شوێنەوە، ﴿أَرْبَعِينَ سَنَةً يَتِيهُونَ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، دەبێ چل ساڵ لە زەویدا بخولێنەوە بە سەرگەردانیی، ئەوە واتایەکی، وە دەگونجێ بە مانای ئەوە بێ، کە بۆ ماوەی چل ساڵ لێیان قەدەغەیەو، دوای چل ساڵەکە بۆیان هەیە بچنە نێوی، وەك دوایی باسی دەکەین، ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾، کەواتە: خەفەت لە گەلی لارێ مەخۆ، ئەوانە شایستەی ئەوەنین خەمیان لێ بخۆی، وە تۆو هارۆونی برات لەگەڵ وان لێك جیادەکەینەوە.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ يَٰقَوْمِ ٱذْكُرُواْ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا ﴾، وەك پێشتر تەفسیرمان کرد، کە دەفەرموێ: ﴿ إِذْ جَعَلَ فِيكُمْ أَنۢبِيَآءَ ﴾، واتە: لە نێو ئێوەدا پێغەمبەرانێکی ناردوە (علیهم الصَّلاة والسَّلام)، کەواتە: هەموویان پێغەمبەر نین، وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا ﴾، مانا ڕواڵەتییەکەی وا دەگەیەنێ، کە هەمووتانی کردوە بە مەلیك و پادشا، ئنجا توێژەرەوانی قورئانیش زۆریان قسە لەوبارەوە کردوە، بەڵام ئەوەی من بە عەقڵمەوە نووساوە، دوو ڕاو بۆچوونن:

ڕای یەکەم: ﴿ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا ﴾، واتە: مادام حوکمڕانەکان لە خۆتانن، وەك ئەوە وایە هەمووتان حوکمڕان بن، چونکە ئەگەر حوکمڕانێك لە وڵاتێك، یان لە نێو قەومێك دادگەر بێ، وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکەکە حوکمڕان بن، مادام بە دادگەریی حوکمی کرد، ئەوە لە بەرژەوەندیی هەمووانە، چونکە بە زۆریی وابووە ئەگەر حوکمڕان لە غەیری قەوم بێ، دەیانچەوسێنێتەوە، بەڵام ئەگەر حوکمڕان لەخۆیان بێ، ئەوە مەگەر چۆن دەنا چاوی لە چەوساندنەوە نیە، خەڵکەکە بۆخۆیان دایانناوە بۆ خۆشیان دەتوانن لایبەرن، بەڵام ئەگەر لە قەومێکی دیکەبێو، خۆی بەسەر قەومێکی دیکەدا فەرز کردبێ، بە زۆریی وایە دەیانچەوسێنێتەوەو، سۆغرە بێگاردو ستەمو زۆرییان بەسەردا دەسەپێنێ، ئەوە واتایەکی.

ڕای دووەم: ﴿ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا ﴾، لێرەدا وشەی (ملوك) مەبەست پێی مانا عورفییەکەی نیە، چونکە مانای عورفیی (ملك)، واتە: پادشاو حوکمڕان، بەڵام مانا زمانەوانییەکەی واتە: کەسێك کە بۆخۆی خاوەنی خۆیەتی، وە ئیشی خۆی بەدەست خۆیەتی، کەس زوڵمی لێ ناکات، وە پێداویستییەکانی

ژیانی بۆ دابین کراون، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چییە؟ ئەم فەرموودەیە: ﴿عَنْ زَيدِ بْنِ أَسْلَمَ فِي قَولِهِ تَعَالى: ﴿ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا ﴾، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (زَوْجَةٌ وَمَسْكَنٌ وَخَادِمٌ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ في مَرَاسِلِيهِ برقم: (١٧٩) مُرْسَلاً}، واتە: زەیدی کوڕی ئەسلەم (کە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ دەربارەی تەفسیری ئایەتی ﴿ وَجَعَلَكُم مُّلُوكًا ﴾، فەرموویەتی: هەر کامێکتان هاوسەری هەیەو، جێگاو ڕێگای هەیەو، کەسێکیشی هەیە خزمەتی بکات (ئەوە مەلیکە).

لە فەرموودەیەکی دیکەدا پێغەمبەری خوا ﷺ مانای ئەم ئایەتەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿مَنْ أَصْبَحَ مِنْكُمْ مُعَافًا فِي جَسَدِهِ، آمِنًا فِي سِرْبِهِ، عِنْدَهُ قُوتُ يَوْمِهِ، فَكَأَنَّمَا حِيزَتْ لَهُ الدُّنْيَا بِحَذَافِيرِها﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ في (الأَدَب المُفرد) برقم: (٣٠٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٣٤٦) وقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤١٤١)، وَالبَيْهَقِي في (شعب الإيمان) برقم: (١٠٣٦٢)، عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ مِحْصَنٍ الأَنْصَارِيِّ، عَنْ أَبِيهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، وَحسَّنَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) رقم: (٢٣١٨)}، واتە: هەر کامێك لە ئێوە لە جەستەیدا سەلامەت بێ‌و بێ دەردو بەلا بێ، لە جێگاو ڕێگای خۆیدا لە خۆی دڵنیابێ‌و، ترسی لەسەر نەبێ، وە نان‌و بژێوی ئەو ڕۆژەی لەلابێ، (واتە: نان‌و ئەمان‌و لەش ساغیی هەبێ) وەك ئەوە وایە هەموو دنیای بە هەموو نیعمەتەکانییەوە بۆ کۆکرابێتەوە، واتە: مەلیکە، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: فلان کەس مەلیکە! یانی: مادام لەشی ساغ بێ‌و هەبووبێ‌و، جێ‌وڕێی خۆی هەبێ‌و، چاوی لە دەستی خەڵك نەبێ‌و، ترسی لەسەر نەبێ، دەڵێن: فلان کەس مەلیکە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾، شتێکی پێداون کە بە هیچ کەس لە جیهانییانی نەداوە، وەك گوتم: لە پەیمانی کۆنیشدا ئەو تەعبیرە بە شێوەی دیکە بەکارهاتووە، بۆتە هۆی لەخۆباییبوونی جوولەکەکان، چونکە بە هەڵە لێی تێگەیشتوون، دیارە لە سەردەمی مووسادا ﷺ بەنی ئیسرائیل شایستەترین گەل بوون لەسەر زەوی، چونکە هەر ئەوان

خواپەرســـتو خــوا بەیەکگــر (موحّد) بــوون، خەڵــکی دیکــە هــەمووی بتپەرســتو سەرگەردانو سەرلێشــێواو بوون، مانای وایە لە سـەردەمی خۆیاندا لە هــەموو خــەڵك باشـتر بوون، بۆیە خوای بەخشــەر ئەوەی بــە وانـی داوە بــە کەســی نـەداوە، ئـەوە لـە لایەك، لە لایەکی دیکەوە: بـەنی ئیســڕائیل بێگومـان زۆر چەوسـێنراونەوەو تووشــی نارەحــەتییو گرفتــاریی بــوون لەبەردەسـتی فیرعەونـدا، بۆیــە خــوای پەروەردگــار کاربەجێیەو بە ئەنـدازەی پێویســتی خــەڵك بــە دەم خەڵــکەوەیە، ئەوانـە وەك چۆن کەسێك زۆر بریندارو دەردەدارو گرفتارو نەخۆشــە، پێویسـتیی بە هاوکاریی زیاترە، ئــەوانیش لەبەردەسـتی فیرعەونــدا کــە زۆر چەوســێنراونەوەو تووشــی نارەحــەتیی بــوونو، نەخۆشــیــیو دەردی زۆریــان تێــدا پەیــدابوون، لەبەرئــەوە پێویســتیان بــە موعجیزەگەلـی زۆرو دەســتگرتنی بەردەوامی خــوا بــووە، بۆیــە خــوای بــە بــەزەیی لــە زۆر ڕووەوە دەسـتی گرتـوونو هاوکاریی کــردوون، وە ئـەو شـتانەی کـە پێیـداون بـە کەسی دیکــەی نەداون، بۆ وێنــە:

## چوار چاکەو نیعمەتی خوا بۆ گەلی موسا

یەکــــەم: دەریـای بـۆ لــەت کــردوون ﴿وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ ... ﴿٥٠﴾﴾ البقــرة، کـە مەبەسـت دەریـاری سـوورە، هەندێکــیش دەڵـێن: مەبەسـت ڕووبـاری نیلـە، بــەڵام واپێدەچـێ دەریـای سـووربێ، کـە لـە میســرەوە هــاتوون، پێشــیان دەریـا بــووەو، پشــتیان فیرعــەونو ســوپایەکەی بــووە، وەك لــە ســوورەتی (الشـعراء)دا خــوای پــەروەردگار بــە تەفصــیلێ باســی دەکـاتو دەفـەرموێ: ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ كَلَّآ ۖ إِنَّ مَعِىَ رَبِّى سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾﴾ الشـعراء، واتە: کاتێك هاوەڵانی مووسا ئەو کۆمەڵەیان بینــی، گوتیــان: (ئەی مووســا فــیرعەونو ســووپایەکــەی) دەمانگەنــێ، {بەردەمیشــمان دەریــایە، یــان

دەبێ بخنکێین، یان دەبێ بکوژرێین؟! وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (چ گورگ بتخوا، چ سوار بتبا)}.

مووسا ﷺ گوتی: نەخێر پەروەردگارم لەگەڵم دایەو ڕێنماییم دەکات، (چی بکەمو چۆن دەربازتان بکەم؟) ئنجا سرووشمان بۆ کرد، گوتمان: بە گۆچانەکەت لە دەریاکە بدە، (گۆچانێکی لێدا)، بوو بە بەش بەشو دالآن دالآن، هەر بەشێکی وەك چیایەکی مەزن بوو (ئەوان دوازدە تیرە بوون، ئەو دەریایەش بوو بە دوازدە ڕێگا، بۆ ئەوەی هەر سەرۆك تیرەیەك ئاگای لە ئەندامانی تیرەکەی خۆی بێ، کەسی لێ بزر نەبێ، هەر تیرەیەك بە کۆلآنێکی دەریادا ڕۆیشتن کە شەق بوو)، جاری وایە پانتایی دەریا چەندان کیلۆمەترە، نەك چەندان مەتر، وە چەندان کیلۆمەتر قووڵە، پەیمانی کۆن دەڵێ: هەمووی جامد بوو بوو لە شوێنی خۆی وەك سەهۆڵ بەستبووی، ئنجا لە هەندێك سەرچاواندا دەڵێ: یەکدیشیان دەبینی، بۆئەوەی هەر تیرەیەك ئاگایان لە یەکدیش بێ، هەتا لێی پەڕیونەوە، چەندان کیلۆمەتر بووە، وە بێگومان زۆری پێوەبوون، ئنجا دیارە فیرعەونو سوپایەکەی دوای وان دێنو وادەزانن ئەوە هەر ڕێیە، وە دوای ئەوەی کۆتا نەفەری بەنی ئیسرائیل لە دەریا دەربازی دەبێو، کۆتا نەفەری فیرعەونییەکانیش دێتە نێو دەریا، دەریا وێکدێتەوەو دەخنکێن، چەند خۆشە مرۆڤ خۆی دەربازبێو دوژمنیشی بە چاوی خۆی ببینێ فەوتاوە[1]، جا لە کتێبەکانی مێژوودا هاتوە، کە بەنی ئیسرائیل دوای ئەوەی لە دەریا دەرباز بوونو سوپای فیرعەونو فیرعەونیش هەموویان غەرق بوون، گوتیان: ئەی مووسا! ئێمە لێرە ناجووڵێین؟ فەرمووی: بۆچی؟ گوتیان: ئەوان بە بنی دەریادا بۆمان دێن، فەرمووی: ئاخر هەموویان خنکاون، گوتیان: نەخێر، لێرە ناجووڵێین، دەبێ جەنازەکانیان ببینین، با جەنازەکانیان سەر ئاو بکەون، ئەگەرنا وەك ماسی بە بن دەریادا بۆمان دێن! دەڵێ: ئنجا مووسا ﷺ لە خوا

١) بۆ وردەکاریی چۆنیەتی دەربازبوونی مووسا علیه السلامو گەلی بەنی ئیسرائیلو شەقبوونی دەریای سوور، دەتوانی سەرنجی: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس) بدەی، بڕوانە: العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ١٤، عبور البحر الأحمر، هلاك جيش فرعون، ص١٦٠، ١٦١.

پاڕایەوەو دووعای کرد، گوتی: پەروەردگارم با جەنازەکانیان وەك ماسی سەر ئاو بکەون، بە جەنازەی فیرعەونیشەوە، تاکو گەلەکەم بیانبینن‌و دڵنیابن کە مردوون، وە لاقیان لە دوا بێ بڕۆن، دیارە فیرعەون زۆری تۆقاندوون، بۆیە بە مردوویش لێی ترساون، ئنجا وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْرَثَكُمْ أَرْضَهُمْ وَدِيَـٰرَهُمْ وَأَمْوَٰلَهُمْ ...﴿٢٧﴾ ﴾الأحزاب، وە سەرزەمینی ئەوان‌و ماڵ‌و سامانی ئەوانی کردە میراتتان.

دووەم: یەکی دیکە لەو نیعمەتانەی کە خوا بە کەسی نەداوە بەوان نەبێ، (واتە: بەنی ئیسرائیل) بریتیە لەوەی کە گەزۆی بۆ باراندوون‌و باڵندەی سەمانیی بۆ دەستەمۆ کردوون، کەدەهاتە بەردەستیان‌و دەیانگرت، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَأَنزَلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ۖ كُلُوا۟ مِن طَيِّبَـٰتِ مَا رَزَقْنَـٰكُمْ ۖ وَمَا ظَلَمُونَا وَلَـٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٥٧﴾ ﴾البقرة.

سێیەم: وە کە گەرمایان بوو لە دەشتی سینادا خوا سێبەری بۆ پەیداکردن، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَظَلَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْغَمَامَ ...﴿٥٧﴾ ﴾البقرة، واتە: هەورمان بۆ کردن بە سێبەر، تەماشا بکەن چەند بەنازبوون‌و، خوای بە بەزییش چەند نازی هەڵگرتوون! هەوری بۆ دەناردن بە هاوین، چونکە بارانی پێوە نەبوو بەس بۆئەوەی سێبەریان لێبکات!

چوارەم: وە کاتێك کە تینوویان دەبێ لە دەشتی سینادا، دەچنە لای مووساو دەڵێن: تینوومانە، مووسا بە فەرمانی خوا گۆچانەکەی لە پارچە چیایەك دەدات، دوازدە کانی‌و سەرچاوەی لێ دەردەقوڵێن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذِ ٱسْتَسْقَىٰ مُوسَىٰ لِقَوْمِهِۦ فَقُلْنَا ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ۖ فَٱنفَجَرَتْ مِنْهُ ٱثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْنًا ... ﴾البقرة، واتە: کاتێك مووسا داوای ئاوی کرد بۆ گەلەکەی، گوتمان: بە گۆچانەکەت لەو بەردە بدە (دیارە دەبێ بەردێکی گەورە یان پارچە

چیایەك بووبێ)، یەکسەر دوازدە سەرچاوەو کانی لێ هەڵقوولاًن، چونکە ئەوان دوازدە تیرە بوون، بۆ ئەوەی هەر تیرە سەرچاوەی خۆی هەبێ، واپێدەچێ لەنێوان خۆشیاندا تەبا نەبووبن‌و کێشەو ناکۆکییان بووبێ، تاکو لەسەر ئەوە بەشەڕ نەیەن[1]، وە خوا زۆر شتی دیکەشی پێداون، بۆیە دەفەرموێ:

﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، شتێکی پێداون کە بە هیچ کەس لە جیهانییانی نەداوە، وە ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرە لە سوورەتی (البقرة)دا بە درێژیی باسی ئەو شتانەمان کردوە.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾، ئەی گەلەکەم! بچنە سەر ئەو زەمینە پاکەوە کە خوا بۆی نووسیوون، ئایا مەبەست لەو سەرزەمینە موقەددەس‌و پاك‌و پیرۆزە کوێیە؟ لەوبارەوە سێ ڕا هەن:

ڕای یەکەم: دەڵێن: مەبەست (بیت المقدس)و دەورو بەرەکەیەتی، واتە: شاری قودس‌و دەوروبەری.

ڕای دووەم: دەڵێن: مەبەست فەڵەستینە.

ڕای سێیەم: دەڵێن: مەبەست لەو شوێنە پاکە، هەموو (شام)ە، واتە: سووریای ئێستاو ئوردن‌و لوبنان‌و فەڵەستین، وە دەشتی سیناش کە هەندێکی دەکەوێتە نێو وڵاتی میسرەوە.

وە دەڵێن: مەبەست لە (المقدَّسة) پاکیی مەعنەوییە، یانی: پاککراوە لە بت‌و صەنەم، کە لێی بپەرسترێ، وە لەبەرئەوەی شوێنی پێغەمبەران بووە، سەلامی خوایان لێ بێ، وە شوێنی خوا بە یەکگرتن‌و خوا بەیەکگران بووە، وەك ئیبراهیم پێغەمبەرو ئیسحاقی کوڕی‌و یەعقووبی کوڕی ئیسحاق، وە کوڕانی یەعقووب‌و ... هتد، کەواتە: مەبەست پێی پاککرانەوە (تطهیر)ی

---

[1]) بڕوانە: (التفسیر التطبیقي للکتاب المقدس، العهد القدیم، سفر الخروج، الإصحاح: ١٦و ١٧، ص ١٦٤ و ١٦٧) کە باسی (المن والسلوی) و (ماء من الصخرة) دەکات.

مەعنەوییە، ڕایەکیش دەڵێ: مەبەست پاکیی ڕواڵەتیی و ماددیە، واتە: سەرزەمینێکە، کە هەندێ نەخۆشیی و دەردو ناڕەحەتیی لێ نیە، چ دەردو نەخۆشییەك کە تووشی ئینسان دەبێ، یان دەردو نەخۆشییەك کە تووشی ئاژەڵ دەبێ، چ دەردو نەخۆشییەك کە تووشی کشتوکاڵ دەبێ، کە ئێستاش هەر وایەو سەر زەمینی فەڵەستین شوێنێکی زۆر بە بەرەکەتە، منیش ڕایەکی دیکەی سێیەم دەخەمەڕوو و دەڵێم: مەبەست لەو پاکیی یە پاکیی مەعنەویی و ماددییە هەردووکی پێکەوە.

ئنجا بەنسبەت ئەوەوە کە دەفەرموێ: ﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾، واتە: خوا بۆی نووسیون، بەڕاستی ئەوە جێی هەڵوەستە لەسەرکردنە، چونکە ئەگەر بەڕواڵەت تەماشای ئەم ئایەتە بکەین جوولەکە بۆیان هەیە بڵێن: ئەوەتا لە قورئانی خۆشتاندا هاتوە، کە ئەوە بۆ ئێمە نووسراوە، شایانی باسیشە لە تەفسیرەکاندا زۆر گەڕام، بە داخەوە نەمبینی زانایانی تەفسیر هەڵوەستەیان لەبەردەم ئەم ڕستەیەدا نەکردبێ، جگە لە (المراغي) کە لە تەفسیرەکەی خۆیدا شتێکی جوانی هێناوە، دەڵێ: {﴿كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾: يُرِيدُ مَا وَعَدَ اللهُ بِهِ إبراهيمَ مِنْ حَقِّ السُّكنى في تِلْكَ البِلاد المُقَدَّسَة، لا أنَّ المُرادَ أنَّها تَكُونُ كُلُّهَا مِلْكاً لَهُم، لا يُزَاحِمُهُم فيها أَحَدٌ، لأن هَذَا مُخَالِفٌ لِلوَاقِعِ، وَلَنْ يخلِفَ اللهُ وَعدَه، فاستنباط اليَهود مِنْ ذَلِكَ الوَعْدِ أَنَّهُ لابُدّ أَن يَعودَ لَهُم ذَلِكَ المِلْكُ، لَيْسَ صَحيحاً}[1]، واتە: مەبەست لەوە کە دەفەرموێ: خوا بۆی نووسیون، ئەوەیە کە کاتی خۆی خوا (وەك دوایی دەیهێنین) لە پەیمانی کۆندا بەڵێنی بە ئیبراهیم دا، کە لەو شوێنەدا لەو سەرزەمینە پاکەدا نیشتەجێ بێ، خۆیو وەچەکەی، نەك مەبەست ئەوەبێ کە ئەوە موڵکی بەنی ئیسرائیلەو هیچ کەسێکی دیکە نابێ لەوێدا هەبێ، چونکە ئایەتەکە ئەوە ناگەیەنێ، ئایەتەکە بەس ئەوە دەگەیەنێ بۆتان هەیە لەوێ نیشتەجێ بن، (ئنجا ئایا بەڵگەمان لەسەر ئەوە چیە کە مەبەست ئەوە نیە کە هیچ کەسێکی دیکەی تێدا نەبێ؟!) چونکە ئەوە پێچەوانەی واقیعە، وە خواش



---

١) تفسير المراغي: ج٢، ص٩٠.

بەڵێنی خۆی بەجێدێنێ (بەڵێنی خوای کاربەجێ درۆ دەرناچێ) ئێمەش دەبینین جگە لە بەنی ئیسرائیل ئەو شوێنە خەڵکی دیکەشی لێبووە، کەواتە: مەبەست لەوە کە خوا بۆی نووسیون ئەوە نیە کە هەر ئەوانی تێدابن، بۆیە هەڵهێنجانی جوولەکەکان لەو بەڵێنە، ئەوە کە دەبێ موڵکی ئەو سەرزەمینە هەر هی ئەوان بێ، ڕاست نیە.

لە (پەیمانی کۆن) لە (سفر التكوين) لە (إصحاح: ١٥) لە ژێر ناوونیشانی بەڵێندانی سەرزەمین (الوعد بالأرض)دا ئاوا هاتوە: (فِي ذَلِكَ الْيَوْمَ عَقَدَ اللهُ مِيثَاقاً مَعَ أَبرَام قَائِلاً: سأُعطي نسلكَ هَذِهِ الأَرضَ مِنْ وَادِي العريش إلى النَّهْرِ الكَبِيرِ نَهْرِ فرات)[1]، دەڵێ: لەو ڕۆژەدا خوا بەڵێنێکی پتەوی بە (أبرام)، (واتە: ئیبراهیم)دا، پێی فەرموو: ئەم سەر زەمینە لە دۆڵی عەریشەوە تاکو ڕووباری گەورەی فورات، بە وەچەکەی تۆ دەدەم.

(پەیمانی کۆن)یش دیارە دەستکاریی کراوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە بەگشتی قسەکەی تەوراتیش لەگەڵ واتای ئایەتەکەدا دێتەوە، چونکە ئەو بەڵێنە بە کێ دراوە؟ بە ئیبراهیم، ئنجا ئەگەر ئەو بەڵێنە بە ئیبراهیم درابێ، دیارە ئیبراهیم دوو کوڕی بوون: ئیسحاق و ئیسماعیل، کەواتە: وەك چۆن وەچەی ئیسحاق بۆیان هەیە لەوێ نیشتەجێ بن، وەچەی ئیسماعیلیش بۆیان هەیە لەوێ نیشتەجێ بن، بەڵام بە هەرحاڵ، خوا بەڵێنی بەو گەلەی داوە کە بۆتان هەیە لەوێ نیشتەجێ بن، ئەمما نەیفەرمووە هی خۆتانەو نابێ کەسی دیکەی تێدابێ، وەك جوولەکە ئێستا ئیددیعا دەکەن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرمویێ: ﴿وَلَا تَرْتَدُّوا عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ فَتَنقَلِبُوا خَٰسِرِينَ﴾، وە پاشاوپاش لەسەر پاژنە پێیەکانتان هەڵمەگەڕێنەوە، دوایی زەرەرمەند دەبن، یانی: پاشگەز مەبنەوە لە فەرمانبەرییو گوێڕایەڵیی بۆ مووسا ﷺ ئنجا ئەوە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە جاری وایە دۆڕاندنی هەڵوێستێك چارەنووسێکی شووم بۆ ئینسان پەلکێش دەکات، خوای پەروەردگار بە بەنی

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص٤٠.

ئیسرائیل دەفەرموێ: هەڵمەگەڕێنەوە، واتە: لە جێبەجێکردنی ئەو فەرمانە، ئەگەرنا زەرەرمەند دەبن، کەواتە: جاری وا هەیە هەڵوێستێکی چارەنوساز لە ژیانی ئینساندا دێتە پێش، کە هەڵوێستەکەی دۆڕاند، ئینسان زیانبار دەبێ، واتە: ئینسان خۆی دەدۆڕێنێ، مەبەستم ئەوەیە جاری وایە هەڵوێستێك دێتە پێش، ئەگەر وەك پێویست نەبووی و دۆڕاندت، تەنیا ئەوە نیە گوناهێك بێ بیکەی، بەڵکو بەتەواویی خۆت لەدەست دەدەی، خوای پەروەردگار پەنامان بدات.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ﴾، گوتیان: ئەی مووسا! ﷺ لەو سەرزەمینەدا کۆمەڵێکی بە زەبرو زۆرو خۆ بە زلگر هەن، وە ئێمە بە تەئکید ناچینە سەر ئەو زەمینە، تاکو ئەوان لێی دەرنەچن، هەرکاتێك ئەوان لێی دەرچوون ئێمەش دەچین، دەربارەی وشەی: (الجبَّار)، زەججاج یەکێکە لە شارەزایانی زمان، دەڵێ: (الجبَّارُ: العاتي وَهُوَ الَّذي يُجْبِرُ النَّاسَ عَلَى مَا يُريد) واتە: ستەمکار، خۆسەپێنەر، کەسێکە کە خەڵك ناچار دەکات لەسەر ئەوەی کە دەیەوێ.

وە شەوکانیی لە تەفسیرەکەی خۆی (فتح القدير)[1]دا دەربارەی وشەی: (الجبَّار)، دەڵێ: (وَالْمُرَادُ هُنَا قَوْمٌ عِظَام الأَجْسَام طوَالٌ متعاظمون، قِيلَ هُمْ قَوْمٌ مِنْ بَقِيَّةِ قَوْمِ عَادٍ وَقِيلَ هُمْ مِنْ وَلَدِ عَيصِ بْنِ إِسْحَاق وَقِيلَ هُمْ مِنَ الرُّومِ، وَيُقَال إِنَّ مِنْهُمْ عُوجُ بْن عُنق الْمَشْهُور بِالطُّول المفرط وعنق هِيَ بنتُ آدمَ قِيْلَ كَانَ طُولُهُ ثَلاثَةَ آلافِ ذراعٍ، وَثَلَثمائةٍ وَثَلاثَةَ وَثَلاثِينَ ذِرَاعاً وَثلُثُ ذِرَاعٍ، قَالَ ابْنُ كَثِير: وَهَذَا شَيءٌ يُسْتَحِيا من ذكره)، واتە: مەبەست لە: ﴿قَوْمًا جَبَّارِينَ﴾، کۆمەڵێ کە جەستەیان زۆر گەورەیە، وە زۆر درێژن و زۆر زلو قەبەن، هەندێك گوتوویانە: ئەوانە پاشماوەی گەلی عاد بوون، هەندێکیش گوتوویانە: ئەوانە لە وەچەی عەیصی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمن، هەندێکیشیان گوتوویانە: لە ڕۆمەکانن، وە گوتراوە:

---

١) ج٢، ص٣٦ – ٣٧.

عوجـی کوڕی عونـق لەو گەلـەیە، کە ناسراوە بەوەی زۆر زۆر درێــژ بـووە، وە عونـق کچی ئادەمە، عوجیش لەو کچـە بووە، واتە: نەوەی ئادەمە، کە گوتراوە درێژییەکەی سـێ هەزارو سێسـەدو سیو سـێو سێیەکی (٣/١، ٣٣٣٣) گەز بـووە، (إبـن كـثير)یـش گوتوویـەتی: شـــەرمە شـتی وا بـاس بکـرێ، دیـاره لـە تەفسـیرەکاندا بـە درێـژیی بەسـەرهاتو بـاسو خواسـی عـووج باسکراوە، دەڵـێ: عـووج دەچووە نێـو دەریاو ماسی دەگرتن، کە دەچووە نێوی ئاوی دەریا هەتا چۆکـی دەهـات! ئنجا کە ماسی دەگرتن هەر بـە تیشکی خۆر دەیبرژاندنو ... هتـد، بـەڵام (إبـن كـثير) قسەیەکی جوان دەکات، کە دەڵـێ: (وَهَذَا شَيءٌ يُسْتَحيا من ذكرهِ)، واتە: ئەوە شتێکە شـــەرمە کـە بـــاس بکـــرێ، واتــە: درۆیــەو بنـەمای نیـە، وە ڕەنگـە بـەنی ئیسـرائیل هـەر بۆخۆیـان ئەو درۆو دەلەسـەیان ڕێکخستبـێ، بۆئەوەی بیکەنـە بەڵـگەو پاساوی ئـەوە کە نەچـنو ئەو شـەڕە بکـەن، ئەگەرنا بەشـــەری وا نـەبووە بـەو شـێوەیە بـێ، ئنجا ئایا ئێمە کـە دەڵـێین: ئـەوە درۆیـەو ئەسـڵو ئەسـاسی نیـە، وە (عـووج)ێکی وا بـەو شـێوەیە نەبووە، بەڵـگەمان چییە؟ بەڵگەمان ئـەم فەرمایشـتەیە، پێغەمبـەری خوا ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّ اللهَ خَلَقَ آدَمَ، وَطُولُهُ سِتُّونَ ذِرَاعًا، ثُمَّ لَمْ يَزَلِ الْخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدَهُ حَتَّى الآنَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (٨١٥٦)، وَالْبُخَارِيُّ بـرقم: (٣٣٢٦)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٧٠٩٢)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٦١٦٢) عَنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه}، واتـە: خـوا ئـادەمی دروست کرد، درێـژییەکەی شەست باسك بوو (یانی: نـزیکـەی سـی (٣٠) مـەتر، یـان زیـاتر، یـان ئـەو دەوروبـەرە) پاشان وردە وردە خـەڵك لـێی کـەم بۆتـەوە (واتـە: لـە قـەدو قیافەو باڵایـان کەم بۆتـەوە) تا وەك ئێسـتای لێهـاتوە.

زانایانی شوێنەوار زانیش هەندێ کە لەشو پەیکـەرو ئێسـقانیان دۆزیوەتـەوە کە زۆر درێژن، دیارە بە ئەندازەی ئەوەش کە زۆر کۆن بـن درێـژترن، ئـادەمو کوڕەکـانیو نـەوەکانی زۆر زۆر کـۆنن، وە پێشـمـوانیە کـە ئێسـقانەکانیشیان مابنـەوە، چـونکە ئێسـقانیش کـە زۆر مایـەوە لـە زەویـدا دەپـڕووکـێو دەبێتـەوە بـە خــاك، وەك خـوا دەفــەرموێ: ﴿ مِنْهَا خَلَقْنَاكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ ﴾طــه، واتـە: لـەوێ دروسـتمان کـردوونو دەتانگێڕینـەوە بـۆ ئـەوێ، جـارێکی دیکـەش هـەر لــەوێ دەرتـان دێنینــەوە، کەواتـە: ئەگـەر ئـادەم عليه السلام بـە خـۆی ئـاوا بووبـێ، یـانی:

شەست باسك بووبێ، مەعقووڵ نیە نەوەکەی بەو شێوەیە بووبێ، چونکە دەقی حەدیسی پێغەمبەری خوایە ﷺ دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ لَمْ يَزَلِ الْخَلْقُ يَنْقُصُ بَعْدَهُ حَتَّى الآنَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٨١٥٦)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٣٢٦)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٧٠٩٢)، وَالبُخَارِيُّ في (الأدب المفرد) برقم: (٩٧٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦١٦٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واتە: پاشان وردە وردە خەڵك لێی کەم بۆتەوە (واتە: لە قەدو قیافەو باڵایان کەم بۆتەوە) تا وەك ئێستای لێهاتوە.

وە لە (پەیمانی کۆن) لە (سفر العدد)، (الإصحاح: ١٣)دا هاتوە، باسی ئەوە کراوە ئەوەی کە مووسا عليه السلام دوازدە نەفەر لە هەر تیرەیەك دەنێرێ بۆئەوەی پێشێ بچن ئەو سەرزەمینە بپشکنن، بزانن چۆنەو کێی لێیەو چییەو چۆنە؟ لە ژێر ناوونیشانی (إستكشاف أرض كنعان) پشکنینی سەرزەمینی کەنعاندا، ئاوا هاتوە: (ثُمَّ قَالَ الرَّبُّ لِمُوسَى: أَرْسِلْ جَوَاسِيس إِلَى أَرْضِ كَنْعَانَ الَّتِي أنا وَاهِبُهَا لِبَنِي إِسْرَائِيلَ أَرْسِلْ مِنْ كُلِّ سِبْطٍ ممثّلاً لَهُ...)، واتە: دوایی پەروەردگار بە مووسای فەرموو: چەند سیخوڕێك بۆ سەرزەمینی کەنعان بنێرە، کە من ئەو سەرزەمینەم بە بەنی ئیسرائیل داوە، وە لە هەر تیرەو هۆزێکی بەنی ئیسرائیل نوێنەرێك.

ئنجا هەر لە پەیمانی کۆندا باسی ڕاپۆرتێك دەکات دەربارەی پشکنینی ئەو سەرزەمینە، بە ناوونیشانی: (تقرير عن استكشاف الأرض) ڕاپۆرتێك لەبارەی پشکنینی زەوییەوە، دەڵێ: (وَبَعْدَ أربَعِين يَوْمًا رَجَعُوا مِن استكشَافِ الأَرْضِ فَأَقبَلوا عَلَى مُوسَى وَهَارُونَ وَسَائِرُ شَعْبِ إِسرَائيل في صَحْرَاءِ فَارَانَ فِي قَادِش وَبَلَّغوهم بِمَا شَاهَدوهُ وَأروهُم ثَمَرُ الأَرْضِ، وَقَالُوا: قَدِ انْطَلَقْنَا إلى الأَرْضِ الَّتِي أَرسلتنا إِلَيْهَا فَوَجَدْنَاهَا تَفيضُ حقاً لَبَنَاً وَعَسَلاً وَهَذِهِ هِيَ ثِمَارُهَا، غَيْرَ أَن الشعب المستوطِنَ فِيهَا بِالِغُ القُوَّةِ ومُدْنُهُ مَنِيعَةٌ وَعَظِيمَةٌ جِداً... وَلَكِنْ كَالِبَ هَدَّأَ رَوْعَ الشَّعْبِ الْمَاثِلِ أَمَامَ مُوسَى وَقَالَ: لِنَمض وَنَمْتَلِك الأَرْضَ لأَنَّنَا قَادِرُونَ حَقاً عَلَى ذَلِك، فَعَارِضَهُ الرِّجَال الَّذِينَ كَانُوا مَعَهُ وَقَالُوا: لانقدرُ عَلَى أَن نُقَاوِمَ سُكانهَا لأَنَّهُم أَقْوَى مِنَّا، وَبِذَلِك أَذَاعُوا الذُّعْرَ بَيْنَ الإِسْرَائِيلِيين مِنَ البِلاد الَّتِي تَجَسَّسوهَا قَائِلِينَ: سَتَفْتَرِسُنَا الأَرْضُ الَّتي تَجَسَّسناهَا وَجَمِيعُ مَنْ شَاهَدنَاهُمْ مِن

سُكَانِهَا عَمَالِقَة، فَقَدْ رَأَيْنَا هُنَاكَ الجَبَابِرَة بَنِي عُنَاق فَبَدَوْنا فِي أَعينِ أَنْفسنا كَالجَرَادِ وَكَذَلِكَ كُنّا فِي أَعينهم)[١]، واتە: لە دوای چڵ ڕۆژ، (واتە: دوای چڵ ڕۆژ لە گەڕان و پشکنینی ئەو دوازدە نوێنەرەی کە مووسا ﷺ ناردنی بە نوێنەرایەتی هەر دوازدە تیرەکەی گەلی بەنی ئیسرائیل)، دوای ئەوەی کە سەرزەمینەکەیان پشکنی گەڕانەوەو ڕوویان کردە مووساو هاروون و گەلی بەنی ئیسرائیل لە بیابانی فاران لە قادیش، وە ئەوەیان پێ ڕاگەیاندن کە بینیویانە (واتە: چییان دیبوو گێڕایانەوە) وە بەرو میوەی ئەو سەرزەمینەش کە چووبوون بیپشکنن و ئەویشیان لەگەڵ خۆیان هێنا، وەك نموونە پیشانیاندان، وە گوتیان: ئێمە چووین بۆ ئەو سەرزەمینەی کە ئێمەت بۆ ئەوێ ڕەوانە کرد بوو، بینیمان، بەڕاستی وایە: شیرو هەنگوینی لێ‌دەڕژێ، (واتە: زۆر بە بەرەکەتە) ئەوەش نموونەی ئەو میوەو بەرهەمەیە کە لەوێیە، بەڵام ئەو گەلەی کە لەوێدا نیشتەجێن، زۆر بەهێزن، وە شارەکانیان زۆر مەحکەمن، وە شارەکانیان گەورەن وە شوورەی مەحکەمیان هەیە، (زۆریان لەوبارەوە گوت)، بەڵام کالیب {واتە: (كالب بن يوفنا) دیارە لێرەدا تەنیا باسی ئەوی کردوە، بەڵام زانایانی ئیسلام لە کتێبەکانیاندا باسی (يوشع بن نون)یش دەکەن هەروەها (پەیمانی کۆن)یش لە شوێنی دیکەدا باسی ئەویش دەکات}[٢]، ئەو گەلەکەی ئارام کردەوە، ئەو گەلەی کە لە بەرانبەر مووسادا وەستا بوو، وە گوتی: با بچین بۆ ئەو سەرزەمینە کە بۆمان دیاریی کراوە، بیکەینە موڵکی خۆمان و تێیدا نیشتەجێ بین، چونکە بێگومان ئێمە دەتوانین ئەوە بکەین، بەڵام ئەو پیاوانەی کە لەگەڵی بوون، {واتە: جگە لە خۆی ئەو یازدەیەی دی، بەڵام لەڕاستیدا (یوشەعی کوڕی نوون)یش هەر ڕای وەك ئەو بوو، واتە: تەنیا ئەو دووەیان ڕایان وابوو و ئەو دەیەی دیکە} گوتیان: ئێمە ناتوانین بچین لەو سەرزەمینەدا نیشتەجێ بین، چونکە دانیشتووانی لە ئێمە بەهێزترن، وە بەو شێوەیە ئەو دە نەفەرەی دیکە ترس و بیمێکی زۆریان لەنێو وەچەی ئیسرائیلدا بڵاوکردەوە لە وڵاتدا، سەبارەت بە خەڵکی ئەو شوێنەی کە چووبوون بۆ پشکنینی، وە گوتیان: ئەگەر ئێمە بچینە سەر ئەو زەمینەو تێیدا نیشتەجێ بین لە بەینمان

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص ٢٩٨، ٣٠١.

٢) بڕوانە: (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر العدد، الإصحاح: ١٤، ص٣٠٤).

دەبەن، وە خەڵكی ئەو شوێنە وەك نێچیر ڕاومان دەكەن، وە هەمووو ئەوانەی كە بینیومانن (عَمالِقة)ە بوون (عَمالقة)ە، كۆی (عِملاَق)ە، (عِملاَق)، واتە: ئینسانی زۆر بە قەڵافەتو بە كەلەشو بەهێز}، وە پێیانگوتن ئێمە لەوێ (جَبَابِرَة)مان بینین، {(جَبَابِرَة) كۆی (جَبَّار)ە، واتە: كەسانی زۆر بە هێزو بە تواناو سەركەش} لە وەچەی (عَناق) كە ئێمە لەچاو ئەوان خۆمانمان بە كوللە بینی، هەروەها ئەوانیش ئێمەیان وەك كوللە دەهاتە بەرچاو لەچاو ئەوان، هێندە گچكە بووین.

دیارە ئەو وردەكارییە لە پەیمانی كۆندا هاتوە، بەڵام لە قورئاندا تەنیا ئاماژەی پێدراوە، كە گوتوویانە: ئێمە ناتوانین بچین چونكە خەڵكێكی بەهێزو توانای تێدایەو، ناتوانین بچین لەوێ نیشتەجێ بینو، ئەوان ڕێگا نادەن، وە شەڕیشمان بۆ لەگەڵ ئەواندا ناكرێ.

**مەسەلەی شەشەم:** ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، دوو پیاو لەوانەی كە (لە خوا) دەترسێن، یاخود لەو خەڵكەی كە لە دوژمن دەترسان، كە خوا چاكەی لەگەڵدا كردبوون، پێیانگوتن، (واتە: بە گەلی بەنی ئیسرائیلیان گوت): كتوپڕ بچنە نێو دەروازەكەیانەوە (واتە: دەروازەی شارەكەیانەوە) ئەگەر ئێوە كتوپڕ پەلامارتان دان، بەسەریاندا زاڵ دەبن، وە پشت بە خوا ببەستن ئەگەر ئیماندارن، لێرەدا پێویستە چەند هەڵوێستەیەك بكەین:

**یەكەم: ئەو دوو پیاوە كێ بوون؟**

لە تەفسیرەكان زانایانی ئیسلام ناویان بە (یوشع بن نون) وە (كالب بن یوفنا) هێناون بۆ وێنە: (فتح القدیر)دا دەڵێ: (جاء في العهد القديم قالَ الربّ لِموسى وهارونَ: إلى مَتى أصفحُ عَن هذهِ الجَماعةِ الشرِّيرة المتذمِّرةِ عَليَّ؟... لَنْ تدخلوا الأرضَ التي وعدتُ يَدي رافعاً بقَسَمٍ أن أُسكِنَكُمْ فيها ماعدا كالبَ بنَ يَفُنَّة و يشوعَ بنَ نونَ، غيرَ أني سأُدخِلُ إليهما أولادَكُمْ الذينَ إدعيتُم أَنَهُمْ يُصبِحونَ أَسرى فيتمتَّعون بالأَرضِ التي إحتقرتموها أَمَّا أنتم فإنَ جثثَكم تتساقطُ في هذا

القَفرِ)[1]، واتە: لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: پەروەردگار بە مووساو هاروونی فەرموو: هەتاکەی من چاوپۆشیی لەو کۆمەڵە خراپەکارە بکەم، کە هەمیشە پرتەو بۆڵەم لەسەر دەکەن، هەمیشە نارەزایی دەردەبڕن؟! خوا فەرمووی: وە ناچنە سەر ئەو زەمینەوە کە بەڵێنم پێداونو دەستم بەرزکردۆتەوەو سوێندم بۆ خواردن، کە ئێوەی تێدا نیشتەجێ بکەم، ئێوە نابێ بچنە نێوی جگە لە دوو کەس (یوشع بن نون) وە (کالب بن یوفنا) تەنیا ئەو دووانە دەچنە نێوی و ئێوە هیچ کامتان ناچنە نێوی، بەڵام ئەو منداڵانەتان کە لای ئەوەتان لێدەدا دەبنە دیلی خەڵکی ئەو سەرزەمینە، (واتە: دەبنە دیلی جەبابیرەو عەمالیقە) ئەوانە دەچنە نێوی، دوای ئێوە، وە ئەو سەرزەمینەی کە ئێوە بە کەمتان تەماشا کرد، ئەوان تێیدا ژیانێکی خۆش دەگوزەرێنن، بەڵام ئێوە دەبێ جەنازەکانتان لەو بیابانەدا بەسەریەکدا بکەون، وەك گەڵارێزان (واتە: دەبێ ئێوە هەمووتان بمرن، ئنجا وەچەی تازەتان منداڵەکانتان پێدەگەن، وە دەچنە نێو ئەو سەرزەمینەو نێو ئەو شارەوە).

**دووەم: ئەوەی جێی سەرنجە لێرەدا خوای باڵادەست ئەو دوو پیاوەی بە دوو سیفەت پێناسە کردوون:**

وەسفی یەکەم: ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ ﴾، بۆ وشەی: (يَخَافُونَ)ە، چەند واتایەکیان لێکداوەتەوە:

١- لە خوا دەترسێن، یانی: بەنی ئیسرائیل لە دوژمنەکان دەترسان، بەڵام ئەوان تەنیا لە خوا دەترسان.

٢- واتایەکی دیکەی: ئەو دوو پیاوەی کە ئەوانیش لە جەبابیرە دەترسان، کە لەو سەرزەمینە پیرۆزە نیشتەجێن، بەڵام لەبەرئەوەی ئیمانیان بە خوا پتەو بوو، هەرچەندە ترسی ئەوانیشیان لە دڵدا هەبوو، گوێیان نەدا بەو ترسە.

---

١) ج٢، ص٣٠٤دا، هەروەها بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدّس، العهد القديم: سفر العدد، الإصحاح: ١٤، ص ٣٠٤.

٣- دوو پیاو لەو گەلی بەنی ئیسرائیلە کە لە دوژمنەکانیان دەترسان واتە:

﴿يَخَافُونَ﴾، دەچێتەوە بۆ ﴿ٱلَّذِينَ﴾، نەك بۆ دوو پیاوەکە، واتە: ئەوان ترسی دوژمنیان نەبوو، تەنیا گەلی بەنی ئیسرائیل ترسیان هەبوو، هەروەها خوێندراویشەتەوە (مِنَ الَّذِينَ يُخَافُونَ)، (يُخَافُونَ) واتە: لەوانەی کە ترسێنران، یاخود مەترسییان لێدەکرا، ئەوە وەسفی یەکەم، کە من زیاتر ئەوەم بە عەقڵەوە دەنووسێ، کە مەبەست پێی ئەوەبێ ئەو دوو پیاوەی کە لە خوا دەترسان، ئەوەش ڕەخنەیە خوا لە بەنی ئیسرائیلی دەگرێ، کە ئێوە مادام ئیددیعای ئیمان دەکەن، دەبوو بەس لە خوا بترسێن، وەك ئەو دوو پیاوە ئیماندارە، نەك لە غەیری خوا بترسێن.

وەسفی دووەم: ﴿أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا﴾:

(أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا) خوا چاکەی لەگەڵدا کرد بوون، ئەو چاکە لەگەڵداکردنەی خوای پەروەردگار دیارە خوا بەگشتی فەرموویەتی، بەڵام دەگونجێ مەبەست ئەوەبێ ئیمانیان هەبووەو، پشتیان بە خوا بەستووەو، ئازا بوونو، دڵیان بەهێز بووەو، ڕووحی فیداکارییان هەبووە، کۆمەڵێك وەسف دەگونجێ ئەم (أَنعَمَ اللهُ عَلَيهِمَا)یان پێ تەفسیر بکرێ، هەموو ئەوانە دەگرێتەوە، ئنجا لە یەکێك لە ڕووەکانی ڕەوانبێژیی لە قورئاندا ئەوەیە کە وشەیەك بەکاردەهێنرێ، کۆمەڵێك مانای هەیە، ئێستا لێرەدا ئەگەر فەرمووبای: (قَالَ رَجُلَانِ مِنَ الَّذِينَ يَخَافُون شُجَاعَيْنِ أَو شُجَاعَانِ}، دوو پیاوی ئازا، ئەوە هەر ئازایەتیی دەگرتەوە، بەڵام لێرەدا کە دەفەرمویٚ (أَنعَمَ اللهُ عَلَيهِمَا) ئازایەتیی دەگرێتەوە، فیداکاریی و لە خۆبردوویی دەگرێتەوە، پشت بە خوا بەستن دەگرێتەوە، ئیمان بە خوا دەگرێتەوە، نەترسان لە دوژمنان دەگرێتەوە، زۆر سیفەت دەگرێتەوە.

## سێیەم: دانانی نەخشەی جەنگ:

ئەنجا ئەم دوو پیاوە واتە یوشەعی کوڕی نوون لەگەڵ کالیبی کوڕی یوفەننا، کە لە تەفسیرەکانی خۆماندا دەڵێ یوفەننا، بەڵام لە پەیمانی کۆندا دەڵێ:

یەفوننە (يَفُنَّة)، بە هەرحاڵ دێن نەخشەیەکی جەنگ دادەنێن بۆ بەنی ئیسرائیل، کە لە دوو سێ وشەدا کورتی دەکەنەوە: ﴿ قَالَ رَجُلَانِ مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، نەخشەیەکی جەنگییان بۆ دادەنێن کە بریتییە لەوەی کتوپڕ پەلامار بدەن، پەلاماری کوێ بدەن؟ یەکسەر پەلاماری دەروازەی شارەکەیان بدەن، پێشتر باسمان کرد کە کاتی خۆی هەر دەوڵەتێك و شارێك شووورەی هەبووە، بۆ وێنە: کە هەولێر دەبینین قەڵای هەیە، هەموو شارەکان وابوون، قەڵایان هەبووەو شووورەیان هەبووە، ئنجا ئەو قەڵایە خەڵکەکەی، دانیشتووانەکەی هەموویان لەنێوی دابوون، وە هەر قەڵایەك کە شووورەی هەبووە، دەروازەشی هەبووە، جا دەروازەیەك بووە، یان دوو دەروازە بوون، یان زیاتر بوون، گرنگ ئەوەیە لەو دەروازەوە نەبێ، ڕێ نەبووە خەڵك بچێتە نێویان، ئەو دەروازەیەش بە دەرگایەکی زۆر گەورەی لە ئاسن، یان پۆڵا، یان لە تەختەیەکی زۆر مەحکەم دروستیان کردوە، وە شتی گەورەیان داوەتە پشتی کە بە هیچ کەس نەبێتەوە، بۆیە ئەو دوو پیاوە دەڵێن: ﴿ ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ ﴾، نەخشە جەنگییەکە لەوەدا کورت هەڵدێتەوە: لە ناکاوو کتوپڕ پەلاماریان بدەن، یەکسەر هێرشیش بکەنە سەر دەروازەی شارەکەیان ﴿ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَٰلِبُونَ ﴾، ئنجا کە نەخشەی جەنگییان بۆ دادەنێن، وە موژدەشیان پێ دەدەن کە ئەگەر ئێوە کتوپڕ چوونە نێو دەروازەی شارەکە، دڵنیابن بەسەریاندا زاڵ دەبن، واتە: بە هێزێکی زۆرەوە پەلاماری دەروازەی شارەکە بدەنو بیکەنەوەو بچنە نێو شار، ئنجا پێشیان دەڵێن: ﴿ وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴾، وە پشتیش بە خوا ببەستن ئەگەر ئیماندارن.

کەواتە: هەم نەخشەی جەنگیان بۆ دادەنێن، هەم موژدەی سەرکەوتنیان پێدەدەن، وە هەم ئامۆژگارییشیان دەکەن، بەڵام بزانین ئایا بەنی ئیسرائیل ئامۆژگاریی ئەو دوو پیاوەش هیچ کاریگەریی لەسەریان هەبووە؟!

**مەسەلەی حەوتەم**: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالُواْ يَـٰمُوسَىٰٓ إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُواْ فِيهَا ﴾، بەنی ئیسرائیل گوتیان: ئەی مووسا! هەرگیز ئێمە ناچینە نێو ئەو شارەوە، یان ناچینە ئەو سەرزەمینەوە، تاکو ئەو دانیشتووانە لەوێدا هەبن، وەك گوتم ئەوانە دیارە خەڵکێك بوون ڕووحی فیداکارییو لەخۆبوردووییان نەبووە، بە کوردەواریی خۆمان دەڵێ: (حازر خۆری بەر سێبەری بوون) قەومێکی واش شایستەی ئەوە نین کە ئەو جەنگو جیهادە بکەن، وە ئەگەر بیشیکەن سەرکەوتوو نابن، بەو ڕووحییەتەوە، هێندە خۆت پێ بێهێز بێتو دوژمنەکەی خۆت پێ ئەوەندە بەهێز بێ، ئەوە تۆ هەر لەڕێوە تێشکاوی، ئنجا ئەگەر تەماشا بکەین ئەوانە چوار جۆرە تەئکیدیان بەکارهێناوە بۆ نەچوون:

یەکەم: (إِنَّا)، (إِنَّا) ئەسڵی خۆی (إِنَّنَا)یە، واتە: بێگومان ئێمە.

دووەم: ﴿ لَن نَّدْخُلَهَآ ﴾، (لَنْ) بۆ داکۆکیی (تَأْكِيد)ەو بۆ هەرگیز (تَأْبِيد)ە، واتە: بە تەئکید ناچینو هەرگیز ناشچین.

سێیەم: (أَبَدًا) تەئکیدیان کردوە، واتە: هەرگیز ئێمە ناچین.

چوارەم: ﴿ مَّا دَامُواْ فِيهَا ﴾، هەتا ئەوان لەوێدا بن، واتە: مەگەر چۆڵی بکەن، کە بێگومان دانیشتووانی هیچ شارو وڵاتێك، لە خۆڕا شارو وڵاتی خۆیان چۆڵ نەکردوە، کەواتە: چوار جۆرە تەئکیدیان بەکارهێناون، تاکو مووسا سەلامی خوای لێ بێ بەیەکجاریی نائومێد بێ لێیان، وە نائومێدی بکەن کەچی دیکە داوایان لێ نەکات، وە بۆئەوەی غەیری مووساش، ئەو دوو پیاوەشو هیچکەسی دیکەش داوایان لێ نەکات، ئنجا بزانین دەڵێن: چی لە بەرانبەردا؟

**مەسەلەی هەشتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴾، ئەو بەنی ئیسرائیلە بە مووسا عليه السلام و، وە بە هاروونی برای دەڵێن: وە دیارە لە پشت ئەوانیشەوە بە یوشەعی کوڕی نوونو بە کالیبی کوڕی یوفەنناش دەڵێن: ﴿ فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴾، تۆو

پەروەردگارت بچن بجەنگن، ئێمەش ئەوە لێرە دانیشتووین، کە دەڵێن: (فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ ) تۆو پەروەردگارت بچن بجەنگن، ئەوە دوو واتای هەن:

١) یان ئەوەتا ئەوانە موجەسسیمە بوون، واتە: خوای پەروەردگاریان جەستاندووەو وایانزانیوە وەك چۆن بەشەر دێتو دەچێو دەڕوا، خوای پەروەردگاریش وایە، واتە: خوایان جەستاندوە وەك جەستە شتی ماددیی تەماشایان کردوە.

٢) یاخود مەبەستیان ئەوە بووە: ئەی مووسا! ﷺ تۆ بچۆ، با خوای پەروەردگاریش یارمەتیت بداو هاوکارت بێ، هەردوو واتاکان هەڵدەگرێ.

ئنجا دەڵێن چی؟ دەڵێن: تۆو پەروەردگارت بچن بجەنگن، بەڵام ئەدی بەنسبەت خۆیانەوە چی؟ دەڵێن: ئێمەش ئەوە لێرە دانیشتووین! لە (پەیمانی کۆن) لە (سیفری عەدەد) لە ئیصحاحی (١٤) لە ژێر ناوونیشانی: (تَمَرُّدُ أَبْنَاءِ إِسرَائِيل) واتە: هەڵگەڕانەوەی بەنی ئیسرائیلدا، ئاوا باسی ئەو هەڵوێستەی بەنی ئیسرائیل دەکات، دەڵێ: (فَرَفَعَ الْشَّعْبُ كُلُّهُ صَوتَهُ وَبَكَى فِي تِلْكَ اللَّيلَةِ وَتَذمَّر عَلَى مُوسَى وَهَارُون، وَقَالوا: لَيتنا مُتْنا فِي دِيارِ مِصر أَو لَيتَنَا مُتنا فِي الصَّحْرَاءِ، لِمَاذا أَحْضَرنا الْرَبُّ إلى هَذِهِ الأَرْض لِنَهلِكَ بِحَدِّ السَّيفِ وَتُؤخَذَ نِساؤُنا وَأَطْفَالُنا سَبَايا؟ أَلَيْسَ مِنَ الأَفْضَل أَنْ نَرجِعَ إلى مِصرْ؟ وَقالَ بَعْضُهُم لِبَعْضٍ لِنَنْتَخِبْ لَنا قَائِدَاً وَنَرجِع إلى مِصرْ...)[١] واتە: لەو شەوەدا گەل هەمووی دەنگی گریانی بەرز بووەوە، وە پرتەو بۆڵەو بێزاریی و نارەزایی زۆریان لە بەرانبەر مووساو هاروونی برای (سەلامی خوایان لێبێ) دەربڕی، وە گوتیان: خۆزگە لە سەرزەمینی میسر مردباین، یان خۆزگە لە بیابان مردباین، بۆچی پەروەردگار ئێمەی هێناوەتە ئەم زەمینەوە، تاکو بە تیژایی شمشێر بکوژرێین! وە ژنەکانمانو منداڵەکانیشمان بە دیل بگیرێن، (ڕەخنەیان لە خوا گرت) دوایی گوتیان: ئایا باشترنیە بگەڕێینەوە بۆ میسر، (ئەو میسرەی کە ساڵەهای ساڵ بووە سوغرەو بێگاریان لەوێدا پێکراو چەوسێنراونەوە) وە هەندێکیان بە هەندێکیان گوت: با فەرماندەیەك بۆخۆمان هەڵبژێرین، وە لەگەڵ خۆی بمانباتەوە بۆ میسر!

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص٣٠٢.

جا دەبێ مووسا ؈ چەندەی خەفەت لەو قسانە خواردبێ!! خوا ﷻ مووسا ؈و هاروونی ؈ برای ناردوون، دوو پێغەمبەری پایە بەرز، کە بچن بەنی ئیسرائیل دەرباز بکەنو لە ژێر چەکمەو پۆستاڵی فیرعەون دەریان بێنن، دەریای بۆ شەق کردوون، فیرعەونی بۆ فەوتاندوون، بە خۆی و بە سوپاکەیەوەو، دەربازی کردوون بۆ بیابانی سینا، لە بیابانی سینا خواردنی حازری بۆ ئامادەکردوون، بە هەور سێبەری لێکردوون، بەڵکو لە پەیمانی کۆندا دەڵێ بە شەوانەش چۆن دەڕۆیشتن لەو بیابانەو چۆن بە ڕێیان دەزانی؟! عەموودێکی ئاگر هەبوو لە شێوەی کۆڵەکەیەکدا ئاگر بوو ڕێی بۆ ڕۆشن دەکردنەوە[1]، ئنجا کانیو سەرچاوەی بۆ ڕەخساندبوون، ئنجا خۆ ناکرێ هەر لە بیابان بن تا قیامەت، خوا بە مووسای فەرموو: بچن لە شام نیشتەجێ بن، لە دەوری (بیت المقدس)، کەچی ئەوە وەڵامیان، بوو!! ئەوەش لە پەیمانی کۆندا هاتوە، کە هەم جوولەکەکانو هەم نەصرانییەکان کتێبی خۆیانە بڕوایان پێیەتی.

ئنجا با ئەوە بەراورد بکەین لەگەڵ هەڵوێستێکی هاوەڵانی پێغەمبەردا ﷺ تاکو بزانین هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ خوا لێیان ڕازی بێ، چەند وەچەو جیلێکی موبارەك بوون، چەند خەڵکێکی جێی ڕێزو خۆشەویستین خوا لێیان ڕازی بێ، وە جێی ئەوەن کە بەڕاستی هەموو هەموو وەچەکانی مسوڵمانان بیانکەنە سەرمەشقو ڕێزیان لێ بگرن، با تەماشا بکەین: ﴿عَنْ أَنَسٍ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ شَاوَرَ حِينَ بَلَغَهُ إِقْبَالُ أَبِي سُفْيَانَ، قَالَ: فَتَكَلَّمَ أَبُو بَكْرٍ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، ثُمَّ تَكَلَّمَ عُمَرُ فَأَعْرَضَ عَنْهُ، فَقَامَ سَعْدُ بْنُ عُبَادَةَ، فَقَالَ: إِيَّانَا تُرِيدُ يَا رَسُولَ اللهِ! وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نُخِيضَهَا الْبَحْرَ لأَخَضْنَاهَا، وَلَوْ أَمَرْتَنَا أَنْ نَضْرِبَ أَكْبَادَهَا إِلَى بَرْكِ الْغِمَادِ لَفَعَلْنَا...﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٨٣) وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٨١)}، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە (لە باسی جەنگی بەدردا) دەڵێ: کە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕاوێژی کرد بە هاوەڵانی بەڕێزی، دوای ئەوەی هەواڵی پێگەیشت کە ئەبو سوفیان بە خۆو بە کاروانەکەوە هاتوە لە شامەوە، وە تێپەڕیوە (دوایی سوپای قوڕەیش بە سەرکردایەتی ئەبو جەهل لە

---

١) هەمان سەرچاوە، سفر الخروج، الإصحاح: ١٣، عمود السّحاب والنار، ص١٥٨.

مەککەوە هاتوە) پێغەمبەر ﷺ ڕاوێژی پێکردن: ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێ قسەی کرد، پێغەمبەر ﷺ ڕووی لێوەرگێڕا، وە عومەر قسەی کرد، ڕووی لێوەرگێڕا، {یانی چی ڕووی وەرگێڕا؟ واتە: مەبەستی نەبوو کۆچکەران قسە بکەن، مەبەستی بوو پشتیوانان قسە بکەن، لەبەر دوو هۆیان:

یەکەم: لەبەرئەوەی کە کۆچکەران ژمارەیان زۆر کەم بوو، وە ئەو (٣١٤) کەسە زۆربەی پشتیوانان بوون.

دوو: لەبەرئەوەی ئەوانەی کە لە مەککەوە کۆچیان کردوە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بۆ مەدینە، دیارە ئامادەی جەنگو جیهادن، بەڵام ئایا پشتیوانانیش کە کاتی خۆی پەیمانیان بە پێغەمبەر داوە ﷺ کە لە عەقەبەی دووەمدا پەیمانیان پێدابوو لە نێو شاردا بیپارێزن، ئایا لە دەرەوەی شاریش ئامادەن جەنگو جیهادی لە خزمەتدا بکەن، لە بەرانبەر دوژمناندا، یان نا؟ دەبێ لێیان تەئکید بکاتەوە، چونکە گرێبەستو پەیمانێك کە لێیان وەرگیراوە، ئەوەی تێدا نەبووە، بۆیە ئێستا دەیەوێ لێیان دڵنیا بێت، کە ئایا ئامادەن؟ بۆیە کە ئەبو بەکر قسە دەکاتو عومەر قسە دەکات خوا لێیان ڕازی بێ، ڕوویان لێوەردەگێڕێ واتە: چاوەڕێی قسەکردنی کەسانی دیکە دەکەم! کەواتە: با بە هەڵە تێنەگەینو پێمان وابێ قسەکەی وانی پێ ناخۆش بووە، نا، لەبەرئەوەی کە پێویستی بە قسەی وان نەبووەو پێویستی بە قسەی پشتیوانەکان بووە، ئەوانەی کە خەڵکی مەدینەن} ئنجا سەعدی کوڕی عوبادە (کە سەرۆکی تیرەی خەزرەج بوو کە زۆرینەی خەڵکی مەدینەیان پێك دەهێنا) هەڵسا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ مەبەستت ئێمەیە؟ (دیارە پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: بەڵێ، یان ئاماژەی بۆ کردوە یاخود سەعدی کوڕی عوبادە مەبەستی ئەوە نەبووە وەڵامی پرسیارەکەی بداتەوە) سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، ئەگەر فەرمانمان پێ بکەی ئەو حوشترانەی کە سواریانین پێیان بەنێو بەحرێ بکەوین، بەنێو دەکەوین، وە ئەگەر فەرمانمان پێ بکەی کە لە کەلەکەی حوشترەکان بدەینو لێیان خوڕین تاکو بەرکو لغیماد، دەچین، (بەرکو لغیماد شوێنێکە پێنج شەو لە مەککەوە دوورە بەلای ئەو لایدا، نەك بەلای مەدینەدا، وەك کوردەواریی خۆمان

دەڵێن: ئامادەین لەسەر فەرمانی تۆ بە نێو ئاگرو ئاو بکەوین)، ئەوە هەڵوێستی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بوو.

یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئنجا خۆ لێرەدا تەنیا سەعدی کوڕی عوبادە قسەی کردوە؟ دەڵێین: دیارە پشتیوانەکان، سەعدی کوڕی عوبادە لەو مەقامەدا نوێنەریان بووە، واتە: کە ئەو قسەیەی کردوە وەك برا گەورەو ڕیش سپییان قسەی هەموویانی کردوە، وەك چۆن کۆچکەرەکان ئەبو بەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ نوێنەریان بوون، کە ئەوان قسەیان کردوە پێویستی نەکردوە، هەموویان قسە بکەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ لە نێو موسوڵماناندا گەورەو بچوکیی هەبێ، وە دەبێ وابێ کە پێویست بکات هەموویان هەر قسە بکەن، چونکە ئەگەر بەرپرسێك مشورخۆرێك قسەی کرد، مانای وایە لە جیاتی ئەوانی دیکەشە.

هەروەها لەوبارەوە ئەم دەقەش دێنین: ﴿عَنْ طَارِقٍ أَنَّ الْمِقْدَادَ قَالَ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ يَوْمَ بَدْرٍ يَا رَسُولَ اللهِ! إِنَّا لا نَقُولُ لَكَ كَمَا قَالَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ لِمُوسَى: ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾، وَلَكِنْ اذْهَبْ أَنْتَ وَرَبُّكَ فَقَاتِلا إِنَّا مَعَكُمْ مُقَاتِلُونَ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٣٩٥٢)، وَأَحْمَد بـرقم: (١٨٨٤٧)، واللَّفظُ لَهُ، تعليق شعيب الأرنؤوط: حَدِيثٌ صَحِيحٌ}، واتە: طاریق دەڵێ: میقداد (کە ئەویش دیارە لەگەڵ ئەو سوپایەدا بووە کە لە خزمەت پێغەمبەردا بوون ﷺ) لە جەنگی بەدردا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە وەك بەنی ئیسرائیل نالێین کە بە مووسایان گوت: ﴿فَٱذۡهَبۡ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَٰتِلَآ إِنَّا هَٰهُنَا قَٰعِدُونَ﴾، واتە: تۆو پەروەردگارت بچن بجەنگن ئێمەش ئەوە لێرە دانیشتووین، بەڵکو دەڵێین: تۆو پەروەردگارت بچن بجەنگن ئێمەش لە خزمەتتانینو جەنگاوەرین.

**مەسەلەی نۆیەم:** پێغەمبەر مووسا ﷺ دیارە کە زۆر بێزارو نائومێد دەبێ، سکاڵای خۆی لە لای خوا دەکات، دەڵێ: ﴿قَالَ رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ

﴿ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾، گوتی: پەروەردگارم! من تەنیا خۆمو برایەکەمم بەدەستە، (واتە: بە مسوۆگەریی خۆمو برایەکەم ئامادەین، کە ئەویش پێغەمبەر بووە، بەڵام خەڵکەکەی دیکە ئامادەنین، دیارە خۆیانو دوو نەفەرەکەی دیکەش کە پێشتر باسمان کردن: یوشەعو کالیب، بایی ئەوەیان نەکردوە جەنگ بکەن، چونکە بە چوار نەفەران جەنگ ناکرێ) بۆیە ئێمەو کۆمەڵی لاڕێیان لێك بترازێنەو لێکمان جیابکەوە، (واتە: بەکەڵکی گەلٚ یەکدی نەماوین، ئەوانە بە قسەم ناکەنو ڕێزم ناگرن، هەرچەندە من سوودی وانم دەوێ، بەڵام ئەوان بەو شێوەیەن، لەبەرئەوە با لێك جیاببینەوە)، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾، ئێمە دوو هەڵوەستە دەکەین:

یەکەم: مەبەست لەو لێکجیابوونەوەیە چییە؟ سێ واتای لێوەردەگیرێن:

١) واتە: ئێستا لە یەکمان جیابکەوە، یانی: ئێمە بمرێنەو لە کۆڵ ئەوانمان بکەوە، یانی: منو هاروونی برام بمرێنەو بمانبە لای خۆت.

٢) واتە: ئەگەر ئەوانت سزادا لە دنیادا ئێمە لەگەڵ ئەوان سزا مەدەو لەوانمان جیابکەوە، چونکە ئەوان بۆ فەرمانبەریت ئامادەنینو ئێمە ئامادەین.

٣) واتە: با لە قیامەت پێکەوە نەبین، یانی پێکەوە لە قیامەتدا سزامان مەدە، چونکە ئێمە وەك وان نین، ئامادەین بۆ هەموو شتێك، دیارە هەر سێ واتاکەش گونجاون.

دووەم: کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾، (قوم) واتە: کۆمەڵ، (فاسق) واتە: لەڕێ دەرچوو، کە دەگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ لە ڕێی شەریعەت دەرچوونو، یان لە شیرازەی فیطرەت دەرچوون، یان لە حوکمی عەقڵی سەلیم دەرچوون، کە لەڕاستییدا هەڵوێستەکەی ئەوانە پێچەوانەی شەریعەت بووەو، پێچەوانەی فیطرەت بووەو، پێچەوانەی عەقڵو مەنتیقیش بووە، بەنسبەت پێچەوانەی شەریعەت ئەوە خوا ﷻ فەرموویەتی: بچنە ئەو سەر زەمینەو نەچوونە، وە بەنسبەت پێچەوانەی فیطرەتیش، ئەوە دیارە

هەموو خاوەن فیطرەتو سروشتێکی ساغ، دەبێ ئامادەبێ بۆئەوەی دەستکەوتێکی دەستبکەوێ، تۆزێك قوربانییو زەحمەتیش بداتە بەر خۆی، تەماشا دەکەی باڵندە بۆئەوەی بەچکەکانی بەخێو بکات، دەچێ خۆی ماندوو دەکاو نێچیریان بۆ دەگرێو خواردنیان بۆ پەیدا دەکات، وە زیندەوەران تا ئەندازەیەك تووشی نارەحەتییو مەشەققەت دەبن لەپێناوی ئەوەدا دەستکەوتو بەرهەمێکیان هەبێ، وە عەقڵو مەنتیق وادەخوازێ، تۆ کە لەبەردەستی فیرعەوندا بوویو تا ئێستا چەوسێنراویەوەو، سۆغرە بێگاردت پێکراوە، ئێستا هاتووی بۆ دەشتو بیابان خۆ ناکرێ هەر لەو دەشتو بیابانەدا بمێنیەوەو دەبێ لە شوێنێك نیشتەجێ بی، ئنجا شارێك هەیە دەگونجێ تێیدا نیشتەجێ بی، قەومێکی تێدایە، لێك تێگەیشتنێکی لەگەڵدا دەکەیو پێی دەڵێی: ئێرە جێی ئێمەشی تێدادەبێتەوەو جێی ئێوەشی تێدادەبێتەوە، ئەگەرنا دەبێ ئامادەی جەنگکردن بن، کەواتە: سەرپێچییەکەیان وەك گوتم: دەرچوون بووە لە حوکمی شەرعو، لە حوکمی فیطرەتو، لە حوکمی عەقڵ، بۆیە ئەوانە شایستەی ئەوەنین کە چیدیکە دوو پێغەمبەری پایەبەرز کە مووساو هاروونن (علیهما الصلاة والسلام) لە نێویاندا بمێننەوە.

**مەسەلەی دەیەمو کۆتایی:** بزانین دوایی چارەنووسیان چی لێ دێ؟ ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴾ خوا ﷻ فەرمووی: لێیان قەدەغەیە ئەو سەر زەمینە بچنە نێوی، وە چل ساڵ لە زەویدا بە سەرگەردانیی دەگەڕێن، خەفەت لە کۆمەڵی بێباوەڕان مەخۆ، کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەو چل ساڵە دەگونجێ پەیوەست بکرێ بە: ﴿ مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡ ﴾ەوە، واتە: بۆ ماوەی چل ساڵ لێیان قەدەغەیە، هەتا چل ساڵی دیکە ناتوانن بچنە نێو ئەو سەرزەمینە، کە ئەو کاتە ڕستەکە ئاوا دەبێ: (قال فإنّها محرّمة علیهم أربعین سنة).

یــــاخود ﴿أَرۡبَعِينَ سَنَةٗ﴾، پەیوەســـــتە بـــــە: ﴿أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾، واتە: دەبــێ چـل ســاڵ ســەرگەردان بنو بخوولێنـەوە لـە بیابـانی سـینادا، بـۆ هـیچ شـــوێنێکی دیکە نەچــن، چونکە ڕوو لـە هـەر شـــوێنێك بکــەن ئـاوەدانیی لێیـە، ئێوەش ئامادەنین جەنگو فیداکاریی بکەنو لەگەڵ هـیچ کەسێك تێکبگـیرێن، مانای وایە دەبێ هەر لەو بیـابانەدا بمێننەوە بە سـەرگەردانیــی، یەکێـك بۆی هەیــە بپرســێ: ئایا ئــەو چل ساڵە حیکمـەتی چییــە؟ حیکمەتەکــەی ئەوەیــە: کـە ئـەو جیلــەی کە لـەو کاتــەدا بوون، کۆتاییــان پــێ بــێ، چـونکە ئـەو کاتـە گەنجەکانیان تەمـەنیان لـە نێوان بیســتو ســی ســاڵ دابـووە، بێگومـان هـی واشیان تێدابووە کە تەمــەنی پەنجــاو شەســتو حەفتــا ســـاڵو زیــاتریش بــووە، ئنجـا ئەوانــەی کــە تەمەنیشــیان بیســتو ســی ســاڵ بــووە، بـەو چل ســاڵە دەبوونـە شەســـتو حـەفتا ساڵ، چـونکە ئـەو جیلـە کـاتی خـۆی وا ڕاهـاتوون هـەر بچەوسـێنرێنەوەو سـۆغرە بێگاریان پێ بکرێو، لـە بـەرماوەی سفرەی فیرعەونـەکان شـتێك بخـۆن، وە لـە ژیـانی کۆیلایـەتیی ڕاهــاتوونو فێـر نەبوونــە نـانی فیداکــارییو ئازایــەتییو جوامێریــی بخـۆن، بۆیە ئەو جیلە بەکەڵکی شـۆڕش نایـەنو دەبـێ ئەوانـە بـڕۆنو وەچـەکانیانو نـەوەکانیان کـە تـازە پێدەگـەن، بەکەڵــکی ئــەوە دێـن کـە لـەنێو بیابانـدا پێدەگـــەن، چـونکە ژیـانی بیــابان ژیـانی خۆشــگوزەرانیی نیـەو ژیـانێکی زەحمەتـە، ســـەرمایەو گەرمایەو نارەحەتییــەو بارانو بایە، ژیـانی بیابـان ژیـانێکی ئاســوودەو نـەرمو نـۆڵ نیە، ئینسـان لەوێدا ژیانێکی نـاز پەروەرانـەی نیـە، کەســانێکیش بەکەڵــکی جـەنگو جیهــاد دێـن کـە ژیــانێکی زبریــان بووبــێ، ئەوانـەی کـە وەختـی خـۆی بـەو شـــێوە ژیانــەی ژێــر دەســتەڵاتی فیرعەونــەوە ڕاهــاتوون، بەکەڵــکی ئــەوە نایــەن بــێن ئــەو فیـداکارییە بکـەن، بۆیە بـا ئەوانـە بڕێنـــەوەو وەچــەی تازەیـان پێبگـات، ئنجا ئـەو وەچـە تازەیە دەتوانن ئەو شـەڕەفەیان پــێ بــبڕێ، بچن لـەو ســـەرزەمینە پیرۆزەدا نیشــتەجێ بن، ئەوە وەك شیکردنەوەیەکی کۆمەڵناســانە، ئەگەرنا دەقێکی شـــەرعیی لەســـەر نیــە، وە کە (پەیمانی کۆن)یش ئێمە جـار جـار هەندێ شـتی لــێدەردێنین، ئــەو شــتانە دێـنین کــە زیــاتر لەگــەڵ سـیاقی ئایەتەکانــدا دەگـونجێنو وردەکـاریی زیاتریــان لەبارەی ڕووداوەکانــەوە تێدایــە، چونکە پێغەمبــەری خــوا ﷺ دەفەرموێ:

﴿حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤٨٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢٧٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٨٤١)، وَالتِّرمذيُّ برقم: (٢٦٦٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٦٢٥٦) عَنْ عَبْدَ اللهِ بْنَ عَمْرِو رضي الله عنه}، واتە: قسان لە بەنی ئیسرائیل بگێڕنەوەو سەغڵەتییتان لەسەر نیە، واتە: ئەو شتانە بگێڕنەوە کە لەگەڵ قورئانو سوننەتدا دەگونجێن، بەڵام شتێك کە پێچەوانەی قورئانو سوننەتە، مەگەر وەك دەرسو پەند وەرگرتن، یان وەك دەرخستنی کەموکوڕییەکان، ئەگەرنا ناگونجێ بە بەڵگە بهێنرێتەوە، جا لە پەیمانی کۆن، (الإصحاح: ٤)[1] دا هاتوە، (غير أَنِّي سَأُدخلُ إليها أولادكم الذين ادَّعيتم أَنَّهم يُصبِحون أسرى، فيتمتَّعون بالأرض التي احتقرتموها، أمَّا أنتم فإنَّ جثثكم تتساقط في هذا القفر. ويبقى بنوكم في الصحراء أربعين سنة تُعانون من فجوركم حتى تَبلَى جثثكم فيها، وتحملون أوزاركم أربعين سنة كل يومٍ بسنةٍ على عدد الأيام الأربعين التي تجسَّستم فيها الأرض فتُدرِكون عاقبة ابتعادي عنكم)؟

(بە حیسابی خوای پەروەردگار وای پێ فەرموون)، واتە: بەڵام مـن ئەو منداڵانەتان کە ئیددیعای ئەوەتان دەکرد دەبنە دیل بەدەستی عەمالیقەو جەبابیرەکانی سەرزەمینی موقەددەس، ئەوان دەخەمە نێو سەرزەمینی پیرۆزەوەو لەو زەوییە بەهرەمەند دەبن، کە ئێوە بە کەم تەماشاتان دەکرد، بەڵام ئێوە جەنازەکانتان لەو بیابانەدا دەکەون، وەك چۆن گەڵای درەختی پایز دەکەوێ، وە منداڵەکانتانو کوڕەکانتان چل ساڵ لە بیاباندا دەمێننەوە، ئێوەش بە هۆی خراپەکارییتانەوە تووشی ئەو ناخۆشییانە دەبن، هەتا ئەو چل ساڵە هەمووتان دەمرن، ئەوانەی ئێستا هەن، (ئەوانەی کەوتوونە تەمەنەوە دەڕۆن)، وە ئێوەش باجی گوناهەکانی ئەو چل ڕۆژە دەدەن، کە چوون ئەو سەرزەمینە بپشکنن بزانن چی لێیە، (مادام دوایی ئامادە نەبوون بچنە نێو ئەو سەرزەمینەوە)، لەجیاتی هەر ڕۆژێك دەبێ ساڵێك لەو بیابانەدا بمێننەوە، تاکو سەرەنجامی دوورکەوتنەوەتان لە من، یان دوورکەوتنەوەی من لە ئێوەتان بۆ دەربکەوێ.

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص٣٠٤.

## لێرەدا دوو پرسیار دێنە پێش :

یەکەم: ئایا مووساو هارۆون (علیهما السلام) لە ماوەی ئەو چل ساڵەدا لەگەڵ گەلەکەیان ماونەوە لە بیابانی سینادا؟

دووەم: ئایا پاش چل ساڵەکە بەنی ئیسرائیل چوونەتە ئەو شوێنەوە؟

لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا، دەڵێین: مادام ئەو چل ساڵ مانەوەی بەنی ئیسرائیل لە نێو دەشتی سینادا، سزایەکی خوا بووبێ‌و خوا ﷻ لەسەر ئەوە سزای دابن کە فەرمانی خواو پێغەمبەران مووساو هارۆونیان شکاندوە، کەواتە: نابێ ئەو سزایە ئەوانی "واتە: مووساو هارۆونی" گرتبێتەوە.

بەڵام ئایا ئەگەر ئەو چل ساڵە بەنی ئیسرائیل لەو بیابانە بێ سەروبنەدا مابنەوە، ئایا مووساو هارۆون (علیهما السلام) چییان بەسەر هاتوە؟ دیارە وەفاتیان کردوە، ئەگەرنا خۆ بەجێشیان نەهێشتوە! چونکە ئەو سەرگەردانیی‌و سەراسیمەییەی ئەو چل ساڵە، سزایەك بووەو سزایەکەش مووساو هارۆونی نەگرتۆتەوە، چونکە ئەوان دوو پێغەمبەری خواو ئامادەبوون، بۆ ئەنجامدانی هەموو فەرمانێکی خوا ﷻ.

وە لە وەڵامی پرسیاری دووەم دا دەڵێین: وایپێدەچێ کە دوای ئەو چل ساڵە چوونە نێو سەرزەمینی موقەددەسەوە، وەك لە تەفسیرەکانی خۆمان‌و لە پەیمانی کۆنیشدا باسکراوە[1]، کە (یوشع بن نون) و (کالب بن یوفنا) دوایی ئەم کارەیان ئەنجام دابێ‌و سەرپەرشتی جیلی تازەی بەنی ئیسرائیلیان کردبێ، وە پێشیان کەوتبن‌و جەنگیان کردبێ لەگەڵ عەمالیقەو جەبابیرەکانی ئەو سەرزەمینەدا کە نەیانهێشتوە بچن، وە سەرەنجام چووبن‌و لەوێدا نیشتەجێ بووبن، ئەوە (الشوکاني) لە (فتح القدیر)[2]دا هێناویەتی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) بڕوانە: (التفسیر التطبیقي للكتاب المقدس، العهد القدیم، سفر العدد، الإصحاح: ٢٢، ص٣٢١، ٣٢٢ ، المحاولة الثانیة لدخول أرض الموعد).

٢) ج٢، ص٤٠ .

# دەرسی حەوتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا ئایەتەکانی (٢٧ تاکو ٣١) تەفسیر دەکەین، لەو پێنج ئایەتەدا خوای پەنهانزان دووەمین بەسەرهاتی کە لەم سوورەتە موبارەکەدا هاتوە، لە چوار بەسەرهاتەکان خستۆتە ڕوو، ئەو بەسەرهاتەش بە بەسەرهاتی قابیل و هابیل ناسراوە، کە کورتەکەی ئەوەیە یەکێك لە دوو کورەکەی ئادەم ئەویدیکەیان دەکوژێ، کە لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: قابیل هابیلی کوشتوە، بۆچی؟ لەسەر ئەوەی کە هەردووکیان سەرو قوربانیی دەکەن، قوربانیی یەکەمیان وەردەگیرێ کە هی هابیلە، وە قوربانیی دووەمیان کە هی قابیلە، وەرناگیرێ، ئەوەی کە قوربانییەکەی لێوەرنەگیراوە حەسوودیی بە برایەکەی دیکەی دەبات، کە قوربانییەکەی وەرگیراوە، وە هەڕەشەی لێدەکات، وە سەرەنجام دوای مشتومڕێك لە نێوانیاندا دەیکوژێ، ئنجا دوای ئەوەی کە دەیکوژێ، بە دەست تەرمەکەیەوە گیر دەخواتو نازانێ چی لێ بکات! چونکە ئەوە یەکەمین ئینسانە کە بکوژرێ، بۆیە ئەزموونی نەبووە لە چۆنیەتی شاردنەوەی مردوودا، واشپێدەچێ کە یەکەمین ئینسانیش بووبێ کە مردبێ، بۆیە نەیزانیوە چی لە جەنازەکەی بکات، لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: جەنازەکەی هەر بە کۆڵەوە بووە، بەس خوا دەزانێ چەند ڕۆژان یان چەند مانگان بە کۆڵیەوە بووە، هەتا خوا قەلەڕەشێك دەنێرێ بە دەنووکی زەوی هەڵدەقەنێو پێشانی دەدا چۆن تەرمی برایەکەی بنێژێ، جا لە تەفسیرەکاندا دەڵێ: دوو قەلەڕەشە دەبن، یەکێکیان ئەوی دیکە دەکوژێ، قەلەڕەشەکەی کە ماوە زەوی دەکۆڵێ بە دەنووکیو، بە پێی زەوی هەڵدەقەنێو تەرمی قەلەڕەشەکەی دیکەی تێدەخاو خۆڵەکەی بەسەردا دەکاتەوە، تاکو قابیل فێر بکات چۆن تەرمی برایەکەی بنێژێ.

﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ
يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾ لَئِنۢ بَسَطتَ
إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ
﴿٢٨﴾ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ
﴿٢٩﴾ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾ فَبَعَثَ ٱللَّهُ
غُرَابٗا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ
أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾﴾.

## مانای وشــه به وشـەی ئایەتەکـان

((وە بـە شـێوەیەکی هـەق بەسـەرهاتی دوو کوڕەکەی ئادەمیـان بەسـەردا بخـوێنەوە، کـاتێك کە هەردووکیـان سـەرو قوربانییەکیـان کـرد، ئنجـا لـە یەکێکـیان وەرگیـراو لـەوی دیکـەیان وەرنـەگیرا، ئـەوەی قوربانییەکـەی وەرنـەگیرابوو، گـوتی: سـوێندبێ دەتکـوژم، قوربـانیی لێوەرگیـراوەکە گـوتی: بێگومـان خـوا تـەنیا لـە پارێزکـاران وەردەگـرێ، (تـۆش پارێزکـارنی بۆیـە قوربانییەکـەت وەرنەگـیراوەو هـیچ سـووچی منیشـی تێدانیـە، لەسەرچی دەمکـوژی؟!) ﴿٢٧﴾ بە دڵنیاییـەوە ئەگەر تـۆش دەسـتم بـۆ درێژ بکـەی تاکو بمکـوژی، مـن دەسـتم بـۆت درێژ ناکـەم کە بتکـوژم، چونکە مـن لە خوای پەروەردگاری جیهانیـان دەترسـێم ﴿٢٨﴾ من دەمـەوێ کە لـە ئـەنجامی کوشـتنی مندا بە ناهـەق، گونـاهی منو گونـاهی خۆیشـت هەڵبگـری‌و، سـەرەنجام لـە هـاوەڵانی ئـاگر بـی، وە ئـەوەش سـزای سـتەمکارانە ﴿٢٩﴾ ئیـدی سـەرەنجام نەفسـی (نەخۆشـی) کوشـتنی برایەکـەی بـۆ ئاسـان کـردو کوشـتی‌و لـە زیانبـاران بـوو ﴿٣٠﴾ ئنجا خـوا قەلەڕەشـێکی نارد بە دەنووکـی لە زەوی دەگەڕا دەیکـۆڵی، تاکـو پێشـانی بـدات، چۆن تـەرمی برایەکـەی بشـارێتەوە، گوتـی: ئەی هـاوار بۆ مـن! ئایا نـەمتوانی کە وەك ئـەم قەلەڕەشەیەش بـم، وە تەرمی برایەکـەم بشـارمەوە؟! ئنجـا لـە ئاکامـدا لـە پەشـێمانان بوو ﴿٣١﴾)).

# شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَٱتۡلُ ): یانی: (وَاقْرَأ) بخوێنەوە، (تَلاه: تَبِعَهُ مُتَابَعَةً لَيْسَ بَيْنَهُما مَا لَيْسَ مِنْهما، قِرَاءَةً بِتَدَبُّرٍ)، واته: شوێنی کەوت، بە شێوەیەك کە لە نێوانی ئەوو ئەو شتەی کە شوێنی کەوتوە هیچ شتێکی نامۆ نەبێ، وە (تِلاوَة) واتە: خوێندنەوە بە لێوردبوونەوەوە، بەڵام (قِرَاءَة) واتە: خوێندنەوە، جا بە لێوردبوونەوەوەبێ، یان بێ لێوردبوونەوە، بەڵام کە گوترا: (تَلَاهُ، يَتلُوهُ) واتە: خوێندیەوە بە تێوەڕامان.

(نَبَأَ ): (النَّبَأُ: خَبَرٌ ذُو فَائِدَةٍ عَظِيمَةٍ يَحْصُلُ بِهِ عِلْمٌ أوْ غَلَبَةُ ظَنٍّ)، (نَبَأ)، بریتیە لە هەواڵێکی سوودبەخشی گەورە، کە زانیاریی یاخود گومانێکی زاڵی پێ وەدەست بێ، تەنیا ئەو کاتە پێی دەگوترێ: (نَبَأ).

(قُرۡبَانًا ): (القُرْبَانُ: مَا يُتَقَرَّبُ بِهِ إلَى اللّه) (قُرْبَان) هەر شتێکە ئینسان پێی لە خوا نزیك بکەوێتەوە، جا چ سەربڕینی ئاژەڵ بێ، چ پارە بکەیە خێر، چ خواردنێك بکەیە خێر، هەر شتێك بێ، هەرچەندە چەمکە عورفییەکەی وشەی (قُرْبَان) زیاتر بۆ ئاژەڵ بەکاردێ، بەڵام لەڕاستییدا وانییە، (قُرْبَان وجمعه قَرَابِين، هي الذَّبيحَةُ والنَّسِيكَةُ في العُرفِ، وَقُربان المَلِكِ: لِمَنْ يَتَقَرَّبُ بِخِدْمَتِهِ إلَى المَلِكِ)، واته: (قُرْبَان) کۆیەکەی (قَرَابِين)ە، کە بریتیە لەوەی سەردەبڕدرێ ئەوە لە عورف دا، بەڵام لە ئەسڵی زماندا (قُرْبَان) هەر شتێکە ئینسان پێی لە خوا نزیك بێتەوە، وە (قُربان المَلِكِ) بۆ کەسێکە شتێك دەکات، خزمەتێك دەکات و پێی لە پادشاو حوکمڕان نزیك بێتەوە.

(بَسَطتَ ): وشەی (بَسَطَ) واتە: پانی کرد، بەڵام لێرەدا بە مانای درێژی کرد، دێ، (لَئِن بَسَطَتَ إلَيَّ يَدَكَ) واتە: ئەگەر دەستت بۆم درێژ کرد، دەڵێ: (بسْطُ الشَّيء: نَشْرُهُ وَتَوْسِيعُهُ، وَبَسْطُ اليَدِ للصولَةِ وَالضَرْبُ)، واتە: (بَسَطَ) یانتی: بڵاوی کردەوەو فراوانی کرد، بەڵام (بسْطُ اليَدِ) بریتیە لەوەی کە دەست ڕابوەشێنی بۆئەوەی لە کابرای بدەی، واتە: دەست وەشاندن.

(تَبُوٓأَ ): (بَـاءَ یعـني: رَجَـعَ)، (بَـاءَ) واتــە: گەڕایـەوە، (تَبَـوءَ) واتـە: (تَرْجِـعَ)، دەڵـێ: (وَبَـاءَ بِغَضَـبٍ مِنَ اللّٰهِ، أَي حَـلَّ مُبَـوأً وَمَعَـهُ غَضَبُ اللّٰهِ أَي عقُوبَتُـهُ)، واتـە: لەگـەڵ تـووڕەیی خـوادا گەڕایـەوە، یـانی لـە شـوێنێك قـەراری گـرتو نیشـتەجـێ بـوو، وە توڕەیی لەگەڵدا بوو، واتە: سزای خوای پەروەردگـار.

( فَطَوَّعَتۡ): واتـە: بۆی ئاسـان کـردو دنـەی دا، (الطَّوْعُ: الإنقِيَادُ، تَكَلُّفُ الطَّاعَةِ، وَهُوَ التَّبَـرّعُ بِمَـا لاَ يَلْـزَمُ كَالتَّنَفُّـلِ ﴿ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ ﴾ أَي: سَـوَّلَتْ لَـهُ وزيَّنَتْـهُ وَشَجَّعَتْهُ عَلَيْهِ)، (طَوْع) بریتیـە لە ملکەچیی، وە (تَطَـوْعُ) بریتیـە لە طـاعـەتێك کە ئینسـان بۆخۆی خۆبەخشـانە بیکـاتو لەسـەری فەرز نەبـێ، وەك کردنی دوو ڕکـــات نوێـــژی ســـوننەت، کـــە دەفـــەرموێ: ﴿ فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ ﴾، واتـــە: نەفسـەکەی بۆی ئاسان کردو بۆی جوان کردو هانیدا بیکـوژێ.

(غُرَابًا ): ئێمە بە کوردیی دەڵێین: قەلەڕەشـە، (سُـمِّيَ الغُرَابُ غُرَابَـاً لِكَونـهِ مُبْعِدَاً فـي الـذَّهَابِ، وَغَـارِبُ السّـنَامِ لِبُعْـدِهِ) بۆیــە قەلەڕەشــە پێــی دەگــوترێ: قەلـــەڕەش، لەبەرئـــەوەی کـــە زۆر دەڕوات، چونکـــە دەڵـــێ: (غَـارِبُ السّـنَامِ) بـــە حوشـــترێك دەگوترێ کە دوونگەکەی لە پشـتی بەرز بووبێتەوە، لەبەرئـەوەی دوورکەوتۆتـەوە لە پشـتی.

(یَبۡحَثُ فِی ٱلۡأَرۡضِ ): زەوی دەکوڵـێ بـە دەنـووکی، یـان بـە پێیـەکانی جنجـڕووکـی لـێدەدا، دەڵـێ: (البَحْـثُ: الكَشْـفُ وَالطَلَـبُ، وَبَحَـثَـتِ النَاقَـةُ الأَرْضَ بِرجلِهـا فِـي السير: إِذَا شَدَّدَتِ الوَطءَ تَشْبِيهَاً بِذَلِكَ)، واتـە: (بَحْث) بریتیـە لـە دەرخسـتنو بەدوای شـتێك کەوتن، وە حوشـتر کە چـاك پێی بـە زەویدا بـدات بۆئـەوەی خێرا بڕوات، دەگـوترێ: (بَحَثَـتِ النَاقَةُ) واتە: پێیەکـەی چـاك بە زەوی دادا، وەك بڵـێی زەوی هەڵکۆڵـی.

(یُوَٰرِی ): (وَارَيـتُ كَـذَا إِذَا سَـترتهُ، وَتـوارى اسـتترَ، وجـاء فـي الحديـث: إِذَا أَرَادَ غـزواً وَرّى بِغيـرِهِ)، (وَارَيتُ كَذَا) واتــە: دامپۆشـی، (تواری يعـني إستتر) خـۆی داپۆشـی،

ون بوو، خۆی پەنهان کرد، لە حەدیسدا هاتوە: ﴿عَن كَعْبِ بْنِ مَالِكٍ: أَنَّ النَّبِيَّ كَانَ إِذَا أَرَادَ غَزْوَةً وَرَّى بِغَيْرِهَا وَكَانَ يَقُولُ: (الْحَرْبُ خَدْعَةٌ)﴾ {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، أَخْرَجَهُ أبو داود برقم: (٢٦٣٩)، وَأَبِي عَوَانَة برقم: (٦٥٤٩) قال الشيخ الألباني: صحيح}، واتە: کەعبی کوڕی مالیك دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر ویستبای جەنگێك بکاتو، بە لایەکدا بڕوات، وای ئامازە پێدەدا کە بۆ لایەکەی دیکە دەچێ، بۆئەوەی ئەوانی بەرانبەر هەواڵیان پێنەگاتو کتوپڕ بتوانێ بچێتە سەریان.

(سَوۡءَةَ ): (كِنَاية عَنِ الفَرْجِ، وَعَنِ العَورَة لأن انكشافها يسوء الإنسان)، (سَوْءة) کینایەیە لە داوێنی ئینسان، پێشو پاشی ئینسان، هەروەها بە عەورەتیش دەگوترێ، واتە: ئەو شوێنانەی کە نابێ دەربکەون، هەم لە ڕووی فیطرەتەوە، هەم لە ڕووی شەرعەوە نابێ دەرکەون، چونکە دەرکەوتنیان دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئینسان پێی ناخۆشو خەفەتبار بێ.

(يَـٰوَيۡلَتَىٰٓ ): (وَيْل) بە مانای سزا دێ، (وَيْلَتَى) واتە: سزایەکەی من، دەڵێ: (وَيْلٌ: قُبْحٌ، وَقَدْ يُسْتَعْمَلُ على التَّحسُّر)، کەواتە: (يا وَيْلَتَى) واتە: ئەی هاوار بۆ من، کە مەبەست پێی خەمو خەفەت خواردنە.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

ئەم بەسەرهاتە وەك پێشتر گوتمان، دووەمین بەسەرهاتە لە سوورەتی (المائدة)دا کە خوا ﷻ باسی کردوە، دیارە سوورەتی (المائدة) جگە لەو چوار بەسەرهاتە کە ئەوانیش هەر کۆمەڵێك یاسای شەرعییان لێ وەردەگیرێن، ئایەتەکانی دیکە هەموویان باسی یاسا شەرعییەکانن، لە یەکەم ئایەت تا کۆتا ئایەت، جا ئەم بەسەرهاتە بە بەسەرهاتی قابیل و هابیل ناسراوە، هەرچەندە ناوی قابیل و هابیل نە لە قورئاندا، وە نە لە سوننەتی صەحیحی پێغەمبەردا ﷺ نەهاتوە، باشە ئەدی لە کوێ هاتوە؟ لە پەیمانی کۆن، لە تەورات وەرگیراوە، ئەو بەسەرهاتە بەو شێوەیە دەست پێدەکات خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ ﴾، وە بەسەریاندا بخوێنەوە هەواڵی دوو کوڕەکەی ئادەم، بە شێوەیەکی هەق، واتە: بە شێوەیەکی ڕاست، بە شێوەیەك کە جێگەی دڵنیایی بێ، وە لە چەند شوێنێکی دیکەدا خوای پەروەردگار ئەم ڕستەیەی فەرمووە: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ ﴾، بۆ وێنە: لە سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ١٧٥ ﴾، بەسەرهاتی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەوە کە ئایەتەکانی خۆمانمان پێدا بوون، واتە: شارەزامان کردبوون لە ئایەتەکانی خۆمان، دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەری خوا موحەممەدە ﷺ لە دوای ئەویش ڕووی دواندن لە هەر کەسێکە کە قورئان دەخوێنێ، یانی: هەواڵی دوو کوڕەکەی ئادەمیان بە شێوەیەکی هەق بەسەردا بخوێنەوە، ئنجا دێتە سەر هەواڵەکەو بەسەرهاتەکە باس دەکات، دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا ﴾، کاتێك کە قوربانییەکیان کرد، واتە: هەرکامێکیان قوربانییەکی کرد، قوربانیی وەك پێشتر باسمان کرد هەر کردەوەیەکە کە ئینسان پێی لە خوا نزیك ببێتەوە، ئەوە مانای زمانەوانییەکەی، لە ئەسڵی زماندا (القُرْبَانُ: مَا يَتَقَرَّبُ بِهِ إِلَى اللّٰه)، بەڵام مانا عورفییەکەی بریتییە لە سەربڕینی ئاژەڵێك بۆئەوەی کە ئینسان پێی لە خوا نزیك ببێتەوە، ئنجا وەك

ئەم بەسەرهاتەش دەلالەتی لەسەر دەکات، هەر شتێك ئینسان بیکات بۆئەوەی پێی لە خوا نزیك ببێتەوە، پێی دەگوترێ قوربانیی، ئەو دوو کوڕەی ئادەم وەك گوتمان نە لە قورئاندا، نە لە سوننەتدا نەهاتوە، ناویان چییە؟ دوایی باسی دەکەین، بەلاّم لە پەیمانی کۆندا (قاین‌و هابیل) هاتوون، بەلاّم لە کتێبە ئیسلامیی‌و سەرچاوە ئیسلامییەکاندا گوتوویانە: (قابیل‌و هابیل) کە دیارە قابیل کوڕە خراپەکەیەو هابیل کوڕە باشەکەیە، ئەوانە سەرو قوربانییان کردوە بۆ لە خوا نزیکبوونەوە، وە باس نەکراوە ئەو قوربانییەیان بۆچی کردوە؟ دوایی باسی دەکەین لە مەسەلە گرنگەکاندا، ﴿فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ﴾، یەکێکیان قوربانییەکەی لێ قبووڵ کرا، لێی وەرگیرا، وە یەکێکیان لێی وەرنەگیرا لەبەرچی؟ یەکێکیان لێی وەرگیراوەو ئەوی دیکەیان لێی وەرنەگیراوە؟ هۆکارێکی هەبووە، بە بەڵگەی ئەوە کە دوای ئەوەی قوربانییەکەی لێوەرنەگیراوە، بەوەی دیکەی گوتوە: ﴿قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَ﴾، واتە: گوتی: بە تەئکید دەتکوژم، وە ئەوەی کە قوربانییەکەی لێ وەرگیرابوو گوتی: ﴿قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾، بێگومان خوا تەنیا لە پارێزکاران وەردەگرێ، تەنیا کردەوەی پارێزکاران وەردەگرێ، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوەی دووەمیان کە قوربانییەکەی لێ وەرنەگیراوە، پارێزکار نەبووە، واتە: یان قوربانییەکەی بۆ خوا نەبووە، یان بە شێوەیەکی باش نەبووە، یان نە بۆ خوای بووەو نە بە شێوەیەکی باشیش بووە، چونکە پارێزکار (مُتَّقِي) کەسێکە:

<u>یەکەم</u>: کردەوەکەی بەپێی شەرع ئەنجام بدات.

<u>دووەم</u>: تەنیا بۆ خواش ئەنجامی بدا، واتە: هەم لە ئەنجامدانی کردەوەکەیدا شوێنی شەرع بکەوێ، وە هەم ئیخلاصیشی هەبێ‌و ئەنجامدانی ئەو کردەوەیەی تەنیا بۆ خوابێ، وە مەبەستی پێ لە خوا نزیك بوونەوەبێ، جا ئەوەی دووەمیان دیارە لە پارێزکاران نەبووە، بۆیە قوربانییەکەی لێ وەرنەگیراوە، ئنجا یان یەکێك لە دوو مەرجەکانی ناتەواو بووە، واتە: قوربانییەکەی یان شەرعیی نەبووە، یان باش نەبووە، یاخود لەبەرئەوەی کە بۆ خواش نەبووەو باشیش نەبووە.

کەواتە: ئەو دوو کوڕەی ئادەم سەرو قوربانییان کردوە، یەکیان لێی وەرگیراوە، ئەوی دیکەیان لێی وەرنەگیراوە، ئنجا ئەوەی کە قوربانیەکەی وەرنەگیراوە، بەوەی دیکەی گوتوە: دەتکوژم، ئەویش گوتوویەتی، بێگومان خوا تەنیا لە پارێزکاران وەردەگرێ، ئنجا ئایا ئەمە چی لێ وەردەگیرێ؟ ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە من ئەو قوربانییەی کە کردومە، هەم شتێکی باشم کردۆتە قوربانی، هەم بۆ خواشم بووە، هی تۆ دیارە ئەم دوو مەرجەی تێدا نەبوون، یەکێکیان یان هەردووکیان، بۆیە خوا لێی وەرنەگرتووی، کەواتە: سووچی من نیە، سووچی خۆتە کە قوربانییەکەت وەرنەگیراوە، مانای وایە تۆ من بە بێ بەڵگەو پاساو دەکوژی، ئنجا ئەوەی کە قوربانییەکەی لێوەرگیراوە بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژبکەی تاکو بمکوژی، من دەست بۆ تۆ درێژ ناکەم کە بتکوژم، بێگومان من لە خوای پەروەردگاری جیهانییەکان دەترسێم، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە کوڕە صالحەکە، دەڵێ: دەستت بۆ درێژ ناکەم بۆ کوشتنت، بەلام ئەدی بۆ بەرگریی لەخۆکردن؟ ئەوەی نەفی نەکردوە! بۆیە زانایان زۆر مشتومڕیان لەوبارەوە هەیە، گوتوویانە: دیفاع لەخۆکردن فەرزە، ئەدی چۆن لێرەدا، دەڵێ: من دەست درێژ ناکەم بتکوژم؟! وەلامەکەی ئەوەیە کە دەڵێ: دەستت بۆ درێژناکەم بۆ کوشتنت، بەلام نەیگوتوە: دەست درێژناکەم بۆ نەهێشتنت کە بمکوژی، چونکە خۆ کەسێك بڵێ: دەتکوژم، نابێ ملی بۆ ڕاگری، ئەمە ئەوەی لێ وەرناگیرێ، وەك دوایی باسی دەکەین، ئنجا هۆکاری ئەوە کە دەست بۆ کوشتنی برایەکەی درێژ ناکات، چییە؟! بەوە پاساوی دەداتەوە، ﴿ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، بێگومان من لە خوای پەروەردگاری جیهانییەکان دەترسێم، کەواتە: کەسێك ترسی خوای لە دڵ دابێ، خوێنی خەڵك بە ناهەق نارێژێ، ئنجا لەسەر هەڵوێستی خۆی بەردەوام دەبێ‌و دەڵێ: ﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، من دەمەوێ گوناهی منو گوناهی خۆشت لەگەڵ خۆت بەریەوە[1]، گوناهی منو



١) باء، يبوء، رَجَعَ، يَرْجِعُ، گەڕایەوە، دەگەڕێتەوە.

خۆشت لەگەڵ خۆ بەری بۆ قیامەتێ بۆ لای خوا، ﴿فَتَكُونَ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلنَّارِ﴾، لە ڕیزی هاوەڵانی ئاگربی، یان لە ڕیزی خاوەنانی دۆزەخ بی، ئەمەش ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئینسان لە ئەنجامی گوناح کردندا دەبێتە هاوەڵی دۆزەخ، یاخود دەبێتە خاوەنی دۆزەخ، ﴿وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، ئەوەش سزای ستەمکارانە کە تۆ ستەم بکەی لە من، بە ناهەق بمکوژی منیش پێم خۆشە گوناهی منو خۆیشت هەڵبگری، دوایی ڕوونی دەکەینەوە بۆچی گوتوویەتی گوناهی منو خۆیشت؟ توێژەرەوان چەند مانایەکیان لەوەدا لێکداوەتەوە.

ئنجا خوا ﷻ هەڵوێستی کوڕە ناصاڵحەکە باس دەکات ﴿فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾، نەفسی کوشتنی برایەکەی بۆ ئاسان کرد، وشەی (طَوْع) دەڵێ: (الطَّوْعُ: الإِنْقِيادُ) وە (تطوّع) بریتیە لە ئەنجامدانی کردەوەیەك کە پێیەوە پابەند نەکراوی، لەسەرت پێویست نیەو، خۆبەخشانە ئەنجامی دەدەی، (طَوَّعَتْ) توێژەرەوان بە (سَهَّلَتْ) و (زَيَّنَتْ) و (سَوَّلت) بە هەرسێکیان لێکیان داوەتەوە، واتە بۆی ئاسان کرد، بۆی جوان کرد، دنەیداو هانیدا، ئنجا ئایا نەفسی بۆچی هانیدا؟ ﴿قَتْلَ أَخِيهِ﴾، کوشتنی برایەکەی بۆ ئاسان کردو بۆی هاندا، ﴿فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾، ئەویش کوشتیو لە زیان باران بوو، لێرەدا ئەم ئایەتە موبارەکە ئەوەی لێ وەردەگیرێ، کە هەرچی گوناهە هەرچی تاوانو خراپەیە، ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەفس، لەوبارەوەش خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةٌۢ بِٱلسُّوٓءِ ﴿٥٣﴾﴾یوسف، واتە: بێگومان نەفس زۆر فەرمان بە خراپە دەکات، واتە: هەرچی هەڵسوکەوتی ئینسانە لە خێرو لە شەڕ، ڕیشەکەی لێرەوەیە، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێکی صەحیح دا باسی تەقوای کردوە، فەرموویەتی: ﴿اَلتَّقْوَى هَا هُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلاثَ مِرَارٍ﴾{أَخْرَجَهُ أَحمد برقم: (٧٧١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤٨٧)}، واتە: تەقوا لێرە دایە، تەقوا لێرە دایە، تەقوا لێرە دایە، ئاماژەی بۆ سینگی موبارەکی کرد، واتە: ڕیشەی تەقواو هاندەری تەقوا لە سینەو دڵی ئینسانەوەیە، هەروەها هی گوناهیش بە هەمان شێوە.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەوە دەكات كە هابیل دیارە یەكەمین مرۆڤ بووە كوژراوە بەدەستی قابیل، یاخود یەكێك لە دوو كوڕەكەی ئادەم كە كوڕە صالّح و چاكەكەی بەدەستی كوڕە خراپەكەی كوژراوە، یەكەمین ئەزموونی كوشتن بووە، بۆیە نەیزانیوە تەرمەكەی چی لێ بكات، جا لە تەفسیرەكاندا زانایان خەیاڵی خۆیان خستۆتە سەری، هەبووە گوتوویەتی: چل ڕۆژ بە كۆڵیەوە بووە، هەبووە گوتوویەتی: ساڵێك بە كۆڵیەوە بووە، هەبووە گوتوویەتی: حەوت ساڵ بە كۆڵیەوە بووە، جەنازەكەی لێ بۆتە بەڵاو نەیزانیوە چی لێ بكات! ئەگەر بەجێی بهێشتبایە، دڕندە دەیانخوارد، بۆیە زۆر ئەزیەتی پێوە كێشاوە، ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، خوا قەلەڕەشەیەكی نارد زەوی دەكۆڵی، (بَحَثَ) یانی: لێی كۆڵیەوەو بە دوای كەوت، لێی گەڕا، ئنجا لێرەدا ﴿يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾، واتە: بە دەنووكی، یان بە چڕنووكەكانی زەوی هەڵدەكۆڵی، قەلەڕەشەش بۆخۆی عادەتی وایە شت دەشارێتەوە، زەوی هەڵدەكۆڵێ و شتەكەی تێدەخات، ئنجا بۆچی خوای پەروەردگار ئەو قەلەڕەشەیەی ناردوە لە پێشچاوی قابیل، واتە: كوڕە خراپەكە زەوی بكۆڵێ؟! ﴿لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِ﴾، بۆئەوەی پێی پێشانبدا چۆن تەرمی برایەكەی بشارێتەوە، ﴿سَوۡءَةَ﴾، بە مانای عەورەت دێ، یان بە مانای هەرشتێك دێ كە مرۆڤ دەركەوتنی پێ ناخۆش بێ، دیارە ئەویش وەك چۆن ئینسان پێی ناخۆشە عەورەتی دەركەوێ، ئەویش پێی ناخۆش بووە، تەرمی ئەو برایەی بە كۆڵیەوە بێ، وە پێشی ناخۆش بووە داینێ و دڕندە بیخوات، لەبەرئەوە وەك شتێك بە ملیەوە بووە، بۆیە خوای پەروەردگار ئەو قەلەڕەشەیەی ناردوە، بەڵام ئایا چۆنی ناردوەو چی كردوە؟ هەروا لە خۆوە گڵی هەڵكۆڵیوەو شتێكی تێخستوە؟ دەگونجێ، وە دەشگونجێ وەك هەندێك لە توێژەرەوان دەڵێن: خوا دوو قەلەڕەشی ناردوون یەكیان یەكیانی كوشتوەو زەوی هەڵكەندوەو، كەلەشی قەلەڕەشە مردووەكەی لەبن گڵی ناوەو، خۆڵی بەسەردا كردوە، بۆئەوەی مردووناشتن فێری مرۆڤ بكات، ﴿قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ﴾، (قابیل

یان کوڕە بکوژە کە) گوتی: هەی هاوار بۆمن، هەی داخو حەسرەت هاوار بۆمن، ئایا من دەستەوستان بووم کە وەك ئەو قەلەڕەشەیەشم پێ بکرێ! کە تەرمی برایەکەم بشارمەوە، بەقەدەر ویشم لێ نەزانی!! بۆیە لە پەشێمانان بوو، واتە: پەشێمان بووەوە کە چەند سەعات یان ڕۆژە، یان چەند مانگو ساڵە، بەڵام پێموانیە مانگو ساڵ بووبێ، چەند سەعات یان ئەوپەڕی چەند ڕۆژێك ئەو جەنازەیەی بەکۆڵیەوە هەڵگرتووە، فکری پێ نەشکاوە لەبن گڵی بنێو بیشارێتەوە، لەبەرئەوە پەشێمان بوو لە بە کوڵ هەڵگرتنەکەی، کە ئەو هەموو ماوەیە ماوەتەوە، نەك لە کوشتنەکەی پەشێمان بووبێ، وەك دوایی ڕوونی دەکەینەوە.

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرمویٚ: ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ﴾، زانایان چەند هەڵوەستەیەكیان لەبەردەم ئەم ڕستە قورئانییەدا كردووە:

یەكەم: ئایا ئەو دوو كوڕە كوڕی ڕاستەوخۆی ئادەم بوون؟ واتە: لە ئادەمو حەووا بوون، یاخود نەوەیان بوون، یان كوڕی نەوەیان بوون؟ تەنانەت هەندێك گوتوویانە: لە بەنی ئیسرائیل بوون، بەڵام ئەوەی دەردەكەوێ، ئەوەیە كە كوڕی ئادەم خۆی بوون، لەبەرچی؟

١) وشەی (بني آدم) كوڕی ڕاستەوخۆ دەگەیەنێ، مەگەر نیشانەیەك هەبێ لەو مانایە لایدا.

٢) كوڕە بكوژەكە لە كۆتایی بەسەرهاتەكەدا كە دەڵێ: ﴿قَالَ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِي﴾، واتە: ئەی هاوار بۆ من داخو حەسرەت بۆ من، ئایا دەستەوسان بووم كە وەك ئەو قەلەڕەشەیە بم! بەڵگەیە لەسەر كوڕی ڕاستەوخۆی ئادەم بوونیان، چونكە ئەگەر هاتباو بكوژ كوڕی ڕاستەوخۆی ئادەم نەبووایەو، یەكەم قەتڵ نەبووایە كە دەكرا لەسەر زەوی، دەیزانی چۆن بیشارێتەوە، بەڵام دیارە ئەزموونی نەبووە، وە یەكەم مرۆڤ بووە بكوژرێ، بۆیە ئەزموونی شاردنەوەو بە خاك سپاردنی نەبووەو، ناچار بووە لە قەلەڕەشە فێربێ، كەواتە: ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە كوڕی ئادەم بوون، چونكە ئەگەر نەوەی بوونایە، یاخود دوور بووونایە، تا ئەوكاتە چەند بەشەر دەكوژران‌و دەمردن‌و بە خاك دەسپێردران‌و، پێویستی بەوە نەدەبوو قەلەڕەشەكە فێری بكات.

دووەم: دەربارەی ناویان: ئایا قابیل‌و هابیل ناویان لە كوێ دا هاتووە؟!

وەك گوتم لە كتێبە ئیسلامییەكاندا لە تەفسیرەكاندا دەڵێ: ناویان قابیل‌و هابیل بووە، كوڕە خراپەكە ناوی قابیل بووە، كوڕە چاكەكەش ناوی هابیل

بووە، جا هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان جار جار وایانزانیوە زمانی عەرەبی تاکە زمانێك بووە کە بەشەر قسەی پێکردووە!! ئیدی هەڵساون بۆ هەموو وشەیەك لێیان کۆڵیوەتەوە ڕیشەی لە عەرەبی دا یانی چی؟ بۆ وێنە: هی نووح گوتوویانە: ئەوە لەبەرئەوەی کە زۆر (نَوْح)ی کردوە، زۆر شینو گریانی کردوە، بۆ ئەو خەڵکەی کە دوایی بە تۆفان هەمووی مردوە، لەبەرئەوە خوا ﷻ ناوی لێناوە نووح، هەروەها ناوی پێغەمبەرانی دیکەشو گەلەکانیانو شوێنەکانیشیان بە هەمان شێوە کە ئەوانە هیچیان وانین، چونکە ئەو ناوانە عەجەمیین، هەر خوا دەزانێ بەو زمانانە چ مانایەکیان هەبووە، ئنجا کە دەگوترێ: ناوی عەجەمیی، مانای وایە عەرەبی نەبووە، تا بیبەیەوە سەر ڕەگو ڕیشەیەکی عەرەبیی، دوایی مانایەکی عەرەبیی لێوەربگیرێ، (نووح)یشو (ئیبراهیم)یشو (شوعەیب)یشو ئەو ناوانەی دیکەش هەموویان، وەك: (مووسا)و (عیسا)و (قابیل)و (هابیل)و (هارووت)و (مارووت)و هەموویان پێیان دەگوترێ: ناوی عەجەمییەکان (الأسماء العجمية)، ئنجا ئایا بۆچی لە قورئاندا ناویان نەهاتوە؟! جاری دیکەش باسمان کردوە، کە لە قورئاندا تەنیا ئەو شتانەی کە تێگەیشتن لە ئایەتەکانو تێگەیشتن لەو بەسەرهاتە، یەکی لەسەری کەوتوە، باس دەکرێ، ئەمما قورئان ناچێتە هەموو وردەکارییەکان باس بکات، ئەگەر قورئان وردەکارییەکانی هەموو باس کردبان، گۆچانەکەی حەزرەتی مووسا چەند مەتر بووەو؟ چەند بست بووەو؟ لە چ دارێك بووەو؟ چۆن بووەو؟ کەشتییەکەی نووح چەند قات بووەو؟ چۆن بووەو؟ چەند مەتر بووەو؟ چەند نەفەری سوار بووە؟ ئەوانە هیچ باس ناکات، بەڵکو قورئان دێنێ نێوەڕۆکی ئەو بەسەرهاتەو نێوەڕۆکی ئەو بابەتە باس دەکات، ئەگەرنا قورئان چەندە، دەبوو سەد هێندەی دیکە بووایە، بەڵام ناوی قابیلو هابیل لە پەیمانی کۆن وەرگیراون، لە (پەیمانی کۆن، سیفری تەکوین ئیصحاح: ٤)[1] لە ژێر ناوونیشانی (تقدمتا قاين وهابيل)دا هاتوە: (وَعَاشَرَ آدَمُ حَوَّاءَ زَوْجَتَهُ فَحَبِلَتْ وَوَلَدَتْ قَايِينَ إِذْ قَالَتْ اقْتَنَيتُ رَجُلاً مِنْ عِنْدِ الرَّبِّ ثُمَّ عَادَتْ فَوَلَدَتْ أَخَاهُ هَابِيل)، واتە: ئادەم لەگەڵ حەووای هاوسەری

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص١٦١.

جووت بوو (سەلامی خوایان لێ بێ)، دووگیان بوو، وە قابیینی بوو، حەووا گوتی: لەلایەن پەروەردگارمەوە پیاوێکم پەیدا کرد، (یانی: کوڕێکم بوو)، دوایی دووبارە کە بەیەکەوە جووت بوون، ئەمجارە هابیلی بوو.

کەواتە: لە پەیمانی کۆندا (قابیین و هابیل)ن و زانایانی خۆشمان واپێدەچێ هەر لێرە وەریانگرتبێ.

ئنجا کە دەفەرموێ: ئەو بەسەرهاتەیان بە هەق بەسەردا بخوێنەوە، دوو واتای هەن:

<u>مانای یەکەمی</u>: واتە: هەق و حیکمەتی تێدایەو، حیکایەتی بەر ئاگردان نیە، ئەوە نیە هەر قسە بێ و گێڕدراوە بێ.

<u>مانای دووەمی</u>: واتە: ڕاستەو دروستەو واقیعی یەو ڕەمزو هێما نیە، دیارە خوای زاناو شارەزا زانیویەتی هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: ئەو بەسەرهاتەو هەندێك لە بەسەرهاتەکانی دیکەی قورئانیش، بەسەرهاتی ڕەمزیین، هێمان و مەرج نیە ڕووداوێك بن ڕوویان دابێ، بەڵکو ئەوە وەك ڕەمزو هێمایەکە کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی، بەلام وانیە بەسەرهاتەو ڕووشیداوەو واقیعییەو هەقە[١].

**<u>مەسەلەی دووەم</u>**: کە دەفەرموێ: ﴿إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ﴾، کاتێك کە قوربانییەکیان کرد، واتە: هەرکامێکیان قوربانییەکی کرد، یەکێکیان قوربانیەکەی لێ وەرگیرا، یەکێکیان لێی وەرنەگیرا، ئایا قوربانییەکە چی بووە؟ ئێمە جار جار هەندێك زانیاری کە لەگەڵ سیاقی

---

١) ژمارەیەك نووسەری عەلمانیی و تووشی ئەو جۆرە هەڵەیە بوو ون، کە بێگومان مەگەر لێی پەشێمان بووبنەوە، ئەگەرنا بەهۆیەوە فڕیان بەسەر ئیسلامەوە نامێنێ، بڕوانە: (العلمانيون والقرآن الكريم، تأريخية النص ) د. أحمد إدريس الطعان. المدخل التأريخي (الأسطوري): ص٥٤٧ -٥٨٣، کە ناوی هەرکام لە:
(طه حسين و أمين الخولي و محمد أحمد خلف الله و محمد أركون و نصر حامد أبوزيد و هاشم صالح و القمني و خالد السعيداني)ی هێناوە کە هەڵگری ئەو جۆرە بیرۆکەیە بوون، بەلام (طه حسين) دوایی لێی پەشێمان بۆتەوە.

ئایەتەکاندا دەگونجێن‌و دژ ناوەستن، هەندێك وردەکاریی کە لە پەیمانی کۆنداو لە پەیمانی نوێدا هەیە ئیستیفادەیان لێ دەکەین، توێژەرەوانی قورئانیش هەموویان یاخود زۆربەی هەرە زۆریان وایانکردوە، چونکە ئەوە تیشکی زیاتر دەخاتە سەر هەندێك بابەت، ئنجا پێغەمبەریش ﷺ لە فەرمایشتێکدا فەرموویەتی: ﴿حَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ حَرَجَ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٣٢٧٤) عَنْ عَبْدِاللهِ بْنِ عَمْرو}، واتە: لە بەنی ئیسرائیلەوە شت بگێڕنەوەو سەغڵەتییتان لەسەر نیە، یانی: ئەوەی کە پێچەوانەی ئایەتەکان نیە، وە لەگەڵ ڕووحی ئیسلام‌و عەقیدەی ئیسلامیی دا دژ ناوەستێ.

لە پەیمانی کۆندا لە (سفر التكوين: الإصحاح: ٤) دەڵێ: (وَكَانَ هَابِيلُ رَاعِياً لِلْغَنَم، أمَّا قَايِينُ فَقَد عَمِلَ فِي فَلاحَةِ الأرْض، وَحَدَثَ بَعْدَ مُرورِ أيَّام، أنْ قَدَّمَ قَايِينُ مِنْ ثِمَارِ الأَرْضِ قُرْبَاناً لِلرَّب، وَقَدَّمَ هَابِيلُ أيْضاً مِن خَيرةِ أبْكَارِ غَنَمِهِ وَأسْمنِهَا فَتَقَبَّلَ الرَّبُّ قُرْبَاناً هَابِيل وَرَضِيَ عَنْهُ لكِنَّهُ لَمْ يَتَقَبَّل قُرْبَان قَايِين وَلَم يَرضَ عَنْهُ)[1]، واتە: هابیل شوان بوو، (واتە: مەڕدار بوو)، قایینیش زەوی دەکێڵاو جوتیار بوو، دوای تێپەڕینی چەند ڕۆژێك، قایین لە بەروبوومی زەوی (کە دیارە کشتوکاڵی کردوە، لە تەفسیرەکاندا هاتوە: باقەیە دانەوێڵەیەکی هێناو تێیگەڕا لە نێو دەغڵەکەی دا کام گوڵە بێ دانە، یان دانەکەی بە کەڵك نایەت، ئنجا گەنم بووە، جۆ بووە، مەرەزە بووە، هەرزن بووە)، باقەیەکی کردە خێرو صەدەقەو قوربانیی، بۆئەوەی پێ لە پەروەردگار خوا نزیك بێتەوە، هابیلیش کە خاوەن مەڕ بوو، ئەویش تێگەڕا لە نۆبەرەی مەڕەکەی کامەیان لە هەموویان قەڵەوترەو چاکترە، یەکێکی کردە قوربانیی، پەروەردگار قوربانیی هابیلی وەرگرت، وە لێی ڕازی بوو، بەڵام قوربانیی قاینی وەرنەگرت‌و لێشی ڕازی نەبوو.

دیارە هابیل کە مەڕدار بووەو کامە مەڕی قەڵەوو چاکە ئەوی کردۆتە خێر، خواش لێی وەرگرتوە، ئینسان شتێك کە پێشکەشی خوای دەکات، دەبێ باش بێ، بەڵام قایین کە جوتیار بووە کام دانەوێڵە خراپە، ئەوەی بۆ خوا کردۆتە خێرو قوربانیی، بۆیە خوای پەروەردگار لێی وەرنەگرتوە.

---

١) التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، ص١٧، ١٨.

ئنجا ئایا هـۆکاری ئـەوە چـی بـووە کـە قوربانییـان کـردوە؟ لـە قورئانـدا بـاس نەکراوەو لـە سوننەتی پێغەمبەریشـدا ﷺ نـەهاتوە، بـەڵکو لـە قورئـانو سـوننەتدا هەر باسیش نەکراوە، کە هی یەکێکیان مەڕ بووە، هی یەکێکیان دانەوێڵەو کشـتوکاڵ بووە، وە لـە پـەیمانی کۆنیشـدا نـەهاتوە، کـە لەبەرچـی ئـەو قوربانییـەیان کـردوە؟ واپێدەچـێ کە تەنیا بۆ لە خـوا نـزیك بوونــەوە ئەو قوربانییەیان کردبـێ، بەڵام لە تەفسیرەکاندا بۆ وێنە: خـاوەنی تەفسیری (التفسـير الكبيـر)[1]دا ئـەوە دەگێڕێتـەوە، کە: حەووا هەر سکەی دووانەی دەبوو، کوڕێك‌و کچێـك، وە دووانـەی سـکی پێشـوو، بۆیان هەبوو لەگەڵ دووانەی سـکی دوایی دا هاوسـەرگیـریی بکەن، واتـە ئـەو کـوڕو کچـەی کـە پێشـێ بـوونو خوشــكو بــران، بۆیــان نــەبوو لەگــەڵ یەکدیـــدا هاوسەرگیــریی بکــەن، چونکە هیچ بەشــەری دیکــە لەسەر زەوی نـەبوون، ئـەدی چـۆن وەچــە پەیدابــێ؟ بۆیــە لەگـەڵ دووانـەی سـکی دواییــدا خوشـکەکانیان دەدا بەیەکدی، وەك دەڵـێ: ژن بە ژنیان پـێ دەکــردن، ئنجــا دەڵـێ: خوشـکەکەی قــایین (لـە تەفسـیـرەکاندا ناوەکەشــی هێنـاوە) زۆر جــوان بـوو، وە خوشـکەکەی هابیـل ناشیرین بوو، دەبوو بشیانـدەن بـە یەکـدی، چونکە هیچ کامیان خوشـکەکەی بـۆ خـۆی نەدەشــیا، بۆیـەش هی ئـەو سکەی دیکــە بـۆ ئەوسکە دەشــیا، چونکە هیچ بەشەری دیکە لەسـەر زەوی نـەبوون، چونکە یـەکێك بـۆی هەیــە بڵــێ: چــۆن ئـەوە دەبـێ، خۆ هەر هـی بابو دایـکێك بوون، دەڵێیــن: بەڵــێ، بـەڵام هـیچ چاری دیکــە نـەبوو، ئنجــا قابیـل ڕازی نــەبوو خوشـکە جوانەکـەی خـۆی بـدا بـە هابیـلو گـوتی: دەبــێ بۆخۆم بــێ، ئـادەمو حـەووایش سـەلامی خـوایان لــێ بــێ گوتیـان: ڕۆڵـە پێـت ناشـێ بـە پێـی شـەریعەتی خـواو، سـەرەنجـام بـووە مشــتومڕیان، ئنجـا ئــادەم پێـی گوت: باشــە قوربانیی بکەن، کامەتان قوربــانییەکەی وەرگیــرا، بـا خوشـکە جوانەکـە بـۆ وی بـێ، کـە قوربانییـەکـەیان کـردوە، دیـارە قوربـانیی هابیـل وەرگیــراوە، ئنجــا هەرچی بووبــێ، مەڕ بووبێ، وەك لە پەیمانی کۆندا دەڵـێ، یان هـەر شــتێك بووبــێ، قوربانییەکــەی وەرگیـــراوەو، قوربــانیی قــایین یــان قــابیلیش وەرنــەگیراوە، ئیــدی سـەرەنجام وەك شـەریعەتەکە بڕیاری داوە، بەو شـێوەیە بووەو، ئەو خوشــکە جوانـە بۆ ئەو بووە، دیارە ئەویش لەسـەر ئەوە حەسوودیی پـێ بردوە.

---

١) ج١١، ص١٧٤، ١٧٥.

ئنجــا ئایـا چۆنیــان زانیـوە ئـەو قوربانییــە قبــوولْ بــووە، یـان قبــوولْ نـەبووە؟ نیشـانەی قبوولْ کرانی قوربانییەکە چی بووە؟ زانایان دوو ڕایـان هـەن:

ڕای یەکــەم: زۆربـــەی هــەرە زۆریــان دەڵــێن: نیشــــانەکەی ئــەوە بــووە، ئەگــەر قوربــانییەکە وەرگیرابــێ، ئاگرێــك هاتۆتــە خــوارو ســوتاندوویەتی، وەك لــە تەفسیـری سورەتی (آل عمـران)دا باســمان کـرد، لە تەفسیـری ئـەو ئایەتـەدا کە دەفــــــەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُۗ قُلۡ قَدۡ جَآءَكُمۡ رُسُلٞ مِّن قَبۡلِي بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِي قُلۡتُمۡ فَلِمَ قَتَلۡتُمُوهُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٨٣ ﴾، واتە: ئەوانەی گوتیـان: ئێمـە خـوا ڕایسپاردووین، بڕوا بە هیچ پێغەمبـەرێك نەهێنین، هەتـا قوربانییەکیـان بۆ نەکـات کە ئاگـر بێ بیسـوتێنـێ، لەبەرچاوی ئێمــە، (خـوا ﷻ دەفەرموێ:) بڵێ: لـە پـێش منـدا پێغەمبـەرانێك هـاتن بـە بەڵـگە ئاشـکراکانەوەو بـەوەش کە گوتتان (واتە: قوربانییەك ئاگر بیســووتێنێ) ئـەدی بۆچـی هـەر کوشتیشــتانن؟ ئەگـەر ڕاسـت دەکـەن؟! وە ئێمـە لـەوێ باسمان کـردوە کـە چۆن لـە سـەردەمی ســولەیماندا، وە لــە ســەردەمی هەنــدێك لــە پێغەمبــەرانی بــەنی ئیســرائیلدا، قوربانییــان کــردوەو ئــاگر لــە پــێش چــاوی هــەمووان هاتۆتــە خــوارێو ئــەو قوربانییەی سوتاندوەو، بۆتە خۆڵەمێش، ئەوە نیشـانەی ئـەوە بـووە کە قبــوولْ کــراوە، ئنجــا زۆربــەی زانایــان ڕایــان وایــە کــە نیشــانەی قبــوولْکرانی قوربانییەکـە، ئەوە بووە کە ئاگر بێتـە خوارێو بیسـووتێنـێ.

ڕای دووەم: موجاهیـد ڕایەکـی پێچــەوانەی هەیــە، دەڵــێ: نیشــانەی وەرنەگـیرانی قوربانییـەکە ئەوەبووە کە ئاگـر بیســووتێنـێ.

بـەڵام دیـارە ڕای زۆربـەیان ڕاسـترە، وە ئایەتەکـەی (آل عمـران)یـش بەڵـگەیەتی، چـــونکە ئایەتەکـــە دەفـــەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُ ﴾، واتـــە: قوربانییەك کە ئاگر بیخواو بیسووتێنێ، مانای وایە قبوولْ کراوە، کەواتە: نیشـانەی قبووڵکرانی قوربانییەکان ئـەوەبووەو ئەگـەر وابــێو ئــەوەی پەیمــانی کۆن ڕاسـت بێ، دەبــێ ئـاگر لـە ئاســمان هاتبێتـە خـوارو مەڕەکـەی هـابیلی سـووتاندبێو، باقە

دانەوێڵەکەی قابیلیش هەر لەوێ بووە نەیسووتاندوە، مانای وایە قبوول نەکراوە، یاخود نیشانەیەکی دیکە هەبووە، خوای پەروەردگار بە وەحی بە ئادەمی گوتوە، کە ئەوە قوربانیی هابیلم قبول کردوەو، قوربانیی قابیلیشم قبوول نەکردوە.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، واتە: ئەوە کە قوربانییەکەی وەرنەگیرابوو بەوەی دیکەی گوت: بە تەئکید دەتکوژم، ئەویش گوتی: بێگومان خوا تەنیا لە پارێزکاران قبوول دەکات، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: ئەوە کەی وەڵامی ئەو قسەیەیە؟ ئەو دەڵێ: دەتکوژم، ئەویش دەڵێ: بێگومان خوا لە پارێزکاران قبوول دەکات، ئەو کە گوتوویەتی دەتکوژم، دیارە بە هۆی حەسوودییەوەیەو لەبەر ئەوەی قوربانییەکەی قبوول نەکراوە حەسوودیی پێ بردوە، حەسەد پاڵی پێوەناوە کە بیکوژێو هەڕەشەی لێ بکات، بەڵام ئەو وەڵامە گونجاو نیە لەگەڵ ئەو هەڕەشەیەی ئەودا کە بڵێ: خوا تەنیا لە پارێزکاران وەردەگرێ؟!

لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، ئەوە وەڵامێکی پڕ بە پێستە، بەڵام قورئان بە کورتی شت دەفەرموێ، ناچێ هەموو وردەکارییەکان باس بکات، درێژەی وتووێژەکەیان ئاوایە قابیل گوتوویەتی: دەتکوژم، هابیلیش گوتوویەتی: بۆچی دەمکوژی؟ قابیل گوتوویەتی: ئەدی بۆچی قوربانیی تۆ وەرگیرا، هی من وەرنەگیرا؟! (هابیل)یش گوتوویەتی: لەبەرئەوە هی تۆ وەرنەگیراوە، کە تۆ پارێزکارنی، کەواتە: خوای پەروەردگار ئەوەی کە (بيت القصيد)و ئامانجی وتووێژەکەیە هێناویەتیو ئەوەی دیکەی لێ قرتاندوە، وە ڕوویەکی گرنگی ڕەوانبێژیی قورئان ئەوەیە کە بە کورتیی مەبەستەکان دەفەرموێ، دیارە کاتێك قسە کورت دەکرێتەوە، کە ئەوەی سیاق دەلالەتی لەسەر دەکاو درێژەو وردەکارییە، بیقرتێنێ، ئنجا کە دەفەرموێ:

﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴾، ئەوە بەڕاستیی دەبێ هەڵوەستەی لە بەرانبەردا بکەین، چونکە (إنَّما) ئامرازی کورت هەڵهێنانو چەسپاندن (أداة الحصر والإثبات)ە، واتە: بێگومان خوا بەس لە پارێزکاران قبوول دەکاتو ئەوی پارێزکار نەبێ، کردەوەکەی بەسەردا دەدرێتەوە، پارێزکاریش دەبێ خۆی لە دوو شتی سەرەکی بپارێزێ:

١/ لە شیرك‌و ڕیابازیی، واتە: لە كردەوەكەیدا خۆی بۆ خوا ساغ بكاتەوەو نیەتەكەی بۆ خوا بێ، مەبەستی پێی لە خوا نزیكبوونەوە بێ.

٢/ كردەوەكەی بەپێی شەرع بێ‌و مۆری شەرعی پێوەبێ، واتە: هەردووك مۆری ئیخلاص‌و شوێنكەوتنی پێوەبن، دیارە هەر كەسێك خۆی لە شیرك‌و ڕیا نەپارێزێ، مانای وایە ئیخلاصی نیە، وە هەر كەسێك خۆی لە لادان لە شەریعەت نەپارێزێ، مانای وایە پابەندیی‌و شوێنكەوتن (إتباع)ی نیە، كردەوەیەكیش ئەو دوو مەرجەی تێدا نەبن، وەرناگیرێ، كەواتە: گرنگ تەنیا كردەوە نیە، بەڵكو گرنگ ئەوەیە كە ئەو كردەوەیە بە شێوەیەك بێ قبووڵ بێ، كاتێكیش كردەوە قبووڵ دەبێ، كە بەپێی شەرع بێ‌و بۆ خوا بێ، وە دیارە بێجگە لە خواش هیچ كەس بە مسۆگەریی نازانێ داخۆ ئەو كردەوەیە قبووڵ بووە، یان نا؟ لەبەرچی؟ لە سۆنگەی ئەوەوە كە تەقوا پەنهانە، دوو مەرجەكەیشی یەكێكیان دیارە بەپێی شەرع بوون، ئەوە دیارە، بەڵام ئیخلاصەكە بۆ خوا، پەنهانە، وە خوا كە لێرەدا لەسەر زمانی ئەو كوڕە صالحە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ﴾، دوایی خوا ﷻ بۆخۆی ڕوونی دەكاتەوە، كە تەنیا خوا بە تەقوا زانایە، دەفەرموێ: ﴿...فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ۝٣٢﴾النجم، خۆتان چاك مەكەن، (واتە: خۆتان پاك‌و چاك پێشان مەدەن بە قسە)، خوا زاناترە بەوەی كێ پارێز دەكات.

كەواتە: خۆ بە قسە چاك‌و پاك پێشاندان خراپە، بەڵام خۆ پاك‌و چاك كردن بە كردەوە، زۆر پەسندە، خوا دەفەرموێ: ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ۝١٤﴾الأعلى، ﴿قَدۡ أَفۡلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩﴾الشمس، ئەوە بە كردەوە، بەڵام بە قسە خراپە، یانی: تەزكییە لە قورئاندا لە شوێنێكدا نەهی لێكراوەو لە شوێنێكدا فەرمانی پێكراوە، نەهی لێكراوە، ئەگەر هەر بە قسە بێ، وە فەرمانی پێكراوە، ئەگەر بە كردەوە بێ، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە فەرمایشتێكی صەحیح دا باسی تەقوای كردوە، فەرموویەتی: «اَلتَّقْوَى هَا هُنَا، وَيُشِيرُ إِلَى صَدْرِهِ ثَلَاثَ مِرَارٍ» {أَخْرَجَهُ أَحْمَد

برقم: (٧٧١٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٤٨٧)}، واتە: تەقوا لێرە دایە، تەقوا لێرە دایە، تەقوا لێرە دایە، ئاماژەی بۆ سینگی موبارەکی کرد، واتە ڕیشەی تەقواو بناغەی تەقوا سەرچاوەی لێرەدایە، بەڵام شوێنەوارەکانی تەقواو بەرهەمەکانی تەقوا دەردەکەون، کەواتە: کاتێك قابیل بە هابیل دەڵێ: دەتکوژم، ئەویش لە وەڵامی دا دەڵێ: ﴿ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴾، واتە هۆکارو پاڵنەری کوشتنەکەی تۆ بۆ من حەسوودییە، حەسوودییەکەشت لەبەرئەوەیە کە قوربانییەکەت قبوولْ نەکراوە چونکە تۆ پارێزکارنی، کەواتە: لە جیاتی ئەوەی من بکوژی دەبوو خۆت چاك بکەی، ئنجا بۆ زانیارییتان، یەکەم دوو گوناهێك کە لە ئاسمان و لەسەر زەوی کراون، هاندەرەکەیان حەسوودیی بووە، ئیبلیس حەسوودیی بە ئادەم برد، کە خوا ڕێزی لە ئادەم گرتوو کردی بە جێنشینی خۆی و بە فریشتەکانی فەرموو: سەجدەی بۆ بەرن و هەموو سەجدەیان برد، واتە: سەجدەی ڕێزگرتن جگە لە ئیبلیس، کە حەسوودیی پێ برد، بە بەڵگەی ئەوە کە دەڵێ: ﴿ قَالَ أَرَءَيۡتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِي كَرَّمۡتَ عَلَيَّ لَئِنۡ أَخَّرۡتَنِ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَأَحۡتَنِكَنَّ ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٦٢﴾ ﴾الإسراء، واتە: (ئیبلیس) گوتی: ئەوە دەبینی کە بەسەر مندا ڕێزت لێناوە! مانای وایە حەسوودیی پێبردوە، وە لەسەر زەویش یەکەمین گوناهێك کە کراوە، قەتڵ بوو، ئەویش هەر بە هاندەری حەسوودیی، کە دیارە کوڕە خراپەکەی ئادەم حەسوودیی بە کوڕە باشەکەی دەبات، لەبەرئەوەی قوربانییەکەی وەرنەگیراوە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە هابیل، (واتە: کوڕە باشەکە) دەڵێ: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقۡتُلَنِي مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَۖ إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، لێرەدا نوقتەیەکی ڕەوانبێژیی تێدایە، بۆ وی دەڵێ: ﴿ لَئِنۢ بَسَطتَ ﴾، بە (فعل) دەیهێنێ، ئەگەر تۆ دەستدرێژ بکەی بۆ من، بۆئەوەی بمکوژی، هی خۆی بە (إسم فاعل) دێنێ، ﴿ مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَ ﴾، دەڵێ: (لِتَأْكِيدِ النَّفِي وَأَنَّهُ لايَفْعَلُ مَا يَكْتَسِبُ به هَذَا الوَصْفُ الشَّنِيع) یانی بۆ تەئکیدکردنەوەیە، کە من

ئـەو وەصـفە لەخۆمـدا ناهێنمـە دیو خـۆم بـە شایسـتـەی ئـەوە نـازانم سـیفەتی دەسـتـدرێژکردن بۆ ڕشتنی خوێنی بە ناهەق لەخۆمـدا بێنمـە دی.

ئنجـا لێرەدا ئیشـکالێك دروسـت دەبێ، ئایا ئەگـەر کەسێك هەڕەشـەی کوشـتن لـە تۆ بکات، شـەریعەت فـەرمانت پـێ دەکـات ملی بـۆ ڕاگـری‌و بڵـێی: فـەرموو بمکـوژە؟! عـەقڵ ئـەوە قبـووڵ ناکـات، وە شـەریعەتی خـوای پـەروەردگاریش بـە پێـی عـەقڵ‌و فیطرەتـی ئینسـانان هـاتوە، کەواتـە: ئەگـەر بگـوترێ: وەك هەنـدێك لـە توێـژەرەوانی قورئـان گوتوویـانە ئـەوە جیـاوازیی شـەریعەتەکانە، واتـە: لـە شـەریعەتی ئێمـەدا بەڵـێ دروسـت نیە، مل بۆ بکـوژ ڕاگـری، چەقـۆی پێدابێنـی‌و بتکـوژێ، بەڵکو دەبـێ بـەرگریی لـە خـۆت بکـەی، بـەڵام ڕەنگـە لـە شـەریعەتی ئـادەمدا ئـەوە دەرفـەتی بووبـێ؟

دەڵێم: نەخێر، چونکە هەموو شـەریعەتەکانی خـوا لەگەڵ فیطـرەتـی ئینسـاندا دەگونجێن، عەقڵ‌و فیطرەتی ساغیش خـوازیـاری ئەوەن کە ئینسـان بۆخـۆی مـل بـۆ چـەقۆ ڕانەگـرێ‌و دەبـێ بەرگریی لە خۆی بکات، ئەدی یـانی چی کە لێـرەدا دەڵـێ: ئەگەر تۆ دەستم بۆ درێژبکـەی بۆ کوشتنم، من دەست درێژ ناکـەم بۆ کوشـتنی تۆ؟

بۆ ئەم پرسـیارە، سـێ وەڵام هـەن:

<u>یەك</u>: یانی ئەگەر تۆ دەسـتپێشـخەری کوشـتنی من بی، مـن دەستپێشـخەری کوشـتنی تۆ نابم، بەڵام ئەوە مانای وانیـە کە من بەرگریـی لە خۆم ناکـەم.

<u>دوو</u>: ویسـتوویەتی ئامۆژگـاریی بکات کـە بیسـڵەمێنێتەوە لـە قـەتڵ، واتـە: تەنـانـەت ئەگـەر تـۆش بتـەوێ بمکـوژی، مـن تـۆ ناکـوژم، واتـە: کوشـتن هێنـدە شـتێکی خراپـە لـە بەرانبـەر کوشـتنی تۆشـدا مـن هـەوڵنادەم بتکـوژم، نـەك هـەر لـە سـەرەتاوە دەستپێشـخەریی بکـەم بۆ کوشـتن.

<u>سـێ</u>: کەسـێك بویسـترێ بکـوژرێ، دروسـتە خـۆی بـە دەسـتەوە بـدات، هەنـدێك وایانـگوتوە، وەك عوسمانی کوڕی عەففـان خـوا لـێی ڕازی بـێ، کەسـێك بزانـێ یـان دەبـێ بەرانبەرەکەی بکـوژێ، یـان ئـەو بکوژرێ، دروسـتە کـەس نەکـوژێ‌و خۆی بە کوشت بدات، عوسمان خوا لـێی ڕازی بێ وایکـردوە، کـە مـن ئـەوەم پـێ ڕاسـت نیـە، وە عوسـمان خەلیفـەی سـێیەم، خـوا لـێی ڕازی بـێ، بۆیـە

وایکرد، چونکە دەیزانی لە بەرگریی کردنو بەرهەڵستیی کردنەکەدا خوێنێکی زۆر دەڕژێو ئەویش هەر دەکوژرێ، لەبەرئەوە گوتوویەتی: با خوێن کەمتر بڕژێ، ئەگەرنا ئەگەر ئومێدی ئەوە بووایەو زانیبای هێزێکی وای بە دەورەوە هەیە کە دەتوانن ئەو ئاژاوەچییانە دوور بخەنەوەو، لە کۆڵی بکەنەوە، پێموانیە گوتبای: دەست مەکەنەوە، بەڵام زانیویەتی شەڕێکی بێ ئەنجامەو دواییش هەر دەیکوژنو، خەڵکێکیش دەکوژرێ، گوتوویەتی: با هەر من ببمە بەڵا گێڕەوەی ئەو خەڵکە.

کەواتە: قسەی ڕاست بۆ وەڵامی ئەو ئیشکالە ئەوەیە کە هابیل نەیگوتوە من بەرگریی لە خۆم ناکەم، بەڵکو گوتوویەتی دەستپێشخەری کوشتنت نابم، وە ئایەتەکەش ئاوا دەفەرموێ: ﴿ مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٖ يَدِيَ إِلَيۡكَ لِأَقۡتُلَكَ ﴾، ئیدی نەیگوتوە من هیچ ناکەمو بەرگریی لەخۆم ناکەمو لە کۆڵ خۆمت ناکەمەوە.

ئنجا ئایا چۆنی کوشتوە؟ دیسان توێژەروان زۆر شتیان گوتوە، لە پەیمانی کۆندا دەڵێ: خەوتبوو، غافڵ گیریی کردو لێی دەخەفتا، ئنجا کوشتی، ئایا بەردێکی بەسەری داداوە؟ لە تەفسیرەکاندا بە پێی خەیاڵی خۆیان چەند شتێکیان گوتوە، بەڵام لە قورئاندا درێژەکەی باس نەکراوەو، لە سوننەتیشدا نەهاتوە، گرنگ ئەوەیە دەبێ ئاگاداری خۆی نەبووبێ کە کوشتوویەتی، ئەگەرنا بەرەو ڕووی چووبایە کە بیکوژێ، لە کۆڵ خۆی دەکردەوەو خوای بەرزو مەزنیش شتێکی لەوبارەوە باس دەکرد، شەرێك، دەستەویەخەبوونێك، بەڵام دیارە ڕاست باسی کوشتنەکەی دەکات بۆیە وا پێدەچێ بە غافڵگیریی کردبێتی، یان لە کاتی خەوتندا بووبێ، ئنجا لەوبارەوە کە ئەگەر ئینسان بزانێت ئاژاوەو فیتنەیەو خەڵك کوشتنەو واباشە نەبێتە هۆکاری خوێن ڕێژیی ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ بُسْرِ بْنِ سَعِيدٍ أَنَّ سَعْدَ بْنَ أَبِي وَقَّاصٍ قَالَ: عِنْدَ فِتْنَةِ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ، أَشْهَدُ أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: (إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتْنَةٌ، الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْقَائِمِ، وَالْقَائِمُ خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي، وَالْمَاشِي خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي)، قَالَ: أَفَرَأَيْتَ إِنْ دَخَلَ عَلَيَّ بَيْتِي فَبَسَطَ يَدَهُ إِلَيَّ لِيَقْتُلَنِي؟ قَالَ: (كُنْ كَابْنِ آدَمَ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (١٦٠٩)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٢٥٦)، وَالتِّرمِذِيَّ بِرقم: (٢١٩٤) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَأَبُو يَعلَى بِرقم: (٧٥٠)، وَالحَاكِمُ بِرقم:

(٨٣٦٢) عَنْ سَعد بن مالكٍ، وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ مُسْلِم قال الشيخ الألباني: صحيح، انظر حديث رقم: (٢٤٣١) في صحيح الجامع}، واته: بوسری کوڕی سەعید لە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاصەوە خوا لێی ڕازی بێ دەگێڕێتەوە کە لە کاتی ئەو ئاژاوەیەی کە عوسمان تێیدا شەهید کرا خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی شایەدیی دەدەم کە پێغەبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: شەڕو کوشتارو ئاژاوەیەك دەبێ، دانیشتوو باشترە لە هەڵساو، هەڵساو باشترە لە ڕۆیشتوو، ڕۆیشتوو باشترە لەوەی کە بەپەلە دەڕوات، یاخود هەوڵی تێدا دەدات، (واتە: ئینسان خۆی لێ دوورە پەرێز بگرێ باشترە، دیارە سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص خوا لێی ڕازی بێ لە کاتی ئەو کێشەو شەڕەی نێوان عەلیو موعاویەشدا کە عەلی لەسەر هەق بووە، خوا لێی ڕازی بێ، وە موعاویە ناهەق بووە خوا عەفوی بکات، سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص هەر کەنارگیر بووە، دوورە پەرێز بووە هەرچەندە ئەگەر پشتی عەلی گرتبایە باشتر بوو، لە بەرانبەر موعاویەدا کە هەڵوێستەکەی هەڵە بوو، بەڵام بەهەرحاڵ وادیارە ئەو فەرمایشتە زۆر کاریگەریی لەسەری هەبووەو لەوێشدا هەر کەنارگیرو دوورەپەرێز بووە، ئنجا دەڵێ) یەکێك لە پێغەمبەری ﷺ پرسی: ئەگەر کەسێك لێم وەژوورکەوتو دەستی درێژ کرد کە بمکوژێ، هەڵوێستم چی بێ؟ فەرمووی: وەك کوڕەکەی ئادەم بە، (واتە: وەك کوڕە باشەکە، کوڕە صاڵحەکە کە گوتی: من ئامادەنیم بەرانبەرەکەم بکوژم، ئامادەنیم ئەوەی دەستم بۆ درێژ دەکات بیکوژم).

هەڵبەتە ئەوەش شوێنی خۆی هەیە، ئەویش لە کاتێکدا کە فەرمایشتەکە ڕاست بێ، ئەگەرنا ئەگەر بێو بیکەینە بنچینە، هەر کەسێ ویستی خەڵکی بکوژێ، هەموویان بڵێن: من وەك کوڕە باشەکەی ئادەم دەبمو تۆ ناکوژم، بێگومان ئەوە هاندانی خەڵکە لەسەر خەڵك کوشتنو خوێنڕێژییو لەسەر زوڵمو ستەم، بۆیە ئەم فەرموودەیە دەبێ شوێنی تایبەتی خۆی هەبێ، لە کاتێکدا کە دەزانێ وەك عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، ئەو دەستکردنەوەو بەرگریی لە خۆکردنە سوودێکی نیە، وە خوێنی زیاتر دەڕژێ، لەو کاتەدا شەریعەت ڕێگای داوە، کە تۆ دەستەوکەر نەکەیو بەرگریی لە خۆت نەکەی، تاکو خوێنی کەمتر بڕژێ، ئەو فەرمایشتە بۆ شوێنێکی وایە، نەك وەك بنچینەیەکی گشتی خەڵك بیەوێ یەکدی بکوژێ،

ئەوانیش بڵێن: با وەك كوڕە باشەكەی ئادەم بین، دەست نەكەینەوە، وە سەرەنجام ئەوانەی كە چاویان لە خوێنڕێژیی‌و زوڵم‌و ستەمە، ڕێیان بۆ تەخت بێ، وە ئەو خەڵكەیان وەك نێچیرێكی تووك نەرم بكەوێتە بەرپەل، كە دیارە هیچ دڕندەیەكیش لە نێچیری تووك نەرم‌و لە نێچیری ئاسان ناسڵەمێتەوە!!.

**مەسەلەی پێنجەم:** كە كوڕە باشەكەی ئادەم (هابیل) دەڵێ: ﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، من دەمەوێ گوناهی من‌و گوناهی خۆشت لەگەڵ خۆت بەریەوە (بۆ قیامەت بۆ لای خوا)، وە سەرەنجام ببی بە هاوەڵی دۆزەخ (یان خاوەنی دۆزەخ)، وە ئەوەش سزای ستەمكارانە.

دوو ئیشكال، یان دوو پرسیار لێرەدا هەن:

یەكەمیان: كە دەڵێ: ﴿ إِنِّيٓ أُرِيدُ أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ ﴾، چۆن دەبێ ئینسانی مسوڵمان پێی خۆش بێ‌و بیەوێ بەرانبەرەكەی گوناهبار ببێ، وە سەرەنجام بچێتە دۆزەخ؟

ئەم پرسیارە دوو وەڵامی هەن:

١- من ئەگەر هەر ناچاربم تۆ گوناهباربی، یان بۆخۆم، تۆ گوناهباربی بە كوشتنم، یان من گوناهباربم بە كوشتنت، دیارە یەكەمیان هەڵدەبژێرم، تۆ گوناهباربی، نەك من گوناهباربم، تۆ خوێنی منت بكەوێتە ئەستۆ، نەك من خوێنی تۆم بكەوێتە ئەستۆ.

٢- دەمەوێ تۆ سزای كوشتنمت بچێتە ئەستۆ، نەك سزای كوشتنی تۆ بچێتە ئەستۆی من.

دووەمیان: كە دەڵێ: ﴿بِإِثۡمِي وَإِثۡمِكَ ﴾، گوناهی من‌و گوناهی خۆت، گوناهی بەرانبەرەكەی كە ئەو دەكوژێ، دیارە، ئەدی گوناهی وی كە كوژراوە چییەو بۆچی دەچێتە ئەستۆی؟ زانایان سێ وەڵامیان داونەوە:

١) گوناهی کوشتنی منو گوناهی پێشووی خۆت، حەتمەن دیارە پێشتریش گوناهی بوو ون، کە ئێستا لەسەر ئەوەی قوربانییەکەی قبوول نەکراوە، ئامادەبێ برایەکی بکوژێ، دیارە گوناهی دیکەشی بوو ون، واتە: ئەو گوناهەمت بچێتە ئەستۆ، لەگەڵ گوناهەکانی پێشووی خۆشت.

٢) گوناهی کوشتنی منو گوناهی وەرنەگیرانی قوربانییەکەت، چونکە ئینسان شتێك بۆ خوا بکاتو خوا وەری نەگرێ، ماناى وایە گوناهبارە.

٣)- گوناهی کوشتنی من کە گوناهی خۆتە، وە گوناهەکانی من کە لە قیامەت هەڵدەدرێنە سەر گوناهەکانت، وەك لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: (أَتَدْرُونَ مَا الْمُفْلِسُ)؟ قَالُوا: الْمُفْلِسُ فِينَا مَنْ لاَ دِرْهَمَ لَهُ، وَلاَ مَتَاعَ، فَقَالَ: إِنَّ الْمُفْلِسَ مِنْ أُمَّتِي مَنْ يَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِصَلاَةٍ، وَصِيَامٍ، وَزَكَاةٍ، وَيَأْتِي قَدْ شَتَمَ هَذَا، وَقَذَفَ هَذَا، وَأَكَلَ مَالَ هَذَا، وَسَفَكَ دَمَ هَذَا، وَضَرَبَ هَذَا، فَيُعْطَى هَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، وَهَذَا مِنْ حَسَنَاتِهِ، فَإِنْ فَنِيَتْ حَسَنَاتُهُ، قَبْلَ أَنْ يُقْضَى مَا عَلَيْهِ أُخِذَ مِنْ خَطَايَاهُمْ فَطُرِحَتْ عَلَيْهِ، ثُمَّ طُرِحَ فِي النَّارِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٨٣٩٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٥٢٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٤١٨)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط) برقم: (٢٧٧٨)}، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ئایا دەزانن مایەپووچ، قەڵۆش، (ئەوەی کە هیچی بەدەستەوە نەماوە) کێیە؟ گوتیان: مایە پووچ لەلای ئێمە کەسێکە، نە زیوی هەبێ، (نە پارەو سامانی هەبێ)، وە نە کەلوپەلی هەبێ، فەرمووی: مایەپووچ لە ئۆممەتی من کەسێکە لە ڕۆژی قیامەت دێ: نوێژی پێیە، ڕۆژووی پێیە، زەکاتو صەدەقەی پێیە، بەلاّم دێت جنێوی بەو داوە، ماڵی ئەوی خواردوە، خوێنی ئەوی ڕشتوە، لەوی داوە، ئنجا لە چاکەکانی دەدرێ بەو خاوەن هەقانە تاکو کە هیچ چاکەی نەمان، ئنجا لە گوناهی خاوەن هەقەکان هەڵدەدرێتە سەر وی‌و بە گوناهەوە فڕێ دەدرێتە نێو دۆزەخ، (ئەوە موفلیسە) کەواتە: ئەو مانایەشی لێ وەردەگیرێ.

ئنجا لەوبارەوە ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەریش ﷺ هەیە کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا، فَالْقَاتِلُ وَالْمَقْتُولُ فِي النَّارِ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ هذَا

الْقَاتِلُ فَمَا بَالُ الْمَقْتُولِ؟ قَالَ: إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا عَلَى قَتْلِ صَاحِبِهِ﴾ {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: الْبُخَارِيُّ (٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧١٨١) عَنِ أَبُو بَكْرَةَ} واتە: هەر کاتێك دوو مسولْمان بە شمشێرەکانیان، (واتە: بە چەکەکانیان) پێکگەیشتن، بکوژو کوژراو هەردووکیان لە ئاگردان، (ڕاوی دەڵێ:) لێمپرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ! ئەوە بکوژ بکوژە، ئەدی کوژراو (بۆچی دەچێتە دۆزەخ)؟ فەرمووی: چونکە ئەویش سوور بووە لەسەر کوشتنی هاوەڵەکەی، (بەڵام یەکیان دەستی خۆی پێشخستوە، دەنا ئەوی دیکەش ویستوویەتی، هەمان تاوان بکات).

کەواتە لێرەدا کە دەفەرموێ: (إِذَا الْتَقَى الْمُسْلِمَانِ بِسَيْفَيْهِمَا) واتە: هەردووکیان دەیانەوێ یەکدی بکوژن بە ناهەق، کەواتە: ئەویان کە بکوژە، ئەوە هەم نیەتی هەبووە، هەم کردەوەی هەبووە، ئەوی دیکەیان کردەوەی نەبووە، بەڵام نیەتی هەبووە، (إِنَّهُ كَانَ حَرِيصًا) ئەویش سوور بووە، ئەگەر بۆی کرابا دەستی خۆی پێش دەخستو ئەوی دەکوشت.

کەواتە، کە هابیل گوتوویەتی: ﴿بِإِثْمِي وَإِثْمِكَ﴾، یانی گوناهی ئەوە کە ئەوی کوشتوە، وە گوناهی ئەوەش کە بەرانبەرەکەی نەیویستوە بیکوژێ، کەچی هەر کوشتوویشیەتی.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ قَتْلَ أَخِيهِ فَقَتَلَهُۥ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ﴾، نەفسی کوشتنی برایەکەی بۆ ئاسان کرد، بۆی جوان کردو هانیداو کوشتیو لە زیانباران بوو.

سێ هەڵوەستە لە بەرانبەر ئەم ڕستە قورئانییەدا دەکەین، کە پێشتریش ئاماژەیەکم پێدا:

١/ ڕیشەی هەموو خراپەو گوناهەکان لە دڵو دەرووندایە، بۆیە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الشمس)دا دەفەرموێ: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ۝٩ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ۝١٠﴾، واتە: سوێند بە نەفسو بەوەی کە ڕێکی خستوەو دروستی کردوە، خراپەکارییو پارێزکاریی فێرکردوە، بە تەئکید سەرفرازە کەسێك کە نەفسی

خۆی پاكو چاك كردوە، وە بەدبەختو پەشێمانە، ئەو كەسەی كە نەفسی خۆی بن گوناهان خستوە.

بەڕێزان !

لەڕاستیدا بناغەی چاك بوونی ئینسان لە دڵەوەیە، وە بناغەی خراپبوونیشی هەر لە دڵەوەیە، بۆیە خوا لە سوورەتی (الأنعام)یشدا دەفەرموێ: ﴿ وَذَرُوا۟ ظَـٰهِرَ ٱلْإِثْمِ وَبَاطِنَهُۥٓ ... ﴿١٢٠﴾ ﴾، واتە: واز لە گوناهی ئاشكراو گوناهی پەنهان بێنن، گوناهی پەنهان بێگومان ڕەگو ڕیشەی گوناهە ئاشكرایەكانیشە.

٢/ ئنجا وەك دەروونناسانیش دەڵێن: هەموو هەڵسوكەوتێك ڕیشەیەكی فیكریی هەیە، هەموو تەصەڕوفێك ڕیشەیەكی تەصەووری هەیە، وە ئەوە كە دەفەرموێ: ﴿ فَطَوَّعَتْ لَهُۥ نَفْسُهُۥ ﴾، ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە نەفسی بەشەر پلە پلە لەسەر چاكەو خراپە ڕادێو یەك تەكان نیە، هەروەك جەستەی بەشەریش هەر وایە، بۆ وێنە: كەسێك بیەوێ مەشقی كاراتە یان كۆنفۆ، یان جومناستیك بكات، یەك تەكان فێرنابێ، بەڵكو بە پلە پلە، نەفسیش هەروایە، وەك چۆن جەستە وردە وردە ڕادێ، نەفسی بەشەریش هەم بۆ چاكە، هەم بۆ خراپە، وردە وردە ڕادێ.

٣/ كە دەفەرموێ: ﴿ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾، هەندێكیان گوتوویانە مەبەست لە: ﴿ فَأَصْبَحَ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ ﴾، چونكە (أصبح) یانی: چووە نێو بەرەبەیانەوە، مانا ڕواڵەتییەكەی وایە، گوتوویانە: دیارە بە شەوێ كوشتوویەتیو ئەوە بەڵگەیە لەسەر شەوكوژكردنی قابیل بۆ هابیلو، كە ڕۆژ بۆتەوە بووە بە زیانبارو چۆتە ڕیزی زیانبارانەوە، ئێمەش دەڵێین: وانیە، چونكە لە زمانی عەرەبیدا (أصبح، بات) یانی: بوو، بەڵێ (بات) جاری وایە بۆ مانای شتێك كە لە شەوێدا دەكرێ، بەكاردێ، بەڵام لێرەدا ئەوەی لێ وەرناگیرێ، هەركام لە: (أصبح) وە (بات) بە مانای موتڵەقی بوونی شتێكیش دێن، وە مەرج نیە كە فەرموویەتی: (أصبح) لە ڕۆژێ دابێو كە گوتی: (بات) لە شەوێ دابێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابًا يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِ ﴾، خوا قەلەڕەشەیەکی نارد زەوی دەکۆڵی، تاکو پێشانیدا چۆن تەرمی برایەکەی بشارێتەوە.

لێرەدا چەند شتێك ڕوون دەکەینەوە:

١) خوا لە ڕێگای باڵندەو زیندەوەرو ژیاندارانەوە، مرۆڤی فێری زۆر شت کردوە، ئەمە ئاماژەیە بەو ڕاستییە، وە لە زۆر بواری جۆراو جۆری زانستو تەکنۆلۆژیادا بەشەر بە لاساییکردنەوەی باڵندەو ئاژەڵو پەڕەوورو زیندەوەران، زۆر شت فێربووە، ئەم ئایەتە ئاماژەیە بەوە کە ئەی بەشەر! دەتوانن لە ئاژەڵو پەڕەورو باڵندەو دڕندەو، هەتا لە زیندەوەرانیشەوە، فێری زۆر شت ببن.

٢) بۆچی خوا لێرەدا باسی قەلەڕەشەی کردوە، یاخود بۆچی قەلەڕەشە ئەو ئەرکەی پێ سپێردراوە؟ من زۆر تەماشای تەفسیرەکانم کردوە، هەر یەکە شتێکیان باس کردوە، بەڵام پێموایە دەتوانین بڵێین: سێ هۆکار هەن کە قەلەڕەشە ئەو ڕۆڵەی پێ سپێردراوە:

أ- قەلەڕەشە باڵندەیەکی نزمو پەستە لە چاو زۆربەی باڵندەکانی دیکەدا، کۆتر ڕەمزی ئاشتییەو شتێکی جوانە، طاووس مەلێکی جوانە، قازو مراوی باڵندەیەکی جوانو گەورەن، بەڵام قەلەڕەشە هەم نابووتە، هەم نزمو پەستە، لەچاو باڵندەکانی دیکە.

ب- قەلەڕەشە نیشانەو هێمای نەگبەتییو شەئامەتە، دەگوترێ: (فلان کەس دەڵێی قەلەڕەشەیە، لە هەر شوێنێك بخوێنێ کاولی دەکات).

ج- قەلەڕەش عادەتی وایە شت دەشارێتەوە، ڕەنگە باڵندەی دیکەش هەبن، بەڵام قەلەڕەش بەوە زۆر مەشهوورە، پارچە گۆشتێك، شتێکی دەستکەوێ عەرزی هەڵدەکۆڵێو تێی دەخات، لەبن گڵدا دەیشارێتەوە.

٣) ئنجا دەربارەی چۆنیەتی فێرکردنی قەلەڕەشە بۆ قابیل: توێژەرەوان گوتوویانە: خوا دوو قەلەڕەشی ناردوونو بەشەڕ هاتوون، یەکیان ئەوی دیکەی

کوشتوەو بکوژەکە، قەلەڕەشە کوژراوەکەی لەبن گڵ خستوە، ئێمەش دەڵێین دەگونجێ ئەوە وابێ، بەڵام هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە، قەلەڕەشەش ئاشکرایە کە عادەتی وایە شت لەبن گڵ دەخاتو دەیشارێتەوە، ئنجا کە دەفەرموێ:

﴿ لِيُرِيَهُۥ ﴾، بۆئەوەی پێشانی بدا، دەگونجێ ڕاناوەکەی بگەڕێتەوە بۆ خوا، یانی: (لِيُرِيَهُ اللّٰه) بۆئەوەی خوا پێشانی بداو بە هۆی قەلەڕەشەوە فێری بکات چۆن تەرمو جەنازە دەشاردرێتەوە، یاخود ڕاناوەکەی بگەڕێتەوە بۆ (غراب) واتە: (لِيُرِيَه الغُرابُ) بۆئەوەی قەلەڕەشەکە فێری بکات، واتە: قەلەڕەشەکە ببێتە مامۆستای، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ كَيْفَ يُوَٰرِى سَوْءَةَ أَخِيهِ ﴾، چۆن تەرمی برایەکەی خۆی بشارێتەوە، ﴿ سَوْءَةَ ﴾، لێرەدا یانی: خراپە، وە لە ئەسڵی زماندا ﴿ سَوْءَةَ ﴾، بە مانای خراپەیە، کە لێرەدا دەگونجێ بە مانای عەورەت بێ، لەبەرئەوەی ئینسان پێی خراپە عەورەتی دەرکەوێ، عەورەتیش بەمانای کەلێنو عەیبوعار دێ، لە ئەسڵدا، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ بُيُوتَنَا عَوْرَةٌ ﴿١٣﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: بێگومان ماڵەکانمان بەدەرەوەن و خاڵیین، وە بە مانای کەلێنو بۆشاییش دێ، وە بە مانای جەنازەش دێ، هەروەها جەنازەش بۆیە ناویان لێناوە ﴿ سَوْءَةَ ﴾، چونکە کەسێك کە عەورەتی دەرکەوێ، پێی ناخۆشەو نارەحەت دەبێ، هەروەها جەنازەش کە دەرکەوێ، ئینسان پێی ناخۆشە کە تەماشای جەنازەیەك بکات، یاخود تەماشای جەنازەی بکرێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەشتەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە سێ ئایەت پێكهاتوە، كە ئایەتەكانی (٣٢و ٣٣و ٣٤)ن و لەو سێ ئایەتەدا خوای كاربەجێ ڕایدەگەیەنێ، كە لە سۆنگەی ئەوەوە كوشتنی بە ناهەق مایەی زیانباریی و پەشیمانیی یە لە قیامەت و دنیادا، لەسەر گەلی بەنی ئیسرائیلمان نووسیوە كە هەر كەسێك یەكێك بە ناهەق بكوژێ، وەك تێكڕای خەڵكی كوشتبێ وایە، هەروەها بە پێچەوانەشەوە: هەر كەسێك ببێتە مایەی مانەوەی كەسێك، وەك تێكڕای خەڵكیی دەرباز كردبێ وایە.

پاشان خوای پەروەردگار باسی چۆنیەتی سزادانی ئەوانە دەكات كە پەشێویی و ئاڵۆزیی بڵاودەكەنەوەو، ئارامیی خەڵكی تێكدەدەن و، چوار جۆر سزایان بۆ دادەنێ بەگوێرەی تاوانەكەیان، وێڕای سزاو ڕیسوایی قیامەت.

ئنجا ئەوانە لەو حوكمی سزادانە هەڵدەوێرێ، كە بەرلەوەی بكەونە بەر پەل، دەگەڕێنەوەو دەست لە خراپەكاریی هەڵدەگرن.

﴿ مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ
أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ
أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۚ وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم بَعۡدَ
ذَٰلِكَ فِي ٱلۡأَرۡضِ لَمُسۡرِفُونَ (٣٢) إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ
وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ
وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ
وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ (٣٣) إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ
عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ (٣٤) ﴾

# مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((لە سـۆنگەی ئـەوەوە، لەسـەر وەچـەی ئیسـرائیلمان پێویسـت کـرد، کـە هـەر کەسـێك بەبێ کوشتنی کەسێك (لە تۆڵـە)دا یـان کـە خراپەکـاربـێ لـە زەویـدا، کەسـێك بکـوژێ، وەك ئەوە وایە تێکـڕای خەڵـکی کوشـتبـێ، وە هـەر کەسـێکیش یەکـێـك زیندووبکـاتەوە (لە مردن دەربـازی بکـات) وەك ئـەوە وایـە تێکـڕای خەڵکـی ژیاندبێتـەوە، وە بێگومـان پێغـەمبەرانمانیان بـە بەڵـگە ڕۆشـنەکانەوە هاتنـەلا، پاشـان زۆریـان دوای ئـەوەش زێدەڕۆییکـەر بـوون (دەسـتدرێژکار بـوون) لـە زەویـدا ﴿٣٢﴾ بێگومـان سـزای ئەوانـەی دژایـەتیی خـواو پێغەمبەرەکـەی دەکـەن‌و، هـەوڵـی خراپـەو ئاشـووبکاریی دەدەن لـە زەویـدا، تـەنیا ئەوەیـە کـە: بکـوژرێن، یـان هەڵبواسـرێن، یـان دەسـتو پێیـان بـە پێچەوانەوە (دەستی ڕاسـتو پێی چـەپ) ببـڕێن، یـان لـە زەویـدا دووربخـرێنەوە، ئـەو (سـزایە)ە لـە دنیـادا بۆیـان مایـەی سـەرشـۆڕییەو، لـە دواڕۆژیشـدا ئازارێکی مـەزنیان هەیـە ﴿٣٣﴾ بێجگـە لەوانەی گەڕاونـەوە بەرلـەوەی تواناتـان بەسـەریاندا بشـکـێ، ئـەوە بزانن کـە خـوا (لە بارەیانەوە) لێبوردەی بە بەزەیـی یە ﴿٣٤﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ ): (الأَجل: الجناية الّتي يُخاَفُ مِنْهَا آجلاً، مِن أَجْل أَي مِن جرَّاء، وَقُرِئَ مِن إجل: أي مِن جِنَايَة)، (أجل) تاوانێكە كە بۆ داهاتوو مایەی مەترسییە، وە خوێنراوەتەوە: (مِن إِجْل) یانی: لەبەر تاوانی.

(لَمُسۡرِفُونَ ): (والسَّرَفُ: تَجَاوُزُ الحدِّ فِي كُلِّ فِعْلٍ يَفْعَلُهُ الإِنْسَانُ)، (سَرف) بریتییە لە لەسنوور دەرچوونی ئینسان لە هەر کردەوەیەکدا کە دەیکات.

(مِّنۡ خِلَٰفٍ ): (الإِخْتِلاَفُ وَالمُخَالَفَةُ: أَنْ يَأْخُذ كُلُّ وَاحِد طَرِيقاً غَير طَرِيق الآخَر فِي حَالِه أَو قوله، مِنْ خلافٍ، أي إِحداهما من جانب والأُخرى من جانب آخر)، (من خلاف) واتە: پێچەوانە، كە مەبەست پێی راستو چەپە، واتە: دەستی راستو پێی چەپ، (إختلاف)و (مخالفة)ش ئەوەیە كە دوو كەس یان زیاتر هەر كامیان لە قسە یان کردەوەدا ڕێیەكی جیاوازو پێچەوانەی ئەوی دیكە، یان ئەوانی دیكە بگرێ.

(يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ ): (نَفى الشَّيءَ: يَنْفِيهِ نَفياً: نَحَّاهُ وَأَبعَدَهُ، أَخْرَجَهُ وطرده)، (يُنْفَوا) دووربخرێتەوە، (نَفي) بە دوورخستنەوەو دەركردنو وەدەرنان دەگوترێ.

(خِزۡيٌ ): {خَزِيَ الرَّجُلُ: لَحِقَهُ انْكِسَارٌ، إمَّا مِنْ نَفْسِهِ وَإِمَّا مِنْ غَيرِهِ، فَالَّذِي يَلْحَقُهُ مِنْ نَفْسِهِ هُوَ الحَيَاءُ المُفْرِط وَمَصْدَرُهُ الخَزَايَة وَرَجُلٌ خَزْيَان وامْرَأَةٌ خَزيَاء، وَجَمْعُهُ خَزَايا، وَفِي حَدِيث مُسلم: (مَرْحَبَاً بِالوَفْدِ غَيْرَ خَزَايَا وَلا النَّدَامى)، وَالَّذِي يَلْحَقُهُ مِنْ غَيْرِه، يُقَالُ: هُوَ ضَرْبٌ مِنَ الإستِخْفَافِ، وَمَصْدَرُهُ: الخِزْيُ وَرَجُلٌ خَزِ...، وَأَخزَى مِنَ الخزاية والخِزْي...} وشەی (خِزْي) لە زمانی عەرەبیدا، لە كوردیی دا یانی: بەخۆدا شكانەوەو شەرمەزاربوون، ئنجا ئەگەر مرۆڤ لە خودی خۆیدا تووشی بێ، ئەوە شەرمكردنو تەریق بوونەوەیە، بەڵام ئەگەر بە هۆكارێكی دەرەكیی بێ، ئەوە شەرمەزارییو ڕیسواییو زەبوونیی پێدەگوترێ.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

هۆی هاتنە خوارەوی ئـەو ئایـەتەی کـە دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿٣٣﴾ ﴾، ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ أَنَّ قَوْمًا مِنْ عُكْلٍ أَوْ عُرَيْنَةَ قَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَاجْتَوُوا الْمَدِينَةَ، فَأَمَرَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ بِلِقَاحٍ وَأَمَرَهُمْ أَنْ يَشْرَبُوا مِنْ أَلبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا، فَانْطَلَقُوا فَلَمَّا صَحُّوا، قَتَلُوا رَاعِيَ رَسُولِ اللّهِ ﷺ وَاسْتَاقُوا النَّعَمَ، فَبَلَغَ رَسُولَ اللهِ ﷺ خَبَرُهُمْ مِنْ أَوَّلِ النَّهَارِ فَأَرسَلَ فِي آثَارِهِمْ فَمَا ارْتَفَعَ النَّهَارُ، حَتَّى جِيءَ بِهِمْ فَأَمَرَ بِهِمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَقُطِّعَتْ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُمْ وَسُمِرَتْ أَعْيُنُهُمْ وَأُلْقُوا فِي الْحَرَّةِ يَسْتَسْقُونَ فَلَا يُسْقَوْنَ..، وفي رواية: فَبَعَثَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فِي طَلَبِهِمْ قَافَةً فَأُتِيَ بِهِمْ، قَالَ: فَأَنْزَلَ اللهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى فِي ذَلِكَ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا ﴾، وفي رواية لمسلم عَنْ أَنَسٍ، قَالَ: إِنَّمَا سَمَلَ النَّبِيُّ ﷺ أَعْيُنَ أُولَئِكَ، لأَنَّهُمْ سَمَلُوا أَعْيُنَ الرِّعَاءِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٢٣٣)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٤٣٣٠)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٣٦٤)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٤٠٣٦)}، واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك دەڵێ: کۆمەڵێك لە هۆزی (عوکل) یان (عورەینە) هاتنە لای پێغەمبەری خوا ﷺ (دیارە مسوڵمان بوو ون) بەڵام ئاوو هەوای مەدینەیان پێ نەکەوتو نەخۆش کەوتن، پێغەمبەری خواش فەرمانی کرد هەندێك حوشتری شیردەری وێدان کە لە شیرو میزیان بخۆنەوە، (وەك چارەسەر)، ئنجا ڕۆیشتن و کاتێك چاکبوونەوە، شوانی پێغەمبەری خوا ﷺ یان کوشت و حوشترەکانیشیان بردن، ئنجا کە هەواڵەکەیان بەرەبەیان بە پێغەمبەری خوا ﷺ گەیشت بە شوێنی دا ناردن و بەر لە نیوەڕۆ هێنایانن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد دەست و لاقیان بڕین و چاویان دەرهێنران و لە (حەڕڕە) فڕێدران و هەرچەندە داوای ئاویان دەکرد پێیان نەدرا...

وە لـە ڕیوایەتێكی دیكـەدا:

پێغەمبەری خوا ﷺ شـوێن پێ هەڵگری بە دوایاندا نـارد، هێنـران، وە خـوای بـەرزو پایەدار لەوبارەوە ئـەوەی نـاردە خـوار: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا ﴾.

وە لە ڕیوایەتێكی (مسـلم)دا: ئەنەس گێڕاویەتیـەوە گوتوویـەتی: بۆیـە پێغەمبـەر چاوی ئەوانەی كوڵێـوەو دەرهێنـاوە، چونكە ئەوانیش چاوی شـوانەكانیان دەرهێنـاوە.

تێبینـی:

دیـارە ئـەو جـۆرە سـزادانە تونـدترین سـزا بـووە، حیكمەتەكەشـی پرینگـاندنەوەو سـڵەماندنەوەی خـەڵـكی ڕێگـرو فیڵـباز بـووە، كـە تەمـاع لـە ئیسـلامو مسـولمانان نەكـەنو چاكەكارییو دڵسـافییو لێبـوردەیی مسـوڵمانان، بـۆ خراپـەكاریی نەقۆزنـەوەو بـزانن ئیسـلام لـە كـاتو شـوێنی خۆیـدا تۆڵـەو زەبریشـی هەیـەو، تەنیـا خـاوەنی بەخشـینو صـەبر نیـە!

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

دوای ئـەوەی لـە ئایەتـەکانی پێشـــوودا خـوای کـاربەجێ بەسـەرهاتی دوو کوڕەکـەی ئادەمی گێڕایەوە کە پوختەکەی بریتیە لـە کوژرانی هابیل لەلایەن قابیلـی برایـــەوە بـەبێ هـیچ بەڵـگەو پاساوێکی ڕاسـتو ڕەوا، لێـرەدا خوای زانـاو شـارەزا سـزای قورسی کوشتنی بە ناهەقی کردۆتە زادەو دەرەنجامی ئەو تاوانە زلەو فەرموویەتی: ﴿ مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ﴾، واتــە: لــە ســۆنگەی ئــەوەوە لەســەر وەچــەی ئیسرائیلمان نووسی کە هەر کەسێك کەسێك بکوژێ، بێئەوەی کەسێکی کوشـتبێ، یـان خراپەکاریی لە زەویـدا کردبێ، وەك ئەوە وایـە کە تێکـڕای خەڵکی کوشـتبێ..

ئنجا دیـارە مادام تـاوانی کوشتنی بە ناهەق خوای دادگەر ئـاوای تەماشا بکات، دیارە سـزایەکەشـی لەقــەدەر خۆی دەبــێ لە دنیـاو دوارۆژدا.

پاشان باسـی پێچەوانەی کوشـتنی بـە ناهــەق دەکات، کە بریتیــە لـە دەربـازکردنی مرۆڤێك لـە مـەرگ: ﴿ وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۚ ﴾، وە هـەر کەســێکیش کەســێك زینــدوو بکاتــەوە "لــە مــردن دەربــازی بکــات" وەك ئــەوە وایــە تێکـڕای خەڵـکی سـەر زەوی ژیـاندبێتــەوە.

پاشان خوای کاربەجێ باسی ڕەوانەکردنی پێغەمبـەرانی خـۆی‌و لاملیـی‌و سـەرپێچی‌و سنوورشـکێنی زۆربـەی خەڵـکی دەکـات: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡأَرۡضِ لَمُسۡرِفُونَ ﴾، وە پێغـەمبەرانی ئێمـە بـە بەڵــگە ئاشــکرایەکانەوە هاتنــە لایــان، کەچــی دوای ئــەوەش زۆرێکــیان هــەر سنوورشـکێن‌و زێدەڕۆییکەر بوون لە زەویـدا.

ئنجـا لـە ئایـەتی دواتـردا خـوای بـەرزو مـەزن دێتـە سـەر خسـتنە ڕووی سـزای کەسـانێك کـە ڕێگریـی‌و چـەتەیی لـە دەشـتو دەر، یـان هەڵکوتانـە سـەر مـاڵان لـە

ئاوەدانییەکاندا دەکەنە پیشەو، هێمنیی و ئاساییشی کۆمەڵگاو خەڵکی گوندو شارەکان تێکدەدەن و لە ژێر ناوونیشانی: ﴿ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ﴾دا، دەیانناسێنێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ۚ ذَٰلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَهُمْ فِي ٱلْآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، واتە: بێگومان سزای کەسانێك کە دژایەتی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و هەوڵی ئاژاوەگێڕیی دەدەن لە زەویدا، ئەوەیە کە بکوژرێن، یان هەڵبواسرێن، یان دەستو لاقیان پێچەوانە ببڕرێن، یان لە زەوی دووربخرێنەوە، ئا ئەوە ڕیسواکردنیانە لە دنیاداو، لە دوارۆژیشدا سزاو ئازارێکی مەزنیان هەیە.

دیارە ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا بە وردیی باسی چۆنیەتی جێبەجێکردنی ئەو چوار جۆرە سزایە دەکەین، کە بە گوێرەی جۆرو چۆنیەتیەکانی تاوانی تێکدانی ئاساییشی هێمنیی خەڵکی دەگۆڕێن، پاشان لە ئایەتی سێیەم دا خوای کاربەجێ باسی حاڵەتی پەشێمانبوونەوەو دەستهەڵگرتنی ئەو تاوانبارانە دەکات لە تاوانی ڕێگریی و هەڵکوتانە سەر ماڵو حاڵی خەڵك، بڵاوکردنەوەی ترس و بیم و پەشێویی و ئاڵۆزیی، وە ڕایدەگەیەنێ کە خوای بە بەزەیی و لێبوردە لەو حاڵەتەدا لەگەڵیان لێبوردەیەو میهرەبانە، کە ئەمە ئاماژەشە بەوەی پێویستە مسوڵمانانیش، "واتە: حکوومەتەکەیان" لەگەڵیان لێبوردەو بە مەرحەمەت بێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْ ۖ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، واتە: جگە لەوانەی کە دەگەڕێنەوەو دەستهەڵدەگرن بەرلەوەی دەستەڵاتتان بەسەریاندا بشکێ، ئەوە بزانن کە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە.

کەواتە:

ئەو چوار جۆرە سزایەی کە باسکران، دەبێ بەسەر هەموو ئەو تاوانبارانەدا بسەپێنرێن، کە تاوانی گۆڕین ئەنجام دەدەن، جگە لەو کەسانەی کە بە ئارەزوو و

ویستی ئازادانەی خۆیان پەشێمان دەبنەوەو، دەست لە تاوانەکەیان هەڵدەگرن، ئەوانە حوکمیان جیاوازە.

ئنجا ئایا بە نسبەت هەموو جۆرە خراپەکانیانەوە، کە بەر لە تەسلیم بوونو ژیوان بوونەوەیان ئەنجامیان داون، بەر لێبوردنو بەخشران دەکەون، یان تەنیا بەشێکیان؟!

ئەو وردەکارییو ڕاجیایی زانایانی تێدایەو، لە مەسەلە گرنگەکاندا ڕوونی دەکەینەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ أَنَّهُۥ مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا﴾، ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ﴾ ئێمە لە کوردیدا دەڵێین: لەبەرئەوە، لە سۆنگەی ئەوەوە، یان لەپێناوی ئەوەدا، واتە: لە سۆنگەی ئەوەوە کە ڕابردو تێپەڕی، لە دوو توێی ئەو بەسەرهاتەی دوو کوڕەکەی ئادەمدا (قابیلو هابیل)، کە کوشتنی بە ناهەق دەبێتە هۆی زیانبارێی بکوژ لە دوارۆژدا، وە دەبێتە هۆی پەشیمانبوونەوەی لە دنیادا، لەسەر وەچەی ئیسرائیلمان نووسیو پێویستمان کرد (كَتَبۡنَا) یانی: (أَوۡجَبۡنَا، فَرَضۡنا) لەبەرئەوەی عادەت وایە یاسایەك کە دادەنرێو بڕیارێك کە دەردەچێ، دەنووسرێ، خوا ﷻ دەفەرموێ: لەسەرمان نووسین، کە هەر کەسێك کەسێك بە ناهەق بکوژێ (بِغَيۡرِ نَفۡسٍ) یانی: بەبێئەوەی کە کەسێکی کوشتبێ، (أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ) یان بێئەوەی کە ئاشووبو خراپەکاریی لە زەویدا بەرپا کردبێ، وەك ئەوە وایە، هەموو خەڵکی سەر زەوی کوشتبێ، وە بە پێچەوانەشەوە، ﴿وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا﴾، هەر کەسێك یەك نەفس دەرباز بکات لە مەرگو بیژیەنێتەوە، کە لێرەدا مەبەست لە ژیاندنەوە، واتە: لە مردن دەربازی بکات، ئەگەرنا ئەگەر کەسێك بمرێ، بە کەس زیندوو نابێتەوە، بە خوا نەبێ، وە سوننەتی خواش ﷻ وانەبووە کە لە دنیادا خەڵك زیندوو بکاتەوە، بەڵکو لە ڕۆژی دواییدا زیندوویان دەکاتەوە، بەڵام ئایا لێرەدا مەبەست لە: ﴿وَمَنۡ أَحۡيَاهَا﴾، چییە؟ واتە: دەربازی بکات لە مەرگو مەترسی مەرگی لێدووربخاتەوە، وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی سەر زەوی لە مەرگ دەرباز کردبێو ژیانی بۆ گێڕابنەوە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرمویّ: ﴿ كَتَبْنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴾، لێرەدا پرسیارێك دەكرێ: ئایا بۆچی خوا ﷻ لێرەدا بەتایبەت باسی بەنی ئیسرائیل دەكات؟ كە بە تەئكید مەسەلەی تۆڵە تایبەت نەبووە بە بەنی ئیسرائیلەوە، بەڵكو هەموو شەریعەتەكانی خوا تۆڵەیان تێدا بووە؟

لەبەرئەوەی عەقڵی سەلیم و فیطرەتی ساغ خوازیاری ئەوەن، كە كەسێك كەسێك بەناهەق بكوژێ، یان ئاشووب و خراپەكاریی لە زەویدا بكات، دەبێ بكوژرێ، وە ناشگونجێ شەریعەتەكانی خوای دادگەر لەوەدا ناكۆكییان بووبێ، ئەدی بۆچی هەر باسی بەنی ئیسرائیل دەكرێ؟ هەندێك لە توێژەرەوان گوتوویانە: لەبەرئەوەی كە بەنی ئیسرائیل یەكەمین ئۆممەت و كۆمەڵگا بوون، كە قەوارەیەكیان دروست كردوە لەسەر بناغەی ئایین، كە بێگومان ئەوە ڕاست نیەو ئۆممەت و كۆمەڵگای دیكەش لەو جۆرە بوو ون.

بەڵام من پێموایە هۆكارەكە ئەوەیە كە بەنی ئیسرائیل (واتە: جوولەكەكان) نوێترین و تازەترین ئەزموونی سیاسی دینیی بوون بەنسبەت ئۆممەتی ئیسلامەوە، كە بۆ ئێمە تۆمار كرابێ، وە بەسەرهات و ڕووداو و هەڵسوكەوتەكانیان لە مێژوودا نزیك بێ و دیار بێ، بۆیە خوای كاربەجێ باسی ئەوان دەكات، ئەگەرنا واپێدەچێ ئەوە یاسایەكی گشتی پەروەردگار بووبێ لە هەموو بەرنامە ئاسمانییەكاندا كە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هێناویانن.

**مەسەلەی سێیەم:** كە دەفەرمویّ: ﴿ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾، لێرەدا تێبینی دەكرێ، كە خوای دادگەر دوو هۆكار دێنێتەوە بۆ كوشتنی خەڵك، یان بۆ كوشتنەوەی خەڵك و تۆڵە لێسەندنەوەیان:

١/ دەفەرمویّ: ﴿ مَن قَتَلَ نَفْسًۢا بِغَيْرِ نَفْسٍ ﴾، واتە: كەسێك كەسێك بكوژێ، بێئەوەی كەسێكی كوشتبێ، یانی: كەسێك كەسێك بە ناهەق بكوژێ، دروستە بكوژرێتەوە، بەڵام قەتڵی بە ناهەق، وەك خوا دەفەرمویّ: ﴿ ... وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۚ ذَٰلِكُمْ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿١٥١﴾ ﴾

الأنعـام، واتە: ئەو نەفسەی کە خوا قەدەغەی کردوە بکوژرێ، بە ناهەق مەیکـوژن، کوشـتنی بە هـەق ئەوەیە کە نەفسـێکی کوشتبـێ، ئەوە هۆکـاری یەکـەم.

٢/ دەفەرموێ: ﴿أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ﴾، یان خراپەکـاریی لە زەویـدا، واتـە: هـی یەکەمیـان مافێکـی تایبەتـە، کەسـێك بەتایبـەت کەسـێکی کوشـتبێ، تۆڵـەی دەکەوێتـە سەر، ئەویدیکەیان مافێکی گشـتییە، ئەو مافە گشـتییە دەبـێ دیـاربێ، سەروسـیمای دیاربـێ، چوارچـێوەی دیاربـێ، ئەگـەرنا هـەر کەسـێك ڕاست بـۆوەو بیـانوو بگـرێو بڵێ: تۆ خراپەکارییت لە زەویدا کردووە دەتکـوژم، ئـەوە نـابێ، ئەدی چۆن دەزانین؟ لە ئایەتی دواییـدا خوای زاناو شارەزا باسی ئـەو خراپـەکاریی (فسـاد)ە دەکات، وە تەعبـیری ﴿وَيَسْعَوْنَ فِي ٱلْأَرْضِ فَسَادًا﴾، بـەکارهێناوە، کە بریتیە لە ڕێگریی‌و هەڕەشە کردن لە خەڵك، لە ژیانیـان، لە ماڵ‌و سـامانیان، لە کەرامەتیـان، لە هێمنیی‌و ئاسـایشیان، هەرکەسـێك ئەوە بکات ئەوە بە شێوەی گشـتیی تۆڵـە ڕووی تێدەکـات، ئـەویش لەبەرئـەوەی مـافێکی گشـتییە، کـە دیـارە ئـەوەش وردەکاریی زۆری هەیـەو، لە هـەموو حاڵەتداو هەموو کەسێك کە فەسـاد دەکات لە زەویـدا، ناکـوژرێ، چونکـە خراپەکاریی‌و ئاشـووب نانەوەش لە زەویـدا جۆراوجۆرە، بۆیـە خـوای پـەروەردگار چـەند سزایەکی جۆراو جـۆری بـۆ دانـاوە، وەك دوایی باسـی دەکـەین.

**مەسـەلەی چـوارەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾، واتـە: کوشـتنی بەناهـەق، وەك ئـەوە وایـە هـەموو خەڵـکی سـەر زەوی کوشـتبـێ، وە بـە نسـبەت دەربازکردنیشـی لـە مـەرگ، دەفـەرموێ: ﴿فَكَأَنَّمَآ أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا﴾، وەك ئەوە وایـە هەموو خـەڵکی سەر زەوی زینـدوو کردبێتـەوە، یاخـود ژیانی بۆ گێڕابنـەوە.

دیـارە لێـرەدا پرسـیارو ئیشـکالێك دێتـە پێشـەوەو، توێـژەرەوانی قورئـان لەوبارەیەوە زۆرر شتیان گوتـوە: هەنـدێك گوتوویانـە: ئـاخر ئەگـەر کەسێك کەسێك بکوژێ، ئـەوە تـەنیا کەسێکی کوشـتوەو جیایـە لـەوەی دووان، یـان سێیان بکـوژێ، وە جیـایە لـەوەی هـەموو خـەڵـکی سـەر زەوی بکـوژێ! ئـەدی بۆچـی لێـرەدا

دەفەرموێ: ﴿ مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي ٱلْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾، هەروەها بە پێچەوانەوەش ﴿ وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾؟!

١) هەندێکیان گوتوویانە: لەبەرئەوەی حورمەتی ئینسانەکان وەك یەکە، حورمەتی خوێنو نەفسیان وەك یەکە، چ ئەمیان بکوژیو چ ئەویان بکوژی، چ یەکێکیان بکوژی، چ دووانیان بکوژی، چ زیاتر هەر وەك یەکەو لەو ڕووەوە کە دەستدرێژیی کراوەتە سەر حورمەتی نەفسێكو نەفسێك کوژراوە، کە نەدەبوو بکوژرێ.

٢) هەندێکی دیکە گوتوویانە: کەسێك دەستی بچێتە خوێنی کەسێكو بە ناهەق بیکوژێ، دەستی دەچێتە دووانو سیانو چوارانیش... هتد.

٣) هەندێکیش گوتوویانە: بۆ ئەو کەسەی کە دەکوژرێو بۆ کەسوکارەکەی، وەك ئەوە وایە کە هەموو خەڵکی سەر زەوی کوژرابێ، کە بۆخۆی لە دنیادا نەما، وەك ئەوە وایە دنیا کاول بووبێ، وەك گوتراوە: (مَنْ مَاتَ فَقَدْ قَامَتْ قِيَامَتُهُ) واتە: هەر کەسێك مرد، تازە قیامەتی وی هاتوە، کە ئەو لە دنیادا نەما جیاوازیی چییە لەگەڵ ئەوەدا کە دنیا تێکبچێ؟ وەك یەکە، هەروەها بەنسبەت کەسوکاریشی هەروایە، کە کەسێکیان لێ دەکوژرێ، وەك ئەوە وایە هەموو دنیایان بەسەردا کاول بووبێ.

بەنسبەت ژیاندنەوەشی، یان دەربازکردنی لە مەرگیش بە هەمان شێوە، کەسێك کەسێك دەرباز بکات، لەو ڕووەوە کە نەفسێکی بە حورمەتی ڕێزلێنراوی دەرباز کردوە لە مەرگ، وەك ئەوە وایە خەڵکی سەر زەوی دەرباز کردبێ، وە کەسێك نەهێڵێ کەسێك بکوژرێ، ئەگەر دەستی بڕوا ناهێڵێ هیچ کەس بکوژرێ، وە کەسێك کە لە مەرگ دەرباز دەبێ، وەك ئەوە وایە هەموو خەڵکی سەر زەوی دەربازبووبێ، بۆخۆی یان بۆ کەسوکاری، هەرسێکیان پاساوی جوانن، بەڵام گرنگ ئەوەیە خوای زاناو شارەزا بە (ك) کافی وێکچوواندن (تشبيه) هێناویەتی، ﴿ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعًا ﴾، هەروەها بە پێچەوانەوەش

﴿ فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا ﴾، واتە: نافەرمویَ: کتومت وایە، دەفەرمویَ: وەك ئەوە وایە.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدۡ جَآءَتۡهُمۡ رُسُلُنَا بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡأَرۡضِ لَمُسۡرِفُونَ ﴾، واتە: بێگومان ڕەوانەکراوانی ئێمە، پێغەمبەرانی ئێمە بە بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە، هاتنە لایان، هاتنە لای کێ؟ مەبەست پێی بەنی ئیسرائیلە، چونکە سیاقەکە باسی ئەوان دەکات، فەرمووی: ﴿ مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ ﴾، کەواتە: مەبەستیش لەو پێغەمبەرانە (علیهم الصلاة والسلام) کێن؟ ئەوەی بۆ ئێمە چەسپاو بێ، یەعقووب و یوسف و برایەکانی ئەوانەی کە پێغەمبەر بوون، پاشان داوود و سولەیمان، ئنجا مووسا، دوایی زەکەریاو یەحیاو عیسا (علیهم الصلاة والسلام)، بەلام لە پەیمانی کۆندا باسی ژمارەیەکی دیکەش دەکات و، چەند ناوێکی دیکە دێنێ، دەڵێ ئەوانیش هەر پێغەمبەر بوون، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: پێغەمبەرانی ئێمە بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە هاتنە لایان، ﴿ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ فِي ٱلۡأَرۡضِ لَمُسۡرِفُونَ ﴾، کەچی دوای ئەوەش زۆریان هەر زێدەڕۆیی کەرو هەر سنوورشکێن و هەر تێپەڕێنەر بوون، واتە: دوای ئەوە کە پێغەمبەران هاتن (علیهم الصلاة والسلام) بە بەرنامەی خواوەو، بە بەڵگە ڕوون و ئاشکرایەکانەوە، وا چاوەڕوان دەکرا پابەندبن، وە سنوورشکێنیی نەکەن و لە خەت دەرنەچن، بەلام بە داخەوە وا نەبوون.

هەڵبەتە لێرەدا جێی سەرنجە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم بَعۡدَ ذَٰلِكَ ﴾، واتە: زۆرێکیان، نافەرموێ: هەموویان، بۆچی؟ چونکە دیارە هەمیشە قورئان کە (كَلاَمُ الله)یە خۆی لە گشتاندن (تعميم) بە دوور دەگرێ، چ بۆ بە چاك دانان، چ بۆ بە خراپ دانان، بۆچی؟ چونکە بە زۆریی گشتاندن لە هەست و سۆزەوە سەرچاوە دەگرێ، نەك لە عەقڵ و مەنتیق و زانیاریی و

حیکمەتەوە، دیارە خوای پەروەردگاریش بە زانیاریی‌و حیکمەتی بێسنووری خۆی فەرمایشت دەفەرموێ، وەك ئێمە نیە جارجار عاطیفەو تووڕەیی‌و خۆشویستن بەسەریدا زاڵ بێ، بۆیە ئەگەر تەماشای قورئان بکەین شتی عاطیفی تێدانیە، شتی وای تێدانیە لەگەڵ عەقڵ‌و زانست‌و واقیع دا نەیەتەوە، هەستی پێ بکەی بڵێی ئەوە شتێکی عاطیفییە، چونکە قورئان فەرمایشتی خوایە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئێمە حەوت هەڵوەستەی گرنگ لەبەردەم ئەم ئایەتە موبارەکەدا دەکەین، کە توێژەرەوانی قورئان زۆر قسەیان لەسەر کردوە، وە مشتومڕی زۆریان لە بەرانبەریدا بووە، بەڵام من لە حەوت کورتە خاڵدا باسی ئەم ئایەتە موبارەکە دەکەم:

# حەوت کورتە خاڵ لەبارەی ئایەتی

## ﴿ ... إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا ... ﴾ەوە:

**یەکەم: هۆی هاتنە خواری ئەم ئایەتە:** ئێمە پێشتریش لە باسی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکاندا باسمان کرد، بەسەرهاتێکمان هێنا لەبارەی ڕووداوی سزادانی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەو حەوت کەسەی کە سێیان لە (عُكْل) وە چواریشیان لە (عُرَينة) بوون، گوتمان ئەو ئایەتە موبارەکە لەوبارەوە هاتۆتە خوار، لێرەشدا ڕیوایەتێکی دیکەی بوخاریی دێنینەوە: ﴿عَنْ أَنَس بْن مَالِكٍ، قَالَ: قَدِمَ عَلَى النَّبيّ نَفَرٌ مِنْ عُكْلٍ وَعُرَيْنَةَ فَأَسْلَموا، ثُمَّ أَتَوا رَسُولَ اللهِ ﷺ

فَقَالُوا: قَدِ اسوخَمْنَا هَذِهِ الأَرْض، فَقَالَ لَهُم: هَذِهِ نَعَمٌ لَنَا فَاخْرُجُوا فيهَا فاشْربوا أَلْبَانهَا، وأَبْوَالـهَا، فَخَرجُوا فيهَا فشربوا مِنْ أَبْوَالِهَا وَأَلْبَانِهَا وَاسْتَصَحُّوا، فَمَالُوا عَلَى الرَّاعي فَقَتَلُوهُ وَاطَّردوا الذَّوْدَ وارتَدّوا، فَبَعَثَ رَسُولِ اللهِ ﷺ جرير بن عَبد الله في آثَارِهِمْ في خيل فَأَدْرَكَهُمْ وَقَدْ أَشْرفوا عَلَى بلادهم، فَمَا ترجَّل النَّهَارُ حَتى جيء بهم، فَأَمَرَ بِهِم فقطعت أَيديهُم وأَرجُلَهُم وَسُمِلَتْ أعيُنهم بمساميرَ أُحميت ثُمَّ حَبسهم حَتَّى مَاتُوا﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٦١٠)}، واتە: ئەنەس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کۆمەڵێك نەفەر، {لە زەمانی عەرەبیدا، واتە: لە نێوان (٣ تا ٩)، وە لە گێڕانەوەی دیکەدا دەڵێ: حەوت کەس بوون}، (سێیان) لە عوکلو (چواریان لە) لە عورەینە بوون، (کە دوو تیرە بوون) هاتن مسوڵمان بوون، (واتە: بە ڕواڵەت وایان پێشاندا کە مسوڵمان بوون)، دوایی هاتنە لای پێغەمبەر ﷺ (واش پێدەچێ ماوەیەك لە مەدینە مابنەوە) گوتیان: ئاوو هەوای ئێرەمان پێناکەوێ، نەخۆشبووین (دیارە خەڵکی بیابان بوون، ئاوو هەوای شاری مەدینەیان پێنەکەوتوە) پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەوە چەند حوشترێکی ئێمەن لەگەڵ حوشترەکان بڕۆنە دەرێ، (واتە: شوانیشیان لەگەڵ دایە)، وە لە شیری حوشترەکان بخۆنەوە، لە میزیشیان بخۆنەوە (وەك چارەسەرو دەرمان بۆ ئەوەی کە چاك ببنەوە)، ئەوانیش لەگەڵ حوشترەکان چوونە دەرەوەو لە شیرو میزی حوشترەکانیان خواردەوە، ئنجا دوای ئەوەی تەندروستییان بۆ گەڕایەوە، یەکسەر شوانەکەیان کوشتو حوشترەکانیشان بە پێش خۆیانداو هەڵگەڕانەوە (لە ئیسلام) پێغەمبەریش ﷺ جەریری کوڕی عەبدوڵڵای بەدوادا ناردن، لەگەڵ چەند سوارێکدا، لە کاتێکدا کە نزیکی شوێنی خۆیان بوون، پێیان گەیشتن، خۆر نەگەیشتبووە نێوەڕاستی ڕۆژ، کە هێنایانن، پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کرد، دەستو لاقیان بڕین، وە بە شیشەی ئاسنی کە سوور کرابوو چاویشیان کوێر کرا، دوایی لەو گۆڕە فڕێ دران تاکو مردن، لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، دەڵێ: داوای ئاویان کرد، ئاویشیان نەدرایە تاکو مردن، ئەوە هۆی هاتنە خوارەوەی بوو، کە ئێمە بێگومان دوایی وردەکاریی زیاتر باس دەکەین لەوبارەوە.

دووەم: ڕوونکردنەوەی چەمكو واتای چەند وشەیەك: بە پێویستی دەزانم چەند وشەیەك لەو ئایەتە موبارەکەدا ڕوون بکەینەوە:

١- ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾: مانا ڕواڵەتییەکەی: ئەوانەی جەنگ لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی دا دەکەن، بەڵام مەبەست پێی ئەوەیە: (يُحَارِبُونَ الله وَأَحْكَامَهُ وَيَعتدُونَ عَلَى حكم الرَّسُول وَسُلطَانِهِ)، واتە: دژایەتی بەرنامەو یاساکانی خوا دەکەن، وە دەستدرێژیی دەکەنە سەر حوکمڕانێتی پێغەمبەر ﷺو لە ژێر دەستەڵاتی سیاسی ئەودا شوانەکەی دەکوژنو حوشترەکانیان پێش خۆیان دەدەن، کەواتە: مەبەست لە: ﴿ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، ئەوەیە.

٢- ﴿ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ﴾: واتە: (يَكتَسِبُونَ فَسَاداً ويجتنونهُ)، واتە: خراپەکاریی وەدەست دێننو ئەنجامی دەدەن، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْـَٔاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا ... ﴿١٩﴾ ﴾ الإسراء، واتە: هەر کەسێك دوارۆژی بوێو کۆششی بۆ بکات، (سَعي) یانی: کۆشش کردنو هەوڵدان، یاخود دەگوترێ: (فُلَانٌ سَعى لأَهلِهِ أي: اكتسب لهم) فلاّن کەس هەوڵدەدا بۆ ماڵو منداڵەکەیو کەسابەتیان بۆ دەکات.

٣- ﴿ فَسَادًا ﴾، (الفَسَاد: إتلاف النَّفْسِ وَالأَمْوَال)، (فَسَاد) واتە: فەوتاندنی نەفسەکانو ماڵو سامان، یان دەست بەسەرداگرتنی.

٤- ﴿ يُقَتَّلُوٓاْ ﴾، واتە: بکوژرێن، کە ئەم شێوازە دەربڕینە، مانای زێدەڕۆییکردنە لە کوشتنیاندا، واتە: باش بکوژرێن.

٥- ﴿ يُصَلَّبُوٓاْ ﴾، لە ئەسڵدا (يُصْلَبوا)ە، بەڵام لە عەرەبییدا بنچینەیەك هەیە دەڵێ: (إذا شُدِّدَ الفعل قوي معناه) ئەگەر کردار گیرەدار کرا، ماناکەشی بەهێز دەبێ، یان دەڵێ: زیادەی پێکهاتە (مَبْنى) نیشانەی زیادەی مانایە،

(يُصْلَبوا) واتە: هەڵبواسرێن، (يُصَلَّبُوا) واتـە: زۆر هەڵبواسـرێن، کـە دەگونجـێ مەبەسـت پێی بە مردوویی هەڵبواسرێن، یاخود بە زینـدوویـی.

٦- ﴿ مِّنْ خِلَٰفٍ ﴾، ئێمـە بـە کوردیـی دەڵـێین: ڕاسـتو چـەپ، (أي تُقْطَـعَ مختلفةً بأن تقطعَ يدهم اليُمنى ورجُلُهُم اليُسرى)، واتـە: بـە جیا بـبڕدرێن، دەستی ڕاسـتییان بـبڕدرێ، لەگـەڵ پێـی چەپیـان.

٧- ﴿ يُنفَوْا ﴾، واتـە: (يُبْعَدوا)، (النَفيُ: الإبعادُ) دوورخـسـتنەوە، (الإبعـادُ مِن المَكان الذي هُوَ وَطَنُهُ لأن النَّفي معنـاهُ عَدَم الوجـود)، وشـەی: (نَفي) واتـە: نـەبوون، وە (يُنفَـوْا) یـانی: لـەو شـوێنە نەهێڵـدرێنو دووربخرێنـەوە بـۆ شـوێنێکی دیکـە.

ئەبو حەنیفەش (نَفي) بە سجن لێکداوەتەوە، بەڵام ڕایەکەی بێهـێزە.

سـێیەم: ئەو ئایەتـە چ حوکمێکـی لێوەردەگـیرێ؟

(مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (التحرير والتنوير)[1] دەڵێ: (وَعَلَى هَذَا يَكُونُ نزولُهَا نَسخاً لِلحَدّ الذِي أقَامَهُ النَّبِيُّ ﷺ سَوَاءٌ كَانَ عَن وَحِي أَمْ عَن اجْتِهَادٍ مِنْهُ، لأَنَّهُ لمّا اجْتَهَدَ وَلَم يُغَيِّرهُ اللهُ عَلَيْهِ قَبْلَ وقُوعِ العَمَلِ بِهِ فَقَدْ تَقَـرَّرَ بِـهِ الشَّرْعُ، وَإِنَّمَا أذِنَ اللهُ لَهُ بِذَلِكَ العِقَابِ الشَّدِيدِ لأَنَّهُم أَرَادوا أَنْ يَكُونُوا قُدوَةً لِلْمُشْرِكِينَ فِي التَحيُّلِ بإظْهَارِ الإسْلاَمَ للتوصُّلِ إلَى الكَيْدِ لِلْمُسْلِمِين، وَلأَنَّهُمْ جَمَعُوا فِي فعلِهِم جِنَايَاتٍ كَثِيرَةٍ)، چەند قسەیەك دەکـات، دوایی دەڵـێ: بە پێی ئەوە کە ڕابرد، هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتـە نەسـخ کەرەوەیە بۆ ئەو سزایەی کـە پێغەمبـەر ﷺ بەسـەر ئـەو چـەند نەفـەرەی داسـەپاند، جا چ ئـەو سـزایە وەحـی خـوا بووبـێ، یـاخود پێغەمبـەر ﷺ کۆششـی کردبـێو بـە عەقڵی خۆی وایدانابـێ، (کە پێغەمبـەر ﷺ بـۆ هەنـدێك مەسـەلە ئیجتیهادیشـی کردوە)، چونکە دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ بەو شـێوەیە سـزای ئەوانـەی داوە، دوایی خوا نەیگۆڕیوە، پـێش ئـەوەی کـاری پێبکـات، لـەوەوە بۆمـان دەرکـەوتوە کـە

١) ج٣، ص١٨٠.

بۆتە شتێکی شەرعیی، وە بۆیە خوا مۆڵەتی داوە بەو سزا توندە ئەوانە سزا بدات، چونکە ئەوانە ویستوویانە ببنە پێشەنگ بۆ ئەو هاوبەشدانەرانە، کە فێڵ بکەن، (کڵاو لەسەری مسوڵمانان بنێن)، خۆیان بە مسوڵمان پێشان بدەن (هەتا لە بن باڵی ئیسلامەتیی داو خۆ بە مسوڵمان پێشاندان بێن فێڵ لە مسوڵمانان بکەن و زەبریان لێبدەن)، وە لەبەر ئەوەشە کە ئەوانە کۆمەڵێك گوناهیان کۆکردووەتەوە، (لە بەرانبەر چاکەی پێغەمبەردا ﷺ خراپەیان کردووەو شوانەکەیان کوشتووە، حوشترەکانیشیان بردووەو لە ئیسلامیش هەڵگەڕاونەوە، بۆیە بەو شێوە توندە سزای داون).

هەروەها هەر (مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) دوایی هەر لەوبارەوە گوتوویەتی: (وَأَيًّا مّا كَانَ سَبَب النزول فَإِنَّ الآية تَقْتَضِي وجُوب عِقَابِ الْمُحَارِبين بِمَا ذَكَر الله فِيهَا، لأَنَّ الحَصْرَ يُفِيدُ تَأْكِيد النسبة)[1]، واتە: هۆی هاتنە خوارەوەی هەرچی بووبێ (چونکە هەندێك گوتوویانە: مەبەست لەو ئایەتانە ئەو کەسانەیە کە هەڵدەگەڕێنەوە، وە هەندێك گوتوویانە: نا، مەبەست ئەو مسوڵمانانەیە کە خراپەکاریی دەکەن و ئاشووبو ئاژاوە دەگێڕن) ئایەتەکە ئەوە دەخوازێ کە پێویستە ئەوانەی دژایەتیی خواو پێغەمبەری خوا دەکەن و ئاشووبو ئاژاوە بڵاودەکەنەوە، بەو شێوەیە سزا بدرێن، واتە: بەو شێوەیەی کە لە ئایەتەکەدا هاتوە، مانای وایە ئەوەی پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی، چ وەحی بووبێ، چ ئیجتیهاد بووبێ، ئەوە ئەو جۆرە سزادانە نەماوەو نەسخ کراوەتەوە.

چوارەم: ئایا ئەو ئایەتە لەبارەی کێوە هاتوە؟

زانایان زۆر قسەیان لەوبارەوە کردوە، بەڵام بەگشتی دوو ڕایان هەن:

١)- هەندێك دەڵێن: دەربارەی کەسانێك هاتۆتە خوار، کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە.

٢)- زۆربەیان دەڵێن: دەربارەی ڕێگران، - کە لە کتێبە فیقهییەکاندا دەڵێن: (قطاع الطرق) - هاتۆتە خوار، دیارە هەرکام لە (الآلوسي) لە (روح المعاني)[2]، وە

---

١) تفسير التحرير والتنوير: ج٣، ص١٨١.

٢) ج٣، ص٤٠٦

(القرطبي) لە (الجامع لأحكام القران)دا[1]، وە زۆر لە توێژەرەوانی دیکەی قورئانیش[2] دەڵێن: مەبەست پێی مسوڵمانانی ڕێگرە، مسوڵمانانێك کە خراپەکاریی و ئاشووب دەگێڕن و لە حوکمی شەریعەت لادەدەن، نەك کەسانێك کە لە ئیسلام هەڵدەگەڕێنەوە.

منیش پێمولیە ڕای دووەم کە ڕای زۆرینەیە، ڕاستە، واتە: مەبەست پێی مسوڵمانانێکی لاڕێ و لاسارو ئاشووبگێڕە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوای پەروەردگار لە ئایەتی دوای ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُواْ عَلَيْهِمْۖ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣٤﴾ ﴾، واتە: جگە لەوانەی تۆبەیان کرد، پێش ئەوەی تواناتان بەسەریاندا بشکێ، بزانن کە خوا لێبوردەی بە بەزەییە، دیارە لێبوردن و بەزەیی خواش تایبەتە بە مسوڵمانانەوە، واتە: خوا ﷻ ئەو سیفەتانەی خۆی بۆ ئەهلی ئیمان بەکاردێنێ، هەروەها وشەی تۆبە بە زۆری بۆ گوناهباران بەکاردێ، مسوڵمانانێك کە گوناح دەکەن و دوایی دەگەڕێنەوە، ئنجا (الآلوسي) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا دەڵێ: (وَإِنَّمَا المُرَاد مُحَارَبة المُسْلِمِينَ إِلاَّ أَنَّهُ جَعَلَ مُحَارَبَتِهِم مُحَارَبَةِ اللهِ عَزَّ وَجَلَّ وَرَسُولِهِ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم تَعْظِيمًا لَهُ وَتَرْفِيعًا لِشَأْنِهِم)[3]، واتە: مەبەست لە دژایەتیکردنی خواو پێغەمبەرەکەی، جەنگ لەگەڵ کردنی مسوڵمانان و ئاشووب گێڕیی یە لە نێوان مسوڵماناندا، بەڵام ڕێگریی کردن لە مسوڵمانانی، وەك جەنگ کردن لەگەڵ خواو پێغەمبەری خوای ﷺ تەماشا کردوە، بۆ بە گەورە دانانی پێغەمبەر ﷺ و بەرزکردنەوەی شکۆو پایەی مسوڵمانان، کە هەر کەسێك دژایەتی مسوڵمانان بکات، وەك دژایەتی خوای پەروەردگاری کردبێ وایە.

١) ج٢، ص١٣٢.

٢) وەك (عبدالرحمن بن ناصر السّعدي)، بڕوانە: (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنّان)، ص: ٢٣٠.

وە (ابن كثير)، بڕوانە : (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص: ٣٧٣.

وە (الشيخ حسنين محمد مخلوف)، بڕوانە: (صفوة البيان لمعاني القرآن)، ص :١٤٩.

وە (حسن الترابي)، بڕوانە (التفسير التوحيدي)، ج ١، ص ٥٠٣).

٣) هەمان سەرچاوەو بەرگو لاپەڕە.

هەروەها (مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] لەوبارەوە دەڵێ: (وَمِنْ أَجْلِ ذَلِكَ اعتَبره العُلَمَاءُ جَزَاءً لِمَنْ يَأْتِي هَذِهِ الجَرِيمَة مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَلِهَذَا لَمْ يَجْعَله الله جَزَاءً لِلْكُفَّارِ الَّذِينَ حَارِبُوا الرَّسُولَ لأَجلِ عِنَادِ الدِّين، فَلِهَذَا الْمَعْنَى عُدِّيَ (يُحَارِبُونَ) إلى (اللهِ وَرَسُولِهِ) لِيَظْهَرَ أَنَّهُمْ لَمْ يَقصُدوا حَرْبَ معيَّنٍ مِنَ النَّاسِ ولا حَربَ صَفٍّ)، واتە: بۆیە زانایان ئەو سزایەی لەو ئایەتەدا هاتوە، بە سزای کەسێکیان داناوە، کە ئەو تاوانە دەکات لە مسوڵمانان، بۆیەش خوا ﷻ ئەو سزایەی بۆ کافرانێک دانەناوە کە دژایەتی دینی خوا دەکەن، {واتە: لە هیچ ئایەتێکدا نیە خوا بفەرموێ: ئەگەر کافرەکانتان گرتن: هەڵیانبواسن، یان دەستو پێیان ببڕن، سزای وامان نیە بۆ کافران} وە وشەی: (يُحَارِبُونَ) تەعەددی پێکراوە بۆ لای خواو پێغەمبەری خوا، تاکو بزانرێ کە مەبەستیان دژایەتیکردنی کەسێکی دیاریکراو، یان کۆمەڵە کەسێکی دیاریکراو نیە، (بەڵکو مەبەستیان دژایەتیکردنی مسوڵمانانە بەگشتی، وە تێکدانی هێمنییو ئاسایشیانە بەگشتی).

پێنجەم: ئایا مەبەست لە (مُحَارَبَة) چییە؟

کە دەفەرموێ: ﴿ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ ﴾، دیسان (مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (التحرير والتنوير)[2] هەندێك قسەی جوان دەکات، دەڵێ: (وَقَدِ اخْتَلَفَ العُلَمَاءُ فِي حَقِيقَةِ الحِرَابَة؛ فَقَالَ مَالِك: هِيَ حَمَلُ السِّلاَحِ عَلَى النَّاسِ لأَخْذِ أَمْوَالِهِم دُونَ نَائِرةٍ ولا دَخَلٍ ولا عَدَاوَةٍ أي بَيْنَ المُحَارِبِ وَبَيْنَ المُحَارَب، سَوَاءٌ فِي البَادِيَة أَوْ فِي المِصْر، وَأن يَكونوا جَمَاعَة المُسلمين، وَقَالَ بِهِ الشَّافِعِيّ وَأَبُو ثَور، وَالأوزَاعي، والليث، وإبْن سَعد، وَقِيلَ: لايكُون المُحَارِبُ فِي المِصرِ مُحَارِبًا، وَهُوَ قَولُ أَبِي حَنِيفَة وَسُفيان الثَوري وَإِسْحَاق)، واتە: زانایان ڕاجیایی یان هەیە دەربارەی وشەی: (حِرَابَة) مالیك دەڵێ: هەر کەسێك چەك هەڵبگرێ لە دژی خەڵك، بۆئەوەی ماڵو سامانیان زەوت

---

١) التحرير والتنوير: ج٣، ص١٨٢.

٢) ج٣، ص١٨٢.

بکاتو لێیان بستێنێ، بۆئەوەی کێشەو ئاژاوە هەبێو دوژمنایەتیی هەبێ لە نێوان ئەو کەسەدا کە چەکەکەی هەڵگرتووەو ڕێگریی دەکاتو، ئەو کەسەدا کە ڕێگریی لێکراوە، ئەوە چ لە بیابانو چ لە چۆڵاییی بێ، چ لە نێو شار بێ، مادام ئەوانە کۆمەڵێك لە مسوڵمانان بنو چەکداریش بن، ئەوە پێی دەگوترێ (حِرَابَة)، وە ئەوانە بە (مُحَارِب) لە قەڵەم دەدرێن، وە ئەو ڕایە ڕای شافیعییو ئەبوو ثەورو ئەوزاعییو لەیثی کوڕی سەعدە، بەڵام ئەبو حەنیفەو سوفیانی ثەوریو ئیسحاق دەڵێن: (حِرَابَة) لە چۆڵایی دا دەبێ، بەڵام لە نێو شاردا نابێ.

کەواتە: هەر کەسێك لەنێو شارو ئاوەدانیی دا بەو کارە هەڵسێ، ئەو پێناسەیە نایگرێتەوەو ئەو جۆرە سزایەشی بەسەردا ناچەسپێنرێ، ئنجا ئایا ئەو ڕاجیایی یە سەر بۆچی دەکێشێ؟ ئەگەر بڵێین: هەر کەسێك هەڵیکوتایە سەر خەڵك، چ لە دەشتو چۆڵایی، چ لە نێو شارو ئاوەدانیی دا، بۆئەوەی ماڵیان لێ بستێنێ، یان دەستدرێژیی بکاتە سەر نەفسیانو نامووسیانو بیانترسێنێ، ئەگەر بڵێین: (حِرَابَة) هەمووی دەگرێتەوە، کەواتە: لە شاربێ یان لە چۆڵایی دا، دەبێ ئەو سزایەی بەسەردا بچەسپێ، بەڵام ئەگەر بڵێین: وەك ئەبو حەنیفەو ئەوانی دیکە دەڵێن: تەنیا ئەو کەسانەی کە لە دەشتو چۆڵایی دا ئەوە دەکەن، دەگرێتەوە، مانای وایە ئەگەر لە شاردا کرا، ئەو سزایە نایانگرێتەوە.

منیش کە زۆر تەماشای بەڵگەی هەموویانم کرد، ڕایەکەی (مالیكو شافیعییو ئەبوو ثەورو ئەوزاعییو لەیثی کوڕی سەعد)م پێ ڕاستە، بۆچی؟ چونکە خوا ﷻ دیاری نەکردووە، هەر دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا ﴾، ئەوانەی جەنگ دەکەن لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەی، وە لە زەویدا خراپەکاریی بڵاودەکەنەوە، هەوڵدەدەن بۆ خراپەکاریی لە زەویدا، ئیدی نەیفەرمووە ئەو زەوییە زەوییەکی چۆڵ، یان ئاوەدان بێ، لە شار بێ، یان لە بیابان، ئنجا مادام خوا ﷻ بەگشتی فەرموویەتی، ئەوە شارو گوندو ئاوەدانییو چۆڵایی دەگرێتەوە.

شەشەم: ئەو چوار سزایە چۆن جێ بەجێ دەكرێن؟ كە دەفەرموێ: ﴿ أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، وشەی: (أو) لە كوردیدا واتە: (یان)، واتە: یان بكوژرێن، یان هەڵبواسرێن، یان دەستی ڕاستو پێی چەپیان ببڕدرێن، یان دووربخرێنەوە، ئنجا ئایا ئەو (یان)ە، بۆ دابەشكردن (توزيع و تقسيم)ە، یاخود بۆ سەرپشك كردنە؟ لێرەشدا دوو ڕا هەن:

١- هەندێك دەڵێن: بۆ سەرپشك كردنە، واتە: دەسەڵاتی شەرعی بۆی هەیەو، سەرپشكە یەكێك لەو چوار سزایە هەڵبژێرێو، بەسەر ئەو كەسانەدا بیچەسپێنێ كە هەڵدەستن بە ئاشووبو هەرا نانەوە لە نێو خەڵكداو، دەستدرێژیی كردنە سەر نەفسو ماڵو ناموسو هێمنییو ئاسایشییان.

٢- هەندێكیش دەڵێن: بۆ دابەشكردن، (توزيع و تقسيم)ە.

بەڵام ڕای دووەم بەهێزترە، كە زۆربەی زانایان ڕایان وایە، چونكە خوا ﷻ چوار حاڵەتی باسكردوون:

١- ﴿ أَن يُقَتَّلُوٓاْ ﴾، یان بكوژرێن.

٢- ﴿ أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ ﴾، یان هەڵبواسرێن.

٣- ﴿ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ ﴾، یان دەستی ڕاستو پێی چەپیان ببڕدرێن.

٤- ﴿ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ ﴾، یان دووربخرێنەوە.

كەواتە: خوا چوار سزای باسكردوون، بۆچی؟ چونكە چوار حاڵەت مەزەندە دەكرێن، بۆ ئەو كەسانەی كە ڕێگریی دەكەن، وە هێمنییو ئاسایشی خەڵك تێكدەدەن:

أ/ یان خەڵك دەكوژن‌و ماڵیشیان لێ دەستێنن، كە سزایان ئەوەیە دەكوژرێن‌و هەڵدەواسرێن.

ب/ یاخود هەر خەڵك دەكوژن، بەڵام ماڵەكەیان نابەن، ئەوە تەنیا دەكوژرێن.

ج/ یاخود تەنیا ماڵ دەبەن، ئەوە دەست‌و پێی ڕاست‌و چەپیان دەبڕدرێ.

د/ یاخود تەنیا خەڵك دەترسێنن، ئەوانەش دووردەخرێنەوە، كەواتە: خوا ﷻ چوار جۆرە سزای داناون، بۆ چوار حاڵەت لە ڕێگریی‌و دەستدرێژییكردنە سەر هێمنیی‌و ئاساییشی خەڵك، كە بە پێی هەر كام لەو ستەم‌و تاوانانە، جۆرێك لەو سزایانە دیاریی دەكرێ، وە ئەو ڕایەش تەئكیدی لەسەر دەكەم كە هەر ئەو ڕاستە، بۆچی؟ بۆئەوەی هەر حوكمڕانێك ڕاست بۆوە نەیەت كەسێك وتارێك بدات، یان قسەیەك بكات بڵێ: ئەوە ئەو ئایەتە: ﴿ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا ﴾، دەیگرێتەوە، جا بێنێ قورسترین سزای بۆ دابنێ! بڵێ: بە دەقی قورئان هەموو جۆرە سزایەكان‌و هەر چواریانم بۆ هەیە بەسەریدا بسەپێنم! بەڵێ لەڕاستییدا ئەو ڕایە ڕاستە كە دەڵێ وشەی: (أو) خوا بۆ دابەشكردن (توزيع‌و تقسيم) هێناویەتی، وە ئێمە ئەگەر تەماشای قورئان بكەین دەبینین خوای كاربەجێ وشەی (أو)ی زیاتر بۆ دابەشكردن بەكارهێناوە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (المائدة)دا دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡ ... ﴿٨٩﴾ ﴾ المائدة، واتە: خوا سوێندی سەرزارەكییتان لێناگرێ، بەڵكو لەسەر ئەو سوێندانە كە دڵیان لەسەر گرێ دەدەن، لێپرسینەوەتان لەگەڵدا دەكات، ئنجا ئەو جۆرە سوێندە دڵ لەسەر چەسپێنراوانە كەفارەتی هەركامێكیان خواردن پێدانی دە نەدارە، لە خواردنێكی میانجیی كە دەرخواردی خێزانتانی دەدەن، یان پۆشاكیان، یان ئازادكردنی گەردن (ی

کۆیلــە)ێك، هــەر کەســێك هیــچ کـام لــەوانەی چنــگ نەکــەوت، ســێ ڕۆژ ڕۆژووگرتنــی لەســەرە، ئــەوە کــەفارەتی ســوێندەکانتانە، هــەر کـات ســوێندتان خـوارد، وە ســوێندەکانتان بپــارێزن، ئاوا خوا ئایەتەکانیتـان بۆ ڕوون دەکـاتەوە بەڵکو سوپاسـگوزاریی بکـەن (بۆ خـوا).

وەك دەبینین، دەفەرموێ: یـان ئـەوە، یـان ئـەوە، یان ئـەوە، ئنجـا ئەگـەر یـەکێك لەوانەت نەتوانی، سێ ڕۆژان بەڕۆژوو دەبی، ئنجا زانـایـان لەوبارەوەش دەڵێن: ئەو کەسـەش تا ئەوەی یەکـەمی پێ بکرێ، نـابـێ هــی دووەم بکــات، وە تــا دووەمـی پـێ بکــرێ نابــێ هـی ســێیەم بکـات، بـەڵام هەندێکــی دیکـە لـە زانایــان دەڵـێن: هەرکامیـان بکات سەرپشکەو بۆی هەیە.

بەڵام ئەوەی مەبەستمە بیڵـێم ئەوەیــە کـە لە قورئــاندا تاکە تاوانێــك چوار جـۆرە سزای بۆ دانــرابێ، یان چــەند ســزایەکی بۆ دانــرابـێ، ئــەم تـاوانەیــە، وە ئـەم تـاوانــەش یـەك حاڵـەت بـە خـۆوە ناگــرێ، وەك کوشـتن، یـان دزیـی، چـونکە دەگونجێ بابای ڕێگر بەس خەڵـك بترسێنـێ، وە دەگونجـێ بیانترسێنێو سامانیان لــێ بســتێنــێ، وە دەگونجــێ وێــڕای مـاڵ لــێستاندن بشیانکــوژێ؟ نــەخێر، وە دەشگونجـێ تەنیا بیانکوژێ، کەواتە: بەپێی حاڵەتەکـە سـزایەکە دیاری دەکـرێ.

حەوتــەم: ئەو چوار سـزایە لەنێـوان مافـی گشتـی و تایبــەتی دا:

زۆربەی زانـایــان لەســەر ئــەوە یەکدەنگــن کــە ئــەو ســزایەی دانـراوە تەنیــا بـۆ پاراستنی مافی تاکە کەس نیـە، بەڵـکو بۆ پاراسـتنی مافی گشــتییە، بۆیـە ئەگــەر یەکێك لەو تاکانە کـە دەســتدرێژیی کراوەتــە ســەر مـاڵو سـامانی، لـە هەقەکــەی خۆی خۆشبوو، ئایا کابرای خراپەکار سزایەکەی لەسـەر لادەچـێ؟ نەخێــر، بۆچـی؟ چونکە ئەوە مافی گشـتییە، مافی خوایــە، با ئەو تاکـەش لە مافی خـۆی خۆشــبێ، چونکـە ئەوە وەك کوشـتنی بە ئانقەسـت (القتل العمد) نیە کە ئەگـەر کابرا لە هــەقی تۆڵـە (قصاص) خۆشبوو، یان خوێنی وەرگرت، یان عـەفووی کـردو هیچی نەویســت، ســزایەکەی لەســەر لادەچـێ، بــەڵام لێـرەدا ئـەو مافــە گشـتییە، بۆیــە هەرچـەندە تاکـەکان چاوپۆشـیی لـە هـەقی خۆشـیان بکـەن، تاوانبـار نابــووردرێو سـزایەکەی لەسـەر لانـاچـێ.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴾، ئەوە سەرشۆڕیی‌و شەرمەزارییە بۆیان لە دنیادا، وە لە دواڕۆژیشدا سزایەکی مەزنیان بۆ هەیە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خوای دادگەر ئەو جۆرە کەسانە ئەگەر تۆبە نەکەن‌و پەشیمان نەبنەوە، لێیان خۆشنابێ، وەك لە ئایەتی دواییدا هاتوە، دەفەرموێ: بەلام ئەگەر تۆبە بکەن‌و پەشیمان ببنەوە خوا لێیان خۆشدەبێ، لەوبارەوە ئەم دەقەش هەیە، دوای ئەوەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ پەیمانی لە هاوەلانی بەرێز وەرگرت لە عەقەبەی دووەم دا، ئنجا فەرمووی: ﴿فَمَنْ وَفَّى مِنْكُمْ فَأَجْرُهُ عَلَى اللهِ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَعُوقِبَ بِهِ، فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ، وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَسَتَرَهُ اللهُ، فَهُوَ إِلَى اللهِ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٢٧٨٥)، وَالْبُخَارِيُّ بِرقم: (١٨)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٤٤٣٦)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٤٣٩) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٤١٧٨)}، واتە: هەر کامێك لە ئێوە پەیمانەکەی بردە سەر، ئەوە پاداشتەکەی لەسەر خوایە، وە هەرکامێك لە ئێوە یەکێك لەو گوناهانەی کرد، ئەگەر لە دنیادا پێی سزا درا، ئەوە دەبێتە مایەی سڕانەوەی، وە ئەگەر هەر کامێك لە ئێوە گوناهێکی کرد، خوا بۆی پۆشی، (واتە: پێی سزا نەدرا لە دنیادا)، ئەوە حوکمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، ئەگەر ویستی سزای دەدات، وە ئەگەر ویستیشی لێی دەبووری.

جا لێرەدا کە دەفەرموێ: (فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ) ئەوە بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە سزای دواڕۆژی لەسەر لادەچێ بەو سزایەی دنیا، ئەدی ئەگەر تۆبە بکات؟ ئەوە دیارە ئەگەر تۆبە بکات، بە هەمان شێوە سزای دواڕۆژیشی لەسەر لادەچێ.

**مەسەلەی هەشتەم‌و کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، جگە لەوانەی کە دەگەڕێنەوە، پەشیمان دەبنەوە پێش ئەوەی تواناتان بەسەریاندا بشکێ، ئەوە بزانن کە خوا لێبوردەی بە بەزەییە، دیارە ئەمە هەر پەیوەستە بەوەی پێشێ،

واتە: یەکێك لەو چوار سزایانە بەسەر ئەو تاوانبارانەدا بسەپێنن، جگە لەو کەسانەی کە پێش ئەوەی ئێوە دەستەڵاتتان بەسەریاندا بشکێ‌و کۆنتڕۆڵیان بکەن، بۆخۆیان بە شێوەیەکی ئازادانە بێ‌ئەوەی ئێوە ناچاریان بکەن، دێن پەشیمان دەبنەوە، ئەوە بزانن کە خوا، لێبوردەی بە بەزەییە، لێرەدا کە دەفەرموێ: خوا لێبوردەی بە بەزەییە، ئایا سزای دنیاو قیامەتیان لەسەر لادەبات، یان هەر سزای قیامەتیان لەسەر لادەبات؟ دیارە دوای ئەوەی کە حکوومەت، دەوڵەت دەستەڵاتی بەسەریدا دەشکێ، ئنجا بڵێ: تۆبەم کرد! ئەوە هیچ نیە، ئەوە تۆبەی ناچارییە، بەڵام پێش ئەوەی دەستەڵاتیان بەسەریاندا بشکێ‌و بۆخۆیان بێن، ئەوە زانایان لەوبارەوە دوو ڕایان هەن:

## ڕای زانایان لە بارەی جەردەو ڕێگران و چۆنیەتی مامەڵە کردنی دەوڵەت لەگەڵیان دا دوای خۆ تەسلیم کردنەوەیان

ڕای یەکەم، دەڵێن: تەنیا سزای قیامەتیان لەسەر لادەچێ، یان تەنیا مافی خوایان لەسەر لادەچێ، بەڵام مافی خەڵکیان هەر لەسەر دەمێنێ‌و پێی سزا دەدرێن.

وە (مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا (التحرير والتنوير)دا دەڵێ: (وَمَعْنَى قَوْلِهِ: ﴿مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡ﴾، مَا كَانَ قَبْلَ أَنْ يَتَحَقَّقَ الْمُحَارِبُ أَنَّهُ مَأْخُوذٌ أَوْ يُضَيَّقَ عَلَيْهِ الحِصارُ أَوْ يطارَدَ فِي جَمِيعِ البِلَادِ وَيُضَيَّقَ عَلَيْهِ، فَإِنْ أَتَى قَبْلَ ذَلِكَ كُلِّهِ طَائِعَاً نَادِمَاً سقطَ عَنْهُ مَا شَرَّعَ اللَّهُ لَهُ مِنَ الْعُقُوبَةِ)[1]، واتە: کە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی کە دەگەڕێنەوە پێش ئەوەی تواناتان بەسەریاندا بشکێ، واتە: ئەو کەسەی ڕێگریی کردووە ئاژاوەی ناوەتەوە، پێش ئەوەی کە دڵنیابێ دەگیرێ، یاخود تەنگی پێ هەڵدەچنرێ، وە هیچ

---

١) ج٣، ص١٨٦

بواری ڕاکردنی نابێ، ئەگەر پێش ئەوە هەمووی بۆخۆی بێو ملکەچ بێ، وە پەشێمان بێ، لەو حاڵەتەدا ئەوەی کە خوا بۆی داناوە لە سزا، لەسەری لادەچێ، (واتە: سزای قیامەتییو ئەوەی کە پەیوەندی بە مافی خواوە پەروەردگارەوە هەیە).

دوایی هەر لەوبارەوە دەڵێ: (وَلَمَّا لَمْ تَتَعرَّضِ الآيَة إِلى غُرْمِ مَا أَتْلَفَهُ بِحرَابَتِهِ، عُلِمَ أَنّ التَّوْبَةِ لا تُؤَثِّرُ فِي سقوطِ مَا كَانَ قَدْ اعْتَلقَ بهِ مِن حقُوقِ النَّاسِ مِنْ مَالٍ أَوْ دَمٍ، لأَنَّ ذَلِكَ مَعْلُومٌ بِأَدِلَّةٍ أُخْرَى)، واتە: لەبەرئەوەی ئایەتەکە باسی بژاردنی ئەو شتانەی نەکردوە بە هۆی ڕێگریی و دژایەتییەکەیەوە، فەوتاندوونی، لەوەوە دەزانرێ کە ئەو تۆبەو پەشێمانبوونەوەیەی کاریگەریی نیە لە لاچوونی ئەو مافانەدا کە کەوتوونە سەر شانی، لە مافەکانی خەڵك، جا چ ماڵو سامان بن، جا چ خوێن، چونکە ئەوە بە چەند بەڵگەیەکی دیکە دەزانرێ، کە ئەو مافانەی لە ئەستۆ دایە.

هەروەها (الآلوسي)یش لە (روح المعاني)دا، ئەویش هەمان ڕای هەیەو دەڵێ: (﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡ ﴾، اسْتِثْنَاءٌ مَخْصُوصٌ بِمَا هُوَ مِن حقُوق الله تَعَالى كَمَا يُنْبِيءُ عَنْهُ قَوْلُهُ: ﴿ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، وَأَمَّا مَا هُوَ مِن حقُوقِ العِبَادِ كَحقُوقِ الأَوْلِيَاءِ مِنَ القِصَاصِ وَنَحْوِهِ فَيَسْقطُ بِالتَوْبَةِ وَجوبُهُ عَلى الإِمَامِ مِن حَيْثُ كونُهُ حداً، وَلاَ يَسقطُ جَوَازُهُ بِالنَّظَرِ إِلى الأَوْلِيَاءِ مِنْ حَيْثُ كونُهُ قِصَاصاً؛ فَإِنَّهُمْ إِن شَاءوا عَفَوا وَإِنْ أَحَبّوا استَوفوا)[1]، هەروەها (قرطبي)یش لە (الجامع لأحكام القرآن)[2] هەمان ڕای هێناوە، واتە: ئەو ئایەتە: کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡ ﴾، جیاکردنەوەیەکی تایبەتە لەوانەی کە تاکە مافی

---

١) ج٣، ص ٤٠٨.

٢) ج٦، ص ١٣٦.

خوای بەرزن، هەروەك قسەی خوای بەرز ئاماژەی بۆ دەكات: ﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ﴾، بزانن كە خوا لێبوردەی بە بەزەییە، بەڵام ئەوەی كە مافی بەندەكانە، وەك مافی كەسوكاری كوژراوان كە تۆڵە بستێنن، یاخود وێنەی ئەوە، ئەوە بە هۆی گەڕانەوەیانەوە تەنیا فەرزبوونەكەی لەسەر ئیمام لادەچێ، (واتە: لەسەر ئیمام پێویست نابێ كە تۆڵە لەو كەسە بستێنێتەوە، لەو ڕووەوە كە سزایەكی شەرعییە)، بەڵام دروست بوون (جواز)ەكەی لاناچێ لەو ڕووەوە كە تۆڵە (قصاص)یەو هەقی خەڵكە. واتە: بەس مافە گشتییەكەی لەسەر لادەچێ، ئەگەر كەسوكاری كوژراوەكان، یان كەسوكاری ماڵ براوەكان، گوتیان: دەیبەخشین، ئەوە بڕاردن و تۆڵەكەیشی لەسەر لادەچێ، بەڵام ئەگەر ئەوان سووربوون لەسەر داواكردنی مافی خۆیان، دەبێ مافی خاوەن كەسەكان وەربگیرێتەوە.

وە لەوبارەوە (قُرطُبی) ئەم فەرموودەیە دێنێ: ﴿عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ رَجُلٌ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! أَرَأَيْتَ إِنْ جَاءَ رَجُلٌ يُرِيدُ أَخْذَ مَالِي؟ قَالَ: (فَلَا تُعْطِهِ مَالَكَ)، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَاتَلَنِي؟ قَالَ: (قَاتِلْهُ)، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلَنِي؟ قَالَ: (فَأَنْتَ شَهِيدٌ)، قَالَ: أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُهُ؟ قَالَ: (هُوَ فِي النَّارِ)﴾{أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٣٥٨)}، واتە: ئەبو هورەیرە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا دەبینی ئەگەر پیاوێك هات ویستی ماڵو سامانەكەم لێ بستێنێ؟ فەرمووی: ماڵو سامانی خۆتی مەدەیە، گوتی: ئەدی ئەگەر لەگەڵم بەشەڕهات؟ فەرمووی: تۆش لەگەڵی بەشەڕوەرە، گوتی: ئەگەر منی كوشت؟ فەرمووی: تۆ شەهیدی، گوتی: ئەدی ئەگەر من ئەوم كوشت؟ فەرمووی: ئەو لە ئاگر دایە.

(إبنُ المنذر) دەڵێ: (بِهِ قَالَ أَكثَرُ أَهلِ العِلْمِ)، واتە: زۆربەی زانایان ڕایان وایە كە دەبێ ئینسان بەرگریی لە ماڵو سامانی خۆی بكات، ئەگەر لەسەریشی بكوژرێ، یان بكوژێ، (القُرطُبي) لە (الجامع لأحكام القرآن)[1] ئەو ڕایەی هێناوە.

١) ج٦، ص١٣٨.

ڕای دووەم، دەڵێن: هەموو جۆرەکانی سزا لادەچن، واتە: کەسێك بێئەوەی ناچاربێ، تۆبە بکاتو بگەڕێتەوە، هەقی خواو خەڵکی هەمووی لەسەر لادەچێ، لەوبارەوە (إبن كثير) دەڵێ: (وَقَوْلِهِ تَعَالى: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ﴾، أَمَّا عَلَى قَوْلِ مَنْ قَالَ: هِيَ فِي أَهْلِ الشِّرْكِ فَظَاهِرٌ، وَأَمَا الْمُحَارِبُون الْمُسْلِمُونَ فَإِذَا تَابُوا قَبْلَ القدرةِ عَلَيْهِم، فَإِنَّهُ يَسقطُ عَنْهُم انحتام القَتْلِ وَالصَّلْبِ وَقَطْعِ الرجلِ، وَهَل يسقط قَطْعُ اليَدِ أَمْ لا ؟ ...، وَظَاهِر الآيةِ يَقتضي سقُوط الجميع، وَعَلَيْهِ عمَلُ الصَّحَابَةِ)[1]، واتە: وە قسەی خوای بەرز کە دەفەرموێ: جگە لەوانە کە دەگەڕێنەوە پێش ئەوەی تواناتان بەسەریاندا بشکێ، لەسەر قسەی ئەوانە کە دەڵێن: ئەوە دەربارەی ئەهلی شیرکە، ئەوانەی هەڵدەگەڕێنەوە، ئەوە دیارە کە کەسێك تۆبەی کردو گەڕایەوە لە موشریکەکان لە هەموو شتێك دەبووردرێ، {وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿الإِسْلَامُ يَجُبُّ مَا قَبْلَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤/٢٠٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (الإرواء) برقم: (١٢٨٠)، عن عمرو بن العاص رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتە: ئیسلام پێش خۆی دەسڕێتەوە}[2]، بەڵام مسوڵمانانی جەنگاوەر، مسوڵمانانی ئاژاوەگێر ئەگەر پێش ئەوەی توانا بەسەریاندا بشکێ، بگەڕێنەوە، ئەوە پێویستبوونی کوژرانو هەڵواسرانو لاق بڕانیان لەسەر لادەچێ، بەڵام ئایا دەست بڕانیان لەسەر لادەچێ؟ ... ڕواڵەتی ئایەتەکە ئەوە دەگەیەنێ، کە هەموو جۆرە سزاکانیان لەسەر لادەچێ، هاوەڵانی بەڕێزیش ئیشیان بەوە کردوە، ئنجا (إبن كثير) لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە دەگێڕێتەوە: {روى إِبْنُ أَبِي حَاتم عَن الشَّعْبي قَالَ: كَانَ حَارِثَةُ بْنُ بَدْرٍ التَّمِيمِيُّ مِنْ أَهْلِ الْبَصْرَةِ قَدْ أَفْسَدَ فِي الأَرْضِ وَحَارَبَ, فَكَلَّمَ رجَالاً مِن قُرَيش مِنْهُمْ: الْحَسَنَ بْنَ عَلِيٍّ، وَابْنَ عَبَّاس، وَابْنَ جَعْفَر، فَكَلَّمُوا عَلِيًّا فَلَمْ يُؤَمِّنْهُ، فَأَتَى سَعِيدَ بْنَ قَيْسٍ الْهَمْدَانِيَّ فَخَلَفَهُ فِي دَارِهِ، ثُمَّ أتى عليًا فَقَالَ: يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ ، أَرَأَيْتَ مَنْ حَارَبَ اللهَ وَرَسُولَهُ وَسَعَى فِي الأَرْضِ فَسَاداً، فَقَرَأَ

---

١) المصباح المنير: ص٣٧٤ ، ٣٧٥.

٢) ئەم فەرموودەیە خۆم زیادم کرد.

حَتَّى بَلَغَ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ﴾، قَالَ: فَكَتَبَ لَهُ أَمَانًا، قَالَ سَعِيدَ بْنَ قَيْسٍ: فَإِنَّهُ حَارِثَةَ بْنَ بَدْرٍ، وَكَذَا رَوَاهُ إبْنُ جَرِيرٍ وَإبْنُ أَبي شَيبة برقم: (٣٣٤٥٩)} واته: ئیبنو ئەبی حاتم لە شەعبییەوە هێناویەتی، دەڵێ: (حارثة بن بدر التميمي) خەڵکی بەسرە بوو، پیاوێکی زۆر ئاشووبگێڕ بوو لە زەوی داو ڕێگر بوو، (بەڵام دەیویست بگەڕێتەوە) لەگەڵ چەند پیاوێك لە قورەیشییەکان قسەی کردبوو، (واستەی پێکردبوون، کە دەمەوێ بگەڕێمەوە) لەوانە: حەسەنی کوڕی عەلیو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسو عەبدوڵڵای کوڕی جەعفەر، خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوانیش قسەیان لەگەڵ عەلی کوڕی ئەبو طالیب دا کرد، (کە دیارە ئەو کاتە خەلیفەی مسوڵمانان بووە) بەڵام ئەمانی پێنەدا، ئەویش "حَارِثَةَ بْنُ بَدْرٍ" چوو بۆ لای سەعیدی کوڕی قەیسی هەمدانییو ئەویش لە ماڵی خۆی داینا و چوو بۆ لای خەلیفەی مسوڵمانان عەلی کوڕی ئەبو طالیب گوتی: ئەی فەرماندەی ئیمانداران! ئایا ئەگەر یەکێك دژایەتی خواو پێغەمبەری خوای کردبێ، وە خراپەی لەسەر زەوی کردبێ، (مەبەست لە دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا واتە: ڕێگریی کردبێ، ئاژاوەگێڕیی کردبێ) حوکمەکەی چییە؟ ئەویش (عەلی) ئەو ئایەتانەی خوێندەوە هەتا گەیشتە ئەو شوێنەی کە دەفەرمووێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ﴾، دەڵێ: ئنجا عەلی کوڕی ئەبو طالیب خوا لێیان ڕازی بێ، ئەمانی بۆ نووسی، گوتی: هەر کەسێك وایە ئەوە مادام بگەڕێتەوە بێ ئەوەی ئێمە گرتبمان، خۆی ئازادانە بگەڕێتەوە، ئەمانی پێدەدەین، (واتە: لە هەموو شتێك دەیبەخشین) سەعیدی کوڕی قەیسیش گوتی: جا ئەوە (حارثة بن بدر) لە ماڵی ئێمەیەو هێنایو ئەویش لێی بورد.

(الشوكاني)یش لە (فتح القدير)دا ئەویش بە هەمان شێوە دەڵێ: {﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِن قَبْلِ أَن تَقْدِرُوا۟ عَلَيْهِمْ ﴾، اسْتَثْنَى الله سُبْحَانَهُ التَّائِبِينَ قَبْلَ القدرةِ عَلَيْهِم مِنْ عمومِ المعَاقبِينَ بِالعقُوبَاتِ السابقَة، وَالظَّاهِرُ عَدمُ الفَرْقِ بَيْنَ

الدِّمَـاءِ وَالأَمْـوَالِ وَبَيْنَ غيرها مِنَ الذُّنُوبِ الموجِبَةِ لِلْعقُوبَات المُعَيَّنَـة المَحْدُودَة، فَلاَ يُطالَبُ التَّائِبُ قبل القدرةِ بِشَيءٍ مِنْ ذَلِكَ وَعلَيْهِ عَمَلُ الصَّحابَةِ وَذَهَبَ بَعْضُ أَهْلِ العِلْمِ إلى أَنَّهُ لاَ يسقُطُ القِصَاصُ وَسَائِرُ حقوقِ الآدَميّين بِالتَوبَة قَبل القدرة والَحَقّ الأَوَّلُ..}[1]، واتـە: ئـەوە کـە خـوا دەفـەرموێ: جگـە لەوانـەی پـێش ئـەوەی تواناتـان بەسـەریاندا بشـکێ دەگەڕێنەوە، خوای پاك پەشـیمانـبووەوانێك کـە پـێش ئەوەی دەستەلاتی ئیسلامیی کۆنتـرۆڵیان بکات، دەگەڕێنـەوە، هـەڵیواردوونو جیای کردوونەتـەوە، لەوانەی کە بەو سـزایانەی پێشـوو سـزا دەدرێن، ئەوەی کە دیاریشـە خوا ﷻ جیاوازیی نەخسـتۆتە نێوان خوێنو ماڵو سـامانو بـاقی ئـەو گوناهانـەوە کە ئەو سزا دیاریی کراوانەیان بەسەردا دەچەسـپێن، بۆیە کەسێك کە پـێش ئـەوەی تواناى بەسـەردا بشـکێنرێ بگەڕێتـەوە، هیچ کام لەو مافانەی لـێ داوا ناکرێتـەوە، وە هاوەڵانیش بـەوە کاریـان کردووە، هەرچـەندە هەنـدێك لـە زانایان گوتوویانـە: تۆڵـەو مافەکانی دیکەی خەڵکی بە تۆبە لاناچـن، بەڵام هـەق ئەوەی یەکەمیـانە.

وە منیش وای بۆ دەچـم رای دووەم ڕاسـتتـربێو واتـە: هەمـوو مافـەکانی لەسـەر لابچـن، چ مافی خوا، چ مافی خەڵـك، وە ئەوە لـە سـەماحەتو لێبوردەیـی ئیسلامو ڕەحمەتی خـوای پـەروەردگار نیـزیکترە، وە ئـەوە هاندەرێکیشـە بـۆ خـەڵك کـە واز لـە ڕێگریـیو ئاشـووب نانـەوەو تـاڕاوەگێڕیی بێنـێو، بێتـەوە ژێـر کۆنـتڕۆڵو ڕکێفـی دەوڵـەتی ئیسـلامیی، چونکە ئەگـەر بگوترێ: هـەقی خەڵـکت هـەر لـێ دەسـتێنین، کـابرا ڕەنگـە لـە ترسـان هـەر نەیەتـەوەو، هـەر بـەردەوام بـێ لەسـەر ڕێگـریـیو خراپەکـاریی.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

١) ج٢، ص٤٨.

# دەرسی نۆیەم

## پێناســەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە (٦) ئایەت پێکدێ، ئایەتەکانی (٣٥ - ٤٠) سەرەتا خوای پەروەردگار بۆ جاری شەشەم لەم سورەتەدا مسولمانان بە نازناوی ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، بانگ دەکاتو، وە فەرمانیان پێدەکات بە سێ شتان: پارێزکارییو بەدەستهێنانی ئامرازو هۆکار بۆ لە خوا نزیکبوونەوە، وە تێکۆشان لە ڕێی خوادا بە مەبەستی سەرفرازبوون (التَقْوَى، وابْتِغَاء الوَسِيلَة، وَالجِهَاد فِي سَبيلِ اللّه)، پاشان خوا ﷻ سەرەنجامی شوومی بێبڕوایان ڕادەگەیەنێ، کە ئەگەر لە قیامەتدا پڕی دنیا، وە وێنەی ئەوەش کە لە دنیادا هەیە، (واتە: دنیا چی تێدایەو هێندەی دیکەشی بخەنە سەر) بیکەنە قەرەبووو بەلاگێڕەوەی خۆیان لە سزای قیامەت دەربازیان نابێ، وە هەرچەندە هەوڵی هاتنەدەریش دەدەن لە دۆزەخ، بەلام بێسوودەو، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، پاشان خوا ﷻ باسی حوکمێك لە حوکمە گرنگەکانی ئیسلام دەکات، کە بریتیە لە دزییو سزای دزیی، دەفەرموێ: پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن، وە پاشان ڕایدەگەیەنێ کە هەرکەسێك پاش ئەو ستەمو تاوانە واتە: پاش دزیی کردن، پەشێمان ببێتەوەو چاکەکاریی بکات، ئەوە خوا لێی دەبوورێ، چونکە خوا لێبووردەی بە بەزیی یە، وە لە ئایەتی کۆتاییدا واتە: لە ئایەتی کۆتایی ئەم دەرسەدا خوا ﷻ ئەو ڕاستییە ڕادەگەیەنێ، کە خوا خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییەو، هەرکەسێك بیەوێ سزای دەدا، بەلام بە پێی تاوانو خراپەی خۆی، هەرکەسێکیش بیەوێ لێی دەبوورێ، لەبەرئەوەی کە دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا، یاخود شایستەی ئەوەیە کە خوا لێی ببوورێ، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي
سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣٥ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ
جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ
عَذَابٌ أَلِيمٞ ٣٦ يُرِيدُونَ أَن يَخۡرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنۡهَاۖ وَلَهُمۡ
عَذَابٞ مُّقِيمٞ ٣٧ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا
مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ٣٨ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ
عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ٣٩ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٤٠ ﴾.

# مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! پارێز لە خوا بکەنو هۆکار بەرەو (ڕەزامەندیی) خوا ﷻ بخوازنو لە پێناویدا تێبکۆشن، بەڵکو سەرفرازبن ﴿٣٥﴾ بێگومان ئەوانەی بێبڕوان ئەگەر تێکڕای ئەوەی لە زەوی دایەو هێندەی خۆیشی لەگەڵ بێ، تاکو بیکەنە قەرەبوویان لە سزای ڕۆژی قیامەت، لێیان وەرناگیرێو سزا (و ئازار)ێکی بە ئێشیان هەیە ﴿٣٦﴾ (هەرچەندە) دەیانەوێ لە ئاگر بچنە دەرێ، بەلام لێی دەرباز نابنو سزایەکی بەردەوامیان هەیە، ﴿٣٧﴾ وە وەك سزایەکی سڵەمێنەرەوانە لەلایەن خواوە، دەستی پیاوو ئافرەتی دز ببڕن لەسەر ئەوەی کردوویانە، وە خوا زاڵی کاربەجێیە ﴿٣٨﴾ ئنجا هەر کەس پاش ستەمەکەی گەڕایەوەو چاکەکاریی کرد، ئەوە بێگومان خوا ﷻ دەگەڕێتەوە سەری (تۆبەی لێوەردەگرێ)، بەڕاستی خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە ﴿٣٩﴾ ئایا نازانی کە خوا ﷻ موڵکی ئاسمانەکانو زەوی هەیە، هەر کەسێکی بوێ سزای دەدات، وە هەر کەسێکیشی بوێ لێی دەبوورێ، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە! ﴿٤٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ): پێشتریش پێناسەی تەقوامان كردوە لێرەشدا بە كورتی دەڵێین: (اتَّقُوا اللّه) پارێز لە خوا بكەن، واتە: لەخۆتان وریابن لە مامەڵەكردنتان لەگەڵ خوادا ﷻ تەقوا لە چییەوە هاتوە؟ لە (وَقَى، يَقي، وقاية) دەڵێ: (الوِقَايَةُ: حِفْظُ الشَّيءِ مِمَّا يُؤْذِيهِ، وَيضُرُّهُ، وَالتَّقوَى جَعْلُ النَّفْسِ فِي وِقَايةٍ مِمَّا يُخَافُ، وَفِي إصطلاحِ الشَّرْعِ حِفْظُ النَّفْسِ عَمَّا يُؤْثِمُ) (وَقَايَة) بریتیە لەوەی كەسێك پارێزگاریی بكات لە هەرشتێك كە ئازاری پێبگەیەنێ و زیانی پێبگەیەنێ، (تَقْوَى) بریتیە لەوەی كە خۆت والێبكەی لەو شتەی كە جێگای مەترسییە خۆت بپارێزی، وە لە زاراوەی شەرعدا بریتیە لە خۆ پاراستن لە هەر شتێك كە ئینسان گوناهبار بكات، ئینسانیش بە دوو شتان گوناهبار دەبێ، بە چوواندنی فەرزەكان، وە بە شكاندنی قەدەغەكان.

(ٱلْوَسِيلَةَ ): (الوَسِيلَةُ: التَّوَصُّلُ إلَى الشَّيءِ بِرَغْبَةٍ وَهِيَ أَخَصُّ مِنَ الوَصِيلَةِ، لِتَضَمُّنِهَا لِمَعْنَى الرَّغْبَةِ، الوَاسِلُ: الرَّاغِبُ إلَى اللّهِ تَعَالَى، وَحَقِيقَةُ الوَسِيلَةِ إلَى اللّهِ: مُرَاعَاةُ سَبِيلِهِ بِالعِلْمِ والعِبَادَةِ، وَتَحَرِّي مَكَارِمِ الشَّرِيعَةِ)، (وَسِيْلَة) بریتیە لەوەی كە بە ئارەزووەوە بەرەو شتێك بچێ و ماناكەی تایبەتترە لە (وصيلة)، (وَصِيلَة)ش هەر ئەوەیە كە تۆ بەرەو شتێك بچی، بەڵام (وَسِيلَة) ئەوەیە كە ئارەزوومەندانە بەرەو شتێك بچی، بۆیە (وَاسِل) واتە: كەسێك كە ئارەزووی هەیە بەرەو خوا، بەرەو خوا بڕواو لە خوا نزیك بێتەوە، وە وشەی (وَسِيلَة) بەرەو لای خوای بەرز، ئەوەیە: كە ڕەچاوی ڕێبازی خوا بكرێ بە زانیاریی واتە: هەوڵبدەی كە لێی شارەزابی، وە بەندایەتیی بۆ خوا، وە بەوە كە ئەو شتانەی كە شەریعەت فەرمانی پێكردوون لە ئەدەبە بەرزەكانی شەریعەت، ئینسان هەوڵبدات لەخۆیدا بیانهێنێتە دی.

(لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ ): واتە: بۆئەوەی بیكەنە بەلاگێڕەوەی خۆیان (إفْتَدَى بِهِ) واتە: ئەو شتەی كردە قەرەبووی خۆی و بەلاگێڕەوەی خۆی، دەڵێ: (الفِدَى وَالفِدَاءُ: حِفْظُ

الإنْسَـانِ عَن النـائِبَةِ بِمَا يَبْذُلُـهُ عَنْـهُ، وَافْتَـدَى: بَذَلَ ذَلِـكَ عَنْ نَفْسِهِ) (فِدَى) و (فِدَاء) بریتـیە لـەوە کە ئینسـان خـۆی لە بەڵایەك بپـارێزێ، بـە هـۆی ماڵێکـەوە کـە سـەرفی دەکـات، (وَافْتَـدَى) واتـە: ئـەو ماڵـەی بەخشـی بۆئـەوەی خـۆی لـە گرفتێـك بپـارێزێ.

(**مُّقِيمٌ** ): بـە کەسـێك دەگـوترێ کـە لـە شـوێنێك نیشـتەجێ بـێ بـەردەوام، (وَيُعَبَّـرُ بِالإِقَـامَةِ عَنِ الدَّوَامِ نَحْو: عَـذَابٍ مُقْيـمٍ) واتە: وشـەی (إِقَامَة) بەکـاردەهێنرێ بـۆ بەردەوام بوون، وە دەگوتـرێ: (عَذَابٍ مُقِيمٍ) واتە: سـزایەکی بـەردەوام.

(**نَكَالًا** ): وشـەی (نَکَـال) لـە کوردییـدا دەبێتـە تەمبـێکردن، یاخـود سـڵەماندنەوەو پرینگاندنەوەو دوورخسـتنەوە، دەڵـێ: (نَكَّلْتُ بِهِ: إِذَا فَعَلْتَ بِهِ مَا يُنَكَّلُ بِهِ غَيرُهُ واسمُ ذَلِكَ الفعل النَّكَالُ) کـە تـۆ سـزای کەسێکـت دا، خەڵـکی دیکـەی پێـوە تەمبـێ بـێ، وە پەند وەربگـرێ، ئەو کردەوەیەی کە تـۆ لەگـەڵ کەسێکدا دەیکەی کەسـێکی دیکـەی پێ عیبـرەت گرتووبێ‌و پێ تەمبێ خواردووبێ، پێـی دەگوتـرێ: (نَکـال)، (نَکـال)یـش لـە (نِکْـل)ەوە هـاتوە (والنِكْـل: قَيْدُ الدّابَّةِ وحَديدةِ اللِّجَامِ لِكَونِهِما مانعَيـن، والجَـمْعُ: أنْكال)، (نِکْل) بە پێوەندی پێـی ولاخ دەگوتــرێ، وە بـەو ئاسـنە دەگوترێ کـە دەکرێتــە لغـاوی ولاخـە بـەرزەو دەخرێتـە نێـو زاری، چونکـە هەم ئەو پێوەندەی کە دەخرێتـە پێـی ولاخـەوە، قەدەغـەی دەکـات لـەوەی کە بەملاو بەولادا بڕوا، وە هەم ئـەو ئاسـنەی دەخرێتـە دەمـی ئەسپیشـەوە، ڕێـی لـێدەگیـرێ لەوە کە گیـاو لـەوەڕ بخوات، کـۆی (نِکْل)یـش (أَنکـال)ە.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

پێشتر ئاماژەم پێدا ئەوە بۆ جاری شەشەمە لەم سوورەتەدا خـوای پەروەردگار بە نازناوی ئیمـان مسـولْمانان دەدوێنـێ، وە زۆرتـرین ڕسـتەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، لەم سووڕەتەدا هاتوە کە (١٦) جارە، واتە: هیچ سوورەتێکی دیکەی مەدەنیی بە قەدەر ئەم سوورەتە، ڕستەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ی تێدا نەهاتوە.

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی لـە ئایەتـەکانی پێشـوودا باسـی سـزای ڕێگریـی‌و تێکـدانی هێمنیی‌و ئاسایشی کۆمەڵگای کرد، بانگی مسـولْمانان دەکات بە خۆشەویسترین نازنـاو، کە بریتیـە لە ئیمـان، چونکە ئینسـان بـە هـۆی ئیمانـەوە دەبێتـە خۆشـەویسـتی خـوا ﴿ ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ... ﴿٢٥٧﴾ ﴾البقـرة، ﴿ ... وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾آل عمـران، وە بـە هـۆی ئیمانـەوە ئینسـان دەربازی دەبـێ لـە دنیـاو سـەرکەوتوو دەبـێ، وەك خـوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ ﴾آل عمران، وە بە هـۆی ئیمانـەوە ئینسـان بەهەشـتی بۆ مسـۆگەر دەبـێ، وە بە هۆی ئیمانەوە ڕەزامەنـدیی خـوای دەست دەکەوێ، بۆیە وشـەی ئیمان نازنـاوێکی زۆر خۆشـەویسـتە لـە لای مسـولْمانان، بۆیـەش خـوا ﷻ هەر کاتێك بیـەوێ فەرمانێکیان پـێ بـدات، یان ڕێگرییـەکیان لـێ بکات، واتـە: ئـەرکێکی شـەرعییان پـێ بسـپێرێ، بـە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، دەیانـدوێنێ، لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، ئەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! پارێز لـە خـوا بکـەن، واتـە: لـە مامەڵەتـان لەگەڵ خـوادا پارێزکـاربن، وریـاو هۆشـیار بـن، کارێـك مەکـەن کـە خـوا لێتـان بڕەنجـێ، کارێـك مەکـەن خـوا لێتـان توورەبـێ، کارێـك مەکـەن دووچاری لێپرسـینەوەو سـزای خـوابن، تـەقوا بریتیـە لـەو حاڵەتـە هۆشـیاریی‌و بێدارییـەی کـە بـۆ ئینسان دروسـت دەبـێ، ئینسـان بـە وریاییـەوە دەژیـێ بـە وریاییـەوە مامەڵە لەگەڵ خەڵك دەکات، هەمیشە چاودێریی خـوا بەسـەر خۆیـەوە دەبینـێ، وە کارێـك ناکـات خـوای باڵادەسـت سـزای بـدات، یـاخود تەنانـەت

گلەییشی لێ بکات بەبێ سزادانیش، ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾، ئنجا وە بەرەو خوا هۆکارێك بخوازن، واتە: ئەو ئامرازو هۆکارانەی کە لە خواتان نزیك دەخەنەوە، ئەوانە پەیدا بکەن، (کە دوایی ئێمە لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشك دەخەینە، سەر ئەوە، وە ئەو مشتومڕەی زانایان کە لەسەر تەوەسسول‌و وەسیلە هەیە، زیاتر باسی دەکەین)، لێرەدا ئەوەی کە لە قورئان وەردەگیرێ کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾، واتە: ئەو هۆکارانەی کە لە خواتان نزیك دەخەنەوە، هەوڵبدەن دابینیان بکەن، ئینسان بە چی لە خوا نزیك دەبێتەوە؟ بێگومان بە طاعەت لە خوا نزیك دەبێتەوە، بە خۆ دوورگرتن لە قەدەغەکراوەکان‌و بە جێبەجێ کردنی فەرمانەکان لە خوا نزیك دەبێتەوە، بە شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر ﷺ لە خوا نزیك دەبێتەوە، بە خۆ ڕازاندنەوەی بە ڕەوشتە بەرزەکان، لە خوا نزیك دەبێتەوە، بە خۆ دوورگرتن لە خوو خدە خراپەکان لە خوا نزیك دەبێتەوە، کەواتە ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾، ڕاستە مانایەکەی ئەوەیە: هەر هۆکارو ئامرازێك لە خواتان نزیك دەخاتەوە، بیخوازن‌و دابینی بکەن، وە ڕەچاوی بکەن‌و کاری پێ بکەن، ﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ ﴾، وە لە ڕێی خوادا تێبکۆشن، کە جیهاد لە ڕێی خوادا یەکێکە لە هۆکارەکانی لە خوا نزیك کەوتنەوە، جا لێرەدا ﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ ﴾، وە لە ڕێی خوادا تێبکۆشن، وشەی تێکۆشان (جهاد) لە زمانی عەرەبیدا لە ئەسڵدا بە مانای ئەوەیە کە مرۆڤ ئەوپەڕی توانای خۆی بەکاربێنێ (بَذلُ أقصى ما في الوسع) کە لێرەدا بە مانای جەنگ (قتال) دێ‌و غەیری جەنگ (قتال)یش هەر دەگرێتەوە، بەڵام لە ئایەتە مەککییەکاندا بە تەئکید مەبەست پێی جەنگ نەبووە، چونکە جەنگ‌و ڕووبەڕووبوونەوەی چەکدارانە لە قۆناغی مەدینەدا فەرز کراوە، ڕێگای پێدراوە بۆ مسوڵمانان کە لە بەرانبەر نەیارەکانیاندا بەکاری بێنن، کەواتە: وشەی جیهاد لە قورئانی مەککییدا واتە: بانگەوازو، فەرمانکردن بە چاکەو ڕێ گرتن لە خراپەو بڵاوکردنەوەی زانستی شەرعیی‌و تێگەیاندنی خەڵك‌و بەرچاو ڕوونکردنەوەیان، بەڵام لە ئایەتە مەدەنییەکاندا ئەوەش دەگرێتەوە، بەخشینی سەرو

ماڵیش لە پێناوی خوادا دەگرێتەوە، ئنجا خوا دەفەرمویٚ: ئەو سێیانە بکەن ﴿لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾، بەڵکو سەرفراز بن، ئنجا دوایی خوا ﷻ باسی سەرەنجامی کوفر دەکات، دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾، بێگومان ئەوانەی بێبڕوان، بێبڕوان بەچی؟! ئەگەر سەرنجتان دابیٚ لە قورئاندا خوا ﷻ کورتیو پوختی ڕەچاو دەکات، بۆ وێنە: لێرەدا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئیمانیان بە چی هێناوە؟ دیاریی نەکردوە، بەڵام لە شوێنی دیکەدا دیاریی کردوە، جا ئەگەر لە هەموو شوێنان بفەرمویٚ: ﴿ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ...﴾، ئەوە درێژ دەکێشیٚ، بەڵام لە چەند شوێنێك دیاریی کردوە کە دەبیٚ چ شتێك ئیمانی پیٚ بهێنریٚ؟ ئیمان بە خواو بە فریشتەکانو بە کتێبەکانو بە پێغەمبەرانو بە ڕۆژی دوایی[1]، وە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) هەواڵیان پێداوە، دەبیٚ ئیمانیان پیٚ بهێندریٚ، لێرەشدا دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾، ئەوانەی بێبڕوا بوون، بە چی بێبڕوا بوون؟ لە سوورەتی (النساء)دا ڕوونی دەکاتەوە، دەفەرمویٚ: ﴿... وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ ...﴿١٣٦﴾﴾ بێبڕوا بوون بە خوا، بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە پێغەمبەرانی، بە ڕۆژی دوایی، بەو پێنج پایە بنەڕەتییە، کە دیارە ئیمان بە قەدەریش هەر دەچێتەوە نێو ئیمان بە خوا، چونکە ئیمان بە قەدەر، واتە: ئیمان بە زانیاریی بیٚسنووری خواو، ئیرادەی بیٚسنووری خواو، حیکمەتی بیٚسنووری خواو، دەسەڵاتی بیٚسنووری خوا، تا کۆتایی، دەفەرمویٚ: بێگومان ئەوانەی بێبڕوان واتە: بێبڕوان بەرانبەر بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پیٚبهێنریٚ، ﴿لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا

---

١) وەك خوا فەرموویەتی: ﴿لَّيۡسَ ٱلۡبِرَّ أَن تُوَلُّواْ وُجُوهَكُمۡ قِبَلَ ٱلۡمَشۡرِقِ وَٱلۡمَغۡرِبِ وَلَٰكِنَّ ٱلۡبِرَّ مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ وَٱلۡكِتَٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ ...﴿١٧٧﴾﴾ البقرة.

﴿ وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ ﴾، ئەگەر ئەوەی لە زەویدا هەیە هەمووی‌و هێندەی دیکەشی لەگەڵدا بێ ﴿ لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾، بۆ ئەوەی بیکەنە بەلاگێڕەوەو قەرەبووی خۆیان، لە بەرانبەر سزای ڕۆژی قیامەتدا ﴿ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، لێیان وەرناگیرێ، وە ئازارێکی بە ئێشیان هەیە، جا ئازار هەر خۆی بە ئێشە، بەڵام دیارە لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئازارێکی زۆر بە ئێشە، بۆیە خوای پەروەردگار بە وەسفی: (ألیم) واتە (مؤلم) ئێش پێگەیەنەر، وەسفی دەکات، ئنجا هەر لەبارەی سەرەنجامی شوومی بێبڕوایانەوە، دەفەرموێ: ﴿ يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ ﴾، دەیانەوێ لە ئاگر بچنەدەر کە ئەو هەموو ئازارو ناڕەحەتییە دەبینن، پەلەقاژەی چوونە دەرو دەرباز بوون دەکەن، ﴿ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا ﴾، بەڵام هەرچی دەکەن ناتوانن لێی بچنەدەرو لێی قوتاربن، ﴿ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴾، وە ئازارو سزایەکی نەپساوەو بەردەوامیان هەیە بۆچی؟! لەبەرئەوەی کە بەرانبەر بە بەدیهێنەری خۆیان‌و پەروەردگاری خۆیان، سپڵەو ناسوپاس بوون‌و، بەرانبەر بە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بێوەفاو سپڵە بوون، خوا ﷻ ئێمەی داناوە لەم سەرزەمینە تاقیمان بکاتەوەو پێغەمبەرانی بۆ ناردووین‌و، کتێبی بۆ ناردووین‌و عەقڵی پێداوین‌و، هەرچی نازو نیعمەتە پێی داوین، وە فەرموویەتی: ئەو پێنج‌و دووڕۆژەی دنیا بە شێوەیەك بگوزەرێنن کە من لێتان ڕازی بم، کە قازانجی دنیاو قیامەتیشتان هەر لەوەدایەو بەرژەوەندیی عەقڵ‌و جەستەو ڕووح‌و تاك‌و خێزان‌و کۆمەڵگاشتان هەر لەوە دایە، بۆیە کەسێك هەر بە لاڕێیەدا بڕواو، بە قسەی شەیتان‌و دوژمنی خوا بکات، دیارە خوای دادگەر بەو شێوەیە سزای دەدات.

ئنجا دێتە سەر باسی یەکێك لە یاساکانی ئیسلام کە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، وە لە ڕابردووەوەو ئێستاش مشتومڕی زۆری لەسەرە، ئەویش مەسەلەی (یاسای دەست بڕینی دزە)، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾، وە پیاوی دزو

ئافرەتی دز دەستەکانیان ببڕن، ئەوە سزایەکە لە بەرانبەر ئەوەدا کە کردوویانەو بەدەستیان هێناوە، سزایەکی تەنبێ کەرانەو سڵەمێنەرانەو دوورخرانەوەیە، لە خواوە، ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴾، وە خوا زاڵی کاربەجێیە، لێرەدا تێبینی دەکرێ کە خوا ﷻ پیاوی دزی پێش ئافرەتی دز خستوە، بەڵام لە سوورەتی (النور)دا، ئافرەتی زیناکەری پێش پیاوی زیناکەر خستوە، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي... ﴿٢﴾ ﴾، بەڵام لێرە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ ﴾، بۆچی؟! چونکە دزیی پێویستی بە غیرەتو جەربەزەیی و دڵڕەقیی و ئازایەتی دەکات، کە ئەوە زیاتر لە پیاودا هەیە، بەڵام زینا بە پێچەوانەوە زیاتر پەیوەندیی بە لایەنی نەرمو ناسکیی و کارتێکراوییەوە هەیە، کە ئافرەتیش زیاتر ئەو سیفەتانەی تێدان، پاشان لەبەرئەوەی کە ئەگەر ئافرەت دەستپێشخەر نەبێ، کەمتر وایە پیاوان جورئەت بکەن، مەگەر وەك حاڵەتی زەوتکردن (إغتصاب)و بە زۆر دەست درێژیی کردنەسەر (إعتداء)، ئەگەرنا کەمتر وایە پیاوان جورئەت بکەن بە چاوی تەماع چاو ببڕنە ئافرەتێکی شەریفو شەرم بەخۆو پۆشتەو بە حەیاو حورمەت، لەبەر ئەوە بە زۆریی وا هەیە بۆ داوێن پیسیی و زینا، ئافرەت دەستپێشخەر دەبێ، بەڵام بۆ دزیی پیاو، بۆیەش خوای کاربەجێ هەر کامێکیانی لە شوێنی خۆیدا پێشخستوە، کێ زیاتر دەستپێشخەرە ئەوی پێشخستوە، ئنجا کە دەفەرموێ: دەستیان ببڕن، لێرەدا بەگشتی فەرموویەتی: دەستیان ببڕن، کە وشەی دەست لە شانەوە تاکو پەنجەکان، هەمووی دەگرێتەوە، بەڵام سوننەتی پێغەمبەر ﷺ بۆی ڕوون کردووینەوە، کە دەبێ لە کوێ ڕا دەست ببڕدرێ:

١) لەلای زۆربەی زانایان لە مەچەکەوە دەبڕدرێ.

٢) هەندێکیش دەڵێن: تەنیا هەر چوار پەنجەکەی دەبێ ببڕدرێن.

٣) وە هەندێکیان گوتوویانە: دەبێ لە ئانیشکەوە ببڕدرێ.

بەڵام ئەوەی کە زۆربەی زانایان لەسەری یەکدەنگن ئەوەیە کە لە مەچەکەوە دەبێ ببڕدرێن، کە پێی دەگوترێ (رَسْغ) ئنجا ئەوەی کە جێی سەرنجە ئەوەیە، کە خوا ﷻ کەم وایە باسی یەکێ لە حوکمە شەرعییەکان بکات، مەگەر ئاماژە دەکات بە حیکمەتەکەی، لێرەشدا ئاماژە دەکات بە حیکمەتی سزای دەست بڕینو دەفەرموێ:

﴿ جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا ﴾، سزای ئەو کاسبییە خراپەی کە کردوویانە، ئەو دەستکەوتە خراپەی کە وەدەستیان هێناوە ﴿ نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، ئەوە بۆ ترساندنە لە خواوە، واتە: ئەم سزایە حیکمەتەکەی زیاتر سڵەماندنەوەی خەڵکە لە دزیی، تەمبێ کردنی خەڵك، کە وەك دوایی باسی دەکەین، دەڵێن: لە هەموو مێژووی دەوڵەتی ئیسلامیی دا شەش دەست بڕدراون‌و وڵات پڕ بووە لە ئاسایش‌و هێمنیی، چونکە هەندێ کەس وا تەصەووڕ دەکات، ئەگەر ئیسلام دەسەڵاتی هەبێ، نیوەی خەڵکی بێ قۆڵ دەبێ! نا وانیە، دوو دەستان ببڕە، دوو هەزار دەستی پێوە تەمبێ دەبێ، وەك خوا ئاماژەی بۆ کردوە: ﴿ نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِ ﴾، ئەوە پرینگاندنەوەو سڵەماندنەوەو دوورخستنەوەیە لە خواوە، وە تەمبێ کردن‌و چاوترساندنی خەڵکە، ﴿ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾، وە خوا زاڵەو کاربەجێشە، ئنجا عادەتی خوا ﷻ وایە مەگەر چۆن، ئەگەرنا باسی گوناح‌و باسی خراپەیەك بکات، دوایی دەرگای تۆبەو گەڕانەوەش دەکاتەوە، وەك لە مەسەلەی ڕێگریی (محاربة)دا باسمان کرد، کە دوایی دەفەرموێ: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٤ ﴾المائدة، لێرەشدا دوای باسی دزیی، دەفەرموێ: ﴿ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِ ﴾، هەر کەسێك دوای ستەمەکەی، ئەو زوڵمەی کە کردوویەتی لە خۆی کردوە، لەو کەسەی کە دزیی لێکردوە، لەو کۆمەڵگایە، لەو شەریعەتە، دوای ئەو زوڵمە جۆراو جۆرە کە کردوویەتی، بگەڕێتەوە، {(تَابَ) یانی: (رَجَعَ)} : گەڕایەوە هەر کەسێك بگەڕێتەوەو واز لە خراپەکاریی‌و ستەم بێنێ (وَاصْلَحَ) وە چاکەکارییش بکات ﴿ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِ ﴾، بێگومان (إِنَّ) ئامرازی تەئکیدە، واتە: بێگومان خوا دەگەڕێتەوە سەری، لە بەکارهێنانی باو (عرف)دا (تَابَ) واتە: تۆبەی کرد، ئەگەرنا لە ئەسڵی زماندا (تَابَ)، یانی: (رَجَعَ، عَادَ) وە (تَابَ اللهُ عَلَيْهِ) یانی: خوا گەڕایەوە سەری، کە تا ئێستا خوا لێی تووڕە بووەو خوا لێی دوورکەوتۆتەوە، لەمەودوا خوا دەگەڕێتەوە سەری بە لێبوردن‌و بەزەیی، وەك چۆن ئەو پێشتر ڕۆیشتوەو، سەری

خۆی هەڵگرتوە، بەڵام ئێستا گەڕاوەتەوە بۆ لای خوا، خواش دەگەڕێتەوە بۆ لای ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾، بێگومان خوا لێبوردەی میهرەبانە.

لە کۆتای ئایەتی ئەم دەرسەماندا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئایا نازانی کە خوا موڵکی ئاسمانەکانو زەوی هەیە، خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییە، ئەوە وەڵامی ئیشکالێك دەداتەوە: خوا بۆچی ئەو سزایانەی بۆ داناون، چۆن وا بەو سزا قورسە سزای کەسێك دەدات کە دزیی کردوە؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ أَلَمۡ تَعۡلَمۡ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ ﴾، ئەدی نازانی کە خوا خاوەنی ئاسمانەکانو زەوییە ﴿ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ ﴾، هەر کەسێکی بوێ سزای دەدات، وە هەر کەسێکی بوێ لێی دەبوورێ، ئەوانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، هەمیشە کردەوەی خوای پەروەردگار کاردانەوە (رد فعل)یەو، ئەوەی بەندە کار (فعل)ە، خوا دەفەرموێ: چاك بی، خوا لێت خۆش دەبێ، خراپ بی، خوا سزات دەدات، بەرەو لای خوا بگەڕێوە، خوا قبووڵت دەکات، واتە: بەپێی ئەوە کە ئێمە هەین، بەپێی ئەوەی کە ئێمە ڕەفتار دەکەین، خوا مامەڵەمان لەگەڵدا دەکات، ﴿ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴾، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، یەکێك لەو شتانەی کە لە سەری بە توانایە، ئەوەیە کە لە شەریعەتی خۆیدا دایناوە، کە بۆ پاراستنی ماڵو سامانی خەڵك، ئەوەی بە ڕەنجی شانو ئارەقی نێوچەوانیان وەسەریەکیان ناوە، کەسێك بیدزێو ببێتە حازر خۆری بەر سێبەر، بێئەوەی ئارەقی پێوە بڕێژێ، ئەوە لەڕاستیدا دەبێ سزا بدرێ، بەڵێ ئەوانەی کە دەیانەوێ لەسەر خوێنی خەڵکی دیکە بژینو حازر خۆری بەر سێبەر بن، دەبێ ئەوانە سزا بدرێن، هەروەك چۆن کەسێك کە هێمنییو ئاسایشی کۆمەڵگا بخاتە مەترسی یەوە، خوای بەرز سزای بۆ داناوە لە شەریعەتی خۆیدا، وە لەڕاستیدا ئەگەر شەریعەتی خوای کاربەجێ جێبەجێ بکرێ، کۆمەڵگا پاك دەبێتەوە لە خراپەکاران، چونکە سزاکانی شەریعەت وایان لێدەکەن لە خراپەو تاوان بسڵەمنەوەو هەنگاوی بۆ نەنێن، وە ئەگەر کەسێکیش هەنگاوی بۆ تاوانو خراپەنا، بە هۆی سزادانەکەیەوە، دەبێتە مایەی پەندو عیبرەت بۆ کەسانی دیکەو مایەی سڵەمینەوەیان.

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، لێرەدا خوای پەروەردگار فەرمان بە سێ شتان دەكات:

١- تَقْوَى. ٢- إبْتِغَاء الوَسِيلَة إلى الله. ٣- الجِهَادُ فِي سَبِيلِ الله.

١- (تَقْوَى) ئەگەر بمانەوێ بە كوردیی مانای بكەین واتە: وریایی و هۆشیاریی و ئاگا لەخۆبوون، لە بەرانبەر خوادا ﷻ، چونكە جاری وا هەیە ئەم وشەیە (تَقْوَى) بۆ خۆپاراستن ئاگریش بەكارهاتوە، وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِيٓ أُعِدَّتۡ لِلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾ آل عمران، واتە: خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن كە بۆ بێبڕوایان ئامادە كراوە.

هەروەها لە سوننەتیشدا بە هەمان واتا هاتوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِّ تَمْرَةٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٨٢٧٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦٥٣٩)، ومُسْلِمٌ برقم: (٢٣٤٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٥٥٢)، وَالبَيْهَقِيُّ في شُعب الإيمان برقم ٧٣٣)، عَدِيِّ بْنِ حَاتِمٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتە: خۆتان لە ئاگر (ی دۆزەخ) بپارێزن، ئەگەر بە لەتكە خورمایەكیش بێ، (كە دەیبەخشن لە پێناوی خوادا).

خوێنەرانی بەڕێز!

لەڕاستییدا مەسەلەی تەقوا وەك زانایان گوتوویانە: (جِمَاعُ خِصَالِ الخَيْرِ كلِّها) هەرچی سیفەتی چاكە لەخۆیدا كۆی دەكاتەوە، چونكە ئەگەر ئینسان بە جۆرێك مامەڵەی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا كرد، كە هەمیشە خوا چاودێریەتی، ئاگای لێیەتی، بەسەری ڕادەگات، بێگومان خەت خوار ناكات، بۆیە پێغەمبەر ﷺ لە كاتی ئامۆژگارییكردنی یەكێك لە هاوەڵاندا، كە ئەبو زەڕە

خوا لێی ڕازی بێ، پێی دەفەرموێ: ﴿اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُ مَا كُنْتَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٣٩٢) تعليق شعيب الأرنؤوط: حَسَنٌ لِغَيْرِهِ، وَرَوَاهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١٩٨٧) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالدَّارِمِي برقم: (٢٧٩١)، وَالحَاكِم برقم: (١٧٨)، صحيح على شرط الشيخين ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي، وَالبَزَّار برقم: (٤٠٢٢)، قال الشيخ الألباني: حَسَنٌ}، واتە: لە هەر شوێنێك بووی‌و لە هەر حاڵێكدا هەی پارێز لە خوا بكە، یانی: هەست بە چاودێریی خوا بكەو بە وریایی لەگەڵ خوادا مامەڵە بكە، كە ئەوە بەڕاستیی بناغەی كەسایەتیی سەركەوتوو پاك‌و چاك‌و ڕاست‌و ساغە، كوردەواریی خۆشمان چاك لەو مەسەلەیە حاڵی بوون! دەڵێن: (لەو كەسە بترسێ لە خوا ناترسێ)! كەسێك لە خوا ترسا، لە ترسی خواو، لە شەرمی خواو، لەبەر گەورەیی خوا ﷻ خەت خوار ناكات، پێویستی بەوە نیە قامچیی قانوونیی چاو لێبێ، هەر لە دەروونی خۆیدا لەبەر خوا، لە خەت لانادات، وە مافی خەڵك پێشێل ناكات، سیستەمی حوكمڕانیی ئیسلامیش پێش ئەوەی قامچیی یاساو سزادان پێشانی خەڵك بدات، سزادانی دنیایی یان بۆ دابنێ، لە دەروونیاندا وایان لێ دەكات لانەدەن، بۆچی؟ چونكە چاوی قانوون هەموو شتێك نابینێ‌و، دەستی قانوون‌و سزادان ناگاتە هەموو شوێنێك، بەڵام ئینسان ئەگەر لە زاتی خۆیدا ترسی خوای لە دڵ دابوو و، شەرم‌و ڕێزو هەیبەتی خوای لە دڵ دابوو، لە ڕاستە ڕێ لانادات، وەك زۆرجار بیستراوە كە لە سەردەمی (عومەری كوڕی خەتتاب)دا خوا لێی ڕازی بێ، عومەر لە سەردەمی خیلافەتی خۆیدا، شەوێك دەگەڕێ بە نێو شاری مەدینەداو گوێی لێ دەبێ دایكێك بانگی كچەكەی دەكات: ڕۆڵە هەستە تۆزێك ئاو لە شیرەكە بكە بۆئەوەی بیفرۆشین (لەبەرئەوەی كە شیرەكە كەم بووە، ئەگەر تۆزێ ئاویشی تێبكەن، تاكو زۆربێ‌و بیفرۆشن‌و پارەی زیاتریان بۆ بكات) كچەكەش دەڵێ: دایە! ئەدی نەتبیستوە ئەمیری ئیمانداران عومەری كوڕی خەتتاب قەدەغەی كردوە ئاو بكرێتە شیرەوە؟! دەڵێ: با، ڕۆڵە، بەڵام خۆ ئێستا عومەر ئاگای لێ نیە!! دەڵێ: دایە! ئاخر پەروەردگاری عومەر ئاگای لێیە، ئنجا دەڵێ: عومەر دەرگاكەی ئەو ماڵە دیاریی دەكات، دوایی بە كوڕەكانی دەڵێ: كامەتان دەیەوێ ژنێ بێنێ؟ كچێكم دۆزیوەتەوە لە ماڵێكدا، ئەوە بێنن، عاصیمی كوڕی ئەو ئافرەتە دێنێ، ئەو

ئافرەتە دوایی دەبێتــە نـەنکی عومـەری کوڕی عەبدولـعەزیز، واتـە: دایکـی دایکـی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، خـوا لە هـەموویان ڕازی بــێ.

٢- ئنجـا بەنسبەت ئـەو ڕســتەیەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾، ئێمە بە تەفصیلێ باسـی وەسـیلە دەکەین، بـەڵام ئەگـەر ســەرنج بـدەین: دەبینین ئەوەی قورئان دەیفەرموێ لە کـوێ؟ وە ئـەوەی سوننەت دەیفـەرموێ، لـە کوێ؟ وە ئەوەی لە نێو مسـوڵماناندا بۆتە باوو کلتور، لە کوێ؟!! کە بەراوردیان دەکـەین زۆر زۆر لێك جیـان، بۆیە مسـوڵمانان کـاتێك لـە قورئـانو سوننەت دووردەکەونـەوە، دەکەونەوە نێـو درِكو داڵو کەنـدالّی عـەجایب!! وشـەی: (وسیلە) لـە: ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾دا، ئێسـتا چـەمكو واتـای وای لـێ پەیـداکراوە کـە لەگـەڵ ئایەتەکـە هەر زۆر جیایە، بەڵکو هەر پێچـەوانەی ئایەتەکەیـە! وەك دوایـی باسـی دەکەین! ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾، پێشتریش باسـم کـرد، واتـە: ئـامڕازو هۆکـار بەرەو خـوا بخوازن، یانی: بزانن بە چ شتێك لە خـوا نـزیك دەبنەوە، پەیدای بکـەن، هەڵبەتـە ئینسان پێش هەموو شتێك بە ئیمان لـە خـوا نـزیك دەبێتــەوە، پاشــان بـە عیبـادەت بـۆ خــواو فەرمانبـەریی بـۆ پێغەمبــەر ﷺ وە بـە پێـنج نوێـژە فـەرزەکان، بـە ڕۆژووی مـانگی ڕەمـەزان، بـە زەکـاتو حـەج، بـە مـاڵ بەخشـین، بـە فەرمان بە چاکـەو ڕێگرتن لە خراپە، بە بانگـەوازکردنـی خەڵـك، بـە هەوڵـدان بـۆ چەسـپاندنی دادگـەریـیو لابردنـی زوڵـمو سـتەم، وە هـەروەها، ئەگـەر هـەموو ئـەو شتانەی کە خـوای پەروەردگار بە چاکی داناون، بە پێی توانــا ئـەنجامیان بـدەی، وە هەموو ئەو شتانەی کە خوا بـە خراپـی داناون، خۆتیـان لـێ بـە دوور بگـری، لـە خــوا نــزیك دەبیـەوە، بەڵــێ ئینســان بـە طـاعـەت لـە خــوا نــزیك دەبێتـەوە، طاعـەتیش یـان وازلێهێنـانی گونـاه (معصـیة)یـە، یـان ئەنجـامدانی چاکەیە، ئـەو شـتەی کـە خـوا بـە چاکی دانـاوە، کەواتـە: ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾، یـانی: (أُطلبـوا مَـا تتَقَرَّبُون بِـهِ إلـى اللهِ سُبْحَانهُ وَتَعَالى) ئـەو شـتە بخـوازن کـە پێـی لـە خـوای پاكو بەرز نـزیك دەبنــەوە.

٣- پاشان کە دەفەرموێ: ﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ ﴾، وە لە ڕێی وی (خوا)دا عَزَّ وَجَلَّ، ئەوپەڕی تواناتان بە خەرج بدەن، چونکە دەڵێ: (الجِهَادُ وَالـمُجَاهَدَةُ: اسْتِفْرَاغُ الوُسْعِ فـي مُدَافَعَـةِ العَدُوِّ، والـمُجَاهَدَةُ ثَلاثَـةُ أَضْـرُبٍ: مُجَاهَدَةُ العَدُوِّ الظَّاهِرِ، وَمُجَاهَدَةُ الشَّيْطَانِ، وَمُجَاهَدَةُ النَّفْسِ)، (جِهَاد ومُجَاهَدَة) ئەوەیە کە ئەوپەڕی توانای خۆت لە بەرانبەر دوژمناندا بەکاربێنی، وە جیهاد سێ جۆرە: تێکۆشانو جەنگ کردن لەگەڵ دوژمنی ئاشکرادا، وە تێکۆشان لە بەرانبەر شەیتاندا، وە تێکۆشان لەگەڵ نەفسی خۆتدا.

لە کۆتایی ئایەتەکەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، بەڵکو سەرفرازبن واتە: ئەگەر وابکەن ئێوە سەرفراز دەبن، ئەگەر ئەم سێ شتانە دابین بکەن، تەقوای خوا، وە پەیداکردنی هۆکارو ئامراز بەرەو خوا، وە تێکۆشان لە پێناوی خواداو، خەرج کردنی ئەوپەڕی توانا لە ڕێی خوادا، ئەوە دەبێتە هۆی سەرفرازییتان.

# باسێک لە بارەی وەسیلەو تەوەسسولەوە

وشەی: (تَوَسُّل) واتە: (تَقَرُّب)، ئەوەیە کە ئینسان بە شتێك لە خوا نزیك بکەوێتەوە، جا من بەگشتی لە سێ خاڵدا باسی تەوەسسول‌و وەسیلە دەکەم:

١/ چەمك‌و واتای (وسیلة) چییە، لە قورئان‌و سوننەتدا؟

٢/(وسیلة) بەگشتی بە پێنج مانا بەکارهاتوە، چوار مانایان ڕەوان، یەکێکیان ناڕەوایە.

٣/ هاوارکردنە غەیری خواو، غەیری خوا کردن بە وەسیلەی پاڕانەوە لە خوا، یاخود غەیری خوا کردن بە هۆکاری نزیك کەوتنەوە لە خوا، شتێکی نادروستە.

## خاڵی یەکەم: چەمك‌و واتای (وسیلة) لە قورئان‌و سوننەت دا:

(الآلوسي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] پێناسەیەکی جوانی هێناوە، بۆ وشەی (الوَسيلَة) دەڵێ: (الوَسِيلَةُ: هِيَ فَعِيلَةٌ بِمَعْنَى مَا يُتَوَسَّلُ بِهِ وَيُتَقَرَّبُ إِلَى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ فِعْلِ الطَّاعَاتِ وَتَرْكِ الْمَعَاصِي، مِنْ وَسَلَ إِلَى كَذَا، أَيْ: تَقَرَّبَ إِلَيْهِ بِشَيءٍ) واتە: (وَسِيلَة) لەسەر کێشی (فَعِيلَة)یە، بە مانای ئەوەیە کە دەیکەی بە هۆکارو پێی لە خوای زاڵ‌و شکۆدار نزیك دەبیەوە، لە ئەنجامدانی چاکەکان، وە وازلێهێنانی سەرپێچییەکان، ئەویش لە چییەوە هاتوە؟ لە (وَسَلَ إِلَى كَذَا) لە زمانی عەرەبیدا واتە: بە شتێك خۆی نزیك خستەوە.

ئنجا ئەوە لە ئەسڵی زماندا (الآلوسي) وای هێناوە، وە زۆربەی توێژەرەوانی قورئانیش هەر لەو چوارچێوەیەدا دەسووڕێنەوە.

ئەگەر تەماشای سوننەتی پێغەمبەریش ﷺ بکەین دەبینین لە سوننەتدا وشەی (وَسِيلَة) بە بەرزترین پلەی بەهەشت دانراوە، وەك لەو دوو فەرموودەیەدا هاتوە:

---

١) روح المعاني: ج٣، ص٤١٣.

فەرمایشتی یەکەم: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ قَالَ حِيْنَ يَسْمَعُ النِّدَاءَ: اللَّهُمَّ رَبَّ هذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاَةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ، وَالفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ، حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٨٥٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٦١٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١١) وَقَالَ: صَحِيحٌ حَسَنٌ غَرِيب، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٧٢٢)، وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٤٢٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٨٩) عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتە: هەر کەسێك کاتێك گوێی لە بانگ دەبێ، بڵێ: ئەی خوایە، پەروەردگاری ئەم بانگەوازە تێرو تەواوە، وە ئەم نوێژە بەرپاکراوە! وەسیلەو فەضیلە، بە موحەممەد ببەخشە، وە ئەو پێگەیەی کە تێیدا ستایش دەکرێ کە بەڵێنت پێداوە، پێی ببەخشە، (هەر کەسێك ئەو دووعایە بکات دوای بانگ) ئەوە شەفاعەتی منی بۆ پێویست دەبێ لە ڕۆژی دواییدا، (واتە: شایستەی ئەوە دەبێ کە پێغەمبەر ﷺ شەفاعەتو تکای بۆ بکات).

فەرمایشتی دووەم: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ أَنَّهُ سَمِعَ النَّبِيَّ ﷺ يَقُولُ: (إِذَا سَمِعْتُمُ الْمُؤَذِّنَ فَقُولُوا مِثْلَ مَا يَقُولُ، ثُمَّ صَلُّوا عَلَيَّ، فَإِنَّهُ مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ بِهَا عَشْرًا، ثُمَّ سَلُوا اللهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ، فَإِنَّهَا مَنْزِلَةٌ فِي الْجَنَّةِ لاَ تَنْبَغِي إِلاَّ لِعَبْدٍ مِنْ عِبَادِ اللهِ، وَأَرْجُو أَنْ أَكُونَ أَنَا هُوَ، فَمَنْ سَأَلَ اللهَ لِيَ الْوَسِيلَةَ حَلَّتْ عَلَيْهِ الشَّفَاعَةُ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٥٦٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٨٤)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٥٢٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٦١٤) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٦٧٨)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٩٠)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص خوا لە خۆیو باوکی ڕازی بێ، دەڵێ: گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بوو دەیفەرموو: هەر کاتێك گوێتان لە بانگبێژ بوو، ئەو چی دەڵێ، ئێوەش وا بڵێنەوە، (واتە: وەڵامی بانگ بدەنەوە) دوایی صەڵەواتم لەسەر بدەن، (بڵێن: اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ) چونکە هەر کەسێك صەڵاتێکم لێ بدات، خوا دە صەڵاتی لەسەر دەدات، دوایی داوای وەسیلەم بۆ بکەن، چونکە (وسيلة) پلەیەکە لە بەهەشت تەنیا بۆ یەکێك لە بەندەکانی خوا شایستەیە، وە ئومێدم وایە کە من ئەو بەندەیە بم، (کە بەرزترین پلەی بەهەشتە)، ئنجا هەر کەسێك وەسیلەم بۆ داوا بکات، ئەوە شەفاعەتی منی بۆ پێویست دەبێ.

كەواتە: ئەوە چەمكو واتای وسیلەیە لە زمانی عەرەبیو لە سوننەتی پێغەمبەردا ﷺ.

## خاڵی دووەم: وشەی (وسیلة) بە پێنج مانایان بەكارهاتوە، چواریان ڕەواو یەكیان ناڕەوایە:

(وَسیلَة) لە بەكارهێنانی هاوەڵانیشدا خوا لێیان ڕازی بێ، بە چوار واتای ڕاست بەكارهاتوە، وە خەڵكێكی عەوام، بەتایبەت ئەهلی تەصەووف، بە مانایەكی چەوتو هەڵەش بەكاریان هێناوە، ئنجا ئێمە چوار مانا ڕاستەكان باس دەكەین، دوایی مانا چەوتو هەڵەكەش دەخەینە ڕوو، كە بەداخەوە زۆر لە مسوڵمانان تەنانەت هەندێك لە ئەهلی عیلمیش بە هەڵە لە مانای وەسیلەو تەوەسسول تێگەیشتوون، وە بە شێوەیەك ئەو وشەیە بەكاردێنن، یاخود بە بیانووی ئەو وشەیە هەندێ ڕەفتارو هەڵسوكەوت دەكەن، كە زۆر پێچەوانەی عەقیدەی ئیسلامییە، وە پێچەوانەی خودی ئەو ئایەتەشە كە باسی وەسیلەی تێدا هاتوە! ئنجا وەسیلە بەگشتی بە پێنج مانایان هاتوە، كە وەك گوتم چواریان ڕەواو ڕاستن، یەكێكیشیان ناڕەوایە:

١) لە قورئاندا وشەی وەسیلە، وەكو ئەسڵی مانا زمانەوانییەكەی كە لە (ئالووسیی)یەوە هێنامان، ئاوا هاتوە، بریتییە لە هۆكارو ئامرازی لە خوا نزیككەوتنەوە، وە وشەی وەسیلە لە قورئاندا لە دوو ئایەتدا هاتوە، لەم ئایەتەی سوورەتی (المائدة)دا كە ئێستا خەریكی تەفسیر كردنینی، ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾، وە لە ئایەتی (٥٧)ی سوورەتی (الإسراء)دا، كە دیارە ئێمە ئایەتی (٥٦)یشی لەگەڵ دێنین، چونكە بەیەكەوە پەیوەستن، خوا دەفەرموێ: ﴿ قُلِ ٱدۡعُواْ ٱلَّذِينَ زَعَمۡتُم مِّن دُونِهِۦ فَلَا يَمۡلِكُونَ كَشۡفَ ٱلضُّرِّ عَنكُمۡ وَلَا تَحۡوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓۚ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحۡذُورٗا ﴿٥٧﴾ ﴾، واتە: بڵێ:

لەوانە بپاڕێنەوە کە پێتان وایە لە جیاتی (خوا) دەپەرسترێن، نە دەتوانن زیانتان لێ لابەرن و نە دەشتوانن لێیان لابدەن، ئەوانەی کە لێتان دەپاڕێنەوە ئەوانە خۆیان هۆکارو ئامراز دەخوازن، بەرەو پەروەردگاریان، (واتە: ئەوانە بۆ خۆیان دەیانەوێ لە خوا نزیك ببنەوە)، وە بە ئومێدی بەزەیی خوان، وە لە سزای خوا دەترسێن، بێگومان سزای پەروەردگارت مەترسیی لێکراوە، واتە: ئەو صالحانەی کە ئێوە لێیان دەپاڕێنەوە، ئنجا پێغەمبەرانن، مەلائیکەن، بەندە صالحەکانی دیکەن، ئەوان بۆخۆیان بە دوای هۆکارو ئامرازێکدا دەگەڕێن، پێی لە خوا نزیك بکەونەوە، وە هیچیان بۆ ئێوە پێناکرێ، بگرە هیچیان بۆخۆیان پێ ناکرێ، بۆخۆیان خوا خوایانە تۆزێك لە خوا نزیك بکەونەوە، کەواتە: (فَاقِدُ الشَّيء لا يُعْطيهِ)، واتە: کەسێك بۆخۆی شتێکی نەبێ، ناتوانێ بیبەخشێ، ئەوان بۆخۆیان چاوەڕێی ڕەحمەتی خوان، بۆخۆیان لە سزای خوا دەترسێن و، بەتەمای ئەوەن خوا لێیان خۆشبێ، ئێستا چۆن دەتوانن لە ئێوە خۆشبن و ئێوە بەرەو لای خوا بەرن؟ بەو واتایە کە گوناهتان لێ لابەرن و لێتان خۆشبن، ئەوانە ئیشی ئەوان نین، کەواتە: (وسیلة) لە قورئاندا بەمانای هۆکاری لە خوا نزیکبوونەوەیە.

٢) لە سوننەتیشدا وەك پێشتر باسمان کرد، لەو دوو فەرموودەیەدا کە هێنامانن (وَسیلَة) بریتیە لە بەرزترین پلەی بەهەشت، کە ئەویش تەنیا بۆ یەکێك لە بەندەکانی خوا شایستەیە، کە کۆتا پێغەمبەرە ﷺ، وەك خۆی فەرموویەتی: ئومێدم وایە کە من ئەو بەندەیە بم، وە ئێستا ئۆممەتەکەی، هەموو ئەوانەی کە ئەو فەرمایشتانە جێبەجێ دەکەن، دوای هەر بانگێك دەڵێن: ﴿اللَّهُمَّ رَبَّ هَذِهِ الدَّعْوَةِ التَّامَّةِ، وَالصَّلاةِ القَائِمَةِ، آتِ مُحَمَّداً الوَسِيلَةَ، وَالفَضِيلَةَ، وَابْعَثْهُ مَقَاماً مَحْمُوداً الَّذِي وَعَدْتَهُ﴾، هەموومان ئەو دووعایەی بۆ دەکەین، ئومێدمان وایە بەبەر شەفاعەتی پێغەمبەریش ﷺ بکەوین، چونکە فەرموویەتی: هەر کەس دوای هەر بانگێك ئەو دووعایە بکات: ﴿حَلَّتْ لَهُ شَفَاعَتِي يَوْمَ القِيَامَةِ﴾[1].

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٨٥٩)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٨٩)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٥٢٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١١)، وَالنَّسَائِيُّ في (الكبرى) برقم: (٩٨٧٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٧٢٢) وَابْنُ خُزَيْمَة برقم: (٤٢٠)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٩٨)، وَالطَّبَرَانِيُّ في الأوسط برقم: (٤٦٥٤).

٣ و ٤) مانای سێیەمو چوارەمی وەسیلەو تەوەسسول لە لای هاوەڵان، ئەوانیش بە دوو واتا بەکاریان هێناوە، هەردووکیشیان ڕاستن، وەك (الآلوسي) گوتوویەتی: (التَوَسُّل بالنَّبيِّ، والتَوَجّه بهِ إلى الله، لَهُ مَعنيان صَحيحَان) پێغەمبەر ﷺ یان کردوە بە وەسیلەو ڕوو پێکردنە خوا لە پشت پێغەمبەرەوە بوەستن، بۆئەوەی پێغەمبەر ﷺ بەرەو خوایان بەرێ، کە ئەویش دوو مانای ڕاستو دروستی هەن:

١- (التَوَسُّل بالإيمانِ بِهِ وبطَاعَتِهِ) خۆ لە خوا نزیك خستنەوە بە بڕوا پێبوونی پێغەمبەرو فەرمانبەریی بۆ کردنی، کە ئێمە لە خوا بپاڕێینەوەو بڵێین: خوایە! لەبەر خاتری ئیمانمان بە پێغەمبەر ﷺ، وە لەبەر خاتری ئەوەی کە ئێمە فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ دەکەین، لێمان خۆشبە.

٢- (دُعَاؤُهُ وَشَفَاعَتُهُ) ئەویش ئەوەیە کە داوا لە پێغەمبەر ﷺ بکرێ، تا دووعاو تکامان بۆ بکات، وەك چۆن ئێمە داوای وەسیلەی بۆ دەکەین، ئەویش شەفاعەتمان بۆ بکات، ئەوەش دروستە.

بەڵگەی ڕەوایی مانای یەکەمیان:

ئەوەیە کە ئێمە هەوڵبدەین بە هۆی ئیمانمان بە پێغەمبەرو ﷺ بە هۆی فەرمانبەرییمانەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ، لە خوا نزیك بکەوینەوە، ئەویش ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ﴾، هۆکار بەرەو خوا بخوازن، ئیمان هێنانمان بە پێغەمبەرو فەرمانبەرییمان بۆ پێغەمبەر ﷺ دەبێتە هۆکاری لە خوا نزیککەوتنەوەمان، چونکە ﴿وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ﴾، (أي: وَابتَغوا إليْهِ القُربَة بطَاعَةِ رَسُولِهِ) دیارە فەرمانبەریی بۆ پێغەمبەریش ﷺ فەرمانبەریی یە بۆ خوا، وەك خوا لە سوورەتی (النساء) ئایەتی (٨٠)دا دەفەرموێ: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدۡ أَطَاعَ ٱللَّهَ ...﴿٨٠﴾﴾، واتە: هەر کەسێك فەرمانبەریی پێغەمبەر بکات، ئەوە فەرمانبەریی خوای کردوە، کەواتە: دروستە ئێمە لە خوا بپاڕێینەوەو بڵێین: خوایە! بە هۆی فەرمانبەرییمان بۆ پێغەمبەر ﷺ لێمان خۆشبە، وە بە هۆی ئیمانمانەوە بە پێغەمبەر ﷺ لێمان خۆشبە.

بەڵگەی ڕەوایی مانای دووەمیان:

وە مانایەکی دیکەی (تَوَسُّل)ی ڕاست بە پێغەمبەر ﷺ ئەوەیە کە داوای دووعای لێبکەین و داوای شەفاعەتی لێبکەین، ئەوەش ڕاستەو، لەگەڵ دەقەکانی قورئان و سوننەتدا تەبایە، ئەم شوێنەوارەش لەوبارەوە هەیە: ﴿عَنْ عُمَرَ ابْنَ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، لَمَّا خَرَجُوا يَسْتَسْقُونَ: (اللَّهُمَّ إِنَّا كُنَّا إِذَا أَجْدَبْنَا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّنَا فَتَسْقِينَا، وَإِنَّا نَتَوَسَّلُ إِلَيْكَ بِعَمِّ نَبِيِّنَا)، مَعْنَاهُ بِدُعَائِهِ هُوَ رَبَّهُ وَشَفَاعَتِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (١٠١٠)}، واتە: عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، (دیارە جارێك وشکە ساڵی بوو، باران نەباریبوو، دەستی عەبباسی مامی پێغەمبەری گرت و لەگەڵ مسوڵمانان چوون بۆ دەشتێك بۆ نوێژە بارانە، یان هەر لە میحرابی پێغەمبەردا لەنێو مزگەوت، ئەو کات دیارە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ خەلیفەی مسوڵمانان بووە) گوتی: ئەی خوایە! ئێمە ئەگەر وشکە ساڵی دەبوو تەوەسسولمان بە هۆی پێغەمبەرمانەوە بۆ لای تۆ دەکرد، تۆش بارانت بۆ دەباراندین، ئێستاش تەوەسسول دەکەین بۆ لای تۆ بە مامی پێغەمبەرەکەمان، بارانمان بۆ ببارێنە، (واتە: ئەو دەکەینە هۆکار کە لە تۆ نزیك بینەوە، کە مامی پێغەمبەر دووعامان بۆ بکاو تکامان بۆ بکات لە تۆ بپاڕێتەوە، بارانمان بۆ ببارێنی).

لێرە دایە زۆر لە ئەهلی تەصەووف و خەڵکی عەوام بە هەڵە داچوون، بەڵام وەك دەبینین عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، تەوەسسولی بە خودی عەبباسی مامی پێغەمبەر خوا لێی ڕازی بێ، نەکردوە بەڵکو تەوەسسولی بە پاڕانەوەو تکاکردنی عەبباس کردوە، واتە داوایان لە عەبباس کردوە کە لە خوا بپاڕێتەوەو داوا لە خوای بەخشەر بکات، بارانیان بەسەردا ببارێنێ، هەتا پێغەمبەر ﷺ مابوو ئەو دوعای دەکرد، چونکە دەبێ بزانین: مەبەست ئەوەنییە کە ئەگەر عەبباس نەبووایە خوای بە بەزەیی بارانی نەدەباراند، بەڵام عومەر خوا لێی ڕازی بێ، وەك خۆ بەکەمگریی (تواضع) وایکردووەو پێغەمبەری خواو خزمەکانیشی زۆر خۆشویستوە، دیارە عەبباسیش خوا لێی ڕازی بێ کە مامی پێغەمبەرە ﷺ، وە عومەر خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: مسوڵمانبوونی عەبباسم پێ خۆشتر بوو لە مسوڵمانبوونی خەتتابی بابم، چونکە دەزانم

پێغەمبەر ﷺ بە مسوڵمانبوونی عەبباسی مامی چەندە دڵی خۆشبوو، تەماشا بکەن چەند دڵسۆز بووە! ئەگەرنا عومەرو خەلیفەو زانایانی دیکەش هەبوون کە لە کاتی نەبارینی باراندا داوای باران بارینیان کردوە.

کەواتە: (تَوَسُّل) بە دوعای عەبباس خوا لێی ڕازی بێ کراوە، نەك زاتی عەبباس، پێغەمبەریش ﷺ تا زیندوو بووە دوعای بۆ کردوون، ئێستا کە لە نێوماندا نەماوە، مردوە دەبێ یەکێکی دیکە دوعا بکات، ئنجا ئەگەر دوعاکردنەکان بە زاتی شەخصەکان بووایە، دیارە پێغەمبەر ﷺ لە پێشتر بوو لە عەبباس، دەیانگوت: ئەی خوای پەروەردگار! لە تۆ دەپاڕێینەوە بە پێغەمبەر ﷺو ئەو دەکەینە وەسیلە بۆ لای تۆ، ئنجا ئەوەی پشتگیری ئەوەش دەکات، ئەوەیە کە دەڵێ: عەبباس دوعای دەکردو عومەری کوڕی خەتتابو مسوڵمانانیش لە پشتیەوە ئامینیان دەکرد، ئەو دەپاڕایەوە ئەوانیش دەیانگوت: ئامین، کەواتە: ئەو (تَوَسُّل)ەی کە بە پاڕانەوەو شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەکرێ، ئەوە لە دوای وەفاتیو مردنی تێپەڕیوەو نەماوە، بەڵام ئەو (تَوَسُّل)ەی کە بە پێغەمبەر ﷺ دەکرێ، کە ئیمان پێهێنانو فەرمانبەریی بۆ کردنیەتی، ئەوە دوای مردنیشی هەر هەیە.

٥) (التَوَسُّل بِهِ بِمَعنَى الإقْسَام عَلَى اللهِ بِذَاتِهِ وَالسُؤال بذَاتِهِ)، واتە: سوێند بە خوا بخورێ بە زاتی پێغەمبەر ﷺ، یان زاتی هەر کەسێك کە داوای پێ لە خوا بکرێ، بۆ وێنە: بگوترێ: خوایە لەبەر خاتری فلاَن کەس ئاواو ئاوام بۆ بکە!

لەوبارەوە (محاسن التأويل) ئەو قسەیە لە (إبنُ تيمية) دەخوازێتەوە، کە تەفصیلێکی هەیە، من پوختم کردۆتەوە، گوتوویەتی: (فَهَذَا هُوَ الَّذِي لَمْ تَكُنْ الصَّحَابَةُ يَفْعَلُونَهُ فِي الإسْتِسْقَاءِ وَنَحْوِهِ لا فِي حَيَاتِهِ وَلا بَعْدَ مَمَاتِهِ، لا عِنْدَ قَبْرِهِ وَلا غَيْرِ قَبْرِهِ، وَلا يُعْرَفُ هَذَا فِي شَيْءٍ مِنَ الأَدْعِيَةِ الْمَشْهُورَةِ بَيْنَهُمْ، وَإنَّمَا يُنْقَلُ شَيْءٌ مِنْ ذَلِكَ فِي أَحَادِيثَ ضَعِيفَةٍ مَرْفُوعَةٍ وَمَوْقُوفَةٍ، أَوْ عَمَّنْ لَيْسَ قَوْلُهُ حُجَّةً كَمَا سَنَذْكُرُ ذَلِكَ إنْ شَاءَ اللهُ تَعَالَى... وَهَذَا هُوَ الَّذِي قَالَ أَبُو حَنِيفَةَ وَأَصْحَابُهُ: إنَّهُ لا يَجُوزُ وَنَهَوْا عَنْهُ حَيْثُ قَالُوا: لا يُسْأَلُ بِمَخْلُوقٍ وَلا يَقُولُ أَحَدٌ: أَسْأَلُكَ بِحَقِّ أَنْبِيَائِكَ... وَقَالَ القدوري: الْمَسْأَلَةُ بِخَلْقِهِ لا تَجُوزُ، لأَنَّهُ لا حَقَّ

لِلْخَلْقِ عَلَى الْخَالِقِ فَلا تَجُوزُ وِفَاقًا)[1]، واتە: (إبنُ تيمية) ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (ئەوەی پێنجەمیان) ئەوەیە کە (بڵێی: خوایە! من سوێندت لێ دەخۆم، ئەو شتەمان بۆ بکەی، لە بەرخاتری فلان کەس)، هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ شتی وایاننەگوتوە، نە بۆ داواکردنی باران، وە نە بۆ غەیری ئەوەش، نە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ کە زیندوو بووە، (هیچ هاوەڵێك نەچووە بڵێ: خوایە! لەبەر پێغەمبەر ئاوامان بۆ بکە)، وە نە دوای مردنیشی، نە لە لای گۆڕەکەی، نە لە لای غەیری گۆڕەکەشی، وە ئەوە نەزانراوە لەو دوعایانەی کە ناسراوو ناوداربوون لە نێوانیاندا، وە هاوەڵان دوعایان کردوە، لە دوعایەکانیشیان دا شتی وا نەبووە، بەڵکو هەندێك لەو جۆرە شتانە لە هەندێك فەرمووددان کە سەنەدەکەیان بێهێزە، کە پاڵ دەدرێن بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، یاخود پاڵ نادرێن‌و دەوەستێنرێن، {فەرموودەی (مرفوع) واتە: لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراوەتەوە، (موقوف) ئەو فەرموودەیە کە هاوەڵێك دەیگێڕێتەوەو لەسەر وی ڕادەوەستێ‌و ناچێتە پاڵ قسەی پێغەمبەر ﷺ} یاخود لە هەندێك کەس کە قسەیان بەڵگە نیە، (لەڕاستییدا بەڵگەی شەرعیی تەنیا قورئان‌و سوننەتە)، وە ئەوەشە کە ئەبو حەنیفەو هاوەڵانی پێشگیریان لێکردوەو گوتوویانە: دروست نیە، بە دروستکراو داوا لە دروستکەر ناکرێ، وە هیچ کەسێك نالێ خوایە! لەبەر هەقی پێغەمبەران ئەو شتەمان بۆ بکە، وە قەددوریی (کە یەکێکە لە زانایانی حەنەفی مەزهەب) دەڵێ: داواکردن بە دروستکراو دروست نیە، چونکە هیچ دروستکراوێك هەقی لەسەر بەدیهێنەر نیە، لەبەرئەوە دروست نیە.

## خاڵی سێیەم: هاوارکردنە غەیری خوا، وە غەیری خوا کردن بە وەسیلەی پاڕانەوە لە خوا دروست نیە:

لێرەدا دەمەوێ ئاماژەی بە قسەیەکی (الآلوسي) بکەم لە تەفسیرەکەیدا بە ناوی (روح المعاني)، {بۆ زانیارییتان (الآلوسي) یەکێك بووە لە زانایانی قورئان، وە خۆی بە شوێنکەوتووی تەریقەتی نەقشبەندیی داناوە لە ڕووی تەزکیەی

١) محاسن التأويل ج٤، ص١٨٦– ١٨٧، کە ئەویش لە (کتاب الوسيلة)ی (إبنُ تيمية)وە هێناویەتی.

نەفسەوە، وە یەكێكیش بووە لە خەلیفەكانی مولانا خالیدی نەقشبەندییو، لە ژێر ناوونیشانی: (التفسير الإشاري)دا هەندێ قسەی ئەهلی تەصەووف دێنێ كە من تێبینییم لەسەر زۆر لەو قسانەی هەیە، بەلاّم بە هەرحالّ، ئینكاریی ناكرێ كە یەكێكە لە زانا گەورەكان}، دەلّێ: (وَاسَتَدَّلَ بَعْضُ النَّاسِ بِهَذِهِ الآيةِ عَلَى مَشْروعِيَةِ الإستِغَاثة بالصَّالِحِينَ وَجَعْلِهِم وَسِيلَةً بَيْنَ اللهِ تَعَالى وَبَيْنَ العِبَاد وَالقَسَم عَلَى اللهِ تَعَالى بِهِم بِأَن يُقَالَ: اللَّهُمَ إنَّا نُقْسِمُ عَلَيكَ بِفُلانٍ أنْ تُعْطِينا كَذَا، وَمِنْهُم مَنْ يَقُولُ لِلْغَائِبِ أَو المَيِّتِ مِنْ عِباد الله تَعَالى الصَّالحين: يَا فُلان ادعُ الله تَعَالى لِيُرزقُني كَذَا وَكَذَا، وَيَزْعُمُونَ أنَّ ذَلِكَ مِنْ بابِ ابْتِغَاءِ الوَسِيلَة، وَيروونَ عَنِ النَّبِيّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، أَنَّهُ قَالَ: إذَا أعيتكم الأُمُورُ فَعَلَيْكُم بأَهْلِ القُبُور، أَو فَاستَغِيثوا بِأَهْلِ القُبُورِ، وَكُلُّ ذَلِكَ بَعِيدٌ عَنِ الحَقّ بِمَرَاحِل)[1]، واتە: هەندێك لە خەلّكی ئەم ئایەتە بە بەلّگە دێننەوە لەسەر ڕەوایی هاوار كردنە پیاوچاكانو كردنیان بە وەسیلە لە نێوان بەندەكانو خوای بەرزدا، وە سوێند لە خوا دەخۆن بەوان كە بگوترێ: خوایە! سوێندت لێ دەخۆم بە فلاّن كەس، كە فلاّن شتەم بدەیە، یاخود هەیانە بە كەسێك كە نادیارە، یاخود كە مردووشە لە بەندە چاكەكانی خوا، (دەچێتە سەر قەبرەكەی، یان لە مالّێ هاواری دەكات) دەلّێ: ئەی فلاّن كەس! لە خوای بەرز بپاڕێوە كە فلاّن شتەو فلاّن شتەم پێبدات، وە پێیانوایە ئەوە لە جۆری داواكردنی هۆكارە بەرەو خوا، وە لەوبارەشەوە ئەوە لە پێغەمبەر ﷺ دەگێڕنەوە، گوایە: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: هەر كاتێك كاروبارەكان سەغلّەتیان كردن، ڕووبكەنە خەلّكی گۆڕستان، یاخود هاوار بكەنە خەلّكی گۆڕستان، (كە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز شتی وای نەفەرمووەو وەك ئالووسیی دەلّێ) ئەوە چەند قۆناغ لە هەق دوورە.

دوایی ئالووسیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لە ژێر ناوونیشانی: (تَحقيق الكَلاَم في هَذَا المَقَام)دا، واتە: ساغكردنەوەی قسە لەوبارەوە، (توسُّل) بە گشتی دەكاتە چوار جۆر، سێیان بە ڕەوا دەزانێ، دەلّێ:

---

١) ج٣، ص٤١٤ – ٤٢٢.

**یەکەم:** ﴿أنَّ الإستِغاثَةَ بِمَخْلُوقٍ وَجعْلِهِ وَسيلَةً بمَعْنَى طَلَبِ الدُّعاءِ مِنْهُ لا شَكَّ فِي جوَازِهِ إنْ كَانَ المَطْلُوبُ مِنْهُ حياً، ولا يَتَوَقَّفُ عَلَى أفْضَلِيتهِ مِنَ الطالِبِ بَلْ قَدْ يطلُبُ الفَاضِلُ مِنَ المفضُول، فَقَدْ صَحَّ أنَّهُ ﷺ قَالَ لعُمَرَ رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ لَما اسْتَأْذَنَهُ في العُمْرَة: (لاَ تَنْسَنَا يَا أخِي مِنْ دُعَائِكَ)!﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٤٩٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٨٩٤)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٥٦٢)، وإسناده ضعيف، كمَا ذكر الشيخ شاكر والألباني}، واته: حاڵەتی یەکەم ئەوەیە ئینسان هاوار بکاتە دروستکراوێك لە دروستکراوەکانی خواو، بیکاتە وەسیلە کە داوای لێبکات بۆی بپاڕێتەوە، (یانی دووعام بۆ بکە)، گومان لە دروستی ئەو حاڵەتە ناکرێ، بەمەرجێك داوا لێکراو زیندووبێ، وە ئەوەش پەکی لەسەر ئەوە نەکەوتوە کە ئەوەی داوای لێ دەکرێ، لە داواکارەکە باشتربێ، بەڵکو جاری وایە کەسێك کە باشترە داوا لە کەسێك دەکات کە بە قەدەر ئەو باش نیە، (داوای لێدەکاتو دوعای بۆ دەکات)، وەك لە ڕێیەکی ڕاستەوە پێمانگەیشتوە کە پێغەمبەر ﷺ بە عومەری کوڕی خەتتابی خوا لێی ڕازی بێ فەرموو، کاتێك مۆڵەتی لێوەرگرت بۆ عومرە: (لاَ تَنْسَنَا يَا أَخِي مِنْ دُعَائِكَ)، واتە: ئەی براکەم لە دوعای خۆت بێبەشمان مەکە، (هەرچەندە هەندێك لە زانایانی فەرموودەناس ئەو فەرموودەیان بە بێهێز زانیوە، وەك شێخ شاکرو شێخ ئەلبانیی)، پاشان دەڵێ: {وَأمْرَهُ أيضاً أن يطلُبَ مِن أُوَيْس القرَنِي رَحْمَةُ اللهِ تَعَالَى عَلَيْهِ أَنْ يَسْتَغْفِرَ لَهُ: (فَإنِ اسْتَطَعْتَ أنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ، فَافْعَلْ، فَطلبَ منه الإسْتغْفار، فاسْتَغْفَرَ لَهُ)[1] وَأمرَ أُمَّتَهُ ﷺ بطَلَبِ الوَسِيلَةَ لَهُ كَمَا مَرَّ آنِفاً وَبِأَنَّ يُصَلُّوا عَلَيْهِ}، واتە: وە هەروەها بە عومەری کوڕی خەتتابی خوا لێی ڕازی بێ فەرموو: کە داوا لە ئوەیسی قەرەنیی بکات تا داوای لێبوردنی بۆ لە خوا بکات، فەرمووی: (فَإنِ اسْتَطَعْتَ أنْ يَسْتَغْفِرَ لَكَ، فَافْعَلْ، فَطلب منه الإسْتغْفار، فاسْتَغْفَرَ لَهُ)، واتە: ئەگەر توانیت وای لێبکەی داوای لێبوردنت بۆ لە خوا بکات، وا بکە، دیارە عومەریش خوا لێی ڕازی بێ داوای لێکرد کە داوای لێبوردنی بۆ لە خوا بکات، ئەویش

١) أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٦٦٥٦)، وَأَحْمَد برقم: (٢٤٨٤٥)، وَأَبُو يَعلى برقم: (٤٥٩٣).

داوای لێبوردنی بۆ لە خوا کرد، هەروەها پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە ئۆممەتی کە داوای وەسیلەی بۆ بکەن، (وەك پێشتر باسمان کرد)، وە صەڵەواتی لێبدەن.

کە دیارە پێغەمبەر ﷺ لە هەموو ئۆممەتەکەی باشترە، کەچی دوعاشی بۆ دەکەن، ئەوە حاڵەتی یەکەمی تەوەسسولی دروستو ڕەوایە.

**دووەم:** {وَأَمَّا إِذَا كَانَ الـمَطْلُوبُ مِنْهُ مَيتاً أَوْ غَائِباً فَلا يَستريبُ عَالِمٌ أَنَّهُ غَيْرُ جَائِزٍ وَأَنَّهُ مِن البِدَعِ الّتِي لَمْ يَفعلها أَحَدٌ مِنَ السَّلَفِ}، واتە: بەڵام ئەگەر داوا لێکراوەکە مردووبووو، یان لەوێ نەبوو (بۆ وێنە: لە شارێکی دیکەیە، تۆ لێرەوە داوای لێبکەی دوعات بۆ بکات) ئەوە هیچ زانایەك گومانی لەوەدانیە کە دروست نیە، وە لەو داهێنراوانەیە کە هیچ کام لە زانایانی پێشین شتی وایان نەکردوە.

**سێیەم:** {نَعَمْ السَّلامُ عَلَى أَهْلُ القبُور مَشروعٌ وَمُخَاطبَتهم جَائِزَة؛ فَقَدْ صَحَّ أَنَّهُ ﷺ كَانَ يُعلمُ أَصْحَابَهُ إِذَا زَارُوا القُبُورَ أَنْ يَقُولُوا: (السَّلامُ عَلَيكُمْ أَهْلَ الدِّيَارِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِينَ، وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللهُ تعالى بِكُم لاحِقُونَ، يَرحَمِ اللهُ تَعَالى الـمُستَقدمِينَ مِنَّا وَمِنْكُم، والـمُستَأخرِينَ نَسْأَلُ اللهَ تَعَالى لَنَا وَلَكُمْ العَافِيَة، اللَّهُمَّ لا تَحرِمْنَا أَجْرَهُمْ وَلا تَفْتِنَّا بَعْدَهُمْ وَاغفِرْ لَنَا وَلَهُمْ)[١]، وَلَمْ يرد عَن أَحَدٍ مِنَ الصَّحَابَةِ رَضِيَ اللهُ تَعَالى عَنْهُمْ وَهُمْ أَحْرَص الخَلْق عَلَى كُلّ خَير أَنَّهُ طَلَبَ مِن مَيِّت شَيئاً، بَلْ قَدْ صَحَّ عَن ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ تَعَالى عَنْهُمَا أَنَّهُ كَانَ يَقُولُ: إِذَا دَخَلَ الحُجْرَةَ النَّبَويَّة زَائِراً: السَّلامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ الله؛ السَّلامُ عَلَيْكَ يَا أَبَا بَكْرٍ، السَّلامُ عَلَيْكَ يَا أَبَتِ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ ولا يَزِيدُ عَلَى ذَلِكَ ولا يطلبُ مِن سيد العَالَمِين ﷺ أَوْ مِنْ ضَجِيعيهِ الـمكرَّمَيْن رَضِيَ اللهُ تَعَالى عَنْهُمَا شَيَئاً، وَهُمْ أَكْرَم مِن ضَمَّتهُ البَسيطة، وَأَرْفَعُ قَدْراً مِنْ سَائِر من أَحَاطَتْ بِهِ الأَفْلاكُ الـمُحيطَةَ}، واتە: بەڵێ، ئەگەر سڵاویان لێبکەیو بیاندوێنی، (واتە: دواندنێکی یەك تەرەفانە) ئەوە دروستە، چونکە لە ڕێی ڕاستەوە

---

١) أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٤٨٤٥)، وَابْنُ مَاجَه برقم: (١٥٤٦)، وَالبَيْهَقِي في (شعب الإيمان) برقم: (١٩١) قال الشيخ الألباني: ضعيف وهو صحيح دون: اللهم لا... .

پێمانگەیشتوە کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی بەڕێزی خۆی فێر دەکرد، ئەگەر سەردانی گۆڕستانیان کرد، بڵێن: سڵاوتان لێ بێ ئەی خاوەنی ئەم مەنزڵگایانە لە ئیمانداران و مسوڵمانان، وە ئێمەش هەرکاتێك خوای بەرز ویستی پێتان دەگەین، خوای بەرز بەزەیی بێتەوە بە پێشووانی ئێمەو ئێوەدا، وە بە دواییانی ئێمەو ئێوەشدا، ئەوانەمان کە تێپەڕبوون و هاتوون بۆ لای ئێوە، وە ئەوانەش کە دوایی دێن، لە خوای بەرز بۆ ئێوەو بۆ ئێمە سەلامەتی داوا دەکەین، خوا لە پاداشتیان بێبەشمان مەکەو، لە دوای وان تووشی بەڵامان مەکە، وە لە ئێمەو لەوانیش خۆشبە.

وە لە هیچ کام لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ نەگێڕدراوەتەوە لەگەڵ ئەوەشدا کە لە هەموو کەس سوورتربوون لەسەر هەموو خێرو چاکەیەك، کە هیچ کامیان داوای لە مردوویەك کردبێ، بۆ هیچ شتێك، بەڵکو لە ڕێی ڕاستەوە پێمان گەیشتوە کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، کاتێك دەچووە نێو ئەو ژوورەی کە پێی دەگوترێ: (الْحُجْـرَةَ النَّبَوِيَّة)، (کە هەر سێ گۆڕی پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ لەوێدان) بۆ سەردانی کردنیان دەچوو، دەیگوت: (السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا رَسُولَ الله؛ السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا أَبَا بَكْر، السَّلَامُ عَلَيْكَ يَا أَبَتِ)، واتە: سەلامت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا، سەلامت لێ بێ ئەی ئەبو بەکر، سەلامت لێ بێ ئەی بابە، دوایی دەڕۆیشت، لەوە زیاتری نەدەگوت، وە هیچ شتێك لە سەرووەری جیهانییان (کە پێغەمبەرە ﷺ) وە لە دوو هاوەڵە لەلا نێژراوەکەی، کە لە هەموو کەس بەڕێزترن، هیچ شتێکی داوا لێ نەکردوون، لەگەڵ ئەوەشدا، کە ئەو سێیانە (پێغەمبەر ﷺ و ئەبو بەکرو عومەر خوا لێیان ڕازی بێ) لە هەموو ئەوانەی کە زەوی گرتوونیە خۆی، بەڕێزترن، {دیارە جگە لە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام)} وە پایەیان بەرزترە لە هەموو ئەوەی کە فەلەکەکان دەوریان داوە، (دیارە تۆزێك موبالەغەی سۆفییانەی کردوە)[1]، واتە: هیچی لە هەر کام لەو سێیانە داوا نەکردوە، بەس سەلامی لێکردوون.

---

١) ئاشکرایە ئەوەی نێوان ئەو دوو کەوانەیە قسەی خۆمە.

**چوارەم:** {وَأَمَّا القَسَمُ عَلَى اللهِ تَعَالى بِأَحَدٍ مِنْ خَلْقِهِ مِثْلَ أَن يُقَالَ: اللَّهُمَّ! إِنِّي أُقْسِمُ عَلَيْكَ أَوْ أَسْأَلُكَ بِفُلان إِلاَّ مَا قَضيت لِي حَاجَتِي، فَعَن ابْنُ عَبْدُ السَّلامِ جَوَاز ذَلِكَ فِي النَّبِي ﷺ لأَنَّهُ سَيِّد وَلَدِ آدَمَ، وَلا يَجُوزُ أَنْ يُقْسَمَ عَلَى اللهِ تَعَالى بِغَيْرِهِ مِنَ الأَنْبياءِ وَالملائِكَةِ وَالأَوْلِيَاءِ، لأَنَّهُم لَيْسُوا فِي دَرَجَتِهِ، وَدَلِيلهُ فِي ذَلِكَ مَا رَوَاهُ التِّرمِذِيُّ وَقَالَ حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ: (عَنْ عُثْمَانَ بْنِ حُنَيْفٍ رَضِيَ اللهُ تَعَالى عَنْهُ أَنَّ رَجُلاً ضَرِيرَ الْبَصَرِ أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: ادْعُ اللهَ أَنْ يُعَافِيَنِي قَالَ: إِنْ شِئْتَ دَعَوْتُ، وَإِنْ شِئْتَ صَبَرْتَ فَهُوَ خَيْرٌ لَكَ؟ قَالَ: فَادْعُهْ، قَالَ: فَأَمَرَهُ أَنْ يَتَوَضَّأَ فَيُحْسِنَ وُضُوءَهُ، وَيَدْعُوَ بِهَذَا الدُّعَاءِ: اللَّهُمَّ! إِنِّي أَسْأَلُكَ، وَأَتَوَجَّهُ إِلَيْكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ، إِنِّي تَوَجَّهْتُ بِكَ إِلَى رَبِّي فِي حَاجَتِي هَذِهِ لِتُقْضَى لِيَ اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ)} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٧٢٧٩)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (٣٥٧٨)، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (١٣٨٥) وَصَحَّحَهُ الألباني فـي (صحيح الجامع) برقم: (١٢٨٩))، واتـە: بـەڵام سوێند خـواردن لەسەر خـوای بـەرز بـە یـەکێك لـە دروسـتکراوەکانی، وەك ئـەوەی بگـوترێ: خـوایە! مـن سـوێندت لـێ دەخۆم، یاخود داوات لێدەکـەم بە فلان کەس، کە فـلان شـتەم بـۆ بکـەی! ئـەوە (العز بْن عَبْدُ السَّلامِ) ئـەوەی بە ڕەوا زانیـوە، بـەڵام تـەنیا بـۆ پێغەمبەر ﷺ لەبەرئەوەی کە گەورەی ڕۆڵەکـانی ئادەمە، وە گوتوویەتی: دروسـت نیـە سوێند لـە خـوای بـەرز بخـورێ، جگـە لـە پێغـەمبەر ﷺ، بـە هیـچ کـام لـە پێغـەمبەرانی دیکە، وە بـە فریشتەکان، وە بەوانـەی کـە دۆسـتی خـوان، چونکە هیـچ کامیـان لـە پلەی بـەرزی پێغـەمبەردا نـین، وە بەڵگـەش لـەوبارەوە ئـەو دەقەیـە کـە (ترمِذِيّ) گوتوویـەتی: (حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ)، دەڵـێ: عوسمانی کوڕی حونـەیف دەگێڕێتەوە، کە پیاوێکی کوێر هاتـە لای پێغـەمبەر ﷺ گـوتی: لـە خـوا بپـاڕێوە کـە چـاکم بکاتـەوە، پێـی فـەرموو: ئەگـەر حـەز دەکـەی دەپاڕێمەوە، ئەگەر حـەزیش دەکـەی خۆڕابگـرە، ئـەوە بـۆ تـۆ چاکتـرە، ئـەویش گوتـی: بـۆم بپـاڕێوە، پێغـەمبەریش ﷺ فەرمـانی پێکـرد، کـە دەسـتنوێژێکی بـاش بگـرێ، وە دوایـی بـەم شـێوەیە بپـاڕێتەوە: ئـەی خـوایە! مـن داوات لێدەکـەم، ڕووت تێدەکـەم بـە پێغەمبەرەکـەت، پێغـەمبەری ڕەحمـەتو بـەزەیی،

ئەی پێغەمبەری خوا! من بە تۆ ڕوو دەکەمە خوای پەروەردگارم، کە ئەم پێویستییەم، ئەم داواکاریەم جێبەجێ بکات، ئەی خوایە! بیکە تکاکار لە مندا، تکای ئەو بۆ من قبوول بکە.

(هەڵبەتە ئەوە جیایە لەوەی دیکە کە باسی دەکەین، بەڵام ئەوەش دیسان وەنەبێ هەموو زانایان ڕایان وابێ)، بۆیە ئالووسی دەڵێ: (وَمِنَ النَّاسِ مَنْ مَنَعَ التَّوَسُّلَ بِالذَّاتِ وَالقَسَمِ عَلَى اللهِ تَعَالَى بِأَحَدٍ مِنْ خَلْقِهِ مُطْلَقاً)، واتە: وە هەندێك لە خەڵكی ڕێیان گرتووە لە تەوەسسول كردن بە زاتی پێغەمبەر ﷺ و سوێند لە خوای بەرز خواردن، بە هیچ كام لە دروستكراوەكانی بە شێوەیەكی ڕەها، ئەوەیان قەدەغە كردوە، {وَهُوَ الَّذِي يَرْشَحُ بِهِ كَلامُ المَجْدِ ابْنِ تَيْمِيَة؛ وَنَقَلَهُ عَنِ الإِمَامِ أَبِي حَنِيفَة رَضِيَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ وَأَبِي يُوسُف وَغَيرِهِمَا مِنَ العُلَمَاءِ الأَعْلامِ، وَأَجَابَ عَنِ الحَدِيثِ بِأَنَّهُ عَلَى حَذْفِ مُضَافٍ أَي بِدُعَاءِ أَوْ شَفَاعَةِ نَبِيِّكَ ﷺ، فَفِيهِ جعل الدُّعَاءِ وَسِيلَة وَهُوَ جَائِزٌ بَلْ مَنْدُوبٌ، وَالدَّلِيلُ عَلَى هَذَا التَقْدِيرِ قَوْلُهُ فِي آخرِ الحَدِيثِ: (اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ) بَلْ فِي أَوَّلِهِ أَيْضَاً مَا يَدُلُّ عَلَى ذَلِكَ}، واتە: وە قسەكەی مەجدی ئیبنو تەیمییە ئەوە دەگەیەنێ، كە ئەوەشی لە ئەبو حەنیفە خوای بەرز لێی ڕازی بێ‌و ئەبو یوسفو غەیری وانیش لە زانایانی ناوداری ئیسلام نەقڵ كردوە، وە وەڵامی ئەو فەرموودەیەشی بەوە داوەتەوە، كە ئەوە شتێكی تێدا قرتێنراوە، واتە: پاڵدراو (مضاف)ەكەی قرتێنراوە، كە دەفەرموێ: {(وَأَتَوَجَّهُ إِلَيكَ بِنَبِيِّكَ مُحَمَّدٍ نَبِيِّ الرَّحْمَةِ) وشەیەك لێرەدا لابراوە، لەبەرئەوە كە سیاقەكە دەیگەیەنێ، واتە: خوایە لێت دەپاڕێمەوەو ڕووت تێدەكەم بە دوعاو تكای پێغەمبەر ﷺ}، دەڵێ: كەواتە: لێرەشدا دوعاو تكاكردنی پێغەمبەر ﷺ كراوەتە وەسیلە، كە ئەوەش دروستە، بەڵكو سوننەتیشە، بەڵگەش لەسەر ئەوە كە وشەیەك دەبێ لێرە دابنرێ، ئەوەیە كە لە كۆتایی فەرموودەكەدا دەڵێ: (اللَّهُمَّ فَشَفِّعْهُ فِيَّ)، خوایە پێغەمبەر بكە بە تكاكار لە مندا، واتە: دوعاو شەفاعەتی ئەو بۆ من قبوول بكە. وە دەڵێ: بەڵكو لە سەرەتای فەرموودەكەش ئەوەی تێدایە، كە ئەوە دەگەیەنێ، ئنجا ئالووسی دەڵێ: (وَقَدْ شَنَّعَ التَاجُ السُّبكِي كَمَا هُوَ عَادَتُهُ عَلَى المَجدِ، فَقَالَ: وَيَحْسُنُ التَوَسُّلُ والإِستِغَاثَةُ بِالنَّبِيّ ﷺ إِلَى رَبِّهِ وَلَمْ يُنْكِرْ ذَلِكَ أَحَدٌ مِنَ السَلَفِ وَالخَلَفِ حَتَّى

جَـاءَ ابْـنُ تَيمِيَـة فَـأَنْكَرَ ذَلِـكَ وَعَـدَلَ عَـن الصِـرَاطِ الـمُسْتَقِيم وَابتـدَعَ مَـا لَـمْ يَقُلْـهُ عَـالِمٌ وَصَـارَ بَـيْنَ الأَنَـامِ مُثْلَـة انتهـى)، واتـە: تـاج سـوبكی (یەکێکـە لـە زانایـانی شـافیعیی مەزهـەب) وەك عـادەتی خـۆی، ئـەوەی کـردوە بـە عەیبـەیەك‌و ڕەخنەیەکی گەورە لەسـەر ئیبنـو تەیمییـە، وە گوتوویـەتی: واباشـە، تەوەسسـول بـە پێغەمبـەر ﷺ بکـرێ‌و، هـاواری تێببەسـترێ بـەرەو پەروەردگـاری (واتـە: بگـوترێ: خوایە لەبەر پێغەمبـەر لـێم خۆشبە! یان ئەی پێغەمبەر شـەفاعەتم بۆ بکە!) وە هیـچ کـەس لـە زانایانی پێشـین‌و دوایین نکووڵـییان لـەوە نـەکردوە، وە جگـە لـە ئیبنو تەیمییە کەس قسـەی وای نەکـردوە، بۆیـە لـە نێو خەڵـکی بۆتـە پەنـد (کە لەڕاسـتییدا سـوبکی نەیپێکـاوە، چونکـە ئیبنـو تەیمییـە ڕەحمـەتی خـوای لـێ بـێ هەر قسـەی زانایانی پێش خۆی گوتـوە، ئنجا بۆیە ئالـووسـییش لێرەدا بەرگرییەك لـە ئیبنـو تەیمیـە دەکـات) دەڵـێ: {وَأَنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ الأَدْعِيَـةَ المَأثورَةَ عَن أَهْلِ البَيْتِ الطَّـاهِرِينَ وَغيرهُـم مِـنَ الأَئِمَـةِ لَـيْسَ فِيهَـا التَوَسُّـلُ بِالـذَّاتِ الـمُكَرَّمَةِ ﷺ، وَلَـوْ فَرَضْـنَا وجُودَ مَا ظَاهِرهُ ذَلِـكَ فَمـؤَوَّلٌ بِتَقـدِيرِ مُضَافٍ كَمَا سَمِعْتَ؛ وَمَـن ادَّعَـى النَّصَ فَعَلَيْـهِ البَيَـان، وَمَا رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ فِي (سُـنَنِهِ) وَغيرُهُ: (أَنَّ رَجُـلاً قَـالَ لِرَسُول اللهِ ﷺ : إِنَّا نَسْتَشْفِعُ بِكَ إِلـى اللهِ تَعالَـى وَنَسْتَشْفِعُ بِاللهِ تَعَالـى عَلَيْـكَ، فَسَـبَّحَ رَسُولُ اللهِ ﷺ حتـى رؤي ذَلِـكَ فِي وَجْهِـهِ وَوُجُوهِ أَصْحَابِهِ، فَقَالَ: وَيْحَـكَ أَتَدرِي مَا اللهِ تَعَالـى؟ إِنَّ اللهَ تَعَالـى لا يُسْتَشْفَعُ بِهِ عَلَى أَحَدٍ مِنْ خَلْقِـهِ شَأن اللهِ تَعالـى أَعْظَمُ مِنْ ذَلِكَ)[1] لا يصلح دليلاً على ما نحـن فيه حيـث أنكـر عليه قولـه : (إِنَّا وَنَسْتَشْـفِعُ بِـاللهِ تَعَـالى عَلَيْـكَ) وَلَـمْ يُنْكِـرْ عَلَيْـهِ الصَّـلاَةُ وَالسَّـلاَمُ قَوْلَـهُ: (إِنَّـا نَسْتَشْـفِعُ بِكَ إِلـى اللهِ تعالـى) لأَنَّ مَعْنَـى الإِستشـفَاعِ بِهِ ﷺ طَلَب الدُّعَـاء مِنْهُ، وَلَيْسَ مَعْنَاهُ الإِقسام بِهِ عَلَى اللهِ تَعَالـى، وَلَوْ كَانَ الإِقْسَام مَعْنَـى لِلإِستشفاع، فَلِمَ أَنْكَر النَّبِـيُّ ﷺ مَضْـمُونَ الجُمْلَـةِ الثـانية دُونَ الأُولَ؟} ، واتـە: تـۆ دەزانـی کـە ئـەو پاڕانەوانـەی گێڕدراونـەوە لـە خانـەوادەی پـاکی پێغەمبـەرەوە ﷺ وە لـە غـەیری

---

١) أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٤٧٢٦)، وَإِبـنُ أَبـي عاصـم فـي (السـنة) بـرقم: (٥٧٥)، والطبرانـيُّ فـي (الكـبير) بـرقم: (١٥٤٧) والبَـزَّار فـي (مسـنده) بـرقم: (٣٤٢٢)، وَقَـالَ الألبـاني فـي (ظـلال الجنّـة) بـرقم: (٥٧٥) إسـناده ضـعيف، ورجالـه ثقـات لكـن ابـن إسـحاق مـدلس ومثلـه لا يحـتج بـه إلا إذا صرَّح بالحديث وهذا ما لـم يفعله هنا.

وانیش لە پێشەوایانی ئیسلام، لە هیچ کام لەو دوعایانەدا، پاڕانەوە بە زاتی پێغەمبەر ﷺ نەکراوە، (یانی: بڵێن: خوایە! لەبەر پێغەمبەر لێمان ببوورە، یان ئەی پێغەمبەر دوعامان بۆ بکە، شتی وا لە دوعاکاندا نەهاتوە) وە ئەگەر شتێکی واش هەبێ، کە ڕواڵەتەکەی ئەوە بگەیەنێ، ئەوە بەوە تەئویل دەکرێ، کە بیستت وشەیەك لەوێدا نیە کە سیاقەکە دەیگەیەنێ، (وەك بڵێی: خوایە! بە دوعای پێغەمبەر ﷺ لێت دەپاڕێمەوە، بە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ لێت دەپاڕێمەوە، یان بڵێی: ئەی پێغەمبەری خوا! دوعام بۆ بکە، شەفاعەتم بۆ بکە)[1]، وە هەر کەسێکیش لافی ئەوە لێبدات، دەبێ ڕوونی بکاتەوە، وە ئەوەی کە ئەبو داوود لە (سنن)ی خۆیدا هێناویەتیو غەیری ویش گێڕاویانەتەوە: {کە پیاوێك بە پێغەمبەری ﷺ گوتوە: ئێمە تکا بە تۆ دەکەین بەرەو لای خوای بەرز، (دەتکەینە تکاکارمان بۆ لای خوای بەرز) وە خوای بەرزیش دەکەینە تکاکار بۆ لای تۆ! پێغەمبەری خواش ﷺ فەرمووی: پاکیی بۆ خوا، هەتا ئەوە لە دەموچاوی هاوەڵاندا بینراو زانیان کە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو قسەیەی زۆر پێناخۆش بوو، دوایی فەرمووی: بێ قەزابێ! دەزانی خوای بەرز کێیە؟! خوای بەرز ناکرێتە تکاکار بۆ لای هیچ کام لە دروستکراوەکانی، (واتە: نابێ بڵێی: خوات بە گژدا دەکەم، یان خوایە! داوا بۆ لە فلان کەس بکە، هیچ کام لە دروستکراوەکانی ئەوە نین خوا بکەی بە تکاکار بۆ لای ئەو) پلەی خوا زۆر زۆر لەوە گەورەترەو مەزنترە} ئەوە بە بەڵگە ناشێ، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ نکوولیی لێکردوە کە تکا بە خوا بکات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، بەڵام نکوولیی لێنەکردوە کە تکا بە پێغەمبەر ﷺ بکات بۆ لای خوا، (واتە: نکوولیی لێنەکردوە بڵێ: ئەی پێغەمبەر ﷺ تکامان بۆ بکە لە لای خوا، بەڵام ئەوەی دیکەی نکوولیی لێکردوە)، چونکە مانای تکاکردن بە پێغەمبەر ﷺ بۆ لای خوا، داوای دوعا کردنە لە پێغەمبەر ﷺ نەك سوێند خواردن بە پێغەمبەر ﷺ لەسەر خوا، وە ئەگەر مانای داوای تکاکردن بە پێغەمبەر ﷺ سوێند پێ لەسەر خوا خواردن بووایە، ئەوە پێغەمبەر ﷺ بۆچی نکوولیی لە ڕستەی دووەمیان کرد، بەڵام نکوولیی لە ڕستەی یەکەمیان نەکرد؟!

---

١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکە خۆم زیادم کرد بۆ ڕوونبوونەوەی مانا.

دوایی ئالووسیی شتێکی دیکەش دەڵێ، کە زۆر شتێکی جوانەو بە ڕاستیی زۆر مەتەڵ حەل دەکات، دەڵێ: (وَقَدْ يَتَمَثَّلُ الشَّيْطَانُ للمُستغيث في صُورَة الَّذِي استغاثَ بِهِ فَيَظنُّ أنَّ ذَلِكَ كَرَامَةٌ لِمَنْ استغاثَ بِهِ، هَيهَاتَ هَيهَاتَ إنَّمَا هُوَ شَيطَانٌ أضلّهُ وَأغواهُ وَزَيّنَ لَهُ هَوَاهُ، وَذَلِكَ كَمَا يَتَكَلَّمُ الشَّيطَانُ فِي الأَصْنَامِ لِيُضِلَّ عَبدَتَها الطّغام)، واتە: وە جاری وایە شەیتان خۆی دەباتە سەر وێنەی ئەو کەسەی کە هاواری تێ بەستراوەو، دوعای بۆ کراوە، ئنجا ئەو کەسەی کە دوعاکەی کردووەو هاوارەکەی کردوە، پێی وایە ئەوە کەرامەتە بۆ ئەو کەسەی کە هاواری لێ کردوە، (بۆ وێنە: یەکێك هاوار دەکاتە شێخ عەبدولقادری گەیلانیی، یەکێك هاوار دەکاتە بەهائەدینی نەقشبەندیی، یەکێك هاوار دەکاتە فلان شێخ، شەیتانیش دەچێتە سەر شێوەی یەکێك لەوانە، چ لە خەویدا چ بە شێوەیەك لە شێوەکانو دەڵێ: ئەوە داواکەت جێبەجێ دەکەم) نەخێر ئەوە زۆر لەوە دوورە، بەڵکو ئەوە شەیتانە گومڕای کردوە، وەك چۆن شەیتان جاری وایە لەو بتو صەنەمانەدا کە خەڵك دەیانپەرستن قسە دەکات (جاری وایە چوون بۆ لای ئەو بتە بیپەرستنو لێی پاڕاونەوە دوایی گوێیان لە قسەیەك بووە، شەیتانێك لە پەنای ئەودا بەبێ ئەوەی کە ئەو ببینن قسە دەکات، دەڵێ: ئەوە دوعایەکەت گیرابوو، فلان شتەشت بۆ دەکەین، بۆ ئەوەی کە ئەوانەی دەیانپەرستن لە خەڵکی هەرچیو پەرچیو نەزانو بێئاگا، زیاتر گومڕایان بکەن).

کە بە تەئکید شیکردنەوەکەی زۆر جوانە، وە ئەو حاڵەتە هەیە، لەوبارەوە عەبدولقادری گەیلانیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، شتێکی جوان دەگێڕێتەوە لە کتێبەکەی خۆی (الغنية لطالبي طريق الحق)دا دەڵێ[1]:

جارێکیان ڕۆشناییەکی مەزنم لێ وەدەرکەوت کە ئاسۆی پڕکرد، پاشان لە شێوەیەك دا شۆڕبۆوە و بانگی کردم:

ئەی عەبدولقادر من پەروەردگارتم و شتە قەدەغەکانم بۆ حەڵاڵ کردی!

گوتم: چغە بە ئەی لەعین! ئیدی ئەو ڕووناکییە بوو بە تاریکییو وێنەکەشی بوو بە دووکەڵ.

١) بڕوانە: (الغُنية لطالبي طريق الحق في الأخلاق و التصوف والآداب الإسلامية)، ج ١، ص ٤ .

دوایـی پێیگوتـم: ئـەی عەبدولقـادر لـە زانیارییـت لەبـارەی فەرمـانی پەروەردگارتـەوە لەدەسـتم دەربـاز بـووی، بـەم ڕووداوە حەفـتا کەسـم لـە ئەهلـی طـەریقەت گومڕا کـردوە.

گوتـم: چاکە هەر لە خواوەیە!

جا ئەگەر شـەیتان ویسـتبی فێـڵ لە عەبدولقـادر بکـات، ئـەدی لـە موریـدو صـۆفیو شـوێنکەوتووەکانی! چـۆن فێـڵ لـەوانیش ناکـات؟! بۆیـە بەڕاسـتیی ئـەو قسـەیەی ئالووسیی زۆر جوانە، وە من بیستوومە لـەو جندانـەی کە قسـەیان کـردوە لەسـەر دەمـی خـەڵك، کـە گوتوویانـە: ئێمـە جـاری وایـە دەچـینە نێـو بـەدەنی کەسـێکەوە، تووشـی حاڵـەتێکی نەخۆشـیی دەکـەین، بـۆ وێنـە: بـادار دەبـێ، زگـی دێشـێ، گورچیلـەی دێشـێ، پشـتی دێشـێ، بۆئـەوەی تووشـی شـیرکی بکـەین، ئـەویش بـەو شـێوەیە: کـە دەچێتە سـەر ئـەو گـۆڕەی کە لێـی دەپاڕێتـەوە، یەکسـەر دێینـە دەرێ، تا تووشی شـیرکی بکـەینو، وابزانێ کـە ئەو شێخە چاکی کردۆتـەوە، مـن ئـەوەم بۆخـۆم لێیـان بیسـتوە، گوتیـان: ئـەو فێڵانەشـمان هـەن، کـە دیارە ئینسـان ئەگـەر بەڕاسـتی ئەهلـی عیلـم بێ، ئـەهلی تەوحید بـێ، خواپەرسـتو خـواناس بـێ، هیچ کات شـەیتان ناتوانـێ ئـەو فێـڵانەی لـێ بکـاتو، ئـەو جۆرە کـڵاوانەی ناچنـە سـەر.

## ئنجا بە پێویسـتی دەزانم کـە ڕای خۆم دەربـارەی (تَوَسُّـلُ وَسِـيلَة) بخـەمەڕوو:

### ڕای خـــۆم لەبارەی وەسـیلەو تەوەسـوسـولـەوە:

<u>**یەکـەم/**</u> ئێمە ئەگەر سـەرنجی ئـەو ئایەتـە بـدەین، کە بەداخـەوە هەنـدێك لـە ئەهلی تەصـەووف، وە هەندێك لـە زانایـانیش، کە پێمـوایە کە زیـاتر لـە ژێـر کاریگـەریی تـەوژمی تەصـەووفو صـۆفیگەریی دابـوون، تەصـەووفو صـۆفیگەریی ناپابەنـد بـە شـەریعـەتەوە، بە هەڵە لـێـی حـاڵی بـوون، باسـی تەوەسسـولو وەسـیلەیان کـردوە،

ئەو ڕسـتە قورئانییـەی کـە دەفـەرموێ: ﴿وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ﴾، دەبینیـن ئەو چـەمكو واتا هەڵەیـەی باسـمان کـرد، هەڵێنـاگرێو نایگـەیەنـێ، ئێسـتاش با سـەرنجی ئـەو ئایـەتە بـدەینو بزانیـن ئایا ئـەو چەمكو واتایـە، کە ئـەو جۆرە

کەسانە لەو ڕستە قورئانە وەریانگرتووە، ئایا ئەو ئایەتە ئەو چەمكو واتایە بەدەستەوە دەدات؟ با تەماشا بکەین:

خوای پەروەردگار لەو ئایەتەدا فەرمان بە سێ شتان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٣٥ ﴾ المائدة، واتە: پارێز لە خوا بکەن، هۆکار بەرەو خوا پەیدابکەن، بۆ نزیکبوونەوە لە خوا، وە لەڕێی خوادا تێبکۆشن، بۆ ئەوەی سەرفرازبن، ئنجا بێگومان:

١- خودی تەقواو، هۆکار پەیداکردن بۆ نزیك بوونەوە لە خواو، تێکۆشان لە ڕێی خوادا، پێچەوانەی ئەو چەمكو واتایەن، کە بەداخەوە لە زۆر لە کتێبەکانی ئەهلی تەصەووفدا هەیە، بۆچی؟ جارێ خوای بالادەست پێش هەموو شتێك فەرمان دەکات بە تەقواو دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، پێشتریش باسمان کرد، کە تەقوا واتە: خۆپاراستن لە هەر شتێك کە مایەی گوناهباریی بێ، بە واتایەکی دی، تەقوا واتە: پابەندیی بە شەریعەتەوە، چ بە بارە ئیجابییەکەی دا، بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکان، وە چ بە بارە سەلبییەکەی دا، بۆ خۆ دوورگرتن لە حەرامو قەدەغەکان، بێگومانیش پاڕانەوە لە غەیری خواو هاوارکردنە غەیری خوا، وە بە شێوەیەك مامەڵەکردن لەگەڵ خوای بێ وێنەدا کە شایستەی خوا نیە، یا بە بیانووی ڕێز لێگرتنی پێغەمبەریشەوە ﷺ بێ، پێچەوانەی تەقوایە، چونکە تەقوا ئەوەیە پابەندبی بە شەریعەتەوە، کوا لە کوێی شەریعەتدا هەیە کە ئێمە لە غەیری خوا بپاڕێینەوە؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَنَّ ٱلۡمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا ١٨ ﴾ الجن، واتە: مزگەوتەکان هی خوان، یاخود ئەو ئەندامانەی سەجدەیان لەسەر دەبردرێ و سەجدەیان پێ دەبردرێ، تەنیا هی خوان، لەگەڵ خوادا لە کەسی دیکە مەپاڕێنەوە، کەواتە: ئەو چەمكو واتا غەڵەتانەی کە خزێنراوەتە نێو وشەی وەسیلەوە، لەڕاستیدا پێچەوانەی تەقوان، پێچەوانەی ئەوەن کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردوە، کە خوا بەیەکگرتن (توحید)ە.

٢- کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَٱبۡتَغُوٓاْ إِلَيۡهِ ٱلۡوَسِيلَةَ ﴾، وەسیلەو هۆکار دەستەبەر بکەن، بەرەو لای خوا، ئەمە پێچەوانەی ئەوەیە کە ئینسان چاوەڕوانی لە غەیری خوا هەبێ، جا فریشتەکانن، پێغەمبەرانن (علیهم الصلاة والسلام)، دۆستانی خوان، هەر کەسێکن، ئەو چاوەڕوانییەی کە لە خوا دەکرێ، ئەگەر لە غەیری خوا بکرێ، ئەوە دەچێتە نێو بازنەی شیرکەوە، وە پاشان پێچەوانەی ئەوەیە کە خوا فەرمانی پێکردوە، خوا دەفەرمویٚ: هۆکار بۆ لە خوا نزیك کەوتنەوە دابین بکەن، تۆ بێنی لە غەیری خوا بپاڕێیەوە، یان هاوار لە غەیری خوا بکەی، یان پشت بە غەیری خوا ببەستی، یاخود سوێند لە خوا بخۆی بە کەسێك، یان بە شێوەیەك مامەڵە لەگەڵ خوادا بکەی کە پێچەوانەی مەقامی بەرزی خوای پەروەردگار بێ، ئەوە مانای وایە تۆ هۆکارت بۆ لە خوا نزیك کەوتنەوە دەستەبەر نەکردوە، بەڵکو شتێکت ڕەچاو کردوە کە لەڕاستییدا بریتیە لە پاڵدانەوەو چاوەڕوانیی کردن لە غەیری خوا، واتە: ڕاست پێچەوانەی فەرمانی خوا ڕەفتارت کردوە.

٣- کە دەفەرمویٚ: ﴿ وَجَٰهِدُواْ فِي سَبِيلِهِۦ ﴾، دیسان ئەو چەمك و واتا هەڵانەی کە بۆ وەسیلەو تەوەسسول پەیداکراون، پێچەوانەی ئەوەشن کە خوا دەفەرمویٚ: وە لەڕێی خواداو لە پێناوی خوادا تێبکۆشن، هەموو وزەی خۆتان و توانای خۆتان صەرف بکەن، کەواتە: هەڵخزان و پاڵدانەوەو خۆزگە خواستن و بە تەمای ئەموئەو بوون، بە بیانووی وەسیلەوە، پێچەوانەی تێکۆشانە لە پێناوی خوادا، کەواتە، هەم تەقواو، هەم داواکردنی هۆکار بۆ نزیکبوونەوە لە خواو، هەم تێکۆشان لە پێناوی خوادا، پێچەوانەی ئەو چەمك و واتایانەن کە خزێنراوەتە نێو وشەی وەسیلەوە.

**دووەم/** دەڵێم لەڕاستییدا کردنە بیانووی وشەیەك و دەرهێنانی لە سیاقی خۆی و، لێبارکردنی ئەو هەموو مانایانەی کە وشەکە هەڵیان ناگرێ، جۆرێکە لەلادان لە ڕێبازی شەریعەت، وە لادان لە ڕێبازی پێغەمبەری خوا ﷺ، کوا لە چ فەرمایشتێکدا هەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ، هاوەڵانی بەرێزی ڕێنمایی کردبێ، لە غەیری خوا بپاڕێنەوە، چاوەڕوانیی لە غەیری خوا بکەن، پشت بە غەیری

خوا ببەستن؟! عەبدوڵلای کوڕی عەبباس خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ڕۆژێك لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ سواری وڵاخێك بووبووم لە پشتیەوە فەرمووی: {يَا غُلامُ!..إِذَا اسْتَعَنْتَ فَاسْتَعِنْ بِاللهِ، وَاعْلَمْ: أَنَّ الأُمَّةَ لَوْ اجْتَمَعَتْ عَلَى أَنْ يَضُرُّوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَضُرُّوكَ إِلاَّ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ عَلَيْكَ، وإِن اجْتَمَعُوا عَلَى أَنْ يَنْفَعُوكَ بِشَيءٍ لَمْ يَنْفَعُوكَ إِلاَّ بِشَيءٍ قَدْ كَتَبَهُ اللهُ لَكَ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٦٦٩)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٥١٦) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالحَاكِمُ برقم: (٦٣٠٢) عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ، وَصَحَّحَهُ الشيخ الألباني في صحيح الجامع برقم: (٧٩٥٧)) (چەند ئامۆژگارییەکی دەکات)، واتە: ئەی کوڕەکە! ئەگەر داوای یارمەتییت کرد، تەنیا داوای یارمەتی لە خوا بکە، ... وە بشزانە: ئەگەر هەموو خەڵکی سەر زەوی کۆببنەوە زیانێکت پێ بگەیەنن، پێت ناگەیەنن مەگەر خوا بۆی نووسیبی، وە لە ڕیوایەتی ئیمام ئەحمەد دا پێی دەفەرموێ: {تَعَرَّفْ إِلَى اللهِ فِي الرَّخَاءِ يَعْرِفكَ فِي الشِّدَّةِ} (أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٨٠٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح)، واتە: لە کاتی ئاسانیی دا خوا بناسەو ئاگات لە خوا بێ، خوا لە کاتی سەغڵەتییدا لە فریات دێ.

تەماشا دەکەین پێغەمبەر ﷺ چ عەبدوڵلای کوڕی عەبباس، چ هاوەڵانی بەڕێزی دیکەی خوا لێیان ڕازی بێ، ڕووی پێ نەکردوونە غەیری خوا، وە هەمیشە هانیداون بەندەی چاکتربن بۆ خوا، وە تەنیا پشت بە خوا ببەستن‌و تەنیا، چاوەڕوانیی لە خوای پەروەردگار بکەن.

ئنجا من لێرەدا دەپرسم: ئایا لە کەیەوە ئەو وشەی وەسیلەو تەوەسسول بەو شێوەیە ڕەواجی پەیداکرد، بەو واتاو چەمکەی کە مسوڵمانان لە پێغەمبەران‌و فریشتەکان‌و پیاوچاکان‌و دۆستانی خوا بپاڕێنەوە، لە جیاتی خوا؟

لەو کاتەدا کە مسوڵمانان لەوپەڕی دوورکەوتنەوە دابوون لە ئیسلام، لەو کاتەدا کە مسوڵمانان لە ڕووحی قورئان‌و سوننەت دوورکەوتنەوە، لە چەمك‌و واتای ڕاستەقینەی ئیمان‌و خوا بەیەك گرتن دوورکەوتنەوە، وە هەر لەو جەوەش دابوو کە تەتەرو مەغۆڵ لە ڕۆژهەڵاتەوەو، خاچپەرستەکان لە ڕۆژئاواوە هاتن‌و زەفەریان بە مسوڵمانان برد!! بەڵام دوایی ئەوە بوو کە جارێکی دیکە پیاوانی وەك

عەبدولقادری گەیلانیی ڕەحمەتی خوای لێ بێ، لەم شاری بەغدایە[1]، دەستی کردوە بە بووژاندنەوەی خوا بەیەکگرتن (توحید)، بۆ وێنە: کتێبی (الفتح الرباني والفيض الرحماني) تەماشا بکەن، وەك من لە کتێبی (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)دا باسم کردوە، چەند جەخت دەخاتە سەر تەنیا خواناسینو خوا بەیەکگرتنو، تەنیا خوا پەرستنو، تەنیا چاوەڕوانیی لە خوا کردنو هەتا کۆتایی، هەروەها، (سەید ئەحمەدی سەرهەندیی) کە کتێبێکی هەیە بە ناوی (المكتوبات) ئەویش زۆر جەخت لەسەر مەسەلەی شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ دەکاتەوە، وە لە کتێبی (ڕێگای صالح بوونو بەرەو خوا چوون)دا لێیم نەقڵ کردوە، کە دەڵێ: بیدعەی چاك نیە، بیدعە هەمووی خراپە، بەڵێ (الإمام الربَّاني) لە کتێبی (المكتوبات)ەکەی خۆیدا (البدعة الحسنة) بوونی نیە، بیدعە هەمووی خراپو تاریکە، مادام پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿كُلَّ بِدْعَةٍ ضَلالَةٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٣٧٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٢٠٠٢)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (١٥٧٨)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٦)}، دەڵێ: ناگونجێ بڵێین: بیدعەت هیچ چاکەو ڕووناکییەکی تێدایە.

بەڵێ ئەو چەمكو واتایانەی بۆ وەسیلەو تەوەسسول پەیدابوون لە کاتێکدا بوو، کە مسوڵمانان لە قورئانو سوننەت دوورکەوتوونەتەوە، وە پیاوانی گەورەی تەصەووفی ڕاستەقینەی پابەند بە قورئانو سوننەتەوە، هەمیشە دژی ئەوە بوون، دژی شیركو، پشت بە غەیری خوا بەستنو، چاوەڕوانیی لە غەیری خوا کردنو، دژی پەنابردنە بەر غەیری خوا بوون.

**سێیەم**/ ئنجا با باسی ئەزموونێکی خۆشم بکەم لێرەدا، من لە ساڵی (١٩٩٦)دا دوای ئەوە کە خێزانی ڕەحمەتییم (ڕوخسار خان) وەفاتی کرد، دیارە من لە ژیانمدا هەوڵم داوە لە بەینی خۆمو خوادا هەمیشە ئیعتیکافم هەبێ، بە تەنیا دانیشتنو بیرکردنەوەم هەبووە، بەڵام ئەو کاتە، زیاتر کەوتمە بیری عالەمی بەرزەخو قیامەتو قەبرو ئەو حاڵەتانە، وە کتێبێکیشم کەوتە بەردەست بە ناوی (التوسل والوسيلة)، ئەوەی (إبن تيمية) نیە، هی زانایەکی بواری تەصەووفە،

١) ئەم دەرسانە لە شاری بەغداد گوتراونەوە.

بەڵام بە هەڵەو لادانەوە، كە لەوێدا دەڵێ: داوای كۆمەكیی كردن (إستمداد) لە رووحی مەشایخو دۆستانی خوا، سوودت پێ دەگەیەنێ، ئەو كتێبەم دەخوێندەوە، جۆرێ لە كارتێكراویی بەو كتێبەم بۆ پەیدا بوو بوو، بەڵام هەستم بە دڵتوندییەكو حاڵەتێكی ناخۆشی دڵ دەكرد، شەو بوو یان رۆژ بوو، خەونم بینی لە خەونمدا سەعاتەكەی ماڵمان لە جیاتی ئەوەی بەرەو پێشێ بچێ، بەرەو دواوە دەگەڕایەوە، یەكسەر هاتە دڵم، گوتم: دیارە ئەوە ئاماژەیەو هۆشیاركردنەوەیە بۆ من، كە ئەو حاڵەتەی ئێستای من راست نیەو، ئەوەی كە من بۆ خۆ بەهێزكردنی لایەنی رووحیی و بۆ پڕكردنەوەی ئەو بۆشاییە یە رووحی یە، دەمەوێ سوودی لێ ببینم، كە هەندێك لەو كتێبانە بوون، كە وەك گوتم شیركو بیدعەتو لادانو غەڵەتو پەڵەتیان تێدا هەبوو، راست نین، ئیدی سوپاس بۆ خوا هۆشیار بوومەوەو، هەڵوێستی خۆمم راست كردەوە، چەرچەندە تەنیا وەك بیرۆكەیەكیش هاتبووە زەینمەوەو كارم پێنەكردبوو.

**مەسەلەی دووەم:** كە لەم ئایەتە موبارەكە وەردەگیرێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾، بێگومان ئەوانەی بێبڕوان، ئەگەر ئەوەی لە زەوییدا هەیەو وێنەی خۆشی لەگەڵدابێ، بۆئەوەی بیكەنە بەلاگێڕەوەی خۆیان لە سزای رۆژی قیامەت، لێیان وەرناگیرێ، وە ئازارێكی بەئێشیشیان هەیە، لەوبارەوە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ هەیە ﴿عَن أنَس بْنُ مَالِكٍ رَضِيَ اللّٰه عَنْهُ أنَّ نَبِيَّ اللّٰهِ ﷺ كَانَ يَقُولُ: يُجَاءُ بِالْكَافِرِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ، فَيُقَالُ لَهُ: أرَأَيْتَ لَوْ كَانَ لَكَ مِلْءُ الأرْضِ ذَهَبًا أَكُنْتَ تَفْتَدِي بِهِ؟ فَيَقُولُ: نَعَمْ، فَيُقَالُ لَهُ: قَدْ كُنْتَ سُئِلْتَ مَا هُوَ أَيْسَرُ مِنْ ذَلِكَ: أنْ لا تُشْرِكَ بِي، فَيُؤْمَرُ بِهِ إِلَى النَّارِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٦٥٣٨)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٧٠١٦)}، واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئینسانی كافر رۆژی قیامەتێ دەهێنرێ، پێی دەگوترێ: ئایا ئەگەر پڕی زەوی زێڕت هەبووایە، ئێستا نەتدەبەخشی، ببێتە بەلاگێڕەوەت، وەك فەرەبوو؟ دەڵێ: با، پێی دەگوترێ:

لەوە زۆر ئاسانترت لێ داواکرا، (واتە: لە دنیادا ئەویش ئەوەیە) کە هیچ شتێك نەکەیە هاوبەشی خوا، بەلاّم ئامادە نەبووی، ئیدی فەرمانی پێ دەکرێ‌و بەرەو ئاگری دۆزەخ دەبرردرێ.

ئنجا ئەم ئایەتە موبارەکە، وەك ئەو ئایەتەی (٥٤)ی سوورەتی (یونس) وایە کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ لِكُلِّ نَفْسٍ ظَلَمَتْ مَا فِي ٱلْأَرْضِ لَٱفْتَدَتْ بِهِۦ ۗ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّدَامَةَ لَمَّا رَأَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ۖ وَقُضِىَ بَيْنَهُم بِٱلْقِسْطِ ۚ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٥٤﴾﴾، واتە: ئەگەر هەر نەفسێك کە ستەمی کردوە (کوفری کردووەو خراپەی کردوە شایستەی سزای خوایە)، ئەگەر پڕی زەوی ماڵی هەبێ لە قیامەتدا، دەیکاتە بەلاّگێڕەوەی خۆی...

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ﴾، واتە: دەیانەوێ لە ئاگری دۆزەخ بچنەدەرو پەلەقاژەی چوونەدەرو دەرباز بوون دەکەن لە ئاگر، بەلاّم لێی ناچنە دەر هەرگیز، وە ئازارو سزایەکی بەردەوام و نەبڕاوەو نەپساوەیان هەیە، لەوبارەوە پێشتریش دیارە ئێمە لە تەفسیری سووڕەتی (النساء) ئایەتی (١٨)دا باسی ئەوەمان کرد، کە هەندێك لە زانایان کە دیارە لە ژێر کاریگەریی فیکری خەواریجدا بوون، ڕایان وایە خەڵك لە قیامەتێ دەبنە دوو بەش: یان بۆ بەهەشت، یان بۆ دۆزەخ، ئەوە نیە خەڵکی بچنە دۆزەخ‌و سزا بدرێن‌و، دوایی دەربازیان ببێ‌و بچنە بەهەشت، هەندێك لە زانایان ڕایان وایە، ئنجا ئێمە لە بەرگی سێیەمی ئەم تەفسیرەدا لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتی (١٨)ی سووڕەتی (النساء) باسمان کردوە، کە هەندێك لە زانایانی هاوچەرخیش ڕایەکی وایان هەیە، هەندێك شتیش بە بەڵگە دێننەوە، بۆ وێنە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿فَرِيقٌ فِى ٱلْجَنَّةِ وَفَرِيقٌ فِى ٱلسَّعِيرِ ﴿٧﴾﴾ الشوری، واتە: کۆمەڵێك لە بەهەشت دانو، کۆمەڵێکیش لە دۆزەخدان، بەلاّم باسم کردوە کە ئەوە مەبەست پێی سەرەنجامی کۆتایی بەشەریەتەو، لە سەرەنجامی کۆتاییدا بەشەر بەسەر بەهەشت‌و دۆزەخدا دابەش دەبن، بەلاّم ئەوە

ئایەتە ڕێگر نیە لەوەی کە لە سەرەتاوە هەندێك لە ئەهلی ئیمان ئەگەر شایستەی سزا دران بنو، بە سزای گۆڕ پاك نەبووبنەوەو، وەبەر عەفووی خواش نەکەوتبن، بسووتێنرێن سزا بدرێن، دوایی دەرباز بکرێن و بچنە بەهەشت، چونکە ئەوە لە چەندان فەرموودەی ڕاستی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ يَزِيدُ الْفَقِيرُ، قَالَ: كُنْتُ قَدْ شَغَفَنِي رَأْيٌ مِنْ رَأْيِ الْخَوارِجِ، فَخَرَجْنَا فِي عِصَابَةٍ ذَوِي عَدَدٍ نُرِيدُ أَنْ نَحُجَّ، ثُمَّ نَخْرُجَ عَلَى النَّاسِ قَالَ: فَمَرَرْنَا عَلَى الْمَدِينَةِ فَإِذَا جَابِرُ بْنُ عَبْدِ اللهِ يُحَدِّثُ الْقَوْمَ جَالِسٌ إِلَى سَارِيَةٍ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَإِذَا هُوَ قَدْ ذَكَرَ الْجَهَنَّمِيِّينَ قَالَ: فَقُلْتُ لَهُ: يَا صَاحِبَ رَسُولِ اللهِ مَا هَذَا الَّذِي تُحَدِّثُونَ، وَاللهُ يَقُولُ: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥ ١٩٢﴾ آل عمران، ﴿... كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا... ٢٠﴾ السجدة، فَمَا هَذَا الَّذِي تَقُولُونَ! قَالَ فَقَالَ: أَتَقْرَأُ الْقُرْآنَ؟ قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ فَهَلْ سَمِعْتَ بِمَقَامِ مُحَمَّدٍ عَلَيْهِ السَّلامِ؟ يَعْنِي الَّذِي يَبْعَثُهُ اللهُ فِيهِ، قُلْتُ: نَعَمْ، قَالَ: فَإِنَّهُ مَقَامُ مُحَمَّدٍ ﷺ الْمَحْمُودُ الَّذِي يُخرِجُ اللهُ بِهِ مَنْ يُخْرِجُ، قَالَ: ثُمَّ نَعَتَ وَضْعَ الصِّرَاطِ وَمَرَّ النَّاسِ عَلَيْهِ، قَالَ: وَأَخَافُ أَنْ لا أَكُونَ أَحْفَظُ ذَاكَ، قَالَ غَيْرَ أَنَّهُ قَدْ زَعَمَ أَنَّ قَوْمًا يَخْرُجُونَ مِنَ النَّارِ بَعْدَ أَنْ يَكُونُوا فِيهَا، قَالَ: يَعْنِي فَيَخْرُجُونَ كَأَنَّهُمْ عِيدَانُ السَّمَاسِمِ، قَالَ: فَيَدْخُلُونَ نَهَرًا مِنْ أَنْهَارِ الْجَنَّةِ، فَيَغْتَسِلُونَ فِيهِ فَيَخْرُجُونَ كَأَنَّهُمُ الْقَرَاطِيسُ فَرَجَعْنَا قُلْنَا، وَيْحَكُمْ أَتُرَوْنَ الشَّيْخَ يَكْذِبُ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَرَجَعْنَا فَلا وَاللهِ مَا خَرَجَ مِنَّا غَيْرُ رَجُلٍ وَاحِدٍ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرقم: (٤٩٣)}، واتە: یەزدیی فەقیر (دیارە یەکێکە لە زانایانی تابیعین) دەڵێ: من سەرسام بوو بووم بە هەندێك لە بۆچوونی خەواریج (خەواریج ئەوانە بوون کە لە عەلی خوا لێی ڕازی بێ هەڵگەڕانەوە، وە چەند بیرو ڕایەکیان هەبوو، کە ئێستا پاشماوەکانیان ئیباضییان پێ دەڵێن، یەکێك لە ڕایەکانیان ئەوەیە کە هەر کەسێك یەك گوناح بکات لە بازنەی ئیسلام و ئیمان دەچێتە دەرێ، بۆ وێنە: هەر کەسێك درۆیەك بکات، غەیبەتێك بکات، قەتڵێك بکات، زینایەك بکات، هەر کەسێك یەك گوناح بکات، چ بە باری سەلبییدا چ بە باری ئیجابییدا بۆ وێنە: هەر کەسێك نوێژێك بچوێنێ، ڕۆژوویەك بچوێنێ، شتێك کە واجب بێ بیچوێنێ، چونکە گوناح

یانی چی؟ چواندنی واجبو، شکاندنی قەدەغەیە، ئەوە یەکێکە لە ڕایەکانیان) وە ئێمە کۆمەڵێك بووین، ژمارەیەکی باش بووین، چووینەدەر ویستمان بچین حەجێ بکەین‌و دوای حەجێ وەدەرکەوین (واتە: یاخی بین لە دەسەڵاتی ئەو کاتە) بە مەدینەدا تێپەڕین تەماشامان کرد جابیری کوڕی عەبدوڵڵا خوا لە خۆیی‌و بابی ڕازی بێ قسەی دەکرد، لە لای کۆڵەگەیەك (دیارە لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ خەڵکی دانیشتبوون) ئەویش فەرموودەی پێغەمبەری بۆ باس دەکردن، لە میانەی قسەکانیدا باسی جەهەننەمیەکانی دەکرد (واتە: ئەوانەی کە لە ئیمانداران دەچنە دۆزەخ‌و دوایی دەربازیان دەبێ) منیش پێمگوت: ئەی هاوەڵی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە چییە ئەوەی ئێوە باسی دەکەن، لەکاتێکدا خوا دەفەرموێ: ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥ...﴿١٩٢﴾﴾ آل عمران، واتە: پەروەردگارمان! هەر کەسێك تۆ بیخەیە دۆزەخەوە ڕیسوات کردوە، (کەواتە: دیارە ئیماندار نیە، مەبەستی ئەوە بووە)، هەروەها دەفەرموێ: ﴿... كُلَّمَآ أَرَادُوٓاْ أَن يَخۡرُجُواْ مِنۡهَآ أُعِيدُواْ فِيهَا...﴿٢٠﴾﴾ السجدة، واتە: هەر کاتێك ویستیان لێی بچنەدەر دەگێڕدرێنەوە نێوی، (خوا ئاوا باسی دۆزەخییەکیان دەکات)، کەواتە: ئەوە چییە ئێوە باسی دەکەن‌و بەڵگەتان چییە؟! ئەویش پێی گوتم: قورئان دەخوێنی؟ (واتە: شارەزاییت هەیە لە قورئان؟) گوتم: بەڵێ، گوتی: ئایا بیستووتە لە قورئاندا مەقامی موحەممەد ئەوە نیە خوا دەفەرموێ: ﴿عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحۡمُودًا ﴿٧٩﴾﴾ الإسراء، گوتم: بەڵێ، گوتی: ئەوە ئەو پێگەو پایە بەرزەی موحەممەدە کە تێیدا ستایش دەکرێ، کە خوا بە هۆی تکاکردنی ئەووەوە کەسانێك لە دۆزەخ دەردێنێ کە لە ئەهلی ئیمانن، دوایی جابیری کوڕی عەبدوڵڵا باسی پردی (صِراط)ی کرد، (صِراط: واتە: ئەو پردەی کە بەسەر پشتی دۆزەخدا ڕادەهێڵدرێ، وە خەڵك بەسەریدا تێدەپەڕن)، وە دواییش گوتی: دەشترسێم کە هەمووم چاك لەبەر نەبێ، (بۆیە ناچمە نێو وردەکارییەکانەوە)، بەڵام فەرمووی: کەسانێك لە دۆزەخ دەچنە دەرێ (واتە پێغەمبەر ﷺ وایفەرمووە) دوای ئەوەی کە لە نێو دۆزەخدا بوون، لێی دەچنە دەر، وەك لاسکی کونجی (لاسکەکەی زۆر

باریك دەبێتەوە، واتە: ئەوانەی لە دۆزەخ دا دەسووتێنرێن، وەك لاسكە كونجی باریك دەبنەوە) دەخرێنە نێو ڕووبارێكەوە لە ڕووبارەكانی بەهەشت، خۆیانی تێدا دەشۆن، كە دێنە دەرێ وەك كاغەزی سپین، (پێشێ وەك لاسكە كونجی وشك و ڕەقو سووتاون، دوایی وەك كاغەزی سپییان لێ دێ، دیارە لە فەرمایشتی دیكەش دا هاتوە كە كۆتا كەس لە دۆزەخ لە ئۆممەتی پێغەمبەر ﷺ دەچێتە دەرێ ئاوایەو ئاوایەو لە بوخاریی‌و موسلیم دا هاتوە)، ئنجا یەزیدی فەقیر دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئێمەش چووینەوە لە نێو خۆماندا گوتمان: ئێمە یاخوا بێ قەزابین، ئایا پیاوە بە تەمەنە (جابیری كوڕی عەبدوڵڵا دیارە ئەو كاتە زۆر بە تەمەن بووە)، تۆ بڵێی درۆ بە زمانی پێغەمبەرەوە ﷺ بكات!! (دیارە ئەو بۆچوونەی ئێمە غەڵەتە، ئێمە بە غەڵەت لە قورئان تێگەیشتووین)، دەڵێ: سوێند بە خوا تەنیا یەك نەفەرمان دەرچوو بۆ لای خەواریج، ئەویدیكە هەمووی وازمان لەو بیرۆكەیە هێنا، وە یاخی نەبووین.

(إبنُ مردويه) ئەویش هەر لە (يزيد بن صهيب الفقير) دیارە بابی ناوی (صهيب) بووە ئەم دەقە دێنێ: ﴿عَنْ يَزِيدَ بْنِ صُهَيبٍ الفَقِيرِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبدِاللهِ رضي الله عنه (أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: يَخرُجُ مِنَ النَّارِ قَومٌ فَيَدخُلُونَ الجنَّةَ)، قَالَ يَزِيدُ الفَقِيرُ: فَقُلْتُ لِجَابِرٍ: يَقُولُ اللهُ تعالى: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُوا۟ مِنَ ٱلنَّارِ وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾﴾ المائدة، قال: أتلُ أول الآية: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفْتَدُوا۟ بِهِۦ مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾ المائدة، أَلاَ إِنَّهُمْ الَّذِينَ كَفَروا}[1]، واتە: (ئەوەش ڕیوایەتێكی دیكەیە) هەر لە یەزیدی كوڕی صوهەیبی فەقیر لە جابیری كوڕی عەبدوڵڵاوە، دەڵێ: گوتی: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: كۆمەڵێك لە دۆزەخ دێنە دەر، دەچنە بەهەشت، دەڵێ: بە جابیری كوڕی عەبدوڵڵام گوت: خوای بەرز دەفەرموێ: دەیانەوێ لە دۆزەخ بچنە دەرێ، لێی ناچنە دەرێ؟ ئەویش گوتی: سەرەتای ئایەتەكە بخوێنەوە

---

١) محاسن التأويل: ج٤، ص١٩٠.

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا وَمِثۡلَهُۥ مَعَهُۥ لِيَفۡتَدُواْ بِهِۦ مِنۡ عَذَابِ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنۡهُمۡۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، ئاگاداربە مەبەست پێی کافرەکانن، کە لێی ناچنە دەر (لە دۆزەخ)، وە مەبەست پێی ئیماندارانی گوناهبار نیە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٣٨﴾ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾، ئەم دوو ئایەتە موبارەکە باسی یەکێك لە یاسا گرنگەکانی ئیسلام دەکەن، کە بریتیە لە یاسای بڕینی دەستی دز، چ پیاو بێ، چ ئافرەت، کە ئەم یاسایە لە ڕابردووشداو، ئێستاش بەتایبەت مشتومڕی زۆری لێ کەوتۆتەوە، بۆیە چەند شتێك لەوبارەوە دەخەینەڕوو، خوا پشتیوان بێ لە دوازدە خاڵدا تەفسیری ئەم ئایەتەو باسی حوکمی بڕینی دەستی دز دەکەین:

# باسێك لەبارەی دزیکردن وحوکمی بڕینی دەستی دزەوە

## یەکەم: پێناسەی دزیی (السَّرقة)و، بە کێ دەگوترێ دز؟

زانایان زۆر پێناسەیان بۆ دزیی کردوە، بەڵام کورتەو پوختەکەی ئەوەیە: (أَخْذُ المَالِ خُفْيَةً مِن حِرْزِ المثل)[1] دیارە تەفسیرەکانی دیکەش هەروا بەوشێوەیە هێناویانە، {بردنی سامانێکە بە پەنهانیی لە شوێنێکدا، کە وێنەی ئەو شتە لەو شوێنەدا دەپارێزرێ}، بۆ وێنە: پارە لە قاصەدا دەپارێزرێ، مەڕو بزنو گاو مانگاو حوشتر لە ئاغەڵداو لە شوێنێ کە ئاژەڵی تێدەکرێ، وە کا لە کادێندا دەپارێزرێ، هەروەها دانەوێڵە لە عەمباردا دەپارێزرێ، هەر شتێك لە شوێنێك کە وێنەی ئەو شتەی تێدا دەپارێزرێ، بە پەنهانیی ببردرێ، ئەوە دزییە.

دز (السارق) بە کێ دەگوترێ؟!

(القُرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[2]، ئاوا پێناسەی دز دەکات: (مَنْ جَاءَ مُسْتَتِراً إِلى حِرْزٍ فَأَخَذَ مِنْهُ مَا لَيْسَ لَهُ، فَإِنْ أَخَذَ مِنْ ظَاهِرٍ فَهُوَ مُخْتَلِسٌ وَمُسْتَلِبٌ وَمُنْتَهِبٌ، ومحترسٌ، فَإِن تَمَنَّعَ بِمَا في يَدِهِ فَهُوَ غَاصِبٌ) هەم پێناسەی دز (سارق)مان بۆ دەکات هەم هی (مختلس)مان بۆ دەکات، هەم هی (غاصب)مان بۆ دەکات، دەڵێ: دز: بریتیە لە کەسێك بە پەنهانیی بێ شتێك بەرێ، کە هی ئەو نەبێو مافی پێوە نەبێ، لە شوێنێکدا کە وێنەی ئەو شتە لەو شوێنەدا دەپارێزرێ، کە لە زاراوە شەرعییەکەیدا دەڵێ: (فِي حِرزِ مثلِه) شتێك کە وێنەی ئەو شتە لەو شوێنەدا دەپارێزرێ، دەڵێ: ئنجا ئەگەر بە پەنهانیی بیبا، دزییە، بەڵام ئەگەر بە ئاشکرا بیباو بیرفێنێ، پێی دەگوترێ: (مختلس)و (مستلب)و (منتهب)و (محترس) ئێمە بە کوردیی دەڵێین: (ڕفاندن) ئنجا ئەگەر بیباو بڕوا، ئەوە ئەو چوار ناوە

---

[1] التفسير المنير: ج٣، ص٥٣٠.
[2] الجامع لأحكام القران: ج٦، ص١٤٧.

دەیگرێتەوە، بەڵام ئەگەر هەر لە دەستی خۆیدا بیهێڵێتەوەو بابای ماڵ لێبراو زەق زەق تەماشای بکات، ئەوە پێی دەگوترێ (غاصب) واتە: زەوتکەر.

**دووەم: حیکمەتی پاشوپێشکردنی نێرو مێ لە دزیی و زینادا؟**

پێشتریش باسمان کرد، خوا بۆ زینا دەفەرمویێ: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖۖ ﴿٢﴾ ﴾النور، واتە: ئافرەتی زیناکەرو پیاوی زیناکەر یەکی سەد قامچیان لێ بدەن، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا ﴿٣٨﴾ ﴾، واتە: پیاوو ئافرەتی دز، دەستیان ببڕن، هۆکارەکەشی ئەوەیە کە دزیی‌و ڕێگریی زیاتر پیاوان تێیدا دەست پێشخەرن، بەڵام داوێن پیسیی زیاتر ئافرەتان، هۆکارنی.

لێرەدا دەمەوێ شتێك ڕاست بکەمەوە، بۆ زۆر کەس، کە لە دەرسەکانی دیکەشدا ئاماژەم پێداوە، ئەویش ئەوەیە کە ئێستا زاراوەیەك بەکاردێنن لە جیاتی زینا، یان داوێن پیسیی دەڵێن: (لەشفرۆشیی) بەڵام ئەو وشەیە لە چەندان ڕووەوە غەڵەتە، کە بە داخەوە زۆرجار کەناڵە ئیسلامییەکانیش (کەناڵەکانی ڕاگەیاندن) بەکاری دێنن، هەروەها زۆر وشەی دیکەش ئاوا تووتییانە خەڵکی بەکاری دێنن، بێئەوەی بیری لێ بکەنەوە، لەشفرۆشیی جیایە لە زینا، جارێ ئەو وشەیە ئاماژە بەوە دەکات کە ئەوە جۆرێکە لە بازرگانیی، ئەو ئافرەتە لەشی خۆی دەفرۆشێ بەو پیاوەو پارەی لە بەرانبەردا وەردەگرێ، یانی: لەبەرئەوەی پارە وەردەگرێ قەدەغەیە، بەڵام ئەگەر بە بەلاش بێ، قەیدی ناکات!! ئنجا ئەوانە هەموو جارێ بانگەشەی مافی ئافرەت دەکەن‌و دەڵێن: ئافرەت ستەمی لێکراوە، ئنجا ئەو وشەیە ستەمێکی زۆری لەو ئافرەتە کردوە، بۆچی؟! چونکە لەشفرۆشیی بەس ئافرەتە زیناکەرەکە دەگرێتەوە، کێ فرۆشەرە؟ ئافرەت، ئەدی کوا بەرانبەرە بێ ناموسەکەی؟! بەپێی ئەو وشەیە بێ دیارنیەو، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچووە! وە لەڕاستیدا بە پێی ئەو وشەیە بێ زیاتر ناوبەدییەکە بۆ ئافرەتەکەیە، وە خەتابارکردنەکە زیاتر ملی ئافرەتەکە دەگرێتەوە، وەك بڵێی پیاوەکە هیچی نەکردوە!!

**سێیەم: یەكەمین دز كە دەستی بڕاوە:**

زانایان و توێژەرەوان دەڵێن: یەكەمین دز كە دەستی بڕاوە لە سەردەمی ئیسلامدا لە پیاوان پیاوێك بووە ناوی (الخِيار بن عَديّ بن نَوْفل بن عَبدُ مَنَاف القُرَشي النَّوْفَلي)ە، كە بە چەند پشتێك دەگاتەوە پێغەمبەر ﷺ، وە لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا منداڵ بووە.

لە ژنانیش یەكەمین ئافرەت كە دەستی بڕاوە ناوی (مرة بنت سفيان بن عبد الأسد من بني مخزوم) ئەو ئافرەتەی كە پێغەمبەر ﷺ لەبارەیەوە تكای بۆ كرا، فەرمووی: ﴿لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ ابْنَةَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ، لَقَطَعْتُ يَدَهَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٥٣٣٦)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٤٧٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٣٨٦)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣٧٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٤٣٠)، وَالنَّسائِيُّ برقم: (٤٨٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٤٧)}، واتە: ئەگەر فاتیمەی كچی موحەممەدیش دزیی كردبا دەستی دەبڕی.

**چوارەم: مەرجەكانی بڕینی دەستی دز:**

زۆر كەس وا دەزانێ هەر كەسێك هەر جۆرە دزییەك بكات دەستی دەبڕدرێ، جا ئەوانەی كە ڕەخنە دەگرن لە حوكمی سزای دەست بڕین لە ئیسلامدا، بە زۆریی لەبەرئەوەی كە شارەزانین، وادەزانن ستەمە، كە بە داخەوە هەندێ لە مامۆستایانیش كاتێك باسی ئەو حوكمە دەكەن دەڵێن: دەبێ دز دەستی ببڕدرێ، بێئەوەی كە تەفصیلی بدەنێ، بەڵام لەڕاستیدا وانیە، جارێ بابای دز پێنج مەرجی هەن و دەبێ پێنج مەرجی تێدابن، ئنجا دەستی دەبڕدرێ، وە ئەو شتەی كە دزراوە، دەبێ چوار مەرجی تێدا ببینرێن، ئەوجار ئەو دزە دەستی لەسەری دەبڕدرێ، وە ئەو شوێنەش كە شتی تێدا دەدزرێ، ئەویش مەرجێكی هەیە.

**یەك/ مەرجەكانی بابای دز بۆئەوەی كە دەستی ببڕدرێ:**

١) دەبێ باڵغ بێ، منداڵ دەستی نابڕدرێ.

٢) دەبێ عاقڵ بێ، شێت دەستی نابڕدرێ.

٣) دەبێ خاوەنی ئەو شـتە نەبێ كە دزراوە، واتە: بەشی تێدا نەبێ، بۆیە هەندێك لە زانایان دەڵێن كەسێك لە خەزێنەی دەوڵەت (بیت المال) دزیی بكات، دەستی نابڕدرێ، چونكە بەشی وی تێدا هەیە.

٤) دەبێ ئەو سامانە كە دزیی لێكردوە، لە ژێر سەرپەرشتیاریی خۆیدا نەبێ.

٥) ئەو كەسە كە دزیی كردوە، نابێ لەبەر برسیەتیی‌و ناچاریی دزیی كردبێ، وەك لە خاڵی یازدەیەمدا بە درێژیی باسی دەكەین.

**دوو : مەرجەكانی ئەو شتەی دەدزرێ‌و دەستی دزی لەسەر دەبڕدرێ :**

١/ (النصاب) واتە: بگاتە ئەندازەی دیاریكراوی شەرعیی، ئنجا ئایا شەریعەت ئەندازەیەكی دیاریی كردوە، یان هەر شتێك بدزرێ، دەستی دزی لەسەر دەبڕدرێ؟! لەوەدا ڕاجیایی هەیە لە نێوان زانایاندا، بەڵام ئەو فەرمایشتە هەیە لەوبارەوە كە دایكمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە كە لە پێغەمبەری خوای ﷺ بیستوە، فەرموویەتی: ﴿لاَ تُقْطَعُ يَدُ السَّارِقِ إِلاَّ فِي رُبْعِ دِينَارٍ فَصَاعِدًا﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٧٨٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٣٧٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٩٣٦)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٥٨٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٤٦٤)}، واتە: دز دەستی نابڕدرێ، مەگەر لەسەر شتێك كە بە قەدەر (٤/١) چواریەكی دینارێكی زێڕو زیاتر بێ، لەسەر كەمتر لەوە، نابڕدرێ.

وە من پێمـوایە دەگونجـێ دەسـەڵاتی شـەرعیی‌و دەوڵەتی ئیسلامیی قسە لەو ئەندازە دیاریكراو (نصاب)ەشدا بكات، واتە: ئەو كاتە ڕەنگە ئەوە ئەندازەیەك بووبێ كە شتێكی گرنگ بووبێ، بەڵام ئەگەر لە ڕۆژگاری ئێمەدا، وە لە ڕۆژگاری دوای ئێمەدا، لە كۆمەڵگایەكدا، ئەو ئەندازەیە هیچ شتێكی وانەبوو و، شتێكی كەم بایەخ بوو، دەسەڵاتی شەرعیی بۆی هەیە قسەی تێدا بكات‌و ئەندازەیەك دابنێ‌و بڵێ لەو ئەندازەیە كەمتر دەستی كەسی لەسەر نابڕدرێ، یەكێك بۆی هەیە بڵێ: ئەدی چی لەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ دەكەن كە دەفەرموێ: ﴿لَعَنَ اللهُ السَّارِقَ، يَسْرِقُ الْبَيْضَةَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ؛ وَيَسْرِقُ الْحَبْلَ فَتُقْطَعُ يَدُهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٤٣٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم:

(٦٧٨٣)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٤٣٨٤)، وَالنَّسَـائِيُّ بـرقم: (٤٨٧٣)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٢٥٨٣) عَن أَبِي هُرَيْرَةَ ﷛}، واتـە: نـەفرینی خـوا لـە دز بـێ، هێلکـە دەدزێ، دەستی دەبڕدرێو گوریسـێك دەدزێ، دەسـتی دەبڕدرێ؟

زانایـان دەڵـێن: لێـرەدا مەبەسـت ڕوونکردنـەوەی حوکمـی شـەرعیی نیـە، بەڵکو مەبەست ترسـاندنی خەڵکـە لـە دزیـی، وەك چـۆن پێغـەمبەر ﷺ لـە فەرموودەیەکـدا دەفـەرموێ: ﴿مَـنْ بَنَـى لِلّهِ مَسْجِداً، وَلَوْ مَفْحَـصَ قَطَـاةٍ، بَنَـى اللّهُ لَهُ بَيْتـاً فِـي الْجَنَّـةِ﴾{أَخْرَجَـهُ ابْـنُ أبي شَـيبَة بـرقم: (٣١٥٦)، وَابْنُ حِبَّانَ بــرقم: (١٦١١)، وَالطَّبَرَانِــيُّ فِــي (الصـغير) بـرقم: (١١٠٥) عَــنْ أَبِــي ذَرٍّ ﷛ وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح الترغيب والترهيب) رقم: (٢٦٩)}، واتـە: هـەر کەسـێك مزگەوتێـك بـۆ خـوا دروسـت بکـات، ئەگـەر بەقـەدەر هێـلانەی باڵـندەیەکیش بـێ (قطـاة: جـۆرە باڵـندەیەکـە) خـوا لـە بەهەشـت خانوویەکی بۆ دروست دەکات.

ئنجا ئایا مزگـەوتی بەقـەدەر هێـلانەی باڵـندە نوێـژی تێـدا دەکرێ؟! نـا، کەواتـە: لێـرەدا مەبەسـت هانـدانی خەڵـکە بـۆ دروسـتکردنی مزگـەوت، نـەك دیـاریکردنی ئەندازەکـەی، باسـی بڕینـی دەسـتی دزیـش بـە هـەمان شـێوە، ئەگەرنا وەنەبـێ لەسەر هێلکـەو لەسەر گوریس دەستی دز ببـڕدرێ.

هەندێکیش گوتوویانە مەبەست لە هێلکـە، واتـە: زێڕێك بەقـەدەر هێلکـە بـێ، وە مەبەستیش لە گوریس، واتە: گوریسێك کە نرخەکەی لـە یـەك لەسـەر چـواری دینـارێکی زێڕ زیاتر بێ، کەواتـە: مـەرجی یەکـەمی ئـەو ماڵـە دەبـێ ئەندازەیەك بـێ کە شەریعەت دیاریکردوە (نصـاب).

٢/ دەبێ لەو جۆرە ماڵـە بـێ کە بگونجـێ بکرێتـە موڵـكو ماڵو سـامان، بۆیـە زانایان گوتوویـانە: لەسـەر بـەراز، لەسـەر سـەگ، لەسەر شـەڕاب، لەسـەر ئـەو شـتانەی کە پیسـن، یا بشـدزرێن، دەسـت نابڕدرێ.

٣/ دەبێ ئەو ماڵەی کە دزیویەتی بەشی خـۆی تێیـدا نـەبێ، بـۆ وێنـە: دەسـتکەوتی جەنگـی، یاخود خەزێنـەی دەوڵـەت، لەبەرئـەوەی هـەموو کـەس بەشـی تێـدا هەیە، دەستی لەسـەر نابڕدرێ.

٤/ دەبێ بگونجێ بدزرێ، شتێك كە نەگونجێ بدزرێ، بۆ وێنە: كەشتییەك لە بیاباندا، یان هەر شتێكی دیكە كە نەگونجێ بدزرێ، ئەوە دیسان دەستی لەسەر نابڕدرێ.

## سێ: مەرجی شوێنی شت لێ دزراو:

ئەویش یەك مەرجی هەیە، كە پێی دەگوترێ: (الحِرْزُ لِمِثْلِ ذَلِكَ الشَّيءِ الْمَسْرُوق) ئەویش بە كورتی ئەوەیە كە ئەو شتە لەو شوێنەدابێ، كە وێنەی ئەو شتە لەو شوێنە دەپارێزرێ، (القرطبي) دەڵێ: (وَجُمْلَةُ الْقَولُ فِيهِ أَنَّ كُلّ شَيءٍ لَهُ مَكَانٌ مَعْرُوفٌ فَمَكَانُهُ حِرزُهُ، وَكُلُّ شَيءٍ مَعَهُ حَافِظٌ فَحَافِظُهُ حِرْزُهُ) واتە: كورتەی قسە تێیدا ئەوەیە كە هەر شتێك شوێنی هەبێ، شوێنەكەی پێی دەگوترێ (حِرْز)، واتە: ئەو شوێنەی كە ئەو شتەی تێدا دەپارێزرێ، وە هەر شتێك پارێزەرێكی لەگەڵدابێ، پارێزەرەكەی (حِرْز)یەتی، بۆ وێنە: مەڕ شوانی لەگەڵدایە، گاران گاوانی لەگەڵدایە، حوشتر حوشترەوانی لەگەڵدایە، یەكێك بێ مەڕێكی لێ بەرێ، حوشترێكی لێ بەرێ، ئنجا بڵێ جا خۆ لە ئاغەڵێدا نەبووە! ئەدی ئەوە نییە شوانی لەگەڵدا بووە، لەبەرچاوی شوانەكەی بیبا، ئەوەش بە مانای (حِرْز)ی ئەو شتەیە، لەوبارەشەوە ئەم فەرمودەیە هەیە كە ئیمام مالیك بە مورسەلی هێناویەتی (مُرْسَل)یش ئەوەیە كە زانایانی تابیعین قسەیەكیان گێڕابێتەوەو پاڵیان نەدابێتە لای هاوەڵانو یەكسەر لە پێغەمبەرەوە ﷺ بیگێڕنەوە: ﴿لا قَطْعَ فِي ثَمَرٍ مُعَلَّقٍ وَلا فِي حَرِيسَةِ جَبَلٍ فَإِذَا آوَاهُ الْمُرَاحُ أَوْ الْجَرِينُ فَالْقَطْعُ فِيمَا يَبْلُغُ ثَمَنَ الْمِجَنِّ﴾ {أَخْرَجَهُ مَالِك بِرقم: (٣٠٧٥)، مُرْسَلاً، عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِالرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي حُسَيْنٍ الْمَكِّيِّ}، واتە: دەست بڕین نییە لە میوەیەكی هەڵواسراودا (یانی: میوەیەكی كە بە درەختەوەبێ)، هەروەها ئاژەڵێك كە لە چیا پارێزگاریی لێ دەكرێ، (مادام شوانی بەلاوە نەبێ)، بەڵام هەر كاتێك ئاژەڵەكە لە ئاغەڵدا بوو، یاخود میوەكە لەسەر خەرمان بوو، لە شوێنی عەمباركردندا بوو، لەو شوێنەی كە تێیدا دەپارێزرێ، ئەوە ئەوكاتە ئەگەر نرخەكەی بكاتە نرخی (مِجَن) واتە: قەڵغان {كە دیارە بە ئەندازەی چواریەكی دینارێكی زێڕ بووە}، ئەو كاتە دەستی لەسەر دەبڕدرێ.

**پێنجەم: دەستی ڕاست دەبڕدرێ لە مەچەکەوە (رسغ)ەوەو داغیش دەکرێ:**

یانی: پاش بڕانی لە مەچەکەوە داغ دەکرێو دەخرێتە نێو شلەمەنییەکی گەرمەوە، بۆئەوەی خوێنەکەی وشك بێ، چونکە نابێ یەکسەر کابرای دز بکوژرێ، بەڵکو دەویسترێ تەمبێ بکرێ، ئەمما چ تەمبێ کردنێك!! هەزاران کەسی دیکەی پێوە تەمبێ دەبێ، هەڵبەتە ئەوەش دیسان ڕاجیایی زانایانی لەسەرە، بەلام ئەوەی گوتم ئەوە ڕای زۆربەیانە، ئەگەرنا:

خەواریج دەڵێن: دەبێ لە شانیەوە ببڕدرێ.

وە هەندێك دەڵێن: لە ئانیشك (مرفق)ەوە.

شیعەی دوازدە ئیمامییش دەڵێن: تەنیا چوار پەنجەکان دەبڕدرێ، واتە: پەنجە گەورەکەی بۆ دەهێڵدرێتەوەو لەپە دەستەکەشی بۆ دەهێڵدرێتەوە (روح المعاني) ئەوەی هێناوە[١]، هەروەها (تەفسیری نمونە)ش ئەوەی هێناوە[٢].

وە بە نسبەت داغ کردنیشی، واتە: ئەو دەستە بخرێتە شلەمەنییەك: ڕۆن، یان زەیت، یان هەر شتێکی داغو گەرم، بۆئەوەی وشك بێ، (القرطبي) دەڵێ: ﴿قَالَ ابْنُ الـمُنْذِرِ: وَقَدْ رَوَيْنَا عَنِ النَّبِيِّ ﷺ أَنَّهُ أَمَرَ بِقَطْعِ يَدِ رَجُلٍ فَقَالَ: احْسِمُوهَا﴾، واتە: لە پێغەمبەرەوە ﷺ گێڕاومانەتەوە، یان بۆمان گێڕدراوەتەوە کە پێغەمبەر ﷺ فەرمانی کردوە بە بڕینی دەستی پیاوێك، دوایی فەرموویەتی (احْسِمُوهَا)، واتە: داغی بکەن. بۆئەوەی خوێنەکەی زوو وشك بێو بە هۆی ئەوەوە نەمرێ، وە (القرطبي) دەڵێ: (لا خِلافَ أنَّ الْيُمْنَى هِيَ الَّتِي تُقْطَعُ أَوَّلاً)، واتە: هیچ ڕاجیایی لەسەر ئەوە نیە کە دەستی ڕاست پێشی دەبڕدرێ.

هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ ثَوْبَانَ، أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ أُتِيَ بِرَجُلٍ سَرَقَ شَمْلَةً، فَقَالَ: أَسَرَقْتَ؟ مَا إِخَالُكَ تَسْرِقُ، قَالَ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللهِ، قَالَ: اذْهَبُوا بِهِ فَاقْطَعُوا يَدَهُ، ثُمَّ احْسِمُوهَا، ثُمَّ ائْتُونِي بِهِ، فَقَطَعُوهُ، ثُمَّ حَسَمُوهُ، ثُمَّ أَتَوْا بِهِ، فَقَالَ: تُبْ إِلَى اللهِ، قَالَ: أَتُوبُ إِلَى اللهِ، قَالَ:

---

١) ج٤، ص٤٢٨.

٢) ج٤، ص٣٧٦ –٣٧٧.

اللهمَّ تُبْ عَلَيْهِ﴾ {أَخْرَجَهُ عبد الرزاق برقم: (١٣٥٨٣)، هَذَا إِسْنَادٌ مُرْسَلٌ، صَحِيحُ الإِسْنَادِ}، واتە: پیاوێکیان هێنایە لای پێغەمبەر ﷺ پۆشاکێکی دزی بوو، فەرمووی: دزییت کردوە؟ پێم وانەبوو دزیی دەکەی! گوتی: با ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: بیبەن دەستی ببڕن، پاشان داغی بکەن، دوایی بیهێننەوە بۆ لام، دەستیان بڕیو داغیان کردو پاشان هێناویانەوە، فەرمووی: بگەڕێوە بۆ لای خوا، گوتی: دەگەڕێمەوە لای خواو پەشێمانم، (پێغەمبەر ﷺ) فەرمووی: خوایە لێی ببوورە.

**شەشەم: بۆچی خوا فەرموویەتی: ﴿أَيْدِيَهُمَا﴾و نەیفەرمووە: ﴿يَدَيهُمَا﴾؟**

کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا ﴿٣٨﴾﴾، نەیفەرمووە (يَدَيهُمَا) هەرچەندە دووان، (الخليل بن أحمد) و (الفراء) کە دوو زانای زمانەوانیین، گوتوویانە: (كُلُّ شَيءٍ يُوجَد فِي خَلْقِ الإِنْسَانِ إِذَا أُضِيفَ إِلَى اثنينِ جُمِعَ، تَقُولُ: هَشَمْتُ رؤوسَهُمَا وَأَشْبَعْتُ بطونَهُمَا. ﴿إِن تَتُوبَآ إِلَى ٱللَّهِ فَقَدْ صَغَتْ قُلُوبُكُمَا ﴿٤﴾﴾التحريم، واتە: لە زمانی عەرەبیدا بنچینە وایە هەر شتێك لە بەدەنی ئینسان، کاتێك پاڵ دەدرێتە لای دوو نەفەران کۆدەکرێتەوە، کە بگوترێ: سەرەکانیانم پان کردنەوە، یان سەرەکانیانم هارین دەڵێ: (هَشَمْتُ رؤوسَهُمَا) ناڵێ: (رأسيهما) یان ئەگەر بڵێ: زگم تێرکردن، دەڵێ (أَشْبَعْتُ بطونَهُمَا)، پەروەردگاریش فەرموویەتی: ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ لای خوا دڵتان لای داوە، (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هەموو ئەو مەسەلانەی باسم کردن، هێناونی[1].

**حەوتەم: ئەگەر بۆ جاری دووەمو سێیەمو چوارەمیش هەر دزیی کرد، سزای چییە؟**

زانایان لەوبارەوە ڕاجیایی یان هەیە:

ڕایەکیان دەڵێ: بۆ جاری دووەم پێی چەپی دەبڕدرێ، بۆ جاری سێیەم دەستی چەپی دەبڕدرێ، وە جاری چوارەم پێی ڕاستی دەبڕدرێ.

١) الجامع لأحكام القرآن: ج٦، ص١٤٠ – ١٥٤.

ڕایەکیشیان دەڵێ: ئەگەر جاری یەکەم دەستی بڕدرا، ئەوە جاری دووەم هەرچەندە دووبارە بێتەوە هەر حەپس دەکرێ، ئەو ڕایە ڕای ئەبو حەنیفەیە، وە عومەری کوڕی خەتتابیش وای کردوە، واتە: کەسێك دوای ئەوەی کە دەستی بڕدرا دزیی کردبێ، عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ سجنی کردوە، نەچووە پێی چەپو، دوایی دەستی چەپو، دوایی پێیەکەی دیکەشی ببڕێ.

کە لەڕاستیدا ئەم ڕایەش لە ڕووحی شەریعەتەوە نزیکترە، وە گرنگ ئەوەیە مرۆڤ ئەگەر بە جاری یەکەم تەمبێ نەبێ، ئەوە مانای وایە سجن بکرێ باشە، بۆئەوەی خەڵك لەدەستی سەلامەت بن[١].

**هەشتەم: ئایا بابای دز ئەگەر شتە دزراوەکەی فەوتاندبوو، پێی دەبژێرێ؟!**

زانایان لەوبارەوە ڕاجیایی یان هەیە:

**ڕای یەکەم**: کە هی شافیعیی و ئەحمەدو ئیسحاقە، ڕەحمەتی خوایان لێ بێ دەڵێن: بابای دز، چ هەبوو (مُیَسّر)بێ، چ نەبوویێ (مُعَسّر)بێ، ئەگەر هەبوویێ، دەبێ یەکسەر ئەو شتەی دزیویەتی لێی وەربگیرێتەوە، وە ئەگەر نەبوویێ، لەسەری دەبێتە قەرزو دوایی دەبێ بیبژێرێ.

**ڕای دووەم**: مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: ئەگەر شتەکە مابێ، ئەوە ڕەتی دەکاتەوە، بەڵام ئەگەر نەمابێ و ئەویش هەبووبێ و ئیمکانیەتی هەبێ، پێی دەبژێرێ، بەڵام ئەگەر نەداربێ و هیچی نەبێ، ئەوە چاوپۆشیی لێ دەکرێ، (قُرطُبي) ئەم ڕایانەی لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناون[٢].

بەڕاستی منیش ڕایەکەی مالیکم پێ لە ڕووحی شەریعەتەوە نزیکترە، کە بابای دز دوای ئەوەی کە دەستێکی بڕدراوە، ئنجا ئەو شتەشی کە دزیویەتی مادام فەوتابێ، یان سەرفی کردبێ، یان نەمابێ، پێمدووره لە ڕووحی شەریعەتەوە لەسەری ببێتە قەرز، تازە ئەو سزای خۆی وەرگرتوە، لە بەرانبەر ئەو شتەدا، ئنجا ئەگەر دووبارە شتەکەشی پێ بهێنرێتەوە، ئەوکاتە دەبێتە دوو سزا، لەبەرئەوە من ڕایەکەی مالیکم پێ ڕاسترە.

١) محاسن التأويل: ج٤، ص١٩٨، وە (الجامع لأحكام القرآن)، ج٦، ص١٥٢.
٢) الجامع لأحكام القرآن، ج٦، ص١٤٦.

**نۆیەم: ئایا تۆبەی بابای دز پێش کەوتنە بەرپەلی، سزای لێ لادەدات؟ واتە: پێش ئەوەی کە پێی بزانرێ و بگیرێ سزای دەست بڕینی لەسەر لادەچێ؟**

زانایان لەوبارەوە ڕا جیان:

١- (عطاء)و هەندێك لە شافیعییەکان دەڵێن: بەڵێ.

٢- زۆربەیان دەڵێن: نەخێر، (إبْنُ العَرَبي) لە کتێبەکەی خۆی (أحكام القُرآن)دا، کە (القُرطُبي) لە تەفسیرەکەی خۆی (الجامع لأحكام القرآن)دا[1] لێی خواستۆتەوە، ئەو ڕایە بەڕاست دەزانێ، کە تۆبەکردنی دز پێش ئەوەی بکەوێتە بەرپەل، سزای دەست بڕینی لەسەر لانابات، بە پێچەوانەی بابای ڕێگرو جەردەو ئەوەی هەڵدەکوتێتە سەر ماڵو حاڵی خەڵك، ئەوەش بە بەڵگە دەهێنێتەوە، دەڵێ: بابای ڕێگرو جەردە کە هەڵدەکوتێتە سەر ماڵی خەڵك، حاڵیان وایە کە کۆمەڵێك بن، دەستەڵاتیان هەبێ، چەکیان پێ بێ، یاخی بن، لەژێر ڕکێفی دەسەڵاتی شەرعییدا نەبن، بەڵام بابای دز لەبەردەستی مسوڵمانانەو هەمیشە لەبەر پەلیان دایە، واتە: ناتوانێ لێیان دەربازبێ، لەبەرئەوە بە پەشێمانبوونەوەکەی سزاکەی لەسەر ناچێ و، حیسابەکانیان لێکجیان، ئەوەی کە ڕێگربێ لە ژێر ڕکێف دانییە، بۆیە ئەگەر پێش ئەوەی بکەوێتە ژێر ڕکێفو کۆنتڕۆڵی دەستەڵاتی شەرعیی و بگەڕێتەوە، ئەوە باسمان کرد کە تۆبەکەی وەردەگیرێ، وە سزایەکانی هەموو لەسەر لادەچن، یان هەندێکیان، بەڵام دز هەر لەبەردەستی مسوڵمانان دایە، لەڕاستیدا منیش ڕایەکەی (إبْنُ العَرَبي) و (قُرطُبي)یم پێ ڕاستە، کە ڕای زۆربەی زانایانیشە.

**دەیەم: لەسەر دزینی میوە، یان دانەوێڵە، ئەگەر تەنیا بە لێخواردن بێ، بایی ئەوەندەی ئەو ئینسانە پێی لە مەرگ دەربازبێ، دەست نابڕدرێ:**

لەوبارەوە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر ﷺ هەیە: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ رضي الله عنه عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ أَنَّهُ سُئِلَ عَنِ الثَّمَرِ الْمُعَلَّقِ؟ قَالَ: (مَنْ أَصَابَ بِفِيهِ مِنْ ذِي حَاجَةٍ غَيْرَ مُتَّخِذٍ خُبْنَةً فَلاَ شَيْءَ عَلَيْهِ، وَمَنْ خَرَجَ بِشَيْءٍ مِنْهُ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ

---

١) الجامع لأحكام القرآن، ج٦، ص١٥٤.

مِثْلَيْهِ، وَالْعُقُوبَةُ، وَمَنْ سَرَقَ دُونَ ذَلِكَ فَعَلَيْهِ غَرَامَةُ مِثْلَيْهِ وَالْعُقُوبَةُ) وفي رواية: (وَجَلَدَاتُ نَكَالٍ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (١٧١٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢٨٩) وَقَالَ: حَسَنٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٩٥٨) وَحَسَّنَهُ الألباني}، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاص، خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، لە پێغەمبەری خوا ﷺ دەگێڕێتەوە کە پرسیاری لێکراوە لەبارەی میوەی هەڵواسراو، (یاخود میوەیەك کە بە درەختەوەیە)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: هەرکەسێك لەبەر پێداویستی بایی ئەوەندەی کە پێویستی پێیەتی، لێی بخوات، بە مەرجێك هەڵنەگرێ لە گیرفانیدا، یاخود لە کراسیدا، (واتە: لێی نەباتە دەرەوەی باغەکە) ئەوە هیچی لەسەر نیە، بەڵام هەرکەسێك هێندەی لێ بەرێتە دەرێ، کە بگاتە نیصابی دەست بڕین، (واتە: بەرانبەر ڕوبعە دینارێکی زێڕ)، ئەوە دەست بڕینی دەکەوێتە سەرێ، وە هەرکەسێك کەمتر لەوە بدزێ، ئەوە پێویستە دوو قاتی ئەوە کە بردوویەتی بیبژێرێ، وە سزاش بدرێ، (واتە: قسەی پێ بگوترێ، دوو قامچی لێ بدرێ)، وە لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: (وَجَلَدَاتُ نَكَالٍ) واتە: چەند قامچییەکیشی لێبدرێ، وەك سڵەماندنەوەو پڕینگاندنەوە، کە جارێکی دیکە ئەوە نەکات.

**یازدەیەم: هەر کەسێك لە برسان و لەبەر ناچاریی دزیی بکات، دەستی نابڕدرێ؟**

لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار ئەو شەریعەتەی ناردوە یاساکانی لە حاڵەتی ئاساییدا جێبەجێ دەکرێن، بەڵام لە حاڵەتی نائاساییدا حوکمەکانی دەگۆڕدرێن، هەر بۆیە عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێی ڕازی بێ، خەلیفەی دووەمی ڕاشیدی پێغەمبەر ﷺ، لە ڕۆژگاری خۆیدا لە ساڵێکدا کە گرانییو قاتو قڕییو برسیەتیی بوو، کە پێی دەگوترێ (عَامَ المجاعة) یان (عَامَ الرَّمَادَةِ) لەو ساڵەدا حوکمی بڕینی دەستی دزی ڕاگرت، لەبەرئەوەی زەمینەی جێبەجێکردنی نەڕەخسابوو، جا ئەوە هەندێك لە شیعەکان بە نەزانیی ڕەخنەی لێ دەگرن، دەڵێن: عومەر سزایەکی شەرعیی لە کارخستوە! بەڵام لەڕاستییدا عومەر پەکی نەخستووەو (تعطيل)ی نەکردوە، بەڵام زەمینەی جێبەجێکردنی ڕەخساو نەبووە، وەك لە سیرەدا هاتوە، کە (حَاطِبُ بْنُ أَبِي بَلْتَعَةَ) دوو غوڵام، یان زیاتر دەبن حوشترێك لە کابرایەك دەدزن وە سەری دەبڕنو گۆشتەکەی دەخۆن، ئەویش دەیانباتە لای عومەر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەو غوڵامانەم ئەو حوشترەیان دزیوە، {واتە: سزا بدرێنو دەستیان

ببڕدرێ﴾، عومەریش خوا لێی ڕازی بێ لێیان دەپرسێ: بۆچی واتان کردوە؟ دەڵێن: برسیی دەکردینو، نانی نەدەداینێو لەبرسان ئەوەمان کردوە، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، بە خاوەنی حوشترەکەی گوت: نرخی حوشترەکەت چەندە؟

ئەویش ئەندازەیەکی گوت، عومەریش بە (حاطب)ی گوت: بچۆ دوو بەرانبەری نرخی حوشترەیەکەی پارەی بدەیە! وەك سزادانێك بۆی کە غوڵامەکانی برسی کردوونو ناچاری کردوون دزیی بکەن !

لەڕاستیدا ئەو هەڵوێستەی عومەر خوا لێی ڕازی بێ زۆر لەگەڵ عەقڵو مەنتیقو ڕووحی شەریعەتدا دەگونجێ، وە هەر حوکمڕانێکی دیکەی عاقڵو لێزانو دووربینیش دەبێ هەر وابکات، هەر یاسایەکی شەرعیی کاتێ مسوڵمانان دەکەونە نێو بارودۆخێکی نائاسایی یەوە، لەو کاتەدا جێبەجێ ناکرێ، بەڵکو بەس لە بارودۆخی ئاسایی دا جێبەجێ دەکرێ، هەر بۆیە شەرعزانان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە دەڵێن: سزا شەرعییەکان لە کاتی جەنگدا جێبەجێ ناکرێن، بۆ وێنە: سزای مەی خۆریی، سزای زینا، بۆچی؟ چونکە مەترسیی ئەوە هەیە کە ئەو ئینسانە لە ترسی ئەوەی سزا بدرێ، پەناتە لای دوژمن، بۆیە مادام کەوتوونەتە حاڵەتێکی نائاساییەوە، کە حاڵەتی جەنگە، سزا شەرعییەکان جێبەجێ ناکرێن.

**دوازدەیەم: ئەگەر باباى دزیی لێکراو، دزەکەی بەخشی، بەرلەوەی بگاتە لای دادوەر سزایەکەی لادەچێ:**

لەوبارەوە ئەم دەقەی سوننەت هەیە:﴿عَنْ صَفْوَانَ بْنِ أُمَيَّةَ ﷺ قَالَ كُنْتُ نَائِمًا فِي الْمَسْجِدِ عَلَى خَمِيصَةٍ لِي ثَمَنُ ثَلَاثِينَ دِرْهَمًا، فَجَاءَ رَجُلٌ فَاخْتَلَسَهَا مِنِّي، فَأُخِذَ الرَّجُلُ فَأُتِيَ بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَأَمَرَ بِهِ لِيُقْطَعَ، قَالَ: فَأَتَيْتُهُ فَقُلْتُ: أَتَقْطَعُهُ مِنْ أَجْلِ ثَلَاثِينَ دِرْهَمًا؟ أَنَا أَبِيعُهُ وَأُنْسِئُهُ ثَمَنَهَا، قَالَ: (فَهَلَّا كَانَ هَذَا قَبْلَ أَنْ تَأْتِيَنِي بِهِ)﴾ {رَوَاهُ أَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٣٩٤)، وَصَحَّحَهُ الألباني) واتە: صەفوانی کوڕی ئومەییە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: لە مزگەوت خەوتبووم سەرم بە خەمیصەیەك کردبوو (خەمیصە: قوماشێکی ڕەنگاو ڕەنگ بووە، دیارە جۆرە بەرگێك بووە، لە قوماشێکی تایبەت) نرخەکەی سی درەم (ئەو کاتە دراوی زیو پێی گوتراوە: "درهم"و دراوی زێڕ پێی گوتراوە: "دینار"، ڕۆمەکان زیاتر زێڕیان بەکارهێناوەو

دراوی وان دینار بووە، وە فارسەکان زیویان بەکارهێناوەو هەر دینارێك بەرانبەری دە (١٠) درهەم تاکو دوازدە درهەم بووە) ئەو کاتی پیاوێك هات ئەو خەمیصەیەی لێ دزییم، دوایی کابرا گیراو بردرا بۆ لای پێغەمبەر ﷺ ئەویش فەرمانی کرد کە دەستی ببڕدرێ، (دیارە دوای ئەوەی لێی کۆڵیوەتەوە لە ناچاریی نەبووەو مەرجەکانی تێدابووە، بەڵام ڕاوییەکان کە فەرمایشتەکان دەگێڕنەوە، ناچنە نێو تەفاصیلی ڕووداوەکان، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ هەر کەسێك کە دزیی کردبێ، یەکسەر نەیفەرمووە: دەستی ببڕن، حەتمەن لێی کۆڵیوەتەوە، ئایا لە ناچاریی دزیویەتی؟ چۆنی دزیوە؟ مەرجەکانی تێدا دێنەدی؟) منیش چووم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ گوتم: ئایا لەبەر سی (٣٠) درەمی زیو دەستی دەبڕی؟ من پێی دەفرۆشم، وە نرخەکەشی بۆ دوا دەخەم (هەرکاتێ بووی نرخەکەم بداتێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: دەبوایە ئەوە پێش ئەوەبێ کە بیهێنێ بۆ لای من (واتە: دوای ئەوە هاتوە بۆ لای من، تازە ئەو سزایە دەبێ جێبەجێ بکرێ).

هەڵبەتە هەندێ: لە زانایانیش دەڵێن: مادام بابای شت لێ دزراو دزەکەی بەخشی، سزایەکەی لەسەر لادەچێ، وە بە تەئکید دەوڵەتی ئیسلامیی بۆی هەیە ئەو ڕایە وەربگرێ، کە مادام بابای شت لێ درزراو دزەکەی بەخشی، ئەو سزایەی بەسەردا نەچەسپێ، واتە: ئەگەر ئەوەش جێبەجێ بکرێ، لەگەڵ ڕووحی شەریعەتدا دەگونجێ، هەرچەندە ئەو فەرمایشتەش هەیە، بەڵام دیارە زانایان‌و شەرعزانان لەبارەی فەرمایشتەکانەوە جاری وا هەیە دەڵێن: سەنەدەکەی بەهێز نیە، جاری وا هەیە دەڵێن: مەتنەکەی لەگەڵ فەرموودەیەکی دیکەدا تێکدەگیرێ، بەهەرحاڵ بواری تێدا هەیە.

ئنجا لە کۆتایی باسی سزای دەست بڕیندا پرسیارێك دەکرێ: ئایا سزای دەست بڕینی دز زۆر قورس نیە لە چاو تاوانەکەیدا! یانی: کەسێك دزیی دەکات، بەڵێ لە ناچاریی نیەو، برسی نیە، بەس دزیی دەکات بایی ڕوبعە دینارێك، ڕوبعە دینارێکی زێڕ، کە وەك گوتم: دەگونجێ دەوڵەتی ئیسلامیی نیصابێکی دیکە دابنێ لەم ڕۆژگارەدا، بۆ وێنە: بگوترێ دەبێ دە گەلا بێ، دەبێ ملیۆنێك دیناری ئێستا بێ، دەبێ ئەوەندە ڕیاڵ‌و تومەنە بێ، دەگونجێ، وە پێموایە بواری تێدا هەیە، بەڵام هەرچۆن بێ، ئایا لەسەر ئەندازەیەکی ئاوا، بڕینی دەستی ئینسانێك‌و کەم ئەندامکردنی، سزایەکی زۆر قورس نیە؟

لە وەڵامدا دەڵێین: با قورسە، جا کاتی خۆی (أَبُو عَلاء المعرِّي) کە شاعیرێك بووە هەندێکیان تۆمەتباریشیان کردووە کە بێدین (مُلحِد) بووە، شیعرێکی گوتوە دەربارەی ڕەخنەگرتن لەم حوکمە شەرعییە، بەڵام زۆر بە زۆرزانانە ڕەخنەکەی گرتووە دەڵێ:

يَدٌ بِخَمْسِ مِئِينَ عَسْجَدٍ وُدِيَتْ

مَا بَالُهَا قُطِعَتْ فِي رُبْعِ دِينَارِ

تَنَاقُضٌ مَا لَنَا إِلاَّ السُّكُوتَ لَهُ

وَأَنْ نَعُوذَ بِمَوْلانَا مِنَ النَّارِ

واتە: دەستێك ئەگەر بە ناهەق ببڕدرێ، بە پێنج سەد دیناری زێڕ خوێنەکەی دەدرێ، ئەدی بۆچی لەسەر چارێگە دینارێك دەبڕدرێ، کە بدزێ.

ئەوە حوکمێکی ناکۆك‌و پێکەوە دژ بووە، کە هیچمان بۆ نییە مەگەر لە بەرانبەریدا بێدەنگ بین.

وە پەنابگرین بە سەرپەرشتیارمان بە پەروەردگارمان، لە ئاگری دۆزەخ!!

ئەوە لێرەدا ڕەخنەیەکی زۆر شەیتانانەیە، ئەگەرنا (تَنَاقُضَ مَا لَنَا إِلاَّ السُّكُوتَ لَهُ) ئەوە ڕەخنەگرتنە لە حوکمی خوا!

ئنجا (علم الدين السَّخَاوِيِّ) کە یەکێکە لە زانایانی ئیسلام، لە وەڵامدا بە یەك دێڕە شیعر ئەو وەڵامەی دەداتەوە، زۆر بە جوانیی‌و هەر لەسەر کێش‌و سەرواى خۆی‌و دەڵێ:

عِزُّ الأَمَانَةِ أَغْلاهَا وأرخصها

ذلُّ الخِيَانَةِ فَافْهَم حكمة الباري

واتە: عیززەتی دەستپاکیی قیمەتەکەی گران کردبوو، واتە: دەستێك کە دزیی نەکات، یەکێك لە خۆڕا بیبڕێ‌و سەقەتی بکات، لەبەرئەوەی دەستێکی ئەمینە قیمەتی زۆرەو دەبێ نیوەی خوێن بدرێ، کە پێنج سەد دیناری زێڕە، بەڵام زەبوونیی خیانەت‌و دزیی هەرزانی کردوە، ئەو دەستەی دەستێکی ئەمین بێ، لە لای

خوا گرانە بە پێنج سەد دیناری زێر دەبێ خوێنەکەی بدرێ، بەڵام دەستێك کە دزیی کرد، خۆی سووكو هەرزان دەکاتو، لەسەر لەسەر چارەگە دیناریکی زێڕ دەبڕدرێ، لە حیکمەتی خوای پەروەردگار تێبگە.

یەکێك لە زانایان دەڵێ: (لَمَا كَانَتِ أَمينة كانت ثمينة ولما خانَت هانت)، واتە: کاتێك ئەو دەستە ئەمین بوو، بە قیمەت بوو، بەڵام کاتێك خیانەتی کرد سووك بوو.

یەکێکی دیکە لە زانایان قسەیەکی جوان دەکات دەڵێ:

(الأيادي أربعة:

١/ يد عَامِلَة: يُكْرِمُهَا الإِسْلَام .

٢/ ويد عَاطِلَة: يُشْغِلُهَا الإِسْلَامِ.

٣/ ويد عَاجِزَة: يُعِينُهَا...

٤/ ويد خَائِنَة: يقطعها...)

واتە: دەستەکان چوارن:

١/ دەستی ئیشکەر، ئیسلام ڕێزی لێ دەگرێ.

٢/ دەستێکی پەککەوتوو یان بێ ئیش، ئیسلام ئیشی بۆ دەدۆزێتەوە،

وەك لەوبارەوە ئەم بەسەرهاتە لە سوننەت دا هاتوە:

﴿عن أنس أن رجلاً من الأنصار أتى النبيَّ ﷺ فسألَه عطاءً، فقال الرسول ﷺ : أما في بيتك شيءٌ؟ قال: بلى، حِلْسٌ نَلْبَسُ بَعضَهُ ونَبْسُطُ بعضهُ، وقعب نشرب فيه، فقال: إئتني بهما، فأخذهما رسول الله ﷺ بيده وقال: من يشتري هذين؟ قال رجلٌ: أنا أخذهما بدرهم، قال رسول الله ﷺ: مَنْ يَزِيدُ على درهم؟ مرتين أو ثلاثاً فقال رجلٌ: أنا أخذهما بدرهمين، بأعطاهما إيّاه، فأخذ الدرهمين وأعطاهما الأنصاريَّ، وقال له: إشتر بأحدهما طعاماً فانبذه الى أهلك، واشتر بالآخر قدوماً فائتني به، فأتاه به، فَشَدَّ فيه رسول الله ﷺ عوداً بيده، ثّم قال: إذهب فاحتطِبْ و بعْ ولا أرينَّك خمسة عشر يوماً.

فجاءَ وقدَ أصاب عشرة دراهم، فاشترى ببعضها ثوباً و ببعضها طعاماً. فقال له رسول الله ﷺ: هذا خيرٌ لك من أن تجيء المسألَةُ نكتة سوداءَ في وجهك يوم القيامة، إن المسألة لا تصلح الا لثلاثة: لذي فقرٍ مُدْقِعٍ، أو لِذي غُرّمٍ مُفظِعٍ، أو لذي دَمٍ موجعٍ﴾ { رواه أبوداود في السنن، ج ٢، ص ١٢٠، وابن ماجة في السنن، ج ٢، ص ٧٤٠ والمنذري في الترغيب والترهيب)، ج ٢، ص ٥٢٢.

کە پوختەی مانایەکەی ئەوەیە: پیاوێکی ئەنصاریی هاتۆتە لای پێغەمبەرﷺو داوای هاوکاریی لێکردوەو، ئەویش بەڕەیەكو قاپێکی گەورەی زیاد کە لە ماڵیان دا بوون، بە دوو درەم بۆی فرۆشتوونو، بە درەمێکیان هەندێك خواردنی بۆ ماڵەوەیان پێ کڕیوەو، بەوی دیکەشیان دەمە بیور (تەور)ێكو، بە دەستی خۆیشی کلکی بۆ تێبڕیوەو، فەرمانی پێکردوە کە بچێ دار لە چیا بهێنێو بیفرۆشێو، هەتا پازدە ڕۆژان بەردەوام بێ، ئنجا پاش پازدە ڕۆژەکە کابرا دە (١٠) درەمی پەیدا کردوونو، هەم جلوبەرگو هەم خۆراکیشی پێکڕیوەو، پێغەمبەریش ﷺ پێی فەرمووە: ئا ئەمە باشتر بوو لەوەی کە ڕۆژی قیامەت بێیو بەهۆی سواڵکردنەوە خاڵێکی ڕەشت بە ڕووەوە بێ!

پاشان فەرموویەتی: کە داواکردنی هاوکاریی تەنیا بۆ سێ جۆرە کەسان ڕەوایە: هەژارێکی ڕەجاڵ، یان قەرزدارێکی بارگران، یان خاوەن خوێنێکی بێچارەو دەرەتان.

کەواتە: دەستێك بێ ئیش بێ، ئیشی بۆ دەدۆزێتەوە.

٣/ وە دەستێك کە دەستە پاچەبێ، کەسابەتی بۆ نەکرێو پەککەوتە بێ، ئیسلام هاوکاریی دەکات.

٤/ وە دەستێکی خیانەتکاریش، ئیسلام دەیبڕێ.

ئنجا ئێمە لە کۆتایی کۆی ئەم باسو بابەتەی حوکمی بڕینی دەستی دزدا دەڵێین:

**یەکەم:** ئیسلام بەرنامەیەکی گشتگیرو هەمەلایەنەیە، وە دەبێ کاتێك سەرنجی یەکێك لە یاساکانی ئیسلام دەدەین، لە نێو لە کۆی بەرنامەکەدا تەماشای بکەین، ئەگەرنا دیمەنێکی هەڵەمان دەکەوێتە بەرچاوو، وێنەیەکی هەڵە وەردەگرین لەو سزایە، یاخود لەو یاسایە، بۆ وێنە: ئینسان دەچێ تەماشای کۆشکێك دەکات، تەماشای خانوویەکی گەورە دەکات، ئەگەر بەس تەماشای دینگەکە بکات، دەڵێ: ئەو دینگەیە بۆ لێرە دانراوە؟! وە ئەگەر تەنیا تەماشای یەکێك لە ژوورەکان بکات، دەڵێ: ئەو ژوورە چی دەکات لێرەدا؟ بەڵام ئەگەر تەماشای کۆی هەمووی بکات، دەزانێ ئەو دینگە واتای خۆی هەیەو، ئەو ژوورە واتای خۆی هەیە، ئەو جامخانەیە واتای خۆی هەیە، وە هەروەها، ئنجا لەڕاستییدا زۆربەی ئەوانەی ڕەخنە لە یاساکانی ئیسلام دەگرن، ئنجا ئەو یاسایە سزای دزییە، یاخود هەر یاسایەکی دیکەو حوکمێکی دیکەی شەرعییە، دەچن لە سیاقەکەی خۆیو لە نێو هەموو یاساکاندا دەری دێننو بە جیا تەماشای دەکەن، ئنجا کە بە جیا تەماشای دەکەن، شتێکی سەیر دێتە بەرچاو، بۆ وێنە: ئەو یاسای دەست بڕینە ئەگەر بە جیا تەماشای بکەی، وایە، بەڵام تۆ وەرە لە کۆی سیستەمی حوکمڕانیی ئیسلامیی دا تەماشای بکە، ئیسلام دەیەوێ دینی خەڵك، عەقڵی خەڵك، نامووسی خەڵك، ماڵو سامانی خەڵك، هێمنو ئاسایشی خەڵك، بپارێزێو هەر کەسێك دەستدرێژیی بکاتە سەر یەکێك لەوانە، سزای بۆ داناوە، کەواتە: ئیسلام دەیەوێ کۆمەڵگای مسوڵمان کۆمەڵگای ئیسلامیی کۆمەڵگایەك بێ، خەڵك لە دینو ژینو ناموسو ئاسایشو ماڵو سامانو ئابڕووی دڵنیابێو، هەر کەسێك یەکێك لەوانە بخاتە مەترسیی یەوە، سزای بۆ دانراوە.

**دووەم:** ئەو مەرجانەی کە دانراون بۆ بڕینی دەستی دز، دەبێ هەموویان تەماشا بکرێن، کە بە داخەوە زۆر لە مامۆستایانیش کە وتار دەدەن لەسەر مینبەر، یان کە دەرس دەڵێنەوەو باسی ئەو حوکمە ئیسلامییانە دەکەن، هەر یەکسەر دێنن لایەنە قانونییەکەی باس دەکەنو حوکمەکەی باس دەکەن، ناچن تەفاصیلی دیکەی باس بکەن: ژینگەی تێدا جێبەجێ کرانی، لە چ کۆمەڵگایەکدا جێبەجێ دەکرێ؟ کەی جێبەجێ دەکرێ؟ بەسەر کێدا جێبەجێ دەکرێ؟ مەرجەکانی چین؟ دەبێ ئەوانە هەموو باس بکرێن، ئەگەرنا وەك گوتم: بۆچوونێكو

تێڕوانینێکی هەڵەمان دەربارەی، چ جا یاسای دەست بڕینی دز بێ، چ هەر یاسایەکی دیکە بێ، بۆ دروست دەبێ.

**سێیەم:** سزا شەرعییەکان لە ئیسلامدا دوایین شتن کە جێبەجێ دەکرێن، هەندێ کەس وا تەصەووڕ دەکات، هەرکات ئیسلام دەستەڵاتی بوو، دەوڵەتێکی ئیسلامیی هەبوو، یەکسەر لە جێبەجێکردنی سزا شەرعییەکانەوە دەست پێدەکات، بزانێ کێ زینای کردوە؟ بزانێ داخۆ کێ شەرابی خواردوە، سزا بدرێ؟ نا، ئەگەر تەماشای دەوڵەتی ئیسلامیی یەکەم بکەین، کە پێغەمبەر ﷺ بەرد بەرد دایناوە، دەبینین سزا شەرعییەکان لە کۆتایی تەمەنی پێغەمبەردا ﷺ هاتوونەتە خوارێ، ئەم سوورەتی (المائدة) کە باسی سزای ڕێگریی تێدایە، وە باسی سزای دزیی تێدایە، وە باسی حوکمی کۆتایی شەراب خۆریی تێدایە، ئەم سوورەتی (المائدة)یە کە وەك پێشتر باسمان کرد، دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: کۆتا سوورەتە کە پێکەوە لە قورئان هاتۆتە خوار، وە هیچ شتێکی تێدانیە نەسخ کرابێتەوە، کەواتە: سزا شەرعییەکان لە دوا دوای تەمەنی موبارەکی پێغەمبەرو ﷺ لە دوا قۆناغی دەوڵەتی ئیسلامیدا هاتوونەتە خوار، دوای ئەوەی کۆمەڵگایەکی ئیسلامیی هەبوو، پەروەردە کراوەو تێگەیەنراوە، خەڵك بەرچاوی ڕۆشن کراوەتەوە، پێداویستییەکانی بۆ دابین کراون، ئنجا دوای ئەوە خەڵك سزا دەدرێ، بەڵام هەر لە ڕێوە خەڵك سزا بدەی! نەخێر، دەبێ سەرەتا پێداویستییەکانی بۆ دابین بکەی، دەوڵەتی ئیسلامیی دەبێ ئەرکەکانی خۆی لە بەرانبەر هاووڵاتییانو دانیشتوانی دەوڵەتەکەی دا جێبەجێ بکاتو سەرەتا پێداویستییەکانی بۆ دابین بکاتو، ڕاستییەکانیان فێر بکاتو، پەروەردەیان بکاتو بەرچاویان ڕۆشن بکاتەوە، ئنجا دوای ئەوە بۆی هەیە سزایان بدات، لەسەر ئەوەی کە لادەدەن، بەڵام هەر لە ڕێوە سزایان بدات، وەك هەندێك گروپو خەڵکی ئیسلامیی لە هەندێ شوێن، چ لە هەرێمی کوردستان، چ لە هەر شوێنێکی دیکەدا ئاوایان کردوە، ئەوە غەڵەتەو، مانای وایە لە ئیسلام تێنەگەیشتوون، چونکە ئیسلام پێش ئەوەی لە سزادانی خەڵك بخەفتێ، لە دابینکردنی پێداویستییەکانیان دەخەفتێ، پێشێ پێداویستییەکانیان بۆ دابین دەکات، ئنجا دوای ئەوە دێنێ لەسەر خراپە سزایان دەدات، ئەگەرنا بە بێ دابینکردنی پێداویستیەکان، وە

بە بێ پەروەردەکردنی خەڵك، بە بێ لێ حاڵی کردنیان، ناگونجێ سزایان بدات، لەسەر شتێك کە بۆی ناچارن بیکەن، یان نایزانن !

**مەسەلەی پێنجەم:** کە لەم ئایەتە وەردەگیرێ، واتە: ئایەتی کۆتایی ئەم دەرسەمان کە دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾، واتە: ئایا نازانی کە خوا موڵکی ئاسمانەکانو زەوی هەیە، هەر کەسێکی بوێ سزای دەدات، هەر کەسێکیشی بوێ لێی دەبوورێ، وە خوا لەسەر هەموو شتێك بە توانایە، ئەوە وەڵامی ئەو گومانو خوتخوتەو پرسیارانە دەداتەوە، کە لە عەقڵو دڵی کەسانێکی وەك (أَبُو عَلاء المعرِّي)، یان هەر کەسێکی دیکەدا، با مسوڵمانیش بێ، پەیدا دەبن، سەبارەت بە قورسیی سزا شەرعییەکان، کە لەڕاستیی دا سزا هەردەبێ قورس بێ، سزا دەبێ بە ئێش بێ، ئەگەرنا خەڵك لە ستەمو خراپە ناپرینگێتەوە، ئنجا وەك باسیشمان کرد: سزای دەست بڕین، یاخود سزای داوێنپیسیی، یاخود هەر سزایەکی دیکەی شەریعەت، وا بە ئاسانیی جێبەجێ ناکرێو، دەبێ هەلومەرجەکەی بۆ بڕەخسێ، وە دەبێ بە ئیسپاتو سەلماندن بێ، دەبێ ئەو مەرجانە کە بە پێویست گیراون هەموویان هەبن، ئەوجار ئەو سزایە دەچەسپێ، وە سزاش دەبێ بە ئێش بێ، بۆ ئەوەی کە خەڵك بپرینگێنەوە لە خراپەو تاوان، ئەگەرنا ئێمە ئێستا دەبینین ئەوانەی کە ئێستا لە جیاتی بڕینی دەستی دز، سزای دیکەیان داناوە، بۆ وێنە: لە وڵاتانی ڕۆژئاوا کە دز دەگرنو زیندانیی دەکەن، هەیە لە نێو حەپسخانەکەشدا دزیی دەکات، وە لەڕاستیدا ئەوەی ئەوان وەك میوانخانەیەك وایەو، ئەو تاوانبارانە نەك لە تاوان ناسڵەمنەوە، بەڵکو بابای تاوانبار دوایی کە دێتەدەر لە زیندان، لەبەرئەوەی ناخۆشی لێ نەگوزەراوە، ڕەنگە زیاتر دزیی بکاتو، زیندان زیاتر سووری بکات لەسەر تاوانو دەست درێژیی!!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دەیەم

## پێناســەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە سێ ئایەت پێکهاتوە (٤١ - ٤٣)، کە تێیاندا خـوای کاربەجـێ بانگـی پێغـەمبەری خـوای موحەممـەد ﷺ دەکـات‌و، وە ئامۆژگـاریی دەکـات کـە لـە پێشبـڕکەکردنی بێبـڕوایان لـە دەخەڵەکـان‌و جوولەکەکـان لـە دژایەتیکـردنی ئیسـلام‌و مسـوڵمانانـدا، دڵتـەنگ نەبـێ، لەوانـەی کـە بـە زار گوتیـان: ئیمانمـان هێنـاوە، بـەڵام دڵەکانیـان ئیمـانی تێدانیە، بە مەبەستی بە درۆدانـان زۆر گوێت بـۆ دەگـرن، یـان زۆر گوێ بـۆ درۆو دەلەسـەی گەورەکانیـان دەگـرن، هـەم بۆخۆیـان هـەم بـۆ کەسـانێکی دیکـە، کە ئامادە نەبوون لەلات، کە ئەگەر دادوەریی پێغـەمبەری خوایـان بـە دڵ بـێ‌و بـە پێـی ئارەزوویـان بـێ، لێـی وەردەگـرن، ئەگەرنـا لـێی وەرناگـرن، پاشـان خـوای پەنهانزان ڕایدەگەیەنێ کە ئەو جۆرە کەسانە، خـوا نەیویسـتوە دڵیـان پـاك بکاتـەوەو، شـایستەی سەرشۆڕیی دنیاو سزای مەزنی دواڕۆژن.

پاشـان خـوای زانـاو توانـا ئەو جۆرە کەسانە بەوە پێناسـە دەکـات، کـە زۆر گـوێ بـۆ درۆو دەلەسـە هەڵدەخـەن‌و، زۆریش حەرامخـۆرن، وە بـە پێغـەمبەر دەفـەرموێ: هـەر کات هاتنـە لات بـۆ دادوەریـی، بۆت هـەیە دادوەریـی یـان لـە نێوانـدا بکـەی‌و، بۆشـت هەیـە پشـتگوێیان بخـەی، بەڵام ئەگەر دادوەرییـت لە نێوانـدا کـردن، دادگـەرانە بیکـە، چونکە خـوا دادگەرانی خۆشـدەوێن.

وە لە کۆتـاییدا خـوای پەروەردگار بە سەرسوورمانەوە ڕایدەگەیەنێ، کە چۆن دەبـێ جوولەکـەکان بێنـە لای تـۆ - ئـەی مەحەممـەد ﷺ ! - بـۆ دادوەریـی، لـە حاڵێکـدا کـە تەوراتیان لەلایەو، لەبـارەی ئـەو مەسـەلەیەوە حوکمـی خـوای تێدایـە؟! کەچـی پشـتی تێدەکـەن، کەواتە: بڕوایان بە تەوراتەکەی خۆیشـیان نیـە!

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ
ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ
سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ يَقُولُونَ
إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن
تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ
لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٤١﴾ سَمَّٰعُونَ
لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن
تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗاۖ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ
يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴿٤٢﴾ وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ
يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٣﴾﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی پێغـەمبەر! بـا ئەوانـەی پێشبـڕکە دەکـەن لـە کـوفردا دڵتەنگـت نەکـەن، لەوانـەی بـە زاریـان گوتیـان: ئیمانمـان هێنـاو دڵـیان ئیمـانی نـەهێناوە، وە لـە جوولەکەکـان، زۆر گوێ هەڵدەخـەن بۆ درۆ، زۆر گـوێ هەڵخـەرن بـۆ کۆمەڵێکـی دیکە کـە نەهـاتوون، وشـەکان پـاش دانرانیـان لـە شـوێنی خۆیانـدا، دەگۆڕن، دەڵێن: ئەگـەر ئەوەیـان پێدان (حـوکم و دادوەرییـەك کە ئارەزووتـانە) ئـەوە وەریبگـرن، بـەڵام ئەگـەر ئـەوەیان پێنـەدان (کـە دڵ پەسـندتانە) ئـەوە وریـابن (وەری مەگـرن)، هـەر کەسـێکیش خوا بیـەوێ بە هۆی (گوناهەکانیـەوە) سـزای بـدات، تـۆ لـە بەرانبـەر خـوادا هیـچـت بـۆی پێنـاکرێ، ئەوانـە کەسانێکن، خـوا نەیویسـتوە دڵیان پـاك بکـاتەوە، (چـونکە شـایستـە نەبوون) لە دنیادا بەشـیان ریسـواییەو، لە ڕۆژی دواییش دا سـزایەکی مـەزن ﴿٤١﴾ زۆر گوێ هەڵخـەرن بـۆ درۆو زۆر حـەرام خـۆرن، ئنجـا هـەر کـات هاتنـە لات، (بـۆ چارەسـەری کێشـەیەك و کردیـانی بە دادوەر) ئەوە دادوەری یان لە نێوانـدا بکـە، یـان پشـتگوێیان بخـە، وە ئەگـەر پشـتگوێیان بخـەی، هـیـچ زیانـت لێنـادەن، وە ئەگـەر دادوەرییشـت کـرد، بـە دادگـەری دادوەریـی یـان لـە نێـوان بکـەو، بێگومـان خـوا دادگـەرانی خۆشـدەوێ ﴿٤٢﴾ ئنجـا ئایا چۆن تۆ دەکـەنە دادوەر، لە حاڵێکـدا تـەوراتیان لەبەردەسـتەو حـوکمی خـوای لـەو مەسـەلەیەدا تێدایـە، کەچـی دوای ئـەوەش پشـت هەڵدەکـەن، بێگومان ئەوانە بڕوادارنیـن (بە تەوراتـەکەی خۆشـیان) ﴿٤٣﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(لَا يَحۡزُنكَ ): (الحَزَنُ والحزونَةُ: خشُونَة في الأَرْضِ وَخشُونَة في النَّفْس، وَحَزَنْتُهُ وَأَحْزَنْتهُ)، (لایَحْزُنكَ) واته: دڵتەنگت نەكات، خەمبارت نەكات، نارەحەتت نەكات، چونكە لە ئەسڵدا (حَزَنْ، حُزونَة) بە زبریی زەوی دەگوترێ، زەوییەك كە زبر بێ، تەختو ساف نەبێ، ئەم وشانەی بۆ بەكاردێن، هەروەها ئینسانیش كە نەفسی ساف نەبێو گرێو گۆڵی تێدابێ، غەمو مەراقی تێدابێ، ئەوەی بۆ بەكاردێ، وە دەگوترێ: (حَزَنْتهُ وأَحْزَنْتهُ) واتە: خەفەتبارم كرد، هەردووكی هاتوه، وە خوێندراویشەتەوە: (لایُحْزِنْكَ)، بەلاّم قیرائەتی (لایَحْزُنكَ) زیاترە.

(يُسَٰرِعُونَ ): (سَرُعَ: فَهُوَ سَرِيعٌ، وَأَسْرَعَ فَهُوَ مُسْرِعٌ: يَتَسَابَقُونَ)،(سَرُعَ، سَرِيعٌ) و (أسرع، مُسْرِعٌ)، واتە: خێرابوو، یانی: هەم (ثُلاثِي)یەكەی هاتوه، هەم (رُبَاعِي)یەكەی هاتوه، ئنجا لێرەدا (يُسَارِعُونَ) یانی: (يَتَسَابَقُونَ) واته: پێشبڕكە دەكەن، یاخود بە مانای خێرایی دەكەن بە موتڵەقیی.

(يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ ): واتە: وشەكان دەگۆڕن، (تَحْرِيفُ الكَلاَمِ: إِمَالَتُهُ وَهُوَ أَن تَجعلَهُ عَلَى حَرْفٍ مِنَ الإحْتِمَالِ يُمْكِنُ حَمْلُهُ عَلَى الوَجْهَيْنِ) لە زمانی عەرەبیدا (تَحْرِيفُ الكَلاَمِ) واته: لادانی ئەو قسەیە بە شێوەیەك كە لەسەر قەراغێك دایبنێی، كە هەم بگونجێ ئەو واتایە بگەیەنێ، وە هەم بگونجێ ئەو واتایەش بگەیەنێ، وەك جوولەكەكان كە دەیانگوت: (رَاعِنا) لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (رَاعاهُ، يُرَاعِيهِ، رَاعِنَا) واتە: چاودێریمان بكە، ڕەچاومان بكە، ئاگات لێمانبێ، بەلاّم ئەوان مانایەكی خراپیان پێ مەبەست بوو، دەڵێ: (رَعِنَ الرَّجُلُ يَرْعَنُ رَعنَاً، فَهُوَ رَعِنٌ، وَأَرْعَنٌ، وامرأَةٌ رَعْنَاءُ وراعنا: إحفظنا)، (رَعِنَ الرَّجُلُ)، واتە: پیاوەكە گێلە، یان كەودەنە، یان كەم هۆشە، (أَرْعَن) واتە: گێلو نەفام، وە بە ئافرەت دەگوترێ: (رَعْنَاء)، واتە: ئافرەتێكی گێل، بەلاّم

(رَاعِنَـا)، واتــە: چاودێرییمان بکـە، ڕەچاومان بکـەو بمـانپارێزە.

(فِتۡنَتَهُۥ): وشـــەی فیتنـــە کـە پێشتـــریش باسمـان کـردوە، لـە ئەسـڵدا بـە مانـای سووتاندنو قاڵکردنـەوەی زێـڕ لە ئاگـردا، تاکو دەرکەوێ داخۆ چـەندی ساغەو چـەندی ناســاغەو، کـانزای دیکـــەی ڕەگـــەڵ خـراوە، بــەڵام دوایــی بــە مانـای تاقیکـــردنەوەو ســـزاو بــەڵاو نارەحەتیـــی بەکارهـــاتوە، وە بــە مانـــای کوفـــرو شیریکیش بەکارهاتوە، بـە پێـی ئـەو سیاقانەی کە تێیانـدا هـاتوە، وشـەی فیتنـە وشـــەیەکە لـە قورئانـدا ڕەنگــە زۆرتـرین مانــا بەدەســـتەوە بـدات، بۆیــە دەبــێ تەماشـــای سیاقی ئایەتـەکان بکـەین، تـا بـزانین بـە چ مانایـەك هـاتوە! بـەڵام لـە ئەســـڵدا بـــە مانـــای تاقیکردنـــەوە دێ، واتـــە: شـــتێك بجـــەڕبێنی بۆئـــەوەی حەقیقەتەکـــەیت بـــۆ دەربکـــەوێ، وە کـــە لـــێرەدا دەفەرمـــوێ: ﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ﴾، یانی: کەسێك خـوا بیـــەوێ بـەڵای بەســـەر بێنـێ، یاخـــود (وَمَنْ يُـرِدِ اللّٰهُ كُفرَهُ) کەسـێك خــوا کوفـــری بـــۆ بـــوێ، یاخـــود (وَمَـنْ يُـرِدِ اللّٰهُ عَـذَابَهُ) کەسـێك خوا بیـەوێ سزای بدات، (وَمَنْ يُـرِدِ اللّٰهُ صَرفَهُ أو انحـرافَهُ) کەسـێك خــوا لادانـی ئــەوی مەبەســت بــێ، ئەو مانـایانە هـەموویـان دەگرێتــەوە.

(لِلسُّحۡتِ): (السُّـحْتُ: القَشْـرُ الَّذِي يُسْـتَأصِـلُ، السَّـحتُ وَالسُّحُت: الحـرَامُ) وشــەی: (سُحْت) لـە زمـانی عەرەبیـــدا بـەو تویێکڵە دەڵـێن کـە لادەچـێ لەسـەر شـتێك کـە دەویسـترێ بخـورێ، یاخـــود هەر شـــتێك کـە ســـپی بکرێ، وە (السَّحتُ وَالسُّحُت) هەردووکیان بـە مانـای حـەڕام دێـن، وەك بڵـێی: هـەر کەسـێك حـەڕام بخـوات، وەك ئەوە وایە دینەکەی خۆی سپی کردبـێو تویێکڵەکـەی لێکردبێتـــەوە، یـان بریـنـداری کردوە، یاخود زیانی پێگـەیاندوە.

(بِٱلۡقِسۡطِ): (القِسْـطُ: هُوَ النَّصِيبُ بِالعَدْلِ كَالنَّصَفِ وَالنَّصَفَةِ، وَالقِسْطُ: هُوَ أَن يَأخُذَ قِسطَ غَيرِهِ، وَالإقسَاطُ: أَن يُعْطِيَ قِسْطَ غَيرِهِ، فَالأَوَّلُ جَوْرٌ، وَالثَّانِي عَدْلٌ وَإِنْصَافٌ) وشـــەی (قِسْط) واتـە: پشـــكو بـەش، كـــە بــە شـــێوەیەكی دادگەرانـە

دابەش کرابێ، (نَصَفُ نَصفَةَ)، واتە: ئینصافو دادگەرییو یەکسانیی، وشەی: (قِسْط) ئەوەیە کە ئینسان بەشی ئەوەی دیکە بۆخۆی بەرێ، بەڵام وشەی: (إقْسَاط) ئەوەیە کە بەشی ئەویدیکە بدات، بۆیە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ﴾، بەڵام لە سوورەتی (الجن)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَمَّا ٱلْقَـٰسِطُونَ فَكَانُوا۟ لِجَهَنَّمَ حَطَبًا ﴿١٥﴾﴾، ئنجا (قاسط) واتە: (جائر وظالم)، چونکە بەشی غەیری خۆی بۆخۆی دەبات، بەڵام (مُقسِط) کەسێکە کە بەشی غەیری خۆی دەدات.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ڕستە قورئانییەی کە دەفەرموێ: ﴿يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا ...﴿٤١﴾﴾، دوو بەسەرهات گێڕدراونەوە:

أ/ ﴿عَنْ نافِعٍ عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَنَّ الْيَهُودَ جَاءُوا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَذَكَرُوا لَهُ أَنَّ رَجُلاً مِنْهُمْ وَامْرَأَةً زَنَيَا، فَقَالَ لَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ: مَا تَجِدُونَ فِي التَّوْرَاةِ فِي شَأْنِ الرَّجْمِ؟ فَقَالُوا: نَفْضَحُهُمْ وَيُجْلَدُونَ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلامٍ: كَذَبْتُمْ، إِنَّ فِيهَا الرَّجْمَ، فَأَتَوْا بِالتَّوْرَاةِ فَنَشَرُوهَا، فَوَضَعَ أَحَدُهُمْ يَدَهُ عَلَى آيَةِ الرَّجْمِ، فَقَرَأَ مَا قَبْلَهَا وَمَا بَعْدَهَا، فَقَالَ لَه عَبْدُ اللهِ بْنُ سَلامٍ: ارْفَعْ يَدكَ فَرَفَعَ يَدَهُ، فَإِذَا فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ، فَقَالُوا: صَدَقَ يَا مُحَمَّدُ فِيهَا آيَةُ الرَّجْمِ فَأَمَرَ بِهِمَا رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَرُجِمَا، قَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ عُمَرَ: فَرَأَيْتُ الرَّجُلَ يَجْنَأُ عَلَى الْمَرْأَةِ، يَقِيهَا الْحِجَارَةَ﴾ {أَخْرَجَهُ مَالِكٌ بِرَقم: (١٤٩٧)، وَالبُخَارِيُّ بِرَقم: (٣٤٣٦)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرَقم: (٤٤٤٦)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرَقم: (٤٤٣٤)}، واتە: نافیع لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە خوا لێیان ڕازی بێ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: جوولەکەکان هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ بۆیان باسکرد کە پیاوێك و ژنێکیان زینایان کردوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: لە تەوراتدا دەربارەی بەردبارانکردن چی دەبینن؟ گوتیان: ڕیسوایان دەکەین، قسەیان پێ دەڵێین، قامچیشیان لێدەدرێ، (ژمارەی لێدانی قامچییەکە دیاریی نەکراوە، گرنگ ئەوەیە باسی بەردبارانیان نەکرد)، عەبدوڵلای کوڕی سەلام (کە یەکێکە لە گەورە زانایانی جوولەکە، بەڵکو ڕەنگە گەورەترینی زانایانیان بووبێ، وەك لە بەسەرهاتی مسوڵمانبوونییدا جوولەکە گوتوویانە: زاناترینمانەو کوڕی زاناترینمانە، بەڕێزترینمانە کوڕی بەڕێزترینمانە، باشترینمانو کوڕی باشترینمانە، مەدحیان کردوە پێش ئەوەی بزانن مسوڵمان بووە، دوایی کە گوتوویەتی: ئەوە من مسوڵمان بووم، گوتوویانە: نەزانترینمانە کوڕی

نەزانترینمانە، خراپترینمانە کوڕی خراپترینمانە،)[1]، بە جوولەکەکانی گوت: درۆ دەکەن لە تەوراتدا باسی بەردبارانکردنی زیناکەر هەیە، ئنجا تەوراتیان بلاوکردەوە، (جا ڕەنگە کتێب بووبێ کردبیانەوە، یان وەك خاوەنی (التحرير والتنوير) دەڵێ: تۆمار بووبێ و پێچراب‌ێ بلاویان کردبێتەوە، وەك فایلێك پێچرابێ) یەکێکیان دەستی لەسەر ئەو ئایەتە دانا کە باسی بەردباران دەکات و، پێش ئایەتەکەو دوای ئایەتەکەی خوێندەوە، عەبدوڵلای کوڕی سەلام گوتی: دەستت لابەرە، دەستی لابرد، ئایەتی بەردبارانکردن لەبن دەستی بوو، گوتیان: ئەی موحەممەد! عەبدوڵلای کوڕی سەلام ڕاست دەکات، ئایەتی بەردبارانکردن هەیە، ئیدی پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد (بە تەوراتەکەی خۆیان حوکمی لە نێواندا کردن و) بەردباران کران، ئنجا عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پیاوەکەم بینی خۆی بەسەر ئافرەتەکەدا شۆڕکردبۆوە (واتە: خۆی بەسەردا گرتبوو، بۆئەوەی بەردی پێنەکەون).

ب/ ﴿عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رضي الله عنه قَالَ مُرَّ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ بِيَهُودِيٍّ مُحَمَّماً مَجْلُوداً فَدَعَاهُمْ ﷺ فَقَالَ: (هَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ)؟ قَالُوا: نَعَمْ، فَدَعَا رَجُلاً مِنْ عُلَمَائِهِمْ، فَقَالَ: (أَنْشُدُكَ بِاللَّهِ الَّذِي أَنْزَلَ التَّوْرَاةَ عَلَى مُوسَى، أَهَكَذَا تَجِدُونَ حَدَّ الزَّانِي فِي كِتَابِكُمْ)؟ قَالَ: لَا وَلَوْلَا أَنَّكَ نَشَدْتَنِي بِهَذَا لَمْ أُخْبِرْكَ نَجِدُهُ الرَّجْمَ، وَلَكِنَّهُ كَثُرَ فِي أَشْرَافِنَا فَكُنَّا إِذَا أَخَذْنَا الشَّرِيفَ تَرَكْنَاهُ، وَإِذَا أَخَذْنَا الضَّعِيفَ أَقَمْنَا عَلَيْهِ الْحَدَّ، قُلْنَا: تَعَالَوْا فَلْنَجْتَمِعْ عَلَى شَيْءٍ نُقِيمُهُ عَلَى الشَّرِيفِ، وَالْوَضِيعِ فَجَعَلْنَا التَّحْمِيمَ، وَالْجَلْدَ مَكَانَ الرَّجْمِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ (اللَّهُمَّ! إِنِّي أَوَّلُ مَنْ أَحْيَا أَمْرَكَ إِذْ أَمَاتُوهُ)، قَالَ فَأَمَرَ بِهِ فَرُجِمَ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي

---

١) بڕوانە: صحيح البخاري: ٣٨١٢، وە صحيح مسلم: ٢٤٨٣.

بۆ درێژەی بەسەرهاتەکەش بڕوانە: (المسند) لأحمد: (٢٥/٦)، و (جامع البيان) للطبري (٨/٢٦ ، ٩)، و(المسند) لأبي يعلى: (٧٨١٦، و صحيح ابن حبان: ٧١٦٢، صحَّحه الحاكم و وافقه الذهبي.

وە بڕوانە (الإستيعاب في بيان الأسباب، ج ٣ ص ٢٠٥ - ٢٠٦، کە گوتوویانە: قلنا: هذا سند صحيح رجاله ثقات.

ٱلْكُفْرِ ﴾، إلـى قَوْلِـهِ: ﴿ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ ... ﴿٤١﴾ ﴾، يَقُولُـونَ ائْتُـوا مُحَمَّـداً فَـإِنْ أَفْتَـاكُمْ بِـالتَّحْمِيمِ وَالْجَلْـدِ فَخُـذُوهُ، وَإِنْ أَفْتَـاكُمْ بِـالرَّجْمِ فَاحْذَرُوا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٨٥٤٨) واللَّفْظُ لَـهُ، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٧٠٠)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٤٤٤٨)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٢٥٥٨)}، واتـه: جوولەکەیەکـیان بـه لای پێغەمبـەر داهێنـا، دەموچـاوی ڕەش کرابـوو، قامچیشـیان لێـدا بـوو، پێغــەمبەری خــوا ﷺ بانگــیکردن، فــەرمووی: ئایــا ئــەوە لــە کتێبەکەتانــدا ســزای زینــایــە؟ (دیـارە ئەو کەسەی زینـای کردوە، بۆیە بـەو جـۆرە سـزایان داوە)، گوتیـان: بەڵـێ، دوایـی پیاوێکـیانی بانگـکرد لـە زاناکانیـان (دیـارە زانیویـەتی ئەهلـی ئینصـافە)، فــەرمووی: خــوات بەگـژ دادەکــەم، (وەك کـوردەواریی خۆمـان دەڵــێن: تـۆ ئــەو خوایــە) کــە تــەوراتی ناردۆتــە ســەر مووســا ﷺ! ئــەوە ســزای زینایــە، لــە کتێبەکەتاندا؟ گوتـی: نـەخێر، وە ئەگەر بـەو شـێوەیە داوات لـێ نەکردبـام (واتـە: ئاوا سـوێندت نەدابـام) هەواڵـم پێنــەدەدای، ســزای زینا لـە کتێبـی ئێمــەدا بریتیـە لــە بەردبارانــکردن، بــەڵام دوای ئــەوەی زینــا لــەنێو پایــەدارەکانمان و خــاوەن پێگەکانماندا زۆر بوو، ئەگــەر یەکێك لەو پیــاوە ناودارانەمـان زینــای کردبا، لــێی دەگەڕاین، ئەگەر یەکێکـی بێهێـزیش زینـای کردبـا، سزامان دەدا، گوتمــان وەرن بـا شـتێك دابنێین بەسـەر پایـەدارو بـێ پایـەدا (واتـە: بەهێـزو بێهـێز) بیچەسـپێنین، ئیدی ڕامان هـاتە سـەر ئەوەی کە دەمـوچاویان ڕەش بکـەین و قامچیـان لـێبدەین، (ئنجا قامچـی بـووە، دار بـووە، بــاس نەکراوە) پێغــەمبەری خــوا ﷺ فــەرمووی: ئەی خـوایــە! من یەکــەم کەسم کە فەرمـانی تۆی زیندووکردۆتـەوە، دوای ئـەوە کە مرانـدبوویان، ئنجا فەرمانی پێکرد ئـەو پیـاوەی زینـای کردبـوو بـەردبارانیان کـرد، خــوای پایـــەبەرزیش ئــەم ئایەتــەی نــاردە خــوارێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ﴾، هــەتا ئــەو شــوێنەی دەفــەرموێ: ﴿ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَٱحْذَرُوا۟ ... ﴿٤١﴾ ﴾. واتــــە: بچــن بــۆ لای موحەممـەد، ئەگـەر ئـاوا فەتوایـدا (کە ئەوانـەی زینایـان کـردوە دەموچـاویان ڕەش بکـرێ و قامچییـان لـێبدرێ) لێی وەربگـرن، بـەڵام ئەگــەر ئـاوا فەتــوای بـۆ نـەدان (وە ئـەگــەر فەتــوای دا کـە بەردبــاران بکـرێن لێـی وەرمەگــرن)، وریــابن، دیـارە بۆخۆیان ڕازی بوون، پێغـەمبەر ﷺ بە تەوراتی حوکمیـان لە نێواندا بکـات.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خـوای پەروەردگار لەم سـوورەتە موبارەکەدا دووجار ڕوو دەکاتە پێغەمبـەری خـوای موحەممـەد ﷺ بـە نازنـاوی (الرسـول) دەیدوێنـێ، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ ﴾، کـە ئێـرە شـوێنی یەکەمیانـە، ئنجـا لەڕاسـتییدا قورئـان هـەمووی ئاراسـتەی پێغـەمبەر ﷺ کـراوە، وە خـوا ﷻ بـە زۆریـی بـە وشـەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، یـاخود بـە ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ ﴾، دەیـدوێنێ، جـاری واش هـەیە بـەبێ نـازناوی نوبـووەتو ڕیسـالەت دەیدوێنێو ڕاسـتەوخۆ فەرمایشتی لەگەڵ دەکات، لێرەدا خـوا ﷻ دوای ڕوونکردنـەوەی ئـەو یاسـاو حوکمـە شـەرعییانەی کـە ڕابـردن، باسـی سـزای ڕێگریـیو دزیـیو هەڵکوتـانە سـەر خـەڵکو تێکدانی هێمنیـیو ئاسایشـی وڵات، ئەمجـار ڕوو دەکاتـە پێغەمبـەری خـوای موحەممـەد ﷺ دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَـٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ﴾، ئەی پێغـەمبەر! با ئەوانەی خێرایی دەکەن لـە کوفردا، واتـە: دەست گـەرمیی دەکـەن لـەو کردەوانـەدا کـە لـە کوفریانـەوە سـەرچاوە دەگـرن، وە لـەو کردەوانەدا کە لە کـافراندا پەیـدادەبن، وە ئەو کردەوانەی کـە کوفرەکـەیان پێکدێنن، با خێراییـکردنی ئـەوان لـە کوفردا تـۆ دڵتەنـگ نەکـاتو نـاڕەحەتـت نـەکات، ئنجـا ئایا ئەوانـە کێن کە خێـرایی دەکـەن لە کـردەوەی کـافرانەدا؟

﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ ﴾، لەوانـەی کە بـە زار گوتیـان: ئیمـانمان هێناوە، واتـە: بـە زار ئیدیعای ئیمانیـان کـرد، بـەڵام دڵیـان ئیمـانی نـەهێناوە، وە لەڕاسـتییدا بەشـی سـەرەکیی ئیمـان، وە ئیمـان بـە شـێوەیەکی سـەرەکیی پەیوەندیی بە دڵو دەروونەوە هەیە، بۆیە هەمیشـە خـوای بـەرز بۆ مونافیقـان نەفی ئیمـان لە دڵو دەروونیان دەکـات، هەروەهـا بـۆ (أعراب)یـش، وەك لـــە ســـوورەتی (الحجـــرات)دا دەفـــەرموێ: ﴿ قَالَتِ ٱلْأَعْرَابُ ءَامَنَّا ۖ قُل لَّمْ تُؤْمِنُوا۟ وَلَـٰكِن قُولُوٓا۟ أَسْلَمْنَا وَلَمَّا يَدْخُلِ ٱلْإِيمَـٰنُ فِى قُلُوبِكُمْ ...﴿١٤﴾ ﴾، واتـــە: عـەرەبـــە

دەشتەکییەکان گوتیان: ئیمانمان هێناوە، بڵێ: ئیمانتان نەچۆتە نێو دڵ، بەڵێ بەشی سەرەکیی‌و بنەڕەت‌و ڕیشەی ئیمان لە نێو دڵ دایە، بەڵام دیارە هەر کام لە دەرککردنی بە عەقڵ‌و هۆش، وە دان پێداهێنانی بە زمان، وە کردەوەی ئەندامەکانیش لە لای زۆربەی هەرە زۆری زانایان بە پێکهێنەری ئیمان لە قەڵەم دەدرێن[١]، جا دەفەرموێ: با ئەوانەی پێشبڕکەو خێرایی دەکەن لە کوفردا لەوانەی بە زار یان گوتوویانە: ئیمانمان هێناوەو دڵیان ئیمانی نەهێناوە، ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾، وە ئەوانەش کە جوولەکەن (هادوا) واتە: (رَجَعوا)، وە (هُدْنا) واتە: (رَجَعْنَا)، یەهوود واتە: ئەوانەی گەڕاونەوە بۆ لای خوا، کە کاتی خۆی دیارە وابوون‌و گەڕاونەوە بۆ لای خوا، بەڵام ئێستا لە خوا دوورکەوتوونەتەوە، ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾، واتە: جوولەکەکان، کەواتە: لێرەدا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: با خێراییکردن‌و دەستکەرمیی کردن‌و پێشبڕکەکردنی مونافیقەکان‌و جوولەکەکان، کە پێشبڕکەو خێرایی دەکەن لە کوفرو کردەوەی خراپدا، تۆ دڵتەنگ نەکات، واتە: زۆر خۆتیان پێ نارەحەت مەکە.

ئنجا دوایی بە چەند وەسفێك پێناسەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ ﴾، ئەوانە زۆر گوێ دەگرن‌و گوێ هەڵدەخەن بۆ درۆ، (سَمَّاع) صیغەی موبالەغەی (سَامِع)ە، (سَامِع) واتە: بیسەر، (سَمَّاع) واتە: زۆر گوێگر، جا مەبەست لە: ﴿ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ ﴾، واتە: ئەوانە زۆر گوێ هەڵدەخەن بۆ درۆ، یاخود زۆر گوێ دەگرن بۆ درۆو دەلەسەی سەرکردەکانیان‌و زاناکانی خۆیان، یاخود گوێ هەڵدەخەن بۆ قسەکانی تۆ بۆئەوەی دوایی درۆت بە دەمەوە بکەن‌و بە درۆت بزانن، واتە: بۆیە دەیانەوێ گوێ بۆ تۆ بگرن، تاکو ئەو زانیاریی‌و شارەزاییەی لە تۆی وەردەگرن، دوایی لە دژی ئیسلام‌و مسوڵمانان بەکاری بێننەوە، وە بیکەن بە

---

١) بۆ بەرچاوڕوونیی زیاتر لەبارەی پێناسەی ئیمان‌و پێکهاتەکانییەوە سەرنجی بەرگی یەکەمی: (ئیمان‌و عەقیدەی ئیسلامیی) بدە، هەروەها لە بەرگی دوومی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا بە درێژی باسی ئیمان و پێکهاتەکانیمان کردوە.

هۆکارێك بۆ بە درۆ دانان، ﴿سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَ﴾، گوێ هەڵدەخەن بۆ تۆ بۆئەوەی بۆ کۆمەڵێکی دیکەی باس بکەن، کە نەهاتوون بۆ لات، واتە: دەیانەوێ ئەو قسانەی تۆ بەوان بگەیەنن، یاخود مەبەست ئەوەیە کە ئەوانە زۆر گوێ هەڵدەخەن، زۆر گوێگرن بۆ کۆمەڵێکی دیکە کە نەهاتوون بۆ لای تۆ، کە مەبەست مشوورخۆران‌و سەرکردەکانیانە، واتە: زیاتر گوێ بۆ ئەوان دەگرن، ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦ﴾، وشەکان دوای شوێنی خۆیان دەگۆڕن، لادەبەن، مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە خوا ﷻ ئەو وشانەی تەورات‌و ئینجیل‌و کتێبەکانی پێشوو کە دایناون لە شوێنی خۆیاندا، ئەوان دەیانگۆڕن، جا چ گۆڕینی بێژە (لَفظ)یی، واتە: بە یەکجاریی وشەکان دەگۆڕن، یان گۆڕینی مەعنەویی بێ، واتە: بە جۆرێك واتایان دەکەن کە خوای پەروەردگار مەبەستی نەبووە، ﴿يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْ﴾، واتە: ئەو جوولەکەو دڵنەخۆشانە کە لێرەدا زیاتر مەبەست پێی جوولەکەکانە، دەڵێن: ئەگەر ئەمەتان پێدرا وەریبگرن، بەڵام ئەگەر پێتان نەدرا وریابن، دەگونجێ لێرەدا مەبەست ئەوەبێ واتە: گوێ هەڵبخەن بۆ پێغەمبەر ﷺ ئەگەر بە دڵی ئێوەو بە ئارەزووی ئێوە قسەی کرد، وەریبگرن، بەڵام ئەگەر قسەکانی لەگەڵ ئارەزوو مەبەستی ئێوە نەهاتەوە وریابن‌و لێی وەرمەگرن، ئەوە مانایەکی، وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا باسمان کرد، کە ئەگەر دەچن بۆ لای موحەممەد ﷺ گوێ بگرن، ئەگەر بەو شێوەیە فەتوای بۆ دان‌و حوکمە شەرعییەکەی پێگوتن، کە بریتییە لەوەی کە ئەوان گوتوویانە: دەموچاو ڕەشکردن‌و قامچیی لێدان، بۆ کەسێك کە زینای کردوە، ئەوە لێی وەربگرن، بەڵام ئەگەر غەیری ئەوەی پێدان، کە بریتییە لە بەردباران کردن، ئەوە لێی وەرمەگرن، ﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔا﴾، هەر کەسێکیش خوا فیتنەی بۆ ئەو بوێ، تۆ لە بەرانبەر ئەودا هیچت بۆی پێناکرێ، فیتنە لێرەدا دەگونجێ مەبەست پێی سزادان (عَذاب) بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی لادان (صَرْف)بێ، واتە: کەسێك خوا بیەوێ لایبدا تۆ ناتوانی

بیگێڕیەوە، وە دەگونجێ مەبەست پێی گومڕاکردن (إضلال) بێ، دەشگونجێ مەبەست پێی بەڵا بەسەرهێنان (بلاء) بێ، وەك دوایی باسی دەکەین وشەی فیتنە بە پێی ئەو سیاقانە کە تێیاندا دێ، ماناکەی دەگۆڕێ، بەهەر حاڵ، لێرەدا یانی: خوا هەر کەس بیەوێ تووشی فیتنەو بەڵاو گرفتاریی‌و ئازاری بکات‌و لایبدات، ئەی موحەممەد! ﷺ تۆ هیچ شتێکت لەلایەن خواوە بۆ ئەو کەسە پێناکرێ، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ﴾، ئەوانە کەسانێکن کە خوا ﷻ نەیویستوە دڵیان پاك بکاتەوە، واتە: نەك هەر دڵی پاك نەکردوونەوە، هەر نەشیویستوە، ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾، لە دنیادا شەرمەزاریی‌و سەرشۆڕیی‌و زەبوونییان بۆ هەیە، وە لە دواڕۆژیشدا ئازارو سزادانێکی مەزن، واتە: لە ئەنجامی ئەو کردەوەو ڕەفتارانەیاندا، هەم لە دنیادا زەبوونیی‌و سەرشۆڕییان بەسەر دێ‌و لە دنیادا عەیبدارن، وە لە قیامەتیشدا تاوانبارو سزادراون.

ئنجا خوا ﷻ ئەو سیفەتەیان زیاتر زەق دەکاتەوە، ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾، زۆر گوێ هەڵدەخەن بۆ درۆ، وە زۆریش حەڕام دەخۆن، (أكَّال) صیغەی موبالەغەی (آكِلْ)ە، واتە: زۆر حەڕام دەخۆن، پێشتریش باسمان کرد، کە: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ﴾، دوو واتای هەن: یان بە مانای: زۆر گوێ هەڵدەخەن بۆ درۆو دەلەسەی زاناو بەرپرسەکانی خۆیان، یان مەبەست ئەوەیە کە زۆر گوێ بۆ تۆ هەڵدەخەن، بۆئەوەی دوایی درۆ بە زمانی تۆوە بڵێن، وە ئەوەی کە لە تۆی وەردەگرن، دوایی بەکاری بێنن بۆ بە درۆ دانانت، ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ﴾، ئنجا ئەگەر هاتن بۆ لات، بۆ دادوەریی ئەگەر کێشەو مشتومڕێکیان بوو، دیارە ئێمە لێرەدا پێمانوایە کە مەبەست پێی زیاتر جوولەکەکانە، دەشگونجێ مەبەست پێی مونافیقەکانیش بێ، بەڵام زیاتر مەبەست پێی جوولەکەکانە، چونکە مسوڵمانەکان خۆیان بە بڕوادار داناوە، سەرپشکیی

نەدراوەتە پێغەمبەر ﷺ، کە دادوەرییان لە نێواندا بکات، یان نەکات، کەسێك گوتبێتی مسوڵمانم، چ بە ڕاستی بووبێ، چ بە درۆ، پێغەمبەر ﷺ مولزەم بووەو ئەویش مولزەم بووە، کە شەریعەتی بەسەردا پیادە بکرێ، بۆیە لێرەدا مەبەست پێی جوولەکەکانە، دەفەرموێ: ئەگەر هاتن بۆ لات، واتە: بۆئەوەی دادوەرییان لە نێواندا بکەیو، کێشەو مشتومڕێکیان هەبوو بۆیان چارەسەر بکەی، ﴿ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ ﴾، بۆت هەیە دادوەرییان لە نێواندا بکەی، بۆشت هەیە پشتیان تێبکەی، ﴿ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗا ﴾، وە ئەگەر پشتت تێکردنو ئیهمالت کردنو پشتگوێت خستنو دادوەرییت لە نێواندا نەکردن، گوێت بە کێشەو ناکۆکییەکەیان نەدا، ئەوە هیچ زیانێکت پێناگەیەنن، ﴿ وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ ﴾، وە ئەگەر دادوەرییشت لە نێواندا کردن، بە شێوەیەکی دادگەرانە دادوەرییان لە نێواندا بکە، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ﴾، بێگومان خوا ﷻ دادگەرانی خۆشدەوێن، کەواتە: تۆش دادگەربە، بۆئەوەی ببیە خۆشەویستی خوا، دیارە پێغەمبەر ﷺ خۆشەویسترین کەسە لەلای خوای پەروەردگار، چونکە لە هەموو کەس دادگەرتر بووە، وە لە هەموو کەس لە پێشتر بووە، لە هەرچی سیفەتی باشە، بەڵکو لە هەموو سیفەتو ڕەوشتێکی بەرزو جواندا لە لووتکەدا بووە.

ئنجا خوا ﷻ لە کۆتایی ئەم سێ ئایەتەدا، لە ئایەتی سێیەمدا بە سەرسوووڕمانەوە، واتە: کە ئەوە جێی خۆیەتی خەڵك سەری لێ سووڕبمێنێو پێی عەجاییب بێ، دەفەرموێ: ﴿ وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ﴾، جا ئەوان چۆن تۆ دەکەنە دادوەر لە حاڵێکدا کە تەوراتیان لەبەردەست دایە، حوکمی خوای تێدایە! واتە: حوکمی خوای لە بارەی ئەو مەسەلەیە تێدایە، نەك تەورات حوکمی خوای تێدابێ بۆ هەموو مەسەلەیەك، کە ژیانی ئینسان ئێستا پێویستی پێیەتی، نەء، واتە: بۆ ئەو مەسەلەیە حوکمی خوای تێدایە، چونکە ئەوان لە حاڵێکدا کە دەڵێن: ئێمە جوولەکەین، دەبێ بە کتێبی خۆیانەوە پابەند بین، وە هەروەها نەصرانیی

یەكان دەبێ بە كتێبی خۆیان مامەڵە بكەن، دیارە هەموو خاوەن دینێك دەبێ بە بەرنامەی خۆیەوە بەڕێوە بچێ، ئەدی ئەوانە بۆچی لە حاڵێكدا كە حوكمی خوای دادگەر دەربارەی ئەو مەسەلەیەی كە ئەوان مشتومڕیان لەسەر بووە، ئەو حوكمە لە تەوراتدا هەبووە، كەچی ئەوان دێن بۆ لای تۆ داوای دادوەرییت لێدەكەن؟! واتە: ئەوە شتێكی سەیرە! وە ئەو ماستە بێ موو نیە، ماناكەی ئەوەیە كە ئەوانە بۆیە هاتوون بۆ لای پێغەمبەر ﷺ چونكە ئەو سزایەی كە لە تەوراتدا هەبووە بۆ زیناكردن، بریتی بووە لە بەردباران كردن، ئنجا گوتوویانە: بچن بۆ لای موحەممەد ﷺ بەڵكو حوكمێكی سووكمان دەست بكەوێ، كە بریتیە لەوەی زیناكەرەكان دەموچاویان ڕەش بكەینو قامچییان لێبدەینو قسەیان پێ بڵێین، ئنجا ئەگەر حوكمە ئاسانەكەمان دەستكەوت، ئەوە باشەو لێی وەربگرن، بەڵام ئەگەر ئەوە نەبوو، لێی وەرمەگرن، ئەوە واتایەكی، واتایەكی دیكەشی ئەوەیە:

﴿ وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ﴾، ئەوانە تۆ ناكەنە دادوەر لە حاڵێكدا كە تەوراتیان لەلایە، بەڕاستی تۆ ناكەنە دادوەر، بەڵكو مەبەستێكی خراپیان هەیە لەوەدا، دوایی دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ﴾، دواییش دوای ئەوە لاملێی دەكەن، پشت هەڵدەكەن، دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: تەورات بێنن، ئایەتەكەی تەوراتیش باسی بەردبارانی كردبوو، ویستیان بیشارنەوەو پشتی تێبكەن، دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ئا ئەو جۆرە كەسانە ئیماندارنین، واتە: نە ئیماندارن بە تەورات، وە نە ئیماندارن بە تۆش ئەی موحەممەد ﷺ، وە نە بەو كتێبەش كە بۆ تۆ نێردراوە، یاخود لە بنەڕەتەوە ئەوانە ئیماندارنین بە خوا ﷻ چونكە لەڕاستییدا كەسێك حوكمی خوا ڕەت بكاتەوە، مانای وایە بڕوای بە خوا نیەو، ئەگەر بە ڕاستیی ئیمانی بە خوا هەبێ، ئیمان بوون بە خوا، واتە: ملكەچبوون بۆ خواو بۆ حوكمی خوا، دیارە ئێمە لە مەسەلە گرنگەكاندا زیاتر تیشك دەخەینە سەر ئەم ئایەتە موبارەكانە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾، ئەم ڕستە موبارەکە کۆمەڵێك شتی لێوەردەگیرێن:

(لَا يَحۡزُنكَ ) خوێندراوەتەوەش (لايُحْزِنْكَ) هەردوو قیراِئەتەکەی هاتوون، (حَزَنَهُ، يَحْزُنُهُ، أَحْزَنَهُ يُحْزِنُهُ)، پێشتریش باسمان کرد لە زمانی عەرەبیدا (الحَزْنُ وَالحزونة خُشُونَةُ فِي الأَرْضِ وَخُشُونَةُ فِي النَّفْسِ)، (حزن) بە زەوییەك دەگوترێ کە زبرو لۆچو کەلێنی تێدابێ، وە نەفسی ئینسانیش کە گرێو گۆڵو خەمو خەفەتو نارەحەتیی تێدابێو دڵی توندبێ، ئەو حاڵەتە پێی دەگوترێ (حَزْن وحزُونَە).

ئنجا لێرەدا کە خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: دڵتەنگ مەبە! پرسیارێك دێتە پێش، چۆن نەهی دەکرێ لە کردەوەی ئەهلی کوفر کە دڵتەنگیی بۆ پەیدانەکات، چونکە ئەو حاڵەتە بەدەست خۆی نیە؟!

زانایان ئاوا وەڵامی ئەو پرسیارەیان داوەتەوە: زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: ئەوە وەك ئەوە وایە کە لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (لا أَرَيَنَّكَ هَاهُنا) واتە: لێرە تۆ نەبینم، یانی: لێرە مەبە، لە زمانی کوردیشدا ئەوە هەیە، دەڵێ: جارێکی دیکە نەتبینمەوە، مەبەستی ئەوەنیە نەیبینێ بە چاو، واتە: جارێکی دیکە نەیەوە بۆ ئێرە، ناڵێ مەیەوە، لازمی مانایەکەی پێ دەڵێ، دەڵێ: جارێکی دیکە نەتبینمەوە، چونکە ئەگەر نەهات مانای وایە نایبینێتەوە، دیارە لە زماندا ئەو جۆرە شێوازانە هەن، لێرەدا مەبەست ئەوەیە کە ئەی پێغەمبەر! ﷺ گوێیان پێمەدەو ئیهمالیان بکەو زۆر خەفەتیان لێ مەخۆو پێیانەوە سەغڵەتو دڵتەنگ مەبە، چونکە سەرەنجامی جرتو فرتو دەست گەرمیی ئەوانە لە کوفرو خراپەدا، بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوەو زیانی بۆ تۆ نیە.

جێی سەرنجە لێرەدا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بە دەست گەرمیی کردنو خێراییو پێشبڕکە کردنی دووجۆر لە کافرەکان دڵتەنگ نەبێ، یەکەم: موناफیقەکان، دووەم: جوولەکەکان.

﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾،

وە لەڕاستییدا زۆرترین خەمو خەفەت کە دراوەتە پێغەمبەر ﷺ وە زۆرترین زیان کە بە ئیسلام گەیەنراوە، لەلایەن ئەهلی نیفاقو، لەلایەن جوولەکەکانەوە بووە، لێرەدا خوا ﷻ نەیفەرمووە: ﴿ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ ﴾، وەك ئەوی دیکە، کە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ ﴾، بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡ ﴾، خوای پەروەردگار لێرەدا ویستوویەتی پێناسەی موناफیقەکانمان بۆ بکات، مونافیق کێیە؟ ئەو کەسەیە کە بە زار دەڵێ: ئیمانم هێناوە، بەڵام بە دڵ ئیمانی نەهێناوە، واتە: خوا ﷻ لە جیاتی ئەوەی یەکسەر ناوی مونافیقەکان بێنێ، وەك لە شوێنی دیکەدا هاتوە، لێرەدا دەفەرموێ: مونافیق ئەوەیە بە زار ئیددیعای ئیمان دەکات، بەڵام ئیمان نەچۆتە نێو دڵی، هەڵبەتە ئەمە ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە شوێنی سەرەکی ئیمان دڵە، وەك خوای بەرزو مەزن لە چەندان شوێن لە قورئاندا ئاماژەی بەوە داوە، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ ... وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ ...﴿١٤﴾ ﴾ الحجرات، یان دەفەرموێ: ﴿ ... كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ ٱلۡإِيمَٰنَ ... ﴿٢٢﴾ ﴾ المجادلة، لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡ ﴾، ئنجا بۆیەش بەشی گەورەو سەرەکیی ئیمان پەیوەندیی بە دڵەوە هەیە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە: لە دڵدا بە ڕاست دانان (تصدیق) هەیە، خۆشویستن (حب) هەیە، ملکەچ کردن (إذعان) هەیە، پەسند کردن (قبول) هەیە، بەڵێ، ئیمان چوار پێکهێنەری هەن: دوای ئەوەی بە عەقڵ تێگەیشتنو دەرککردن دەبێ، بە دڵیش قبووڵ کردنو خۆشویستنو پەسند کردن دەبێ، بە زاریش دان پێداهێنان دەبێ، بە

ئەندامەکانیش ئەنجامدانو جێبەجێ کردن دەبێ، خوای پەنهانزان پێناسەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾، واتە: خێرایی دەکەن (سَارَعَ، يُسَارِعُ، مُسَارَعَةً)، وە دەشگونجێ بە مانای پێشبڕکە دەکەن، بێ، واتە: هەر کامێك لە جوولەکەکانو لە مونافیقەکان هەوڵدەدات لەوەی دیکە کافرترو خراپەکارتر بێ، لە جیاتی ئەوەی لە چاکەدا پێشبڕکە بکەن، لە خراپەدا پێشبڕکە دەکەن.

ئنجا ئەوە کە دەفەرموێ: ﴿يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾، وە دوایش باسی کردەوەکانیان دەکات، باسی قسەکانو هەڵوێستەکانیان دەکات، ئەوەی لێوەردەگیرێ کە وەك چۆن ئیمان چەند پێکهێنەری هەن، وە کردەوەکان دەبنە هۆی پێکهێنانی ئیمان، کوفریش چەند پێکهێنەرێکی هەن، چونکە خوای زاناو شارەزا ئەوە دادەنێ بە خێرایی کردنیان لە کوفردا کە:

١- گوێ دەگرن بۆ پێغەمبەر ﷺ، یان بۆ سەرکردەکانی خۆیان، گوێ بۆ درۆکانیان دەگرن.

٢- دەڵێن: ئەگەر ئەو حوکمەتان پێدرا وەریبگرنو ئەگەر ئەوە نەبوو وەریمەگرن، خوای بێهاوتا ئەو ڕەفتارو کردەوانەی ئەوانی بە کوفر داناوە، کەواتە: کردەوە خراپەکانیش پێکهێنەری کوفرن، وەك چۆن کردەوە چاکەکان پێکهێنەری ئیمانن.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَ﴾، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێش: ئایا مەبەست لە: ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ﴾، مونافیقەکانن؟ یان جوولەکەکانن؟ یان هەردووکیانن؟ توێژەرەوانی قورئان هەر سێ ڕایەکەیان گوتوون.

بەڵام ئەوەی من پێموایە لە ڕاستییەوە نزیکترە، ئەوەیە کە مەبەست پێی هەردووکیانن، بۆچی؟ چونکە هەم مونافیقەکانو هەم جوولەکەکانیش گوێیان گرتوە، یەکەم: بۆ درۆیەکانی مشوورخۆرو گەورەو سەرکردەکانی خۆیان، دووەم:

گوێشیان بۆ پێغەمبەر ﷺ گرتوە، تاکو ئەوەی کە لە پێغەمبەر ﷺ وەریدەگرن، دوایی لە دژی خۆی بەکاری بێننەوە، وەك هەندێك کەس دەچێ لە قورئان شارەزابێ، یان لە مێژووی ئیسلام شارەزابێ، نەك بۆ ئەوەی تێبیگات، بەڵکو بۆئەوەی شەڕی پێبکات، بۆئەوەی دوایی بیکاتە چەکێك‌و لە دژی مسوڵمانان بەکاری بێنێ، ئەوە سیفەتێکی هاوبەشی مونافیقەکان‌و جوولەکەکانیش بووە، وە هیچ نیشانەیەکیش نیە کە خوا تایبەتی کردبێ بە یەکێکیانەوە، کەواتە: مەبەست پێی هەردووکیانە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَ﴾، زۆر گوێ دەگرن بۆ کۆمەڵێکی دیکە کە نەهاتوونە لات، ئەوە دوو واتای هەن، واتە: گوێ بۆ تۆ دەگرن، بۆئەوەی قسەکانی تۆ بۆ ئەو کۆمەڵە بەرن، کە نەهاتوونە کۆڕو مەجلیسی تۆ، یان گوێ بۆ درۆو دەلەسەی ئەوان هەڵدەخەن.

ئنجا ئایا ئەوانە بۆچی نەهاتوونە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ؟ دیارە یان لەبەر خۆبەزلگریی بووە، یان چاویان بە پێغەمبەر ﷺ هەڵنەهاتوە، چونکە کەسێك نەچێتە کۆڕو مەجلیسی پێغەمبەر ﷺ یان لەبەر خۆبەزلگرییە، یان لەبەرئەوەیە چاوی پێی هەڵنایەو لەبەر حەسوودیی‌و بوغزو کینەیە، کە بۆتە پەردەیەك‌و ڕێی لێگرتوە کە پێغەمبەر ﷺ ببینێ‌و بە خزمەتی بگات.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦ﴾، وشەکان لە دوای شوێنەکانی خۆیان دەگۆڕن، واتە: دوای ئەوەی دانراون لە شوێنەکانی خۆیاندا لایان دەبەن، ئەمەش دوو واتای هەن:

١/ وشەکان دوای ئەوەی لە شوێنی خۆیان دانراون، بە شێوەی ڕواڵەتیی دەیانگۆڕن، کە ئەوە لادانی بێژەیی (تحريف لفظي)یە، خوا ﷻ وشەیەکی داناوە، ئەوان دێنن وشەیەکی دیکەی لە جێ دادەنێن.

٢/ وشەکان دوای ئەوەی لە شوێنی خۆیان دانراون، واتاکانیان دەگۆڕن، ئەوەش لادانی مانایی (تحريف معنوي)یە، ئنجا لێرەدا کە خوا دەفەرموێ: ﴿يُحَرِّفُونَ

ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ﴾، مەبەست پێی ئەوەیە کە ئایەتەکانی خوا دەگۆڕن، وشەکانی خوا دەگۆڕن، ئەم تەعبیرە کە لە سوورەتی (النساء)یش لە ئایەتی (٤٦)دا هاتوە، زۆر لە توێژەرەوان تێکەڵیان کردوون و گوتوویانە: لێرەو لەوێش مەبەست یەك شتە، بەڵام وانییە، وەك من لەوێ ڕوونم کردۆتەوە، لە ئایەتی (٤٦)ی سوورەتی (النساء) ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ واتە: ئەوانەی جوولەکەن، وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەبەن، وشەکان دەگۆڕن، لێرەدا دەفەرمووێ: دوای ئەوەی لە شوێنی خۆیاندا دانراون، ئەوەی ئەوێ مەبەستی ئەوەیە ئەو وشانەی بەکاریان دێنن، بەو واتایانە بەکاریان ناهێنن، کە واتای ڕاستەقینەیانن، بەڵکو بە واتایەکی دیکە بەکاریان دێنن، ئنجا ئەگەر تەماشای ئایەتەکە بکەین زۆر جوان دیارە، ئەوەی ئێرە هەم بە پێی سیاقی ئایەتەکە، هەم بە پێی هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکە، دیارە کە مەبەست پێی گۆڕینی وشەکانی خوایە، بەڵام لەوێ مەبەست پێی زمان بادانی خۆیانە، واتە: گۆڕینی واتای ئەو وشانەیە کە خۆیان بەکاریان هێناون، لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ وەك دەفەرمووێ: ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَٱسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّۢا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى ٱلدِّينِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا۟ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَٱسْمَعْ وَٱنظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ ٱللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾﴾النساء، لێرەدا زۆر جوان دیارە، دەفەرمووێ: لەوانەی جوولەکەن وشەکان لە شوێنی خۆیان لادەدەن، وە دەڵێن: بیستمان و سەرپێچییمان کرد، وە ببیستە پێ بیستراو نەبی، وە چاودێرییمان بکە، (یان تۆ شوانی ئێمەی، یان نەفامیی) زمانیان بادەدەن و تانە لە دین دەدەن، وە ئەگەر گوتبایان بیستمان و فەرمانبەریین، وە گوێت لێمان بێ و چاودێرییمان بکە، ئەوە بۆیان چاکتر بوو...، کەواتە: لەوێ مەبەست پێی گۆڕینی قسەکانی خۆیانە، لێرەشدا مەبەست پێی گۆڕینی وشەکانی ئایەتەکانی خوای پەروەردگارە.

دیارە سەرجەم ئەو تەفسیرانەی كە من سەرنجم داون، نەمبینیوە ئەو جیاوازییەیان كردبێ، هەموویان پێیان وابووە كە لە هەردوو شوێن دا هەر مەبەست گۆڕینی وشەكانی خوایە، كەچی ئەوەی سووڕەتی (النساء) زۆر بە ڕوونیی دیارە، بە پێی سیاقی ئایەتەكەش، كە مەبەست ئەوە بووە، ئەوان چەند وشەو تەعبیرێكیان بەكارهێناون، دوو واتایان هەبووە، واتای چاكو خراپیان هەبووە، خوای پەنهانزانیش دەفەرموێ: دەبووایە ئەو وشانە بەكاربێنن كە یەك واتایان هەیە، كە واتای چاكو باشو ڕاستو ڕێكن، بەلام ئەوانە بە شەیتانیيو زۆرزانیی، ئەو وشانەیان بەكارهێناون، كە وەك تیغی دوو دەم وان، كە بە هەردوو دیواندا دەبڕێ.

**مەسەلەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَقُولُونَ إِنْ أُوتِيتُمْ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمْ تُؤْتَوْهُ فَاحْذَرُوا ﴾، ئەگەر ئەمەتان پێدرا وەریبگرن، وە ئەگەر پێتان نەدرا وەریمەگرن، وریابن، لە هۆی هاتنە خوارەوەی دیارە، كە مەبەست ئەوەبووە: ئەگەر ئەوەتان پێدرا كە قامچیی لێدانەوەو دەموچاو ڕەشكردنە، ئەو سزایەتان پێدرا، بۆ كەسێك كە زینای كردوە، لێیان وەربگرن، بەلام ئەگەر سزای بەردباران كردن بوو، لێیان وەرمەگرن، ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟ ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ كە گولبژێركردن (إنتقائية) لە حوكمەكانی ئاییندا عادەتێكی جوولەكەكانە، واتە: ئێمە لەگەڵ دینی خوادا، نابێ بە شێوەیەكی گولبژێرانە (إنتقائية) مامەڵە بكەین، چی بە دڵمانە وەریبگرین، یان ئەو ئایەتانەی كە لەگەڵ مەبەستی ئێمەدا دێنەوە، ئەوانە بێنین، یان ئەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ، بەلام ئەوانەی لەگەڵ قسەو بۆچوونو ئارەزووەكانی ئێمەدا ناگونجێن، نادیدەیان بگرین! ئەوە لەڕاستییدا عادەتی جوولەكەكانەو دەبێ لەوە وریابین، هەڵبەتە ئەوەش جیایە لە مەسەلەی پلەپلەیی (التدرّج) لە شەریعەتدا، پلەپلەیی لە شەریعەتدا هەیە، بە پێی بەرەوپێشچوونی كۆمەڵگاو، بەپێی ئەوە كە دەبێ زەمینەی جێبەجێكردنی حوكمە شەرعییەكان بڕەخسێ، ئەوجار حوكمە شەرعییەكان جێبەجێ بكرێن، ئەوە پلەپلەیی (التدرج)ی پێ دەڵێن، بەلام (إنتقائية) ئەوەیە حوكمێكی شەرعیی زەمینەشی بۆ ڕەخسابێ، بەلام تۆ حوكمێكی دیكە بێنیە جێی ئەو حوكمە

شەرعییە، هەرچەندە ئەوەی یەکەمیشیان زەمینەی جێبەجێکردنی ڕەخسابێ، ئەوە پێی دەگوترێ گوڵبژێرکردن، کە لەڕاستییدا مسوڵمان مافی ئەوەی نییە، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ الأحزاب، واتە: هیچ پیاوێکی ئیماندارو ئافرەتێکی ئیماندار، بۆیان نییە دوای ئەوەی خواو پێغەمبەری خوا بڕیارێك دەردەکەن، مافی سەرپشك بوون بەخۆیان بدەن، (پێوەی پابەند بن، یان پێیەوە پابەند نەبن)، مادام تۆ خۆت بە ئیماندار لە قەڵەم دەدەی، ڕێی ئەوەت لە خۆت بڕیوەتەوە کە سەرپشك بی: بە قسەی خوا بکەی، یان نەیکەی، ڕێی سەرپشك بوونت نییە، دەبێ ملکەچ بی بۆ خوا، بەڵێ دەتوانی بڵێی: هەر ئیمانم نییە، ئەوکاتە بۆخۆت چی دەکەی بیکە، بەڵام کە گوتت: ئیماندارم، خۆت بەستۆتەوە بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾، هەر کەسێك خوا فیتنەی بوێ بۆی، تۆ هیچت لە بەرانبەر خوادا بۆ ئەو پێناکرێ، ناتوانی هیچ سوودێکی پێ بگەیەنی، وشەی فیتنە لە قورئاندا زۆر هاتوە، بەلای کەمەوە، ئەوەندەی من سەرنجم داوە، بە شەش واتایان هاتوە:

# مانای ڕیشەیی وشەی (فیتنە)ومەبەستەكانی:

جـارێ ئەسـڵی وشـەی: (فَتْن) وەك (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (أصْلُ الفَتْنِ: إدْخَالُ الذَّهَبِ النَّـار لِتَظهَر جَوْدَتُهُ مِنْ رَدَاءَتِهِ) واتـە: ئەسڵی وشەی (فِتنَة) لـە (فَتْن)ەوە هـاتوە (فَتْن)یش ئەوەیە زێڕ بخەیە نێو ئاگـر، بۆئەوەی چـاك وخراپی لەیـەك جیابێتـەوە، وەك خـوای كاربـەجێ بـە مووسـای فـەرمووە: ﴿... وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ...﴿٤٠﴾﴾ طـه، واتە: تۆمان تاقیكردەوە بە چەند تاقیكردنەوەیەك، تاكو خڵتەی پێـوە نەهێڵێ، (وَاسْتُعْمِلَ فِي إدْخَالِ الإنْسَان النَّار، قَالَ تَعَالى: ﴿يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾﴾) الـذاريات، واتـە: دوایـی بـەكارهێنراوە بـۆ خستنە نێـو ئاگـری ئینسانیشـەوە، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿يَوْمَ هُمْ عَلَى ٱلنَّارِ يُفْتَنُونَ ﴿١٣﴾ ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ هَٰذَا ٱلَّذِى كُنتُم بِهِۦ تَسْتَعْجِلُونَ ﴿١٤﴾﴾ الذاريات، واتـە: ئـەو ڕۆژەی كـە بێبـڕوایانن لەسـەری سـزا دەدرێـن، دەسووتێنرین، (پێیان دەگوترێ:) سـزایەكەتانو سـووتاندنەكەتان بچێژن، ئەوە بـوو كە پەلەتـان لێی دەكـرد.

ئنجا بە پێـی سەرنجدانی ئایەتەكانی قورئـان (فِتنَة) ئەم شەش واتـای هـەن:

١) بـە مانـای سـووتاندنو سـزا دێ، وەك دەفـەرموێ: ﴿ذُوقُوا۟ فِتْنَتَكُمْ ...﴿١٤﴾﴾ الذاريـات، واتە: بیچێژن سووتاندنەكەتـانو سـزایەكەتان.

٢)- بـە مانـای تاقیكردنـەوە دێ، وەك خـوا ﷻ بـە مووسـا سـەلامی خـوای لێبـێ دەفـەرموێ: ﴿... وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا ...﴿٤٠﴾﴾ طـــه، واتـــە: تۆمـــان بـــە زۆر شـــێوە تاقیكـردەوە، خـوای بەرز ئەگەر ویستی كەسێك بكات بە پێشـەوا، ئەوە بـە چەند

جۆرێك تاقیدەكاتەوەو، لە ئەنجامدا لە تاقیكردنەوەكانی خوا دەردەچێ، ئنجا بە كەڵكی ئەو ئەركە دێ، مووسا ﵇ كە خوا ویستی بیكات بە پێشەوای بەنی ئیسرائیلو بەنی ئیسرائیلی پێ دەرباز بكات لە دەستی فیرعەونو، بە گژ فیرعەونی دا بكات، بە چەند شێوەیەك تاقیكردەوە، هەر لە سەرەتای كۆرپەبوونیەوە، دوایی لە كڵ دەرهاتو توندو پتەوو مەحكەم بوو، بە كەڵكی ئەوە هات كە ئەو بارە قورسەو، ئەو ئەمانەتە كە ئەركی پێغەمبەرایەتییە لە ئەستۆی بگرێ، هەروەها خوا ﷻ لە ئایەتی (٣٥)ی سوورەتی (الأنبیاء)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَنَبۡلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلۡخَيۡرِ فِتۡنَةٗۖ وَإِلَيۡنَا تُرۡجَعُونَ ٣٥ ﴾، (نَبْلُوكُم) واتە: (نَفْتِنَكُمْ بالشَّرِّ وَالخَيْرِ فِتْنَةً)، بەڵام خوای پەروەردگار وشەی (نبلو)ی بەكارهێناوە وەك فیعلەكە، وە لە شوێنی دیكەشدا وشەی (يفتنوا)ی بەكارهێناوە، بۆئەوەی كە جیاب‌ێو دووبارە نەبێتەوە، واتە: تاقییتان دەكەینەوە بە ناخۆشییانو بە خۆشییان، كەواتە: لێرەدا (فِتْنَة) بە مانای تاقیكردنەوە دێ، جا چ بەوبارەدا بێ كە مرۆڤ بە نیعمەتی بزانێ، چ بەو بارە بێ كە بە بەڵاو موصیبەتی بزانێ.

٣) بە مانای بەڵاو موصیبەت دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ ... ٧١﴾ المائدة، واتە: جوولەكەكان پێیان وابوو، ئەوە كە پێغەمبەران دەكوژن، نابێتە هۆی بەڵاو موصیبەت بۆیان.

٤) بە مانای ئازاردرانو رێی دینداریی لێگرتن دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱلۡفِتۡنَةُ أَشَدُّ مِنَ ٱلۡقَتۡلِ ١٩١﴾ البقرة، لێرەدا فیتنە بە مانای لادانی مسوڵمانانو ئەزیەتدانیان دێ، بۆئەوەی هەڵیان بگێڕنەوە لە دین، یاخود رێ لێگرتنیان لەوەی كە مسوڵمان بن، كە ئەوە لە كوشتنیان خراپترە، هەروەها لە ئایەتی (١٩٣)ی سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ لِلَّهِۖ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَلَا عُدۡوَٰنَ إِلَّا عَلَى ٱلظَّٰلِمِينَ ١٩٣﴾، واتە: لەگەڵ كافرەكاندا

بجەنگن تاکو فیتنە نامێنێ، واتە: هەتا ناتوانن مسولْمان ئەزیەت بدەن، یاخود تاکو ناتوانن مسولْمانان لە ڕێی دینداریی بگێڕنەوەو، ڕێی دینداریيان لێ بگرن.

٥) بە مانای گوناحو سەرپێچیی دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾التوبة، واتە: هەیانە لە دەغەڵو دڵنەخۆشەکان دەڵێ: مۆڵەتم بدە، نەیەم بۆ جەنگ (جەنگی تەبووك)و گوناهبارم مەکە، تووشی گوناهێکم مەکە! دەڵێ: یەکێك لە زلەزلەکانی مونافیقان بووە گوتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! قەومەکەی من دەزانن چەند سەرسامم بە ئافرەتان، وە لە بەرانبەر ئافرەتاندا خۆم بۆ ڕاناگیرێ، بیستوومە ئافرەتی ڕۆمەکانیش زۆر سپیو جوانن دەترسێم بێم بۆ جەنگو لەوێ تووشی نەزەرێ ببم!! بۆئەوەی تووشی نەزەرێ نەبم، لەگەڵ خۆتم مەبە بۆ جەنگو جیهاد[1]، ئەوەیە دەڵێ: (عوزر لە قەباحەت خراپترە) خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْ﴾، ئاگاداربن! ئەوەی کە دەیکەن ئەوە فیتنەیە، ئەوە گوناهە، کە لە پێغەمبەری خوا بەجێ دەمێننو نایەن بۆ جەنگو جیهاد،

---

١) ئەو کابرایە ناوی (جُدّ بن قیس) بووە، کە ئەمەش دەقی ئەو وتوویژەی نێوان پێغەمبەری خواو ﷺ ئەو مونافیقەیە.

(عن جابر بن عبدالله، قال: سمعت رسول الله ﷺ يقول: يا جُدّ! هل لك في جِلاء بني الأصفر؟!! قال جُدّ: أَوَ تأذن لي يا رسول الله؛ فإني رجلٌ أُحب النساءَ وإني أخشى إن أنا رأيت نساء بني الأصفر أن أُفْتَنَ؟ فقال رسول الله وهو مُعْرِض عنه: قد أذنتُ لك، فعند ذلك أنزل الله : ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّي وَلَا تَفْتِنِّيٓۚ أَلَا فِي ٱلْفِتْنَةِ سَقَطُواْۗ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمُحِيطَةُۢ بِٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٤٩﴾﴾التوبة.

بڕوانە: (الإستيعاب في بيان الأسباب، ج ٢، ص ٢٨٠ - ٢٨١، کە بە (صحيح)یان داناوە، وە گوتوویانە : أخرجه ابن أبي حاتم في (التفسير) رقم : ٩٦٠٠، قال شيخنا العلامة الألباني رحمه الله في (الصحيحة) رقم : ٢٩٨٨، : وهذا إسناد حسن رجالُهُ ثقات معروفون من رجال التهذيب...

یانی: ئەوان بە فیعلی كەوتوونە نێو گوناهەوە، كە بریتیە لەوەی خۆ بە پاش دەدەن لە چوونە جەنگو جیهاد، لەبەر گوناهێكی ئیحتیمالیی كە ڕەنگە تووشی نەزەر، یان تووشی خراپتر لە نەزەر ببن، نایەن بۆ جەنگو خۆیان تووشی گوناهێكی واقیعیی دەكەن!

٦) بە مانای گومڕاكردن دێ، وەك دەفەرمووێ: ﴿مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَـٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾ إِلَّا مَنْ هُوَ صَالِ ٱلْجَحِيمِ ﴿١٦٣﴾﴾الصافات، واتە: (ئەی شەیتانەكان!) ئێوە ناتوانن كەس گومڕا بكەن، یاخود كەس بفەوتێنن بەنسبەت خوای پەروەردگارەوە، مەگەر لەوانەی كە بۆیان دانراوە بچنە دۆزەخەوە، هەروەها لە ئایەتی (٤٩)ی سووڕەتی (المائدة)دا كە دوایی دەیگەینێ دەفەرمووێ: ﴿وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَـٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾﴾ واتە: وە لەوان وریابە كە لات نەدەنو گومڕات نەكەن، لە هەندێك لەوەی كە خوا بۆی ناردوویە خوار... هەڵبەتە گەلێك وشەی دیكەش هەن مانای جۆراو جۆریان هەنو، بۆ دیاریكردنی یەكێكیان دەبێ تەماشای سیاقەكەیان بكەی، وشەی (فِتنَة)ش كە تەماشای سیاقەكانی دەكەین، جاری وایە دەگونجێ بە مانای عەزاب بێ، وەك: ﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتْنَتَهُۥ فَلَن تَمْلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾، وە جاری وایە دەگونجێ مەبەست پێی گومڕاییو فەوتان بێ، وەك ﴿مَآ أَنتُمْ عَلَيْهِ بِفَـٰتِنِينَ ﴿١٦٢﴾﴾الصافات، وە جاری وایە دەگونجێ مەبەست پێی بەڵاو موصیبەت بێ، كە بەسەری دێ، وەك ﴿وَحَسِبُوٓا۟ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ ...﴿٧١﴾﴾المائدة، وە دەگونجێ مەبەست پێی گوناحو تاوانو سەرپێچی بێ، وەك: ﴿وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ ٱئْذَن لِّى وَلَا تَفْتِنِّىٓ ...﴿٤٩﴾﴾التوبة.

**مەسـەلەی شەشـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡ ﴾، واتـە: ئەوانـە کەسـانێکن کـە خـوا نەیویسـتوە دڵیـان پـاك بکاتـەوە، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: باشە بۆچی خوا نەیویستوە دڵیان پاك بکاتەوە؟

لـە وەڵامـدا دەڵـێین: کاتێـك خـوا شـتێك دەفـەرموێ، هـەموو تەفاصـیلۆ وردەکارییەکانی دیکە نافەرموێ، بۆیـەش دەفەرموێ: لە قورئـانێ وردبنـەوە، ئنجـا لێـرەش کـە خـوا دەربـارەی ئەوانـە دەفەرموێ: خـوا ﷻ نەیویسـتوە دڵیـان پـاك بکـاتەوە، یانی: هـەتا ئـەوان خـاوەنی ئـەو ڕەفتـارانە بـن، خـاوەنی ئـەو نیـەتو نیازو مەبەستە پیسانە بن، بە کەڵـکی ئـەوە نایـەن خـوا دڵیـان پـاك بکـاتەوە، ئـەدی ئایـا خوا ﷻ دڵـی کـێ پـاك دەکـاتەوە؟ دڵی کەسـێك کە شـایسـتە بێ، وەك لە سـوورەتی (الحجـرات)دا دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصۡوَٰتَهُمۡ عِندَ رَسُولِ ٱللَّهِ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ ٱمۡتَحَنَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ لِلتَّقۡوَىٰۚ لَهُم مَّغۡفِرَةٌ وَأَجۡرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾ ﴾، واتـە: ئەوانـەی دەنگـی خۆیـان لـە خزمـەت پێغەمبـەردا کـپ دەکەنـەوە (نـزم دەکەنـەوە)، ئەوانـە کەسـانێکن خـوا ﷻ دڵـی پـاڵاوتوون بـۆ تـەقوا، واتـە: وای لێکـردوون تـەقوا بچێتـە نێـو دڵۆ دەروونیـانەوە، بۆچـی؟ چـونکە ئـەو ئـەدەبو ڕێزەیـان لەگەڵ پێغـەمبەردا ﷺ، وە ئەو لە خزمـەتی پێغەمبـەردا ﷺ بوونـەیان، وای لێکـردوون، شـایستەی ئەوەبن، کە خوا ﷻ دڵیان ئامادە بکات بۆئـەوەی تـەقوای تێدا جێگیربێ، بەڵام لێرەشدا بە پێچـەوانەوە، ئەوانـە ڕەفتارەکانیـانو بێئەدەبییـان لـە خزمـەت پێغەمبـەردا ﷺ، وایلێکـردوون کـە شایسـتەی ئـەوە نـەبن خـوا ﷻ بیەوێ دڵیان پاك بکاتەوە، ئنجا ئایا لەچی پاکـی بکـاتەوە؟ باسـی نـەکردوە، بـەڵام بـە پێـی سیاقەکە دیارە، (أَنْ يُطَهِّرَ قُلُوبَهُم مِنَ الشِّرْكِ والنِّفَاق والعِصيَان...) کـە دڵیـان پاك بکـاتـەوە لە شـیرکو سەرپێچـیی.

ئنجا لێرە بۆچی خوای کاربەجێ نەیفەرمووە: ﴿ لَمۡ يُطَهِّرِ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡ ﴾، خـوا دڵـی پـاك نەکردوونـەوە، دەفـەرموێ: ﴿ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡ ﴾، بۆئـەوەی کـە ئێمـە بـزانین کردەوەکـانی خـوا ﷻ، لـە ئیـرادەی خـواوە سەرچاوە

دەگرن، ئنجا ئەوانە ئەوەندە خراپن، هەر لە سەرەتاوە خوا ئیرادەی نەکردوە دڵیان پاکبکاتەوە، نەك هەر بە کردەوە پاکیان نەکاتەوە، بەڵکو هەر لە ویستی ئەزەلیی خوای پەروەردگاردا نەبووە، کە ئەوە دوورتری دەخاتەوە لەوەی کە بفەرموێ: دڵی پاك نەکردوونەوە، بەڵکو هەر لە بنەڕەتدا نەیویستوە پاکیان بکاتەوە، لەبەرئەوەی شایستە نەبوون.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾، ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟ کۆمەڵێك سیفەتی جوولەکەو مونافیقەکان باس دەکات، دوایی دەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ﴾، لە دنیادا سەرشۆڕیی و زەبوونیی و شەرمەزاریی بۆ وان هەیە، ﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾، وە لە دوارۆژیشدا ئازارێکی مەزن، کەواتە:

١) گوناح و تاوانەکان پێش قیامەت هەر لە دنیادا زەرِ بە ئینسان دەگەیەنن: شەرمەزاری دەکەن، ریسوای دەکەن، عەیبداری دەکەن، واتە: گوناح و تاوان و لادانەکان، پێش گوناهباریی قیامەت، عەیبداریی دنیایان بە دواوەیە.

٢) پاشان ئەوەشی لێوەردەگیرێ کە رەفتاری ئەو جوولەکەو مونافیقانە سزای دنیاییان نیە لەلایەنی مسوڵمانەوە، واتە: نابێ مسوڵمانان ئەو رەفتارو هەڵسوکەوتانەی مونافیق و جوولەکەکان بکەنە پاساوی ئەوەی سزایان بدەن بۆچی؟ چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞ﴾، لە دنیادا سەرشۆڕیی و زەبوونی و شەرمەزارییان بۆ هەیە، ﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ﴾، وە لە دوارۆژیشدا سزایەکی مەزن، کەواتە: ئێوە بۆتان نیە لەسەر ئەو شتانە سزایان بدەن.

٣) وە ئەوەش دەگەیەنێ کە کۆمەڵگای مسوڵمان، کۆمەڵگای ئیسلامیی زۆر بە لێبوردەیی و سینگ فراوانیی و دڵ گەورەیی لەگەڵ نەیارە فیکرییەکانی

خۆیدا، ئەگەر موونافیق و جوولەكەش بن مامەڵە دەكات، نەك هەر كە پێیان خوار داناو خراپەكیان كرد، مسوڵمانان سزایان بدەن، وەك هەندێك كەس وا تەصەووڕ دەكەن، كە مسوڵمانان ئەگەر دەستەڵاتیان بكەوێتە دەست، هەرچی نەیاری خۆیان بێ، پەتو سێدارەی بۆ هەڵدەواسن!! ئەوە هیچ بنەمایەكی نیە، خوای لێبووردە لە چەندان شوێن لە قورئاندا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱصۡفَحۡ ﴾، لێیان ببوورەو چاوپۆشییان لێبكە، ڕوویان لێوەربگێڕەو صەرفی نەزەریان لێبكە.

**مەسەلەی هەشتەم:** كە دەفەرمووێ: ﴿ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِ ﴾، وشەی (سُحْت) بە چوار قیرائەت هاتوە: (سُحْت، سَحْت، سُحُت، سِحْت) هەر چواریشی بە مانای حەرام دێ، واتە: دەگونجێ بڵێی: (أَكَّالون للسُّحْت، أَكَّالون للسَّحْت، أَكَّالون للسُّحُت، أَكَّالون للسِّحْت)، بۆیە ئەگەر جارێك بیستتان قورئان خوێنێك بە هەر كامێك لەو وشانەی خوێندەوە، پێتان وانەبێ لێی تێكچووە، ئەوە هەموو شێوەی خوێندنەوە، (قراءة)ن، ئنجا ئایا بۆچی لێرە وشەی (سُحْت) لە جیاتی حەرام بەكارهێنراوە؟ چونكە لە شوێنی دیكە لە قورئاندا وشەی (حرام)یش هەر بەكارهاتوە؟ دەڵێ: (السَّحْتُ: القِشْرُ الذي يُسْتأصَلُ)، (سَحْت) بریتیە لەو توێكڵەی كە دەبێ لابدرێ، بۆ وێنە: پەتاتە كە سپی دەكەی، یان هەنار، گوێز كە توێكڵەكەی لادەدەی، دەڵێ: چونكە حەرامیش وەك ئەوە وایە كە دینی ئینسان بتاشێ و لێی بكاتەوە، لە زمانی عەرەبییدا دەڵێ: (سَحَتَه وأَسْحَتَهُ: أهْلَكَهُ)[1] یانی لە بەینی برد، وە خوای پەروەردگار لە ئایەتی (٦١)ی سووڕەتی (طه) ﴿ ... فَيُسۡحِتَكُم بِعَذَابٖۖ ...﴿٦١﴾ ﴾، یانی: (فَيُهْلِكَكُم بِعَذاب) خوێندراویشەتەوە (فَيَسْحِتُكُم) هەردوو قیرائەتەكەی هاتوە، واتە: لە بەینیان بەرێ، بە هۆی سزایەكەوە كە بۆتان دەنێرێ، وەك مووسا سەلامی خوای لێ بێ بە فیرعەون و دارو دەستەكەی دەڵێ.

---

١) المعجم الوسيط: ص٤١٨.

جا هەندێـك لـە زانایـان گوتوویانـە: لێـرەدا کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿أَكَّٰلُونَ لِلسُّحۡتِ﴾، یـانی: (أَكَّـالُونَ للرَّشْـوَةِ) بـەرتیل دەخـۆن، بـەرتیل ئەوەیـە تـۆ ئەندازەیەك ماڵ لە کەسێك وەربگری لە بەرانبەر ئـەوەدا کە ناهەقێکی بـۆ دەکـەی بە هەق، یان هەقێکی بۆ دەکەی بە ناهـەق، جا (القرطبي) دەڵـێ: (وَلاَ خِلاَفَ بَيْنَ السَّلَفِ أَن أَخذ الرِّشْـوَةِ عَلَى إِبْطَالِ حَقٍّ أَوْ مَا لا يَجُـوزُ سُحْتٌ حَرَامٌ)[1]، واتـە: ڕاجیایی نیـە لـە نێـوان زانایـانی پێشـینیدا (هەروەهـا پاشـینیش) کـە وەرگرتنـی بەرتیل بۆ پووچاندنەوەی هەقێـك، یاخـود بـۆ شـتێك کـە دروست نـەبێ، حەرامـە. (عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو) خوا لـێی ڕازی بێ دەگێڕێتـەوە: ﴿لَعَـنَ رَسُولُ اللهِ ﷺ الرَّاشِيَ وَالْمُرْتَشِيَ﴾ {رَوَاهُ التِّرمِذِيّ برقم: (١٣٣٧)، وقال: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَقَالَ الألبـاني فـي (الإرواء) بـرقم: (٢٦٢١)، ورَوَاهُ أبـوبكر فـي (زاد الـمسافر) و زاد: (وَالرائِشَ)، صَحِيحٌ بِاللَّفظ الأول}، واتە: پێغـەمبەری خـوا ﷺ نەفرینـی کـردوە لـە کەسێك کـە بـەرتیل دەدات و، کەسێك کـە بـەرتیل وەردەگرێـت و، کەسێك کـە لـە نێوانیاندا دێت و دەچێـت دەڵاڵـەو بەرتیلـدەرو بەرتیـل وەرگـر پێکـدێنێ، بۆئـەوەی مـاڵی مـەزڵوومێك لـە بەیـن بچـێ، پێغـەمبەر ﷺ نەفـرەت (لعنـة)ی لـە هەرسێکیان کردوە.

**مەسـەلەی نۆیـەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـٔٗا﴾، ئەگەر هـاتن بـۆ لات دادوەرییـان لـە نێواندا بکە، یاخود پشـتیان تێبکە، ئیهمالیان بکـە، وە ئەگـەر پشـتیشـت تێکـردن هـیچ زیانێکـت پـێ ناگەیـەنن، ئەگـەر دادوەرییشـت لـە نێوانـدا کـردن، دادگەرانـە دادوەریـی بکـە، تویژەرەوانی قورئـان لـەوبارەوە کـە ئایـا دەوڵـەتی ئیسـلامیی بـۆ کەمایەتییـە دینـیو فیکرییەکـان کـە لـە ژێـر سـایەی دا دەژیـن، جـا جوولەکـەو نەصـرانیی بن، یان غەیـری وانیش، وەك مـن لـە کتێبـی (ئیسـلامو دەوڵەتـداریی)دا بـە تەفصـیل باسـم کـردوە[2]، هـەموو کەمایەتییـە فیکرییەکـان، بـە خـاوەن کتێـبو

---

١) الجامع لأحكام القرآن ج٦، ص١٦٢.

٢) لە بەرگـی چوارەم دا کە بۆ ئەو بابەتـە تەرخـان کـراوە.

مورتەددو مونافیقو بتپەرستو موشریکەوە، هەموو بۆیان هەیە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دا بژین، ئنجا ئایا کەمایەتییە فیکریی و دینییەکان، کە هاووڵاتییانی نامسوڵمانن، ئیسلام چۆن مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات؟ ئەوە لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتەدا مامەڵەیان لەگەڵ دەکرێ، کە دەفەرموێ: ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾، ئەگەر هاتن بۆ لات بۆ دادوەریی و بۆ چارەسەری کێشەکانیان، دادوەرییان لە نێواندا بکە، یاخود پشتیان تێبکە، ئیهمالیان بکەو هەردووک لات بۆ هەیە، دیارە لەوبارەوە توێژەرەوانی قورئان زۆر شتیان گوتوە:

(مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] پوختەیەکی جوانی ئەو بابەتەی هێناوە، دەڵێ: (وَالَّذِي يُسْتَخلَصُ مِنَ الفِقهِ فِي مَسأَلَةِ الحُكمِ بَيْنَ غَيرِ المُسْلِمِينَ دُونَ تَحكِيمٍ: أنَّ الأُمَّة أَجمَعَت عَلَى أنَّ أهلَ الذمّة دَاخِلُونَ تَحْتَ سُلْطَان الإِسْلاَمِ، وَأَنَّ عُهودَ الذِمَّةِ قضت بإبقَائِهِم عَلَى مَا تَقْتَضِيهِ ملَلهُم فِي الشُؤُون الجَارِيةِ بَيْنَ بَعضُهُم مَعَ بَعْض بِمَا حُدِّدَتْ لَهُمْ شَرَائِعهُم، وَلِذَلِكَ فَالأُمُورُ الَّتِي يَأتُونَهَا تَنْقَسِمُ إِلى أَرْبَعَةَ أَقسَامٍ:

القِسْمُ الأَوَّل: مَا هُوَ خَاصّ بِذَاتِ الذِمِّيّ مِن عِبَادَتِهِ كَصَلاَتِهِ وَذَبحِهِ وَغَيرها مِمَّا هُوَ مِنَ الحَلاَلِ وَالحَرَامِ، وَهَذَا لا اخْتِلاَفَ بَيْنَ العُلَمَاءِ فِي أَنَّ أَئِمَّة المُسْلِمِينَ لايتعرَّضُونَ لَهُمْ بِتَعْطِيله إِلاَّ إِذَا كَانَ فِيهِ فَسَاد عَامّ كَقَتْلِ النَّفْسِ.

القِسْمُ الثَّانِي: مَا يَجْرِي بَيْنَهُمْ مِنَ المُعَامَلاَتِ الرَّاجِعَةِ إِلى الحَلاَلِ وَالحَرَامِ فِي الإِسْلاَمِ، كَأَنْوَاعٍ مِنَ الأَنْكِحَةِ وَالطَّلاَقِ وَشُربِ الخَمْرِ وَالأَعْمَالِ الَّتِي يَسْتَحِلُونَهَا وَيُحرِّمُهَا الإِسْلاَم، وَهَذِهِ أَيْضاً يُقَرُّونَ عَلَيْهَا...

القِسْمُ الثَّالث: مَا يَتَجَاوزهُم إِلى غيرهِم مِنَ المَفَاسِدِ كَالسَّرِقَةِ وَالإعْتِدَاءِ عَلَى النّفوسِ وَالأَعْرَاضِ، وَقَدْ أَجْمَعَ عُلَمَاء الأُمَّة عَلَى أَنَّ هَذَا القِسْم يَجرِي عَلَى أَحْكَام الإِسْلاَم، لأَنَّا لَمْ نعاهدهُم عَلَى الفَسَادِ، وَلِذَلِكَ نَمْنَعُهُم مِنْ بَيْعِ الخَمْرِ لِلْمُسلِمِينَ وَمِنَ التَظَاهر بِالمُحرَّمَات.

---

١) التحرير والتنوير: ج٣، ص٢٠٣، ٢٠٤.

القِسْمُ الرّابعُ: مَا يَجري بَيْنَهُمْ مِنَ الـمُعَامَلاتِ الَّتِي فِيهَا اعْتِداءُ بَعْضُهُمْ عَلَى بَعْضٍ: كَالجِنَايَاتِ، وَالدِيون، وَتَخَاصُم الزَّوْجَيْنِ. فَهَذَا القِسْم إِذَا تَرَاضَوا فِيهِ بَيْنَهُمْ لاَنَتعرَّضُ لَهُمْ، فَإِن استَعْدَى أَحَدُهُمْ عَلَى الآخر بحَاكِمِ الـمُسْلِمين، فَقَالَ مَالِك: يَقْضِي الحَاكِمُ الـمُسْلِم بَيْنَهُم فِيهِ وُجُوبَاً، لأَنَّ فِي الإعْتِداءِ ضَرْبَاً مِنَ الظُّلْمِ وَالفَسَادِ، وَكَذَلِكَ قَالَ الشَافِعِيُّ، وَأَبُو يُوسُف، وَمُحَمَّد، وَزُفَر، وَقَالَ أَبُو حَنِيفَة: لاَيَحْكُم بَيْنَهُمْ حَتَّى يَتَرَاضَى الخَصْمَانِ مَعَاً).

واتە: دەربارەی مەسەلەی حوکمو دادوەریی کردن لە نێوان نامسولْمانانێك کە لە نێو دەولْەتی ئیسلامیدا دەژین، ئەوەی کە پوخت دەبێتەوە لە تێگەیشتن لەوبارەوە ئەوەیە: کە ئوممەتی ئیسلام (واتە: زانایانی ئوممەتی ئیسلام) یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە ئەهلی زیممە (واتە: ئەوانەی پەیمانیان لەگەڵ ئەهلی ئیسلام لە ئەستۆ دایە کە لە ژێر سایەی دەولْەتی ئیسلامییدا بژین) ئەوانە لە ژێر ڕکێفی دەولْەتی ئیسلامییدان، ئەو پەیمانەش کە بەستوویانە لەگەڵ دەولْەتی مسولْمانان خوازیاری ئەوەیە کە ئەو کاروبارانەی لە نێویاندا دەگوزەرێن، بە پێی ئەوە کە بەرنامەکانیانو دینیان دیاری کردوە، مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێ، وە بەگشتی هەڵسوکەوتەکانیان لەوبارەوە، دەبن بە چوار جۆر:

جۆری یەکەم/ ئەوەی کە تایبەتە بە بابای نامسولْمان، وەك: نوێژەکەی، قوربانی سەربڕینەکەی، وە غەیری ئەو شتانەش کە پەیوەندییان بە حەڵاڵو حەرامەوە هەیە، زانایان ڕاجیایی یان نیە کە پێشەواو بەرپرسانی مسولْمانان هەقیان بەسەریانەوە نیە، چۆن بۆخۆیان نوێژ دەکەن، چۆن سەردەبڕن، چۆن عیبادەت دەکەن، بە پێی دینی خۆیان ڕەفتار دەکەن، بیکەن.

جۆری دووەم/ ئەوەی کە لە نێوانیاندا دەگوزەرێ، لە هەڵسوکەوتەکان، کە ئەوانیش پەیوەندییان بە حەڵاڵو حەرامەوە هەیە، لە ئیسلامدا، وەك مەسەلەی هاوسەرگیرییو، تەڵاقو، خواردنەوەی شەراب، وە ئەو کردەوانەی کە ئەوان بۆخۆیان بە حەڵاڵیان دەزانن، بەڵام ئیسلام بە قەدەغەیان دەزانێ، وەك خواردنی گۆشتی بەرازو خواردنەوەی شەرابو قومارکردن، ئەوەش بە هەمان شێوە لێیان دەسەلمێنرێ، کە بۆخۆیان چۆنیان پێ چاکە وابکەن.

جۆری سێیەم/ ئەوەی کە تایبەت نیە بە نێوخۆیانەوە، بەڵکو دەچێتە دەرەوەی خۆیان لە خراپەکاریی، وەك: دزیی‌و دەستدرێژیی بۆ سەر ماڵ‌و نامووسی خەڵك، ئەوە تێکرای زانایانی ئوممەت لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە ئەم جۆرەی سێیەم بە پێی یاساکانی ئیسلام مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ، (هەموو دەوڵەتێکیش هەر وایە، کێی زۆر دیموکراتییە، ئەگەر سەیارەیەك لە سەیارەیەك بدات، ئایا کابرا بۆی هەیە بڵێ: من هیندۆسییم، لە ئایینی ئێمەدا سەیارە لە سەیارە بدات تۆڵەی نیەو، نابێ هیچی لێ بکەی؟ نەخێر، تۆ کە لە بەریتانیای بەپێی یاسای هاتووچۆی بەریتانیی مامەڵەت لەگەڵ دەکرێ، هەروەها لە ئەڵمانیاو فەرەنساو ... هتد، هەر دەوڵەتێك دیارە کۆمەڵێك یاسای هەن بۆ نەهێشتنی ناکۆکیی‌و ڕێگریی‌و دەستدرێژیی خەڵك بۆ سەر نەفس‌و ماڵ‌و نامووسی یەکدی‌و جێبەجێیان دەکات)، بۆیە زانایانی ئیسلام لەوبارەوە لەسەر ئەوە یەکدەنگن نابێ ڕێگە بدرێ ئەوانە بێن لە نێو دەوڵەتی ئیسلامیی دا خراپە بکەن‌و شەراب‌و گۆشتی بەرازو ئەوانەی قەدەغەن بە مسوڵمانانی بفرۆشن، (یان بێن بە ئاشکرا لە نێو کوچەو کۆڵانەکان شەراب بخۆنەوە، یان هەر کردەوەیەکی دیکەی قەدەغە لە ئیسلامدا بکەن).

جۆری چوارەم/ ئەوەیە کە لە نێوانیاندا ڕوودەدات لە هەڵسوکەوتەکان، وەك ئەوەی کە هەندێکیان دەستدرێژیی بکەنە سەر هەندێکیان، یەکدی بریندار بکەن‌و یەکدی بکوژن، یاخود قەرزیان لەسەر یەکدی دەبێ، یاخود ژن‌و مێرد پێکەوە ناکۆك دەبن، ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە ئەگەر لە نێوان خۆیاندا پێکهاتن بۆ چارەسەری ئەو گرفت‌و کێشانە، ئەوە حاکمی مسوڵمانان هەقی نیە، بەڵام ئەگەر یەکێکیان پەنای بردە بەر دادوەری مسوڵمانان، مالیك دەڵێ: حاکمی مسوڵمان لەسەری پێویستە دادوەرییان لە نێواندا بکات‌و، گرفت‌و کێشەکەیان بەو شێوەیەی کە شەریعەت دەڵێ چارەسەر بکات، (هەڵبەتە هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەگەر لە شەریعەتی خۆیاندا حوکمێك هەبوو، ئەوە شەریعەتی خۆیانیان بەسەردا دەچەسپێنێ)، هەروەها شافیعیی‌و ئەبو یوسف‌و موحەممەدو زوفەریش وایانگوتوە، بەڵام ئەبو حەنیفە دەڵێ: نابێ دادوەرییان لە نێواندا بکات تاکو هەردوو تەرەفە ناکۆکەکە ڕازی نەبن، (ئەگەر

تەنیا تەرەفێك بێ ئەوە حاكمی مسولمانان هەقی بەسەریانەوە نیە، دەبێ هەردوو تەرەفەكە رازی بن).

وە منیش رایەكەی ئەبو حەنیفەم پێ راسترە، وە ئەوەش باشتر لەگەڵ رواڵەتی ئایەتەكە دەگونجێ، كە دەفەرموێ: ﴿ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ ﴾.

**مەسەلەی دەیەمو كۆتایی:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، سێ راستیی لەو ئایەتە موبارەكە وەردەگیرێن:

١- كە دەفەرموێ: ﴿ وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ ﴾، ئەوە دوو مانای هەن:

یەكەم: چۆن دەتكەنە دادوەر؟! ئەوە پێی دەگوترێ: پرسیاركردنی نكوولیی كەرانە (الإِستفهام الإنكاري)، واتە: تۆ ناكەنە دادوەر بەراستی، كە دەتكەنە دادوەریش دیارە شتێكی رواڵەتییەو بۆ مەبەستێكی دیكەیە.

دووەم: واتە: سەیرە كە تۆ بكەنە دادوەر لە حاڵێكدا كە تەوراتیان لەبەردەست دایە، ئەوە شتێكی سەیرە، كەواتە: تۆ نیشانەی پرسیاری لەسەر دابنێ، حەتمەن دیارە ئەو ماستە بێ موو نیە.

٢- كە دەفەرموێ: ﴿ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ ﴾، لێمان تێكنەچێ! كە دەفەرموێ: تەوراتیان لەبەردەستە حوكمی خوای تێدایە یانی: لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە، نەك لە بارەی هەموو شتێكەوە، چونكە ئەوە تەوراتمان لەبەردەستە، حوكمی هەموو مەسەلەیەكی تێدانیە، بەڵكو حوكمی ئەو مەسەلانەی كاتی خۆی تێدا هەبووە، كە زۆریشی گۆردراوە، بەڵام دیارە لەوبارەوە حوكمەكە نەگۆردراوە، بۆیە خوای پەروەردگار ئیستیشهادی كردوە بە تەورات، ئەگەر حوكمەكە گۆردرابایە دیارە وای نەدەفەرموو، بەڵام مەرج نیە ئێستاش مابێ و دەستكاری نەكرابێ!.

٣- كە دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾، وە ئەوانە ئیماندارنین، ئایا ئیماندارنین بەچی؟ بە تەورات، بە قورئان، بە خوا، بە هیچ كام لەوانە،

لەڕاستییدا کە دەفەرموێ: ئیماندارنین، ئیدی نەیفەرموە ئیماندار نین بە چی، بۆیە دەگونجێ بڵێی: بە هەموویان، وە ئەمە لێشی وەردەگیرێ کە هەر کەسێك ئامادە نەبێ ملکەچ بکات بۆ حوکمی شەریعەت، بە ئیماندار لە قەڵەم نادرێ، ناگونجێ بڵێین: جوولەکەو نەصرانیی ئیماندارنین، ئەگەر ملکەچ نەکەن بۆ تەوراتو ئینجیل، بەڵام مسوڵمانان با ملکەچیش نەبن بۆ قورئان، هەر ئیماندارن! وەك دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتەکانی دیکەدا کە دوایی دێن، وە دەریدەخەین کە ئەوە وانییە، بەڵکو مسوڵمانان زیاتر جەختیان لێکراوە، داکۆکییان لەسەر کراوە، کە پابەندبن بە شەریعەتەکەیانەوە، تاوەکو خەڵکی دیکەی خاوەن کتێبەکان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی یازدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئـەم دەرســەمان چـوار ئایـەت دەگرێتــە خـۆی، ئایەتەکـانی (٤٤ - ٤٧)، خـوای بـەرزو مـەزن سـەرەتا لەو چوار ئایەتـەدا ڕایدەگەیەنـێ کـە کـاتی خـۆی تـەوڕاتـی بـۆ مووسـاو هاڕوونی برایو گەلەکەیان، واتە: گەلی جوولەکـە، (بـەنی ئیسـڕائیل) ناردۆتـە خـوار، کــە ڕێنمــاییو ڕوونــاکیی گرتۆتــە نێـوخــۆی، وە تەوڕاتــی بۆیــە نــاردوە، تــاکو پێغەمبـەرانی خـوا کە بۆ خـوا ملکـەچنو مشــوورخۆرانو زانــایانێك کـە پاراستنییان پـێ سـپێردراوە، حـوکمی پـێبکـەن لـە نێـو گەلـی جوولەکـەدا، وە دەیخـاتە ڕوو کـە کاتی خۆی بە پێغەمبەرانو مشـوورخۆرو زانایانی بـەنی ئیسـڕائیلی فـەرمووە، کە جگـە لـە خوا لـە هیـچ کـەس نەترســنو، ئایەتەکانی خـوا بـە نرخێکـی کـەم نەفرۆشــن، یـاخود دەستبەرداری ئایەتەکانی خـوا نەبـن لـە بەرانبــەر بەرژەوەندییەکـی کەمـی دنیـادا، وە واز لە کارپێکـردنی شـەریعەتی خـوای پـەروەردگار نەهێنــن.

ئنجا ڕایدەگەیەنـێ کە هەر کەسێك - لە حوکمڕانان - حـوکم بـەو بەرنامەیـە نـەکات، کە خـوا ناردوویەتە خـوارێ، ئەوە ئەوانـەن کـافری ڕاسـتیی، پاشان ڕایدەگەیەنـێ کـە لـە تەوڕاتدا سـزای تۆڵـەی لەسەر جوولەکـەکـان نووسـیوە، نەفس بە نەفس، چـاو بە چاو، لووت بە لـووت، گوێ بە گوێ، ددان بە ددان، بریــن بە برین، وە پاشـان جارێکی دیکە ڕایدەگەیەنێ کە هەر کەسێك حوکم نەکات بەو بەرنامەیە کە خوا ناردوویەتــە خــوار، ئـا ئەوانـەن ستەمکاری ڕاسـتەقینە، دوایـی باسـی ئـەزموونی نەصـڕانییەکان دەکات، کـە عیســای کـوڕی مەریــەم ســەلامی خــوایان لەســەر، وەك پێغەمبــەر، وە ئینجیلـی وەك بەرنامەیـەکی درێـژکراوەو تەواوکـەری تـەوڕات بـۆ نـــاردوون، ئــەوانیش هەردووکیــان تەوڕاتیــان بەڕاســت دانـاوەو ئینجـیلیش ڕێنمـاییو ڕۆشــناییو ئامۆژگـاریی گرتۆتــە خــۆی، وە ڕایشیدەگەیەنـێ کە کـاتی خــۆی بـە نەصـڕانییەکانی فــەرمووە کە حوکــم بە ئینجیـل بکـەنو، هەر کــەس حوکمـی پێنەکـات ئەوە ئەوانــەن لـە ڕێ دەرچووانـــی ڕاســتەقینە.

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ
لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ
شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن
لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ
بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ
وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ
أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾ وَقَفَّيۡنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَ مُصَدِّقٗا
لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا
بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ
أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکــان

((ئێمە تەوراتمان ناردۆتە خوارێ ڕێنمایی‌و ڕووناکیی تێدایە، پێغەمبەرانێك كە ملكەچبوون - بۆ خوا - لە نێو جوولەكەكاندا حوكمیان پێدەكرد، هەروەها مشووورخۆران‌و زانایان، بەهۆی ئەوەوە كە كرابوونە ئەمانەتدارو پارێزەری كتێبی خواو چاودێر بوون بەسەریەوە (وە پێمانگوتن) هەر لە من بترسن‌و لە خەڵك مەترسن، وە نرخێكی كەم بە ئایەتەكانم مەكڕن، هەر كەسێكیش حوكم بەو (بەرنامەی)ە نەكات كە خوا دایبەزاندوە، ئەوە مسۆگەر ئەوانەن كافران (ی ڕاستەقینە) ﴿٤٤﴾ وە تێیدا لەسەریان (واتە: لەسەر جوولەكەكان) پێویستمان كردبوو (سزای تۆڵە) كە هەر كەسێك بە ناهەق كەسێك بكوژێ، پێی بكوژرێتەوە، وە چاو بە چاوو، لووت بە لووت‌و، گوێ بە گوێ‌و، ددان بە ددان‌و، برین بە برین تۆڵەبێ، هەر كەسێكیش (چاوپۆشیی لە تۆڵەستاندنەوە بكات‌و) خێرو چاكە بكات، ئەوە بۆی دەبێتە مایەی سڕانەوە (ی گوناهەكانی)، هەركەسێكیش حوكم بەوە نەكات كە خوا دایبەزاندوە، ئەوە بە دڵنیایی یەوە ئەوانەن ستەمكاران (ی بەڕاستیی) ﴿٤٥﴾ وە بە شوێنیاندا عیسای كوڕی مەریەممان نارد، كە تەوراتی پێش خۆی بە ڕاست دادەنا، وە ئینجیلمان پێدا، ڕێنمایی‌و ڕووناكیی تێدابوو، وە تەوراتی پێش خۆی بەڕاست دادەناو، ڕێنمایی‌و ئامۆژگاریی بوو بۆ پارێزكاران ﴿٤٦﴾ وە (پێمانگوتن) با خاوەنانی ئینجیل بەوە حوكم بكەن كە (خوا) لەو (ئینجیل)ەدا ناردوویەتە خوار، هەر كەسێكیش بەوە حوكم نەكات كە خوا دایبەزاندوە، ئەوە بێگومان ئەوانەن لاڕێ بووان (ی تەواو) ﴿٤٧﴾)).

## شـیکردنـەوەی هـەندێـك لە وشـــەكان

(وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ ): كۆی (الرَّبَّانِي)یە، (الرَّبَّانِي: مَنْسُوبٌ إِلى الرَّبَّان، مِثْلُ عَطْشَان وَسَكْرَان، وَقِيلَ مَنْسُوبٌ إِلى الربّ الَّذِي هُوَ الـمَصْدَرُ، وَهُوَ الَّذِي يَرُبُّ العِلْمَ، وَقِيلَ هُوَ مَنْسُوبٌ إِلى الرَّبِّ، أَي الله تَعَالى مِثْل إِلهي، لِحْيَاني، وجُمَّاني) وشەی (ربَّاني) یان پاڵدراوەتە لای ڕەببان، وەك (عَطْشَان وَسكْرَان) واتە: كەسێك كە خۆیو خەڵك پەروەردە دەكات، وە دەشگوترێ: پاڵدراوەتە لای (رَب) بە مانای چاوگ نەك بە مانای پەروەردگار، واتە: پەروەردەكردن، ئەویش ئەو كەسەیە كە زانیاریی لە خۆیدا زۆر دەكاتو بڵاوی دەكاتەوە، هەندێكیش گوتوویانە: وشەی ڕەببانیی پاڵدراوەتەوە لای (رَب) بە مانای خوای بەرز وەك: (إِلهِي) واتە: سەر بە پەرستراو، سەر بە پەروەردگار، وەك لە زمانی عەرەبیدا دەگوترێ: (لَحْيَاني وجُمَّاني)، (لَحْيَاني) بە كەسێك دەگوترێ كە ڕیشی گەورەی هەبێ، وە (وجُمَّاني)یش بە كەسێك دەگوترێ كە تووكی پێشە سەری گەورەبێ.

(وَٱلْأَحْبَارُ ): (الحِبْرُ الحَبْرُ: الأَثَرُ المُسْتَحْسَنُ وَمِنْهُ مَا رَوَى (يَخْرُجُ مِنَ النَّارِ رَجُلٌ قَدْ ذَهَبَ حِبْرُهُ وَسِبْرُهُ)، (والحِبْرُ والحَبْرُ العَالِم) (حِبْر، حَبْر) واتە: شوێنكی خۆش یان شتێكی جوان، وە گێردراوەتەوەو لە شوێنەوار هاتوە، دەفەرموێ: پیاوێك لە ئاگر دێتە دەرێ، (قَدْ ذَهَبَ حِبْرُهُ وَسِبْرُهُ) واتە: هیچ ڕەنگو ڕووی نەمابوو. وە وشەی: (حِبْر) و (حَبْر) بە مانای زانا دێ، كە زیاتر بۆ زانای خاوەن كتێبەكان بەكارهێنراوە.

(بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ ): (بِمَا وَكَّلَ بِهِم حِفْظَ كِتَابِ الله وَأَحْكَامهُ، وَهَذَا يَكُونُ بالعِلْمِ وَالعَمَلِ) واتە: بە هۆی ئەوە كە پارێزگاریكردنی كتێبی خوایان پێ سپێردرابوو، ئەویش بە دوو شت دەكرێ:

یەكەم: زانیارییت هەبێ بە كتێبی خوا.

دووەم: كاری پێ بكەی.

(قِصَاصٌ ): دەڵێ: (القَصُّ تَتَبُّعُ الأَثَر، وَالقَصَصُ الأَخْبَارُ الـمُتَتَبَّعَةُ، وَالقِصَاصُ تَتَبّعُ الدَّم بالقَوَدِ)، (قِصَاصُ) بە مانای تۆڵە دێ، لە ئەسڵیشدا لە (قَصّ)ەوە، هاتوە،

(قَصّ) واتە: بە دوای شوێن و پێکەوتن، (قَصَص)یش بە مانای شوێنەوار دێ، وە (قَصَص) بە مانای هەواڵێك دێ كە خەڵك بەدوای بكەوێ، وە (قِصَاص)یش واتە: تۆڵە، یانی: بە دوای خوێنەكەیدا بڕۆی، تاكو تۆڵەی دەكەیەوە.

(وَقَفَّيْنَا ): واتە: بە شوێنی دا ناردمان، چونكە دەڵێ: (قَفَّيْنَا) یانی: (أَتْبَعْنا) واتە: بە دوامان خستن، ئەویش لە (قفا)دوە هاتوە، (قفا) بە پشتە مل دەگوترێ، شتێك بە دوای شتێك بكەوێ، لە دوای پشتەملیەوە دەڕوا، (وَاقْتَفَيْتُهُ تَبِعْتُ قَفَاهُ، وَالإِقْتِفَاءُ اتِّبَاعُ القَفَا)، (اقتَفَيْتُهُ) واتە: بە دوای پشتە ملی كەوتم، (إِقْتِفَاء) واتە: شوێن پشت ملی كەسێك كەوتن.

(وَهُدَى ): (الهِدَايَةُ دَلاَلَةٌ بِلُطْفٍ، والهِدَايَة أَرْبَعَة أَنْوَاع: عَامٌ، خَاصٌ، أَخَصّ، أُخْرَوِي)، (هُدى) واتە: ڕێنمایی، ڕێ پێشاندان، وە هیدایەت بریتییە لە ڕێنمایی كردنێكی بە پەنهانیی و كارامەیی، وە هیدایەت چوار جۆرە: گشتی، تایبەت، تایبەتتر، هی دواڕۆژ:

ڕێنمایی گشتی: وەك خوا دەفەرموێ: ﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ۝٥٠﴾ طه، واتە: پەروەردگارمان ئەو كەسەیە كە هەموو شتێكی دروست كردوەو ڕێنمایی كردوە، خوا هیچ شتێكی دروست نەكردوە، مەگەر بەرنامەیەكی بۆ داناوە، ئنجا ئەوە هیدایەتی گشتی خوایە، بۆ هەموو شتەكان، بە ژیاندارو بێ ژیان و وردو درشتەوە.

ڕێنمایی تایبەت: وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَهُدًى لِّلْعَٰلَمِينَ ۝٩٦﴾ آل عمران، ڕێنماییە بۆ تێكڕای جیهانییان، ئەوەش هیدایەتێكی تایبەتە بە مرۆڤ و جندەوە، چونكە قورئان لەبەردەستی هەموو خەڵكی دایە، با سوودی لێوەربگرن.

ڕێنمایی تایبەتتر: وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَذِكْرًا لِّلْمُتَّقِينَ ۝٤٨﴾ الأنبیاء، ﴿هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢﴾ البقرة، قورئان ڕێنمایی یە بە شێوەی تایبەتتر بۆ

پارێزکاران، بۆچی؟ چونکە تەنیا پارێزکاران وەك پێویستە لە قورئان سوودمەند دەبن.

ڕێنمایی دوارۆژ: وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ تَجْرِي مِن تَحْتِهِمُ الْأَنْهَارُ ۖ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ ۖ لَقَدْ جَاءَتْ رُسُلُ رَبِّنَا بِالْحَقِّ ۖ وَنُودُوا أَن تِلْكُمُ الْجَنَّةُ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ الأعراف، لە دوارۆژدا کە ئیمانداران دەچنە بەهەشت، خوا ڕێنمایی یان دەکات بۆ دۆزینەوەی شوێن و جێگەی خۆیان و ئەوانیش دەڵێن: ﴿ الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي هَدَانَا لِهَٰذَا وَمَا كُنَّا لِنَهْتَدِيَ لَوْلَا أَنْ هَدَانَا اللَّهُ ﴾، واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ڕێنمایی کردین بۆ ئەوە، ئەگەر خوا ڕێنمایی نەکردبایین پێمان نەدەزانی و نەماندەدۆزییەوە، وە لە حەدیسدا هاتوە، دەفەرموێ: بەهەشتییەکان وا بە ماڵی خۆیان دەزاننەوە، وەك بڵێی چەند ساڵ بێ ماڵیان لەو شوێنە بووبێ[1]، دیارە بەهەشت عالەمێکی جیاوازە، وەك شارێك نیە چەند گەڕەکێك بێ، بۆیە ئەوەی کە خوای پەروەردگار باسی دەفەرموێ: کە هیدایەتیان دەدات لە بەهەشتدا، ئەوە شتێکی زۆر گەورەیە، کە ئینسان لە بەهەشتێ بە جێگاو ڕێگای خۆی بزانێتەوە، خوای بەخشەر بە نسیبمان بکات.

(وَمَوْعِظَةً ): لە (وَعْظ)ەوە هاتوە، (الوَعْظُ: زَجْرٌ مُقْتَرِنٌ بِتَخْوِيفٍ، وَالتَّذْكِيرُ بِالخَيْرِ فِيمَا يَرِقُّ لَهُ القَلْبُ وَالعِظَةُ وَالمَوْعِظَةُ: الإِسْم)، واتە: (مَوْعِظَة) بریتیە لە ئامۆژگاریی کردنێکی بە تێخوڕین، واتە: بە جۆرێك کە بیترسێنی، یاخود بە شێوەیەکی وا کە چاکەی بیر بخەیەوە، بە جۆرێك کە دڵی بۆی نەرم بێ، وە (عِظَة، مَوْعِظَة) ناون.

---

[1]) کە ئەمە دەقی ئەو فەرموودەیە: (فو الّذي نفسي بيده إنَّ أحدهم بمنزله في الجنّة أدلُّ منه بمسكنه كان في الدنيا) رواه البخاري، فتح الباري، ج ٥، ص ١١٥.

## هـۆی هاتنـه خـوارەوەی ئایـەتـەکان

١) هۆی هاتنــه خــوارەوەی ئــەو ئایەتــانەی کە خــوا تێیــاندا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ۝٤٤ ﴾، ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٤٥ ﴾، ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ۝٤٧ ﴾:

أ/ ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: إِنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ أَنْزَلَ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ۝٤٤ ﴾، ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٤٥ ﴾ ﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ۝٤٧ ﴾، فِي الطَّائِفَتَيْنِ مِنَ الْيَهُودِ، وَكَانَتْ إِحْدَاهُمَا قَدْ قَهَرَتِ الأُخْرَى فِي الْجَاهِلِيَّةِ حَتَّى ارْتَضَوْا أَوِ اصْطَلَحُوا عَلَى أَنَّ كُلَّ قَتِيلٍ قَتَلَهُ الْعَزِيزَةُ مِنَ الذَّلِيلَةِ فَدِيَتُهُ خَمْسُونَ وَسْقًا، وَكُلَّ قَتِيلٍ قَتَلَهُ الذَّلِيلَةُ مِنَ الْعَزِيزَةِ فَدِيَتُهُ مِائَةُ وَسْقٍ، فَكَانُوا عَلَى ذَلِكَ حَتَّى قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ فَذَلَّتِ الطَّائِفَتَانِ كِلْتَاهُمَا لِمَقْدَمِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَيَوْمَئِذٍ لَمْ يَظْهَرْ وَلَمْ يُوطِئْهُمَا عَلَيْهِ وَهُوَ فِي الصُّلْحِ، فَقَتَلَتِ الذَّلِيلَةُ مِنَ الْعَزِيزَةِ قَتِيلاً فَأَرْسَلَتِ الْعَزِيزَةُ إِلَى الذَّلِيلَةِ: أَنِ ابْعَثُوا إِلَيْنَا بِمِائَةِ وَسْقٍ، فَقَالَتِ الذَّلِيلَةُ: وَهَلْ كَانَ هَذَا فِي حَيَّيْنِ قَطُّ دِينُهُمَا وَاحِدٌ وَنَسَبُهُمَا وَاحِدٌ وَبَلَدُهُمَا وَاحِدٌ، دِيَةُ بَعْضِهِمْ نِصْفُ دِيَةِ بَعْضٍ؟ إِنَّا إِنَّمَا أَعْطَيْنَاكُمْ هَذَا ضَيْمًا مِنْكُمْ لَنَا وَفَرَقًا مِنْكُمْ، فَأَمَّا إِذْ قَدِمَ مُحَمَّدٌ فَلا نُعْطِيكُمْ ذَلِكَ، فَكَادَتِ الْحَرْبُ تَهِيجُ بَيْنَهُمَا ثُمَّ ارْتَضَوْا عَلَى أَنْ يَجْعَلُوا رَسُولَ اللهِ ﷺ بَيْنَهُمْ، ثُمَّ ذَكَرَتِ الْعَزِيزَةُ فَقَالَتْ: وَاللهِ مَا مُحَمَّدٌ بِمُعْطِيكُمْ مِنْهُمْ ضِعْفَ مَا يُعْطِيهِمْ مِنْكُمْ، وَلَقَدْ صَدَقُوا مَا أَعْطَوْنَا هَذَا إِلاَّ ضَيْمًا مِنَّا وَقَهْرًا لَهُمْ، فَدُسُّوا إِلَى مُحَمَّدٍ مَنْ يَخْبُرُ لَكُمْ رَأْيَهُ إِنْ أَعْطَاكُمْ مَا تُرِيدُونَ حَكَّمْتُمُوهُ، وَإِنْ لَمْ يُعْطِكُمْ حَذِرْتُمْ فَلَمْ تُحَكِّمُوهُ، فَدَسُّوا إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ نَاسًا

مِنَ الْمُنَافِقِينَ لِيَخْبُرُوا لَهُمْ رَأْيَ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَلَمَّا جَاءَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَخْبَرَ اللهُ رَسُولَهُ بِأَمْرِهِمْ كُلِّهِ وَمَا أَرَادُوا فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ ﴾،إلى قَوْلِهِ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾، ثُمَّ قَالَ: فِيهِمَا وَاللهِ نَزَلَتْ وَإِيَّاهُمَا عَنَى اللهُ عَزَّ وَجَلَّ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢١٢)، وَقَالَ الشَيْخ شعيب الأرناؤوط: إِسنَادُهُ حَسَنٌ، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) رقم: (٢٥٥٢)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: دەربارەی دوو کۆمەڵەکە لە جوولەکە هاتۆتە خوار، (بَنِي قُرَيْظَةَ وبَنِي النَّضِير)، ئەو دوو کۆمەڵە لە سەردەمی نەفامییدا یەکێکیان بەسەر ئەویدیکەدا زاڵ بوو، هەتا لەسەر ئەوە ڕێککەوتبوون کە هەرکاتێك تیرە بە دەستەڵاتەکە (بَنِي النَّضِير) نەفەرێکی کوشت لە تیرە بێ دەستەڵاتەکە (بَنِي قُرَيْظَة)، دەبێ بە دەستەڵاتەکە (بَنِي النَّضِير) نیوەی خوێن بدەن بە بێدەستەڵاتەکە (بَنِي قُرَيْظَةَ)، کە پەنجا ویسق بوو، (کە بە ئەندازەیەك دانەوێڵە دەگوترێ، ویسقێك شەست ڕبە (صاع)یەو، هەر ڕبەیەکیش چوار کیلۆ زیاترە، ئنجا هەر کەسێك کوژرابایە، خوێنەکەی سەد ویسق بوو)، بەڵام ئەگەر تیرە بێدەستەڵاتەکە (بَنِي قُرَيْظَةَ) نەفەرێکیان کوشتبایە لە بە دەستەڵاتەکە (بَنِي النَّضِير) دەبووایە سەد ویسقیان پێبدەن[1]، جا دەفەرموێ: لەسەر ئەوە بوون هەتا پێغەمبەری خوا ﷺ هاتە مەدینە، ئیدی هەردوو کۆمەڵەکە بە هاتنی پێغەمبەری خوا ﷺ ملکەچبوون، (واتە: ئەو دەستەڵاتەیان نەما زوڵم لە یەکدی بکەن)، ئەوەش پێش ئەوەی پەیمان هەڵبوەشێننەوەو لە مەدینە دەربکرێن، کە لە حاڵەتی صوڵح و تەبایی دا بوون لەگەڵ مسوڵمانان، لەو کاتەدا بێهێزەکە (بَنِي قُرَيْظَةَ) نەفەرێکیان کوشت لە بەهێزەکە (بَنِي النَّضِير)، ئەوانیش جوابیان بۆ ناردن گوتیان: خوێنمان بۆ بنێرن، سەد ویسق، (واتە: شەست صاع، کە کوردەواریی خۆمان ڕبەی پێدەڵێن و ڕبە چوار مستە) بێهێزەکە (بَنِي قُرَيْظَةَ)ش گوتیان: هەرگیز شتی

---

١) وشەی (وِسْق) و (وَسْق) بە (أَوسُق و أَوساق و وسوق) کۆ دەکرێتەوە، المعجم الوسيط، ص٣٣٢.

وابووە! دوو تیرە دینیان یەك بێو ڕەچەڵەكیان یەك بێو لە یەك ولاتدابن، كەچی یەكێكیان ئەگەر نەفەرێكی لێكوژرا خوێنەكەی نیوەی ئەویدیكە بێ؟!! وە گوتیان: ئێمە كاتی خۆی لێتان ترساوینو ئێوە زوڵمتان لێكردووین، بەڵام ئێستا كە موحەممەد هاتوە، ئەوەتان پێنادەین، (واتە: خوێنی دوو قاتی خۆمانتان پێنادەین) ئیدی خەریك بوو جەنگیان لە بەیندا بەرپابێ، دوایی ڕازی بوون كە پێغەمبەری خوا ﷺ بخەنە نێوان خۆیانو بیكەنە دادوەر، دوایی تیرە دەستەلاتدارەكە گوتیان: سوێند بە خوا موحەممەد ئەوەمان ناداتێ (دوو قاتی وانمان ناداتێ)، بۆیە نەفەرێك بنێرن بۆ لای موحەممەد، بزانن داخۆ ڕای چۆنە؟ ئەگەر ئەوەی داینێ كە كاتی خۆی وەرمانگرتوە، دەیكەینە دادوەر، ئەگەر ئەوەشی نەداینێ، نایكەینە دادوەر، نەفەرێكیان نارد بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ كاتێك هاتنە لای، خوای پەنهانزان پێغەمبەری ﷺ بەو كەیسەو بەینە ئاگادار كردەوە، وە خوا لەوبارەوە ئەم ئایەتانەی ناردە خوار.

جا عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: سوێند بە خوا دەربارەی ئەوان هاتۆتە خوارێو خوای پەروەردگاریش مەبەستی ئەوان بووە.

دیارە ئێمە پێشتر باسمان كرد كە ئەو ئایەتانە دەربارەی پیاوو ئافرەتێك هاتوونە خوار كە زینایان كردبوو، بەڵام دەگونجێ ئەوەش بووبێو ئەویش بووبێ، چونكە جۆراو جۆر بوونی هۆی هاتنە خوارەوەكان تێكناگیرێن، ئەو ڕووداوەش بووەو ئەوی دیكەش بووە.

ب/ ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا أَنَّ الآيَاتِ الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ الَّتِي قَالَهَا اللهُ عَزَّ وَجَلَّ ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ إِلَى قَوْلِهِ: ﴿ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴾، إِنَّمَا أَنْزَلَتْ فِي دِيَةِ بَنِي النَّضِيرِ وبَنِي قُرَيْظَةَ، وَذَلِكَ أَنَّ قَتْلَى بَنِي النَّضِيرِ، وَكَانَ لَهُمْ شَرَفٌ يُودَوْنَ الدِّيَةَ كَامِلَةً، وَأَنَّ بَنِي قُرَيْظَةَ كَانُوا يُودَوْنَ نِصْفَ الدِّيَةِ، فَتَحَاكَمُوا فِي ذَلِكَ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَنْزَلَ اللهُ ذَلِكَ فِيهِمْ فَحَمَلَهُمْ رَسُولُ اللهِ ﷺ عَلَى الْحَقِّ فِي ذَلِكَ فَجَعَلَ الدِّيَةَ فِي ذَلِكَ سَوَاءً﴾ {أَخْرَجَهُ إِبْنُ جَرِيرٍ بِرقم: (١١٩٧٤) وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٤٧٣٣)، وَقَالَ الشَيخ

الألباني: حَسَنٌ صحيح الإِسَناد}، واتە: عەبدوڵلاى کورى عەبباس خوا لێیان ڕازى بێ، دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەى خوێنی (بَنِي قُرَيْظَةَ وبَنِي النضيرِ) هاتۆتە خوار، کە کوژراوەکانی (بَنِي النَّضِيرِ) لەبەرئەوەى دەستەڵاتیان هەبوو، خوێنی تەواویان لە بەرانبەر بۆ وەردەگرتن، بەڵام کوژراوەکانی (بَنِي قُرَيْظَةَ) نیوە خوێنیان لە بەرانبەر بۆ وەردەگرتن، لەوبارەوە دادوەرییان بردە لاى پێغەمبەرى خوا ﷺ، خواش ئەو ئایەتانەى دەربارەیان ناردە خوار، پێغەمبەرى خواش ﷺ ئەوەى هەقە لەوبارەوە لەسەرى پێویست کردن، (چونکە لەو شتانەدا کە خوێنو ئاشووبو ئاژاوە دەبێو، دەچن بۆ لاى پێغەمبەرى خوا ﷺ ئەو کاتە بە پێى شەریعەت حوکم دەکرێن)، وە خوێنی هەموویانی وەك یەك لێکرد، {دیارە (بَنِي النَّضِيرِ)یش زانیویانە کە پێغەمبەر ﷺ زوڵمیان بۆ ناکات، بۆیە گوتوویانە: با نەچین بۆ وێ، لە ڕیوایەتەکەى دیکەدا هاتوە: پێشێ نەفەر دەنێرن، تاکو بزانن داخۆ ئەوەى ئەوان دەیانەوێ دەیانداتێ یان نا؟ ئنجا ئەگەر بۆیان دەرکەوت بەو شێوەیە دادوەرییان لە نێواندا دەکاتو لە بەرژەوەندیی وان بوو بچن، ئەگەرنا نەچن}.

لەوبارەوە (جمال الدين القاسمي) لە تەفسیرەکەى خۆیدا[1] دەڵێ: (وَقَد يَكُونُ اجتمَعَ هَذَانِ السَّبَبَانِ فِي وَقْتٍ وَاحِدٍ، فَنَزَلَت هَذِهِ الآيات فِي ذَلِكَ كُلِّهِ)، واتە: دەبینی هەردوو هۆیەکان کۆبوونەتەوە لە یەك کاتدا، خواش ئەم ئایەتانەى دەربارەى هەردوو ڕووداوەکان ناردوونە خوارێ.

١) محاسن التأويل: ج٤، ص٢١٧.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خـوای پەروەردگار هەر لە درێژەی باسی خــاوەن کتێبەکانـــدا بەگشـتی، بـاس دەکات کە تەوراتی ناردۆتــە خــوارەوە، دوایی باسـی ئـەوە دەکات کـە ئینجـیلی ناردۆتـە خـوار، ئنجـا وەك دوایی دەیگەینـێ، ڕوو لـە پێغەمبـەری کۆتـایی ﷺ دەکـات، کـە کتێبمـان بۆ لای تۆش نـاردوە، لێرەدا ئەوەی گرنگـە ئێمە بیزانین، ئەوەیـە کـە خـوای کاربەجـێ لـەو کاتـەوە کە ئادەمی لەسەر زەوی داناوە، هەتا دوا ئینسان لەسـەر زەوی دەمێنـێ، کتێبـی خـۆی بـۆ نـاردوون‌و، پێغەمبـەرانی بـۆ نـاردوون، پـەیتا پـەیتا، وەك دەفـەرموێ: ﴿ ثُمَّ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا تَتْرَا ...﴾(٤٤) المؤمنون، واتە: پێغەمبـەرانی خۆمـان یـەك بـە دوای یەکـدا نارد، خـوا ﷻ لەوکاتـەوە ئادەم‌و حـەووا‌و ئیبلیسـی ناردنـە سـەر زەوی، فـەرمووی: مـن هیدایەت‌و ڕێنمایی خۆمتـان بۆ دەنێرم، بۆئەوەی بزانن داخۆ کـێ ڕێـی خـوا دەگـرێ‌و بەندایەتیـی بۆ خوا دەکـات‌و، کێش لـە ڕێی خـوا لادەدات؟ وە خـوای دادگـەر بـەڵێنی خـۆی لەگــەڵ مرۆڤایــەتیی دا بردۆتــە ســەر، وە ئەمــە ئەوەشـــی لێــوەردەگیرێ کــە بەشــەریەت بـەبێ ڕێنمـایی خـواو بـەبێ کتێبەکـانی خـوا، ناتوانـێ ژیـانێکی ڕێـك‌و ڕاست‌و تەواوی هـەبێ، بەڵـێ ڕەنگـە لـە ڕووی ماددییـەوە بـەرەو پێشـەوە بچـێ، وەك ئەو واقیعەی ئێسـتا لە ڕۆژئـاواو یابان‌و چین هەیە، دیارە لـە ڕووی ماددییـەوە بـەرەو پێشـەوە دەچن، بەڵام لەڕووی ئینسـانییەوە بـەرەو دوا دەچنــەوە، لـە ڕووی ڕووحیـی‌و ڕەوشــتەوە بـەرەو دوا دەچنــەوە، بگـرە هـەر ئـەو بـەرەو پێـش چوونە ماددییەیەکـە، بـەرەو دواوەیـان دەبـات، لەبەرئـەوەی لەسـەر حیسـابی لایـەنی ڕووحیـی‌و ئینسانیی‌و ئەخلاقییە، بۆیە بە دەست بەرهەمە تەکنۆلۆژیـایی یەکەیانـەوە گیـر دەخۆن، تەماشا دەکـەی ئێسـتا بەشـەریەت بەدەسـت ئـەو چەکـە کۆکـوژیی‌و ماڵوێرانـکەرانەی کـە بەرهـەمی هێنـاون، گیری خـواردوە، هەتـا هەنـدێ جار بـیردەکەنەوە لـەوەی کـە ئـەو چەکانە بەرن بۆ سـەر مانگ، بەتایبـەتی چەکە بایۆلۆجییـەکان‌و نیۆکییـەکان، دەڵـێن: ئەگەر کـاتی زۆر پێ بچـێ‌و بمێننـەوە، ئەگـەری زۆرە لـە ئـەنجامی کارلێـك (تفـاعـل)ی کیمیاییدا بتەقنـەوە، لە ئەنجامدا ژیانی بەشـەریەت کۆتایی پـێ بـێ لـەم سـەر زەوییـە، بە پێی ئەو مەزەندانە، جا خـوا لێـرەدا دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى

وَنُورٌ ﴾، ئێمە تەوڕاتمان ناردۆتە خوار، کە ڕێنمایی‌و ڕووناکیی تێدایە، ڕێنمایی وا پێدەچێ مەبەست پێی بووناسیی‌و عەقیدەو ڕەوشت بێ، وە ڕووناکیی (نور)یش وا پێدەچێ مەبەست پێی لایەنی حەڵاڵ‌و حەرام‌و ئەمرو نەهی بێ، خوا تەوراتی بۆچی ناردوە؟ ﴿يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ ﴾، پێغەمبەرانێك (عليهم الصلاة والسلام) کە بۆ خوا ملکەچبوون، حوکمیان پێدەکرد، بۆ ئەوانەی کە جوولەکە بوون، هەروەها ڕەببانییەکان‌و ئەحبارەکانیش (واتە: مشوورخۆران‌و زاناکانیش) ئیشیان بە تەورات دەکرد، لە نێو گەلی جوولەکەدا، ﴿بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ﴾، بەهۆی ئەوەوە کە پارێزگاریی لێکردنی کتێبی خوا بەوان سپێردرا بوو، وە بەسەریشیەوە چاودێر بوون، واتە: پاراستنی تەورات بە کێ سپێردرابوو؟ بە ڕەببانییەکان‌و ئەحبارەکان، لە پێش ئەوانیشدا بە پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) وە بەسەریشیەوە چاودێر بوون، ﴿فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ ﴾، وە لە خەڵك مەترسێن‌و لە من بترسێن، ﴿وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾، وە بە ئایەتەکانی من نرخێکی کەم مەکڕن، واتە: سەوداو مامەڵە بە ئایەتەکانی من مەکەن، بۆیەش دەفەرموێ: ﴿ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾، نرخێکی کەم، مەبەست ئەوەنیە ئەگەر بە نرخێکی زۆربێ قەیدێ ناکات ئایەتەکان بفرۆشێ! بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەگەر لە بەرانبەری ئایەتەکانی خوادا هەر نرخێك وەربگری، هەر کەمە، ئەگەر هەموو دنیاش بێ، هەر نرخێك بیخەیە تەرازووی مامەڵەکردن بە ئایەتەکانی خوا، هەر کەمە، ئەگەر هەموو دنیاش بێ، مەبەستی ئەوەیە، ئەگەرنا ئەوە مەفهوومی موخالەفەکەی لێرەدا وەرناگیرێ، یانی بگوترێ: خوا دەفەرموێ: بە نرخی کەم ئایەتەکان مەفرۆشن، کەواتە: ئەگەر بە نرخی زۆریان بفرۆشین قەیدێ ناکات! وانیە، بەڵکو واتە: ئایەتەکانی من بە هەموو دنیاش مەدەن، هەموو دنیاش لە بەرانبەر ئایەتەکانی مندا وەربگرن، هەر کەمە، جا لێرەدا خوای پەروەردگار ئاماژە دەکات بە دوو هۆکار، ئەوانیش ترس‌و برسن، ﴿فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ

﴿ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ ﴾، واتە: نە لە ترسان نە لە برسان دەست لە ئایین‌و بەرنامەو یاسای شەریعەتی من هەڵمەگرن، ﴿ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴾، وە هەر كەسێك حوكم نەكات بەوەی كە خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن كافران، لێرەدا "وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باسی دەكەین" مشتومڕی زۆر لەنێو زانایاندا هەیە، كە ئایا مەبەست لەم ئایەتە تەنیا جوولەكەكانە؟ یاخود مسوڵمانانیش دەگرێتەوە؟ وە پاشان حوكمڕانانی مسوڵمانان، كامانە دەگرێتەوە؟ وە ئایا هەر كەسێك لە یەك مەسەلەشدا لابدات، دەیگرێتەوە؟ یاخود بەس ئەوانەی كە شەریعەتی خوا بەگشتی ڕەفز دەكەن؟ ئەوە دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باسی دەكەین، لێرەدا بواری ئەوە نییە كە هەقی خۆی بە تەواویی بدەینێ، ئنجا خوا ﷻ بەردەوام دەبێ‌و دەفەرمووێ: ﴿ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ وَٱلۡعَيۡنَ بِٱلۡعَيۡنِ وَٱلۡأَنفَ بِٱلۡأَنفِ وَٱلۡأُذُنَ بِٱلۡأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ ﴾، وە لەوێدا لەسەرمان نووسیبوون، لە كوێدا، ڕاناوەكە بۆ كوێ دەچێ؟ بۆ تەورات، لە تەوراتدا لەسەر ئەوانمان پێویست كردبوو، لەسەرمان نووسیبوون، نەفس بە نەفس، كەسێك بە ناهەق كەسێك بكوژێ، دەكوژرێتەوە، وە كەسێك چاوی كەسێك كوێر بكات كوێر دەكرێتەوە، ئەگەر چاوی ڕاستی بێ چاوی ڕاستی، ئەگەر چاوی چەپی بێ، چاوی چەپی، وە ئەگەر هەردوو چاوی بن، هەردوو چاوی، وە ئەگەر كەسێك لووتی كەسێك ببڕێ، یان وای لێبكات هەستی بۆنكردنی نەمێنێ، بۆی هەیە وای لێبكاتەوە، وە گوێ بە گوێ، ئەگەر یەكێك گوێی كەسێك بقرتێنێ، ئنجا كەم بێ یان زۆر، بابای گوێ قرتاو بۆی هەیە هەمان شت لە بەرانبەرەكەی بكاتەوە، وە ددان بە ددان، چ ددانێكە، ئەو ددانە، ﴿ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٞۚ ﴾، برینەكانیش تۆڵەن، دیارە ئەگەر برینێك ئێسقانەكەی تێدا شكابێ، یان گەیبێتە سەر ئێسقان، بۆی هەیە ئەو برینەی تێبكاتەوە، ﴿ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٞ لَّهُۥۚ ﴾، هەر كەسێك بیكاتە خێرو چاكە، ئەوە بۆ ئەو دەبێتە مایەی سڕانەوە، واتە: ئەگەر كەسێك لەلایەن

کەسێکەوە دەستدرێژیی کرایە سەر خزمێکیو کوژرا، یان خۆی چاوی کوێر کرا، یان لووتی، دەستی شکا یان بڕا، لاقی بڕا یان شکا ، یان برینی تێکرا، هەرچی بوو، گوتی: لەبەر خوا دەتبەخشم، ئەوە بۆی دەبێتە مایەی سڕانەوەی گوناهی، بەڵام ئەگەر گوتیشی تۆڵەم دەوێ، هەقی تۆڵەشی هەیە، ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾، وە هەر کەسێك دادوەریی‌و حوکم نەکات بەوە کە خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن ستەمکاران، هی پێشێ فەرمووی: ئەوانەن کافران، ئەمەیان دەفەرموێ: ئەوانەن ستەمکاران، چونکە هی پێشێ باسی ئەوەبوو کە ئایا شەریعەتی خوای قبووڵە کە، یان قبووڵ نیەه؟ لە ترسی خەڵك‌و لەبەر تەماع دەست لە شەریعەتی خوا هەڵدەگرێ، یان هەڵناگرێ؟! بەڵام لەمەدا باس باسی هەقی خەڵکە، ئاشکرایە هەر کەسێك شەریعەتی خوا لە ترسان یان لە برسان دەست لێ هەڵبگرێ بە کافر دادەنرێ، بەڵام هەر کەسێك هەقی خەڵك پێشێل بکات، ستەمکار دەردەچێ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ﴾، وە بە شوێنیاندا عیسای کوڕی مەریەممان نارد، واتە: بە دوای ئەو پێغەمبەرانەی پێشوودا عیسامان نارد، ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ﴾، لە حاڵێکدا بەڕاستدانەری ئەو تەوراتە بوو کە لە پێش دەستییەوە بوو، ئەو تەوراتەی کە لە پێش ئەودا نێردرابوو، عیسا علیه السلام ئەو تەوراتەی بە ڕاست دادەنا، ﴿ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ ﴾، وە ئینجیلیشمان پێدا، عیسا تەوراتی بە ڕاست دادەناو تەوراتیش لەبەردەستیاندا بوو، بەڵام خوای کاربەجێ ئینجیلیشی پێدا، بۆئەوەی ئەو شتانەی جوولەکەکان تێیاندا کەوتبوونە ڕاجیاییەوە لە تەورات دا، بۆیان ڕوونبکاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَلَمَّا جَآءَ عِيسَىٰ بِٱلْبَيِّنَـٰتِ قَالَ قَدْ جِئْتُكُم بِٱلْحِكْمَةِ وَلِأُبَيِّنَ لَكُم بَعْضَ ٱلَّذِى تَخْتَلِفُونَ فِيهِ ۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٦٣﴾ ﴾ الزخرف، واتە: وە کاتێك عیسا بە بەڵگە ئاشکرایەکانەوە هاتە لایان، گوتی: حیکمەتم بۆ هێناون، وە بۆئەوەی هەندێك لەوەی کە ئێوە تێیدا کەوتوونەتە ڕاجیاییی، بۆتان ڕوون بکەمەوە، دەجا

پارێز لە خوا بکەنو فەرمانبەرییم بکەن. وە هەندێك یاسای تازەش کە سەردەمی عیسا سەلامی خوای لێبێ دەیخواستن، نێردرابوونە خوار لە ئینجیلدا، ﴿ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡإِنجِيلَ فِيهِ هُدٗى وَنُورٞ ﴾، وە ئینجیلمان بە عیسا دابوو، کە ڕێنمایی تێدابوو، وە ڕووناکیی تێدابوو، ڕێنمایی "وەك گوتمان" دەگونجێ مەبەست پێی لایەنی بووناسیی‌و، جیهانبینیی‌و، عەقیدەو ڕەوشتو ئاکاربێ، وە ڕووناکیی دەگونجێ مەبەست پێی لایەنی حەڵاڵو حەرامو ئەمرو نەهی‌و بەرنامەکانی ژیان بێ، ﴿ وَمُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلتَّوۡرَىٰةِ ﴾، وەك چۆن عیسا تەوراتێك کە لە پێش دەستی ئەودا نێردراو بوو، بە ڕاستی دەزانی‌و بە ڕاست دانەری تەورات بوو، ئینجیلیش کە بە عیسا درابوو، ئەو ئینجیلەش دیسان تەوراتی بە ڕاست دادەنا، لە هەردووکیان دا دووبارە کراوەتەوە، ﴿ وَهُدٗى وَمَوۡعِظَةٗ لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾، وشەی (هدى) جارێکی دیکەش دووبارە بۆتەوە، واتە: وە ڕێنمایی‌و ئامۆژگاریی بوو بۆ پارێزکاران، لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ﴾، وە با خاوەنانی ئینجیل، (واتە: نەصرانییەکان) دادوەریی بکەن بەوەی کە خوا تێیدا ناردوویەتە خوار، با حوکمڕانیی پێ بکەن، دیارە ئینجیلیش تەورات بە ڕاست دەزانێ، کەواتە: پابەندبن بە تەوراتیشەوە، بۆیە ئێستا تەوراتو ئەو کتێبانەی دیکەی لەگەڵێنی‌و هەر چوار ئینجیلەکانو نامەکان هەموویان لە دوو توێی کتێبێك دان بەناوی (الكتاب المقدس) ئینجیلەکانیش لە نێو حەفتا ئینجیلدا چواریان لێ هەڵبژاردوون، بۆیە ئەوەی ئەهلی ئیسلام هەیەتی کەس نیەتی، کاتێك (پەیمانی کۆن) و (پەیمانی نوێ) دەخوێنیەوەو لەگەڵ قورئان بەراوردیان دەکەی، ئاسمانو ڕێسمانیان بەینە، هەڵبەتە ناڵێین ئێستا لە تەوراتو ئینجیلدا هیچ قسەیەکی خوایان تێدا نەماوە، بەڵام هەڵەو پەڵەو گۆڕانکاریی زۆریشیان تێدا کراوە، وە بەڕاستیی کە لەگەڵ قورئاندا بەراوردیان دەکەی، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێین: هەر خوایان یەکە!!

ئنجـــا خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾، وە هەر کەسێك حوکم نەکات بەوەی خوا ناردوویەتە خوار، ئا ئەوانەن لارێیان، جاری یەکەم فەرمووی: ئا ئەوانەن کافران، جاری دووەم فەرمووی: ئا ئەوانەن ستەمکاران، ئەمجارە دەفەرموێ: ئەوانەن لارێیان، وەك باسمان کرد لەبەرئەوەی جاری یەکەم باس باسی ئەوەیە کە بەرنامەو ئایاتەکانی خوا بهێڵدرێنەوە، یاخود لە ترسانو لە برسان وەلابنرێنو، لە ژێر فشاری ترسو بیمو بەرژەوەندیی دا، دەستیان لێ هەڵبگیرێ؟! بۆیە لەوێدا دەفەرموێ: هەر کەسێك حوکم نەکات بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، ئەوانەن بێبڕوا، چونکە کەسێك دەستبەرداریی دینی خوابێ لە ترسانو لە برسان، مانای وایە بێبڕوایە، بەلام ئەوەی دیکە، چونکە باس باسی تۆڵە بوو، دیارە هەر کەسێك حوکم نەکات بە دینی خوا، لە بواری هەقو مافی خەڵکدا، ئەوە ستەمی کردوە، لێرەشدا کە باس باسی ڕەوشتو ئەدەبو ڕەفتارو لایەنی مەعنەوییە، هەر کەسێك لەو ڕووەوە لە وەحی خوا لابدات، ئەوە تووشی لاڕێ بوونو گوناهباریی دەبێ.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ﴾، بۆ زانیارییتان: خاوەن کتێبەکان، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان ئێستا یەك کۆمەڵە کتێبیان هەیە، هەموویان لە ژێر ناوونیشانی، یاخود لە نێو دوو بەرگی کتێبی پیرۆز (الکتاب المقدس)دا کۆدەبنەوە، ئەو (الکتاب المقدس)ە، کە بە ئینگلیزی (Holy book)ی پێدەڵێن، ئەوە دەبێتە دوو بەش: (پەیمانی کۆن)و (پەیمانی نویٚ)، پەیمانی کۆن، تەوراتی تێدایە، لەگەڵ چەند کتێبێکی دیکە بۆ وێنە: زەبووری داوود، سرووودەکانی داوود، پەندو حیکمەتەکانی سولەیمان، وە باسی عیسقیال و دانیاڵ و باسی کۆمەڵێك کەسایەتیی دەکات، کە دەڵێ ئەوانە پێغەمبەر بوون، هەروەها باسی زەکەرییاو یەحیاش دەکات، وە پەیمانی نوێش چوار ئینجیلەکان و نامەکانی بۆڵصی تێدان، ئنجا وەك چۆن قورئان سوورەت سوورەتە، تەوراتیش ئاوا چەند (سِفْر)ێکە، وەك: (سِفْر التکوین، سِفْر التثنیة، سِفْر الخروج، سِفْر اللاویین، سِفْر العدد)، ئنجا هەر (سِفْر)ێك چەند (إصحاح)ێکە، وە هەر (إصحاح)ێکیش چەند ئایەتێکە، وەك چۆن ئێمە دەڵێین: قورئان (١١٤) سوورەتەو هەر سوورەتەش چەند ئایەتێکە، خوا دەفەرمویٚ: ئێمە تەوراتمان ناردۆتە خوار، ڕێنمایی و ڕووناکیی تێدایە، وەك پێشتریش باسم کرد، ئەو دوو وشەیە هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەوانە وشەی هاوواتا (مُترادف)ن، واتە: بێژەکەیان لێك جیایە، بەڵام ماناکەیان یەکە، بەڵام من پێموایە وشەی: (مُترادف) لە قورئاندا هەر نیە، وە هەر وشەیە مانایەکی سەربەخۆی خۆی هەیە، (هُدى) واتە: ڕێنمایی، (نور)یش یانی: ڕووناکیی، ئینسان لە ژیانی دا پێویستی بە دوو شتان هەیە: بووناسیی، کە تێبگات ئینسان چییە؟ بوونەوەر چییە؟ لە کوێ هاتوە؟ بۆچی هاتوە؟ بۆ کوێ دەچێتەوە؟ کێ هێناویەتی؟ دەبێ چی بکات؟ چۆن بکات؟ ئەوە پێی دەگوترێ: بووناسیی (معرفة الوجود)، وە ئیمان و عەقیدە لێرەوە سەرچاوە دەگرێ، ئەوە لەلایەك، بەڵام وێڕای ئەوە ئینسان پێویستیشی بە بەرنامەیەك هەیە، کە پێی بڵێ: حەڵاڵ چییە؟ حەرام چییە؟ چاکە چییە؟ خراپە چییە؟ ڕاست چییە؟ چەوت چییە؟ چی بکات؟

چۆنی بکات؟ لە چوارچێوەی خودی خۆیدا، لە چوارچێوەی خێزاندا، لە چوارچێوەی کۆمەڵدا، لە چوارچێوەی دەوڵەتدا، لەگەڵ میللەتانی دیکەدا چۆن مامەڵە بکات؟ ئەوەش پێی دەگوترێ: ڕووناکیی، بۆیە من پێموایە: (هُدى) واتە: بووننا‌سیی‌و عەقیدە، وە (نور)یش واتە: حەڵاڵ‌و حەرام‌و چاکەو خراپەو ئەو یاسایانەی شەریعەت کە خوا ناردوونیە خوار.

**مەسەلەی دووەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ ﴾، پێغەمبەرانێك (عليهم الصلاة والسلام) کە ملکەچبوون، بەو تەوراتە حوکمیان دەکرد، بۆ کێ ملکەچبوون؟ بۆ خوا، ئەدی حوکمیان بۆ کێ پێدەکرد؟ دەفەرموێ: ﴿ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ ﴾، لە نێو جوولەکەکاندا حوکمیان پێدەکرد، ﴿ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ ﴾، وە مشوورخۆرەکان‌و زاناکانیان ئەوانیش ئیشیان بە تەورات دەکرد، لە نێو جوولەکەکاندا، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشێ: ئیسلام واتە: ملکەچیی، لێرەدا خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ ﴾، پێغەمبەرانێك (عليهم الصلاة والسلام) کە ملکەچبوون حوکمیان بە تەورات دەکرد، ئەو پێغەمبەرانە مسوڵمان بوون، ملکەچبوون، جا توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ملکەچبوون بۆ خوا، شتێك نیە پێغەمبەرانی پێ مەدح بکرێن، چونکە مسوڵمانێکی سادەش بۆ خوا ملکەچە، ئەدی وەڵامی ئەمە چییە؟ توێژەرەوان زۆر شتیان گوتوە، بەڵام من پێموایە، وشەکانی ئیمان، ئیسلام، تەقوا، عیبادەت، ئیحسان، پشت بە خوا بەستن (توکل)، ئەوانە هەموویان تەنیا یەك پلەیان نیە، بەڵکو هەر کامێك لەوانە، چەندان پلەی هەیە، وە ئیسلامەتیی‌و ئیمان‌و تەقواو عیبادەت‌و ئیحسان‌و پشت بە خوا بەستنی پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) جیابوون، لە هی خەڵکی دیکە، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ ﴾، پێغەمبەرانێك کە ملکەچبوون بۆ خوا حوکمیان پێدەکرد، ملکەچیی پێغەمبەران

(عليهم الصلاة والسلام) لووتكەی ملكەچییە بۆ خوا، بەڵام ملكەچیی خەڵكی دیكە لە قەدەر خۆیانە، بۆیە خوای بەرز نەك هەر لێرە، بەڵكو لە سوورەتی (البقرة)دا دەربارەی ئیبراهیم دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥ ۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٣٠﴾ إِذْ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسْلِمْ ۖ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٣١﴾ ﴾، واتە: كاتێك پەروەردگاری پێی فەرموو: ئیسلام ببە، ملكەچبە، (ئیبراهیم) گوتی: ملكەچبووم بۆ خوای پەروەردگاری جیهانییان. دیارە ملكەچیی ئیبراهیم سەلامی خوای لێ بێ، كە (خَلِيل الله)یە لە لووتكەی ملكەچیی دایە بۆ خوا، كەواتە: وشەی (أسلموا) هەر لەسەر مانای خۆیەتی بەڵام ملكەچیی پێغەمبەران لە قەدەر خۆیانە، هی خەڵكی دیكەش لە قەدەر خۆیەتی، هەروەها ئیمانو تەقواو تەزكیەو باقی سیفەتەكانی دیكەشیان بە هەمان شێوەیە.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ ﴾، واتە: حوكمیان بە تەورات دەكرد، بۆ جوولەكان، هەڵبەتە تەورات تایبەت بووە بە گەلی جوولەكەوە، وە بۆ زانیارییتان دینی جوولەكە دینێكی داخراوە، وەك دینی یەزیدییەكان، كەس دەعوەت ناكەن، جوولەكە بانگەواز ناكەن خەڵك بكەنە جوولەكە، هەروەها یەزیدییەكانیش كەس ناكەنە یەزیدیی، لەبەرئەوەیە ئەوانە هەر لێیان كەم دەبێو لێیان زیاد نابێ، ئەگەرنا جوولەكە مێژووەكەیان نزیكەی سێ هەزارو پێنج سەد ساڵە، ئایا دەبووایە ئێستا هەر ئەوەندەبن؟!! ڕەنگە لە هەموو دنیا ژمارەیان بگاتە بیست ملیۆنێك كەمتریان زیاتر، ئەو دەوروبەرە، بەڵام دەبووایە زۆر زیاتربن، بەس لەبەرئەوەی دینێكی داخراوە، لێیان دەبێتە مسوڵمان، دەبێتە نەصرانیی، یان دەچنە سەر دینی دیكە، بەڵام لێیان زیاد ناكات، چونكە ئەوانە بڕوایان بە پاكیی ڕەچەڵەكو خوێنی خۆیان هەیەو دەڵێن: نابێ كەس تێكەڵ بە ئێمە ببێ، ﴿ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ ﴾، هەندێك گوتوویانە: ڕەببانیی زانای نەصرانیین، ئەحباریش زانای جوولەكەكانن، بەڵام لەڕاستییدا وانییە، وەك من لە بەرگی دووەمی ئەم تەفسیرەدا لە سوورەتی (آل عمران)دا بە تەفصیل باسم كردوە، لەو

شـــوێنەدا کـــە دەفـــەرموێ: ﴿ مَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُؤْتِيَهُ ٱللَّهُ ٱلْكِتَـٰبَ وَٱلْحُكْمَ وَٱلنُّبُوَّةَ ثُمَّ يَقُولَ لِلنَّاسِ كُونُوا۟ عِبَادًا لِّى مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلَـٰكِن كُونُوا۟ رَبَّـٰنِيِّـۧنَ بِمَا كُنتُمْ تُعَلِّمُونَ ٱلْكِتَـٰبَ وَبِمَا كُنتُمْ تَدْرُسُونَ ﴿٧٩﴾ ﴾، ڕەببـــانیی واتـــە: مشوورخۆر، بەرپرس، وڵات هەڵسووڕێنەر، ئنجا (أحبار)یش کە کۆی (حِبَر)ە[1]، واتە: زاناو شارەزا، ڕێنمایی خەڵك دەکات، بەڵام مشوورخۆر نیە، جا مەلای گەورەی کۆیی هەزار ڕەحمەتی لێ بێ، قسەی جوانی هەن، لە یەکێك لە قسەکانی دا دەڵێ: (مەلای وایە لەسەر دەفتەری دەوڵەتت بۆ تەشکیل دەکات، بەڵام چوار نەفەرانی تەسلیم بکە، ناتوانێ نانیان بداتێو سەروبەریان بکاو ئیشیان ڕاپەڕێنێ) مشوورخواردن جیایە لە قسەکردن، کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: (ئیشکەرت بمرێ، بەس مشوورخۆرت نەمرێ) زۆر کەس دەزانێ ئیشێ بکات، بەڵام کەم کەس دەزانێ مشووری بخوات، زۆر کەس دەتوانێ زانابێو قسە بکاتو ئایەتو حەدیسان بێنێ، بەڵام کەم کەس دەتوانێ ئەو ئایەتو حەدیسانە لە شوێنی خۆیدا دابنێ، وە خەڵکیان لەسەر پەروەردە بکات، کۆمەڵگا دروست بکاتو خەڵك بگۆڕێ، ئەوە بە هەموو کەس ناکرێ، (الرَّبَّانِيُّون) ئەوانەن کە مشوورخۆرن، بە زانیارییەکەیان خەڵك دەگۆڕن، تەگبیرو سەرپەرشتی کاروباری خەڵك دەکەن، بەڵام (الأحبار) زانایانو شارەزایانن، بەڵام مەرج نیە، ڕابەرو مشوورخۆربن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ﴾، بە هۆی ئەوەوە کە پارێزگاریی لێکردنی کتێبی خوایان پێسپێردرابوو، وە بەسەریشییەوە چاودێر بوون، لێرەدا شتێکمان بۆ دەردەکەوێ، خوا پاراستنی تەوراتی بە کێ سپاردوە؟ دیارە بە ڕەببانییەکانو بە ئەحبار، زانایانو مشوورخۆرانی جوولەکە، بەڵام پاراستنی قورئانی بە کێ سپاردوە؟ بە خۆی، وەك دەفەرموێ: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾الحجر، واتە:

---

١) المعجم الوسيط، ص١٥١، وشەی (حَبْر)، یان (حِبر) بە (أحبار) و (حبور)یش کۆدەکرێتەوە.

ئێمە خۆمان قورئانمان دابەزاندوە، وە خۆشمان پارێزەرینی، ئنجا تەماشا بکەن! شتێك ئینسان بیپارێزێ لە قەدەر خۆی دەیپارێزێ، شتێکیش خوا بیپارێزێ لە قەدەر خۆی دەیپارێزێ، تەوراتێك کە پاراستنی بە ڕەببانییەکانو ئەحبارِ سپێردرابوو، ئەوە بۆخۆتان دەیبینن، چۆن دەستکاریی کراوەو گۆڕدراوە، قورئانیش کە خوا بۆخۆی بە ئەستۆیەوە گرتوە بیپارێزێ، ئەوەتا تەماشا دەکەین نەك وشەیەك پیتێکیشی لێ نەگۆڕاوەو دەستکاریی نەکراوە، ئەوەش جیاوازیی نێوان قورئانو کتێبەکانی دیکەی خوایە، ئەگەرنا هەموویان هەر فەرمایشتی خوا بوون، چونکە جاری وایە هەندێ مسوڵمان لەبەر دەمارگیریی بۆ مسوڵمانەتیی، ئەگەر ئاگای لەخۆی نەبێ، کە باسی تەوراتو ئینجیلو زەبوورو صوحوف دەکات، وا دەزانێ ئەوانە لە خوار قورئانەوەن! نەخێر هەموویان لە یەك ئاست دان، لەو ڕووەوە کە فەرمایشتی خوان، بەڵام ئەو کتێبانە، خوای کاربەجێ بۆ قۆناغێکی دیکەو هەلومەرجێکی دیکەو میللەتانێکی دیکە ناردوونی، پاشان دەستکارییش کراونو گۆڕدراویشن، ئەگەر وەك خۆشیان مابانەوە هەر باش بوو، بەڵکو وەك خۆشیان نەماونەوە، بۆیە ئەگەر وەك خۆشیان مابانەوەو نەشگۆڕدرابان، بۆ ئێستا بەکەڵك نەهاتبان، عەجایب نەبوو، چونکە خوای زاناو شارەزا بۆ ئێستای نەفەرموون، بەڵکو بۆ هەزاران ساڵ لەمەو پێشی فەرموون، ئەگەرنا لەو ڕووەوە کە فەرمایشتی خوان، وەك یەکن، بۆیە لە سوورەتی (البقرة)دا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ قُولُوٓاْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَمَآ أُوتِيَ ٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ١٣٦ ﴾، واتە: بڵێن: بڕوامان بە خوا هێناوەو، بەوە کە بۆ لامان نێرراوەتە خوار، وە بەوە کە بۆ لای ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحاقو یەعقووبو نەوەکانی نێرراوەتە خوار، وە بەوە کە بە مووساو عیسا دراوەو، بەوە کە بە سەرجەم پێغەمبەران دراوە، لە پەروەردگاریانەوە، جیاوازیی ناخەینە نێوان هیچ کامیانەوە، وە ئێمە بۆی ملکەچین.

کەواتە: مسولّمان کراوەیە بە ڕووی هەموو خاوەن ئایینو خاوەن کتێبە ئاسمانییەکاندا، ئەگەر کتێبەکەشیان گۆڕدرابێ، دەڵێین: مادام ئیددیعای ئەوە دەکەن کە کتێبێکتان لە خواوە لە ئاسمانەوە بۆ دابەزیوە، بەو جۆرە مامەڵەتان لەگەڵ دەکەین کە خاوەن کتێبی ئاسمانیین، بەڵکو بە ڕووی هەموو خاوەن فیکرەیەکی دیکەوە، وەك بەشەر کە خوا ڕێزی لێناوە، بەڵام دیارە ئەوانەی کە کتێبی ئاسمانییان لەبەردەست دایە، لە شەریعەتی ئیسلامدا ئیمتیازیان پێدراوە، ژنو ژن خوازیان لەگەڵدا دروستەو، سەربڕاویان دەخورێو خواردنیان دەخورێو، تێکەڵیی زیاتریان لەگەڵ دەکرێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَـٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًا ﴾، دیارە کاتی خۆی خوای پەروەردگار ئاوای بە جوولەکەکان فەرمووە، بە ڕەببانییەکانو ئەحباری فەرمووە: لە خەڵك مەترسێنو لە من بترسێن، وە بە ئایەتەکانی من نرخێکی کەم مەکڕن، ئنجا ئایا بۆچی دەفەرموێ نرخی کەم؟ چونکە ئینسان هەرچی لە بەرانبەر دینی خوادا وەربگرێ، هەر کەمە، ئەگەر هەموو دنیاش بێ، خوای دادگەر بۆ خۆی زاناو شارەزایە بە هەموو شتێك، دەزانێ کە لادان لە جادەی شەریعەت لەلایەن زانایانەوەو، لەلایەن مشوورخۆرانی مسولّمانانو ئەهلی دینەوە، هەمیشە یان لە ترسانە، یان لە برسانە، بۆیە دەفەرموێ: لە خەڵك مەترسێن، لە من بترسێن، وە لەبەر تەماعو چاوچنۆکییو دنیا ویستیی، لە ڕووی ئابووریی یەوە، ئایەتەکانی من بە نرخێکی کەم مەگۆڕنەوە.

**مەسـەلەی پێنجـەم:**

# ڕای زانایان لەبارەی حوكمڕانێكـەوە كە حوكم بەشەریعەت ناكات



كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ ﴾، دیـارە زانایان دەربارەی ئـەو ڕسـتەیەو ئـەو دوو ڕستەیەی دیكـەش، كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ ﴿٤٥﴾ ﴾، ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الْفَاسِقُونَ ﴿٤٧﴾ ﴾ زۆر قسـەیان كـردوە، ئێمـە سـەرەتا قسـەكانی ئـەوان دێنیـن، دوایـیش چیمـان پـێ ڕاسـت بـوو دەیخـەینـە ڕوو:

هەڵبەتـە زۆربـەی تەفسیرەكان ئاماژەیـان بـە ڕاجیـایی زانایـان كـردوە، لـە تەفسیركردنی ئەو سێ ئایەتـەدا، بـە تایبـەتی یەكـەم كە دەفەرموێ: هـەر كەسـێك حوكم نەكـات بەوەی كە خـوا ناردوویەتـە خـوار، ئـا ئەوانـەن بێبـڕوایـان، وە ئـەو تەفسیرانەی من سـەرنجم داون، زۆرن، بەڵام ئەوانەیـان كـە تـا ڕاددەیـەك ڕاجیـایی زانایانیـان باش خسـتۆتە ڕوو، ئەم پێنجـەن:

١/ (التفسیـر الكبیـر)ی (فخرالدین الرازي)، بەرگی (٦) لاپەڕە (٥٦٦).

٢/ (الجامع لأحكام القرآن)ی (القرطبي) بەرگی (٦) لاپەڕە (١٦٧ - ١٦٨).

٣/ (روح المعاني)ی (الآلوسي) بەرگی (٣) لاپەڕە (٤٤٣ - ٤٤٤).

٤/ (محاسن التأویل)ی (جمال الدین القاسمي) بەرگی (٤) لاپەڕە (٢١٥ - ٢١٦).

٥/ (التحریر والتنویر)ی (مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) بەرگی (٣) لاپەڕە (٢١١ - ٢١٢).

من هەوڵدەدەم سەرەتا پوختەی قسەی زانایان دەربارەی ئەو سێ ئایەتە بێنم، وە دواییش بیروڕاو بۆچوونی خۆم لە حەوت کورتە خاڵدا دەخەمەڕوو:

ئێستا بە پێویستی دەزانم ئەم ڕوونکردنەوەیەی (فخرالدين الرازي) بێنم کە لە تەفسیرەکەی خۆیدا بە ناوی (التفسير الكبير)[1] کە بە (مفاتح الغيب) بە ناوبانگە، هێناویەتی، ڕای زانایان بەگشتی دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە، دەکاتە پێنج (٥) ڕا، وە لەو پێنجەش چوار ڕایان بە بێهێز دەزانێ، و، یەکێکیان هەڵدەبژێرێ، دەڵێ: {﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾.

**الأَوَّل**: أَنَّ هَذِهِ الآية نَزَلَتْ فِي اليَهُود فَتَكُون مُخْتَصَةً بِهِم، وَهذَا ضَعِيفٌ لأَنَّ الإعتِبَار بِعمُومِ اللَّفْظِ لابِخصُوصِ السَّبَبِ، وَمِنْهُمْ مَنْ حَاوَلَ دَفْعَ هَذَا السُّؤَالِ، فَقَالَ المُرَادُ (وَمَنْ لَمْ يَحْكُم مِنْ هَؤلاءِ الَّذِينَ سَبَقَ ذِكرُهُم بِمَا أَنْزَلَ اللّه فَأُولَئكَ هُمُ الكَافِرون)، وَهذَا أيضاً ضَعِيفٌ، لأَنَّ قولَهُ وَمَن ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾ كَلاَمٌ أَدْخِلَ فِيهِ كَلِمَة (مَنْ) فِي مَعرضِ الشَّرْطِ فَيَكُون لِلعمُومِ، ثُمَّ زِيَادَةٌ فِي النَّصِ وَذلِكَ غَيْر جَائِز.

**الثَّاني**: قَالَ عَطاء هُوَ كُفْرٌ دُونَ كُفْر، وَقَالَ طَاوُس: لَيْسَ بِكُفْرٍ يَنْقُلُ عَنِ المِلَّةِ كَمَنْ يَكْفُرُ بِاللهِ وَاليَوْمِ الآخر، فكَأنَّهُمْ حملوا الآية عَلَى كُفرِ النِّعْمَةِ لا عَلَى كُفْرِ الدِين، وَهُوَ أَيضَاً ضَعِيفٌ، لأَنَّ لفظ الكُفْرِ إِذَا أُطلِقَ انْصَرَفَ إِلَى الكُفْرِ فِي الدِين.

**الثَّالث**: قَالَ ابْنُ الأَنْبَارِيُّ: يَجُوزُ أَنْ يَكُون المَعْنَى ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، فَقَدْ فَعَلَ فِعْلاً يضَاهِي أَفْعَال الكُفار، وَيُشْبِهُ مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ الكَافِرِين، وَهَذَا ضَعِيفٌ أَيضَاً لأَنَّهُ عَدول عَنِ الظَّاهِرِ.

**الرابع**: قَالَ عَبْدُ العَزِيزِ بْن يَحيى الكِنَانِيُّ: قَوْلَه: ﴿ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، صِيغَةُ عمُومٍ فَقَوْلِهِ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، مَعْنَاهُ مَنْ أَتَى بِضدِّ حُكم

---

١) ج٦، ص٥٦٦.

اللّه تَعَالَى فِي كُلّ مَا أَنْزَلَ اللّه فَأُولَئكَ هُمُ الكَافِرون، وَهَذَا حَقّ لأَنَّ الكَافِر هُوَ الَّذِي أَتَى بِضدِّ حُكْم اللّه تَعَالى، في كُلّ مَا أَنْزَلَ اللّه، أَمَّا الفَاسِقُ فَإِنَّهُ لَمْ يَأْتِ بِضدِّ حُكْم اللّه إلاّ في القَلِيل وَهُوَ العَمَل، أَمَّا فِي الإِعتِقَاد وَالإِقْرَار فَهُوَ مُوَافِق، وَهَذَا أَيْضَاً ضَعِيفٌ لأَنَّهُ لَوْ كَانَت هَذِهِ الآيَةُ وَعِيداً مَخْصُوصَاً بِمَنْ خَالَفَ حُكم اللّه تَعَالَى فِي كُلّ مَا أَنْزَلَ اللّه تَعَالى، لَمْ يَتَنَاوَلُ هَذَا الوَعِيد اليَهُود بِسَبَبِ مُخَالَفَتِهِم حُكْم اللّه في الرَّجْم، وَأَجْمَعَ المُفَسّرون عَلَى أَنَّ هَذَا الوَعِيد يَتَنَاوَل اليَهُود بِسَبَب مُخَالَفَتِهِم حُكم اللّه تَعَالَى فِي وَاقِعَة الرّجم، فَيَدل عَلَى سقُوطِ هَذَا الجوَاب.

**الخامس**: قَالَ عِكْرِمَة: قَوْلُه: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾، إِنَّمَا يَتَنَاوَلُ مَنْ أَنْكَرَ بِقَلْبِهِ وَجَحَدَ بِلِسَانِهِ، أَمَّا مَنْ عَرَفَ بِقَلْبِهِ كَونهُ حُكم اللّه وَأَقَرَّ بِلِسَانِهِ كونهُ حُكْم اللّه إلاّ أَنَّهُ أَتَى بِمَا يُضَادُّه فَهُوَ حَاكِمٌ بِمَا أَنْزَلَ اللّه تَعَالى وَلَكِنهُ تَارِك لَهُ، فَلاَ يَلْزَمُ دَخُولُهُ تَحْتَ هَذِهِ الآية، وَهَذَا هُوَ الجَوَابُ الصَحِيحُ وَاللّه أَعْلَم)}.

واتە: (هەر كەسێك بەوە حوكم نەكات كە خوا ناردوویەتە خوار، ئەوانەن كافران)، لەوبارەوە ئەم پێنج رایە هەن:

رای یەكەم: دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە ئەوەیە، كە ئەم ڕستەیە دەربارەی جوولەكەكان هاتۆتە خوار، كەواتە: تایبەتە بەوانەوە، بەڵام ئەوە ڕایەكی بێهێزە، چونكە عیبرەت بە واتای گشتی وشەكانو بێژەكانە، نەك بە تایبەتمەندیی هۆی هاتنە خوار، {واتە: با دەربارەی جوولەكەكان بەتایبەت هاتبێتە خوار، بەڵام واتای ئایەتەكە گشتییە، ئەوەش دیارە بنچینەیەكی شەرعییە، زانایان دەڵێن: (إنَّ خصُوصَ السَّبَبِ لايَمْنَعُ شمُولَ المَعْنَى) واتە: تایبەتمەندبوونی هۆكاری هاتنە خوار، ڕێگا ناگرێ لە گشتگیریی واتایەكەی}.

وە گوتوویانە: مەبەست لەو ڕستە قورئانییە ئەوەیە: (وَمَنْ لَمْ يَحْكُم مِنْ هَؤلاءِ الَّذِينَ سَبَقَ ذِكرُهُم بِمَا أَنْزَلَ اللّه فَأُولِئَكَ هُمُ الكَافِرون)، ئەو زیادەیەی تێدەخرێ، واتە: هەر كەسێك حوكم نەكات "لەوانەی كە پێشتر باس كران" بەوەی كە خوا ناردوویەتە خوار، ئەوە ئەوانەن بێبڕوایان، بەڵام ئەوەشیان ڕایەكی بێهێزە، چونكە كە خوا دەفەرموێ: (وَمَنْ لَمْ يَحْكُم بِمَا أَنْزَلَ اللّه) ئەوە

قسەیەکە لە باسی مەرج دا، (مَن)ی خراوەتە سەرێ، کەواتە: واتاکەی گشتییە، پاشان ئەو زیادە تێدا تەقدیر کرانەی ئەو ئایەتەش، هیچ پاساوێکی بۆ نیەو دروست نیە.

ڕای دووەم: (عَطَاء) گوتوویەتی: مەبەست لە کوفر لێرەدا (هُوَ كُفْرٌ دُونَ كُفْرٍ)ە، واتە: مەبەستی پێ کوفری گچکەیە، نەك کوفری گەورە، (کوفری گچکە واتە: گوناهباریی)، وە طاووس گوتوویەتی: ئەوە کوفرێك نیە ئینسانی پێ لە دین بچێتە دەرێ، وەك کەسێك کە کوفر بە خواو بە ڕۆژی دوایی دەکات، جا (فخر الدين الرازي) دەڵێ: وا دێتە پێش چاو ئەوان ئەو وشەیان بە کوفرانی نیعمەت، لێکداوەتەوە.

منیش دەڵێم: {بەڵام ناشگونجێ مەبەستیان پێی کوفرانی نیعمەت بێ، وەك ئیمام فەخرەددینی ڕازی دەڵێ و ئەو ئەگەرەی داناوە، بەڵکو مەبەستیان هەر ئەو کوفرەیە، کە بە مانای گوناه (معصية)ە، چونکە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خواشدا ﷺ هەندێ لە گوناهە گەورەکان بە کوفر ناوبراون، بۆ وێنە ئەم فەرموودە: ﴿اثْنَتَانِ فِي النَّاسِ هُمَا بِهِمْ كُفْرٌ: الطَّعْنُ فِي النَّسَبِ، وَالنِّيَاحَةُ عَلَى الْمَيِّتِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٠٤٣٨)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٧) وَأَبُو عَوَانَة برقم: (٦٤) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ}، واتە: تانەو تەشەر دان لە ڕەچەڵەك و شینگێڕان لەسەر مردوو، کوفرن، واتە: سیفەتی کافرانن}[1]، دەڵێ: بەڵام ئەو ڕایەش بێهێزە، چونکە وشەی کوفر کاتێك بە ڕەهایی دێ، یەکسەر مەبەست پێی کوفرە لە دیندا، نەك مەبەست پێی گوناهی گەورە، یان کوفرانی نیعمەت بێ.

ڕای سێیەم: (ابْنُ الأَنْبَارِيُّ) کە یەکێکە لە زانایان، گوتوویەتی: دەگونجێ مەبەستەکە ئاوابێ، واتە: هەر کەسێك حوکم نەکات بەوەی خوا ناردوویەتە خوار، ئەوە کردەوەیەکی کردوە وەك کردەوەی کافران، لەبەرئەوە وەك کافران دەچێ. دەڵێ: دیسان ئەو ڕایەش بێهێزە، چونکە لادانە لە ڕواڵەتیی وشەکە بەبێ پاساو.

---

١) ئەوەی نێوان دوو کەوانەکان زیادی خۆمە.

ڕای چوارەم: عەبدولعەزیزی کوڕی یەحیای کینانیی گوتوویەتی: کە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، دەڵێ: ئەوە وشەیەکی گشتییە، کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، واتە: هەر کەسێك بەرنامەیەك بێنێ پێچەوانەی بەرنامەی خوای بەرز بێ، لە هەموو ئەو شتانەدا کە خوا ناردوونیە خوارێ، ئەوە ئەو کەسە بێبڕوایە، بەڵام مسوڵمانی گوناهبار، (فاسق) لە هەموو ئەوانەدا کە خوا ناردوونیە خوارێ، پێچەوانەکەیان ناهێنێ، بەڵکو لە بەشێکی دا دەیهێنێ، کە بریتیە لە کردەوە، بەڵام بڕوا پێبوونیو، دان پێداهێنانی بە زمان ئەوە لە جێی خۆیەتی، بۆیە ئەمە ئەوە ناگرێتەوە، دەڵێ: دیسان ئەو ڕایەش بێهێزە، چونکە ئەگەر مەبەست لەو ئایەتە هەڕەشەیەکی تایبەت بووایە لە کەسێك کە لە هەموو شتێکدا پێچەوانەی حوکمی خوا بجووڵێتەوە، ئنجا بیگرێتەوە، ئەوە ئەو کاتە ئەم ئایەتە کە ئەو هەڕەشەیەی تێدا هاتوە، جوولەکەکانی نەدەگرتەوە، چونکە جوولەکەکان لە یەك حوکمدا پێچەوانەی شەریعەتی خوا جووڵانەوە، کە ئەویش حوکمی سزادانی زیناکەر بوو، یاخود مەسەلەی خوێنی کوژراو، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکاندا هەیە.

ڕای پێنجەم: (کە ئیمام فەخرەددینی ڕازی ئەم ڕایە هەڵدەبژێرێ) (قَالَ عِكْرِمَةَ: قَوْله: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾، إِنَّمَا يَتَنَاوَلُ مَنْ أَنْكَرَ بِقَلْبِهِ وَجَحَدَ بِلِسَانِهِ، أَمَّا مَنْ عَرَفَ بِقَلْبِهِ كونهُ حُكْم الله وَأقَرَّ بِلِسَانِهِ كونهُ حُكْم الله إلاَّ أَنَهُ أَتَى بِمَا يُضَادُّهُ فَهُوَ حَاكِمٌ بِمَا أَنْزَلَ الله تَعَالى وَلَكِنهُ تَارك لَهُ فَلا يَلْزَمُ دَخُولُهُ تَحْتَ هَذِهِ الآيَة، وَهَذَا هُوَ الجَوَابُ الصَحِيحٌ وَالله أَعْلَم) واتە: عیکرِمە گوتوویەتی: خوا کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، مەبەست پێی کەسێکە وێڕای ئیش پێنەکردنی ئایەتەکان، بە دڵیش بڕوای پێیان نیەو بە زمانیش نکوولێیان لێدەکات، دەڵێ: بەڵام کەسێك کە بە دڵ حوکمی خوا بناسێو بزانێ ئەوە حوکمی خوایەو پێی ڕاست بێ، وە بە زمانیش دانی پێدابێنێو بڵێ: ئەوە بەرنامەی خوایەو ڕاستو تەواوە، بەڵام بە کردەوە پێچەوانەی ئەوە ڕەفتار بکات، ئەوە لە ڕاستییدا بە دڵو بە زمان حوکمی بەوە

کردوە کە خوا ناردوویەتە خوارو، تەنیا بە کردەوە وازی لێهێناوە، بۆیە ناچێتە ژێر هەڕەشەی ئەم ئایەتەوە، وە بە کافر لە قەڵەم نادرێ، (ئیمام فەخرەددینی ڕازی دەڵێ:) وە ئەوەش وەڵامی ڕاستەو خواش زاناترە.

دیارە منیش تا ڕاددەیەك پشتگیریی ڕایەکەی دەکەم، بەڵام بەتەواوییش نا!!

بەڵام پێش ئەوەی ڕای خۆم بنووسم، ئەم دەقە دێنم، کە دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم سێ ئایەتەن: ﴿عَنْ حُذَيْفَةَ أَنَّ الآياتِ الثَّلاث ذكرت عِنْدَهُ، فَقَالَ رجلٌ: إِنَّ هَذَا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَقَالَ حُذَيْفَةُ: (نِعْمَ الإِخْوَةُ لَكُمْ بَنُو إِسْرَائِيل، إِنْ كَانَ لَكُمْ كُلَّ حلوَة، وَلَهُمْ كُلَّ مُرَّة!! كَلا وَاللهِ لِتَسْلُكُنَّ طَرِيقَهُمْ قِدَى الشِّرَاك)﴾ {أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٣٢١٨)، وقال صحيح الإسناد ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي}[(١)]، واتە: ئەو سێ ئایەتە لە لای حوزەیفە خوێندرانەوە (کە باسی ئەوە دەکەن، کە کەسێك حوکم نەکات بەوەی خوا ناردوویەتە خوار، کافرن، ستەمکارن، لاڕێن) پیاوێك گوتی: ئەوە دەربارەی جوولەکەکان هاتۆتە خوارێ، حوزەیفەش گوتی: بەنی ئیسرائیل باشترین بران بۆ ئێوە، ئەگەر هەموو شتێکی شیرین بۆ ئێوەبێ و، هەموو شتێکی تاڵیش بۆ ئەوان بێ!! (یانی: ئەگەر هەردووکتان پێکەوە گوناهێك بکەن، ئێوە لەسەری سزا نەدرێن و، ئەوان لەسەری سزا بدرێن، یان ئەوان پێی کافربن و، ئێوەش تەنیا پێی گوناهباربن) دوایی گوتی: نەخێر سوێند بە خوا ئێوەش بە ڕێی ئەواندا دەڕۆن، چۆن لاسکی نەعل ڕێك بە نێو پەنجەکان دادێ، ئێوەش ڕێك بەوێدا دەڕۆن، چ سزایەك بۆ وان هەیە، هەمان سزاش بۆ ئێوە هەیە، (کە بێگومان ڕایەکەی زۆر جوانە).

جا من بەڕاستیی دوای ئەوەی دەربارەی ئەو سێ ئایەتە، زۆر تەماشای تەفسیرەکانم کرد، گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە لەو چەند خاڵەدا دەینووسم، وە شایانی باسیشە کاتی خۆی لە بەرگی چوارەمی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یشدا ئەو ڕایەم خستۆتە ڕوو، ئەگەر کتومت واش نەبێ، هەروەها لە بەرگی (٣)ی کتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله)، کە لە زیندانی ئەمریکییەکاندا نووسیوومە، لەوێشدا باسم کردوە:

---

١) روح المعاني: ج٣، ص٤٤٤.

## بیروڕاو هەڵوێستم لە بارەی حوکمی کەسێکەوە، کە حوکم بە بەرنامەی خوا ناکات:



١/ ئاشکرایە کە ئەو چوار ئایەتە لە سیاقێکدا هاتوون کە باسی جوولەکەکان دەکات، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەشدا دیارە، کەواتە: ڕاستە ئەو ئایەتانە لەبارەی جوولەکەکانەوە هاتوون.

٢/ بەڵام بێگومان بەپێی بنچینەی (إِنَّ خُصُوصَ السَّبَبِ لايَمْنَعُ شُمُولَ الـمَعْنَى) واتە: تایبەتمەندبوونی هۆکاری هاتنە خوار، ڕێگا ناگرێ لە گشتگیریی واتایەکەی، یانی: ئایەتێك دەربارەی کافرێك، جوولەکەیەك، نەصرانییەك هاتۆتە خوار، بەڵام ماناکەی گشتییە، تایبەتمەندبوونی هۆکار ڕێ ناگرێ لە گشتگیربوونی واتا، کەواتە: مسوڵمانانیش دەگرێتەوە، ئنجا بە لای زۆربەی زانایانیشەوە (شَرْعٌ مِن قَبلنا شَرْعٌ لَنَا إِذَا حُكِيَ مُقَرَّراً وَلَمْ يُنْسَخْ) وەك (جمال الدين القاسمي) لە (محاسن التأويل)[١] هێناویەتی، واتە: بەرنامەو شەریعەتی پێغەمبەرانی پێشوو کە بۆمان دەگێڕدرێتەوە، بەرنامەی ئێمەشە بە مەرجێك کە بۆمان دەگێڕدرێتەوە، وەك دان پێداهێنان بۆمان بگێڕدرێتەوەو نەسخ نەکرابێتەوە، لێرەشدا خوای پەروەردگار وا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾ ﴾، ئەگەر گریمان مەبەست پێی ئەوانیش بێ، بەڵام بەرنامەی ئێمەشە، ئەوە ڕای زۆربەی هەرە زۆری زانایانە، بەڵکو من پێمـوایە دەبوو ڕای هەموو زانایان وابووایە، بۆچی؟ چونکە وانەبێ خوای کاربەجێ بۆچی بەسەرهاتی پێغەمبەران بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە؟ بۆچی لە سوورەتی (الأنعام)دا دوای ئەوەی ناوی هەژدە لە پێغەمبەران دێنێ، دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ هَدَى ٱللَّهُ فَبِهُدَىٰهُمُ ٱقْتَدِهْ ...﴿٩٠﴾ ﴾، واتە:

---

١) ج ٦، ص٢١٩.

ئەوانە کەسانێکن خوا ڕێنمایی کردوون، تۆش بە دوای ڕێنمایی وان بکەوە.

کەواتە: پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ خوا مولزەمی کردوە، کە بە دوای ڕێبازی پێغەمبەران بکەوێ، وە ئەو بەرنامانەی کە لە خواوەش هێناویانن بە مەرجێك بزانین نەگۆڕدراون و نەسخ نەکراونەوە، لەڕاستییدا بە هی ئێمەش دادەنرێن، جگە لەو حوکمە شەرعییانەی کە دەزانین، تایبەتن بە خەڵکی ئەو ڕۆژگارانەوە بۆ وێنە: خوای کاربەجێ هەندێ شتی لەسەر جوولەکەکان قەدەغە کردوە، بە هۆی لادان و سەرپێچییانەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ ﴾ النساء، واتە: بە هۆی ستەمکردنی جوولەکەکانەوە شتی هەندێ خۆش و بە تاممان لێ قەدەغەکردن، وە بە هۆی ئەوە کە زۆر خەڵکیان لە ڕێی خوا لادەدا، ئەو کاردانەوە بووەو جیایە، بەڵام ئەویدیکە لە جێی خۆیەتی.

٣/ لە نێوان ڕای خەواریج کە دەیانگوت: (كُلُّ مَعْصِيَةٍ كُفْرٌ) واتە: هەر کەسێك گوناهێکی گەورە بکات پێی کافر دەبێ، بەڵکو هەندێکیان فەرقی گوناهی گەورەو گچکەشیان نەکردوەو گوتوویانە: هەموو گوناهێك گەورەیە، وە هەموو گوناهێکیش کوفرە، لەگەڵ ئەو ڕایەی مورجیئەدا کە گوتوویانە: (لا كُفْرَ إلاَّ الكُفر الإعتقادِي وَاللِّسَانِي)، واتە: ئینسان تەنیا کاتێك کافر دەبێ، کە بە دڵ کافربێ و بە زمان دانی پێدابێنێ، بەڵام کردەوەی خراپیان بە کوفر دانەناوە، گوتوویانە: کردەوە بەشێك نیە لە ئیمان، وە ئینسان هەرچەندە گوناهان بکات، ئیمانەکەی زەرەری پێناگات: (لا تَضرُّ مَعَ الإيمانِ مَعْصِيَةَ) بەڵێ دەڵێین: لە نێوانی ئەو دوو ڕایەدا، هی خەواریج کە تێیان پەڕاندوون، مورجیئەش کورتیان هێناوە، ڕای ڕاست ئەوەیە: کە هەموو گوناهێك کوفر نیە، وەك خەواریج دەڵێن، بەڵکو هەندێك لە گوناهەکان کوفرن، وە کافربوونیش تەنیا بە دڵ و بە زمان نیە، وەك مورجیئە دەڵێن، بەڵکو هەندێك لە کردەوەکانیش کوفرن، (ئەو مەسەلەیە ئێستا کێشەی زۆر لەسەرە لە نێوان خەڵکی ئیسلامیی دا، کە هەندێکیان تێدەپەڕێنن و هەندێکیان کورت دێنن)

ئنجا با تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین:

١- لە سوورەتی (البقرة) ئایەتی (١٠٢)دا دەفەرمویٚ: ﴿...وَلَٰكِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ ٱلنَّاسَ ٱلسِّحۡرَ ...﴿١٠٢﴾﴾، واتە: شەیتانەكان بێبڕوا بوون، كە خەڵكیان فێری جادوو دەكرد، كەواتە: خەڵك فێری جادوو كردن، كە كردەوەیەكە، بووەتە هۆی كافربوون.

٢- لە سوورەتی (التوبة) ئایەتی (٦٦)دا خوای زاناو شارەزا لە سیاقێكدا كە باسی مونافیقەكان دەكات، دەفەرمویٚ: ﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ ...﴿٦٦﴾﴾، واتە: ئەگەر لێیان بپرسی: ئەو قسانە چین دەیانكەن؟! دەڵێن: هەروا قسەی ڕێگەمان دەكردو بە گاڵتەو گەمە قسەمان دەكرد، پێیان بفەرموو: ئایا گاڵتە بە خواو بە ئایەتەكانی خواو بە پێغەمبەری خوا دەكەن؟! پاساو مەهێننەوە، دوای ئیمانەكەتان كوفرتان كردوە. كەواتە: هەندێك لە كردەوەكانیش ئینسان كافر دەكەن، یەكێك لەوانە گاڵتەكردن بە دینی خوا، یاخود بە خواو، بە ئایەتەكانی خواو، بە پێغەمبەری خوا صەلاتو سەلامی خوای لەسەر.

٣- لە سوورەتی (النور) ئایەتی (٤٧)دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا ثُمَّ يَتَوَلَّىٰ فَرِيقٞ مِّنۡهُم مِّنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ وَمَآ أُوْلَٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٤٧﴾﴾، واتە: وە ئەوانە دەڵێن: ئیمانمان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەرو، وە ملكەچو فەرمانبەریشین، كەچی دوایی كۆمەڵێك لەوان دوای ئەوە پشت هەڵدەكەن، وە ئەوانە ئیماندارنین. هەرچەندە بە زمانیش گوتوویانە: ﴿ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ﴾، بەڵام مادام بە كردەوە پابەند نەبوونەو، پشتیان لە شەریعەت كردوە خوای پەنهانزان دەفەرمویٚ: ئەوانە ئیماندارنین.

٤/ بۆیە پێم وایە پێویست ناكات ئایەتەكان لە مانای ڕواڵەتیی خۆی لابدەین، چونكە ڕستەی: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾،

زۆر گشتییە: هەر کەسێك حوکم نەکات بەوەی خوا ناردوویەتە خوار ئا ئەوانەن بێبڕوایانن، ئەم ڕستە قورئانییە سەرجەم ئەوانە دەگرێتەوە کە بەرنامەی جیا لە ئیسلام دێنن، وە بێگومان هەر کەس لە حوکمڕانان سیستەمێکی حوکمڕانیی غەیری ئیسلام تەبەننیی بکات، دیارە پێی لە ئیسلام چاکترە، یان بە لایەنی کەمەوە پێی وەك ئیسلامە، ئەوەش کوفرێکە یەکدەنگیی زانایانی لەسەرە، بۆیە پێویست ناکات بڵێین: ئەگەر بە دڵو زمانیش ئیسلامی قبوول نەبێ ئەوجار کافر دەبێ، وەك ڕای پێنجەم گوتی، کە لە عیکرەمەوە هاتوە، ئێمە دەڵێین: نەخێر، چونکە ئایەتەکە باسی ئەوەی نەکردوەو ئەو تەفصیلاتەی تێدانیە، پاشان مەحاڵیشە حوکمڕانێك ئیسلامی پێ لە هەموو بەرنامەیەك باشتربێ، لە هەمان کاتیشدا کاری پێنەکات! بەڵکو دەڵێین: هەر کەسێك حوکمی نەکرد بە ئیسلام، ئەوە لەڕاستییدا وەك خوا دەفەرموێ: ئەوە لە ڕیزی کافران دایە. بەڵام ئایا لە هەموو حاڵەتدا حوکم نەکردن بە قورئان ئینسانی پێ کافر دەبێ؟ بێگومان نەخێر، ئەوە لە خاڵی پێنجەمدا ڕوونی دەکەینەوە.

٥/ ئەوەی کە بەشێك لە زانایانی ناچاری ئەو تەئویلانە کردوە، کاریگەریی هەندێك لە حوکمڕانانی مسوڵمانان بووە لەسەریان، کە بینیویانە کەمو زۆر بەشێك یان زۆر لە حوکمڕانان کەوتوونە ژێر فشاری ئارەزووەکانو گومانان (الشهوات والشبهات)و لە ئەنجامدا لە شەریعەتیان لاداوە، یان لە ژێر کاریگەریی تەماعو بەرتیل، یان لە ژێر کاریگەریی هەر هۆکارێکی دیکەدا، لە شەریعەتیان لاداوە، لەولاشەوە پابەندبوونە بە شەریعەتەوە بەگشتیو، واشیانزانیوە حوکمی ئەو ئایەتە دەیانگرێتەوە، بۆیە خۆیان ناچار بینیوە کە تەئویلی بکەن، بەڵام بێگومان لادان لە شەریعەتو کارپێنەکردنی لە مەسەلەیەكو دووان، یاخود لە چەند مەسەلەیەکی دیاریکراودا، مادام حوکمڕانەکە بەگشتی پابەندبێ بە شەریعەتەوە، ئەوە هەر بە گوناح دادەنرێو، بە کوفری گەورەو چوونە دەر لە بازنەی ئیسلام (كُفرٌ مخرجٌ عَنِ المِلَّة) دانانرێ. بەڵکو تەنیا گوناهێکی گەورەیە، بۆچی؟ چونکە وەك چۆن کەسێك دزیی، قەتڵ، زینا دەکات، مەی دەخواتەوە، کە هەر کام لەوانە گوناهێکی گەورەن، بە هەمان شێوەش کەسێك کە حوکم بە شەریعەتی خوا نەکات لە مەسەلەیەکدا، یان لە چەند

مەسەلەیەکدا، پێی کافر نابێ، مادام بەگشتی شەریعەتی تەبەننیی کردووەو پێوەی پابەندە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندییەك‌و لە ژێر زەختو فشارێك دا، یان لەبەر ئارەزوویەك لە چەند مەسەلەیەکدا لە شەریعەت لادەدات، دەڵێین: چەند گوناهێکی گەورەی کردوون، بەڵام کەسێك کە هەر لە ئەسڵدا شەریعەت تەبەننیی نەکاتو پێوەی پابەند نەبێ، بە نامسوڵمان‌و بە کافر لە قەڵەم دەدرێ‌و حیسابەکەیان جیایە.

٦/ ئەگەر یەکێك بڵێ: جا خۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکان، لادانی جوولەکەکان بووە لە یەك حوکمی شەریعەت، نەك لە هەمووی، واتە: هۆی هاتنە خوارەوەکەی ئەوەبووە، کە جوولەکەکان لە یەك حوکمی شەریعەت لایانداوە، نەك شەریعەتیان هەموو ڕەفز کردبێتو غەیری شەریعەتیان تەبەننیی کردبێ، ئەدی ئێمە لێرەدا چۆن وا دەڵێین؟!

دەڵێین: ڕاستە، بەڵام بە تێوەڕامانی سەرجەم دەقەکانی شەریعەت، دەزانین کە لادان لە شەریعەت لە حاڵەتی خۆ پێ گوناهبار بوون‌و ئینکاریی نەکردندا، کوفر نیە، وەك لە خاڵی پێنجەم دا (فخرالدین الرازي) لە عیکرِمەوە هێنای، واتە: کاتێك کەسێك لادەدات لە شەریعەت بە شێوەیەکی بەشیی (جزئي) بەڵام خۆی پێ گوناهبارەو ئینکاریی‌و نکووڵیی ناکات لە ڕاستیی یاساکانی شەریعەت ئەوە بەو هەڵوێستەی کافر نابێ، بە بەڵگەی ئەوە کە مسوڵمانان جاری وایە جەنگ پێکەوە دەکەن‌و یەکدیش دەکوژن، کەچی خوای میهرەبان هەر بە ئیماندار لە قەڵەمیان دەدات، وەك لە سوورەتی (الحجرات)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِن طَآئِفَتَانِ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱقۡتَتَلُواْ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَاۖ فَإِنۢ بَغَتۡ إِحۡدَىٰهُمَا عَلَى ٱلۡأُخۡرَىٰ فَقَٰتِلُواْ ٱلَّتِي تَبۡغِي حَتَّىٰ تَفِيٓءَ إِلَىٰٓ أَمۡرِ ٱللَّهِۚ فَإِن فَآءَتۡ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَهُمَا بِٱلۡعَدۡلِ وَأَقۡسِطُوٓاْۖ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٩ إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ إِخۡوَةٞ فَأَصۡلِحُواْ بَيۡنَ أَخَوَيۡكُمۡۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٠ ﴾، واتە: ئەو ئیماندارانەی کە پێکەوە شەڕ دەکەن‌و یەکدی دەکوژن...، کەواتە: ئەوانە لەو بوارەدا لە شەریعەت لایانداوەو کەچی خواش بە ئیماندار ناوی بردوون، یان دەفەرموێ: ﴿ وَمَا كَانَ

لِمُؤْمِنٍ أَن يَقْتُلَ مُؤْمِنًا إِلَّا خَطَـًٔا... ﴿٩٢﴾ النســاء، واتــە: هــیچ ئیمانداریێــك بـۆی نیـە ئیمانداریێك بكـوژێ، مەگەر بە هەڵە لە دەستی بكــوژرێ، بـەڵام ئـەوان لێرەدا بـە ئانقەسـت یەكـدی دەكوژن، كەواتـە: لێـرەدا لـە شـەریعەت لایـانداوە، بـەڵام خـوا بـە ئیمانــدار لـە قەڵـەمی داون، بۆچـی؟ چونكـە خوێنـی یەكدی بـە حــەڵاڵ نازانــن، شـەڕەو تووڕەبوونەو خۆشیان پـێ هەڵـەو گوناهبـارە، جاری وایـە كەسـێك زۆر تـووڕە دەبــێ دەڵــێ: پێشــی كافر بم ئـەو ئیشــە هـەر دەكـەم، یان هەیە دەڵـێ: وەڵڵاهـی ئەگەر خـوا جەهەننەمم بۆ دابخات ئـەو شـتە هـەر دەكەم، واتـە: دەزانــێ گوناهــەو حەرامـە، بـەڵام شــەیتان و نـەفس بەسـەریدا زاڵ بوونـە، بەڵام ئەگەر ئـەو گوناهو حەرامەی پـێ حـەڵاڵ بـێ و بـە حەڵاڵـیی بیكـات، ئـەوە دیـارە پێـی كـافر دەبـێ.

ئنجا خــوای پــەنهانزانیش زانیویــەتی كــە جوولەكــە نكوولــیی لــە ڕاســتیی شــەریعەت دەكەن، وە بە هـۆی نكوولیی لێكردنەكەیانـەوە، وێـرای ئیشـپێنەكردنی شــەریعەت، بـەوە كـافر بـوون، كەواتـە: ڕەفـزی كـۆی شــەریعەت بـە تەبـەننیی نەكردنی لە ژیاندا، یاخود نكوولیی لێكردنی حوكمێكی شـەریعەت، لەگەڵ ئیـش پێنـەكردنی دا، ئـەو دووانـە سـەر دەكێشــن بـۆ كوفــری گـەورەو دەرچـوون لـە بازنـەی ئیسـلام.

٧/ یەكێــك بـۆی هەیــە بڵـێ: باشــە بۆچـی خــوا لـە ئایـەتی یەكەمـدا دەفـەرمویٚ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾، وە لــە هــی دووەمدا دەفەرمویٚ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾، وە لــە هــی ســێیەمدا دەفــەرمویٚ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾؟

دەگونجـێ بە چەند شێوەیەك وەڵامی ئەو پرسـیارە بدەینــەوە:

**یــەك**: دەڵێیــن: حـوكم نـەكردن بـە شــەریعەت لـە ڕووی پەیوەنـدیی هـەبوونی حوكم نەكـردن بـە شـەریعەتەوە، بـە خـواوە، ئـەو كـردارە بـە كوفر دادەنـرێ،

چونكە كەسێك حوكمی خوا ڕەت بكاتەوە، مانای وایە ئیماندارنیەو واش لە ئیماندار ناوەشێتەوە، وە لەڕاستییدا ئەگەر سەرنج بدەینە ئەو ڕستەیەی كە دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾، سیاقی تێدا هاتنی ئەو ڕستەیە، ئاوایە: ﴿... فَلَا تَخْشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنًا قَلِيلًاۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾، كەواتە: لێرەدا جۆرێك لە نكوولیی لێكردنو ڕەتكردنەوەی شەریعەتی خوا لە ئارادایە، لەو حاڵەتەدا دیارە ئینسان بە كافر لە قەڵەم دەدرێ.

**دوو**: دەڵێین: بە نسبەت ڕستەكەی دوای وی كە دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾، ئەویش لەم سیاقەدا هاتوە، ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ...﴾ واتە: باسی هەقی خەڵك دەكات، كە ئەگەر كەسێك دەستدرێژیی كردە سەر كەسێكو كوشتی، یان چاوی كوێر كرد، لووتی بڕی، یان گوێی بڕی، یان ددانی شكاند، یاخود برینداری كرد، دەبێ سزا بدرێتەوە، ئنجا ئیش نەكردن بە شەریعەت لەو بوارەدا، زوڵمو ستەمە، چونكە مافی خەڵك پێشێل دەكرێ.

**سێ**: وە لە ڕووی ڕەوشتییەوە ئەو ڕەفتارە بە لاڕێ بوون (فسق) دادەنرێ، ئەگەر تەماشای ئەو ڕستەیەش بكەین، كە دەفەرموێ: ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾، ئەویش سیاقی تێداهاتنی ئاوایە: ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ...﴾.

کەواتە: ئەوەی خوا لە ئینجیل ناردوویەتی زیاتر ئاراستەکردنی ڕەوشتیی و مەعنەویی یە، چونکە یاساکان لە تەورات دا هەبوون، دیارە هەر کەسێکیش لە ڕووی ئاکارو ڕەوشتەوە لابداتو حوکم بە شەریعەت نەکاتو بەپێی شەریعەت بەڕێوە نەچێ، ئەوە لاڕێ دەردەچێ.

بەڵام (الآلوسي) لە تەفسیرەکەیدا[1] بەم شێوەیە حیکمەتو هۆکاری ئەو تەعبیرە جیاوازانە دەخاتە ڕوو، دەڵێ:

١) (فَلإِنْكَارِهِم ذَلِكَ وَصَفُوا بِالكَافِرِين)، واتە: لەبەرئەوەی نکوولّیان کردوە لە حوکمی خوا بە کافر وەسفی کردوون.

٢) (وَلِوَضْعِهِم الحُكْمَ فِي غَيْرِ مَوْضِعِهِ، وَصَفُوا بِالظَّالِمِين)، واتە: وە لەبەرئەوەی حوکمی خوایان لە غەیری شوێنی خۆیدا داناوە، بە ستەمکار ناسێنراون.

٣) (وَلِخُرُوجِهِم عَنِ الحَقِّ وَصَفُوا بِالفَاسِقِين)، واتە: وە لەبەرئەوەی لە هەق دەرچوون، بە لاڕێ (فاسق) ناوزەد کراون.

هەروەها (الآلوسي) لە هەمان سەرچاوەدا دەڵێ: (وُصِفُوا بِهَا بِاعْتِبَارِ أَطْوَارِهِم وَأَحْوَالِهِم المنضمّة إِلَى الإِمْتِنَاعِ عَنِ الحُكْم: فَتَارَةً كَانُوا عَلَى حَالٍ تَقْتَضِي الكُفْر، وَتَارَةً عَلَى أُخْرَى تَقْتَضِي الظُّلْمَ، أَو الفِسْقَ)، ئەویش نزیکە لە قسەی پێشوو، واتە: بەپێی حاڵەتە جۆراوجۆرەکانیان لەگەڵ ئەوەی کە ئیشیان بە شەریعەت نەکردوە، حاڵەتی جۆراوجۆریشیان هەبوون، جاری وایە حاڵەتیان وابووە کە خوازیاری ئەوە بووە کە ئەوانە بە کافر لە قەڵەم بدرێن، جاری وایە حاڵەتەکەیان وابووە بە زاڵم، یان فاسق، لە قەڵەم بدرێن.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ

١) روح المعاني: ج٣، ص٤٤٣-٤٤٤.

قِصَاصٌ ﴾، دیارە لەو تەوراتەدا کە ئێستا لەبەردەستمان دایە، واتە: لە پەیمانی کۆن ئەو حوکمە هەیە[1]، کە دەفەرمویٚ: هەر کەسێك کەسێکی کوشت دەبیٚ بکوژرێتەوە، تۆڵە بە تۆڵە بە گشتی، هەر کەسێك چاوی یەکێکی کوێر کرد، یان گوێی بڕی، یان لووتی بڕی، یان ددانی شکاند، دەبیٚ وەك وی لیٚ بکرێتەوە، دیارە سزای تۆڵەش بەو شێوەیە کە ئەم ئایەتەیە دەفەرمویٚو هەموو زانایانیش لەسەر ئەوە یەکدەنگن، هەرچەندە ئایەتەکە لە سیاقێکدا هاتوە کە دەربارەی جوولەکەکان قسە دەکات، بەڵام هەموو زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە کۆکن کە لە ئیسلامیشدا ئەم ئایەتە ئەسڵە بۆ تۆڵەسەندنەوە، بەڵیٚ لە ئیسلامدا ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت دەکوژرێتەوە، دیارە کوشتنەوەی خەڵك لە شوێنی دیکەشدا هاتوە، بەڵام بە شێوەی دیکە هاتوە، بۆ وێنە: خوا دەفەرمویٚ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَى ... ﴿١٧٨﴾ ﴾البقرة، کە ئەوەش کاتی خۆی باسمان کردوە بۆچی وادەفەرمویٚ؟ هۆکاری خۆی هەیە، بەڵام لێرەدا بەگشتی دەفەرمویٚ: ﴿ وَكَتَبۡنَا عَلَيۡهِمۡ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفۡسَ بِٱلنَّفۡسِ ﴾المائدة.

هەروەها هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر یەکێك چاوی یەکێك کوێر بکات، یان لووتی ببڕێت، یان گوێی ببڕیٚ، یان هەستی بیستنی لە کار بخات، یان دەستی ببڕیٚ، یان ئێسقانی بشکێنیٚ... هتد، ئەوە وای لێدەکرێتەوە، کەواتە: ئەو ئایەتە ئەسڵە لە بواری تۆڵەو سزادا.

---

١) بڕوانە: التفسير التطبيقي للكتاب المقدس، العهد القديم، سفر الخروج، الإصحاح: ٢١، (أحكام مُختصَّة بالقاتل والمتعتدي)(... نفساً بنفس، وَعَيْناً بِعَيْن، و سِنّاً بِسن، ويداً بِيَدٍ، و رجلاً بِرْجِلٍ، و كيّاً بكيٍّ، و جُرحاً بجُرْحٍ، و رِضّاً بِرَضٍّ..)، ص ١٧٥، ١٧٦.

# ئێستاش با لەوبارەوە ئاماژە بە قسەی هەندێک لە زانایان و چەند فەرموودەیەکیش بکەین

١/ (الحسن البصري) لێی گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: (هِيَ عَلَيْهِم وَعَلَى النَّاس عَامَّة) (رَوَاهُ إِبْنُ أبي حاتم)، واتە: ئەو ئایەتە بۆ جوولەکەکانو بۆ تێکڕای خەڵکە.

٢/ (حكى الإمام أبو منصُور بن الصباغ في كتابه (الشامل) اجتماع العُلَمَاء على الإحتجاج بِهَذِهِ الآيـة على مَا دَلَّت عَلَيْهِ)، واتە: ئەبومەنصوری کوڕی صەبباغ لە کتێبی خۆیدا بە ناوی (شامل) گوتوویەتی: هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە بەڵگە بەم ئایەتە بێننەوە، لەسەر ئەوەی کە دەلالەتی لەسەر دەکات، کە بریتیە لە تۆڵەسەندنەوە.

٣/ (إبن كثير)یش دەڵێ: (احْتَجَّ الأَئِمَةُ كُلُّهُم عَلَى أَنَّ الرَّجُلَ يُقْتَلُ بِالْمَرأَةِ بِعمُومِ هَذِهِ الآيَـةِ الكَرِيمَة)[١]، واتە: هەموو پێشەوایان ئەوەیان بە بەڵگە هێناوەتەوە لەسەر ئەوە کە ئەگەر پیاوێك ئافرەتێکی کوشت پێی دەکوژرێتەوە، بە چەمکی گشتی ئەم ئایەتە بەپێزە.

هەڵبەتە وێڕای ئەم ئایەتە لە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەریشدا ﷺ سزای تۆڵە هاتوە، بۆ وێنە: ﴿كَتَبَ رَسُولُ الله مَعَ عَمْرِو بْنُ حَزْمٍ إلى أَهْلِ اليَمَنِ كِتَابَاً .. هَذِهِ نسخَتُها: من محمد النَّبيّ إلى شُرَحْبِيلُ بْنُ عَبْدِ كُلال، ونُعيم بْنُ عَبْدِ كَلال، والحارث بن عبد كلال و قَيْلِ ذِي رُعَيْن، وَمُعَافِرَ وَهَمْدَانَ أَمَّا بَعْدُ: وَكَانَ فِي كِتَابه: وَإِنَّ مَنْ اعْتَبَطَ مُؤْمِنًا قَتْلا عَنْ بَيّنَةٍ فَإِنّهُ قَوَدٌ بِهِ إِلاَّ أَنْ يَرْضَى أَوْلِيَاء الْمَقْتُول، وَإِنَّ فِي النَّفْسِ: الدِّيـة مِائَة مِنَ الإِبْلِ وَفِي الأنف إِذَا أوعب جَدْعه" الدِّيـة، وَفِي اللِّسَانِ: الدية، وَفِي الشَفَتَين: الدية، وَفِي البَيضتَين: الدية، وَفِي الذكر:

١) محاسن التأويل: ج٤، ص٢١٩.

الدية، وَفِي القلْب الدية، وفي العَينين: الدية، وفي الرجل الواحدة: نصف الدية، وَفِي المأمومة: ثلث الدية، وفي الجائفة: ثُلُث الدية، وفي المنقلة: خمس عشرة من الإبل، وفي كل أصبع من أصابع اليد والرجل: عشر من الإبل، وفي السن: خمس من الإبل، وفي الموضحة: خمس من الإبل، و إن الرجل يقتل بالمرأة وَعَلَى أَهل الذهب أَلف دينار}(١).

واته: پێغەمبەری خوا ﷺ نامەیەكی نووسی لەگەڵ عەمری كوڕی حەزم بۆ خەڵكی یەمەن، (دەربارەی سزادانی كەسانێك كە دەستدرێژیی دەكەنە سەر خوێنی خەڵك، كە دیارە لەوێ كێشە هەبووە) دەڵێ: لە موحەممەد پێغەمبەرەوە بۆ شورەحبیلی كوڕی عەبدوكولالو نوعەیمی كوڕی عەبدوكولالو حاریسی كوڕی عەبدوكولالو قەیلی زی ڕوعەین، وە مەعافیرو هەمدان (ئەوانە دیارە عەشیرەتن) دوای ستایش بۆ خوا:

هەر كەسێك بە ناهەق ئیماندارێك بكوژێ بەڵگەی لەسەربێ، ئەوە پێی دەكوژرێتەوە، مەگەر كەسوكاری كوژراوەكە ڕازی بن، (واتە: ڕازی بن نەیكوژنەوە، یان ڕازی بن بە خوێن) وە هەر كەسێك كەسێك بكوژێ، سەد حوشتر خوێنیەتی، وە كەسێك لووتی كەسێك ببڕێ، ئەگەر بە تەواویی بڕیبی، ئەوە خوێنی تەواوە (كە سەد حوشترە)، وە هەر كەسێك زمانی كەسێك ببڕێ، خوێنی تەواوی هەیە، وە هەر كەسێك دوو لێوی كەسێك ببڕێ، خوێنی تەواوی هەیە، وە كەسێك دوو هێلكە گونی كەسێك ببڕێ، یان بیخەسێنێ، خوێنی تەواوی هەیە، وە كەسێك ئەندامی نێرینەی كەسێك ببڕێ، خوێنی تەواوی هەیە، وە كەسێك پشتی كەسێك بشكێنێ، خوێنی تەواوی هەیە، وە كەسێك هەردوو چاوی كەسێك دەربێنێ، خوێنی تەواوی هەیە (دیارە ئەگەر چاوێك بێ نیوە خوێنە)، وە كەسێك لاقی كەسێك ببڕێ، نیوە خوێن هەیە، (باسی دەستی نەكردوە، چونكە دەستیش هەر وایە) وە برینێك گەیشتبێتە سەر مووخ، یەك لەسەر سێی خوێن هەیە، وە كەسێك برینێك لە كەسێك بكات ئەودیو بووبێ (واتە: گەیبێتە بە تاڵایی و بۆشایی) یەك لەسەر سێی خوێنی هەیە، وە كەسێك برینی لە كەسێك كردبێ (دەستی یان لاقیو)

١) سيرة إبن هشام: ج٤، ص٢٤١، محاسن التأويل: ج٤، ص٢٢١-٢٢٢.

ئێسقانەکەی لابردبێ لە جێی خۆی (واتە: شکاندبێتی) ئەوە پازدە حوشتر خوێنیەتی، وە بۆ هەر پەنجەیەك لە پەنجەکانی دەستو پێ، دە حوشتر هەیە، وە هەر کەسێك ددانی کەسێك بشکێنێ، خوێنی پێنج حوشترە، وە برینێك کە (هێندە قوولْ بێ) ئێسقانەکەی دەربخات، پێنج حوشتر خوێنیەتی، وە پیاویش بە ئافرەت دەکوژرێ، (پیاوێك ئافرەتێك بکوژێ پێی دەکوژرێتەوە، چونکە لە سەردەمی نەفامیی دا وانەبووە، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ باسی کردوە، وە خوای دادگەریش فەرموویەتی: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ ﴾ المائدة، جونکە کاتی خۆی وانەبووە، پێیان سەیر بووە! جا چۆن دەبێ پیاو لە بەرانبەر ئافرەتدا بکوژرێ؟ ئەوە ئیسلام دایهێناوە) وە ئەوانەی کە زێڕدارن، لە جیاتی سەد حوشتر، خوێنەکەیان هەزار دینارە.

هەروەها لەوبارەوە ئەو فەرموودەیەش هەیە، کە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿الْمُؤْمِنُونَ تَتَكَافَأُ دِمَاؤُهُمْ، وَهُمْ يَدٌ عَلَى مَنْ سِوَاهُمْ، وَيَسْعَى بِذِمَّتِهِمْ أَدْنَاهُمْ، أَلاَ لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ، وَلاَ ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ، مَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا فَعَلَى نَفْسِهِ، وَمَنْ أَحْدَثَ حَدَثًا أَوْ آوَى مُحْدِثًا فَعَلَيْهِ لَعْنَةُ اللهِ وَالْمَلاَئِكَةِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد بِرقم: (٤٥٣٠)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٤٧٣٤)، وَالحَاكِمُ بِرقم: (٢٦٢٣)، وَأَحْمَد بِرقم: (٩٩١)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سُنن أبي داود)}، واتە: ئیمانداران خوێنیان یەکسانە (خوێنی کەس لە هی کەس گرانتر نییەو وەك یەکن) وە هەموویان یەك دەستن لە بەرانبەر غەیری خۆیاندا، وە بچووکترینیان دەتوانێ ئۆباڵی هەموویان بکێشێ (خەڵك پەنا بدات)، وە دروست نیە ئیماندار بە کافر بکوژرێ، هەروەها نامسوڵمانێك کە پەیمانی لەگەڵ مسوڵماناندا هەیە نابێ بە کافر بکوژرێ، {دیارە ئەو کافرە مەبەست پێی کافری سەنگەرە، واتە: کافرێك کە دوژمنەو سەنگەری لە مسوڵمانان گرتوە، ئەگەر مسوڵمانێك کوشتی، پێی ناکوژرێتەوە، وە نامسوڵمانێکیش کە پەیمانی لەگەڵ مسوڵماناندا هەیەو لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیی دایە، ئەگەر کافرێکی جەنگی بکوژێ، پێی ناکوژرێتەوە، هەڵبەتە هەندێکیان گوتوویانە: (لاَ يُقْتَلُ مُؤْمِنٌ بِكَافِرٍ) واتە: بەگشتی، بەڵام ئەوە کە دەفەرموێ: (وَلاَ ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ)

ڕێمان لێدەگرێ لەو بۆچوونەو، بۆمان دەردەخات کە لێرەدا مەبەست لە هەموو جۆرە کافرێك نیەو مەبەست پێی کافری جەنگییە} وە هەر کەسێك کەتنێك بکات زیانەکەی بۆخۆیەتی، {واتە: نابێ یەخەی بابو دایكو براو ئامۆزاو خزمو کەسی بگیرێ، جا دەبێ وشەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا ورد بکەینەوە، چونکە عورفو باوی نەفامیی ئاوا بووە، ئێستاش هەر وایە ئەگەر کابرا کەسێك بکوژێ، دەچن برای، یان بابی، یان ئامۆزای دەکوژنەوە، کە ئەوە هیچی لە شەرعدا نیە} وە هەر کەس کەسێك بکوژێ، یان بکوژێك پەنا بدات، ئەوە نەفرینی خواو فریشتەکانو تێکرای خەڵکی لەسەرە.

ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ ڕای وایە مەبەست لە کافر لێرەدا، کافری جەنگییە، دیارە منیش هەر ڕام وایە، بە بەڵگەی ڕستەی دوایی کە دەفەرموێ: (وَلاَ ذُو عَهْدٍ فِي عَهْدِهِ) واتە: ئینسانی کافر کە پەیمانی لەگەڵ مسوڵمانانda هەیە نابێ لە بەرانبەر کافرێکدا بکوژرێ، ئەگەرنا کافر بە کافر دەکوژرێ، بەڵام کافرێکی لاشەڕی هاووڵاتیی بە کافرێکی جەنگیی سەنگەر لە ئیسلام گرتوو ناکوژرێ، ئەگەرنا کافرو کافر هاوکوفن، دیارە ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا، تەفسیری سووڕەتی (البقرة)، وە لە بەرگی سێیەمدا تەفسیری سووڕەتی (النساء)، بە درێژیی باسی قەتڵو تۆڵەو ئەو مەسەلانەمان کردوە، کە پێیانەوە پەیوەستن، بۆیە لێرەدا بەوەندە لێی دەگەڕێین.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡجُرُوحَ قِصَاصٌ ﴾، واتە: برینەکان تۆڵەیان هەیە، (أي مُقَاصةٌ، أو ذَوَاتُ قِصَاصٍ) یانی: هەر جۆرە برینێکی دیکە، ئەو کەسەی برینی تێکراوە، بۆی هەیە ئەو برینەی تێ بکاتەوە، هەڵبەتە شەرعزانان لێرەدا وردەکارییان کردوە لە کتێبەکاندا، دەڵێن: ئەگەر مسۆگەرو دڵنیا نەبێ ئەو ئەندازەیەی پێ بریندار دەکرێتەوەو ڕەنگە زیاتربێ، ئەوە دەبێ ببژێردرێو پارە وەربگرێ لە بەرانبەریدا، بەڵام ئەوەی کە دیاربێ بۆ وێنە: چاوی کوێر کردوە، گوێی بڕیوە، لووتی بڕیوە، یان دەستی شکاندوە، یان ئێسقانی دەرخستوە، ئەوانە دیارنو دەتوانێ تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە، دیارە برینێك کە کەسەکە پێی نەمردوە، بەڵام ئەگەر دڵنیا نەبێ کە ئەگەر ئەویش برین لەو بکات،

پێی نامرێ، ئەو كاتە دروست نیە برینداری بكاتەوە، بەڵكو دەبێ هەندێ پارە لە بەرانبەری وەربگرێ، چونكە ئەگەر كوشتی، دوایی تۆڵەی دەكەوێتە سەرێ، ئەگەر لە بەرانبەر برینێكدا بیكوژێ، تۆڵەی دەكەوێتە سەرێ، نابێ بڵێ: من برینی خۆمی تێدەكەم كەیفی خۆیەتی با بمرێ! چونكە ڕەنگە ئەو جەستەی بەهێزتر بێ، یان ئەو زێدەڕۆیی لە برینداركردنەكەدا بكات... هتد.

**مەسەلەی هەشتەم**: كە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ﴾، هەر كەسێك نەفەری لێ دەكوژرێ، یان كەمئەندام دەكرێ، یان برینی تێدەكرێ، یاخود ئەزیەتی پێدەگەیەنرێ، بڵێ: ئەوە لێی خۆشبوومو كردم بە خێرو چاكە، لە كوردەواریی خۆماندا ئەوە زۆرە، جاری وایە نەفەر نەفەری كوشتوە، دەچن بۆ لای بابی، یان مامی، یان ڕیش سپییەكیان دەڵێ: ئەوە بەخشیم بە مەجلیس، زۆر پیاوی وا جوامێرو بەخشندە هەبوون، كەواتە: ﴿ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ﴾، واتە: هەر كەسێك لە هەقی خۆی خۆشبێ، ئەوە دەبێتە مایەی سڕانەوەو پاكبوونەوەی، لەوبارەوەش ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مَنْ تَصَدَّقَ عَنْ جَسَدِهِ بِشَيْءٍ كَفَّرَ اللهُ تَعَالَى عَنْهُ بِقَدْرِ ذُنُوبِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٢٧٩٤) وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٢٧٣) وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: صحيح بشواهده}، واتە: عوبادەی كوڕی صامیت خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك بە جەستەی خۆی چاكەیەك بكات، خێرو صەدەقەیەك بكات، خوای بەرز بە ئەندازەی ئەوە گوناهەكانی لێ دەسڕێتەوە، بۆ وێنە: یەكێك زللەیەكی لێدراوە، دەڵێ: من ئەو زللەیەی لێنادەمەوە لەبەر خوا، چونكە مەرج نیە هەر برینی تێبكات، بەڵێ هەمیشە شەریعەت پێی خۆشە لای لێبوردنو سەماحەتو بەخشندەیی بگیرێ.

هەڵبەتە ئەوەش بە مەرجێك كە تەرەفی بەرانبەر پێی لەخۆبایی نەبێو زیاتر پێی یاخی نەبێ، ئەوجارە نەفەرێكی كوشتوە، جارێكی دیكە بیكاتە دوو نەفەر، نەخێر، ئەگەر زانرا پێی لەخۆبایی دەبێو زیاتر پێی لە ڕێ دەردەچێ، ئەوە لەڕاستییدا تۆڵەسەندنەوە باشترە لەو حاڵەتەدا، ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿ فَمَن

﴿ تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ﴾، زانایان دوو تەفسیریان بۆ كردوون:

١) هەندێك دەڵێن: (أي كفارة للمَجْنِيِّ) واتە: دەبێتە پاكبوونەوەو سڕانەوەی گوناهی ئەوەی كە تاوانەكەی بەرانبەر كراوە.

٢) هەندێكیش دەڵێن: (أي كفارة للجاني) واتە: دەبێتە پاكبوونەوەو سڕانەوەی گوناهی ئەوەی كە تاوانەكەی ئەنجام داوە، مادام خاوەن هەق لە هەقی خۆی خۆشبێ، تاوانبارە گوناهی لادەچێ، چونكە مافی خەڵك (حق الناس)ە، ئەو خەڵكە كە لە هەقی خۆی خۆشبوو، خوای بە بەزەییش ئەوەی لەسەر لادەباو پاكی دەكاتەوە، بەلام زیاتر وا پێدەچێ مەبەست پێی ئەوە كەسە بێ كە چاوپۆشیی دەكات، واتە: ئەو كەسەی كە تاوانەكەی بەرانبەر كراوە.

**مەسەلەی نۆیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ﴾، جێی سەرنج ئەوەیە كە خوا ﷻ بۆ هەر كام لە عیساو لە ئینجیل ئەو رستەیەی بەكارهێناوە: ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ﴾، ئەوە بۆچییە؟ بۆ ئەوەیە كە هەموو لایەك بزانن كە هەم پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) پێغەمبەرانی پێش خۆیان بە راست دەزانن، وە هەم كتێبەكانی خوا یەكدی بە راست دەزانن، وە عیسا كە پێغەمبەری كۆتاییە، پێش پێغەمبەری خۆمان، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿أَنَا أَوْلَى النَّاسِ بِابْنِ مَرْيَمَ، وَالأَنْبِيَاءُ أَوْلاَدُ عَلاَّتٍ، لَيْسَ بَيْنِي وَبَيْنَهُ نَبِيٌّ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (١٦١٧) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ}، واتە: من نزیكترین كەسم لە كوڕی مەریەمەوە، وە پێغەمبەران هەموویان لە باباێكن و دایكیان جیایە، وە لە نێوان منو عیسای كوڕی مەریەم دا هیچ پێغەمبەرێكی دیكە نەبووە.

جا عیسا ﷺ هەموو پێغەمبەرانی پێش خۆی بە راست داناوە، بە كتێبەكانیشیانەوە، بەلام لێرەدا باس باسی تەوراتە، بۆیە بەس باسی وی كراوە،

هەروەها ئینجیلیش تەوراتی بە ڕاست داناوەو، دیارە هەموو پێغەمبەرانیشی بەڕاست داناوە.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ﴾، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: باشە خوا لێرەدا فەرمان دەکات بە ئەهلی ئینجیل، بە شوێنکەوتووانی ئینجیل کە کار بەوە بکەن خوا تێیدا ناردوویەتە خوار، جا ڕەنگە نەصرانییەکانیش بڵێن: زۆر باشە! ئێمە ئیش بە ئینجیل دەکەین، بۆیە بڕوا بە مەحەممەد ناهێنین! بۆیە زانایان دەڵێن: نەخێر ئاوا نییە، دەبێ وردی بکەیەوە، ئنجا تێی دەگەی، کە دەفەرموێ: ﴿ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ﴾، واتە: با خاوەنانی ئینجیل ئیش بەوە بکەن خوا تێیدا ناردۆتە خوار، دیارە خوای کاربەجێ زۆر شتی لە ئینجیلدا ناردۆتە خوار، بەڵام بە تەئکید لێرەدا مەبەست شتێکی تایبەتە، ئەویش ئەوەیە کە دەربارەی موژدەدانی عیساو ئینجیل بە هاتنی پێغەمبەری کۆتایی مەحەممەدە ﷺ، لێرەدا مەبەست ئەوەیە، ئەگەرنا خوا دەیفەرموو: (وَلْيَحْكُم أَهْلُ الإِنْجِيلِ بِالإِنْجِيل)، بەڵام کە فەرموویەتی: ﴿ وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ ﴾، بەوەی کە خوا لەوێدا ناردوویەتە خوار، دیارە مەبەست پێی شتێکی تایبەتە، ئەگەرنا ئینجیل هەر هەمووی خوا ناردوویەتە خوار.

وە دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ، واتە: با خاوەنانی ئینجیل ئیش بەو ئینجیلە بکەن، بەو شێوەیە کە خوا ناردوویەتە خوارو بەو حەقیقەتانەی کە تێیدان، پێش ئەوەی دەستکاریی بکرێن و بگۆڕدرێن، ئەوەش هاندانی نەصرانییەکانە بۆ ئەوەی لە ئینجیل بکۆڵنەوە.

جا بۆ زانیارییتان من زۆر لە پەیمانی کۆن و نوێم کۆڵیوەتەوە، ئەو ئینجیلانەی کە لەبەردەستی نەصرانییەکان دان، بە تەئکید وشەی خوای پەروەردگاریان تێدا ماون، بەڵام پێموایە قسەکانی خوا زیاتر لە تەوراتدا ماون، وە من سێ نوسخەم لە تەورات (واتە: پەیمانی کۆن) لەلا بوو لە کاتی نووسینی کتێبی: (الإسلام

كما يتجلّى في كتاب الله)دا لە زیندانی ئەمریكییەكاندا، هەر سێكیان لێك جیاواز بوون، هەروەها ئەو ئینجیلانەی سەد ساڵ، یان پەنجا ساڵ پێش ئێستا چاپ كراون، بەراوردیان بكەی زۆر جیاوازییان تێدایە، وە هەر خودی ئەو چوار ئینجیلانەش بۆخۆیان جیاوازییان هەیە لە هەندێ شتدا.

وە ئینجیلی بەرنابا كە من لە لامە بەو شێوە باسی هەوڵی گرتنو لەخاچدانی عیسا دەكات، كە قورئان باسی دەكاتو دەڵێ: یەكێك لە قوتابییەكانی بووە كە لە خاچ دراوەو شێوەی عیسای چۆتە سەرو عیساش سەلامی خوای لێبێ بە كلاوڕۆژنەدا بەرزكراوەتەوە بۆ ئاسمان بە جەستەو ڕووحەوە، جا كاتێك ئینسان بەراوردی ئەو كتێبانە دەكاتو لێیان دەكۆڵێتەوە، زیاتر حەقیقەتی ئەو ئایەتەی بۆ دەردەكەوێ.

كەواتە: ئەو ئایەتە هاندەرێكە بۆ نەصرانییەكان، بۆئەوەی لێی بكۆڵنەوە، ئەوەی لە ئینجیلدا خوا ناردوویەتە خوار كامەیەو چییەو چۆنە؟ بە قووڵایی مێژوودا بچنەوەو سەرنجی نووسخەكانی ئینجیل بدەن، تاكو بۆیان دەربكەوێ ئەوانەی ئێستا هەن زۆر دەستكاریی كراونو گۆڕدراون.

وە بۆ زانیارییتان ئەو چوار ئینجیلەی ئێستا لە نێو حەفتا (٧٠) ئینجیل دا هەڵبژێردراونو تەبەننیی كراون بە ڕەسمیی، وە ئینجیلی (بەرنابا) بۆیە تەبەننیی نەكرا، چونكە باسی ئەوە ناكات كە عیسا عليه السلام كوڕی خوایە، بەڵكو دەڵێ: عیسا عليه السلام بەندەی خوایەو نێردراوی خوایە، وە لە سەردەمی (قسطنطين)ی قەیسەری ڕۆمدا ئەو بیرۆكەی سێ تۆخمەكان (الأقانيم الثلاثة) تەبەننیی كراو گوتیان: بە خواو عیساو ڕووح لقودوس، خوا پێكدێنن!! بەڵام ئینجیلی بەرنابا ئەو شتانەی تێدانین، بەڵكو دەڵێ: خوا خوایەو، عیسا عليه السلام بەندەو پێغەمبەری خوایەو، بە فووی خوا كە بە جبریلدا ناردوویەتی دروست بووە، ئنجا لەبەرئەوەی لەگەڵ سێكوچكە (ثالوث)ی ئەواندا تێكناكاتەوە، بۆیە ئەو ئینجیلەیان تەبەننیی نەكردووەو نادیدەیان گرتووە. □

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی دوازدەیەم



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە سێ ئایەت پێكدێ، لە ئایەتی (٤٨ - ٥٠) لەم سێ ئایەتە موبارەكەدا خوای كاربەجێ سەرەتا بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: وەك چۆن تەوراتو ئینجیلی بە مووساو عیسا صەلاتو سەلامی خوایان لەسەر بێ، داون، كتێبیشی بۆ تۆ ناردۆتە خوار، ئەویش قورئانە، وە ئەو قورئانە بە هەق نێردراوەتە خوار، وە بە ڕاستدانەری كتێبە پێشووەكانی پێش خۆیەتی، وە بەسەریشیانەوە چاودێرە، ئنجا فەرمان بە پێغەمبەر ﷺ دەكات، كە لە كاتی هەڵبژاردنی دادوەریی كردن لە نێوان خاوەن كتێبەكاندا، ئەگەر بۆ چارەسەری مشتومڕەكانیان هاتنە لای، دەبێ بە گوێرەی وەحی دابەزێنراوی خوا دادوەرییان لە نێواندا بكات، وە بە دوای ئارەزووەكانیان نەكەوێ، هەروەها خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ كە بۆ هەر كام لە ئۆممەتانی: جوو، دیان، مسولمان، بەرنامەو ڕێبازێكی سەربەخۆی ناردوە، لە وردەكارییەكاندا، وە ئەگەر ویستباشی دەیكردنە یەك كۆمەڵو، وە شوێنكەوتەی یەك بەرنامەو كتێب، بەڵام بە مەبەستی تاقیكردنەوە كردوونی بە ئۆممەتانی خاوەن كتێبو بەرنامەی جیا جیا، ئنجا دوایی خوا ﷻ فەرمان بە هەموویان، واتە: بە جووو دیانو مسولمانان دەكات، كە لە چاكەكارییدا پێشبڕكە بكەن، چونكە گەڕانەوەیان بۆ لای خوایە، وە هەواڵیشیان پێدەدا بەو شتانەی كە تێیاندا كەوتوونەتە ڕاجیایی یەوە.

پاشان لە ئایەتی دووەمدا جارێكی دیكە داكۆكیی دەكات لەسەر دادوەرییكردنی پێغەمبەر ﷺ لە نێوان خاوەن كتێبەكاندا، ئەگەر بۆ دادوەریی هاتنە لای، بۆ وریا بوون لە شوێنكەوتنی ئارەزووەكانیانو لادان لە شەریعەت، ئەگەر تەنیا لە یەك یاساشدا بێ، وە پێشیان ڕادەگەیەنێ كە پشت هەڵكردنیان لە حوكمی دادگەرانەی

خوا، مایەی سزاو تۆڵەی دنیایی خوایە بۆیان، لەسەر بەشێك لە گوناهەکانیان، دیارە مەبەست لەوە نیە کە مسوڵمانان سزایان بدەن، واتە: خوا بەڵایان بەسەر دێنێ، وە ڕاشیدەگەیەنێ کە زۆربەی خەڵکی لاڕێو لادەرن.

وە لە ئایەتی سێیەمو کۆتایی ئەم دەرسەدا خوا، ﷻ بە نکووڵیی لێکردنەوە دەفەرموێ: ئایا خاوەن کتێبە مل نەدەرەکان بۆ حوکمی پێغەمبەر ﷺ، حوکمی نەفامیی دەخوازن؟! وە دەفەرموێ: بێگومان حوکمی هیچ کەس لە هی خوا، بۆ ئیماندارانی لێکۆڵەرەوەو وردبووەوە باشترنیە.

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا
عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ
لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن
لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم
بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ
وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ
أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ
يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴿٥٠﴾ ﴾

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە کتێبمـان بە هـەق بـۆ لای تـۆ نـاردە خـوار، کتێبەکـانی پێـش خـۆی بەڕاسـت دادەنێ‌و بەسەریشیانەوە چاودێرە، دەجا بەوەی کە خوا دایبەزانـدوە، دادوەریـی یـان لـە نێوان (لـە نێـوان خـاوەن کتێبـە پێکـەوە ناکۆکەکـان)دا بکـەو شـوێن ئارەزووەکانیـان مەکـەوە، بـۆ هـەر کامێکتـان (لـە جـوو و دیـان‌و مسـوڵمانـان) بەرنامـەو ڕێبـازێکی تایبەتمان داناوە، وە ئەگەر خـوا ویسـتبای دەیکـردنە یەك کۆمـەڵ (وە یـەك کتێـب‌و بەرنامەی بۆ دەناردن) بەڵام ویستوویەتی بەهۆی ئەوەوە کـە (لە کتێـب‌و بەرنامەکـان) پێیـداون تاقیتـان بکـاتەوە، لـە ئەنجـامدانی چاکەکـاندا پێشـبڕکە بکـەن، چـونکە گەڕانەوەی هەمووانتـان بۆ لای خوایـەو هەواڵتـان پێدەدات، بەو شـتانەی کە تێیـاندا ناکـۆك‌و ڕاجیـا بـوون ﴿٤٨﴾ وە بـەوەی کـە خـوا ناردوویەتـە خـوار دادوەریـی یـان لـە نێواندا بکـەو شـوێن ئارەزووەکانیـان مەکەوە، وە لێیـان وریابـە کـە لـە بەشـێك لـەوەی خـوا بـۆ لای ناردوویـە خـوار لات نـەدەن، وە ئەگەر پشـتیان هەڵـکرد، ئـەوە بزانـەو دڵنیـابە کە خوا دەیـەوێ سزایان بدات بە هەندێك لـە گوناهەکانیان، وە بـە دڵنیـاییەوە زۆربەی خەڵکیش لارێـن ﴿٤٩﴾ ئایا ئەوانە دادوەریـی نەفامێتـیی یـان گەرەکـە! جا ئایا حوکمی کـێ لە هی خـوا چاکتـرە، بۆ کۆمەڵێـك بڕوایەکـی پتـەوو بەرچاوڕوونانەیـان هەبـێ؟! ﴿٥٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(وَمُهَيْمِنًا ) زانایان دەربارەی وشەی: (مُهَيمن) دوو ڕایان هەن: هەندێکیان دەڵێن: وشەیەکی سەربەخۆیە، دەگوترێ: (هَيْمَنَ الرّجُلُ يُهَيمنُ إذَا كَانَ رَقيباً عَلَى الشيء وَشَاهِداً عَلَيْهِ وحَافِظاً) واتە: وشەیەکە سەربەخۆیە (هَيْمَن، مُهَيْمَن) لە کوردەوارییدا دەڵێ: بەسەری ڕاگەیشت، چاودێری بوو، یان خستیە ژێر چاودێریی و ڕکێفی خۆیەوە، وە هەندێکیشیان دەڵێن: لە (أَمَن)ەوە هاتوە (أَأمَن يُؤامِنُ فَهُوَ مُؤامِنٌ، ثُمَّ قُلِبَت الأُولى هاءً) کە ئەویش دیارە هەر هەمان مانای پێشێی هەیە، واتە: بەسەریەوە چاودێرە، پارێزەرە.

(شِرْعَةً ): (الشَّرْعُ: نَهْجُ الطَّرِيقِ الوَاضِحِ، شِرْعٌ، وَشَرْعٌ، وَشِرْعَةٌ) هەموویان یەکن واتە: ڕێیەکی ڕوون، ئاشکرا، (وَاسْتُعِيرَ ذَلِكَ لِلْطَرِيقَةِ الإِلَهِيَّةِ مِنَ الدين، وَسُمِّيَت الشَّرِيعَةُ شَرِيعَةً تَشْبِيهاً بِشَرِيعَةِ المَاءِ، وَالمَاءُ يُرْوِي وَيُطَهِّرُ) ئەو وشەیە خوازراوەتەوە بۆ ڕێبازی خوا لە دین دا، وە شەریعەت بۆیە پێی دەگوترێ: شەریعەت، چونکە ئەو ڕێیەی کە عەرەب بۆی دەچن بۆ کانی، یان سەرچاوەیەك ئاوی لێوە بێنن، دەڵێن: (شِرعة)، یان (شريعة) ئیدی خوا ناوی لە بەرنامەی خۆی ناوە شەریعەت، وەك چۆن خەڵك لە ڕێی شەریعەتی ڕواڵەتییەوە دەچێ ئاوی سازگارو شیرین لە کانی دێنێ، کە دوایی پێی تێر ئاو دەبێ و پاك و خاوێنی خۆی پێ ئەنجام دەدا، بە هەمان شێوەش ئەو بەرنامەیەی کە خوا دایناوە، خەڵك لێیەوە بەرنامەی خوای پەروەردگار وەردەگرێ، کە دەبێتە هۆی تێر ئاو بوونیان لە ڕووی مەعنەوییەوەو پاکبوون و چاکبوونیان.

(وَمِنْهَاجًا ): (النَّهْجُ: الطَّرِيقُ الوَاضح، وَنَهَجَ الأَمْرُ وَأَنْهَجَ: وَضَحَ، وَمَنْهَجُ الطَّرِيقِ وَمِنْهَاجُهُ...) (مِنْهاجُ) لە زمانی عەرەبییدا واتە: ڕێیەکی ڕۆشن، (وَنَهَجَ الأَمْرُ وَأَنْهَجَ: وَضَحَ) واتە: ڕێیەك کە ڕۆشن بوو، (وَمَنْهَجُ الطَّرِيقِ وَمِنْهَاجُهُ) واتە: ڕێیەکی ڕۆشن و دیار.

(فَٱسۡتَبِقُواْ ): واتە: پێشبڕكە بكەن، (الإستِباقُ: التَسَابق) وەك خوا لە قورئاندا لەسەر زاری نەوەكانی یەعقووب، براكانی یوسف دەفەرمویٚ: ﴿إِنَّا ذَهَبۡنَا نَسۡتَبِقُ ١٧﴾ یوسف، ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕكەمان دەكرد، غارغارێنمان دەكرد بە سواری وڵاخ، یاخود بە پێ.

كەواتە: ﴿فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾، واتە: پێشبڕكە بكەن، بۆ ئەنجامدانی كارە چاكەكان، كامەتان زیاتری دەكات، ئنجا (الإستِباقُ: التَسَابق) بە موتڵەقی پێشكەوتنیش دەگوترێ، واتە: پێشكەوت.

(يَفۡتِنُوكَ ) واتە: لات بدەن، یان گومڕات بكەن، (عُدِّي بـ (عَنْ) تعدية يخْدَعُوك) بۆیە بە پیتی (عَنْ) تەعەددیی پێكراوە، تاكو مانای هەڵخەڵەتاندن بگەیەنێ، واتە: وریابە هەڵت نەخەڵەتێنن، فریوت نەدەن، لە هەندێك فەرمان كە جێبەجێی دەكەی.

(ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ ): واتە: نەفامێتیی (جَهْل)یش، واتە: نەفامیی، جا (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (الجَهْلُ عَلَى ثَلاثَةَ أَضْرُبٍ) نەفامیی یان نەزانیی سێ جۆرە:

١- (الأَوَّلُ: وَهُوَ خُلُوُّ النَّفْسِ مِنَ العِلْمِ): ئەوەیە كە ئینسان شتێك نەزانێ، زانیاری دەربارەی شتێك نەبێ، لێی نەزانێ، مانای وایە بەو شتە جاهیلە.

٢- (الثَّانِي: اعْتِقَادُ الشَّيءِ بِخِلافِ مَا هُوَ عَلَيْهِ): بیروبڕواو بۆچوونی بەرانبەر بە شتێك پێچەوانەی واقیعی ئەو شتەبێ، قەناعەتێكی هەیە بە شتێك، بەڵام قەناعەتەكەی هەڵەیە.

٣- (الثَّالِثُ: فِعْلُ الشَّيءِ بِخِلافِ مَا حَقُّهُ أَنْ يُفْعَلَ) ئەنجامدانی كارێك بە پێچەوانەی ئەوەوە كە دەبێ ئەنجام بدرێ، بۆ وێنە: كەسێك ماڵی خەڵك دەدزێ، كە نابێ بكرێ، درۆ دەكات، غەیبەت دەكات، جنێو بە خەڵك دەڵێ، كە نابێ بكرێن، ئەوەش پێی دەگوترێ: (جَهْل) واتە: (جَهْل) لێرەدا بریتیە لەو كردەوانەی كە پێچەوانەی هەقن، پێچەوانەی بەرژەوەندیین.

(**يُوقِنُونَ**): واتــە: بڕوایـەکی پتــەویان هەیـــە، (الـيَقِينُ: هُوَ سُكُونُ الفَهْـمِ مَعَ ثَبَـاتِ الحُكْـمِ، واليَقِينُ: مِنْ صِـفَةِ العِلْـمِ فَوْقَ الـمَعْرِفَةِ وَالدِّرَايَـةِ) وشـەی (يَقِين) بریتیـە لـەوە کـە ئینسـان تێگەیبـێ و تـەواو تێیـدا گەیبێتـە ئەنجـام، وە بڕیـارو حوکمـی لەبـارەی ئەو شـتەوە جێگیـر بووبێ، ئەوە تێیدا گەیشتۆتە یەقین، واتە: پێویسـت بەوە ناکـات چی دی زانیـاری دەربـارەی ئـەو شـتە زیاتربـێ، جـێی تێبینییـە کە خــوا ﷻ وشـــەی (عِلْـم)ی بۆخــۆی بەکارهێنـــاوە، بـــەڵام وشــەی (مَعْرِفَـة)ی بەکارنەهێنـاوە، چـونکە دەگونجـێ (مَعْرِفَة) کامـڵ بـێ، دەشگونجـێ ناتـەواو بـێ، بـەڵام (عِلْم)، واتـە: زانیـاریی تەواو بەو شـتە هەیـە، دیارە (يَقِين) (عِلْم)ێکـە کە ئینسان لەرەلەرو دڵ لە دڵدانی تێدا نـەمابێ و گەیبێتــە دڵنیـایی، بۆیـە دەگونجـێ بڵــێین: یـەقین واتـە: ئیمـانێکی پتـەو، ئەگـەر بـە مانـای ئیمـان بـێ، یاخــود زانیـارییـەك کە هیچ خلّتـەو خـاڵی تێدا نەمابێ.

# هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

هۆی هاتنە خـوارەوەی ئەو ئایەتـە کـە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ (٤٨) ﴾، ﴿عَـنِ ابْـنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُما، أنَّ أَحْبَارَ اليَهُودِ قَالُوا: اذْهَبُوا بِنَا إلى مُحَمَّدٍ لعلَّنَا نَفْتنه عَن دينـهِ، فقَالوا: يَا مُحَمَّدُ! قَدْ عَرَفْتَ أَنَّا أَحبَارُ اليَهُود، وَأَنَّا إن اتَّبَعنَاكَ اتَبْعَتْنا اليَهُود كُلُّهُم، وَأنَّ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمِنَا خُصُومَةٌ فَنَتَحاكَمُ إلَيْكَ فَتَقْضِي لَنَا عَلَيْهِم، وَنَحْنُ نُؤْمِنُ بِكَ وَنُصَدِّقُكَ فَأَبَى ذَلِكَ رَسُولُ الله، فَنَزَلَتْ﴾[1]، واتـە: عەبـدوڵڵای کـوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: زاناکانی جوولەکە گوتیان: وەرن با بچین بۆ لای موحەممەد بەڵکو لە دینەکەی لای بدەین، چوونە خزمەتی گوتیان: ئەی موحەممەد! تۆ دەزانی ئێمە زانایـانی جوولەکەین، وە ئەگەر ئێمە شـوێنت بکەوین، جوولەکە هـەموو بـە دوای ئێمـەدا شـوێنت دەکـەون، وە ئێمـە ئـەو کۆمەڵە زانایـە لەگەڵ خەڵـکەکەی خۆمـان ناکۆکییـەکمان هەیـە، دادوەرییمـان دێنینـە لای تـۆ، تـۆش بڕیارمـان بـۆ بـدە بـە بەرژەوەندیی‌و قازانجی ئێمە، ئێمەش ئیمانت پـێ دێنین‌و بـە ڕاستت دادەنـێین، (یـانی سـەودا دەکـەین، تـۆ ناهەقیێکمان بـۆ بکـە بـە هـەق، ئێمـەش دان بـەو هەقـەی تـۆدا دادەنێیـن) پێغـەمبەری خـواش ﷺ ڕازی نەبوو، لەو بـارەوە ئەم ئایەتـە هاتەخـوار کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ...(٤٨) ﴾.

١) أخْرَجَهُ الطَّبَري في تفسيره برقم: (١٢١٥٠)، وإبن أبي حاتم والبيهقي.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

خوا ﷻ دوای ئەوەی باسی ئەزموونی پێشووی جوولەکەکانی کرد، پاشان باسی ئەزموونی دیانەکانی کرد، وە باسی ئەوەی کرد، کە کتێبی بۆ هەریەك لەوانە ناردوە، تەورات بۆ جوولەکەکان، ئینجیل بۆ نەصڕانییەکان، کە دیارە نەصرانییەکان وێڕای ئینجیل بە دوای تەوراتیش هەر کەوتوون، چونکە ئینجیل هاتوە تەوراتی بەڕاست داناوە، بەڵام هەندێك شتی دیکەی زیاد کە سەردەمو ڕۆژگاری عیسا ﷷ پێویستی کردوە، لە ئینجیلدا هاتوە، ئەگەرنا عیسا ﷷ ئیشی بە تەوراتیش هەر کردوە، ئنجا دوای ئەوە ڕوو لە پێغەمبەر ﷺ دەکات: کە وەك چۆن (أَهْلِ الكِتَابَيْن) خاوەنی ئەو دوو کتێبە ئاسمانییە، تەوراتو ئینجیل، کتێبی خوایان لەبن دەستدا بووەو ئەزموونێکی دیاریان هەبووە، بۆ تۆش ئەزموونێکی دیارو لەسەر بناغەی کتێبێکی تایبەت کە بۆت دەنێرین، لە ئارادایە، ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، ئەو (و)وە، (واو العطف) ئەوەی ئێرە دەخاتە سەر ئەوەی پێشێ، واتە: وەکو چۆن تەوراتمان بە جوولەکەکاندا بوو، وە ئینجیلمان بە نەصرانییەکاندا بوو، بە هەمان شێوە بۆ لای تۆش کتێبێکمان بە هەق ناردۆتە خوارێ، ئنجا جێی سەرنج ئەوەیە، لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾، نافەرموێ: (قُرآن) بۆچی؟ ئەوە دیارە کە خوا چوار ناوی بۆ قورئان بەکارهێناون، (كِتَاب، قُرآن، فُرْقَان، ذِكْر) لەگەڵ چەندان وەسفدا، لێرەدا بۆیە خوا ناوی قورئان بەکارناهێنێ، ناوی کیتاب بەکاردێنێ، واتە: قورئان کتێبی تەواو عەیاری خوای پەروەردگارە، ئەگەر کتێبێك هەبێ، تەواوبێو دووربێ لە دەستکاریی کرانو گۆڕدران قورئانە، ئنجا دەفەرموێ: ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾، ئەو کتێبانەی کە لەپێش دەستیەوەن، واتە: پێش ئەو هاتوون بە ڕاستیان دەزانێ، لێرەدا ﴿ لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾، واتە: ئەو کتێبانەی کە لە پێش دەستیەوەن، بەڕاستیان دەزانێ، جا زانایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: ﴿ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾، لێرەدا (ال) بۆ

(جینس)ە، واتە: جینسی کیتاب، نەیفەرمووە (کُتُب)، کتێبەکان، بەڵکو فەرموویەتی: ﴿ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾، هەر کتێبێك لە پێش ئەودا هاتوە، قورئان بەڕاستی دەزانێ، سەرجەم کتێبەکانی خوا، وەك ئەسڵەکەیان بەڕاست دەزانێ، ﴿ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ ﴾، وە بەسەریشیانەوە چاودێرە، ﴿ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾، کەواتە: تۆش بەوەی خوا ناردوویەتە خوار حوکمیان لە نێواندا بکە ﴿ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم ﴾، وەك دوایی باسی دەکەین، واتە: دادوەریی یان لە نێواندا بکە، بەڵام وشەی (حکم) لەم ئایەتەداو، لە شوێنی دیکەشدا کە سەرنج دەدەین، هەر بەمانای دادوەریی نیە، بەڵکو بە مانای سزا شەرعییەکانیش و بەرنامەی ژیانیش و سیستەمی حوکمڕانییشە، ئنجا دەفەرموێ: بەوەی کە خوا بۆی ناردوویەتە خوار، دادوەریی یان لە نێواندا بکە، ﴿ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ ﴾، بەدوای ئارەزووی ئەوان مەکەوە، لابدەی لەو هەقەی بۆ تۆ هاتوە، ئەوە هەمووی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوە کە دیارە جوولەکەکان، زۆر هەوڵیانداوە کە لەزمەیەك لە پێغەمبەر ﷺ بگرن و لایبدەن لە شەریعەت و، دوایی بیکەن بە پروپاگەندە کە ئەها! ئەو موحەممەدە کە دەڵێ پێغەمبەری خوام، کەچی لایداوە، پێغەمبەران دەبێ لە وەحی خوا لانەدەن، کەچی ئەوەتا ئێمە بڕیارمان پێ گۆڕی و لاماندا!! بە تەئکید ئەو کاتە ماددەیەکی پروپاگەندەی باشیان دەکەوتە دەست دژی پێغەمبەر ﷺ، بەڵام دیارە پێغەمبەران پارێزراون لە هەڵە و لادان.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ ﴾، ئەوە وەڵامی جوولەکەکان و نەصرانییەکانە کە گوتوویانە: مادام خوا تەوڕات و ئینجیلی ناردوون، قورئانیش تەوڕات و ئینجیل و کتێبەکانی دیکەش بەڕاست دەزانێ، ئەدی ئەو کتێبە بۆچی هاتوە؟! پاساوی نێردرانی ئەو کتێبە چییە؟ مادام قورئان بەڕاستیان دەزانێ کە کتێبی خوان؟! خوا دەفەرموێ: بۆ هەر کامێك لەو ئوممەتانە، ئوممەتی جوو، ئوممەتی دیان، ئوممەتی مسوڵمان، بەرنامە و ڕێبازێکمان ناردوە، پڕ بەپێستی ئەو واقیعەیە کە ئەوان تێیدا دەژین، دیارە هەر لە وردەکارییەکاندا بەرنامەکان لێك جیان، ئەگەرنا لە هێڵە گشتییەکاندا یەکن، ﴿ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ

﴿ وَٰحِدَةً ﴾، ئـەوەش وەڵامـی پرسـیارێکی دیکـە، کـە ڕەنگـە لـە مێشـکی هەنـدێ کەسـی دیکـەدا سـەرهەڵـدات: بۆچی خـوا یـەك کتێبـی نەدەنـاردو بەشـەریەتیشـی نـەدەکردە یـەك کۆمـەڵ؟ دەفـەرموێ: ئەگـەر خـوا ویستبای دەیکردنـە یـەك کۆمـەڵ، بەهـۆی ئەوەوە کە یـەك کتێبـی بـۆ دەنـاردن، ﴿ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡ ﴾، بـەڵام بۆیـە کردوونـی بـە چـەند ئۆممـەتێك، چـەند کتێبـو بەرنامەیەکیشـی جـۆراو جـۆری بـۆ ناردوون، بە پێی گۆڕانکارییەكو پێشـکەوتنێك کە لە سەردەمو زەمانەکانـدا دێتـە دی، بۆیـە وای کـردوە، تـاکو تاقیتـان بکاتـەوە لـەوەدا کـە پێتـان دەدات، ئایـا هـەر کامێـك پابـەندە بـە کتێبـەوە کـە بـە پێغـەمبەری خۆیانـدا بۆیـان هـاتوە؟ پاشـان ئایـا ئەگەر کتێبەکـانی خـوای کاربەجـێ، هەنـدێ حوکمیـان لـەو کتێبـەی پێشـوودا لابـردو نەسـخ کردەوە، ئامادەی بە دوای ئـەو کتێبـەی دیکـەیان بکـەوێ، یـاخود دەمارگیـرانە دەڵـێ: نـەخێر هـەر بـە دوای کتێبـی خـۆم دەکـەوم، بـا حوکمەکـەش سـڕرابێتەوەو هەڵوەشـابێتەوە؟! ئەوە تاقی کردنەوەکـە لێرە دایـە.

ئنجا دەفـەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾، ئێـوە لـە چـاکەکاندا پێشـبـڕکە بکـەن، نەك دەمارگیریی، جوولەکە هەر بە شـتی خۆیـان پابەندنو، دیان هەر بـە شـتی خۆیـان، مسوڵمان هەر بە شـتی خۆیان، هەر کامێـك لـە ئێـوە بـە پێـی کتێبەکـەی خۆتـان، ئـەوەی چاکە پێشـبڕکە بکەن لە ئەنجـامدانیدا، جا ئەوانـەی کـە ئێسـتا پێیـان دەگـوترێ: (أَهْل الشَّرَائع السَّمَائِية) جوولەکەو دیـانو مسـوڵمان، شـوێنکەوتووانی ئەو سـێ کتێبـە کـە لـە قورئانـدا باسـیان هـاتوە، ئەگـەر بـێو هـەر کامێکیـان ئـەو شـتە چـاکانەی لـە بەرنامەکەیـداو لـە دینـەکەیدا هـەن، ئەنجامیـان بـدات، دنیـا زۆر بـە باشـی دەگـۆڕێ، ئەگـەر نەصـرانیی بـە ئینجیـل کـار بکـەنو، جوولەکـە بـە تـەوڕات کـار بکـەن، نـەك ئەوەی ئارەزووییانە جێبەجێی بکـەنو، ئەوەی دیکە جێبەجێ نەکەن، چونکە ئێسـتاش هەردووك پەیمـانی کـۆنو نوێ، شـتی زۆر باشـیان تێـدا هەیـە، هەڵبەتـە ناڵـێین واقیعـی ئێسـتایان پـێ چارەسـەر دەکـرێو، کێشـەکانی بەشـەریان پـێ چارەسـەر دەکـرێن، بـەڵام ئێستاش شـتی زۆر باشیان تێدایـە، بـەڵام ئـەوان پێچـەوانەی وان ڕەفتـار دەکەن، ئنجا خـوا لێـرەدا دەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِ ﴾، بۆ چاکـە کردنـێ پێشـبـڕکە بکـەن، ﴿ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعًا ﴾، هەمووتان بۆ لای خـوا دەگێڕدرێنەوە، گێڕانەوەتـان

بـۆ لای خــوایە، ﴿ فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾، هەواڵــتان پــێدەدا بــەوەی کـە تێیـدا کەوتبوونـە ڕاجیـایی یـەوە، تەماشــا بکـەن! ئیسلام چـەند بـە فراوانـی تەماشــا دەکات، وەرە جوولەکـە لەگەڵ تەوڕاتی خۆتان دا ڕاسـت بکـەن، وەرن نەصــرانی لەگـەڵ ئینجیلی خۆتـان دا ڕاسـت بکــەن، مسـوڵمانیش دەبــێ لەگەڵ قورئــاندا ڕاســت بکات، ئەو کاتە هاوکـاریی‌و تەبـایی پەیدادەبــێ لەسـەر زۆر بـەهای بـەرز بـەرز، هەڵبەتـە جار جـار ئەوانــەی دەیانــەوێ کۆمەڵــگاو خێـزان هەڵوەشـێننەوەو، باسـی گـۆڕینی ڕەگـەزو جێنـدەرو دژایەتیکردنـی خێـزان‌و ڕووخـاندنی بەهـای ڕوحیـی‌و ڕەوشـتیی دەکەن، لـە بەرانبەریانــدا جــار جــار زاناکــانی مســوڵمان‌و جوولەکـەو نەصــرانییەکان پێکــەوە دادەنیشـن، هەندێك تەگبیـر دەکەن، ئەوە لە ڕاسـتییدا ئیسـلام ئـەو فەرمانـەی کردوە، دیارە ئەوەی پێی دەگوتـرێ: (التقريب بين الأديان) ئـەوەم مەبەسـت نیـە، هەرچــەندە هــەر چـــۆن بــێ گفتوگـــۆو پێکــەوە دانیشـــتن هــەر باشــە، نەصــرانییەت چۆنـــەو، یەهودییـــەت چـۆنەو، ئیسـلام چـۆنە؟ نـاگۆڕێن‌و هـەروەك خۆیـانن، بـەڵام دەگونجـێ شـوێنکەوتووانیان پێکـەوە تەبـاو ڕێـك بن.

ئنجا کە دەفـەرموێ: گێرانەوەتـان بۆ لای خـوایـە، وە هەواڵیشتان پێ دەدات، بــەوەی کـە تێیـدا ڕاجیــا بــوون، واتــە: ئێـرە مەکـەن بـە شـوێنی: لێکـدەرکــردن (تصـفية الحسـاب)و بە دەمارگیـرانە پێکەوە مامەڵە مەکـەن، جارێکـی دیکە ڕوو لـە پێغـەمبەر دەکـات: ﴿ وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ﴾، وە دادوەریــی یـان لـە نێوانـدا بکە بـەوەی خــوا ناردوویەتــە خــوار ﴿ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ ﴾، وە دوای ئارەزووەکانیــان مەکــەوە، ﴿ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللَّهُ إِلَيْكَ ﴾، وە لێیـان وریــابە کـە لات نەدەن لە هەندێك لەوەی خوا بۆی ناردووی، نەك لە هەمووی تەنانەت لـە هەندێکیشــی لانـەدەی، بـۆ ڕازیـکردنی ئـەوان، ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا ﴾، ئنجا ئەگـەر پشـتیان تێکـردی‌و ڕوویـان تێنـەکردی، دیـارە پێغەمبـەر ﷺ زۆری مەبەســت بـووە ئەوانـە ئیمــان بێـنن، وە زۆر سوور بووە لەسەر ئەوەی سـەرنجیان ڕابکێشــێ‌و، دڵیــان ڕابکێشــێ‌و ئیمان بێـنن، بـەڵام خـــوا دەفــەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّوْا فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ﴾، بـــەڵام ئەگەر هەر پشـتیان تێکردی، ئـەوە بزانـە کـە خــوا دەیــەوێ بەڵایــان بەسـەر بێنــێ، بە

هۆی هەندێك لە گوناهەكانیانەوە، واتە: لە دنیادا، بەڵام ئەو بەڵایەی كە بەسەریان دێ، لەسەر هەموو گوناهەكانیان، لە كوێیە؟ قیامەت شوێنی سزای خوایە، بەڵام لە دنیاشدا بە هۆی هەندێ لە گوناهانەوە ئینسان تووشی هەندێ بەڵاو موصیبەت دێ، جوو بێ، دیان بێ، مسوڵمان بێ، خواناس بێ‌و، خوا نەناس بێ، گوناهەكان باجی خۆیان هەیە، ﴿وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ﴾، وە بێگومان زۆر لە خەڵكی لاڕێن، لادەدەن، واتە: زۆربەی خەڵكت بۆ نایەتە سەر ڕێ‌و، لە فیطرەتی خۆیان‌و لە ڕێبازی خواو لە عەقڵ دەردەچن، ئەوەش حەقیقەتێكە دەبێ بیزانین، چونكە ئەوە زۆر كاریگەریی هەیە بۆ ئینسان، وەختێك دەبینی زۆربەی خەڵكی دنیا لاڕێ دەڕواو زۆربەی خەڵك ڕێی ڕاست ناگرێ، خوای زاناو شارەزا پێشی هەواڵی پێداوین: كە بزانن ئاوایە، خوا بۆ خۆی عەبدەكانی خۆی چاكتر دەناسێ، كەواتە: تۆ ئەگەر شتێك بزانی، دوایی لە واقیعدا ببینی، زۆر پێی نارەحەت نابی، بەڵام ئەگەر وات تەصەووڕ كردبێ‌و پێت وابێ، دەگونجێ هەموو خەڵك ئیمان بێنێ، كە دوایی ئیمانیان نەهێنا زۆر پێی نارەحەت دەبی!

لە كۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ﴾، ئایا ئەوانە ئەگەر بە حوكمی تۆ ڕازی نەبن، تۆ دادوەریی یان لە نێواندا بكەی، وە بە حوكمی خوا ڕازی نەبن، گرفت‌و كێشەكانیان چارەسەر بكەن، ئەدی حوكمی نەفامییان دەوێ؟ بەدیلی حوكمی خوا، حوكمی نەفامییە، دوایی باسی دەكەم بۆچی خوای دادگەر بە حوكمی غەیری خۆی دەفەرموێ: حوكمی نەفامیی؟ ئایا ئەوانە حوكمی نەفامیی دەخوازن؟ واتە: شتێكی زۆر بێ‌جێ دەكەن، ئەوە لە زمانی عەرەبیدا پێی دەگوترێ: (الإستفهام الإنكاري) پرسیاركردنێكی نكووڵیی لێكەرانە، بۆ وێنە: كەسێك ئاو بۆ یەكێك دێنێ، پێی دەڵێ: ئەوە ئاو نیە؟! یانی ئەوە پرسیارێك نیە چاوەڕێی بكەی بڵێ: با، بەڵكو تۆ بەو شێوازە ئینكاریی لە ئینكارییەكەی ئەو دەكەی، لێرەدا خوا دەفەرموێ: ئایا حوكمی نەفامیی دەخوازن؟ جا حوكمی كێ لە هی خوا چاكترە، بۆ كەسانێك كە بڕوایەكی پتەویان هەبێ‌و زانیارییەكی باشیان هەبێ.

# چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾، خوای کاربەجێ قورئان بە پێنج وەسف پێناسە دەکات:

١/ ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ﴾، کەواتە: قورئان لە خواوە دابەزیوە، ئەوە سیفەتی یەکەمی قورئانە، وەك چۆن سیفەتی هەموو کتێبەکانی دیکەی خوای پەروەردگاریشە، فەرمایشتی خوایە، خوا ئەو فەرمایشتەی بە جبریل گوتووە جبریل هاتوە خستوویەتە عەقڵو دڵی پێغەمبەرەوە ﷺ، وە لەکاتێکدا کە فێری کردوە، دەنگی موبارەکی دەرچووەو بە قسەش فێری کردوە، وەك لە سووڕەتی (القیامة)دا دەفەرموێ: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ ﴾القیامة، واتە: زمانتی پێ مەجووڵێنە بۆئەوەی بە پەلەپەل بیخوێنی، واتە: جبریل بەسەریدا خوێندۆتەوەو، لە عەقڵو دڵیدا جێگیر بووە، گۆ (تَلَفُّظ)یشی پێ کردوە، بۆئەوەی بزانێ خوا ﷻ چۆن بە جبریلی فەرمووە، قورئان ئاوا بە وردیی هاتووە[1]، خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾القیامة، واتە: پەلە مەکە، لەسەرمانە کۆی بکەینەوە لە دڵو سینەی تۆداو بیخوێنینەوە، ئنجا ئەگەر خوێندمانەوە، بە دوای خوێندنەوەکەی بکەوە، پاشان ڕوونکردنەوەیشی لەسەر خۆمانە. لێرەدا (قرآن) بە مانای خوێندنەوە دێو چاوگ (مصدر)ە.

٢/ ﴿ ٱلْكِتَٰبَ ﴾، کتێبە، شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: (كِتَاب) لە (كَتْب)ەوە، هاتوە، (كَتْب)یش واتە: (جمع) لەبەرئەوەی پیتەکان وشەیان

---

١) لە کتێبی: (الإسلام كما يتجلي في كتاب الله) لە بەرگی سێیەمی داو لە کتێبی: (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)دا بە درێژایی باسی ئەو بابەتەمان کردوە.

لـێپێكـدێن‌و، وشـەكان ڕسـتەیان لـێ پێكـدێ، ڕسـتەكانیش ئایەتـەكانیان لـێپێكـدێ، كـە دەفـەرموێ: (كِتَـاب) واتـە: نووسـراوو كـۆكراوە، وەك دەفـەرموێ:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ ﴾، ئەوە (ال)ی سەر (كِتَـاب)، (ال)ی (عهد)ە، یـان (ال) (تعریف)ە، واتە: ئەگەر كتێبێك هەبێ تەواو عەیـار بێ، ئەو كتێبـەیـە.

٣/ ﴿ بِٱلْحَقِّ ﴾، ئـەوە (بـالحَقّ)ە، دوو واتـا هەڵدەگـرێ: دەگونجـێ مەبەسـت پێـی ئـەوەبێ قورئـان هـەقی تێدایـە، وە دەگونجـێ مەبەسـت ئـەوەبێ كە بـە شـێوازێكی هـەق لە لایـەنی خـوای پەروەردگـارەوە دابەزێنـراوە.

٤/ ﴿ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَـٰبِ ﴾، بەڕاست دانەری ئـەو كتێبـانەیە كە لە پێشـیەوە بوون، واتە: وەك ئەسڵەكەیان بەڕاستیان دەزانێ، ڕێزیان دەگـرێ‌و دەزانـێ فەرمایشـتی خـوان.

٥/ ﴿ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾، بەسـەریشـیانەوە چـاودێرە، بەڕاسـتیان دادەنـێ، وەك ئەسـڵەكەیان، بـەڵام بەسـەریشـیانەوە چاودێرە، ئەگەر دەسـتكـاریی كـرابن، یـان فەرامۆشـییان تێـدا كرابـێ، وەك خـوا دەفـەرموێ: ﴿ وَنَسُوا۟ حَظًّا مِّمَّا ذُكِّرُوا۟ بِهِۦ ﴿١٣﴾ ﴾ المائـدة، یـان دەفـەرموێ: ﴿ يُحَرِّفُونَ ٱلْكَلِمَ مِنۢ بَعْدِ مَوَاضِعِهِۦ ﴿٤١﴾ ﴾ المائدة، چ ئـەوەی كە لەبیـركرابـێ، چ ئـەوەی كـە لادرابـێ، چ ئـەوەی كە گۆڕدرابـێ، قورئـان بەسـەریانەوە چاودێـرەو ئاگادارە، لـە دەرسـەكانی پێشـوودا چەند شـتێكمان باسـكرد، كە لـە تـەوراتو ئینجـیل دەسـتكاریی كرابوون، قورئـان ڕاستی كردبوونەوە، ئەوەی كە بە پێویسـت زانرابـێ.

**مەسـەلەی دووەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾، بەوەی كە خـوا ناردوویەتە خـوار، دادوەریی یان لە نێوانـدا بكـە، وە بە دوای ئارەزووەكانیـان مەكـەوە، كە لابـدەی لـەو هەقـەی كە بـۆت هـاتوە.

پرسیارێك لێرەدا دروست دەبێ، ئایا لە نێوان ئەم ڕستەیەدا کە دەفەرموێ: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ﴾، کە پێغەمبەر مولزەم دەکات بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار دادوەریی بکات، لەگەڵ ئەو ڕستەیەی پێشیدا، کە دەفەرموێ: ﴿فَإِن جَآءُوكَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ ﴿٤٢﴾﴾ المائدة، ئەگەر نامسوڵمان هاتن بۆ لاتو کێشەو مشتومڕێکیان بوو، دادوەرییان لە نێواندا بکە، یاخود پشتگوێیان بخە، تێکگیران نیە، کە لێرەدا مولزەمی دەکاتو، لەوێ سەرپشکی دەکات؟!

هەندێك لە زانایان بەداخەوە! ئەوانەی کە سەرکێڵانە تەماشای ئەو ئایەتانەیان کردوە، هەر کە بینیویانە بە ڕواڵەت دوو ئایەت تێکدەگیرێن، ئەوەیان بە دەم گرتوە دەڵێن: ئەوەی دوایی هاتوە، ئەوەی پێشێی نەسخ کردۆتەوە! لێرەشدا گوتوویانە: ئەمەی ئێرە کە دەفەرموێ: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ﴾، ئەوەی پێشێی کە دەفەرموێ: ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾، نەسخ کردۆتەوە، چونکە لەوێ سەرپشکی کردوە، لێرەش مولزەمی کردوە؟

ئێمە دەڵێین: نەخێر، چونکە ئەوپەڕی مانای ئەو ڕستەیەی ئێرە ئەوەیە: ئەگەر دادوەرییت کرد لە نێوانیاندا بە گوێرەی وەحی خوا دادوەرییان لە نێواندا بکە، کەواتە: ئیلزامو فەرمانەکە بۆ: دادگەرانە دادوەریی کردنە، نەك خودی دادوەریی کردنەکە! واتە: هیچ لەگەڵ ئەوەی پێشێ تێکناگیرێ، هەرچەندە زۆر لە زانایان دەڵێن: ئەم ئایەتە نەسخ بۆتەوە!! بۆیەش من هەر زوو لە سووڕەتی (البقرة)دا بە تەفصیل باسی (نسخ)م کردوەو گوتوومە: لە قورئاندا هیچ ئایەتێکی تێدانیە نەسخ کرابێتەوە، بەو واتایەی کە خەڵك ئێستا لێی تێدەگات، واتە: حوکمەکەی ئیشی پێ نەکرێ، بەڵێ ئایەت هەیە مانای ئایەتێکی تایبەت کردوە، یاخود ڕەهابووە، بەنددار (مُقَيَّد) ی کردوە یان (مُجْمَل) بووە، تەفصیلی داوەتێ، وە پلە پلەیی (التَدَرُّج) هەیە، بەڵام ئەوە کە ئایەتێك لە قورئاندا هەبێو حوکمی ئایەتێکی دیکەی نەهێشتبێ، شتی وانیە لە قورئاندا، وەك ئێمە لە درێژەی ئەو دەرسانەدا تاکو ئێستا هاتووین، هەموو ئەو شوێنانەی کە

گوتوویانە: ئەو ئایەتە نەسخ بۆتەوە، تەماشامان كردوە وانیە بەو مانایەی كە ئیشی پێ نەكرێ، وە پێموایە كاتی خۆیشی هیچ ئایەتێك نەسخ نەبۆتەوە.

لێرەدا (القُرطُبي) قسەیەكی جوان دەكات، دەڵێ: (﴿ وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾المائدة، أي احْكُم بِذَلِكَ إنْ حَكَمْتَ وَاخْتَرْتَ الحُكْمَ؛ فَهُوَ كُلُّه مُحْكَم غَير منسُوخ، لأَنَّ النَاسِخ لا يَكُون مُرتَبِطاً بِالْمَنسُوخ مَعْطُوفاً عَلَيْهِ، فالتَخَيير لِلْنَبِيّ ﷺ فِي ذَلِكَ مُحْكَم غَير مَنْسُوخ) واتە: یانی: دادوەریی‌و حوكم بەوە بكە كە خوا ناردوویەتە خوار، ئەگەر ئەوەت هەڵبژارد كە حوكمیان لە نێواندا بكەی‌و دادوەریی یان لە نێواندا بكەی، بەو شێوەیەی كە خوا ناردوویەتی، ئاوا دادوەریی یان لە نێواندا بكە، كەواتە: هیچی مەنسووخ نیە، ناشگونجێ ناسیخ‌و مەنسوخ پێكەوە پەیوەست بن‌و، وە عەطف بكرێنەوە سەریەك {﴿ وَأَنِ ٱحۡكُم ﴾، ئەو (و) واوی عەطفە، ناگونجێ ئەوە بەوشێوەیە بێ}، دەڵێ: كەواتە: سەرپشككردنی پێغەمبەر ﷺ لە ئایەتی پێشێدا هەر لە شوێنی خۆیەتی، وە نەسخ نەبۆتەوەو ئەمەی ئێرە لەگەڵ ئەوەی وێ تێكناگیرێ، كە دەفەرموێ: ئەگەر ئەوەت هەڵبژارد كە حوكمیان لە نێواندا بكەی، ئەوە بە وەحی خوا دادوەریی بكە، هەر یەك مانایان هەیە.

**مەسەلەی سێیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: بۆ هەر كامێك لە ئێوە، مەبەست پێی كێیە؟ ئەوەی كە باسكراون، جوون، دیانن، مسوڵمانانن، كەواتە: خوا دەفەرموێ: بۆ هەر كام لە جووو، دیان‌و، مسوڵمانان (شِرعَة)شمان ناردوە، (مِنْهَاج)یشمان ناردوە، ئنجا ئایا (شِرْعَة)و (مِنْهَاج) چین، وە جیاوازییان چییە؟ سێ ڕا هەن، وەك وەڵام بۆ ئەم پرسیارە:

أ- هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەم دوو وشەیە هاوواتا (مُتَرَادِف)ن، واتە: بێژە (لَفْظ)کەیان جیاوازەو، ماناکەیان یەکە، بەڵام من قەناعەتم وایە هیچ دوو وشەیەك لە قورئاندا نین بێژەکەیان جیابێ‌و، ماناکەیان یەك بێ، واتە: قەناعەتم وایە (مُتَرَادِف) لە قورئاندا نیە، چونکە ئەوە جۆرێکە لە زیادیی، وە ئەوەش لەگەڵ لووتکەی ڕەوانبێژیی، کە لە کتێبی خوادا هەیە ناگونجێ.

ب- هەندێکیش دەڵێن: (شِرْعَة) واتە: بنچینەکانی ئایین، وە (مِنْهَاج) واتە: لقو پۆپەکانی‌و وردەکارییەکانی.

ج- ڕای سێیەم کە لەڕاستیدا ئەوە زیاتر ڕای خۆمە، ئەوەیە کە (شِرْعَة)، واتە: ئەو حەڵاڵ‌و حەرام‌و یاساو فەرمان‌و قەدەغانەی کە لە قورئاندا هەن، (مِنْهَاج)یش شێوەی مامەڵەکردنە لەگەڵ ئەواندا، واتە: (شِرْعَة) ئەسڵی بەرنامەکەیە، وە (مِنْهَاج)یش ڕێبازو میتۆدو شێوەو چۆنیەتی میکانیزمی جێبەجێکردنی ئەو بەرنامەیە، کە بە تەئکید قورئان وەك چۆن بەرنامەیە، شێوەو شێوازی جێبەجێکردنیشی هەر لە نێوخۆیدا هەیە کە: دەبێ پلە پلەیی هەبێ، دەبێ لە پێشترەکان ڕەچاوبکرێن چی لە پێش چییەوەیە؟ وە دەبێ هەلومەرجی جێبەجێکردنی ئەو حوکمە بڕەخسێ، تا ئەو حوکمە جێبەجێ بکرێ ... هتد.

لێرەدا پرسیارێك دەکرێ: لە لایەکەوە خوا دەفەرموێ: ﴿شَرَعَ لَكُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا وَصَّىٰ بِهِۦ نُوحًا وَٱلَّذِيٓ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ وَمَا وَصَّيۡنَا بِهِۦٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ وَعِيسَىٰٓ ... ﴿١٣﴾﴾ الشورى، واتە: ئەو بەرنامەیەی لە دین بۆی داناون، هەمان شتە کە نووحی پێ ڕاسپاردوە، وە ئەوەی کە بۆتۆمان ناردوە، وە ئەوەی کە بۆ ئیبراهیم‌و ئیسماعیل‌و بۆ مووساو عیسامان ناردوە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە خوا یەك بەرنامەو ئایینی ناردوە، لە نووحەوە تا پێغەمبەری خاتەم (علیهم الصلاة والسلام)، کەچی لێرەشدا دەفەرموێ: ﴿لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗا﴾، واتە: بۆ هەرکامێکتان بەرنامەو ڕێبازێکمان داناوە، ئنجا ئایا ئەو دوو ئایەتە

پێکەوە ناکۆك نین؟! لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، چونکە بنچینە گشتی یەکانی ئایین و حەڵاڵ و حەرامە سەرەکییەکان، هاوبەشن، لە هەموو بەرنامە ئاسمانییەکاندا یەکن، نەك تەنیا لە بواری عەقیدەدا، بەڵکو لە بواری حەڵاڵ و حەرام و ئەمرو نەهی و شتە سەرەکییەکاندا، هەموو کتێبە ئاسمانییەکان یەکن، بەڵام هەر بەرنامەیەش بەپێی هەلومەرجە جۆراو جۆرەکان، تایبەتمەندیی خۆی بووە لە وردەکارییەکاندا، مەبەست ئەوەیە کە دەفەرموێ بۆ هەرکامێکتان (شِرْعَة)و (مِنْهَاج)ێکمان ناردوە، واتە: هەر کام لەو بەرنامانە وردەکاریی و مۆرکی تایبەتی ئەو هەلومەرجەو ئەو کاتەی کە ئەو ئۆممەتە تێیدا ژیاوە، پێوەیە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾، ئەم ڕستە قورئانییە چەند شتێکی لێوەردەگیرێ:

١) کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً ﴾، یانی: ئەگەر خوا ویستبای یەك کتێب و بەرنامەی بۆ هەمووتان دەنارد، ئەوکاتە دەبوون بە یەك کۆمەڵ، یەك ئۆممەت، بەڵام خوا نەیویست وا بکات، ئەمە یانی چی؟ یانی حیکمەتی خوا وای خواستوە کە شەریعەت دابەش ببێ بۆ قۆناغی جۆراوجۆر بۆ چەند ئۆممەتێك، وە بۆ هەرکام لەو قۆناغانەو ئەو ئۆممەتانە کە لەو قۆناغانەدا ژیاون، بەرنامەیەکی تایبەتی بنێرێ، کە لە وردەکارییەکاندا جیابێ، لەوی دیکە، بەڵام لە چەمکە گشتییەکاندا هەموو یەکن، ئنجا خوا دەیتوانی وابکات خەڵك بکات بەیەك بۆچی واینەکردوە؟ حیکمەتی وای خواستوەو لەڕاستیدا خوا ﷻ ویستوویەتی مرۆڤایەتی ئازادبێ، چونکە لە دواییدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ﴾، بەڵکو خوا ویستوویەتی تاقییتان بکاتەوە، تاقیکردنەوەش بەبێ ئازادیی نابێ، لەگەڵ تاقیکردنەوە هاتە پێش، دەبێ ئازادیی هەبێ، لەگەڵ ئازادیی هەبوو جۆراوجۆریی دەبێ، تۆ تەماشا بکە! ئەو

شوێنەی کە ڕژێمێکی دیکتاتۆریی لێیە، کەسێك خۆی دەسەپێنیو خەڵك هەمووی یەك شێوە قسە دەکات، کاتی خۆی (صَدام) نەیدەگوت: (إِذَا قَالَ صَدامُ قَالَ العِرَاق) تەواو هەمووی یەك قسەیە، کۆڕسە! کە دیارە لەو حاڵەتەدا خەڵك ئارەزووی خۆیو بۆچوونی خۆی کپ دەکاتو، خۆی لەگەڵ ئەودا دەگونجێنێ، بیستوومە هەندێك لەو سەرکردە دیکتاتۆرانە وایانکردوە، کە ئەگەر ئەو پژمی، ئەوانیش هەمووی بپژمن، وە ئەگەر ئەو کۆخی، ئەوانیش هەموو بکۆخن!! وەك چۆن قازێك دەقیرێنی هەموو دەقیرێنن، یان کە مەڕێك دەڕوا ئەوانی دیکە هەمووی سەری لە دوو دەنێن، ئەو دیکتاتۆرانە خەڵکیان ئاوا دەوێ، دەیانەوێ خەڵك هەمووی وەك ڕەوە قاز بکەن، یان وەك ڕانە مەڕێك سەریان لە دوو بنێن، بێ ئەوەی بزانن بەرەو کوێ دەچن! ئەگەر مەڕێك هەڵبدێرێ لە شاخێك (١٠٠- ٢٠٠) مەڕیش لە دوای وی هەڵدەدێرێ! چونکە مەڕ کە دەڕۆن، تەماشای پێش خۆیان ناکەن، بزانن ئەوەی پێشی چی لێ هاتوە؟ ئنجا خوای کاربەجێ نەیویستوە بەشەر وابێ، بەڵێ دیکتاتۆرەکان وایان لێدەکەن، بەلاّم ئەوە پێچەوانەی ویستی شەریعەتی خوایە، پێچەوانەی حیکمەتی خوایە، ویستی خوا، واتە: ئەو ویستەی خوا کە لە شەریعەتدا بەرجەستەیە، نەك ویستی دروستکردنی (الإرادة التكوينية)، چونکە هیچ کەس ناتوانێ پێچەوانەی ئیرادەی تەکوینی خوا بجووڵێتەوە، بەلاّم دەکرێ مرۆڤ پێچەوانەی ویستی تەشریعیی (الإرادة التشريعية)ی خوا بجووڵێتەوە، بەڵێ خوای بەرز لە شەریعەتی خۆیدا وای پێ باش بووە، کە خەڵك جۆراو جۆر بێ، دوایی کە دیکتاتۆرێك دێ لە ماوەیەکی دیارییکراوداو بۆ ماوەیەکی کەم، ناچاریان دەکات، هەموویان وەك یەك بیربکەنەوە، یان هەموو وەك یەك قسە بکەن، لەڕاستیدا ئەوە حاڵەتێکی نامۆو ناسروشتییە، وەك لەم ئایەتانەدا خوای پەروەرگار پێشانمان دەدات، دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ لَأٓمَنَ مَن فِي ٱلۡأَرۡضِ كُلُّهُمۡ جَمِيعًاۚ أَفَأَنتَ تُكۡرِهُ ٱلنَّاسَ حَتَّىٰ يَكُونُواْ مُؤۡمِنِينَ ٩٩﴾ يونس، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای، خەڵکی سەر زەوی تێکڕا ئیمانیان دەهێنا، ئایا تۆ زۆر لە خەڵکی دەکەی تاکو ئیمانداربن، واتە: من بە خوایەتیی خۆم زۆرم

لێ نەكردوونو ویستوومە ئازادبن، ئایا ئەی موحەممەد! تۆ دەتەوێ زۆریان لێ بكەی! بۆت نیە، وە خوا ﷻ لە سوورەتی (هود)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ شَآءَ رَبُّكَ لَجَعَلَ ٱلنَّاسَ أُمَّةً وَٰحِدَةً ۖ وَلَا يَزَالُونَ مُخْتَلِفِينَ ﴿١١٨﴾﴾، واتە: ئەگەر پەروەردگارت ویستبای خەڵكی دەكردە یەك كۆمەڵ، بەڵام بەردەوام ڕاجیان.

٢) كە دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ﴾، واتە: هەر كەس بەپێی بەرنامەی خۆی تاقی دەكرێتەوە، ئایا پێوەی پابەند دەبێ، یان پێوەی پابەند نابێ، مانایەكی دیكەی ئەوەیە كە: ئایا هەر كامێك لە ئێوە ئامادە دەبێ دەست هەڵبگرێ لە بەرنامەیەكی تایبەت بە سەردەمو ڕۆژگارێك، دوای ئەوە خوا بەرنامەیەكی دیكە دەنێرێ، ئایا جوولەكە ئامادە بوون دەست لەوە هەڵبگرن، كە لە تەورات لادراوە، وە ئەوەی لە ئینجیل هاتۆتە جێی، پێوەی پابەندبن؟ ئایا نەصرانیی ئامادە بوون دەست لەوە هەڵبگرن كە لە كتێبەكانیاندا حوكمەكەی لابردراوەو قورئان هاتۆتە شوێنی؟

خوا ﷻ بەوە تاقییتان دەكاتەوە، وە دیاریشە لەڕاستیدا زۆر لە خاوەن كتێبەكان لەو تاقیكردنەوانەدا دەرنەچوون، چونكە دەمارگیر بوون، من جارێك لە زیندانی ئەمریكییەكاندا لەگەڵ یەكێك قسەم كرد، كە ئیددیعای ئەوەی دەكرد كە زانیاریی قووڵی دەربارەی كتێبی موقەددەس هەیە، گوتی: ئایا ئەگەر ئێوەی مسوڵمان ببنە جوولەكە، یان ببنە نەصرانیی چییە؟ خۆ تەوراتو ئینجیلییش هەر كتێبی خوان، ئێوە ناڵێن: ﴿لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِۦ﴾، گوتم: با، جیاوازییان ناخەینە نێوان، گوتی: دەجا قەیدی چییە، ببنە جوولەكەو نەصرانیی، ئێوە هەر بە دوای پێغەمبەری خوا دەكەونو زەرەرتان نەكردوە؟ گوتم: ڕاستە، بەڵام ئەگەر ئێمە ببینە جوولەكە، یان نەصرانیی، مانای وایە بەرەو دوا گەڕاوینەوە، بەس ئێوە كە دەبنە مسوڵمان بەرەو پێشەوە دێن، گوتی: چۆن؟ گوتم: خوا ﷻ تەوراتی سێ هەزارو پێنج سەد ساڵ پێش ئێستا ناردۆتە خوار، وە ئینجیلی دوو هەزار ساڵ زیاتر پێش ئێستا ناردۆتە خوار، ئنجا منێكی مسوڵمان ئەگەر بە دوای ئینجیلێك بكەوم كە

دوو هەزار ساڵ پێش ئێستا هاتوە، مانای وایە بەرەو دوا گەڕاومەوە، بەڵام تۆ دوای ئەوەی ئیمان بە قورئان دێنیّ، کە سێ هەزار یان دوو هەزار ساڵ دوای کتێبەکەی تۆ هاتۆتە خوار، مانای وایە تۆ بەرەو پێش هاتووی، ئەوە لەلایەك، ئنجا کەسێك کە ئیمان بە قورئان دێنیّ، مانای وایە کە ئیمانی بە تەوراتو ئیجیلیش هەر هێناوە، ئەوانی لەدەست نەچوون، وە کەسێك کە ئیمان بە موحەممەد ﷺ دێنی ئیمانی بە مووساو عیساش هەر پاراستوە لە خۆیدا، بەڵام مسوڵمانێك بگەڕێتەوەو ببێتە جوو، موحەممەدو عیسای لە دەست دەچن، وە ئەگەر بشبێتە دیان، موحەممەدی لە دەست دەچیّ، مانای وایە ئێوە کە مسوڵمان بن، قازانج دەکەن زیان ناکەن، بەڵام ئێمە ببینە جوو یان دیان، زۆرمان زەرەرە! کابرا خۆشی بە شارەزا دەزانی، ئیدی تەماشای یەکدییان کردو گوتیان: بەڕاستی وەڵامەکەت زۆر مەنتیقییە، ئەوانە عادەتیان وایە شتێك کە بە هەقیان زانی لێی بیّ دەنگ دەبن، ئەگەر بواریان هەبیّ وەریشی دەگرن!.

٣) کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ ﴾، واتە: هەرکامێکتان بە پێی بەرنامەی خۆی خێرایی بکات لە چاکەکاریدا، وە هەوڵ بدەن لە چاکەدا پێشەنگ بن، لە جیاتی ئەوەی بە دەمارگیرانە هەرکەس دەست بە کتێبی خۆیەوە بگریّ، بزانن لە کتێبەکانتان چ شتێکی باش هەیە، دەستی پێوە بگرن، کە وەك گوتم ئەگەر خاوەن کتێبەکان وا بکەن لەگەڵ مسوڵمانەکان، دنیا زۆر دەگۆڕیّ.

٤) کە دەفەرموێ: ﴿ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ﴾، واتە: ڕاجیاییەکانی یەکدی تەحەممول بکەن، وە خوا دادگەرە، وە دنیا مەکەنە شوێنی تەصفیە حیساب، جوولەکەو نەصرانیی بە تەما نەبن کە مسوڵمان دەستبەرداریی مسوڵمانەتییەکەی بیّ، دەبیّ جیاوازیی یەکدی تەحەممول بکەن، مسوڵمانیش بە هەمان شێوە کابرای جوولەکەو نەصرانیی کە مسوڵمان نابن، بۆی نیە بە زۆر مسوڵمانیان بکات، بەڵکو دەبیّ یەکدی تەحەممول بکەن، لە چاکەدا پێشبڕکە بکەنو، بەڵام ڕاجیاییەکانتان هەڵگرن، قۆناغێکی دیکە دیّ، کاتێکی دیکە دیّ، خوا هەقو ناهەقان لێك جیا دەکاتەوە.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ ﴾، واتە: وە حوکم بکە بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوارێ، وە دادوەریی یان لە نێواندا بکەو، بە دوای ئارەزووویان مەکەوە، وە وریابە لات نەدەن لە هەندێك لەوەی خوا ناردوویەتە خوار، لێرەدا جەخت کراوەتەوە لەسەر دادوەریی کردن بەپێی وەحی خوا، وە وریا بوون لە شوێنکەوتنی ئارەزووەکانیان، ئەوە چی لێ وەردەگیرێ؟ هەمیشە بەدیلی وەحی شوێنکەوتنی ئارەزووە، بەدیلی (هُدى)، (هَوى)یە، ئەوەی بە دوای (هُدى) نەکەوێ، لە چاڵی (هَوى) دەکەوێ، ئنجا یان بە دوای هەوای خۆی دەکەوێ، یان بە دوای هەوای یەکێکی دیکە دەکەوێ، خواش ﷻ بەرنامەی خۆی و رێنمایی خۆی ناردوە بۆ ئێمە، تاکو لە چنگ ئارەزووی خۆمان و ئارەزووی خەڵك رزگار بین و نەکەوینە شوێن ئارەزووەکان.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ ﴾، بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بەڵام کوردەواریی خۆمان دەڵێن: دیوار لەگەڵ تۆمە گوێسوانە گوێت لێبێ، ئەگەر پێغەمبەر ﷺ پێویستی بەوە هەبێ وریابێ لاینەدەن، دەبێ ئێمە چەندمان پێویست بێ؟! دیارە (يَفتِنُوكَ) یانی: (يَصْرِفُوك، يَخْدعُوكَ)، کەواتە: دەبێ مسوڵمانان لە نامسوڵمانان وریابن، جا چ ئەهلی کیتاب بن، چ ئەوانە بن کە بروایان بە هیچ کتێبێك نیە، وریا بن لایان نەدەن لە هەندێك ئەوەی خوا ناردوویەتە خوار، دیارە ئەهلی کوفر بە کەمە لادانێکی ئێمەش لە هەق، قەناعەت دەکەن، ئەگەر تۆزێکیش لابدەین، هەر پێیان چاکە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴾:

١/ بۆیە دەفەرموێ: ﴿ بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡ ﴾، چونکە کەمێك لادان بایی سزای دنیاییەو سزای دنیایی لەسەرە، بەڵام لادانی تەواو، یاخود گوناهەکانیان بە تەواویی، لە

کوێ سزای پڕ بە پێست وەردەگرنەوە؟ لە قیامەت، بەڵام سوننەتی خوایە بەشێك لە گوناهەکان لە دنیادا سزایان دەداتەوە، وەك لە سوورەتی (الروم)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِى ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِى ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِى عَمِلُوا۟ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴿٤١﴾ ﴾، واتە: خراپەو ئاشووب لە تەڕو وشك (لە دەریاو وشکانیی)دا دەرکەوت، بە هۆی کردەوەی خەڵکەوە، (واتە: بە هۆی کردەوە خراپەکانیانەوە) تاکو سزای بەشێك لە کردەوە خراپەکانیان پێ بچێژێ، بۆئەوەی بگەڕێنەوە.

ئێستا ئەو هەموو جۆرە نەخۆشییە وەك: ئایدزو زوهرییو سەیلانو ئەو نەخۆشییانەی دیکە کە بە هۆی زیناو تاوانو ئینحرافی جنسییەوە پەیدا دەبن، بۆئەوەی خەڵك بێتەوە سەرخۆی، ئەو هەموو نەخۆشییانەی کە لە جگەرەکێشانو شەڕابو قومارو لە حەرام خواردنەوە پەیدا دەبن، حیکمەتیان چییە؟ ئەوەیە کە خەڵك بگەڕێتەوە، وە ئەوە باجێکی کەمی گوناهو تاوانەکانە کە ئینسان لە دنیادا دەیدات، بەڵام سزای پڕ بە پێستی تاوانەکان، لە ڕۆژی قیامەت دایە.

٢/ کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴾، وە زۆربەی خەڵکی، (واتە: لەسەر ئاستی مرۆڤایەتیی) لارێن، تەماشا بکەن! هەمیشە قورئان خۆی لە گشتاندن (تعمیم) دەپارێزێ، تاکو ئێمەش فێری ئینصاف بین، بڵێین: زۆر لە خەڵکی لارێن، نەڵێین: هەموو خەڵکی لارێن، یان خوا باسی ئەهلی کتێب دەکات دەفەرموێ: زۆریان وان، نافەرموێ: هەموویان وان.

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾، ئایا دادوەرییو بەرنامەی نەفامیی دەخوازن؟! ئایا حوکمی کێ لە هی خوا چاکترە بۆ کەسانێك کە بڕوایەکی پتەویان هەبێ، خوای پەروەردگار چەند شتێکی بە ناوی نەفامیی هێناون لە قورئاندا:

١- ﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ﴾، حوکمی نەفامیی.

٢- ﴿ وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٣٣﴾ ﴾الأحزاب. خۆڕازاندنەوەی نەفامیی.

٣- ﴿ ... يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ... ﴿١٥٤﴾ ﴾آل عمران، گومانی نەفامانە.

٤- ﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ... ﴿٢٦﴾ ﴾الفتح. دەمارگیریی نەفامیی.

کەواتە: جاری وایە ڕەوشتو ڕەفتارو هەڵسوکەوتو خۆڕازاندنەوەو جوانیی خۆدەرخستن نەفامانەیە، وە جاری وایە گومان نەفامانەیە، گومانی ئەوە بە خوا بەری کە شایستەی نەبێ، وە جاری وایە تووڕە بوونو دەمارگیریی نەفامانەیە، چونکە گومانی هەقیش هەیەو تووڕەیی هەقیش هەیە، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ، کە نەفامیی قۆناغێکی مێژوویی نیە تێپەڕبێ، بەڵکو جۆرێك لە بیرکردنەوەو جۆرێك لە هەستو نەستو جۆرێك لە ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکە، لە نەزانینو ئارەزوو و دەمارگیریی ئینسانەوە سەرچاوە دەگرێ.

واتە: نەفامێتیی شتێك نیەو قۆناغێك نیە تێپەڕی بێ، وەك (مُحَمَّد قُطْب) خوا پاداشتی بداتەوە لە کتێبی (جاهلیة القرن العشرين)دا جوانی ڕوون کردۆتەوە، دەڵێ: نەفامێتیی قۆناغێك نیە تێپەڕی بێت، بەڵکو حاڵەتێکە ئینسان تێیدا دەژی، هەر کەسێك لە خوا دوورکەوتەوە، تووشی حوکمی نەفامیی دەبێ، ئەگەر بە دوای حوکمی خوا نەکەوت لە بیرکردنەوەی هەستو نەستدا، بیرکردنەوەی بەرانبەر بە خوا نەفامانە دەبێ، لە بەرگو پۆشاکدا خۆڕازاندنەوەی نەفامانە دەکات، وە لە دەمارگیریدا هەڵوێستی نەفامانەی بۆ دروست دەبێ، هەروەها لە هەڵسوکەوتو ڕەفتاردا، ئنجا ئایا ئەو حاڵەتە لە چییەوە دروست دەبێ؟ لە دوورکەوتنەوەی ئینسان لە بەرنامەی خوا، بۆیەش خوا بە حوکمێکی غەیرە ئیسلامییو، هەڵسوکەوتو ڕەفتارو، گومانێکی خراپ

دەفەرموێ: نەفامانەیە، چونکە لەڕاستیدا ئەوەی خوا دەیفەرموێ، چ دەربارەی یاساکانی ژیان بێ، چ دەربارەی عەقیدە بێ، چ دەربارەی ڕەوشت بێ، چ دەربارەی باری کەسێتی بێ، دەربارەی هەرشتێك بێ، خوا لەسەر بناغەی عیلمو حیکمەت دەیفەرموێ، عیلمێکی بێ سنوور، حیکمەتێکی بێ کۆتایی.

بەڵام ئەوەی ئینسان دەیڵێ، زۆرجار لەسەر بناغەی هەواو ئارەزووی خۆی، یان هەواو ئارەزووی کەسێکی دیکە، یان لەسەر بناغەی گومان، یان لەسەر بناغەی زانیارییەکی کەم، دەیڵێ بۆیە ئەوەی ئینسان بە زۆری نەزانینی لەگەڵ تێکەڵ دەبێ، وە ئەوەی خوای پەروەردگار لە زانیارییەکی بێ خلّتەوەو، حیکمەتێکی بێ خلّتەوەو، ڕەحمەتو بەزەییەکی بێسنوور تێرو تەواوەوە، سەرچاوە دەگرێ.

لە کۆتاییدا خوای بەرز کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴾، حوکمی کێ چاکترە لە هی خوا، بۆ کۆمەڵێك کە یەقینیان هەبێ؟! واتە: زانیارییەکی تەواویان هەبێ، یان ئیمانێکی تەواویان هەبێ، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێ: (قەدری زێڕ لای زێڕنگەرە) کەسانی زاناو شارەزا قەدری ئیسلامو یاساو ڕێساکانی شەریعەتی پڕ حیکمەتی خوا دەزانن، بەڵام ئەوەی نەزان بێو، سەرکێڵ بێ، ئارەزووباز بێو، خاوەن بەرژەوەندی ناشەرعیی بێ، ئەوە شتێکی چاوەڕوان کراوە، بە ئیسلام ڕازی نەبێ بۆچی؟ چونکە بناغەی یەقینی نیە، ئنجا یەقین چ بە مانای بڕوای پتەو بێ، چ بە مانای زانیاری ڕاستو بەرچاوڕوونیی تەواو.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی سێزدەیەم

## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسەمان لە سێ ئایەت پێكدێ، لە ئایەتەكانی (٥١ - ٥٣) كە تێیانـدا خـوای كاربەجـێ فەرمـان بە بڕواداران دەكـات كە جوولەكـەو نەصـرانییەكـان بـە دۆست نـەگرن‌و پشتیان پێنەبەستن، وە ڕایدەگەیـەنێ كـە جوولەكـەو نەصرانییەكان دۆستو پشـتیوانی یەكـدین، پاشـان هەڕەشـەیەكی گـەورەیان لێـدەكاتو دەفـەرموێ: وە هـەر كەسێك لـە ئێـوە ئـەوان بـە دۆست بگـرێ، لـە ڕیـزی ئەوانـدا حیسـاب دەكـرێو، بـە ستەمكاریش دادەنـرێو، ڕێنمـایی خوا نایگرێتـەوە.

پاشـان لـە ئایـەتی دووەمـدا ڕوونـی دەكـاتەوە كـە ئـەوە دڵنـەخۆش‌و دەغەڵەكـانن خێـرایی دەكـەن، لـە دۆستایەتیی كردنـی جوولـەكەو نەصـرانییەكاندا، بـە بیـانووی ئـەوە كـە لـە بـەڵاو كارەسـات دەترسـێن‌و دووربینیـی بۆخۆیـان دەكـەن! خـوای باڵادەسـتیش بـۆ بەرپەرچـدانەوەی ئـەو بروبیـانووانە دەفـەرموێ: نـزیكە خـوا ﷻ سـەركەوتنێك یان گۆڕانكارییەكی تایبـەت لە هاوكێشـەی هێزەكـاندا بێنێتـەدی، كە ئـەو جۆرە كەسـانە لەسەر ئەو گومان‌و خولـیاو بەدبینـی یانەی خۆیان پەشـیمان ببنـەوە.

ئنجا لە ئایـەتی سێیەمیشـدا هەڵوێسـتی ئیمانـداران - كە ئەگـەری هـەیـە بێتـەدی پـاش گۆڕانكاریـی لـە بـارودۆخ دا - دەخاتـەڕوو، كـە زۆر نـزیكە ئیمـاندارانیش بـە سەرسـوڕمانەوە بەرانبـەر بـەو جـۆرە كەسانە بڵێن: ئایـا ئەوانـە بـوون كـە سـوێندی پتـەویان دەخوارد كە لەگـەڵ ئێـوەن؟! كەچی ئێسـتا بە هـۆی ئـەو هەڵوێسـتانەیانەوە، كردەوە باشـەكانیان هەڵوەشاونەوەو لە زیانبـاران بوون، ئایا ئەوانـە بـوون پێیـان وابـوو ئیماندارن، لە ڕیزی مسـوڵمانان دان! كەواتـە: خـەیاڵ پـلاویان كـردوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ
وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي
قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ
بِٱلۡفَتۡحِ أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ فَيُصۡبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ
ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ
فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾﴾

## مانای وشــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! جوولەکـەو نەصـرانییەکان بـە دۆسـت مەگـرن، ئـەوان هەنـدێکیان دۆسـتو پشـتیوانی هەندێکیـانن، وە هـەر کـەس لـە ئێـوە دۆسـتایەتییان بکـات ئـەوە لەوانـە، بێگـومان خـوا ﷻ ڕێنمـایی کۆمـەڵی سـتەمکاران ناکـات ﴿٥١﴾ ئنجـا تۆ هەمیشـە ئەوانـەی دڵیـان نەخۆشـیی (نیفاق) تێدایـە، دەیـانبینی کە خێرایی دەکەن لە دۆسـتایەتیی کـردن (ی جوولەکـەو نەصـرانیی)یاندا، (بـە پاسـاوی ئەوە کە) دەڵێن: دەترسین بـەڵامان تووشـبێ، زۆریـش نـزیکە خـوا سـەرکەوتنێك (بـۆ مسوڵمانان) بێنێتە پێش، یان گۆڕانکارییەك لەلایـەن خۆیەوە بکات، وە سـەرەنجام ئـەو جۆرە کەسانە لەسەر ئەوەی کە لـە دڵیانـدا پـەنهانی دەکـەن (لە گومـانی خـراپو تـرسو خولیـای ترسـنۆکانە) پەشـیمان ببنـەوە ﴿٥٢﴾ وە لـە ئاکـامدا بڕوادارانیـش بڵـێن: ئایـا ئـەوانە بوون کە سـوێندی گەورەیان بە خـوا دەخـوارد، کە لە ئێـوەن (کەچی ئـەوەش هەڵوێسـتیانە)؟! بــە دڵنیـایی یـەوە ئـەو جـۆرە کەسـانە (لـە سـۆنگەی ئـەو هەڵوێسـتانەیانەوە) کردەوە باشـەکانیان هەڵوەشـانەوەو لە زیانبـاران بووون﴿٥٣﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(أَوۡلِيَآءَ): كۆی (وَلِي)یە، وەلی بە كوردی ئێمە دەڵێین: دۆست، نزیك، خۆشەویست، بە مانای پشتیوان دێو، بە مانای یارمەتیدەریش دێ، لەڕیشەدا لە چییەوە هاتوە؟ (الوَلاَءُ وَالتَّوَالِي: أَنْ يَحْصُلَ شَيئَانِ فَصَاعِداً حُصُولاً لَيْسَ بَيْنَهُمَا مَا لَيْسَ مِنْهُمَا، وَيُسْتَعَارُ ذَلِكَ لِلْقُرْبِ مِنْ حَيْثُ المَكَانُ، وَمِنْ حَيْثُ النِّسْبَةُ، وَمِنْ حَيْثُ الدِّينُ، وَمِنْ حَيْثُ الصَّدَاقَةُ والنُّصْرَةُ وَالإِعتِقَادُ) وشەی (وَلِي) لە ڕیشەدا (وَلِيَ يَلِي)یە، واتە: (قَرُبَ يَقْرُبُ)، (يَلِيهِ)، واتە: بە دوای دادێ، دەڵێ: (وَلاءُ، تَوَالِي) ئەوەیە كە دوو شت یان زیاتر بە دوای یەكدا بێن، كە شتێكی نامۆیان لە نێواندا نەبێ، یەكسەر بە دوای یەكدا بێن، وە ئەوە خوازراوەتەوە بۆ نزیكیی، واتە: وشەی (وَلِي، تَوَالِي) بۆ نزیكی خوازراوەتەوە لە ڕووی شوێنەوەو لە ڕووی نسبەتەوە (بۆ وێنە: باب و كوڕ، یان براو ، برا یان ژن و مێرد)و لە ڕووی دینەوە (هاودین بن) لە ڕووی پشتگیریی كردنەوە (پشتگیریی یەكدی بكەن)و لە ڕووی برادەرایەتیی و هاوەڵایەتیی یەوە، یان لە ڕووی عەقیدەو بڕوا پێ بوونەوە.

(يَتَوَلَّهُم): پشتیان پێ ببەستێ، بە دۆستیان بگرێ، لێیان نزیك بێ، (تَوَلَّى إِذَا عُدِّيَ بِنَفسِهِ اقْتَضَى مَعْنَى الوَلاَيَةِ، وَإِذَا عُدِّيَ بـ (عَنْ) لَفْظَاً أَوْ تَقْدِيراً، اقْتَضَى مَعْنَى الإِعْرَاضِ: فَإِنْ تَوَلُّوا)، وشەی (تَوَلَّى) ئەگەر بۆخۆی تەعەددا بكات بۆ (مفعول) ئەوە مانای وەلایەت و نزیكیی و دۆستایەتیی دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بە وشەی (عَنْ) تەعەددا بكات، جا چ بە بێژە (لَفْظ) یان (تقدیر) ئەوە مانای پشت تێكردن دەگەیەنێ، (تَوَلاَّهُ)، واتە: دۆستایەتی كرد، (تَوَلَّى عَنْهُ)، واتە: پشتی تێكرد، واتە: پێچەوانەی دۆستایەتیی كردن، كە لێرەدا دەفەرمویێ: (فَإِن تَوَلَّوا)، ئەگەر پشتیان هەڵكرد، واتە: پشتیان تێكرد.

(فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ): واتە: لە دڵیاندا نەخۆشیی هەیە، ئەو وشەیە خوای پەنهانزان بۆ دوو جۆرە كەسان بەكاری دێنێ، جاری وایە بۆ مونافیقان بەكاری دێنێ، جاری

واشە بۆ مسولمانانێكی ئیمان لاواز بەكاری دێنێ، ئەوەی من بۆم دەركەوتوە مەرج نیە هەمیشە كە دەفەرموێ: (فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ) مەبەست پێی موناقیقەكان بێ، جاری وایە مەبەست پێی مسولمانانێكی ئیمان لاوازە، بە بەڵگەی ئەوە كە لە سوورەتی (الأنفال)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ إِذْ يَقُولُ ٱلْمُنَٰفِقُونَ وَٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ ...﴿٤٩﴾ ﴾، واتە: كاتێك كە موناقیقەكانو ئەوانەی كە دڵیان نەخۆشیی تێدایە دەڵێن، جا موناقیقەكان ئەوە دیارن، وە مادام بە (و) عەطف كراوەتەوە سەر، ﴿ ٱلْمُنَٰفِقُونَ ﴾، كە دیارە موناقیقەكانیش دڵیان هەر نەخۆشیی تێدایە، بەڵام موناقیقەكان نەخۆشییەكە سەرتاپای دڵی داگرتوون، بەڵام دەگونجێ ئینسانی مسولمان سیفەتێكی، یان چەند سیفەتێكی موناقیقانی تێدابن، بەڵام نەبووبێتە موناقیقی تەواو، دڵی نەخۆشە، بەڵام نەخۆشییەكە بە تەواویی بەسەریدا زاڵ نەبووە نەبۆتە موناقیقی تەواو، كە بەشی بە ئیسلامەوە نەمێنێ، دەڵێ: (الْمَرَضُ: الخُرُوجُ عَنِ الإعْتِدَالِ الخَاصِّ بالإنْسَانِ، جِسْمَاً وَرُوحَاً) واتە: (مَرَض)، بریتییە لە دەرچوون لە حاڵەتی هاوسەنگیی و تەندروستیی كە تایبەتە بە ئینسانەوە لە ڕووی جەستەیەوە، یاخود لە ڕووی ڕووحیی، كەواتە: ئینسان دەگونجێ لە ڕووی جەستەییەوە نەخۆشبێ، دەگونجێ لە ڕووی ڕووحییەوە، كە دیارە نیفاقو شیركو كوفرو ئیلحادو ئەوانە نەخۆشیین، تووشی ڕووح دەبن، وەك چۆن جەستەش تووشی سیلو سەرەتانو نەخۆشیی دیكە دەبێ.

(دَآئِرَةٌ): (الدَائِرَةُ: عِبَارَةٌ عَنِ الخَطِّ الْمُحِيطِ... ثُمَّ عُبِّرَ بِهَا عَنِ الحَادِثَةِ وَالدَّورةِ وَالدَّائِرَةِ في المَكروهِ كَمَا يُقَالُ الدَّوْلَة في المَحْبُوب)، وشەی (دَائِرَة) لە ئەسڵدا بریتییە لەو هێڵەی كە دەوری شتێك دەدات، بازنە، دوایی بەكارهێنراوە لەجیاتی ڕووداوو كارەسات، بۆچی؟ وەك چۆن بازنە دەوری شت دەدات، ڕووداویش كە ڕوودەدات دەوری ئەو خەڵكە دەدات كە بەسەریان هاتوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ ... عَلَيْهِمْ دَآئِرَةُ ٱلسَّوْءِ ... ﴿٩٨﴾ ﴾التوبة، واتە: بازنەی

خراپو بەلای خراپیان بەسەر بێ، کە کەسیان چەپاڵە نەدا، جا دەڵێ: (الـدَّورةُ وَالدَّائِرَةُ في المَكروهِ كَمَا يُقَالُ الدَّوْلَة في المَحْبُوب) هەر دوو وشەی (دورة، دائرة) بۆ شتی خراپ بەکاردێن، بەڵام وشەی (دولة) بۆ شتی باش بەکاردێ، وەك خوای زاناو شارەزا لە سوورەتی (الحشر)دا دەفەرموێ: ﴿... كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ ... ﴿٧﴾﴾، واتە: بۆئەوەی ماڵو سامان تەنیا لە دەستی دەوڵەمەندەکاندا خڕ نەبێتەوە.

(بِالْفَتْحِ ): (الفَتْحُ: إِزَالَةُ الإِغْلاقِ وَالإِشْكالِ، وَالفَتْحُ: النُّصْرَةُ والظَّفَرُ والحُكْمُ)، (فَتْح) لە ئەسڵدا بە مانای لابردنی داخران و گرێ کوێرەیەکە، بەڵام دوایی وشەی (فتح) بەکارهێنراوەو خوازراوەتەوە بۆ سەرکەوتن و بردنەوەو بالادەستی.

(جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ ): واتە: سوێندێك کە ئەوپەڕی توانای خۆیان تێدا بەکارهێناوە، (الجَهْدُ وَالجُهْدُ: الطَّاقَةُ وَالمَشَقَّةُ)، (جَهْدُ و جُهْد) بە مانای وزەو، بە مانای شتێك دێ، کە ئینسان بەزەحمەت بۆی بکرێ، (وَجَهْدَ أَيمَانِهِم: أَبْلَغَ الأيمان وَأَقْوَاهَا وَأَوكَدُوهَا)، یانی: سوێندێك کە بگاتە ئەوپەڕی، وە زۆر بەهێز بێ، زۆر داکۆکیی لەسەرکراوبێ.

(حَبِطَتْ )، واتە: هەڵوەشاوەتەوە، لەبەین چووە، (أَصْلُ الحَبْطِ مِنَ الحَبَطِ، وَهُوَ أَن تُكثِرَ الدَّابَةُ أَكْلاً حَتَّى يَنْتَفِخَ بَطْنُهَا...) وشەی (حَبْط) لە ئەسڵدا لە (حَبَط)ەوە هاتوە، کە حاڵەتێکە تووشی ئاژەڵێك دێ، زۆر لەوەڕێ دەخوات، تاکو زگی دەئاوسێ و دەمرێ.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی هـەر سـێ ئایەتـە کـە دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥١﴾ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴿٥٢﴾ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴿٥٣﴾﴾ ﴿رَوَى إِبْنُ جَرِيرٍ عَنْ عَطِيَّةَ بْنِ سَعْدٍ قَالَ: جَاءَ عُبَادَةُ بْنُ الصَّامِتِ رضي الله عنه مِنْ بَنِي الحَارِث بن الخَزْرَجِ إِلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ إِنَّ لِي مَوَالِي مِن يَهُودٍ كَثِيرٌ عَدَدُهُمْ، وَإِنِّي أَبْرَأُ إِلى اللهِ وَرَسُولِهِ مِنْ وَلَايَةِ يَهُودٍ، وَأَتَوَلَّى اللهَ وَرَسُولَهُ، فَقَالَ عَبْدُ اللهِ بْنُ أُبَيِّ بْنِ سَلُولٍ: إِنِّي رَجُلٌ أَخَافُ الدَّوَائِرَ، لَا أَبْرَأُ مِنْ وَلَايَةِ مَوَالِيَّ، فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، يَا أَبَا الحُبَابِ! مَا تَجَلَّبَ بِهِ مِنْ وَلَايَةِ اليَهُودِ عَلَى عُبَادَةَ بنِ الصَّامِتِ، فَهُوَ لَكَ دُونَهُ، فَقَالَ: قَدْ قَبِلْتُ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيهِمَا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ...﴾﴾[1]، واتـە: ئیبنو جەریر لـە عـەطییـەی کوڕی سەعد دەگێڕێتەوە کە گوتوویەتی: عوبادەی کوڕی صـامیت خـوا لـێی ڕازی بـێ، (کـە یـەکێك بـووە لـە نوقـەبا، لـەو دوازدە نەقیبـەی کـە پێغەمبـەر ﷺ لـە بەیعـەی عەقەبەی دووەمدا کردنی بـە سـەرپەرشتیاری مسـوڵمانانی ئـەوس و خـەزرەج)، کـە لـە بـەنی حـاریثـی کـوڕی خەزرەجـە، هـات بـۆ لای پێغـەمبەری خـوا ﷺ، گـوتی: ئـەی پێغـەمبەری خـوا ﷺ! مـن هەنـدێك هاوپەیمانـم هـەن لـە جوولەکەکـان ژمارەشیان

---

١) جامع البيان: برقم: (١٢١٥٦).

زۆرە، بەڵام من ئەوە حاشا دەكەم لە دۆستایەتیی كردنو نزیكیی‌و هاوپەیمانەتیی لەگەڵ جوولەكە، وە دۆستایەتیی خواو پێغەمبەری خوا دەكەم (واتە: ئەو پەیمانەی لەگەڵ واندا هەمە بەسەریاندا دەدەمەوە پەیوەندیی‌و كەین‌و بەینم لەگەڵیاندا نامێنێ، لەگەڵ پێغەمبەرو ئەهلی ئیماندا دۆستایەتی دەگرم)، دوایی عبدوڵلای كوڕی ئوبەیی كوڕی سەلوول (كە بە سەرۆكی موونافیقەكانی مەدینە ناسراوە)، گوتی: من پیاوێكم لە بەڵاو موصیبەتان دەترسێم! وە من دەستبەرداری دۆست‌و پشتیوانەكانم، نابم پێغەمبەری خواش ﷺ بە عەبدوڵلای كوڕی ئوبەییەی فەرموو: ئەی ئەبو حوباب (بزانن! پێغەمبەری خوا چەند بەرێز بووە، عەرەب عادەتیان وایە، ئەگەر رێز لە یەكێك بگرن، بە كونیەی بانگی دەكەن، ناوی ناهێنن، لەگەڵ ئەو خراپییەیدا ئەو هەمووە رێزەی لێناوە)، ئەو دۆستایەتیی‌و پشتیوانیی‌و هاوكاریی‌و هاوپەیمانییەی كە تۆ رژدییت پێكرد لە بەرانبەر عوبادەدا (واتە: ئەو بەخشی، بەڵام تۆ نەتبەخشی) با ئەویش هەر بۆ تۆ بێ، (واتە: ئەوەی عوبادەش هەر بۆ تۆ بێ)، ئەویش گوتی: ئەوە قبووڵم كرد، ئیدی خوای زاڵی پایەدار ئەو ئایەتانەی ناردنە خوار دەربارەیان.

## مانای گشتی ئایەتەکان

خوا ﷻ هەر لە سیاقی ئەو ئایەتانەدا کە باسی چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ خاوەن کتێبەکاندا دەکەن، دوای ئەوەی باسی هەڵوێستی ناحەزانەی جوولەکەو نەصرانیی یەکانو هەوڵدانو پیلانگێڕانیان دەکات، بۆئەوەی کە پێغەمبەر ﷺ لە دینی خوا لابدەن، وە تووشی هەڵەی بکەن، "بەڵام خوا پێغەمبەری خۆی پاراستوە"، دوای ئەوە ئنجا ڕوو لە ئیمانداران دەکات بۆ جاری حەوتەم بە نازناوی ئیمان دەیاندوێنێ، لەم سوورەتەدا خوای پەروەردگار (١٦) جار ڕستەی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ی بەکارهێناوە، ئەوە جاری حەوتەمینە، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! ئیمانیان بە چی هێناوە؟ بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ، واتە: بە خوا، بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە پێغەمبەرانی، وە بە ڕۆژی دوایی، بە هەموو ئەو شتانەی کە پێغەمبەر ﷺ لە خواوە هێناونی، ئەی ئیماندارینە! جوولەکەو نەصرانی یەکان بە دۆست مەگرن، (أَوْلِيَاءَ) کۆی (وَلِي)، ئەمیش یانی: دۆست، نزیك، پشتیوان، کەسێك کە پشتی پێ دەبەستیو کەینو بەینت لەگەڵی هەیە، بۆچی؟ دەفەموێ: ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ﴾، ئەو جوولەکەو نەصرانییانە هەندێکیان دۆستو پشتیوانی هەندێکیانن، واتە: هەرگیز لەگەڵ مسوڵمانان دا نابنە پشتیوان، تۆش وا گومان ببەی، وا خەیاڵ پلاو بکەی کە دۆستایەتییت لەگەڵی هەیەو هاوپەیمانی، ئەو لەگەڵت ڕاست ناکات، چونکە ئەوان لەنێو خۆیاندا دۆستو پشتیوانی یەکدین، جا لێرە دا کە دەفەموێ: ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ﴾، ئەمە دوو واتای هەن:

١) واتە: جوولەکە لە نێوان خۆیاندا دۆستو پشتیوانی یەکدین، نەصرانییش لە نێوان خۆیاندا دۆستو پشتیوانی یەکدین.

٢) واتایەكی دیكەی ئەوەیە كە جوولەكەو نەصرانیی دۆستایەتیی یەكدی دەكەن لە نێو خۆیاندا، بەڵام دۆستایەتیی ئێوە ناكەن، ئەی مسوڵمانینە!

ئنجا ئەوەش كە خوا دەیفەرمووێ، ئێستا لە واقیعدا زۆر بە بەرجەستەكراویی دەیبینین، نایبینن ئێستا چۆن ئەمریكا هەموو جارێ لە ئەنجوومەنی ئاسایش مافی ڤیتۆ بەكاردێنێ، لە بەرانبەر هەموو ئەو بڕیارانەدا كە دژی جوولەكە دەردەچن، كە بڕیاری ڕاستیشن؟! مانای وایە ئەوەی خوا دەیفەرمووێ سەدا سەد ڕاستە، ئەوەتا جوولەكەو نەصرانیی یەكان پێكەوە دۆستو پشتیوانی یەكدینو، پێكەوە بەرگریی لە یەكدی دەكەنو پشتیوانیی لە یەكدی دەكەن، بۆیە خوا دەفەرمووێ: ئێوە پشتیان پێ مەبەستن، وە باوەڕو متمانەیان پێ مەكەن، چونكە هەرگیز بۆ ئێوە ساغ نابن. ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ﴾، ئەوە هەڕەشەیەكی زۆر گەورەیە هەر كەسێك لە ئێوە بە ڕەهایی دۆستایەتییان بكاو، نزیكییان بكاتو، پشتگیرییان بكاتو، لەگەڵیان بێ، ئەوە لەوانە، واتە: حوكمی ئەوانی هەیەو لە بازنەی ئیسلام دەچێتە دەر، {كە دوایی لە مەسەلە گرنگەكاندا باسی دەكەین مەبەست (دۆستایەتیی ڕەها) چییە؟} واتە: كەسێك دۆستایەتیی (بە مانای تەواوی ئەو وشەیە) جوولەكەو نەصرانییان بكات، لە بازنەی ئیسلامو ئیمان دەچێتە دەر، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾، بێگومان خوا ڕێنمایی كۆمەڵی ستەمكاران ناكات، واتە: هەر كەسێك وابكات ستەمكارە، وە خواش ڕێنمایی كۆمەڵی ستەمكار ناكات، بەپێی یاساو سوننەتی خۆی، خوا یاسایەكی داناوە لە ژیانی مرۆڤایەتیی دا، هەر كەسێك خراپە بكات خوا وێڵی دەكات، وە هەر كەسێك چاكە بكات، خوا زیاتر هیدایەتی دەدات، وەك دەفەرمووێ: ﴿وَيُضِلُّ ٱللَّهُ ٱلظَّـٰلِمِينَ ۝٢٧﴾ إبراهيم، واتە: خوا ستەمكاران گومڕا دەكات، بەڵام كێ هیدایەت دەدات؟ دەفەرمووێ: ﴿وَٱلَّذِينَ ٱهْتَدَوْا۟ زَادَهُمْ هُدًى وَءَاتَىٰهُمْ تَقْوَىٰهُمْ ۝١٧﴾ محمد، واتە: ئەوانەی هیدایەتیان وەرگرتووە هەنگاوی یەكەمیان بەرەو خوا ناوە، خوای پەروەردگار بەرەو ڕوویان دێ، ئەوانەش كە لە خوا دوور دەكەونەوە، خۆ خوا ﷻ بە تۆبزی نایانهێنێتەوە،

بۆچی؟ چونکە خوای پەروەردگار ژیانی ئەم دنیایەی داناوە بۆ تاقیکردنەوە، بەڵام خوا خاوەنی لوتفو کەرەمە، لەگەڵ کەسێکدا کە بەرەو خوا دەچێ، هەر کەسێك بەرەو خوا بچێ، خوا بەرەو ڕووی دەچێ، وە هەر کەسێك پشت لە خوا بکات، خوا وێڵی دەکاو پشتگوێی دەخات، ئنجا خوا ﷻ ئەوە دەخاتە بەرچاوی پێغەمبەری خۆی ﷺ وە دەیخاتە بەرچاوی ئێمەش، وە هەرکەسێك کە قورئان دەخوێنێ، کە ئەوانەی دۆستایەتیی جوولەکەو نەصرانی یەکان دەکەن، کێن؟

دەفەرموێ: ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ ﴾، زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: خوای پەروەردگار دەیەوێ ئەوانەی دۆستایەتی جوولەکەو نەصرانی دەکەن، بۆمانیان وێنا بکات لە دیمەنێکدا بە تابلۆیەك بۆئەوەی تەماشای بکەین، ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ ﴾، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە وەك گوتم: دەگونجێ مەبەست پێییان موناڤیقی تەواوبن و، دەشگونجێ مەبەست ئەوانە بن کە بەرەو نیفاق چوون و مسوڵمانی دڵنەخۆش و ئیمان بێهێزو کرچو کاڵن: ئەوانەی کە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، تۆ دەیانبینی خێرایی دەکەن لەواندا (واتە: لە دۆستایەتییکردنی جوولەکەو نەصرانییەکاندا، دیارە ئەوە شتێکی زۆر گەورەیە، کەواتە: ئەو کاتو ئێستاو لە مەودواش هەر کەسێکتان بینی سوور بوو لەسەر ئەوەی لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکاندا دۆستایەتیی بکات، چ دۆستایەتیی شەخصی، چ دۆستایەتیی کۆمەڵایەتیی، دۆستایەتیی سیاسی، لەسەر ئاستی دەوڵەت، لەسەر ئاستی حیزبیی، بەڵام بەو واتایەی کە گوتمان، واتە: خۆشی بوێن، بە تەنگیانەوە بێ و، پشتیان بگرێ و لەگەڵیان بێ و خۆیان بۆ بە کوشت بدات، هەر کەسێکتان وا بینی، نیشانەی پرسیاری لەسەر دابنێن؟! دیارە دینەکەی تەواو نیە، جا یان موناڤیقە، یاخود بەرەو نیفاق چووەو دڵی نەخۆشیی تێدایە، ﴿يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ﴾، پاساو دێننەوە بۆ ئەو کارەیان و دەڵێن: دەترسین بەڵامان تووش بێ، لەبەر بەڵای ناگەهان و گۆڕانکاریی زەمان، ئێمە دۆستایەتیی لەگەڵ جوولەکەو نەصرانیی یەکاندا دەکەین، تاکو ئەگەر دنیا شتێکی بەسەرهات، کەسێك هەبێ پەنای بۆ

بەرین! ﴿فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ﴾، نزیکە خوا سەرکەوتنێك بێنێتە پێش، یاخود گۆڕانکارییەك، کارەساتێك لە لایەنی خۆیەوە بێنێتە پێش، بێئەوەی دەستی بەشەرەکانی تێدابێ، ﴿فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ﴾، سەرەنجام ئەوانەی کە دۆستایەتیی جوولەکەو نەصرانیی یەکان دەکەن، لەسەر ئەوەی کە لە دڵیاندا پەنهانیان کردوە، پەشیمان ببنەوە، واتە: نزیکە دنیا گۆڕانکاریی بەسەردابێ‌و مسوڵمانان بەهێزو پێزبن، وە ئەهلی کوفر بێهێز بن، وە ئەوانەی دۆستایەتی ئەهلی کوفریان کردوە، پەشیمان ببنەوە، چونکە بۆیە دۆستایەتییان کردوون تاکو سەلامەت بن، کەچی ڕەنگە دنیا وابگۆڕێ، هەرچی لە پەنای واندابێ، زەرەرمەند بێ، ئنجا ئەوە کاتی خۆی وابووەو ئێستاش وایە، ئەوانەی کە دەڵێن دەبێ ئێمە لەگەڵ ئەمریکا بین، لەگەڵ ڕۆژئاواو جوولەکەو فلان وڵاتدا پەیمانمان هەبێ‌و، نزیك بین‌و دۆستایەتییمان هەبێ، بە حیساب دەیانەوێ بەرژەوەندیی دنیایی خۆیان دابین بکەن، دەڵێن: گۆڕانکاریی بەسەر دنیاو زەمان دادێ، با پەنایەك هەبێ خۆمانی پێ بگرینەوە، بەڵام خوا ﷻ دەفەرموێ: نزیکە گۆڕانکاریی وا ڕوودەدات، مسوڵمانان سەرکەوتن‌و بردنەوەیەکیان بۆ بێتە پێش، ئەو جۆرە کەسانەی ئەوە هەڵوێستیانە، پەشیمان ببنەوە.

لە کۆتایی دا دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾، وە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە دەڵێن، دەشگونجێ بەو (یقول)ە بخوێندرێتەوەو عەطف بێ بۆ سەر ڕستەی پێشوی: ﴿يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِىَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ﴾، ئنجا ئەگەر ئاوا بخوێندرێتەوە: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾، ئەوە ڕستەیەکی سەرەتاییەو، ئەگەر (یقولَ)ش بێ، واتە: لەسەر ئەوە پەشیمان ببنەوە کە لە دەروونی خۆیاندا پەنهانیان کردوە، وە ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە بڵێن: ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُوا۟

﴿بِٱللَّهِ جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡ﴾، ئا ئەوانە بوون، زۆر بە قورسی سوێندیان بە خوا دەخوارد ﴿إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡ﴾، دەیانگوت ئێمە لەگەڵ ئێوەین ﴿حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ﴾، کردەوەکانیان هەڵوەشانەوە، ﴿فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ﴾، سەرەنجام لە زەرەرمەندان بوون، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ﴾، واتە: ئەو کردەوە چاکانەی کردوویانن، لە ئەنجامی دۆستایەتیی گرتنیان لەگەڵ ئەهلی کوفردا، هەڵوەشاونەوە، کردەوەی چاکیش بەچی هەڵدەوەشێتەوە؟ بە کوفر، کەواتە: دۆستایەتییکردنی ڕەهای ئەهلی کوفر بە کوفر لە قەڵەم دەدرێ، وەك خوا ﷻ لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ ﴿٢٨﴾﴾، واتە: ئیمانداران با کافران لە جیاتی ئیمانداران بە دۆست نەگرن، هەر کەسێك وا بکات، هیچ پەیوەندیی بە خواوە نامێنێ، هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾﴾ النساء، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! کافران لە جیاتی ئیمانداران بە دۆست مەگرن و پشتیان پێ مەبەستن، ئایا دەتانەوێ بەڵگەیەکی ئاشکرای خوا پەروەردگار لەسەر خۆتان دابنێن؟ واتە: خوا بەڵگەی لەسەرتان هەبێ، کە ئێوە لە دینەکەی هەڵگەڕاونەوە؟!

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ﴾، لێرەدا دەمەوێ سەرنجی هەموو لایەك ڕابکێشم، کە ئێمە کاتی خۆی لە بەرگی دووەمی ئەم تەفسیرەدا، لە کاتی تەفسیرکردنی ئایەتی (٢٨)ی سوورەتی (آل عمران)دا کە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡكَـٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ فَلَيۡسَ مِنَ ٱللَّهِ فِي شَيۡءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنۡهُمۡ تُقَىٰةٗۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفۡسَهُۥۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلۡمَصِيرُ ﴿٢٨﴾﴾، لەوێ تارادەیەك باسی ئەوەمان کردوە کە حوکمی دۆستایەتی لەگەڵ کردنو نزیکی لەگەڵ ئەهلی کوفردا چۆنەو، سەرەنجامی چییە؟ هەروەها لە بەرگی سێیەمیش، لە کاتی تەفسیرکردنی ئەم ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَـٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَـٰنٗا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾﴾النساء، دیسان لەوبارەوە قسەمان کردوە، لەبەرئەوە ئەوەی کە لەوێ گوتومانە، ئیکتیفای پێ دەکەم، بەڵام لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بە چەند شتێك بکەم بە خێرایی:

# چەند خاڵێکی گرنگ لە بارەی حوکمی دۆستایەتی گرتنی موسڵمانان لەگەڵ کافران دا

١/ کە خوا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَ﴾، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەموو جۆرو حاڵەتەکانی دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ کافراندا، چ جوولەکەو دیان، چ غەیری ئەوان، سەر ناکێشێ بۆ کافربوون، ئەگەرنا خوا نەیدەفەرموو: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دیارە ئیمانیشیان هەیەو دەشفەرموێ: ئەوە مەکەن! هەروەها لە سەرەتای سووڕەتی (الممتحنة)شدا کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمۡ أَوۡلِيَآءَ ...﴿١﴾﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! دوژمنی منو دوژمنی خۆتان بە دۆست مەگرن، وە لە سووڕەتی (النساء)یش دا دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡكَٰفِرِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيۡكُمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾﴾، کەواتە: مەرج نیە هەموو جۆرە دۆستایەتییەکی ئیمانداران لەگەڵ ئەهلی کوفردا یەکسەر ئینسانی موسوڵمان لە بازنەی ئیسلام بەرێتە دەر بە یەکجاریی، بەڵکو حاڵەتی دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ نامسوڵماناندا جۆراو جۆرەو هەر جۆرەو حوکمێکی تایبەتیی هەیە.

٢/ ئەو ڕستەیەی کە دەفەرموێ: ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖ﴾، ئەوە دەگەیەنێ کە جوولەکە لەگەڵ نەصرانی یەکاندا دۆستایەتیی یەکدی دەکەن، ئەوەش دیارە وەك لە مانای گشتی ئایەتەکاندا ئاماژەم پێدا، لە واقیعی ئێستاشدا دەبینرێ، وە ئەگەر تەماشای مێژووش بکەین، جوولەکەو نەصرانیی لە بەرانبەر ئەهلی ئیسلامدا، هەمیشە بوونە یەك بەرەو چوونە یەك سەنگەرەوە.

٣/ ئەو ڕستەیەی کە دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ﴾، هەر کەسێك لە ئێوە دۆستایەتییان بکات ئەوە لەوانە، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە هەر کەسێك بە ڕەهایی دۆستایەتی لەگەڵ کافراندا هەبێ (بَيْنَهُ وَبَيْنَهُم الـمُوَالاةُ الـمُطْلَقَة) ئەوە لە بازنەی ئیسلامو ئیمان دەچێتە دەر، وەك لێرەدا خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ﴾، وە لە سوورەتی (آل عمران)یشدا، باسمکرد کە دەفەرموێ: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ﴾، هەر کەسێك وابکات هیچ پەیوەندیی بە خواوە نامێنێ، بەڵام ئەوەی گرنگە لێرەدا بیزانین، ئەوەیە کە ئایا دۆستایەتی ڕەها (الـمُوَالاةُ الـمُطْلَقَة) چییەو چۆنە؟

ئەوەی من دوای لێکۆڵینەوەی زۆر بۆم دەرکەوتووە، دۆستایەتیی ڕەهای مسوڵمانان بۆ کافران، کە پێی لە بازنەی ئیمانو ئیسلام دەچنە دەر، چوار حاڵەتی هەنو لە چوار شتاندا، هەرکامیان بە جیا بە جیا، یان هەر چواریان پێکەوە، بەرجەستە دەبێ:

أ- بە دڵ خۆشی بوێنو، بە خۆشییان دڵخۆشو بە ناخۆشییان دڵ ناخۆش بێ.

ب- ئایینو بەرنامەکەیانی پێ ڕاست بێ، لەو شتانەدا کە پێچەوانەی ئیسلامن، ئەگەرنا لە تەوراتو ئینجیلدا هەندێ شت هاتووە، لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە، یان پێچەوانەی قورئانو سوننەت نیە، بەڕاستیش بزانێ زەرەری نیە، دەبێ شتی ڕاستت پێ ڕاست بێو، شتی چاکت پێ چاك بێ، لە هەر کەسێکەوە بێ.

ج- وە لە حاڵەتی جەنگدا، جەنگیان لەسەر بکات، خۆیان لەسەر بەکوشت بداتو خەڵکیان لەسەر بکوژێ.

د- پەیوەندیی نزیکیو کەینو بەینی لە جیاتی مسوڵمانان لەگەڵ ئەوان دا بێو، پشتیان بگرێو سەریان بخات بە قسەو کردەوە، تەنانەت ئەگەر بەسەر مسوڵمانانیش دابێ، چ وەك قسەو مەجلیس بێ، چ حاڵەتی کۆمەڵایەتیی بێ،

چ حاڵەتی سیاسی بێ، پشتیان بگرێو بە ڕەهایی بەسەر مسوڵمانان دا سەریان بخات.

هەر کەسێك یەکێك لەو چوار حاڵەتەی تێدابێ، مانای وایە دۆستایەتیی ڕەهای ئەهلی کوفری کردوە، جا چ جوولەکەو نەصرانیی بن، چ غەیری ئەوان، تەفسیرەکانیش باسی زۆر شتیان کردوە، دەربارەی دۆستایەتیی ڕەهای مسوڵمانان لەگەڵ کافراندا، بەڵام من پێموایە لەو چوار حاڵەتە ناچێتە دەرێ.

بەڵام ئەوەی کە تەنیا بە گوناهی گەورە دادەنرێو بە کوفر دانانرێ، لە دۆستایەتیی کردنی کافراندا، ئەوەیە کە بابایەکی مسوڵمان لە حاڵەتێکی تایبەتدا هاوکارییەکی دیاریی کراوی کافران بکات، بە پاڵنەری موجامەلەو پاراستنی بەرژەوەندیی یەك، یان دوورخستنەوەی زیانێك، وەك هەڵوێستەکەی (حَاطِبِ بْنِ بَلْتَعَة)[1] کە نامەیەك دەنووسێ بۆ ئەبوسوفیانو قورەیش کە ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێ بێ بۆ گرتنی مەککە، دوایی خوای پەنهانزان جبریل دەنێرێو پێغەمبەر ﷺ ئاگادار دەکاتەوە، کە ئەوە نامەیەکی ئاوا نێردراوە بە پیرەژنێکدا ئەو پیرەژنە لە فلان شوێنەیە، پێغەمبەر ﷺ عەلی کوڕی ئەبو طالیبو زوبەیرو میقداد دەنێرێ، دەبینن پیرەژنێکە سواری وڵاخێك بووە لە کەژاوە

---

١) ﴿عَنْ عَلِيٍّ رضي الله عنه، قَالَ: بَعَثَنِي رَسُولُ اللهِ ﷺ، أَنَا وَالزُّبَيْرَ وَالْمِقْدَادَ بْنَ الأَسْوَدِ، قَالَ: انْطَلِقُوا حَتَّى تَأْتُوا رَوْضَةَ خَاخٍ، فَإِنَّ بِهَا ظَعِينَةً، وَمَعَهَا كِتَابٌ، فَخُذُوهُ مِنْهَا فَانْطَلَقْنَا، تَعَادَى بِنَا خَيْلُنَا حَتَّى انْتَهَيْنَا إِلَى الرَّوْضَةِ فَإِذَا نَحْنُ بِالظَّعِينَةِ، فَقُلْنَا: أَخْرِجِي الْكِتَابَ فَقَالَتْ: مَا مَعِي مِنْ كِتَابٍ فَقُلْنَا: لَتُخْرِجِنَّ الْكِتَابَ أَوْ لَنُلْقِيَنَّ الثِّيَابَ فَأَخْرَجَتْهُ مِنْ عِقَاصِهَا فَأَتَيْنَا بِهِ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَإِذَا فِيهِ: مِنْ حَاطِبِ بْنِ أَبِي بَلْتَعَةَ، إِلَى أُنَاسٍ مِنَ الْمُشْرِكِينَ، مِنْ أَهْلِ مَكَّةَ، يُخْبِرُهُمْ بِبَعْضِ أَمْرِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: يَا حَاطِبُ مَا هذَا، قَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ لاَ تَعْجَلْ عَلَيَّ إِنِّي كُنْتُ امْرَءًا مُلْصَقًا فِي قُرَيْشٍ، وَلَمْ أَكُنْ مِنْ أَنْفُسِهَا وَكَانَ مَنْ مَعَكَ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ، لَهُمْ قَرَابَاتٌ بِمَكَّةَ يَحْمُونَ بِهَا أَهْلِيهِمْ وَأَمْوَالَهُمْ؛ فَأَحْبَبْتُ، إِذْ فَاتَنِي ذلِكَ مِنَ النَّسَبِ فِيهِمْ، أَنْ أَتَّخِذَ عِنْدَهُمْ يَدًا يَحْمُونَ بِهَا قَرَابَتِي وَمَا فَعَلْتُ كُفْرًا وَلاَ ارْتِدَادًا، وَلاَ رِضًا بِالْكُفْرِ بَعْدَ الإِسْلاَمِ فَقَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: لَقَدْ صَدَقَكُمْ فَقَالَ عُمَرُ: يَا رَسُولَ اللهِ دَعْنِي أَضْرِبْ عُنُقَ هذَا الْمُنَافِقِ، قَالَ: إِنَّهُ قَدْ شَهِدَ بَدْرًا، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللهَ أَنْ يَكُونَ قَدِ اطَّلَعَ عَلَى أَهْلِ بَدْرٍ، فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ﴾ {أخرجه البخاري في: ٥٦ كتاب الجهاد والسير: ١٤١ باب الجاسوس وقول الله تعالى (لا تتخذوا عدوّي وعدوّكم أولياء)}.

دایە، لە شوێنێکە بە ناوی (روضة خاخ) دەیگرن دەڵێن: ئەو نامەیەمان بدەیە، حاشا دەکات، دەڵێن: یان نامەکەی دێنی، یاخود دەتپشکنین، پۆشاکەکەت لەبەر دادەکەنین، کە دیارە مەبەستیان پۆشاکی سەرەوە بووە، ئیدی کە دڵنیا دەبێ هەر دەیپشکنن، نامەکەی کە لەبن کەزیی ناوە، ویان دەدات، پێغەمبەری خوا ﷺ (حَاطِبِ بْنِ بَلْتَعَة) بانگ دەکات دەڵێ: (حَاطِبِ) بۆ وات کردوە؟ دەڵێ: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ پەلە مەکە! هاوەڵانی بەرێزی تۆ خزم و کەسیان لەوێ هەبوو، منیش لەوێ کەسێکی وام نەبوو، گوتم: با چاکەیەکم لە چاوی واندا هەبێ، خزمەکانم سەلامەت بن "دیارە بۆ دەستەڵات بوونە" دەنا هەر مسوڵمانم و دڵیشم هەر وەك خۆیەتی و بە کوفر ڕازی نیم، عومەر گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ لێم گەڕێ با لە گەردنی بدەم، بۆتە موناڤیق، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ﴿دعه يَا ابْنَ الْخَطَّابِ، وَمَا يُدْرِيكَ لَعَلَّ اللَّهَ اطَّلَعَ عَلَى هَذِهِ الْعِصَابَةِ مِنْ أَهْلِ بَدْرٍ، فَقَالَ: اعْمَلُوا مَا شِئْتُمْ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبَيْهَقِيُّ فِي (شُعَبِ الإِيمَان) برقم: (٩٣٧١)}، واتە: عومەر لێی گەڕێ، دەبینی خوا سەرنجێکی ئەهلی بە دری داوە، فەرموویەتی: بڕۆن چی دەکەن لە مەودوا بیکەن، لێتان خۆش دەبم، واتە: مادام ئەو هەڵوێستە گەورەو چاکەی بووە لە جەنگی بەدردا، با ئەو هەڵەو خاڵە لاواز (نُقْطَةُ الضُعْف)ەشی هەبێ، ئەوە بەس گوناهبارەو ئێستاش پەشیمانە، ئەمە جۆرێکە لەو دۆستایەتییەی کە ئینسانی پێ لە بازنەی ئیسلام و ئیمان ناچێتە دەرێ و تەنیا گوناهی گەورەیەو کوفر نیە، ئنجا هەموو حاڵەتێکی دیارییکراو وایە، بەڵام وەك عەرەب دەڵێ: (عَلَى طُولِ الخَط) لە سەرەتا تا ئەنجام، لەگەڵیان بێ و پشتیان بگرێ و هاوکاریان بێ، ناتوانێ بڵێ مسوڵمانم.

ئنجا لێرەدا شتێکی دیکە دێتە پێش: ئایا مەسەلەی خۆش ڕەفتاریی و ڕەوشت جوانیی و ڕێزگرتن و پێشوازیی لێکردن و پەیوەندیی سیاسی و دبلۆماسیی، ئەوانە دەچنە بازنەیەکەوە؟

دەڵێین: لەڕاستیدا ئەوانە ناچنە نێو بازنەی دۆستایەتیکردنی ئەهلی کوفرەوە، چونکە مسوڵمان دەبێ ڕەوشتی جوان بێ، ڕووی خۆشبێ، زمانی شیرین

بـێ، بەڕێـز بـێ، چاکەکـار بـێ، بە ئینصـاف بـێ، دادگەر بـێ، میهرەبـانو بـە بەزەیی بێ، ئەوانە کۆمەڵێك سیفەتن مسوڵمان دەبێ لە هەموو حاڵاندا خۆییان پـێ بڕازێنێتـەوە، وە ئـەوە هـیچ پەیوەنـدیی بـە مەسـەلەی دۆسـتایەتییکردنی کافرانـەوە نیـە، بەڵـگەمان چییە؟ بەڵـگەمان ئەوەیـە کـە خـوای پەروەردگـار لـە چـەندان ئایەتـدا فەرمـان بـە مسـوڵمانان دەکـات، کـە دەبـێ قسـەیان بـاش بـێ، ڕەوشـتیان باش بێ، چاکەکـار بن لەگەڵ مسـوڵمانانو نامسـوڵماناندا، بۆ وێنـە، خـوا فەرموویـەتی:

١) ﴿... وَأَحْسِنُوٓا۟ ۛ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ البقـرة، واتـە: ... چـاکە بکـەن، بێگومـان خـوا چاکەکارانی خۆشـدەوێ، چـاکە لەگـەڵ کێ بکـەن؟ بـە موتڵەقیی فەرموویەتی، چاکـە لەگەڵ هەموو کەس بکەن، ئەوە بە نیسـبەت چاکەکـردن.

٢) ﴿... وَقُولُوا۟ لِلنَّاسِ حُسْنًا ...﴿٨٣﴾﴾ البقـرة، واتە: وە قسەی باش لەگەڵ خەڵك بکـەن، یانی: کردەوەی باشـیان لەگەڵ بکەنو، قسـەی باشـیشیان لەگەڵ بکەن.

٣) ﴿لَّا يَنْهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمْ يُقَـٰتِلُوكُمْ فِى ٱلدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَـٰرِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوٓا۟ إِلَيْهِمْ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُقْسِطِينَ ﴿٨﴾﴾ الممتحنـة، واتـە: خـوا ڕێتـان لێنـاگرێ لە بەرانبەر ئەوانەدا کە لەسەر دینتـان جەنگـتان لەگەڵ ناکەن، وە لە نیشـتمانی خۆتـان وەدەرتـان نـانێن، کـە چاکـەیان لەگەڵدا بکـەن، وە (لـە ماڵی خۆتان)پێیان ببەخشـن.

٤) ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾﴾ النسـاء، واتە: ئەگەر سڵاوتان لێکرا بە سڵاوێك بە چاکتر لـە خـۆی، یان بەلایـەنی کـەم وەك خـۆی وەڵامی بدەنـەوە.

کەواتە: خۆش ڕەفتـاریی‌و بـەڕێزیی‌و قسـە خۆشـیی‌و هاوکـاریی‌و چاکەکاریی لەگـەڵ ئـەهلی کـوفر، لـە بـواری مامەڵـەو هەڵسـوکەوتدا، ناچـێتە نێـو بازنـەی دۆستایەتیی کردنیانـەوە، بـەڵکو ئـەوە کۆمەڵـێك ڕەوشـتو ڕەفتـارن، کـە پێویسـتە مسـوڵمان هەر بەو شـێوەیە بـێ.

٤/ دەفەرمووێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئەوە دەگەیەنێ کە دۆستایەتی گرتن لەگەڵ کافرانی جوو و دیانو غەیری وانیشدا، مایەی بە ستەمکار ئەژمارکردنی ئینسانە، دیارە ستەمیش دەگونجێ کوفر بێ، وەك خوا دەفەرمووێ: ﴿ وَٱلۡكَٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ۝٢٥٤ ﴾البقرة، واتە: کافران ستەمکاری تەواون، زوڵمی هەرە تەواو بە مانای وشەی زوڵم لە کافراندا دێتە دی، وە دەشگونجێ ئەو زوڵمە گوناهی گەورەبێ، کەواتە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، ئەگەر دۆستایەتیی ڕەهایان هەبێ واتە: کافرن، بەڵام ئەگەر دۆستایەتیی موتڵەقیان نەبێ، واتە: ئەوانەی گوناهێکی گەورەیان کردوە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرمووێ: ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ ﴾، ئەوانەی دڵیان نەخۆشیی تێدایە دەیانبینی خێرایی دەکەن، پێشبڕکێ دەکەن لە دۆستایەتی گرتن لەگەڵ خەڵکی جوولەکەو نەصرانییدا، کەواتە: ئەوە عادەتی مونافیقەکانە لە هەموو ڕۆژگارێکدا، چونکە تەعبیری ﴿ ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ ﴾، وەك پێشتریش باسمان کرد، زیاتر بۆ مونافیقەکان بەکارهاتوە، جا چ مونافیقی تەواو عەیار بنو، نیفاقی گەورەیان هەبێو فڕیان بە ئیسلامو مسوڵمانانەوە نەمابێ، وە چ سیفەتو ئاکارێکی نیفاق یان زیاتریان تێدابێ، چونکە کەسانێك هەن دڵیان نەخۆشو دەردەدارە، بەڵام نەبوون بە مونافیقی تەواو، ئەو تەعبیرە زیاتر مەبەست پێی ئەوانە.

کەواتە: ئەوەی کە دۆستایەتی ئەهلی کوفر دەکات، ئەو کەسەیە کە دڵی نەخۆشە، جا چ مونافیقی تەواوبێ، چ دڵەکەی نەخۆشبێو ئیمانەکەی کرچوکاڵ بێو لاوازبێ.

ئنجا وشەی ﴿ يُسَٰرِعُونَ ﴾، کە پێشتریش ئاماژەم پێدا، حاڵەتی کردەیی ئەوان دەخاتە پێش چاو، زانایانی ڕەوانبێژیی دەڵێن: ئەوە لە ڕابردوودا بووە،

بەڵام خوای کاربەجێ دەیکات بە (فعل المضارع) ئێستا بۆئەوەی بیهێنێتە بەرچاو: ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ ﴾، ئەوانەی دڵیان نەخۆشە دەیانبینی، واتە: لەبەرچاوت دێن و دەچن کەین و بەینیان لەگەڵدا دەکەن "لەگەڵ ئەهلی کوفردا" ماستاویان بۆ دەکەنو، سینگیان لێ دەهێننە پێشێ و تەمەللوقیان بۆ دەکەن.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌ ﴾، دەڵێن: دەترسین کە بەڵامان تووش ببێ، کارەساتێکمان بەسەربێ، ئەوە پاساوی هەموو ئەوانەیە کە کەین و بەین لەگەڵ ئەهلی کوفردا دەکەن، دەڵێن: ئەوە دنیایەو ڕۆژگارە، دنیا دەگۆڕێ و هاوکێشەکان دەگۆڕێن، با دووربینی خۆمان هەبێ و بەلەمێکی لەبن پچکێکی بشارینەوە، بۆ کاتی هەڵاتنێ! مِن زۆرجار ئەو تەعبیرەم بەکارهێناوە، هی وا هەیە شتێك دەشارێتەوەو، ئامادەی دەکات دوایی پێی هەڵێ و پێی ڕابکات! ئەوە لەڕاستیدا بەلەم شاردنەوەیە، شوێن دانانە بۆ کاتی هەڵاتن و پاشەکشەکردن، بۆیە خوا ﷻ ئەو تەعبیرە بەکاردێنێ وشەی: ﴿ دَآئِرَةٌ ﴾ش، لە ئەسڵدا یانی: بازنە، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی بەڵایەکە، وەك چۆن بازنە دەوری ئەو شتە دەدات کە بەدەوری داهاتوە، ئەو بەڵایەش ئاوا دەوری ئەو خەڵکە بداتو هیچیان جەب نەداو هیچیان قوتار نەبن.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِيٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴾، لێرەدا خوا ﷻ دوو شتی باسکردوون:

١/ ﴿ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ ﴾، یان سەرکەوتن بێنی، یان کارێك لەلایەن خۆیەوە، (فتح) واتە: سەرکەوتنی مسوڵمانان و دەروو لێکرانەوەیان، یانی: هاتیان بێ و، بارودۆخەکە بە قازانجی ئەوان تەواو بێ، وە دەستی خۆیانی تێدابێ، ﴿ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ ﴾، مەبەست پێی چییە؟ واتە: کارەساتێکی پێشبینی نەکراو

بێتە پێش، کە دەستی ئینسانی تێدا نەبێ، وەك کاتی خوای یەکێتی سۆڤیەتی هەڵوەشاند، سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ مسوڵمانان، چونکە مسوڵمانان دەبوایە لە بەرانبەر دوو بەرەدا شەڕ بکەن، بەرەی ڕۆژئاوا، بەرەی ڕۆژهەڵات، دوایی بەرەی ڕۆژهەڵات هەرەسی هێنا، کاتێك مارکسیزم هەرەسی هێنا، مایەوە بەرەی ڕۆژئاوا، ئەوە ﴿أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ﴾ە، ئەوە خوا لە لایەی خۆیەوە دەیهێنێ، بە پێی یاسای خوا ﷻ دێتە پێش، بەڵام دەستی ئینسانەکانی تێدانیە.

٢/ کە دەفەرموێ: ﴿فَيُصْبِحُوا۟ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَـٰدِمِينَ﴾، دوایی لەسەر ئەوەی کە لە دڵی خۆیاندا پەنهانیان کردوەو شاردوویانەتەوە، پەشیمان ببنەوە، ئەوەی کە لە دڵی خۆیاندا پەنهانیان کردوە چییە؟

١- دەگونجێ مەبەست پێی نەخۆشی نیفاق بێ.

٢- دەگونجێ مەبەست پێی گومانو دوو دڵیی بێ.

٣- دەگونجێ مەبەست پێی ترسو بیم بێ لە دوژمنان.

٤- دەگونجێ مەبەست ئەو خۆزگە خواستنەی شکستی مسوڵمانان بێ.

٥- دەشگونجێ هەموو ئەوانەو غەیری ئەو شتانەش بێ، ئنجا دیارە کە لە دڵی خۆیاندا پەنهانیان کردوە، بەڵام دەریاننەخستوە، مەبەست پێی شتی خراپە، بە پێی پەندی (گۆزە چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ) بابای خراپ هەر گومانی خراپو خەیاڵی خراپی بە دڵدا دێ، جا چ بەرانبەر بە خوا، چ بەرانبەر بە خەڵك.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَهَـٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُوا۟ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَـٰنِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ۚ حَبِطَتْ أَعْمَـٰلُهُمْ فَأَصْبَحُوا۟ خَـٰسِرِينَ﴾:

١/ پێشتریش باسمکرد، (يَقُول) دوو قیرائەتی هەیە. (وَيَقُولُ، وَيَقُول)، ئەگەر (وَيَقُولُ)بێ وەك (حَفْص)و هاوڕایەکانی دەڵێن: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾، ئەوە

پێی دەگوترێ ڕستەیەکی دەست پێکردن (الجُمْلَة الإبتدائية)، واتە: هەر لە سەرەتاوە ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، دەڵێن: ئا ئەوانە بوون کە زۆر بە خەستییو بە سەختیی سوێندیان بە خوا دەخوارد، کە لەگەڵ ئێوەن، ئەوە لەگەڵ دابوونەکەیان بوو! ئێستا کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوە، وە لە زیانباران بوون، واتە: بە سەرسوورمانەوە وا دەڵێن.

وە ئەگەر (يَقُولُ)بێ، واتە: لەسەر ئەوەی لە دڵیاندا پەنهانیان کردوە پەشێمان ببنەوەو، لەو کاتەشدا ئیماندارانیش بڵێن: ئا ئەوانە بوون کە سوێندی سەختیان دەخوارد بە خوا، کە لەگەڵ ئێوەن، کەچی ئەوەش چارەنووسیانە؟!

٢/ کە دەفەرموێ: ﴿ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ ﴾، ئەم هەمزەیە پێی دەگوترێ (همزة الإستفهام الإنكاري)، واتە: ئەوە هەڵوێستێکی نامەنتیقیی یە، (مانای هەمزەی ئیستفهامی ئینکاریی)یش ئەوەیە کە تۆ چاوەڕێی وەڵامەکە نابی، بۆ وێنە: تۆ بە کەسێك دەڵێی: ئەوە کامێرە نیە؟! یان دەڵێی ئەوە قورئان نیە؟! چاوەڕێ ناکەی بڵێ: با، واتە: ئەوە دیارە، چونکە ئیستفهامی ئینکاریی: (يَتَضَمَّنُ جَوَابَهُ فِي طَيَاتِهِ)، وەڵامەکەی هەر لەنێو خۆیدایە.

٣/ کە دەفەرموێ: ﴿ أَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ﴾، ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە ئینسانی درۆزن بۆ قەرەبووکردنەوەی هەست کردن بە ناتەواوییەك کە لە خۆیدا هەستی پێ دەکات، پێویستی بەوە هەیە زۆر سوێند بخوات، جاری واش هەیە کەسێك ڕەنگە هەر زمانی ڕاهاتبێ لەسەر سوێند خواردن، بەڵام ئەگەر تێبینیتان کردبێ، بە زۆریی وایە کەسێك کە درۆزن بێ زۆر سوێندان دەخوات، ئەوەی ڕاستگۆبێ، زۆر پێویستی بە سوێند نیە، باوەڕو متمانەی بە خۆی هەیەو درۆ ناکات لەگەڵ خەڵك، تا ناچار بێ قسەکەی خۆی بەهێز بکات بە سوێند، باوەڕی بە قسەکەی خۆی هەیە، قسەکەی ڕاستەو پێی پشت ئەستوورە، وەك گوتم دەگونجێ جاری وایە ئینسانی ڕاست بێژیش سوێند بخوات، بۆئەوەی بەرانبەرەکەی دڵنیا بکاتەوە، وەك خوای پەروەردگار سوێندی خواردوەو پێغەمبەریش ﷺ سوێندی خواردوە، فەرمویەتی: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ، وَالَّذِي نَفْسُ مُحَمَّدٍ بِيَدِهِ) جاری وایە سوێندی خواردوە، مەبەست ئەوە نەبووە بڕوای بە قسەی خۆی نیە، بەڵام ئینسانی ئیماندار زۆر سوێند ناخوات

لە حاڵەتی ئاسایی و شێنەییدا، بەڵکو لە پیاوچاکان هەبووە گوتوویەتی: نە بە ڕاستو نە بە درۆ سوێندم نەخواردوە، جا لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ﴾، دەڵێ (مَنْصُوبٌ عَلَى أَنَّهُ مَصْدَرٌ لأقسموا مِن مَعناه، وَالمَعنَى: أَقسموا إِقْسَاماً مجتَهَداً فِيهِ)، واتە: کە دەفەرموێ: ﴿ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ﴾، مەنصووبە لەسەر ئەوە کە چاوگە بۆ وشەی (أَقْسَمُوا) لە ماناکەیدا نەك لە بێژە (لَفْظ)ەکەی واتە: سوێندیان خواردوە بە سوێند خواردنێك کە زۆر کۆششی تێدا کراوە، زۆر هەوڵی بۆ دراوەو زۆر خۆی تێدا ماندوو کراوە.

٤/ کە دەفەرموێ: ﴿ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ﴾، ئەوەی لێی وەردەگیرێ کە دۆستایەتیکردنی ڕەهای ئەهلی کوفر، کردەوەکانی ئینسان هەڵدەوەشێنێتەوە، کردەوەکانی ئینسانیش هەڵناوەشێنەوە بەبێ کوفر، وەك خوا لە سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ: ﴿ ... وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ ...﴿٢١٧﴾ ﴾، واتە: هەر کەسێك لە ئێوە لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوەو، بە کافریی بمرێ، کردەوەکانی هەڵوەشاونەوە لە دنیاو دواڕۆژدا، کەواتە: کردەوەکان بە کوفر هەڵدەوەشێنەوە، لێرەشدا کە دەفەرموێ: ﴿ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ﴾، باسی کوفری نەکردوە، هەر باسی ئەوەی کردوە کە ئەوانە خێرایی دەکەن لە دۆستایەتییکردنی جوولەکەو نەصرانییەکاندا، ئیمانداران دەڵێن: ئا ئەوانە بوون کە سوێندیان دەخوارد، کەچی کردەوەکانیشیان هەڵوەشاونەوە؟! وە لە زیانباران بوون، کەواتە: کە دەفەرموێ کردەوەکانیان هەڵوەشاونەوە، واتە: بەو دۆستایەتیی کردنەی جوولەکەو نەصرانییەکان کافربوونو، لە بازنەی ئیسلام دەرچوون.

کەواتە: لێرەدا مەبەست لەو دۆستایەتیی کردنە، دۆستایەتیی کردنی ڕەها (الموالاة المطلقة)یە، دیارە ئەگەر ئاوا لە ئایەتەکانی قورئان ورد نەبینەوە کەسێك پێی وادەبێ، ئەگەر یەکێك هەر سەلامو چاكو چۆنیەکی لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەك کرد، پێی کافر دەبێ!! کەواتە: دەبێ وردی بکەینەوە،

خـۆش خوڵقـیی، لـە دۆسـتایەتیی جیـایە، دۆسـتایەتییکردنی کـافرانیش یـەك جۆر نیە، دۆسـتایەتییکردن هەیـە دەبێتـە گونـاهی گـەورە، وەك هەڵوێسـتەکەی (حاطـب)، دۆسـتایەتیی ڕەهـاش هەیـە، کە دەبێتـە کوفرو کوفرێکی لـە ئیسـلام بەرە دەریـش (کفرٌ مُخْـرِجٌ من المـلَّة).

٥/ کـە دەفـەرموێ: ﴿ فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴾، واتـە: لـە زیانبـاران بـوون، گـەورەترین زیانبـاریی ئەوەیـە کە ئینسـان لەسـەر ژیانەکـەی خـۆی، لەسـەر تەمەنەکـەی خـۆی قەرزدار بێتەوە، چـۆن قـەرزدار دەبێتـەوە؟! خـوا ﷻ لە کۆتایی سـوورەتی (النبأ)دا دەفـەرموێ: ﴿ ...وَيَقُولُ ٱلْكَافِرُ يَٰلَيْتَنِي كُنتُ تُرَٰبًا ۝٤٠ ﴾، واتـە: ئینسـانی کـافر دەڵـێ: خۆزگە گـڵ بامـایە، یـانی چـی؟ زانـایان دوو مانـایان بۆ کـردووە:

یەکـەم: دەڵـێ: خۆزگـە هـەر گـڵ بـامو دروسـت نـەکرابامو، لـە سـەرەتاوە خـوا دروستی نەکـردبام، چونکـە ئینسـان جەسـتەکەی لە خـاك دروسـت بووە.

دووەم: مانایـەکی دیکـەی ئەوەیـە: کاتێـك ئـاژەڵو دڕنـدەو ئەوانـە دەهێنـرێن بـۆ حیسـاب وەك پێغـەمبەر ﷺ دەفەرموێ: خـوا ﷻ هـەقی مـەڕی کوڵـە بەسـەر بزنـی شـاخ دارە وە ناهێڵـێ: ﴿إِنَّ الْجَمَّـاءَ لَـتُقَصُّ مِـنَ الْقَرْنَـاءِ يَـوْمَ الْقِيَـامَةِ﴾ {رَوَاهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٧٩٩٦) عَنْ عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ رضي الله عنه، تعليق شعيب الأرنـؤوط: حَسَـنٌ لِغَـيْرِهِ}، واتـە: ئـەوەی بـێ قـۆچ تۆڵـەی بـۆ دەکرێتـەوە لـەوەی قـۆچدار.

کاتێـك خـوای دادگەر لێپرسـینەوە لەگەڵ واندا دەکات، دوایـی ئـەوان دەبنـەوە بە گڵ چونکـە بەهەشتو دۆزەخیـان نیـە، بـەس بـۆ هاتنـە دی دادگـەریی خـوا، خـوای بـەرز حیسـابوکیتـاب لەگـەڵ وانـدا دەکـات، لەسـەر ڕای هەنـدێك لـە زانایـان، وەك لـە هەنـدێ فـەرموودەو شـوێنەواران داهـاتوە، مرۆڤـی کـافر کاتێـك ئەوانـە دەبینـێ، دەبنـەوە بـە خـاك، خۆزگـە بـەوان دەخـوازێو دەڵـێ: خۆزگـە منیـش ئـاژەڵو چـوارپـێ بوومایـە، ئێسـتا دەبوومـەوە بـە خـاكو تووشـی دۆزەخـێ نەدەبووم، چـەند ناخۆشـە ئینسـان بگـاتە حاڵـەتێکی وا کە خۆزگـە بە ئـاژەڵو دڕندەکـان بخوازێ؟!!

بەڕێـزان!

خوا ﷻ بەو شێوازە بەهێزەی جەختکردن، جەختی تەئکیدی کردۆتەوە لەسەر ئەوە کە مسوڵمانان نابێ دۆستایەتی جوولەکەو نەصرانییەکان بە تایبەتو هی کافران بەگشتی، بکەن، بەڵام لێرەدا باس باسی جوولەکەو نەصرانییانە، ئەگەرنا بەگشتی نابێ دۆستایەتی ئەهلی کوفر بکرێ، وەك ئایەتەکەی سوورەتی (النساء) دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ ﴾، کافران لە جیاتی ئیمانداران بە دۆست مەگرن، واتە: کافر بەگشتی، چ خاوەن کتێب بن، چ بێ کتێب بن، چ بت پەرست بن، چ شوێنکەوتووی بەرنامەیەکی ئاسمانیی نەبن.

ئەگەر تەماشای ئەو ئایەتانە بکەین، نۆ (٩) جۆرە تەئکیدیان تێدان:

١- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوْلِيَآءَ ﴾، بە ئاشکراو بە ڕوونیی و بێ پەردە خوا دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! جوولەکەو نەصرانیی یان مەگرن بە دۆست.

٢- ﴿ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍ ﴾، شتێکی زۆر بێ مانایە، ئەوان دۆستایەتیی یەکدی دەکەن و، هەرگیز بۆ تۆ نابنە دۆست، کەواتە: چۆن دەچی دۆستایەتییان دەکەی و، پشتیان پێ دەبەستی؟!

٣- ﴿ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُۥ مِنْهُمْ ﴾، هەر کەسێك دۆستایەتییان بکات بە ڕەهایی، ئەوە لەوانە، واتە: لە بازنەی مسوڵمانان دەچێتە دەرو دەچێتە بازنەی ئەوان، وە حوکمی ئەوانی دەبێ، هەندێکیش گوتوویانە: واتە: کردەوەی وەك ئەوانی ئەنجام داوە، بەڵام ئەوە لە حاڵێکدایە کە دۆستایەتیی کردنەکە ڕەها نەبێ و جوزئیی بێ، بەڵام لێرەدا سیاقەکە ئەوە دەگەیەنێ، کە مەبەستی پێی دۆستایەتیی ڕەهایە.

٤- ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، کەواتە: هەر کەسێك دۆستایەتیی جوولەکەو نەصرانییان بکات، لە ستەمکارانە.

٥- ﴿ فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ ﴾، کەواتـە: ئـەوەی دۆسـتایەتیی وان دەکـات، دڵـی نەخۆشـیی تێـدایە.

٦- ﴿ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ ﴾، کەواتـە: هـەر کەسـێك دۆسـتایەتی جوولەکـەو نەصـرانییان بکـات، دوایی پەشـێمان دەبێتـەوە.

٧- ﴿ وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقْسَمُواْ بِٱللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۙ إِنَّهُمْ لَمَعَكُمْ ﴾، واتـە: ئیمانـداران سـەریان سـوورِ دەمێنـێ دەڵـێن: ئـا ئەوانـە بـوون سـوێندیان دەخوارد، کە بڕوادارن؟ چۆن کەسێك دۆستایەتیی جوولەکەو نەصرانییان بکات، لە مسـوڵمانانـە؟!

٨- ﴿ حَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ ﴾، واتە: کردەوەکانیـان هەڵوەشـاونەوە.

٩- ﴿ فَأَصْبَحُواْ خَٰسِرِينَ ﴾، زیانبـار بوون، خۆیـانو تەمەنەکـەیان زایە بوون.

خـوا بـە لـوتفی خـۆی ئێمـە لـەو کەسانە بگـێڕێ، کـە دڵو دەروونیـان پـڕە لـە ئیمـانو لە خوا بەیەکگرتن (توحید)و لـە خۆشـویستنـی خـواو پێغەمبـەری خـواو مسـوڵمانان، وە تۆزقاڵێك مەیلیان لـە دڵ دانیـە سـەبارەت بـە خۆشـویستنـی ئەهلـی کوفـر، وە لـەو کەسـانەمان بگـێڕێ کـە بـە جـوانترین شـێوە لـە سـنووری شـەرعدا مامەڵـەو هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکـدا دەکـەن، بـە شـێوەیەك کـە لـە ئیسـلامو، وە لــە شــوێنکەوتووانی پێغــەمبەر ﷺ، دەوەشــێتەوە، وە بـایی ئەوەنـدە لـە دیـن تێبگـەین، کە ڕەفتارو مامەڵـەو قسـەی خۆشو هـاوکاریی‌و بەزەیـی‌و چاکەکـاریی، کــە لەســەر هــەموو مســـوڵمانێك پێویســـتەو لــە هــەموو کاتێکــدا، لەگــەڵ دۆسـتایەتییکردنو پشـت پێ بەسـتنو هاوکـارییکردنـدا، تێکـەڵ نەکـەین.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی چواردەیەم



## پێناسـەی ئەم دەرسـە

ئەم دەرسـەمان لە ئایـەتی: (٥٤ تاکو ٥٦) دەگرێتە خۆی، لەم سـێ ئایەتـەدا، خـوا ﷻ بۆ جـاری هەشـتەم بە نازنـاوی ئیمـان بانگـی ئیمانـداران دەکاتو پێیـان ڕادەگەیەنـێ، کە هـەرکـامێکـیان لـە ئایینەکـەی پاشـگەزبێتەوە – لـێی هەڵگەڕێتـەوە – خـوا بـێ باکـە، وە کۆمەڵـێك دێنـێ لـە جیـاتی ئـەو هەڵـگەڕاوانە، کە خـاوەنی شـەش سیفەتی سـەرەکیین:

خوا خۆشـیدەوێنو خوایان خۆشـدەوێو، لەگەڵ ئیمانـداران میهرەبـانو لـە بەرانبـەر کافرانـدا زبرنو پتـەون، لە ڕێی خـوادا تێدەکۆشـنو لـە لۆمـەی لۆمەکـاران بێباکـن، وە ئەوەش بـە بەخشـشـێکی خوایـی دادەنـێ کـە لـە ڕووی زانیـارییو کەرەمییەوە بـە کەسـانی شـایسـتەی دەبەخشـێ.

پاشان خوای زانـاو توانا دەیخاتـە ڕوو کـە دۆسـتو پشـتیوانی بـڕواداران تـەنیا خـواو پێغەمبەرەکـەیو کەسـانی بـە ئیمـانن، ئەوانـەی نوێـژ بـەرپا دەکـەنو، زەکـات دەدەنو، زۆر ڕکـووع دەبـەن، دیـارە ئەوانە سـێ سیفەتی سـەرەکیی مسـوڵمانانن.

وە سـەرەنجـام خـوا ڕایدەگەیەنـێ کـە هـەر کەسـێك خـواو پێغەمبەرەکـەیو بـڕواداران بـە دۆسـتو پشـتیوان بگـرێ، ئـەوە ئـەو کەسـە دەچێتە ڕیـزی کۆمەڵـی خـواوەو، کۆمەڵـی خواش هەمیشـە زاڵو سـەرکەوتـوون.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ يُجَـٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ۚ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ ۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴿٥٥﴾ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴿٥٦﴾ ﴾.



## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـــان

((ئەی ئەوانـــەی بڕواتـان هێنـاوە! هەرکامێکتان لە ئایینەکەی پاشگەزبێتەوە، ئـەوە خــوا (پـەکی ناکــەوێو) لەمـەودوا کۆمـەڵێك دێنـێ کـە خۆشـیدەوێنو خۆشـیان دەوێ، لەسـەر بـڕواداران نـەرمو نیـانو لەسـەر بێبـڕوایان زبـرو زاڵـن، لـە ڕێـی خــوادا تێدەکۆشـنو لە لۆمەی لۆمەکاران بێباکن، ئەوەش بەخششـی خوایـە، بە هـەر کەسێکی بـوێ دەیبەخشـێ، وە خـوا سیفەت فراوانـی زانایـە ﴿٥٤﴾ بێگومـان دۆسـتو پشـتیوانتان تـەنیا خـــواو پێغەمبەرەکـەیو، ئەوانـەن کـە بڕوایـان هێنـاوە، ئەوانـەی نوێـژ بـەرپا دەکـەنو، زەکــات دەدەنو، زۆر ڕکـــووع بـەرن ﴿٥٥﴾ وە هـەر کەســێکیش دۆســتایەتیی خــواو پێغەمبـــەرەکەیو بـڕواداران بکـات، ئـەوە (کۆمـەڵی خوایـەو) بێگومـان کۆمـەڵی خــواش هەمیشـە ســەرکەوتوون ﴿٥٦﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(يَرْتَدَّ): (الإرتِدَادُ وَالرِدَّةُ: الرُّجوعُ في الطَّريقِ الَّذِي جَاءَ مِنْهُ، وَلَكِن الرِدَّة تَخْتَصُّ بِالكُفْرِ، والإرتدَادُ يُسْتَعْمَلُ فيهِ وَفِي غَيْرِهِ)، وشەی (يَرْتَدَّ) واتە: هەڵگەڕێتەوە، پاشگەزبێتەوە، بچێتەوە دوا، (الإرتِدَادُ وَالرِدَّةُ)، واتە: گەڕانەوە بەو ڕێیەدا كە لێیەوە هاتوە، لە ڕێیەكەوە هاتووی بە وێدا بگەڕێیەوە، پێی دەگوترێ: (إرتِدَادُ وَرِدَّةُ)، بەڵام وشەی (رِدَّة) تایبەتە بە كوفرەوە، واتە: كەسێك لە ئیمانەوە هەڵگەڕێتەوە بەرەو كوفر، لە كوردەواریی دا پاشگەزبوونەوەو هەڵگەڕانەوەو وەرگەڕانی پێ دەڵێن، دەڵێن: لە دین وەرگەڕاوە، وە وشەی (إرتِدَاد) بۆ لە دین هەڵگەڕانەوەو، لە ئیمان هەڵگەڕانەوەو، چوونەوە نێو كوفریش بەكاردێ، وە بۆ غەیری ئەوەش بەكاردێ، هەر كەسێك واز لە شتێك بێنێ، یاخود بە ڕێیەكدا بگەڕێتەوە، هەر وشەی (إرتِدَاد)ی بۆ بەكاردێ.

(يُحِبُّهُمْ): واتە: خۆشی دەوێن، لە عەرەبیدا دەگوترێ (حَبَبْتُ، وَأَحْبَبْتُ: جَعَلْتُ قَلْبِي مُعَرَّضَاً لِحُبِّهِ)، (حَبَبْتُ، وَأَحْبَبْتُ) واتە: دڵی خۆم وا لێكرد كە خۆشەویستیی ئەوی بچێتێ، (لَكِنَ فِي التَّعَارُفِ وضِعَ مَحْبُوبٌ مَوْضِعَ مُحَبٍّ، وَالمحَبَّةُ: إرَادَةُ مَا تَرَاهُ أَوْ تَظُنُّهُ خَيراً لِلَذَّةٍ أَوْ مَنْفَعَةٍ أَوْ فَضْلٍ، وَالمحَبَّةُ أَبْلَغُ مِنَ الإرَادَةِ فَكُلّ مَحَبَّةٍ إرَادَةٍ وَلَيْسَ كُلّ إرَادَةٍ مُحَبَّة)، لە عورفو باوی زمانەوانییدا وشەی (مَحبُوب) لە جێی (مُحَبّ) دانراوە، (مُحَب) واتە: خۆشویستراو، (مَحَبة) واتە: خۆشویستن، (مَحَبَّة)یش بریتییە لەوەی كە تۆ شتێكت بوێ كە بە چاكی دەزانی، جا یان لەبەرئەوەی كە چێژی لێ دەكەی، یان لەبەرئەوەی سوودی لێ دەبینی، یان لەبەرئەوەی چاكەیەكی لێ دەبینی، بەڕاستی پێناسەكەی جوانە، وەك من دوایی لە بڕگەكانی دیكەی ئەم تەفسیرەدا دەیخەمە ڕوو، (مَحَبَّة)یش مانای زیاتری تێدایە لە (إرَادَة)، (مَحَبَّة)، واتە: خۆشویستن، (إرَادَة)، واتە: ویستن، چونكە هەموو خۆشویستنێك ویستنیشە، بەڵام هەموو ویستنێك خۆشویستن نیە، هیچ شتێك ڕوونادات، هەتا خوا نەیەوێ، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾التكویر، بەڵام ئەو شتانەی خواش ئیرادەیان دەكاتو دەیەوێن هەموویانی خۆشناوێن، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿ إِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِىٌّ عَنكُمْ ۖ وَلَا يَرْضَىٰ لِعِبَادِهِ ٱلْكُفْرَ ۖ وَإِن تَشْكُرُوا۟ يَرْضَهُ لَكُمْ ...﴿٧﴾ ﴾الزمر، واتە: خوا كوفری بۆ بەندەكانی بەلاوە پەسەند نیە، كوفری خۆش ناوێ، بەڵام ئەگەر سوپاسگوزاریی خوا بكەن، لێتان ڕازی دەبێو خوا حەزی لە طاعەتەو خۆشی دەوێ، بەڵام ڕقی لە كوفرو سەرپێچییەو ڕقی لە ناسوپاسیو سپڵەییە، كەواتە: هەموو خۆشویستنێك ویستنیشی لەگەڵدایە، بەڵام هەموو ویستنێك خۆشویستنی تێدانیە.

(أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ )، (أَذِلَّةٍ)، كۆی (ذَلِيل)ە، واتە: ملكەچو نەرمو نیانو بە ڕەحم، واتە: لەسەر بڕواداران نەرمو نیانن، دەڵێ: (الذُّلّ: مَا كَانَ عَن قَهْرٍ: ذَلَّ يَذِلُّ ذُلًا، وَالذِّلُّ: مَا كَانَ بَعْدَ تَصَعُّبٍ، وَشِمَاسٍ، مِنْ غَيْرِ قَهْرٍ: ذَلَّ يَذِلُّ ذِلاً، وَالذُّلُّ: مَتى كَانَ مِن جِهَةِ الإنْسَانِ مِنْ نَفْسِهِ لِنَفْسِهِ فَمَحْمُودٌ)، (ذُلّ) لە كوردیدا دەڵێین: ملكەچیی، زەبوونیی، بێ دەسەڵاتیی، ژێردەستەیی، (ذَلَّ يَذِلُّ ذُلاً) واتە: ملكەچ بوو، ژێردەستە بوو، ژێردەستە دەبێ، ژێردەستە بوون، (وَالذِّلُّ: مَا كَانَ بَعْدَ تَصَعُّبٍ)، دیارە (ذُلّ)، ئەوەیە لە ئەنجامی بێدەستەڵاتیی دا دەبێ، لە بەرانبەر كەسێكدا كە دەستەڵاتی هەیە، بەڵام (ذِلّ) دوای چەمووشییو یاخی بوون بەكاردێ، بەتایبەت وڵاغ دوای ئەوەی كە چەمووش دەبێو یاخیی و عاسێ بێ، ئنجا دوایی بكەوێتە ژێربار، وە بەوە دەگوترێ: (ذَلَّ يَذِلُّ ذُلاً فَهُوَ ذَلُول)، ئەوی دیكەش دەگوترێ: (فَهُوَ ذَلِيل)، جا دەڵێ میهرەبانییو ملكەچیی ئەگەر لەلایەنی ئینسانەوە بێ، وە بۆخۆی بەسەرخۆی دابێنێ، شتێكی ستایشكراوە، بەڵام ئەگەر بە زۆر بەسەریدا فەرز بكرێ، شتێكی خراپە، بۆیە لێرەدا كە دەفەرموێ: ﴿ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، واتە: بۆخۆیان خۆیان میهرەبان كردوە بەسەر ئیمانداراندا، باڵیان بەسەردا دێننو، دەیانخەنە ژێر سێبەری خۆیان، نەك ناچاركرابن ئەو كارە بكەن.

(أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ )، (أَعِـزَّة جَمْـع عَزِيـز)، (عَزِيـز)، واتـە: زاڵ، پتـەو، سـەخت، لـە بەرانبەر کافراندا زاڵـن، سـەختو پتـەون، دەڵـێ: (العِـزَّةُ: حَـالَةٌ مَانِعَةٌ للإِنْسَـان مِـنْ أَنْ يُغْلَـب، مِـنْ قَولِهِم: أَرْضٌ عَزَازٌ، أَي: صُلْبَةٌ، وتَعَزَّزَ اللَّحْمُ: اشْتَدَّ وَعَزَّ، كَأَنَّهُ حَصَلَ فـي عَزَازٍ مِنَ الأَرض يَصْعُب الوصُول إِلَيْهِ)، (عِـزَّة)، حاڵەتێکە بـۆ ئینسان دێتـە پێشـێ کە ڕێـی لـێدەگرێ خـەڵك بەسـەریدا زاڵ بـێو ژێردەست بکرێ، کە گوتیـان: فـلان کـەس عـەزیزە، واتـە: تێکشـکاوو بەرانبەرەکـەی دەسـتەڵاتیی بەسـەریدا ناشـکێ، ئایا لـە چییەوە هاتوە؟ لە عەرەبیدا دەگوترێ: (أَرْضٌ عَزَازٌ)، واتـە: زەوییـەکی پتـەوو سـەخت، (وتَعَـزَّز اللَّحْـمُ: اشْتَدَّ وَعَزَّ)، ئەگـەر گۆشـتەکەی پتـەوو چڕ بـێ دەگوترێ: (تَعَزَّزَ اللَّحْمُ)، وەك بڵـێی لـە شوێنێکی وابـێ، کـە بـە زەحمـەت دەست بیگاتـێ.

(لَوْمَةَ لَآئِمٍ )، واتـە: لۆمـەی لۆمـە کـەران، سـەرکۆنەی سـەرکۆنەکەران، ڕەخنـەی ڕەخنـەگران، (اللَّوْمُ: عَـذْلُ الإنْسَان بِنِسْـبَتِهِ إِلَـى مَا فِيهِ لَوْمٌ، يُقَالُ: لُمْتُـه فَهُوَ مَلُومٌ، وَاللَّومَةُ: الـملامَةُ، واللائِمَةُ: الأَمْرُ الَّذِي يُلامُ عَلَيْهِ الإِنْسَان، وَاللَّومَةُ الـمرَّة مِـن اللَّـوْمِ)، وشـەی (لـوم)، لـە زمـانی عەرەبیـدا بریتیـە لـەوەی کـە ئینسـان سـەرزەنشـتو سـەرکۆنە بکـرێ، بـە هـۆی شـتێکەوە کـە کردوویـەتی، دەگوتـرێ: (لُمْتُـه فَهُوَ مَلُومٌ)، واتە: لۆمـەم کـرد، ئـەو لۆمـە کـراوە، سـەرزەنشـتم کـرد، ئـەو سـەرزەنشـت کـراوە، جـا وشـەی (لومـة)، دەگونجـێ ناوبـێ، واتـە: لۆمەکـردن، (لائِمَـة)، ئیشـێکە ئینسان لەسـەری لۆمـە بکرێو ڕەخنـەی لـێ بگیـرێ، وە وشـەی (اللومـة)، جـارێکە لە لۆمەکـردن.

(حِزْبَ )، (الحِـزْبُ: جَمَاعَـةٌ فِيهَـا غِلَـظٌ، فَـإِنَّ حِـزبَ اللهِ هُـمُ الغَـالِبُون: أَنْصَـار الله)، (حِـزْب) واتـە: کۆمەڵـێکـە کە پتـەویی‌و قـایمییـان تێـدابـێ، کـە دەفـەرموێ:

﴿ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، واتە: پشـتیوانانی خـوا.

(ٱلْغَٰلِبُونَ): (الغَلَـبَـةُ: القَهْرُ، وَغَلَبَ عَلَيْـهِ كَذَا: اسْتَولَى)، (غَلَبَة): بریتیـە لـە دەسـەڵات بەسـەردا ڕانـان، پێوێـران، (وَغَلَـبَ عَلَيْـهِ كَـذَا: اسْـتَولَى)، واتـە: فـلان شـتە بەسـەریدا زاڵ بـوو.

# مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خـوا ﷻ دوای ئـەوەی لـە ئایەتـەکانی پێشـوودا ڕووی لـە ئیمـانداران کـردو، لێـی قەدەغـە کـردن کـە جوولەکـەو نەصـرانی یـەکان بـە دۆست بگـرن‌و، کـەین‌و بـەینیان لەگەڵیـاندا هـەبێ‌و، پشـتیان پـێ ببەسـتن، وە هەڕەشـەی لێکـردن کـە هـەر کەسێك بەرەهـایی دۆسـتایەتییان لەگـەڵدا بگـرێ، ئـەوە دەچێتـە ڕیزی ئەوانـەوە، وە باسـی کـرد کـە مونـافیق‌و دڵ نەخۆشـەکان ئـەوە پیشـەیانە، کـە لەگـەڵ ئـەهلی کـوفردا دۆسـتایەتیی‌و کـەین‌و بـەین دەکـەن، وە دوایـیش سـەرەنجامیان پەشـیمانیی‌و مـاڵ وێرانییەو، چاکەکانیشـیان بەزایە دەچن، ئنجـا بـۆ جاری هەشـتەم خـوای پـەروەردگار لـەم سـوورەتە موبـارەکەدا بانگی مسـوڵمانان دەکـات بـە نازنـاوی ئیمـان، دەفـەرموێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾،

ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەر کامێك لـە ئێـوە لـە ئایینەکەی پاشگەزبێتەوەو لێـی هەڵگەڕێتـەوە دەسـتبەرداریی ببـێ، ئەوە بـە تەئکیـد خـوا کۆمەڵێکـی دیکـە دێنـێ، کـە بـە چـەند وەسـفێك پێناسـەی ئـەو کۆمەڵـە دەکـات، ئەمـە چـی لـێ وەردەگیـرێ؟ ئایەتـەکانی قورئـان هـەموو وەك ئاڵقـەی زنجـیر یەکـدی دەبەسـتنەوەو تێکهەڵکێشـن هەرچـەندە، ئێمە زۆرجـار باسـی ئـەوە ناکـەین پەیوەسـتبوونی ئـەو کۆمەڵـە ئایـەتە بـەو کۆمەڵـە ئایەتـەوە چۆنە؟ چونکە لـە میانـەی تەفسیرکردنەکەماندا چۆنیەتی ئـەو پەیوەسـتـبوونەی ئایەتـەکان بـە یەکدییـەوە، ڕوون دەکەینـەوە، هەڵبەتـە هـەر کۆمەڵـە ئایەتێـك کـە بـە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، دەسـت پێـدەکات، دیـارە مەبەسـت پێـی بابـەتێکی سـەربەخۆیە، بـەڵام ئایەتـەکانی قورئـان هـەموویان وەك ئاڵقـەکانی زنجیر یەکـدی دەبەسـتنەوە، خـوا ﷻ لـە ئایەتـەکانی پێشـوودا دوای ئـەوەی باسـی ڕەفتـارو هەڵسـوکەوتی پیلانگێڕانەی جوولەکەو نەصـرانییەکانی کـرد، بەتایبـەتی جوولەکـەکان، هۆشـداریی دایە ئیمانداران‌و فـەرمووی: جوولەکـەو نەصـرانییەکان بـە دۆست مـەگرن‌و پشـتیان پـێ مەبەسـتن، وە ئـەوە عـادەتی مونـافیق‌و دڵنەخۆشـەکانە کـە پێشـبـڕکێ دەکـەن لە دۆسـتایەتییکردنی ئەوانـدا !

ئنجا لێرەدا خـوا ﷻ دەفەرموێ: ئەی ئیمانداریـنە! هەر کەسێك لە ئێوە لە ئایینەکەی پاشگەزبێتەوە، خوا (پەکی ناکەوێ) کۆمەڵێکی دیکە دێنێ، ئەمە چی لێوەردەگیرێ؟ ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە لە ئەنجامی دۆستایەتیی گرتنی مسوڵمانان لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکانداو پشت پێ بەستنیان، وە کەین و بەین لەگەڵ کردنیان دا بەرەو ئەوە دەچن کە لە دین هەڵگەڕێنەوە، واتە: دەروازەیەکی دەرچوون لە بازنەی ئیسلام و ئیمان، بریتیە لە پەیوەندیی و دۆستایەتیی تایبەت هەبوون و خۆشویستن و پشتگیریی کردن و هاوکاریی کردنی نامسوڵمانان بەگشتی، بەتایبەت لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکاندا، کە دوژمنی مێژوویی مسوڵمانان بوونە، واتە: ئیمانداریـنە! وریابن لە دۆستایەتیی گرتن لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکاندا، بۆئەوەی ئەوە سەر نەکێشێ بۆ دەرچوونتان لە ئیسلام، ئەگەرنا هەر کەسێك لە ئێوە لە بازنەی ئیمان و ئیسلام دەربچێ و هەڵبگەڕێتەوە، ئەوە خوا پەکی ناکەوێ! ﴿ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ ﴾، (قوم) واتە: کۆمەڵە خەڵکێك، خوا کۆمەڵێك دێنێ، ئنجا خوا پێناسەی ئەو کۆمەڵەمان بۆ دەکات و دەفەرموێ: ﴿ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖۚ ﴾، بە شەش وەسف پێناسەیان دەکات:

١/ ﴿ يُحِبُّهُمۡ ﴾، خوا خۆشی دەوێن، کە دوایی من باسی دەکەم لە مەسەلە گرنگەکاندا خوا لە گۆترە کەسی خۆشناوێ، هەروەك لە گۆترە ڕقیشی لە کەس هەڵناستێ، خـوا باسی کردوە کێی خۆشدەوێ ئەهلی ئیمانی خۆشدەوێ، ئەهلی تەقوای خۆشدەوێ، خۆڕاگرانی خۆشدەوێ، شوکرانە بژێرانی خۆشدەوێ، تێکۆشەرانی ڕێی خۆی خۆشدەوێ، بەڵام ئایا خوا بۆچی ئەو سیفەتانە باس دەکات؟ تاکو سەرنجمان بۆ ئەوە ڕابکێشێ، کە کەسانێك دوای ئەوەی خەڵکێك لە دینەکەیان پاشگەزدەبنەوەو لێی هەڵدەگەڕێنەوە، ئەوان دێن خزمەتی دینی خوا دەکەن و دەبنە بەیداغو ئاڵا هەڵگری ئیسلام، ئەوانە لەلای خوا خۆشویستراون و، ئەوە دەستکەوتێکی زۆر گەورەیەو دەبێ دڵیان پێی خۆشبێ.

٢/ ﴿وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾، خوایان خۆشدەوێ، خۆشویستنی ئێمە بۆ خوا چییەو چۆنە؟ دوایی باسی دەکەین، چونکە هەندێك لە زانایان پێیان وایە کە خوا دەفەرموێ: بەندەکان خوایان خۆشدەوێو خوا ﷻ بەندەکانی خۆشدەوێ، دەبێ واتایەکی دیکەی تایبەت دابنێیین بۆ ئەو وشەیە، جیا لەوەی ئێمە دەیزانین بۆ وشەی: (خۆشویستن)، کە بۆخۆمان لەنێو خۆماندا بەکاری دێنین، کە من ئەو ڕایەم پێ هەڵەیە، بەڵام دوایی باسی دەکەم، گرنگ ئەوەیە خوا ﷻ دەفەرموێ: ئەوانیش خوایان خۆشدەوێ، دیارە هەر کەسێك خوای خۆشبوێ، بە دوای خۆشەویستی خوا دەکەوێ، کە پێغەمبەرە ﷺ، وەك دەفەرموێ: ﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١﴾ آل عمران، واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشی دەوێن، نیشانەو بەڵگەی خۆشویستنی خوا لەلایەن بەندەوە، ئەوەیە بە دوای پێغەمبەرەکەی بکەوێو، بە دوای کتێبو ڕێبازەکەی بکەوێ، ئەوە مامەڵەیان لەگەڵ خوادا: لەلایەن خواوە خۆشویستراون، وە ئەوانیش خوایان خۆشدەوێ، ئنجا با بزانین مامەڵەیان لەگەڵ ئیمانداران چۆنە؟

٣/ ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾، لەسەر ئیمانداراندا میهرەبانن، بە ڕەحمو بە بەزەیین، نەرمو نیانن، بەڵام نەك لەبەر بێدەستەڵاتیی، چونکە وشەی (ذَلَّ عَلَيْهِ)، جیایە لە: (ذَلَّ لَهُ)، واتە: بۆی ژێردەست بوو لەبەر بێدەستەڵاتیی، بەڵام (ذَلَّ عَلَيْهِ)، واتە: لەگەڵی نەرم بوو لەبەر بەزەییو شەفەقەتو سۆزو پەرۆشیی، نەك لەبەر بێدەستەڵاتیی، ئنجا با بزانین لەگەڵ کافراندا چۆن مامەڵە دەکەن؟

٤/ ﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، لەسەر کافران بە دەمارن، زبرن، زاڵن، سەریان بۆ دانانەوێنن، ئەوە دیارە لە بواری جەنگدا، ئەگەرنا لە حاڵەتی ئاساییدا دەبێ خۆش ڕەفتاربنو ڕووخۆش بن، بەڕێز بن، چاکەکار بن، هاوکار بن، بەڵام لە بواری جەنگو ڕووبەڕووبوونەوەدا، مسوڵمان دەبێ زبرییو سەختییو توندییو پتەوییو دڵ ڕەقیی هەبێ، بەرانبەر ئەهلی کوفر، لە کاتێکدا شەڕی

پێدەفرۆشن‌و ڕێ لەخۆی‌و دینەکەی دەگرن، وەك لە شوێنی دیکەش دەفەرموێ: ﴿ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً ﴿١٢٣﴾ ﴾التوبة، واتە: با زبرییتان پێوە ببینن، نەك فەقیرۆکەیی‌و بەستە زمانیی‌و تووك نەرمیی، چونکە هەموو دڕندەیەك حەزی لە نێچیری تووك نەرمە!

٥/ ﴿ يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ﴾، وە لە پێناوی خوا دەجەنگن، ئەوانەی خوا دەیانهێنێ دینی خۆییان پێ بووژێنێتەوەو زیندوو بکاتەوە، لە کاتێکدا خەڵکێك دەستی لێ هەڵدەگرێ‌و لێی هەڵدەگەڕێتەوە، کەسانێکن لە ڕێی خوا تێدەکۆشن، خۆیان لە پێناوی خوادا بەخت دەکەن.

٦/ ﴿ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ ﴾، وە لە لۆمەی لۆمەکاران‌و سەرکۆنەی هیچ سەرکۆنەکەرێك ناترسێن‌و بێباکن، ﴿ ذَٰلِكَ فَضْلُ ٱللَّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾، ئەوە بەخششی خوایە دەیدات بە هەر کەسێك کە بیەوێ، وە خوا سیفەت فراوانی زانایە، سیفەتەکانی خوا: بەخشندەیی، بەزەیی، لێبووردەیی، کاربەجێیی، دەستەڵاتی، هەموو سیفەتەکانی فراوانن، یانی: بێسنوورن، وە خوا زانایە، واتە: خوا بیەوێ هەر شتێك بە هەر کەسێك ببەخشێ دەتوانێ، گرنگ ئەوەیە سیفەتەکانی خوا بێ کۆتایین، بەڵام دەشزانی بە کێ دەبەخشێ‌و چەندیشی پێ دەبەخشێ.

ئنجا خوا ﷻ لە ئایەتی دووەمدا دوای ئەوەی لە ئایەتەکانی پێشێدا فەرمووی: دۆستایەتیی جوولەکەو نەصرانییەکان مەکەن‌و، کەین‌و بەینتان لەگەڵیان نەبێ، پشتیان پێ مەبەستن‌و، ڕازونیازتان لەگەڵیاندا نەبێ، ئەدی ئایا ئیمانداران پشت بە کێ ببەستن‌و، کێیان لە ناخی دڵەوە خۆشبوێ‌و، کێ بە دۆستی خۆیان بزانن؟!

دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، بێگومان دۆست‌و پشتیوانی ئێوە، نزیکی ئێوەو، هاوکارو یاوەری ئێوە، تەنیا خوایە، دیارە دۆستبوونی خوا بۆ ئیمانداران، لە چەندان شوێن لە قورئاندا دووبارە بۆتەوە، چ بە وشەی (ولي)، وەك:

﴿ٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴿٢٥٧﴾﴾البقرة، چ بە وشەی (مولى) وەك: ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّ ٱللَّهَ مَوۡلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾محمد، ئنجا وشەی (ولي) بە مانای دۆستو سەرپەرشتیارو خۆشەویستو پشتیوانو هاوکارو سەرخەرو نزیك دێ، هەروەها (مولى)ش بەهەمان شێوە، بەڵام وشەی (مولى) زیاتر مانای مشوورخۆرییو سەرپەرشتیارێتی دەگەیەنێ.

هەڵبەتە دۆستبوونی خوای پەروەردگار بۆ ئیمانداران لەقەدەر خۆیەتی، هەروەها هی ئیماندارانیش بۆ خوا لەقەدەر خۆیانە.

ئنجا ﴿وَرَسُولُهُۥ﴾، وە ڕەوانەکراوی خوا، پێغەمبەری خواش ﷺ دۆستو پشتیوانی ئێوەیە، ئەی ئیماندارینە! ئەویش دیارە بە چەمكو واتای خۆی، یانی: دۆستبوونی خوا ﷻ بۆ ئیمانداران واتایەکی هەیە، هی پێغەمبەری خوا ﷺ واتایەکی دیکەی هەیە، ئێستا خوای بێوێنە یارمەتیدەرو خۆشەویستی ئێمەیە، بەڵام ئایا دەتوانین بڵێین: پێغەمبەری خوا ﷺ یارمەتیدەرو سەرخەری ئێمەیە؟ نەخێر، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ مردووە چۆتە عالەمی هەق، بەڵێ بەو واتایەکە ئەگەر ئێمە بە دوای ڕێبازەکەی بکەوین سەردەکەوین، ڕاستە، بەڵام بەو واتایە نا، کە ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ ئێمە سەربخاتو لەگەڵمان بێو هاوکارمان بێ، بەو واتایە ئەمە تایبەتە بە خوای پەروەردگارەوە[١].

﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، وە دۆستو پشتیوانی ئێوە دوای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە، غەیری ئیمانداران دۆستو پشتیوانی ئێوەنین، چونکە بە ئامرازی (إِنَّمَا) دەستی پێکردوە، ﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، کە زۆر لە زانایان دەڵێن: (إِنَّمَا: أَدَاة الحَصْر والإِثْبَات)، واتە: (إِنَّمَا) ئامرازی

١) هەڵبەتە لە خەون دا بینرانی پێغەمبەری خوا ﷺ، وە بەهرە وەرگرتنی لە ڕێنمایی یەکانی، کە شتێکی چەسپاوەو هەیە، مەسەلەیەکی دیکەی جیایە لەوەی ئێمە لێرەدا قسەی لەبارەوە دەکەین.

چەسپاندنو کورت هەڵهێنانە، واتە: کە دەچێتە سەر شتێك حوکمەکەی تێدا دەچەسپێنێو کورتی هەڵدێنێ، ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، واتە: دۆستو پشتیوانی ئێوە تەنیا خواو پێغەمبەریو ئیمانداران[١].

ئنجا خوا بە سێ سیفەتی سەرەکی پێناسەی ئیمانداران دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ﴾، ئەوانەی نوێژ بەرپادەکەنو، زەکات دەدەنو، زۆر ڕکووع دەبەن، دیارە ڕکووع عیبادەتێکە بەس لەنێو نوێژ دایە، سەجدە لە غەیری نوێژیشدا هەیە، سەجدەی شوکر هەیە، سەجدەی قورئان خوێندن هەیە، بەڵام ڕکووع تەنیا لەنێو نوێژدا هەیە، ئەدی بۆچی خوا جیای کردۆتەوە؟ لەبەر زێدە گرنگیی دان بە ڕکووع، ئەوە لە عەرەبیدا پێی دەگوترێ (ذِكْرُ الخاصِ بَعْدَ العَام)، دوای ئەوەی خوا بەگشتی شتێك باس دەکات، یەکێك لە تاکەکانی (مفرد)ی ئەو شتە بە جیا باس دەکات، بە مەبەستی زیاتر سەرنج ڕاکێشانمان بۆ زیاتر گرنگیی پێدانی.

خوای کاربەجێ لە زۆر شوێنان لە قورئانیدا نوێژو زەکاتی پێکەوە هێناون، نوێژو زەکات، یاخود نوێژو بەخشین، بۆچی؟ لەبەر ئەوەی کە نوێژ بریتیە لە جۆری پەیوەندیی ئینسان لەگەڵ خوا، وە نوێژ بریتیە لە ئەوپەڕی ملکەچیی، لەوە ملکەچیی زیاتر، کە ئینسان سەر بخاتە سەر زەویو بچەمێتەوە لە بەرانبەر خوادا! لەوە ملکەچی زیاتر، کە بەندە لە خزمەتی خوادا ڕابوەستێو دەستی لەسەر سنگ دابنێ! یان لە تەحیاتدا لە خزمەتی خوا دابنیشێو سڵاوی[٢] لێ بکات، وە سڵاو لە پێغەمبەر بکات، لەوە ئەدەب نواندن زیاترو، ملکەچ کردن زیاترو فەرمانبەریی زیاتر نواندن نیە، کەواتە: مسوڵمانان کەسانێکن کە ئەوپەڕی ملکەچییو ڕێزو

---

١) شارەزایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: وشەی (إنَّما) مانایەکەی دەبێتە (ما، الاّ) یانی: (ما ولیّکم الاّ الله و رسوله...).

٢) چونکە وشەی (تحیة) لە زمانی عەرەبیی دا کە بە (تحیات) کۆدەکرێتەوە، بە کوردیی دەبێتە (سڵاو)، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ ...فَإِذَا دَخَلۡتُم بُيُوتٗا فَسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ تَحِيَّةٗ مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِ مُبَٰرَكَةٗ طَيِّبَةٗ ... ﴿٦١﴾ ﴾النور.

حورمەت لە بەرانبەر خوادا بنوێنن‌و، لە خۆیاندا بەرجەستەی بکەن، کە وەك گوتمان نوێژ بەرجەستەکەری هەموو ئەوانەیە.

(زەکات)یش جۆرێکە لە بەخشین، بۆیە لە هەندێك شوێنان دەفەرموێ: ﴿ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿٣﴾ ﴾الأنفال، واتە: لە جیاتی زەکات دەفەرموێ: لەوەی پێمان داون دەبەخشن، چونکە ماڵ‌و سامان بەخششی خوایە بە مسوڵمانانی داوەو، زەکاتیش هەقی خەڵکە لەو بەخشش‌و نیعمەتە، کەواتە: نوێژ هەقی خوایەو، زەکات‌و هاوکاریکردنی خەڵکیش مافی خەڵکە، بۆیە دەتوانین بڵێین زەکات‌و ماڵبەخشینیش بەرجەستەکەری جۆری پەیوەندیی مسوڵمانە لەگەڵ خەڵك دا.

کەواتە: مسوڵمان ئەو کەسەیە کە خوا پەرست بێ‌و خەڵك دۆست بێ، مسوڵمان کەسێکە کە ئەوپەری ملکەچیی هەبێ بۆ خوا، وە ئەوپەڕی ڕەحم‌و بەزەییشی هەبێ بۆ خەڵکی خوا، بۆیە ئەو دووانە لە قورئاندا زۆر پێکەوە هاتوون، مسوڵمانان ئەوانەن کە ئەوپەڕی ملکەچییان هەبێ بۆ خوا، وە ئەوپەڕی چاکەکاریی‌و هاوکاریی‌و ڕەحم‌و بەزەییان هەبێ بۆ خەڵکی خوا، کە بە پلەی یەکەم لەوەدا خۆی دەنوێنێ کە ئەو ماڵ‌و سامانەی بە ئارەقەی نێوچەوان‌و بەرەنجی شانیان پەیدای دەکەن، بە خەڵکی ببەخشن، چ وەك فەرز کە زەکاتە، چ وەك سوننەت کە غەیری زەکاتە، بەڵکو هەندێك لە زانایان ئەو فەرمایشتە بە بەڵگە دێننەوە، لەسەر ئەوە کە غەیری زەکاتیش جاری وایە فەرز دەبێ ﴿إنَّ في المال حقّ سِوَى الزَّكَاةِ﴾{أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٦٦٠) وقال: إسناده ليس بذاك وأبو حمزة ميمون الأعور يضعف، وَأَخْرَجَهُ أَيْضاً: ابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٧٨٩) وَالدَّارَمِيُّ برقم: (١٦٣٧) وضعَّفُ كل من الألباني وحسين سليم أسد}، واتە: لە ماڵ‌و سامانداا، جگە لە زەکاتدا هەقی دیکەش هەیە.

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ﴾، بە تەئکید هەر کەسێك دۆستایەتیی خواو پێغەمبەری خواو ئەوانەی ئیمانیان هێناوە بکات، ئەوانە کۆمەڵی خوان، کۆمەڵی خواش زاڵ‌و سەرکەوتوون.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! هەر كامێك لە ئێوە لە ئاینەكەی پاشگەز بێتەوە! ئەمە ئیعجازێكی هەواڵیی (إعجاز خبري) تێدایە، قورئان لە هەمو ڕوویێكەوە موعجیزەیە، یەكێك لە ڕووەكانی ئیعجازو دەستەوەستانكردنی قورئان بۆ بەرانبەرەكانی، بریتیە لەوە كە قورئان هەندێك هەواڵیداون كە بە مسۆگەریی هاتوونە دی، بۆ وێنە لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ ﴾، هەر كەسێك لە ئێوە لە دینەكەی پاشگەزبێتەوە، كەواتە: خوا زانیویەتی هەندێك كەس دەبن، دوایی لە ئاینەكەیان پاشگەزدەبنەوەو هەڵدەگەڕێنەوە، كە دیارە ئەوەش هاتۆتە دی، یان وەك لە كۆتایی سووڕەتی (ص)دا دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴿٨٨﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان دوای ماوەیەك هەواڵەكەی (هی قورئان) دەزانن، لە كاتێكدا سووڕەتی (ص) لە مەككە هاتۆتە خوارێ، ئەو كاتە مسوڵمانان لە چوارچێوەی مەككەدا قەتیس مابوون، چ جای ئەوەی ئیسلام لە جیهاندا بڵاوبێتەوە! چونكە لە ئایەتی پێشتردا دەفەرموێ: ﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾ ص، واتە: بەدڵنیاییی ئەم قورئانە بیرخەرەوەیە بۆ هەموو جیهانییان.

بەڵام خوا لەو كاتەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَعۡلَمُنَّ نَبَأَهُۥ بَعۡدَ حِينِۭ ﴿٨٨﴾ ﴾، دوای ماوەیەكی دیكە هەواڵی ئەم قورئانەتان بۆ دەردەكەوێ، كە ئەم قورئانە چییە، ئەی كافرە ملهوڕەكانی مەككە! دیارە ئیعجازی هەواڵیی (الإعجاز الخبري) لە قورئاندا باسێكی دوورو درێژە.

هەڵگەڕانەوەش لە ئیسلام لە سەردەمی خەلیفە ئەبوبەكری صیددیق دابوو، (أبوبكر صديق) خوای لێ ڕازی بێ یەكەمین جێنشینی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ حاڵەتی هەڵگەڕانەوەو پاشگەزبوونەوە لە ئیسلام زۆر پیاوانەو مەردانە ڕووبەڕوو

بۆوە، كە لە هەندێك ڕیوایەتاندا هاتوە، دەڵێ: جگە لە خەڵكی مەككەو مەدینەو طائیف، خەڵكی زۆربەی شوێنەكانی دیكە مەرج نیە هەموو خەڵكەكە بە تێكڕا، بەڵام لە هەموو شوێنەكانی دیكەدا خەڵك هەڵگەڕابۆوە لە ئیسلام، (أبوبكر الصدیق) خوا لێی ڕازی بێ وەك كێو لە بەرانبەر ئەو حاڵەتەدا وەستا، هەرچەندە هەندێ لە هاوەڵان ڕایان نەبوو چەكو هێز بەكاربهێنرێ لە بەرانبەر هەڵگەڕاواندا و دەیانگوت: پێیان ناوێرین، بەڵام ئەبوبەكر، گوتی: ئەگەر بە تاقیتەنیاش بم لە بەرانبەر ئەو حاڵەتەدا دەوەستم، وە قسە ناودارەكەی خۆی كرد كە گوتی: (أَيَنْقص هَذَا الدِّين وأنا حَيّ)، ئایا ئەم دینە دەبێ كەم بكات لە كاتێكدا من زیندووم؟! نابێ كەم بكات، ئەمڕۆ زەكاتیان لابرد، سبەینێ شتێكی دیكەشی لێ لادەبەن‌و، دوو سبەی شتێكی دیكەی لێ لادەبەن، چونكە ئەوانەی كە هەڵگەڕابوونەوە زەكاتدانیان كردبوو بە بیانوو و دەیانگوت: لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ زەكاتمان داوە، بەڵام ئێستا نایدەین بە غەیری پێغەمبەر، ئەوە باجێكە خراوەتە سەرمان.

**مەسەلەی دووەم:** كە دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ﴾، وەك پێشتر باسمان كرد (ردّة) بریتیە لەوە كە ئینسان لە ئیسلام بەرەو كوفر هەڵگەڕێتەوە، هەڵگەڕانەوەو پاشگەزبوونەوەش لە ئیسلام بە سێ شتان دەبێ:

١- بە دڵ‌و نیەت دەبێ، كە دڵی لەسەر شتێك بچەسپێنێ كوفرو شیرك بێ، ئینسان لە دڵی خۆیدا دەگونجێ كافر بێ، بێئەوەی دەریببڕێ.

٢- بە زمانی دەبێ، كە شتێك بە زمان بڵێ كوفرو شیرك بێ.

٣- بە كردەوە دەبێ، كە ڕەفتارێك بكات بە كوفرو شیرك دابنرێ، بەڵام ئەوەی كە مامەڵەی دنیایی لەسەر بنیات دەنرێ، دەربڕینی زمان‌و كردەوەی ئەندامەكانە، ئەوەی كە دەگوترێ‌و دەبینرێ، بەڵام چی لە دڵدا هەیە؟ بڵێی: من دەزانم تۆ هەڵگەڕاویەوە، چونكە لە دڵتدا فلان شت هەیە؟! كەس ئەو هەقەی نیە، وە زانایان وەك بنچینەیەك دایانناوە (نَحْنُ نَحْكُمُ بالظَّاهِرِ وَاللَّهُ يَتَولّى السَرائِر) ئێمە حوكم بە ڕواڵەت‌و ئاشكرا دەكەین، نهێنییەكانیش حەواڵەی خوا دەكەین،

دیارە من لە نامیلکەی (هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام)دا باسی سزای هەڵگەڕانەوەم کردوە، چۆنە؟ کە ئەو بابەتە بەشێکە لە کتێبی: (ئیسلامو دەوڵەت داریی و حوکمڕانیی)، هەروەها لە بەرگی (٨)ی (الإسلام کما یتجلی في کتاب الله)شدا قسەم لێکردووە پێشتریش لە تەفسیری سوورەتی (البقرة) لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا لەوبارەوە دواوم، بۆیە لێرەدا بە خێرایی بەسەریدا ڕەتبووم.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ﴾، ئەم ڕستە قورئانییە دوو هەڵوەستەی پێویستی لەبەردەمدا دەکەین:

**هەڵوەستەی یەکەم:**

**مەدحێکی گەورەی ناڕاستەوخۆی (أبو بکر الصدیق)**

ئەم ڕستە مەدحێکی زۆر گەورەی ئەبوبەکری صیددیقی تێدایە خوا لێی ڕازی بێ، هەروەها هی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر کە لە خزمەت ئەبوبەکر دابوون، وە لەگەڵ هەڵگەڕاوەکانداو لەگەڵ زەکات نەدەرەکاندا ڕووبەڕووبوونەتەوە، مەدحێکی گەورەی ئەوانی تێدایە، ئەویش لە سێ ڕووەوە:-

١) ئەم ئایەتە ڕایدەگەیەنێ کە هەر کاتێك کەسانێك لە ئاینەکەیان هەڵگەڕانەوە، خوا کۆمەڵە کەسانێك دێنێ بۆ شوێن پێگرتنەوەی ئەو کۆمەڵە هەڵگەڕاوەیە، دەفەرموێ: ﴿ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ ﴾، هەر یەکێك لە ئێوە لە دینەکەی هەڵگەڕێتەوە، خوا کۆمەڵێك دێنێ، کەواتە: ئەوەی کە شیعە دەیڵێن ڕاست نیە: شیعە دەڵێن چی؟ دەڵێن: ئەو هاوەڵانەی پێغەمبەر ﷺ کە دانیان بە خەلیفایەتیی ئەبوبکردا هێنا، هەموویان هەڵگەڕاونەوەو کافر بوون، چونکە نکوولێیان لە دەقێکی ئاشکرا (نص جَلِيٍّ)ی پێغەمبەر ﷺ کردوە، لەسەر پێشەوایەتیی عەلی خوا لێی ڕازی بێ، چونکە ئەگەر ئەو قسەیە ڕاست

بووایەو ئەو هاوەڵانە هەڵگەڕابانایەوە، دەبوو یەکسەر خوا کۆمەڵێکی دیکەی هێنابا بۆ شوێنی ئەوان، چونکە خوا دەفەرموێ: ﴿مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ﴾، لێرەدا بە تەئکید دوێنەراوانی یەکەم بەم ئایەتە هاوەڵان بوونو پێش هەموو جیلەکانی مسوڵمانان ڕووی لەوانە، کە هەر کاتێك کۆمەڵێك لە ئێوە هەڵگەڕێتەوە، خوا کۆمەڵێك دێنێ، ئنجا مادام خوا کەسی نەهێناوە بۆ جێپێگرتنەوەی هاوەڵان، کەواتە: هەڵنەگەڕاونەتەوە، نە ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێ خەلیفایەتیی لە عەلی داگیر کردووە، نە هاوەڵانیش هەڵگەڕاونەوە، چونکە ئەگەر ئەبوبەکر زەوتکەر (غاصب)و ستەمکار بووایەو هاوەڵان هەڵگەڕابانایەوە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە پشتگیریی ئەبوبەکریان کردووەو لە هەقی عەلی بێدەنگ بوون، "وەك شیعە گومان دەبەن" دەبوو خوای بەرز کۆمەڵێکی دیکە بێنێ، ئنجا کە کەسی نەهێناوە، مانای وایە ئەو قسەیەی ئەوان ڕاست نیە، ئەم ئایەتە لەو ڕووەوە مەدحێکی گەورەیە بۆ ئەبوبەکرو هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، وە بە درۆخستنەوەی شیعەکانیشە لەو بۆچوونەیاندا.

٢) هەروەها ئەو ئایەتە مەدحو ستایشێکی گەورەیە بۆ ئەبوبەکری صیددیقو هاوەڵانیش بەگشتی، چونکە خوا ڕایگەیاندوە کە هەر کات بەشێك لە بڕواداران هەڵبگەڕێنەوە، ئەوە خوا کۆمەڵێکی دیکە دێنێ بۆ بەرپەرچدانەوەیان، یان بۆ شوێنگرتنەوەیان، ئاشکراشە کە مەسەلەی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلامدا لە ڕۆژگاری خیلافەتی ئەبوبەکردا ڕوویداو، ئەبوبەکرو هاوەڵانیش ڕووبەڕوویان بوونەوە، کەواتە: سەرجەم ئەو (٦) سیفەتەی کە خوا ئەوانەی پێ مەدح دەکات، کە دەیانهێنێ بۆ شوێن پێگرتنەوەی هەڵگەڕاوەکان لە ئاینەکەی، ئەو شەش سیفەتە بە پلەی یەکەم لە ئەبوبەکردا خوا لێی ڕازی بێ، وە پاشان لە هاوەڵانی بەڕێزدا کە لە خزمەتی دابوون، هاتوونەتە دی، کە خوا دەفەرموێ: خوا خۆشیدەوێنو خوایان خۆشدەوێ، لەگەڵ ئیمانداراندا نەرمو نیانو میهرەبانن‌و، لە بەرانبەر کافراندا بە دەمارو سەختن، وە لە ڕێی خوادا تێدەکۆشن، وە لە لۆمەی لۆمەکاران ناترسێن، جا جێی سەرسووڕمان ئەوەیە کە هەندێك لە شیعەکان ویستوویانە ئەو وەسفانە بەسەر (عەلی)دا خوا لێی

ڕازی بێ بچەسپێنن، بە بەڵگەی ئەوە کە ئیمامی هەق بووەو، هەر کەس لەگەڵی نەبووبێ هەڵگەڕاوە (مُرْتَـد) بووە! بـەڵام قسـەکەیان ڕاست نیـە، هەر بـە خودی قســەو هەڵوێســتی عـەلی خـوا لێـی ڕازی بـێ، چونکە بـە یـەك دەنگیـی (إتفـاق)ی شــیعەو ســوننە عەلــی خـوا لێــی ڕازی بــێ، نەیارەکــانی خــۆی، چ ئەوانــەی لـە جـەنگی (صـفّین)دا لەگـەڵی ڕووبەڕووبوونــەوە، واتـە: موعاویـەو عـەمری کـوڕی عـاص‌و ئەوانەی لەگەڵیـانـدا بوون، چ ئەوانەی لە جەنگـی (جَمَل)دا واتـە: دایکمان عائیشــە خـوا لێـی ڕازی بـێ طـەڵحـەو زوبێـرو ئـەوان خـوا لێیـان ڕازی بـێ، وە چ ئەوانـەی لـە جـەنگی نەهرەوانـدا کـە خـەوراج بوون، هیـچ کـام لەوانـەی بـە کـافر دانەنـــاوە، بـە بەڵـگەی ئـەوە کـە هـــەموو جـارێ عـەلی لـە کۆتـایی جەنگەکانـدا دەیگـوت: جـەنازەکان بێـنن‌و نوێـژی لەسـەر هـەموو کوژراوەکـان دەکـرد، وە دەشـیفەرموو: ئەوانـە بـرای دینیمـانن، بـەڵام ئـەوە پێکـەوە شـەڕ دەکـەین، ئـەوە شـتێکی موتەواتـیرە کـە عەلـی خـوا لێـی ڕازی بـێ نـەیارەکانی خـۆی ئەوانـەی لـە جەنگـەکانی (صـفّین)و (جَمَـل)و (نَهْـرَوان)دا لەگـەڵی ڕووبەڕووبوونـــەوە، بـــە مسـوڵمانی داناون، کەواتـە: ئەو قسـەیە ڕاسـت نیـە.

٣) ئـەم ئایەتـە بەڵگـەی ڕاســتیی خەلیفایــەتیی ئەبوبەکـرە خـوا لــێی ڕازی بــێ، چونکــە خــوا ئەوانــەی پــاش هەڵــگەڕانەوەی هەڵــگەڕاوان (إرتـداد الـمرتدین) دەیانهێنــێ، بـەو شـەش سـیفەتە وەسفی کـردوون کـە باسـمان کـردن: خۆشـی دەوێـن‌و خۆشـیان دەوێ، لەسـەر ئیمانـداران میهرەبـان‌و بـە بـەزەیین لـە بەرانبـەر کافرانـدا تونـدو بـە زەبـرن، لـە ڕێـی خـوادا تێدەکۆشـن‌و لـە لۆمـەی لۆمەکـەران ناترسـێن، کە دیارە ئەبوبەکر خـوا لێـی ڕازی بــێ، هـەر کـام لـەو شـەش سـیفەتەی زۆر بە تۆخیـی تێـدا هـەبوون، با تەماشـا بکـەین:

١و ٢/ ﴿ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ﴾: خوا خۆشـی دەوێـن‌و خوایان خۆشـدەوێ، ئەگـەر خـوا ئەبوبـەکری خۆشــنەویستبایە ئـەو کـارە گرنگـەی بـە قســمەت نەدەکــرد، کـە بریتیــە لـە ڕاوەســتان لـە بەرانبــەر ئەوانــەدا کـە لـە ئیسـلام هەڵــگەڕاونەوەو دژایـەتی ئیسـلام دەکەن‌و، دەیانەوێ ئیسـلام لە مێخـەوە دەربێنن، کـە بێگومـان لە دوای کـارە گەورەکەی پێغـەمبەر ﷺ ئەو کـارەی ئەبوبـەکر گـەورەترین کـار

بووە کە کراوە، چونکە پێغەمبەر ﷺ جاری پێکهێنانی دەوڵەتی ئیسلامییدا، ئەبوبەکریش خوا کردیە هۆکاری ئەوە کە ئەو دەوڵەتە نەڕووخێ‌و، ئەو ئیسلامە هەر ڕۆژە شتێکی لێ کەم نەکرێتەوە!

دیاریشە ئەگەر ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێ، ئەوپەڕی خۆشویستنی بۆ خوا نەبووایە، ئەوەی نەدەکرد، بەتایبەتی لە کاتێکدا کە هاوەڵانیش زۆربەیان هەڵوێستەکەی وییان پێ ڕاست نەبوو، یەکێك لەوانە عومەر خوا لێی ڕازی بێ، بۆچی پێی ڕاست نەبوو؟ دەیگوت: ناتوانین زاڵ بین بەسەر ئەو خەڵکەدا، چونکە زۆرزۆر بوون، وە جۆرێك لە ئیشکالی فیکریشی هەبوو، لەبارەی ئەو جەنگەوە، بە هۆی تێگەیشتنێکی تایبەت بۆ فەرموودەی: ﴿أُقَاتِلُ النَّاسَ حَتَّى يَقُولُوا لا إِلَهَ إلاَّ اللَّه، فَإِذَا شَهِدُوا أَنْ لا إِلَهَ إلاَّ اللَّه وَآمَنُوا بِي وَبِمَا جِئْتُ بِهِ فَقَدْ عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ إِلاَّ بِحَقِّهَا وَحِسَابُهُمْ عَلَى اللهِ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ برقم: (٢٤٠٥)}.

٣/ ﴿ أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾: بەنسبەت سیفەتی بەزەیی‌و نەرم‌و نیانیی‌و میهرەبانیی ئەبوبەکریش دەڵێین:

ئەگەر تەماشای سیرەو ژیانی ئەبوبەکر بکەین، دەبینین یەکجار بە ڕەحم‌و بە بەزەیی‌و بە سۆز بووە، پێغەمبەریش ﷺ لە فەرمایشتێکدا دەفەرموێ: ﴿أَرْحَمُ أُمَّتِي بِأُمَّتِي أَبُو بَكْرٍ وَأَشَدُّهُمْ فِي دِينِ اللهِ عُمَرُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٠٢٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٧٩١) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيح، وَالنَّسَائِي فِي (الكبرى) برقم: (٨٢٤٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٥٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٧١٣٧)، وَالحَاكِمُ برقم: (٥٧٨٤)، وَقَالَ: صحيح على شرط الشيخين عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ﷺ وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: بە بەزەییترینی ئۆممەتم بەرانبەر بە ئۆممەتم ئەبوبکرە، خوا لێی ڕازی بێ، وە توندترینیشیان لە ئاییینی خوادا عومەرە.

٤/ ﴿ أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴾، هەروەها ئەبوبەکر لە بەرانبەر کافراندا زۆر سەخت‌و توند بووە، لەوبارەوەش ئەبوبەکر ئەو هەڵوێستەی بەسە کە

بەرجەستە بوو لە قسە ناودارەکەیدا کە گوتی: (وَاللّٰهِ لأقتلنَّهُم وَإِنْ كُنتُ وَحدي) سوێند بە خوا لە دژی هەڵگەڕاوەکان دەجەنگم (کە دەیانویست هێرش بکەن بۆ سەر مەدینە) ئەگەر بە تەنیاش بم، هەتا لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ گوتی: ئەگەر سەگو گورگ لە خرخاڵی پێی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ ڕۆبێن (پڕیان دەنێ)و کەس نەبێ بەرگرییان لێ بکات، من ئەو جەنگە هەر دەکەم! عیززەت لەوە زیاتر دەبێ چی بێ؟! زەبریی و عیززەت لە بەرانبەر بێبڕوایانێکدا کە سەنگەریان لە ئیسلام گرتوە.

٥/ ﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾: سیفەتی لە ڕێی خوادا تێکۆشانیش، ئەبوبەکر هەر لە سەرەتاوە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووەو لە هەموو جەنگەکاندا نزیکترین کەس بووە لێیەوە، وە لە دوای ئەویش سەرکردەی موجاهیدان بووە.

٦/ ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوۡمَةَ لَآئِمٖ﴾: هەروەها ئەبوبەکر گوێی بە لۆمەی کەس نەداوە، بەڵکو گوێی بە لۆمەو قسەو ڕەخنەی عومەرو هاوەڵانی دیکەشی نەدا، چونکە ڕایان لەگەڵ جەنگ نەبوو، هەتا عومەر دەڵێ: دوایی کە تەماشام کرد ئەبوبەکر زۆر پێداگیریی دەکات، خوای پەروەردگار دڵی منیشی گوشاد کردو منیش چوومە سەر ڕایەکەی وی، دیارە مسوڵمانان زیاتر تەماشای دەمی ئەبوبەکرو دەمی عومەریان کردوە خوا لێیان ڕازی بێ، وە ئەوانی دیکەش کە تەماشایان کرد ئەوان یەك دەنگن، شوێنیان کەوتن، ئەم قسانە (فخرالدین الرازي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] هێناونی، بەڵام هەندێکیان بۆ خۆم زیاتر ڕوونم کردوونەوە.

١) مفاتيح الغيب، ج٣، ص١٧ – ٢٠.

## هەڵوەستەی دووەم:

### ئەوانەی کە شایستەیی بوژاندنەوەی ئیسلامیان هەیە دەبێ خاوەنی ئەو شەش سیفەتە بن:

واتە: کەسانێك کە شایستەیی ئەوەیان هەیە خوا بیانهێنێ دینەکەی خۆییان پێی ببووژێنێتەوە، لە کاتێکدا خەڵکێك دەستبەرداری دەبن، دەبێ ئەو شەش سیفەتە مەزنو گرنگانەیان تێدابن:

یەکەم: ﴿يُحِبُّهُمْ﴾: دەبێ ئەو کەسانە بن کە خوا خۆشیدەوێن، ئنجا ئایا خوا کێی خۆشدەوێ:

١- ئەوانەی شوێن پێغەمبەری خوا ﷺ دەکەون، ﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾﴾ آل عمران، واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ، شوێنم بکەون، خواش خۆشیدەوێن، کەواتە: بە ئەندازەی شوێنکەوتنمان بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ خۆشویستنی خوا بۆ خۆمان مسۆگەر دەکەینو دەشیسەلمێنین کە خوامان خۆشدەوێ، یانی: شوێنکەوتنی پێغەمبەر ئەملاولای خۆشویستنە: بەڵگەی خۆشویستنی ئێمەیە بۆ خوا، وە هۆکاری خۆشویستنی خواشە بۆ ئێمە.

٢- ئەوانەی زۆر تۆبە دەکەنو زۆر خۆ پاك دەکەنەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة، واتە: بێگومان خوا زۆر تۆبەکارانو خۆ پاککەرەوانی خۆشدەوێن.

٣- ئەوانەی زۆر خۆیان دەپارێزنو پارێزکارن: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾﴾ التوبة، واتە: بێگومان خوا پارێزگارانی خۆشدەوێ.

٤- ئەوانەی زۆر خۆڕاگرو ئارامگرن: ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٤٦﴾﴾ آل عمران، واتە: وە خوا زۆر ئارامگرانی خۆشدەوین.

٥- ئەوانەی پشت بە خوا دەبەستن: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾﴾ آل عمران، واتە: بێگومان خوا پشت پێبەستووانی خۆشدەوێن.

٦- ئەوانەی چاکەکارن: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٩٥﴾﴾ البقرة، واتە: بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن.

٧)- ئەوانەی لە ڕێی خوادا دەجەنگن: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِهِۦ صَفًّا كَأَنَّهُم بُنْيَـٰنٌ مَّرْصُوصٌ ﴿٤﴾﴾ الصف،، واتە: بێگومان خوا ئەوانەی خۆشدەوێن کە بە ڕیز لە پێناویدا دەجەنگن، دەڵێی دیواری قورقوشمیین.

دووەم: ﴿وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾: دەبێ ئەوانیش خوایان خۆشبوێ، کێ خوای خۆشدەوێ؟ پێشتر باسمکرد، کێ زیاتر بە دوای پێغەمبەر ﷺ بکەوێ، زیاتر شوێن پێی هەڵبگرێ، مانای وایە زیاتر دەیسەلمێنێ کە زیاتر خوای خۆشدەوێ، خوا دەفەرموێ: بڵێ: ئەگەر خواتان خۆشدەوێ، شوێنم بکەون تاکو خواش خۆشی بوێن.

سێیەم: ﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾: باسمکرد (ذَلَّ عَلَيْهِ) واتە: باڵی بەسەردا شۆڕکرد، بە زەیی پێداهاتەوەو سۆزی بۆی هەبوو، ئیماندار دەبێ لەگەڵ ئیمانداران دا بە ڕەحم بێ، کاتێك دەسەڵاتت هەیە دەبێ لەگەڵ خەڵك بە بەزەیی بێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِمَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٢١٥﴾﴾ الشعراء، کەواتە: وەك چۆن باڵندە بێچووەکانی خۆی لە بن باڵ دەگرێ، دەبێ بەرپرسانی مسوڵمانان، هەر کەس، دەستەڵاتی هەیە، بە ئەندازەی ئەوە کە قسەی دەڕوا، ئاوابێ لەگەڵ ئیمانداران.

چوارەم: ﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ﴾: دەبێ لە بەرانبەر کافرانێکدا کە سەنگەری لێدەگرن، بە عیززەتو زبرو سەخت بێ، نەك نەرمو نۆڵو فەقیرۆکە.

پێنجـــەم: ﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾: دەبـێ ئامادەبـێ ئەوپـەڕی توانـای خـۆی لەپێنـاوی خــواداو لـە پێنـاوی دینی خـوادا بـەخت بکات، بـە دڵو بـە دەسـتو بـە زمـانو بە مـاڵ.

شـەشـــەم: ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ﴾: وە دەبــێ لـە لۆمــەی لۆمــەکاران نەترسـن، لەڕاسـتیدا هـەر کەسـێك گـوێ بداتـە قسـەو قـاڵی خـەڵكو پڕوپاگەنـدەو درۆو دەلەسـەیان، دەبێ هیچ نەکات، لەوبارەوە ئـەم فەرموودەیـە هەیـە: ﴿عَـنْ عُبَادَةَ بْنَ الصَّـامِتِ ﵁، قَـالَ: بَايَعْـنَا رَسُولَ اللَّه ﷺ عَلَـى السَّمْعِ والطَّاعَـةِ فـي العُسْـرِ والـيُسْرِ، والـمَنْشَـطِ وَالـمَكْرَه، وَعَلَـى أثَـرَةٍ عَلَينَا، وَعَلَـى أنْ لا نُنَـازِعَ الأمْـرَ أهْلَـهُ، إلاَّ أنْ تَـرَوْا كُفْـراً بَوَاحاً عِنْـدَكُمْ مِنَ اللّهِ تَعَـالَى فِيـهِ بُرْهَـانٌ، وَعَلَـى أنْ نَقُـولَ بـالحَقِّ أيْنَمَـا كُنَّـا لاَ نَخَـافُ فـي اللهِ لَوْمَـةَ لائِـمٍ﴾ {أخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٧١٩٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٧٤٥) وهذا لفظه}، واتە: عوبـادەی کوڕی صامیت خوا لێـی ڕازی بێ (کە یەکێك بوو لەو دوازدە کەسـەی کە پێغەمبـەر ﷺ لـە پـەیمانی دووەمـی عەقەبـەدا فـەرمانی کـرد دوازدە نـەقیب هەڵبـژێرن، یـەکێکیان عوبـادەی کـوڕی صـامیت بـوو)، دەڵـێ: پـەیمانمان لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا بەسـت (واتـە: لـەلای عەقەبـە لـە شــەوەکەی دا لـە سـاڵی دوازدەی پێغـەمبەرایەتییدا بـۆ جاری دووەم)، لەسـەر گـوێ بـۆ گـرتنو فەرمانبـەریی بـۆ کـردن (بـۆ کـێ؟ بـۆ پێغەمبـەر، بـۆ بەرپرسـان) لە تەنگـانەو لە ئاسـانییدا، لە کـاتی پێخۆشـبوونو پێنـاخۆشـبووندا، وە ئەگەر خەڵکیشـمان بەسەردا هەڵبژێردرێو بەشیشــمان بخورێ، وە پەیمانـمان پێـدا کە کەسـانێك حوکمڕانو بەرپرسـن ناکۆکییـان لەگەڵدا نەکەینو دژایەتییان نەکەین، بـەڵام هـەق بڵێین لـە هەرشـوێنێك بووین، لـە پێنـاوی خـوادا لـە لۆمـەی لۆمەکـاران نەترسـێین.

هـەروەها هـەر لـەوبارەوە ئـەم فەرموودەیـەش هەیـە، کـە فەرموودەیـەکی زۆر کۆکەرەوەیــە: ﴿عَـنْ أَبِـي ذَرٍّ ﵁، قَـالَ: أَمَرَنِـي خَلِيلِـي ﷺ بِسَـبْعٍ أَمَرَنِـي بِحُـبِّ الْمَسَاكِينِ، وَالدُّنُوِّ مِنْهُمْ، وَأَمَرَنِي أَنْ أَنْظُـرَ إِلَـى مَنْ هُـوَ دُونِـي، وَلا أَنْظُـرَ إِلَـى مَنْ هُـوَ فَوْقِـي، وَأَمَرَنِـي أَنْ أَصِلَ الـرَّحِمَ، وَإِنْ أَدْبَـرَتْ، وَأَمَرَنِـي أَنْ لا أَسْـأَلَ أَحَدًا شَـيْئًا،

وَأَمَرَنِي أَنْ أَقُولَ بِالْحَقِّ وَإِنْ كَانَ مُرّاً، وَأَمَرَنِي أَنْ لا أَخَافَ فِي اللهِ لَوْمَةَ لائِمٍ، وَأَمَرَنِي أَنْ أُكْثِرَ مِنْ قَوْلِ لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ، فَإِنَّهُنَّ مِنْ كَنْزٍ تَحْتَ الْعَرْشِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٤٠٢٢) تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح}، واتە: ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: خۆشەویستەکەم (واتە: پێغەمبەرﷺ) فەرمانی پێکردم بە حەوت شتان: فەرمانی پێکردم نەدارەکانم خۆشبوێن و لێیان نزیك بم و، لەگەڵیان تێکەڵ بم، وە فەرمانی پێکردم تەماشای کەسێك بکەم کە لە خوار خۆمەوەیە (لە ژیانی و گوزەرانی ماددییدا) و تەماشای کەسێك نەکەم لە سەرووی خۆمەوەیە، وە فەرمانی پێکردم کە پەیوەندیی خزمایەتی بگەیەنم ئەگەر خزمەکانیشم پشتم تێبکەن، وە فەرمانی پێکردم کە داوای هیچ شتێك لە هیچ کەس نەکەم و، هیچ چاوەڕوانییەکم لە کەس نەبێ، وە فەرمانی پێکردم کە هەق بڵێم ئەگەر تاڵیش بێ، (واتە: با خەڵکێك پێشی ناخۆشبێ هەر بیڵێم)، وە فەرمانی پێکردم کە لە پێناوی ڕازیکردنی خوادا لە لۆمەی هیچ لۆمەکارێك نەترسێم، وە فەرمانی پێکردم کە زۆر بڵێم: (لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلاَّ بِاللهِ) لادان نیە لە گوناح و هێز نیە بۆ چاکە، مەگەر بە خوا، (فەرمووی) چونکە ئەو چەند وشەیە خەزێنەیەکن لە ژێر عەرش، واتە: وشەی زۆر بەرزو پیرۆزن.

هەروەها هەر لەوبارەوە ئەم فەرموودەیەش هەیە: ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ رضي الله عنه، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: أَلا لايَمْنَعَنَّ أَحَدَكُمْ رَهْبَةُ النَّاسِ، أَنْ يَقُولَ بِحَقٍّ إِذَا رَآهُ أَوْ شَهِدَهُ، فَإِنَّهُ لا يُقَرِّبُ مِنْ أَجَلٍ وَلا يُبَاعِدُ مِنْ رِزْقٍ، أَنْ يَقُولَ بِحَقٍّ أَوْ يُذَكِّرَ بِعَظِيمٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٤٩٢)، تعليق شعيب الأرنؤوط: حديث صحيح دون قوله: فَإِنَّهُ لا يُقَرِّبُ مِنْ أَجَلٍ وَلا يُبَاعِدُ مِنْ رِزْقٍ، أَنْ يَقُولَ بِحَقٍّ أَوْ يُذَكِّرَ بِعَظِيمٍ}، واتە: ئاگاداربن! با ترس لە خەڵك وا لە یەکێ لە ئێوە نەکات، هەق نەڵێ، لە هەق گوتن نەیسڵەمێنێتەوە هەرکاتێك بینی یان ئامادەبوو، چونکە بە تەئکید هەق گوتن و بیرخستنەوەو ئامۆژگارییکردنی کەسێکی ورەوبالا ئینسان لە ئەجەل لە مەرگ نزیك ناخاتەوە.

# ڕوونکردنەوەی چەمک و واتای خۆشەویستی بەندە بۆ خوا

خاوەنی کتێبی (الکشاف) کە یەکێکە لە زانایانی زەبر دەستی تەفسیرکردنی قورئان، بەڵام (مُعتزلة) بووە، واتە: هەندێ بیروبۆچوونی هەبوون، کە جیابوون لە هی زۆربەی زانایان: (الزمخشري) لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ...﴾: دەڵێ: (مَحبَّةُ العِبَادِ لِربِّهِم طَاعَتُهُ وَابْتِغَاءُ مَرْضَاتِهِ، وَأَنْ لا يَفعَلُوا مَا يُوجِبُ سَخَطَهُ وَعِقَابَهُ، وَمَحبَّةُ اللهِ لِعبَادِهِ أَن يُثيبهُم أَحْسَنَ الثَّوابِ عَلَى طَاعَتِهِم وَيُعظِّمَهُم وَيُثْني عَلَيهِم وَيَرْضى عَنْهُمْ..)، واتە: خۆشەویستی بەندەکان بۆ پەروەردگاریان ئەوەیە کە فەرمانبەریی بۆ بکەن، وە ڕەزامەندیی خوا داوابکەن و بخوازن، وە شتێك نەکەن کە خوا تووڕەبێ، یاخود سزایان بدات، وە خۆشەویستیی خوا بۆ بەندەکانی، ئەوەیە کە پاداشتیان بداتەوە بە باشترین پاداشت دانەوە، لەسەر فەرمانبەرییان، وە ڕێزیان بگرێ، وە ستایشیان بکات وە لێیان ڕازی بێ...

(الآلوسي)یش لە (إبن المنير)ەوە لە کتێبی (الإنتصاف)دا بەرپەرچی ئەو قسەیەی زەمەخشەریی دەداتەوە، کە بێگومان قسەکەشی ناڕاستە، دەڵێ: (أَنَّهُ لا شَكَّ أَن تفسيرَ مَحبَّةِ العَبْدِ للهِ تَعَالَى بِطَاعَتِهِ لَهُ سُبْحَانَهُ، عَلَى خلافِ الظَّاهِرِ وَهُوَ مِنَ المَجَازِ الَّذِي يُسَمَّى فِيهِ المُسَبَّبِ بِاسْمِ السَّبَبِ، وَالمَجَازُ لا يُعْدَلُ إِليهِ عَنِ الحَقِيقَةِ إِلاَّ بَعْدَ تَعَذُّرِها فَلْيُمتَحن حقيقةُ المَحبّةِ لُغَةً بالقَوَاعِدِ لننظُرَ أَهِيَ ثَابتةٌ للعبدِ مُتعلقةً بِاللهِ تَعَالَى أم لا؟ فَالمَحَبَّةُ مَيْلُ المُتَّصِفِ بِهَا إِلَى أَمْرٍ مُلَذٍّ واللَّذاتُ البَاعِثةُ عَلَى المُحَبَّةِ مُنقسمة إلى مُدْرَك (بالحسِّ) كَلذَّةِ الذَّوقِ في المطعوم، ولذةً النظر في الصور المستحسنة إلى غير ذَلِكَ، وَإِلَى لَذَّةٍ مُدْرَكَةٍ بِالعَقْلِ كَلَذَّةِ الجَاهِ والرِّيَاسَةِ والعلُوم وما يَجري مَجرَاهَا ....، ثُمَّ تَتَفَاوتِ المَحبَّةِ ضَرورَةً بِحَسَبِ تَفَاوتِ البَوَاعِثِ عَلَيْهَا ....، وَلَيْسَ مَعْلُومٌ أَكمَلَ ولا أَجَلَّ مِنَ المَعبُودِ الحَقّ، فاللّذةُ الحَاصِلَةَ مِن مَعْرِفَتِهِ وَمَعْرِفَةِ جَلالهِ وَكَمَالِهِ، تَكُونُ أَعْظَم، وَالمَحَبَّةُ المُنْبَعِثةُ عَنْهَا تَكُونُ أَمكَن، وَإِذَا حَصَلَتْ هَذِهِ المحبَّةُ بَعَثَت

عَلَى الطَّاعَاتِ وَالمُوَافَقَات، فَقَدْ تَحْصَّلَ مِنْ ذَلِكَ أَن مُحَبَّة العَبْدِ لِرِبَّهِ سُبْحَانَه مُمْكنَةُ بَلْ وَاقِعَة مِنْ كُلّ مُؤْمِن، فَهِيَ مِن لوازِمِ الإِيمَانِ وَشروطِهِ)، واتە: بێگومان تەفسیرکردنی خۆشویستنی بەندە بۆ پەروەردگار، بەوە کە پابەندبێ بە بەرنامەی خواوەو فەرمانبەری بێ، پێچەوانەی ڕواڵەتی ئایەتەکەیە، وە لەڕاستیدا ئەو جۆرە تەفسیرکردنە بەو (مجاز)ە دادەنرێ کە تێیدا ناوی هۆکار دەبرێتە سەر پەیداکراو، (مَجَاز)یش نابێ پەنای پێ ببردرێ لەحیاتی حەقیقەت، مەگەر نەگونجێ ئەو مانا (حقیقي)یە لەو شوێنە دابنرێ، ئنجا ئێستا با تەماشای نێوەڕۆکی خۆشەویستی بکەین، داخۆ دەگونجێ لە ڕووی زمانییەوەو لە ڕووی بنچینەکانەوەو عەبد خوای خۆشبوێو وەك خۆشویستن پەیوەست بێ بە خوای پەروەردگارەوە یان نا؟ خۆشویستن بریتیە لە مەیلو کێشکرانی کەسێك کە ئەو خۆشەویستییەی لە دڵدایە، بەرەو شتێك کە خۆشیدەوێو ئارەزووی لێیەتی، ئەو شتانەش کە لەزەتیان هەیەو پاڵ بە ئینسانەوە دەنێن کە ئینسان خۆشیبوێن، هەندێکیان بە هەستەوەرەکان دەزانرێن، وەك ئەوە کە ئینسان چێژ دەکات لە خواردنی خۆش، یان چێژ دەکات لە شتێکی جوان... هەروەها چێژو لەزەتێك کە بە عەقڵ دەزانرێ، وەك لەزەتی سەرۆکایەتیی، یاخود زانستو شارەزایی، وە شێوەی ئەوانە، دیارە ئەندازەی خۆشەویستییەکەش بە ئەندازەی ئەو هۆکارانەی کە پەیدای دەکەن، دەگۆڕێ، بێگومانیش هیچ زانراوێك تەواوترو پتەوتر نیە لە پەرستراوی بە هەق (کە خوایە)، بۆیە ئەو لەزەتو چێژو ئارەزووەی کە بە هۆی ناسینی خواوەو بەهۆی ناسینی بەرزییو تەواویی خوای پەروەردگارەوە پەیدا دەبێ، لە هەموو چێژو لەزەتێکی دیکە گەورەترو مەزنتر دەبێ، وە ئەو خۆشەویستییەی لەو لەزەتەوە دێ، دیارە لە هەموو خۆشەویستییەك زیاتر لە دڵدا دەچەسپێ، وە کاتێك ئەو خۆشەویستییەش پەیدادەبێ، وا لە ئینسان دەکات کە فەرمانبەریی خوا بکات، وە بە دوای ڕەزامەندیی خوا بکەوێ، کەواتە: دەرکەوت کە دەگونجێ بەندە پەروەردگاریی خۆی خۆشبوێ، بەڵکو ناگونجێ هیچ ئیمانداریك هەبێ ئیمانی هەبێو خوای پەروەردگاری خۆشنەوێ!

منیش دەڵێم: خۆشـــویستنی مرۆڤـ بـۆ شـــتێك كێشـــكرانیەتی لـه دەروونـەوە بـۆ ئەو شـتە، بـۆ وێنـە: ئینسـانی تێنـو ئـاوی خۆشـدەوێو حـەزی لـه ئـاوە، یـان پیـاو حەزی له ئافرەتـە، ئافرەته حـەزی له پیـاوە، ئەوە لەڕووی جەسـتەییەوە.

وە لـه ڕووی مەعنەوییـــەوە، ئینســـانی حـــەزی لـه جوانییـە، حـەزی لـه دەنگـی خۆشـە، حەزی له بۆنی خۆشـە، وە پاشان حەزی لە چاكییە، حـەزی لـه دادگەرییـە، حـەزی لـه تەواوییـە، حـەزی لـه ئازایەتییـە، حـەزی لـەو سیفەتانەیه كـه بـەرزن، بـه تەئكیـد خـوای بـــەرزیش خـاوەنی هـەموو سیفەتێكی چـاكو پەسـەندو بـەرزە، وە خـاوەنی ئەوپـــەڕی جـوانییو دادگـەرییو تەواوییـــە، پاشـان خـوای پەروەردگـار هـــەرچی لـــەززەتی ماددیی یـه ئـەو بەدیهـێنەریەتی، كەواتـە: خـوای پەروەردگـار دەبـێ لە هەموو شـتێك زیاتر خۆش بویسـترێ، ئەوە شتێكی زانراوو سەلمێنراوە.

__مەسـەلەی چـوارەم:__ كـه دەفـەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُۚ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾، وشـەی (ذَٰلِكَ) ناوی ئامـاژە (إِسْم إِشَارَة)یەو دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی كـه لـه سـەرەتای ئایەتەكەوە باسـكرا، كه دەفەرموێ: ﴿مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ...﴾، دوایـی دەفـەرموێ: (ذَٰلِكَ)، واتـە: ئـەوە كـه خـوا كەسـانێك بكاتـە شایسـتەی ئـەوە كـه دوای ئـەوەی كەسـانێك لـه دینەكـەی هەڵدەگەڕێنـەوە، ئـەوان بـێن بـۆ ئـەوەی بەیـداغی دیـنی خـوا هـەڵبگرن، ئـا ئـەوە بەخششێكی خوایە، دەیـدات بە هەر كەسـێك كە بیـەوێ، دیارە ویسـتو خواسـتی خـوا ڕەهـا (مطلق)یـەو سـنووردار نیـە، بـەڵام مانـای واشـنیە كـه لەگـۆترە دەبەخشـێ، ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ﴾، وە خـوا فراوانـی زانایـە، واتـە: سیفەتەكانی خـوا فراوانن، بـێ سنوورن، بەزەیی خـوا، زانیـاری خـوا، دەسـتەڵاتی خـوا، لێبوردەیی خـوا، بەخششی خـوا، هـەموو سیفەتەكانی خـوا بێ سـنوورن، وە خـوا زاناشـەو بـه پێـی ئـەو سـیفەتە بـێ سـنوورانەی خـۆی، مامەڵـەی زانایانـە لەگـەڵ دروسـتكراوەكانیدا دەكاتو، هەر كەسـه بە ئەندازەی ئەوە كە شـایستەبێ، پێـی دەبەخشـێ، جا لێـرەوە كـه دەفـەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ فَضۡلُ ٱللَّهِ يُؤۡتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾، وشـەی (فَضْـل)، واتـە:

بەخشش، شتێك كە بەبێ ئەوەی ئینسان لەسەری پێویست بێ، بیبەخشێ، دیارە خوای بەرز هیچ شتێكی لەسەر پێویست نیە، لەلایەن بەندەكانەوە، بۆیە خوا هەرچی بە بەندەكانی دەدات، هەمووی هەر فەزڵە، بەڵام ئایا بەخششی خوا مانای وایە كە بەبێ زەحمەتی ئینسانو ماندووبوونی ئینسان پێی دەدرێت؟ نەخێر، بەڵگەشمان ئەوەیە:

كە خوا لێرەدا دەفەرموێ: ﴿مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِۦ فَسَوْفَ يَأْتِى ٱللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُۥٓ ...﴾، كەواتە: لە ئەنجامی ئەوەدا ئەو فەزڵو بەخششەیان پێدەدرێ، كە خاوەنی ئەو سیفەتە بەرزانەن، كە وایانكردوە خوا خۆشیبوێنو خوایان خۆشدەوێ، وە لەگەڵ ئیمانداراندا میهرەبانو بەڕەحمن، لەگەڵ دوژمناندا زبرو بە دەمارن، وە لە ڕێی خوادا تێدەكۆشنو لە لۆمەی لۆمەكاران ناترسن، ئەو حەقیقەتەش لە زۆر شوێنی قورئاندا دووبارە بۆتەوە، كە ئینسان بەبێ خۆماندووكردنو خۆ زەحمەتدان، هیچی دەستگیر نابێ، وەك خوا لە سوورەتی (النجم) دا دەفەرموێ: ﴿ وَأَن لَّيْسَ لِلْإِنسَـٰنِ إِلَّا مَا سَعَىٰ ﴿٣٩﴾ ﴾، واتە: ئینسان هیچ شتێكی دەستگیر نابێ، مەگەر كۆشش بكاتو خۆی ماندوو بكات.

ئنجا ڕاستە بە پێی خۆماندووكردن خوا بە بەندەی خۆی دەبەخشێ، بەڵام ئایا ئەو بەخشینەش بەگوێرەیە؟ نەخێر، بەڵكو خوای كاربەجێ لە سوورەتی (النبأ)دا دەفەرموێ: ﴿ جَزَآءً مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابًا ﴿٣٦﴾ ﴾، بەخششی پەروەردگارت بە ژمارەیە، بەڵێ پاداشتدانەوەی خوای كاربەجێ بە حیسابو كیتابەو بەگوێترە نیە، وەك دەفەرموێ: ﴿لَا يَنَالُ عَهْدِى ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴿١٢٤﴾﴾البقرة، واتە: پەیمانی من ستەمكاران ناگرێتەوە، ئەوەی ستەمكار بێ بەكەڵكی ئەوە نایەت ببێتە سەرپەرشتیاری خەڵك، كەواتە: خوای دادگەر لە گوترە هیچ بە كەس نابەخشێ، هەمووی بە حیسابو كیتابو بە گوێرەی شایستەییە، وە لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ أَعْلَمُ حَيْثُ يَجْعَلُ رِسَالَتَهُۥ ﴿١٢٤﴾﴾، واتە: خوا زاناترە پەیامی خۆی لەلای كێ دادەنێ، پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام)

بۆیە خوا ﷻ کردوونی بە پێغەمبەرو بە نوێنەرو بە پەیام هەڵگری خۆی، چونکە لە نێو هەموو بەشەریەتدا، ئەوانە گوڵبژێر بوونو لە هەموو کەس شایستەتر بوون، مەعدەنەکەیان لە هی هەموو خەڵکی سەردەمی خۆیان، بەڵکو لە تێکڕای بەشەر باشتربوون.

ئنجا دەربارەی وشەی: ﴿ وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾، وە خوا فراوانی زانایە، سیفەتەکانی خوا ﷻ هەموویان فراوانو بێ سنوورن: زانیاریی، توانای، حیکمەتی، بەزەیی، ویستیی، لێبوردنی .. هتد، ئنجا خوا بەو سیفەتە فراوانو بێسنوورانەی خۆی مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات لەسەر بناغەی زانیاریی و حیکمەتیو دەزانێ هەر کەس چەندی دەداتێو چیو چی دەداتێ؟

<u>**مەسەلەی پێنجەم:**</u> کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴾، ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەکان بکەین، مانای ئەو ئایەتە زۆر ڕۆشنە، واتە: بێگومان دۆستو پشتیوانو یارمەتیدەری ئێوە تەنیا خوایە، وە پێغەمبەرەکەیەتی، وە ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە، جا ئەوانەی کە ئیمانیان هێناوە خوا بەوە وەسفیان دەکات دەفەرموێ: ئەوانەی نوێژ بەرپا دەکەن، زەکات دەدەن، وە زۆر ڕکووع دەبەن.

## بەرپەرچدانەوەیەکی شیعە لە تێگەیشتنێکی هەڵەیاندا:

ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ کە مسوڵمانان بۆیان نیە لە دوای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ غەیری ئیمانداراندا دۆستایەتیی بگرن، وە پشت بە غەیری ئیمانداران ببەستن‌و، لەگەڵیان بە ڕێدا بڕۆن، موداراو گوزەران لەگەڵ هەموو کەس دەبێ، بەڵام ئەوەی خۆشت بوێ‌و، پشتی پێ ببەستی‌و، جێی ڕازو نیازت بێ‌و، جێی کەین‌و بەینت بێ‌و، لەگەڵی دابی‌و لەگەڵت دابێ، دەبێ تەنیا ئیمانداران بن، شیعە ئەم ئایەتە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کە عەلی کوڕی ئەبو طالیب خوا لێی ڕازی بێ، پێشەوای دانراوی مسوڵمانانەو تاکە حوکمڕانیی‌و شایستە بووە، بەڵام ئەبوبەکرو عومەرو عوسمان غەدریان لێکردووە، ئەو پێشەوایەتیی‌و خەلیفایەتییەی کە پێغەمبەر ﷺ بۆی داناوە، لەم ئایەتەدا ئاماژەی بۆ کراوە، لێیان داگیر کردوە!

بەڵام لەڕاستیدا وانیە، بەس با بزانین ئەوان چۆن ئەم ئایەتە بە بەڵگە دێننەوە؟ هەڵبەتە هەر لە سووڕەتی (المائدة)دا ئایەتێکی دیکەش بە بەڵگە دێننەوە کە دوایی دەیگەینێ، لێرەدا ئەوان دەڵێن: بێگومان (إِنَّمَا: أَدَاةُ الحَصْرِ وَالإِثْبَاتِ)، (إِنَّمَا) واتە: ئامرازی چەسپاندن‌و کورت هەڵهێنانەو خواش فەرموویەتی: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، بێگومان دۆست‌و پشتیوانی ئێوە، تەنیا خوایەو، پێغەمبەرەکەیەتی‌و، ئەوانەن کە ئیمانیان هێناوە، ئەوانیش کێن؟ ﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴾، ئەوانەن کە نوێژ بەرپا دەکەن، وە زەکات دەدەن، وە زۆر ڕکووع دەبەن، ئنجا ئەوان ئاوا تەفسیری دەکەن، دەڵێن: ڕۆژێك سواڵکەرێك هاتوە بۆ مزگەوت داوای شتێکی کردوە، کەس هیچی نەداوەتێ، عەلی کوڕی ئەبو طالیب نوێژی کردوەو لە ڕکووع دابووە، ئەنگوستیلەیەکی لە دەستدا بووە، (ڕەنگە ئەنگوستیلەی زیو بوو بێ) ئاماژە بۆ کابرا دەکات: ئەم ئەنگوستیلەیە دەربێنە، ئەو صەدەقەیەی پێدەدات، وە کەس لە ڕکووعدا صەدەقەو خێری نەکردوە، جگە لە عەلی! کەواتە: خوا کە

دەفەرمویٚ: دۆستو پشتیوانی ئێوە خوایەو پێغەمبەری خوایە ﷺو ئیمانداراننن، ئەوانەی نوێژبەرپا دەكەنو زەكات دەدەنو زۆر ڕكووع دەبەن، دەڵێن: هەرچەندە لێرەدا بە كۆ فەرموویەتی، بەڵام مەبەستی پێ تاكە، ئەویش عەلی كوڕی ئەبو طالێبە، وە (ولي)یش لێرەدا بە مانای (والي) یان (متولّي الأمور) یان (متصرِّف) دێ، واتە: سەرپەرشتیاریو پێشەوا، وە لەوبارەوە ئەم دەقە دێنن: ﴿رُوِيَ أَنَّ سَائلاً سَأل في مَسْجِدِ رَسُول الله ﷺ فَلَم يُعطه أحد شيئاً، وَكَانَ عَلي في الصَّلاَة في الركُوع، وَفِي يَمينه خَاتَم، فَأشَار إلى السَّائِل بيدهِ حَتَّى أَخذه﴾[1]، واتە: گێڕدراوەتەوە كە سوالكەرێك ڕۆژێك لە مزگەوتی پێغەمبەردا ﷺ داوای شتێك دەكات، هیچ كەس هیچی ناداتێ، (عەلی)یش خوا لێی ڕازی بێ نوێژ دەكات لە ڕكووع دا دەبێو، لە پەنجەی دەستی ڕاستیدا ئەنگوستیلەیەك دەبێ، ئاماژەیەك دەكات بۆ كابرای سوالكەر دێو ئەنگوستیلەكەی دەداتێ.

جا دەڵێن: خوا دەفەرمویٚ: دۆستو پشتیوانی ئێوە لە دوای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا ئەو ئیماندارانەن كە نوێژ بەرپا دەكەنو، زەكات دەدەن بە ڕكووعەوە، ئەوان وای تەفسیر دەكەن (يُؤدون الزَكَاة وَهُمْ رَاكِعون) بەڵام مانای وانییەو، ماناكەی ئاوایە: (يُصَلُّونَ ويُؤدُّون الزَّكَاة وَيَركعون كثيراً) نوێژ دەكەنو زەكات دەدەنو زۆر ڕكووع دەبەن، دیارە ئەوەی كە ڕێ دەگرێ لەو قسانەی كە شیعەكان دەیڵێن، زۆر بەڵگەن بۆ نموونە:

١- ئەگەر زەكات دان بە ڕكووعەوە خێرتر بووایە، دەبوو زانایان بیانگوتبایە: لەمەودوا هەر كەسێك ویستی زەكات بدات، با بچێتە ڕكووع ئنجا زەكاتەكەی بدات، چونكە خوا دەفەرمویٚ: (ويُؤتون الزَكَاة وَهُمْ رَاكِعون)، كە ئەوە هیچ زانایەك واینەگوتوە نە لە زانایانی سوننەتو جەماعەت نە شیعە، نە خەواریج.

٢- ئایەتەكە باسی زەكات دەكات، ئەوەی عەلی كوڕی ئەبو طالێب خێرێك بووە، زەكاتیش جیایەو ئەنگوستیلەیەك بكرێتە خێر جیایە، لە زەكات دان، بۆیە

---

١) أَخْرَجَهُ إِبْنُ جَرير (٦/ ١٨٦)، عن السدي مُرْسَلاً، وإسنادهُ ضعيف، الجامع لأحكام القرآن: ج٦، ص١٩٣.

ئەگەر گریمان گێڕراوەکە ڕاستیش بێ‌و، ئایەتەکەش مانایەکەی وابێ کە ئەوان گوتوویانە: هیچ پەیوەندییان پێکەوە نیە!

٣- ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، بەڵام دەربارەی عەلی کوڕی ئەبو طالیب بووایە، دەبوو فەرمووبای: (وَالَّذِي آمَنَ الَّذِي يُقيمُ الصلاةَ و يُؤتى الزَّكَاةَ وَهُوَ رَاكِع) واتە: ئەو کەسەی ئیمانی هەیەو، نوێژ دەکات‌و زەکات دەدات‌و ڕکووعبەرە! ئاوای فەرمووبا، بەڵام هەموو بە کۆیە: ﴿ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمْ رَٰكِعُونَ ﴾.

٤- (إبْنُ كَثير) زانایەکە، هەم توێژەرەوەی قورئانە، هەم مێژووزانە، هەم فەرموودە ناسە، زانایەکی زۆر موعتەبەرەو قوتابی (إبْنُ تَيْمِيَة) بووە ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، دوای ئەوەی ئەو دەقەی پێشوو دێنێ، دەڵێ: دەقێکی ڕاست نیە، کە شیعە لە زۆربەی کتێبەکانیان دا باسی دەکەن‌و دووبارەی دەکەنەوە، دوای ئەوەی (إبْنُ كَثير) ئەم دەقە دێنێ لە (إبْنُ أبي حَاتم وإبْن جَرير وعَبدالرزاق وإبْن مردويه)ەوە دوایی گوتوویەتی: (وَلَيْسَ يَصِحُّ شَيء مِنْهَا بِالكُلِّيَّةِ، لِضُعْفِ أسَانيدها وَجَهَالَةِ رجالها) هیچ کام لەوانە کە (إبْنُ أَبي حَاتم، إبْن جَرير، عَبدالرزاق، إبْن مردوية) هێناونی، هیچ کامیان لە بنەڕەتەوە ڕاست نین، چونکە سەنەدەکەیان بێهێزەو پیاوەکان، (واتە: ڕاوییەکان)یشیان نەناسراون[1].

٥- (البَغَوِي)، کە زانایەکی گەورەی ئیسلامە کتێبێکی هەیە بە ناوی (شَرح السُّنَّة)، دەڵێ: (روِيَ عَن عَبْدُ المَلِك بْنِ سُلَيمَان قَالَ: سَأَلْتُ أَبا جَعْفَرَ مُحَمَّد بْن عَلِي البَاقر عَن هَذِهِ الآية: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، مَنْ هُمْ؟ فَقَالَ: المُؤمِنُون، فَقُلْتُ: إِنَّ نَاسَاً يَقُولُونَ هُوَ عَلِي، فَقَالَ: عَلي مِنَ الَّذِينَ

١) محاسن التأويل ج٤ ص١٥٩.

آمَنُـوا)[١]، بەغــەویی دەڵـێ: لـە عەبدولـمەلیکی کوڕی ســولەیمان گێڕدراوەتــەوە (کە هـەردووکیان حـوکمڕانی دەوڵەتی ئومـەویی بـوون)، دەڵـێ: لـە ئـەبو جەعفـەر موحەممەد کوڕی عەلی باقـرم پرسـی دەربـارەی ئـەم ئایەتـە: ﴿ إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، ئەوانـە كێن؟ گوتی: ئیمانداران، گوتم: هەنـدێك كـەس دەڵێن: مەبەسـت پێـی (عەلـی)یە، گوتــی: عەلـی یەكێك لە ئیمـاندارانە.

٦- بەڵـگەیەكی دیكــە، ئـەم ئایەتـە لـە سیاقێكدا هاتوە كـە هـەمووی قسـە لـەبارەی ئیماندارانەوە دەكات، كە دەبـێ تەنیا پشـت بە ئیمانداران ببەسـتن‌و، دۆستایەتیی كـافران نەكــەن‌و، ئـەهلی ئیمــانیان خۆشـبوێ، وە هـیچ پەیوەنـدیی بـەو قسـەو باسـانەی شـیعەكانەوە نییە.

ئنجـا (فخرالدین الرازي)یش لە تەفسـیرەكەی خـۆی دا[٢] بەرپەرچێكی باشـی ئەو قسـانەی شـیعەكان دەداتــەوەو، بە تەفصـیل بەڵگەكـانی دێنـێ.

هەروەهــا (الآلوسـي)یـش لــە تەفسـیــرەكەیدا[٣] قســەی زۆر دەكــات بــۆ ڕەتدانـەوەی شیعەكان، دوایـی دەڵـێ: (هَذَا الـدَّلِيل كَـمَا يَـدلّ بِزَعْمِهِم عَلَـى نَفِـي إمَامَـةِ الأَئِمَـةِ الــمُتَقَدِّمِين، كَــذَلِكَ يَـدلّ عَلَــى سَـلْب الإمَامَـةِ عَـنِ الأَئِمَـةِ الـمُتَأَخِرِينَ كَـالسبطين رَضِيَ اللهُ تَعَـالَى عَنْهُمَـا وَبَـاقِي الإِثـني عشـر رَضِـيَ اللهُ تَعَالــى عَـنْهُمْ أَجْمَعِين بعـين ذَلِـكَ التَقريـر، فَالـدّليل يَضـرُّ الشِيعَةَ أَكْثَـر مِمَّـا يضـرُّ أَهْـلَ السُّـنَّة..)، دیـارە شـیعەكان دەڵێن: دۆســتو پشـتیوانی ئێوە تـەنیا خـواو پێغەمبەرو عەلـی كوڕی ئـەبو طاڵیبـە، واتـە: لـە دوای پێغەمبـەری خـواوە، دەبــێ تــەنیا عــەلی ئیمـام‌و ســەرپەرشتیارتان بـێ، دەڵـێن: كەواتـە: ئەبوبـەكرو عومـەرو عوسـمان سەرپەرشتیاری مسـوڵمانان نـەبوون‌و بـە نـاڕەوا خەلیفـە بـوون، ئنجـا (ئالوسي)، دەڵێ: ئەگەر ئەو ئایەتە بكەنە بەڵگەی ئەوە كە پێشـەوایەتیی سـەركردە پێشـووەكان نەفـی دەكـات، بـە هـەمان شـێوە ئیمامـەتیش لـە سـەركردە

١) جامع البيـان: (١٢٢١١).
٢) مفـاتيح الغيـب: ج٣، ص٢٣ ـ ٢٧.
٣) روح المعانـي: ج٣، ص٤٧٢.

داهاتووەکانیش سەلب دەکات، وەك حەسەنو حوسەینو باقی دوازدە ئیمامەکان خوا لێیان ڕازی بێ، چونکە ئەگەر ئیمام لە دوای پێغەمبەر تەنیا عەلی کوڕی ئەبو طالیب بێ، کەواتە: لە دوای (عەلی)یش نابێ کەسی دیکە ببێ، وەك چۆن لە پێشی نەبێ، لە دواییشی نابێ کەسی دیکە هەبێ ببێتە ئیمام.

بە هەر حاڵ هەر ویستم تۆزێك بەرپەرچی ئەو قسەو قالانەی شیعەکان بدەینەوە، کە زۆر جار لایەڕانیان پێ ڕەش دەکەنەوە، بەلام لەڕاستیدا کە لە قسەکانیان دەفکری، هیچ بەڵگەیەکیان لەسەرنیە، ئنجا زانایانی ئەهلی سوننەت بەتایبەتی (طبري) وە زۆر لە زانایانی دیکەش هەر شوێنەوارێكو هەرشتێك کە بیستبیان یەکسەر نووسیویانەتەوە، بێئەوەی لێی بکۆڵنەوە بزانن داخۆ ڕاستە، یان ڕاست نیە، چونکە ئەوانەیان حەواڵەی زانایانی دوای خۆیان کردوە، (طبري) بۆخۆی دەڵێ: من لە تەفسیرەکەم دا، وە لە (تأريخ)ەکەمدا زۆر شتم کۆکردۆتەوە نووسیوە، بەلام لێکۆڵینەوەم دەربارەی ڕاستییو ناڕاستییان نەکردوە، بەڵکو ئەوەم بەجێهێشتوە بۆ زانایانی دوای خۆم، کە ئەوان لێی بکۆڵنەوە کامی وایەو کامی وانیە، واتە: بە ئینصافەوە هەرچی پێیانگەیشتووە گوتراوە هێناویانە، نەهاتوون لە بێژینگی بدەنو لە مەحەکی بدەن، کەواتە: ئەوە کە (طبري) شتێك دێنێ، یان فلان زانا شتێك دێنێ، ڕیوایەتێك دێنێ، مانای وانیە ئەو ڕیوایەتە ڕاستەو ڕای لەگەڵ ئەوە دابوو، بەڵکو ویستوویەتی وەك ئەمانەتی زانستیی ئەو ڕایانە بێنێ، بۆیە بەڵگە هێنانەوەی شیعە بەو جۆرە قسەو ڕیوایەتانەی هیچ بایەخێکیان نیەو چەسپاو نین، وەك دەست بە چڵەپووش گرتنی بابای بەڕووباردا چوویە.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَـٰلِبُونَ ﴾، وە هەر کەسێك دۆستایەتیی لەگەڵ خواو پێغەمبەرەکەیو ئەوانەدا کە ئیمانیان هێناوە، بکات، ئەوە بێگومان کۆمەڵی خوا زاڵن، واتە: ئەوانە دەبن بە کۆمەڵی خوا، کە تەنیا خوا بە دۆستو پشتیوان دەگرن، ئنجا پێغەمبەری خوا ﷺ، پاشان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، هەر کەسێك وابێ، ئەوە کۆمەڵی خوایە، وە کۆمەڵی خواش سەرکەوتوویە.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە کۆمەڵی خوا (حزب الله) کێ لەنێو بازنەو چوارچێوەیدا کۆدەبێتەوە؟ مەرج نیە ڕێکخراوێکی ئیسلامیی بێ، بەڵام کێ لە چوارچێوەو بازنەی کۆمەڵی خوادا کۆدەبێتەوە؟ بە دەقی ئایەت کەسێك کە تەنیا پشت بە خوا ببەستێ، وە پاشان دۆستایەتیی لەگەڵ پێغەمبەری خوا ﷺ دابێ، وە دوای خواو پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا دۆستایەتییو نزیکییو خۆشەویستیی لەگەڵ ئیمانداراندا هەبێ، کەواتە: کەسێك کە کەینو بەینی لەگەڵ حیزبێکی عەلمانییدا دەبێو، پشت بە حیزبێکی عەلمانیی دەبەستێ، وە ڕازو نیازی لەگەڵ حیزبێکی عەلمانیی، یان ڕژێمێکی عەلمانیی، یان لەگەڵ حیزبو ڕژێمێکی طاغووتییو دیکتاتۆریی دادەبێ، دوایش دێنێ ئەوە بە مسوڵمانان دەفرۆشێ، کە من شوێنێکەوتەی قورئانو سوننەتمو شوێنکەوتەی پێشینەی چاکم! لە حاڵێکدا کە پێشینی چاك لەگەڵ حوکمڕانانی ستەمکاردا دانوویان نەکوڵیون، چ جای حوکمڕانانێك کە نیشانەی پرسیار لەسەر ئەسڵی ئیمانو مسوڵمانەتییەکەیان هەیە!!

کەواتە: تۆ کە بانگەشەی شوێنکەوتنی قورئانو سوننەتو شوێن پێ هەڵگرتنی سەلەفی صالح دەکەی، دەبێ هەڵوێستە سیاسییەکەت ڕاست بکەیەوە، دەبێ سەروکارو پەیوەندیی سیاسییت، وە خۆشەویستیو لەگەڵ دا ڕۆیشتنت، وە هاوکاریی کردنو پشتگیریی کردنت، تەنیا بۆ ئەهلی ئیمان بێ، تەنیا بۆ مسوڵمانان بێ، بەڵام لەگەڵ حیزبو ڕژێمێکی طاغووتییو عەلمانییدا هەڵسیو دانیشیو ڕازونیازت لەگەڵی بێو، ئەو داتبنێو ئەو تەوجیهت بکاو، بە قسەی ئەو بەڕێوەبچی، ئەوە لەڕاستییدا ئەو قسەو بانگەشەیەی کە دەیکەی کە گوایە شوێن قورئانو سوننەت کەوتووی!! ئەوە پارەی قەڵبەو سەر بە خاوەنیەتی.

لێرەدا ئاماژەیەکی کورت بەوەش دەکەم کە هەندێك لەو جۆرە کەسانەی کە یان ئەوەتا لە ئیسلام تێنەگەیشتوون، یان فریودراونو کڵاوی عەلمانییەکانیان چۆتە سەر، دژایەتیی لایەنە ئیسلامییەکان دەکەنو بۆ دژایەتییکردنی تەوژمی ئیسلامیی، دێنن کۆمەڵ بوونی مسوڵمانانو کۆبونەوەیان لە ڕێکخراو، یان حیزبێکدا، دەخەنە ژێر نیشانەی پرسیارەوە! بۆچی؟ دەڵێن: ئەوە بیدعەتەو لە سەردەمی پێغەمبەری خوادا ﷺ نەبووە!! کە لەڕاستیدا ئەوە قسەیەکی زۆر

بێجێیە، چونکە ئەگەر تەماشای ژیاننامەی پێغەمبەر ﷺ بکەین، لە یەکەم ڕۆژەوە کۆبوونەوەی کردوە بە هاوەڵانی بەڕێزی، وە هۆنیونیەوەو پەروەردەی کردوونو لێکی بەستوون، وە کەسانێکی پەرشو بڵاونەبوون، بەڵکو لە ماڵی ئەرقەمی کوڕی ئەرقەمدا کۆبوونەوەی پێکردوون، بە شێوەی نهێنیی، سێ ساڵ بە شێوەی نهێنیی کاری کردوە، دوایی بانگەوازی ئاشکرا کردوە، بەڵام کۆبوونەوەی نهێنیی هەر هەبووە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بانگەواز بە ئاشکرا بووە، بەڵام کۆبوونەوەی تایبەتو نهێنیی هەر هەبووە، پاشان پێغەمبەر ﷺ دووجار پەیمانی لە هاوەڵانی وەرگرتوە، لە لای (عەقەبە) وە لەسەر ئەساسی ئەو پەیمانە دەوڵەتی ئیسلامیی دامەزراندوە! ئنجا سەیر ئەوەیە کە ئەوانەی ئەو جۆرە قسانە دەکەن، بۆ نیشانەی پرسیار خستنە سەر لایەنە ئیسلامییەکان، لە هەمان کاتیشدا دەبینی هیچ کێشەیان نیە لەگەڵ حیزبێکی عەلمانیی، یان حیزبێکی قەومیی، یان حیزبێك دا کە غەیری ئیسلام تەبەننی دەکات، تەنیا شەڕ بە لایەنە ئیسلامییەکان دەفرۆشن!! کەواتە: بە ئاشکرا دیارە کە ئەوانە یان هەر سادەو ناحاڵیینو لە دینو ژین بێئاگان، یان دەستیان لە پشت دەدرێو، کڵاویان لەسەر نراوەو، بە سەهوو برداونو مەرامێکی سیاسییان پێ جێبەجێ کراوە.

دیارە من لە چەند کتێبو نامیلکەیەکمدا باسی ئەوەم کردوە، کە پێویستە "نەك هەر دروستە" کە مسوڵمانان کۆمەڵ بنو کاری خۆیان بە ڕێکیی و بە شێوەی ڕێکخراوەیی بکەن، بۆ نموونە: کتێبی (ئیسلامو مسوڵمانەتییو کاری ئیسلامیی لە ژێر ڕۆشنایی قورئانو سوننەتدا) هەروەها نامیلکەی: (کارو پرۆژەی ئیسلامییو ڕەواندنەوەی چەند تەمومژێك)، هەروەها کتێبی: (ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکانو هێڵە گشتی یەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی) بە تەفصیل لەو کتێبو نامیلکانەدا، باسی ئەو بابەتەم کردووە، بەرپەرچی قسەو قاڵی ئەو جۆرە کەسانەم داوەتەوە، کە بزانن یان نەزانن ئاو لە ئاشی ناحەزانی تەوژمی ئیسلامیی دەکەنو، لە پشتەوە خەنجەری غەدر لە مشوورخۆرانی ئیسلام دەدەن!

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی پازدەیەم



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە دە (١٠) ئایەتان پێکدێ (٥٧ - ٦٦) کە سەرەتا خوای پەروەردگار بۆ جاری نۆیەمین لەم سوورەتەدا بانگی ئیمانداران دەکات بە نازناوی ئیمان ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾، وە ڕێگرییان لێدەکات لە دۆستایەتیی کردن لەگەڵ کافرانێکدا کە گاڵتە بە ئایینەکەیان دەکەن، لە خاوەن کتێبانو بتپەرستانو هاوبەش بۆ خوا دانەران، ئەوانەی کاتێك مسوڵمانان بانگ دەدەن بۆ نوێژ، یاریی‌و گاڵتە بە نوێژەکەیان، یاخود بە بانگەکەیان، یان بە هەردووکیان دەکەن، پاشان خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویّ: کە بە خاوەن کتێبەکان بڵێ: ئایا چیمان لێ بە ڕەخنە دەگرن، ئەوە نەبیّ کە ئیمانمان بە خواو کتێبەکانی خوا هێناوە!

پاشان خوا هەندێك لە هەڵوێستە خراپەکانیانو، ئەو بەڵایانەی کە بە هۆیانەوە بەسەریان هاتوون، بە چاویاندا دەداتەوە، کە بە هۆیانەوە نەفرینی لێکردوونو لێیان تووڕەبووەو، هەندێکیانی گێڕاوە بە مەیموونو بەراز، بەتایبەتی جوولەکە.

ئنجا باسی ئەو هەڵوێستەی مونافیقەکان دەکات، کە هەر کات دێنە لای پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان، خۆیان بە بڕوادار پێشان دەدەن، هەرچەندە لە هەردوو حاڵەتی هاتنو چوونەدەریاندا، هەر بێبڕوان، وەك دەفەرمویّ: ﴿وَقَد دَّخَلُوا۟ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا۟ بِهِۦ﴾، پاشان باسی خێرایی کردنیان لە گوناهو دەستدرێژیی‌و حەرامخۆرییاندا دەکاتو، سەرزەنشتی بەرپرسو زاناکانیشیان دەکات، کە بۆچی لە گوناح کردنو حەرام خواردن، نایانپەرێگێننەوەو ئامۆژگارییان ناکەن؟!.

پاشان باسی قسەیەکی جوولەکەکان دەکات کە بێ‌ڕێزییەکی گەورەیە بەرانبەر بە خوا، ئەویش ئەوەیە کە گوتوویانە: خوا دەستی نووقاندوەو نابەخشێ، وە خوا بەرپەرچیان دەداتەوەو چەند سیفەتو ڕەفتارێکی دیکەی دزێویان دەخاتەڕوو.

وە لە کۆتاییدا خوای بە بەزەیی خاوەن کتێبەکان بۆ ئیمانو تەقوا هان دەدات، کە ئەگەر ئەهلی ئیمانو تەقوابن، کە لە ئاکامدا خراپەکانیان لێ دەسڕێتەوەو دەیانخاتە بەهەشتەوە، هەروەها موژدەیان پێدەدات، کە ئەگەر تەوراتو ئینجیلو دابەزێنراوی پەروەردگاریان جێبەجێ بکەن، خوا بەرەکەتو پێزی ئاسمانو زەوییان بەسەردا دەڕێژێ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ
مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ (٥٧) وَإِذَا نَادَيۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا
هُزُوٗا وَلَعِبٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ (٥٨) قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ هَلۡ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنۡ
ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلُ وَأَنَّ أَكۡثَرَكُمۡ فَٰسِقُونَ (٥٩) قُلۡ هَلۡ أُنَبِّئُكُم
بِشَرّٖ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِۚ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيۡهِ وَجَعَلَ مِنۡهُمُ ٱلۡقِرَدَةَ
وَٱلۡخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَۚ أُوْلَٰٓئِكَ شَرّٞ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ (٦٠) وَإِذَا جَآءُوكُمۡ
قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلۡكُفۡرِ وَهُمۡ قَدۡ خَرَجُواْ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكۡتُمُونَ (٦١)
وَتَرَىٰ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ
يَعۡمَلُونَ (٦٢) لَوۡلَا يَنۡهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ عَن قَوۡلِهِمُ ٱلۡإِثۡمَ وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ
لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ (٦٣) وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا
قَالُواْۘ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن
رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۚ وَأَلۡقَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا
لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا ٱللَّهُۚ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗاۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ (٦٤) وَلَوۡ أَنَّ
أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ ءَامَنُواْ وَٱتَّقَوۡاْ لَكَفَّرۡنَا عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ وَلَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ
(٦٥) وَلَوۡ أَنَّهُمۡ أَقَامُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم مِّن رَّبِّهِمۡ لَأَكَلُواْ مِن
فَوۡقِهِمۡ وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۚ مِّنۡهُمۡ أُمَّةٞ مُّقۡتَصِدَةٞۖ وَكَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ سَآءَ مَا يَعۡمَلُونَ (٦٦)﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی ئەوانـــەی بڕواتـان هێنـاوە! ئەوانـەی گاڵتـەو یـاریی بـە ئایینەکـەتان دەکـەن، لەوانەی پێش ئێوە کتێبیـان پێدراوەو لـە کافرەکـان، بـە دۆســت مـەگرن، وە پـارێز لـە خـوا بکـەن، ئەگەر بڕوادارن ﴿٥٧﴾ وە (ئەوانــەی) هـەر کات (خەڵکتان) بـۆ نوێـژ بـانگ کـرد گـاڵتەو یاریی پێدەکـەن، ئەویش لە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە کۆمـەڵێکن نافامن ﴿٥٨﴾ بڵـێ: ئەی خـاوەن کتێبینە! چیمان لـێ بە ڕەخنـە دەگرن، ئـەوە نـەبێ کـە بڕوامـان بـە خـواو بەو (وحـي)ە هەیـە کـە بۆمـان دابـەزێنراوەو، بـەوەی لەپێشدا دابـەزێنراوە، وە بـەو هۆیەشـــەوە نەبــێ کـە زۆربەتـان لاڕێـن! ﴿٥٩﴾ بڵـێ: ئایا هـەواڵتان پێبـدەم بـە کەســێك کـە ســزای لـەوە خـراپتری لـە لای خـوا هەیـە؟ کەسـێك کـە خـوا نـەفرینی لێکـردوەو، لێـی تـووڕە بـووەو، هەندێکـیانی گێـڕاوە بـە مـەیموونو بـەرازو، طاغووتیـان پەرسـتوە، ئـا ئەوانـە حاڵیــان خـراپترەو لـە ڕێـی ڕاسـت لادەرتـرو گـومڕاترن ﴿٦٠﴾ وە کاتێك دێنە لاتـان دەڵـێن: بڕوامان هێنـاوە، هەرچـەندە بـە کوفرەوە وەژووركـەوتوونو بـە کوفریشـــەوە چوونـــەدەر، وە خـوا زانـاترە بـەوەی دەیشـارنەوە ﴿٦١﴾ وە زۆرێکیـان دەبینـی لـە گونـاهو دەسـتدرێژیی و حـەرام خۆرییـدا خێرایـی دەکـەن، بێگومـان ئـەوە خراپترین ڕەفتارە کە دەیکەن ﴿٦٢﴾ دەبووایە مشـوورخۆرانو زانایان، لـە قسـەی گونـاهو حەرام خـواردن قەدەغەیـان کردبـانە (ئـەو بـێ هەڵوێسـتییەیان) بێگومـان خـراپترین ڕەفتـارە کـە بـە وەسـتایی دەیکـەن ﴿٦٣﴾ وە جوولەکـەکان گوتیـان: خـوا دەست بەسـتراوو چەنگ قووچـاوە، دەستیان ببەسترێو نەفرینیان لـێ بـێ، بـە هـۆی ئـەوەوە کـە گوتیـان، بەڵکو هەردووك دەستی کراوەن، چۆنی بوێ دەبەخشـێ، وە زۆریـان ئـەوەی کـە لەلایـەن پەروەردگـارتەوە بـۆت نێرراوەتــە خـوار، یاخیبــوونو کوفریــان تێـدا زیـاد دەکـات، وە هەتـــا ڕۆژی قیامەتـــێ دوژمنایــەتییو ڕقو قینمـان خســـتۆتە نێوانیـان، هـەر کـات ئاگرێکیان بۆ جەنگو ئاشووب هەڵکــرد، خـوا دەیکوژێنێتـەوە، وە هـەوڵی خراپەکـاریی دەدەن لــە زەویــداو، خــواش خراپــەکارانی خۆشــناوێن ﴿٦٤﴾ وە ئەگـەر هاتبـاو خـاوەن

کتێبەکان ئیمانیان هێنابایەو پارێزیان کردبایە، بە مسۆگەریی خراپەکانیانمان لێیان دەسڕیەوەو، دەمانخستنە باغە پڕ نازو نیعمەتەکانەوە ﴿٦٥﴾ وە ئەگەر ئەوان تەوراتو ئینجیلو ئەوەی کە لەلایەن پەروەردگاریانەوە دابەزێنراوە، جێبەجێیان کردبایەو، پێیانەوە پابەندبوونایە، بە دڵنیاییەوە لە ڕۆزییو بەرەکەتی سەرووویانو ژێر پێیان دەیانخوارد، کۆمەڵێکیان ڕێکو ڕاستنو، زۆربەشیان خراپترین ڕەفتار دەکەن ﴿٦٦﴾)).

## شـیکردنـەوەی هـەندێـك لە وشـــەكان

(هُزُوًا ): (الهُـزْءُ: مَـزْحٌ فـي خِفْيَـةٍ، هَزِئْـتُ بِـهِ واسـتَهزأتُ، والإسـتهزَاءُ إرتِيَـادُ الهُـزُؤ)، (هُـزْء) هـەروەها بـە (هُـزو)یـش دێ بـەبێ هـەمزە، بریتیـە لـە گاڵتـە پێكردنێكـی پـەنهان، وە دەگـوترێ: (هَزِئْـتُ بِـهِ واسـتهزأتُ) هـەردووكی واتـە: گاڵـتـەم پێكـرد، (الإسـتهزَاءُ)یش ئەوەیـە كە بگـەڕێـی بۆ شـتێك گـاڵتـەی پـێ بكـەی.

(وَلَعِبًا ): (لَـعِب)، واتـە: یـاریی، وازیـی، گەمــە، (أَصْلُ الكَلِمَـةِ اللُّعَـابِ، وَهُوَ البُـزَاقُ السَّـائِلُ)، وشــەی (لَعِـب) لـە ڕیشــەدا لـە (لُعَـاب)ەوە هـاتوە، واتـە: لیكـی شـلی نێـوزاری ئینسـان (وَلَعِبَ إِذَا كَانَ فِعلُهُ غَير قَاصِدٍ بِهِ) دەگوترێ: (لَعِبَ) ئەگەر ڕەفتارێكی بە گـاڵتە بكـاتو بە جیـددیی نەیكـات.

(نَادَيْتُمْ ): واتـە: بانگـتان كـرد، (النِّـدَاءُ: رَفْعُ الصَّـوْتِ وَظُهُوره)، (نِدَاء): بریتیـە لـە دەنگ بەرزكـردنەوە، وە دەنگـێكی ئاشـكرا (نَـادَى إِلَى الصَّلاَة دعا إِلَيْهَا) كـاتێـك بۆ نوێـژ بانـگ دەكـرێ، واتـە: (دَعَا إِلَيْهَا) كە (أذان)یـشی پـێ دەڵـێن.

(تَنقِمُونَ مِنَّآ ): واتە: لێمـان بە ڕەخنـە دەگـرن، لێمـان بـە عـەیب دەگـرن، لەسـەر ئـەوە سـەركۆنەمان دەكــەن، دەگــوترێ: (نَقِمْـتُ الشَّـئَ وَنَقَمْتُـهُ)، (نَقِمْـتُ، وَنَقَمْـتُ)، هەردووكی بە مانـای ئـەوە دێ، ڕەخنــەم لـەو شــتەی گـرت، بـە عەیبــم زانـی، بـە كـەموكــوڕییم زانـــی (إِذَا أَنكَـرتَهُ إِمَّـا بِاللِّسَـانِ وَإِمَّـا بِالعقُوبَـة) كـە دەگـوترێ: (نَقِمْتُ الشَّـيءَ)، ئەگەر نكـوولّیی لێبكـەی بـە زمــان، یـان بـە ئــازاردان، (نِقْمَـة) بە مانای سـزادان دێ، (نعمـة) واتە: چاكـە.

(مَثُوبَةً ): بەمانــای ســزا دێو بـە مانـای پاداشــتیش دێ، (أَصْلُ الثَّوبِ: رُجُوعُ الشـيءِ إِلـى حَالَتِـهِ الأُولَـى الَّتِـي كَـانَ عَلَيْهَـا، وَالثَّـوَابُ يُقَـالُ فـي الخَيْـرِ والشّـرِ، لَكِنَ الأَكْثَرَ المُتَعَارف فِي الخيـر)، (ثَوَاب) بۆ چاكـەو خراپـە بەكـاردێ، بـەڵام زیاتر

بۆ چاکە بەکاردێ، (ثَوَاب)، واتە: پاداشت، ئێمە لە کوردەواریی دا ئەگەر چاکە بێ، دەڵێین: پاداشتی دا، ئەگەر خراپە بێ دەڵێین: سزای دا، جا وشەی (ثَوَاب) لە عەرەبییدا بۆ پاداشتو سزا بەکاردێ، بەڵام زیاتر بۆ پاداشت بەکاردێ، کەسێك چاکەیەکی کردوە تۆ خەڵاتی دەکەی ئەوە پاداشتت داوەتەوە.

(ٱلطَّٰغُوتَ ): (عِبَارَةٌ عَنْ كُلِّ مُتَعَدّ، وَكُلِّ مَعْبُودٍ مِنْ دُونِ اللهِ، وَيُسْتَعْمَلُ فِي الوَاحِدِ والجَمْعِ، والطَّاغُوتُ: السَّاحِرُ، والكَاهِنُ، والمَارِدُ مِنَ الجِنِّ، والصارِفُ عَنْ طَرِيقِ الخَيْرِ)، (طَاغُوت): لە ئەسڵدا واتە: زۆر یاخیی، یان زۆر لە سنوور دەرچوو، ئەوەش هەر کەسێکە کە بەندایەتیی بۆ بکرێو بپەرسترێ جگە لە خوا، چونکە خوا تاکە پەرستراوی شایستەو بە هەقە، غەیری خوا هەر کەسێك بپەرسترێ، لەڕاستیدا طوغیانی کردووە لە سنوور دەرچووە، وە وشەی (طاغوت) بۆ تاك، وە بۆ (کۆ)ش بەکاردێ، وە هەروەها (طاغوت) بریتییە لە جادووگەرو فاڵچییو شەیتانی یاخییو، هەر کەسێك خەڵك لە ڕێی خێرو چاکە لابدات.

(مَغۡلُولَةٌ ): (مُقَيَّدَةٌ بِالغُلِّ والغِلّ: الحِقْد)، (غُلّ)، ئەوەیە کە لە دەست دەکرێو دەستی پێ دەبەسترێ، (غِلّ)، ئەو کینەیە کە لە دڵدا دەپەچنرێ، لێرەدا کە دەفەرموێ: جوولەکە گوتیان: ﴿يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌ﴾، مەبەستیان ئەوە بوو کە ڕژدو چرووکەو نابەخشێ، حاشا بۆ خوای بەخشەر.

(طُغۡيَٰنٗا ): (الطُّغيَانُ: تَجَاوُزُ الحَدّ فِي العِصْيَان)، (طُغْيَان)، بریتییە لە سنوور بەزاندن لە سەرپێچیی دا.

(مُّقۡتَصِدَةٌ ): واتە: نێوەڕاست، کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱقۡصِدۡ فِي مَشۡيِكَ...﴾ ﴿١٩﴾ لقمان، واتە: لە ڕۆیشتنەکەتدا خەتی نێوە ڕاست بگرە، واتە: نە زۆر بەپەلەبە، نە زۆر هێواش، نێوەنجیی بە، (مُقْتَصِدَةٌ) لێرەدا مانا زمانەوانییەکەی واتە: میانجیی، نە بەمەلادا، نە بەولادا، دەڵێ (القَصْدُ: إستِقَامَةُ الطرِيق،

والإقْتِصَادُ: التَوَسُّطُ بَيْنَ الإفْرَاطِ وَالتَفْرِيط)، (قَصْد)، بریتیە لەوە کە ڕێی ڕاست بگری، یاخود ڕێیەکی ڕاست، (إقتِصَاد)یش لە خەتی نێوە ڕاست دایە، لە نێوان بەزایەدانو تێپەڕاندن دایە، جا دەڵێ لەبەرئەوەی کە زۆربەی شتەکان ئەمسەرو ئەو سەریان خراپن، بۆ وێنە: ئازایەتیی سەرێکی ترسنۆکیی (جُبْن)ە، سەرێکی تەهەووره، ئازایەتیی نێوە ڕاستە، ئینسان نە تێپەڕێنێ لە ئازایەتییدا، نە کورتیش بێنێ کە ترسنۆکییە، ئازایەتیی ئەوەیە لە کاتێکدا پێویست بکات ئیقدام بکەی، تەهەوور ئەوەیە بەبێ ئەوەی پێویست بکات ئیقدام بکەی، (جُبن)یش ئەوەیە ئەگەر پێویستیش بکات بچیە پێش، بێیەدواو نەوێری، یان سەخاوەت ئەوەیە، لە کاتی پێویستدا ببەخشی، چرووکیی ئەوەیە لە کاتی پێویستدا نەبەخشی، ئیسراف ئەوەیە زیاد لە ئەندازەی پێویست ببەخشی.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

١) ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَٱلْكُفَّارَ أَوْلِيَآءَ ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ﴾، ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ تَعَالى عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ رِفَاعَةُ بْنُ زَيْدِ بْن التَّابُوت، وَسُوَيْد بْن الحَارِث قَدْ أَظْهَرا الإِسْلامَ، ثُمَّ نَافَقَا، وَكَانَ رِجَالٌ مِنَ المُسْلِمِين يُوادُّونَهُمَا، فَأَنْزَلَ الله: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ...﴾﴾[1]، واتە: عبدوڵـلای کوڕی عـەبباس خـوا لـێیان ڕازی بێ، دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ڕیفاعەی کوڕی زەیدی کوڕی تابووت، وە سوەیدی کوڕی حاریث (کە هەردووکیان واپێدەچێ جوولەکە بووبن، یان بتپەرست بووبن)، مسوڵمانەتییان پێشاندا، بەڵام بە نیفاق وایانگوت، چەند پیاوێك لە مسوڵمانانیش دۆستایەتییان دەکردن، خۆشیاندەویستن و پەیوەندییان لەگەڵ هەبوون (دیارە دەبێ نەیانزانیبێ ئاوان، یاخود زانیویانە، بەڵام دڵیان نەخۆشی تێدابووە)، لەوبارەوە خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوار، (کە دیارە ئەو دوو کەسەش لەوانە بوون کە گاڵتەیان بە بانگ و بە نوێژ و بە مسوڵمانەتیی کردوە).

٢) ﴿وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾، ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ تَعَالى عَنْهُمَا، قَالَ: كَانَ مُنَادي رَسُول الله ﷺ إِذَا نَادَى بالصَّلاةِ فَقَامَ المُسْلِمُونَ إِلَيْهَا قَالَتِ اليَهُود: قَدْ قَامُوا لاقَامُوا، فَإِذَا رَأَوهُم رُكَّعاً وسُجَّداً استَهزأوا بِهِم وَضَحِكُوا مِنْهُم﴾[2]، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێك بانگ بێژی پێغەمبەری خوا ﷺ بانگ دەدا بۆ نوێژ، مسوڵمانان بۆ نوێژ هەڵدەستان، جوولەکەکان دەیانگوت: ئەوە هەڵسان؟!

١) رَوَاهُ أبُو الشَيخ، محاسن التأويل: ج٤، ص ٢٦٣.

٢) روح المعاني: ج٣، ص ٤٧٨.

یاخـوا هەڵنەسـتن، وە کاتێك لـە حاڵەتی ڕکووعو سـەجدەدا دەیانبینین، گاڵتەیان پێدەکردنو پێیان پێدەکەنین.

٣) ﴿ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ ۚ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ ۚ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ ﴾،

﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ تَعَالى عَنْهُمَا، قَالَ: وَأَتَى رَسُولَ اللهِ ﷺ نَفَرٌ مِنْهُمْ أَبُو يَاسِرِ بْنُ أَخْطَبَ، وَنَافِعُ بْنُ أَبِي نَافِعٍ، وَغَازِي بْنُ عَمْرٍو وَخَالِدٌ وَزَيْدٌ وَإِزَارُ بْنُ أَبِي إِزَارٍ فَسَأَلُوهُ عَمَّنْ يُؤْمِنُ بِهِ مِنَ الرُّسُلِ؟ فَقَالَ أُؤْمِنُ بِاللهِ تَعَالى وَمَا أُنْزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنْزِلَ إِلَى إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ وَيَعْقُوبَ وَالأَسْبَاطِ وَمَا أُوتِيَ مُوسَى وَعِيسَى وَمَا أُوتِيَ النَّبِيُّونَ مِنْ رَبِّهِمْ لا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِنْهُمْ، وَنَحْنُ لَهُ مُسْلِمُونَ، فَلَمَّا ذَكَرَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ عَلَيْهِ السَّلامَ، جَحَدُوا نُبُوَّتَهُ، وَقَالُوا: لا نُؤْمِنُ بِعِيسَى وَلا بِمَنْ آمَنَ بِهِ! ثُمَّ قَالُوا: (كَمَا فِي رِوَايَةِ الطَبرانِي) لا نَعْلَمُ دِيناً شَراً مِنْ دِينِكُم، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَالَى هَذِهِ الآيَةَ ﴿ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ ... ﴾﴾[1]،

واتـە: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خـوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: کۆمەڵێك لـە جوولەکەکان کە ئەبویاسری کوڕی نـافیعو نافیعی کوڕی ئـەبی نـافیعو غـازی کوڕی عـەمرو خالیدی کوڕی زەیدو ئیـزاری کوڕی ئـەبی ئیزاریان لـەنێودابوون، هـاتن پرسیاریان لـە پێغەمبەری خـوا ﷺ کـرد، کـە ئایـا تـۆ ئیمانـت بـە کێ لـە پێغـەمبەران هەیـە؟ ئەویش فەرمووی: ئیمانم بە خـوای بەرز هەیـە، وە بـە وەی کـە ناردوویەتـە خـوار بـۆ ئیبـراهیم، وە بـۆ ئیسـماعیل، وە بـۆ ئیسـحاق، وە بـۆ یەعقـووبو بۆ ئەسـباط، وە بەوەی کە دراوە بە مووسـاو عیسـا، وە بەوەی کـە دراوە بـە پێغـەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لـە پەروەردگـاریانەوە، جیـاوازیی ناخەینە نێوان هیچیانەوە، ئێمە بۆ خوا ملکەچین.

ئنجـا کـاتێ عیسـای کـوڕی مەریـەمی (عليه السلام) باسـکرد ئـەوان نکووڵییـان لـە پێغەمبەرایـەتیی وی کـرد، گوتیـان: ئیمـان بـە عیسـا نـاهێنـین، وە ئیمـانیش بـە

١) أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ في التفسير ج٦، ص ٢٩٢، وَابْنُ إِسْحَاق.

کەسێك ناهێنین کە ئیمان بە عیسا بێنێ (واتە: ئیمان بە تۆش ناهێنین) دوایی وەك لە ڕیوایەتی طەبەڕانییدا هاتوە گوتیان: هیچ بەرنامەو دینێکمان پێ شك نایەت لە دینی ئێوە خراپتر، بەوبۆنەوە خوا ئەو ئایەتەی ناردە خوار: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ... ﴾، واتە: پێتان بڵێم بەرنامەی کێ و سزای کێ خراپترە لەلایەن خواوە...؟!

## مـانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

خـوا ﷻ بـۆ جاری نۆیـەم لـەم سـوورەتە موبارەکـەدا مسـوڵمانان دەدوێنـێ بـە نازناوی شیرینی ئیمان: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، لە ئایەتەکانی پێشوودا جارێك بانگی کردن و ئاگاداریی کردنەوە فـەرمووی: جوولەکەو نەصـرانییەکان مەکەن بـە دۆسـت، وە جـارێکی دیکـە بـانگی کـردن فـەرمووی: ئەگـەر لـە ئاینـی خـوا هەڵـگەڕێنەوەو پاشگەزببنـەوە، ئـەوە خـوا بێباکـەو بێمنەتـە، وە کۆمـەڵێکی دیکـە دێنـێ کـە ئـەوە سیفەتەکانیانە، ئەمجارەش بانگیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾، ئەی ئەوانەی ئیمانتـان هێنـاوە! ئەوانـەی ئایینەکـەتان بـە گاڵتە دەگرنو گەمەو یاریی پێدەکـەن، لەوانەی پێش ئێوە کتێبیـان پێـدراوەو لەوانـەی غەیری وانیش، بە دۆسـت مەگرن، واتە: مـادام گاڵـتەو گەمـەو یـاریی بـە ئایینەکەتان دەکەن، بە دۆسـتیان مەگرنو خۆشـتان نەوێنو لێیان نـزیك مـەبن، بـەڵام نەیفـەرمووە مودارایـان لەگـەڵ مەکـەن، وە نەیفـەرمووە: هـیچ هەڵسـوکەوتێکیان لەگـەڵ مەکـەن، دەفەرموێ: بە دۆسـتیان مەگرن، کە وەك پێشـتر باسـمان کـرد، واتـە: خۆشتان نـەوێن لـە دڵـەوە، وە هاوکـاریان مـەبنو دەستبارگریان مـەبنو بـە ڕێـی وانـدا مـەڕۆن... تـا کۆتـایی ماناکـانی وشـەی (وَلَايَة) و (وَلـي)، ئنجا هەڕەشـەیان لێـدەکاتو دەفـەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ﴾، پارێـز لـە خـوا بکـەنو ئەگـەر ئێـوە ئیمانـدارن دۆسـتایەتیی ئەوانـە مەکـەن کـە گاڵـتە بـە دینەکـەتان دەکـەن، ئنجا هـۆی هاتنـە خـوارەوەکەیمان باسکرد، بەڵام زانایـان بنچـینەیان دانـاوە (إِنَّ خصُوصَ السَّبَبِ لايَمْنَعُ شمـُولَ الـمَعْنَى) واتـە: تایبەتمەنـدبوونی هۆکـاری هاتنـە خـوار، ڕێگـا نـاگرێ لـە گشـتگیـریی واتایەکەی، نابێ پێمـان وابـێ ئـەوە بـۆ ئـەو کـاتی بـووە، بەڵـکو ئێسـتاش مسـوڵمانان ئەگـەر دۆسـتایەتیی لەگەڵ کەسـانێکدا بکـەن، کـە گاڵـتە بـە دینیـان

دەکەن، جا چ لە جوولەکەو نەصرانییەکان، چ هەر جۆرە کافرێکی دیکە بن، ئەوە لەڕاستییدا پێچەوانەی تەقوایان پێشانداوە، پێچەوانەی تەقواش، جاری وایە گوناهی گەورەیە، جاری وایە شیرکە.

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلَوٰةِ اتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا﴾، وە کاتێك کە بانگ دەکەن بۆ نوێژ، ئەوان بە گاڵتەو بە یاریی دەگرن، لێرەدا ڕاناوی (ها)یان بۆ نوێژ دەچێتەوە، یان بۆ بانگ دەچێتەوە، ئەگەر بۆ بانگ بچێتەوە، ئەوکاتە دەڵێین: دیارە وشەکە واتە: (اتَّخَذوا المُنَادَاةَ لِلصَّلاة هزواً) دەشگونجێ بۆ هەردووکیان بچێتەوە، واتە: کۆی نوێژو بانگو دروشمەکانی ئێوە، ئەگەر بۆیان بگونجێ گەمەو یاری پێدەکەن، ﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ﴾، ئەوەش لەبەرئەوەی ئەوان کۆمەڵێکن نافامنو نازانن، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ هەر کەسێك گەمە بە موعتەقەداتو پیرۆزییەکانی خەڵکی دیکە بکات نیشانەی کەودەنییەتی، بۆیە دەبێ مسوڵمانیش ئەو ڕەفتارە لە خۆی نەوەشێنێتەوە، هەر بۆیەش خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الأنعام)دا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ ﴿١٠٨﴾﴾، واتە: ئەوانەی لە جیاتی خوا دەیانپەرستن، جنێویان پێ مەڵێن، دیارە گەمەو یاری پێکردنیش هەر لە حوکمی جنێو پێدان دایە.

ئنجا خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ئاوا ئەهلی کتێب بدوێنە: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّا إِلَّا أَنْ آمَنَّا بِاللَّهِ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ﴾، بڵێ: ئەی خاوەن کتێبەکان! چیمان لێ بە ڕەخنە دەگرن، چیمان لێ بە عەیب دەگرن؟ ئەوە نەبێ کە ئیمانمان بە خوا هێناوە، وە ئیمانمان بەوە هێناوە، کە بۆ لامان دابەزێنراوە، وە ئیمانیشمان بە هەر کتێبو وەحییەکی خوا هێناوە، کە لە پێش ئێمەدا دابەزیوە؟ ﴿وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَاسِقُونَ﴾، واتە: هیچ پاساوێك نیە بۆ گاڵتە بە ئێمە کردن و ڕەخنە لە ئێمە گرتن، جگە لەوەی کە

بڕوامان بە خواو بە وەحی هەیە، وە جگە لەوەی کە ئێوە لاڕێن، واتە: خەڵکی لاڕێ کە لە بەرنامەکەی خۆشیانو لە عەقڵو لە فیطرەتیش لایان داوە، ئەوانەن کە بەبێ ئەوەی کە پاساوی ڕەخنە گرتن هەبێ، ڕەخنە دەگرن، کەسانی لاڕێ لە بیانوو دەگەڕێنو هەر شەڕ دەفرۆشن، ئەگەرنا لەڕاستییدا هیچ بەڵگەو پاساوێکیان نیە کە ڕەخنەتان لێدەگرنو گاڵتەتان پێ دەکەن، لەسەر ئەو شتانە، ئنجا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ اللَّهِ ﴾، دیارە ئەوان گوتوویانە: ئەو دینەی ئێوە خراپترین دینە، هیچ دینێکمان لەوە خراپتر نەبینیوە، کەواتە: هیچ کەس لە مسوڵمانان خراپتر نیە، یان ئەگەر هوی هاتنە خوارەوەکەش ڕەچاو نەکەین، دیارە جوولەکەو نەصرانییەکان، ئیسلامو ئەهلی ئیسلامیان پێ خراپە، ئنجا خوا دەفەرموێ: بفەرموو: ئایا هەواڵتان پێ بدەم کێ سزای خراپترە، ئەوە ئێمەی مسوڵمان نین، بەڵکو ئەوە ئێوەن: ﴿ مَن لَّعَنَهُ اللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ الطَّاغُوتَ ۚ أُولَٰئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَاءِ السَّبِيلِ ﴾، ئەوانە سزایان لە لای خوا خراپترە، کە خوا نەفرینی لێکردوونو، لە ڕەحمەتی خۆی دووری خستوونەوەو، لێیان تووڕە بووە، وە هەندێکی لێگێڕاون بە مەیموون، وە هەندێکی دیکەی لێگێڕاون بە بەراز، وە ئەوانەی کە طاغووتیان پەرستوە، ئەوانە جێگاو ڕێگایان خراپترە، وە لە ڕاستەڕێش زیاتر گومڕاو سەرلێشێواونو دوورکەوتوونەتەوە، واتە: ئێوەن ئەو حاڵەتانەتان بەسەر هاتوە، کە دیارە ئێمە لەکاتی تەفسیرکردنی سوورەتی (البقرة)دا باسی ئەوەمان کرد کە چۆن هەندێکیان بوون بە مەیموونو بەراز، وە چۆن خوا لێیان تووڕە بووە، وە لە سوورەتی (النساء)دا باسی زۆر لە هەڵوێستی جوولەکەو نەصرانییەکانمان کرد، بەتایبەتی جوولەکەکان.

ئنجا خوا ﷻ باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَاءُوكُمْ قَالُوا آمَنَّا وَقَد دَّخَلُوا بِالْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُوا بِهِ ۚ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُوا يَكْتُمُونَ ﴾، ڕاناوی (جاؤا) لە ﴿ وَإِذَا جَاءُوكُمْ ﴾، ئایا تەنیا بۆ خاوەن کتێبەکان (جوولەکەو

نەصرانییەکان) دەچێتەوە؟ یاخود بۆ سەرجەم کافران؟ دەگونجێ بۆ سەرجەم کافرەکان بچێتەوە، ئەوانەی بە نیفاقو دووڕوویی لەگەڵ مسوڵماناندا مامەڵەیان کردوە، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءُوكُمْ ﴾، وە کاتێك هاتنە لاتان ﴿ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا ﴾، دەڵێن: ئیمانمان هێنا، خۆیان بە ئیماندارو مسوڵمان پێشاندەدەن ﴿ وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلْكُفْرِ وَهُمْ قَدْ خَرَجُواْ بِهِۦ ﴾، دیارە پێغەمبەر ﷺو مسوڵمانان نەیانزانیوە، کێ مسوڵمانەو کێ ڕاست دەکات؟! بەڵام خوا پەنهانزانە، بەڵام دیارە پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی ئایەتەکانی بۆ دابەزیون بە تەئکید ناسیونی، دەفەرموێ: ئا ئەوانە بە کوفرەوە لێتان وەژوورکەوتن، وە هەر بە کوفریشەوە چوونەدەر، واتە: هیچ گۆڕانیان بەسەردا نەهاتوە، کە هاتنە ژوور کافربوون، وە کە چوونەدەریش هەر کافر بوون ﴿ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكْتُمُونَ ﴾، وە خوا زاناترە بەوەی کە دەیشارنەوە، واتە: لە خوای پەنهانزان، پەنهان نابن و ناشێرڕێنەوە.

ئنجا باسی هەڵوێستێکی دیکەیان دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ ﴾، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، کە سیاقەکە هەمووی دەربارەی جوولەکەو نەصرانییەکانەو ئەو ڕایە واپێدەچێ بەهێزتر بێ، چونکە دەفەرموێ: زۆرێکیان دەبینی خێرایی دەکەن لە گوناح کردنو لە دەستدرێژیی کردنو لە حەرام خۆریدا، ئەوە خراپترین کارە کە دەیانکرد، خوای پەروەردگار ئەو دەستدرێژیی و خراپەکارییانە، بە خراپترین کردەوەی جوولەکەو نەصرانییەکان ناوزەد دەکات.

ئنجا سەرزەنشتی زاناکانو بەرپرسو مشوورخۆرەکانیان دەکاتو دەفەرموێ: ﴿ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ ﴾، ( لَوْلَا ) ئەگەر چووە سەر (الفعل المضارع) مانای هاندان (تحضيض) دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بچێتە سەر (الفعل الماضي)، مانای سەرزەنشت (التوبيخ) دەگەیەنێ، لێرەدا هانیان دەداتو دەفەرموێ: دەبووایە مشوورخۆرو زاناکانیان

قەدەغەیان کردبان لە قسەی خراپو لە خواردنی حەڕام، ئەوە خراپترین شتێکە کە دەیکەن بە کارامەییو بە لێزانیی.

ئنجا دێتە سەر باسێکی دیکەی تایبەت بە جوولەکەکانو دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌ﴾، جوولەکەکان گوتیان: خوا دەستی بەستراوە، مەبەستیان ئەوە بووەو، کە خوا دەستی قووچاوەو هیچ نابەخشێ، ﴿غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ﴾، خواش دەفەرموێ: دەستیان ببەسترێو نەفرینیان لێ بێ، بەهۆی ئەو قسەوە کە کردیان، چونکە وانیە، ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ﴾، بەڵکو هەردوو دەستی پەروەردگار کراوەن، کەسێك ئەگەر زۆر بەخشندەبێ دەڵێن: بە هەردوو دەستان دەبەخشێ، مەبەست پێی ئەوەیە، نەك مەبەست ئەوە بێ کە خوا دوو دەستی هەن، کە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا زیاتر تیشکی دەخەینە سەرو باسی دەکەین، بەڵکو مەبەست ئەوەیە خوا زۆر بەخشندەیە، ﴿يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُ﴾، چۆنی بوێ ئاوا دەبەخشێ، ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗا﴾، وە زۆرێکیان ئەوەی بۆ تۆ نێردراوەتە خوار لە پەروەردگارتەوە، هەر سەرکێشیی پێ زیاد دەکەنو، هەر کوفریان تێدا زیاد دەکات، ﴿وَأَلۡقَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ﴾، وە دژایەتییو ڕقو کینەمان خستۆتە نێوانیانەوە، تاکو ڕۆژی قیامەت، ﴿كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا ٱللَّهُ﴾، هەر کە ئاگرێك هەڵدەگیرسێنن، واتە: دەیانەوێ شەڕێك هەڵگیرسێنن (لە کوردەواریی خۆشمان دەڵێن: فڵان کەس ئاگری بن کایە، یان دەڵێن: ئاگری شەڕ هەڵدەگیرسێنێ)، خوا ئاگرەکەیان دەکوژێنێتەوە، ﴿وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗا﴾، وە دەیانەوێ خراپە لەسەر زەوی بڵاوبکەنەوە، ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾، خواش خراپەکارانی خۆشناوێن، جا لە

کۆتاییـــدا دەفـــەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَـٰهُمْ جَنَّـٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾، وە ئەگـــەر خـــاوەن کتێبـــەکان ئیمانیـــان هێناباو پارێزیان کردبایە، خراپەکانمان لـێ دەسڕینەوەو دەشمانخســتنە چەند باغێکی پڕنـازو نیعـمەتەوە، ئـەوە بـە نیســبەت دوارۆژەوە، ئـەدی بـە نیســبەت دنیـاوە؟ دەفـەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا۟ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم﴾، وە ئەگـــەر تـــەورات و ئینجـــیل و ئـــەوەی لـــە پەروەردگاریانەوە بۆیان دابەزێنراوە، ئیشـیان پێکـردباو بەپێـی ئـەوە بەڕێوەچووبان، لـە ســەرووشیانەوە دەیانخــواردو لـە بـن پێشــیان، واتــە: ڕزق و بەرەکــەتی عــەرزو ئاســمانمان بــۆ دادەباراندن، ﴿مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ﴾، کۆمەڵێـکی ڕێکوپێکیان لەنێـودا هـەن، کـە تێیـان نەپەڕانـدوەو بەزایەشــیان نـەداوەو خـەتی نێوەڕاستیان گرتوە، بەڵام زۆربەیـان خراپـترین کـردەوە ئەنجـام دەدەن.

## چـەند مەسـەلـەیـەكی گرنـگ

**مەسـەلەی یەكـەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ وَٱلۡكُفَّارَ أَوۡلِيَآءَۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، ئەم ئایـەتە موبـارەكە چـەند شـتێكی لـێ وەردەگیـرێن:

١/ دروست نیـە گاڵتـەو یارییـكەران بـە دیـن، بـە دۆسـت بگیــرێن، نابـێ مسـولْمانان دۆسـتایەتییو خۆشـەویستـییو نـزیكـیی یان لەگـەڵ هـەبـێ.

٢/ لە قورئـاندا تەنـانەت یەك وشـەش زیـاد نیـە، چونكە خـوای كاربـەجێ قورئـانی بە پێوەرو تەرازوو نـاردوە، ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ وَٱلۡمِيزَانَۗ وَمَا يُدۡرِيكَ لَعَلَّ ٱلسَّاعَةَ قَرِيبٞ ﴿١٧﴾ ﴾الشـــوری، لێـــرەدا دەفـــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمۡ هُزُوٗا وَلَعِبٗا ﴾، (هُـــزوا)، واتـــە: (مهـــزوءً بـــهِ)، واتـــە گاڵتەپێكراو، وە (لَعِـب)، واتە: یـارییو گەمـە، ئایـا جیـاوازیی ئـەو دووانـە چییە؟ ئینسـان جـاری وایـە گاڵـتە بـە شـتێك دەكـات بـە شـێوەیەكی پەنهـان، چونكـە هەندێـك لە زانایان بەتایبـەتی (راغـب) دەڵـێ: (الـهُزْءُ: مَزْحٌ فـي خِفيَـةٍ)، واتـە: گاڵتەكردنێكی پەنهـانیی، بـەڵام یـارییو گەمەپێكردن دیـارە دەبـێ بـە ئاشـكرابێ، كەواتە: چ ئەوانەی كە بە پەنهـانییو بە پەنـامەكـیی بە سووك تەماشـای ئیسـلام دەكەن، وە چ ئـەوانەی بە ئاشـكرا بێڕێـزیی بەرانبـەر دەنـوێنن، دەشـگونجێ بڵێین: گاڵتە پێكردن ئەوەیە كە هەر بە قسـە بێ، بـەڵام یاریی پێكـردنو گەمە پێكردن ئەوەیە كە وەك لاسـاییـكردنـەوە، یان حـاڵەتێكـی كردەیی بەخۆیـەوە بگـرێ.

٣/ پرسـیارێكی دیكـە لێـرەدا دروسـت دەبـێ، خـوا دەفـەرموێ: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـــاوە! ئەوانـەی گاڵتـە بـە دینەكـەتان دەكـەنو گەمـەو یـاریی پێدەكـەن، لەوانـەی پـێش ئێـوە كتێبیـان پێـدراوەو لـە كافرەكـان بـە دۆسـت مـەگرن، ئایـا كافرانێـك كـە گاڵـتەو یاریی بـە دینمـان نەكـەن دروسـتە بـە دۆسـت بگیــرێن؟ لـە وەڵامـدا دەڵێین:

نەخێـر، لـە ئایەتەکـەی پێشـوودا خـوا بەگشـتی فەرموویو ئەگـەر گاڵـتەش بـە دینمان نەکەنو یاریشـی پێنەکـەن، هەر دروست نیە، دۆستایەتییان لەگەڵ بکرێ، بـەڵام وەك گوتراوە: (بعض الشـرِّ أهْوَن)، کەسێك کە هـەر کافربێ لـە ماڵی خۆی، دیـارە دۆسـتایەتیکردنی هەر قەدەغـەیە، بـەڵام کەسێك وێـڕای کـافربوون گاڵتـەش بـە ئیسـلام بکـاو بـە کـەم تەماشـا بکـات، ئـەوە بە تەئکیـد دۆسـتایەتیی لەگـەڵ کردنـی گوناهتـرەو پەیوەنـدیی لەگـەڵ گرتنـی بـە شـێوەیەك کـە شـەرع ڕێگـای نەدابـێ، قەدەغـەترە.

٤/ دەربـارەی ئـەوە کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، ئەمـە ئـەوە دەگـەیەنێ کـە ئیمـان سەرچـاوەی تەقوایـە، واتـە پـارێز لـە خـوا بکـەن، ئەگـەر ئیماندارن، کەواتە: کێ پـارێز لە خوا دەکات؟ ئینسـانی ئیمـاندار، بە ئەندازەی ئەوە کە ئیمانمـان هەیـە، تـەقوامان دەبـێ، پاشان ئەوەشی لێوەردەگیـرێ کـە تـەقوا بەشێکی بریتیـە لەوە کە ئینسـان دۆسـتایەتیی نەبێ لەگەڵ دوژمنـانی ئیسـلامدا، چونکە زۆر کەس بەتایبـەتی ئەهلـی تەصـەووف وا لـە وشـەی تـەقوا حـاڵی بـوون، یان ئەوانەی جەخت لەسەر عیبـادەتی تایبـەتی دەکەن، وا لـە تـەقوا حـاڵی بـوون، کـە هـەر لـە نێـوان خـۆتو خوادایـەو، تەقـوا پەیوەنـدیی بـە لایەنـە کۆمەڵایەتییـەکانو سیاسـییەکانەوە نیە، بە دوای چ بەرنـامەیەك دەکەوی ئـازادی، گـرنگ ئەوەیـە عیبـادەتی شەخصـییت هەبـێ، مانـای وایـە بـە تـەقوای! بـەڵام ئـەو ئایـەتە لێـرەدا باسـی ئەوەمان بۆ دەکـاتو، ئـەوەمان بـۆ دەردەخـات کـە لەڕاستییدا مرۆڤـی پارێزکـار کەسێکە کەینو بەینو دۆسـتایەتی لەگەڵ دوژمنـانی ئیسـلام دا نەبـێ، ئەوە پارێزکارە، هەروەها ئەو ئایەتـە ئەوەشـی لێـوەردەگیـرێ، کە ئینسـان ئەگەر بە تەقوا بوو، لە ناشـەرعییان دوور دەبـێ، ئنجـا ئـەو ناشـەرعییە چ ئـەوە بێ، کە ئەو کەسـانەی گاڵـتە بە ئیسـلام دەکەنو بە سـووکیی تەماشـای دەکـەن، بە دۆسـتیان بگـرێ، چ هەر شـتێکی دیکـە بێ.

**مەسـەلەی دووەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا نَادَيۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوٗا وَلَعِبٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ قَوۡمٞ لَّا يَعۡقِلُونَ ﴾، ئـەم ئایـەتە موبـارەکەش چـەند شـتێکی لێـوەردەگیـرێـن:

١) وشـــەی ﴿ نَادَيْتُمْ إِلَى الصَّلَوٰةِ ﴾، یـانی: (أَذَّنْتُـمْ للصَّـلاَة) بانگتانـدا بـۆ نوێـژێ، (نَـادَيْتُم) یـانی: (دعـوتم)، خەڵـکتان بـانگ کـرد، خـەڵکتان ئاگـادار کـردەوە (وَأَذِّن بِالنَّـاسِ)، واتـە: (أَعْلِمِ النَّاس) خـەڵك ئاگـادار بکــەوە بـەس لـەم ئایــەتەدا باسی بانــگ هــاتوە، لەگــەڵ ســوورەتی (الجمعـة) کــە لــەوێ تایبەتــە بــە جومعــەوە، دەفەرمـــوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِىَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوْمِ ٱلْجُمُعَةِ فَٱسْعَوْاْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلْبَيْعَ ذَٰلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ۝٩ ﴾، کـــە ئـــەوەش نیشـــانەی گـــەورەیی ڕۆژی جومعـــەو گرنگیـــی کۆبوونـــەوەی مســـوڵمانانە لـــە ڕۆژی جومعـەدا، بـەڵام لێـرەدا بەگشـتی باسـی بانـگ دەکـات، بانـگ کردنـی خەڵـك بـۆ نوێــژ.

٢) ﴿ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا هُزُوًا وَلَعِبًا ﴾، ئـەو ڕانـاوی (هـا)یـە کـە بـۆ (مؤنـث) دەچێتـەوە، هـەندێك دەڵـێن: مەبەسـت پێـی نوێـژە، چـونکە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا نَادَيْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ ٱتَّخَذُوهَا ﴾، واتـــە: نـزیکتـــرین شــتێك کــە باســکراوە، نوێـژەو ڕانـاوەکە بۆ وێ دەچێتـەوە، دەشـگونجێ مەبەست بانگ بێ، بەڵام ئەوکاتـە: ﴿ ٱتَّخَذُوهَا ﴾: (أَي اتَّخَـذُوا الـمُنَادَاة)، ئـەو کـــاتە بێژەکـــە دەبـــێ بــە (مُؤَنَّـث) بگـوترێ، بۆئەوەی لەگەڵی بگونجێ.

٣) کە دەفەرمـوێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴾، بۆیـە گاڵـتەو یاریــی بـە دین دەکـەن، لەبەرئــەوەی ئــەوان کۆمەڵێکــی نەفــامن، ئەمــە ئــەوەی لێــوەردەگیرێ کــە ئینسـانی نــەفامو کــەودەنو بێعــەقڵ، گاڵــتە بــە پیرۆزیــیەکانی خەڵــکی دەکــات، بەتایبــەت پیرۆزییــەکی وەك نوێــژ کــە تــەواوترین بەرجەســتەکەری بەندایــەتیی ئینسـانە بـۆ خــوا، یـاخود بـانگ کـە شـیعارو دروشــمێکی یـەکجار بـەرزەو لــەوە بــەرزتر ڕەنگــە لــە وجــوددا نــەبێ، کــە نــاوی خــوا، وەحدانیــەتی خــوا، ئنجـا ڕەوانەکراوێتیی پێغەمبەر، بانـگ کردنی خەڵك بۆ ســەرفرازیی، وشــە لـە وشـەکانی بانگ گەورەتر لە بوون (وجـود)دا نیــە، کەسێك گاڵــتە بـەوە بکـات، مانـای وایــە

زۆر بێعەقڵو نەفامە، وە هەر بەگشتیش دیارە ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئینسان نابێ گاڵتەو سووکایەتیی بە پیرۆزییەکانی هیچ کەسێك بکات، لەو ڕووەوە کە هەموو ئینسانێك ڕێز لێگیراوە، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴿٧٠﴾﴾ الإسراء، وە هەموو مرۆڤێکیش بیروڕایەکانی خۆیو پیرۆزییەکانی خۆی پێ لە خۆی گرنگترن‌و، ئامادەیە لە پێناویاندا سەری خۆی دابنێ، کەواتە: ئەگەر ئینسانەکە ڕێز لێگیراوبێ، دەبێ پیرۆزییەکانی زیاتر ڕێز لێگیراوبن، با تۆ پێشت هەڵە بن، بەڵام بێڕێزییان بەرانبەر ناکەی، بەو مانایە نا کە تۆ پێت ڕاستن، بەڵکو بەو واتایە کە تۆ دەتەوێ هەستی بەرانبەرەکەت بریندار نەکەی، دیارە ڕێزگرتنیش لە بیروڕایەکانی خەڵك، مانای ڕەخنە لێنەگرتن نیە، بە هەردوو دیوەکەیدا، چ مسوڵمانان ڕەخنە لە نامسوڵمانان بگرن، چ نامسوڵمانان ڕەخنە لە مسوڵمانان بگرن، ئەوە جیایە، وە سووکایەتیی‌و بێڕێزیی‌و گاڵتە پێکردنیش جیایە.

# باسێك لە بارەی بانگ (آذان) و قامەت کردنەوە

زۆربەی ئەو باسەم لە تەفسیری (القُرطبي) وەرگرتوە[١]، لەگەڵ هەندێ سەرچاوەی دیکە کە ئاماژەیان پێدەدەم:

**١) مانای وشەی (النِّدَاء):**

دەڵێ: (النِّدَاء: الدُّعَاءُ بِرَفْعِ الصَّوْتِ، وَنَادَاهُ مُنَادَاة وَنِدَاء: أي صَاحَ بِهِ)، (نِدَاء)، واتە: بانگ کردن بە دەنگی بەرز، وە لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (وَنَادَاهُ مُنَادَاة وَنِدَاء) یانی هاواری کردێو بە دەنگی بەرز بانگی کرد.

١) الجامع لأحكام القُرآن: ج٦، ص١٩٦، ٢٠٥.

## ٢) قسـەی زانایـان دەربـارەی بـانگ:

(قُرطُبي) دەڵـێ: (قَالَ العُلَمَاءُ: وَلَمْ يَكُن الأَذَانُ بِمَكَّةَ قَبْلَ الهِجْرَة، وَإِنَّمَا كَانُوا يُنَادُونَ "الصَّلاَةُ جَامِعَة" فَلَمَّا هَاجَرَ النَّبِيُّ ﷺ وَصُرِفَتِ القِبْلَةُ إِلى الكَعْبَةِ أَمَرَ بِالأَذَانِ، وَبَقِي "الصَّلاَةُ جَامِعَة" للأَمْرِ يَعْرِضُ)، واتە: زانایان گوتوویانە: لە مەککە بانگ نەبووە پێش کۆچکردن، بەڵکو ئیشێك کە دەهاتە پێش (پێویست دەبوو مسوڵمانانی بۆ کۆبکرێتەوە) ئەوە دروشمیان بووە: (الصَّلاَةُ جَامِعَة) نوێژ کۆکەرەوەیە، (ئەوە دروشمێکیان بوو، مەرج نیە کاتی نوێژیش بووبێ، کاتی نوێژیش نەبووبێ هەر وایان کردوە، نوێژ کۆتان دەکاتەوە، واتە: کارێك هاتۆتە پێش پێویستە کۆببنەوە)، کاتێك پێغەمبەر ﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو رووگە (قبلة) لە (بیت المقدس)ەوە گۆڕا بۆ کەعبە (لە ساڵی دووەمی کۆچییدا) لەو کاتەدا فەرمان بە بانگ کرا، وە وشەی (الصَّلاَةُ جَامِعَة) بانگ هەر مایەوە، بۆ ئیشێك دەهاتە پێش.

وە بانگ لە چەند ڕێیەکەوە تەشریع کراوە، جارێ ئەوە ئایەتەکە باسی دەکات، کەواتە: بانگ لە قورئاندا باسی کراوە.

وە پێغەمبەری خوا ﷺ دەقی بانگی فێری (أَبُو مَحْذُورَة) کردوە، وەك لە (صَحِيح مُسْلِم)دا هاتوە، وە لە (صَحِيح ابْنُ مَاجَه)دا هاتوە شێخ ئەلبانیی بە صەحیحی داناوە.

وە هەر کامێك لە عەبدوڵڵای کوڕی زەید،و عومەری کوڕی خەتتابیش خوا لێیان ڕازی بێ، وەك دوایی ئاماژە بە فەرموودەکە دەکەین، لە خەودا خەونیان بینیوە بە بانگەوە، وە چوون بۆ پێغەمبەری خوایان ﷺ گێڕاوەتەوە، بەو شێوە بانگەی کە ئێستا هەیە، بەڵام زانایان دەڵێن: ئەوە مانای ئەوە نیە تەنیا لە ڕێی خەونەوە، کە هاوەڵان بینیویانە، وەك عەبدوڵڵای کوڕی زەیدو عومەری کوڕی خەتتاب خوا لێیان ڕازی بێ، تەنیا لەو ڕێیەوە بانگ دانرابێ، بەڵکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەگونجێ وێڕای خەونی ئەو هاوەڵە بەڕێزانە، بۆخۆشی بە وەحیش خوای پەروەردگار پێی ڕاگەیاندبێ.

## ٣) حوکمــی بــانـگو قامــەت:

زانـایـان ڕاجیـایی یان هەیـە لە بـارەی حوکمی بانـگو قامەتـەوە:

أ/ هـەندێكـیان دەڵـێن: هەردووكیـان پێویسـتی تایبـەت (فَرْض الْعَيْنِ)ن ، واتـە: هەر مسـوڵمانێك نوێـژی فـەرزی كرد، دەبـێ بانگـی بۆ بـداو قامەتیشـی بۆ بكـات.

ب/ وە هەندێكیشـیان دەڵـێن: هەردووكیان پێویستی گشـتی (فَرْض الكِفَايَة)ن.

ج/ وە هەندێكیشیان دەڵـێن: هەردووكـیـان سـوننەتـن.

د/ وە هەیـە دەڵــێ: بانــگ فــەرزە، بەڵام قامــەت سـوننەتە.

هـ/ وە هەیشـــە دەڵـــێ: هــەردووكیان فــەرزی كیفایــەن، یــان یــەكێكیان فــەرزی كیفـایەیەو ئەوی دیكـە فـەرزی عەینـە، یان بە پێچـەوانەوە ...، چەند ڕایەك هــەن لەوبــارەوە.

بەڵام بەپێی ئەو دەقانەی كە دوایی ئاماژەیان پێدەكەین، ڕای ڕاست ئەوەیە كە بـەلای كەمــەوە بـانگو قامـەت فـەرزی كیفـایەن، ئەگـەر هـی عـەینیش نـەبن، با تەماشای ئەو چـەند دەقـە بكـەین:

یەكـەم: ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رضي الله عنه، قَالَ كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يُغِيرُ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ وَكَانَ يَسْتَمِعُ الأَذَانَ فَإِنْ سَمِعَ أَذَانًا أَمْسَكَ وَإِلاَّ أَغَارَ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بـرقم: (٨٤٥)، وَأَبُو دَاوُد بـرقم: (٢٦٣٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بـرقم: (١٦١٨)} ، واتـە: ئەنەسـی كوڕی مالیـك خــوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ عـادەتی وابـوو هێرشـی دەكـردە سـەر دوژمنێـك (كـە لەگـەڵی لـە حـاڵەتی جـەنگ دابـوو) لـە كـاتی بەرەبەیـانـدا، ئەگـەر گوێـی لـە بانـگ بووایـە هێرشـی نـەدەكردو، دەسـتی دەگرتەوە، بەڵام ئەگەر گوێـی لە بانـگ نەبووایـە، هێرشـی دەكـرد. واتـە: ئەگـەر گوێی لە بـانگ بووایـە، ئـەوەی دەگـەیاند كـە دیـارە ئەوانـە مسـوڵمانن، كەواتـە: بانـگ شـیعاری مسـوڵمانـەتییـە، وە ئەگـەر گوێشـی لـێ نەبووایـە، دیـارە نامسـوڵمان بوون.

دووەم: ﴿قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ لِمالِكِ بْنِ الْحُوَيْرِثِ وَابْنِ عمّ لَهُ: (إذَا كُنْتما في سَفرٍ فَأذِّنَا ثُمَّ أقِيمَا وَلْيَؤُمَّكُما أكْبَرُكُمَا)﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٣٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (١٥٣٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٥) وَقَالَ: حَسَنٌ صحيح، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٦٣٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢١٢٨)}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بە مالیکی کوڕی حویریثو ئامۆزایەکی ئەوی فەرموو: ئەگەر پێکەوە لە سەفەرێ بوون بانگ بدەن، وە قامەتیش بکەن، وە با کامەتان بە تەمەنترە پێشنوێژییتان بۆ بکات، واتە: با یەکێکتان ببێتە ئیمامو یەکێکتان ببێتە مەئمووم.

(إبْنُ المُنذِر)، دەڵێ: (فَالأذَانُ وَالإقَامَةُ وَاجِبَانِ عَلَى كُلّ جَمَاعَةٍ فِي الحضَرِ والسّفَرِ، لأنَّ النَّبِي ﷺ أمَرَ بالأذَان وأمرهُ عَلَى الوُجُوب)، ئەوە (قُرطُبي) لە (إبْنُ المُنذِر)ەوەی دێنێ، کە زانایەکی گەورەی خاوەن ڕای تایبەت بەخۆی بووە، هەندێکیش دەڵێن: لە چوارچێوەی مەزهەبی شافیعیدا بووە، بەڵام واپێدەچێ زۆر ڕای تایبەتی هەبووبن، واتە: (إجتهاد)ی کردوە، دەڵێ: بانگدانو قامەتکردن فەرزن لەسەر هەر کۆمەڵێك لە مسوڵمانان نیشتەجێ بن، یان ڕێبوار بن، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردوە بە بانگ (هەروەها بە قامەتیش) وە فەرمان کردنی ئەویش پێویست بوون دەگەیەنێ.

(أبو عمر) واتە: (إبن الصلاح الشهرزوري) دەڵێ: (وَاتَّفَقَ الشافعي وَأبُو حَنيفَة وأصحابهما والثوري وَأحمَد وَإسْحَاق وَأبُو ثَور والطَبَري عَلَى أنَّ المُسَافِر إذَا تَرَكَ الأذَان عَامِداً أو ناسياً أجزأتهُ صلاتهُ؛ وَكَذلِكَ لَو تَرَكَ الإقَامَة عِنْدَهُم، وَهُمْ أشَدّ كَرَاهَة لِتَركِه الإقَامَة)[1]، واتە: شافیعیو ئەبو حەنیفەو هاوەڵەکانیان، وە ثەورییو ئیسحاقو ئەبو ثەورو طەبەریی ڕەحمەتی خوا لە هەموویان بێ، لەسەر ئەوە ڕێککەوتوون کە بابای ڕێبوار ئەگەر بانگی نەدا بەئەنقەست، یان لەبیری چوو، نوێژەکەی هەر بەردەکەوێ، (بەڵام دیارە لەسەر ڕای ئەوانەی کە دەڵێن فەرزن، گوناهبار بووە، وە لەسەر ڕای ئەوانەی کە دەڵێن: سوننەتە، خێرێکی لەدەست چووە)، وە هەروەها ئەگەر قامەتیش

١) الجَامع لأحكام القُرآن ج٦، ص١٩٨.

نــەکات بــۆ نوێژەکــەی، لــەلای ئــەوان، نوێژەکــەی هــەر دروســتە، بــەڵام قامــەت نەکردنەکەیان پێنـاخۆشتـرە لە بانــگ نەدانەکـە.

## ٤) چۆنیـەتـی بانـگدان‌و چۆنیـەتی قامـەت کـــردن:

دیـــارە بـــانگی زۆرینـــەی زۆری مســـوڵمانان ئەوانـــەی لەســـەر ڕاســـتە شـــەقامی پێغـەمبەری خــوا ﷺ‌و هــاوەڵانی ســەرڕاســتن خــوا لێیـان ڕازی بێ، بـەو شـێوە بووە کە ئێسـتا هەیە، ئیـدی بـانگی دیکـەی خەڵـکی لادەرو لاڕێ، زۆر ئیعـتیباری پێ ناکـرێ، ئنجـا زۆربـەی خــەڵك وادەزانـن هـەر یــەك شـێوە بـانگ هەیـە، بـەڵام دیـارە وانیــە. وە ئەو شـێوە بانگەی ئێستا باوە لە جیهانی ئیسـلامییدا ئاوایـە:

اللّٰه أَكْبَـرُ اللّٰه أَكْبَــرُ      اللّٰه أَكْبَـرُ اللّٰه أَكْبَــرُ

أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلاَّ اللّٰه      أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلاَّ اللّٰه

أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ      أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ

حَـــيَّ عَـلَـــى الصَّـلاَةِ      حَـــيَّ عَـلَـــى الصَّـــلاَةِ

حَـــيَّ عَـلَـــى الْفَـلاَحِ      حَـــيَّ عَـلَـــى الْفَـــلاَحِ

اللّٰه أَكْـبَرُ اللّٰه أَكْـبَرُ

لَا إِلَهَ إِلاَّ اللّٰه

ئەمە لە فەرموودەکـەی (أَبِي مَحْذُورَةَ)دا هاتوە کـە (مسلم وأبو داود والنسائي وإبن ماجه) هێناویانـەوە ئـەلبانیش لـە (صحيح سنن النسـائي)دا بـە صەحیحی دانـــاوە، کـە بـەو شـێوەیە پێغەمبــەری خـــوا ﷺ بانگــی فێـری (أَبِي مَحْــذُورَةَ) کردوە.

جـا ئــەو چۆنیـــەتی بانـــگ فێرکردنــە، بەســەرهاتێکی لەگــەڵ دایــە، کــە لــە تەفسیـرەکاندا هـاتوە، گـێڕانەوەی خــراپ نیــە:

(أَبِي مَحْـذُورَةَ) یـەکێك بـووە لـە مونـافیقەکان، (دەڵـێ: ئێمـە کۆمـەڵێك بـووین کاتێـــك لــە جــەنگی تەبــووك دەگەڕاینـــەوە، دانیشـــتبووین گاڵتــەمان بــە بانـــگ

دەکرد، کاتێك بانگ بێژی پێغەمبەر ﷺ بانگی دەدا، ئێمەش لاساییمان دەکردەوەو گاڵتەمان پێدەکرد، دەڵێ: من یەکێك بووم لە گاڵتە پێکەرەکان، وە من بەتایبەتی زیاد دەنگم پێ بەرز کردەوە، پێغەمبەر ﷺ بانگی کردین، فەرمووی: کامەتان بوو کە دەنگی لە هەمووتان بەرزتر بوو؟ دەڵێ: هاوەڵەکانم ئاماژەیان بۆ من کرد، گوتیان: فلاَن کەس بوو، بۆخۆشم گوتم: بەڵێ من بووم، دەنگم لە هەموویان بەرزتر بوو، (دیارە مەترسیی هەبووە پێغەمبەر ﷺ لێی توورە بێ)، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: وەرە پێش، منیش لێی چوومە پێش، دەستێکی بە نێو چەوانم داهێنا تا گەیشتە سەر نێوکەمو دوعای بۆ کردم، ئنجا فەرمووی: ئەو وشانەی پێت دەڵێم وەك من بیانڵێوە، گوتم: بەڵێ، ئیدی ئەو وشانەی بانگی پێگوتم، دوای ئەوەی لێبوومەوە، (أَبِي مَحْذُورَةَ بەناوبانگ بووەو بانگ بێژێکی دیار بووە)، سوێند بە خوا کە چوومە لای پێغەمبەر ﷺ هیچ کەس نەبوو هێندەی وی بیبوغزێنم، وە ئەمری هیچ کەسیشم لە ئەمری وی پێ ناخۆشتر نەبوو، کە پێی فەرمووم بیانڵێوە، بەلاَم کە بانگەکەم تەواوکردو دەستی بەسەرداهێنام، هیچ کەس نەبوو هێندەی پێغەمبەر ﷺ خۆشم بووێ، وە بانگیشم زۆر زۆر خۆشویست)، {دیارە دوایی (أَبِي مَحْذُورَةَ) بۆتە بانگدەری ڕەسمیی، کە بێگومان ئەوەش بەرەکەتی خوابووە، بەلاَم بێگومان ڕەوشتو خووی بەرزو سینگ فراوانیی پێغەمبەریش هۆکاری سەرەکی بووە.

دەربارەی (إقامة)ش کە لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێین: قامەت، وە مانای وشەکە (هەڵساندنەپێ)یە، ئەسڵی خۆی واتە: ئەو نوێژە ئەهلی جەماعەت هەڵسێنێ بۆ نوێژو نوێژەکە بەرپا بکەن، (إقامة)ش ئەوەی کە باوە ئاوایە:

اللّٰهُ أَكْبَـرُ اللّٰهُ أَكْبَـرُ

| | |
|---|---|
| أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إلاَّ اللّٰهُ | أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّٰهِ |
| حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ | حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ |
| قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ | قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ |

اللّٰهُ أَكْبَرُ اللّٰهُ أَكْبَرُ

لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰهُ

دیارە وشەکانی بانگ، مانای زۆر زۆر گەورەیان هەیە، وە دروشمی هەرە گەورەی ئیسلامن، خوای بەرز، وە پێغەمبەری خوا ﷺ بە بەلاش و بێ حیکمەت نیە، ئەو وشە گەورانەیان کردوە بە دروشمو بانگ بۆ مسوڵمانان، کە ئەوە تایبەتە بە مسوڵمانانەوەو هیچ خاوەن دینو بەرنامەیەکی دیکە شتی وایان نیە، ڕۆژێ پێنج جاران ئەو وشە گەورانە بگوترێن، وە شیعاری کۆکردنەوەی مسوڵمانان بن، بۆ شتێك کە گەورەترین شتە لە دینەکەیاندا کە نوێژە، مانای وشەکان بەم شێوەیە:

(اللّٰهُ أَكْبَرُ)، واتە: خوا گەورەترە، بەو واتایە نا لە فلان شتو لە فلان شت! خوا گەورەترە بە موتڵەقی، هەرچی تۆ بە دڵو مێشکت دادێ، خوا گەورەترە، بە هەموو شێوەکانی گەورەیی خوا گەورەترە، بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە، نەك گەورەییەکت بە مێشکی دابێ کە لەگەڵ بێوێنەیی خوای پەروەردگاردا نەگونجێ، چوار جار ئەوە دووبارە دەبێتەوە.

(أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ اللّٰهُ)، واتە: شایەدیی دەدەم کە جگە لە خوا هیچ پەرستراونین، نەك بێجگە لە خوا هیچ خوانین، کە بەداخەوە من گوێم لە وتاربێژەکانیش دەبێ، گوێم لە بانگخوازەکانیش دەبێ، جیاوازیی نێوان (إِلَـه) و (اللّٰه) دا ناکەن، دەڵێن: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّٰهُ)، واتە: بێجگە لە خوا هیچ خوا نین! نەخێر، وانیە، چونکە پەرستراو (إِلَه) جیایەو خوا (اللّٰه) جیایە، ئەم ڕستەیە واتە: بێجگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، چونکە بتپەرستەکانیش نکوولێیان لەوەدا نەکردوە، کە یەك خوا هەیە بەمانای بەدیهێنەرو پەروەردگارو خاوەن، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُم مَّنْ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ وَسَخَّرَ ٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُ فَأَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ العنكبوت، واتە: ئینکارییان نەکردوە، لەوەدا کە تەنیا خوا بەدیهێنەرو پەروەردگارە، بەڵام ئایا لە چیدا بە هەڵە داچوون؟ لەوەدا کە غەیری

خوایان پەرستوە، بۆیە (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ)، واتە: هیچ پەرستراوی بە هەق نین، جگە لە خوای بەرزو مەزن و بێوێنە.

(أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللّهِ)، شایەدیی دەدەم کە موحەممەد ڕەوانەکراوی خوایە.

(حَيَّ عَلَى الصَّلاَةِ)، (حَيَّ) بۆ تاك و دووان و كۆو هەمووان دەبێ، واتە: وەرن بۆ نوێژ.

(حَيَّ عَلَى الْفَلاَحِ)، وەرن بۆ سەرفرازیی.

(اللّهُ أَكْبَرُ)، خوا گەورەترە.

(لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّهُ)، هیچ پەرستراوێك نیە (بە هەق) جگە لە خوا ﷻ.

قامەتیش ئەوە دیارە، تەنها: (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ، قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) یانی: نوێژ بەرپابوو، نوێژ بەرپابوو.

ئنجا فەرموودەكەی عەبدوڵلای كوڕی زەید كە دێتە خزمەت پێغەمبەرو ﷺ بۆی دەگێڕێتەوە، كە بەو شێوەیە خەونی بینیوە، لە خەونەكەیدا یەكێك دەڵێ: با وەك هی جوولەكەكان بانگ بكەین، یەكێكی دیكە دەڵێ: با وەك نەصرانییەكان (ناقووس) بەكاربێنین، دوایی دەڵێ: پێیان گوتم: ئەو وشانە بڵێ، وە كە دەچێ بۆ خزمەت پێغەمبەر ﷺ ئەویش پێی دەفەرموێ: (أَلْقِهِ عَلَى بِلاَلٍ، فَإِنَّهُ أَنْدَى مِنْكَ صَوْتًا) ئەو وشانە فێری بیلال بكە، با بیلال بیانڵێ، ئەو دەنگی لە تۆ خۆشترە.

زانایان دەڵێن: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە كێ دەنگی خۆشە ئەو بانگ بدات، ئەو شیعارو دروشمە بەرزە، دەبێ بە دەنگێكی زۆر زوڵاڵ و خۆش و كاریگەر ڕابگەیەنرێ.

### ٥) چەند ئاگاداریی یەك دەربارەی بانگ و قامەت:

یەك: هەندێك لە زانایان دەڵێن: بانگ و قامەت هەردووكیان چوار (اللّهُ أَكْبَر)یان لە پێشەوەیە، واتە: نەك قامەت دوو (اللّهُ أَكْبَر)بێ، كە ئێستا

ئێمـــە وادەکـــەین، ئـــەوە حەنەفییەکـــان ڕایـــان وایـــە، وە ڕایـــان وایـــە شـایەتمانەکـــانیش دوو دووبـــن، واتـــە: وەك چـــۆن لـــە بانگـــدا دوو دوون، لـــە قامەتیشـــدا دوو دووبـن، وە ئـەبو حەنیفـەو هـاوەڵەکانیو ثـەوریـیو حەسـەنی کوڕی حـەیی ڕایـان وایە، کـە (ترجیع) لە بانگـدا سـوننەت نیـە.

(تَرجیع)، چییـــە؟ ئەوەیـە کە شـایەتمانەکان بەر لـەوەی بانگبێـژ بـە دەنگی بـەرز بیانڵـێ، بە دەنگی نزم بیانڵـێ، دواییـ بـە دەنگی بـەرز بیانڵـێ، یاخـود دووجـار بیـانڵێتـەوە، (تَرجیع)، واتە: گێڕانـەوە.

دوو: مـالیـك دەڵێ: تەنیا یـەك جار (قَدْ قَامَتِ الصَّلَاةُ) دەگوترێ لە قامەتێـدا، بـەڵام زانـایـانی دیکە هـەموو ڕایـان وایـە کە نەخێـر دەبێ دووجـار بگـوترێ.

سـێ: مالیكو ثـەوریو لـەیثو شافیعیی لە قسـەی قەدیمی دا دەڵێن: (الصَّـلاَةُ خَيْـرٌ مِـنَ النَّـوْمِ) لـە نوێـژی بـەیانی دا کـە (تَثویب)ی پـێ دەڵـێن، سـوننەتە بگوترێ، بـەڵام ئـەبو حەنیفە، وە شافیعیی لە قسـەی تـازەی دا کە لە میسـرِ گوتوویەتـی دەڵـێن (تَثویب)، واتـە: (الصَّـلاَةُ خَيْرٌ مِنَ النَّوْمِ) سـوننەت نیـە، دیـــارە ڕای زۆرینـە ئەوەیـە کـە سـوننەتە، بـەڵام لـە هـەردوو فەرموودەکـەی (عَبـدُاللّٰه بْـن زَيـد)، و(أَبِي مَحْـذُورَة)دا (الصَّـلاَةُ خَيْـرٌ مِـنَ النَّـوْمِ) لـە بـانگی بەیـانیـدا هەیـە.

چـوار: زانـایان یەکدەنگـن کـە هەتا کاتی بـانگ نـەبێ، دروست نیـە بـانگ بـدرێ، جگە لە نوێـژی بەیانی، وە نوێـژی بەیانی پێش کـاتی هاتنـی نوێـژیش دروسـتە بـانگ بـدرێ، بـۆ ئاگادارکردنـەوەی مسـوڵمانان، وەك لـەم فەرموودەیـەدا دیـارە پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ بِـلاَلاً يُـؤَذِّنُ بِلَيْـلٍ فَكُلُـوا وَاشْـرَبُوا حَتَّـى يُـؤَذِّنَ ابْـنُ أُمِّ مَكْتُـومٍ﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٤٥٥١)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٦٣٣، ٦٢٣)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٢٠٣)، وَقَـالَ: حَسَـنٌ صَـحِيحٌ، وَالنَّسَـائِيُّ بـرقم: (٦٣٧)، وَابْنُ حِبَّانَ بـرقم: (٣٤٧١) عَـن ابْـن عُمَـرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ}، واتـە: بێگومـان بـیلال بـە شـەو بانـگ دەدا (واتە: شەو دەمینـێ کـە بـانگ دەدات) بۆیـە ئەگـەر گوێتـان لـە بانگـی بیـلال بـوو، جـارێ لەسـەر خـواردنو خواردنـەوە بـەردەوام بـن، هـەتا ئیبنو ئوممی مەکتـوم (واتـە: عەبـدوڵڵای کوڕی ئوممـی مەکتـوم خـوا لێیـان

ڕازی بێ) بانگ دەڵێ، (کە دوای ئەوەی کە شەبەقی بەیان دەدات، ئەو بانگ دەڵێ).

پێنج: ئەبو عومەر، واتە: (إِبْنُ الصلاح الشَهرَزوري) وەك (قُرطُبي) لێیەوە هێناوە، دەڵێ: (ذَهَبَ أَحْمَد بْنُ حَنْبَل وَإِسْحَاق بْن رَاهوية وَدَاوُدَ بْن عَلى وَمُحَمَّد بْنِ جَرِير الطَّبَري إلى إجَازَةِ القول بكُلّ مَا رُوي عَن رَسُول الله ﷺ وَحَملوه عَلَى الإِبَاحَة وَالتَخيير، قَالوا: كُلّ ذَلِكَ جَائِز لأنهُ قَدْ ثَبَتَ عَنْ رَسُول الله ﷺ جَمِيعُ ذَلِكَ، وَعمِل بهِ أَصْحابهُ فَمَنْ شَاءَ، قَالَ الله أَكْبَر مَرَّتَين فِي أوَّل الأَذَان، وَمَنْ شَاءَ قَالَ ذَلِكَ أَرْبعاً، وَمَنْ شَاءَ رَجَّعَ فِي أَذَانِهِ، وَمَنْ شَاء لَمْ يُرجِّعْ، وَمَنْ شَاءَ ثنّى الإقامَة، وَمَنْ شَاء أَفرَدَهَا، إلاَّ قَوْلَه: "قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ" فَإِنَّ ذَلِكَ مَرَّتَان مَرَّتَان عَلَى كُلّ حَالٍ!!)[1]، واتە: ئیبنو صەلاحی شارەزووریی ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: (أَحْمَد بْنُ حَنْبَل وَإِسْحَاق بْن رَاهوِيَه وَدَاوُدَ بْن عَلى وَمُحَمَّد بْن جَرِير الطَّبَري) دەڵێن: هەموو ئەو شێوازانەی بانگو قامەت کە لە پێغەمبەر ﷺ گێڕدراونەوە دروستە، بە هەرکامێکیان بانگ بدرێ، یان قامەت بکرێ، چونکە مادام هەموویان ڕەوان، سەرپشکبوونیان تێدایە، {کەواتە: مەسەلەکە ئەوە نیە ئەو هاوەڵە بەڕێزانە کە بەلای کەمەوە بۆ زیاتر لە نۆ (٩) ساڵ گوێیان لێبووە کە بانگ دراوەو قامەت کراوە، نەیانزانیبێ چۆن بوون؟! نا، بەڵام وادیارە بە مۆڵەتی پێغەمبەر ﷺ بە چەند شێوەیەك بانگ دراوەو، بە چەند شێوەیەکیش قامەت کراوە.

بۆیەش شێوەکان هەن، تاکو ڕێ بۆ مسوڵمانان فراوان بێ، وەك لە زۆر شتی دیکەش دا پێغەمبەر ﷺ وایکردوە بۆ وێنە: چەند جۆرە تەحیاتێکی خوێندوە، چەند جۆرە (إستفتَاح)ێکی خوێندوە، وە چەند جۆرە زیکرێکی ڕکووعو سەجدە هەن} ئنجا دەڵێ: ئەوانە هەموویان لە هاوەڵان گێڕدراونەوەو هاوەڵانیش کاریان پێکردوون، بۆیە کەسێك بیەوێ با لە سەرەتای بانگدا دوو (اللهُ أَكْبَر)ان بکات، وە ئەوەی دەیەوێ با چوار (اللهُ أَكْبَر)ان بکات (وەك

---

١) الجامع لأحكام القُرآن ج٦، ص٢٠٠.

ئێستا باوە)، وە كەسێك بیەوێ با بە (ترجیع) بانگ بدات، ئەوەی ناشیەوێ با بە (ترجیع) بانگ نەدا، وە كەسێك بیەوێ با (اللّهُ أَكْبَر)ی قامەتیش دوو دوو بن‌و دەتوانێ شایەتمانەكان یەك بن، جگە لە (قَدْ قَامَتِ الصَّلاَةُ) ئەوە دەبێ هەر دوو جار بێ، بە پێی ڕای زۆربەی زانایان، جگە لە ڕای ئیمام مالیك.

### ٦) وەڵامدانەوەی بانگ:

ئەوە سوننەتێكە كە زۆر لە مسوڵمانان فەرامۆشیان كردوە، بەڵام سوننەتێكی زۆر گەورەیەو، پێغەمبەر ﷺ زۆر گرنگیی پێداوە، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿إِذَا قَالَ الْمُؤَذِّنُ: اللّهُ أَكْبَرُ، اللّهُ أَكْبَرُ، قَالَ أَحَدُكُمْ: اللّهُ أَكْبَرُ، اللّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللّهُ، قَالَ: أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللّهُ، ثُمَّ قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّهِ، قَالَ: أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّهِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ، قَالَ: لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلا بِاللّهِ، ثُمَّ قَالَ: حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ، قَالَ: لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلا بِاللّهِ، ثُمَّ قَالَ: اللّهُ أَكْبَرُ، اللّهُ أَكْبَرُ، قَالَ: اللّهُ أَكْبَرُ، اللّهُ أَكْبَرُ، ثُمَّ قَالَ: لا إِلَهَ إِلا اللّهُ، قَالَ: لا إِلَهَ إِلا اللّهُ، مِنْ قَلْبِهِ دَخَلَ الْجَنَّةَ﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِم بِرقم: (٨٤٨)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٥٢٧)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (١٦٨٥) عَنْ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ رضي الله عنه}، واتە: ئەگەر بانگدەر گوتی: (اللّهُ أَكْبَرُ، اللّهُ أَكْبَرُ)، یەكێك لە ئێوەش وەك وی گوتی: (اللّهُ أَكْبَرُ، اللّهُ أَكْبَرُ) دوایی بانگدەر گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللّهُ) ئەویش وەك ئەو شایەتمانی هێنا، دوایی گوتی: (أَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللّهِ)، ئەویش وەك ئەوی گوتەوە، دوایی كە بانگدەر گوتی: (حَيَّ عَلَى الصَّلاةِ) ئەویش گوتی: (لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلا بِاللّهِ)، دوایی گوتی: (حَيَّ عَلَى الْفَلاحِ)، ئەویش گوتی: (لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إِلا بِاللّهِ)، دوایی بانگدەر گوتی: (اللّهُ أَكْبَرُ، اللّهُ أَكْبَرُ) ئەویش وایگوت، دوایی بانگدەر گوتی: (لا إِلَهَ إِلا اللّهُ) ئەویش وایگوت، ئەو وشانەی بە دڵ گوتن، دەچێتە بەهەشت.

لە فەرموودەیەكی دیكەدا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿مَنْ قَالَ حِينَ يَسْمَعُ الْمُؤَذِّنَ: أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَه إِلاَّ اللّهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَهُ، وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، رَضِيتُ بِاللّهِ رَبّاً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلامِ دِيناً، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ﴾

{أَخْرَجَـهُ مُسْلِم بـرقم: (٨٤٩)، وَأَبُـو دَاوُد بـرقم: (٥٢٥)، والتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٢١٠)، والنَّسَائِيُّ بـرقم: (٦٧٨)، عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ رضي الله عنه}، (دوای ئـەوەی کـە بـانگ دەدرێو، وەڵام دەدرێتـەوە، با وانەزانرێ تێکدەگیـرێن، وەڵامـی بـانگ لەگەڵ بـانگ دەدرێتــەوە، بـەڵام دوای ئــەوەی وەڵامـی بانــگ تـەواو بـوو، ئنجا ئـەو دوعایـە دەکرێ)، واتە: هەر کەسێك گوێی لە بانـگبێژ بوو کە بانگـیدا، وە گوتی: (أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَـه إِلاَّ اللّٰهُ وَحْدَهُ لاَ شَرِيكَ لَـهُ)، واتـە: شـایەدیی دەدەم کـە بێجگـە لـە خـوا هیچ پەرسـتـراوی بـە هـەق نـین (وَأَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ)، واتـە: وە شـایەدیـی دەدەم کـە موحەممـــەد بەنـدەی خــواو ڕەوانـەکراوی خوایــە، وە پاشـان گـوتی: (رَضِيتُ بِاللّٰهِ رَبّاً، وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولاً، وَبِالإِسْلاَمِ دِيناً، غُفِرَ لَهُ ذَنْبُهُ)، واتـە: ڕازییـم بـە پەروەردگــارێتیی خـوا، وە ڕازیــیم بــە پێغەمبەرایـەتیی موحەممـەد لەلایـەن خــواوە، وە ڕازییم کـە ئیسـلام بەرنـامەم بــێ، هـەر کەسـێك (بـە دڵ) ئـەوە بڵـێ: ئــەوە هەرچـی گونـاهی پێشــوویەتی دەبـوردرێو دەسـڕێتەوە، سـوننەتە کاتێـك ئینسان گوێـی لـە بـانگ دەبـێ ئەو دوعـایە بخـوێنـێ.

### ٧) پاداشتی بـانگو پـایەی بـانگ بێـژان:

بانگدان عیبـادەتێکی زۆر گـەورەیـە، بە پێـی ئەم دەقـانە:

أ- ﴿عَـنْ أَبِـي هُرَيْـرَةَ رضي الله عنه، أَنَّ رَسُـولَ اللّٰهِ ﷺ، قَـالَ: (إِذَا نُـودِيَ لِلصَّــلاَةِ أَدْبَـرَ الشَّــيْطَانُ وَلَـهُ ضُــرَاطٌ حَتَّـى لاَ يَسْـمَعَ التَّـأْذِينَ)﴾ {أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٦٠٨)، وَمُسْلِم بـرقم: (٨٥٤)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٥١٦)، وَالنَّسَـائِيُّ بـرقم: (١٢٥٣)، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (١٦٦٣)}، واتـە: ئـەبو هـوڕەیڕە خـوا لێـی ڕازی بـێ دەڵـێ: پێغەمبــەری خــوا ﷺ فەرمـوویـەتی: کاتێـك بـانگ دەدرێ بـۆ نوێـژ، شـەیتان ڕادەکاو پشـت دەکـاتەوە، (بـا)ی لــێدەبێتەوە، تـاکو گوێـی لـە بانگـەکە نەبـێ، (بە دەنگی بـەرز بـای لـێ بەردەبـێ).

ب- ﴿عَـنْ مُعَاوِيَـةَ رضي الله عنه سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللّٰهِ ﷺ يَقُـولُ: (الْمُؤَذِّنُـونَ أَطْـوَلُ النَّـاسِ أَعْنَـاقاً يَـوْمَ الْقِيَامَـةِ)﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (١٦٩٠٧)، وَمُسْلِم بـرقم: (٨٥٠)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (٧٢٥)، وَابْـنُ حِبَّـانَ بـرقم: (١٦٦٩)، وَالبَيْهَقِـيُّ فـي (شـعب

الإيمان) برقم: (٣٠٥١)) واتە: موعاویە خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو: بانگبێژان لە هەموو کەس لە ڕۆژی قیامەت گەردنیان بەرزترە، (جا گەردنی ڕواڵەتییان بەرز دەبێ، یان مەبەست پێی ئەوەیە پایەیان بەرزە)، بەڕاستیی ئەوانەی ئەو دروشمو شیعارە بە گوێی مسوڵمانانادا دەدەن لە قیامەت سەربەرزن‌و، ئەگەر مەبەست پێ گەردن بەرزییش بێ، مەبەست جوانیی قەدو قیافەکەیان.

ج- ﴿عَنْ أَبُو سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ قَالَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: (لا يَسْمَعُ مَدَى صَوْتِ الْمُؤَذِّنِ جِنٌّ، وَلا إِنْسٌ، وَلا شَيْءٌ، إِلا شَهِدَ لَهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١١٤١١)، وَعَبْد بْنُ حُمَيد برقم: (٩٩٣)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٦٠٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٦٤٤)، وَابْنُ مَاجَه برقم: (٧٢٣)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (١٦٦١)}، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: دەنگی بانگبێژ نابیستێ، جن‌و ئادەمیزادو، هیچ شتێك، (واتە: وەکو ئاژەڵ‌و ژیاندارانی دیکەش) مەگەر ڕۆژی قیامەتێ شایەدیی بۆ دەدەن.

د- ﴿عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولَ اللهِ ﷺ: (مَنْ أَذَّنَ ثِنْتَيْ عَشْرَةَ سَنَةً، وَجَبَتْ لَهُ الْجَنَّةُ، وَكُتِبَ لَهُ بِتَأْذِينِهِ فِي كُلِّ يَوْمٍ سِتُّونَ حَسَنَةً، وَلِكُلِّ إِقَامَةٍ ثَلاثُونَ حَسَنَةً)﴾ {أَخْرَجَهُ وَابْنُ مَاجَه برقم: (٧٢٨)، والبَزَّار برقم: (٥٩٣٣)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سنن ابنُ مَاجَه)}، واتە: ئیبنو عومەر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك دوازدە ساڵان بانگ بڵێ، (وە قامەتیش بکات) بەهەشتی بۆ پێویست دەبێ، وە بە هەر بانگێك کە هەموو ڕۆژێك دەیدات، شەست (٦٠) چاکەی بۆ دەنووسرێ، وە بە هەر ئیقامەیەکیش کە دەیخوێنێ، سی (٣٠) چاکەی بۆ دەنووسرێ.

## ٨) ئایا کرێ وەرگرتن لە بەرانبەر بانگ بێژیی دا دروستە؟

زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە، دوو فەرموودە دێنینەوە لەوبارەوە:

یەکەم: ﴿عَنْ عُثْمَانَ بْنِ أَبِي الْعَاصِ رضي الله عنه قَالَ: إِنَّ مِنْ آخِرِ مَا عَهِدَ إِلَيَّ رَسُولُ اللهِ ﷺ أَنْ اتَّخِذْ مُؤَذِّنًا لا يَأْخُذُ عَلَى أَذَانِهِ أَجْرًا)﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ برقم:

(٥٣١)، وَالتَّرمِذِيُّ برقم: (٢٠٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٦٧١) قال الشيخ الألباني: صحيح}، واتە: عوسمانی کوڕی ئەبی عاص خوا لێی ڕازی بێ گوتوویەتی: دوایین شتێك کە پێغەمبەری خوا ﷺ بە منی ڕاگەیاند، فەرمانی پێکردم، کە هیچ بانگبێژێك نەگرم، کە لە بەرانبەر بانگدانەکەیدا کرێ وەربگرێ، کەواتە: بە پێی ئەم فەرمایشتە بێ، دروست نیە کرێ لە بەرانبەر بانگدان دا وەربگیرێ.

دووەم: بەڵام لە فەرموودەکەی (أَبِي مَحْذُورَةَ)دا کە پێشتر هێنامان، لە کۆتایی فەرموودەکەدا دەڵێ: ﴿ثُمَّ دَعَانِي حِينَ قَضَيْتُ التَّأْذِينَ، فَأَعْطَانِي صُرَّةً فِيهَا شَيْءٌ مِنْ فِضَّةٍ﴾، واتە: دوای ئەوەی کە بانگەکەم گوت (دیارە کاتی نوێژ بووە، بانگی داوە) بانگی کردم، پڕێسکەیەکی دامێ، توورەکەیەکی دامێ، ئەندازەیەك زیوی تێدابوو.

شەرعزانانیش زۆر قسەیان لەو بارەوە کردوە، وە من پێموایە وەرنەگرتنی کرێو پارە لە بەرانبەری بانگدا باشترە، بەڵام ڕەواشە وەربگیرێ، بەتایبەتی بۆ ئەو کەسەی خۆی بۆ ئەو کارە تەرخان کردبێ، وە کارێکی وای نەبێ کە پێی بژیەت.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ﴾، بڵێ: ئەی خاوەن کتێبینە! چیمان لێ بە عەیب دەگرن، ڕەخنەمان لەسەر چی لێ دەگرن، ئەوە نەبێ کە بڕوامان بە خوا هێناوە، وە بەوەی کە بۆ ئێمە نێردراوەتە خوار کە قورئانە، وە بەوەی کە پێش ئێمەش نێردراوەتە خوار (کە هەموو کتێبەکانی خوان)؟! واتە: ئایا ئەوەمان لێ بە عەیب دەگرن، کە بڕوامان بە خواو بە کتێبەکانی خوا هەیە؟! ﴿وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ﴾، وە چ هۆکارێکی دیکە هەیە بۆئەوەی ڕەخنەمان لێ بگرن، ئەوە نەبێ کە ئێوە زۆربەتان لاڕێن، لاڕێییتان وا دەکات ڕەخنە لە ئێمە بگرن، وەك گوتراوە (بابای نەخۆش ئاوی شیرینی بەدەم

تاڵـە)، ئێوە لەبەرئـەوەی بۆخۆتـان لارێــن، ئێمـە کـە بەرێــدا دەڕۆیـن بەڕاســتیی، ڕاسـت ڕۆیشـتنەکەی ئێمەتـان پێ عەیبـەو، لێمـان بـە ڕەخنـە دەگــرن، ئەمـە وەك ئــەو ئایــەتە وایــە: ﴿ وَمَا نَقَمُواْ مِنۡهُمۡ إِلَّآ أَن يُؤۡمِنُواْ بِٱللَّهِ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡحَمِيدِ ﴿٨﴾ ﴾ البــروج، واتــە: ئەوانــەی ئیمـانداراتیـان کوشــت (وەك لـە ســووڕەتی "البــروج"دا باسیان دەکـات، کە پێش هاتنـی ئیسـلام کەسـانێکی کـافر کۆمـەڵێك ئیمـانداریان کوشـتوون)، هیچـیان لــێ بـە عەیــب نـەگرتن، ئـەوە نـەبێ کە ئیمانیـان هـەبوو بـە خـوای زاڵـی شایســتەی سـتایش‌و سـوپاس، هـەر ئیمـان هێنــان بـە خوایان لــێ بـە عەیـب دەگرتــن، ئەمـە وەك ئـەو شــیعرەی شاعیرێك وایـە کـە مـەدحی قەومەکـەی خـۆی دەکـات، دەڵــێ:

لا عَيْـبَ فِيهِـم غَيْـرَ أَنَّ سُـيُوفَهُـم بِهِـنَّ فُلُـولٌ مِنْ قِرَاعِ الكـتَـائـِبِ

واتـە: قەومەکـەی مـن هـیچ عـەیبیان نیـە، تـەنیا ئـەوە نەبـێ کـە شـمشـێرەکانیان پاچـاوەنەوە، هێنـدەی شـەڕە شمشــێری پێکـەن! کـە دیـارە ئـەوەش عـەیب نیـە، شـمشــێر وەشــێنێك هێنـدە شـمشــێرەکەی وەشـاندبـێ دەمەکـەی پاچابێتــەوە، مانــای زۆر ئــازاو بەجەرگـە! کەواتـە: وایـە قەومەکـەی مـن هـیچ عەیبیــان نیــە، مەگـەر چاکەکانیـان بە عەیـب بزانــن!

وشــەی (نَقَمُواْ ) بـە (نَقِـمَ)ش دەخوێنرێتــەوە، ئەگـەر لـە قورئانـدا نـەبێ (نَقِـمَ، يَنْقَمُ، نَقَمَ، يَنْقِمُ)، واتـە: ڕەخنـەی گـرت، ڕەخنـەی لێدەگـرێ، نکـوولێی لێکـرد، نکوولــیی لێدەکـات، عەیبـی لێگـرت، عەیبــی لــێدەگرێ، (فهــو نـاقم)، (ناقـم)، واتە: ڕەخنـەگر، یاخود عەیـب گر، زۆر جـاری دیکـەش ئاماژەم پێـداوە، خــوا ﷻ لــە قورئانــدا هــەرگیز گشــتاندن بەکـارناهێنــێ، زۆر بەدەگمــەن، وەك ئــەوەی بفـەرموێ: هــەمووتان وان، یـان ئەهلــی کیتـاب هــەموویان وان، یـان موشـریکەکان هەموویــان وان، بەڵـکو دەفەرموێ (أَكْثَرهُم) کـە باسـی خـەڵك دەکات دەفـەرموێ: ﴿ وَأَكۡثَرُهُمۡ لِلۡحَقِّ كَٰرِهُونَ ﴿٧٠﴾ ﴾ المؤمنــون، لێـرەدا کـە باسـی کـــافران دەکـــات، دەفـەرمــوێ: ﴿ أَكۡثَرُكُمۡ فَٰسِقُونَ ﴾، یـان باســی ئەهلــی کتێـب دەکـات دەفـەرموێ:

﴿وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَسِقُونَ﴾، بۆئەوەی ئێمەش فێری ئینصاف بین، هەرگیز نەڵێین: هەمووی وایە، نا، هیچ قەومێکی خراپ لە چاکە خاڵیی نابن، هەروەك هیچ قەومێکی چاکیش لە خراپە خاڵیی نابن، خودا فێری ئینصافو دادگەرییمان دەکات، تاکو حوکمی گشتاندن بەسەر خەڵکدا نەدەین.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ أُوْلَٰٓئِكَ شَرٌّ مَّكَانًا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾، پێشتر لە هۆی هاتنە خوارەوەکەی دا باسمان کرد، کە هەندێك لە خاوەن کتێبەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ، وە دوای ئەوەی لە پێغەمبەری خوایان ﷺ پرسی: ئیمانت بە کێ هەیە؟ ئەویش فەرمووی: بڕوام بە خوا هەیە، وە بەو کتێبانەی کە ناردوونیو بە هەموو پێغەمبەران، گوتیان: هیچ دینێکمان نەبینیوە لە دینی ئێوە خراپتر، جا هەندێك لە توێژەروان دەڵێن: ئەوە وەڵامی ئەو قسەیەیانە: ﴿قُلْ هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ مَثُوبَةً عِندَ ٱللَّهِ﴾، ئایا هەواڵتان پێبدەم دینداریی کێ زۆر خراپە؟! چونکە دین خراپ نیە کە خوا ناردوویەتی، یاخود پێتان بڵێم شوێنکەوتووانی چ دینێك خراپنو، کێ سزای لەلای خوا خراپترە؟ هی کەسێك کە ﴿لَّعَنَهُ ٱللَّهُ﴾، خوا نەفرینی لێکردوون، ﴿وَغَضِبَ عَلَيْهِ﴾، وە لێیان تووڕە بووە، ﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ﴾، وە هەندێکی لێ گێڕاون بە مەیموونو بەراز، ﴿وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ﴾، وە طاغووتیشیان پەرستوە، کە ئەو چوار سیفەتە هەر چواریان لەسەر جوولەکەکان دەچەسپێن.

کەواتە: ئێوە سزاتان لە هەموو خاوەن دینەکانی دیکە قورسترەو، ئێوە لە هەموو کەس خراپترن، چونکە ئەو چوار سیفەتەتان تێدان، خوا لەعنەتی

لێکـــردوون، لێتـــان تووڕەبـــووە، هەنـــدێکتانی کـــردوە بـــە مـــەیموونو بـــەراز، وە طاغووتیشتان پەرستوە، دیارە ئێمە لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیـرە لە سووڕەتی (البقـرة)دا، باسـی چۆنیـــەتی بوونـــە مەیمـــوونو بـــەرازی هەندێـــك لـــە بـــەنی ئیسـرائیلمان کرد، وە کە دەفەرموێ: ﴿ وَعَبَدَ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾، بە چەند قیـرائەتێك، بەچەند شـێوەیەك خوێندراوەتەوە، مەبەست ئەوەیە کە ئەوانە طاغووتیان پەرستوە، طاغووت کێیە؟ دەڵێ: (وكلُّ مَنْ أطاعَ أحدًا فِي مَعْصِيَةِ اللهِ فَقَدْ عَبَدَه)[1]، واتە: هەر کەسێك فەرمانبەریی کەسێك بکات کە سەرپێچیی خوا بێ، ئەوە ئەو کەسەی پەرستوە، دیارە ئەمە زانینی زۆر شتێکی گرنگە، بۆ وێنە: کەسێك فەرمانبەریی حیزبێکی بێدین دەکات، لە شتێکدا کە سەرپێچیی خوای پەروەردگارە، مانای وایە ئەو حیزبەی پەرستوە، وە هەر کەسێك بە قسەی مەلایەك، یان شێخێك، یان سیاسییەك، یان هەر کەسێك بکات، لە شتێکدا کە سەرپێچیی خوایە، مانای وایە بە ئەندازەی ئەوەی بە قسەی دەکات، لە سەرپێچییکردنی خوادا، پەرستوویەتی، چونکە پەرستن یانی چی؟ یانی بۆ ملکەچ بوونو گوێڕایەڵ بوونو بەقسەکردن، طاغووتیش زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: (كُلُّ مَعْبُودٍ سِوَى الله)، هەر پەرستراوێکە جگە لە خوا، بەڵام ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە، (طاغوت: كُلُّ مُطَاعٍ سِوَى الله)، واتە: هەر کەسێك بەقسەی بکرێ، جگە لە خوا، چونکە من پێمـوایە بتو صەنەمو خۆرو ئەستێرەکان، ئەوانە بە طاغووت لە قەڵەم نادرێن، هەرچەندە دەشپەرسترێن، بەڵکو هەر کەسێك خەڵك ملکەچ بکاو، ناچاریان بکاتو، ڕێیەکیان پێشانبدا ناچاریان بکات لەسەری، ئەوە طاغووتە، وە هەر کەسێك فەرمانبەریی بۆ بکرێ بە شێوەیەك ئەو فەرمانبەریی کردنە لەگەڵ شەریعەتی خوادا تێکبگیرێ، ئەوە طاغووتە، طاغووت زیاتر ئەوانەن کە خاوەن ئیرادەن، جا چ ئینسان بێ، چ شەیتان بێ، بەڵام ئەوەی ئیرادەی نەبێ، یاخود ئیرادەی هەبێ، بەڵام پێی خۆشنەبێ مامەڵەی بەو شێوەیەی لەگەڵدا بکرێ، بۆ وێنە: نەصرانییەکان کە عیسا ﵇ دەپەرستن، وە بە کوڕی خوای دەزانن، یاخود هەندێك لەوانەی کە

---

١) التفسير الكبير ج١٢، ص٣٢.

فریشتەکان دەپەرستن، یاخود پێغەمبەرانی دیکە دەپەرستن، ئایا ئەو پەرستراوانە پێیان دەگوترێ طاغووت؟ نەخێر، چونکە خەڵکیان ناچار نەکردوەو، پێیان خۆشنەبووە بەو شێوە ڕەفتاریان لەگەڵدا بکەن.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا جَآءُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلۡكُفۡرِ وَهُمۡ قَدۡ خَرَجُواْ بِهِۦۚ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكۡتُمُونَ ﴾، خوا ﷻ لێرەدا باسی حاڵەتی نیفاق و دووڕوویی و دەغەڵیی دەکات و، بەپێی سیاقەکە دەردەکەوێ، کە زیاتر مەبەست پێی جوولەکەکانە، دەفەرموێ: کاتێك دێن بۆ لاتان دەڵێن: ئیمانمان هێناوە، هەرچەندە بە کوفرەوە هاتبوونە لاتان، وە بە کوفریشەوە چوونەدەر لەلاتان، وە خواش زاناترە بەوەی دەیشارنەوە، کەواتە: جوولەکەکان هەر هەموویان نەیانگوتوە جوولەکەین، بەڵکو هەندێکیان حاڵەتی نیفاقیان بەکارهێناوەو گوتوویانە: ئیمانمان هێناوە، کەچی ڕاستیشیان نەکردوە، وە کاتێك کە هاتوونە خزمەت پێغەمبەر ﷺ هەر کافر بوون، وە کاتێك کە چوونە دەرێش هەر کوفریان پێ بووە، واتە: هیچ لێی بەهرەمەند نەبوون، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ کە بێ تەوفیقیی زۆر شتێکی نەگبەتییەو زۆر موصیبەتە، تەماشا بکەن! ئەوانە لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دابوونە، کە سەراپا نوورو بەرەکەت بووە، ئنجا وەرە لە خزمەتی دابنیشیی و، قورئانت بۆ بخوێنێتەوەو، ئەو ڕەوشتە بەرزو پەسندەو ببینیی و ئەو نوورو بەرەکەتەی هەبێ، کەچی سوودی لێ نەبینیی!! ئەوە بەڕاستی گەورەترین موصیبەتو بەڵایە، کە ئینسان لە خزمەت پێغەمبەر ﷺ دابێ، یان لە خزمەت کەسانێك دابێ کە بە ڕێی پێغەمبەر ﷺ دادەچن، بەڵام لێیان بەهرەمەند نەبێ و، لێیان سوودمەند نەبێ، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكۡتُمُونَ ﴾، وە خوا زاناترە بەوەی کە دەیانشاردەوە، واتە: ئەوەی کە دەیانشاردەوە، چ ئەو کوفرە بووە، چ پیلان بووە، چ هەر شتێکی دیکە بووە، خوای پەنهانزان پێی زانایە، وە لە کاتی پێویستدا پێغەمبەر ﷺ و مسوڵمانانی لێ ئاگادار کردۆتەوە، بۆئەوەی لە پیلان و فێڵەکانیان تووشی زیان نەبن.

**مەسـەلەی شـەشـەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْإِثْمِ وَٱلْعُدْوَٰنِ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، زۆریان دەبینی خێرایی دەکەن لە گوناحو لە دەستدرێژییو لە حەرام خۆرییدا، ئەوە خراپترین کردەوەیە کە دەیکەن،

لێرەدا دیسان دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَىٰ كَثِيرًا ﴾، نافەرموێ: هەموویان، بۆچی؟ چونکە دیارە هەندێك لە جوولەکەکان بە پێی دینی خۆیان بەڕێوەچوونو گوناهیان نەکردوە، دەستدرێژییان نەکردووە، حەرامیشیان نەخواردوە، خوای دادگەر ئێمە فێری ئینصاف دەکات، دەربارەی جوولەکەکان نافەرموێ: هەموویان (كُلُّهم) دەفەرموێ: ( كَثِيرًا )، زۆریان، دیارە هەیانبووە بەپێی دینەکەی بەڕێوەچووەو گوناهیشی نەکردوە، وە بەپێی دینەکەی خۆی دەستدرێژیشی نەکردووە، حەرامیشی نەخواردوە، بەلاّم دیارە ئەوانی دیکە بەپێی دینەکەی خۆیشیان دەستدرێژییان کردووە حەرامیشیان خواردوە.

خوای کاربەجێ، لێرەدا سێ شتی باسکردوون: (الإِثم، والعُدوَان، وأكل السُّحت).

(الإِثم)، بریتیە لەو گوناهانەی ئینسان لە نێوان خۆیو خوادا دەیانکات.

(العُدوَان)، بریتیە لەو گوناهانەی کە ئینسان لە نێوان خۆیو خەڵکدا دەیانکات.

(أكل السُّحت)، بریتیە لەو گوناهانەی کە ئینسان هەم لە نێوان خۆیو خوادا دەیانکات، وە هەم لە نێوان خۆیو خەڵکدا، بەو ئیعتیبارەی حەرامێك دەخوات کە خوا قەدەغەی کردوە، ئەوە لە نێوان خۆیو خوادا دایە، وە بەو ئیعتیبارەی کە مەگەر چۆن دەنا حەرام هەقی خەڵکە، لە نێوان خۆیو خەڵك دایە کەواتە: ئەوەی سێیەم (إثم)و (عدوان)یش کۆ دەکاتەوە، بۆیە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، ئەوە خراپترین کردەوەیان بوو کە دەیانکرد، واتە: حەرام خواردنەکە، یاخود هەر سێ جۆرە گوناهەکە.

**مەسەلەی حەوتەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴾، مەبەست لە ئایەتی پێشوو عەوامەكانی ئەهلی كیتاب بوو، بەڵام ئەم ئایەتە كە لێرەدا قسەی لێدەكەین، مەبەست پێی زانایانیانن، قورئان هەر وشەیەكی دەبێ لێی وردبیەوە، ئەو وشەیە بۆچی لەم وشەیە جیایە؟ بۆچی لەوێ پیتێك زیادە؟ هەڵبەتە هەمووی نهێنی لەبن دایە، هەرچەندە ئێمە كەمتر لایەنە ڕەوانبێژییەكانی زمانی عەرەبی باس دەكەین، چونكە ئەم تەفسیرە، بۆ كوردزمانان دەكەین و ئەوانیش كەمیان لە زمانی عەرەبیی دا پسپۆڕو شارەزان، وە من خۆشم ئیددیعای ئەوە ناكەم كە زۆر پسپۆڕو شارەزام لە زمانی عەرەبیی و لایەنی ڕەوانبێژییەكەی دا، بەتایبەتی قورئان كە زۆر وردەكاریی تێدایە، هەر كام لە: (زمخشري) و (بیضاوي) و (نسفي) و (فخرالدین الرازي) زۆر وردەكارییان لەو بوارەدا باسكردوە، ئێمەش هەر نەبێ دەتوانین لەوانەوە نەقڵ بكەین، بەڵام دەزانم خوێنەری كورد كەمتر لێی بەهرەمەند دەبێ، بەڵام ئەوەی كە پێویستەو چاك تێگەیشتنی ئایەتەكان دەیخوازێ هەر دەبێ ئاماژەی پێ بدەین، خوای بەرز باسی عەوامی جوولەكەكانی كرد، ئنجا باسی زاناكانیان دەكات و دەفەرموێ: ﴿ لَوْلَا يَنْهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ ٱلْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ ٱلسُّحْتَ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴾، واتە: دەبووایە ڕەببانییەكانیان و ئەحبارییان (ڕەببانییەكانیان، واتە: مشوورخۆرو كاربەدەستەكانیان، ئەحبارەكانیش واتە: زاناكانیان) ڕێیان لێ گرتبان لە قسەی خراپ و خواردنی حەرام، وە ئەوە (بێ هەڵوێستییان لە بەرانبەر عەوامەكانیاندا، كە لە قسەی گوناح خواردنی حەرام نایان سڵەمێننەوەو ئامۆژگارییان ناكەن)، خراپترین شتە كە زۆر بە كارامەیی دەیكەن، كەچی بەنسبەت عەوامەكان فەرمووی: ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾، بەڵام لێرەدا دەفەرموێ: ﴿لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴾، چونكە زانایان و مشوورخۆران وەختێك شتێك دەكەن، زۆر بە وەستایی و كارامەیی و لێزانیی دەیكەن، خەڵكی

عەوام هەروا لاسەرلایی دەیکات، بەڵام ئەوان زۆر بە وەستایی‌و لێزانیی‌و کارامەیی دەیکەن، چونکە ئێمە لە زمانی عەرەبیدا سێ وشەمان هەن (فعل، عمل، صُنع):

١- (فعل)، بریتیە لە هەر کردوەیەك بکرێ، با نیەتیشی لەگەڵ دانەبێ، کە پاڵدەدرێتە لای بێ ژیان‌و ئاژەڵ‌و زیندەوەرانیش.

٢- (عمل)، بریتیە لەوەی نیەتی لەگەڵ دابێ.

٣- (صُنع)، بریتیە لەوەی نیەتی لەگەڵ دابێ‌و کارامەیی‌و دەست ڕەنگینیشی لەگەڵ دابێ.

ئنجا وشەی (لَوْلا)، لە زمانی عەرەبیدا ئەگەر بچێتە سەر کرداری ڕابردوو (الفعل الماضي) ئەوە مانای سەرزەنشتکردن (توبيخ) دەگەیەنێ، وەك دەفەرموێ: ﴿لَّوۡلَا جَآءُو عَلَيۡهِ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ ﴿١٣﴾﴾النور، خوا سەرزەنشتیان دەکات کە بۆچی چوار شاهێدیان نەهێنان! بەڵام ئەگەر بچێتە سەر (الفعل المضارع) ئەوە مانای هاندان (تحضيض) دەگەیەنێ، ﴿لَوۡلَا يَنۡهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ﴾، یانی: دەبووایە مشوورخۆرو زانایانیان لە قسەی گوناح‌و خواردنی حەرامیان گێڕابانەوە..

کە دەفەرموێ: ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ﴾، واتە: خراپترین کار هەڵوێستی مشوورخۆرو زانایانێکە، کە لە خراپەیەکەوە ڕادەمێنن، لەنێو خەڵکدا دەکرێ، وە خەڵك لە خراپە ناگێڕنەوەو ئامۆژگارییان ناکەن.

**مەسەلەی هەشتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْۘ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُۚ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۚ وَأَلۡقَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا ٱللَّهُۚ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗاۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ

ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴾، جوولەکەکان بێرێزیی و بێئەدەبیی گەورە گەورەیان کردوون لە بەرانبەر خوادا، وەك لە سووڕەتی (آل عمران)یشدا پێشتر باسمان کرد، خوا دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُۘ... ﴿١٨١﴾ ﴾، واتە: خوا قسەی ئەوانەی بیست کە گوتیان: خوا هەژارەو ئێمە دەوڵەمەندین، جا ئەوە دەگونجێ بە تەوس و توانجەوە گوتبێتیان، وە دەشگونجێ هەر قەناعەتیان وا بووبێ، گرنگ ئەوەیە لێرەدا ئەو قسەیان لێ نەقڵ دەکات و دەفەرموێ: جوولەکەکان گوتیان: خوا دەستی بەستراوە (غُلّ) واتە: کۆت و پێوەند، ئەوەی کە دەستی ئینسانی پێ دەبەسترێ، یانی: وەك چۆن کەسێك دەستی دەبەسترێ، وە ناتوانێ دەستی بخاتە گیرفانی، خوای پەروەردگاریش نابەخشێ، مەبەستیان ئەوەیە!

جا ڕەنگە ویستبێتیان ڕەخنە بگرن لە ئیسلام و مسوڵمانان و بە توانجەوە ئەو قسەیان کردبێ، واتە: ئێوە کە دەڵێن: خوا دەفەرموێ: ﴿... وَأَقۡرَضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا يُضَٰعَفُ لَهُمۡ وَلَهُمۡ أَجۡرٞ كَرِيمٞ ﴿١٨﴾ ﴾، واتە: قەرزی باش لەگەڵ خوادا بکەن، دەیانگوت: خوا بۆ داوای قەرز لە ئێمە دەکات، بۆخۆی نابەخشێ؟ یاخود هەر قەناعەتیان وابووە، گرنگ ئەوەیە خوا دەفەرموێ: ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ ﴾، جوولەکەکان گوتیان: خوا دەستی بەستراوە! دەستیان بەسترێ، وە نەفرینیان لێ بێ، بەهۆی ئەو قسەوە کە کردیان.

خوای پەروەردگار دەربارەی بەخشین لە سووڕەتی (الإسراء) دا دەفەرموێ:

﴿ وَلَا تَجۡعَلۡ يَدَكَ مَغۡلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبۡسُطۡهَا كُلَّ ٱلۡبَسۡطِ فَتَقۡعُدَ مَلُومٗا مَّحۡسُورًا ﴿٢٩﴾ ﴾الإسراء، واتە: دەستت مەنووقێنە بە ملتیەوەی بنووسێنی، (کەسێك بیانەوێ شتێکی لێ بستێنن، دەستی دەباتە بن گەردنی تا هیچی

لێنەستێنن)، وە واشی لێ مەکە هیچی پێوە بەندنەبێ، واباشە شتێکی پێوە بەندببێو شتێکیش ببەخشی، حاڵەتی سەخاوەت ئەوەیە، لە نێوان زێدەڕۆیی‌و ڕەزیلییدا بی، وە لە سووڕەتی (الفرقان)دا دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامًا ﴿٦٧﴾ ﴾، ئنجا خوا عليه السلام لەم ئایەتەدا دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُ ﴾، بەڵکو خوا هەر دوو دەستی کراوەن، چۆنی بوێ وا دەبەخشێ، لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (فلان بَسَطَ يده)، یانی: فڵان کەس سەخاوەتی نواند، بەخشی، بەڵام ئەگەر بگوترێ: (قَبضَ يَدَهُ)، واتە: نەیبەخشی‌و دەستی نووقاند، لە زمانی عەرەبی دا ئەو جۆرە تەعبیرانە بەکاردێن (مبسوطة اليد)، ئەگەر دەستێکی کراوەبێ‌و ببەخشێ، ئەدی ئەگەر بە دوو دەستان؟ خوا دەفەرموێ: ﴿ بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ ﴾، مانای ئەوەیە بەدوو دەستان ببەخشێ، هەر زۆر سەخییە، خوای پەروەردگار ئەوپەڕی کەرەم‌و بەزەیی هەیە، نەك مەبەستی ئەوەبێ دوو دەستی خوای پەروەردگار بێنیە بەرچاوت! لێرەدا نەویستراوە باسی سیفەتێکی خوا بکرێ، کە دوو دەستی خوان، بۆچی؟ چونکە: ئەوان ئینکاریی دەستی خوایان نەکردوە، بەڵکو ئەوان ئینکاریی سەخاوەت‌و بەخشش‌و کەرەمی خوایان کردوە، خوای بەرزیش دەیەوێ ئیسپاتی بەخشندەیی خۆی بکات، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا ئەو تەعبیرە بەکاردێ، ئەگەر بە کەسێك بڵێین زۆر بەخشندەیە دەڵێن بە هەردوو دەستان دەبەخشێ.

# ئاماژەیەک بۆ ڕاست تێگەیشتنی ئەو وشانەی وەسفی خوایان پێ دەکرێ

دیاره من له كتێبی (ئیمانو عەقیدەی ئیسلامیی) له بەرگی (٣)دا، به درێژیی باسی ناوو سیفەتەكانی خوای بێوێنەم كردوه، بەڵام لەو سیاقانەدا كه خوای زاناو شارەزا وشەیەك بەكاردێنێ، ئێمه دەبێ تەماشا بكەین، بزانین خوا باسی سیفەتێكی خۆی دەكات، یاخود دەیەوێ تەعبیری پێ بكات له مانایەكی دیكه،

بۆ وێنه: كه له سوورەتی (القلم)دا دەفەرموێ: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ ﴿٤٢﴾﴾، واته: ئەو ڕۆژەی كه لاق هەڵدەكرێ، لێرەدا هەندێ له زانایان گوتوویانه: خوا (ساق)ی هەیه، بەڵام لێرەدا خوا (ساق)ی پاڵنەداوەته لای خۆی، بەڵكو ئەوە تەعبیرێكی ڕەمزییه عەرەب بەكاری دێنن، له كوردەواریی خۆشماندا دەڵێن: ڕۆژی بارانان هەر قوڕە، یان ئەگەر چوویه بوارێ دەبێ لاق هەڵبكەی، یان لەكاتی تینییێ دا دەڵێ: خۆت گورج بكەو لاق هەڵكه، ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ﴾، واته: ئەو ڕۆژەی كه خەڵك لاق هەڵدەكات، بۆ ئەوەی داوێنی شۆڕنەبێتەوە كه له پچكان بئاڵقێو ڕێی لێ بگرێ بۆ ڕاكردن، دیاره ئێمه لەسەر بۆچوونی پێشینی چاك (السلف الصالح)ین، كه دەڵێن سیفەتەكانی خوا وەك خوا فەرموونی، ئاوا دەیانڵێین..

دیاره له قورئاندا خوای پەروەردگار چەند وشەیەكی بەكارهێناون بۆ وەسفی خۆی، وەك: (يَد، عَيْن، قَبْضَة، يَمين، ساق، وجه) هەروەها خوا وەسفی خۆیشی به چەند كردەوەیەك كردوه، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلْمَلَكُ صَفًّا صَفًّا ﴿٢٢﴾﴾الفجر، واته: وە پەروەردگارت هات، وە فریشتەكانیش ڕیز ڕیز، ... هتد.

ئـنجا زانـایان بوونەتـە دوو بـەش، لە بواری تێگـەیشـتنیـاندا بۆ ئەو وشـانە:

یەکـەم: دەڵـێن: لەبەرئـەوەی ئـەو وشـانە مانـا ڕواڵـەتییەکەیان لەگـەڵ خـوادا ناگونجـێ، دەبـێ بـە شـێوەیەك مانـا بکرێن کە خـوا بـە ئینسـان نەچوێنرێ، بۆچـی؟ گوتوویـانە: چونکە (يَـد) واتـە: دەسـت، (عَـيْن) واتـە: چـاو، (قَبْضَـة) واتـە: چـنگ، (يَمـين) واتـە: دەسـتی ڕاسـت، وە (سـاق)، واتـە: لاق، وە هـەموو ئەوانـەش ئەندامێکـن لـە پێکهـاتەی جەسـتەی ئینسـان، بۆیـە کـە دەگوتـرێ: دەسـتی خـوا، لەبەرئـەوەی عەقـڵی ئینسـان تـەنیا دەرکی شـتە مادديیـەکان دەکات، ڕەنگـە بیـری بـۆ ئـەوە بچـێ کە دەستی خوا وەك دەستی ئەو بێ! کە ئەوەش وانیـە، چونکە وەك یەکێك لـە زانایان دەڵـێ: (وَكـلُّ مَـا جَـرَى بِبَالِـكَ، فَـاللّهُ بِخِـلاف ذَلِـكَ)، واتـە: هەرچـی بـە مێشـکت دادێ، خـوا پێچـەوانەی ئەوەیـە، وە هەروەهـا خـوای بێوێنـە بۆخـۆی ئـەوەی بڕیوەتـەوە، وەك لـە سـوورەتی (الشـورى)دا فەرموویـەتی: ﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ١١﴾، واتـە: هیچ شـتێك وەك وێنـەی خـوا ﷻ نیـە.

جا ئەوانـە دەڵێن: دەبـێ ئـەو وشـانە بـە شێوەیەك مانـا بکرێن، کـە لەگەڵ پاکـێتیی‌و بـەرزێتی خـوای بێوێنـەو بـێ هاوتـادا بگونجـێن، بۆیـە دێـن وشـەکان تەئویـل دەکـەن، بـۆ وێنـە: دەڵێن: (يَـد)، واتـە: دەسـتەڵات، یـان نیعمـەت، یـانی چاکـەی خـوا بەسـەر چاکـەی ئەوانـەوە، وە دەربـارەی وشـەی: (عَـيْن) دەڵێن: دەبـێ تەماشـا بکـەین، بـزانین ئایـا بـە مانـای چـاودێریی دێ، یـان بـە مانـای ئاگـالێبوون‌و پاراسـتن دێ، بـۆ وێنـە: کـە دەفـەرموێ: ﴿فَإِنَّكَ بِأَعۡيُنِنَاۖ ٤٨﴾ الطـور، واتە: تۆ بە چاوەکانی ئێمـەی، واتـە: تـۆ لـە ژێـر چاودێریـی ئێمـە دای‌و ئێمـە ئاگـامان لە تۆیـە، یـان کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلِتُصۡنَعَ عَلَىٰ عَيۡنِيٓ ٣٩﴾ طـه، واتـە: بۆئـەوەی لەسەر چـاوی مـن دروسـت بکـرێی، واتـە: لـە ژێـر چاودێریـی منـدا بیـت، هەروەهـا دەربـارەی وشـەی: (وَجـه) دەڵـێن: مەبەسـت پێـی زاتـی خـوای بێوێنـەیە، یان مەبەسـت ڕەزامەنـدیی خـوایە.

دووەم: کە زۆربەی زانایانی پێشـینن، دەڵێن: ئێمە ئەو وشانە بەکاردێنین، وە ماناکەشیان دەزانین، بەڵام چۆنیەتی ئەو مانایانە بۆ خوای زاناو شارەزا دەگێڕینەوە، وە خوای پەروەردگار ئەو وشانەی بۆ هەندێ سیفەتی خۆی بەکارهێناون، وەك پرسیار کراوە لەو بارەوە لە (مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ) دەربارەی وشەی: (الإستواء)، (قيلَ لَهُ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾ طـه، كَيْفَ اسْتَوَى؟ فَقَالَ مَالِكٌ: الإِسْتِوَاءُ مَعْلُومٌ وَالْكَيْفُ مَجْهُولٌ، وَالإِيمَانُ بِهِ وَاجِبٌ، وَالسُّؤَالُ عَنْهُ بِدْعَةٌ)، واتە: گوترا: ئەی بابی عەبدوڵڵا کە خوا دەفەرموێ: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ عَلَى ٱلۡعَرۡشِ ٱسۡتَوَىٰ ۝٥﴾ طـه، چۆن (اسْتَوَى)ی کردووە؟ مالیکیش گوتی: (إسْتَوَاء) ماناکەی دیارە، زانراوە، (علا، إرتفع، استقر) چۆنیەتییەکەی بۆ خوا نەزانراوە، (نازانین خوا چۆن چوّتە سەر عەرش! چونکە کاتێك خوا هەبووە، هیچ شتێك نەبووە، نە کورسی و نە عەرش، وە خوا ﷻ پێویستی بە غەیری خۆی نییە، هەڵیبگرێ)، وە ئیمان بوون بەوەی کە خوا ﷻ چوّتە سەر عەرش، پێویستەو، پرسیارکردنیش لەوبارەوە شتێکی داهێنراوە.

مەبەستی ئەوە بووە کە پێشتر پرسیاریان لەوە نەکردووە، وە ڕەنگە مالیك یەکەم کەس بووبێ ئەو پرسیارەی لێکراوە.

ئنجا ئەوەی من پێی گەیشتووم، وەك لە کتێبی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی) لە بەرگی سێیەمدا، کە باسی ناووسیفەتەکانی خوا دەکات، زۆر بە تەفصیل باسم کردووە، پوختەکەی ئەوەیە:

لەڕاستیدا کاتێك خوای بێهاوتا باسی سیفەتێکی خۆیمان بۆ دەکات، یان باسی ناوێکی خۆیمان بۆ دەکات کە دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡأَسۡمَآءُ ٱلۡحُسۡنَىٰ فَٱدۡعُوهُ بِهَاۖ وَذَرُواْ ٱلَّذِينَ يُلۡحِدُونَ فِيٓ أَسۡمَٰٓئِهِۦۚ سَيُجۡزَوۡنَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ۝١٨٠﴾ الأعراف، واتە: خوا ناوە هەرە چاکەکانی هەن، بە ناوە هەرە چاکەکانی لێی بپاڕێنەوە، یان دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٦٠﴾ النحل، واتە: خوا سیفەتی هەرە بەرزی

هەیە، هەرچی سیفەتی هەرە باش‌و ناوی بەرزە هەیەتی، جا ئێمە کاتێك ناووسیفەتەکانی خوا دەبینین لە قورئاندا، بۆ وێنە کە دەفەرموێ: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤﴾النساء، ﴿هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١﴾الإسراء، ﴿وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ١٣٧﴾البقرة، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ٥٤﴾البقرة، ﴿إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٩٨﴾يوسف، ﴿وَإِنَّ ٱللَّهَ لَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ٦٢﴾ آل عمران، ...هتد، دیارە سیفەتەکانی خوای بێوێنە لە قەدەر خوان، بەڵام ئایا فەرمایشتکردنی خوا چۆنە؟ ئێمە نازانین، ئایا بینینی خوا چۆنە؟ نازانین، ئایا بیستنی خوا چۆنە؟ نازانین، بەڵام تەواوی سیفەتەکانی خوا بۆ خوا وەك خۆی دادەنێین بەنسبەت ئەو وشانەوە، کە دیارە خوای بەرزو مەزن باسی سیفەتەکانی خۆییان پێدەکات، وە بەنسبەت ئەو وشانەی دیکەشەوە کە ڕواڵەتەکەیان ناوە بۆ ئەندام (عضو)ێك، دەبێ تەماشای سیاقی ئایەتەکان بکەین، بۆئەوەی بزانین خوای کاربەجێ بۆچی بەکاری هێناون؟ ئایا مەبەستی پێیان باسکردنی سیفەتەکانی خۆی بووە، یان مەبەستێکی دیکە دەگەیەنن بۆ وێنە: وشەی: ڕوو (وَجـه)، هەم خوا لە قورئاندا بەکاری هێناوە، هەم لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە، فەرموویەتی: ﴿حِجَابُهُ النُّورُ، لَوْ كَشَفَهُ لأَحْرَقَتْ سُبُحَاتُ وَجْهِهِ مَا انْتَهَى إِلَيْهِ بَصَرُهُ مِنْ خَلْقِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٦٤٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٤٤)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (١٩٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٢٦٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ في الأوسط برقم: (٦٠٢٥) عَنْ أبي موسى الأشعري}، واتە: (خوا) پەردەکەی ڕووناکییە، ئەگەر پەردەکەی لابدات، پڕشنگی ڕووی هەتا ئەوپەڕی سنووری بینینی لە دروستکراوەکانی (کە بێگومان هیچ شتێك لە دروستکراوەکان نیە خوا نەیبینێ‌و لە حوکمی بینینی دا نەبێ، کەواتە: هەموو شتێك) دەسووتێنێ. واتە: نوور حیجابێکە ڕووی پەروەردگاری شاردۆتەوە، کەواتە: (وَجْه) سیفەتێکی خوایە، بەڵام ڕوو (وجُه)ێك کە بۆ خوا شایستەیە، وە کە باسی هەر سیفەتێك دەکەین، دەبێ بڵێین: وەك بۆ خوا شایستەیە، چونکە ئەو وشانە لە بەکارهێنانی ئێمەدا مانای ئەندام دەگەیەنن، واتە: تەماشا دەکەین بزانین ئایا مەبەست ئەوەیە خوا باسی سیفەتێکی خۆی بکات؟ ئەو کات دەڵێین: خوای پەروەردگار

ڕووی هەیە، دەستی هەیە، بەڵام بە شێوەیەك كە شایستەیەتی، بەڵام ئەگەر لەو سیاقەدا وا نەهاتە بەرچاو، كە خوا مەبەستی بێ باسی سیفەتێكی خۆی بكات، بەڵكو مەبەستی ئەوە بێ مانایەكی دیكە بگەیەنێ، ئەو كاتە پێویستیمان بەوەنیە بڵێین: خوا لێرە باسی (دەست)ی خۆی دەكات، یان باسی (چاو)ی خۆی دەكات، یان باسی (ڕوو)ی خۆی دەكات، ... هتد، بۆ وێنە: لێرەدا خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ ٱلْيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغْلُولَةٌ ﴾، واتە: جوولەكەكان گوتیان: دەستی خوا نووقاوە، قووچاوە، كەسێك نەیەوێ شتێك ببەخشێ، دەستی دێنێتەوە یەك، ئنجا (مَغْلُولَة) یانی: دەستی كۆت كراوە، زنجیری تێكراوە، چونكە دەست كە كۆتی تێكرا دەنووقێ، لێرەدا زۆر ڕوونە كە جوولەكەكان مەبەستیان ئەوەبووە كە خوا نابەخشێ، یان وەك پێشتریش باسمان كرد، مەبەستیان توانج بووە لە مسوڵمانان، یان مەبەستێكی دیكەیان هەبووە، خواش لە وەڵامی ئەو بێئەدەبییەیان دا دەفەرموێ: ﴿ غُلَّتْ أَيْدِيهِمْ وَلُعِنُوا۟ بِمَا قَالُوا۟ ۘ بَلْ يَدَاهُ مَبْسُوطَتَانِ ﴾ دەستیان ببەسترێ و نەفرینیان لێ بكرێ بەوەی گوتیان، بەڵكو هەردوو دەستی كراوەن، واتە: خوا زۆر زۆر بەخشندەیە، چونكە ئەوان مەبەستیان ئەوە نەبووە بڵێن: خوا دەستی هەیە، دەستەكەی قووچاوە، بەڵكو مەبەستیان ئەوەبووە بڵێن: خوا نابەخشێت، خوای پەروەردگاریش وەڵامی ئەو قسەو تۆمەتەی ئەوان دەداتەوەو دەفەرموێ: نەخێر! دەستی ئەوان ببەسترێ و لەعنەتیان لێبكرێ، بەڵكو هەردوو دەستی خوا كراوەن، ﴿ يُنفِقُ كَيْفَ يَشَآءُ ﴾، چۆنی بوێ دەیبەخشێ، كەواتە: مەبەست لە دەستكرانەوەكەی ئەوەنیە كە خوا لێرەدا باسی هەردوو دەستی خۆی بكات، بەڵكو مەبەست ئەوەیە باسی بەخشندەیی بێسنووری خۆی بكات، بۆیە لێرەدا پێویست ناكات لێی بكۆڵینەوە بزانین: دەستی خوا چییەو چۆنە؟ هەروەها لە هەموو ئەو سیاقانەی دیكەشدا ئەگەر بۆمان دەركەوت خوا نایەوێ باسی سیفەتێكی خۆی بكات، بەڵكو دەیەوێ باسی مەبەستێكی دیكە بكات، بەڵام بەو وشەیە بیگەیەنێ، چونكە ئێمە وا حاڵی دەبین، پێویست ناكات و ڕاست و ڕەواش نیە، ئەو وشەیە بە سیفەتێكی خوا بزانین، بۆ وێنە كە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يُبَايِعُونَكَ إِنَّمَا يُبَايِعُونَ ٱللَّهَ يَدُ ٱللَّهِ

﴿فَوْقَ أَيْدِيهِمْ ۚ فَمَن نَّكَثَ فَإِنَّمَا يَنكُثُ عَلَىٰ نَفْسِهِ ۖ وَمَنْ أَوْفَىٰ بِمَا عَاهَدَ عَلَيْهُ اللَّهَ فَسَيُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٠﴾﴾ الفتح، واتە: بێگومان ئەوانەی پەیمان لەگەڵ تۆ دەبەستن (ئەی پێغەمبەر ﷺ) ئەوە پەیمان لەگەڵ خوا دەبەستن، دەستی خوا بەسەر دەستی وانەوەیە، لێرەدا لە سیاقەکە وادەردەکەوێ کە خوا مەبەستی نیە باسی دەستی خۆی بکات، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئەوانەی دێن پەیمان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا دەبەستن‌و دەستیان دەخەنە نێو دەستی پێغەمبەری خوا ﷺ، بابزانن ئەوە دەستی خوا لەسەردەستی ئەوانە، واتە: وەك ئەوە وایە پەیمانیان لەگەڵ خوا بەستبێ، یان بۆ وێنە، کە دەفەرموێ: ﴿وَالْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَالسَّمَاوَاتُ مَطْوِيَّاتٌ بِيَمِينِهِ ۚ سُبْحَانَهُ وَتَعَالَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٦٧﴾﴾ الزمر، واتە: لە ڕۆژی دوایی دا خوا هەموو زەوی لە چنگ دەگرێ، وە ئاسمانەکان لە بن باڵی ڕاستی دا دەپێچێتەوەو، لە بن هەنگڵی ڕاستیان دەنێ، لێرەدا ئێمە دەبێ تەماشا بکەین، بزانین ئایا سیاقەکەی وا لێ دەفامرێتەوە کە خوا مەبەستی بێ باسی چنگ (قبضة)ی خۆی بکات، یان باسی دەستی ڕاست (یمین)ی خۆی بکات؟ ئەگەر مەبەستی ئەوەبێ دەڵێین: ئەو دووانە دوو سیفەتی شایستەی خوان، بەڵام کە لێرەدا تەماشا دەکەین، دەبینین خوای کاربەجێ مەبەستی ئەوەیە شتێك لە مێشکی ئێمە نزیك بکاتەوە، یانی: وەك چۆن ئێوە شتێك لە چنگتان دەگرن، یان وەك چۆن تۆمارێك دەپێچنەوەو لە بن هەنگڵتان هەڵیدەگرن، چەندە بۆتان ئاسانە؟! خوای پەروەردگاریش مەرزەم کردنی زەوی‌و پێچانەوەی ئاسمانەکانی ئاوا بۆ ئاسانن، ئنجا مادام ئایەتەکە بە ڕوونیی ئەوە بگەیەنێ، پێویست ناکات بڵێین: چنگ (قبضة)و دەستی ڕاست (یمین) دوو سیفەتی خوان، بەڵکو دەڵێین: ئەوە تەعبیرێکە خوای زاناو شارەزا لەقەدەر عەقڵی ئێمە بەکاری هێناوە، یاخود بۆ وێنە کە دەفەرموێ: ﴿فَإِنَّكَ بِأَعْيُنِنَا ﴿٤٨﴾﴾ الطور، واتە: تۆ بە چاوەکانی ئێمەی، واتە: تۆ لەژێر چاودێریی ئێمە دای، یان کە بە مووسا دەفەرموێ: ﴿وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِي ﴿٣٩﴾﴾ طه، واتە: بۆ ئەوەی لەسەر چاوی من دروست بکرێی، لەسەر چاوی من پێبگەیەنرێی، ئاشکرایە کە لەسەر چاوی خوا

پێناگەیەنرێ، بەڵكو واتە: لەژێر چاودێریی مندا بی، جا وەك گوتم دەبێ سەرنجی ئەو سیاقە بدرێ كە ئەو ئایەتەی تێدا هاتوە، ئەگەرنا منیش ئەو ڕایەم پێ ڕاستە كە زانایانی سەلەف گوتوویانە: (أَمَرّوها كَمَا جَاءَتْ) ئەو وشانە تێپەڕێنن، وەك چۆن خۆیان هاتوون، یانی: ماناكەیان دەزانین، بەڵام چۆنیەتییەكەیان نازانینو حەواڵەی خوای بێهاوتای دەكەین.

ئنجا بۆ زانیارییتان هەندێ وشە هەن، هەموو زانایان یەكدەنگن كە دەبێ تەئویل بكرێن، بۆ وێنە ئەم ڕستەیە كە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ۝٤﴾ الحدید، واتە: وە ئەو (خوا) لەگەڵتانە لە هەر شوێنێك بن، زانایان دەڵێن: دەبێ بگوترێ: (بِعِلْمِهِ وَقُدرتِهِ)، نابێ بڵێی: ئێستا خوا لێرەیە، بۆچی؟ چونكە ئەوە دژ دەوەستێت لەگەڵ فەرمایشتی خوادا كە دەفەرموێ: ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝٥﴾ طـه، واتە: خوا لەسەر عەرشە، ئنجا زانایانی ئیسلام دەڵێن: (إِنَّ اللهَ بَائِنٌ عَنْ خَلْقِهِ) خوا لە دەرەوەی دروستكراوەكانی خۆیەتی، (وَهُوَ مُسْتَوٍ عَلَى عَرْشِهِ) وە ئەگەر لەسەر عەرشی خۆیەتی، واتە: خوا لە دەرەوەی ئاسمانەكانو زەوییە، ئنجا مادام ئێمە ئەوە دەزانین كەواتە: كە دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾، ناگونجێ خوا لێرەش بێ لەگەڵمانو، لە هەمان كاتیشدا لەسەر عەرشی خۆی بێ، بەڵكو دەبێ بڵێین: خوا لەگەڵمانە بە زانیاریی، بە دەسەڵاتی، بە ڕەحمەتی، بە حیكمەتی، بە ئیرادەی، بە هەموو سیفەتەكانی لە هەر شوێنێك بین لەگەڵمانە، نەك بە زاتی خۆی لەگەڵمان بێ[1]!! بۆیە ئیمام ئەحمەدو سەرجەم زانایان دەڵێن: دەبێ ئەو ئایەتە

---

١) با بۆ وێنە سەرنجی قسەی هەندێك لە زانایان بدەین لەبارەی تەفسیركردنی ئەم ئایەتەوە:

١- قال ابن أبي حاتم في تفسیره.... عن ابن عباس في قوله ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ قال: هويم (العرش و علمه، سنده حسن) مجموع الفتاوى لابن تيمية، ج٥، ص٤٨٥ - ٤٨٦.

٢- قال ابن أبي حاتم في تفسيره.... عن مقاتل بن حيان: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ يعني: بقدرته وسلطانه و علمه؛ ﴿مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ مجموع الفتاوى، ج٥، ص٤٩٧ - ٤٩٨.

٣- ابن كثير: ﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ ...﴾ أي رقيب عليكم شهيد على أعمالكم.. المصباح المنير، ص:١٣٦٣

تـەئویل بکـرێ، دیـارە هەنـدێك لەوانـەی کـە خۆیـان بـە مەشـرەب سـەلەفیی ناودەبەن، پێیان وایە کە تەئویل کردن لە هیچ کاتێکدا دروست نیە، کە ئـەوە وانیـە، چونکـە زانایـانی پێشـین هەنـدێ شـتیان تـەئویل کـردووەو هەنـدێك شـتیشـیان تـەئویل نـەکردوە، پاشـان دەشـگونجێ بڵێین: ئـەوە هـەر تەئویلـیش نیـە، چونکـە وشەیەك کە لە زمانی عەرەبیدا مانای مـەجازیی هەیەو مانای حـەقیقی هەیـە، بـۆ وێنـە: ئێسـتا ئێمـە لێرە دانیشـتووین، ئەگـەر بڵـێم: ئـەوە شـێرەکە هـات (جَاءَ الأَسَدُ)، کـەس گومـانی وایـە دڕندەیـەك بـوێ؟ بێگومـان نـەخێـر، چـونکە دەزانـن مەبەستم پیـاوێکی ئازایـە، کـە وەك شێر وایـە، یان ئەگـەر بڵـێم: ڕێوییەکـە هـات، دەزانـن مەبەسـت پیـاوێکی فێڵبـازە، ... هتـد، ئنجا ئێمـە بـەپێی سـیاقەکان بۆمـان دەردەکـەوێ کـە ئـەو وشـەیە ماناکـەی حەقیقـییە یـان مەجـازیی، ئەوکـاتە هـیچ پێویسـت ناکـات بڵـێین: تەئویلـیش.

وەك گـوتم مـن لـە بـەرگی سـێیەمی کتێبـی: (ئیمـانو عەقیـدەی ئیسـلامیی)دا بـە درێـژیی باسـی ناوو سـیفەتەکانی خـوام کـردوە، کە لێـرەدا جێی نابێتـەوە.

**مەسـەلەی <u>نۆیـەم</u>:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ﴾، وە زۆریـان ئـەوەی لـە پەروەردگـارەوە بـۆت دابەزێـنراوە، یاخـی بوونو کوفریـان تێـدا زیاد دەکات، یەکێك بۆی هەیـە بپرسـێ: وەحی خـواو کتێبـی خـوا چۆن دەبێتە مایەی زیادبوونی یاخیبوونو کوفر لـە ئینسـاندا؟ ئـەم پرسـیارە دوو وەڵامـی هـەن:

١/ هـەر کاتێـك ئایەتێـك دێ، ئەوانـەی بـڕوای پێنـاهێنن، مانـای وایـە زیـاتر سـەرپێچیی دەکـەن، وە کـوفرێکی دیکەشـیان تێـدا زیـاد دەبـێ، بـۆ وێنـە: خـوای پەروەردگـار (٦٢٣٦) ئایـەتی دابەزانـدوە، کەسـێك ئیمـان بـە یـەك ئایـەت نەهێنـێ کوفری کـردوە، بـەڵام ئیمـان بـە شـەش هـەزار ئایـەت نەهێنـێ، یـانی شـەش هـەزار کـوفری کـردوە، وە هـەروەها، هـەتا ئایـەتی خـوا زیـاتر دابـەزنو ئـەوانیش ئیمـان نەهێنـن، مانـای وایـە کوفریـان زیـاد دەبـێ، وە هـەتا ئایـەتی خـوا دابـەزنو ئەوانیش پێوە پابەند نەبن، سـەرپێچیی تێیـاندا زیـاتر دەبـێ.

٢/ هەتا ئایەت دابەزێو قورئان زیاتر بێتە خوار، ئەوانیش کینەو حەسوودییو بوغزیان بەرانبەر ئیسلام زیاد دەبێ، ئەوەش دەبێتە هۆی ئەوەی کە سەربکێشێ بۆ زیاتر یاخیی بوونو کافربوونیان.

**مەسەلەی دەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ ﴾، وە دوژمنایەتییو ڕقو کینەمان خستە نێوانیانەوە تا ڕۆژی قیامەت، هەندێك گوتوویانە: مەبەست پێی جوولەکەو نەصرانییەکانە، لە نێوان جوولەکەو نەصرانییەکاندا دوژمنایەتییو کێشەو ناکۆکیی هەیە، کە ئەوە وایەو ئێستاش هەر هەیە.

هەندێکی دیکە گوتوویانە: مەبەست پێی تاقمەکانی جوولەکەکانە، جوولەکەکان لە نێوان خۆیاندا چەند تاقمێکن.

هەندێکیش گوتوویانە: مەبەست پێی تاقمەکانی نەصرانییەکانن، ئێستا نەصرانییەکان سێ تاقمن، هەر کامێکیان وەك دینێکی سەربەخۆ وایە: (کَاثُولِیك، بروتستانت، أرثدۆکس)، ڕێشی دەچێتێ کە دەفەرموێ:

﴿ وَأَلْقَيْنَا بَيْنَهُمُ ٱلْعَدَاوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ ﴾، هەرچەند سیاقەکە زیاتر باس لە جوولەکەکان دەکات، بەلام مەبەست پێی خاوەن کتێبەکان بێ، بەگشتیو هەموویان بگرێتەوە، چ لە نێو خودی یەك میللەتدا، وەك نەصرانیی، یان جوولەکە چ لە نێوان هەردووکیاندا، کە دەبینین بەردەوام دوژمنایەتییو ناکۆکییان هەبووەو هەیە، وە هەمیشە ئەهلی باطڵ پێکەوە ناکۆکن، خەڵك تەنیا لەسەر هەق دڵی کۆدەبێتو گرێ دەدرێ، وە هەرگیز ناگونجێ خەڵك لەسەر ناهەق دڵی پێکەوە گرێ بدرێو جۆش بخوات.

**مەسەلەی یازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ كُلَّمَآ أَوْقَدُوا۟ نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا ٱللَّهُ ۚ وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا ۚ وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾، هەر کاتێك ئاگرێکیان هەڵگیرساند بۆ جەنگ، خوا دەیکوژێنێتەوە، وە خراپە لە زەویدا دەکەنو خواش

خراپەکارانی خۆشناوێن، ئایا مەبەست ئەوەیە، هەرکات جوولەکە ئاگر دابگیرسێنن، خوا بچێ بیکوژێنێتەوە؟ ئەوە یەکێك لەو شوێنانەیە کە مانای مەجازیی دەگەیەنێ، کەواتە: ئەوانەی دەڵێن: مەجاز لە قورئاندا نیە دەبێ بڵێن: هەرکات جوولەکە ئاگر بکەنەوە، تاکو چایی لێنێن، شێو (چێشت) لێنێن، خوا دەچێ ئاگرەکەیان لێ دەکوژێنێتەوە، کەچی ئێمە دەبینین جوولەکە ئاگر دەکەنەوە، نەصرانیی ئاگر دەکەنەوەو خواش لێیان ناکوژێنێتەوە! کەواتە: لێرەدا مەبەست لە ئاگرەکە مانای ڕواڵەتیی ئاگر نیە، بەڵکو مەبەست: (كُلَّمَا أَوْقَدُوا نَارًا لِّلْحَرْبِ أَطْفَأَهَا اللَّهُ) واتە: هەرکات فیتنەیەکیان هەڵگیرساند، خوا کپی دەکاتەوە، نەك ئاگرێك بێ و خوا بیکوژێنێتەوە، واتە: لێرەدا مەبەست لە ئاگر (نار) ئاژاوە (فِتنَة)یەو ئاماژەیە بۆ دروستکردنی ئاشووبو هەرا.

ئنجا خوا کە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ﴾، وە خوا خراپەکارانی خۆشناوێن، دیارە نەك هەر خۆشی ناوێن بەڵکو ڕقیشی لێیان هەڵدەستێ، بەڵام ئەوە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە خوا پێی خۆشە بەندەکانی وابکەن خۆشی بوێن، کەواتە: خوا لە بیانوو نیە بۆئەوەی ڕقی لە بەندەکانی هەڵسێ، بەڵکو پێی خۆشە وابکەن خۆشی بوێن، بەڵام کە خراپەکاربن، خۆشی ناوێن، واتە: خراپەکاریی لەخۆتاندا لابەرن و ببنە چاکەکار، بۆئەوەی ببنە خۆشەویستی خوا!

خوێنەرانی بەڕێز!

ئەگەر ئێمە تەماشای قورئان بکەین، دەبینین خوای کاربەجێ هەمیشە هەڵوێستەکانی خۆی دەبەستێتەوە بەو سیفەتانەوە کە لە کۆتایی ئایەتەکان دەیانهێنێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٧٧﴾ القصص، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلۡمُتَطَهِّرِينَ ٢٢٢﴾ البقرة، هەرگیز نایانبەستێتەوە بە گەل و نەتەوەو پارەو سامان و قەدو قیافەو ڕەنگ و شێوەو دیمەنەوە، بۆچی؟ چونکە ئەگەر باسی عەرەب بوون بکات، یان باسی کورد بوون و تورك بوون و فارس بوون، یان باسی ڕەش بوون و یان سپی بوون، یان نێر بوون و مێ بوون، یان جوانیی و ناشیرینیی ... هتد، ئەوانە هیچیان ئیرادەی ئینسانیان تێدانیە، بۆیە خوای دادگەر

هەڵوێستەکانی نابەستێتەوە بەو شتانەوەو لەسەر ئەو شتانەیان بینا ناکات، کە لە دەرەوەی ئیرادەی ئینسان دان، بەڵکو بەو شتانەیانەوە دەبەستێتەوە کە لەژێر ڕکێفی ئیرادەی ئینسان دان، کە بریتین لە عەقیدەو فیکرو چاکەو خراپەو هەڵسوکەوتو ڕەفتارەکان.

**مەسەلەی دوازدەیەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ لَأَكَلُوا۟ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم ۚ مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ﴾، جاری دیکەش باسمان کردووە، هەمیشە خوا ﷻ کە باسی مونافیقەکان، یان جوولەکەکان، یان نەصرانییەکان، یان موشریکەکان، یان کافرەکان دەکات، دەفەرموێ: ئەو سیفەتە خراپانەیان هەنو لەبەر ئەو سیفەتە خراپانە خوا ڕقی لێیان هەڵدەستێو خوا خۆشی ناوێن، ئەی مسوڵمانینە! ئەوە کردەوەکانیانن، لێیان وریابن!

بەڵام مەگەر چۆن، ئەگەرنا دوایی دەروازەیەکیان بۆ هاتنەوەو گەڕانەوە لێدەکاتەوە، لێرەش دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ﴿٦٥﴾﴾المائدة، ئەو خاوەن کتێبانەی کە ئەو سیفەتە خراپانەیان هەن: "جوولەکەکانو غەیری وانیش، هەموو ئەوانەی خۆیان بە خاوەن کتێبی ئاسمانیی دەزانن"، ﴿ءَامَنُوا۟﴾، ئەگەر ئیمان بێننو هەق قبووڵ بکەن، وە هەقیش پیادە بکەن، یانی: بە عەقڵ وەریبگرنو قەناعەتی پێ بێنن، وە بە دڵیش قبووڵی بکەن، وە بە زمانیش دانی پێدابێنن، وە بە کردەوەش پێیەوە پابەندبن، ﴿وَٱتَّقَوْا۟﴾، پارێزیش بکەن، لەلادان ئەوە ﴿لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّـَٔاتِهِمْ﴾، ئەوە بە تەئکید ئێمە خراپەکانیان لێ دەسڕینەوە، جا ئەو (ل)ە، زانایان دەڵێن: لامی قەسەمە، واتە: زۆر بە تەئکید ئێمە خراپەکانیان لێ دەسڕینەوە، ﴿وَلَأَدْخَلْنَٰهُمْ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ﴾، ئنجا دوای ئەوەی پاكو

چاكبوون، دەشیانخەینە شوێنی چاكو پاكانەوە، چونكە بەهەشت شوێنێكی پاكو خاوێنو بۆنخۆشو ڕازاوەیەو، بە كەڵكی خەڵكی پیسو پۆخڵ نایەت، بۆیە سەرەتا دەفەرمویٚ: ﴿ لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ ﴾، پێشێ خراپەكانیان لێ دەسرینەوە، خاوێنو پوختەو بۆنخۆش دەبن، ئنجا دەیانخەینە بەهەشتەوە، وەك لە سوورەتی (الزمر)یشدا دەفەرمویٚ: ﴿ ... طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ ۝٧٣ ﴾، واتە: ئێستا پاكو چاكن، ئنجا بچنە نێو بەهەشت، ئەوە بەنسبەت دواڕۆژەوە، تەماشا بكەن لێرەدا خوا ﷻ بۆ خاوەن كتێبەكان كە باسی دواڕۆژو بەهەشت دەكات، پێشێ باسی خاوێنبوونەوەیان لە گوناهەكانیان دەكات، ئەگەر ئیمانو تەقوایان هەبێ.

ئنجا دوایی دێتە سەر باسی شوێنەوارو بەرهەمی دنیایی ئیمانو تەقوا، دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ ﴾، وە ئەگەر هاتبایە ئەوانە تەوراتو ئینجیلو ئەوەی لە پەروەردگاریانەوە بۆیان دابەزێنراوە، بەرپایان كردبا، یانی: هەقی خۆیان دابایەو بە تەواویی جێبەجێیان كردبایە ﴿ لَأَكَلُوا مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم ﴾، ئەوە بێگومان لە سەروویانەوەو لە ژێر پێیەكانیشیانەوە دەیانخوارد، وەكو لە كوردەواریی خۆماندا دەڵێ: (لە سەرێو لە خوارێ، هەر بۆی دەبارێ)، سەر (فوق)و ژێر (تحت)، یانی: ئاسمانو زەوی، هەندێك لە زانایانیش ئاوایان تەفسیر كردوە: خوا لە ئاسمان بارانو بەرەكەتیان بەسەردا دەبارێنێ، لە ئەرزیشەوە دانەوێڵەو میوەو سەوزەو شتی باشیان بۆ دەڕوێنێ، بەڵام واپێدەچێ زیاتر مەبەست ئەوەبێ كە ئاسمانو زەویو هەموو هۆكارەكان دەستەبەر دەبن بۆیانو، دەبنە مایەی خێرو بەرەكەتو پیتو پێز لە ژیانیاندا، ئنجا ئەوەی جێی سەرنجە، لە ئایەتی پێشێدا خوا فەرمووی: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا ﴾، لەوەیاندا دەفەرمویٚ: ﴿ وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِم مِّن رَّبِّهِمْ ﴾، ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ، كە ئیمانو تەقوا كاتێك لە مرۆڤدا دێنە دی كە پابەندبێ بە كتێبەكانی خواوە، پێشێ دەفەرمویٚ: ئەگەر ئیمانو تەقوایان هەبێ، دوایی

دەفەرموێ: ئەگەر کتێبەکانی خوا بەرپا بکەنو پێیانەوە پابەندبن، وایان بۆ دەکەین، واتە: ڕێی وەدەستهێنانی ئیمانو تەقوا پابەندییە بە کتێبەکانی خواوە، یەکێك بۆی هەیە بپرسێ: ئایا چۆن خوا دەفەرموێ: بە تەوراتو ئینجیلەوە پابەندبن! لە کاتێکدا کە تەوراتو ئینجیل گۆڕدراونو دەستکاریی کراون؟ زانایان ئاوا وەڵامیان داوەتەوە:

أ- دەڵێن: واتە: بەو شتانەوە پابەندبن کە نەگۆڕدراونو دەستکاریی نەکراون.

ب- هەندێکیش دەڵێن: واتە: ئەو تەوراتو ئینجیلەی کە موژدەیان تێدایە بە هاتنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ وە کە قورئان دوا کتێبی خوایە، وە سەرەنجام ببنە مسوڵمان، هەردووماناکەش ڕاستن، چونکە ئێستاش تەوراتو ئینجیل بایی ئەوەندە هەقیان هەر تێدا ماوە، کە ئەگەر جوولەکەو نەصرانیی پێوەیان پابەندبن، ژیانیان زۆر دەگۆڕێ، پێشتریش ئاماژەمان پێدا، وە ئەم ئایەتە وەك ئەو ئایەتەی سوورەتی (الأعراف) وایە، خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ ...﴿٩٦﴾﴾، واتە: ئەگەر خەڵکی ئاوەدانییەکان ئیمان بێننو پارێز بکەن، بەرەکەتو پیزی ئاسمانو زەوییان بەسەردا دەبارێنین.

ئنجا خوای دادگەر لە کۆتایی دا پۆلێنیان دەکات، بۆ دوو جۆر، تاکو ئێمە فێری ئینصافو دادگەریی بکات، چونکە گشتاندن (تعميم) کارێکی زۆر خراپە، بۆ وێنە بگوترێ: ئەو خەڵکە هەموویان خراپن، هیچیان بە کەڵك نایەن! یان ئەو خەڵکە هەموویان چاکن! خوا دەفەرموێ: ﴿مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ﴾، هەندێك لە زانایان دەڵێن: مەبەست لە: ﴿مِّنْهُمْ أُمَّةٌ مُّقْتَصِدَةٌ﴾، واتە: ئەو جوولەکەو نەصرانییانەی کە ئیمان دێننو مسوڵمان دەبن، بۆیە خوا مەدحی کردوون، کە میانجییینو خەتی نێوەڕاستیان گرتوە.

بەڵام من وای تێدەگەم مەبەست پێی مسوڵمانەکانیان نیە، چونکە لەوان (مِنْهُم) یانی: هەر لەو جوولەکەو نەصرانییانەی کە خوا زەمیان دەکاتو بە

خـــراپ باســـیان دەكـات، كەمێكـــیان هـەن وانـین، چونكــە ئـەو: لـە (مِن)یـە، بـۆ بەشـكردن (تَبعِیض)ە، یـانی: كەمێكـیان هـەن "لـە چـاو زۆربەیـان" ڕێـك و پێـك و ڕاســـت و ڕەوانـــن و لەگـەڵ دینەكـەی خۆیانـدا ڕاســت دەكـەن، ئنجـا ﴿ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴾، بـەڵام زۆریـان خـراپترین كـردەوە ئـەنجام دەدەن، بـە كـورتیی: هەنـدێكیان هـەن لەگـەڵ دینەكــەی خۆیـــان ڕاست دەكـەن، بـەڵام زۆریـان لەگـەڵ دینــەكەی خۆشیاندا ڕاست ناكـەن.

بەڕێـــزان!

ئەمە ئەوەی لێوەردەگیـرێ "وەك پێشــتریش گوتمان" كە ئێمەی مســـوڵمان دەبـێ لەگەڵ خەڵكـدا دادگـەرو بە ئینصـاف بین، پاشانیش زۆر گرنگە خەڵـك هانبدەین بـە پرەنســـیپەكان (مبـادیء)ی خۆیـــانەوە پابەنـــدبن، ئەگــەر جوولەكەبـــێ بـە تەوراتــەوە پابەنــدبێ، ئەگـەر نەصـرانیـــبێ بــە ئینجـیلەوە پابەنـدبێ، ئەگـەر عەلمانییـــە بـــە عەلمانییەتیەكـــەی خۆیـــەوە پابەنـــد بـێ، وە ئەگـەر ئیددیعـــای دیموكراسیەت دەكـات، بـا بـە دیموكراسیەتەكەی خۆیەوە پابەنـدبێ، ... هتـد، بـەڵام ئێمـە كێشــەمان لەگـەڵ ئـەو كەسانە دایـە كـە شـیعاری بـێ كرداریان هەیـە، قسـەی خۆش و بۆشـیان هەیـە، دووركـوژی نزیك خەسارن، ڕواڵەت جوانیی نزیـك وێرانن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی شازدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە پێنج (٥) ئایەت پێکدێ، (٦٧ - ٧١) لەم پێنج ئایەتە موبارەکەدا خوا ﷻ سەرەتا لە ئایەتی یەکەمدا ڕوو دەکاتە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، وە بۆ جاری دووەم لەم سووڕەتەدا بە نازناوی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ﴾، ئەی پێغەمبەر! دەیدوێنێو پێی ڕادەگەیەنێ، کە ئەوەی خوا بۆی ناردۆتە خوار ڕایبگەیەنێ، ئەگەرنا بە نەگەیەنەری پەیامی خوا دادەنرێ، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾، وە بەڵێنیشی پێدەدات کە لە خەڵکی کافر بیپارێزێ.

پاشان لە ئایەتی دووەمدا ڕوونی دەکاتەوە کە دەبێ چی ڕابگەیەنێ، کە بریتیە لەوەی بە خاوەن کتێبەکان بفەرموێ: ئەگەر تەوراتو ئینجیلو ئەوەی خوا ناردوویەتەخوار، جێبەجێی نەکەن، ئەوە مانای وایە لەسەر هیچ نین، هیچ دینێکتان نیە، دوایی خوا ﷻ ڕایدەگەیەنێ کە زۆرێك لە خاوەن کتێبەکان بە هۆی وەحی دابەزێنراوی خواوە، هەر زیاتر یاخی بوونو کوفریان تێدا زیاد دەبێ، وەك لە ئایەتی پێشێشدا باسی کرد.

ئنجا لە ئایەتی سێیەمدا خوای زانا ڕای دەگەیەنێ کە هەر کام لە مسوڵمانانو جوولەکەو صابیئەو نەصرانییەکان، مادام کاتی خۆی بەڕاستیی بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی هێنابێو، کردەوە باشەکانیشیان ئەنجام دابێ، ئەوە پێشینانەیان کە کاتی خۆی ڕاستو ساغ بوون، نە ترسیان لەسەرەوو نە پەژارەش دایاندەگرێ، پاشان لە ئایەتی چوارەمدا ڕایدەگەیەنێ کە کاتی خۆی خوا پەیمانێکی پتەوی لە

جوولەکەکان بەتایبەت وەرگرت، وە پێغەمبەرانێکی بۆ ناردوون، بەڵام هەر کات پێغەمبەرێك هاتبێ بۆ لایانو، شتێکی گوتبێ کە لەگەڵ ئارەزووەکانی ئەواندا نەگونجێ ئەوە بەشێکیان لەو پێغەمبەرانە بە درۆزن داناونو، بەشێکی دیکەشیان بەوەندە وازیان نەهێناوە بە درۆزنیان دابنێن، بەڵکو کوشتووشیانن.

ئنجا لە ئایەتی پێنجەمدا ڕوونی دەکاتەوە کە ئەو جوولەکانە، پێیانوابووە ئەو جۆرە مامەڵانەیان مایەی بەڵاو گرفتاریی نین، وە پێیانوابووە بەهۆی ئەو کردەوانەوە تووشی بەڵاو گرفتارییو نارەحەتیی نابن، بۆیە لە ئاکامی ئەوەدا کوێرو کەڕ بوون، دوایی خوای بە بەزەیی گەڕاوەتەوە سەریانو لێیان خۆشبووە، دوای ئەوەی کە تۆبەیان کردوە، کەچی زۆرێکیان دیسان دوای ئەوەش هەر کوێرو کەڕ بوونەوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ
وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٧﴾ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ
ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن
رَّبِّكُمۡۗ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۖ فَلَا تَأۡسَ
عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٦٨﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ
مَنۡ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ
يَحۡزَنُونَ ﴿٦٩﴾ لَقَدۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ رُسُلٗاۖ كُلَّمَا
جَآءَهُمۡ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهۡوَىٰٓ أَنفُسُهُمۡ فَرِيقٗا كَذَّبُواْ وَفَرِيقٗا يَقۡتُلُونَ ﴿٧٠﴾
وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ ثُمَّ عَمُواْ
وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ﴿٧١﴾﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی پێغەمبەر! ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە، ڕایبگەیەنە، وە ئەگەر وانەکەی، پەیامەکەییت نەگەیاندوە، وە خوا لە (زیان و خراپەی) خەڵکی (کافر) دەتپارێزێ، بێگومان خوا ڕێنمایی کۆمەڵی کافران ناکات ﴿٦٧﴾ بڵێ: خاوەن کتێبینە! هەتا تەورات و ئینجیل و ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوە، بەرپای نەکەن (و پێوەی پابەند نەبن) مانای وایە لەسەر هیچ شتێك (لە هەق) نین، وە بە دڵنیاییەوە ئەوەی کە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە، یاخی بوون و کوفری زۆرێکیان زیاد دەکات، دەجا خەفەت لە کۆمەڵی کافران مەخۆ ﴿٦٨﴾ بێگومان ئیمانداران (مسوڵمانان)و جوولەکەکان و صابیئەکان و نەصرانییەکان، هەر کامێکیان بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێنێ و کردەوەی باش ئەنجام بدات، نە ترسیان لەسەر دەبێ و نە دڵتەنگ و پەژارەدار دەبن ﴿٦٩﴾ بێگومان پەیمانی پتەومان لە وەچەی ئیسرائیل (جوولەکەکان) وەرگرت، وە پێغەمبەرانێکمان بۆ لا ڕەوانەکردن، (بەڵام) هەر کە پێغەمبەرێکیان دەهاتە لا بە پەیامێکەوە کە حەزیان لێ نەدەکرد، دەستەیەکیان (لە پێغەمبەران) بە درۆ دانا، وە دەستەیەکیشیان لێ کوشتن ﴿٧٠﴾ وە پێیانوابوو کە ئەوە نابێ بە مایەی بەڵاو سزا بۆیان، بۆیە کوێرو کەڕ بوون (لە بەرانبەر پەیامی خوادا)، پاشان خوا گەڕایەوە سەریان (وە چاوپۆشیی لێکردن)، کەچی دواییش زۆریان کوێرو کەڕ بوون (لە بەرانبەر هەق دا)، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن ﴿٧١﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(بَلِّغْ ): (الْبَلاَغُ: التَّبْلِيغُ: أَي إِيصَالُ الكَلاَمِ، أَوِ الخِطَاب)، (بَلِّغ) واتە: بیگەیەنە، ئەو پەیامە، یان ئەو فەرمایشتە كە بۆتهاتوە، بیگەیەنە بەوەی كە پێویستە پێی بگەیەنی، بە كوردی دەڵێین: پێگەیاندن، یان پێڕاگەیاندن.

(رِسَالَتَهُۥ): واتە: پەیام، نامە، دواندن، (الرِّسَالَةُ: مَا يُرسَلُ، الخِطَاب، كِتَابٌ يَشتَمِل عَلَى قَلِيلٍ مِنَ المَسَائِل) هەندێكیش گوتوویانە: (الرِّسَالَةُ) مانای فراوانو گشتگیرە، یانی: هەموو وەحی خوای پەروەردگار دەگرێتەوە.

(يَعْصِمُكَ): (العَصْمُ: الإِمْسَاك، والإعْتِصَام، وَعِصْمَةُ الأَنْبِيَاء: حِفظُهُ إِيَّاهُمْ)، (عَصْمُ) واتە: دەستپێگرتن، توند دەست بە شتێكەوە بگری، كە دەستت بە شتێك گرت مانای وایە دەیپارێزی، بۆیە: (يَعْصِمُكَ) واتە: خوا دەتپارێزێ، وەك چۆن كەسێك توند دەست بە شتێك بگری نەیەڵێ بكەوێ، خوای پەروەردگاریش ئاوا تۆ دەپارێزێ، وە كە دەڵێین: پێغەمبەران مەعصوومن، واتە: خوا دەیانپارێزێ، دواییش زیاتر ڕوونی دەكەینەوە.

(تُقِيمُواْ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ): واتە: تەوراتو ئینجیل بەرپا بكەن، واتە: پێیانەوە پابەندبنو حوكمەكانیان جێبەجێ بكەن، (وَيُقِيمُونَ الصَّلاَةَ: أَي يُدِيمُونَ فعلها وَيُحَافِظُونَ عَلَيْهَا) واتە: لەسەری بەردەوام دەبن، پارێزگارییشی لێدەكەن، پارێزگاریی لە ڕواڵەتیشی دەكەنو لە نێوەرۆكیشی.

(فَلَا تَأْسَ): واتە: (فلا تَحزَن)، (الأسى: الحَزن، أَسِيْتُ لَهُ، وَأَسِيْتُ عَلَيْهِ) لە زمانی عەرەبیدا (الأسى) بە مانای دڵتەنگیو نارەحەتیی دێ.

(وَٱلصَّٰبِـُٔونَ ): (قَومٌ كَانُوا عَلَى دِينِ نُوح، وَصَبَأَ: خَرَجَ مِن دِينِهِ إِلى دِينٍ آخَر)، (صَبَأَ) لە دین هەڵگەڕانەوەیە، واتە: لە دینی خۆی بۆ دینێكی دیكە چوو، وە

هەندێك دەڵێن: (صابئة) كۆمەڵێك بوون لەسەر دینی پێغەمبەر نووح بوون، هەندێك دەڵێن: ئەستێرە پەرست بوون، وە هەندێك دەڵێن: خۆیان بە شوێنكەوتەی پێغەمبەر ئیبراهیم دەزانن، ڕەنگە جۆراو جۆریش بن.

(مِيثَٰقَ): واتە: پەیمانی پتەو، (عَقْدٌ يُؤَكَّدُ بِيَمِينٍ وَعَهْدٍ)، واتە: پەیمانێكە بە سوێند لەسەر خواردنو بەیعەت لەسەر دان پتەوكرابێ، وە ئەسڵی وشەی: (مِيثاق) دەڵێ (وَثِقْتُ بِهِ أَثِقُ ثِقَةً، وَاعْتَمَدْتُ عَلَيْهِ، وأوثقته شددته) واتە: متمانەم پێكردو قایمم كرد.

(لاتَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمۡ): واتە: نەفسیان ئارەزووی لێ ناكات، حەزی لێ نیە، دەڵێ: (الهَوَى: مَيْلُ النَّفس إِلى الشَّهْوَة) واتە: هەوا بریتیە لە جووڵانی نەفسی ئینسان بەرەو ئارەزوو.

(وَحَسِبُوٓاْ): واتە: وایانزانی، پێیانوابوو، (الحِسْبَان، أَن يُحْكَم لأَحَد النَقِيضَين مِن غَيرِ أَن يَخْطِرَ الآخر ببالِهِ، الظَنّ أَن يَخْطِر النَّقِيضين ببالِهِ فَيُغَلِّبَ أَحَدَهُمَا على الآخر)، (حِسْبَان) لە زمانی عەرەبییدا بە مانای ئەوەیە كە دوو شت پێچەوانەی یەكدین، یەكیان بە دڵ دابێ، بەبێ ئەوەی ئەویدیكە بە دڵ دابێ، بەڵام گومان ئەوەیە هەردووكیانی لە مێشك دایە، بەڵام یەكێكیان بەسەر ئەویدیكەدا زاڵ دەكات.

(فِتۡنَةٌ): (البلية، العَذَابُ، وانحراف عَنِ الحَق) فیتنە یان بە مانای بەلا دێ، یان بە مانای سزا دێ، یان بە مانای لادانە لە هەق، خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَ ﴾، وریابە لاتنەدەن، دیارە (يَفتِنُوكَ) یانی (يَصْرِفُوك)، لاتبدەن.

## مـانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

لێرەدا خوا ﷻ پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد ﷺ دەدوێنێ، دیارە قورئان هەمووی هەر دواندنو فەرمانی خوای پەروەدگارە ئاراستەی پێغەمبەر ﷺ کراوە، بەڵام لە هەندێك شوێندا خوای کاربەجێ بە تایبەت بە نازناوی ڕەوانەکراوێتیی و پەیامبەرێتیی ناوی دەهێنێ، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ ﴾، ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ ﴾، وە جاری واش هەیە کە بەبێ بانگکردن بە ناوونیشانی ڕیسالەتو نوبووەت دەزانین کە یەکسەر دواندنەکە لەگەڵ پێغەمبەری خوایە ﷺ، لێرەدا هەر کەسێك تەماشای سیاقی ئەو ئایەتانە بکات، دەزانێ مەبەستی کێیە؟ کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ﴾، ئەی پێغەمبەر! ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە بیگەیەنە، دیارە مەبەست پێی کێیە؟ چونکە باسی جوولەکەو نەصرانییەکانمان کرد، ئنجا هەر لە دوای ئەم ئایەتە یەکسەر دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، واتە: دیارە سیاقەکە باسی جوولەکەو نەصرانییەکان دەکات، وە لێرەدا خوای پەروەردگار هۆشداریی دەداتە پێغەمبەرو ﷺ وریای دەکاتەوەو جەختی لەسەر دەکاتەوە، کە ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە، بیگەیەنە، هەڵبەتە پێغەمبەر ﷺ موکەللەف بووە کە هەرچی خوای پەروەردگار پێی فەرمووە، هەمووی بگەیەنێ، بەڵام لێرەدا کە خوا بەتایبەت دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ ﴾، وە دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾، وە ئەگەر وا نەکەی، پەیامەکەی خوات نەگەیاندوە، دواییش بەڵێنی پێداوە: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، وە خوا لە خەڵکی دەتپارێزێ، وشەی: (الناس) واتە: لە ئەسڵدا بە مانای (خەڵك)ە، بەڵام لە سیاقەکەوە دیارە کە مەبەست (خەڵکی کافر)ە، چونکە دوایی فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ

﴿ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، بێگومان خوا ڕێنمایی کۆمەڵی بێبڕوایان ناکات، کە زیان لە تۆ بدەن، لێرەدا بۆمان دەردەکەوێ کە ئەوە پەیامێکی تایبەتە کە دەبێ پێغەمبەر ﷺ بیگەیەنێ، وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، چونکە زۆر لە تەفسیرەکان، ئەوانەی من تەماشام کردوون، لێرەدا ئیشکالیان بۆ دروست بووە، نەیانزانیوە چۆن خۆیانی لێ دەرباز بکەن، ئیشکالەکە ئەوەیە: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾، ئەی پێغەمبەر! ئەوەی لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە، بیگەیەنە، وە ئەگەر نەیگەیەنی مانای وایە پەیامی خوات نەگەیاندوە، دەڵێن: ئاشکرایە ئەگەر پێغەمبەر پەیامی خوا نەگەیەنێ، مانای وایە پەیامی خوای نەگەیاندوە، وەك بڵێی ئەوە دووبارەیەو (تحصيل الحاصل)ە!! بەڵام وەك دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، وانیە، بەڵکو لێرەدا ئەوە شتێکی تایبەت بووە بە خاوەن کتێبەکانەوە، بە جوولەکەو نەصرانییەکان، نەك گشتی بێ، واتە: ئەگەر ئەو شتە تایبەتە نەگەیەنێ بە جوولەکەو نەصرانییەکان، ئەوە وەك ئەوە وایە کە هیچ کام لە پەیامو بەرنامەی خوای پەروەردگاری نەگەیاندبێ، وە دوایی خوا موژدەو بەڵێنی پێدەداتو دڵنیای دەکاتەوە، ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، واتە: بەتەئکید خوا دەتپارێزێ لە خەڵکی، وشەی: ﴿ ٱلنَّاسِ ﴾، لە بەکارهێنانی قورئاندا بەگشتی واتە: خەڵك، لە هەندێك شوێنیش دەردەکەوێ کە مەبەست پێی خەڵکی کافرە، بۆ وێنە: لە سوورەتی (آل عمران) کە دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنٗا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣ ﴾، لێرەدا مەبەست لە (الناس)ی یەکەم کابرایەك بوو لە موشریکەکان، هەواڵیدا بە پێغەمبەر ﷺ و هاوەڵانی، وە مەبەست لە (الناس)ی دووەم ئەبو سوفیانو سوپاکەی بوو، کە ئێمە پێشتر لە تەفسیری سوورەتی (آل عمران)دا باسمان کردوە، جا لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، واتە: بەتەئکید خوا

دەتپارێزێ لە کافران، وە من بۆیە ئەوەتان زۆر بۆ ڕوون دەکەمەوە، چونکە شیعە ئەوە دەکەنە بەڵگە لەسەر ئەوە کە مەبەست لەوە ئیمامەتو ویلایەتی (عەلی)یە، خوا لێی ڕازی بێ، ئەوان ئاوای تەفسیر دەکەن: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ﴾، (أي ولايَةَ عَلَي وَإمَامَتَهُ) ﴿وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ﴾، (أي وَإن لَمْ تُبَلِّغ أصْحَابَك بأن عَلَيّ إمَامٌ بَعْدَك) ﴿فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُ﴾، (أي إذَا لَمْ تكمل النّبوّة بالإمامَة، مَا بَلَّغتَ رسَالَتَهُ)، ﴿وَاللَّهُ يَعْصِمُكَ مِنَ النَّاسِ﴾، (أي مِنْ أصْحَابِك)، ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْكَافِرِينَ﴾، (أي الرافضين لإمَامة عَلِيٍّ)، شیعە ئاوای تەفسیر دەکەن، بۆیە من زۆر تەئیکد لەوە دەکەمەوە کە ئەو ئایەتە ئەگەر تەماشای پێشیو دوای بکەین، دەبینین هیچ پەیوەندیی بە ئیمامەتی (عەلی)یەوە خوا لێی ڕازی بێ، نیە، بەڵکو هەمووی پەیوەندیی بە جوولەکەکانەوە هەیە، دوایی دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَيْءٍ﴾، ئەوە ئەو شتەیە کە خوا دەفەرموێ: ئەوەی کە بۆت نێردراوە، بیگەیەنە، چییە؟ ئەو شتە تایبەتەی کە دەبێ پێغەمبەر ﷺ بە جوولەکەو نەصرانییەکانی بگەیەنێ، تاکو بۆیان دەربکەوێ کە لەسەر بۆشن، لە حاڵێکدا کتێبەکەی خۆشیان گۆڕاوەو دەستکاریی کراوە، ئیمانیش بە قورئان نەهێنن، کەواتە: لەسەر هیچ نینو دینەکەیان بۆشە، لێیان قبووڵ ناکرێ، ﴿حَتَّىٰ تُقِيمُوا التَّوْرَاةَ وَالْإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾، هەتا تەوراتو ئینجیلو ئەوەی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزیوە بەرپا نەکەنو پێوەی پابەند نەبن، واتە: ئەو هەقەی لە تەوراتو ئینجیلدا ماوەتەوەو دەستکاریی نەکراوە، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەی: ئەو بەشە لە تەوراتو ئینجیل کە موژدە دەدەن بە هاتنی پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺ، ﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَانًا وَكُفْرًا﴾، وە بە تەئکید زۆرێکیان ئەوەی لە پەروەردگارت بۆت دابەزێنراوە، یاخی بوونو کوفریان تێدا زیاد دەکات، پێشتریش باسمان کردوە،

بۆچی؟ ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ﴾، خەفەت لە کۆمەڵی بێبڕوایان مەخۆ، ئەوانە سروشتیان وایە، ئەو وەحییەی بۆ تۆ دێ، ئەو قورئانەی کە بۆ تۆ دێ، لە جیاتی ئەوەی دڵیان پێی نەرم بێو بگەڕێنەوە، هەر زیاتر پێی یاخی دەبنو پێی کافر دەبن.

ئنجا خوای پەروەردگار وەك شتێکی گشتی باسی هەموو میللەتان دەکات، (الشهرستانی) کتێبێکی هەیە (الملل)، هەروەها (إبْنُ حَزم)یش کتێبێکی هەیە بە ناوی: (الملل والنحل)، (الملل) کۆی (ملة)یە، واتە: ئەو کۆمەڵە خەڵکانەی بە دوای پێغەمبەران کەوتوونو بە دوای کتێبە ئاسمانییەکان کەوتوون، (النحل)یش کۆی (نحلة)یە، یانی: ئەو دەستەو تاقمانەی لە نێو میللەتێکدان، بۆ وێنە: شیعەو خەواریجو مورجیئەو موعتەزیلە کە لەگەڵ جەماوەری مسوڵمانان (أَهْلِ السُّنَّةِ وَالجَمَاعَة)، ئەوانە پێیان دەگوترێ: (نِحل)، بەڵام (الملل) جیایە، بۆ وێنە: میللەتی یەهودیی، میللەتی نەصرانیی، میللەتی مسوڵمان، میللەتی بوودیی، میللەتی گاپەرست ... هتد، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَٱلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ﴾، بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، (واتە: مسوڵمانان)، وە ئەوانەی کە گەڕاونەوە، (واتە: جوولەکەکان)، وە صابیئە کە ئەوانیش کۆمەڵێك بوون، وە نەصرانییەکان، هەر کامێك لەو چوارانە بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێنن، وە کردەوە باشەکانیش ئەنجام بدەن، نە ترسیان لەسەرە، نە پەژارەداریش دەبن، واتە: بۆ داهاتوو ترسیان لەسەر نیە، بۆ ڕابردووش پەژارەدار نابن، لێرەدا هەندێ کەس گوتوویانە: مادام خوا دەفەرموێ: مسوڵمانو جوولەکەو صابیئەو نەصرانیی، هەر کامێك لەوانە بڕوا بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێنێو، کردەوەی باش بکات، نەترسی لەسەرەو نە پەژارە دایدەگرێ، کەواتە: لێرەدا مسوڵمانو جوولەکەو صابیئەو نەصرانیی هەموویان یەکسانن! ئەوە هەندێ مەلای دین فرۆش ئەم ئایەتە ئاوا تەفسیر دەکەن، کە ئەوە مەبەست نیە، جا ئەم ئایەتە موبارەکە لە سوورەتی (البقرة)ەشدا هاتوە، لەگەڵ کەمێك جیاوازیی، هەروەها لە سوورەتی

(الحج)یشدا هاتوە، لەوێشدا بە جیاوازییەکی کەم، کە بە تەئکید مەبەست ئەوەیە ئەوانەی مسوڵمانن و ئێستا ئۆممەتی موحەممەدن ﷺ، وە ئەوانەش کە جوولەکەن کاتی خۆی ئەگەر لەگەڵ تەورات و مووسادا ﵇ راستیان کردبێ، ئیمانیان بە خواو بە ڕۆژی دوایی بووبێ و کردەوەی باشیشیان ئەنجام دابێ، وە ئەوانەی صابیئەن بە هەمان شێوە لە کاتی خۆیدا لەگەڵ پێغەمبەرو دینی خۆیاندا ڕاستیان کردبێ، وە ئەوانەی نەصرانیین لەگەڵ عیسا ﵇ و دینی نەصرانییەت ڕاستیان کردبێ و، بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی بوبێ و کردەوە باشەکانیان ئەنجام دابێ، هەموو ئەوانە ﴿ فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾، واتە: ئەوە بۆ ڕابردووە، ئەوە واتایەکی، واتایەکی دیکەشی ئەوەیە کە مسوڵمانان و جوولەکەو صابیئەو نەصرانیی هەموویان، ئەگەر بە ڕاستی ئیمان بە خوا بێنن و، ئیمان بە ڕۆژی دوایی بێنن و، کردەوە باشەکان ئەنجام بدەن، بەڵام ئیمان بە خوا هێنان و، ئیمان بە ڕۆژی دوایی هێنان و، کردەوەی باش ئەنجامدان، بە شێوەیەك کە قورئان دەفەرموێ، چونکە ئیمانێك بە ئیمان دادەنرێ، وە ئیعتیباری پێ دەکرێ، کە بەپێی قورئان بێ، وە هەروەها ئیمان بە ڕۆژی دواییش دەبێ بە پێی قورئان بێ، وە کردەوەش کاتێك باش دەبێ و بە باش دادەنرێ کە بە پێی شەریعەت بێ، کەواتە: ئەم ئایەتە دوو واتای ڕاستی هەن:

١) ئەو میللەتانە هەر کامێکیان ئەگەر کاتی خۆی لەگەڵ بەرنامەی خوادا ڕاستی کردبێ، ئەوە سەرفرازن، یانی: باب و باپیرانیان و پێشووەکانیان.

٢) وە ئێستا ئەگەر هەر کامێکیان ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێنێ، وە کردەوەی باش بکات، ئەوە سەرفرازە، نەك بڵێی جوولەکە لەگەڵ جوولەکایەتیی دا ڕاست بکاو، نەصرانیی لەگەڵ نەصرانییەتی خۆی ڕاست بکات، صابیئە لەگەڵ ئەوەی خۆیدا ڕاست بکات، ئەوە هەموویان وەك یەکن! ئەم ئایەتە ئەوە ناگەیەنێ، وەك دوایی جارێکی دی دەگەڕێینەوە سەری.

ئنجا خوای پەروەردگار باسی پەیمان وەرگرتنی خۆی دەکات لە جوولەکەکان، دەفەرموێ: ﴿ لَقَدۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَأَرۡسَلۡنَآ إِلَيۡهِمۡ رُسُلٗا ﴾، بێگومان ئێمە پەیمانی پتەومان لە وەچەی ئیسرائیل وەرگرت، وە پێغەمبەرانێکیشمان

بۆ لا ڕەوانەکردن، کەچی ئەوان چیان کرد؟ ﴿ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولُۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُواْ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴾، هەر کاتێك پێغەمبەرێك هاتبا بۆ لایان بە شێوەیەك شتێکی پێگوتبان کە نەفسیان ئارەزووی لێ نەدەبوو، دڵپەسەندی ئەوان نەدەبوو، بە پێی ئارەزووو هەوای ئەوان نەدەبوو، ئەوە کۆمەڵێکیان لە پێغەمبەران بە درۆ دەزانین، کۆمەڵێکیشیان لێ دەکوشتن، هەر بەوەندە وازیان نەدەهێنا پێیان بڵێن درۆ دەکەن، بەڵکو دەشیان کوشتن، یانی ئەو خراپییەیان بە میرات بۆ ماوەتەوە، وە بەو بارە سەختەوە لەمێژە باریان گرتوە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (خوێکی گرتت بە شیری تەرکی ناکەی بە پیری)، عەرەبیش دەڵێن: (مَنْ شَبَّ عَلَى شَيءٍ شَابَ عَلَيْهِ) ئەوە جۆرێکە لە دڵنەوایی بۆ پێغەمبەر ﷺ، وە بۆ مسوڵمانان کە وەختێ ئەو کەللە ڕەقیی و سەرسەختیی و پیلان و فێڵ و خراپەکارییەی جوولەکە دەبینن، زۆر دڵ نارەحەت نەبن، بزانن کە ئەوە بە میرات بۆیان ماوەتەوە، وە زانایانی کۆمەڵناسیش دەڵێن: ئەوەی باب و باپیران لەسەر دەبن، کاریگەریی هەیە بۆ سەر ڕۆڵەکانیان، خواش لە سووڕەتی (الكهف)دا کە باسی ئەو خەزنەی لە بن دیوارەکەدا بووە، دەکات، دەفەرموێ: ﴿ ... وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا ... ﴿٨٢﴾ ﴾، بابی ئەو دوو کوڕە پیاوێکی باش بوو، هەرچەندە بابیان نەماوە، بەڵام لەبەرئەوەی پیاوێکی باش بووە، خوای بە بەزەیی مووساو ئەو بەندە صالحە بەکاردێنێ بۆئەوەی ئەو ماڵەیان زایە نەبێ، کە لە بن ئەو دیوارەدایەو خەریکە بڕووخێ.

لە کۆتاییدا خوای زاناو شارەزا دەفەرموێ: ﴿ وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُواْ وَصَمُّواْ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴾، وە پێیان وابوو کە ئەو هەڵوێستەیان لە بەرانبەر پەیمانی خوادا کە هەڵیانوەشاندۆتەوەو، لە بەرانبەر پێغەمبەراندا کە بە درۆیان زانیون و کوشتوویانن، نابێتە مایەی عەزاب، یاخود مایەی گوناهباریی و بەلا، بۆیە کوێر

بوونو کەڕ بوون، دوایی کە گەڕانەوە بۆ لای خوا، خواش گەڕایەوە سەریان، ﴿ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ﴾، بەڵام دووبارە جارێکی دیکە، چونکە خوویان پێوە گرتبوو، زۆریان لە بەرانبەر هەقیێدا کوێر بوونو کەڕ بوون، نافەرموێ هەموویان، ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرٌ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن، واتە: چاك دەیانبینێ کە چی دەکەن، کەچی شەرم لە خوای پەروەردگار ناکەن، ئەوە هەمووی کە خوا باسی سیفەتەکانی ئەوانمان بۆ دەکات وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: (دیوار لەگەڵ تۆمە گوێسوانە گوێت لێبێ)، بۆیە باسی ئەو سیفەتانەیان دەکات، تاکو ئێمە عیبرەتیان لێوەربگرین، مسوڵمانان بزانن کە جوولەکە خوا ئەو هەموو چاکەیەی لەگەڵ کردوونو، بە بەزەیی بووە لەگەڵیانو، نیعمەتی پێداون، کەچی هەروا بە سەرەخەریی‌و سەرسەختیی‌و بە کەللە ڕەقیی هێناویانە، بۆیە سەرەنجامەکەشیان ئاوا خراپە، دەبێ پەندیان لێوەربگرین، خوا سەرەنجاممان خێر بکات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ﴾، واتە: ئەی پێغەمبەر! (کە مەبەست پێی موحەممەدە ﷺ) ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت نێردراوەتە خوار، ڕایبگەیەنە، وە ئەگەر وانەکەی ئەوە پەیامو بەرنامەی خوات ڕانەگەیاندوە، توێژەرەوانی قورئان، وەك ئاماژەم پێدا لە بەرانبەر ئەم ڕستەیەدا کە دەفەرموێ: ﴿وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾، ئەگەر وانەکەی پەیامەکەی خوات نەگەیاندوە، مشتومڕێکی زۆریان کردووەو چوونە نێو تەفاصیلی ڕەوانبێژیی (بلاغة)یەوە، لەبەرئەوەی بە ڕواڵەت ئایەتەکە دەفەرموێ: ئەگەر پەیامی خوا نەگەیەنی، پەیامی خوات نەگەیاندوە، ﴿وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾، یانی: (وإذا لَمْ تُبَلِّغ رِسالته، فَما بَلَّغت رِسالَتهُ) دەڵێن: ئەوەش جۆرێکە لە دووبارەبوونەوە، دووبارەبوونەوەش لە کەلامی خوای پەروەردگاردا نییە، جا هەندێکیان گوتوویانە: لێرەدا خوای پەروەردگار ویستوویەتی بە پێغەمبەر ﷺ بفەرمووێ: ﴿وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ واتە: ئەگەر پەیامی خوا نەگەیەنی، بزانە کە پەیامی خوات نەگەیاندوە! واتە: وەك چۆن یەکێ لە شاعیرەکان دەڵێ: (والشِّعْرُ شِعرِي) شیعری من شیعرە، واتە: پەیام نەگەیاندن پەیام نەگەیاندنە، یانی: گوناهێکی زۆر زۆر گەورەیە، ناگونجێ بە غەیری خۆی بە هیچ شتێك وەسف بکرێ، هەڵبەتە دەشگونجێ وابێو مانایەکی جوانیشە.

بەڵام ئەوەی من بۆم دەرکەوتوە، دوای سەرنجدانی زۆری تەفسیرەکانو لێ وردبوونەوەی خۆم لە ئایەتەکان، ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ

﴿ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴾، ئەو ﴿ مَآ أُنزِلَ ﴾ یانی: (الشيءُ الخاصُّ الّذي أُنزِلَ إِلَيكَ مِن ربِّكَ) ئەو شتە تایبەتییەی کە لە پەروەردگارتەوە بۆت نێردراوەتە خوار، بەلاّم کە دوایی دەفەرمووێ: ﴿ فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ ﴾، ڕیسالەتەکە کۆی ئەو وەحییەیە کە بۆ پێغەمبەر ﷺ هاتوە، بەلاّم ﴿ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ﴾، شتێکی تایبەتە، ئەوکاتەش دووبارەبوونەوە دروست نابێ، ئەوەم پێ ڕاستترو ڕێکترە، واتە: خوا دەفەرمووێ: ئەگەر ئەو شتە تایبەتەی کە من پێمگوتووی‌و بۆت نێردراوەتە خوار، نەیگەیەنی، ماناى وایە کە هیچ بەشێك لە پەیام‌و بەرنامەی خوات نەگەیاندوەو وەك ئەوە وایە هیچت نەگەیاندبێ، واتە: ئەگەر ئەو بەش (جزء)ە نەگەیەنی، ماناى وایە گشت (كل)یشت نەگەیاندوە، بۆیەش وادەڵێم، چونکە خوای کاربەجێ لە ئایەتی دوایی دا، یەکسەر بۆمان ڕووندەکاتەوە کە ئەو شتە تایبەتە چییە؟ ئەویش ئەوەیە کە دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَسْتُمْ عَلَىٰ شَىْءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ ﴾، بلێ: ئەی خاوەن کتێبینە! لەسەر هیچ نین تاکو تەورات‌و ئینجیل‌و ئەوەی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوە، بەرپای نەکەن‌و کاری پێنەکەن، کەواتە: ئا ئەوە ئەو پەیامە تایبەتەیە کە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ، ئەگەر ئەوە نەگەیەنی، وەك هیچ بەشێك لە بەشەکانی پەیامی خوات نەگەیاندبێ، دیارە ئەویش شتێکی قورس بووە بۆ پێغەمبەر ﷺ، کە بیگەیێنێ بە جوولەکەو نەصرانییەکان کە لافو گەزافی زۆریان لێداوە: ئێمە خاوەن کتێبین‌و ئێمە واین‌و، ئێمە وا چووین! بە تایبەتی جوولەکەکان، پێغەمبەر ﷺ پێیان بفەرمووێ: ئێوە لەسەر هیچ نین، ئەگەر وێڕای تەورات‌و ئینجیلەکەی خۆتان (واتە: ئەوەی کە نەگۆڕدراوە، یان ئەو بەشەی کە پەیوەندیی بە موژدەدان بە پێغەمبەری کۆتاییەوە ﷺ هەیە) ئەگەر وێڕای ئەوە، شوێن قورئانیش نەکەون، ئێوە لەسەر هیچ نین، کە ئەوە هێنانە سەر (سفر)یانەو، دیارە زۆر لەسەر دڵیان قورسە، پێغەمبەری خواش ﷺ لەبەرئەوە کە ڕەوشت بەرزترین‌و

ڕەوشت جوانترین كەس بووە، زۆر پێیناخۆش بووە مەگەر زۆر ناچاربێ، كە شتێ بە كەسێ بڵێ، كە بزانێ پێی ناخۆشە، بە تەئكید جوولەكەو نەصرانیەكانیش ئەوەیان لە هەموو شتێك پێ ناخۆشتر بووە، تۆ زەربی سفریان بكەیو، بڵێی لەسەر هیچ نین، زۆر زۆر پێیان ناخۆشە، بۆیە خوای بالادەست وا بە جەخت لەسەر كردنەوە دەفەرموێ: دەبێ ئەوەیان پێ ڕابگەیەنی، ئەگەرنا وەك پەیامی خوات هیچ نەگەیاندبێ وایە، وە لە پێش ئەوەشدا دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ﴾، وە خوا لە خەڵك دەتپارێزێ، واتە: لە خەڵكی كافر، بۆیە لە زیانی ئەوان مەترسێو لە كاردانەوەی ئەوان مەترسێ، ئەو پەیامە بگەیەنە، تاكو ئەوان بزانن كە لە دوای هاتنی پێغەمبەری كۆتایی موحەممەد ﷺ، وە لە دوای دابەزینی قورئان، بەرنامە پێشووەكانو ڕێبازەكانی پێغەمبەرانی پێشوو لەبەر تیشكی قورئانو لەبەر تیشكی ڕێبازی پێغەمبەری كۆتایی دان، هەرچی ئەو پەسەندی بكات، پەسندەو هەرچی ئەویش پەسەندی نەكات، بەكەڵك نایەتو نەسخ بۆتەوەو كاری پێ ناكرێ، وە كەسانێك كە لەسەریان دەڕۆن، لە قیامەتێ دەبنە سەپانی پووشێ.

## هەڵوەشاندنەوەی بۆچوونێكی هەڵەی شیعە لە بارەی ئەم ئایەتەوە

لێرەدا شیعە دەربارەی ئەم ڕستە قورئانییە كە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾، ئیددیعای ئەوە دەكەنو لافی ئەوە لێدەدەن كە لێرەدا ئەو شتە تایبەتە كە خوا بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بیگەیەنە، ئیمامەتی (عەلی)یە خوا لێی ڕازی بێ! دەڵێن: ماناكەی ئاوایە: ئەی پێغەمبەر! بە خەڵك ڕابگەیەنە كە لە دوای تۆ ڕاستەوخۆ عەلی كوڕی ئەبو طالیب دەبێ بە ئیمامو

خەلیفەی مسولْمانان! ئنجا كە ئاواش دەڵێن، لەڕاستیدا هیچ بەڵگەیەكیان بەدەستەوە نیە، وەك پێشتریش باسمان كرد، وە ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەكان بكەین، دەبینین كە ئەو فیكرەیە شتێكی نامۆو نەگونجاوە لەگەڵ سیاقی ئایەتەكاندا، ئایەتەكان هەموویان باسی ئەوە دەكەن كە ئاوا بە جوولەكەو نەصرانییەكان بڵێو، ئاوا بۆیان ڕوونبكەوە ... هتد، هەموو ئایەتەكان لەو بارەوەن، وە ئیمامەتی عەلی خوا لێی ڕازی بێ شتێكی بێگانەیەو نامۆیە بە سیاقو جەوی ئایەتەكانو خزێنرانیە نێویان، شتێكی سەیرو نەگونجاوە، خوای پەروەردگاریش فەرمایشتەكەی هەمووی وەك ئاڵقەكانی زنجیرێك یەكدی دەبەستنەوەو، هەمووی تەواوكەری یەكدییە، وە ناگونجێ فیكرەیەكی نامۆ بێتە ناو شوێنێكەوە كە لەگەڵی نەگونجێ! بەلام با تەماشا بكەین بزانین ئەوان بەڵگەیان چییە؟

شیعەی دوازدە ئیمامیی (الشیعة الإثنا عشریة الإمامیة) دەڵێن: كاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاوایی (حَجّةُ الْوَدَاع) گەڕایەوە لە ساڵی دەیەمی كۆچی دا، لە شوێنێك كە (غَدِیر خُم)ی پێدەگوترێ، {كاتی خۆی (غَدِیر) بیرێك بووە، (خُمّ)یش چالاییەك بووە} ، سوپایەكەی لەوێ ڕاگرت، وە مسولْمانانی بەگشتی لەوێ وەستاند، وە پێی ڕاگەیاندن، كە عەلی لە دوای خۆی پێشەواو گەورەی مسولْمانانە، ئەویش دوای ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەی پێ ڕاگەیاندن، مەترسی هەبووە لە قبوولْنەكردنی هەندێك لە هاوەلانی بۆ ئەو مەسەلەیە كە چاویان لەوە بوو دوای پێغەمبەر ﷺ ببنە حوكمڕان!! دەڵێن: پێغەمبەر ﷺ خەریك بوو لە ترسی قبوڵنەكردنی ئەوان ڕاینەگەیەنێ، هەتا خوا پێی فەرمووە:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ وَإِن لَّمۡ تَفۡعَلۡ فَمَا بَلَّغۡتَ رِسَالَتَهُۥۚ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَـٰفِرِينَ ﴾، لە تەفسیرەكانی شیعاندا دەڵێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ ﴾: (أي: إمامةِ عَلِي) پێشەوایەتی عەلی ڕابگەیەنە، ﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، خوا لە خەڵك دەتپارێزێ (أي: مِنْ أَصْحَابِكَ) لە هاوەڵەكانت دەتپارێزێ، ناهێڵێ زەرەرت لێ بدەن، (وەك هاوەڵەكان

دوژمنی پێغەمبەر ﷺ بووبن‌و لێی لە کەمیندا بووبن!! ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، وە خوا ڕێنمایی کافران ناکات (أَي: الرافضين لإمَامَة عَلِي) ئەوانەی ڕەفزی ئیمامەتی عەلی دەکەن!! دیارە ئەوەش هەمووی لەسەر ئەم ئایەتە هەڵدەچنن، وە لەسەر فەرموودەیەکی پێغەمبەری خوا ﷺ کە فەرموویەتی: ﴿مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاهُ اللَّهُمَّ وَالِ مَنْ وَالاهُ وَعَادِ مَنْ عَادَاهُ﴾ {رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (١٨٥٠٢)، عَنِ الْبَرَاءِ بْنِ عَازِبٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ تَعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح لغيره} واتە: هەر کەسێ من دۆستی بم، نزیکی بم، (جا ئەوان دەڵێن سەرپەرشتیاری بم) ئەوە عەلی دۆست‌و نزیکیەتی (ئەوان دەڵێن: سەرپەرشتیاریەتی)، ئەی خوایە! هەر کەسێك دۆستایەتیی بکات، دۆستایەتیی بکەو، هەر کەسێك دژایەتیی بکات دژایەتیی بکە، دەڵێن: ئەوە بەو شێوەیە بووە کە پێغەمبەر ﷺ ئەو مەسەلە گرنگەی لەوکاتەدا ڕاگەیاندووە، ئەو ئایەتە بەو بۆنەوە هاتۆتە خوارێ[1]!

بەڵام ئەوەی ئەوان دەیڵێن: هیچ بنەمایەکی نیەو وەك زۆر بیروبۆچوونی دیکەیان قسەیەکی بۆشە، وە ڕاستیی مەسەلەکە بەم شێوەیە: پێغەمبەری خوا ﷺ پاش گەڕانەوەی لە حەجی ماڵئاوایی لە شوێنێك لە نزیك (الجحفة) بەناوی (غَدِيرِ خُمّ) لە نێوان مەککەو مەدینە لە ڕۆژی (١٨)ی (ذي الحجة)ی ساڵی دەیەمی کۆچیی دا، دوای ئەوەی بیستی کە کەسانێك بە خراپەو زەم باسی عەلی کوڕی ئەبو طالیب دەکەن، خوا لێی ڕازی بێ، ئەوانیش ئەو کۆمەڵە خەڵکە بوون کە لە یەمەن لەگەڵی گەڕاونەتەوە عەلی خوا لێی ڕازی بێ، لە یەمەن بوو لە یەمەنەوە گەڕایەوە، بۆئەوەی فریای حەج بکەوێ، لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ کۆمەڵێك لەگەڵی دابوون، ئنجا لەبەرئەوەی کە عەلی خوا لێی ڕازی بێ ڕازی نەبوو بوو لە قوماشێکی (بيت المال) کە پێیانە، یەکی سەرو قات بکەن، بەبێ ئاگاداریی وی سەرو قاتیان لێکردبوو، ئەویش دوایی لێی ستاندنەوەو گوتی: دروست نیە، لەسەر ئەوە بە خراپە باسیان کردوە، پێغەمبەریش ﷺ خەڵکەکەی کۆکردۆتەوەو فەرموویەتی: باسی عەلی مەکەن، ئەوەی کردوویەتی هەقە، بۆیە

---

١) بڕوانە: التفسير الكاشفي، ج٣، ص ٩٧، محمد جواد مُغنية.

ڕەوانییە زەمو غەیبەتی بکەن، باسی مەکەن، خۆشتان بوێ، من خۆشم دەوێ، مەسەلەکە ئاوا بووە.

ئنجا با تەماشای چەند دەقێك بکەین، کە لەڕاستیدا هەر ئەو دەقانە لەوبارەوە هاتوون، وە شیعەش هەر پشت بەو دەقانە دەبەستن، بەڵام ئەوان بە جۆرێك واتایان دەکەن، کە لەگەڵ ئەو بیرۆکە چەوتەی ئەواندا بگونجێ، کە بێگومان ئەوە جۆرێکە لە گۆڕینو لادانی وشەکان لە شوێنی خۆیان، وەك عادەتی سەرگەردانانەی خاوەن کتێبەکان لە پێش ئیسلامدا، ئەوەش ئەو دەقانەن کە لەوبارەوە هاتوون:

١- ﴿قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: وَحَدَّثَنِي يَحْيَى بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي عَمْرَةَ عَنْ يَزِيدَ بْنِ طَلْحَةَ بْنِ يَزِيدَ بْنِ رُكَانَةَ قَالَ: لَمَّا أَقْبَلَ عَلِيٌّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ مِنَ الْيَمَنِ لِيَلْقَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ بِمَكَّةَ تَعَجَّلَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَاسْتَخْلَفَ عَلَى جُنْدِهِ الَّذِينَ مَعَهُ رَجُلًا مِنْ أَصْحَابِهِ فَعَمَدَ ذَلِكَ الرَّجُلُ فَكَسَا كُلَّ رَجُلٍ مِنَ الْقَوْمِ حُلَّةً مِنَ الْبَزِّ الَّذِي كَانَ مَعَ عَلِيٍّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، فَلَمَّا دَنَا جَيْشُهُ خَرَجَ لِيَلْقَاهُمْ فَإِذَا عَلَيْهِمُ الْحُلَلُ، قَالَ: وَيْلَكَ مَا هَذَا؟ قَالَ: كَسَوْتُ الْقَوْمَ لِيَتَجَمَّلُوا بِهِ إِذَا قَدِمُوا فِي النَّاسِ، قَالَ: وَيْلَكَ انْزِعْ قَبْلَ أَنْ تَنْتَهِيَ بِهِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ قَالَ: فَانْتَزَعَ الْحُلَلَ مِنَ النَّاسِ فَرَدَّهَا فِي الْبَزِّ، قَالَ: وَأَظْهَرَ الْجَيْشُ شَكْوَاهُ لِمَا صُنِعَ بِهِمْ﴾(موحەممەدی کوڕی ئیسحاق هێناویەتی لە سیرەی خۆیدا، ئیبنو هیشام لەوەوە هێناویەتی)[1].

واتە: کاتێ عەلی خوا لێی ڕازی بێ لە یەمەنەوە گەڕایەوە، بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککە، پەلەی کرد، وە پیاوێکی لە سەربازەکانی لە شوێنی خۆی دانا، ئەو پیاوەش دوای ئەوەی کە عەلی خوا لێی ڕازی بێ چوو بۆ لای پێغەمبەر ﷺ بۆ مەککە هەڵسا لەو قوماشەی کە پێیان بوو {کە جارێ دابەش نەکراوەو هی (بيت المال)ە} هەر پیاوەی سەرو قاتی دانێ، (دیارە قوماشێکی تازەو چاك بووە)، کاتێك سوپایەکە نزیك کەوتەوە، عەلی خوا لێی ڕازی بێ چوو بیانبینێ، تەماشای کرد هەموو بەرگی تازەیان لەبەردایە، بە کابرای کە لە شوێنی خۆی دانابوو، گوتی: ئەی بێقەزابێ! ئەوە

١) السيرة النبوية، لابن هشام، ج ٤، ص ٣٥٢، ٣٥٣.

چیت کردوە؟ ئەوە چییە؟ گوتی: هەر کامێکیان قاتێکم داوەتێ، تاکو بە بەرگی نوێوە بێنە نێو خەڵکی، گوتی: بێقەزابی بەرگەکەیان لێ بستێنەوە، پێش ئەوەی بچینە لای پێغەمبەر ﷺ، ئیدی بەرگەکانی لێ ستاندنەوە، وە گێڕایەوە بۆ نێو قوماشەکە، سوپایەکەش سکاڵایان کرد، {واتە: ئەو خەڵکە قاتو جلەکانیان لێ ستێندرابووەوە} سکاڵایان کردو نارەزاییان دەربڕی (لەبەر ئەوەی عەلی خوا لێی ڕازی بێ ئەو فەرمانەی کردوە).

٢- ﴿عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيّ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ، قَالَ: اشْتَكَى النَّاسُ عَلِيًّا رِضْوَانُ اللّٰهِ عَلَيْهِ فَقَامَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ فِينَا خَطِيبًا، فَسَمِعْتُه يَقُولُ: أَيُّهَا النَّاسُ! لا تَشْكُوا عَلِيًّا، فَوَاللّٰهِ إِنَّهُ لأَخْشَنُ فِي ذَاتِ اللّٰهِ، أَوْ فِي سَبِيلِ اللّٰهِ مِنْ أَنْ يُشْكَى﴾ {رَوَاهُ الْبُخَارِي فِي التَّأْرِيخِ الكَبِير، وإبن إسحاق}[1]، واتە: ئەبو سەعیدی خودریی خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: خەڵکێك گلەییان لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب کرد باسیان دەکردو سکاڵایان لە دەست دەکرد، پێغەمبەر ﷺ هەڵسا وتاری بۆ داین (ناوی شوێنەکە ناهێنێ کە "غدیر خم"ە) دەڵێ گوێم لێبوو دەیفەرموو: ئەی خەڵکینە! گلەیی لە عەلی مەکەنو سکاڵای لە دەست مەکەن، سوێند بە خوا لەبەر خوا زۆر زبرە، یاخود لەڕێی خوای بەرزدا لەوە بەرزترە کە سکاڵای لەسەر بێ، (واتە: ناهەقیی قبووڵ ناکات، زەمی مەکەن لەو شتەی کە کردوویەتی لەبەرئەوەی هەقە).

٣- ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ بُرَيْدَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا، قَالَ غَزَوْتُ مَعَ عَلِيٍّ الْيَمَنَ فَرَأَيْتُ مِنْهُ جَفْوَةً فَلَمَّا قَدِمْتُ عَلَى رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ ذَكَرْتُ عَلِيًّا فَتَنَقَّصْتُهُ فَرَأَيْتُ وَجْهَ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ يَتَغَيَّرُ فَقَالَ: يَا بُرَيْدَةُ! أَلَسْتُ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنْفُسِهِمْ؟ قُلْتُ: بَلَى، يَا رَسُولَ اللّٰهِ! قَالَ: مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَعَلِيٌّ مَوْلاهُ﴾ {رَوَاهُ الحَاكِم برقم: (٤٥٧٨)، وَأَحْمَد برقم: (٢٢٩٩٥)، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين وَإبْنُ أبي شيبه برقم: (٣٢٧٩٥)}.

واتە: بورەیدەی ئەسلەمیی (یەکێکە لە هاوەڵان) خوا لێیان ڕازی بێ، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس لێی دەگێڕێتەوە، دەڵێ: من لەگەڵ عەلی بۆ جەنگێك

---

[1] ) السيرة النبوية، لابن هشام، ج ٤، ص ٣٥٣.

چووینــە یەمەن (بورەیدە لە خزمەت عەلی بووە، دیارە دەبێ ئەو بەرپرس بووبێ، چووە بۆ یەمەن) منیش حاڵەتێکی (جەفا)م لێ بینی، بێ مەیلییم لێ بینی، (وەك بڵێی وەك پێویست ئاگای لێ نەبووەو هەستی کردوە کە لەگەڵی سارده)، کاتێك گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ باسی (عەلی)م کرد (واتە: گلەیی کردوە لە لای پێغەمبەر ﷺ لە عەلی) تەماشام کرد ڕووی پێغەمبەری خوا گۆڕا، (واتە: پێی ناخۆش بوو)، ئنجا پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئەی بورەیدە! ئایا من بۆ ئیمانداران لە خۆیان لە پێشتر نیم؟ ﴿ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿ ٱلنَّبِيُّ أَوْلَىٰ بِٱلْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَأَزْوَٰجُهُۥٓ أُمَّهَٰتُهُمْ...﴿٦﴾ ﴾ الأحزاب، واتە: پێغەمبەر ﷺ بۆ ئیمانداران لە خۆیان لە پێشترەو دەبێ لە خۆیان خۆشتریان بوێ، وە هاوسەرەکانیشی دایکیانن، دیارە پێغەمبەر مەبەستی ئەوە بووە﴾، منیش گوتم: با، ئەی پێغەمبەری خوا (تۆ بۆ ئێمە لە خۆمان لە پێشتری)، فەرمووی: هەر کەسێك من خۆشەویستی بم، عەلیش خۆشەویستییەتی.

دیارە لێرەدا (مولاه) بەو مانایە نایەت کە شیعە دەیڵێن، بۆچی؟! چونکە ناگونجێ پێغەمبەر ﷺ بفەرموێ: هەر کەسێ من سەرپەرشتیاری بم، عەلی سەرپەرشتیاریەتی، چونکە کێشە لەسەر ئەوە نەبووە عەلی سەرپەرشتیار بێ، کێشە ئەوە بووە کە زەمی عەلییان کردووەو خۆشیان نەویستوە، واتە: پێغەمبەر ﷺ جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە عەکسەکەی لە نێو خەڵکیدا باو بووە، کە بریتی بووە لە ڕق، ڕقیان لە عەلی بووەو لەسەر ئەو هەڵوێستەی بوغزاندوویانە، ئەو هاوەڵەش دیارە لەسەر شتێك ساردیی لەگەڵیدا هەبووە، ئەویش فەرموویەتی: هەر کەسێك منی خۆشدەوێ، دەبێ عەلیشی خۆش بوێ، ئیدی هیچ باسی سەرپەرشتیارێتیو خەلیفایەتیی نیە.

٤- ﴿عَن زَيد بْنِ أَرْقَم رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: لَما رَجَعَ رَسُول الله ﷺ مِن حَجَّة الوَدَاعِ وَنَزَلَ غَدير خُمّ أمرَ بدوحاتٍ فقُنَّ[1]، ثُمَّ قَام فقَالَ: كَأَني قَد دُعيتُ فَأَجبتُ إِنّي

---

١) قنى الشيءَ يَقْنيه قَنْياً: كَسَبَهُ وَجَمَعَهُ/ المعجم الوسيط، ص ٧٦٣، کەواتە: فَقُنَّ: یانی: سەری درەختەکانو لقو پۆپەکانیان کۆکرانەوە سێبەریان پێ دروست کرا.

تَارك فِيكُم الثَّقلين أَحدهما أَكبَرُ مِنَ الآخَر: كِتَابَ اللّهِ وَعَترَتي أَهل بَيتِي فَانْظُرُوا كَيْفَ تَخْلفوني فيهما؟ فَإِنَّهُمَا لَن يتفرَّقا حَتَّى يرِدَا عليَّ الحوضَ ثُمَّ قَالَ: إِنَّ اللّه تعالى مولاي وأنا ولي كُلّ مُؤْمِنٍ ثُمَّ أخذَ بيدِ عَلي فَقَالَ: مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَهَذَا مَوْلاهُ، اللَّهُمَّ وَالِ مَنْ وَالاهُ وَعَادِ مَنْ عَادَاهُ، مَا كَانَ في الدوحاتِ أَحدٌ إلا قد راه بعينيه وسمعه بأذنيه﴾ {رَوَاهُ النسائي في (الكبرى) برقم: (٨١٤٨)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٤٩٦٩)، وَالحَاكِمُ برقم: (٤٥٧٦)، وَقَالَ: صَحِيح عَلَى شرط الشيخين} ، واته: زەیدی کوڕی ئەرقەم خوا لە خۆیی‌و بابی ڕازی بێ دەڵێ: کاتێ پێغەمبەری خوا ﷺ لە حەجی ماڵئاوایی (واتە: کۆتا حەجی کە هەر ئەو حەجەشی کرد) گەڕایەوە، لە غەدیری خوم دابەزی (لەوێ بارگەو بنەیان خست)، دوایی فەرمانی کرد هەندێ درەخت سەرەکەیان هێندرایەوە یەك، (سێبەریان پێ کرا) ئنجا دیارە لەژێر ئەو سێبەرەدا وەستاو وتاری دا فەرمووی: نزیکە من بانگ بکرێم‌و وەڵام بدەمەوە، (واتە: بانگ بکرێم، بۆ مەرگ، ڕووحەکەم بەرز بکرێتەوە بۆ مەلەکووتی ئەعلاو، منیش وەڵام بدەمەوەو وەفات بکەم) من لە نێو ئێوەدا دوو شتە قورسەکان بەجێ دێڵم، کە هی یەکەمیان لە هی دووەمیان گەورەترە، کتێبی خواو بنەماڵەکەم (یانی: نزیکەکانم) سەرنج بدەن‌و ریابن بزانن چۆن دەبنە جێنشینی من لە چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ قورئان، وە لەگەڵ بنەماڵەو نزیکانمدا، چونکە قورئان‌و خزم‌و نزیکەکانم لە یەك جیانابنەوە، تاکو پێکەوە دێنە سەر حەوزی کەوسەر، (واتە: ئەو خزمانەی کە ڕەسەنن، هی پێغەمبەر ﷺ لە ڕێبازی پێغەمبەر لانادەن لە ڕێبازی قورئان لانادەن، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ خزمی ناڕەسەنیشی هەبوون، بۆ وێنە: (أبو لهب)ی مامی، هەروەها زۆر کەس هەیە بە شەجەرە خزمیەتی، بەڵام تەماشا دەکەی پشتی لە پێغەمبەرە ﷺ کە دیارە ئەوە هیچ نیە)، دوایی فەرمووی خوا دۆستو نزیکی منە، وە من دۆستو نزیکی هەر ئیماندارێکم، دوایی دەستی عەلی گرتو فەرمووی: هەر کەسێك من دۆستی بم، ئەوەش دۆستیەتی ئەی خوایە! هەر کەسێك دۆستایەتی بکات، تۆش دۆستایەتیی بکە، وە هەر کەسێك دژایەتیی بکات، دژایەتیی بکە، وە هیچ کەس نەبوو لە ژێر ئەو درەختانەدا، مەگەر بە چاوی خۆی ئەوەی بینی، وە بە هەردوو گوێیەکانی خۆشی ئەوەی بیست.

## جا با بزانین گرفتی خراپ تێگەیشتنی شیعە لە چی دایە؟

یەکەم: ئایەتەکەیان بە غەڵەت هێناوە!

واتە: فیکرەیەکی نامۆو نەگونجاو "لەگەڵ مانای ئایەتەکەو سیاقی گشتی ئایەتەکاندا" یان خستۆتە نێو ئایەتەکەوە، ئەگەرنا ئایەتەکە هیچ دەلالەتی لەسەر ناکاتو، کەمو زۆر پەیوەندیی پێیەوە نیە.

دووەم: هەروەها فەرموودەکەشیان لە جەوو سیاقی خۆی دەرهێناوەو، مانایەکی نامۆیان تێخزاندوە، چونکە هۆی گوترانی ئەو فەرموودەیە، "وەك چۆن ئایەت (سبب النزول)ی هەیە فەرموودەش (سبب الورد)ی هەیە " ئەوە بوو کە باسمان کرد: خەڵکێك زەمی عەلییان کردوە، خوا لێی رازی بێ لەسەر هەق بێژیی و هەق گوتن، پێغەمبەریش ﷺ بەرگریی لێکردوە، کە زەمی نەکەن، وە بە تەئکید پێغەمبەری خوا ﷺ خوای زانا عزَّ وجلَّ ئاگاداری کردۆتەوەو پێی راگەیاندوە کە لە دوای وەفاتی خۆی، کەسانێك دەبن کە لە عەلی کوڕی ئەبو طالیب یاخی دەبنو لێی جیادەبنەوە، وەك (معاویة)و کۆمەڵەکەیو، کۆمەڵی خەواریج، بۆیە تەئکیدی کردۆتەوە کە من عەلییم خۆشدەوێو ئێوەش (عەلی)تان خۆشبوێ، مەسەلە خۆشویستنی (عەلی)یە خوا لێی رازی بێ، ئەویش لەبەر ئەو هۆکارەی باسمان کرد، نەك ئیمامەتو خیلافەت، ئەگەرنا پێغەمبەر ﷺ لە جیاتی فەرمووبای (مَنْ كُنْتُ مَوْلاهُ فَهَذَا مَوْلاهُ) دەیفەرموو: هەر کەسێك کە من بەرپرسیمی ئەوە عەلی لە دوای من خەلیفەو حوکمڕانو سەرپەرشتیاریەتیو، بەتەواویی مەسەلەکەی ڕوونو یەکلایی دەکردەوە.

سێیەم: گۆڕین (تحريف)ی ماناو چەمکی وشەی (مولی):

شیعە دەڵێن: (المولی) یانی: (الأَولى بالتَصَرّف، وَهُوَ عَين الإمامة) یانی: (مەولا) واتە: لە پێشتر بۆ بڕیاردان، کە ئەوەش خودی پێشەوایەتییە، دەڵێین: (مَولی) کەی بە مانای (أولی)یە؟ بەڵکو لە زمانی عەرەبیدا بەو مانایە هەر نەهاتوە، (مولی) و (أولی) زۆر لە یەك جیان، بەڵام ئەگەر گریمان (مولی) بە مانای (أولی)ش بێ، دەبێ بڵێین: (الأولی بالمَحَبَّة) بۆچی؟ چونکە ڕووداوەکە

باسی ئەوە دەکات کە (علي)یان خۆشنەویستوەو ڕقیان لێ بۆتەوەو ڕەخنەیان لێ گرتووە، گلەییان لێ کردوە، کەواتە: ئەوەی کە پێویستی بە جەخت لەسەرکردنەوە بووە، خۆشویستنی عەلی بووە خوا لێی ڕازی بێ، نەك بە خەلیفە دانانی، کە ئەو مەسەلەیە هەر لە ئارادا نەبووە، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە کە مەبەست لە (مولی) یا (ولي) یانی: (الأَوْلی بالمَحَبَّة) ئەگەر (مولی) بە مانای (أولی)ش بێ، کە واش نیە، ئەوەیە کە خوا لە سوورەتی (آل عمران) لە ئایەتی (٦٨)دا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾، ﴿ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ ﴾ یانی: (إنَّ أَقْرَبَ النَّاسِ بإِبراهِيم) نزیکترین کەس و لە پێشترین کەس بۆ ئیبراهیم، ئەوانەن کە کاتی خۆی شوێنی کەوتوون، وە ئەم پێغەمبەرەیە (کە موحەممەدە ﷺ)، وە ئیماندارانێکن کە لە خزمەت ئەو پێغەمبەرە دان کەواتە: ئەگەر گریمان وشەی (مولی) بە مانای (أولی)ش بێ، یانی: (الأولی والأقرب بالمحبة والإتباع) وە مەسەلەی سەرپەرشتیاریێتیی و ئیمامەت لەئارادا نیە.

چوارەم: ئنجا شیعەکان دەڵێن: چۆن پێغەمبەر ﷺ ئەو هەموو خەڵکە کۆدەکاتەوەو وتاریان بۆ دەدا، کە پێیان بڵێ عەلی یان خۆشبوێ؟ خۆ مسوڵمانان هەر دەبێ یەکدییان خۆشبوێ، ئەوە شتێکی بەڵگە نەویستە؟!

دەڵێین ئەوە ڕاست نیە، چونکە:

یەك/ خۆشویستن بەگشتی بۆ مسوڵمانان و ئیمانداران جیایەو، خۆشویستنی تایبەتییش جیایە.

دوو/ هۆکارێك هەبووەو قیل و قالێك بلاوبۆتەوەو، کەسانێك زەمی عەلی یان کردوە خوا لێی ڕازی بێ، لەسەر ئەو هەڵوێستەی کە باسمان کرد، پێغەمبەریش ﷺ بە پێویستی زانیوە کە باسی بکات، وەك چۆن جاری دیکە بۆ ئەبو بەکر خوا لێی ڕازی بێ بە پێویستی زانیوە باس بکات، کە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً مِنْ أُمَّتِي لاتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ ولكن أخوَّة

الإسلام وَمَوَدَّتُهُ﴾ {رَوَاهُ أَحْمَد بـرقم: (١١١٥٠)، وَالبُخَارِيُّ بـرقم: (٤٦٦)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦١٢٠)}، واتـه: ئەگـەر لـە نێـو ئۆممەتەكـەم دا كەسـم كردبایـە بـە نـزیكتـرین خۆشەویسـتی خـۆم، ئـەوە ئەبوبەكـرم دەكـردێ، برایەتیـیو خۆشـەویستی ئیسلامیی (لە نێوان دا هەیـە).

**مەسـەلـەی دووەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، وە خـوا لـە خەڵكی دەتپارێزێ، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، بێگومان خـوا ڕێنمایی كۆمەڵی كافران ناكـات، لەوبـارەوە ئـەم فەرموودەیـە هەیـە: ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَـتْ: كَانَ النَّبِيُّ ﷺ يُحْرَسُ حَتَّى نَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، فَأَخْرَجَ النَّبِيُّ ﷺ رَأْسَهُ مِنَ الْقُبَّـةِ، فَقَالَ: (يَا أَيُّهَا النَّاسُ انْصَـرِفُوا فَقَـدْ عَصَـمَـنِي اللهُ)﴾ {رَوَاهُ التِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٣٠٤٦)، والحَـاكِم بـرقم: (٣٢٢١)، وَحَسَّنَهُ الألبَـانِي فِي (السلسلة الصحيحة) رقم: (٢٤٨٩)}، واتە: دایكمان عائیشـە خـوا لـێی ڕازی بـێ، گوتوویـەتی: كـە پێغەمبـەر ﷺ ئێشـكەی لـێ دەگیـراو پاسـەوانیی لـێ دەكـرا، هەتـا ئـەم ئایـەتە هاتـە خـوارێ: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾، وە خوا لە خەڵكی دەتپارێزێ، پێغەمبەر ﷺ سـەری دەرهێنا لـە قوببـە (چـادرێك بـووە، شـتێك بـووە هەڵیانـداوە، وا پێدەچـێ لـە غەزایـەك بـووبن‌و لـە چۆڵـەوانییەك چادریان هەڵداوە) فـەرمووی: ئـەی خەڵـكینە! بـڕۆن هـەر كەسـەو بچێتەوە شوێنی خـۆی، خـوای بـەرز منـی پاراسـتوە، (بەڵـێنی داوە مـن بپارێزێ‌و پێویسـت ناكات، خۆتـان مانـدوو بكـەن).

لێـرەدا پرسـیارێك دەكـرێ: ئەگـەر خـوا ڕایگەیانـدوە كـە پێغەمبـەری خـۆی ﷺ دەپارێزێ، ئـەدی بۆچـی لـە جـەنگی ئوحـوددا ددانـی شـكا؟ ڕوومـەتی برینـدار بووو زۆر نارەحـەت بوو؟ پاشـان بۆچـی لە كاتی گرتنی خەیبـەردا ژەهر خـواردیان كـرد[1]، وە لە صـەحیحی بوخـاریی دا هـاتوە كـە لـەبیـدی كـوڕی ئەعصــــەم

---

١) صحيح البخاري: ٥٧٧٧.

جـادووی لــێكـردوە[١]؟!

زانـایان بە چـەند شـێوەیەك وەڵامـی ئەو پرسـیارەیان داوەتـەوە:

١/ (راغب الأصـفهاني) دەڵـێ: {عِصْمَةُ الأَنبيَـاءِ:

أ) حِفظُهم بما خُصّـوا به من صـفاء الجَـوهر.

ب) ثُـمَّ بما أولاهـم مِن الفضـائل الجسـمية والنفسـية.

ج) ثُـمَّ بالنُّصْرَةِ وبتثبيتِ أقـدامهـم.

د) ثُـمَّ بإنـزال السَّكِينَـةِ عَلَـيْهِم.

هـ) وَبِحِفظ قُلُوبهم وَبالتَّـوفيـق}.

واتـە: پارێزرانی پێغـەمبـەران ﷺ لەلایەن خـوای پەروەردگـارەوە، واتـە:

أ) پاراسـتنیان بەوەی كە جەوهـەرو فیتـرەتێكی زۆر صـاف‌و سـاغی پێـداون.

ب) پاشـان بـەو ڕەوشـت‌و ئاكـارە جەسـتەیی‌و دەروونییـە بەرزانـەی كـە خـوای پەروەردگـار لەسـەری سـروشـتاندوون.

ج) دوایی بەوە كـە خـوا پشـتی گرتـوون‌و پێی چەسـپانـدوون.

د) دوایی بەوە كـە خـوا ئـارامیی ڕشـتوّتە سـەر دڵیـان.

هـ) دوایـی بـەوە كـە خـوا دڵـی پاراسـتوون‌و كـاری بـۆ ئاسـان كـردوون، واتـە: پاراسـتنی خـوا بۆ پێغەمبەران ﷺ ئەو پێنـج واتـایانەی هەیـە.

كەواتـە: كـە لـە جـەنگی ئوحـوددا ددانـی شـكاوە، ڕوومـەتی بریـنـدار بـووەو، تووشـی نارەحـەتیی بووە[٢]، لەگـەڵ ئەم ئایەتـە تێكناگیـرێ، چونكە ئـەم ئایەتـە

---

١) صحيح البخاري: ٥٧٦٥ و ٥٧٦٦.

٢) بڕوانـە: السيرة النبوية لابن هشـام، ج ٣، ص ٢٦، كە لەوبـارەوە ئەمـە هـاتـوە: (... أن عتبة بن أبي وقاص رمى رسول الله ﷺ يومئذ فكسر رُباعيَّتَـهُ اليُمنـى السُّفْلـى، و جُـرِحَ شَفتُـهُ السُّفْلـى، وأن عبدالله بن شـهاب الزهـري شجَّـهُ فـي جَبْهَتِـهِ، وأن ابـن قَمْئـةَ جَـرَحَ وَجْنَتَـهُ فَدَخَلَـتِ حَلْقَتـان من حِلَق المغفر في وجَنَتـه، و وقع رسـول الله ﷺ في حُفـرة من الحُفَـر التـي عَمِـل أبو عـامر لِيَقع فيها المسلمون...).

باسی پاراستنی مەعنەویی پێغەمبەر ﷺ دەکات، بەپێی قسەی ڕاغیب، دیارە (ڕاغیب)یش بۆیە وا دەڵێ: چونکە هەندێ لە پێغەمبەران کوژراون، وەك زەکەرییاو یەحیا، ئەدی خوا چۆن پاراستوونی؟ واتە: لەو ڕووانەوە پاراستوونی، نەك لە ڕووی جەستەییەوە.

٢/ هەندێکیشیان وا چارەسەری ئەو ئیشکالە دەکەن، دەڵێن: ئەم ئایەتانە پاش جەنگی ئوحود دابەزیون، واتە: لە دوای جەنگی ئوحودەوە پێغەمبەر ﷺ نە برینداربووە، نە نارەحەت بووە. منیش دەڵێم: دوای جەنگی ئوحودیش بووە، چونکە لە جەنگی خەیبەردا ژەهر خوارد کراوە!

٣/ منیش وای تێدەگەم، کە مەبەست لە پارێزرانی پێغەمبەر ﷺ جگە لەو واتایانەی کە ڕاغیب گوتنی، کە بۆ هەموو پێغەمبەران ئەو پاراستنە مەعنەوییە هەر هەبووە، بەلام پاراستنی پێغەمبەرمان موحەممەد ﷺ، پاراستنی گیانیی بووە، واتە: کە کافرەکان بۆیان ناکوژرێ، بەلام خوا نەیفەرمووە: بریندار ناکرێ‌و، ژەهر خوارد ناکرێ‌و، جادووی لێ ناکرێ‌و، نارەحەت ناکرێ‌و، خەفەتی نادرێتێ، ئەوەی نەفەرمووە، واتە: لێرەدا مەبەست لە: ﴿ وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ ﴾ یانی: (یحفظكَ مِنَ القَتل)، واتە: دەتپارێزێ لەوەی کە بتکوژن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾، بێگومان خوا ڕێنمایی کۆمەڵی کافران ناکات، یانی چی خوا ڕێنماییان ناکات، ئەدی خوای پەروەردگار بۆچی پێغەمبەرانی ﷺ ناردوون؟! هەندێ لە زانایان هەندێ ئیشکال‌و مشتومڕیان لێرەدا هەیە، بەلام ئەم ئایەتە دوو مانای بێ گرێ‌و گۆڵی هەن:

یەکەم: هیدایەتیان نادات، واتە: ئەو هیدایەتە تایبەتەی خوا بۆ ئیماندارانی دەنێرێ لە ئەنجامی ئیمانەکەیاندا، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ زَادَهُمۡ هُدٗى وَءَاتَىٰهُمۡ تَقۡوَىٰهُمۡ ١٧ ﴾محمد، ئەو جۆرە هیدایەتە کافرەکان لێی

بێبەشن، چونكە هەنگاوی یەكەمیان بەرەو خوا نەناوە، تاكو خوای پەروەردگاریش هاوكارو دەستبارگریان بێ.

دووەم: بەڵام من پێمـوایە "وەك هەندێ لە توێژەرەوانی قورئانیش ئاماژەیان پێداوە" ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەكە بكەین لێرەدا، ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴾ مەبەست پێی ئەوەیە كە ڕێنمایی یان ناكات بۆئەوەی زیان لە تۆ بدەن ئەی پێغەمبەر ﷺ! یاخود ڕێنماییان ناكەن كە زیان لە ئەهلی ئیمان بدەن، واتە: خوای دادگەر كار ئاسانییان بۆ ناكات و ڕێنمایی یان ناكات و لەگەڵیان نابێ، لەوبارەوە، چونكە سیاقەكە باسی زیان پێ گەیاندن و دژایەتیی دەكات.

**مەسەلەی سێیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ ﴾، ئێمە پێشتریش باسی ئەوەمان كرد، كە خوا دەفەرموێ: بڵێ ئەی خاوەن كتێبینە! لەسەر هیچ نین، ئەگەر تەورات و ئینجیل و ئەوەی لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێنراوە، كاری پێنەكەن و جێبەجێی نەكەن، لێرەدا كە خوا دەفەرموێ: ﴿ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ ﴾، ﴿ شَيۡءٍ ﴾ یانی: شت، ﴿ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ ﴾، یانی: لەسەر هیچ شتێك نین، عەرەب عادەتیان وایە ئەگەر شتێك زۆر نادیدەی بگرن، دەڵێن: (لَيْسَ بشيء)، شتێك نیە، یان دەڵێن: (أَقلّ مِن لا شيء) لە هیچ كەمترە، پێغەمبەریش ﷺ وەك لە صەحیحی بوخارییدا هاتوە پرسیاریان لێكردوە دەربارەی (كُهَّان) كاهینەكان، ئەوانەی بە حیساب هەواڵی داهاتوو دەدەن، فەرموویەتی: ﴿لَيْسُوا بِشَيْءٍ﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٧١٢٢)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥٩٥٣)، وَإِبْنُ حِبَّان برقم: (٦١٣٦) قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح} هیچ شتیك نین، واتە: هیچ نین، شتێك نین، یانی: كە بتوانن هەقێ بڵێن و نهێنیی ئایندە ئاشكرا بكەن، لێرەشدا، ﴿ لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ ﴾ (أَي: دينٍ يعتدُ بهِ وَيَلِيقُ بأَن يُسَمّى شَيئاً لِظُهور

بطلانـهِ وَوضُـوح فسـادِه)[1]، واتـه: لەسـەر دینـێك نیـن كـه بایـەخی هـەبێ، وه شایسـتەی ئەوەبـێ كـه پێـی بگوتـرێ: شـت، لەبـەرئەوەی كـه زۆر پووچـەو زۆر ناڕێكـه، واتـه: كـه ئێوه پابەنـد نـابن بـه تـەوراتو ئینجیـلو بـه وەحـی كۆتـایی خـواوه، كـه دابەزێنـراوه بـۆ پێغەمبـەری كۆتـایی موحەممـەد ﷺ، مانـای وایـه لەسـەر بۆشـن.

ئنجـا كـه دەفـەرموێ: ﴿حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ﴾، ئـەوەی لێـوەردەگیـرێ كـه دینـداریی و خواپەرسـتیی، بـەبێ كتێبـی خـواو بـەبێ وەحـی خـوا، نایـەته دی، كەواتـه: هەنـدێك لـه ئەهلـی تەصـەووف، ئەوانـەی كـه لـه قورئـانو سـوننەت شـارەزانین و پێیـان وایـه دەگونجـێ شـێخێكی نەخوێنـدەوار ببێتـه ڕێنماییكـەریان، پێیـانوایـه دەگونجـێ ئینسـان بـەبێ شـارەزایی لە شـەریعەت دینداریی بكات، وه هەیـانه گوتوویەتی: (حَدَّثَنِي قَلْبِي عَن رَبِّي) واتـه: دڵـم لـه پەروەردگارمـەوه هەواڵـی پێـدام! ئەوانـه لەڕاسـتییدا تێـی نەگەیشتوون، ئنجا هەرچەنده خوا لێرەدا ئەوه بـه خـاوەن كتێبـەكـان دەفەرموێ، بـەڵام لـه پشـت ئەوانـەوه بـه مسـوڵمانانیـش دەفـەرموێ، كـه بنـاغەی دینداریی، شـوێنكەوتنی قورئـانەو شـوێنكەوتنی وەحـی خوایـه، بـەبێ وەحـی خـوا چـۆن مامەڵـه لەگـەڵ خـوادا دەكـرێ؟! ئەگـەر پێویسـتی نەكردبایـه، خـوا ئـەو هـەموو پێغەمبـەرانەی نەدەنـاردن و، ئەو كـتێبانەی دانـەدەبەزانـدن، دیاره پێغەمبـەران لـه لووتكـەی عەقـڵ و حیكمـەت دابوون، ئـەدی بۆچی وەحـی بـۆ پێغەمبـەران هاتوه؟ ئەگـەر وابووایـه، خوا حـەواڵەی عەقـڵی خۆیـانی دەكـردن، هەروەها پێغەمبـەران لـه لووتكـەی صـەفای دڵ و دەروون دا بـوون، ئنجـا ئەگـەر دڵ سـافییو سـاف كردنەوەی دڵ بـەس بووایه بۆ هیـدایەت وەرگرتـن، پێغەمبـەران لـه هەموو كـەس فیطـرەت دڵ و دەروونیـان سـاغ و سـافتـر بـووه، بـەڵام نـەخێر، ڕێ دەركـردن لـەم ژیانی دنیـاییەداو، بەرێـی خۆ بینین، پێویسـتی بـه وەحـی خـوا هەیـه، پێویسـتی بەو شـەریعەته هەیـه كه لـەرێـی وەحـی خـوای پەروەردگـارەوه دێ.

---

١) روح المعـاني، ج٣، ص٣١٤.

ئنجا لـێرەدا کـە دەفـەرموێ: ﴿ حَتَّىٰ تُقِيمُوا۟ ٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴾، هەنـدێك لە زانـایان ئەو ئیشـکالەیان بۆ دروسـت بووەو گوتوویـانە: ئایا تـەوراتو ئینجیل کە پـڕن لـە شـتی ئەفسـانەیی غەڵـەتو پەڵـەتو گـۆڕاون‌و دەسـتکاریی کـراون، وەك دەقـی قورئـان دەفـەرموێ، ئـەدی چۆن خـوا داوایـان لـێ دەکات کـە هـەتا تـەوراتو ئینجـیل بەرپـا نەکـەن‌و پێیانـەوە پابەنـد نـەبن، هـەروەها ئـەوەی کـە بۆیـان دابەزێنراوە لە پەروەردگاریان، لەسەر هیچ نین، چۆن وا دەفـەرموێ؟! لێکۆڵـەرەوان ئاوایـان وەڵام داوەتـەوە:

دەڵێن: مەبەسـت ئەو بەشەیە لە تەوراتو ئینجیل کە بە سـەلامەتیی ماوەتـەوە، یاخـود ئەو بەشـەیان کـە لەگەڵ وەحـی کۆتـایی خـوا تێکناگیـرێ، کـە قورئانـە، وە موژدە دەدا بە هاتنی پێغـەمبـەری خاتـەم موحەممـەد ﷺ وە بـە دابـەزینی کـتێبی کۆتایی خـوا، کە قورئـانە.

بەڵام من شـتێکی دیکەشـی لـێ وەردەگـرم ئەویـش ئەوەیـە، کـە خـوا دەفەرموێ: ئـەی جوولەکـەو نەصـرانییەکان! ئێـوە ئەگـەر لەگـەڵ ئـەو تـەوراتو ئینجیلانـەی خۆشـتاندا، هەرچـەندە دەسـتکاریی کـراون‌و گـۆڕدراون، ڕاسـت بکـەن‌و پێیانـەوە پابەنـدبن، دەتـانگـەیەنن بـەوەی کـە بـڕوا بـە پێغـەمبـەری کۆتـاییش بێـنن، کـە بێگومان ئـەوەش وایــە، چونکە ئێسـتاش لـە پـەیمانی کۆنـدا، وە لـە پـەیمانی نوێدا (واتـە: تـەوراتو کتێبـەکانی دیکـەی کـە لەگـەڵـنیو، ئینجـیلەکان‌و کتێبەکـانی دیکـە کـە لەگـەڵـیان دان) ئێسـتاش زۆر دەق هـەن کـە مـوژدەی ئـەو پێغـەمبـەرانە دەگـەیەنن، بـەوەی کـە پێغـەمبـەری کۆتـایی دێ، وە قورئـان دادەبـەزێ، چـەند وەسـفێکیان باسـکردوون، لـەوبارەوە کـە پێغـەمبـەرێك دوایـی دێو دینەکـەی‌و بەرنامەکـەی دنیا دادەگـرێ، کـە ئـەو وەسـفانە تـەنیا لەگـەڵ پێغـەمبـەری کۆتـایی موحەممـەددا ﷺ دەگـونجێن، کەواتـە: دەتـوانین بڵـێین جوولەکـەو نەصـرانییەکان ئەگـەر لەگـەڵ تـەوراتو ئینجیلەکـەی ئێستاشـیاندا "بـەو گـۆڕان‌و دەسـتکاریی کرانەشـیانەوە" ڕاسـت بکـەن، ئـەوەش دەیانگەیـەنێ بـەوەی کـە بـڕوا بێـنن بـە کۆتـا نوسـخەی هیدایەتی خواو پێغـەمبـەری کۆتـایی خـوا موحەممـەد ﷺ.

**مەسـەلەی چـوارەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، دەفەرموێ: زۆرێکیان لەوانە، (واتە: لە جوولەکەو نەصرانییەکان) ئەوەی لە پەروەردگارتەوە بۆت دابەزێنراوە (طغیان)یان تێدا زیاد دەکات، واتە: یاخیبوون و گوناهو سەرپێچیی ﴿ وَكُفْرًا ﴾، وە کوفریشیان تێدا زیاد دەکات، ﴿ فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴾، خەفەت لە کۆمەڵی کافران مەخۆ، پێشتریش ئەو پرسیارەمان کرد، ئایا دەگونجێ قورئان ببێتە هۆکاری زیادبوونی یاخیی بوون و کوفر لە ئینسـاندا؟! سەرەتا دەڵێین: ئەم ئایەتەی وەك ئەو ئایەتانەی سووڕەتی (التوبة)یە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا مَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ فَمِنْهُم مَّن يَقُولُ أَيُّكُمْ زَادَتْهُ هَٰذِهِۦٓ إِيمَٰنًا فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ فَزَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَهُمْ يَسْتَبْشِرُونَ ﴿١٢٤﴾ وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ وَمَاتُوا۟ وَهُمْ كَٰفِرُونَ ﴿١٢٥﴾ ﴾:

**ئنجا دەڵێین:**

١/ هەڵبەتە لەڕووی پزیشکییەوە خواردنی باش خواردنێك کە پڕ بێت لە پرۆتینات و ڤیتامینات و ... هتد، ئەگەر ئینسانێکی ساغ بیخوا، لێی بەهرەمەند دەبێ، ئەدی نەخۆشێك؟ نەخۆش بیخوا، ڕەنگە هەر نەخۆشییەکەی پێ زیاد بکات، نەخۆش بە خواردنی چاك زەرەر دەکات، چونکە میزاجەکەی تێکچووە، بۆ وێنە: ئاوێکی شیرین و زوڵاڵ بدەیە کەسێك کە تووشی گرانەتا بووبێ، لە زاری تاڵە، وا دەزانێ ژەقنەبووتە، کاتێك هەڵامەت دەگری، تام لە هیچ ناکەی، هیچ شتێك بۆن ناکەی، بۆچی؟! چونکە میزاجەکەت تێکچووەو هەڵسوکەوتێکی نارێك لەگەڵ دەرەوەی خۆیدا دەکەن، ئنجا بە هەمان شێوە، ئەوانەش کە میزاجی دەروونیان تێکچووە، بەو هیدایەتەی خوا، لە جیاتی ئەوەی بەهرەمەندبن، زەرەرمەند دەبن، ئەوە لە لایەك.

٢/ پاشان هەتا ئایەت زیاتر دادەبەزن، ئەوانە زیاتر حەسەدو بوغزیان دەجووڵێ بەرانبەر بە ئیسلامو، بەرانبەر بە ئەهلی ئیسلام، مانای وایە ئەوەش دەبێتە هۆی زیاتر یاخی بوونو کافربوونیان.

٣/ پاشان هەتا ئایەت زیاتر دادەبەزن، ئەوانیش بڕوایان پێناکەن، ئنجا کەسێك کە بڕوا بە ئایەتێك نەکات، جیایە لەوەی کە بڕوا بە دوو ئایەتان ناکات، هەروەها ئەویش جیایە لەوەی کە بڕوا بە شەش هەزار ئایەت ناکات، وە کەسێك بڕوا بە یاسایەکی ئیسلام ناکات، جیایە لە کەسێك کە بڕوا بە هیچ یاسایەکی ئیسلام ناکات، بەڵێ کوفر هەر کوفرە، بەڵام کوفریش (درجات)ی هەیە، وەك چۆن ئیمان (درجات)ی هەیە، وەکو چۆن ئیمان پلە پلەیە، کوفریش پلە پلە بەرەو خوارە، کوفر هەیە، کوفرتر هەیە، کوفری سەختو پتەو هەیەو کوفری سووکتر هەیە، ئنجا جێی سەرنجە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ﴾، نافەرموێ: هەموویان، دەفەرموێ: زۆریان بەو وەحییەی کە بۆ تۆ دادەبەزێو لێی یاخی بوونو کافر بوون، وەحییەکە کە بۆ تۆ دادەبەزێ، ئەوان بە هۆیەوە لە یاخی بوونو کافر بوون زیاد دەکەنو تێیاندا زیاد دەکات چونکە هەیانە وانیەو هیدایەت وەردەگرێ.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّـٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، دیارە ئێمە پێشتر ئەم ئایەتەمان لە سوورەتی (البقرة) لە بەرگی یەکەمی ئەم تەفسیرەدا تەفسیر کردووەو ڕوونمان کردۆتەوە، بەڵام لێرەش هەر شتێکی کورتی لەسەر دەڵێین، خوا دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، وە ئەوانەی گەڕاونەوە، (واتە: گەڕاونەوە بۆ لای تەورات، یان بۆ لای ئەو بەرنامەیەی کە مووسا لەسەری بووە، یانی: جوولەکەکان)، وە صابیئەکانو نەصرانییەکان، هەر کامێك لەو چوار میللەتانە، ﴿ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا ﴾، ئیمان بە خواو بە ڕۆژی دوایی بێنێو، کردەوە باشەکان

ئـەنجام بـدات، ﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ﴾، نەترسیان لەسـەرەو نـە خەمباریش دەبـن.

ئێمـە پێویسـت دەکـات جـارێ لـە ڕووی ماناکەیـەوە قسـەیەك لەسـەر ئـەم ئایەتـە بکـەین، دوایـی لە ڕووی چۆنیـەتی ڕێزمـانییەوە قسـەیەکی لەسـەر بکـەین:

لـە ڕووی مانـاکـەیـەوە:

ئەم ڕستە قورئـانییە وەك کاتی خۆی لـە تەفسـیری سـوورەتی (البقرة)دا باسـمان کـردوە، دوو مانـای ڕاسـتی هەن، مانایەکی هەڵەشـی هەیە، دوو مانا ڕاسـتەکان:

یـەك: مەبەسـت لـە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، لەبەرئـەوەی ﴿ءَامَنُواْ﴾ بۆتـە درووشـم بـۆ مسـوڵمانان واتـە: شـوێنکەوتووانی موحەممـەد ﷺ، ئەگـەرنا جوولەکـەش ئەگـەر ئیمانیـان هێنـابێ، پێیـان دەگوتـرێ: ﴿ءَامَنُواْ﴾، نەصـڕانییش ئەگـەر ئیمـانیان هێنـابێ، وە صـابیئەش ئەگـەر کـاتی خـۆی ئیمـانیان هێنـابێ، پێیـان دەگـوترێ: ﴿ءَامَنُواْ﴾، بـەڵام لێـرەدا، ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەپێی بە عورفو بـاو بۆتـە دروشـمێك بـۆ مسـوڵمانان، واتـە: لێـرەدا خـوا دەفەرموێ: مسـوڵمانانو جـوولەکـەکانو صـابیئەکانو نەصـڕانییەکان، هـەر کـامێکـیان ئەو سـێ سـیفەتەی تێـدابن:

١- ئیمـان بە خـوا.

٢- ئیمـان بە دواڕۆژ.

٣- کـردەوەی بـاش، ئـەوە ترسـی لەسـەر نیـەو پـەژارەش داینـاگرێ، واتـە: مسـوڵمانان لە ڕۆژگـاری خۆیـاندا، وە بابو باپیـرانی ئەم جوولـەکـانەی ئێسـتا، ئەگـەر کـاتی خـۆی بەڕاسـتیی بڕوایـان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی هێنـابێو کـردەوەی باشـیان ئەنجامـدابێ، لـە خزمـەت مووسـاو پێغەمبـەرانی دیکـەدا، وە نەصـڕانییەکان بـە هـەمان شـێوەو، صـابیئەکان بـە هـەمان شـێوە، ئەگـەر لەگـەڵ

پێغەمبەرانی خۆیانداو، لەگەڵ دینی خۆیاندا ڕاستیان کردبێ کاتی خۆی، ئەوانە سەرفرازن.

دوو: مانایەکی دیکە هەر کامێك لە مسوڵمانانو لە جوولەکەو لە صابیئەو لە نەصرانییەکان، ئەگەر ئێستا ئەم سێ سیفەتە لە خۆیاندا بێننە دی:

١- ئیمان بە خوا.

٢- ئیمان بە ڕۆژی دوایی.

٣- کردەوەی باش، ئەوە نەترسیان لەسەر دەبێو نەپەژارەش دایاندەگرێ، دیارە ئیمان بە خواو، ئیمان بە ڕۆژی دواییو، کردەوەی باش، واتە: بە پێی ئیسلام، یانی هەرکامێك لەوانە ئەگەر پابەند بێ بە ئیسلامەوە، با ئەو کەسە جوولەکە بووبێ، یان نەصرانی بووبێ، یان صابیئە بووبێ، دوایی کە دێتە ڕیزی ئیماندارانەوە، وەك ئەوانی لێ دێ.

مانای سێیەمی کە هەڵەیە، کە جاری وابووە گوێم لە هەندێك لە بەناو زانایانی ئیسلام بووە، کە ماستاو دەکەن بۆ هەندێ حیزبی عەلمانیی، یان هەندێك ڕژێمی طاغووتییو عەلمانییو موجامەلەی درۆ دەکەن بۆ جوولەکەو نەصرانییەکانو ... هتد، ئەوان دەڵێن: مەبەست ئەوەیە کە مسوڵمانو جوولەکەو نەصرانییو صابیئی، هەرکامێکیان لەگەڵ دینی خۆیدا ڕاست بکاتو پێوەی پابەندبێ، سەرفرازە!!

بەڵام لەڕاستیدا ئەوە وانییە، ئەوە مانا لێکدانەوەیەکی هەڵەیە، چونکە ئەگەر وا بووایە پێویستی نەدەکرد خوا بە پێغەمبەری خاتەم بفەرموێ: بە خاوەن کتێبەکانو بەوانی دیکەش بڵێ: با مسوڵمان ببن، وەك فەرموویەتی: ﴿ فَإِنْ حَآجُّوكَ فَقُلْ أَسْلَمْتُ وَجْهِيَ لِلَّهِ وَمَنِ ٱتَّبَعَنِ ۗ وَقُل لِّلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْأُمِّيِّـۧنَ ءَأَسْلَمْتُمْ ۚ فَإِنْ أَسْلَمُوا۟ فَقَدِ ٱهْتَدَوا۟ ۖ وَّإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ ٱلْبَلَٰغُ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٢٠﴾ ﴾ آل عمران، ئەو دوو ماناو لێکدانەوەی کردمانن ئەو دووانە ڕاستن، ئەوە لەڕووی ماناکەیەوە.

لە ڕووی ڕێزمانییەوە:

زانایان لێرەدا ئیشكالێكیان بۆ دروست بووە، ئایەتەكە ئاوایە: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، كە لەوێ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ ﴾، ﴿ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ ﴾ واتە: دەبێتە (إسم)ی ﴿ إِنَّ ﴾ەوە، دەبێ (منصوب)بێ، واتە: (الصائبين) بێ، كەچی (مرفوع)ە؟ بۆیە زانایان ئیشكالێكیان بۆ دروست بووە لێرەداو دەڵێن: ئایا هۆی (مرفوع) بوونی ئەوە چییە؟! هەرچەندە (الصابئين)یش خوێنراوەتەوە، زانایان چەند وەڵامێكیان داوەتەوە، ئەوەی كە لەگەڵ سروشتی دەرسەكەی ئێمەدا بگونجێ، بە كورتی دووانن:

١) دەڵێن كە خوا باسی مسوڵمانانو جوولەكەكانو نەصرانییەكان دەكات (صابئون)ی خستۆتە نێوان، ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ – وَٱلنَّصَٰرَىٰ ﴾ەوە، بەم شێوەیە:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ وَٱلنَّصَٰرَىٰ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴾، كە ئەو كاتە ماناكەی ئاوای لێدێ: (بێگومان ئەوانەی بڕوایان هێناوەو جوولەكەو صابیئونیشو وەك وانن وە نەصرانییەكان، ...) ئەو كاتەش (صابئون) نابێتە (إسم)ی (إن)و دەبێتە (مبتدأ)و ئەوەی دوایی دەبێتە (خبر)و هەردووكیان (مرفوع) دەبن، ئەوە (خليل بن أحمد الفراهيدي، وسيبويه) ئەو ڕایەیان هەڵبژاردوە.

٢) دەڵێن: لەبەرئەوەی ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾ەش (مبنيّ)یە کە دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ﴾، وا ئیعتیبار کراوە، کە (إِنَّ) ئیشی نەکردوە، چونکە ﴿ ٱلَّذِينَ ﴾، هەر (مبنيّ)یەو حاڵەتی (رفع)و، (نصب)و، (جر)ی هەروەك یەکە، ئنجا کە (إِنَّ)یە ئیشی نەکرد، مانای وایە ئەوکاتە ئەگەر بڵێی: ﴿ وَٱلصَّٰبِـُٔونَ ﴾، ئەوە بەو ئیعتیبارەیە کە (إِنَّ) ئیشی نەکردوە، بۆیە (الصابئون) بە (مرفوع)ی ماوەتەوە.

بە هەرحاڵ ئەوەی گرنگە ئێمە بیزانین ئەوەیە کە قورئان بناغەی زمانی عەرەبییەو، ئێمە ناچار نین لەبەرئەوەی فلان زمانزانی عەرەبی وایگوتوە، لە بەرانبەر قورئاندا بکەوینە گومانەوە، قورئان زمانی عەرەبی کردوتە زمانی عەرەبی، قورئان ئەسڵو بناغەی زمانی عەرەبی داناوە، بۆیە لەڕاستیدا دەبێ بنچینەکانی زمانی عەرەبی لەگەڵ قورئاندا بگونجێن، ئنجا زانایان حیکمەتی ئەوەشیان بەتایبەتی (مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) خاوەنی (التحرير والتنوير)، دەڵێ: حیکمەتی ئەوە کە حاڵەتی ئیعرابییەکەی (صابئون) جیایە، ئەوەیە کە مسوڵمانانو جوولەکەو نەصرانیی، کتێبیان هەیەو دیارن، بەڵام (صابئون) کتێبێکی دیاریان نیە، بۆیە خوای پەروەردگار حاڵەتی ئیعرابیەکەی ئەوانی جیاکردۆتەوە، بۆ ئەوەی کە دەردەکەوێ تەنانەت ئەوانیش ئەگەر بێتو ئیمان بێنن بە خواو بە ڕۆژی دوایی و کردەوەی باش بکەن، ئەوانیش هەر سەرفرازن، هەرچەندە دووریشن لەو میللەتانەی کە خاوەن کتێبن.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ لَقَدْ أَخَذْنَا مِيثَٰقَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهِمْ رُسُلًا ۖ كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ فَرِيقًا كَذَّبُوا۟ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴾، واتە: بێگومان ئێمە پەیمانێکی پتەومان لە بەنی ئیسرائیل وەرگرت، وە پێغەمبەرانیشمان بۆ لا ڕەوانەکردن، هەرکاتێك پێغەمبەرێك هاتبا بۆ لایان، بە شێوەیەك قسەی کردبایە کە نەفسیان حەزی لێ نەدەبوو، دڵ

پەسندی ئەوان نەدەبوو، دژایەتییان دەکردن، کۆمەڵێکیان لێ بە درۆ زانین‌و کۆمەڵێکیشیان لێ کوشتن.

ئەم ڕستە قورئانییە لە سوورەتی (البقرة)شدا هاتوە، کە دەفەرموێ: ﴿...أَفَكُلَّمَا جَآءَكُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُكُمُ ٱسْتَكْبَرْتُمْ فَفَرِيقًا كَذَّبْتُمْ وَفَرِيقًا تَقْتُلُونَ ﴿٨٧﴾﴾ لێرەدا زانایانی زمانی عەرەبی، دەڵێن کە لە ئایەتەکەی (المائدة) دەفەرموێ: ﴿كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ﴾ وشەیەك فەرتێنراو (محذُوف)ە، وەك: (ناصبوهم بالعداوة) یان (استكبروا) وەك لە ئایەتەکەی سوورەتی (البقرة)شدا هاتوە، بەڵام ڕستەی: ﴿فَرِيقًا كَذَّبُوا۟ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ﴾، دەلالەتی لەسەر دەکات، ئەوەی کە گرنگە ئێمە بیزانین ئەوەیە کە خوای کاربەجێ لە چەند شوێنان لە قورئاندا باسی ئەوە دەکات، کە پەیمانی پتەوی لە جوولەکەکان وەرگرتوە، وە لە سوورەتی (البقرة)دا کە من باسم کردوە بە تەفصیلێ، باسی بڕگەکانی ئەو پەیمانەش دەکات، کە پەیمانێکی دە بڕگەیی بووە، بەڵام لێرەدا بە کورتیی باسی دەکات‌و لەوێ بە درێژیی باسی دەکات، ئەوەی کە گرنگە ئەوەیە کە خوا دەیەوێ بە ئۆممەتی ئیسلام بفەرموێ: جوولەکەکان لە پێش ئێوەدا پەیمانی زۆر پتەویان لێ وەرگیراو، پێغەمبەرانیشیان بۆ ڕەوانەکران‌و کتێبیشیان بۆ دابەزێنران، بەڵام لەگەڵیاندا ڕاستیان نەکردو، ئەوەش سەرەنجامیانە کەواتە: ئێوەش دەرس‌و عیبرەت لەوان وەربگرن، تاکو وەك ئەوانتان بەسەر نەیەت.

**مەسەلەی حەوتەم‌و کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿وَحَسِبُوٓا۟ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ فَعَمُوا۟ وَصَمُّوا۟ ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ثُمَّ عَمُوا۟ وَصَمُّوا۟ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ ۚ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ﴾، پێشتر خوا کە فەرمووی: جوولەکەکان هەندێك لە پێغەمبەرانیان بە درۆ زانی‌و هەندێکیانیشیان لێ کوشتن، ئەوانەی کە

كوشـــتیانن بـە مسـۆگەریی زەكەریـیـاو یەحیایـان لــێ كوشـتوون، وە هـەوڵیان داوە عیساش بكـوژن، وە لە تـەوراتو پەیمـانی كۆنــدا باسـی پێغـەمبـەرانێك دەكات كە كوشتوویانن‌و ناویشیان دێنـێ، ئنجا كـە ئـەوەیان كـرد، ﴿وَحَسِبُوٓاْ أَلَّا تَكُونَ فِتۡنَةٞ﴾، واتە: هەرچـەندە جوولەكـەكان بەشێكیان لە پێغـەمبـەران بـە درۆ زانـیو بەشـێكیشـیان لـێ كوشـتن، كەچی پێشـیان وابوو هیچ بەڵایـەكیان بەسـەردا نایـەتو ئـەوە نابێتـە هـۆی بـەڵاو ئـازارو، نابێتـە هـۆی گوناهبـاریی‌و عەیبداریيان! واتـە: ئـاوا خەیـاڵ پلاویـان كرد، ﴿فَعَمُواْ وَصَمُّواْ﴾، وە سەرەنجـام كوێر بـوون‌و كـەڕ بـوون، هەڵبــەتە لێــرەدا مەبەســـت كــوێر بــوون‌و كـــەڕبوونی ڕواڵـــەتیی نیـــە، واتــە: لــە بەرانبـەر حەقیێـكدا كە پێغـەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) هێنایان نـەیانبینی‌و كوێر بوون، وە كـەڕ بوون‌و نەیانبیســت، كەســێك هـــەق نەبینــێ، وەك كـوێر بـــێ وایـــە، وە كەســـێك هــەق نەبیستـــێ، وەك كــەڕ بـــێ وایـــە، ﴿ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡ﴾، دوایـی خــوا گەڕایـەوە سـەریان، دیـارە ئـەوان تۆبـەیان كـردوە، خــواش گەڕاوەتـەوە ســەریان، بـەڵام خــوا ئامــاژە بــە تۆبەكـەی وان ناكـات، چـونكە مەقـام مەقامی زەمكـردنی ئەوانـە، بەڵام ئەگەر فەرمووبـای: (تابوا وتـاب الله علیهم) ئـەوە مەدح بوو، بۆیــە ئــەوەی كـە دەبێتـــە هـۆی مـەدح بۆیــان، چونكــە لێـرەدا مەقـام مەقــامی زەمــكردن‌و ســەرزەنشـتە، ئـەوە لادەبـاو، دەفـەرموێ دوایـی خــوا گەڕایـەوە سەریان، ﴿ثُمَّ عَمُواْ وَصَمُّواْ كَثِيرٞ مِّنۡهُمۡ﴾، دوایـی دووبـارە زۆرێكـیان كـوێر بوون لە بەرانبـەر هـەقـدا، وە كـەڕ بوون لە ئاسـتیدا.

لێـرەدا توێژەرەوانی قورئان سـەبارەت بـەو دوو جـارە كـوێر بوونـەو، دوو جـار كـەڕ بوونـەی جوولەكـەكان لە بەرانبـەر هـەقدا، زۆریـان شـت گوتـوە بۆ وێنـە:

(الزمخشري) دەڵـێ: جـاری یەكــەم ئـەوەبوو كـە گۆلكـیان پەرسـت، دووەم ئـەوە بـوو كە داوای بینـینی خوایـان كرد.

(القفال) كە (آلوسي)یش لەوی وەرگرتوە، دەڵێ: جاری یەكەم ئەوە بوو كە (بخت النَّصر)ی بابلیی، چووە ئۆرشەلیمو ئەو شوێنانەی كە جوولەكەكانی لێبوونو كاولی كردن، جاری دووەمیش ئەوە بوو كە زەكەرییاو یەحیایان كوشت.

هەندێكیش دەڵێن: مەبەست لەو دووجارە، ئەوەیە كە لەو ئایەتانەی سوورەتی (الإسراء)دا هاتوە، ئایەتی چوار تا حەوت، لەوێ باسی دوو جاران دەكات، كە دەفەرموێ: ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُـۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾﴾، ئەم چوار ئایەتە: (٤ - ٧) باسی ئەو دوو جارە دەكەن، (مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) لە (التحرير والتنوير)ەكەی خۆیدا[1] باسی ئەو دوو جارە ئاوا دەكات، ئەو دووجارە كە جوولەكەكان ماڵ وێرانییان بەسەردا هاتوە:

جاری یەكەمیان: (بخت النَّصر)ی مەلیكی ئاشوور چووە نێو (بيت المقدس) كە بەگشتی سێ جاران چۆتە نێو (بيت المقدس)ەوە:

أ/ لە ساڵی (٦٠٦) پێش زاییندا.

ب/ لە ساڵی (٥٩٨)داو.

ج/ لە ساڵی (٥٨٨) پێش زاییدا.

لە جاری سێیەمیاندا شاری ئۆرشەلیمی سووتاند، وە بەنی ئیسرائیلی هەموو لەگەڵ خۆی هەڵگرتنو بردنی بۆ بابل بە دیلیی، ئنجا مەبەست لەوە كە

---

١) ج٣، ص٢٧٧ -٢٧٨.

خوا دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ ﴾، واتە: دوایی نۆرەمان بۆ ئێوە گێڕایەوە، ئەویش ئەوە بوو کە پادشای فارس بەسەر ئاشوورییەکاندا زاڵ بوو، لە ساڵی (٥٣٠) پێش زایندا، وە دەستی بەسەر بابلدا گرت، وە جوولەکەکانی ئیزنداو گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان‌و، مزگەوتەکەیان دروست کردەوە، ئەوە جاری یەکەم.

جاری دووەم: ئەوە بوو کە (طیطس) فەرماندەی ڕۆمانی کوڕی ئیمپراتۆر (وەسبیانووس) ئۆرشەلیم ئابلووقە دەدات، تا وای لێدێ جوولەکەکان هەندێکیان یەکدی دەخۆن، واتە: خەڵکیان کە لێ‌دەمرێ گۆشتیان دەخۆن، وە پێست‌و شتی دیکەیان خوارد، وە بە پێی ڕیوایەتی ئەوکات: هەزار هەزار، واتە: یەك ملیۆن (١٠٠٠,٠٠٠) کەسی لێ کوشتن، وە نەوەدو حەوت هەزار (٩٧,٠٠٠)یش ژن‌و منداڵی لێ بە دیل گرتن، ئەوە لە ساڵی (٦٩) زایینی، واتە (٦٩)ی دوای لە دایکبوونی عیسا علیه السلام، دوایی بە دوای ئەودا ئیمپراتۆر (ئەدریان)یش لە ساڵی (١١٧)ی زایینیدا، وە لە ساڵی (١٣٨)ی زایینیدا، جارێکی دیکە شارەکەی کاول کرد، بۆئەوەی هیچی لێ سەوز نەبێ، وە لەوکاتەدا دەوڵەتی جوولەکە نەما، وە بە زەویدا بڵاوبوونەوە.

منیش دەڵێم: دەگونجێ مەبەست لەم دووانە بێ، یان دەگونجێ مەبەست ئەو دووانە بێ کە (الزمخشري) گوتوونی، یان ئەو دوو جارەی کە (القفال و الآلوسي) دەڵێن، بەڵام من پێموایە مەرج نیە تەنیا ئاماژە بۆ ئەو دوو جارە بێ کە ڕابردوون، بەڵکو پێموایە خوا لێرەدا باسی عادەتی گشتی جوولەکەکان دەکات، واتە: جار لە دوای جار، ئێوە سەرپێچیی دەکەن، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الملك)دا دەفەرموێ: ﴿مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ ٱلرَّحْمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٍ فَٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ هَلْ تَرَىٰ مِن فُطُورٍ ۝٣ ثُمَّ ٱرْجِعِ ٱلْبَصَرَ كَرَّتَيْنِ يَنقَلِبْ إِلَيْكَ ٱلْبَصَرُ خَاسِئًا وَهُوَ حَسِيرٌ ﴾، هەموو توێژەروان دەڵێن: (كَرَّتين) واتە: جار لە دوای جار، ئیدی مەرج نیە، تەنیا دوو جار بێ، خوای پەروەردگاریش کە ئاماژە بەو دوو

جـاره دەکـات، واتـە: ئـەی جوولەکـەکان! ئێـوە هــەر عادەتتـان وایـە جار لـە دوای جـار، هەر پەیمـانـشـکـێنیـی دەکـەن‌و سـەرپێچیی دەکەن، بەردەوام بـێ فەرمـانیی خـوا دەکـەن، هەر عـادەتتـان وایەو پێوەی ڕاهـاتوون! ئەگەرنا مـەرج نیـە ئامـاژە بـێ بۆ دوو جـار.

پاشـان تێبینییـەکی دیکەشـم هەیـە: ئەگـەر ئامـاژەش بـێ بـۆ دوو جار، ئـەوە جارێکیان تێپـەڕیوەو جارێکیشـان دێ، وەك لـە فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەردا ﷺ هـاتوە کـە مسـولمان‌و جوولەکـە پێکـەوە بەشـەڕ دێـن[1]، وە جـارێکی دیکـە جوولەکـە لێیـان تێکـدەچـێ، ئـەوەی کـە خـوای پـەروەردگار ئامـاژەی پێـدەکات:

﴿فَإِذَا جَآءَ وَعۡدُ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾، دەگونجـێ (وعـدُ الآخـرة) (وعـد الـمرة الآخرة)بـێ، دەشـگونجێ وەعـدی پێـش دواڕۆژ بـێ، کـە جوولەکـە جـارێکی دیکـە لێیـان بقـەومێ‌و لەسـەر ئـەو سـتەمەی کە ئێسـتا لـە مسـولمانانی فەلەسـتینی دەکـەن، بەڵاو موصـیبەتیان بەسەر بێ! خـوای پەروەردگـار هەموو لایەکمـان بپـارێزێ لـە بێ فەرمانیی‌و سەرپێچـیی‌و سـنوور شـکێنیی، بۆئـەوەی کـە لـە سزاو جەزرەبـەی خـوا دووربیـن لە دنیـاو لە قیـامەت دا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) کە ئەمـە یەکێك لەو فـەرموودانەیـە:

﴿تقـاتلكم اليهـودُ فَتُسـلَّطون عليـهم، حتـى يقـول الحجـرُ يـا مسـلمُ! هـذا يهـودي ورائـي فاقتلهُ﴾ {رواه البخاري: ٣٥٩٣، و مسلم: ٢٩٢١} .

# دەرسی حەڤدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە پێنج (٥) ئایەت پێكدێت، (٧٢ - ٧٦) لەم پێنج ئایەتە موبارەكەدا خوای تاكو پاك، بەتایبەت باسی نەصرانییەكان دەكات، واتە: ئەوانەی لافی ئەوە لێدەدەن كە بە دوای عیسای كوڕی مەریەم كەوتوون، سەلامی خوا لە عیساو، خوا لە دایكی ڕازی بێ، وە بەهۆی بە خوا زانینی مەسیحی كوڕی مەریەمەوە، مۆری كوفریان بە نێوچەوانەوە دەنێ، هەروەها لەسەر زمانی عیسا سەلامی خوای لێ بێ، بە هاوبەش بۆ خوادانەرو بێبەش لە بەهەشتیان ناوزەد دەكات، وە بە ستەمكار ناویان دەبات.

پاشان جارێكی دیكە بەهۆی ئەفسانەی سێكوچكە (ثالوث)ەوە كە دەڵێ: خوا یەكێكە لە سێیان، لە لایەن نەصرانییەكانەوە، بە كافر ناوزەدیان دەكاتو ڕاشیدەگەیەنێ كە جگە لە یەك پەرستراوی هەق كە خوایە، هیچ پەرستراوی دیكە بوونیان نیەو، لە حاڵەتی وازنەهێنانیشیان دا، هەڕەشەیان لێ دەكات بە سزایەكی بە ئێش.

پاشان بە پرسیار كردنو سەرسووڕمانەوە دەفەرموێ: ئایا ناگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێبوردنی لێ ناكەن، لەو هاوبەشو كوڕ بۆ دانانەدا؟! پاشان خوای زاناو توانا ڕایدەگەیەنێ، كە مەسیحی كوڕی مەریەم جگە لە پێغەمبەرێكی خوا كە بە دوای پێغەمبەرانی دیكەدا هاتوە، هیچی دیكە نیە، وە دایكیشی تەنیا ئافرەتێكی صیددیقەو زۆر ئیمانداراو ڕاستبێژ بووە، كە ئەوانیش وەك هەر كەسێكی دیكە خواردنیان خواردوە.

پاشان لە كۆتاییدا بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ دەفەرموێ، كە بە نەصرانییەكان بفەرموێ: ئایا چۆن جگە لە خوا شتێك دەپەرستن، كە هیچ جۆرە زیانو سوودێكیان بەدەست نیە، لە حاڵێكدا خوا بیسەری زانایە؟!

﴿ لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ
يَـٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ
عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّـٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴿٧٢﴾ لَّقَدْ كَفَرَ
ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ ۘ وَمَا مِنْ إِلَـٰهٍ إِلَّآ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا۟
عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ أَفَلَا يَتُوبُونَ
إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٧٤﴾ مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ
مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا
يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ۗ ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْـَٔايَـٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ
يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾ قُلْ أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ
ضَرًّا وَلَا نَفْعًا ۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٧٦﴾ ﴾

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((بێگـومان ئەوانـەی گوتیـان: خـوا بریتـیە لـە مەسـیحی کوڕی مەریـەم، کـافر بـوون، وە مەسیح گوتی: ئـەی وەچـەی ئیسـرائیل! خـوا بپەرستن پـەروەردگاری مـنو خۆشـتانە، بـە مسـۆگەریی هـەر کـەس هاوبـەش بـۆ خـوا دابنـێ، ئـەوە بێگومـان خـوا بەهەشـتی لـێ قەدەغــە دەکـات، وە جێگـای حــەوانەوەی ئــاگر (ی دۆزەخ)ە، وە سـتەمکاران هیـچ پشـتیوانیان نیـن ﴿٧٢﴾ بـە دڵنیاییـەوە ئەوانـەی گوتیـان: خـوا بریتیـە لە سـێیەمی سـێ (پەرسـتـراو)ان، کـافر بوونـە، وە هیـچ پەرسـتـراو (ی بـە هـەق) نیـن جگـە لـە یـەك پەرسـتـراو (کە خـوایە) وە ئەگـەر واز لـەوە نـەهێنن، کە دەیڵێن، مسـۆگەر ئەوانەیـان کـە کـافرن، سزایەکی بەئێشـیان دەدرێ ﴿٧٣﴾ ئـایا بـەرەو لای خـوا ناگـەڕێنەوەو داوای لێبوردنی لـێ ناکەن، لـە حاڵـێکدا کە خـوا لـێبـوردەی بـە بـەزەیی یـە؟ ﴿٧٤﴾ وە مەسـیحی کوڕی مەریــەم جگــە لـە پێغـەمبەرێك، کـە لـە پـێش ویـدا پێغـەمبەرانی دیکـە ڕابـردوون، هیچی دیکـە نـەبووە، وە (مەریـەمی) دایکیشـی صیددیقـەیـەك بوو، ئەوانیش (وەك خەڵکی دیکە) خـواردنیان دەخـوارد، سـەرنج بـدە! چـۆن ئایەتـەکانیان بـۆ ڕوون دەکەینـەوە (لەسـەر پووچـیی بـیـرۆکەی بـە بەشـێك لـە خوا دانـانی عیسـاو دایکـی) دوایـی سـەرنج بـدە! چــۆن (لـە هــەق) لادەدرێــن! ﴿٧٥﴾ بڵـێ: ئایـا (چـۆن) جگـە لە خوا شـتێك دەپەرسـتن، کـە هـیچ زیـانو سوودێکی بۆتـان بە دەسـت نیـە، لە حـاڵێکـدا کە تەنیـا خـوا بیسـەر (ی هــەموو قسـەیەك)و زانــایە (بە هـەموو شـتێك) ﴿٧٦﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ ): (أي: وَاحِدٌ مِنْ ثَلاَثَةٍ، ثَلَّثْتُ الشَّيءَ تَثْلِيثاً: جَعَلْتُهُ عَلَى ثَلاَثَةِ أَجْزَاء)، ئەوانەی كافرن گوتیان: خوا یەكێكە لە سێیەكان، نەك لە ریزبەندییدا، كە یەكو دووی لە پێش دا هەبن، ئەویش سێیەم بێ، چونكە دەگوترێ: (ثَلَّثْتُ الشَّيءَ تَثْلِيثاً) واتە: ئەو شتەم كردە سێ بەش.

(إِلَٰهٍ ): واتە: (مَعبُود) پەرستراو، وە (إِلَه) جیایە لە (الله)، چونكە (الله) ناوی عەلەمە بۆ خوا، لە زمانی كوردیدا دەڵێین: خوا، بە فارسی دەڵێن: (خُدَا)، بە ئینگلیزی دەڵێن: گۆد (Gad)، وە هەروەها لە زمانی هەموو میللەتاندا ناوێكی تایبەت هەیە بۆ خوا، بەڵام (إِلَه) واتە: پەرستراو، جا خوا یەكێكە، بەڵام پەرستراوەكان زۆرن و جۆراوجۆرن، هەڵبەتە پەرستراوی بە هەق تەنیا یەكە، ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾، واتە: پەرستراوی بە هەق، ئەگەرنا پەرستراوی بە ناهەق زۆرن، ئنجا ئایا وشەی: (إِلَه) لە چییەوە هاتوە؟ سێ ئەگەر (إحتمال) هەن، وەك (راغب الأصفهاني) دەڵێ:

١) (أَلَهُ فُلاَنٌ يَألَهُ إِلاهةً: أي عَبَدَ يَعْبُدُ عِبَادَةً) (أَلَه) واتە: (عَبَدَ)، (يَألَهُ إِلاهة) یانی: (عَبَدَ يَعْبُدُ عِبَادَةً)، واتە: پەرستی، دەپەرستێ، پەرستن، كەواتە: (إِلَه) كەسێكە كە غەیری خۆی دەیپەرستێ.

٢) یاخود لە (أَلِهَ يَأْلَهُ إِلاهة)ەوە هاتوە (أَي: تَحَيَّر)، واتە: سەرسام بوو، چونكە پەرستراوی بە هەق كەسێكە كە عەقڵ تێیدا سەرسامەو بۆی ئیستیعاب ناكرێ، لە هەموو سیفەتەكانی دا.

٣) یاخود لە (لاهَ يَلوهُ لِيَاهاً)ەوە هاتوە (أَي: احْتَجَبَ)، (لاهَ)، واتە: (احْتَجَبَ)ە، (يَلوهُ) واتە: (يحتَجِب)، (لِيَاهاً) واتە: (احْتجَاباً)، لەبەرئەوەی پەرستراوی بە هەق كە خوایە نابینرێ، ئنجا (إِلَه) بە (أَلِهَة) كۆدەكرێتەوە، (أَلِهَة)

واتـە: پەرسـتـراوەکان، نەدەبووایـە کۆبکرێتـەوە، بـەڵام خـەڵك بـە هەڵەداچـووەو، لەگـەڵ پەرسـتـراوی بە هەقـدا پەرسـتـراوی ناهەقیـش دەپەرسـتن.

(صِدِّيقَـةٌ ): لـە (صَـدَقَ)ەوە هـاتوە، (صَـدَقَ) واتـە: ڕاسـتی کـرد، (الصِّـدِّيق) کەسێکە کە زۆر ڕاسـت دەکات، یـاخود کەسـێکە کە بەرانبەرەکەی خـۆی زۆر بـە ڕاسـت دەزانـێ، ئێسـتا ئەبوبـەکری صـیدديق کـە پێـی دەگـوترێ: (الصِّـدِّيق) یـان لەبەرئـەوەیە زۆر ڕاسـتبێـژ بووە، یان لەبەرئەوەیـە کە هـەرچی پێغـەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی، ئەو بە ڕاسـتی دانـاوە، (كَثِيرُ الصِّدق، أَوْ كَثِيرِ التَّصديق)، کـە هـەردووك لاشـی وایـە، دەڵـێ: (الصِّـدِّيقُ: مَنْ كَثُرَ مِنْهُ الصِّدْقُ، أَو مَنْ لاَ يَكْـذِبُ قَـطُّ، أَو لِمَـنْ لاَ يَتَـأَتَّى مِنْـهُ الكَذِبُ لِتَعَوُّدِهِ الصِّـدقَ، وَالصِّـدْقُ: مُطَابَقَـةُ القَـوْلِ الضَّـمِيرَ وَالـمُخْبَـرَ عَنْـهُ مَعًـا)، واتـە: (صِدِّيق) بـە کەسـێك دەگـوترێ کـە قسـەی ڕاسـتی زۆربـێ، یـان هـەرگیز درۆ نەکـات، یاخـود کەسـێکە لەبەرئـەوەی لەسەر ڕاسـتیی خـۆی ڕاهێنـاوە، درۆی لـێ نایـەت و ناتوانـێ درۆ بکات، (صِدْق)یـش بریتـیـە لە ڕاسـتبێژیـی، دەڵـێ: (مُطَابَقَةُ القَوْلِ الضَّمِيرَ وَالمُخْبَرَ عَنْهُ مَعًا) واتە: کە قسـە دەکـەی، هەم لەگـەڵ ئـەوەی کە لەنێو دڵـت دایـە ڕاست بێ، هـەم ئەو شـتـەی هـەواڵی پێـدەدەی ڕاسـت بـێ، هەم لەگەڵ خـۆت ڕاست بکەی، هـەم لەگـەڵ دەرەوەی خۆتـدا ڕاسـت بکـەی.

(يُؤْفَكُونَ ): (الإِفْكُ: فِي الأَصلِ كُلُّ مَصْـروفٍ عَنْ وَجْهِهِ الَّذِي يَحِقُّ أَنْ يَكُونَ عَلَيْـهِ، (يُؤْفَكُـونَ) أَيْ: يُصْـرَفُونَ عَـنِ الحَـقّ فِـي الإِعْتِقَـادِ إِلـى البَـاطِلِ وَمِـنَ الصِّـدقِ فِـي الـمَقَالِ إِلـى الكَذِبِ، وَمِـنَ الجَمِيـل فِـي الفِعْـلِ إِلـى القَبِـيحِ)، واتـە: (الإِفْكُ) لە ئەسڵدا بریتیـە لە هەر شـتێك کە لەسەر ئـەو بـارە چاکەی کـە دەبـێ لەسـەری بـێ، لابـدرێ، (يُؤْفَكُـونَ) واتـە: (يُصْـرَفُونَ) لادەدرێـن، لـە عەقیـدەو بـیـروبڕوای هـەق، لادەدرێـن بـۆ ناهـەق، وە لـە ڕاسـتبێژیی لـە قسـەکردنـدا لادەدرێـن بـۆ درۆ، وە لـە کـردەوەی بـاش و جـوان، لادەدرێـن بـۆ کـردەوەی خـراپ و ناشـیـرین.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەكـــان

خوا ﷻ دوای ئـەوەی لـە ئایەتـەكانی پێشـیدا بەگشـتی باسی خـاوەن كتێبـەكانی كرد، وە بەتایبـەتی باسـی جوولەكەكانی كرد، لێرەدا لەم پێنج ئایەتـەدا بەتایبـەت باسی نەصرانییەكان دەكات، وە بیـرۆكەی پووچی نەصرانییەكان، كە بریتیـە لـە بە یەكـێك لـە سـێ بەشـەكان دانـانی خـوا، هەڵدەوەشـێنێتەوە، هەڵبەتـە ئێمـە لـە ڕابردووشـدا هەر لـەم سـوورەتەدا باسـی ئەوەمـان كرد، بـەڵام لێرەشـدا خـوای زاناو شـارەزا بـە تەفصـیلێ تـرو ڕوونتـر باسـی عەقیـدەی پووچی نەصرانی یـەكان دەكات، دەفـــەرمووێ: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ﴾، واتـە: بە مسـۆگەریی‌و بـە دڵنیـایی ئەوانـەی گوتیـان: خـوا مەسیحی كوڕی مەریەمە، كافرن، هیـچ دوو دڵ مەبـن لـەوەدا، هەر كەسـێك خـوا بە مەسیحی كوڕی مەریـەم دابنـێ، یاخود مەسـیحی كوڕی مەریـەم بە بەشـێك لە خوا دابنـێ، "وەك دوایی باسی دەكـەین" ئـەوە كـافرە، چـونكە خـوای بێوێنـە، پاكـە، تاكـە، وەك لـە سـوورەتی (الإخـلاص)دا پێناسـەی خـۆی دەكـات، دەفـەرمووێ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ ﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ۝١ اللَّهُ الصَّمَدُ ۝٢ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ۝٣ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ۝٤ ﴾، واتـە: بە نـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، بڵـێ: خـوا تاكە، جێـی نیـازو بێنیـازە، هـەموو شـتێك پێویسـتی پێیـەتی‌و ئـەو پێویسـتی بـە هیچ شتێك نیـە، كەسـی لـێ نەبـووە، لـە كەسـیش نـەبووە، (واتـە: نـە فـەرعی هەیـەو نـە ئەسڵی هەیـە) وە هیـچ كـەس وێنـەو هاوتـای وی نیـە.

جـا لێـرەدا دەفـەرمووێ: ئەوانـەی گوتیـان خـوا مەسـیحی كـوڕی مەریەمـە، (كـە دەشگونجا گوترابـا: مەسیحی كوڕی مەریـەم خـوایە)، ئەوانـە بێبـڕوان، هـەر هەمـان ئەو ڕستەیە لە ئایـەتی ژمارە (١٧)ی ئەم سوورەتەش دا هاتوە، ﴿ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُوا اللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ ﴾، واتـــە: وە مەسـیح گـوتی: ئـەی وەچـەی ئیسرائیل! (واتـە: جوولەكەكان، چونكـە عیسـا ﷺ بۆخۆشی لە نەتـەوەی جوولەكـە

بووە، وە بۆ وانیش نێردراوە، واتە: لە وەچەی یەعقووبە، وشەی (ئیسرائیل)یش بەهۆی ئەو دەوڵەتە داگیرکەر (غاصب)ەی ئیسرائیلەوە، ئێستا کە لەبەر دڵی زۆر کەس بێزراوە، ئەگەرنا ئیسرائیل نازناوی پێغەمبەر یەعقووبە ﷺ، واتە: بابی یوسف و بنیامین و دە برایەکەی دیکە، کە دیارە یەعقووبیش کوڕی ئیسحاقە، ئیسحاقیش کوڕی ئیبراهیمە (علیهم الصلاة والسلام)، ئیسرائیل بە زمانی عیبری واتە: عەبدوڵڵا (إسرا) واتە: عەبد، (ئیل) واتە: (اللە)، خوا بپەرستن، پەروەردگاری منەو پەروەردگاری ئێوەشە، یانی: خاوەنی منو خاوەنی ئێوەشە، پەرستراوی منو پەرستراوی ئێوەشە، چونکە وشەی (رب) بە مانای پەروەردگار، خاوەن، سەید، سەروەر، پەرستراو، دێ، ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ ٱلۡجَنَّةَ﴾، بێگومان هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، خوا بەهەشتی لێ قەدەغە کردوە، ﴿وَمَأۡوَىٰهُ ٱلنَّارُ﴾، وە جێگای حەوانەوەو ئیسراحەتیشی ئاگرە، واتە: ئاگری دۆزەخ، ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ﴾، وە ستەمکاران هیچ پشتیوانێکیان نیە، تەماشا بکەن! بە چەند شێوە، لێرەدا عیسای مەسیح، (مەسیح نازناوی عیسایە ﷺ) بانگیان دەکات دەفەرموێ: پەروەردگاری خۆم و خۆتان بپەرستن، هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، خوا بەهەشتی لێ قەدەغە دەکات و، جێگای ئاگرەو ستەمکاریشە.

ئنجا خوای پاك و تاك دووبارە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ﴾، بە مسوگەری ئەوانە بێبڕوان کە گوتیان: خوا سێیەمی سێیانە، واتە: سێیەمی سێیەکانە، ئەوە لە نەصرانییەتدا پێی دەگوترێ: (ثالوث) واتە: سێکوچکە، بۆیە ئەگەر تەماشا بکەن لە ڕۆژئاوا ئەو مەسەلەی سێکوچکەیە زۆرە، کاتی خۆی حیزبی بەعس (وحدة، حرية، إشتراكية)یان هەبوو، ماسۆنیەکان (الإخاء والحرية والمساواة)، ئەو سێکوچکەیە زۆرە، مەبەستم ئەوەنیە هەر شتێك سێ بێ خراپە، بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ئەوان هەوڵدەدەن بیرۆکەو شیعارە گرنگەکانیان لە سێ خاڵدا جێی بکەنەوە، کە لەڕاستییدا ئەوە کاریگەریی ئەو

سێکوچکەیە کە لە نەصرانییەتدا هەیە، ئنجا خوا دەفەرموێ: بێگومان ئەوانەی گوتیان: خوا سێیەمی سێیەکانە، بێبڕوان، ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾، وە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لە یەك پەرستراو، ﴿وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، وە ئەگەر وازیش نەهێنن لەوەی کە دەیڵێن ئەو (ل)ە، لامی قەسەمە، (ن)ەکەش، نوونی تەوکیدە، واتە: سوێند بە خوا بە تەئکید ئەوانەی بێبڕوان لەوان، سزاو ئازارێکی بە ئێشیان تووش دەبێ، ئنجا ئایا ئەو سێیانە کێن کاتێك گوتوویانە: خوا سێیەمی سێیەکانە؟

هەندێکیان گوتوویانە: خوا، مەریەم، عیسا، هەندێکیشیان گوتوویانە: خوا، عیسا، گیانی پیرۆز (الروح القدس).

دوایی خوا ﷻ دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ ۚ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، خوا بە نکووڵیی لێکردنەوە دەفەرموێ: ئایا ناگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێبوردنیشی لێناکەن؟! لە حاڵێکدا کە خوا زۆر لێبووردەیەو زۆر بە بەزەییە؟! لەگەڵ ئەو بێئەدەبییەو ئەو بێڕێزییەش کە بەرانبەر بە خوا دەیکەن، کە دەیکەن بە بەشێك لە سێ بەشان، کوڕی بۆ بڕیار دەدەن، هاوتای بۆ بڕیار دەدەن، بەڵام خوا ﷻ دەرگای گەڕانەوەو پەشێمانبوونەوەیان بۆ دەکاتەوە!!

ئنجا خوای پەروەردگار ڕایدەگەیەنێ، دەفەرموێ: ﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾، مەسیحی مەریەم جگە لە پێغەمبەرێك کە لە پێش ئەودا پێغەمبەرانی دیکە تێپەڕبوونو ڕۆیشتوونو لە نێو بەشەردا هاتوون، هیچی دیکە نەبووە، پێغەمبەرێك بووە وەك هەموو پێغەمبەرانو هیچی لەوان زیاتر نەبووە، ﴿وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ﴾، دایکیشی زۆر ڕاستبێژ بووە، یاخود زۆر بە ڕاست دانەر بووە، یاخود زۆر بە ئیمان بووە، ئافرەتێکی یەکجار چاك بووە، بەڵام ﴿كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ﴾،

هەردووکیان خواردنیان دەخوارد، ئنجا کە خواردنیان خواردبێ، مانای وایە وەك ئەو خەڵکە بەشەر بوون، وە کە خواردنیان خواردبێ، مانای وایە پێویستییان بە غەیری خۆیان بووە، ئنجا کەسێك پێویستی بە مستە ئاوێكو چنگە گەنمێك بێ، چۆن خوایەتی بۆ دەکرێ؟! ﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ﴾، سەرنج بدە! چۆن ئایەتەکانیان بۆ ڕوون دەکەینەوە، دوایی سەرنج بدە چۆن لادەدرێن، (يُؤۡفَكُونَ) واتە: (يُصْرَفُون) یانی: لادەدرێن، وەك بڵێی ئیرادەیان بەدەست خۆیان نەمابێ، ئاوا بە لاڕێ دا دەبرێن، ئەمە ئاماژەیە بۆئەوەی کە ئەوانە کوفرو نیفاق وا لە دڵیاندا جێگیر بووە، وەك بڵێی ئیرادەی لێ زەوت کردوون، ویستی بە دەست نەهێشتوون و جڵەویان کەوتۆتە دەست شەیتانو ئارەزوو و لە دەست خۆیاندا نەماوە، بۆیە دەفەرموێ: ﴿يُؤۡفَكُونَ﴾، لادەدرێن، وە ئەو تەعبیرە لە زۆر شوێنی قورئاندا هاتوە.

لە کۆتاییدا دەفەرموێ: ﴿قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ﴾، بە پرسیارکردنێکی نکوولێیکەرانە پرسیاریان لێ بکە، نەك پرسیارێك کە چاوەڕێی وەڵامەکەی بی، بەڵکو پرسیارێك کە وەڵامەکەی لەنێوخۆی دایە، وەك جاری دیکەش باسم کردوە، بۆ وێنە بڵێی: ئەمە کامیرە نیە؟! ئەمە مێز نیە؟! یانی چاوەڕێ ناکەی کابرا بڵێ: با، چونکە وەڵامەکەی ئاشکرایە، دەڵێ: (الإستفهام الإنكاري: يَتَضَمَّن جوابهُ في طيَّاتِهِ) واتە: پرسیارکردن بە نکوولیی لێکردنەوە، وەڵامەکەی لەنێوخۆی دایە، ﴿قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا﴾، بڵێ: ئایا جگە لە خوا شتێك دەپەرستن، کە نە زیانی بۆ ئێوە بەدەستە، نە قازانج، واتە: نە دەتوانێ زیانتان لێ دووربخاتەوە، نەدەتوانێ سوودتان پێ بگەیەنێ، پەرستراو دەبێ بتوانێ سەرت بخات، شیفات بدات، بە دەمتەوە بێ، بە دەنگتەوە بێ، لێت ببووری، بتژیەنێ، بتمرێنێ، پەرستراوی هەق دەبێ ئەو شتانەی بە دەست

بن، بەڵام ئەو شتانەی ئێوە دەیانپەرستن، نە دەتوانن زیانتان لێ دووربخەنەوە، نە دەتوانن سوودتان پێ بگەیەنن، ئنجا ئەگەر عیسایە ﷺ، ئەگەر دایكیەتی، ئەگەر گیانی پیرۆز (روح القدس)ە، ئەگەر داروبەردە، ئەگەر ئاسمانە، ئەگەر هەر شتێك هەیە، زەرەرو قازانجی خۆی بە دەست نیە، تا هی تۆی بە دەست بێ، ﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾، لە حاڵەتێكدا كە هەر خوا بیسەری زانایە، ئەو قسەو داوای بەندەكانی دەبیستێ، وە پێداویستیەكانیشیان دەزانێ و وەڵامیان دەداتەوە.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرمووێ: ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ﴾، بێگومان ئەوانەی گوتیان: خوا بریتیە لە مەسیحی کوڕی مەریەم، کافر بوون، ئەوە کاکڵەی عەقیدەی نەصرانییەتە کە عیسای مەسیح سەلامی خوای لێ بێ بە بەشێك لە خوا دەزانن، هەڵبەتە ئێمە لە تەفسیری ئایەتی ژمارە (١٧)ی ئەم سوورەتەدا بە تەفصیل باسمان کردوە، وە لەوێ ئاماژەشمان بە ئینجیلەکاندا، بۆیە لێرەدا ئەوەی وێ دووبارە ناکەینەوە، وە خودی ئەو ڕستەیە لە ئایەتی ژمارە (١٧)دا هاتوە، بێ کەم و زیاد، ﴿ لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُوا إِنَّ اللَّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ ﴾، بەڵام لەوێ خوا ﷻ ئاوا بەرپەرچی داوەتەوەو دەفەرمووێ: ﴿ قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ اللَّهِ شَيْئًا إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ الْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَأُمَّهُ وَمَن فِي الْأَرْضِ جَمِيعًا ۗ وَلِلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ ۚ وَاللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿١٧﴾ ﴾ المائدة، لە وەڵامی ئەو قسەیاندا دەفەرمووێ: پێیان بفەرموو: ئەدی کێ لەلایەن خواوە هیچی بە دەستە، ئەگەر ویستی مەسیحی کوڕی مەریەم بفەوتێنێ، وە دایکی بفەوتێنێ، وە تێکڕای خەڵکی سەر زەوی بفەوتێنێ؟! کەس هیچی پێ دەکرێ؟ نەخێر، کەواتە: پەرستراوی بە هەق تەنیا خوایە.

**مەسەلەی دووەم:** لێرەدا وەڵامی ئەو قسەیەی ئەوان بەچی دەداتەوە؟ لێرە لەسەر زمانی مەسیح وەڵامی داوەتەوە، دەفەرمووێ: ﴿ وَقَالَ الْمَسِيحُ ﴾، واتە: مەسیح گوتی، ئنجا ئایا مەسیح لە کوێ وایگوتوە؟ دیارە کاتێك مەسیح هاتوە بۆ لای بەنی ئیسرائیل، لەمیانەی گەیاندنی پەیامی خوادا ئەوەی پێگوتوون، ﴿ وَقَالَ

ٱلْمَسِيحُ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ۖ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ۖ وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ﴾، یانی مەسیح بۆخۆی بەرائەتو حاشای لەو بیرۆکەی ئەوان کردوە، کەواتە: بۆچی عیسا پاڵ دەدەنە لای مەسیحییەت؟! بۆیە زانایان دەڵێن: نابێ بگوترێ: مەسیحییەت، دەبێ بگوترێ: نەصرانییەت، چونکە لەڕاستییدا ئەوەی نەصرانییەکان دەیڵێن، شوێنکەوتنی مەسیح نیەو مەسیح واینەگوتوە، بەڵام ئەگەر بڵێی نەصرانییەت لەبەرئەوەی شوێنکەوتوانی مەسیح ئەوەیان داهێناوە، ئەوانیش هەموویان نا، بەڵکو هەندێکیان، نازناوی (نەصرانیی)یش، یان لەبەرئەوەیە کە گوتوویانە: (نَحْنُ أَنْصَارُ اللّٰه)، یان لەبەر ئەوەیە کە مەسیح خەڵکی دێیەکە لە شام بە ناوی (نصرانة)، بۆیە بەوە ناونراون، جا لێرەدا عیسا ﵇، پێنج شتان دەڵێ:

١- ﴿ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ ﴾، خوا بپەرستن.

٢- ﴿ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ﴾، پەروەردگاری منو پەروەردگاری ئێوەشە، واتە: دەبێ بەس پەروەردگار بپەرسترێ، وە پەروەردگاری منو ئێوەش، تەنیا خوای بێوێنەیە.

٣- ﴿ إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ ﴾، هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، جا ئەو هاوبەش دانانە بتو صەنەمێکە، مانگو خۆرێکە، ئەستێرەیەکە، کەسێکە، پێغەمبەرێکە، فریشتەیەکە... هتد، هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ، بە تەئکید خوا بەهەشتی لەسەر قەدەغە کردوە.

کەواتە: ئەگەر بەتەمای بەهەشتێن، هاوبەش بۆ خوا دامەنێن.

٤- ﴿ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴾، جێگای حەوانەوەی ئاگرە (مأوی) دەڵێ: (أوى: يأوي، فَهُوَ يؤويهِ)، واتە: پەنای پێ برد، (مأوى) ئەو شوێنەیە کە ئینسان پەنای بۆ دەباتو تێیدا ئیسراحەت دەکاتو لێی پشوو دەدات، دەفەرموێ: ﴿ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ ﴾، یانی: ئەوانە ئەگەر شوێنێك هەبێ تێیدا پشوو بدەنو

ئیسـراحەت بكەن، ئاگری دۆزەخـە، دیارە لـە ئاگریشـدا ئیسـراحەت نـاكرێ، جا هەنـدێك لە زانـایان دەڵـێن: ئەوە خـوا بـە تەوسـەوە، بـە توانجـەوە وا دەفـەرموێ، یـانی شـوێنی پشـوودانیان نیـە بێجـگە لـە ئاگـر.

٥- ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ﴾، وە ستەمكارانیش هیـچ یارمەتیدەرێكـیان نیـە، كەواتـە: ئەوانـە سـتەمكاریشـن.

**مەسـەلەی سـێیەم:** كـە دەفـەرموێ: ﴿لَّقَدۡ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٖ﴾، بێگومان ئەوانەی گوتیـان: خـوا سـێیەمی سێیانە، بێـبڕوان، پێشـتـریش باسـمـكرد، نەصـرانییەكان بـە خـوا ﷻ و عیسـاو جبـریل دەڵـێن: (الأقـانیم الثـلاثة)، (أقنوم) بە كوردیی، واتە: پێكهاتـە، پێكـهێنـەر، چونكـە دەڵـێـن: خـوا لە سـێ بەش پێكهاتوە: خوا بۆخـۆی، عیساش كە كوڕیـەتی، وە (روح القـدس)یـش كە لـە نێوان خـواو عیسـادا دێو دەچـێو پەیـام دێنـێ، هەندێكیشیان لـە جیاتی (روح القـدس) دەڵێـن: مەریـەم، واتـە: خـواو عیسـاو مەریەم، هەردوو عەقیـدەكان بـوو ون، وە ئێسـتاش هەر هەن، ئەمـە وەك ئـەو ئایەتـەی سـوورەتی (النسـاء)ە، كە دەفـەرموێ: ﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾﴾، كـە كـاتی خـۆی لـە بـەرگی سـێی ئـەم تەفسیـرەدا بـە تەفصیـلێ قسـەمان لەسـەر كـردوە، لەوێشـدا خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ئـەی خـاوەن كتێـبینـە! لـە ئایینـەكەتـان دا تێمـەپەڕێنن، وە جگـە لـە قسـەی هەق لەسەر خـواو بە ناوی خـواوە مەكـەن، مەسـیح عیسـای كوڕی مەریـەم ڕەوانـەكراوی خـوایەو وشـەی خـوایە، هاوێشـتوویەتی بـۆ مەریـەم، {(ألقاها يعني

رماها) چۆن؟ ئەو ڕووحەی عیسا سەلامی خوای لێبێ، جبریل بردوویەتی فووی بە یەخەی کراسی مەریەم دا کرد، خوا لێی ڕازی بێو سەلامی خوای لێ بێ، وە ڕووحێکی تایبەتی بوو، واتە: بەبێ ئەوەی لە ڕێی نوتفەی دایكو بابەوە بێ، یەکسەر بەشێوەی ڕووح وەك فوویێك بە بەرۆکی مەریەم داکرا، وە چووە نێو مندالّدانیو بوو بە عیسا} دەجا ئیمان بە خواو بە پێغەمبەرانی خوا بێنن، وە مەڵێن سێ، وازبێنن بۆ ئێوە باشترە، چونکە خوا تەنیا یەك پەرستراوە، پاکیی بۆی کە ڕۆڵەی هەبێ، هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدا هەیە هی ویە، وە ئەو بەسە بۆئەوەی کە سەرپەرشتیاربێ.

ئنجا لەبەرئەوەی لەوێ بە تەفصیل باسمان کردوە، بۆیە لێرە باسی ناکەینەوە.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ ۚ وَإِن لَّمْ يَنتَهُوا عَمَّا يَقُولُونَ لَيَمَسَّنَّ الَّذِينَ كَفَرُوا مِنْهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، واتە: هیچ پەرستراونین جگە لە یەك پەرستراو، وە ئەگەر واز نەیەنن، لەوەی کە دەیلێن، ئەوانەی بێبڕوان لەوان ئازارێکی بەئێشیان تووش دەبێ، ئەمە ڕاستە ماناکەیەتی، بەلاّم پێویستە دەربارەی ئەم ئایەتە چەند شتێك ڕوون بکەینەوە:

١/ ﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾، ئەگەر فەرمووبای: ﴿وَمَا إِلَٰهٌ إِلَّا إِلَٰهٌ وَاحِدٌ﴾، هەر تەواو بوو، بەلاّم ئەو (مِن)ە، بۆ زیادە تەئکید کردنەوەیە، وە بۆ جەختکردنەوەیە لەسەر ئەوەی کە بە هیچ شێوەیەك جگە لە تاکە پەرستراوی بە هەق، هیچ پەرستراوی دیکە نین، کە شایانی پەرستن بن، نەك لە دنیای واقیع دانین، چونکە لە دنیای واقیعدا هەن، خوا دەفەرموێ: ﴿وَاتَّخَذُوا مِن دُونِ اللَّهِ آلِهَةً لَّعَلَّهُمْ يُنصَرُونَ ﴿٧٤﴾﴾ یس، واتە: مانای وایە ئیسلام دان بەوەدا دەنێ کە پەرستراوی دیکە هەن، بەلاّم پەرستراوی بەناهەقن، واتە: بە ناهەق دەپەرسترێن، ئەگەرنا پەرستراو نین، بەلاّم پەرستراوی بە هەقو شایستەی پەرستن، یەکە، ئەویش خوای بێ هاوتاو بێوێنەیە.

٢/ ﴿وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ﴾، قسەکەیان دووبارە ناکاتەوە، بەس دەفەرموێ: ئەوەی دەیڵێن، خوای بەرزو مەزن هێندە قسەکەیانی پێناخۆشە، بە پێویستی نازانێ دووبارەی بکاتەوە.

٣/ ﴿لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ﴾، لە جیاتی بفەرموێ: (لَيَمَسَّنَّهُم عَذَابٌ أَلِيم) دەفەرموێ: ﴿لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ﴾، بۆ ئەوەی دەریبخات کە ئەوانەی وا دەڵێن کافرن، ئەوە زانایانی ڕەوانبێژیی پێی دەڵێن: (وَضع المُظْهَرِ مَكَان المُضْمَر) شتێك دەرخراوە، دەبووایە بشاردرێتەوە، بۆئەوەی کە دەریبخات، ئەوانە بە هۆی ئەو قسەیانەوە، کافرن.

٤/ ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، وشەی (عَذَابٌ) لە فەرهەنگەکانی زماندا دەڵێن: (الإيجاع الشَّديد) واتە: ئێش پێگەیاندنی توند، (أَلِيم)یش دەڵێ: (الوَجعُ الشَّديد) ئەویش یانی: ئازارێکی توند، کە لە قورئاندا ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، زۆر دووبارە بۆتەوە، (عَذَاب) هەر بۆخۆی واتە: ئازارێکی بەئێش، (أَلِيم) هەر واتە: بەئێش، کەواتە: دەبێتە زۆر زۆر بەئێش.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾، ئایا ناگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لێبووردنی لێناکەن؟! لە حاڵێکدا کە خوا لێبووردەی بە بەزەیی یە! بەڕاستی ئینسان سەری سووڕدەمێنێ لەو هەموو هێمنیی (حِلم) و بەخشش (کَرَم) و بەزەیی (رَحْمَة) و لێبووردن (مغفرة)ی خوای بە بەزەیی، سبحان اللّٰه! خوا چەند هێدیی و مەندە، چەند بەخشندەیە، چەند بە بەزەیی یە، چەند لێبووردەیە، دوای ئەو هەموو گوناح و سەرپێچیی و بێئەدەبیی و هاوبەش دانانەش! چونکە خوای بێهاوتا زۆر زۆر ڕقی لە شیرکە، لەگەڵ ئەوەشدا خوای خاوەن کەرەمی بێسنوور، وەك ئەوەی یەکێك بە یەکێك بڵێ: نافەرمووی بێیە ماڵێ! نافەرمووی لادەی و لە لامان میوان بی؟!! خواش دەفەرموێ: ﴿أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ﴾، ئایا

ناگەڕێنەوە بۆ لای خواو داوای لـێبوردنی لێنـاکەن؟! خۆ خـوا زۆر لێبوردەیـەو زۆر بە بەزەیی یە، بۆچـی نایەن واز لەو شـتانە بێنـن، خۆ خـوا زۆر لـێبوردەیەو لێتـان خۆشـدەبێ، زۆر بـە بەزەییـە!! خـوا بـە ئینکارکردنێکـی میهرەبانانـەوە، داوای گەڕانەوەی لای خۆییـان لـێ دەکـات، هەڵبەتـە ئێمـەش دەبـێ شـتی لـێ فێـر بـین، ئێمـەش کـە دەبینـین کەسـێك هەرچـەندە بیـروبۆچوونێکی زۆر پووچـی هەبـێ، بیـروبڕوایەکی زۆر هەڵـەو هەڵسـوکەوتێکی زۆر خراپـی هەبـێ، دەبـێ چـاو لـە سیفەتەکانی خـوای پـەروەردگـار بکـەین، ئـەو سـیفەتانەی خـوای بێوێنـە کـە لەگـەڵ ئێمـەدا دەگونجێـن، زانایانی ئیسـلام دەڵـێن: دەبـێ خۆمـان بـەو سیفەتانە بڕازێنینـەوە، ئێمـەش دەبـێ هەوڵبـدەین ئەهلـی (حِلم) بین، هێدیـیو مەنـد بیـن، ئەهلـی (کَـرَم) بـین، بەخشـندە بـین، بـە بـەزەیی بـین، وە دەبـێ هەوڵبـدەین لای لێبوردن بگـرین، لای بـەزەیی بگـرین، خـوای پـەروەردگارمان وایـە، هەڵبەتـە هەندێ سـیفەت هـەن تایبـەتن بـە خـواوە، وەك بەدیهێنـەرایەتیـی، پەروەردگـارێتیـی، پەرسـتراوێتـیی، ئـەوە کـە خـاوەنی نـاوە هـەرە چاکـەکانو، سـیفەتە هـەرە بەرزەکـانە، ئـەوە کـە خـوا ملـپێکەچکـەر (قَهّار) و ناچارکـەر (جَبّار)ە، ئەوانـە تایبەتن بە خـوای پەروەردگارەوە، بەڵام کۆمـەڵێك سیفەت هـەن، بەشـەریش دەتوانـێ پشـكو بەشـی لەو سـیفەتانەدا هـەبـێ، بەقـەدەر خـۆی.

**مەسـەلەی شەشـەم:** دەفـەرموێ: ﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ ﴾، لێـرەدا زانایان مشـتومڕێکی زۆریان هەیـە لەسـەر ئـەوەی کـە ئایا مەریـەم یـەکێك بـووە لـە پێغـەمبـەرانی خـوا، یـان نا؟ لەبەرئـەوەی خـوا ﷻ بـاس دەکـات کـە فریشـتەکان قسـەیان لەگەڵ مەریەمـدا کـردوە، جا بـە بۆنـەی ئـەوەوە لـە تەفسیـرکردنی ئـەو ئایەتـانەدا، زانـایـان دوو ئافرەتـی دیکـەش دێنـن، دەڵـێن: ئـەو سێیانە پێغەمبـەر بـوون، (سـارة) دایکـی ئیسـحاق، وە دایکـی مووسـا، لەگـەڵ مەریـەم، دەڵێن: لەبـەر ئـەوەی خـوای پەروەردگـار بۆمـان دەگێڕێتـەوە، کـە هـەر کـام لـەو سـێ ئافرەتانـە فریشـتە قسـەی لەگـەڵ کـردوون:

# سێ ئافرەت کە خوا وەحی بۆ ناردوون،

# ئایا پێغەمبەرن یان نا؟!

١) بە نسبەت (سارة)وە خوا لە سوورەتی (هود) لە درێژەی ئەو ئایەتانەدا کە باسی ژمارەیەك لە پێغەمبەران دەکات، دوایی دەفەرموێ: فریشتەکانمان هاتن بۆ لای ئیبراهیم، پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَٱمۡرَأَتُهُۥ قَآئِمَةٞ فَضَحِكَتۡ فَبَشَّرۡنَٰهَا بِإِسۡحَٰقَ وَمِن وَرَآءِ إِسۡحَٰقَ يَعۡقُوبَ ﴿٧١﴾ قَالَتۡ يَٰوَيۡلَتَىٰٓ ءَأَلِدُ وَأَنَا۠ عَجُوزٞ وَهَٰذَا بَعۡلِي شَيۡخًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عَجِيبٞ ﴿٧٢﴾ قَالُوٓاْ أَتَعۡجَبِينَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِۖ رَحۡمَتُ ٱللَّهِ وَبَرَكَٰتُهُۥ عَلَيۡكُمۡ أَهۡلَ ٱلۡبَيۡتِۚ إِنَّهُۥ حَمِيدٞ مَّجِيدٞ ﴿٧٣﴾ ﴾، واتە: وە ئافرەتەکەی (ئیبراهیم) وەستابوو، ئێمەش مژدەی پەیدابوونی ئیسحاقمان پێداو دوای ئیسحاقیش یەعقووب. گوتی: هەی هاوار بۆ من! چۆن منداڵم دەبێ لە حاڵێکدا کە نەزۆکم و مێردەکەشم پیرە! بەڕاستیی ئەمە شتێکی سەرسووڕهێنەرە! گوتیان: ئایا سەرت لە کاری خوا سووڕدەمێنێ! ڕەحمەتو پێزی خواتان لەسەر بێ ئەی ماڵی (ئیبراهیم) بێگومان ئەو (خوا) شاییستەی ستایشی پایە بەرزە.

دیارە فریشتەکان ئەو قسانەیان لەگەڵ (سارة)دا کردووەو ئەویش لەگەڵ فریشتەکاندا قسەی کردووە.

٢) بەنسبەت دایکی مووساوە، خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِۖ فَإِذَا خِفۡتِ عَلَيۡهِ فَأَلۡقِيهِ فِي ٱلۡيَمِّ وَلَا تَخَافِي وَلَا تَحۡزَنِيٓۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيۡكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلۡمُرۡسَلِينَ ﴿٧﴾ ﴾ القصص، واتە: سرووشمان کرد بۆ لای

دایکی مووسا کە شیری پێبدات، "پێمان گوت" وە ئەگەر لێی ترسای بیخە نێو دەریا، وە مەترسێ و دڵتەنگیش مەبە، ئێمە بۆ لای تۆی دەگێڕینەوە، دەشیکەین بە پێغەمبەرو لە ڕیزی پێغەمبەرانی دادەنێین.

لێرەدا خوا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ ﴾، ئەگەر (سارة) فریشتە قسەیان لەگەڵ (سارة)دا کردوە، ئەوە لێرەدا خوا ڕاستەوخۆ وەحی بۆ دایکی مووسا ناردوون.

٣) بەنسبەت مەریەمیشەوە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرموێ: ﴿ وَإِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰكِ وَطَهَّرَكِ وَٱصۡطَفَىٰكِ عَلَىٰ نِسَآءِ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٤٢﴾ يَٰمَرۡيَمُ ٱقۡنُتِي لِرَبِّكِ وَٱسۡجُدِي وَٱرۡكَعِي مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: کاتێك فریشتەکان گوتیان: ئەی مەریەم! خوا تۆی هەڵبژاردوە، وە پاکی کردوویەوەو بەسەر ئافرەتانی جیهاندا هەڵیبژاردووی، ئەی مەریەم! گەردن کەچ بە بۆ پەروەردگارت، سەجدەی بۆ بەرەو لەگەڵ ڕکووعبەراندا ڕکووعی بۆ بەرە.

(إبنُ حزم الأندلسي) دەڵێ: هەر کام لەو سێ ئافرەتەش پێغەمبەر بوون.

(إبنُ كثير)یش دەڵێ: ئەو ئایەتانە هیچیان ئەوە ناگەیەنن، کە ئەو سێ ئافرەتە پێغەمبەر بوو بن.

هەڵبەتە ڕای زۆربەی زانایان ئاوایە، دەڵێن: (إنَّ اللهَ لَمْ يَبعَث نبيّاً إلاّ مِنَ الرِّجَال)، واتە: بێگومان خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە، مەگەر لە پیاوان بووە، چونکە خوا بۆخۆی دەفەرموێ: ﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالٗا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِم مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡقُرَىٰٓۗ أَفَلَمۡ يَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۗ وَلَدَارُ ٱلۡأٓخِرَةِ خَيۡرٞ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْۚ أَفَلَا تَعۡقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ ﴾ يوسف، واتە: لە پێش تۆدا تەنیا وەحیمان بۆ پیاوانێك ناردون لە خەڵکی شارە

قەرەباڵغەکان، {(قُرى) كۆی (قرية)یە، (قرية) واتە: شار}، کەواتە: بە پێی ئەم ئایەتە بێ، خوا تەنیا لەنێو پیاواندا پێغەمبەرانی ناردوون، واش پێدەچێ هەر ئەم رایە راستبێ.

وە دەربارەی ئەوەش کە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ ﴾، یانی فریشتە قسەیان لەگەڵ (مەریەم)دا کردوە، یاخود قسەیان لەگەڵ (سارة)دا کردوە، کە ئەوانیش هەر پەیامی خوایان پێ راگەیاندوون، زانایان دەڵێن: قسەکردنی فریشتان لەگەڵ غەیری پێغەمبەراندا، چ گرفتێکی تێدانیە، مانای وانیە کە ئەوان پێغەمبەرن، لەبەرئەوەی فریشتە قسەی لەگەڵدا کردوون، بەڵام لێرەدا خوای پەروەردگار مەبەستی پێی ئیلهامە، چونکە خوا وشەی وەحی بۆ هەنگیش بەکارهێناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ أَنِ ٱتَّخِذِي مِنَ ٱلۡجِبَالِ بُيُوتٗا وَمِنَ ٱلشَّجَرِ وَمِمَّا يَعۡرِشُونَ ٦٨ ﴾النحل، واتە: خوا وەحی کرد بۆ هەنگ...

هەروەها خوا وشەی وەحی بەکارهێناوە بۆ ئاماژە کردن، وەك دەفەرموێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ١١ ﴾ مریم، کە مەبەست زەکەریایە دوای ئەوەی خوا مژدەی یەحیای پێدەدات، دەفەرموێ: لە میحرابەکەی چووە دەرێ بۆ لای گەلەکەیو بە ئاماژە پێیگوتن: بەیانیان و ئێواران خوا بە پاك بگرن! تەنانەت خوا وشەی وەحی بۆ وەسوەسەی شەیتانەکانیش بەکارهێناوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ رَبُّكَ مَا فَعَلُوهُۖ فَذَرۡهُمۡ وَمَا يَفۡتَرُونَ ١١٢ ﴾الأنعام.

ئەسڵی مانای وشەی (وحي)یش لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (الكلام الخَفِيُّ) واتە: قسەیەکی پەنهان، جا ئەو قسە پەنهانە، دەگونجێ هی فریشتە بێ، دەگونجێ خوا بیخاتە دڵەوە، دەگونجێ لە رێی ئیلهامەوە بێ، دەگونجێ لە رێی وەسوەسەوە بێ، کەواتە: ئەو وشەیە بە تەنیا بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە ئەو

سێ ئافرەتە بەرێزە پێغەمبەرن، بەلاَم بە تەئکید هەرسێکیان ئافرەتی زۆر گەورەو هەلْکەوتوو و لە خوا نزیك بوون.

ئنجا کە دەفەرمویٚ: ﴿وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ﴾، ئەگەر تەماشا بکەین خوای کاربەجیٚ پلەی صیددیقییەتی لە دوای پێغەمبەرایەتیی هێناوە، وەك دەفەرمویٚ: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ النساء، کەواتە: لە دوای پێغەمبەرایەتیی پلەی صیددیقییەت لە هەموو پلەیەك بەرزترە، تەنانەت لە شەهیدییش، خوای پەروەردگاریش مەریەمی بە صیددیقە وەسف کردوە.

وە کە دەفەرمویٚ: ﴿كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ﴾، واتە: عیساو مەریەمی دایکی خواردنیان دەخوارد، واتە: هەر کەسێك پێویستی بە خواردن‌و خواردنەوە بیٚ ناگونجیٚ پەرستراوبیٚ، ئەگەر نانی لێبڕا برسی بیٚ، ئەگەر ئاوی لێبڕا تینووی بیٚ، ئەوە چۆن شایستەی خوایەتییە؟! یەکێك پێویستی خۆی پیٚ جێبەجیٚ نەکریٚ، هی خەلْکی چۆن پیٚ جێبەجیٚ دەکریٚ؟! دیارە هەندیٚ لە توێژەرەوان گوتوویانە خواردن‌و خواردنەوە پاشەڕۆکیشی هەیە، ئەوەش نەگونجاوە، وە لە ئەسلْدا ئەو سیفەتانە نیشانەی نوقصانیی‌و ناتەواویین، وە خوای بیٚوێنە لە هەموو نوقصانیی‌و ناتەواوییەك بەدوورە.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلْءَايَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ﴾، سەرنج بدە! چۆن ئایەتەکان ڕوون دەکەینەوە، پاشان سەرنج بدە! چۆن لادەدرێن؟!

ئەگەر ئێمە سەرنج بدەین، دەبینین خوا لەو کاتەدا کە خەلْك قسەی زۆر خراپ دەکات، بۆ وێنە: نەصرانییەکان گوتوویانە: عیسا کوڕی خوایە، جوولەکەکان گوتوویانە: عوزێر کوڕی خوایە، موشریکەکان شیرکیان بۆ خوا داناوە، دەهرییەکان هەر دانیان بە خوادا نەهێناوە، کەچی خواش - وەك کوردەواریی خۆمان ئەو تەعبیرە بەکاردێنن - ، خۆی شلویٚ ناکات، بۆیە کە قورئان

دەخوێنــیەوە، هەســت دەکەی جیایە لـە قســەی خـەڵکی دیکە، کەسـێك کتێبێـك دەنووسـێ، تەنانـەت فـەرموودەکانی پێغەمبـەر ﷺ حاڵـەتی بەشـەریان پێـوە دیـارە، چونکــە لـە فەرمایشـــتێکدا تووڕەیـە، لـە فەرمایشـــتێکی دیکـەدا عاطیفـەو سـۆز بەکـاردێنــێ، بـەڵام لـە هــەق نەچۆتــە دەرێ، بـەڵام لە قورئانـدا قســەی عـاطیفیی نابینـن، لە کاتێکـدا کە جێــی ئەوەیە قســەی زۆر تونـد بکـرێ، خـوای پـەروەردگار خۆی شـلوێ ناکـاتو خۆی تێکــنادات، مـەقامی بـەرزی خـوایەتیی چۆن دەخـوازێ، هـەر بـەو شــێوەیە مامەڵـە دەکـات، ئەگـەر ئێمـە بـین تـووڕە دەبـین، قســە دەکـەین، هەڕەشە دەکەین، ... هتـد، بـەڵام خـوای تـاكو پـاك نـەخێر، لە کاتێـکدا قســەی زۆر خراپــیش دەبیســـتێو، موناقەشـەی فیکـرەی ئـەوانیش دەکـات، هـەر دەرگـای تۆبـەو گەڕانــەوەو پەشـێمانبوونەوەیـان بۆ دەخـاتە سـەر پشــت.

ئنجـا کە دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴾، دوایـی تەماشا بکـەو ســەرنج بــدە ! چــۆن لادەدرێــن؟! واتــە: وەك بڵــێی ئــازادیی‌و ویســتی خۆیــان لەدەسـتداوەو، جڵـەویان کەوتۆتـە دەست غـەیری خۆیان، جا ئایا کێ لایان دەدات؟ ئەوە وەك شـارەزایانی زمـانی عەرەبی دەڵێن: (مبنيٌّ للمجهول)ە، لادەدرێن، شــەیتان لایانــدەدات، نەفســیان لایانـــدەدات، خەڵکــێك چۆتــە بــن کلێشــەیان لایانـدەدات، گرنـگ ئەوەیە ویسـتی خۆیان لەدەسـتداوە، بە ویسـتی خۆیان بەڕێوە ناچـن.

**مەســەلەی هەشـتەمو کۆتـایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُلۡ أَتَعۡبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمۡلِكُ لَكُمۡ ضَرًّا وَلَا نَفۡعًاۚ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ﴾، بڵـێ: ئایـا لـە جیاتی خـوا، یـان جگــە لە خــوا شــتێك دەپەرســتن، {(ما)ی بەکـارهێنــاوە واتــە: شــتێك}، نە زیـان نـە سـوودی ئێوەی بەدەســتە، واتـە: پەرسـتــراو کەسێکە بتوانـێ سوود بگەیەنێ بە بەندەکانیو ئەوانـەی کـە دەیپەرستن، وە بتوانـێ زیانیشــیان لــێ دووربخاتەوە، یاخود دەبێ بتوانـێ زیانیان لێبدات، ئەگـەر ســەرپێچـییـان لێکـرد، وە ســوودیان پێبگەیــەنــێ ئەگـەر بەقســەیان کـرد، بـەڵام ئێوە شـتێك دەپەرستن، نـە ســوودی بەدەســتە، نە زیــانی بەدەســتە، کەواتە: شـایانی پەرسـتن نیـە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی هەژدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان دە ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (٧٧ تاکو ٨٦)، بابەتی ئەم دە ئایەتە بریتییە لە تیشك خستنە سەر هەڵوێستی خاوەن کتێبەکان، (جووو دیانەکان) لە خودی خۆیانداو لە بەرانبەر ئیسلامو مسوڵماناندا، لە خودی خۆیاندا چۆنن، وە لە بەرانبەر ئیسلامو مسوڵمانانیشدا چۆنن؟

جا سەرەتا خوای بەرزو مەزن بە پێغەمبەری کۆتایی خۆی موحەممەد ﷺ دەفەرموێ: کە بە خاوەن کتێبەکان بڵێ: لە دینداریتاندا بە ناهەق تێمەپەڕێننو ڕۆمەچن، وە بە دوای ئارەزووی کۆمەڵێکی گومڕای گومراکەر مەکەون.

پاشان خوا ڕایدەگەیەنێ کە ئەوانەی بێبڕوا بوون لە جوولەکەکان، لەسەر زمانی هەر کام لە داوودو عیسای کوڕی مەریەم (علیهما السلام) بە هۆی سەرپێچییو سنوورشکێنی یەوە، نەفرینیان لێکراوە.

پاشان خوا ﷻ بەوە وەسفیان دەکات کە ڕێگرییان لە خراپە نەکردوە، ئنجا باسی هەڵوێستو ڕەفتارێکی دیکەی زۆر خراپیان دەکات، کە بریتییە لە دۆستایەتیی گرتنیان لەگەڵ بێبڕواياندا... وە ڕایدەگەیەنێ ئەگەر ڕاستیایە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرەکەیانو، کتێبی دابەزێنراوی خوا بووایە، بێبڕوایانیان بە دۆست نەدەگرت، کەواتە: نە لەگەڵ خواو، نە لەگەڵ پێغەمبەری خواو، نە لەگەڵ کتێبی دابەزێنراوی خوادا، ڕاستیان نەکردوە.

ئنجا بە جەختکردنەوە ڕایدەگەیەنێ کە: سەرسەختترین کەس لە دوژمنایەتییکردنی بڕواداراندا، بریتین لە جوولەکەو هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان، وە نزیکترین کەسانێك کە خۆشەویستیو سۆزیان بۆ ئیمانداران هەبێ، بریتین لە نەصرانییەکان، کە بەلای نەرمو نیانییدا شکاونەوەو، جۆرێك لە سۆزو بەزەییو

نـزیکییـان لەگـەڵ مسـوڵمانان دا هـەیـە، وە چـونکە قەشـەو ڕاهیبیـان لـە نێـودانو، خۆبەزلـگـریش نیـن، وە کاتێك کە ئەو قورئانـە دەبیستن کـە بـۆ پێغـەمبەر دابـەزیوە، چـاویان پڕدەبـێ لـە فرمێسـك بـە هـۆی ناسینی هەقـەوەو، داواش لـە پـەروەردگاریان دەکـەن کـە لەگـەڵ شـایەداندا بیاننووسـێ، وە شـایەدیی دەدەن کـە موحەممـەد ﷺ پێغەمبـەری کۆتـایی خـوایە، وە قورئـانیش کۆتـا پـەیامی خـوایە، وە بـە پرسیارکردنی نکووڵـیی لێکـەرەوانەوە دەڵـێن: بۆچـی ئیمـان بـە خـوا نـەهێنینو بـەو هەقـەی کـە بۆمـان هـاتوە، لـە حاڵێکـدا کـە بـە تەمـاین خـوا ڕەگـەڵ صـاڵحـانمان بخـات؟! وە کەسـانێك خـوا دەیانخـاتە ڕیـزی صـاڵحانەوە کە ئیمـان بێنـن.

دیـارە خـواش ﷻ لەسـەر ئـەو هەڵوێستـەیان پاداشـتیان بـە بەهەشـت دەداتـەوە، پاشان خـوای دادگەر باسی سـەرەنجامی بێبـڕوایانو سـزای دادگەرانـەی پـڕ بـە پێسـتیان دەکـات.

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ
قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴿٧٧﴾ لُعِنَ
ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا
عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ
لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ
كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ
خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ
أَوْلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ ۞ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ
ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟
ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ
لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ
مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾
وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ
ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُوا۟ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ
وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٨٥﴾ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ أُو۟لَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ
ٱلْجَحِيمِ ﴿٨٦﴾﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((بلّێ: ئەی خاوەن کتێبینە! لە دینداریتاندا بە ناهەق تێمەپەڕێنن، وە مەکەونە شوێن ئارەزووەکانی کۆمەڵێك کە لەمەو پێش گومڕابوون، وە زۆر کەسیان گومڕاکرد، وە لە ڕاستەڕێ گومڕابوون (٧٧) ئەوانەی بێبڕوا بوون لە وەچەی ئیسرائیل، لەسەر زمانی داوودو عیسای کوڕی مەریەم لەعنەتیان لێکرا، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە سەرپێچییان کردو بەردەوام دەستدرێژییان دەکرد (٧٨) عادەتیان وابوو کە یەکدییان نەدەگێڕایەوە لە خراپەیەك کە دەیانکرد، ئەوە خراپترین شت بوو کە دەیانکرد (٧٩) زۆریان لێ دەبینی کە ئەوانەی بێبڕوان بە دۆست دەگرن، بە دڵنیاییەوە خراپترین شت کە بۆ خۆیانیان پێشخستوە، ئەوەیە کە خوا لێیان تووڕەبێ‌و لە سزاو ئازاردا بە هەمیشەیی بمێننەوە (٨٠) وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بە خواو پێغەمبەرو ئەوەی بۆی دابەزێنراوە ببوایە، ئەوان (بێبڕوایان) یان بە دۆست نەدەگرت، بەڵام زۆریان لە ڕێ دەرچوون (٨١) بە مسۆگەریی جوولەکەو هاوبەشدانەرەکان لەنێو خەڵکیدا دەبینی، سەختترین دوژمنایەتییان لەگەڵ بڕواداراندا هەیە، وە دەبینی ئەوانەی کە گوتیان: ئێمە نەصرانیین لە هەموو خەڵکی لە ڕووی خۆشەویستییەوە لە بڕواداران نزیکترن، ئەویش لە سۆنگەی ئەوەوە کە قەشەو ڕاهیبەکانیان لە نێودانو خۆشیان بە زل ناگرن (٨٢) وە کاتێك ئەوەیان بیست کە بۆ پێغەمبەر (موحەممەد) دابەزێنراوە، چاویان دەبینی لە فرمێسکان کە لە ڕێژیی دەکەن[1]، بەهۆی ئەو هەقەوە کە ناسیویانە، دەڵێن: پەروەردگارمان! بڕوامان هێنا، دەجا لەگەڵ شایەداندا بماننووسە (٨٣) (وە دەڵێن:) ئایا بۆچی بڕوا بە خواو بەو هەقە ناهێنین کە بۆمان هاتوە، لە حاڵێکدا کە دەمانەوێ پەروەردگارمان ڕەگەڵ کۆمەڵی صالحانمان بخات! (٨٤) خواش بەهۆی ئەوەوە کە گوتیان: چەند باغێك کە ڕووباریان بە ژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، کردیە پاداشتیان، وە ئەوەش پاداشتی چاکەکارانە (٨٥) ئەوانەش کە بێبڕوا بوونو ئایەتەکانمانیان بە درۆ دانا، ئا ئەوانە هاوەڵانی کڵپە ‌ی دۆزەخ - ن (٨٦))).

---

١) کە لە ڕێژیی دەکەن: پڕ دەبن لە فرمێسكو لێشیان دەڕژێ.

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(لَا تَغْلُوا ): (الغُلُوُّ: تَجاوزُ الحَدِّ، إذَا كَانَ فِي السّعرِ غَلاَءٌ، وَإذَا كَانَ فِي القَدْرِ وَالمَنْزِلَةِ غُلُوٌّ، وَفِي السَّهْمِ: غَلْو، وَأَفعَالُهَا جَمِيعاً غَلا يَغْلُو، وَالغَلِيُ وَالغَلَيَانُ يُقَالُ فِي القِدرِ إذَا طَفَحَت، وَالغَلَواء: تَجَاوز الحَدِّ فِي الجِماع، وَبِهِ شُبِّه غَلْواءُ الشَّبَاب)، (غُلُو) بریتیە لە سنوور دەرچوون، ئەگەر لە نرخدابێ دەگوترێ: (غَلاء)، وە ئەگەر لە ئەندازەو پێگەدابێ دەگوترێ: (غُلُوّ)، وە ئەگەر بۆ تیر بێ دەگوترێ: (غَلْو)، وە فیعلی هەموویان (غَلا يَغْلُو)ە، ئنجا (غَلِيُ، غَلَيَانُ) بۆ مەنجەڵ كە دەكوڵێو سەرقاپەكەی هەڵدەدات بەكاردێ، وە (غَلواء) بریتیە لە سنوور بەزاندن لە سەرجێیدا، وە (غَلْواءُ الشَّبَاب) واتە: گەنجێتییەك كە ئینسان لە ڕووی ئارەزووی جینسییەوە سنوور شكێنی بكات.

(أَهْوَآءَ ): (الهَوَى: مَيْلُ النَّفْسِ إلَى الشَهْوَة، وَالهُويُّ سُقُوطٌ مِنْ عُلُوٍ إلَى سُفْلٍ)، (هَوَى) بریتیە لە ئارەزووكردنی نەفس بۆ شتێك، (هُوِيّ) واتە: كەوتنە خوار لە سەرێوە بۆ خوارێ.

( لُعِنَ ): (اللَّعْنُ الطَّرْدُ وَالإبْعَادُ عَلَى سَبِيلِ السَّخَطِ وَذَلِكَ مِنَ اللهِ تَعَالَى فِي الآخِرَةِ عُقُوبَةُ وَفِي الدُّنيَا انْقِطَاع مِن قبول رَحْمَتِهِ وَتَوفيقِه)، (لَعْن) بریتیە لە دەركردنو دوورخستنەوە بە شێوەی لێ تووڕەبوون، لە دواڕۆژدا سزایە، وە لە دنیاشدا بریتیە لەوەی كە ئەو ئینسانە لە بەزەیی خوا دادەبڕێ، وە لە تەوفیقی خوا دادەبڕێ.

(لَا يَتَنَاهَوْنَ ): (النَّهيّ: الزَّجْرُ عَنِ الشيءِ، بالقَوْلِ أَوْ بِغَيْرِهِ، وَتَنَاهَى الشَّيءُ: بَلَغَ نِهَايَتَهُ وَتَنَاهَى القَوْمُ عَنِ المُنْكَرِ: نَهْى بَعْضُهُم بَعْضاً عَنِ المُنْكَر)، (نَهي) بریتیە لە گێڕانەوەی كەسێك بە قسە یان بە كردەوە، لە هەر شتێك بیگێڕیەوە، (تَنَاهَى الشَّيءُ) واتە: ئەو شتە گەیشتە كۆتایی، (تَنَاهَى القَوْمُ) واتە: قەومەكەی لە نێوان خۆیاندا یەكدییان لە خراپە گێڕایەوە.

(عَدٰوَةً ): (العَداوة: التجاوُز ومُنَـافاةُ الإلتئام... بالقَلْبِ، العَداوَةُ والمُعَادَاةُ بالمشيِ العَدو، في الإخلال بالمعامَلَة: العُدوَان)، (عَدو) بریتیە لە تێپەڕاندن، وە پێچەوانەی پێکەوە گونجانە، ئەگەر بە دڵ بێ دەگوترێ: (عَداوَةُ، مُعَادَاةُ)، ئەگەر مەبەستیش بە پێ ڕۆیشتن بێ، (عدو)ە، وە ئەگەر لە ڕووی هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکی کردن دابێ بە تێپەڕاندن، ئەوە پێی دەگوترێ: (العُدوَان).

(مَّوَدَّةً ): (الوُدُّ: مَحَبَّة الشَّيءِ وَتَمَنِّي كَونِهِ، أَسْبَابُ المَوَدَّةِ كَالنَّصِيحَةِ وَغَيْرِها)، (وُد) بریتیە لە خۆشویستنی شتێك لەگەڵ خۆزگە پێی خواستنی واتە: خۆزگە بخوازیو هۆکارەکانی بۆ ساز بکەی.

(نَصَٰرَىٰ ): (النَّصَارَى: واحده نَصْرَانِي، إمَّا مِنْ: وَنَحْنُ أَنْصَارُ الله، وَإمَّا مِنَ الإنتِسَابِ إلى قَرِيَةَ نَصْرَانَة)، (نَصَارَى) تاکەکەی (نَصْرَانِي)یە، حەوارییەکانی عیسا ﵇ کە گوتوویانە: (نَحْنُ أَنْصَارُ الله) لەوەوە هاتوە، یاخود لە پاڵدرانە لای گوندی (نَصْرَانَة) کە عیسا ﵇ لەگەڵ دایکی خەڵکی ئەوێ بوون.

(قِسِّيسِينَ ): (القَسُّ والقِسّيسُ: العَالِمُ العَابِدُ مِنْ رُؤس النَّصَارى)، (قَسّ، قِسّيسُ) کە ئێمە بە کوردی دەڵێین: کەشیش یان قەشە، بریتیە لە زانایەکی خواپەرست لە گەورە گەورەکانی نەصرانیان.

(وَرُهْبَانًا ): یان کۆی (رَاهِب)ە، یاخود (رهبان) بۆخۆی تاکەو کۆیەکەی (رهابية) یان (رهابين)ە، ئەویش بە کەسێك دەگوترێ کە دووریی بکات لە لەزەتو نیعمەتەکان، (الرَّهْبَانِية غلوّ فِي تَحَمُّلِ التَّعَبُّدِ)، (رهبانية) ئەوەیە کە ئینسان تێپەڕێنێ لە خواپەرستییدا.

(تَفِيضُ ): واتە: دەڕژێ، (فَاضَ المَاءُ إذَا سَالَ مُنْصَباً، وَأَفَاضَ المَاءُ).

(وَنَطْمَعُ ): (الطَّمَعُ: نُزوعُ النَّفْسِ إلى الشيء شَهْوَة لَهُ)، (طَمْع) بریتیە لەوەی نەفس بەرەو شتێك بچێ بە ئارەزووەوە بۆئەوەی کە دەستی بکەوێ.

( فَأَثَٰبَهُمُ): واتە: پاداشتی دانەوە، (الإثَابَةُ: تُسْتَعْمَلُ فِي المحبُوب)، وشەی (إثَابَة) تەنیا بۆ شتی باش بەکاردێ.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

١/ هۆی هاتنە خـوارەوەی ئەو ئایەتانە کە خـوا دەفەرموێ: ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾﴾:

أ- ﴿أَخْـرَجَ ابْـنُ أَبِي حَاتِمٍ عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَـيِّبِ وَأَبِي بَكْرِ بْنِ عَبْدِ الرَّحْمَنِ وَعُـرْوَةَ بْـنِ الزُّبَيْـرِ، قَالُـوا: بَعَـثَ رَسُـولُ اللهِ ﷺ عَمـرو بْـن أُمَيَّـة الضَّـمْري وَكَتَـبَ مَعَـهُ كِتَابَاً إِلَـى النَّجَاشِي فَقَدِم عَلَى النَّجَاشِي فَقَرَأَ كِتَابَ رَسُولِ اللهِ ﷺ ثُمَّ دَعَا جَعْفَر بْنَ أَبِي طَالِب وَالْمُهَاجِرِينَ مَعَهُ وَأَرْسَلَ إِلَى الرُّهْبَان والقِسِيسين، ثُمَّ أَمَرَ جَعْفَر بْنَ أَبِي طَالِب فَقَرَأَ عَلَيهِم سُورَةَ مَرِيَم فَآمَنوا بِالقُرآنِ وَفَاضَتْ أعينهُم مِنَ الدَّمْعِ فَهُم الَّذِينَ أَنْـزَلَ اللهُ فِيهِم: ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ﴾ إِلَـــى قَوْلِـــهِ: ﴿فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾﴾﴾، واتـە: ئیبنو ئـەبی حاتـەم لـە سـەعیدی کوڕی موسـەییب (کـە یەکێکـە لـە زانایـانی تابیعــین) وە لـە ئەبوبـەکری کـوڕی عەبدوڕڕەحمــان، وە لـە عورووەی کوڕی زوبەیر (هەموویـان لە تابیعــینن، خـوا لێیان ڕازی بـێ) دەگێڕنـەوە پێغەمبـەری خــوا ﷺ (عَمـرو بْـن أُمَيَّـة الضَّـمري) بـە نامەیەکـەوە نـارد بـۆ لای نەجاشــیی، چوو بۆ لای نەجاشیی‌و نامەکەی پێغەمبـەری خـوای ﷺ بەسـەردا خوێندەوە، نەجاشیی جەعفـەری کـوڕی ئەبو طاڵیبــی بانــگ کــرد (واتـە: بـرای عەلـی، کـە ئەوکاتـە پەنایـان بردبـوو بـۆ حەبەشــەو لــەوێ بـوون) لەگــەڵ ئـەو کۆچکەرانەی لەگەڵی بوون، ئنجـا بـە دوای ڕاهیبەکــان‌و شـارەزایانیشــی دا نــارد

(کە نەصرانیی بوون)، پاشان فەرمانی بە جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب کرد، ئەویش سوورەتی مەریەمی خوێندەوە، ئەوانیش ئیمانیان هێناو چاویان پڕ بوو لە فرمێسكو فرمێسكی لێ ڕژا، ئەوانەن کە خوای پەروەردگار ئەو ئایەتانەی لە بارەوە ناردنە خوار.

ب/ ﴿وَرَوى ابْنُ أَبِي حَاتِم عَنْ سَعِيد بْن جُبَيْر قَالَ بَعَثَ النَجَّاشِي ثَلاثِينَ رَجُلاً مِنْ خِيَارِ أَصْحَابِهِ إِلى رَسُول الله ﷺ فَقَرَأَ عَلَيهِم سُورَة (يَس) فَبَكَوا فَنَزَلَت فِيهِم الآيَة﴾، واتە: ئیبنو ئەبی حاتەم لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: نەجاشی سی کەس لە هاوەڵانی خۆی کە ئیمانیان هێنابوو، ناردنی بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەری خوا ﷺ سوورەتی (یس)نی بەسەردا خوێندنەوە، هەموویان گریان، وە ئەم ئایەتە لەبارەی ئەوانەوە هاتە خوار.

هەروەها (طبراني) لە عەبدوڵلای کوڕی عەبباسەوە ئەم بەسەرهاتەی گێڕاوەتەوە، وە (السيوطي)یش لە (أسباب النزول)ەکەی خۆیدا هێناویەتی[1].

(إبنُ كثير) گوتوویەتی: ئەم قسەیە تێبینی لەسەرە! چونکە ئەم ئایەتە لە مەدینە هاتۆتە خوار، وە بەسەرهاتی جەعفەرو نەجاشی لە پێش کۆچکردندا بووە بۆ مەدینە.

بەڵام خاوەنی تەفسیری (محاسن التأويل) (جمال الدين القاسمي) وەڵامێکی باشی (إبنُ كثير)ی داوەتەوە، دەڵێ: (أَقُولُ: إِنَّ نظره مدفوعٌ، فإنهُ حُكيَ في هذهِ الآية بَعْدَ الهِجْرَة مَا وَقَع قبلها، ونظائرهُ في التنزيل كثيرة ولا إشكال فيه)[2]، واتە: تێبینییەکەی ڕەتکراوەیە، چونکە لەم ئایەتەدا دوای کۆچکردن ئەوە گێڕدراوەتەوە کە لە پێش کۆچکردندا ڕوویانداوە، (واتە: ئەم ئایەتە باسی بەسەرهاتێك دەکات، کە لە پێش کۆچکردندا ڕوویداوە، با دوایش گێڕدرابێتەوە) بەڵام باسی ڕووداوێکی پێشتر دەکات، وە ئەوەش لە قورئاندا زۆرەو هیچ کێشەیەکی تێدانیە. منیش دەڵێم قسەکەی ڕاستە.

---

١) بڕوانە: لُباب النقول: ٤٢٩، ٤٣٠، ٤٣١.

٢) محاسن التأويل: ج٤، ص٣٣٧.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

دوای ئـەوەی لـە ئایەتـەکانی پێشوودا زۆرێـك لـە هەڵـەو پەڵـەکانی نەصـرانییەکان خرانـەڕوو، ئـەمجارە خـوای کاربـەجێ فـەرمان بـە پێغەمبـەری خاتـەم موحەممەد ﷺ دەکـات کـە ڕووبکـاتە خـاوەن کتێبەکـانو پێیـان بفـەرموێ کـە بـە نـاهەق لـە دینـداریی یانـدا تێنەپـەڕێننو، نەکەونـە شـوێن ئـارەزووی کۆمەڵـێکی گـومڕای پێشـتـر گومـڕابووی گومڕاکـەر: ﴿ قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ وَلَا تَتَّبِعُوٓا۟ أَهْوَآءَ قَوْمٍ قَدْ ضَلُّوا۟ مِن قَبْلُ وَأَضَلُّوا۟ كَثِيرًا وَضَلُّوا۟ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، دیارە ئێمـە لـە مەسـەلە گرنگەکانـدا هەڵوەسـتەی بـاش لـە بەرانبەر ئەم ئایەتـەو چوار ئایەتەکەی دواییشـیدا دەکـەین، کە هـەر پێنجیان پێکـەوە پەیوەستنو لەبـارەی لانەدان لـە دیـنو، پاشـان ئەنجـامدانی ئەرکـی گـەورەو گرنگی فەرمانـکردن بە چاکەو ڕێگـریی کردن لە خراپـە، بۆیـە لێرە بە کورتیی بەسـەریاندا ڕەتـدەبین.

ئنجـا خـوای پەنهـانزان باسـی ڕاسـتییەکی مێژوویی گەورەو هەستیار دەکات کە جێـی خۆیـەتی ئەهلـی ئیسـلام پەندێکـی گـەورەی لێوەربگـرن، ئـەویش بریتیـە لـەوەی کە کۆمەڵـێکی بێبـڕوای جوولەکـە بـە هـۆی تـاوانو سـەرپێچییانو، پاشـان بەهـۆی ڕێگـریی نەکردنیـان لەنێـو خۆیـاندا لە خراپـەو لادان، شـایستـەی ئـەوە بـوون کـە لەسـەر زمـانی داوودو عیسـای کـوڕی مەریـەم نـەفرینیان لـێ بکـرێ: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنۢ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ ۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا۟ وَّكَانُوا۟ يَعْتَدُونَ ﴿٧٨﴾ كَانُوا۟ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ ۚ لَبِئْسَ مَا كَانُوا۟ يَفْعَلُونَ ﴾، وە سـەرەنجام خـوای بەرزو مـەزن باسـی هەڵوێسـتێکی دیکـەی لادەرانـی گەلـی جوولەکـە دەکـات، کـە بریتیـە لـە دۆسـتایەتیی گرتنیـان لەگـەڵ کافرانـداو هاوکـاریی کردنیـانو بـە هـۆی ئـەو ڕەفتـارو هەڵوێسـتە

مەترسیدارەیانەوە، ئیمانیان بە خواو پێغەمبەرو کتێبی خوا، دەخاتە ژێر نیشانەیەکی پرسیاری گەورەوە، بگرە ئیمانەکەیان زەربی سفر دەکاتو دەفەرموێ: ئەگەر ڕاستبا ئیمانیان هەبووایە، ئەهلی کوفریان بە دۆست نەدەگرت: ﴿ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ ﴿٨٠﴾ وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ ﴿٨١﴾ ﴾، کەواتە: مسوڵمانانیش دەبێ وریابنو بە هۆی دۆستایەتی گرتنو کەینو بەین هەبوون لەگەڵ ئەهلی کوفردا، لە جیاتی ڕاوەستانیان لە بەرانبەر نەخشەو پیلانەکانیاندا، نیشانەی پرسیار نەخەنە سەر ئیمانو ئیسلامەکەیان!

ئنجا خوا ﷻ لە درێژەی باسی هەڵوێستی خاوەن کتێبەکاندا، واتە: جوولەکەو نەصرانییەکان، بەڵکو لە کۆتایی باسکردنیاندا، مسوڵمانان ئاگادار دەکاتەوە کە کێ زیاتر دوژمنی سەرسەختی مسوڵمانانەو، کێش دەگونجێ تۆزێك نزیکیو خۆشەویستیو هاوسۆزیان لەگەڵ مسوڵماناندا هەبێ، خوا ﷻ مسوڵمانانی ئەوکاتو ئێستاو داهاتووش ئاگادار دەکاتەوە، وە ئەوەی خوا فەرموویەتی میصداقەکەی بە بەرجەستەکراویی دەبینین لە دنیای واقیعدا، دەفەرموێ: ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ النَّاسِ عَدَاوَةً لِّلَّذِينَ آمَنُوا الْيَهُودَ وَالَّذِينَ أَشْرَكُوا ﴾، بێگومان تۆ دەبینی سەرسەختترین کەس، ئەوانەی دوژمنایەتی سەختیان هەیە لەگەڵ ئەوانەدا کە ئیمانیان هێناوە، جوولەکەکانن، وە ئەوانەن کە هاوبەشیان بۆ خوا بڕیار داوە، واتە: ئەوانە لە هەموو خەڵکی دیکە، لە هەموو نامسوڵمانان زیاتر دوژمنی سەرسەختی ئەهلی ئیمانن، خوای کاربەجێش هەر بەوەندە ئەو حەقیقەتە ڕادەگەیەنێو وازی لێ دێنێ، کە دیارە ئێمە دوایی لە مەسەلە گرنگەکان دا باسی دەکەین، چۆنە؟ ئنجا دێتە سەر باسی هەڵوێستێکی پێچەوانەی ئەوە، واتە: پێچەوانەی دوژمنایەتییو کین لە دڵ بوون بەرانبەر ئەهلی ئیمان، کە بریتییە لە هاوسۆزییو خۆشەویستییو نزیکیی،

دەفـــــــەرموێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَٰرَىٰ ﴾، وە بـە تەئكـيد نـزيكتـرين كـەس لـە خۆشـەويسـتييەوە بـۆ ئەوانـەی ئيمانيـان هێنـاوە لـە نامسـوڵمانان، ئەوانـەن كـە گوتيـان: ئێمـە نەصـرانيين، واتـە: نەصـرانييەكان لـە ڕووی هاوسـۆزيی و نـزيكـييەوە، لـە ئـەهلی ئيمـان نـزيكتـرن، ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، ئەويش لە سۆنگەی ئەوەوە كە قەشەو ڕاهيبيان تێدان، وە خۆيـان بـە زل ناگـرن، (قسيسين) كۆی (قِسِّيس)، يـان (قِس)ە، هـەردووكی بـە مانـای زانـای نەصـرانيی دێ، بـە كوردی دەڵـێ: كەشيش يـان قەشـە، ﴿ وَرُهْبَانًا ﴾، وە كەسانێكی گۆشـەگيـريان تێدا هـەن، (رُهبَان) كۆی (راهب)ە، (راهب) واتـە: كەسێك كـە گۆشـەگيـر بووە لـە پەنـايـەك، لـە شـوێنێكی چـۆڵ بۆخـۆی خـواپەرستی دەكـات، ﴿ وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، وە لەبەر ئەوەش كە خـۆبەزلگـر نين، واتە: سروشـتيان سروشـتێكی نـەرمو نيانە، نـەك خۆبەزلگر بن، بەڵكو نەرمو نيـانانەو بە هێـديی و مەندييـەوە قسـە دەكەن.

ئنجـا دێتـە سـەر درێـژەی هەڵوێسـتەكەيانو دەيخاتـەڕوو، دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾، وە كاتێك ئـەوەی بـۆ پێغـەمبەر ﷺ دابـەزێنراوە گـوێ بيسـتی دەبـن، تـۆ چاويـان دەبينی پڕ دەبێ لە فرمێسـك بەهـۆی ئـەو هەقـەوە كە بيسـتوويانە، كاتێك گوێ لە پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەگـرن، ئايەتيـان بەسـەردا دەخوێنێتـەوە، ئـەو هەقە كـە ئايەتـەكان دا گرتوويانەتـە نێـو خۆيـان دەيناسـنو پـەی پێدەبـەن، بەهـۆی ئـەوەوە دەكەونـە ژێـر كاريگـەريی و فرمێسـكيان بـە چـاودا دێتـە خـوار، بـە تەئكيـد لێـرەدا مەبەست پێی كۆمەڵێك لە نەصرانييەكانە، چونكـە هەموويـان وا نـەبوون، كە لە كاتی بەسـەردا خوێنـرانەوەی ئايەتەكان بگريەن، ديارە لێرەدا مەبەست لەوانەيە كە ئيمانيان هێنـاوە، بـەڵام ئـەوەی ديكـە مەبەسـت پێـی حاڵـەتی گشـتييانە، بەگشـتی بـە هـۆی ئـەوەوە كە زانـاو خـواپەرستيان لـە نێـودا هـەنو، خـۆ بـە زلگـر نـين، نـەرمن لەگـەڵ

ئیمانداراندا، هەڵوێستیان نەرمترە، بەڵام بەتایبەتییش هەندێکیان لەنێودا هەن، کە کاتێك ئەو ئایەتانە دەبیستن کە بۆ پێغەمبەری خاتەم ﷺ دابەزێنراون، دەکەونە ژێر کاریگەریی، وە چاویان پڕ دەبێ لە ئاو، فرمێسکیان لە چاو دێ، چونکە دەڵێ: (فَاضَ يَعني: امْتَلأَ، فَاضَ الإِنَاءُ، يعني: امتلأ) قاپێك کە پڕبێ و لەسەری بڕژێ، ئەوە پێی دەگوترێ: (فَاضَ)، جا بۆیەش دەگوترێ: (فَيضَان) چونکە بارانەو لافاوە، دێ بەسەر دەوروبەری خۆی دەگەڕێ، ﴿ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَاكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، دەڵێن: پەروەردگارمان! ئیمانمان هێنا لەگەڵ شایەداندا بماننووسە، واتە: لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە شایەدیی دەدەن کە ئەم قورئانەو ئیسلام و پێغەمبەری خاتەمە (موحەممەد) ﷺ هەقن، دوایی بۆخۆیان لە نێو دڵی خۆیانداو، لەبەر خۆیانەوە دەڵێن: ﴿ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾، واتە: بە نکوولیی لێکردن و بە سەرسووڕمانەوە دەڵێن: جا بۆچی ئیمان بە خوا نەهێنین و، بەو هەقەی کە لە خواوە بۆمان هاتووە؟! ﴿ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴾، لە حاڵێکدا کە ئێمە ئومێدمان وایە پەروەردگارمان بمانخاتە گەڵ کۆمەڵی صاڵحان، کە هەم لە دنیادا لە ریزی ئەواندا بین و، هەم لە دوارۆژدا پێکەوەبین لە بەهەشتەکانی خوا، کە ئەوان ئەوە هەڵوێستیانە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ﴾، لە پاداشتی ئەوەدا کە گوتیان خوا بەهەشت گەلێکی پێدان چەند باغ و باخچەیەکی پێدان، کە مەبەست پێی ئەو شوێنەیە کە بۆ ئیمانداران ئامادەکراوە، کە پێی دەگوترێ بەهەشت، ئێمە لە کوردەواریی خۆماندا دەڵێین: بەهەشت مەبەستمان پێی ئەو شوێنەیە کە لە دوارۆژ بۆ ئیمانداران دانراوە، بەڵام لە قورئاندا وشەی: (جَنَّة) واتە: باغ، جا ئەو باغە دەگونجێ باغێکی سەر زەوی بێ، وە دەشگونجێ باغێك بێ کە ئیمانداران لە قیامەت پێیان دەدرێ و چاوەڕێی دەکەن، بەڵام ئەوەی ئێرە مەبەستە پێی ئەوەیە کە لە قیامەتدا بۆیان دانراوە، خوا لە

پاداشتی ئەوەدا چەند بەهەشتێکی پێدان، کە چەندان ڕووباری ئاویان بە ژێر دەڕۆن، وە بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، ﴿وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، ئا ئەوەش پاداشتی چاکەکارانە.

ئنجا خوای بالادەست لە کۆتایی دا بە کورتی باسی سزای بێبڕوایان و ئەوانەش کە پێغەمبەرانی خوا بە درۆ دەزانن، ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانن، دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَكَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ ﴾، وە ئەوانەش کە بێبڕوابوون، وە ئایەتەکانی ئێمەیان بە درۆزانی، ئەوانە خاوەنی کڵپەی ئاگری دۆزەخن، یاخود هاوەڵنی، چونکە (أَصْحَاب) کۆی (صَاحِب)ە، (صَاحِب) هەم بە مانای دۆستو هاوەڵ دێ، وە هەم بە مانای خاوەنیش دێ، کە دوایی ڕوونی دەکەینەوە بۆچی خوای پەروەردگار بە بێبڕوایانێك کە دەچنە دۆزەخەوە هەمیشە تەعبیری ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْجَحِيمِ﴾، یان ﴿أَصْحَٰبُ ٱلنَّارِ﴾ وە بە پێچەوانەوە بۆ ئیمانداران کە دەچنە بەهەشت تەعبیری: ﴿أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِ﴾، بەکاردێنی؟

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ غَيْرَ ٱلْحَقِّ﴾، خوای پەروەردگار بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، بفەرموو: ئەی خاوەن کتێبینە! بە ناهەق لە دینداریتاندا تێمەپەڕێنن، ڕۆمەچن، یاخود بە شێوەی ناهەق تێمەپەڕێنن، یاخود بە تێپەڕاندنێکی ناهەقانە لە دینداریدا تێمەپەڕێنن، جا لێرەدا خوای زاناو شارەزا چوار وشەی بەکارهێناون، کە ئەمانەن:

١- ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾، خاوەنانی کتێب، ئەوانەی کە ئیددیعا دەکەن کتێبی خوایان لەبەردەستە، زۆربەی زانایان دەڵێن: هەر مەبەست جوولەکەو نەصرانییەکانن، بەڵام من پێموایە هەموو ئەوانەی کە لافی ئەوە لێدەدەن کە کتێبی ئاسمانییان لەبەردەست دایە، دەگونجێ مامەڵەی ئەهلی کتێبیان لەگەڵدا بکرێ، بەڵام دیارە بە پلەی یەکەم جوولەکەو نەصرانییەکان، چونکە لە قورئاندا خوای پەروەردگار ناوی ئەو دووانەی هێناوە، هەرچەندە ناوی مەجووسیو صابیئەشی هێناوە، کە دیارە هەر کام لە مەجووسو صابیئەش ئیددیعای ئەوە دەکەن کە شوێنکەوتووی پێغەمبەرانن (عليهم الصلاة والسلام) هەر بۆیەش لەگەڵ مەجووسییەکانیشدا مامەڵەی خاوەن کتێبەکان کراوە، پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿سُنُّوا بِهِمْ سُنَّةَ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾[1]، وەك خاوەن کتێبان مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن، چونکە ئەوانیش کتێبەکەیان (ئاڤێستا)یە، یان کتێبێکی دیکەیە، وە بەنسبەت صابیئەوە، کتێبێکیان هەیە بە ناوی

١) قال الألباني، في (إرواء الغليل): ١٢٤٨، حديث عبدالرحمن بن عوف: (سُنُّوا بِهِم سنة أهل الكتاب):

أخرجه مالك في (الموطأ)(٤٢/ ٢٧٨/ ١)، وأخرجه ابن أبي شيبة في (المصنَّف) (٢/ ٢٢٧ / ٢)، وقال الهيثمي في (المجمع) (١٣/ ٦) رواه الطبراني، دفية مَنْ لم أعرفه.

وقال الشيخ الألباني في (إرواء الغليل): ١٢٤٨ : حديث عبدالرحمن.

(كَنـزا رَبّـا)[١] بـا زۆر سەلـمێنراویش نەبـێ، بـەڵام گـرنگ ئەوەیـە لـەوەدا کـە ئیمانیـان بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـیو بـە پێغـەمبەران هـەیە، لـە ئەسـڵدا بـە خـاوەن کتـێب لە قـەڵـەم دەدرێـن.

٢- ﴿لَا تَغْلُواْ﴾، دەڵـێ: (غَـلا، يَغْلُـو، غُلُـوّاً) واتــە: تێپـەڕانـد، تێدەپەڕێنــێ، زۆر ڕۆچــوون، (مُحَمَّـد الطـاهر بـن عاشـور) لـە تەفسیـرەکەی خۆیـدا (التحرير والتنويـر)[٢] دەڵـێ: (غَـلاَ فـي الأَمْـرِ إِذَا جَاوَزَ حَدّهُ الـمعروف، فَالغُلُوُّ الزيـادَةُ في العَمَلِ الـمتعارف منـهُ، بِحَسَـبِ العَقْـلِ، أَوِ العَـادَةِ، أَوِ الشَّـرْعِ) واتـە: (غَـلاَ) لـە کارێکـدا، بریتیـە لـەوەی ئینسـان لـە سنووری کارەکە تێبپەڕێنـێ، لـەوەی کە بە چـاك زانـراوە، بـە پێـی عـورف پەسـندە، جا چ بـەپێی عـەقڵ ئـەو شتە بـە چاك زانرابـێ، چ بـە پێـی عـادەتو عـورف، چ بـە پێـی شـەرع، تێبپـەڕێنرێ، پێـی دەگوترێ: (غُـلُوّ)، تێپـەڕانـدن.

٣- ﴿فِي دِينِكُمْ﴾، لێـرەدا مەبەسـت لـە دیـن (تَـدَيُّن)ە، واتــە: (تَدَيُّنُـكُم) لـە دینـداریـتـانـدا تێمـەپەڕێنـن، وە لـە فەرمایشـتێکدا پێغەمبـەری خـوا ﷺ دەفەرمـوێ: ﴿إِيَّـاكُمْ وَالْغُلُـوَّ فِي الدِّينِ فَإِنَّمَا أَهْلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ الْغُلُوُّ فِي الدِّينِ﴾ {أَخْرَجَـهُ مُسْلِمٌ بِرَقَمِ: (٣٨٧١)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٣٠٥٧) عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رضي الله عنه} ، واتە: خۆتـان لە تێپـەڕاندن لە دینداریی دا بپارێزن، ئەوانـەی پێـش ئێـوە بە هـۆی تێپـەڕاندنـەوە لە دینداریـی دا فەوتـان.

نەصرانییەکان دەربارەی عیسا سـەلامی خـوای لـێ بێ تێیانپەڕانـد، بەنـدەی خـوا بـوو، پێغـەمبەری خـوا بـوو، کردیـان بـە کوڕی خـوا، سـەرەنجام تووشـی شیـرك بـوونو فـەوتان، جوولەکەکانیش تێیانپەڕانـد لـە دژایـەتیکردنی عیسـادا، بوختـانیان بـۆ کـردو گوتیـان: کـوڕی بـابی خـۆی نیـەو زۆڵـە، هـەروەهـا تێشـیانپەڕاند بـە بـاری دنیـاداریی دا، تووشـی گۆلـك پەرستـییو پـارەو سـامان پەرستـیی بـوون، هـەموو خـاوەن بەرنامـە خـوایيەکان هەنـدێك تێیانپەڕانـدوە بـە

١) واتــە: خەزێنـەی خـوای پـەروەردگار.
٢) ج٣، ص٢٩٠.

بارێکدا، هەندێکی دیکەیان بە بارێکی دیدا، کە بووەتە هۆی فەوتان‌و کورتبوونەوەی تەمەنیان، وە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرمایشتێکی دیکەی زۆر بەلیغدا فەرموویەتی: ﴿أَلاَ هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ، أَلاَ هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ، أَلاَ هَلَكَ الْمُتَنَطِّعُونَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٦٥٥)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٧٢٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٦٠٨) وَالبَزَّارَ برقم: (١٨٧٨) عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه}، واتە: سێ جاران فەرمووی: ئاگاداربن! ئەوانەی سەختگیریی دەکەن فەوتان، واتە: لە شتێکدا سەختگیریی دەکەن کە پێویست ناکات سەختگیریی تێدا بکەن، تێدەپەڕێنن، سنوور بەزێنیی دەکەن، چونکە لە دینداریيدا دەبێ نە تێبپەڕێنی نە کورتبێنی‌و بەجێبمێنی، بەڵکو خەتی نێوەڕاست بگری، چونکە هەم کورتهێنان‌و بەزایەدان (تفريط) خراپە، وە هەم تێپەڕاندن زێدەڕۆیی (إفراط)یش، دەبێ ئینسان کەمتر لە ئیسلام مسوڵمان نەبێ، وە زیاتر لە ئیسلامیش مسوڵمان نەبێ، لە ئیسلام ئیسلامتر نەبێ، وە لێشی کەمتر نەبێ، وەك گوتمان خەتی نێوەڕاست بگرێ، بۆیە ئێمە پێنج فەرزە لە نوێژدا دەڵێین: ﴿ ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ﴾، ڕێی ڕاستمان پێشانبدە، بمانخە سەر ڕێی ڕاست، یان لەسەر ڕێی ڕاست بمانهێڵەوە، واتە: ئەو هێڵە ڕاستەی کە نە تێبپەڕێنی، نە کورتی بێنی، نە بەلای ڕاستدا، نە بە لای چەپدا.

٤ - ﴿ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ ﴾، دوو واتای هەن:

أ/ لە دیندارییتاندا تێمەپەڕێنن، ئەو تێپەڕاندنەی کە هەمووی بە تاڵ‌و ناهەقە.

ب/ تێپەڕاندنێکی ناهەق تێمەپەڕێنن، یانی: تێپەڕاندنی بە هەقیش هەیەو، تێپەڕاندنی بە ناهەقیش هەیە، بەڵام من مانای یەکەمم پێ ڕاستترە، چونکە پێموایە هەموو تێپەڕاندنێك ناهەقە، وە هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: مەبەست لە تێپەڕاندنی بە هەق، ئەوەیە کە ئینسان لە بواری (فقه)دا زۆر بچێتە نێو وردەکارییەکانەوە، یان لە بواری ڕەوانبێژییدا، زۆر بچێتە نێو وردەکارییەکانەوە، بەڵام پێموایە، ئەوە تێپەڕاندن نیە، بەڵکو تێپەڕاندن ئەوەیە لە سنووری مەعقوول‌و مەشروع بچێتە دەرێ، بەڵام هەرچەندە بە

دینـدا قوولْ بیەوە، هەرچـەندە بە زانسـتدا قـوولْ بیـەوە، مادام تووشـی ناهـەق نەبـی (غُلُوّ) نیـە.

**مەسەلەی دووەم:** کـە دەفـەرموێ: ﴿وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ﴾، بـە دوای ئارەزووەکـانی کۆمەڵێك مەکـەون، کە پێشـتر گومڕابوون، وە خەڵکێکی زۆریان گومڕا کـردووە، لـە ڕاستە شـەقام ونبـوونو گومـڕابـوون، وشـەی: (أَهْـوَاء) کـۆی (هَـوَى)یە، (الـهَوَى: مَا ذَكَرَ اللهُ الـهَوَى فـي القُـرآنِ إلاَّ مَذمُـوماً)، خـوا لـە قورئـاندا باسـی هـەوای نـەکردوە مەگـەر بـە زەمکراویی، هەمیشـە بـە ڕەخنـە لـێگرتنو زەمکراویی باسی کردوە، بۆ وێنـە:

١- ﴿ ... وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ ... ﴿٢٦﴾ ﴾ص، واتـە: بـە دوای هـەوا مەکـەوە لـە ڕێی خـوا لات دەدات...

٢- ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلۡهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ ﴾النجم، واتە: (پێغەمبەر ﷺ) لـە ئـارەزووەوە قسـە ناکات.

٣- ﴿ أَرَءَيۡتَ مَنِ ٱتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ أَفَأَنتَ تَكُونُ عَلَيۡهِ وَكِيلًا ﴿٤٣﴾ ﴾الفرقـان، واتە: ئـایا ئەو کەسـەت دیوە کە ئـارەزووی خـۆی کـردۆتـە پەرسـتـراوی خـۆی؟! ئایا تۆ دەکری بەسـەرییـەوە چاودێـر بـی!

٤- ﴿ فَلَا يَصُدَّنَّكَ عَنۡهَا مَن لَّا يُؤۡمِنُ بِهَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرۡدَىٰ ﴿١٦﴾ ﴾طـه، واتـە: (ئەی مووسـا) با تۆ لە قیـامەت لانـەدات کەسێك کە ئیمانی پێـی نیـە، (واتـە: بـە دواڕۆژ) وە کەوتـۆتـە دوای ئـارەزووی خـۆی ئەگـەرنا دەفـەوتێـی!

بـە کـوردی بـە (هـوی) دەڵـێین: ئـارەزوو، ئـەوەی کـە نـەفس پێـی خۆشـە، بـەڵام ئەگـەر ناهـەق بـێ، چونکـە نەفس خـواردنی خۆشـی پـێ خۆشـە، ئـاوی سـازگاری پـێ خۆشـە، میـوەی پـێ خۆشـە، ئـەوە پێـی نـاگوترێ (هـوی)، یـان ئەگـەر ناویشـی

لێبنێی (هوی) ئارەزوویەکی ناهەق نیە، بەڵام بەهەرحاڵ ئەوە پێی دەگوترێ: (شهية)، کە ئارەزوویەکی فیطرییانەیە، وە مادام (هوی) لە قورئاندا هەمیشە زەمکرابێ، دیارە مەبەست پێی جووڵاندنی ئارەزوویە بە باری ناهەقدا، جا چ لە ڕووی فیکرییەوە بێ، چ لە ڕووی ئەخلاقییەوە، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە، چ لە ڕووی سیاسییەوە ... هتد، مادام بە باری ناهەقدا بێ، پێی دەگوترێ (هوی)، بەڵام ئەگەر بە باری هەق دابێ، پێی ناگوترێ (هوی).

دەگێڕنەوە ڕۆژێك کابرایەك بە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسی گوت: (إنَّ هَوايَ مَعَ هَوَاكَ) عەبدوڵڵاش پێی گوت: هەوا شتێکی خراپە، بڵێ: ڕام لەگەڵ ڕای تۆیە.

ئنجا خوا ﷻ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، کە بە خاوەن کتێبەکان بفەرموێ: بەدوای ئارەزووی کەسانێك مەکەون کە پێشێ گومرابوون، (واتە: پێش هاتنی ئیسلام) ئنجا بەوەندەش ئیکتیفایان نەکردوە، کە هەر خۆیان گومرابن، ﴿ وَأَضَلُّواْ كَثِيرًا ﴾، بەڵکو خەڵکێکی زۆریشیان گومرا کردووەو لە ڕێ لاداوە، ﴿ وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ﴾، وە دوای ئەوە کە ئیسلامیش هاتوە، شوێن ئیسلامیش نەکەوتوون، کەواتە: سێ جار وشەی (ضلال)یان بۆ بەکاردێنێ:

أ/ پێش ئیسلام گومرابوون.

ب/ خەڵکیشیان گومرا کردوە.

ج/ وە کاتێك کە ئیسلام هاتوە هەر لەسەر گومرایەتییەکەی پێشێیان ماونەوە.

دیارە لێرەدا قسە لەگەڵ جوولەکەو نەصرانییەکانە، واتە: ئەی جوولەکەو نەصرانییەکان! بەدوای ئەو بەرپرس و زاناو مشوورخۆرانەتان مەکەون، کە ئاوابوون، ڕیشی خۆتان لە دەستی وان مەنێن، کوێرانە بەدوایان مەکەون و بۆخۆتان بیر بکەنەوە.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ

﴿٧٨﴾ كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُۚ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ ﴿٧٩﴾﴾، خـوا ﷻ لێـرەدا باسـێكی بێبـڕوایانی جوولەكـەكان دەكـات، دەفـەرموێ: ئەوانـەی بێبـڕوا بـوون لـە جوولەكـەكان، لە وەچـەی ئیسـڕائیل لەسـەر زەمانی داوودو عیسـای كوڕی مەریەم لەعنـەتیان لێكرا، بۆچی؟ دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعْتَدُونَ﴾، بە هۆی ئـەوەوە كـە سـەرپێچییان كـرد، وە هەمیشـە دەسـتدرێژییان دەكـردو، سـنوورشـكێنییان دەكـرد، لێـرەدا كـە دەفـەرموێ: لەسەر زەمـانی داوودو عیسـای كوڕی مەریەم لەعنـەتیان لێكـراوە، واتـە: لـە (زەبـووروو ئینجـیل)دا لـەو دوو كتێبـەدا لەعنـەت كرابـوو لەوانـەی كـافر بـوون لـە بـەنی ئیسـڕائیل، كەواتـە: بـەنی ئیسـڕائیل هەموویـان كـافر نـەبوون، تـەنیا ئەوانـەیان كـافر بـوون، كـە بـە قسـەی پێغـەمبەرانیـان نەكـردووەو بـە ناڕاسـتیان زانیـون، بەهـەر حـاڵ ئەوانەی بەر ئەو لەعنەتە كەوتوون، لە بازنەی ئەو ئیمانو ئیسـلامە دەرچوون، كە ئایینی گشـتی تێكـڕای پێغەمبەرانـە ئـەدی بۆچی دەفەرموێ: لەسـەر زەمـانی داوودو عیسـای كـوڕی مەریـەم لەعنەتیـان لێـكرا؟ وەڵامەكـەی ئەوەیـە كـە مـەرج نیـە تەنیـا ئـەو دوو پێغـەمبەرە لەعنەتیـان لێكـردبن، بـەڵام لەبەرئـەوەی پاش مووسـا تەنیـا (داودو عیسـا) خاوەنی كتێبـی ناسـراو بوون، بۆیـە تـەنیا نـاوی ئەو دووانە هێنـراوە.

ئەوجـار باسـی سـیفەتێكی دیكـەیان دەكـات، دەفەرمـوێ: ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُۚ لَبِئْسَ مَا كَانُواْ يَفْعَلُونَ﴾، عـادەتیان وابـوو یەكدییان نەدەگێڕایەوە لە خراپەیەك كە دەیانكرد، یـان: ڕێگرییـان نەدەكـرد لە خراپە، وە ئەوەش خراپتـرین كردەوەیان بوو، كە دەستی یەكدییان نەدەگێڕایـەوە لە خراپـەو گونـاحو تـاوان.

دیـارە لێـرەدا كـە دەفەرموێ:﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾، ئەوانـەی كـە بێبـڕوا بـوون لـە بـەنی ئیسـڕائیل، وەك گوتـم، كەواتـە: هـەموویان بێبـڕوا نەبـوون.

پاشان کە دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ﴾، هەمیشە خوا ﷻ کە باسی سزایەکی خۆی دەکات، سزایەکی دنیایی بێ، یان قیامەتیی، مەگەر چۆن ئەگەرنا باسی حیکمەتەکەی‌و هۆکارەکەشی دەکات، لێرەدا دەفەرموێ: لەعنەتیان لێکرا لەسەر زمانی داوودو عیسای کوڕی مەریەم، لەبەرچی؟ دەفەرموێ: ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ﴾، واتە: بەهۆی ئەوە کە سەرپێچییان کردو دەستدرێژییان کرد، یانی: ئەو نەفرینەی لێیان کرا، بەهۆی ئەو دوو جۆرە تاوانەوە بوو.

هەڵبەتە دەشگونجێ وشەی: ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ﴾، واتە: وازیان لە خراپە نەدەهێنا، واتە: هەرچەندە پێغەمبەرانیان بۆ هاتوون، وشەی: (تَنَاهَى، تَنَاهَوا)، دەگونجێ مەبەست پێی: یەکدییان نەگێڕایەوە بێ، یان دەستیان لەو کارە هەڵنەگرت، هەردوو ماناکەی هەیە، جا ئەمە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئەگەر ئینسان هەوڵنەدات خراپە لابەرێ‌و ڕیشەکێشی بکات، مانای وایە گوناهێکی گەورەی کردوە، واتە: ئەنجامنەدانی ئەرکی فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا دەفەرموێ: ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ﴾، (ل) لامی قەسەمە، وە (بئس) واتە: خراپترین کردەوەیان بوو کە دەیانکرد، شتێك کە خراپترین کردەوەبێ، یانی گوناهی گەورەیە، بەڵێ یەکدی نەگێڕانەوەو یەکدی قەدەغە نەکردن لە خراپەو ناشەرعیی، یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، ئنجا با تەماشای ئەم دوو فەرموودەیە بکەین لەوبارەوە:

یەکەم: «عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ مَسْعُودٍ رضي الله عنه عَنْ رَسُولِ اللهِ ﷺ قَالَ: لَمَّا وَقَعَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ فِي الْمَعَاصِي، نَهَتْهُمْ عُلَمَاؤُهُمْ، فَلَمْ يَنْتَهُوا، فَجَالَسُوهُمْ فِي مَجَالِسِهِمْ وَوَاكَلُوهُمْ وَشَارَبُوهُمْ، فَضَرَبَ اللهُ قُلُوبَ بَعْضِهِمْ بِبَعْضٍ، وَلَعَنَهُمْ عَلَى لِسَانِ دَاوُدَ، وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ، ذلِكَ بِما عَصَوا وَكَانُوا يَعتَدُونَ، وَكَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُتَّكِئًا، فَجَلَس فَقَالَ: لا وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ! حَتَّى تَأْطُرُوهُمْ على الحَقِّ أَطْرًا، أَيْ: تَعْطِفُوهُمْ عَلَيْهِ» {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٧١٣)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٤٧)،

وَقَالَ: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، تعليق شعيب الأرنؤوط: إسنادُهُ ضَعِيف لانقِطَاعِهِ، وَضَعَّفَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٥١٤٨)}، واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوود خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کاتێك بەنی ئیسرائیل کەوتنە نێو گوناهو سەرپێچیی، زانایەکانیان ڕێگرییان لێکردن، بەڵام ئەوان دەستیان هەڵنەگرت، دوایی زاناکانیشیان دادەنیشتن لەگەڵیان لە کۆڕو مەجلیسیان، وە لەگەڵ وان دەیانخواردو دەیانخواردەوە (ژیانیان دەگوزەراند)، خواش دڵی هەندێکیانی بە هەندێکیان دادا، (واتە: ناکۆکیی و کێشەیان لە نێوان پەیدابوو) وە خوا لەسەر زمانی داوودو عیسای کوڕی مەریەم لەعنەتی لێکردن، ئەویش بەهۆی سەرپێچییان و بەهۆی دەستدرێژیی کردنیانەوە، لەوکاتەدا پێغەمبەری خوا ﷺ کە ئەوەی فەرموو پاڵی دابوّوە، ئنجا هەڵسا دانیشت و فەرمووی: نا، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، دەبێ ئەوانە بگێڕنەوە سەر هەق واتە: ئەگەر نەیانگێڕنەوە سەر هەق ئێوەش ئەی مسوڵمانینە وەك بەنی ئیسرائیل نەفرینتان لێ دەکرێ، یانی هەمان سزای ئەوانتان دەبێ.

ئنجا لەوبارەوە ئەم شوێنەوارە هەیە کە پێشتریش هێنامان: ﴿عَنْ حُذَيْفَةَ أَنّ الآياتِ الثَّلاثَ ذُكِرَتْ عِنْدَهُ، فَقَالَ رَجُلٌ: إنَّ هَذَا فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَقَالَ حُذَيْفَةَ: (نِعْمَ الإِخْوَةُ لَكُمْ بَنُو إِسْرَائِيل، إنْ كَانَ لَكُمْ كُلُّ حلوَة، وَلَهُمْ كُلُّ مُرَّة، كَلاَّ وَاللّهِ لِتَسْلُكُنَّ طَرِيقَهُمْ قِدَّ الشراك)﴾{أَخْرَجَهُ الحَاكِمُ برقم: (٣٢١٩)، وَقَالَ صَحِيح الإِسناد ولم يخرجاه، ووافقه الذهبي}[1]، واتە: ئەو سێ ئایەتە لە لای حوزەیفە خوێندرانەوە کە باسی ئەوە دەکەن، (کە کەسانێك حوکم نەکەن بەوەی خوا ناردوویەتە خوار: کافرن، ستەمکارن، فاسقن) پیاوێك گوتی: ئەوە دەربارەی جوولەکەکان هاتۆتە خوارێ، حوزەیفەش گوتی: بەنی ئیسرائیل باشترین بران بۆ ئێوە، ئەگەر هەموو شتێکی شیرین بۆ ئێوەبێ و، هەموو شتێکی تاڵیش بۆ ئەوان بێ، (یانی: ئەگەر هەردووکتان پێکەوە گوناهێك بکەن، ئێوە لەسەری سزا نەدرێن و، ئەوان لەسەری سزا

---

١) روح المعاني: ج٣، ص٤٤٤.

بدرێن، یان ئەوان پێی کافربن‌و، ئێوەش تەنیا پێی گوناهباربن) دوایی گوتی: نەخێر سوێند بە خوا ئێوەش بە ڕێی ئەواندا دەڕۆن، چۆن لاسکی نەعل ڕێك بە نێو پەنجەکاندا دێ، ئێوەش ڕێك بەوێدا دەڕۆن، چ سزایەك بۆ وان هەیە، هەمان سزاش بۆ ئێوە هەیە!

دووەم: ﴿إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ لا يُعَذِّبُ الْعَامَّةَ بِعَمَلِ الْخَاصَّةِ، حَتَّى يَرَوْا الْمُنْكَرَ بَيْنَ ظَهْرَانَيْهِمْ، وَهُمْ قَادِرُونَ عَلَى أَنْ يُنْكِرُوهُ، فَلا يُنْكِرُوهُ، فَإِذَا فَعَلُوا ذَلِكَ، عَذَّبَ اللَّهُ الْخَاصَّةَ وَالْعَامَّةَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (١٧٧٥٦)، عَنْ عَدِيِّ بْنِ عَدِيٍّ الْكِنْدِيِّ، وَقَالَ شعيب الأرنؤوط: حَسَنٌ لِغَيرِهِ}، واتە: خوای زاڵی پایەدار هەموو خەڵکی بەگشتی سزا نادات بە هۆی خەڵکی تایبەت (واتە: کۆمەڵێك کە گوناهو تاوان دەکەن، خوا هەموو خەڵکیان پێوە سزا نادات) تاکو خراپە بە ئاشکرا لە نێوخۆیاندا نەبینن، وە بشتوانن لایبەرن، بەڵام لاینەبەن، ئەگەر وایانکرد، ئەوە خوا ئەوانەی تایبەت کە گوناهیان هەبووەو ئەوانەی گشتیین، هەموویان پێکەوە سزا دەدات، چونکە خەڵکێك لە بەرانبەر خراپەو تاواندا هەڵوێستی نەبێ، دەبێتە هاوبەشی‌و لەوبارەوەش خوا دەفەرموێ: ﴿ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَٰفِقِينَ وَالْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾ ﴾ النساء، واتە: بێگومان ئێوە لە کتێبدا بۆتان نێردراوەتە خوار، کە هەر کاتێك بیستتان ئایەتەکانی خوا کوفریان پێ دەکرا، یان گاڵتەیان پێ دەکرا، لەگەڵیاندا دامەنیشن (واتە: لەو کۆڕو مەجلیسەدا کە تێیدا گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا دەکرێ، وە کوفریان پێ دەکرێ، دامەنیشن) تاکو ئەو کۆڕو مەجلیسە دێنە نێو باس‌و خواسێکی دیکەوە، {ئەگەرنا هەر لەوێ دابنیشن گوێ تەپ بکەن یاخود بە دەمیانەوە پێ بکەنن} ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾، ئەوە ئێوەش وەك وانن، واتە: لە گوناح‌و حوکمدا حوکمی ئەوانتان هەیە، ئەگەر بۆت پەرچ نادرێتەوە، دەتوانی

هەڵسیو ئەو مەجلیسە بەجێ بهێڵی، بەڵام لەوێ دابنیشیو بە دەمیانەوە پێبکەنی، یان بێدەنگ بی، ئەوە حوکمی ئەوانت هەیە، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴾، بێگومان خوا کۆکەرەوەی موونافیقەکانو کافرەکانە بە تێکڕایی لە دۆزەخدا، هەموویان پێکەوە خڕدەکاتەوە.

کەواتە: ئێوە لە خۆتان وریابن، حوکمی ئەوانتان نەبێ، ئەگەرنا ئێوەش لەگەڵ واندا لە دۆزەخدا کۆدەبنەوە، وەك چۆن لەو کۆڕو مەجلیسەدا کوفر بە ئایەتی خوا کراو، گاڵتە بە ئایەتەکانی خوا کراو، ئێوەش بەشدار بوون، لە کۆڕو مەجلیسی دۆزەخیش لەگەڵیاندا بەشدار دەبن، ئنجا کاتێك تۆ لەو مەجلیسە دادەنیشی کە کۆڕی شەرابو قومارە، یان گاڵتە بە دینی خوا دەکرێو تۆش بێدەنگی، ئەوان دەڵێن: دیارە ئەویش ڕای وەك ڕای ئێمەیە! بۆیە هەمان حوکمتان دەبێ.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴾، زۆرێکیان لێ دەبینی (واتە: لە جوولەکەکان، یان لە خاوەن کتێبەکان بەگشتی) دۆستایەتیی ئەوانە دەکەن کە بێبڕوان، یانی: لێیان نزیکنو پشتیان دەگرنو، خۆشیان دەوێنو لەگەڵیاندان، ﴿لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ ﴾، ئەو هەڵوێستەیان کە نەفسیان بۆیان پێش دەخات، خراپترین شتە، کە چییە؟ ﴿أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴾، خراپترین شتە کە ئینسان کارێك بکات، ببێتە هۆی ئەوەی خوا لێی تووڕەبی، وە لە سزاو ئازاری خوادا بە هەمیشەیی بمێنێتەوە، ئەمە وەك ئەو دوو ئایەتەی سووڕەتی (النساء)ە، کە خوا دەربارەی هەندێك لە جوولەکەکان، بۆ وێنە: کەعبی کوڕی ئەشرەفو ئەوانەی لەگەڵی دابوون، دەفەرموێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟

نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾ ﴾، واته: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی بەشێك لە كتێبیان پێدراوە، ئیمان بە جیبتو طاغوت دێنن، {(جبت)، واتە: بتو صەنەم، وە (طاغوت) كەسێكە كە فەرمانبەریی بۆ دەكرێ لە ناشەرعییدا، یاخود كەسێك كە ناشەرعیی بەسەر خەڵكیدا دەسەپێنێ، یان غەیری ئیسلام دەكاتە بەرنامەیان} دەڵێن: (واتە: ئەوانەی بەشێك لە كتێبیان پێدراوە، بە بێبڕوایەكان دەڵێن) ئەوانە ڕێیان ڕاستترە لەوانەی ئیمانیان هێناوە.

ئنجا وەك لە بەرگی سێیەمدا كە تەفسیری سوورەتی (النساء)ە، باسمان كرد، دەربارەی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەو بەسەرهاتە گێڕدراوەتەوە: ﴿عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: رَكِبَ كَعْبُ بنُ الأَشْرَفِ فِي تِسْعِينَ رَاكِبًا مِنَ اليَهُودِ فيهم: حُيَيُّ بنُ أخْطَبَ وجَدِيُّ بن أَخْطَبَ وَمَالِكُ بْنُ الصَّيْفِ وغيرهم إلى أهل مَكَّةَ لِيُحَالِفُوهُمْ عَلَى رَسُولِ اللهِ ﷺ، وينقضوا العهد الذي كان بينهم وبينه قبل أجَلِهِ، فَقَالَ أبو سُفيان: يا أهلَ الكتاب! أنشدكم باللهِ أيّهُم أقربُ للهدى نَحْنُ أم مُحَمَّد وأصحابهِ، فإنا نُعَمِّر مسجد اللهِ، ونَسْقِي الْحَجِيجَ، ونَحجبُ الكَعْبَةَ، ونَصِلُ الرَّحِمَ، وَمُحَمَّدٌ قطع أرْحَامنَا، وَاتَّبَعَهُ سُرَّاقُ حَجِيجِ بنو غِفَار، فَنَحْنُ أَهْدَى أم هُمْ؟ فقالت: اليَهُود: أنْتُمْ أهْدَى مِنْهُم سَبِيلا، فَأنْزَلَ اللهُ هَذِهِ الآيَةَ﴾ {أَخْرَجَهُ الطَّبَرِيُّ برقم: (٧٧٣٣) والتفسير الكبير للطبراني: ج٢، ص٢٤٨، ولُباب النقول في أسباب النزول للسيوطي: (٢٩٣، ٢٩٤)}، واتە: عەبدوڵڵای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: كەعبی كوڕی ئەشرەف سەرۆكی جوولەكەكانی خەیبەر لەگەڵ نەوەد سوار لە جوولەكەكان كە حوییەی كوڕی ئەختەبو جەدیی كوڕی ئەختەبو مالیكی كوڕی صەیف، وە غەیری وانیشیان تێدابوون، چوون بۆ لای خەڵكی مەككە، بۆئەوەی پەیمانیان لەگەڵ ببەستن، كە پەیمانی نێوانیان لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ پێش ئەوەی كاتەكەی بەسەر بچێ، هەڵیوەشێننەوە، ئەبوسوفیان لێی پرسین: ئەی كۆمەڵی خاوەن كتێبان! خواتان بە

گڕدا دەكەم، (واتە: بە ناوی خواوە داواتان لێ دەكەم) ئێمە لە هیدایەتەوە نزیكترین، یان موحەممەدو هاوەڵانی؟ ئێمەماڵی خوا (واتە: مزگەوتی خوا، كەعبە) ئاوەدان دەكەینەوەو، ئاو بە حاجیان دەدەینو، پەردە بۆ كەعبە دەكەین، وە پەیوەندیی خزمایەتی دەگەیەنین، كەچی موحەممەد پەیوەندیی خزمایەتیی پچڕاندوە (مەبەستی ئەوە بووە كە مسوڵمانان وازیان لە دایكو بابیان هێناوە، ئەوانەی كە دایكو باوكیان كافر بوون، ئەوەی بە پچڕاندنی پەیوەندیی خزمایەتیی داناوە!) وە حاجییە خراپەكانی بەنیی غیفار شوێنی كەوتوون، (واتە: خەڵكی خراپ شوێنی كەوتوون) ئایا ئێمە ڕێی ڕاستترمان گرتوە، یاخود ئەوان؟ جوولەكەكان گوتیان: بەڵكو ئێوە لەسەر ڕێی ڕاستن، وە ڕێی ئێوە ڕاستترە.

دیارە دەشیانزانی درۆ دەكەن، بۆیە خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ﴿ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُۖ وَمَن يَلۡعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾ ﴾، واتە: ئا ئەوانە كەسانێكن خوا نەفرینی لێكردوون، وە هەر كەسێك خوا نەفرینی لێبكات، هیچ پشتیوانێكت بۆی چنگ ناكەوێ، كەواتە: لێرەدا خوای پەروەردگار باسی هەڵوێستی خاوەن كتێبەكان دەكات، بەتایبەت جوولەكەكان، كە دۆستایەتی لەگەڵ كافرەكاندا دەكەن، لە بەرانبەر ئەهلی ئیماندا، كە ئێستاش هەر وایە: ئەمریكا پشتی ڕووس دەگرێ، پشتی چین دەگرێ، پشتی گاپەرستەكان دەگرێو كەینو بەینیان لەگەڵ دروست دەكات لە دژی ئیسلام.

**مەسەلەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ وَلَوۡ كَانُواْ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِيِّ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مَا ٱتَّخَذُوهُمۡ أَوۡلِيَآءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُمۡ فَٰسِقُونَ ﴾، واتە: وە ئەوانە ئەگەر ئیمانیان بە خوا ﷻ وە بە پێغەمبەر ﷺ، وە بەوەی كە بۆ پێغەمبەر ﷺ نێرراوە، هەبووایە، كافرەكانیان بە دۆست نەدەگرت لە جیاتی ئیمانداران، بەڵام بە زۆری لاڕێنو لە ڕێ دەرچوون.

توێژەرەوانی قورئان دوو مانایان بۆ ئەم ڕستە قورئانییە لێكداوەتەوە، كە مەبەست لە ئیمان هێنان بە خوا ﷻ دیارە، ئەگەر ئیمانێكی ڕاستو

دروستیان بە خوا هەبووایە، ئەوەیان نەدەکرد، بەلاَم ئایا مەبەست لە ئیمان هێنان بە پێغەمبەر ﷺ چییە؟ دوو ئەگەری هەن:

١) دەگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەری خۆیان بێ، واتە: ئەگەر جوولەکەکان بڕوایان بە مووساو پێغەمبەرەکانی خۆیان هەبووایە، وە ئەگەر نەصرانیی بڕوایان بە عیسا هەبووایە، وە ئیمانیان بەو کتێبانەی کە بۆ پێغەمبەران نێردراون هەبووایە، ئەوە کافرەکانیان بە دۆست نەدەگرت.

٢) دەشگونجێ مەبەست پێی پێغەمبەری خاتەم، موحەممەد ﷺ بێ، وە مەبەست لە: ﴿ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ ﴾، قورئان بێ، واتە: ئەگەر ئیمانیان بە پێغەمبەری خاتەمو قورئان هەبووایە، ئەو ئیمانە راستو دروستە بە خواو بە پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد ﷺو قورئان، رێی لێ دەگرتن کە کافران بکەنە دۆستی خۆیانو پشتیان پێ ببەستن، لە بەرانبەر مسوڵمانانداا.

کەواتە: ئیمانو دۆستایەتییکردنی کافران، دوو شتی پێکەوە نەگونجاون، ناگونجێ ئینسان ئیمانی هەبێو دۆستایەتیی دوژمنانی خواش بکات، دیارە ئێمە لە ئایەتەکانی پێشتردا بە تەفصیل باسی مەسەلەی دۆستایەتیی کافرانمان کرد، کە چۆنەو چەند پلەیەو... هتد، بەتایبەت لەکاتی تەفسیرکردنی ئەو ئایەتەدا کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَـٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ٥١ ﴾ المائدة.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةٗ لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشۡرَكُواْۖ ﴾، زانایانی رەوانبێژیی دەڵێن: (ل)ی سەر وشەی ﴿ لَتَجِدَنَّ ﴾، لامی قەسەمە، واتە: سوێند بە خوا بە مسۆگەریی تۆ سەرسەختترین کەسانێك لە دوژمنایەتییدا بۆ ئیمانداران دەبینی جوولەکەکانو، ئەوانەن کە هاوبەش بۆ خوا دادەنێن، واتە: جوولەکەو هاوبەش بۆ خوادانەران، لە هەموو کەس زیاتر دوژمنی سەرسەختی ئیماندارانن، ئەوەی خوای زاناو شارەزاش فەرموویەتی،

هاتنەدیی (مِصْدَاق)یەکەی لە مێژووی کۆنداو لە واقیعی ئێستاشدا زۆر جوان دیارە، کێ لە قەوارەی زایۆنی جوولەکەکان دڵ پڕ کینەترە بەرانبەر مسوڵمانان؟ وە پاشان بتپەرستەکان، ئێستا دەبینین بتپەرستەکانی (میانمار) چی بە مسوڵمانان دەکەن، وە هێندە گاپەرستەکان، چی بە مسوڵمانانی کشمیر دەکەن، وە هەروەها ... بێگومان ئەوەی خوا دەیفەرموێ وایەو جوولەکەو بتپەرستەکان، لە هەموو کەس دوژمنایەتیی سەختترو قورسترییان لەگەڵ مسوڵماناندا هەیە.

ئنجا خوای پەروەردگار لێرەدا، وە لە ئایەتی (٩٦)ی سوورەتی (البقرة)شدا پێکەوە باسی جوولەکەو هاوبەش بۆ خوادانەرەکان دەکات، لەوێ دەفەرموێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّهُمْ أَحْرَصَ ٱلنَّاسِ عَلَىٰ حَيَوٰةٍ وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟ ۚ يَوَدُّ أَحَدُهُمْ لَوْ يُعَمَّرُ أَلْفَ سَنَةٍ وَمَا هُوَ بِمُزَحْزِحِهِۦ مِنَ ٱلْعَذَابِ أَن يُعَمَّرَ ۗ وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾، واتە: وە بێگومان تۆ دەیانبینی (واتە: جوولەکەکان دەبینی) کە سوورترین کەسن لەسەر هەر جۆرە ژیانێك، تەنانەت لە هاوبەشدانەرەکانیش سوورترن، یەکێکیان حەز دەکات هەزار ساڵ تەمەن بکات، هەرچەندە ئەگەر ئەو تەمەنەشی ببێ، لە ئازاری دۆزەخ لای نادات، وە خوا بینەری ئەوەیە کە دەیکەن.

وشەی (حیاة)ی بە (نکرة) هێناوە، واتە: هەر جۆرە ژیانێك، ژیانێکی سەربەرزانەش نەبێ، هەر دەیانەوێ بژیەن، نەك بڵێن: ئەگەر بەسەر بەرزانە نەژین، با نەژین، گرنگ ئەوەیە لە ژیاندا بمێننەوە.

ئنجا ئایا هۆکاری ئەوە چییە کە جوولەکە هێندە دژایەتیی و دوژمنایەتیی بێڕەزایان لەگەڵ مسوڵماناندا هەیە؟!

بەنسبەت جوولەکەوە هۆکارەکەی ئەوەیە کە گرێ و گۆڵی دەروونیی زۆریان هەیە لەگەڵ هەموو گەلاندا، چونکە جوولەکە پێیانوایە گەلی هەڵبژاردەی خوان، دەڵێن: ئێمە گەلی بژاردەی خواین، (نَحْنُ شَعْبُ اللهِ المُخْتَار)، وە خوای پەروەردگار لە سوورەتی (المائدة)دا کە پێشتر هێنامان، دەفەرموێ: ﴿ وَقَالَتِ

﴿ ٱلْيَهُودُ وَٱلنَّصَـٰرَىٰ نَحْنُ أَبْنَـٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّـٰٓؤُهُۥ ﴿١٨﴾ ﴾، وە جوولەکـــــــــــەو نەصــرانییەکان گوتیـان: ئێمــە کـوڕانو خۆشـەویسـتانی خـواین، خۆیـان زۆر پـێ گرنگو پاكو چاك بـووە، جـا هەر کەسێك خـۆی زۆر پـێ چاك بوو، خـەڵکی پـێ خـراپ دەبێ، لەخـۆبـایی دەبێو دوایـی کـە خەڵـك بـەو شێوەیە مامەڵەی لەگەڵدا نەکرد کە بۆخـۆی تەصـەووڕ دەکـات، پێـی وایـە زوڵمیـان لێکـردوە، بۆیـە ئێسـتا جوولەکە هـەر چـۆنی مامەڵـەیان لەگەڵدا بکـەی، هـەر ڕازی نـابن، ئەگـەر چاکەیان لەگەڵدا بکـەی، پێیـانـوایە، واجبێکـت جێبەجێکـردوە، ئەگـەر خراپەشیان لەگەڵدا بکەی، ئەوە پێیانـوایـە تۆ شتێکی زۆر خراپت کردوە، یانی: خراپتـر لەوەی کـە هەیـە دەیبینـن، جـا بەنسـبەت گـەلانی دنیاوە بەگشـتی، جوولەکـە ڕقو کینـەیان هەیـە، بۆیــە جوولەکــە مەگــەر چــۆن دەنـا لــە هــەر شــوێنێکی دنیـابووبن، تووشـی چەوســـێنرانەوەو شـــەڕو هـــەرا بـــوون، بۆچـــی؟ چونکـــە بـــە ڕووحێکـــی خـــۆ بەزلگرانـەوە لەگـەڵ خەڵکـدا مامەڵـەیان کـردووە، خـەڵکیش بـەو چـاوە تەماشـای نەکــردوونو ســەرەنجــام تێکگیــراون، وە لەگــەڵ مســوڵمانانیشــدا بەتایبـەتی ڕقو کینــەو بوغزێکـی زۆریـان لە دڵو دەروونـدا هەیە، ئەوە بەنسـبەت جـوولەکەکانەوە.

وە بەنسـبەت هاوبەش بـۆ خـوا پەیداکەرەکانـەوە، لەبەرئـەوەی کـە کاکـڵی ئیسـلام بریتـیە لە خوا بەیەکگرتن، وە جەوهەری شـیـرکیش بریتـیە لە هاوبـەش بـۆ خـوا پەیـداکردن، وە خـوا بە یەکگرتنیش لەگەڵ هـاوبەش بـۆ خـوا دانـان تێکدەگیـرێو دژی یەکـدین، وە لەڕاسـتییدا ئیسـلام لەسـەر زانسـت بنیـاتنراوە، شیـرك لەسـەر ئەفسـانەو فیکـری پـڕوپـووچو بـێ بنـەما، دیـارە ئـەو دووانـەش تێکـدەگیـرێـن.

**مەسەلـــەی حـەوتـــەم:** کـــە دەفـــەرموێ: ﴿ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّا نَصَـٰرَىٰ ۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، وە تـــۆ دەبینـــی نـزیکتـــرین کـــەس لـــە ڕووی خۆشـەویســـتییەوە بـۆ ئەوانـەی ئیمـــانیان هێنـــاوە، ئەوانـەن کـە دەڵـێن: ئێمـە نەصرانیین، ئەویش بەهـۆی ئـەوەوە کە (قسیسین)یـان لـە نێـودان، وە (ڕهبـان)یـان لە نێـودان، وە لەبـەرئـەوەش کە خۆیـان بەزل ناگـرن.

ئەمیش دیسان هاتنەدیی (مصداق)یەکەی ئاشکرایە، بەگشتی دەبینین نەصرانییەکان هەڵوێستیان نەرمترە لەگەڵ مسوڵماناندا، ناڵێین: هەموو نەصرانییەکان وان، بەڵام بەگشتی هەڵوێستیان نەرمترە، وەك دەبینین جاری وایە شتێك دەکرێ بەرانبەر بە جیهانیی ئیسلامیی، لە وڵاتانی ئەورووپاو ئەمریکادا خۆپێشاندان دەکرێ، پشتگیریی مسوڵمانان دەکەن دژی ڕژێمەکانی خۆیان، هەڵبەتە کەمۆکەیەکیش لە جوولەکاندا هەن، کە جاری وایە پێچەوانەی سیاسەتی قەوارەی زایۆنیو پێچەوانەی زلهێزەکانن، کە بەرانبەر مسوڵمانان ڕەفتار دەکەن، بەڵام زۆر کەمن، وە نەصرانییەکان ئەهلی ئینصافو خەڵکی نەرمو نیانو میهرەبانیان بەرانبەر مسوڵمانان، تێدا زیاترە، وە خوای زاناو شارەزا هۆکارەکەشی دەخاتەڕوو و دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، (قسیس) واتە: قەشە، یان کەشیش، واتە: زانای نەصرانیی، واتە: لەبەرئەوەی زانایان لەنێودا هەن، وە (رهبان) کۆی (راهب)ە، بە کوردی گۆشەگیرو ڕەبەن واتە: لەبەرئەوەی کەسانێکی گۆشەگیرو خواپەرستیان لەنێودا هەن، ﴿ وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، وە لە سۆنگەی ئەوەشەوە کە خۆیان بە زل ناگرن.

هەڵبەتە زانستو عیبادەتیش وا لە ئینسان دەکات کە دڵی نەرمبێ، با لەسەر ناهەقیش بێ، زانیاریی و شارەزایی و عیبادەت، هەر چۆن بێ کاریگەریی لەسەر ئینسان دەبێ، ئەگەر ئەو ئینسانە بێبڕواش بێ، ئەگەر تەماشای سووڕەتی (الحدید) بکەین، خوای پەروەردگار باسی ئەو ڕاستییە دەکات، دەفەرموێ:

﴿ ... وَقَفَّيْنَا بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ وَجَعَلْنَا فِى قُلُوبِ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ رَأْفَةً وَرَحْمَةً وَرَهْبَانِيَّةً ٱبْتَدَعُوهَا مَا كَتَبْنَٰهَا عَلَيْهِمْ إِلَّا ٱبْتِغَآءَ رِضْوَٰنِ ٱللَّهِ فَمَا رَعَوْهَا حَقَّ رِعَايَتِهَا ۖ فَـَٔاتَيْنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مِنْهُمْ أَجْرَهُمْ ۖ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَٰسِقُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾، واتە: بە دوای پێغەمبەراندا عیسامان نارد، وە بەزەیی و پەرۆشو لە خوا ترسانمان خستە دڵی ئەوانەوە کە شوێنی کەوتبوون، وە گۆشەگیرییەك (دنیا بە

کەم گرتنێـك) کـە بۆخۆیـان دایانـهێنابوو، ئێمـە لەسـەریانمان پێویسـت نەکردبـوو، (بەحیسـاب بۆئـەوەی زیـاتر لـە خـوا نـزیك ببنـەوە) بۆئـەوەی ڕەزامەنـدیی خـوا بەدەسـت بێنن، بەڵام وەك پێویسـت ڕەچـاویان نەکـردو پێـوەی پـابەند نەبـوون.

جـا (القاسـمي) لـە (محاسـن التأويل)ەکـەی خۆیـدا[1] دەڵـێ: (وَفـي الآيـة دَلـيلٌ عَلَـى أنَّ: الإقبـالَ عَلَـى العِلْمِ والإعـراض عَنِ الشَّـهَوَاتِ والبَـراءَة مِنَ الكِبـرِ مَحْمُـودٍ وَإِنْ كَـانَ ذَلِـكَ مـن كـافر)، واتـە: لـەو ئایەتـەدا بەڵـگە هەیـە لەسـەر ئـەوەی ڕووکـردنـە زانسـتو پشـتکردنـە ئارەزووەکـان (واتـە: ئـەو ئارەزووانـەی کـە ناشـەرعیین) وە خۆ دوورگرتن لـە خۆبـەزلگـریی شتێکی باشـە، ئەگـەر لـە بابایـەکی کافریـش دا بێ، یـانی: سـیفەتی باش لـە کافریشـدا هـەر باشـە، وەك چۆن سیفەتی خـراپ لە مسـوڵمانیشـدا هـەر خراپـە.

ئنجـا کـە دەفـەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ﴾، نەیفـەرمووە (إِنَّ النَّصَـارَى) کە دەشگونجا وای بفەرمووبـا، چونکـە لـە شوێنی دیکە وای فـەرمووە، بـۆ وێنـە: ﴿وَقَالَتِ ٱلنَّصَٰرَى ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ ٱللَّهِ... ﴿٣٠﴾﴾التوبـة، واتـە: نەصرانییەکانیش گوتیـان: عیسـا کـوڕی خـوایە، (پاکـیی بـۆ خـوا)، بـەڵام لێـرەدا دەفـەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ﴾، ئـەوە ئاماژەیـە بـۆ ئـەوە کـە کاتی خـۆی گوتوویانـە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُونُوٓاْ أَنصَارَ ٱللَّهِ كَمَا قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ لِلۡحَوَارِيِّـۧنَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِۖ فَـَٔامَنَت طَّآئِفَةٞ مِّنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَكَفَرَت طَّآئِفَةٞۖ فَأَيَّدۡنَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَىٰ عَدُوِّهِمۡ فَأَصۡبَحُواْ ظَٰهِرِينَ ﴿١٤﴾﴾الصـف، لێـرەش دەفـەرموێ: ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ﴾، کەواتـە: ئـەوە بیـرخستنەوەی ئـەو حەقیقەتەیـە کـە کـاتی خـۆی پشـتی عیسـا (عليـه السلام)یـان گرت، حەوارییەکانی کە کۆمەڵە ڕەفیقێکی تایبـەتی بـوون، پشـتیان گـرت لـەپێناوی خـواداو بۆ سەرخستنی ئەو پەیـامەی کە هێنـابووی، کەواتـە: ئـەوە مەدحێکـە بـۆ

---

[1] ج٤، ص٣٣٣.

ئــەوان، کــە دیــارە لێرەشــدا خــوای پــەروەردگار بەگشــتی باســی هەڵوێســتی نەصــرانییەکان دەکات، بـەڵام بەتایبــەتییش باسـی کۆمەڵـێك دەکـات، کـە دیـارە هەڵوێستێکی ئەرێنییان لە بەرانبـەر ئیسـلامدا هەبووەو، ئیمانیـان بـە پێغەمبـەری کۆتـایی‌و ئـەو قورئانـەش هێنـاوە، کـە بـۆی نێـردراوە، کـە ئـەوە لـە مەسـەلەی هەشـتەمدا بـاس دەکـەین.

**مەســەلەی هەشــتەم:** کــە دەفەرمــوێ: ﴿وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ۖ يَقُولُونَ رَبَّنَآ ءَامَنَّا فَٱكْتُبْنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿٨٣﴾ وَمَا لَنَا لَا نُؤْمِنُ بِٱللَّهِ وَمَا جَآءَنَا مِنَ ٱلْحَقِّ وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٤﴾ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُوا۟ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ﴾، پێشـتـریش باسـمان کـرد کـە زانایان دەڵـێن: ئـەم چـوار ئایەتـە دەربـارەی نەجاشـیی‌و هـاوەڵەکانی هاتوونـە خـوار خـوا لـێیان ڕازی بێ، کە هەڵوێستی باشیان هەبوو لە بەرانبەر پێغەمبەر ﷺ و مسـوڵمانانداو، لـەوبارەوە ئـەم دەقـە هەیـە: ﴿قَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ: فَلَمّا رَأَى رَسُولُ اللّهِ ﷺ مَا يُصِيبُ أَصْحَابَهُ مِنَ الْبَلاءِ، وَمَا هُوَ فِيهِ مِنَ العَافِيَةِ، بِمَكَانِهِ مِن اللّهِ وَمِنْ عَمّهِ أَبِي طَالِبٍ، وَأَنّهُ لا يَقْدِرُ عَلَى أَنْ يَمْنَعَهُمْ مِمّا هُمْ فِيهِ مِنَ البَلاءِ، قَالَ لَهُمْ لَوْ خَرَجْتُمْ إلَى أَرْضِ الحَبَشَةِ، فَإِنّ بِهَا مَلِكًا لا يُظْلَمُ عِنْدَهُ أَحَدٌ، وَهِيَ أَرْضُ صِدْقٍ حَتّى يَجْعَلَ اللّهُ لَكُمْ فَرَجًا مِمّا أَنْتُمْ فِيهِ، فَخَرَجَ عِنْدَ ذَلِكَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ أَصْحَابِ رَسُولِ اللّهِ ﷺ إلَى أَرْضِ الْحَبَشَةِ، مَخَافَةَ الْفِتْنَةِ وَفِرَارًا إلَى اللّهِ بِدِينِهِمْ، فَكَانَتْ أَوّلَ هِجْرَةٍ كَانَتْ فِي الإِسْلامِ فَكَانَ جَمِيعُ مَنْ لَحِقَ بِأَرْضِ الْحَبَشَةِ، وَهَاجَرَ إلَيْهَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ سِوَى أَبْنَائِهِمْ الّذِينَ خَرَجُوا بِهِمْ مَعَهُمْ صِغَارًا وَوُلِدُوا بِهَا، ثَلاثَةً وَثَمَانِينَ رَجُلاً﴾[1]، واتـە: ئیبنـو ئیسحاق دەڵـێ: کاتێـك پێغەمبـەری خـوا ﷺ بینـی هــاوەڵانی تووشــی ئــازارو ئەشــکەنجــەدان دێــنو، وە خۆشــی لەچــاو ئــەوان ســەلامەتە، بەهــۆی پێگــەی لەلای خـواو بەرگرییکـردنی مامییــەوە (ئـەبو طاڵیـب)،

---

[1] السيرة النبوية: ج١، ص٣٥٢.

وە تەماشای کرد ناتوانێ بەرگریشیان لێبکات (کە نەهێڵێ کافرەکان ئەزیەتو ئەشکەنجەیان بدەن)، پێی فەرموون: ئەگەر بچن بۆ سەرزەمینی حەبەشە، پادشایەکی لێیە کە کەس لەلای ئەو ستەمی لێناکرێ، وە ئەوێ شوێنێکی باشە، هەتا خوا دەروویەکتان لێدەکاتەوە (ئەو وەزعە بە جۆرێکی دیکە دەگۆڕێ)، لەو کاتەدا مسوڵمانان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ بەرەو سەرزەمینی حەبەشە چوون، تاکو چیدی ئەشکەنجەو ئازار نەدرێن، وە بەرەو خوا ڕایان کرد، وە دینەکەیان ڕفاند تاکو هەڵیان نەگێڕنەوە لە ئایینەکەیان، وە ئەوە یەکەمین کۆچێك بوو لە ئیسلامدا، وە تێکڕای ئەوانەی کە چوون بۆ سەرزەمینی حەبەشەو کۆچیان بۆ کرد لە مسوڵمانان، جگە لە منداڵەکانیان کە گچکە بوونو لەگەڵ خۆیانیان برد بوون، وە ئەوانەی لەوێ لە دایك بوو بوون، (چونکە دیارە ئافرەتیشیان لەگەڵدا بوون) هەموویان هەشتاو سێ پیاو بوون.

لێرە دیارە باسی ئافرەتەکانی نەکردوە، ئەگەرنا کۆمەڵێك ئافرەتیشیان لەگەڵدا بوون، بۆ وێنە: عوسمانی کوڕی عەففان خۆیو خێزانی بووە، وە کۆمەڵێك لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ هاوسەریان لەگەڵدا بووە.

دیارە پێشتر باسمان کرد کە جەعفەری کوڕی ئەبو طالیب سوورەتی مەریەم دەخوێنێتەوە، نەجاشیو ئەوانەی کە لەگەڵی دابوون دەگریەنو، ئەو هەقەی کە خوا ناردوویەتی دەیناسن، وە ئیمانیشی پێ دێنن، ئەو ئایەتانە مەدحی ئەوانن.

هەروەها ئەم ئایەتانە هۆی هاتنە خوارەوەیەکی دیکەشیان هەبووە، کە نەجاشیی سی (٣٠) نەفەر لە هاوەڵەکانی خۆی دەنێرێ بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ سوورەتی (یس)یان بۆ دەخوێنێتەوە، ئەوانیش دوای ئەوەی ئایەتەکان دەبیستن، دەگریەنو، ئیمان دێنن، بەلام بێگومان نەصرانییەکان کەمێکیان وابوون، کە کۆمەڵێکی تایبەت بوون، نەك هەموویان، کە لێرەدا خوای پەروەردگار بەو مەدحانە باسیان دەکات، بەلام لە سیفەتەکانی پێشیدا بەگشتی باسیان دەکات! بۆیە دەبێ لێمان تێکنەچێ: ئەوانەی لێرەدا مەدحیان دەکاو پاداشتیان دەداتەوە بە بەهەشت، هەموو نەصرانییەکان نین، بەڵکو بەس ئەوانەن کە ئیمانیان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ هێناوە، وە

ئیمانیان بە قورئان هێناوە، بەڵام ئایەتەكەی پێشوێ باسی حاڵەتی گشتییان دەكات، وە دەفەرمویٚ: ﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴾، ئەوە مەبەست پێی نەصرانییەكانن، بەگشتی، كە ئەوان چاكترن و سۆزو خۆشەویستییان زیاترە بۆ مسوڵمانان، لە جوولەكەكان و لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان، بەڵام لەنێوواندا كۆمەڵێك هەن، ئیمان بە قورئان و بە ئیسلام دێنن، جا چ ئەوانەی كاتی خۆی ئیمانیان هێناوە، چ ئەوانەی ئێستا ئیمان دێنن، كە زیاتر هەر نەصرانییەكانن.

**مەسەلەی نۆیەم**: كە دەفەرمویٚ: ﴿ وَإِذَا سَمِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَى ٱلرَّسُولِ تَرَىٰٓ أَعْيُنَهُمْ تَفِيضُ مِنَ ٱلدَّمْعِ مِمَّا عَرَفُوا۟ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾، كاتێك كە گوێبیستی ئەوە دەبن بۆ پێغەمبەر دابەزێنراوە، دەبینی چاوەكانیان پڕ دەبن لە فرمێسك بەهۆی ئەو هەقەوە كە ناسیویانە، ئیماندار جارجار كە گوێی لە فەرمایشتی خوا (كلام الله) دەبێ، یان گوێی لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ، دەبێ، بگریەت، گریان شتێكی پەسندە لەو حاڵەتەدا، هەڵبەتە نەك گریانی شین و شەپۆرو هاواركردن و دەنگ بەرزكردنەوە، گریانی عالیمانە ئەوەیە كە فرمێسكیش بێ و كەسیش پێی نەزانێ، ئەگەر لە تەنیشتیشت بن، كە ئەوە دەگونجێ و ئەوەش گریانێكی عابیدانەو ئیماندارانەی ڕاستەقینەیە، بەڵام ئەوەی دەیكات بە گریان و دەنگ بەرزكردنەوەو خەڵك پێی دەزانێ، ئەوە لەڕاستییدا مەگەر كەسێك خۆی بۆ كۆنترۆڵ نەكرێ، یان بەڵایەكی گەورەی بەسەرهاتبێ و حاڵەتی نەفسیی زۆر تێكچووبێ، ئەگەرنا ئەوە شتێكی پەسندو باش نییەو جاری واش هەیە ناپەسند بگرە حەڕامیشە!

پێغەمبەری خواش ﷺ دەربارەی گریان و خاشیع بوون و ملكەچبوون لە كاتی خوێندنەوەی قورئاندا، یان لە كاتی بەسەردا خوێنرانەوەی قورئاندا، فەرموویەتی: ﴿أُبْكُوا فَإِنْ لَمْ تَجِدُوا بُكَاءَ فَتَبَاكَوْا﴾ {رَوَاهُ ابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٤١٩٦)، والمنذري، وَضَعَّفَهُ الألباني في (ضعيف الترغيب والترهيب)، ولكنَّهُ صحيح موقوفاً عَن عبد الله بن عمرو رضي الله عنهما في الحجر فقال: ابكوا فإن

لـم تجـدوا بكـاء فتبـاكوا، (رواه الحـاكم بـرقم: (٨٧٢٣) وَقَـالَ هَـذَا إِسـناد صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشـيخَين، وَصَحَّحَهُ الألبـاني} ، واتـە: بگریـەن (لـە کـاتی خوێندنـەوەی قورئـان، یـان قورئـان بەسـەردا خوێنرانـەوەدا، وە ئەگـەر گریانتـان نـەهات، خۆتـان بگریەنـن، واتـە: خۆتــان وا لێبکــەن هەسـت بـە تـرس و شـەرمو شـكۆ لـە بەرانبـەر خـوادا بکـەن، کەواتـە: دەگونجـێ ئینسـان ئـیش لەسـەر خـۆی بکـات، بـۆ پەیـدابوونی حاڵـەتی خشـووعو ترس، بەرانبـەر بە خـوا.

هەنـدێك لـە زانایـان لـە کۆمـەڵی کەڕرامییـەکان (الكرّامية) گوتوویانـە: کـە خـوا دەفەرموێ: ﴿ فَأَثَٰبَهُمُ ٱللَّهُ بِمَا قَالُواْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾ ، واتـە: خـوا پاداشـتی دانـەوە بـەهۆی ئـەوەوە کـە گوتیـان، بـە چـەند بەهەشـتێك کـە ڕووبـاریان بـەژێردا دەڕۆن، ئەمـە بەڵگەیـە لەسەر ئەوە کە ئیمـان تەنیـا قسـەو دەربڕینـە، گوتوویـانە: مادام خـوا دەفـەرموێ: خـوا پاداشـتی دانەوە لەسەر ئەوە کە گوتیـان: ئیمانمان هێنـا، کەواتـە: ئیمان تـەنیا بریتیـە لـەوەی کە بڵێی: ئیمـانم هێنـاوە بە زار، بـا لـەنێـو دڵیشـتدا هیچ نەبـێ، وە کـردەوەش نەبـێ، هـەر ئـەوە پێـی دەگوتـرێ: ئیمـان!

بـەڵام بێگـومان بۆچوونەکەیـان هەڵەیـە، چـونکە خـوای پـەنهانزان لـە چـەند شـوێنان زەمـی ئەوانـە دەکـات کـە بـە قسـە دەڵـێن، ئیمانمـان هێنـاوەو ئیمـان لـە دڵیـاندا نیـەو، بە کـردەوەش ڕاسـت ناکـەن، بۆ وێنـە:

١/ دەفـــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلْكُفْرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفْوَٰهِهِمْ وَلَمْ تُؤْمِن قُلُوبُهُمْ ...﴿٤١﴾ ﴾ المـائـدة، وەك دەبینین ئەوانــەی بــە زار گوتوویــانە: ئیمانمان هێنـاوە، بـەڵام دڵیـان ئیمـانی نەهێنـابوو، ئەوانــە بە بێـبـڕوا لە قەڵـەم دەدرێــن.

٢/ دەفـەرمـوێ: ﴿ وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلْيَوْمِ ٱلْأَخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ ﴿٨﴾ ﴾ البقـرة، واتـە: لـە نێـو خەڵکیـدا کەسانێك هـەن دەڵێن: ئیمانمـان هێنـاوە بـە خـواو بـە ڕۆژی دوایـی، بڕواداریش نیــن.

ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ ... وَنَطْمَعُ أَن يُدْخِلَنَا رَبُّنَا مَعَ ٱلْقَوْمِ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ المائدة، ئایا مەبەست پێی کێیە؟ ئایا مەبەستیان ئەوەیە خوا بیانخاتە گەڵ هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر ﷺ، یان مەبەستیان پێی پێشووە چاکەکانی خۆیانە؟ من پێمـوایە هەردووکیان دەگرێتەوە، واتە: خوایە هەم بمانخە ریزی هاوەڵانی بەرێزی پێغەمبەر ﷺ، هەم بمانخە ریزی ئەو پێشینە چاکانەی کە لە میللەتانی پێشوو بوون، ئنجا ئەوەشی لێوەردەگیرێ، ئەگەر ئینسان بیەوێ بچێتە ریزی صالحان، دەبێ بە رێی صالحاندا بڕوات، بەڵام ئینسان بە رێی فاسقاندا بڕواو بە تەمای گەیشتن بە صالحان بێ، یان بە تەمای پاداشتو مەنزڵگایەك بێ کە دەدرێ بە صالحان! ئەوە لەڕاستییدا بە غەڵەتدا چووەو، ئەوە وەك ئەوەیە کەسێك بڵێ: دەمەوێ بچمە بەغداو، ڕێڕەوی هەنگاوەکانی پێچەوانەی ڕۆیشتن بەرەو بەغدابێ! دیارە ئەو کەسە هەرچەند دەڕوات دوورتر دەکەوێتەوە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی نۆزدەیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان سێ ئایەت دەگرێتە خۆی، ئایەتەکانی (٨٧و ٨٨و ٨٩)، لەو سێ ئایەتە موبارەکەدا خوای کاربەجێ لەم سوورەتەدا بۆ جاری دەیەم بە نازناوی ئیمان بانگی مسوڵمانان دەکات: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، وە ڕێگرییان لێدەکات کە ڕۆزییە خۆش و بەتامەکان کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوون، لە خۆیان قەدەغە بکەن، وە ئەو ڕەفتارەیان بە دەستدرێژیی و سنوورشکێنیی لە قەڵەم دەدات، پاشان خوای باڵادەست فەرمان بە مسوڵمانان دەکات، کە لەو ڕۆزییە حەڵاڵ و خۆش و سوودبەخشانەی پێیداون بخۆن و، پارێز لە خوا بکەن، دوایی خوای بەرزو مەزن باسی سوێند خواردن دەکات، وە ڕایدەگەیەنێ کە سوێندی سەر زارەکیی لێپرسینەوەی لەسەر نیە، وەك: بەڵێ، نەخێر وەڵاهی، بەڵێ وەڵاهی، کە ئینسان بەسەر زاری دادێ، وە باسی کەفارەتی سوێندێك دەکات کە دڵی لەسەر دەچەسپێنرێ و بە جیددیی خاوەنەکەی سوێند دەخوات، کە ئەویش کەفارەتەکەی بریتییە لە خواردن پێدانی دە کەسی نەدار، خواردنی ڕۆژێك، یاخود پۆشتەکردنیان، یان ئازادکردنی کۆیلەیەك، هەر کەسێکیش هیچ کام لەوانەی نەبوون، ئەوە دەبێ سێ ڕۆژان بەڕۆژوو بێ، وە لە کۆتاییدا خوا فەرمانیان پێدەکات بە پاراستنی سوێندەکانیان.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ
إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ٨٧ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلٗا طَيِّبٗاۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ٨٨ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ وَلَٰكِن
يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ
مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ
أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡۚ وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ
لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٨٩ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەكـان

((ئەی ئەوانـەی بڕواتـان هێنـاوە! (ڕۆزییـە) خـۆش‌و سوودبەخشـەكان كـە خـوا بـۆی حـــەڵاڵ كـــردوون، قەدەغـــە مەكـــەن‌و سـنوورشـكێنـــیی مەكـــەن، بێگومـــان خـــوا سنوورشـكێنـــانی خۆشـــناوێن، ﴿٨٧﴾ وە لـەو ڕۆزییـە حـەڵاڵ‌و خـۆش‌و چاكانەی خـوا پێیـــداون بخـــۆن، وە پارێـــز لـەو خـوایە بكـــەن، كـە ئیمانتـــان پێـــی هەیـــە، (پێـــی بڕواداران) ﴿٨٨﴾ خـوا سوێندی سـەر زارەكییتان لێنـاگرێ، بەڵكو لەسـەر ئـەو ســوێندانە كە دڵتانیـان لەســەر گـرێ دەدەن، لێپرسـینەوەتان لەگـەڵدا دەكـات، ئنجا ئـەو جۆرە ســوێندە دڵ لەســـەر چەســـپێنراوانە، كـەفارەتی هـەركامێكـیان خـواردن پێـدانی دە نەدارە لە خواردنێكی میانجیی كـە دەرخـواردی خێزانتـانی دەدەن، یـان پۆشـاكیان، یـان ئـازادكردنی گـەردن (ی كۆیلـە)یێك، هەر كەســێك هیچ كـام لەوانــەی چنگ نەكەوت، ســێ ڕۆژ ڕۆژووگرتنـــی لەســـەرە، ئـەوە كەفـــارەتی ســـوێندەكانتانە، وە هــەر كـات ســـوێندتان خـــوارد، سـوێندەكانتـــان بپـــارێزن، ئـــاوا خـــوا ئایەتـــەكانیتان بـــۆ ڕوون دەكـاتەوە، بەڵكو ســوپاسـگوزاریی بكـەن (بۆ خـوا) ﴿٨٩﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(لَا تُحَرِّمُواْ ): واتە: قەدەغە مەكەن، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەنییە، كە كەسێك بڵێ: ئەوە فلان شتم قەدەغە كرد، بۆچی؟ چونكە هەر كەسێك حەلاڵێك حەرام بكات، یان حەرامێك حەلاڵ بكات، پێی كافر دەبێ، بەڵام لێرەدا خوا هەر بە نازناوی ئیمان مسوڵمانان دەدوێنێ، كەواتە: هەر لەسەر حاڵەتی ئیمانیی خۆیانن، كەواتە: ﴿لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾، یانی: ئەوەی خوا حەلاڵی كردوە لە خۆتانی قەدەغە مەكەن و مەڵێن: نایخۆین، نەك مەبەست ئەوەبێ ئەوەی خوا حەلاڵی كردوە، تۆ بڵێی حەرامە، بۆیە دەڵێ: (الحَرامُ: الـمَمْنُوعُ مِنْهُ، إمَّا بتَسْخيرِ إلهـي، أوْ بِمَنْعٍ بَشَريٍّ، وَإمَّا بِمَنْعٍ قَهْري، وَإمَّا بِمَنْعٍ مِنْ جِهَةِ العَقْلِ أَوِ الشَّرْعِ أَوْ مِنْ جِهَةِ مَن يُرْتَسَمُ أَمرُهُ)، وشەی: (حَرَامُ) بریتییە لە شتێك كە ڕێ لێگیراوبێ، جا یان بەهۆی ئەوەوە كە خوا وایدا ناوە كە ئەو شتە نەكرێ، یان بەهۆی ئەوەوە كە بەشەرێك ڕێی لێدەگرێ، یاخود لەبەرئەوەی كە ڕێگرییەك دێتە بەردەم، یان لەبەرئەوەی عەقڵ ڕێ لەو شتە دەگرێ، یاخود شەرع ڕێی لێگرتوە، یاخود لەبەرئەوەی كە حوكمڕانێك بڕیارێك دەر دەكات، كە ئەو شتە نەكرێ.

(طَيِّبَٰتِ ): كۆی (طَيِّبَةَ)یە، (طَيِّبَةَ) واتە: زۆر چاك و سوودبەخش و بەتام و خۆش، دەگوترێ: (طَابَ الشَيءُ يَطيبُ طَيْبَاً فَهُوَ طَيِّبٌ) واتە: شتەكە خۆشە، یان بەسوودە، یان چاكە (فَهُوَ طَيِّبٌ) (طَيِّبٌ) واتە: شتی باش و بە لەززەت و خۆش و بە كەڵك (وَأَصْلُ الطَّيِّبِ: مَا تَسْتَلِذُّهُ الحَوَاسُّ ومَا تَسْتَلِذُّهُ النَّفْسُ) لە بنچینەدا (طَيِّب) هەر شتێكە كە هەستەكان تامی لێوەربگرن، بۆنێكی خۆش، تامێكی خۆش، ڕەنگێكی جوان، دەنگێكی خۆش، شوێنێكی خۆش، زەوییەكی بەپیت، هەموویان پێیان دەگوترێ: (طَيِّب)، هەموویان ئەو شتانەی كە خۆشن، وە هەرشتێك كە نەفس لەززەتی لێبكات، (طَيِّب)یان بۆ بەكاردێ،

بەلاَم بە پێی سیاقی ئایەتەکان ماناکەی دەگۆڕێ، (والطَّعَامُ الطَيِّب فِي الشَّرْعِ، مَا كَانَ مُتَنَاولاً مِنْ حَيْث مَا يَجُوز)، وە خواردنی خۆش لە شەرعدا ئەوەیە کە دروست بێ، بەکاربهێنرێ.

(﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ﴾): واتە: لێتان ناگرێ، یاخود سزاتان نادات، (المؤاخَذَة: المُجَازَاة..) واتە: سزادان و لێپرسینەوە.

(﴿بِٱللَّغۡوِ﴾): واتە: بە سوێندی لەغو، (اللَّغو مِنَ الكَلَام: مَا لا يُعتَدُّ بِهِ وَهُوَ الَّذِي يُورَدُ لاعَنْ رويةٍ وَفِكرٍ فَيَجْرِي مَجْرى اللَّغا وهُوَ صَوت العَصَافِير ونحوهَا مِنَ الطِّيُور)، واتە: (اللَّغو) (کە جاری وایە بۆ کردەوەش بەکاردێت) بەلاَم ئەگەر بۆ قسە بەکاربێت قسەیەکە کە گرنگی پێنەدرێ، وە ئەویش ئەو قسەیە کە دوای بیرکردنەوە و تێوەڕامان نەگوترێ، واتە: بە سەرزارەکی قسەکە بکات، قسەیەك کە بە سەرزارەکیی دەکرێ، بەبێ بیرلێکردنەوە، وەك (لَغَا) وایە، (لَغا)ش: بریتیە لە دەنگی چۆلەکە پاساریی و وێنەی چۆلەکە پاساریی کە دەجریوێنێ و، بۆ ئێمە هیچ واتایەکی نیە، دیارە بە تەئکید بۆخۆیان واتاو مەبەستێکی هەیە، بەلاَم بۆ ئێمە هەر جریوە جریوەو هیچ واتایەکی نیە، قسەیەکیش کە بەبێ بیرلێکردنەوە بکرێ و هەروا بە سەرزارەکیی بگوترێ، وەك دەنگی چۆلەکەو بالْندە وایە.

(﴿أَيۡمَٰنِكُمۡ﴾): (وَاليَمِينُ أَصلُهُ الجَارِحَة، وَاليَمِينُ فِي الحَلِف مُسْتَعَارٌ مِنَ اليَدِ اعتِبَارًا بِمَا يَفْعَلُهُ المُعَاهِدُ وَالمُحَالِفُ وَغَيْرُه)، وشەی: (أَيْمَان) كۆی (يَمِين)ە، لە ئەسلْدا بە مانای دەستی ڕاستە، بەلاَم دوایی خوازراوەتەوە بۆ سوێند، بەو ئیعتیبارەی کە کەسێك پەیمان لەگەلْ کەسێك دەبەستێ، یاخود بەلْێنێکی پێدەدات، دەستی ڕاستی لەنێو دەستی دەنێ، سوێند لەو (يَمِين)ەوە هاتوە.

(﴿عَقَّدتُّمُ﴾): یان (عاقَدتُم) یاخود (عَقَدتُم) هەر سێ قیرائەتەکان هاتوون، واتە: گرێتان داوە، (العَقْدُ: الجَمْعُ بَيْنَ أَطْرَافِ الشَّيءِ واستَعِير لِعَقْدِ البَيْعِ وَالعَهْد)،

(عَقْد) به كوردیی، واته: گرێدان، دوو شت هەردوو سەرەكەی پێكەوە بێنیەوە، بۆ وێنە: بەنەخوێن، یان هەر شتێك كە گرێ دەدرێ، پێی دەگوترێ، (عَقْد) لێرەدا ئەو وشەیە خوازراوەتەوە بۆ گرێبەستی كڕینو فرۆشتن، یاخود پەیماندان، هەروەها لێرەدا ﴿ عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ﴾، واته: ئەو سوێندانەی كە دڵیان لەسەر گرێ دەدەنو دەچەسپێنن.

(فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ ): لە (كَفْر)ەوە هاتوە، واته: (سَتْر)، كافر بۆیە وای پێ دەگوترێ، چونكە ئەو خواناسین (مَعْرِفَةُ الله)یەی كە لە دڵی دایە دەیشارێتەوە، ئنجا (كَفَّارَة) ئەوەیە كە ئینسان گوناهێكی كرد، شتێك بكات كە ئەو گوناهەی بسڕێتەوە، دەڵێ: (مَا يُغَطِّي الإِثْم..) هەر شتێكە كە گوناهەكەت داپۆشێ، كەسێك سوێندێك دەخوات، دوایی وا پێویست دەكات، سوێندەكەی نەباتە سەر، بۆ وێنە: سوێند دەخوات سەردانی خزمێكی نەكات، یان پەیوەندیی لەگەڵ بپچڕێنێ، وا باشە سوێندەكەی بشكێنێ، بەڵام بۆ ئەوەی گوناهبار نەبێ، دەبێ كەفارەت بدات، بۆئەوەی گوناهەكەی لەسەر لابچێ.

(مَسَٰكِينَ ): كۆی (مسكين)ە، (مسكين) واته: نەدار، (فقير) واته: هەژار، جا نەدار ئەو كەسەیە شتێكی هەبێو پێی نەژیەتو، بەشی نەكات، وە هەژار ئەو كەسەیە هیچی نەبێ.

(أَوْسَطِ ): دوو واتای بۆ لێكدراوەتەوە: (الوَسَطُ بَيْنَ الإِفْرَاطِ وَالتَفْرِيط، أَو الأحسَن والأجْوَد)، (أَوسَط) لە ئەسڵی زمانی عەرەبییدا، واته: میانجیی لە نێوان تێپەڕاندنو بەزایەداندا، نە زۆر باشو نە زۆر خراپ، هەروەها بە مانای باشترینو چاكترین دێ.

(أَهْلِيكُمْ ): كۆی (أَهْل)ە، (أَهْل) واته: خێزان، نەك هەر ئافرەتو هاوسەر، بەڵكو هاوسەرو كوڕو كچو ئەوانەی لەماڵیدان، هەموویان دەگرێتەوە، (أَهْلُ الرَّجُل: مَنْ يَجْمَعُهُ وَإِيَّاهُم نَسَبٌ، أَو دِينٌ، أَو مَا يَجْرَى مَجْرَاهُمَا: مِن صِنَاعَةٍ

وَبَيْتٍ، وَبَلَدٍ)، واتە: ئەهلـی پیـاو ئەوانەن کە لەگەڵ ئەوان پێکدەگاتەوە لە نەسەبدا، یان لە دیندا، وە لە هەر شتێکدا کە وەك نەسەبو دین وایە، وەك پیشە، وڵات، وە ئەوانەی لە چوارچێوەی ماڵێکدان.

(أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ): (الكِسْوَةُ: اللِّبَاسُ)، واتە: پۆشاكو جلو بەرگ، کە سوێند دەخوات، بۆ دە کەس لە نەدارانی دەکڕێ.

(رَقَبَةٍ): (الرَّقَبَةُ: إِسْمٌ لِلعُضْوِ المَعْرُوفِ، ثُمَّ يُعَبَّرُ بِهَا عَنِ الجُمْلَةِ، وَجُعِلَ فِي التَّعَارُفِ اسْمَاً لِلمَمَالِيكِ، كَمَا عُبِّر بالرَّأْسِ وَبِالظَّهْرِ عَنِ المَرْكُوبِ)، واتە: (رَقَبَة) لە ئەسڵدا واتە: گەردن، ئەستۆ، مل، دوایی بەکارهێنراوە بۆ ئینسانو کە گوتراوە: (تحرير رقبة)، وە مەبەست ئەوەنیە کە تەنیا ملەکەی ئازاد بکەی، واتە: هەموو بەدەنەکەی ئازاد بکەی، پاشان وەك عورفێك کراوە بە ناو بۆ کۆیلە، هەروەك چۆن کە دەگوترێ: پشت، یاخود سەر، دەگوترێ: فلان کەس ئەوەندە سەر مەڕی هەن، خۆ مەبەست تەنیا سەرەکانیان نین، یان چەند پشتی هەیە، واتە: ئەو وڵاخانەی کە بۆ بارو شت بەکاردێن، ئنجا وەك چۆن وشەی سەرو پشت، بۆ وڵاخ بەکاردێن، وشەی (رَقَبَة)ش بۆ ئینسان بەکاردێ.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەكان

١/ هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەو ئایەتـەی كـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾، لەوبارەوە سێ گێڕانەوە هەن:

أ- ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ أَنَّ رَجُلاً أَتَى النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! إِنِّي إِذَا أَصَبْتُ اللَّحْمَ انْتَشَرْتُ لِلنِّسَاءِ وَأَخَذَتْنِي شَهْوَتِي، فَحَرَّمْتُ عَلَيَّ اللَّحْمَ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٥٤) وَصَحَّحَهُ الأَلْبَانِي}، واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەبباس خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: ئەم ئایەتە بە هۆی ئەوەوە هاتە خوار: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! من عادەتم وایە كە گۆشتم خوارد ئارەزووم دەجووڵێ، (واتە: مەیلی ئافرەت دەكەم) بۆیە من گۆشتم لە خۆم قەدەغە كردوە، خواش ئەو ئایەتەی نارده خوار.

ب- {عَنْ أبي مَالِكٍ قَالَ: نَزَلَت فِي عُثْمَانَ بْنَ مَظْعُونٍ وَأَصْحَابهُ حَرَّموا عَلَيهم كَثيراً مِنَ الطَيِّبَاتِ، فَهَمَّ بَعْضُهُمْ أَنْ يقطع ذَكَرهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿٨٧﴾ ﴾﴾ {الإستيعاب في بيان الأسباب: ج٢، ص٩٣، سليم بن عبدالهلالي، ومحمد بن موسى آل نصر}، واتە: ئەبو مالیك (یەكێكە لە زانایانی تابیعین) دەڵێ: ئەم ئایەتە دەربارەی عوسمانی كوڕی مظعون (كە یەكێكە لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ، پیاوێكی زۆر عابیدو زاهید بووە) لەگەڵ هەندێك لە هاوەڵەكانی كە وەك خۆی بیریان دەكردەوە، هاتە خوار، كە زۆر

خـواردنی خۆشـیان لـە خۆیـان حـەرام کردبـوون، (چـوونە لای هاوسـەرەکانیشـیان) هەتــا هەنـدێکـیان ویســتیان ئەنـدامی نێرینـــەی خۆیــان ببــڕن، لـە ڕیوایــەتی دیکـەدا دەڵـێ: ویسـتیان خۆیان بخەسـێنن، خـوای بەرزیش ئـەو ئایەتـەی لـەبارەوە ناردە خوار.

ج- ﴿عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: جَاءَ ثَلَاثَةُ رَهْطٍ إِلَى بُيُوتِ أَزْوَاجِ النَّبِيِّ ﷺ يَسْأَلُونَ عَنْ عِبَادَةِ النَّبِيِّ ﷺ، فَلَمَّا أُخْبِرُوا كَأَنَّهُمْ تَقَالُّوهَا، فَقَالُوا: وَأَيْنَ نَحْنُ مِنَ النَّبِيِّ ﷺ، قَدْ غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ وَمَا تَأَخَّرَ؛ قَالَ أَحَدُهُمْ: أَمَّا أَنَا فَإِنِّي أُصَلِّي اللَّيْلَ أَبَدًا؛ وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَصُومُ الدَّهْرَ وَلاَ أُفْطِرُ؛ وَقَالَ آخَرُ: أَنَا أَعْتَزِلُ النِّسَاءَ فَلاَ أَتَزَوَّجُ أَبَدًا، فَجَاءَ رَسُولُ اللهِ ﷺ، فَقَالَ: أَنْتُمُ الَّذِينَ قُلْتُمْ كَذَا وَكَذَا؟ أَمَا وَاللهِ إِنِّي لَأَخْشَاكُمْ لِلَّهِ وَأَتْقَاكُمْ لَهُ، لَكِنِّي أَصُومُ وَأُفْطِرُ، وَأُصَلِّي وَأَرْقُدُ، وَأَتَزَوَّجُ النِّسَاءَ؛ فَمَنْ رَغِبَ عَنْ سُنَّتِي فَلَيْسَ مِنِّي﴾ (أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ برقم: (٥٠٦٣)}، واتـە: ئەنەسـی کوڕی مالیك خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ، دەڵـێ: سـێ کـەس هـاتن بـۆ لای ماڵـەکانی پێغەمبـەر ﷺ (هاوسـەرەکانی هەرکامێکیان لـە ژوورێکدا بوون لـە تەنیشـت یەکدی) پرسیاریان کـرد دەربارەی خـواپەرسـتیی پێغەمبـەر ﷺ، کاتێـك هەواڵیـان پێـدرا، بـە کـەمیان زانـی، دوایـی گوتیـان: جا ئێمـە لـە کوێو پێغەمبـەر ﷺ لـە کـوێ؟! خـوا لـە هـەموو شـتێکی خۆشـبووە، لـە گونـاهی پێشـێو دوایـی (واتـە: لـە گونـاهی ڕابـردووو داهـاتووی، خۆشــبووەو ئێمــە ناگەینــە وی، ئەگــەر لــەوی زیـاتر خــواپەرستیی نەکـەین) یەکێکـیان گـوتی: مـن هەمیشـە شـەونوێژ دەکـەم، (واتـە: شـەوێ ناخـەوم)، ئـەوی دیکەشـیان گـوتی: منـیش هـەموو ڕۆژێـك بـە ڕۆژوو دەبـم، (واتـە: هـەرگیز ڕۆژێـك نـابوێرم بـە ڕۆژوو نـەبم) ئـەو دیکەشـیان گـوتی: منـیش کەنارگیـریی لـە ئافرەتـان دەکـەمو هـەرگیز ژنـێ نـاهێنم، (دیـارە دەبـێ گـەنج بـوون) پێغەمبـەر ﷺ کـە گەڕایـەوە بـۆ مـاڵ، هـەواڵیان پێـدا (هاوسـەرە بـەڕێزەکانی خـوا لێیـان ڕازی بـێ)، پێغــەمبەریش ﷺ فــەرمووی: ئێــوە بــوون کــە ئــاواو ئاواتــان گوتــوە؟ (دیـارە ئەوانیــش گوتوویانــە: بەڵــێ، بــەس لێــرەدا بـاس نەکــراوە) دوایـی فـەرمووی: ئاگـاداربـن! بە خـوا مـن لە هەمووتـان زیـاتر لـە خـوا دەترسێمو لـە هەمووشـتان زیاتر پـارێزی لێدەکەم، بـەڵام بـەڕۆژوو دەبم (واتـە: ڕۆژووی سـوننەت) جـاری واش

هەیە بەڕۆژووش نابم، وە شەوێ نوێژیش دەکەم، وە دەشخەوم، (واتە: ئیسڕاحەتیش دەکەم) وە هاوسەرگیرییش دەکەم لەگەڵ ئافرەتان، هەر کەسێ لە ڕێبازی من لابدات، لە من نیە.

٢/ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغْوِ فِيٓ أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ ۖ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيْمَٰنِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَٱحْفَظُوٓا۟ أَيْمَٰنَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٨٩﴾﴾، ﴿عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللهُ عَنْهَا قَالَتْ: فِي قَوْلِهِ: كَلاَّ وَاللهِ وَبَلَى وَاللهِ﴾ {رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٤٦١٣)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٣٥٤)}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێندی (لغُو) ئەوەیە کە کەسێك دەڵێ: بە خوا نەخێر، وە با بە خوا وابوو، {ئاوا سوێندی بەسەر زاری دادێ، بێئەوەی کە دڵی لەسەری بچەسپێ، ئەوە باوترین مانای (لَغْو الیَمِین)ە واتە: سوێندی سەرزارەکیی}.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـــان

خــوا ﷻ وەك گوتمــان بـۆ جــاری دەیــەم لـەم ســوورەتەدا بـە نازنـاوی ئیمـان، مســولْمانان بـانگ دەکـات، کـە بـە تەئکیـد هـەر کاتێك خـوا فـەرمووی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، یـان فەرزێـك دەفەرمـوێ، یـان قەدەغـەکراوێـك، یـان فەرمانێکـە، یـان رێگرییـەك حەتمـەن حوکـمێکی شـەرعیی بـاس دەکـرێ، جـا چ لـە بـواری عەقیـدەدابێ، چ لـە بـواری عیبادەتـدا، چ لـە بـواری هەڵسـوکەوتەکاندا، چ لـە بـواری سـیاسـەتدا، چ لـە بـواری بازرگـانییـدا، بۆچـی؟ چونکـە کاتێك کۆمەڵـگای ئیسـلامیی یەکـەم دروسـت بوو، مسولْمانان قەوارەی سیاسییان بۆ دروست بـوو، شـایسـتەی ئـەوە بوون کە خـوا ئەرکـە شەرعییەکانیان پێ بسـپێرێ، بۆیـەش: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، تەنیـا لـە سـوورەتە مەدەنییـەکـانـدا هـاتوە، چـونکە لـە مەدینـەدا مسـولْمانان قەوارەیـەکی سـیاسییان بـۆ دروسـت بـوو، دەسـتەڵاتی شـەرعییان بەدەسـت خۆیان بـوو، جوگرافییەیەکـیان هـەبوو، وە کۆمەڵـگایەکیان هـەبوو، توانـای ئـەوەیان هـەبوو کـە شـەریعەت پیـادە بکـەن، بەڵام لە مەککـە لەبەرئەوەی نـە سـەرزەمینـی خۆیان بـوو، نـە دەسـتەڵاتیان هـەبوو، نـە کۆمەڵـگایەکی سـەربەخۆیان هـەبوو، نەدەگونجـا ئەرکـە شـەرعییەکـان جێبەجـێ بکـەن، بۆیـە لـەوێ یـەکجاریش خـوای کاربـەجێ بـە نـاوی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، بانگی نەکردوون‌و هەر فەرموویەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْإِنسَـٰنُ ﴿٦﴾ ﴾ الانفطار، ﴿ يَـٰبَنِىٓ ءَادَمَ ﴿٢٧﴾ ﴾ الأعراف، ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ﴿١﴾ ﴾ النساء، جا لێرەدا بـۆ جـاری دەیەم خـوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحَرِّمُوا۟ طَيِّبَـٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! ئەو رۆزییـە خۆش‌و سـوودبەخش‌و بە تامانەی کە خـوا بـۆی حـەڵاڵ کـردوون، قەدەغەیـان مەکـەن، نەك بەو مانایەی کـە بڵێین: حـەرامن، بەڵـکو یـانی: لـە خۆتانیـان مەگرنـەوە، وە دەسـتدرێژیی مەکـەن‌و سـنوورشکێنیی مەکـەن، بێگومـان خــوا سـنوور

شكێنانی خۆشناوێن. چۆنیەتی پەیوەستبوونی ئەم ئایەتانە بە ئایەتەكانی پێشەوە ئەوەیە كە لە دەرسی پێشوودا خوا باسی هەڵوێستی خراپی جوولەكەكان و هاوبەش بۆ خوادانەرەكانی كرد، وە باسی هەڵوێستی نەرمو نیانی نەصرانییەكانی كرد بەگشتی، وە هی هەندێكیان بەتایبەت، كە ئیمان دێنن بە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد ﷺ وە لە میانەی باسكردنو مەدحكردنی نەصرانییەكاندا فەرمووی:

﴿ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ المائدة،

ئەوەش لەبەرئەوەی كە زانایانیان لەنێودا هەنو خواپەرستانیان لەنێودا هەن، وە خۆ بە زلگرنین، دیارە ئەو كاتە نەصرانییەكان بەگشتی نەرمو نیانو خۆ بە كەمگرو، دنیا بە كەمگر بوونو زۆر ڕوویان لە لەززەتو مادیگەریی نەبووە، ئنجا لێرەدا خوا ﷻ بۆئەوەی مسوڵمانان بە هەڵە لەوە حاڵی نەبن، بڵێن: مادام خوا مەدحی نەصرانییەكان دەكات، كە لەگەڵ ئەهلی ئیسلامدا میانەیان باشەو، نەرمو نیانن‌و، لە بەرانبەر پێغەمبەری خاتەمدا ﷺ هەڵوێستیان باشەو، هەندێكیان ئیمانیان بە پێغەمبەری خاتەم ﷺ، وە بەو قورئانەی كە بۆی دابەزێنراوە هێناوە، بۆئەوەی وا نەزانن كە لە ئیسلامدا ئەوە شتێكی باشە، ئەو ڕەهبانیەتو گۆشەگیرییەی نەصرانییەكان دەیكەن، بۆیە خوا ﷻ ئەو ئایەتانەی ناردە خوار لەوكاتەدا، هەڵبەتە لە هۆی هاتنە خوارەوەكەشدا باسمان كرد، كە هەندێك لە مسوڵمانان ویستوویانە، وەك نەصرانییەكان بكەن، ژیانی ڕەبەنیی بگرنە بەر، وە شتی خۆشو بە تام لە خۆیان قەدەغە بكەن، بە حیساب ئاوا لە خوا نزیك دەبنەوە، وە ئاوا زیاتر دەتوانن كە ڕوو لە خوا بكەن، بەڵام خوای پەروەردگار ئاگاداری كردنەوە، كە نەخێر، ئەوە وانیە، ئەی ئیماندارینە! ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەو خواردنە خۆشو بە تامانەی خوا بۆی حەڵاڵ كردوون، قەدەغەیان مەكەن‌و دەستدرێژیی مەكەن، واتە: لە قەدەغەكردنی ئەو خواردنە خۆشو بەتامانەدا، ئەوە دەستدرێژیی‌و سنوورشكێنییە، وە خوا سنوورشكێنانی خۆشناوێن، ﴿ وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا ﴾، دوای ئەوەی پێیان دەفەرموێ: لە خۆتانیان قەدەغە مەكەن، ئنجا فەرمانیشیان پێدەكاتو دەفەرموێ: وە لەو ڕۆزییەی خۆشو چاكەی كە خوا پێیداونو بۆی حەڵاڵ كردوون، بخۆن،

﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤۡمِنُونَ ﴾، وە پارێز لەو خوایە بکەن کە ئێوە پێی ئیمانداران‌و ئیمانتان پێی هەیە، پارێزی لێبکەن، واتە: پارێزی لێبکەن‌و شتێك کە خوا بۆی حەڵاڵ کردوون، لە خۆتانی مەگێڕنەوە، وە پارێزیشی لێبکەن، لە حەڵاڵیشدا تێمەپەڕێنن‌و زێدەڕۆیی مەکەن، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَكُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ وَلَا تُسۡرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡرِفِينَ ٣١ ﴾ الأعراف، واتە: بخۆن‌و بخۆنەوە، بەڵام زێدەڕۆیی مەکەن، چونکە (خوا) زێدەڕۆییکەرانی خۆشناوێن، جا کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ﴾، پارێز لە خوا بکەن، چی‌و چی دەگرێتەوە؟ دوایی زیاتر تیشکی دەخەینە سەر، ئنجا دوای ئەوە خوا ﷻ باسی سوێند دەکات، بۆچی؟ چونکە دیارە هەندێك لەو مسوڵمانانە گوتوویانە: خواردنی خۆش ناخۆین، یاخود ناچینە لای هاوسەرەکانمان، یان گۆشت ناخۆین‌و، پێدەچێ سوێندیان خواردبێ لەسەر ئەو شتانە، دوایش گوتوویانە: سوێندەکان چی لێبکەین؟! بۆیە خوای زاناو شارەزا باسی کەفارەتی سوێند خواردن دەکات، دەفەرموێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ ٱللَّهُ بِٱللَّغۡوِ فِيٓ أَيۡمَٰنِكُمۡ ﴾، خوا لێتان ناگرێ بەهۆی لەغو لە سوێندەکانتاندا، (لغو) واتە: قسەی پووچ، یاخود قسەی سەر زارەکیی، یاخود سوێندێکی دڵ لەسەر نەچەسپێنراو، (لغو الیَمِین)، یان ئەوەیە کە وا بزانی شتێك وابووەو سوێندی لەسەر بخۆی، یاخود وا بزانی شتێك وانەبووەو سوێندی لەسەر بخۆی، دوایی دەربکەوێ کە وابووە، یان وانەبووە، ئەوەش مانایەکی دیکەیەتی، بە هەر حاڵ خوا دەفەرموێ: خوا لەسەر سوێندی لەغو کە دەیخۆن لێتان ناگرێ ﴿ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلۡأَيۡمَٰنَ ﴾، بەڵام لێتان دەپێچێتەوەو لێتان دەگرێ بەهۆی سوێندێکەوە، کە گرێتان داوە، واتە: سوێندێك کە دڵتان لەسەر گرێ داوە، لێپرسینەوەی لەسەرە، سوێندێك کە بە جیددیی خواردووتانە، ئەوجار باسی چۆنیەتی لابردنی گوناهی ئەو سوێندە دەکات، کە دڵی لەسەر چەسپێنراوەو جێبەجێ ناکرێ، دەفەرموێ: ﴿ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ ﴾، کەفارەت‌و سڕانەوەی ئەو

سوێندانەتان بەوە دەبێ کە خواردن بە دە کەسی نەدار بدەن، لە خواردنێکی مام نێوەندیی کە دەیدەن بە ماڵو خێزانی خۆتان، واتە: نە باشترین جۆر، نە خراپترین جۆر، بەڵکو لای نێوەڕاستی بگرن، خواردنێکی میانجیی، نەك لەوەی بە دەگمەن بۆخۆتان دەیخۆن، لە خواردنی باش، یاخود لە خواردنی خراپ، ﴿أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ﴾، یاخود پۆشاکیان، یانی پۆشاکیان بۆ بکڕی هی دە نەدار، جا پۆشاکەکەش، دوایی باسی دەکەین، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: هەر شتێك بێ پێی بگوترێ: پۆشاك دەبێ، ئەگەر کڵاوێك بێ، ئەگەر مێزەرێك بێ، ئەگەر سەرپۆشێك بێ، کراسێك بێ، وە هەندێك گوتوویانە: دەبێ سەرتاپا بێ، ﴿أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ﴾، یان ئازادکردنی گەردنێك، واتە: ئازادکردنی کۆیلەیەك، دیارە ئێستا کۆیلە نەماون، کەفارەتی سوێند خواردن بۆتەوە بە نانداڵو پۆشاك بۆ کردن، ﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖ﴾، ئنجا کەسێك وەدەستی نەکەوت، واتە: نە خواردنی هەبوو بیدات بە نەدار، نە توانای هەبوو پۆشاکیان بۆ بکڕێ، وە نە کۆیلەشی بۆ کڕدرا، بۆئەوەی ئازادی بکات، کە وەك گوتم ئێستا هەر نیەK ئەوە سێ ڕۆژ ڕۆژووگرتنی لەسەرە، ﴿ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡ﴾، ئا ئەوە کەفارەتی سوێندەکانتانە، هەر کات سوێندتان خوارد، ئنجا ئایا ئەو سێ ڕۆژە لەسەر یەك بەڕۆژووبێ؟ یان پچڕپچڕیش بێ دەبێ؟ زانایان هەردوو ڕایەکیان هەن، لە کۆتاییدا خوا دەفەرموێ: ﴿وَٱحۡفَظُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ﴾، وە سوێندەکانتان بپارێزن، واتە: زۆر سوێند مەخۆن، بەپێی پێویست نەبێ سوێند مەخۆن، ئەوە مانایەکی، یاخود کە سوێندتان خوارد، هەر لە خۆوە بەبێ هۆ سوێندەکانتان مەخەن، واتە: دەبێ سوێندەکە بەرنە سەر، ئەگەر ئەو شتە کە سوێندتان لێ خواردوە باشتر بوو، دەبێ کەفارەت بدەن، ئەگەرنا دەبێ سوێندەکەتان بەرنە سەر، ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾، ئاوا بەو شێوەیە خوا ئایەتەکانی خۆیتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو سوپاسگوزاریی بۆ خوا ﷻ بکەن.

## چـەند مەسـەلـەیـەکی گرنـــگ

**مەسـەلەی یەکـەم**: کە دەفەرمـوێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تُحَرِّمُواْ طَيِّبَـٰتِ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكُمْ وَلَا تَعْتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْمُعْتَدِينَ ﴾، بـە درێـژایی مێژوو بەشـەر بـە دوو شـێوە تووشـی هەڵە بـووە، لـە بـواری مامەڵە لەگەڵ ئـەو شـتانەدا کـە پێـی خۆشـن، جـا خــواردن‌و خــواردنەوەیە، بـەرگ‌و پۆشــاکە، خانووبەرەیـــە، ... هتـد، هــەموو ئەو شـتانەی کە ژیـانی دنیـایی پێویسـتی پێیانە:

<u>هەڵـەی یەکەمیان</u>: بریتی بووە لە تێپەڕاندن، واتە: نوقم بوون لەو مەتاع‌و ڕابواردن‌و خۆشـیی‌و لەززەتــە ماددیانـــەدا، بۆیـــە خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿ وَكُلُواْ وَٱشْرَبُواْ وَلَا تُسْرِفُوٓاْۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿٣١﴾ ﴾الأعـراف، واتـە: وە بخـۆن‌و بخـۆنەوە، بـەڵام زێـدەڕۆیـی مەکـەن.

<u>هەڵەی دوومیـان</u>: بریتــی بـووە لـە لەخۆ قەدەغـەکردنی ئـەو شــتە خۆشـانە، بۆیـە خـــوا دەفـــەرموێ: ﴿ قُلْ مَنْ حَرَّمَ زِينَةَ ٱللَّهِ ٱلَّتِيٓ أَخْرَجَ لِعِبَادِهِۦ وَٱلطَّيِّبَـٰتِ مِنَ ٱلرِّزْقِۚ قُلْ هِيَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا خَالِصَةً يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِۗ كَذَٰلِكَ نُفَصِّلُ ٱلْأٓيَـٰتِ لِقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣٢﴾ ﴾الأعـراف، واتە: بڵـێ: کـێ ئەو جوانیەی کە خـوا بـۆ بەندەکـانی وەدەری نـاوە، ئەو ڕۆزیـی‌و خواردن‌و خواردنەوە بە تام‌و خۆشـانەی کە خوا بۆ بەندەکـانی دروستی کردوون، قەدەغـەی کردوون؟! واتە: مادام خوا بـۆ بەندەکـانی دروسـتی کردوون، کـەس مافـی ئەوەی نیـە لێیانیـان قەدەغـە بکـات.

ئیسـلام هــاتوە خـەتی نێوەڕاسـتی گرتـوە، دەڵـێ: نـە تێپـەڕێنن‌و لـە ڕابـواردنی ماددییـدا نوقــم بـن، وە نـە کورتیشــی بێـنن، کە ئەوانـە لـە خۆتان بگرنـەوە، وەك ڕاهیبـە نەصـرانییەکـان، بەڵکو خـەتی نێوەڕاسـت بگـرن.

وە لەوبارەوە پێشەوای توێژەروانی قورئان (أَبُو جَعْفر الطَّبَري) هەندێ قسەی زۆر جوانی کردوون، کە (القرطبي) لە تەفسیرەکەی خۆی دا[1] لێی نەقڵ دەکات، دەڵێ: (قَالَ الطَّبَري: لا يَجُوزُ لأَحَدٍ مِنَ الـمُسْلِمِينَ تَحْرِيمُ شَيءٍ مِمَّا أَحَلَّ اللهُ لِعِبَادِهِ الـمُؤْمِنِينَ عَلَى نَفْسِهِ مِن طَيِّبَات الـمطاعِم وَالـمَلابِسِ وَالـمَنَاكِحِ، إِذَا خَافَ عَلَى نَفْسِهِ بِإِحْلَالِ ذَلِكَ بِهَا بَعْض العنت وَالـمَشَقَّة؛ وَلِذَلِكَ رَدَّ النَّبِيّ ﷺ التبتل عَلى ابن مَظعُون فَثَبَتَ أَنَّهُ لاَ فَضْلَ فِي تَرْكِ شَيءٍ مِمَّا أَحَلَّهُ اللهُ لِعِبَادِهِ، وَأَن الفَضْلَ وَالبِرّ إِنَّمَا هُوَ فِي فِعْلِ مَا نَدبَ عِبَادِهِ إِلَيْهِ، وَعَمل بِهِ رَسُولُ اللهِ ﷺ، وَسَنَّهُ لِأُمَّتِهِ، وَاتَّبعهُ عَلَى مِنْهَاجِهِ الأَئِمَة الرَّاشِدُون، إِذْ كَانَ خَيرُ الهَدِي هَدي نَبِيّنَا مُحَمَّد ﷺ، فَإِذَا كَانَ كَذَلِكَ تَبَيَّنَ خَطَأُ مَنْ آثر لِبَاس الشَّعرِ وَالصوفِ عَلَى لِبَاس القُطْنِ وَالكَتَّان إِذَا قدر عَلَى لِبَاسِ ذَلِكَ مِنْ حِلِّهِ، وَآثر أَكل الخشن مِنَ الطَّعَامِ وَتَرْك اللَّحْمِ وَغَيْرِهِ حذراً مِن عَارِضِ الحَاجَّةِ إِلَى النِّسَاءِ،... وَذَلِكَ أَنَّ الأَوْلَى بِالإِنْسَان صَلاحُ نَفْسِهِ وَعونه لَهَا عَلَى طَاعَةِ رَبِّهَا، وَلا شَيءَ أَضَرَّ لِلْجِسْمِ مِنَ المطاعِمِ الرَدِيئَةِ لأَنَّهَا مُفْسِدَةٌ لِعَقْلِهِ وَمضعفة لأَدَوَاتِهِ الَّتِي جعَلَهَا اللهُ سَبَباً إِلى طَاعَتِهِ، وَقَدْ جَاءَ رَجُلٌ إِلى الحَسَنِ البَصَرِيّ؛ فَقَالَ: إِنَّ لِي جَاراً لا يَأْكُلُ الفَالُوذَج، فَقَالَ: وَلِمَ؟ قَالَ: يَقُولُ لا يُؤَدِّي شكره؛ فَقَالَ الحَسَن: أَفَيَشْرَبُ الـمَاءَ البَارِدَ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، فَقَالَ: إِنَّ جَارَكَ جَاهِلٌ، فَإِنَّ نِعْمَةَ اللهِ عَلَيْهِ فِي الـمَاءِ البَارِدِ أَكْثَرُ مِنْ نِعْمَتِهِ عَلَيْهِ فِي الفَالُوذَج)، واتە: (طبَري) دەڵێ: دروست نیە بۆ هیچ کام لە مسوڵمانان هیچ کام لەو شتانەی کە خوا بۆ بەندە ئیماندارەکانی حەڵاڵی کردوون لە شتە خۆش و بە تامەکان، لە جۆرەکانی خواردن، جل و بەرگ و پۆشاك، یاخود هاوسەرگیریی، لە خۆی قەدەغە بکات، کاتێك مەترسیی ئەوەی هەبێ، لەوەی کە ئەگەر لێیان بەهرەمەند بێ، دوایی بەهۆی ئەوەوە ئارەزووی جینسیی دەجووڵێ، یان بەهۆی ئەوەوە کە بەدەنی بەهێز دەبێ، تووشی گوناح ببێ، دەڵێ: هەر بۆیەش پێغەمبەر ﷺ بەرپەرچی (ابْنُ مَظعُون)ی دایەوە، کاتێك ویستی گۆشەگیریی بکات، کەواتە: ئەوە دەرکەوت کە هیچ چاکەیەك لەوەدا نیە کە ئەوەی خوا بۆ بەندەکانی خۆی حەڵاڵ کردوە، وازی لێبێنی،

---

١) الجامع لأحكام القرآن: ج٦، ص٢٢٨.

(پێت وابێ بەوە لە خوا نزیك دەكەویەوە) بەڵكو چاكەو چاكەكاریی لەوەدایە كە خوا بەندەكانی بۆ هانداوە، وە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داوەو ڕەنگی بۆ ڕشتوە، وە پێشەوایانی سەرراستیش بە دوای پێغەمبەر ﷺدا ڕۆیشتوون، چونكە باشترین ڕێباز ڕێبازی پێغەمبەر موحەممەدە ﷺ، جا مادام وابێ، كەواتە: دەركەوت ئەوانەی كە بەرگی مووو خوریی لەبەردەكەن، (شعر: بە مووی بزن دەگوترێ، صوف: بە خوری مەڕ)، هەڵیدەبژێرن بەسەر پۆشاكێكدا كە لە لۆكەو كەتتان دروست دەكرێ، ئەوانە بەهەڵەداچوون، (مادام بتوانی بە حەلاڵی پۆشاكێكی باشتر لەبەربكەی بۆچی هی خراپتر لەبەر دەكەی؟!!) هەروەها ئەوانەی كە خواردنی زبر دەخۆن و هەڵیدەبژێرن بەسەر خواردنی چاكدا (زبر: واتە: خواردنێك كە باش نیەو هێزو پێزی وا ناداتە بەدەن)، وە دەچێ واز لە خواردنی گۆشت و غەیری گۆشت دێنێ لەو خواردنانەی كە پێویستن بۆ بەدەن، لە ترسی ئەوەی كە پێویستی بە ئافرەت بێ، (لە ترسی ئەوەی كە ئارەزووی جینسیی بجووڵێ) ئەوانە بەهەڵەداچوون، چونكە باشتر وایە بۆ ئینسان كە خۆی چاك بكات، وە نەفسی خۆی لە شتی حەلاڵ تێر بكات، تاكو بتوانێ فەرمانبەریی پەروەردگاری بكات، وە هیچ شتێكیش بۆ بەدەن خراپتر نیە لە خواردنی خراپ، ئەو خواردنانەی كە هێزو پێزیان نەبێ، چونكە خواردنی خراپ دوایی عەقڵیشی تێكدەدات، وە ئەندامەكانی بەدەنیشی بێهێز دەكات، كە بە دەنێكی بە هێزی نەبێ و عەقڵێكی سەلیمی نەبێ طاعەت و خواپەرستییشی پێ ناكرێ، (كاتی خۆی كەسانی وا هەبوون و ئێستاش هەر هەن، كە تێپەڕێنن بە باری دنیا بە كەمگرتنداو، پێیانوایە بەوە لە خوا نزیك دەبنەوە) ئنجا دەڵێ: پیاوێك دەچێ بۆ لای حەسەنی بەصرایی پێی دەڵێ: دراوسێیەكم هەیە (فَالُوذَج) ناخوات، (واپێدەچێ شیرینییەكی وەك پاقلاوە بووبێ) ئەویش دەڵێ: بۆچی نایخوات؟ دەڵێ: سوپاسی خوام بۆ لەسەری ناكرێ، (یانی: شتێكی زۆر خۆشە، دەترسم بیخۆم، نەتوانم خواپەرستیی هێندە بكەم كە وەك سوپاسگوزاریی وابێ لە بەرانبەر ئەو نیعمەتەدا) حەسەنی بەصراییش دەڵێ: دراوسێیەكەت ئاوی سارد دەخواتەوە؟ دەڵێ: بەڵێ، دەڵێ: دراوسێیەكەت نەزانە، چونكە نیعمەتی خوا لە ئاوی سارددا، زۆر زیاترە لە نیعمەتی خوا لە (فَالُوذَج)دا، {چونكە هەموو كەس بەبێ (فَالُوذَج) دەژی، بەڵام كەس بەبێ ئاوی سارد ناژی}.

کەواتە: با لە ترسی ئەوەی کە شوکری خوای بۆ ناکرێ واز لەو نیعمەتە نەهێنێ، با نیعمەتەکانی خوا بەکاربێنێ، بەلام زێدەڕۆییان تێدا نەکات، وە سوپاسی خواشیان لەسەر بکات، بۆئەوەی جەستەیەکی بەتوانای هەبێ، چونکە ئەگەر مرۆڤ بەهۆی خواردنی خراپو بەهۆی پشتگوێخستنی جەستەیەوەو جەستەی نەخۆش بوو، مانای وایە ئەوکاتە نە خواپەرستییو دینداریی باشی بۆ دەکرێ، وە نە دنیاداریشی بۆ دەکرێ، کەواتە: بە کورتیی ئەم ئایەتە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە ئیسلام ئایینی فیطرەتو عەقلی ساغە، وە لەگەڵ ئینساندا مامەڵەیەکی واقیعییانە دەکات، وە هەموو غەریزەکانی ئینسان لەبەرچاو دەگرێ، کە تێریان بکات، وەك خوای پەروەردگار لە سووڕەتی (آل عمران) دەفەرموێ: ﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاءِ وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ وَالْخَيْلِ الْمُسَوَّمَةِ وَالْأَنْعَامِ وَالْحَرْثِ ... ﴿١٤﴾ ﴾ واتە: خۆشەویستی ئارەزووەکان بۆ خەڵك جوان کراون لە ئافرەتو کوڕان زێڕو زیوو... هتد، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿ وَلَا تَعْتَدُوا ﴾: چوار واتای هەن:

١) سنوورشکێنیی مەکەن، بەوە کە ئەوەی خوا حەلالی کردوە، حەرامی بکەن، کە ئەوە کوفرە.

٢) سنوورشکێنیی مەکەن، بەوە کە زێدەڕۆیی بکەن لەوەدا کە خوا حەلالی کردوە.

٣) سنوورشکێنیی مەکەن، بەوە کە ئەوەی خوا حەرامی کردوە، بە حەلالی دابنێن.

٤) سنوورشکێنیی مەکەن، بەوەی ئەو خواردنە خۆشو بەتامانە زۆر بخۆنو زێدەڕۆییان تێدا بکەن، دوایی زیان بە نەفسو بەدەنی خۆتان یان ماڵو خێزانتان بگەیەنن.

**مەسـەلـەی دووەم:** کـە دەفەرمـوێ: ﴿ وَكُلُواْ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَٰلًا طَيِّبًا وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ أَنتُم بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴾، لێـرەدا ئـەوەی پێویسـتە بزانـرێ، ئەوەیـە کـە زۆرجـار گـوتراوە: وشـەی (طَيِّبَات) واتـە: حـەلاڵ، بـەڵام ئـەوە هەڵـەیەو حـەلاڵ شـتێکەو (طَيِّبَات) شـتێکی دیکەیە لەڕاسـتیدا (طَيِّب) واتە: هەر شـتێك کـە خۆش و بـە تـام و بـە لـەززەتەو بـە سـوودە، (الطيِّب: ما تستلذه النفس والحواس)[١] حـەلاڵیش ئەوەیە کە لـە ڕووی شـەرعییەوە خـوای پـەروەردگار بـە ڕەوای داناوە، وە خـوای پەروەردگـار دەفـەرموێ: ﴿ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ ﴾ الأعـراف، هەرچـی خۆش و بـە تامـە خـوا حـەلاڵی کـردوە، تـەنیا خـوا ئـەو شـتانەی قەدەغـە کـردوە کـە پـیس و زیانبەخشـن ﴿ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ ﴾ الأعـراف، وە هـیچ شـتێکی سـوودبەخش نیـە خـوا حەلاڵـی نەکـردبێ، هـیچ شـتێکی زیانبەخشـیش نیـە، قەدەغـەی نەکردبێ.

(فَخـرُ الـدِّين الـرازي) دەڵـێ: لـە ڕێگـرتن لـە قەدەغـەکردنی شـتە خـۆش و بەتامەکـان، چوار حیکمـەتی تێـدان:

{الأوّل: أن الرهبانية المفرطة والإحتراز التام عن الطيبات واللذات مما يوقع الضُّعف في الأعضاء الرئيسية التي هي القلب والدماغ، وإذا وقع الضعف فيهما اختلت الفكرة وتشوش العقل. ولا شك أن أكمل السعادت وأعظم القربات إنما هو معرفة الله تعالى، فلمَّا كانت الرهبانية الشديدة مما يوقع الخلل في ذلك بالطريق الّذي بيناه، لا جرم وقع النهي عنها.

والثاني: وهو أن حاصل ما ذكرتم أن اشتغال النفس بطلب اللذات الحسية يمنعها عن الإستكمال بالسعادات العقلية، وهذا مُسَلَّمٌ لكن في حق النفوس الضعيفة، أما النفوس المستعلية الكاملة، فإنها لا يكون استعمالها في الأعمال الحسية مانعاً لها من الإستكمال بالسعادات العقلية، فإنا نشاهد النفوس قد

---

١) مفردات ألفاظ القرآن، لراغب الأصفهاني، لفظ: طاب.

تكون ضعيفة بحيث متى اشتغلت بمهم امتنع عليها الإِشتغال بمهم آخر، وكلما كانت النفس أقوى كانت هذه الحالة أكمل، وإذا كان كذلك كانت الرهبانية الخالصة دليلاً على نوع من الضعف والقصور، وإنّما الكمال في الوفاء بالجهتين والإِستكمال في الناس.

الثالث: وهو أن من استوفى اللذات الحسية، كان غرضه منها الإِستعانة بها على استيفاء اللذات العقلية، فإن رياضتهُ ومجاهدته أتم من رياضة من أعرض عن اللذات الحسية، لأن صرف حصة النفس إلى جانب الطاعة أشق وأشد من الإِعراض عن حصة النفس بالكلية، فكان الكمال في هذا أتم.

الرابع: وهو أن الرهبانية التامة توجب خراب الدنيا وانقطاع الحرث والنسل}.

١- پوختەی مانای قسەکانی (الرازي) ئاوایە: ڕەهبانیەتی تێپەڕێنەرانە لە گۆشەگیریی‌و لە دنیا بە کەمگرتنداو یەکجاریی دەست هەڵگرتن لە شتی خۆش‌و بە تام، دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەدەن بێهێز بێ، بەتایبەت ئەندامە سەرەکییەکان، وەك عەقڵ‌و دڵ، وە کاتێك کە بەدەنیش بێهێز دەبێ، دڵ‌و عەقڵیش باش ئیش ناکەن، ئنجا کە دڵ‌و عەقڵیش باش ئیشیان نەکرد، پێش هەموو شتێك مرۆڤ ناتوانێ خواناس بێ‌و مانای وایە پەکی دەکەوێ.

٢- دیارە سەرگەرم‌بوونی نەفس بە لەززەتە مادییەکانەوە، ڕێی لێدەگرێ لە گەشەکردنی عەقڵیی‌و ئیمانیی، بەلام ئەوە بۆ کەسانێکی بێهێز وایە، ئەمما ئەوانەی نەفسێکی بەهێزیان هەبێ‌و کامڵ بن، هەم هەقی لایەنی مادیی دەدەن، لە جەستەیان، هەم هەقی لایەنی مەعنەوییش دەدەن بە ڕووحیان.

٣- لەڕاستییدا ئەو کەسەی لە ڕووە مادییەکەوە بەهرە وەردەگرێ لە لەززەتە جەستەییەکان، بۆئەوەی کە بیکاتە هۆکار بۆ لە خوا نزیکبوونەوە، باشترە لەوەی کە نەفسی خۆی لە هەموو شتێك دەگێڕێتەوە، دوایی هەمیشە چاوی تێوەیەتی.

٤- بە دڵنیاییەوە ڕەهبانییەت‌و گۆشەگیریی تەواو، دەبێتە هۆی تێکچوونی دنیاو کۆتایی پێهێنانی وەچەی بەشەر.

**مەسـەلەی سـێیەم:** كـه خــوا دەفـەرموێ: ﴿ لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَانِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَانَ ۖ فَكَفَّارَتُهُ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَاكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ۖ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ ۚ ذَٰلِكَ كَفَّارَةُ أَيْمَانِكُمْ إِذَا حَلَفْتُمْ ۚ وَاحْفَظُوا أَيْمَانَكُمْ ۚ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾، واته: خـوا لێتـان ناپرسـێتەوەو سـزاتان نـادات بە هۆی ئـەو سـوێندانەتـانەوە كە (لـغـو)ن، بـەڵكو لێتـان دەپرسـێتەوەو سزاتان دەدا بەهـۆی ئەو سـوێندانەتـانەوە كە دڵیـان لەسـەر دەچەسـپێنن...

ئێمە بـۆ شـیكردنەوەی ئـەم ڕستە قورئانییـە، باسـێك لـەبارەی سوێند خـواردنەوە دەخەینـە ڕوو، واتە: باسێكی تەفسـیـریی فیقهـیی لـە حـەوت خـاڵدا، بۆئـەوەی لـە هەر شـوێنێكی دیكـە لەم تەفسیـرەدا مەسەلەی سوێندمان هاتەوە پێـش، حـەواڵـەی ئێـرەی بكـەین:

## باسێک لە بارەی سوێند خواردن و کەفارەتەکەیەوە

**یەكــەم: پێناسـەی سـوێندی (لـغـو):**

ئـەوە شـتێكی ئاشـكراو ڕوونـەو دیاردەیـەكی بـاوە لـەنێو هـەموو میللـەتاندا، كـە سـوێند خـواردنی جیـددیی هەیـەو، سـوێند خــواردنی سەرزارەكـیی (لغــو) هەیـە، بەكوردی دەڵێیـن سـەرزارەكی، یـان سـوێندێك كـە دڵی لەسـەر نەچەسـپێنرابـێ، كـە دوایـی زیـاتر شـیدەكـەینـەوە، سـوێندی (لـغـو) چییـە؟

(راغب) له (مفردات)ەكەی خۆیـدا[١] دەڵـێ: (اللَّغو مِنَ الكَلاَمِ مَا لا يُعْتَدّ بِهِ وَهُوَ الَّـذِي يُورَدُ لا عَـن رويَـةٍ وَفِكرٍ فَيَجْري مَجْرَى اللَّغَا، وَهُوَ صَوْتُ العَصَافِيرِ وَنَحْوِهَـا

١) ص٧٤٢.

مِنَ الطَّيُورِ، اللَّغْو فِي الإيمَان أَي مَا لا عَقْدَ عَلَيْهِ وَذَلِكَ مَا يَجري وَصلاً للكَلاَمِ بضَربٍ مِنَ العَادَة)، واتە: وشەی (لَغو) لە ئەسڵی زماندا قسەیەکە کە گرنگیی پێنەدرێ، ئەویش قسەیەکە کە ئینسان بەبێ بیر لێکردنەوەو تێوەڕامان بیکات، ئەو جۆرە قسەیە وەك (لغا) وایە، (لغا)ش بریتیە لە دەنگی پاساریی (چۆلەکە)، وە وێنەی چۆلەکە پاساریی لە باڵندەکانی دی، وە وشەی (لغو) لە سوێندەکاندا واتە: ئەو سوێندەی کە دڵی لەسەر ناچەسپێنرێ، بەڵکو وەك تەواوکردنی قسە وەك عادەت پێوەگرتن دەڵێن: (بە خوا وابوو، بە خوا وانەبوو)، (لا واللە بَلَى واللهِ).

## جۆرەکانی سوێند خواردن:

### ئنجا ئایا سوێندی (لغو) چەند جۆری هەیە؟

سوێندی لەغوو دوو جۆری سەرەکییە، کە یەکیان پەیوەندیی بە زمانەوە هەیەو، یەکیشیان بە دڵەوە پەیوەستە، زانایانیش هەندێکیان دەڵێن: ئەوە ماناکەیەتی، هێندێکیشیان دەڵێن: ئەوی دیکە، وە من پێمووایە سوێندی (لغو) هەردووکیانە:

١- (مَا يَسبِقُ إِلَيْهِ اللِّسَانُ مِنْ غَيْرِ قَصْدِ الحَلِفِ كَقَولِ الإنسَان لا وَاللهِ، وَبَلَى وَاللهِ) واتە: ئەو سوێندەیە کە زمان بۆی پێش دەکەوێ، بێئەوەی ئینسان مەبەستی بێ، بەسەر زاری دادێ، کوردەواریی خۆمان دەڵێن: سوێندی سەرزارەکی، کە هەر لە خۆوە ئینسان دەڵێ: بە خوا ئەو شتە وابوو، نە بەخوا وانەبوو، بەڵام مەبەستی نیە سوێند بخوات، ئەوە پێناسەیەکی (لغو).

٢- (أَنْ يَعْقِدَ الإِنْسَانُ عَلَى اليَمِينِ يَظنُ صِدْقَ نَفْسِهِ، فَبَانَ بِخِلاَفِ ذَلِكَ) ئەوەیە کە ئینسان دڵی خۆی بچەسپێنێ لەسەر شتێك، مەبەستی بێ سوێندی لەسەر بخوات، وە پێشیوابێ ڕاست دەکات، بەڵام دوایی بۆی دەرکەوێ کە بەهەڵەداچووە، بۆ وێنە: سوێندێ بخوا کە فلان کەس هاتۆتەوە لە سەفەرێ، پێیوابێ کە ڕاست دەکات، لە حاڵێکدا کە نەشهاتۆتەوە، بە هەردوو باردا، چ ئیسپاتی بکەی، چ نەفی بکەی، بەڵام دوایی دەرکەوێ، پێچەوانەیە، هەندێك

گوتوویانە: ئەوەیان پێی دەگوترێ: سوێندی (لغو)، ئەو کەسە مەبەستی ئەوە نەبووە ئینکاریی هەقێك بکات، بەلاّم لەو کاتەدا قەناعەتی وابووە، کە من پێمووایە سوێندی (لغو)، هەردووکیان دەگرێتەوە، هەرچەندە زیاتر جۆری یەکەمیان دەگرێتەوە، لەبەر ئەم دەقە کە لە دایکمان عائیشە خوا لێی ڕازی بێ گێڕدراوەتەوە، گوتوویەتی: ﴿إِنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ قَالَ: اللَّغو في اليَمِينِ هُوَ كَلاَمُ الرَّجُلِ فِي بَيْتِهِ: كَلاَّ وَاللهِ وَبَلَى وَاللهِ﴾ {رَوَاهُ البُخَارِيُّ برقم: (٤٦١٣)}، واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: سوێندی (لَغْو) ئەوەیە کە کابرا لە ماڵی خۆیدا دەڵێ: نەخێر بەخوا وانییە، وە با بەخوا وابوو، ئاوا سوێندی بەسەر زار دادێ، بێئەوەی کە دڵی لەسەری بچەسپێ، ئەوە باوترین مانای (لَغْو اليَمِينِ) سوێندی سەرزارەکییە.

**دووەم: جۆرەکانی سوێند:**

وشەی (یَمِین) واتە: سوێند، وە لە ئەسڵدا (یَمِین) بە دەستی ڕاست دەگوترێ، بەلاّم بۆچی خوازراوەتەوە بۆ سوێند؟! چونکە عادەتیان وابووە کە بەدەستی ڕاست پەیمانیان لەگەڵ کەسێك بەستوە، وەك بڵێی سوێندیان خواردوە، ئنجا لەوەوە وشەی (یَمِین)یان لە دەستی ڕاستەوە خواستۆتەوە بۆ سوێندیش، وشەی (یَمِین) بە (أءمُن) کۆدەکرێتەوە، وە بە (أَیْمان)یش، وە وشەی (اليَمِين: تُذكّر وتؤنث)، واتە: بە (مُؤنّث)یش دێ، لە زمانی عەرەبیدا (المُؤنّث المَجَازِي)، بە (مُذَكَّر)یش دێت، دەگونجێ بگوترێ: (هَذَا يَمِينٌ)، وە (هَذِهِ يَمِين).

(القُرطُبي) لە (الجامع لأحكام القُرآن)[1]دا، دەڵێ: جۆرەکانی سوێند چوارن، (جا من قسەکەی ئەو دێنم، بەلاّم من پێمووایە جۆرەکانی سوێند پێنجن)، دەڵێ: (الأَيْمَانُ فِي الشَّرِيعَةِ عَلَى أَرْبَعَةِ أَقْسَامٍ: قِسْمَانِ فِيهِمَا الكَفَّارَةُ، الرَّجُلُ الَّذِي يَحْلِفُ وَاللهِ لا أَفْعَلُ كَذَا وَكَذَا، فَيَفْعَلُ، وَالرَّجُلُ يَقُولُ: وَاللهِ لأَفْعَلَنَّ كَذَا وَكَذَا، فَلاَ يَفْعَلْ، وَقِسْمَانِ لَيْسَ فِيهِمَا كَفَّارَة، الرَّجُلُ يَحْلِفُ وَاللهِ مَا فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا، وَقَدْ فَعَلَ، وَالرَّجُلُ يَحْلِفُ لَقَدْ فَعَلْتُ كَذَا وَكَذَا وَلَمْ يَفْعَلْهُ) واتە: لە شەریعەتدا

---

١) ج٦، ص١٣١ ـ ١٣٢.

ســـوێند چـوار جـۆرە: دوو جۆریـــان کـەفارەتیان لەسـەرە (بـە یەکدەنگـیی هـەموو زانـایان، ئەو دوو جۆرە کە کەفارەتیان لەســەرە) ئەوەیـە کـە پیـاوێك سـوێند بخـوا بڵــێ: بـە خـوا ئـاواو ئـاوا ناکــەم، ئـەو شــتە ناکـەم، دوایـی بیکـات (بـۆ وێنـە: بڵـێ سـەردانی فلان کەس ناکەم، دوایـی سـەردانی بکـات، ئـەوە دیـارە کـەفارەتی دەکەوێتـە سـەر بەپێچــەوانەوە) وە پیـاوێك ســوێند بخـوا بڵــێ: بەخـوا وادەکــەمو وادەکـەم، دوایـی وانەکــات (بـۆ وێنـە: بڵــێ: دەچمــە فـلان شــوێن، دوایـی نەچـێ، ئــەوە سـوێندەکەی نەهێناوەتـە جـێ، واتـە دەبـێ کەفارەت بـدات) وە ئـەو دوو جـۆرەی کـە کــەفارەتیان تێدانیـــە ئەوەیــە کــە ســوێند بخـوا، بڵــێ ئــەو شـــتەم نــەکردوە، کردبێتیشـی، یـاخود بڵـێ ئەوشـتەم کـردووەو نـەیکردبێ، بـەلاّم پێیـوابـێ کـە راسـتی کـردوە، ئەگەرنـا ئەگـەر کەسـێك نکووڵــیی لـە شـتێك بکـاو کردبێتـی، یـاخود بـە نکووڵـیی بڵــێ: شـتێکی کـردووەو نـەیکردبێ، بـۆ هـەق کردنـە ناهـەقو ناهـەق کردنـە هـەق، ئـەوە جـۆری پێنجـەمی سـوێندەکەیە پێـی دەگـوترێ (الـيَمين الغمـوس) واتـا سـوێندی نقـوومکەر، لەبەرئـەوەی خاوەنەکـەی لە گونـاحـدا نقووم دەکـات.

جـا (القـرطبي) دەڵـێ: (وَاليَمِينَـانِ الأَوليَـانِ فَـلاَ اخْتِلاَفَ فِيهِمَـا بَيْنَ العُلَمَـاءِ أنَّ فِيهِمَا كَفَّارَة) ئەو دوو ســوێندەی یەکـەم، ئـەوە دیارە کەسێك سوێند بخـواو بڵـێ: وادەکـەم، دوایـی وای بـۆ نـەکرێ، یـان بڵــێ: واناکـەم دوایـی وابکـات، دیـارە کـەفارەتی دەکەوێتــە ســەرێ بەیەکدەنگیی هـــەموو زانایــان، بــەلاّم دوو ســـوێندەکەی دوایـی، زانایـــان تێیـــاندا کەوتوونـــە راجیـــایی، زۆربـــەیان کـــە (مَـالِـك وسُـفيان الثَـوري وأَصْحَاب الرَأي، وَأَحْمَد وأَبو عُبيد)ن، دەڵێـــن (فَإِنْ كَـانَ الحَـالِفُ حَلَفَ عَلَـى أَنَّـهُ لَمْ يَفْعَل كَذَا وَكَذَا، أَوْ أَنَّهُ قَدْ فَعَلَ كَذَا وَكَذَا عِنْدَ نَفْسِـهِ صَادِقًا يَرَى أَنَّهُ عَلَى مَـا حَلَـفَ عَلَيْـهِ، فَلاَ إِثْم عَلَيْـهِ وَلا كَفَّـارَةَ عَلَيْـهِ) ئەگــەر ئـەو کەسـەی ســـوێندی خـواردوە لە دڵی خۆیـدا خۆی بەراسـت بزانــێو ســوێندی لەســەر بخـوا، جا چ بـە باری کردندا بڵــێ وامکــردوە، دوایی واش نەبووبــێ، چ بڵــێ وام نـەکردووەو لـە بیـری چـووبێ، واشـیکردبێ، ئــەوە لەسـەر رای زۆربـەی زانایـان دەچـێتە بازنــەی جـۆری ســوێندی (لغـو)ەوەو نـە کەفـارەتی لەسـەرە، نـە گونـاهی لەسـەرە، بـەلاّم شـافيعيی رەحمەتی خـوای لێبــێ، دەڵێ با پێشـی وابـێ راسـت دەکـات لـە نـەفی کـردن، یـاخود

لـە ئیسـپات كردنـدا، مـادام سـوێندی لەسـەر خـوارد، گونـاهی ناگاتـیێ، چونكـە پێـیـوابووە ڕاسـت دەكـات، بـەڵام كەفـارەتی لەسـەرە.

(المِرْوَزِي) یەكێكـە لە زانـایان دەڵـێ: (وَلَيْسَ قَول الشـافِعِي فـي هَذَا بِالقَـوِيِّ) واتە: قسـەی شافیعیی لێرەدا بـەهێز نیـە، ئـەوە هـەمووی (قُرطُبي) لـە سـەرچـاوەی ئاماژەپێكــراودا هێنـاوەتیو منـیش ڕای زۆربـەم پـێ ڕاسـتە، كـە نابـێ كـەفارەتی لەسـەربێ.

**سـێیـەم: سـوێندی نقـومكـەر(الـيمين الغمـوس):**

دەڵـێ: (سُـمِّيَت غَمُوسَـاً لأَنَّهَا تَغْمِـسُ صَـاحِبَهَا فِـي النَّـار) بۆیـە پێـی دەگـوترێ (اليَمِين الغموس) واتـە: سـوێندی نقوومكـەر[1]، یان نغرۆكەر، چونكە خاوەنەكەی لـە ئـاگردا نقـووم دەكـات، ئەوەنـدە گوناهەكـەی گەورەیـە، ئـەوەش بریتیـە لەچـی؟ (القـرطبي) ئەویشـی پێناسـە كـردوە، هەرچـەندە نەیخسـتۆتە نێـو چـوار بەشـەكان، دەڵـێ: (وَإِنْ كَـانَ الحَـالِـفُ عَلَـى أَنَّـهُ لَـمْ يَفْعَـلْ كَـذَا وَكَـذَا، وَقَـدْ فَعَـلَ مُتَعَمِّـدَاً للكَذِب، فَهُوَ آثِـمٌ وَلا كَـفَّارَة عَلَيْهِ فِي قَوْلِ عَامَّةِ العُلَمَاء: مَالِـك وَسُفيان الثَـوري وَأَصْـحَاب الـرَأي وَأَحْمَـد بْـن حَنْبَـل وَأَبِـي ثَـور وَأَبِـي عُبَيـد، وَكَـانَ الشـافِعِي يَقُـول يُكَفِّر) (الجامع لأحكام القُرآن)[2] واتە: ئەگـەر ئـەو كەسـەی سوێند دەخـوا كـە وای نـەكردوە كردبێشـیتی، جا ئـەو جۆرەكـەی دیكـەی نـەهێناوە كـە بریتیـە لـەوەی شـتێكی نەكردبـێ، بـەڵام بـە ئانقەسـت سـوێند بخـوا كـە كردوویـەتیو درۆ بكا، (واتـە: بزانـێ كردوویـەتیو ئینكـاریی لـێ بكـات، یـان بزانـێ نـەیكردوەو ئیسـپاتی بكـات) ئەوە گوناهبـارە، وە كەفارەتیشـی لەسـەر نیە لـە لای زۆربـەی زانایـان...

جێـی پرسـیارە: مادام گوناهبـارە بۆچـی كەفارەتی لەسـەر نیـە؟ بـەڵام شـافیعیی دەڵـێ: گوناهباریشـەو دەبـێ كەفـارەتیش بـدات، ئەوانـەی كـە دەڵـێن: كـەفارەتی لەسـەر نیـە كـە دوایـی چـەند فەرموودەیـەكی پێغەمبـەر ﷺ دێـنین، دەڵـێن: لەبەرئەوەیە گوناهەكەی هێنـدە گەورەیـە بـە كەفـارەتو شـتی وا لاناچـێ! منـیش

[1] نوقم، یان نقـووم، هەردووكیان بەكـاردێن.
[2] ج٦، ص٢٣١.

ئەو ڕایەم بە دڵەو پێم ڕاستە، چونكە هەر كەسێك ڕاست بۆوە سوێندێكی بە درۆ بخوات، بۆ ئەوەی هەقێك بكات بە ناهەق، ناهەقێك بكاتە هەق و شایەدییەكی درۆ بۆ كەسێك بدات، دوایی بڵێ كەفارەت دەدەم و گوناهەكەی لەسەر لابچێ، ئەوە دەكاتە خەڵك هاندان لەسەر سوێندی درۆ و شایەدیدانی بە درۆ.

(إبْنُ العَرَبِي) لە (أحكام القرآن)دا قسەیەكی جوان دەكات، كە (القُرطُبي) لێی دەخوازێتەوە لە تەفسیرەكەی خۆیدا، دەڵێ: (أنَّ الآيَةَ وَرَدَتْ بِقِسْمَيْنِ: لَغْوٌ، وَمُنْعَقِدَةٌ، خَرَجَتْ عَلَى الْغَالِبِ فِي أَيْمَانِ النَّاسِ، فَأَمَّا الْيَمِينُ الْغَمُوسُ فَلا يَرْضَى بِهَا ذُو دِينٍ أَوْ مُرُوءَةٍ، وَيُحِلُّ الإِشْكَالَ أَيْضًا أَنَّ اللهَ سُبْحَانَهُ عَلَّقَ الْكَفَّارَةَ عَلَى قِسْمَيْ الْيَمِينِ الْمُنْعَقِدَةِ، فَدَعْ مَا بَعْدَهَا يَكُونُ مِائَةَ قِسْمٍ فَإِنَّهُ لَمْ تُعَلَّقْ عَلَيْهِ كَفَّارَةٌ)، واتە: ئەو ئایەتە دوو جۆرە سوێندی تێدا هاتوە: سوێندی (لَغْو)، وە سوێندی دامەزراندن، وە سوێندی خەڵك لەو دوو جۆرەیە: یان سوێندی (لغو)یە یاخود سوێندێكی دامەزراوە، دەڵێ: چونكە خوای پەروەردگار كەفارەتی تەنیا لەسەر سوێندی دامەزراو داناوەو، فەرموویەتی سوێندی (لَغْو) كەفارەتی ناوێ، با ئەوی دیكە سەد جۆریش بێ، تەنیا دابەش دەبێتەوە بۆ ئەو دوو جۆرە، یان سوێندی دڵ لەسەر چەسپێنراوە، یاخود سوێندێكی سەرزارەكییە، بەلام سوێندی (غموس) هیچ جوامێرێك پێی ڕازی نیە.

لەبارەی سوێندی (غموس)ەوە ئەم فەرموودەیە دێنین: ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ جَاءَ أَعْرَابِيٌّ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللهِ! مَا الْكَبَائِرُ؟ قَالَ: الإِشْرَاكُ بِاللهِ، قَالَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: ثُمَّ عُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ، قَالَ: ثُمَّ مَاذَا؟ قَالَ: الْيَمِينُ الْغَمُوسُ، قُلْتُ: وَمَا الْيَمِينُ الْغَمُوسُ؟ قَالَ: الَّذِي يَقْتَطِعُ مَالَ امْرِئٍ مُسْلِمٍ هُوَ فِيهَا كَاذِبٌ﴾ {رَوَاهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٦٩٢٠)، وَالتِّرمِذِي برقم: (٣٠٢١)}، واتە: عەبدوڵلای كوڕی عەمری كوڕی عاص خوا لە خۆیی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: كابرایەكی عەرەبی خێڵەكیی دەشتەكیی هاتە لای پێغەمبەر ﷺ گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا ! گوناهە زۆر گەورەكان كامانەن؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان، گوتی: دوای ئەوە چیدیكە؟ فەرمووی: ئێشاندنی دڵی دایك و باب، گوتی: دوای ئەوە چیدیكە؟ فەرمووی: سوێندی غەمووس، سوێندی

نقوومکەر، گوتم: (دیارە عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لە کۆڕەکەدا بووە)، سوێندی غەمووس چییە؟ فەرمووی: ئەو سوێندەیە کە کەسێك ماڵی مسوڵمانێکی بۆخۆی پێدادەبڕێ‌و درۆش دەکات لە سوێندەکەیدا.

لە فەرموودەیەکی دیکەیدا پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: ﴿مَن اقْتَطَعَ حَقَّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ بِيَمِينِهِ، فَقَدْ أَوْجَبَ اللهُ لَهُ النَّارَ، وحَرَّمَ عَلَيْهِ الْجَنَّةَ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ: وَإِنْ كَانَ شَيْئًا يَسِيرًا يَا رَسُولَ اللهِ؟ قَالَ: وَإِنْ قَضِيبٌ مِنْ أَرَاكٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٢٢٢٩٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٥١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٤١٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢٣٢٤)، وَالدَّارَمِيُّ برقم: (٢٦٠٣)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (٧٩٧)، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ الْحَارِثِيِّ رضي الله عنه}، واتە: هەر کەسێك ماڵی ئینسانێکی مسوڵمان بە سوێندی خۆی بۆخۆی دابڕێ، (واتە: سوێندی بە درۆ) ئەوە خوا ئاگری بۆ پێویست کردوە، وە بەهەشتیشی لێ قەدەغە کردوە، (چەند هەڕەشەیەکی گەورەیە!)، پیاوێك گوتی: ئەگەر شتێکی کەمیش بێ، ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ فەرمووی، سیواکێکیش بێ (سیواکێك لە داری ئەراك)، یاخود با چڵەدارێکیش بێ.

**چوارەم: سوێندی دڵ لەسەر دامەزراو (اليمين المنعقدة) بریتیە لەچی؟**

(قُرطُبِي) ئاوا پێناسەکەی هێناوە، دەڵێ: (الیَمِینُ المُنْعَقِدَةُ مُنْفَعِلَةٌ مِنَ العَقْدِ، وَهِيَ عَقْدُ القَلْبِ فِي المُسْتَقْبَلِ أَلاَّ يَفْعَلَ فَفَعَلَ؛ أَوْ لَيفعَلَنَّ فَلا يَفْعَل، فَهَذِهِ الَّتِي يُحِلّهَا الإِسْتِثْنَاءُ وَالكَفَّارَة)، واتە: سوێندی دامەزراو، وشەی (مُنْعَقِدَة) (إِنْفَعَال)ە، لە (عَقْد) واتە: گرێدان گرێبەست، ئەویش ئەوەیە کە دڵی خۆی لە داهاتوودا بچەسپێنێ لەسەر شتێك کە ئەو شتە نەکات، دوایی بیکات، یاخود دڵی بچەسپێنێ ئەو شتە بکات، دوایی نەیکات، ئەو جۆرە سوێندە ئەوە حەڵاڵی دەکاتەوە (مەبەستی لە حەڵاڵ کردن، یانی ئەوەی ئەو گوناهە لە کۆڵ ئینسان دەکاتەوە، کە یان دەبێ هەڵاواردن (إستثناء)ی تێدا بکات، بە گوتنی (إن شاء الله) یان دوایی دەبێ کەفارەتی لەسەر بدات.

(إستثناء) واتە: هەڵاواردن کە دوایی باسی دەکەم، ئەوە چۆن دەکرێ؟ گرنگ ئەوەیە بەو دووە، گوناهی سوێندەکەی لەسەر نامێنێ: یان لە میانەی

سـوێندەکەیدا هـەڵاواردنی تێدا بکات، کە بریتیـە لـە گـوتنی (إن شاء اللّه)، یان ئەوەتا دەبێ دوای سوێندەکە کەفارەت بدات، ئەگەرنا گوناهبـارە.

کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ﴾، وشـەی: (عَقَّدْتُم) بە سێ (قِراءة) خوێندراوەتەوە، (عَقَدْتُم) و (عَاقَدْتُم) و (عَقَدْتُم) بەبێ شـەددە، هەر سێکی یەك مانـایە، واتـە: گرێتـان دابـێ، دڵتان لەسەر چەسپاندبێ، کە دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ ٱلْأَيْمَٰنَ﴾، واتە: خوا سزاتان دەدات بە هـۆی ئەو سوێندانەوە کە دڵتان لەسەر چەسپاندوون، یانی: ئەگەر جێبەجێتـان نەکـردن، هەرچـەندە خـوای پـەروەردگار نەیفـەرمووە: ئەگـەر سوێندەکانتـان جێبـەجێ نـەکردن (إذا حَنِثْتُم فِيها) ئەگـەرنا ئەگـەر سوێندەکە جێبـەجێ بکـات گوناهبـار نابـێ، کەسێك سوێند دەخـوا دەڵێ: بـەیانی بەسـەفەر دەچم، دوایی بە سـەفەر دەچێ، ئەوە دیارە دڵیشـی لەسەر چەسپاندوە، بـەڵام ئایا خـوا موحاسـەبەی دەکـات؟ نەخێـر، بۆچی؟ چونکە ئـەوەی کـە سـوێندی لەسەر خـواردوە، سـوێند لەسـەر خوراوەکـەی جێبـەجێ کـردوە، بـەڵام ئەگـەر سـوێند لەسـەر خوراوەکـە جێبـەجێ نـەکرا، ئـەو کاتـە پێـی دەگـوترێ (حَنِثَ فِي يَمِينِهِ) واتـە: سـوێندەکەی جێبـەجێ نـەکردو دەبـێ کـەفارەت بـدات، یـان دەبـێ لەمیانـەی سـوێندەکەیدا (إسـتثناء)ی کردبێ، واتە: گوتبێـتی: (إن شاء اللّه)، بۆ وێنە کەسـێك دەڵـێ: سوێند بە خـوا (إن شاء اللّه) بەیانی بـە سـەفەر دەچم، ئەگەر وای گوتبـێ، یـان سوێند بـە خـوا (إن شـاء اللّه) ئـاوا دەکـەم، ئەگـەر دوایـی بـۆی نەکـرا، مـادام (إسـتثناء)ی تێخسـتوە، کەواتە: گوناهبـار نیـە.

پێغـەمبەر ﷺ لـە فەرمایشـتێکدا دەربـارەی ئـەوە کە ئەگەر ئینسـان سـوێندی لەسەر شتێك خـواردو دوایی تەماشای کرد نـەکردنی شـتەکە باشـترە لـە کردنـی، پێویسـتە کەفارەت بدات، لەوبارەوە فەرموویـەتی: ﴿إنِّي وَاللّهِ إنْ شَـاءَ اللّهُ لا أَحْلِفُ عَلَـى يَمِـينٍ فَـأَرَى غَيْرَهَـا خَيْـرًا مِنْـهَا، إلاَّ أَتَيْـتُ الَّـذِي هُـوَ خَيْـرٌ وَكَفَّـرْتُ يَمِينِـي﴾{أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ بـرقم: (٦٦٢٣)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٤٢٣٩)، وَأَبُـو دَاوُدَ بـرقم: (٣٢٧٦)، وَابْنُ مَـاجَهْ برقم: (٢١٠٧) عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه}، واتە: من سـوێند بـە خـوا

(پێغەمبەر ﷺ سوێندیش دەخوا)، ئەگەر خوا بیەوێ، هیچ سوێندێك ناخۆم لەسەر شتێك، بەڵام تەماشا بکەمو ئەوەی سوێندم لێ خواردوە (بیکەم یان نەیکەم) باشترە (بۆ وێنە: سوێندی خواردوە قسە لەگەڵ فلان کەس نەکات، بەڵام قسە کردنەکە باشتر بێ) ئەوە ئەوەی کە سوێندم لەسەر خواردوە نەیکەم، دەیکەم، وە دوایی بۆ سوێندەکەشم کەفارەت دەدەم، ئەوە بەنسبەت خۆی.

بەنسبەت گشتیش دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَلَفَ عَلَى يَمِينٍ فَرَأَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا فَلْيَأْتِ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ وَلْيُكَفِّرْ عَنْ يَمِينِهِ﴾ {أخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٨٧١٩)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٢٤١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٣٠) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٣٤٩)، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه}، واته: هەر كەسێك سوێندی خوارد لەسەر شتێك، دوایی تەماشای کرد غەیری ئەوە باشترە، با ئەوەی کە بە چاکی دەزانێ بیکاتو، کەفارەتی سوێندەکەی بدات.

دیارە سەرەتای سورەتی (التحريم)یش ئەگەر تەمەن باقی بێ إن شاء الله دەیگەینێ، لەوبارەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَۖ تَبۡتَغِي مَرۡضَاتَ أَزۡوَٰجِكَۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ١ قَدۡ فَرَضَ ٱللَّهُ لَكُمۡ تَحِلَّةَ أَيۡمَٰنِكُمۡۚ وَٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡحَكِيمُ ٢ ﴾، (ئەوەش دیارە بەسەرهاتێکی هەبووە: پێغەمبەر ﷺ سوێند دەخوا نەچێتە لای ماریەی قیبطیی کە کەنیزەیەکی بووە، لەبەرئەوەی هەندێك لە خێزانەکانی لەوبارەوە گلەیی لێ دەکەن، یاخود خواردنێکی لە لای یەکێ لە خێزانەکانی خواردوە، ئەوانی دیکە پێی هەستیار بوون، ئەویش سوێندی خواردوە جارێکی دیکە ئەو خواردنە نەخواتەوە، هەردوو ڕیوایەتەکان هەن)[1]،

١) یەکەمیان: ﴿عن أنس بن مالك أن رسول الله ﷺ كانت له أَمَةٌ يَطَؤُها، فلم تَزَلْ به عائشة و حفْصة حتى حَرَّمَها على نفسه، فأنزل الله عزّ وجلّ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ لِمَ تُحَرِّمُ مَآ أَحَلَّ ٱللَّهُ لَكَ... ١﴾ التحريم . أخرجه النسائي في التفسير: ٦٢٧، وصححه الحاكم و وافقه الذهبي.

دووەمیان: ﴿عن عائشة قالت: كان رسول الله ﷺ يَشْرَبُ عَسَلاً عند زينب ابنة جحش

واتە: (خوا دەفەرموێ:) ئەی پێغەمبەر! بۆچی شتێك كە خوا بۆی حەڵاڵ كردووی، قەدەغەی دەكەی؟ بۆئەوەی كە هاوسەرەكانت لە خۆت ڕازی بكەی، (دیارە هاوسەرو ژن زەختو فشاری هەیە لەسەر پیاو، ئەگەر پێغەمبەری خواش ﷺ بێت)، وە خوا لێبووردەی بە بەزەیی یە ﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ وَاللَّهُ مَوْلَاكُمْ وَهُوَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ ②﴾، لە ڕابردوودا كەفارەت،،ی سوێندی بۆ دیاری كردوون، وە خوا سەرپەرشتیارتانەو خوا زانای كاربەجێیە.

(عبدالرحمن بن ناصر السعدي) دەڵێ: (هَذَا عِتَابٌ مِنَ اللهِ لِنَبِيِّهِ مُحَمَّدٍ ﷺ، حِينَ حَرَّمَ عَلَى نَفْسِهِ سَرِيَّتَهُ "مَارِيَة" أَوْ شُرْبَ العَسَلِ، مُرَاعَاةً لِخَاطِرِ بَعْضِ زَوْجَاتِهِ، ﴿قَدْ فَرَضَ اللَّهُ لَكُمْ تَحِلَّةَ أَيْمَانِكُمْ﴾، أَي: قَدْ شَرَعَ لَكُمْ، وَقَدَّرَ مَا بِهِ تَنحَلّ أَيْمَانكُمْ قَبْلَ الحِنْثِ، وَمَا بِهِ الكَفَّارَة، بَعْدَ الحِنْث)[1]، واتە: ئەمە گلەیی كردنێكە لە خواوە بۆ پێغەمبەرەكەی، موحەممەد ﷺ كاتێك ماریەی كەنیزەكەكەی خۆی لەخۆی قەدەغە كرد، یاخود خواردنەوەی هەنگوینی لەخۆی قەدەغە كرد، بۆئەوەی هەندێك لە هاوسەرەكانی ڕازی بكاتو دڵیان چاك بكاتەوە، مەبەست ئەوەیە لە ڕابردوودا لە شەریعەتی خۆیدا بۆی داناون، ئەوەی كە سوێندەكانتانی پێ هەڵدەوەشێتەوە، پێش ئەوەی سوێندتان لێ بكەوێ، یاخود ئەوەی كە دەبێتە كەفارەت دوای ئەوەی كە سوێندتان لێ كەوتوە، (چونكە ئینسان دەگونجێ كەفارەتەكە بدا پێش ئەوەی شتەكە بكات، دەگونجێ شتەكە بكاو دوایی كەفارەتەكە بدات).

## پێنجەم: سوێند پێخوراو (الْمَحْلُوفُ بِهِ) چییە؟

هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كە سوێندی پێخوراو تەنیا خواو ناوو سیفەتە هەرە پەسەندەكانی، تەنیا ئیمام ئەحمەد لەبارەی ڕەوایی سوێند

---

ویمكث عندها، فوأطأت أنا و حفصة عن أيَّتنا دخل عليها فَلْتُقل له: أكلت مَغافير...﴾ رواه البخاري: ٤٩١٢، و مسلم: ١٤٧٤.

١) تيسير الكريم الرحمن، ص ٨٧٢.

خواردن بە پێغەمبەرەوە قسەیەکی هەیە، هەڵبەتە خەڵکی دیکەی ئەهلی بیدعەتو لادەر هەن، کە سوێندیان بە غەیری خوا پێ ڕەوایە، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی کە بەڵگە شەرعییەکان دەیگەیەنن، ئەوەیە کە سوێند بە غەیری خواو سیفەتەکانی دروست نیە، لەوبارەوەش بەڵگە زۆرن:

١) ﴿إِنَّ جِبْرِيلَ لما نَظَرَ إِلى الجَنَّةِ، وَرَجَعَ إِلى اللهِ، فَقَالَ: وَعِزَّتِكَ لا يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ إِلا دَخَلَهَا، وَكَذَلِكَ قَالَ فِي النَّارِ: لا يَسْمَعُ بِهَا أَحَدٌ فَيَدخلُها﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٨٦٣٣) تَعليق شُعيب الأرنؤوط: إِسْنَادُهُ حَسَنٌ، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٧٤٤)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٥٦٠) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٣٧٦٣)، وَالحَاكِمُ بِرقم: (٧٢)، وَالبَيْهَقِي في (شعب الإيمان) بِرقم: (٣٨٤) قَالَ الشيخ الأَلباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ} ، واتە: پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ: کاتێك جبریل تەماشای بەهەشتی کرد، دوایی گەڕایەوە لای خوای بەرز، گوتی: سوێند بە عیززەتی تۆ هەر کەسێك ناوو وەسفی بەهەشت بیستێ دەچێتە نێوی (یانی: مادام ئیمانی پێ بێ، کارێکی وادەکات بچێتە نێوی، بۆئەوەی چاك تێبگەین لە فەرمایشتەکان، مەبەستی پێ ئەوەیە، نەك هەر کەسێك وەسفی بەهەشتی بیست، حەتمەن بچێتە بەهەشتێ)، دوایی جبریل کە تەماشای ئاگری دۆزەخی کرد، گوتی: بە عیززەتی تۆ هیچ کەس دەنگو باسی جەهەننەم نابیستێ، بچێتە نێوی، (واتە: کارێکی وادەکات کە نەچێتە نێو دۆزەخەوەو ئەو کردەوانەی کە بە دۆزەخی دەگەیەنن، خۆی لێیان بە دوور دەگرێ)، کەواتە: لێرەدا جبریل سوێندی بە عیززەتی خوا خواردوە کە سیفەتی خوایە.

٢) ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: أَكْثَرُ مَا كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ يَحْلِفُ بِهَذِهِ الْيَمِينِ: (لاَ وَمُقَلِّبِ الْقُلُوبِ)﴾ {رَوَاهُ أَحْمَد بِرقم: (٤٧٨٨)، وَالْبُخَارِيُّ بِرقم: (٦٦١٧)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٣٢٦٢) وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٤٣٣٢)} ، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: زۆربەی جار پێغەمبەری خوا ﷺ ئاوا بەو شێوەیە سوێندی دەخوارد، نەخێر (ئەو شتە وانیە)، سوێند بە هەڵگێڕەرەوەی دڵان، یاخود {لا ومُصَرِّفِ الْقُلُوبِ} ، واتە: لادەری دڵان، ئەوە (النسائي) هێناویەتیو ئەلبانیی بە (صحیح)ی داناوە لە (صحیح سنن

النسائي)دا واتە: ئەو شتە وانیە سوێند بەو كەسەی كە دڵان لادەدا، یاخود هەڵگێڕو وەرگێڕیان دەكات.

ئنجا (القُرطُبي) لە (الجامع لأحكام القُرآن)[1] دەڵێ: (لا تَنْعَقدُ اليَمينُ بغير اللهِ تَعَالى وَأَسْمَائِهِ وَصِفَاتِهِ، وَقَالَ أَحْمَد بْن حنبل: إِذَا حَلَفَ بالنَّبِي ﷺ انعقدتْ يَمينه؛ لأَنَّهُ حلف بمَا لا يَتم الإِيْمَان إِلاَّ بِهِ، فَتلزمه الكَفَّارَة كمَا لَو حلف بالله، وَهَذَا يرده ما ثَبَتَ في الصَّحيحَين وَغيرهمَا عَنْ رَسُول الله ﷺ أَنَّهُ أَدْرَك عُمَر بن الخَطَّاب في ركب وعمر يحلف بأبيه، فَنَادَاهُم رَسُول الله ﷺ: أَلا إِنَّ اَللّه يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاَللّهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ) واتە: سوێند دانامەزرێ‌و سوێند ناخورێ بە خوای بەرزو ناوەكانی‌و سیفەتەكانی نەبێ، ئیمام ئەحمەد گوتوویەتی: ئەگەر سوێند بە پێغەمبەر ﷺ بخوات سوێندەكەی دادەمەزرێ، چونكە سوێندی بە شتێك خواردوە تا ئیمانی بەو نەبێ، بە ئیماندار لە قەڵەم نادرێ، كە ئیمان بە پێغەمبەرە ﷺ، بۆیە كەفارەتی دەكەوێتە سەر، وەك چۆن كەسێك سوێند بە خوا بخوا كەفارەتی دەكەوێتە سەر، سوێند بە پێغەمبەریش ﷺ بخوا، كەفارەتی دەكەوێتە سەر، {ئێوە ئەو شتانە بزانن باشە، بۆئەوەی ئەگەر دەروێشێك، سۆفییەك، عەوامێكتان بینی، گوتی: بە پێغەمبەر، یەكسەر نەڵێن كافر بووی! ئەوەتا ئیمام ئەحمەد دەڵێ: ئەگەر سوێند بە پێغەمبەر بخوا ﷺ بەڵام بەو نیەتە كە ئیمان بە پێغەمبەر بەشێكە لە ئیمان، سوێندەكەی دادەمەزرێ، بەڵام دیارە من پێموایە ئیمام ئەحمەد لەوەدا نەیپێكاوە، وە قسەكەی (قرطبي) زۆر جوانە كە بەرپەرچی قسەكەی ئیمام ئەحمەد دەداتەوەو دەڵێ:} كە لە صەحیحی بوخاریی‌و موسلیم‌و غەیری ئەوانیشدا هاتوە، كە پێغەمبەر ﷺ گوێی لێبوو لە عومەری كوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێ لەگەڵ كاروانێك بوون، (ئایا لە جەنگێك بوون، لە سەفەرێك بوون، گوێی لێ بوو) سوێندی بە بابی دەخوارد (وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێن: بە سەری بابم، بە قەبری فلان كەس)، پێغەمبەر ﷺ بانگی كردن، فەرمووی: ﴿أَلا إِنَّ اَللّهَ يَنْهَاكُمْ أَنْ تَحْلِفُوا

---

١) ج٦، ص١٣٦.

بِآبَائِكُمْ، فَمَنْ كَانَ حَالِفاً فَلْيَحْلِفْ بِاللهِ، أَوْ لِيَصْمُتْ﴾ {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ: البُخَارِيُّ بِرقم: (٦٦٤٦)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٦٤٦) عَنْ اِبْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا}، واتە: ئاگاداربن خوا لێتان قەدەغە دەكات سوێند بە باباتان بخۆن، هەر كەسێك سوێند دەخوا، با سوێند بە خوا بخوا، ئەگەرنا بێدەنگ بێ.

كەواتە: ئەو قسەیەی ئیمام ئەحمەد بەسەریدا دەدرێتەوە، چونكە لەگەڵ فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ تێكدەگیرێ، وە ئەوە كە ئیمان بە پێغەمبەر ﷺ بەشێكە لە ئیمان، مانای وانیە دروستە سوێندی پێ بخورێ، ئەگەرنا ئیمان بەوەش كە كەعبە قیبلەی مسوڵمانانە، هەر فەرزە، وە ئیمان بە فریشتەكانیش فەرزە، ئنجا ئایا سوێند بە كەعبەو فریشتەكان دەخورێ؟ یان ئایا سوێند بە بەهەشتو بە دۆزەخ دەخورێ، لەبەرئەوەی واجبە ئیمانمان پێیان هەبێ؟ نەخێر، بۆیە (قُرطُبي) دەڵێ: (وَهَذَا حَصْرٌ فِي عَدَمِ الحلِفِ بِكُلِّ شَيءٍ سِوَى اللهِ تَعَالَى وَأَسْمَائِهِ وَصِفَاتِهِ كَمَا ذَكَرْنَا) قسەیەكی جوانە دەڵێ: ئەوە كورتهەڵهێنان (حصر)ە لەوەدا كە دەبێ سوێند بە هیچ شتێك نەخورێ، جگە لە خوای بەرزو ناوەكانیو سیفەتەكانی وەك باسمان كرد.

٣) لە فەرمایشتێكی دیكەدا لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿لا تَحْلِفُوا بِآبَائِكُمْ، وَلا بِأُمَّهَاتِكُمْ، وَلا بِالأَنْدَادِ، وَلا تَحْلِفُوا إِلاَّ بِاللهِ، وَلا تَحْلِفُوا بِاللهِ إِلاَّ وَأَنْتُمْ صَادِقُونَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٣٢٤٨)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٣٧٦٩)، وَالطَّبَرَانِيُّ فِي (الأوسط) بِرقم: (٤٥٧٥)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٤٣٥٧) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الأَلْبَاني فِي (صحيح الجامع) برقم: (٧٢٤٩)} واتە: سوێند بە باوو باپیرانتان، مەخۆن، وە سوێند بە دایكو نەنكتان مەخۆن، وە سوێند بە بتو صەنەمەكان مەخۆن، وە بە هاوبەشەكان كە بۆ خوا دادەنرێن، وە بێجگە لە خوا بە هیچ شتی دیكە سوێند مەخۆن، وە سوێند بە خوا مەخۆن مەگەر ڕاستگۆبن، (واتە: بە درۆ سوێند بە خوا مەخۆن، هەتا هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەگەر ئینسان بە درۆ سوێند بە خوا بخوا، گوناهی كەمترە لەوەی كە بەڕاستی سوێند بە غەیری خوا بخوا.

٤) وە لە فەرمایشتی دیکەدا پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿مَنْ حَلَفَ بِغَيْرِ اللَّهِ فَقَدْ كَفَرَ أَوْ أَشْرَكَ﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٣٥)، عَنْ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (٢٠٤٢)}، واتە: هەر کەسێك سوێند بە غەیری خوا بخوات، ئەوە بە تەئکید کوفری کردوە، یان هاوبەشی بۆ خوا داناوە، کە لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە سیفەتێکی کافران یان هاوبەشدانەرانی تێدایە، مادام سوێندی بە غەیری خوا خواردوە، ئەوە کوفری کردوە، یان شیرکی کردوە، دیارە ئەگەر سوێند خواردنەکەی وابێ ئەو شتە بێنێتە ریزی خواو، بێنێتە ئاستی خوا، ئەو کاتە دیارە ئەوە هەر یەکجاری کافر بووە، یاخود موشریك بووە.

٥) ﴿مَنْ حَلَفَ فَقَالَ فِي حَلِفِهِ: وَاللَّاتِ وَالعُزَّى، فَلْيَقُلْ: لَا إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ. وَمَنْ قَالَ لِصَاحِبِهِ، تَعَالَ أُقَامِرْكَ، فَلْيَتَصَدَّقْ﴾ {مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، البُخَارِيُّ برقم: (٤٨٦٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٢٣٦)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٣٢٤٧)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٥٤٥) عَنْ أَبي هُرَيرَةَ رضي الله عنه}، واتە: هەر کەسێك سوێندی خواردو لە سوێندەکەیدا گوتی: سوێند بە لاتو سوێند بە عوززا، {(اللاَّت)کە (مؤنَّث)ی (إلـه) و (العُزَّى) (مؤنَّث)ی (عزيز)ە، دوو بت بوون، هەر وەك (المَناة)یش (مؤنَّث)ی (مَنان)ە، ئەوانە بت بوون کافرەکانی مەککە دەیانپەرستن، هەر کەسێك سوێندی بە لاتو عوززا خوارد، یان بە هەر شتێکی دیکەش، چونکە مەرج نیە سوێند هەر بە بتو صەنەم بخورێ، بە هەر شتێکی دیکەش سوێند بخورێ، هەر ناشەرعیی یە} کەفارەتەکەی ئەوەیە بڵێ: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه) بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێك نیە {بۆچی؟! چونکە سوێند خواردن بە هەر شتێك، واتە: تۆ ئەو شتەت بردۆتە ریزی خوا، سوێند یانی چی؟ کە تۆ دەڵێی: بە خوا، واتە: خوا ئاگادارە کە من ئەو شتەم کردوە، یان نەمکردوە، وە من خوا دەکەمە پاڵپشتی قسەی خۆم، کەواتە: کە سوێند بە هەرشتێکی دیکە دەخۆی، مانای وایە هێناوتەتە ریزی خوای پەروەردگار، بۆیە کەفارەتەکەی ئەوەیە بڵێی: (لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللّه)}، وە هەر کەسێك بە هاوەڵەکەی گوت: وەرە با پێکەوە قومار بکەین، با لە جیاتی ئەو قسەیە خێرێك بکات، ئەوە دەبێتە کەفارەتی ئەو قسەیەی، (چونکە قومارکردن حەرامە).

## شەشەم: ئایا سوێند بە چی هەڵدەوەشێتەوە:

وەختێك ئینسان سوێندێك دەخوا، بەڵام دوایی بە پێویستی دەزانێ ئەوەی سوێندی لەسەر خواردوە، بیکات، ئەوە باشترە کارەکەی بکاتو سوێندەکەی نەکاتە بیانوو و پەرچ (مانع) وەك لە حەدیسەکاندا هاتووە، پێشتر هێنامانن، کە ئەویش بە دوو شێوە دەبێ: یان دەبێ لەمیانەی سوێندەکەدا هەڵاواردن (إستثناء) بکات، یان دەبێ کەفارەتی سوێندەکە بدات.

(القُرطُبي) دەڵێ: (إِذَا انْعَقَدَتِ الْيَمِين حَلَّتها الكَفَّارَةُ أَوِ الإِستِثناء، وَقَالَ ابْنُ العَرَبِي: وَهُوَ مَذْهَبُ فُقَهَاءِ الْأَمْصَار، وَهُوَ الصَّحِيحُ؛ وَشَرطه أَنْ يَكُون مُتَّصِلاً مَنْطُوقًا)[1]، واتە: سوێند کە دامەزرا، یان کەفارەت حەڵاڵی دەکاتەوەو هەڵیدەوەشێنێتەوە، یاخود (إستثناء)، (واتە: هەڵاواردنی تێدا بکەی) (إبن العربي) گوتوویەتی: ئەوە مەزهەبو ڕای شارەزایانی هەموو شارە گەورەکانە، وە هەر ئەوەش ڕاستە، بەڵام مەرجی ئەو هەڵاواردن (إستثناء)ە، ئەوەیە کە پەیوەست بێ بە سوێندەکەوە، وە بێژراویش بێ، (واتە دەنگی پێ بەرز کرابێتەوە، وە بە قسە گوترابێ)، بۆ وێنە: پێغەمبەر ﷺ لێرەدا سوێندی خواردوە، دەفەرموێ: ﴿إِنِّي وَاللَّهِ إِنْ شَاءَ اللَّهُ لاَ أَحْلِفُ عَلَى يَمِينٍ فَأَرَى غَيْرَهَا خَيْرًا مِنْهَا إِلاَّ كَفَّرْتُ عَنْ يَمِينِي، إِلاَّ أَتَيْتُ الَّذِي هُوَ خَيْرٌ وَكَفَّرْتُ يَمِينِي﴾ {أَخْرَجَهُ البُخَارِيُّ بِرقم: (٦٦٢٣)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٤٢٣٩)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٣٢٦٦)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢١٠٧) عَنْ أَبِي مُوسَى رضي الله عنه}، ئەوە سوێندی خواردوە، بەڵام (إستثناء)ی تێدا کردوە، مـن بڵێم سوێند بە خوا (إن شاء الله) بەیانی دەگەڕێمەوە بۆ هەرێم، ئەگەر نەگەڕامەوە (إستثناء)م تێدا کردبوو، گوناهبار نیم، کەفارەتیشم ناکەوێتە سەرێ، ئەو (إستثناء)ە دیارە دەبێ لەگەڵ سوێند خوردنەکە بێ، هەڵبەتە ڕایەکی دیکەی زانایان هەیە دەڵێ: دوای ساڵێکیش بۆی هەیە هەڵاواردن (إستثناء) بکات، دیارە ئەو قسەیە پاڵ دەدرێتە لای (ابْنُ عَبَّاس)، بەڵام بێگومان ئەوە ڕاست نیە، کابرا ئێستا سوێندی خواردو دوای

---

١) الجامع لأحكام القرآن ج٦ ص٢٣٨.

ساڵێك گوتی: (إن شاء الله) ئایا ئەوە ڕێی تێدەچێ؟ بە تەئكید ڕێی تێناچێ، وەك دوایی باسی دەكەم، پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە[1] دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَلَفَ فَاسْتَثْنَى فَإِنْ شَاءَ مَضَى وَإِنْ شَاءَ تَرَكَ غَيْرَ حَنِثٍ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٤١٤)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٣٧٩٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٢١٠٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٣٤٢) عَنْ ابْنِ عُمَرَ}، واتە: هەر كەسێك سوێندی خواردو هەڵاواردن (إستثناء)ی تێدا كرد، ئەگەر ویستی با ئیشەكەی خۆی بكاو، ئەگەر ویستیشی با ئیشەكە نەكات، بێئەوەی كە سوێند شكاندنیشی بكەوێتە سەری، واتە: با (إستثناء)شی تێدا كردبێ، دەتوانێ هەر بیكا، وە دەشتوانێ نەیكاتو سەر پشكە (إستثناء)یش، واتە: (إن شاء الله)ی تێدا بڵێ، یان بە كوردی بڵێ: ئەگەر خوا بیەوێ، ئەگەر خوا حەز بكات.

جا لەوبارەوە ئەو (لطیفة)یە دەگێڕینەوە، شتێكی خۆشە كە (القرطبي) هێناویەتی، دەڵێ: (كَانَ أَبُو الْفَضْلِ الْمَرَاغِيُّ يَقْرَأُ بِمَدِينَةِ السَّلامِ، فَكَانَتْ الْكُتُبُ تَأْتِي إِلَيْهِ مِنْ بَلَدِهِ، فَيَضَعُهَا فِي صُنْدُوق، وَلا يَقْرَأُ مِنْهَا وَاحِدًا مَخَافَةَ أَنْ يَطَّلِعَ فِيهَا عَلَى مَا يُزْعِجُهُ أَوْ يَقْطَعُ بِهِ عَنْ طَلَبِهِ، فَلَمَّا كَانَ بَعْدَ خَمْسَةِ أَعْوَامٍ، وَقَضَى غَرَضًا مِنَ الطَّلَبِ، وَعَزَمَ عَلَى الرَّحِيلِ شَدَّ رَحْلَهُ، وَأَبْرَزَ كُتُبَهُ، وَأَخْرَجَ تِلْكَ الرَّسَائِلِ وَقَرَأَ مِنْهَا مَا لَوْ أَنَّ وَاحِدَةً مِنْهَا قَرَأَهَا فِي وَقْتِ وُصُولِهَا مَا تَمَكَّنَ بَعْدَهَا مِنْ تَحْصِيلِ حَرْفٍ مِنَ الْعِلْمِ، فَحَمِدَ اللهَ تَعَالَى، وَرَحَّلَ عَلَى دَابَّتِهِ قِمَاشَهُ، وَخَرَجَ إِلَى بَابِ الْحَلْبَةِ طَرِيقِ خُرَاسَانَ، وَتَقَدَّمَهُ الْكَرِيُّ بِالدَّابَّةِ، وَأَقَامَ هُوَ عَلَى فَامِيٍّ يَبْتَاعُ مِنْهُ سُفْرَتَهُ؛ فَبَيْنَمَا هُوَ يُحَاوِلُ ذَلِكَ مَعَهُ إِذْ سَمِعَهُ يَقُولُ لِفَامِيٍّ آخَرَ: أَمَا سَمِعْتَ الْعَالِمَ يَقُولُ يَعْنِي الْوَاعِظَ: إِنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ يُجَوِّزُ الإِسْتِثْنَاءَ وَلَوْ بَعْدَ سَنَةٍ، لَقَدْ اشْتَغَلَ بَالِي بِذَلِكَ مِنْهُ مُنْذُ سَمِعْته يَقُولُهُ: وَظَلَلْتُ فِيهِ مُتَفَكِّرًا؛ وَلَوْ كَانَ ذَلِكَ صَحِيحًا، لَمَا قَالَ اللهُ تَعَالَى لِأَيُّوبَ: ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْۗ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًاۚ نِّعْمَ ٱلْعَبْدُۖ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ ﴾ص، فلمـــا

١) واتە: لەوبارەوە كە (إستثناء) كردن لە سوێندا، ئەگەر پێكەوە پەیوەست بن، دروستە.

سمعه أبو الفضل قَالَ: هَل مَدينة فاميَّه بهذه الْمَرْتَبَةِ مِنَ العِلْم، أَخْرُجُ عَنْهُ إلَى الْمَرَاغَةِ؟ لا أَفْعَلُهُ أَبَداً؛ وَاقْتَفَى أَثَرَ الْكَرِيِّ، وَحَلَّلَهُ مِنَ الكِرَاءِ، وَصَرَفَ رَحْلَهُ، وَأَقَامَ بِهَا حَتَّى مَاتَ رَحِمَهُ اللّه)[1].

واتە: (أَبُو الْفَضْلِ الْمَرَاغِيُّ) یەکێك بووە لە زانایان (کە ئەوە بەڕاستی زۆر دەرسو عیبرەتی لێ وەردەگیرێ بۆیە نووسیم)، لە مەدینەی سەلام، واتە: (بغداد) دەیخوێند، قوتابی زانستی شەرعیی بووە، (لێرە لەم بەغدایە)[2]، نامەی بۆ دەهاتن لە وڵاتی خۆیەوە لە مەراغەوە، (مەراغە شارێکە لە ئێران لەوێوە نامەی بۆ دەهات)، هەر نامەیەکی بۆ دەهاتن لە صندوقێکدا هەڵی دەگرتو هیچیان نەدەخوێندەوە، لە ترسی ئەوەی نەوەك شتی وای تێدابێ ئەگەر بیخوێنێتەوە، پێی ناڕەحەت ببێتو وە ناچار بێ دەست لە خوێندن هەڵبگرێو لە بەغداوە بگەڕێتەوە بۆ شارەکەی، دوای پێنج ساڵان دوای ئەوەی کە ئەندازەیەکی لە زانست وەدەست هێنا، وە عەزمی جەزم کرد کە بگەڕێتەوە، بارو بنەگەی خۆی پێچایەوە، ئنجا کتێبەکانی هێنایەدەرێ، ئەو نامانەشی هێنایە دەرێو خوێندنیەوە نامەکان شتی وایان تێدابوو، کە ئەگەر یەکێك لە نامەکانی خوێندبایەوە (نەك هەموویان) دوای ئەوەی کە دەگەیشتە بەغدا، نەیدەتوانی هیچ ئەندازەیەك (ئەو دەڵێ پیتێك) لە زانست بخوێنیو دەبووایە یەکسەر بگەڕێتەوە (دیارە هەواڵی وای تێدا بووە، فلان کەسمان مردوە، فلان شتە قەوماوە) ئیدی ستایشی خوای کرد کە نامەکانی نەخوێندۆتەوە، بۆئەوەی خوێندنەکەی لێ تێکنەچێ، وە بارو کەلوپەلەکەی خستە سەر وڵاغێك (قِمَاشَه: واتە: کەلوپەلو شتەکانی) بەرەو دەرگای (الْحَلْبَةِ) (واتە: ڕێی خوراسان، ڕێی ئێران) ڕۆیشت، ئەو کەسەی کە وڵاغەکەی، بارەکەی بۆ لێناوە پێشی کەوت ئەویش لەلای کابرایەکی ڕزق فرۆش (فَامِيٍّ: دەڵێ: ئەوەیە کە خواردن دەفرۆشێ) ڕاوەستا خواردنی ڕێی لێ دەکڕی، لە کاتێکدا خەریك بوو سەودای لەگەڵدا دەکرد، گوێی لێ بوو ئەو کەسەی کە خواردنەکەی لێ دەکڕی، (وەك چۆن بڵێی ئەوانەی عارەبانەو شتیان پێیە، پاقڵە دەفرۆشن، شت دەفرۆشن، خواردنی سەفەریی) بە

---

١) الجامع لأحكام القرآن ج٦ ص٢٤٠.

٢) ئەم دەرسانە لە بەغداد گوتراونەوە.

یەکێکــی دیکــەی دەگــوت: گوێــت لێبــوو ئــەو زانایــە چــی دەگــوت؟! ئــەو ئامۆژگارییــەکەرە دەیگــوت: کــە عەبــدوڵای کــوڕی عــەبباس بــە دروســتی دانــاوە هــەڵاواردن لــە ســوێنددا بکــرێ، ئەگــەر دوای ســاڵێکیش بــێ، (واتــە: ئێســتا کەســێك ســوێندێك دەخــوا دوای ســاڵێکی دیکــە بــۆی هەیــە بڵــێ: (إن شـاء اللّه) ئــەو کاتــە کەفــارەتی ناکەوێتــە ســەری)، گــوتی: لەوکاتــەوە گــوێم لــەو قسەیە بــووە ئــەو زانایــە ئەو قســەیەی کردوە، فکــرم پێــوە مەشــغووڵ بــوو، هــەر فکــرم لــێ دەکــردەوە، ئەگــەر ڕاســت بووایــە، خــوا بــە ئــەییوب پێغەمبــەری نەدەفــەرموو: ﴿ وَخُذْ بِيَدِكَ ضِغْثًا فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا تَحْنَثْ إِنَّا وَجَدْنَٰهُ صَابِرًا نِّعْمَ ٱلْعَبْدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴿٤٤﴾ ﴾ص، واتــە: وە بەدەستی خۆت چەپکە گیایەك بە دەستەوە بگرەو، پێی لە خێزانەکەت بدە، وە ســوێندەکەت مەخــە، (لــە هەنــدێ شوێنەوارانــدا هــاتوە کــە ئــەییووب ﷺ ســوێندی خــواردبوو لەســەر ئــەوەی ڕۆژێــك هاوســەرەکەی جــۆرێ لــە پرتــەو بۆڵــەی کــردوەو نــارەزایی دەربڕیــوە، کــە ئــەییوب هێنــدە نەســاغ بــووەو هــەر خزمــەتی کــردوە، چــاك نەبۆتــەوەو بێــزار بــووە، ئــەییووبیش پێــی ناخــۆش بــووەو ســوێندی لــێ خــواردوە ئەگــەر چــاك ببمــەوە، دەبــێ ســەد قامچیت لێبــدەم، خــوای پــەروەردگاریش بــۆ کەفــارەتی ســوێندەکەی فــەرمووی: سەد چڵــە گیــا بەدەستەوە بگرەو بەو ســەد چڵە گیــایە لێــی بدە، ئەویــش زۆر ئەزیــەتی ناگــاو تــۆش سوێندەکەت لەســەر لادەچــێ) ئــەو خــواردن فرۆشــە بــەوی دیکــەی گــوت: چ شــتێك ڕێــی گرتبــوو لــە خــوای پەروەردگــار کە پێــی بفــەرموێ بڵــێ: (إن شـاء اللّه)، هەرچەندە زۆریشی پــێ چــووە کــە ســوێندەکەت خــواردوە لــە خێزانــت، بــەڵام ئێســتا بڵــێ: (إن شـاء اللّه) ئــەو کاتــە کــەفارەتی ناکەوێتــە ســەر، واتــە: پێویســت ناکــات لێــی بــدەی، کاتێــك (أَبُو الْفَضْلِ الْمَرَاغِـيُّ) قســەی ئــەو کابرایــەی بیســت، کــە لەگــەڵ ئــەو ڕەفیقــەی خۆیــدا قســەی دەکرد، (هەردووکیــان خــواردن فرۆش بوون) گــوتی: لــە شــارێك پاقڵــە فرۆشــەکان، یــان خــواردن فرۆشــەکان ئــەو هــەموو زانســتەیان هــەبێ، وە بــەو شــێوەیە بــن مــن بەجێــی دێڵــەو دەچمــەوە بۆ مەراغــە!! (دیارە مەراغــە ئــەو کــاتە وانەبــووە) قــەد شــتی واناکــەم، وە بــە دوای کــابرای صــاحیب وڵاغ کــەوت، وە ســەودایەکەی لەگــەڵ هەڵوەشــاندەوە، وە لە بەغدا مایــەوە تاکو وەفــاتی کرد.

وەك گـوتم ئـەو بەسـەرهاتە دەرس‌و پەنـدی زۆری لـێ وەردەگیـرێ، ئـەوەش دەگەیـەنـێ کـە ئـەو کـاتە ئـەم بەغدایـە عارەبـانە چییەکانیشـی ئەهلـی عیلـم بوون!!

## حـەوتـەم: کـەفـارەتـی سـوێنـد:

دیارە خـوای پەروەردگـار دەفـەرموێ: ﴿فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ ذَٰلِكَ كَفَّٰرَةُ أَيۡمَٰنِكُمۡ إِذَا حَلَفۡتُمۡ﴾، ئێمـە لـە چـەند خاڵێکـدا باسـی کەفارەتی سوێند دەکەین، ئایەتەکە پێشتـر مانامان کردوە، بەڵام لێـرەش دووبارەی دەکەینـەوە کەفارەت‌و سڕینەوەی ئەو سوێندە کە خـواردووتـە، (بـەڵام بە پێویسـتی دەزانـی کە پێچەوانەکەی بکەی‌و هەڵیبوەشـێنیەوە)، ئەوەیە کە خـواردنی دە نـەدار بدەن لـە خـواردنێکی مـامنێوەنجـیی، کە دەیـدەن بـە مـاڵ‌و منـداڵی خۆتـان، یـاخود پۆشاکی دە کەسی نەدار بکـەن، یاخـود کۆیلەیـەك ئـازاد بکەن، هـەر کەسێك ئـەوەی چنگ نەکـەوت، با سێ ڕۆژان بـەڕۆژوو بـێ، ئەوە کـەفارەتی سـوێندەکانتانە ئەگـەر سوێندتان خـوارد.

### ئێسـتاش با لە دوو خاڵـی سـەرەکیی دا باسـی کەفارەتی سـوێند بکەین:

١- دیـارە پێشـتر باسمـان کـرد کـە کـەفارەت دان باشـترە لـەوەی ئینسـان سـوێندەکەی جێبـەجێ بکـات، مادام ئەو شـتەی کە سـوێندی لـێ خـواردوە، شـتێکی بـاش بـێ، وەك پێشـتـر چـەند فەرموودەیـەکمان هێنـان، ئـەوەش فەرموودەیـەکی دیکەیـە، پێغـەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿وَاللَّهِ لأَنْ يَلِجَّ أَحَدُكُمْ بِيَمِينِهِ فِي أَهْلِهِ آثَمُ لَهُ عِنْدَ اللَّهِ مِنْ أَنْ يُعْطِيَ كَفَّارَتَهُ الَّتِي افْتَرَضَ اللَّهُ عَلَيْهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨١٩٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٢٦٧)، وَالبَيْهَقِيُّ برقم: (١٩٦٣٧)}، واتـە: سـوێند بـە خـوا! ئەگـەر یـەکێك لـە ئێـوە کـە سـوێندی خـواردوە، لـە مـاڵی خۆیـدا، لەسـەر سـوێندەکەی بـەردەوام بـێ، (واتـە شتەکەشـی خـراپ بـێ، بـۆ وێنـە: سـوێندی خـواردوە دەبـێ لـە منداڵەکـەی بـدات، یـاخود نەچـێتە مزگـەوت، یـان سـوێندی

خواردوە سلاّو لە دراوسێكەی نەكات)، ئەوە بۆی گوناهباركەرترە لە لای خوا، لەوە كە كەفارەتەكەی بدات، كە خوا لەسەری فەرز كردوە، ئێمە زۆرجار ئەوەمان دێتە ڕێو چەندان جار شتی وابووە: فلاّنكەس بۆچی ئەو كارە خێرە ناكەی؟ مامۆستا تازە سوێندم خواردوە، سوێندی خواردوە قسە لەگەلّ بابو دایكی نەكات! سوێندی خواردوە قسە لەگەلّ خزمێكی نەكات، سوێندی خواردوە زیانێك لە كەسێك بدات! سوێندی خواردوە، سەردانی فلاّن خزمی نەكات! تۆ كە سوێندت خواردوە صیلەی ڕەحم بپچڕێنی، صیلەی ڕەحمەكە بەجێ بگەیەنەو كەفارەتەكەی بدە، ئەوە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەرە ﷺ، یان سوێندی خواردوە گوناهێك بكات! گوناهەكە مەكە كەفارەتەكە بدە، ئنجا ئەم فەرمایشتە هەر دەقە لەسەر ئەوە، دەفەرموێ: ﴿مَنْ حَلَفَ فِي قَطِيعَةِ رَحِمٍ أَوْ فِيمَا لا يَصْلُحُ فَبِرُّهُ أَنْ لا يُتِمَّ عَلَى ذَلِكَ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢١١٠) عَنْ عَائِشَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح سُنَن ابْنُ مَاجَه)، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر كەسێك سوێندی خوارد پەیوەندیی خزمایەتی بپچڕێنێ، یاخود شتێك كە باش نەبێ بكرێ، سوێندی لێ خواردبێ، بۆ ئەو، دینداریی‌و خواپەرستی ئەوەیە كە ئەو شتە تەواو نەكات، واتە: كەفارەت بداو ئەو شتەی كە سوێندی لەسەر خواردوە بیكات، مادام گوناهە با سوێندیشی خواردبێ، با نەیكات، یان سوێندی لەسەر خواردوە نەیكات، كە پێویستیشە بكرێ، با بیكات.

٢- چۆنیەتی كەفارەت دانەكە؟ خوا ﷻ ئاوا دەفەرموێ: ﴿فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ أَوۡ كِسۡوَتُهُمۡ أَوۡ تَحۡرِيرُ رَقَبَةٖۖ فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٖۚ﴾، چوار شتی باسكردوون، خواردن دانی دە نەدار لە خواردنی مامنێوەنجیی كە دیدەن بە مالّو منداڵتان، یان پۆشاك، یان ئازادكردنی كۆیلەیەك، وە كەسێك نەیبوو، سێ ڕۆژان بەڕۆژوو بێ.

(القُرطُبي) خوا پاداشتی بداتەوە، زۆر گرنگیی داوە بە حوكمە شەرعییەكان، وە بەڕاستیی پیاوێكی زۆر موعتەبەریشەو لێكۆڵینەوەی جوان دەكات،

ئەگەرنا بۆ هەرکام لەم ئایەتانە تەماشای (٢٠ - ٣٠) تەفسیر دەکەم، بەڵام ئەوەی کە ئەو دەیهێنێ، پێم لەوانی دیکە بەهێزترو کۆکەرەوەترە، (القُرطُبي) لە تەفسیرەکەیدا دەڵێ: (ولا خِلاَفَ فِي أَنَّ كَفَّارَةَ اليَمِين عَلَى التَخْيير؛ قَالَ إِبْنُ العَرَبِي: وَعِنْدِي أَنَّهَا تَكُونُ بِحَسَبِ الحَالِ؛ فَإِنْ عَلِمْتَ مُحْتَاجًا فَالإِطْعَامُ أَفْضَلُ؛ لأَنَّكَ إِذَا أَعْتَقْتَ لَمْ تَرْفَعْ حَاجَتَهُمْ وَزِدْتَ مُحْتَاجًا حَادِيَ عَشَرَ إِلَيْهِمْ، وَكَذَلِكَ الكِسْوَةُ تَلِيهِ...)[1]، واتە: ڕاجیایی لەوەدا نیە لە نێو زانایاندا کە کەفارەتی سوێند لەسەر بناغەی سەرپشك بوونە، {واتە سەرپشك بوون لە نێو ئەو سێ شتەدا، چونکە بە (أو) هێناویەتی: ﴿ فَكَفَّرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴾، کەواتە: یان (أو) بۆ سەرپشکییە، ڕایەکی بێهێز هەیە کە دەڵێ: خواردن پاشان، پۆشاك، پاشان ئازادکردنی کۆیلە، بەڵام لەڕاستییدا ئەوەی دیکە ڕاستترە و کە (قرطبي)یش دەڵێ خیلافی تێدانیە، دیارە خیلافەکەی بەهێند هەڵنەگرتوە، کورتە خیلافێکی تێدایە}، (إِبْنُ العَرَبِي) کتێبێکی هەیە بە ناوی (أحكام القرآن) جار جار قسەی خۆش و سەرنج ڕاکێش دەکات، دەڵێ: بە لای منەوە ئەوە بەپێی حاڵە: بەڵێ بابای سوێند خۆر کە دەیەوێ کەفارەت بدات، سەرپشکە لە نێوان ئەو سێیانەدا، بەڵام ئەوە بەپێی حاڵە، ئەگەر زانی نەدارەکان پێویستیان بە خواردن هەیە، خواردن باشترە، بەڵام ئەگەر زانی پۆشاکیان بۆ پێویستە، ئەوە پۆشاك باشترە، وە ئەگەر زانی کۆیلەیەك ئازاد بکرێ باشترە، با کۆیلەکە بێ، بەڵام وەنەبێ لە هەموو حاڵاندا هەر وابێ، بۆ وێنە ئەگەر تۆ کۆیلەیەك ئازاد بکەی، لە حاڵێکدا کە دە (١٠) کەسی برسیش هەبن، یان دە (١٠) کەس پێویستییان بە پۆشاك هەبێ، تۆش بچی کۆیلەیەك ئازاد بکەی، مانای وایە دە (١٠) کەسی برسی هەن، تۆش برسییەکی یازدەیەم، یان بێ بەرگێکی دیکەی یازدەهەمت خستۆتە گەڵ ئەوان!! قسەکەی زۆر جوانە لەجیاتی ئەوە، ئەو دە برسیانە تێربکە، یاخود ئەو دە بێ بەرگانە پۆشتە بکەی باشترە، وەك لەوەی یەکێکی

---

١) الجامع لأحكام القرآن ج٦ ص٢٤١.

دیکەشیان بخەیە گەڵێ، شەریعەت دەڵێ چۆن بەرژەوەندیی خەڵك تەحقیق بێ، دەبێ وای جێبەجێ بکەی.

**ئێستاش با سەرنجی بڕگەکەی کەفارەتی سوێند بدەین:**

(أ) سەرەتا دەفەرموێ: ﴿ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ ﴾، (طَبَرِي) بە سەنەدێکی باش وەك (التفسير الصحيح)[1] هێناویەتی دەڵێ: (عَنْ عَلِيِّ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَوْلَهُ: ﴿ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ ﴾، قَالَ: إِنْ كُنْتَ تُشْبِعُ أَهْلَكَ فَأَشْبِعِ الْمَسَاكِينَ، وَإِلَّا فَعَلَى مَا تُطْعِمُ أَهْلَكَ بِقَدْرِهِ)، واتە: عەلی کوڕی ئەبو طەلحە لە ئیبنو عەبباسەوە هێناویەتی: کە دەفەرموێ: ﴿ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطۡعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنۡ أَوۡسَطِ مَا تُطۡعِمُونَ أَهۡلِيكُمۡ ﴾، واتە: ئیبنو عەبباس گوتوویەتی: ماڵو منداڵی خۆت لە چ خواردنێك تێر دەکەی، نەدارەکانیش لەو جۆرە خواردنە تێر بکە، ئەگەرنا ئەگەر لە خواردنێکی باشیان تێر بکەی باشترە، ئەگەرنا چ جۆرە خواردنێك دەدەیە ماڵو منداڵی خۆت، خواردنێکی مامنێوەندییە، خواردنێکی سادەیە، بەو شێوەیە.

وە (الشوكاني) لە (فتح القدير)[2] دەڵێ: (الْمُرَادُ بِالْوَسَطِ هُنَا الْمُتَوَسِّطُ بَيْنَ طَرَفِي الْإِسْرَافِ وَالتَّقْتِيرِ وَلَيْسَ الْمُرَادُ بِهِ الْأَعْلَى) وشەی (أَوْسَط) لە زمانی عەرەبیدا، واتە: (أَعْلَى) باشترین، بەڵام لێرەدا دەڵێ: مەبەست لە (وَسَط) واتە: ئەوەی کە لە نێوان زێدەڕۆییو چرووکیی دایە، حاڵەتێکی مامنێوەنجیی.

ئنجا (إبن ماجه) ئەو قسەیە لە ئیبنو عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، دەڵێ: ﴿عَنْ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: كَانَ الرَّجُلُ يَقُوتُ أَهْلَهُ قُوتاً فِيهِ سَعَةٌ، وَكَانَ الرَّجُلُ يَقُوتُ

١) ج٢، ص٣٣٧، د. حكمت بن بشير بن ياسين.
٢) ج٢، ص٩١.

أَهْلَـهُ قُوتـاً فِيـهِ شِـدَّةٌ، فَنَـزَلَتْ، مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ﴾ {أَخْرَجَهُ ابْنُ مَاجَهْ فِي سننهِ برقم: (٢١١٣)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (صحيح ابن ماجه) برقم: (١٧١٧)}، واتە: ئیبنو عەبباس خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ، دەڵێ: بۆیە خوای بەرز وایفەرمووە، چونکە پیاو هەبوو خواردنی دەدا بە ماڵو منداڵەکەی، خواردنێکی باشی دەداتێ، وە پیاوی واش هەبووە کە خواردنێکی سادەو نەدارانەی دەدانێ، ئیدی ئایەتەکە هاتە خوار: خواردنێکیان بدەنێ لە نێوان زۆر باش و خراپدا، هەر کەسە بەپێی خۆی، هەر کەسەو لەو خواردنەی دەیدا بە ماڵو منداڵی خۆی، لەو جۆرە خواردنەش کەفارەت بدەن.

وەك گوتراوە: (خَيْرُ الأُمُورِ أَوْسَطُهَا)، واتە: باشترینی کارەکان نێوەڕاستیانە، ئنجا لەوبارەوە زانایان مشتومڕیانە، کە ئایا ئەو خواردن پێدانە دەبێ ژەمێك بێ، دەبێ دوو ژەم بێ، دەبێ سێ ژەم بێ؟ چۆن بێت؟ یاخود مستێك بێت؟ یاخود دوو مست بێت؟ یان چوار مست بێت، چەندبێ؟! لەوبارەوە ڕاجیاییان زۆرەو زۆر ڕا هەن، بەڵام (جمال الدين القاسمي) خاوەنی (محاسن التأويل) قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: (فأمّا الطَّعَام فَلَيْسَ فِيهِ تَحديد بقَدَر، لا في وجبةٍ ولا وَجْبَتَين، ولا في قدر من الكَيل، وَلَذا روي عَن الصَّحَابَةِ وَالتابعين فيهِ وجُوه جميعها مِمَّا يَصْدُقُ عَلَيْهِ مُسَمَّاهُ فَبأَيِّها أَخَذَ أَجزأه: يُغَدِّيهِم ويُعَشِّيهم، أَكْلَةٌ وَاحِدَةٌ، نصف صاعٍ من بُرٍّ أو تمر أو نحوها، لكلّ مسكين مدٌ من بر ومعه إدامه، والأصل هُوَ التَّمْلِيكُ عِنْدَ الأَكْثَر)[1]، واتە: خواردن پێدان بەو دە نەدارە، دیاریکردنی تێدانیە نە بە ئەندازە، (بڵێ ئەوەندەیان بدەنێ) مستێك، دوو مست، ڕەبەیەك، کیلۆیەك، دوو کیلۆ وە نە بەژەمو دوو ژەمیش، وە نە بە ئەندازەی پێوانیش، بۆیە لە هاوەڵانو شوێنکەوتووانەوە خوا لێیان ڕازی بێ چەند شتێك لەوبارەوە هاتوە، {خوا بەگشتی فەرموویەتی ﴿إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ﴾، خواردن پێدانی دە نەدار}، هەندێکیان گوتوویانە: (يُغدّيهم ويُعَشّيهم)، عەرەب عادەتیان وابووە

---

١) ج٤، ص٣٥١ – ٣٥٢.

دووجـار نانیان خـواردوە، (غَدَاء وعَشَـاء) واتـە: بـەیانیانو ئێـواران، وە هەنـدێکیان گوتوویانە: (أَكْـلَةٌ وَاحِدَةٌ)، یەکجـار، یەك ژەم، هەندێکیان بە پێوان (نصف صَاع) واتە: نیو ڕبـە، (صـاع)ێك چوار مسـتە، واتە: دوو مسـت، جا لـە گـەنم، یـاخود لـە خورمـا، یـاخود وێنــەی خورمـاو گـەنم، هەنـدێکیان گوتوویانـە: بـۆ هـەر نـەدارێك مستێك گەنــم، وە پێخـۆریشــی لەگەڵدابێ، هەڵبەتە ئەسڵیش ئەوەیە کە دەبێ ئەو خــواردنە کــە دەدرێ بــە کــەفارەتی ئــەو برسـیيانە، تەسـلیمیان بکـرێ، وە بدرێتـە دەسـتیان، ئەوە بەنسـبەت خـواردن پێـدانـەوە.

(ب) کـە دەفـەرموێ: ﴿ كِسْوَتُهُمْ ﴾، ئەگـەر خــواردن پێـدان نـەبوو، ئـەوی دیکـەی هەڵبـژارد، پۆشـاکیان بـۆ بکـات، لێرەشـدا زانایـان دەڵـێن: خـوا دیاریی نـەکردوە ئەنـدازەی ئەو پۆشـاکە چـەندبێ؟ زۆرجـار پرسـیار کراوە ئایا چی بێـت؟

هەندێــك گوتوویـــانە: هـەر شــتێك پێـی بگوتــرێ پۆشـــاك، جـا کڵاوێـك بـێ مێزەرێ بـێ، سـەرپۆشـێك بـێ، کراسێك بـێ، شـەرواڵێك بێ، هەمووی هەر دەبێ.

هەندێکـیش گوتوویـــانە: دەبـــێ بەرگـێك بـــێ کـە نوێـژی تێـــدا بکـرێ، واتـە: ڕەوابـێ کە نوێـژی پێـوە بکـرێ، ئەو دوو ڕایـە هـەن، بەگشـتی.

بەڵام لەڕاسـتیدا ئایەتەکە دیـاری نەکـردوە، بۆیــە هەردووکیـان دەگونجـێن.

(ج) کە دەفەرموێ: ﴿ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ ﴾، کۆیلەیـەك ئـازاد بکـرێ، ئێسـتا کۆیلـە نـین (الحمـد لله)،

١/ ئایـا ئەو کۆیلــەیە دەبـێ چـۆن بـێ، زانایـان ڕاجیـاییان هـەیە:

ئەبو حەنیفە گوتوویـەتی: ئەو کۆیلـەیە مسـوڵمان بێ، یاخود کـافر، دروسـتە.

شــافیعییو زانایـانی دیکـە گوتوویانــە: ئــەو کۆیلەیــە هــەر دەبــێ ئیمانــداربێ، هەڵبـەتە لێرەدا خـوا دیاریی نەکردوە کە ئیمانـداربێ، لە شـوێنی دیکـەدا هاتوە کە دەبـێ ئیماندار بـێ ﴿ ... وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ ...﴿٩٢﴾ ﴾النسـاء، بـەڵام لێـرەدا دیـاریی نەکــردوە، هەندێکیان دەڵـێن: ئەمە قیـاس دەکرێتــە سـەر ئەوێ.

بەڵام لەڕاستییدا من ڕای (أبو حنیفة)م پێ ڕاستترە، مادام لێرەدا دیاریی نەکراوە، ئەوەش بواری عیباداتە، لەوێ کە دیاریی کراوە، دیارە کە حیکمەتێکی تێدایە، کە دەبێ ئیماندار بێ، وە لێرەدا کە دیاری نەکراوە، دیارە نامسوڵمانیش بێ هەر دەگونجێ ئازاد بکرێ.

٢/ ئنجا ئایا دروستە کەفارەت هەمووی بدرێتە یەك نەدار؟

ئەبو حەنیفە دەڵێ: بەڵێ، دروستە هەمووی بدرێتە یەك نەدار، با بە دە ڕۆژان بیخوات، بە دە (١٠) ژەمان بیخوات.

مالیكو شافیعییو زۆربەی زانایان دەڵێن: نەخێر، دەبێ بدرێتە دە نەداران، چونکە خوای پەروەردگار باسی دە (١٠) دەکات.

لەوەدا من ڕای زۆربەم پێ ڕاستترە، کە دەبێ بدرێتە دە کەسان.

٣/ ئنجا ئایا نرخی ئەو خواردنە، یاخود نرخی ئەو پۆشاکە، دروستە بدرێ لە کەفارەتی سوێند یان دەبێ حەتمەن پۆشاك بێ، یان خواردن بێ؟

ئەبو حەنیفە دەڵێ: نرخەکەشی دەبێ.

مالیكو شافیعییو زۆربەی زانایان دەڵێن: نابێ.

من لەوەدا ڕای ئەبو حەنیفەم پێ ڕاستترە، چونکە جاری وا هەیە سوودی ئەو کەفارەتە ئەگەر بە پارە بێ، زیاترە بۆ نەدارەکانو دەگونجێ کەلێنی باشتری پێ بگرن، وە لەوانەیە ئەو پۆشاکەیان بۆ نەبێ، یاخود پۆشاکێکی بە دڵی خۆیان بکڕن، یان خواردنێکی بە دڵی خۆیان بخۆن، بۆیە من پێموایە قیمەتەکەش دەبێ، وە ڕای ئەبو حەنیفە لێرەدا باشترە.

٤/ ئایا ئەو کەفارەتە دروستە بدرێ بە ئینسانی نامسوڵمان؟

ئەبو حەنیفە دەڵێ: دروستە.

مالیكو شافیعیی دەڵێن: دروست نیە بدرێتە نامسوڵمان.

من پێموایە دروستە، چونکە خوا دیاریی نەکردوە کە حەتمەن بدرێتە مسوڵمان.

(د) كــە دەفــەرموێ: ﴿فَمَن لَّمۡ يَجِدۡ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ﴾، زانایــان لــەوەدا كەوتوونەتە ڕاجیـایی یەوە، ئایـا ئەو سـێ ڕۆژە دەبـێ بـە دوای یەكـدا بـن، یـاخود جیـاجیـابن؟

هەندێكـیان گوتوویــانە: دەبــێ بــەدوای یەكــدا بــن، بــەڵام لەڕاسـتیدا هــیچ بەڵگەیەك لەســەر بەدوای یەكدا بوونەكە نیـە، كەواتـە: نێو بـە نێـویش بـێ هـەر دروســتە، پاشــان زانایــان لــەوبارەوە كــە ئایـا ســنووری ئـەو تـەنگ دەسـتییو نەدارییــەی كـە مرۆڤـ بـۆی هەیــە كەفـارەتەكە نــەدات، واتـە: خـواردن پێـدانو پۆشــاك بـۆ كڕیــنو كۆیلــە ئازادكــردن، وە ســێ ڕۆژەكــان بگـرێ سـنوورەكەی چییــە؟

هەندێكیان گوتوویانە: هـەر كەسێك نانو نەفەقـەی خـۆیو ماڵو منـداڵی ئـەو شــەوو ڕۆژەی هـەبێ، زیـادەی هـەبێ، زیـادەكە دەبێت بكـاتە كەفـارەت.

هەندێكیـان گوتوویـانە: دەبێ هێنـدەی هـەبێ كە دەسـتمایەیەكی وای هەبــێ كـە ماوەیــەك پێــی بـژی.

ئـەبو حەنیفـە ڕەحمـەتی خـوای لــێ بـێ دەڵـێ: دەبــێ هـەر كەسـێك ئەنـدازەی (نصــاب)ی نەبــێ، واتـە: هێنـدەی نەبــێ زەكـاتی لــێ بكـەوێ، بـۆی هەیــە كـە بــەڕۆژوو بــێ.

من ڕای ئـەبو حەنیفــەم پــێ جوانــە، چونكــە هـەر كەسـێك ئەنـدازەی زەكـات لـێكەوتنــی نەبــێ، مانــای وایــە هــەژارو نــەدارەو زەكــاتی پێدەشــێو هــەر كەسـێكـیش زەكـاتی پـێ بشــێو بـە هــەژارو نـەدار دابنـرێ، مولـزەم نـاكرێ بـە كەفـارەت دان.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیستەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا چوار ئایەت دەتوێژینەوە، کە ئایەتەکانی (٩٠ - ٩٣)ن، لەو چوار ئایەتە موبارەکەدا خوای کاربەجێ پاش ئەوەی بۆ جاری یازدەیەمین لەم سوورەتەدا بە نازناوی ئیمان بانگی مسوڵمانان دەکات ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، حوکمی کۆتایی‌و یەکجارەکیی شەراب‌و قومارو دانانی بت‌و صەنەم‌و بەکارهێنانی زەلەمان ڕادەگەیەنێ، کە هەموو ئەوانە حەرام‌و پیسن‌و لە کردەوەی شەیتانن‌و، دەبێ مسوڵمانان نەك هەر نەیانکەن، بەڵکو دەبێ توخنیشیان نەکەون، پاشان خوای پەروەردگار پێیان ڕادەگەیەنێ، کە شەیتان دەیەوێ بە هۆی شەراب‌و قومارەوە، دوژمنایەتیی‌و ناکۆکیی لە نێو مسوڵمانان پەیدا بکات‌و، لە نوێژو یادی خوا بێئاگایان بکات، وە فەرمانیان پێ دەکات فەرمانبەریی خواو پێغەمبەر ﷺ بکەن، وە بزانن‌و دڵنیابن، کە ئەگەر پشت هەڵبکەن، تەنیا خۆیان بەرپرسیارن، وە لە کۆتاییدا خوا ﷻ حوکمی مەیخۆریی‌و ئەو کەسانەی پێش قەدەغەکرانی خواردوویانەتەوە، ڕادەگەیەنێ، کە هیچیان لەسەر نیە، بە مەرجێك لەمەودوا خاوەنی کردەوەی باش‌و ئیمان‌و تەقوابن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ
ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ
ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ
أَنتُم مُّنتَهُونَ ٩١ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ
أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٩٢ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ
جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ
ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ٩٣﴾

## ماناى وشە بە وشەى ئايەتەكان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە دڵنیاییەوە (بزانن کە) شەڕابو قومارو بتەکانو زەلەمەکان پیسن لە کردەوەی شەیتانن، دەجا لێیان دووربکەونەوە، بەڵکو سەرفرازبن ﴿٩٠﴾ بێگومان شەیتان دەیەوێ لە میانەی مەیخۆریی‌و قومارکردنەوە، دوژمنایەتیی‌و بوغزو غەرەزتان بخاتە نێوان، وە لە یادی خواو نوێژ بتانگێڕێتەوە، جا ئایا دەست هەڵدەگرن! ﴿٩١﴾ وە فەرمانبەریی خواو پێغەمبەرەکەی بکەن، وە وریا بن، ئنجا ئەگەر پشتتان هەڵکرد، ئەوە بزانن پێغەمبەرەکەمان تەنیا گەیاندنی ڕوونی (پەیامی خوای) لەسەرە ﴿٩٢﴾ ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوە باشەکانیان ئەنجام داون، لەسەر ئەوەی کە لە ڕابردوودا خواردوویانەتەوە (پێش قەدەغە کران) گوناهیان لەسەر نیە، ئەگەر لەمەودوا پارێز (لە مەیخواردنەوە) بکەن، وە ئیمان بێنن‌و کردەوە باشەکان ئەنجام بدەن، ئنجا پارێز بکەن‌و ئیمان بێنن، ئنجا پارێز بکەن‌و چاکە بکەن، وە خوا چاکەکارانی خۆشدەوێ ﴿٩٣﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(ٱلْخَمْرُ): بە كوردی دەڵێین: شەراب، مەی، ئارەق، (أَصْلُ الخَمْرِ: سَتْرُ الشَّيءِ، وَالخِمَار مَا تُغَطِّي بِهِ المَرْأَة رَأْسَها، وَجَمْعُهُ خُمُرٌ، وَسُمِّيَتْ لِكَونِهَا خَامِرَةً لِمقرِّ العَقْلِ وَهُوَ اسْم لِكُلّ مُسْكِرٍ)، واتە: وشەی (الخَمْرِ) لە ریشەدا بە مانای داپۆشینی شتێك دێتو، ئەو شتەی كە شتێكی پێ دادەپۆشرێت پێی دەگوترێ (خِمَار) وە سەرپۆشی ئافرەت یان دەسماڵ، یان لەچك پێی دەگوترێ: (خِمَار)، كۆیەكەی (خُمُر)ە، بۆیەش بە شەراب گوتراوە (خَمْر) چونكە عەقڵ دادەپۆشێ، وشەی (خَمْر) ناوە بۆ هەموو سەرخۆشكەرێك.

(وَٱلْمَيْسِرُ)، واتە: قومار، لەبەرئەوەی ماڵێكە مرۆڤ بە ئاسانیی دەستی دەكەوێ، (اليُسْرُ ضِدّ العُسْر، وَتَيَسَّرَ كَذَا وَاسْتَيْسَرَ: تَسَهَّلَ وَمِنَ اليُسر: المَيْسِرُ، والميسِرُ: القِمَارُ، الميسَرَة: الغِنَى واليَسَار)، وشەی (مَيْسِر) لە (يُسْر) هاتوە، واتە: ئاسانیی، پێچەوانەی زەحمەتەو قورسییە، دەگوترێ: (تَيَسَّرَ كَذَا وَاسْتَيْسَرَ)، واتە: ئاسان بوو، وە (المَيْسِرُ) واتە: (قِمار) وە دەوڵەمەندییو دەست رۆیشتوویی پێ دەگوترێ (مَيْسرة) لەبەرئەوەی ئینسان بە ئاسانی دەتوانێ تەصەرروف بكات ئەگەر دەوڵەمەندبێ.

(وَٱلْأَنصَابُ ): واتە: (نَصْبُ الشَّيء، وَضْعُهُ وَضْعَاً نَاتِئَاً، كَنَصْب الرّمْحِ، وَالنَّصِيبُ: الحِجَارَةُ تُنْصَب عَلَى الشَّيء، وَجَمْعُهُ نَصَائِب وَنُصُب وأَنْصَاب، وَكَانَ للعَرَب حِجَارَة تَعْبُدُهَا وَتذبَحُ عليها)، (نَصْبُ الشَيءِ) واتە: ئەو شتەی چەقاندو بە قیتیی داینا، وەك چۆن رمێك دەچەقێنی، (نَصيب) بەردێكە دەچەقێنرێ لەسەر شتێك، كۆیەكەی (نَصَائِب وَنُصُب وأَنْصَاب)ە، عەرەب عادەتیان وابووە، بەردێكیان داناوە بەبێ ئەوەی شێوەی مرۆڤ و ئەوانەی بۆ بكەن، ئەگەر شێوەیان بۆ كردبێ ناویان ناوە (وثن)و (صَنَم)، ئەگەر شێوەیان بۆ نەكردبێ ناویان ناوە (نَصَب) جا عادەتیان وابوو پەرستوویانەو قوربانیشیان بۆ

سەربڕیوە.

(وَٱلۡأَزۡلَٰمُ ): (أَزْلام) كـۆی (زَلَـم)، (الأَزْلام: السَّهْمُ الَّذِي لا رِيشَ عَلَيْهِ، وَكَانوا يَسْتَقسمونَ بِهَا)، (زَلَم) ئەو تیرەیە كە پەڕی پێوە نیە تا بڕوات، واتە: شتێكە وەك تیر نووكەكەی پێوەیە، بەڵام پەڕەكەی دواوەی پێوە نیە كە بەهۆی پەڕەكەی دواوە دەڕوات، عادەتیان وابوو شتیان پێ دابەش دەكرد، دوایی زیاتر باسی دەكەین.

(رِجۡسٌ): (الرِّجْس: القَذِر، الشَّيءُ القَذِر)، واتە: (رِجْس) بە مانای پیسی دێ، یاخود بە مانای شتێكی پیس دێ، هەروەها (الفِعْل القَبيح، والكُفر، العذَاب) بە كردەوەی خراپو بە كوفرو بە سزاش دێ.

(جُنَاحٌ ): (سُمِّي الإِثْمُ المَائِلُ بالإنسان عَنِ الحَقِّ جُنَاحاً، جَنَحوا: مَالوا)، (جُنَاح) بە مانای باڵە، جا (جُنَاح) ئەو گوناهەیە كە ئینسان لادەدا لە هەق، یان لاری دەكاتەوە بەڕاستو چەپدا لای دەدات، (جَنَحوا)، واتە (مَالوا) لایاندا.

(طَعِمُوٓاْ ): (الطَّعْمُ: تَنَاوُلُ الغِذَاءِ، وَقَدْ يُسْتَعْمَلُ طَعِمْتُ فِي الشَّرَابِ كَقَوْلِهِ: ﴿فَمَن شَرِبَ مِنۡهُ فَلَيۡسَ مِنِّي وَمَن لَّمۡ يَطۡعَمۡهُ فَإِنَّهُۥ مِنِّيٓ ﴿٢٤٩﴾ ﴾البقرة)، (طَعِم)، واتە: خواردی، زیاتر بۆ خواردنو خۆراك بەكاردێ، بەڵام لە زمانی عەرەبیدا وشەی (طَعِم) بۆ خواردنەوەش بەكاردێ، وەك خوای پەروەردگار لە سوورەتی (البقرة) وایفەرمووە.

## هـۆی هـاتنـە خـوارەوەی ئایەتەکـان

هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾ دوو بەسەرهات لەمبارەوە گێڕدراونەوە، هەڵبەتە زیاتریش هەن، بەڵام من ئەو دووانەم هەڵبژاردوون:

أ) ﴿عَنْ سَعْدِ بْنِ أَبِي وَقَّاصٍ ﷺ، أَتَيْتُ عَلَى نَفَرٍ مِنَ الأَنْصَارِ وَالْمُهَاجِرِينَ، فَقَالُوا: تَعَالَ نُطْعِمْكَ وَنَسْقِيكَ خَمْراً، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ تُحَرَّمَ الْخَمْرُ، قَالَ: فَأَتَيْتُهُمْ فِي حَشٍّ "وَالْحَشُّ الْبُسْتَانُ" فَإِذَا رَأْسُ جَزُورٍ مَشْوِيٌّ عِنْدَهُمْ وَزِقٌّ مِنْ خَمْرٍ، قَالَ: فَأَكَلْتُ وَشَرِبْتُ مَعَهُمْ، قَالَ: فَذُكِرَتِ الأَنْصَارُ وَالْمُهَاجِرُونَ عِنْدَهُمْ، فَقُلْتُ: الْمُهَاجِرُونَ خَيْرٌ مِنَ الأَنْصَارِ، قَالَ: فَأَخَذَ رَجُلٌ أَحَدَ لَحْيَيِ الرَّأْسِ فَضَرَبَنِي بِهِ فَجَرَحَ بِأَنْفِي فَأَتَيْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ فَأَخْبَرْتُهُ، فَأَنْزَلَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ فِيَّ (يَعْنِي نَفْسَهُ) شَأْنَ الْخَمْرِ: ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَٰنِ ﴿٩٠﴾﴾﴾ {أَخْرَجَهُ مُسْلِمٌ بِرَقَمِ: (٦١٨٨)}، واتە: سەعدی کوڕی ئەبی وەققاص خوای لێ ڕازی بێ (لە درێژەی بەسەرهاتێکدا) دەڵێ: ڕۆژێك چوومە لای کۆمەڵێك لە پشتیوانانو کۆچکەران (لە هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ) ئەوانیش بانگیان کردم، گوتیان: وەرە خواردنیشمان لەلا بخۆ، شەڕابیشمان لەلا بخۆوە، (ئەوە بەرلەوەی شەڕاب قەدەغە بکرێ)، دەڵێ: منیش چووم بۆ لایان لەنێو باغێکدا دانیشتبوون، سەری حوشترێکیان برژاندبوو، وە مەشکەیەك، یان کوندەیەك شەڕابیان لەلابوو، دەڵێ: منیش لەگەڵ ئەواندا نانم خواردو شەڕابیشم خواردەوە، لەوێ باسی پشتیوانانو کۆچکەران کرا، منیش گوتم: کۆچکەران لە پشتیوانان چاکترن، (دیارە دەبێ سەرخۆش بووبێ)، یەکێك لە پیاوەکان یەکێك لە شەویلاگەکانی سەرەکەی گرتوو لە دەموچاوی دامو، لووتی بریندار کردم، (هەندێك دەڵێن: لووتی شکاوە، هەندێکیش دەڵێن: لووتی تۆزێ قڵیشاوە)، دەڵێ:

چووم بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ هەواڵم پێدا، خوای بەرزو پایەدار لە بارەی منەوە، ئەو ئایەتەی ناردە خوار کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ ۝٩٠﴾.

ب) هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ۝٩٣﴾، ﴿عَنْ أَنَسٍ رضي الله عنه، قَالَ: كُنْتُ سَاقِيَ الْقَوْمِ، فِي مَنْزِلِ أَبِي طَلْحَةَ، وَكَانَ خَمْرُهُمْ يَوْمَئِذٍ الْفَضِيخَ، فَأَمَرَ رَسُولُ اللهِ ﷺ مُنَادِيًا يُنَادِي: أَلاَ إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ، قَالَ: فَقَالَ لِي أَبُو طَلْحَةَ: أُخْرُجْ فَأَهْرِقْهَا، فَخَرَجْتُ فَهَرَقْتُهَا، فَجَرَتْ فِي سِكَكِ الْمَدِينَةِ، فَقَالَ بَعْضُ الْقَوْمِ: قَدْ قُتِلَ قَوْمٌ وَهِيَ فِي بُطُونِهِمْ، فَأَنْزَلَ اللهُ: ﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ... ۝٩٣﴾﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرَقم: (٤٦٢٠)، وَمُسْلِمٌ بِرَقم: (٥٢٤٦)، وَأَبُو دَاوُد بِرَقم: (٣٦٧٥)}، وەك جارێکی دیکەش باسمان کردوە، جاری وا هەیە، دوو ڕووداو یان سێ ڕووداو، خوای پەروەردگار ئایەتێك دەنێرێتە خوارێ بۆ هەموویان.

واتە: ئەنەسی کوڕی مالیك خوا لێ ڕازی بێ، دەڵێ: من لە ماڵی ئەبو طەڵحە شەڕابم بۆ خەڵکێك دەگێڕا، (دیارە ئەنەس گەنج بووە، چونکە دەڵێ: ئەو کاتەی تەمەنم دە ساڵان بوو لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ بووم)، پێش ئەو کاتەی شەڕاب قەدەغە بکرێ، شەڕابیش لە (فَضِيخ) دروست دەکرا {(الْفَضِيخُ: شَرَابٌ يُتَّخَذُ مِنَ الْبُسْرِ الْمَفْضُوخِ: أَي الْمَشْدُوخِ)، واتە: فەزییخ شەڕابێکە لە خورمای تێکگوشراو دروستکراوە} ئنجا ئەو کاتەی شەڕابەکەم بەسەردا دەگێڕان پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە جارچی جاڕ بدا، فەرمووی: (أَلاَ إِنَّ الْخَمْرَ قَدْ حُرِّمَتْ) ئاگادار بن! شەڕاب قەدەغە کرا، ئەبو طەڵحە پێی گوتم: ئەنەس

بچۆ دەرێ ئەو شەرابە برێژە، (جا دەبێ خواردبیانەوە، یان فریا نەکەوتبن بخۆنەوە، یان هەندێکیان خواردبێتەوەو هەندێکی دیکەی فریا نەکەوتبن بیخۆنەوە) منیش چووم شەرابەکەم ڕشت، شەراب بە کۆڵانەکانی مەدینەدا دەڕۆیشت، (هەر ماڵێك شەرابی هەبووە ڕشتوویەتی)، هەندێك لە خەڵکەکە گوتیان: (قَدْ قُتِلَ قَوْمٌ وَهِيَ فِي بُطُونِهِمْ)، کەسانێکمان لێکوژران، ئەم شەرابەیان لە گەدە دابووە، ئەدی ئەوانە حوکمیان چییە؟ ئیدی خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارێ: ﴿ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ...﴿٩٣﴾ ﴾، واتە: ئەوانەی خاوەن ئیمانن و کردەوە باشەکانیان ئەنجامداوە، گوناهیان ناگاتێ کە لە ڕابردوودا خواردوویانەتەوە، مادام خوای پەروەردگار ئەو کاتە قەدەغەی نەکردبێ.

# مانای گشتی ئایەتەکان

دیارە وەك پێشتر باسمان کردوە، لەم سوورەتە موبارەکەدا زۆرترین جار وشەی:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾، دووبارە بۆتەوە، کە (١٦) جارە، ئەم جارەیان یازدەیەمین جارە لەم سوورەتەدا، ئاشکرایە هەرجارێك خوای بەرز بە نازناوی ئیمان بانگی مسوڵمانان بکات، حەتمەن یان واجبێکە پێیان ڕادەگەیەنێ، یان قەدەغە کراوێکە ئاگاداریان دەکاتەوە، یان فەرمانێکیان پێدەکات، یان نەهییەکیان پێ دەفەرموێ،

ئنجا دەفەرموێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! واتە: ئیمانتان هێناوە بە خواو بە پێغەمبەر ﷺ وە هەرچی کە خوا لە ڕێی پێغەمبەرەوە هەواڵی پێداون و، هەرچی کە خوا ناردوویەتی بە پێغەمبەری خۆیدا، وە وشەی:

﴿ءَامَنُوٓا۟﴾، وەك نازناوێك وایە بۆ مسوڵمانان، ئەگەرنا وشەی (آمَنُوا)، یانی: (آمَنُوا باللّهِ وملائكته ورُسُله وَكُتُبه وَاليَومِ الآخِرِ وبِكلّ مَا يجب أن يُؤمَن به).

دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾، بێگومان ﴿ٱلْخَمْرُ﴾، واتە: شەڕاب، مەی، ﴿وَٱلْمَيْسِرُ﴾، واتە: قومار، ﴿وَٱلْأَنصَابُ﴾، واتە: کۆی (نَصْب)ە، واتە: ئەو بتانەی کە دایاندەنێن بێئەوەی کە وێنەیان بکێشن ﴿وَٱلْأَزْلَـٰمُ﴾، کۆی (زَلَم)ە، واتە: ئەو داروچکانەی وەك یانسیب شتیان پێ دابەش دەکەن، ئەمانە هەر چواریان پیسن، لە کردەوەی شەیتانن، لێیان دووربکەونەوە، بەڵکو سەرفرازبن، لێرەدا خوا ﷻ وەك قۆناغی چوارەمو کۆتایی قەدەغەکردنی شەڕاب، وە قۆناغی دووەمو کۆتایی قەدەغەکردنی قومار، ئەم بانگەوازە ئاڕاستەی ئیمانداران دەکات، چونکە وەك دوایی باسی دەکەین، شەڕاب بە چوار قۆناغ قەدەغە بووە، قوماریش بە دوو قۆناغ، خوا ﷻ کە ئامرازی (إِنَّمَا)ی بەکارهێناوە، واتە: (خَمْر ومَيسر وأَنْصَاب وأَزلام) بەس پیسن و کردەوەی شەیتانن، واتە: هیچی دیکە نین جگە لە پیسیی و، جگە لەوە کە کردەوەی شەیتانن،

کەواتە: لێیان دووربکەونەوە، بۆئەوەی سەرفرازبن، هەڵبەتە لە مەسەلە گرنگەکان زیاتر باسی دەکەین، ئنجا حیکمەتی قەدەغەکرانی ئەو چوارە، بەتایبەت شەڕاب و قومار، ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾، بێگومان شەیتان بە هۆی ئەوەوە کە شەڕاب و قومارتان لەلا شیرین دەکات، بەس دەیەوێ دوژمنایەتیی و ڕقتان بخاتە بەین، بە هۆی شەڕاب خواردنەوەو قومارکردنەوە، وە لە یادی خواو لە نوێژ بتانگێڕێتەوە، ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾، ئنجا ئایا دەست هەڵدەگرن! یان: ئایا هەر وازیان لێ ناهێنن!

ئنجا خوای پەروەردگار بە ئیمانداران دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ ﴾، وە فەرمانبەریی خوا بکەن، واتە: پابەندبن بە قورئانەوە، وە فەرمانبەریی پێغەمبەری خوا ﷺ بکەن، واتە: پابەندبن بە سوننەتەوە، ﴿ وَٱحْذَرُواْ ﴾، وە وریابن و هۆشیاربن، لە بێ فەرمانیی خواو پێغەمبەری خوا ﷺ، ﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴾، ئنجا ئەگەر پشتتان هەڵکرد، واتە: لەجیاتی ئەوەی ڕووبکەنە خواو پێغەمبەری خوا، پشتتان تێیان کردو لە جیاتی ئەوەی فەرمانەکانیان جێبەجێ بکەن، لاملیی و سەرپێچییتان کرد، ئەوە بزانن کە پێغەمبەری ئێمە (موحەممەد ﷺ) تەنیا گەیاندنێکی ڕوونی لەسەرە، دوای ئەوەی بە ڕوونی پێی ڕاگەیاندن کە شەڕاب و قومارو بتەکان و زەڵەمەکان قەدەغەن، هەر کەسێك لە ئێوە توخنی یەکێك لەوانە بکەوێ، بۆخۆی بەرپرسیارە، وە پێغەمبەر ﷺ لەسەری پێویست نیە بتانگێڕێتەوە، بەس لەسەری پێویستە ئاگادارتان بکاتەوە، وەك دەفەرموێ: ﴿إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ﴿٤٨﴾﴾ الشورى، واتە: تۆ بەس گەیاندنت لەسەرە.

ئنجا لە ئایەتی چوارەم و کۆتاییدا خوا ﷻ وەڵامی ئەو ئیشکالە دەداتەوە، کە بۆ هەندێك لە هاوەڵان دروست بووە خوا لێیان ڕازی بێ، ئەویش ئەوەبووە کە هەندێکیان لە جەنگی بەدردا شەهید بوون، یان لە جەنگی ئوحوددا شەهید بوون، کە شەڕابیش

دوای ئەو جەنگانە قەدەغەكراوە، گوتوویانە: ئەو برایانەمان، ئەو هاوەڵانەمان كوژراونو لەو كاتەشدا شەڕابیان لەنێو گەدەدا هەبووە، واتە: شەڕابیان خواردۆتەوە، ئایا حوكمیان چییە؟ خوای پەروەردگار وەڵامی ئەو پرسیارو ئیشكالە دەداتەوەو، دەفەرموێ: ﴿ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓا۟ إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّأَحْسَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوە، (بە هەموو ئەو شتانەی كە پێویستە ئیمانیان پێ بهێنرێ)، وە كردەوە چاكەكانیان ئەنجام داون، گوناهیان لەسەر نییە لەسەر ئەوەی كە لە ڕابردوودا خواردوویانە، واتە: خواردوویانەتەوە لە شەڕاب، وە من وای تێدەگەم بۆیە خوای زاناو شارەزا وشەی: ﴿ طَعِمُوٓا۟ ﴾ی بەكارهێناوە، چونكە ﴿ طَعِمُوٓا۟ ﴾، هەم بۆ خواردنو، هەم بۆ خواردنەوەش بەكاردێ، ئنجا ماددە سەرخۆشكەرەكانیش تەنیا بە شێوەی خواردنەوە بەكارنایەن، وەك شلەمەنیی، بەڵكو بە شێوەی دیكەش بەكاردێن، وە بە شێوەی حەب دەرزیش بەكاردێن، دەفەرموێ: ئەوانەی كە لە ڕابردوودا ئەو ماددە سەرخۆشكەرانەیان بەكارهێناوە، گوناهیان لەسەر نییە، چونكە كاتی خۆی قەدەغە نەكرابوون، ﴿ إِذَا مَا ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، ئەگەر لە ڕابردوودا پارێزیان كردبێ لەو شتانەی كە قەدەغە كراون، شەڕاب كە قەدەغە نەكراوە، پارێزیشیان لێ نەكردبێ، گوناهیان ناگاتێ، بەمەرجێك لەو شتانەی دیكە كە قەدەغەكراون، پارێزیان كردبێ، ﴿ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّءَامَنُوا۟ ﴾، پاشان كە شەڕاب قەدەغە كراوە، ئنجا خۆیان لە شەڕابیش دەپارێزنو ئیمانیشیان هەیە، دیارە ئیمانەكە وایان لێدەكات خۆیان بپارێزن، ﴿ ثُمَّ ٱتَّقَوا۟ وَّأَحْسَنُوا۟ ﴾، وە بەردەوام بە پەیژەی لە خواترسانو تەقوادا سەردەكەون، بەرەو پلەی سەرەوەی لە پارێزو خواترسان، نەك بە پلەی خوارەوەو نێوەڕاست قەناعەت بكەن، وە چاكەكارییش ئەنجام دەدەن، ﴿ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴾، وە خوا چاكەكارانی خۆشدەوێن.

# چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم:** خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، لێرەدا پێویست دەكات ئەم پێنج وشەیە شی بكەینەوە، چونكە دوایی پێویستمان پێیان دەبێ:

(الخَمْرُ، المَيْسِرُ، الأَنْصَابُ، الأَزْلامُ، الرِّجْسُ).

١/(الْخَمْر): كە پێشتریش چەمك و واتاكەیمان شیكردووە: (الخَمْرُ: اسْمٌ لِكُلّ مُسْكِرٍ يُذَكَّرُ وَيُؤَنَّثُ وَيُقالُ: خَمْرَة، وَالجَمْعُ: خُمُور، وَالخَمَّار: بائِعُهَا، وَسُمِّيَت الخَمْرُ خَمْرًا لأَنَّهَا تَسْتُرُ العَقْلَ..)[١]، واتە: ناوە بۆ هەر سەرخۆشكەرێك، بە (مُذَكّر) دێ، بە (مُؤَنَّث)یش دێ، كە دیارە (مُذَكّرو مُؤَنَّث)ی (مجازي)ین، وە دەشگوترێ: (خَمْرَة) كۆی (خَمْر) بریتییە لە (خُمُور)، (وَخَمَّار) ئەو كەسەیە كە شەراب دەفرۆشێ، وە (خَمْر) بۆیە وای پێگوتراوە، چونكە عەقڵ دادەپۆشێ، ئینسان سەرخۆش دەكات و عەقڵی لەلا نامێنێ.

ئنجا مادام هەر ماددەیەك ئینسان سەرخۆش بكات، پێی دەڵێن: (الخَمْر)، كەواتە كە خوا دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، مانای وایە هەرچی سەرخۆشكەرە دەیگرێتەوە، بۆیەش زۆر جەختی لەسەر دەكەمەوە، چونكە ئەبو حەنیفە دەڵێ: بەس ئەوەی لە ترێ دروست دەكرێ، پێی دەگوترێ: (خَمْر)، خواش لێرەدا بەس باسی (خَمْر)ی كردوە، هەڵبەتە ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خوای لێ بێ، وایگوتوە، بەڵام دیارە گوتووشیەتی: حوكمی ماددە سەرخۆشكەرەكانی دیكە لە بەڵگەی دیكەوە دەزانرێ، ئەگەرنا ئایەتەكە تەنیا ئەوە دەگەیەنێ،

١) المعجم الوسيط: ج٢، ص٥٥.

بەڵام وەك لێرەدا دەردەكەوێ، وانیەو وشەی (خَمْر) هەموو سەرخۆشكەرێك دەگەیەنێ، هەرچی ماددەی سەرخۆشكەرە: شلەمەنییو حەبو هی توندو دەرزییو دووكەڵو هەرچی بێت ... هتد، چونكە ئێستا بە زۆر جۆرو شێوە مادده سەرخۆشكەرەكان بەكاردەهێنرێنو، بەشەر هونەر بازیی (تفنُّن)ی زۆر بەكاردێنێ بۆ سەرخۆشكردن.

٢/(الْمَيْسِر): (اللَّعب بالقِدَاحِ..) بریتیە لە یاریی كردن بە قیداح، (قِدَاح)یش كە كۆیەكەی (أقداح)ە، بریتیە لە دارووچكەیەك كە بۆ تیر چاكیان كردوە، ئەگەر ویستیان بیكەن بە تیر، نووكێكی تیژو پەڕیشی بە دواوە بووە، ئەگەرنا هەر دارەكە بووەو، شتیان پێ دابەش كردوە، سێ (قِدَاح)یان هێناوە، لەسەر یەكێكیان نووسیوە: (أَمَرَنِي رَبِّي)، پەروەردگارم فەرمانی پێكردووم، وە لەسەر ئەوەی دیكەیان نووسیوە: (نَهَانِي رَبِّي)، پەروەردگارم لێی قەدەغەكردووم، وە لەسەر ئەویدیكە هیچیان نەنووسیوەو، لەنێو توورەكەیەك دایانناونو هەڵیان شەقاندوە، پاشان یەكیان لێ ڕاكێشاوە، ئەگەر ویستبیان سەفەرێك یان هەر كارێك بكەن، ئەگەر ئەوەیان دەرچووبێ كە تێیدا نووسراوە، (أَمَرَنِي رَبِّي) ئەوە گوتوویەتی: خوا فەرمانی پێكردوومو، دەبێ سەفەرەكە بكەم، وە ئەگەر ئەوەیان كە لەسەری نووسراوە: (نَهَانِي رَبِّي) دەرچووبێ، سەفەرەكەیان نەكردوە، وە ئەگەر ئەوەی كە هیچی لەسەر نەنووسراوە، دەرچووبایە دووبارەیان دەكردەوە، یاخود بۆ شت دابەشكردن بەكاریان هێناوە، ئنجا دەڵێ: (كُلُّ شيء فيهِ قِمَار فَهُوَ مِنَ المَيْسِر)، واتە: وە هەر شتێك كە قوماری تێدابێ، ئەوە (میسر)ە.

قومار چییە؟ (الجرجاني) لە كتێبی (التعریفات)دا دەڵێ: (القِمَارُ: هُوَ كُلُّ لَعب يَشْتَرِطُ فيهِ الغَالِبُ مِنَ المُتَغَالِبين شَيْئًا مِنَ المَغْلُوب)، واتە: هەر یارییەك كە كۆمەڵە كەسێك دەیكەن، ئەوەیان كە زاڵ بێت ئەندازەیەك ماڵ لەسەر ئەوە فەرز دەكات كە دۆڕاندوویەتی.

هەروەها پێناسەیەكی دی بۆ كردوە (الجرجاني) دەڵێ: (القِمَارُ: هُوَ أَنْ يَأْخُذ مِن صَاحِبه شَيئاً فَشَيئًا فِي اللَّعب) واتە: قومار ئەوەیە یەكێك جار لە دوای جار لە هاوەڵەكەی بباتەوە، ئنجا دەگوترێ: (قَامَرَ الرَّجُل مُقامَرَة وَقِمَاراً: إِذَا

لاعبه لعباً فالقِمَارُ هُوَ الرِّهان)، وە یان بە کوردی دەڵێن: گرەو لەسەر شتێك بێ، هەڵبەتە شەرعزانان زۆر وردەکارییان لەسەر باس کردوە، دواییش زیاتر ڕوونی دەکەینەوە.

٣/(الأَنْصَاب):- کۆی (نَصْب)ە، واتە: (حَجَر كَانُوا يَنْصِبُونَهُ فِي الجَاهِلِية، وَيَتَّخِذُونَهُ صَنَمَاً فَيَعْبُدونهُ)، واتە: بەردێکە دایاننابوو چەقاندوویانە لە سەردەمی نەفامییدا، وەك بت پەرستوویانە، وە جاری واشبووە ئاژەڵیان لەلا سەربڕیوە، خوێنەکەشیان پێدا هەڵسوە.

٤/(الأَزْلامُ)، کۆی (زَلَم)ە، واتە: (السَّهْمُ الذِي لا رِيشَ عَلَيْهِ، وَكَانَ أَهْلُ الجَاهِلية يَسْتَقسِمُونَ بالأزلام وكَانُوا يَكتُبُونَ عَلَيْهَا الأَمْرُ أَو النَّهي، وَيَضَعُونَهَا في وِعَاءٍ، فَإِذَا أَرَادَ أَحَدُهُمْ أَمْرَاً أَدْخَلَ يَدَهُ فِيهِ وَأَخْرَجَ سَهْمَاً، فَإِذَا خَرَجَ مَا فِيهِ الأَمْرُ مَضَى لِقَصْدِه، وَإِنْ خَرَجَ مَا فِيهِ النَّهي، كَفَّ)[1]، پێشتر لە باسی (میسر)دا پێناسەمان کرد.

٤/(رِجْس): (الرِّجْسُ: الشَّيءُ القَذِرُ)، یانی: هەر شتێکی پیس، دەگوترێ: (رَجُلٌ رِجْسٌ وَرِجَالٌ أَرْجَاسٌ، وَالرِّجْسُ يَكُونُ عَلَى أَرْبَعَةِ أَوْجُهٍ: إمَّا مِنْ حَيْثُ الطَّبْعُ، وَالعَقل، وَالشَّرْع، وَمِنْ كُلِّهَا كَالْمَيْتَة، فَإنَّهَا تُعَافُ طَبْعَاً وَعَقلاً وَشَرْعَاً، ﴿إِنَّمَا ٱلْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ ﴿٢٨﴾﴾التوبة، وَجَعَلَ الكَافِرِينَ رِجْسَاً مِنْ حَيْثُ أَنَّ الشِّرك بالعَقْلِ أَقْبَحُ الأَشْيَاء، قَالَ تعالى: ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَتْهُمْ رِجْسًا إِلَىٰ رِجْسِهِمْ ...﴿١٢٥﴾﴾التوبة، وقوله تعالى: ﴿وَيَجْعَلُ ٱلرِّجْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٠﴾﴾يونس، قِيلَ الرِّجْسُ: النتن، وَقِيل العَذَاب)، واتە: دەگوترێ پیاوێکی پیس، پیاوانێکی پیس، وە پیسیش چوار جۆرە:

١/ پیسی لە ڕووی سروشتییەوە.

٢/ پیسی لە ڕووی عەقڵەوە.

---

[1] المعجم الوسيط: ص٣٩٨ ـ ٣٩٩.

٣/ پیسیی لە ڕووی شەرعەوە.

٤/ پیسیی لە هەر سێ ڕووەكانەوە، وەك: مردارەوەبوو، كە هەم سروشتی پیسەو، وە هەم ئینسان لە ڕووی عەقڵەوە دەزانێ خراپەو، هەم لە ڕووی شەرعەوەش پیسە.

ئنجا خوا كە دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ ﴿٢٨﴾﴾، واتە: بێگومان هاوبەشدانەرەكان بۆ خوا پیسن، (دیارە پیسیی ماددیی نا، ئەگەر دەستت بە كافرێك كەوت، دوایی چۆن دەستت بە میزو پیسایی كەوتوە، ئاوا دەستت بشۆی! چونكە زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: مرۆڤ پیس نیە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ... ﴿٧٠﴾﴾الإسراء، واتە: ڕێزمان لە ئادەمیزاد گرتوە، ئادەمیزادێكی ڕێز لێگیراو، پیس نیە، بەڵكو لێرەدا مەبەست پیسیی مەعنەوییە)، بۆیە (راغب) دەڵێ: كافرەكان بە پیس دانراون لەبەرئەوەی كوفرو شرك بە عەقڵ، خراپترین و ناشیرینترین و قێزەوەنترین شتن، وەك خوا دەفەرموێ: (ئەوانەی كە دڵیان نەخۆشیی تێدایە، لەگەڵ ئەو پیسییە، خوا پیسی دیكەشی بۆ زیاد كردن) یان لە سووڕەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿... وَيَجۡعَلُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يَعۡقِلُونَ ﴿١٠٠﴾﴾یونس، واتە: ئەوانەی كە نەفامن خوا پیسیی بۆ بڕیارداون، واتە: پیسیی خستە نێو دڵیان مەبەست لە پیسیی كوفرو شیركە، وە هەندێكیش دەڵێن: مەبەست لە: (رِجْس) واتە شتی بۆگەن، هەندێكیش دەڵێن (رِجْس) واتە: سزاو ئازار.

**مەسەلەی دووەم:**

# باسێك لە بارەی شەراب و قومارەوە

لە حەوت خاڵدا باسی شەڕاب دەكەین، دوایی لە چوار خاڵیشدا باسی قومار دەكەین.

**یەكەم : شەڕاب ( خَمر ):**

**یەك : پێناسەی شەڕاب (خَمْر)و جۆرەكانی :**

ئێمە پێشتر پێناسەی (خَمْـر)مان كرد، بەڵام مەی (خَمْر) چەند جۆرێكی هەن، كە لە چەند شتێك دروست دەكرێن.

(رَاغِب الأَصْفَهَانِي) دەڵێ: {.. وَالخَمْر سُمِّيت لِكَونِهَا خَامِرَةٍ لِمَقَرِّ العَقْلِ، وَهُوَ عِنْدَ بَعْضِ النَّاسِ اسْمٌ لِكُلّ مُسْكِرٍ، وَعِنْدَ بَعْضهم اسْمٌ لِلْمُتَّخَذِ مِنَ العِنَبِ وَالتَّمْرِ لما رُوِي عَنْهُ ﷺ: (الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ النَّخْلَةِ وَالْعِنَبَةِ)}، واتە: مەی بۆیە ئەو ناوەی لێنراوە چونكە داپۆشەری شوێنی عەقڵ و هۆشە، وە هەندێك لە زانایان گوتویانە (خَمْر) ناوە بۆ هەر شتێك سەرخۆشكەر بێ، هەندێكیش گوتوویانە: تەنیا ئەوەی لە تریّ و خورما دروست دەكرێ، پێی دەگوترێ: (خَمْـر)، چونكە پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿الْخَمْرُ مِنْ هَاتَيْنِ الشَّجَرَتَيْنِ! النَّخْلَةِ وَالْعِنَبَةِ﴾ {(أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٧٧٣٩)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (١٩٨٥)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٣٦٧٨)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٨٧٥)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٥٥٧٣)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣٣٧٨) وغيرهم عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ)، واتە: شەڕاب لەو دوو درەختەیە دارخورماو ترێ.

دیارە ئەو شەڕابەی كە لەو كاتەدا باو بووە، لەو دوو درەختە دروست كراوە، ئەگەرنا لە شتی دیكەش شەڕاب دروست دەكرێ، كە سەرخۆشكەر بێ، وە لە مەسەلەی خواردن و خواردنەوەو مامەڵەو نەریتەكان دا! تەماشای حیكمەت دەكرێ، حیكمەتی قەدەغەبوونی شەڕاب (خَمْر)یش سەرخۆشكردنە، بۆیە هەر شتێك ببێتە هۆی سەرخۆشكردن، بە مەی (خَمْر) دادەنرێ و قەدەغەیە.

وەك بەڵگەش لەوبارەوە کە هەر شێك ماددەیەکی سەرخۆشکەری لێ دروست بکرێ، هەمان حوکمی خورماو ترێی هەیەو مەرج نیە (خَمْر) تەنیا لە خورماو ترێ دروست بکرێ، ئەم دەقەیە: ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ قَالَ: سَمِعْتُ عُمَرَ بْنَ الْخَطَّابِ عَلَى مِنْبَرِ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ يَقُولُ: أَيُّهَا النَّاسُ! أَلا إِنَّهُ قَدْ نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ وَهْيَ مِنْ خَمْسَةٍ: مِنَ الْعِنَبِ وَالتَّمْرِ وَالْعَسَلِ وَالْحِنْطَةِ وَالشَّعِيرِ، وَالْخَمْرُ مَا خَامَرَ الْعَقْلَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٣٧٨)، ومُسْلِمٌ برقم: (٧٤٧٥)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٦٩)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٥٩)}، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر دەڵێ: گوێم لە عومەری کوڕی خەتتاب بوو خوا لێیان ڕازی بێ لەسەر مینبەری پێغەمبەری خوا ﷺ وتاریدا {دیارە بە ئامادەبوونی هاوەڵانی بەڕێز، بۆیەش شەرعزانان ئەم دەقەی عومەر بە بەڵگە دێننەوەو دەڵێن: مادام هاوەڵان هەموو لەوێ بوون، ئەوە حوکمی کۆدەنگیی (إجماع)ی هەیە} گوتی: ئەی خەڵکینە! ئاگاداربن قەدەغەبوونی شەڕاب خوا ناردیە خوار، شەڕابیش لە پێنج شتان دروست دەکرێ: لە ترێو خورماو هەنگوینو گەنمو جۆ، وە (خَمْر) هەر شتێکە کە عەقڵ داپۆشێ، (واتە: مرۆڤ سەرخۆش بکات).

کەواتە: قسەکەی ئەبو حەنیفەو هاوەڵەکانی ڕەحمەتی خوایان لێ بێ هەر چەندە ئیمامێکی گەورەیە، کە گوتوویانە: (خَمْر) بەس لە ترێ دروست دەکرێ، نەیانپێکاوە، با ترێ باوترین سەرچاوەی دروستکردنی شەڕابیش بێ، هەروەها خورماش، بەڵام هەر شتێکی دیکە کە ئەو ماددە سەرخۆشکەرەی لێ دروست دەکرێ، هەر پێی دەگوترێ: (خَمْر) وە هەمان حوکمیشی هەیە، چونکە وەك باسمان کرد: (وَسُمِّيَت الخَمْرُ خَمْرًا لأَنَّهَا تَسْتُر العَقْلَ) بۆیە (خَمْر) دەگوترێ: (خَمْر)، چونکە لە (سَتْر)ەوە هاتووە عەقڵ دادەپۆشێ.

## دوو: قۆناغەکانی قەدەغەبوونی شەڕاب:

پێم شك نایەت هیچ شتێکی دیکە ئەوەندەی شەڕابی خایاندبێ بۆ قەدەغەکرانی، شەڕاب بە چوار قۆناغ قەدەغە بووە، حیکمەتەکەشی ئەوەیە کە ئەو شتانەی خەڵك بە خواردنو خواردنەوەیانەوە ڕادێت، دەبنە بەشێك لە کەسایەتیی ئینسانو حاڵەتی جەستەییو عەقڵییو نەفسیی، دەست لێ

هەڵگرتنیان ئاسان نیەو، بە نووکە قەڵەمێك ناکرێ بگوترێ: دەست هەڵگرن ! بەڵکو پێویستی بە پەروەردەکردنو پلەپلەیی هەیە، بەتایبەت شەراب، کە شتێك بووە عەرەبەکان زۆر عادەتیان پێوە گرتوەو، زۆر لەسەری ڕاهاتوون، بۆیە خوای پەروەردگار بە چوار قۆناغ شەرابی قەدەغە کردوە:

**قۆناغی یەکەم**: خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النحل) ئایەتی ژمارە (٦٧)دا ئاماژەیەکی سووك دەکات بەوە کە شەراب شتێکی خراپەو مەی خواردنەوە شتێکی خراپە، دەفەرموێ: ﴿وَمِن ثَمَرَٰتِ ٱلنَّخِيلِ وَٱلْأَعْنَٰبِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾﴾ النحل، واتە: لە بەروبوومی دارخورماو ترێ (مێو) شەرابی لێ دروست دەکەنو رزقێکی باشیشی لێ دروست دەکەن {واتە: مێوژو دۆشاوو سرکەو...هتد} بێگومان لەوەدا نیشانە هەیە بۆ کەسانێك کە بفامن، کە ئەمە ئاماژەیە، چونکە خوا دەفەرموێ: لە بەری دارخورماو بەری مێو، دوو شتان دروست دەکەن:

یەکەم: ماددەیەکی سەرخۆشکەر (تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا).

دووەم: ڕزقو ڕۆزییەکی باش (وَرِزْقًا حَسَنًا)، کەواتە: ئەو ماددە سەرخۆشکەرە ڕزقێکی چاك نیەو خراپە، دیارە ئەوەش لە قۆناغی مەککەدا بووە، کە جارێ خوای پەروەردگار حوکمە شەرعییەکانی نەناردوونە خوارێ، تاکو بفەرموێ: شەراب مەخۆنەوە، نەشدەگونجا لەو قۆناغەدا قەدەغە بکرێ، بەپێی حیکمەتی خوای زانا، چونکە پێش ئەوەی خەڵك حەڵاڵو حەرامی بۆ دیاری بکرێ، دەبێ ئیمانو عەقیدەی هەبێو، عیبادەتی هەبێو، خوای پەروەردگاری ناسیبێو، بڕوای بە دوارۆژبێو بەرچاوی ڕۆشن بوو بێتەوە، ئنجا پێی بگوترێ وابکەو وامەکە، قۆناغی یەکەم ئەم ئایەتە بوو.

**قۆناغی دووەم**: ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ ...﴿٢١٩﴾﴾ البقرة، واتە: دەربارەی شەرابو قومار پرسیارت لێدەکەن: بڵێ گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیەو، هەندێ سوودو

کەڵکیشیان تێدا هەن بۆ خەڵکی، کە ئەمەش ئاماژەیەکی دیکەی بەهێزترە، کەواتە: شەڕاب‌و قومار گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیەو هەندێ وردە قازانجیشیان تێدا هەن، بەڵام دیسان خوا نەیفەرمووە: مەیخۆنەوە، بەس ئەوەی زۆر عاقڵ‌و لێزان بووبێ، هەر بە ئایەتەکەی سوورەتی (النحل) کە دەفەرمویّ: لە ترێ‌و خورما ماددەی سەرخۆشکەرو ڕزقێکی باشی لێ دروست دەکەن، کەواتە: دیارە شەڕاب ڕزقێکی باش نیە، هەر ئەوەندە بۆخۆی کەسانێك عەقڵیان بەقوەت بووبێ، بەڵگە بووە بۆئەوەی خۆیانی لێ دووربگرن، ئنجا ئەوەی پێشتریش حاڵی نەبووبێ، بە ئایەتی سوورەتی (البقرة) لێی حاڵی بووە، کە دیارە شەڕاب‌و قومار گوناهێکی گەورەیان تێدا هەیە.

**قۆناغی سێیەم**: خوای بێوێنە لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ ...﴿٤٣﴾ ﴾

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! توخنی نوێژ مەکەون بە سەرخۆشیی، هەتا دەزانن چی دەڵێن، (چونکە ئینسانی سەرخۆش نازانێ چی دەڵێ)، ئەمجارەش خوای کاربەجێ نەیفەرمووە: مەیخۆنەوە، بەڵکو فەرموویەتی: بە سەرخۆشیی نوێژ مەکەن، ئنجا مادام سەرخۆشیش تا چەند سەعات (وەك سەرخۆشەکان دەڵێن) بەری نادات، مانای وایە بۆیان نەبووە کە لە نێوان نوێژی نیوەڕۆو عەسر، یان شێوان‌و خەوتناندا بخۆنەوە، کەواتە: دوو دەرفەتیان هەبووە: لە دوای نوێژی بەیانی تاکو نیوەڕۆ دەرفەتێك بووە، وە لە دوای نوێژی خەوتنانیش تاکو بەیانی دەرفەتێك بووە واتە: خوا ماوەی شەڕاب خواردنەوەی زۆر لێ تەسك کردوونەتەوە، پێش ئەوەی یەکجاریی لێیان قەدەغە بکات.

**قۆناغی چوارەم**: ئەو ئایەتەی سوورەتی (المائدة) بوو کە خوای پەروەردگار شەڕاب‌و قوماری لەگەڵ بتپەرستیی دا باسکردن‌و، یەکجاریی لێی قەدەغەکردن، کە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾، واتە: ئەی

ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان شەراب و قومارو بت و صەنەمەکان و زەلەمەکان {(أزلام): کە بۆ یانسیب بەکاریان هێناوە} پیسن لە کردەوەی شەیتانن، خۆتانیان لێ بە دووربگرن، بۆئەوەی سەرفرازبن. ئنجا نەفامی وا هەیە دەڵێ: خۆ خوا لەوێشدا نەیفەرمووە: شەراب مەخۆنەوە، بەس فەرموویەتی: خۆتانیان لێ دووربگرن! بەڵام بێگومان خۆ دوورگرتن زۆر بەقووەتترە لەوەی بڵێ: مەیخۆوە، چونکە لێرە کە فەرموویەتی: خۆتانی لێ دووربگرن واتە: مەیکڕن، مەیفرۆشن، لەو مەجلیسە دامەنیشن کە تێیدا دەخورێتەوە، ڕەفاقەتی ئەوانە مەکەن کە دەیخۆنەوە، خۆ لێ دوورگرتن هەر تەنیا خواردنەوەکەی ناگەیەنێ، بەڵکو زۆر شتی دیکەش دەگەیەنێ، کە هەموویان حەرامن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە.

وە لەمبارەوە ئەم دەقە هەیە: ﴿عَنْ أَبِي مَيْسَرَةَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ قَالَ: لَمَّا نَزَلَ تَحْرِيمُ الْخَمْرِ، قَالَ عُمَر: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شَافِياً، فَنَزَلَتْ هَذِهِ الآيَةُ الَّتِي فِي سُورَةِ الْبَقَرَةِ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَا ... ﴾، فَدُعِيَ عُمَرُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شَافِياً، فَنَزَلَتْ الآيَةُ الَّتِي فِي سُورَةِ النِّسَاءِ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ ...﴿٤٣﴾ ﴾، فَكَانَ مُنَادِي رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ إِذَا أَقَامَ الصَّلاةَ نَادَى أَنْ لا يَقْرَبَنَّ الصَّلاةَ سَكْرَانُ، فَدُعِيَ عُمَرُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ، فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ، فَقَالَ: اللَّهُمَّ بَيِّنْ لَنَا فِي الْخَمْرِ بَيَاناً شَافِياً، فَنَزَلَتْ الآيَةُ الَّتِي فِي الْمَائِدَةِ، فَدُعِيَ عُمَرُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ فَقُرِئَتْ عَلَيْهِ فَلَمَّا بَلَغَ: ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾، قَالَ: فَقَالَ عُمَرُ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُ: انْتَهَيْنَا انْتَهَيْنَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحمَدْ برقم: (٣٧٨) تعليق شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح رجاله ثقات، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٧٠)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٣٠٤٩)، وَصَحَّحَهُ الألباني}، واتە: ئەبی مەیسەرە دەڵێ: کاتێك خوا قەدەغەکردنی شەرابی نارده خوار، عومەر خوا لێی ڕازی بێ، گوتی: ئەی خوایە! دەربارەی شەراب خواردنەوە ڕوونکردنەوەکی باشمان بۆ بنێرە خوار (ئایا بیخۆینەوە یان نەیخۆینەوە؟

چونکە هەستێکی زۆر بە قووەتی هەبووە) ئیدی ئەو ئایەتەی سوورەتی (البقرة) هاتە خوار کە دەفەرمویٚ: ﴿يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ قُلْ فِيهِمَا إِثْمٌ كَبِيرٌ .... ﴾، عومەر بانگکراو ئایەتەکەی بۆ خوێندرایەوە (بەڵام تەواو دڵی پێیدانەکەوت) گوتی: ئەی خوایە! دەربارەی شەراب خواردنەوە ڕوونکردنەوەیەکی باشمان بدەیە (ئایا بیخۆینەوە یان نەیخۆینەوە؟)، ئنجا ئەو ئایەتەی دیکەی سوورەتی (النساء) هاتە خوارێ کە دەفەرمویٚ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَقْرَبُوا الصَّلَاةَ وَأَنْتُمْ سُكَارَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ ... ﴿٤٣﴾﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! توخنی نوێژی مەکەون بە سەرخۆشیی (واتە: هەتا سەرخۆشن نوێژی مەکەن، جا دوای هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەی سوورەتی (النساء) بانگدەری پێغەمبەر ﷺ کە بانگی دەداو قامەتی دەکرد، دەیفەرموو: ئەوەی سەرخۆشە با جارێ نەیەتە نوێژ، (واتە: سەرخۆشەکانیش بۆیان هەبوو نوێژێ بکەن، بەڵام دەیفەرموو: با نەیەن بۆ نوێژێ، یانی لە ماڵی خۆیان نوێژێ بکەنو نەیەن بۆ مزگەوت، یان با بە سەرخۆشیی نوێژێ نەکەن، تاکو سەرخۆشیی بەریاندەدات) ئنجا عومەر دووبارە بانگکرا خوا لێی ڕازی بێ، وە ئەو ئایەتەی (النساء)یشی بەسەر خوێندرایەوە، دووبارە عومەر گوتی: ئەی خوایە! دەربارەی شەراب خواردنەوە ڕوونکردنەوەکی باشمان بدەیە، {واتە: پێویستیمان بەوە ناکات بڵێین: دەبێ شەراب حەرام بێ یان حەڵاڵ؟} ئنجا ئەو ئایەتە کە لە سوورەتی (المائدة)دا هەیە هاتە خوار، کە دەفەرمویٚ: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَنْ يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَنْ ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ فَهَلْ أَنْتُمْ مُنْتَهُونَ ﴿٩١﴾﴾، (سەرەتا دەفەرمویٚ: ئەوانە لە کردەوەی شەیتانن، وازیان لێبێنن، دوایی دەفەرمویٚ: ئایا واز ناهێننو دەستبەرداری شەراب نابن؟!) جا کە بەسەریدا خوێندرایەوە، عومەر گوتی: (انْتَهَيْنَا

انْتَهَيْنَا) وازمان هێنا، وازمان هێنا، مادام خوا فەرمووی: پیسەو لە کردەوەی شەیتانە، ئایا هەر واز ناهێنن؟! ئەوە وازمان هێنا، وازمان هێنا.

## سێ: حوکمی خواردنەوەی شەراب:

دیارە شەراب حەرامەو خواردنەوەی شەراب یەکێکە لە گوناهە گەورەکان، وە لە قسەی خەلیفەی سێیەم (عُثْمَان بْنَ عَفَّان)دا هاتوە خوا لێی ڕازی بێ، گوتوویەتی: {اجْتَنِبُوا الخَمْرَ فَإِنَّهَا أُمُّ الخَبَائِثِ}(أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ برقم: (٥٦٦٦) قال الشيخ الألباني: صحيح موقوف)، واتە: خۆتان دووربگرن لە شەراب، بێگومان دایکی هەموو گوناهەکانە.

یانی: لە ئەنجامی شەراب خۆرییدا تووشی زۆر گوناهی دیکە دەبن.

شایانی باسیشە ئێمە لە مەسەلەی سێیەمدا چۆنیەتی دەلالەتی ئەو سێ ئایەتە کە بە دوازدە شێوە دەلالەت دەکەن، لەسەر ئەوەی شەراب خواردنەوە قەدەغەیە، باس دەکەین، چونکە هەندێك لە خەڵکی نەفامو سەرکێڵ، دەڵێن: کوا خوا نەیفەرمووە شەراب مەخۆنەوە، هەر دەفەرموێ: پیسەو لە کردەوەی شەیتانە، هەر دەستی لێ هەڵناگرن؟! وە دەفەرموێ: نزیکی مەکەون، بەلام دوایی باسی دەکەین کە لەڕاستییدا ئەوەی خوا فەرموویەتی بەهێزترە لەوەی کە بفەرموێ: مەیخۆنەوە، کە دەفەرموێ: نزیکی مەکەون، یانی: نەك هەر مەیخۆنەوە، هیچ جۆرە مامەڵەیەکی لەگەڵ مەکەن، بۆ وێنە: ئەوانەی دەشیخۆنەوە لەلایان دامەنیشن، بەلام ئەگەر فەرموویای: مەیخۆنەوە، بەس خواردنەوەکەی حەرام بوو، بەلام ئێستا هەموو شتەکانی دیکەشی حەرامن، وەك دوایی باسی دەکەین.

ئنجا زانایان لەسەر ئەوەی کە شەراب خواردنەوە قەدەغەیە، یەك دەنگن، وە هیچ زانایەکی موعتەبەر نەیگوتووە شەراب خواردنەوە حەلاڵە، چەند فەرمایشتێکیش لەوبارەوە هەن:

١) ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنُ عِبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا: أَهْدَى رَجُلٌ لِرَسُولِ اللهِ ﷺ رَاوِيَةَ خَمْرٍ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: (أَمَا عَلِمْتَ أَنَّ اللهَ حَرَّمَ شُرْبَهَا)؟ فَسَارَّ الرَّجُلَ إِنْسَانٌ إِلَى جَنْبِهِ، فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّ ﷺ: (بِمَ سَارَرْتَهُ)؟ فَقَالَ: أَمَرْتُهُ أَنْ يَبِيعَهَا، فَقَالَ لَهُ

رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: (إنَّ الَّذِي حَرَّمَ شُرْبَهَا حَرَّم بَيْعَـهَا)، فَفَتَحَ الـمُزَادَتَيْنِ حَتَّى ذَهَبَ مَا فِيهِمَا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٩٠)، وَمُسْلِمٌ رقم: (١٥٧٩)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٤٦٦٤)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٤٩٤٢)، وَالدَّارَمِيُّ برقم: (٢١٠٣)}، واتـە: عبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس خـوا لـە خـۆیو بـابی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پیاوێـك مەشکەیەك کـە شـەڕابیان تێکـردوە، هێنـای بـۆ لای پێغـەمبەری خـوا ﷺ کردیـە دیـاری، پێغـەمبـەر ﷺ پێـی فـەرموو: نەتزانیـوە کـە خـوا قەدەغـەی کـردوە؟ گـوتی: نەخێـر، پیـاوێك بە چرپـە بە گوێـی دا چپاند، پێغەمبەر ﷺ لە کابرای پرسی چیت پێ گوت؟ کابراش گوتی: پێمگوت: بیفرۆشە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: ئەو کەسەی کە خواردنەوەی قەدەغەکردوە، فرۆشتنیشی قەدەغـە کـردوە، ئنجـا کابرا دەمی مەشـکەکەی گـرتو ڕۆی کرد، تاکو شـەڕابەکەی هـەمووی ڕشـت.

دیـاره ئـەو دەفرانـەی کـە شـەڕابیان تێکـردوونو شوشـتوویانو بەکـاریان هێنـاونەوەو پێغـەمبەر ﷺ پێـی نەفـەرموون بەکـاری مەهێنن.

٢) ﴿عَنْ عَبْدِ اللّٰه بْنِ عَمْرٍو رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰه ﷺ: (شَارِبُ الْخَمْرِ كَعَابِدِ الْوَثَنِ)﴾ {أَخْرَجَهُ الْبَزَّار برقم: (٢٢٢٥)، وَعَبدالرَّزَاق برقم: (١٧٠٦٤)، وَصَحَّحَهُ الألباني فِي (صحيح الجامع) برقم: (٣٧٠١)}، واتـە: عەبدوڵـڵای کـوڕی عەمـر خـوا لە خۆیو بابی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغـەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: شـەڕاب خـۆر وەك بـت پەرسـت وایـە.

کەواتـە: پێغەمبـەر ﷺ شـەڕاب خـۆری وەك بـت پەرسـت لـە قەڵـەم داوە، وە بەڕاسـتی وێکچـوونێکی زۆر بەجێیـە، وەك چـۆن بـت پەرسـت هەمیشـە لەگـەڵ بتەکـەی خـۆی دا خەریکـە، شـەڕاب خـۆریش هـەر لەگـەڵ پێکەکـەو شـەڕاب خـواردنەوەکەی خـۆی خەریکـە، زۆر بـە زەحمـەت دەسـتی لـێ بـەردەبێ، مەگـەر ئیمـانێکی باشـی هـەبێ.

٣) ﴿عَنْ ابْنَ عُمَرَ رَضِيَ اللّٰهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللّٰهِ ﷺ: (لُعِنَتْ الْخَمْرُ عَلَى عَشْرَةِ وُجُوهٍ: لُعِنَتِ الْخَمْرُ بِعَيْنِهَا، وَشَارِبُهَا، وَسَاقِيهَا، وَبَائِعُهَا، وَمُبْتَاعُهَا، وَعَاصِرُهَا، وَمُعْتَصِرُهَا، وَحَامِلُهَا، وَالْمَحْمُولَةُ إِلَيْهِ، وَآكِلُ ثَمَنِهَا)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٥٣٩١)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣٨٠) وَصَحَّحَهُ الألباني في (المشكاة)

برقم: (٢٧٧٧)}، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: لە دە ڕووەوە شەڕاب لەعنەتی لێکراوە:

١- لەعنەت لە خودی شەڕاب.

٢- لەو کەسەش کە دەیخواتەوە.

٣- لەو کەسەش کە دەیگێڕێ.

٤- لەو کەسەش کە دەیفرۆشێ.

٥- لەو کەسەش کە دەیکڕێ.

٦- لەو کەسەش کە دەیگوشێ.

٧- لەو کەسەش کە بۆی دەگوشرێ.

٨- لەو کەسەش کە هەڵیدەگرێ.

٩- لەو کەسەش کە بۆی دەبردرێ.

١٠- لەو کەسەش کە نرخەکەی دەخوات.

کەواتە: کە خوای زاناو شارەزا فەرموویەتی: ﴿فَٱجۡتَنِبُوهُ﴾، لێی دووربکەونەوە، بۆ ئەوەیە هەر دەیان بگرێتەوە، وە ئەگەر فەمووبای: مەیخۆنەوە، ئەو کاتە تەنیا ئەو کەسەی دەگرتەوە کە دەیخواتەوە، بەڵام کە دەفەرموێ: توخنی مەکەون، واتە: نە بیکڕنو نە بیفرۆشنو نە بیگوشنو نە هەڵیبگرنو نە بەشداریی ئەو کەسانەش بکەن لەسەر مێز دەیخۆنەوەو دایاننناوەو ... هتد.

٤) ﴿عَنْ عَبْدِ اللهِ بْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَالَ: (مَنْ شَرِبَ الْخَمْرَ فِي الدُّنْيَا، ثُمَّ لَمْ يَتُبْ مِنْهَا، حُرِمَهَا فِي الآخِرَةِ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٦٩٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٥٢٥٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥١٩١)، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٦٧٣)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣٧٣)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧٢٣٠)}، واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك شەڕاب لە دنیادا بخواتەوەو پاشان تۆبەی لێ نەکات، ئەوە لە دوارۆژدا لێی بێبەش دەبێ.

واتە: ناچێتە بەهەشت، چونکە هەندێك گوتوویانە: دەچێتە بەهەشت بەڵام شەرابی نادەنێ!

بەڵام ئەوە ڕاست نیەو هەر کەس چووە بەهەشت، هیچ شتێکی لێ قەدەغە نیە، (دواتر ڕای خۆم لەبارەی مانای ئەو فەرموودەیەوە دەخەمەڕوو).

٥) ﴿عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْرٌ، وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ، وَمَنْ مَاتَ وَهُوَ يَشْرَبُ الْخَمْرَ يُدْمِنُهَا، لَمْ يَشْرَبْهَا فِي الآخِرَةِ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٨٣١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٥١٨٥)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٦١)، وَقَالَ: حسن صحيح، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٧٩) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٦٦)}

واتە: عەبدوڵلای کوڕی عومەر خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: هەموو سەرخۆشکەرێك (خَمْر)ە، وە هەموو سەرخۆشکەرێك قەدەغەیە، هەر کەسێك شەراب بخواتەوە بمرێو لەسەری بەردەوام بێو، لێی پەشێمان نەبێتەوە، لە دوا ڕۆژدا نایخواتەوە.

<u>تێبینی:</u>

دیارە بە پێی ئەو دوو فەرمایشتە بابای مسوڵمانی مەیخۆر ناچێتە بەهەشت! کە دیارە ئەوەش وێڕای چەندان ئایەتو فەرموودە، لەگەڵ کۆدەنگیی زانایانیشدا تێکدەگیرێ، کە دەڵێن: خاوەنی گوناهە گەورەکان (أصحاب الكبائر) بە پێچەوانەی ڕای (خوارج)ەوە مادام ئەسڵی ئیمانیان هەبێ سەرەنجام دەچنە بەهەشت!

پێشەوایە مەبەست لەو دوو فەرموودەیە ئەگەر سەلمێنرا کە ڕاست (صحیح)نو، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموونی ئەوەیە کە:

١- بە سەلامەتیو بەبێ لێپرسینەوەو سزا "مادام تۆبەیان نەکردبێ" ناچنە بەهەشت.

٢- لەگەڵ ئیماندارانێك کە خاوەنی گوناهە گەورەکان نین، ناچنە بەهەشت بەڵکو دوا دەکەون!

## چـوار: پیسـی‌و پاكـیی شــەڕاب:

زانیمان شـەڕاب لە ڕووی مەعنەوییەوە پیســە، بـەڵام لـە ڕووی ڕواڵەتییـەوە ئایا شــەڕاب پیســە؟ واتە: بێنوێـژەو ئەگـەر پرێشـكێكی بـەر جلوبەرگـت بكەوێ، دەبـێ بیشـۆی؟ لەوبـارەوە زانایـان چـەند ڕایەكیـان هـەن:

زۆربەیـان دەڵـێن: پیسـە، واتە: بە شـوێنێكت بكـەوێ دەبـێ بیشـۆیەوە.

هەندێكـیش دەڵـێن: لـە ڕووی مەعنەوییـەوە پیسـەو حەڕامـە، بـەڵام لـە ڕووی ڕواڵـەتەوە پیس نیـەو پاكـە، وەك شـلەمەنییەكانی دیكـە وایـە، وە ئـەو زانایانـەی كە دەڵێن: پـیس نیـە، ئەمانـەن: (ربیعة ولیث بـن سـعد والـمُزَني صاحب الشافعي، وبعـض الـمتأخرین مـن البغـدادیین والقـرویین) (قُـرطُبي) لـە (الجـامع لأحكـام القـرآن)[1] دەڵـێ: ئەوانـە دەڵـێن: پاكـە.

وە (مُحَمَّـد الطـاهر بـن عاشــور) لــە تەفسـیرەكەی خۆیــدا، دەڵــێ: (الَّـذِي يَقْتَضِـيهِ النَّظَـرُ أنَّ الخَمْـرَ لَيْسَـتْ نَجِـسَ العَـينِ، وَأَنَّ مَسَاقَ الآيـةِ بَعِيـدٌ عَـنْ قَصْـدِ نَجَاسَـةِ عَيْنِهـا، إنَّمَـا القَصْـدُ أَنَّهَـا رِجْـسٌ مَعْنَـوي، وَلِـذَلِكَ وَصَـفَهُ بِأَنَّـهُ مِـنْ عَمَـلِ الشَّيْطَانِ .. ولأَنَّ النَّجَاسَـةِ تَعْتَمِدُ الخَبَاثَة والقَذَارة وَلَيْسَتِ الخَمْـرُ كَـذَلِكَ، وَإِنَّمَـا تَنَـزَّه السَّـلَفُ عَـن مُقَارَبَتِهَـا لِتَقْرِيـرِ كَرَاهِيَتِهَـا فِـي النُّفُـوس)[2]، واتـە: ئـەوەی كـە عەقـڵ پەسـندی دەكـاو دەیخـوازێ، ئەوەیـە كـە شـەڕاب لـە خــۆی پـیس نیـە، (وەك پیسـییەكی وا پێویسـتی بـە شـۆردن بـێ) سیاقی ئایەتەكـە تەماشا دەكـەین، دووره لەوەی مەبەسـتی ئـەوە بـێ كە شـەڕاب وەك پیسـیی عـەینی بێ، بەڵـكو مەبەسـت ئەوەیـە كــە لـە ڕووی مەعنــەوییەوە پیســە، (واتـە: خراپــەو قەدەغەیـە) بۆیــەش بــەوە وەسف كراوە كە لە كردەوەی شەیتانە، چونكە پیسیی، (واتە: پیسیی مـاددیی‌و بەرهەسـت) دەبـێ قێزەون‌و بێـزلێكراو بێ، كـە شــەڕاب (خَمْـر)یش بـەو شــێوەیە نیـە (وەك میـزو خوێن‌و پیسـایی) كە قێـزەونن.

---

١) ج٦، ص٢٥٢.

٢) التحریر والتنویر: ج٧، ص٢٧.

بەڵام زانایانی پێشێ بۆیە خۆیان لێ دوورگرتوە، بۆئەوەی کە بزانرێ شتێکی قێزەونو خراپە لە ڕووی ڕواڵەتیو مەعنەوییەوە، تاکو خەڵك خۆی لێ دووربخاتەوە، وە من ڕای دووەمم پێ چاکە، کە تەنیا لە ڕووی مەعنەوییەوە پیسەو لە ڕووی ڕواڵەتەوە پیس نیە.

هەندێکیش ئەوە بە بەڵگە دەهێننەوە کە پێغەمبەر ﷺ کاتێك ئایەتەکەی بۆ هاتە خوارێ، هاوەڵان هەرچی شەڕاب هەیە لە کوندەو مەشکەدا هەموویان ڕشتوەو، بەوێشدا ڕۆیشتوونو پریشکیشیان پێکەوتوە، ئنجا ئەگەر پیس بووایە، ئەوە پێغەمبەر ﷺ دەیفەرموو: وریابن پریشکتان پێ نەکەوێ، منیش دەڵێم: بەڵام ئەوە بەڵگەیەکی بەهێز نیە، هەرچەندە زانایان باسیان کردوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ڕواڵەتی ئایەتەکە هیچ پیسیی ناگەیەنێ، وە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەردا ﷺ هیچ ئاماژەیەك بەو پیسییە نەکراوە، کە وەك پیسایىو میز پیس بێ.

**پێنج : حیکمەتی قەدەغەکرانی شەڕاب :**

ئایا بۆچی شەڕاب قەدەغەیە؟ خوا ﷻ چوار هۆکاری بەیان کردوون، دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ٩١﴾، واتە: شەیتان دەیەوێ بە هۆی شەڕابو قومارەوە، دوژمنایەتییو ڕقو کینەتان لەنێواندا پەیدا بکاتو، لە یادی خواو نوێژ بتانگێڕێتەوە، دیارە ئەو چوار هۆکارەش زۆر شت کۆ دەکەنەوە، بەڵام وەك من سەرنجم داوە، لە حەوت ڕووەوە حیکمەتی شەڕاب قەدەغەکردنم دیاریی کردووەو ڕەنگە زیاتریش بن:

١- زیانی کۆمەڵایەتیی.

٢- زیانی مەعنەویی.

٣- زیانی تەندروستیی.

٤- زیانی ئابووریی.

٥- زیانی ئەمنیی.

٦- زیانی تاوانیی (الجنائي).

٧- زیانی ئەخلاقیی.

١- **زیانی کۆمەڵایەتیی**: دیارە ئایەتەکە ئاماژەی پێدەکات دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾، واتە: بێگومان شەیتان دەیەوێ لە ڕێی شەڕاب‌و قومارەوە دوژمنایەتیی‌و ڕق‌و بوغز بخاتە نێوانتان، بۆیە دەبینین شەڕاب خۆرەکان زۆر پێکەوە بەشەڕ دێن‌و بە مەست‌و بۆکس لێکدەدەن‌و، بە شەڕە چەقۆ یەکدی زامدار دەکەن، وە ئەوانەی شەڕاب خۆرن‌و معتاد دەبن لەجیاتی ئەوەی ماڵ‌و خێزانی بژیەنن دادەڕزێن، وە ئەگەر لەسەر شەڕاب خۆریی بەردەوام بن، دوایی معتاد دەبن‌و پێی سەرخۆش نابن، بۆیە دەبێ بیگوازنەوە بۆ جۆرێکی دیکەی بەهێزتر.

٢- **زیانی مەعنەویی**: واتە لە ڕووی ئیمان‌و دینداریەوە ئینسان کاتێك دەتوانێ عیبادەت بکات، ئەگەر عەقڵی تەواوبێ، بەڵام کاتێك عەقڵی لەدەستدا بەهۆی شەڕاب خواردنەوەوە، عیبادەتی لەدەست دەچێ.

٣- **زیانی تەندروستیی**: ئێستا هەموو پزیشکەکان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە مەی خۆریی‌و شەڕاب خۆریی، "ج جای سەرخۆشکەرەکانی دیکە" لەشی ئینسان دادەڕزێنێ‌و کاریگەریی خراپی هەیە بۆ سەر گەدەو سییەکان‌و دڵ‌و جگەرو گورچیلەو زۆربەی کۆئەندامەکان.

٤- **زیانی ئابووریی**: مەیخۆریی‌و موعتاد بوون بە بەکارهێنانی ماددە سڕکەرەکانەوە، بەرهەم کەم دەکاتەوەو، بابای سەرخۆش‌و موعتاد کارو کەسابەتی بۆ ناکرێ‌و نەخۆش دەبێ‌و، نەك ماڵ‌و خێزان بگرە مەسرەفی خۆیشی پێ ناکرێ.

٥- **زیانی ئەمنیی**: زۆرجار بەهۆی سەرخۆشییەوە، بابای سەرخۆش و موعتاد وەك جاسووسیی شتی لێ وەردەگرن و نهێنییەکانی لێدەردەهێنن.

٦- **زیانی تاوانیی**: زۆربەی ڕووداوی کوشتن و ڕاوو ڕووت و وەرگەڕانی سەیارەو دزیی و ڕێگریی، بەهۆی سەرخۆشییەوە ڕوودەدەن.

٧- **زیانی ئەخلاقیی**: مەیخۆریی و موعتادبوون دەبێتە مایەی داڕووخانی ڕەوشت و، بڵاوبوونەوەی خوو خدە دزێوەکان، چونکە مرۆڤ بە عەقڵ و هۆش چاکەو خراپە لە یەك جیادەکاتەوە.

بۆ زانیاریتان: لە وڵاتانی دەرەوە، بەرپرسان بۆیان دیاری دەکەن نابێ شەراب لە هەموو شوێنێك بخۆنەوە، بۆ وێنە: لە شوێنی کۆبوونەوەکان و، لە شوێنی کار، یان لە کاتی وتاردان و بڕیاردان و حوکم کردن ... هتددا.

## شەش: سزای مەیخۆریی:

زۆر تەماشای تەفسیرەکان و کتێبە فیقهییەکانم کردوە، بۆم دەرکەوت کە سزادانی مەیخۆریی مەسەلەیەکی (إجتهادي)یە، واتە: دەقێکی ڕوون و ئاشکراو بێ چەندو چوونی شەریعەت نییە، لەسەر سزای مەیخۆریی، واتە: سزای دنیایی، ئەگەرنا سزای قیامەت ئەوە دیارە، بەڵام لە ڕووی سزای دنیایی یەوە، چەند دەقێکمان هەن، چوارچێوەیەك دیاری دەکەن:

١/ لەوبارەوە ئەم دەقە گێڕدراوەتەوە: ﴿عَنْ عِكْرِمَةَ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: أَنَّ الشُّرَّابَ كَانُوا يُضْرَبُونَ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ: بِالأَيْدِي وَالنِّعَالِ وَبِالعِصِيِّ حَتَّى تُوُفِّيَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَكَانُوا فِي خِلافَةِ أَبِي بَكْرٍ أَكْثَرَ مِنْهُمْ فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَجْلِدُهُمْ أَرْبَعِينَ حَتَّى تُوُفِّيَ، فَكَانَ عُمَرُ مِنْ بَعْدِهِ يَجْلِدُهُمْ كَذَلِكَ أَرْبَعِينَ، ثُمَّ أُتِيَ بِرَجُلٍ مِنَ الْمُهَاجِرِينَ الأَوَّلِينَ وَقَدْ شَرِبَ، فَأَمَرَ بِهِ أَنْ يُجْلَدَ، فَقَالَ: أَتَجْلِدُنِي؟ بَيْنِي وَبَيْنَكَ كِتَابُ اللهِ، فَقَالَ عُمَرُ: (أَفِي كِتَابِ اللهِ تَجِدُ أَلاَّ أَجْلِدَكَ؟) فَقَالَ: إِنَّ اللهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿ لَيْسَ عَلَى ٱلَّذِينَ

ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ... ﴿٩٣﴾ ﴾المائدة، الآيَةَ؛ فَأَنَا مِنَ الّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ، ثُمَّ اتَّقَوْا وَآمَنُوا، ثُمَّ اتَّقَوْا وَأَحْسَنُوا، شَهِدْت مَعَ رَسُولِ اللّهِ ﷺ بَدْراً وَأُحُداً وَالْخَنْدَقَ وَالْمَشَاهِدَ كُلَّهَا، فَقَالَ عُمَرُ: (أَلَا تَرُدُّونَ عَلَيْهِ مَا يَقُولُ؟) فَقَالَ ابْنُ عَبَّاسٍ: إنَّ هَذِهِ الآيَاتِ أُنْزِلَتْ عُذْراً لِمَنْ صَبَرَ وَحُجَّةً عَلَى النَّاسِ؛ لأَنَّ اللّهَ تَعَالَى يَقُولُ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾المائدة، الآيَةَ، ثُمَّ قَرَأَ حَتَّى أَنْفَذَ الآيَةَ الأُخْرَى؛ فَإِنْ كَانَ مِنَ الّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ فَإِنَّ اللّهَ تَعَالَى قَدْ نَهَاهُ أَنْ يَشْرَبَ الْخَمْرَ، فَقَالَ عُمَرُ : (صَدَقْت، مَاذَا تَرَوْنَ؟: فَقَالَ عَلِيٌّ:) إنَّهُ إذَا شَرِبَ سَكِرَ، وَإِذَا سَكِرَ هَذَى، وَإِذَا هَذَى افْتَرَى، وَعَلَى الْمُفْتَرِي جَلْدُ ثَمَانِين﴾ {أَخْرَجَهُ النَّسَائِيُّ في (الكبرى) برقم: (٥٢٨٨)، وَالحَاكِمُ برقم: (٨١٣٢) ووافقه الذهبي، وَالدَّارَقُطْنِيُّ (٣/١٦٦)، وَالطَّبَرَانِيُّ برقم: (١١٥٥٠)}

واتە: عیکرەمە لە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباسەوە دەگێڕێتەوە، مەیخۆرەکان لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا ﷺ بە دەستو بە نەعلو بە گۆچان، (وە لە ڕیوایەتێکدا هاتوە: وە بە پۆشاك، دیارە قوماشێکیان پێ بووە، دەبێ بایی ئەوەندە هێشاندبێتی) بەوە لێیان دەدرا، تاکو پێغەمبەری خوا ﷺ وەفاتی کرد، (واتە: سزایەکی دیاریکراوی نەبوو، بۆیەش پێشتر باسمکرد کە سزای مەی خۆریی سزایەکی ئیجتهادییەو، دەقێکی شەرعیی ڕوونو بێ چەندوچوونی لەسەر نیە، ئنجا ئەم دەقەش پشتگیریی قسەکەی ئێمە دەکات)، وە لە سەردەمی جێنشینایەتی ئەبوبەکردا خوا لێی ڕازی بێ، شەراب خۆرەکان ژمارەیان زۆرتر بوو، لە ڕۆژگاری پێغەمبەر ﷺ، بۆیە ئەبوبەکر خوا لێی ڕازی بێ سزای مەیخۆریی دیاری کرد بە چل قامچی، (یان چل دار)، هەتا وەفاتی کرد، دوایی لە سەردەمی عومەردا خوا لێی ڕازی بێ، (واتە: لە سەردەمی خیلافەتی عومەردا) ئەویش بە هەمان شێوە چل قامچی، (یان چل داری) لێ دەدان، هەتا ڕۆژێکیان پیاوێك لە کۆچکەرانی یەکەمیان هێنا کە شەرابی خواردبوووەوە، (واتە: یەکێك بوو لەوانەی کە لە جەنگەکاندا بەشداریی کردوە،

وە هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ بووە، بەڵام بە هەرحاڵ ئەو گوناهەی کردوە)، عومەر فەرمانی کرد: سزای بدەن، (واتە: چڵ دار، یان چڵ قامچی لێبدەن)، ئەو هاوەڵەش گوتی بۆچی قامچیم لێ دەدەی؟ لە نێوانی منو تۆدا کتێبی خوا هەیە؟ عومەر گوتی: لە کوێی کتێبی خودا دەبینیی کە من سزات نەدەمو قامچیت لێ نەدەم؟ ئەو هاوەڵەش گوتی: خوای بەرز دەفەرموێ:

﴿ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ ... ﴿٩٣﴾ ﴾المائدة،

جا گوتی: وە منیش لەو کەسانەم ئیمانیان هێناوەو، کردەوە باشەکانیان ئەنجام داوە، وە لەو کەسانەم پارێزکارییان کردووەو ئیمانیان هێناوەو، وە لەو کەسانەم پارێزکارییان کردووەو چاکەکارییان کردوە، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بەشداریی جەنگەکانی بەدرو ئوحودو خەندەقو هەمموو ئەو ڕووبەڕووبوونەوانەی کە پێغەمبەر ﷺ تێیاندا تەشریفی بووە، منیش لە خزمەتی دابووم، (لەبەرئەوە من لەوانەم کە خوا دەفەرموێ: ئەوانەی کە ئیمانو تەقواو، پاشان ئیمانو تەقواو ئیحسانیان هەیە سزایان لەسەر نیە، کەواتە: نابێ من سزا بمگرێتەوە) عومەر گوتی: ئایا بەرپەرچی نادەنەوە لەسەر ئەوەی کە دەیڵێ؟ دیارە کۆڕو مەجلیسێك بووە، عەبدوڵلای کوڕی عەبباس لە کۆڕو مەجلیسەکەدا بوو خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، گوتی: ئەم ئایەتانە نێردراونە خوار، وەك عوزر بۆ ئەوانەی ڕابردوون، وە بەڵگەشن لەسەر خەڵك، (واتە: بۆ ئێستاو بۆ دوای هاتنە خوارەوەیان، بەڵگە بوون لەسەر خەڵك)، چونکە خوای بەرز دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾ ﴾المائدة،

ئنجا دوایی ئایەتەکەی دیکەشی بەدوادا خوێندەوەو هەمووی تەواوکردن، دوایی عەبدوڵلای کوڕی عەبباس گوتی: ئەگەر ئەو کەسە کە شەڕابی خواردۆتەوە لەوانە بێ کە ئیمانیان هێناوەو، کردەوە باشەکان ئەنجام دەدەن، وە لەوانەبێ کە ئەهلی ئیمانو ئەهلی تەقواو ئەهلی ئیحسانن، ئەوە بێگومان خوا لێی قەدەغە کردوە کە شەڕاب بخواتەوە، کە لێی قەدەغە کردوە شەڕاب بخواتەوە، خواردیشیەوە، مانای وایە گوناهبارە، (کەواتە: ئەوە کە دەفەرموێ:

گوناهیان لەسەر نیە، واتە: بەنسبەت ئەوانەی پێشی، پێش ئەوەی حوکمی قەدەغەبوونی شەراب دابەزێ) عومەر گوتی: ڕاست دەکەی، ئێستا ڕاتان چییە؟ چۆنی سزا بدەین؟ عەلی خوا لە هەموویان ڕازی بێ، (قیاسی کرد، بەڵگەیەکی مەنتیقیی هێنایەوە، کە دیارە ئیجتیهادو هەڵهێنجانی حوکمە شەرعییەکان هەمووی بە عەقڵە) گوتی: هەر کەس شەرابی خواردەوە سەرخۆش دەبێ، کە سەرخۆش بوو قسان دەبزرکێنێ، قسەی بێڕێو جێ دەکات کە قسەی بێڕێو جێی کرد، بوختان دەکات بۆ خەڵك، کە بوختانی کرد (واتە: بوختانی داوێنپیسیی بە ئافرەتێك یان بە پیاوێکی پاك) ئەوە دەبێ هەشتا قامچی لێبدرێ، {خوای پەروەردگار لە سوورەتی (النور)دا وادەفەرموێ،

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ۝٤ ﴾} کەواتە دەبێ سزاکەی هەشتا قامچی بێ، (یانی: ئەویش ڕای خۆی گوتو دەقێکی نەهێنایەوە، مانای وایە ئیجتیهادی کرد) ئیدی عومەر فەرمانی کرد هەشتا قامچیان لەو هاوەڵەدا.

٢/ دەقێکی دیکە هەر لەوبارەوە کە سزای مەی خۆریی‌و شەراب خۆریی، یاخود بەکارهێنانی ماددە سەرخۆشکەرەکان، شتێکی دیارییکراو نیە لە شەریعەتدا، ئەم دەقەیە: ﴿عَنِ السَّائِبِ ابْنِ يَزِيدَ قَالَ: كُنَّا نُؤْتَى بِالشَّارِبِ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللهِ ﷺ وَإِمْرَةِ أَبِي بَكْرٍ وَصَدْرًا مِنْ خِلافَةِ عُمَرَ، فَنَقُومُ إِلَيْهِ بِأَيْدِينَا وَنِعَالِنَا وَأَرْدِيَتِنَا حَتَّى كَانَ آخِرُ إِمْرَةِ عُمَرَ فَجَلَدَ أَرْبَعِينَ حَتَّى إِذَا عَتَوْا وَفَسَقُوا جَلَدَ ثَمَانِينَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (١٥٧٥٧)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٦٧٧٩)، وَالحَاكِمِ برقم: (٨١٢٧)}، واتە: سائیبی کوڕی یەزید یەکێکە لە هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ، دەڵێ: ئێمە لە ڕۆژگاری پێغەمبەری خوادا ﷺ مەیخۆریان دەهێنا بۆ لامان، وە لە ڕۆژگاری جێنشینایەتیی ئەبوبەکریشدا خوا لێی ڕازی بێ، وە ماوەیەکیش لە جێنشینایەتیی‌و حوکمڕانیی عومەر خوا لێی ڕازی بێ، (لە هەر سێ کاتەکاندا شەراب خۆریان کە دەهێنا) هەڵدەستاین لێمان دەدا، بە دەستمان، بە نەعلەمان، وە بە پۆشاکامان (دیارە وەك چۆن ئەفغانییەکان

شتێك لەسەر ملی خۆیان دادەنێن، یان یەمەنییەکان قوماشێکیان پێیە، ئەو پۆشاکەش قووەتێکی بووە، وەك پشتێنی کوردی گرێیەکی لێبدەی بۆئەوەی ئێشی هەبێ) هەتا لە دوا دوای ڕۆژگاری عومەردا خوا لێی ڕازی بێ، کردی بە چل دار، چل قامچی، تا کاتێك زێدەڕۆییان کردو لاڕێیان کرد، (واتە: شەراب خۆرەکان تێیانپەڕاند، دیارە ژمارەیان زیاتر بووە) سزایەکەی کردە هەشتا قامچی.

کەواتە: ئەوە مەسەلەیەکی ئیجتیهادییە، چونکە ئیجتیهادی هاوەڵانیش خوا لێیان ڕازی بێ هەر ئیجتهادە، مادام یەك دەنگ نەبووبن لەسەری، وە یەکدەنگیی (إجماع)ی زانایانیش دروست نابێ، مەگەر دەقێکی شەرعیی هەبێ، کەمتر وایە یەکدەنگیی (إجماع) دروست بووبێ، مەگەر پشت بە دەقێکی شەرعیی ببەستێ، کەواتە: ئەو سزادانە مەحاڵی قسەی تێدا هەیە، ئایا ئەوەندە بۆ کە دانراوە، کەمتر بێ، گرتن بێ، غەرامەی ماڵیی لێ بکرێ ... هتد، دەگونجێ ئەو سزایە قسەی تێدابکرێ لەلایەن دەوڵەتی ئیسلامیی و شەرعزانان و یاسادانەرەکانەوە، کە یاسا دادەنێن بۆ دەوڵەتێکی ئیسلامیی لەم ڕۆژگارەدا، چونکە دەقێکی شەرعیی پابەندکەرمان بەدەستەوە نیە، بڵێ: دەبێ هەر ئاوابێ.

## حەوت‌وکۆتایی: کەم‌و زۆریی شەراب کاریگەریی نیە لەسەر حوکمی شەراب خواردنەوە:

ئەوەش فەرمایشتی پێغەمبەری ﷺ لەسەرە: ﴿مَا أَسْكَرَ كَثِيرُهُ فَقَلِيلُهُ حَرَامٌ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٦٧٤)، وَأَبُو دَاوُد برقم: (٣٦٨١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٨٦٥) وَقَالَ: حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٥٦٠٧) وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٣٨٢)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣٩٣) عَنْ جابر بن عبدالله، قَالَ الشيخ الألباني: حَسَنٌ صَحِيحٌ}، واتە: هەر شتێك بە زۆری سەرخۆش بی، کەمیشی حەرامە.

یەك دڵۆپەشی حەرامە، مادام ئەگەر زۆری بخۆیەوە پێی سەرخۆش بی، ئەوەش مەسەلەیەکی گرنگە چونکە هەندێ کەس دەڵێن: ئێمە بیرە دەخۆینەوە، پێی سەرخۆش نابین، من خەڵکی مسوڵمانم بینیوە لەم ڕۆژگارەی خۆماندا، نوێژکەریشە، ڕۆژووگریشە گوتوویەتی: مامۆستا! من جار جار بیرە دەخۆمەوە لەبەرئەوەی سەرخۆش نابم‌و ئەگەر سەرخۆش نەبی، قەیدێ ناکات،

گوتم: نەخێر وانییە، ئنجا قسەکەشی پاڵ دەدایە لای فەتوای کەسایەتییەکی ئیسلامیی، کە دوایی ساغم کردەوە وانەبوو، گوتم: ئەوە وانییە، چونکە دەقی فەرمایشتی پێغەمبەرمان ﷺ هەیە کە هەر شتێك بە زۆری سەرخۆش بێ، کەمیشی قەدەغەیە، ئەوە لەلایەك، وە لەلایەکی دیکەشەوە: بەڵێ حیکمەتی قەدەغەبوونی مەیخۆریی سەرخۆش بوونە، بەڵام جگە لەوە زیانی دیکەشی هەیە، ئنجا ئەگەر زۆر بخۆیەوە، زۆر زیانت لێ دەدات، کەمیش بێ، کەم، بەڵام گرنگ ئەوەیە زیانی هەر هەیە، وە مەرجیش نیە حەتمەن سەرخۆش بێ، ئەوجار زیانت لێ بدات، پاشان لەوانەم بیستوە کە زۆر ڕادێن و (معتاد) دەبن بە شەراب خۆریەوە، دەڵێن: دوایی وای لێدێ هەر پێی سەرخۆش نابێ، بەدەنی لەسەری ڕادێ، ئنجا مانای وایە دەبێ لەو حاڵەدا لەسەریان هەڵگیرێ، ئەوەی زۆری بخواتەوە لەبەرئەوەی زۆری خواردۆتەوە سەرخۆش نابێ، دەبێ بۆ وان حەڵاڵ بێ؟! بەڵام ئەوەی کەم دەخواتەوە، چونکە سەرخۆش دەبێ، قەدەغەیە!! ئنجا بەردەوام بوون لەسەر مەی خۆریی دوایی کە مرۆڤ سەرخۆش نابێ، پەنا دەباتە بەر شتی دیکە، ماددەی بەهێزتر، یان دەرزی لەخۆدان، مانای وایە هەر لەسەری بەردەوام دەبێ، تاکو دادەڕزێ، لەبەر ئەوە شەریعەت ئاگربڕی کردووە دەڵێ: ئەگەر یەك دڵۆپەش بێ قەدەغەیە، چونکە لە دڵۆپەیەکەوە دەبێتە چەند دڵۆپەیەك و، لەوەش وەك فارس دەڵێن: (قطرة قطرة دَريا ميشوَد) دەریاش هەر لە دڵۆپان پێکدێ.

**دووەم: قومارکردن (المیسر):**

**١) پێناسەی قومارکردن:**

ئێمە پێشتر پێناسەی (مَیسر)مان کرد، کە بریتیە لة هەر یارییەك گرەوی (رِهان) تێدابێ، وە بابای دۆڕاو شتێکی دیاریکراو بدا بە براوە، دوو نەفەر، یان چەند نەفەرێك گرەو دەکەن، ئەوەی کە دەدۆڕێنێ ئەندازەیەك ماڵ دەدات بەوەی کە بردوویەتەوە، چونکە لە شەریعەتدا باسی سوار چاکیی (السّباق)و نیشانەدارکردن، (الرمي)یش کراوە، کە بێگومان ڕەوا (مباح)ن، چونکە لەواندا ئەندازەیەك ماڵ دادەنرێ لەلایەن هەموویانەوە، نەك بڵێی تەنیا لایەك دایبنێ، کە ئەوە دەبێ لە کتێبە فیقهییەکاندا بۆ تەفاصیل و وردەکارییەکانی بگەڕێین،

بەڵام گرنگ ئەوەیە قومار ئەوەیە كە تەرەفی دۆڕاو ئەندازەیەك ماڵ دەدات یان شتێك دەدات بە براوە، زانایان دەربارەی یارییەكانی دی كە لەسەر شت ناكرێن، قسەو باسی جۆراو جۆریان كردوە، ئنجا ئەو یاریانە بە پێی عورفو عادەتی میللەتان دەگۆڕێن، بۆ وێنە: شەترەنج یارییەكی جیهانییەو لەنێو هەموو میللەتاندا هەیە، بەڵام هەندێ یاریی ڕەنگە هەر لەنێو ئێمەدا هەبن، وەك: (كلاوكلاوێنە)، (دامە)و (دۆمینە)و (تاوڵە) و (سێ ڕیزكێنە)و (نۆڕیزكێنە)و... هتد، كە من هیچیان نازانم، بەڵام گوێبیستیان بوومو خەڵك دەیكەن، جاری وایە هەندێكیان بەشێك لە مەلاو مامۆستایانیش كردوویانەو دەیكەن.

ئنجا ئایا ئەوانە حوكمیان چییە؟!

هەڵبەتە زانایان لەوبارەوە ڕاجیاییان هەیە، هەندێكیان ئەو یاریانە هەموو بە قەدەغە دادەنێن، وە هەندێكیشیان دەڵێن: مادام مایەی ڕقو دوژمنایەتیی نەبنو، نەبنە هۆی نوێژ جواندنو خوا لەیادكردن، وە لەسەر پارەش نەبن، ئەوە ڕەوان (مباح)ن، یارییەكی فیكرییە ئینسان دەیكات، بەتایبەتی شەترەنج بیستوومە كە نەخشەدانانی جەنگو بیروٚكەی سیاسیو ئەو شتانەی تێدا هەیە، كە من بە داخەوە نایزانم، لەبەرئەوەش نیە نەیزانم چونكە بە حەرامی دەزانم، چونكە من پێموایە شەترەنجو، ئەو شتانەی دیكەی وەك شەترەنجن، مادام لەسەر پارە نەبن، وە نەبنە هۆی ئەوەی كە ڕقو دوژمنایەتیی پەیدابێ، كە ئەوە حیكمەتی حەرامكردنی قومارو شەرابە، وە نەبنە هۆی ئەوەی كە نوێژیان لەسەر بچوێنرێ، لەسەر ئەسڵی خۆیان كە ڕێپێدران (إباحة)ە، ماونەوە.

(مُحَمَّد الطاهر بن عاشور) لە تەفسیرەكەی خۆیدا دەڵێ: (أَمَّا مَا كَانَ مِنَ اللَّهْوِ بِدون قِمَار كَالشَطْرَنْجِ دُونَ قِمَار، فَذَلِكَ دُونَ المَيْسِر، لأَنَّهُ يَنْدرُ أن يصُدَّ عَنْ ذِكْرِ اللهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ، وَلأَنَّهُ لا يُوقِعَ فِي العَدَاوَةِ وَالبَغْضَاءِ غَالِباً، فَتَدْخُلُ أَحْكَامُهُ تَحْتَ أَدِلَّةٍ أُخْرَى)[1]، واتە: بەڵام ئەو كات بەسەربردنانەو ئەو یارییو گەمانەی كە قومار نین، وەك شەترەنج كە قوماری تێدا نەبێ، (واتە: لەسەر پارەو شت ناكرێن، بۆیەش دەڵێ: وەك شەترەنج بەبێ قومار، چونكە دەكرێ

١) التحرير والتنوير: ج٧، ص٢٧.

شـەترەنج لەسـەر پـارە بکـرێ، ئەگـەر لەسـەر پـارەو شـت کـرا، ئـەویش هـەمان حوکمی پێشـووی هەیـە) ئـەوە ئەوانـە جیـان لـەو (مَیْسَر)ەی کـە خـوا قەدەغـەی کردوە، چونکـە بەدەگمـەن وایە کە ببێتـە هۆی ئەوەی بکـەرەکانی لـە یـادی خـواو لە نوێژ بگێڕنـەوە، وە نابنـە هـۆی ئـەوە کـە ئەنجامـدەرانی ئـەو یارییانـە بخەنـە نێـو دوژمنایـەتییو ڕقو کینـەوە، بـەزۆریی وایـە وانابـێ، بۆیـە حوکمیـان دەچێتە ژێـر هەندێ بەڵگەی دیکـەوە (کە مەبەستی پێ ئەوەیە ئەوانە لەسـەر حاڵەتی ڕەوایـی خۆیـان دەمێننـەوە).

## ٢) قۆناغـەکـانی قەدەغـەکردنـی قومـار (الـمَیْسر):

هەڵبەتـە مـن نـەمبینیوە زانایـان باسـی قۆناغـەکانی قەدەغـەبوونی قوماریـان کردبـێ، ئەوەنـدەی مـن بەرچـاوم کـەوتوە لـە تەفسـیرەکاندا کـە تەماشـام کـردن" نـزیکەی (١٥ - ٢٠) تەفسـیرێکم تەماشا کـردوە" بـەڵام ئاشـکرایە کـە قوماریش بـە پلەپلـەیی قەدەغـە کراوە، وە بە لای کـەمـەوە بە دوو قۆناغـدا تێپـەڕیوە:

<u>قۆنـاغی یەکـەم</u>: ئایەتەکـەی سـوورەتی (البقـرة)یـە کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِۖ قُلْ فِيهِمَآ إِثْمٌ كَبِيرٌ وَمَنَٰفِعُ لِلنَّاسِ وَإِثْمُهُمَآ أَكْبَرُ مِن نَّفْعِهِمَاۗ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَۗ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمُ ٱلْـَٔايَٰتِ لَعَلَّكُمْ تَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١٩﴾ ﴾، کـە لـە بـەرگی یەکـەمی ئـەم تەفسـیرەدا، ئـەو ئایەتەمان تەفسـیر کردووە ئەو بابەتەمان بـاس کـردوە.

واتـە: پرسـیارت لێدەکـەن دەربارەی مـەیو قومـار، بڵێ: گونـاهێکی گـەورەیان تێدایـە، وە چـەند سـوودێکیش بـۆ خـەڵك، وە گوناهەکـەیان گـەورەترە لـە سـوودەکەیان، ئـەوە قۆنـاغی یەکـەم بـووە، کـە خـوا نەیفـەرمووە: مەیکـەن، وەك دەبینـین، هـەروەك بۆ شـەڕابەکەش نەیفەرمووە: مەیخـۆن، بەڵام ئاماژەیـەکی زۆر بەقوەتـە کە ئەوە گونـاهێکی گـەورەی تێدایە، گوناهـە گەورەکەشی زیاترە لـە وردە سـوودەکانی، کە وەك گوتم سـوودەکانی زیـاتر یـان کـات بەسـەربەردنە، بەنسـبەت قومارەوە، یان ڕەنگە ئەوە بێ کابرا کە دەیباتەوە، پارەیەکی دەست بکـەوێ.

قۆناغی دووەم: ئەم ئایەتەیە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾ المائدة، وە پێموایە حوکمی کۆتایی لێرەدایە، وە نەمبینیوە وەك شەراب کە قەدەغەکردنەکەی بە چوار قۆناغدا تێپەڕیوە جگە لەو دوو قۆناغە قۆناغی دیکەی هەبن، حیکمەتی پلە پلەیی هەبوون لە قەدەغەکردنی قوماردا پلە پلەیی بەکارهێنان لە قەدەغە کردنی قوماریش هەر ئەوەیە، کە ئەوانە "مەیخۆریی‌و قومارکردن" دوو عادەتی زۆر ڕیشەدار بوون لەنێو عەرەبدا، وە لەنێو هەر کۆمەڵگایەکدا ئەو عادەتانە کە خەڵك خویان پێوە دەگرێ، بە نووکە قەڵەمێك چارەسەر ناکرێن، ئەوەتا وەك لە دەقەکانی پێشێدا هێنامان، شەرابیش قەدەغە کراوە پێغەمبەری خوا ﷺ ڕای گەیاندووە، فەرمووییەتی بیڕێژن، کەچی خەڵك هەموویان هاوەڵ (صحابي) بوون لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ کەچی مەیخۆر هەر هەبوون‌و سزاش دراون! قەزیەکەش ئەوە نەبووە کە ئەو ئینسانە لە خوا ناترسێ، قەزیەکە ئەوە بووە کە نەفسی بەشەر وەختێك بە خراپەوە ڕادێ، بە گوناهێکەوە ڕادێ، دوایی بە ئاسانی ناتوانێ دەستی لێ هەڵبگرێ، وە حیکمەتی پەروەردەکردن لە ئیسلامدا لێرەدایە وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: {مُرُوا أَوْلادَكُمْ بِالصَّلاةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ، وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا، وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ، وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ﴾{أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٦٦٨٩)، وَابْنُ أَبِي شَيْبَة برقم: (٣٤٨٢)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٩٥)، وَقَال الشيخ الألباني: حسن صحيح)، واتە: منداڵەکانتان بە حەوت ساڵیی فەرمانیان پێ بکەن بە نوێژ، وە کە بوونە تەمەنی دە ساڵیی لێیان بدەن لەسەر نوێژ نەکردن، وە شوێنی نوستنیان لێك جیابکەنەوە.

لێیان بدەن، واتە: گوێیان ڕابکێشن، زللەیان لێبدەن، تێیان بگەیەنن کە پێتان ناخۆشە نوێژ ناکەن، چونکە ئەو منداڵە لە تەمەنی دە ساڵیی دا هیچی لەسەر نیە، بەڵام ئەگەر پێوەی ڕاهات، دوایی نوێژکردن زۆر لەسەر قالبی خۆش دەبێ‌و دەبێتە بەشێك لە کەسایەتیی، شتی باش ئەگەر ئینسان پێوەی ڕابێ، چونکە لەگەڵ فیطرەت‌و عەقڵیشی دا دەگونجێ، دەبێتە شتێکی ڕیشەدار لە

بوونیدا، بەڵکو شتی خراپیش ئینسان ئەگەر پێوەی ڕاهات، هەر دەبێتە بەشێك لێی، بۆ وێنە: کەسێك جگەرە دەکێشێ، کەسی وام بینیوە گوتوویەتی: وەڵڵا مامۆستا لە دە ساڵییەوە جگەرەم کێشاوە، گوتوومە چۆن؟ گوتوویەتی: بابم هەموو جارێ کە جگەرەی دەکێشا، جگەرەیەکی بە منیش دەدا، یان نەنکم، یان دایکم، یان کێ؟ بێگومان خوا خێریان بۆ نانووسێ، شتێکی خراپیان کردوە!

جا ئینسان شتی چاك و خراپ کە پێوەی ڕاهات و عادەتی پێگرت، دەبێتە بەشێك لە بوون و کیانی، بۆیە بە ئاسانیی دەستی لێ هەڵناگیرێ، هەر بۆیەش شەریعەت ئەو شتانەی قۆناغ قۆناغ و پلە پلە قەدەغە کردوون، چونکە مەسەلە هەر ئەوە نیە حوکم دەربکەی، گرنگ ئەوەیە پابەندیی پێوە بکرێ، کاتی خۆی لە ئەمریکا مەشهوورە کە ویستیان شەراب قەدەغە بکەن، چەند ملیار پارەیان سەرف کرد، چەند خەڵکیان سزادا، چەند چییان کرد، بەڵام لەبەرئەوەی خەڵکیان پەروەردە نەکردبوو، لەبەر ئەوەی کە بناغەیەکی عەقیدەیی و فیکریی پتەویان نەبوو، تەماشایان کرد، ئەو شەرابەی کە بە دزیی دەخورێتەوە، زۆر زیاترە لەوەی کە کاتی خۆی بە ئاشکرا دەخورایەوە، وە ئەوەی بە دزیی دروست دەکرێ و بە قاچاغ دەفرۆشرێ، زۆر زیاترە، بۆیە بە ناچاریی هەر بۆخۆیان پاشگەزبوونەوەو، گوتیان: ئەوە قانوونەکەمان هەڵوەشاندەوە، چونکە زەرەرمان کرد، خەڵکیش سزا دراو خەڵکیش نارەحەت کرا، وە شەراب خۆرەکانیش هەر زیاد بوون، بۆیە ئیسلام قۆناغ قۆناغ ئەو شتانەی قەدەغە کردوون، دوای ئەوەی کە زەمینەی بۆ خۆش کردن، زەمینەی عەقیدەیی، فیکریی، ئابووریی، سیاسی، ئنجا حوکمەکانی بۆ داناون، هەڵبەتە کاتی خۆی وابووە ئێستاش هەر دەبێ وابێ.

هەندێك مسوڵمانی عاتیفیی و سادەو سەرکێڵمان هەن، کە باسی جێبەجێکردنی یاساکانی شەریعەت دەکرێ، دەڵێ: وەختی خۆی پێغەمبەر ﷺ بەڵێ وایکردوە، پلە پلەیی ڕەچاوکردوە، بەڵێ قورئان بە (٢٣) ساڵ هاتۆتە خوارێ، بەڵام ئێستا ئێمە دەبێ بە (٢٣) خولەك هەمووی جێبەجێ بکەین! کە لەڕاستیدا ئەوە تێنەگەیشتنە لە دینی خواو ڕێبازی پێغەمبەر ﷺ کە ئەو زاتە مەزنە بەو هەموو گەورەییەی خۆی، وەحی خوای بۆ هاتوە، هاوەڵان

هێندەیان خۆشویستوە، ئنجا نەیتوانیوە ئەم قورئانە لە کەمتر لە (٢٣) ساڵدا بۆی دابەزێندرێو جێبەجێی بکات، ئێستا تۆ چۆن بە شەوو ڕۆژێك دێی هەمووی جێبەجێ دەکەی؟! بێگومان ناکرێو ئەوە خەیاڵ پڵاوە، بینای ئیسلام وەختی خۆی خشتو بەرد بەرد بینا کراوە، ئێستاش دەبێ دووبارە ئەگەر بویسترێ لە هەر کۆمەڵگایەکی ئیسلامیدا ئیسلام پیادە بکرێتەوە، پلە پلەیی ڕەچاو بکرێ، قۆناغ بەندیی ڕەچاو بکرێو، زەمینەی جێبەجێکردنی برەخسێندرێ، ئنجا حوکمە شەرعییەکان جێبەجێ بکرێن، بەڵێ خوای پەروەردگار شەریعەتی خۆی هەمووی تەواوکردووە، لە ئاسمان ناردوویەتە خوار بۆ زەوی، بەڵام جارێکی دیکە کە تۆ دایبەزێنیەوە سەر واقیعێکی دیارییکراو، دیسان پێویستی بە قۆناغ بەندیی‌و، بە پلە پلەیی دەکات، ئەگەر بەڕاستیی بویسترێ جێبەجێ بکرێ، بەڵام ئەگەر هەر بۆ موزایەدەبێ، ئەوە بڕیارماندا شەریعەت جێبەجێ بکرێ، بەڵام بە کردەوە جێبەجێ (تَطْبِيق) نەکرێ، یاخود خەڵك لامڵیی لێ بکات، مانای وایە هیچمان نەکردا!

## ٣) حوكمی قوماركـردن:

دیارە حوکمی قوماریش وەك هی مەیخۆرییە، کە قەدەغەبوونە، چونکە خوای پەروەردگار هەردووکی بەیەکەوە هێناون، هەڵبەتە ئێمە دوایی ئایەتەکان وردتر قسەیان لێدەکەین، ئنجا وێڕای ئایەتەکە کە زۆر بە ڕوونو ڕاشکاویی فەرموویەتی، کە دوایی باسی چۆنیەتی دەلالەتی ئایەتەکە دەکەین، سەبارەت بە قەدەغەبوونی قومارو شەراب، هەروەها (أنصاب وأزلام)، وێڕای ئەوەش، چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەریش ﷺ هەن سەبارەت بە قەدەغەبوونی قومار:

یەکەم: ﴿ مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ، فَكَأَنَّمَا صَبَغَ يَدَهُ فِي لَحْمِ خِنْزِيرٍ وَدَمِهِ ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ بِرقم: (٢٣٠٧٥)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٥٨٥٦)، وَالبُخَارِي فِي (الأدب المفرد) برقم: (١٢٧١)، وَأَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٩٣٩)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣٧٦٣)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٥٨٧٣)، قال الشيخ الألباني: حَدِيثٌ صَحِيحٌ}، واتە: پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: هەر کەسێك یاریی بکات بە نەردەشیر، ئەوە وەك ئەوە وایە دەستی خستبێتە نێو گۆشتو خوێنی بەرازەوە.

كە دیارە پیسن، یانی شتێكی حەرامو پیسی كردوە. نەردەشیر، نەردیشی پێ دەڵێن، كە بە كوردیی (زار)ی پێ دەڵێن، شتێكە چوار گۆشەیەو شەش ڕووی هەن، هەر ڕووی چەند خاڵێكی لەسەرن، شەشو پێنجو چوارو سێو دووو یەك، كە یاریی پێدەكرێ هەڵدەدرێ.

(المعجم الوسيط)یش لە لاپەڕە (٩١٢)دا ئاوا پێناسەی (نرد) دەكات كە وەك گوتم (نردشیر)یشی پێ دەگوترێ، دەڵێ: (النَّرْدُ: فَهُوَ لُعْبَةٌ ذَاتُ صندُوقٍ وَحِجَارَةٍ وَفَصَّين، تَعْتَمَد عَلَى الحَظِّ وَتُنْقَلُ فِيهَا الحِجَارَة عَلَى حَسَبِ مَا يَأْتِي بهِ الفَصّ: الزَهر، وَتُعْرَف عِنْدَ العَامَّةِ بالطَّاوِلَة، يُقَالُ: لَعِبَ بالنَّرْد) واتە: (نرد) بریتیە لە یارییەك كە لە صندوقێكو بەردێك پێكدێ (ئەو بەردە) دوو دیوی هەن، (هەڵبەتە ڕەنگە ئەوەش جۆرێكی بێ و ڕەنگە زۆر جۆری هەبێ) وە ئەو یارییە بەستراوەتەوە بە بەختو شانس (واتە: هەڵی دەدا بە كام دیوەی دا دەكەوێو كام دیوەی بۆ دەردەكەوێ)، وە بەردەكە دەگوازرێتەوە بەپێی ئەوەی كە ئەو مۆرە، (زارە) خاڵەكانی لێ دەردەكەون، لەلای خەڵكی بەگشتی بە (طاولة) ناسراوە، وە دەگوترێ (لَعِبَ بالنَّرْد).

<u>دووەم</u>: ﴿مَنْ لَعِبَ بِالنَّرْدَشِيرِ فَقَدْ عَصَى اللهَ وَرَسُولَهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (١٩٥٣٩)، وَالبُخَارِيُّ فِي (الأدب المفرد) برقم: (١٢٦٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٤٩٣٨)، وَالحَاكِمُ برقم: (١٦٠) وقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَيْخَين، وَالبَزَّار برقم: (٣٠٧٥)، وَابْنُ حِبَّانَ برقم: (٥٨٧٢) عَنْ أَبِي مُوسَى الأَشْعَرِيِّ}، واتە: هەر كەسێك یاریی بە نەردەشیر بكات، ئەوە سەرپێچیی لە خواو لە پێغەمبەری خوا كردوە.

<u>سێیەم</u>: ﴿قَالَ طَاوُوس، كُلُّ القِمَار مِنَ الْمَيْسِرِ، حَتَّى لَعِبِ الصِّبْيَانِ بِالْجَوْزِ وَالْكِعَابِ﴾ {أَخْرَجَهُ إبنُ أَبي شَيبه برقم: (٢٦٦٩٣)، وغيره) واتە: طاووس دەڵێ: هەموو جۆرەكانی قومار، (واتە: گرەوكردن لەسەر شتو یارییكردن لە (مَيْسر)ن، تەنانەت یاریی منداڵان كە لەسەر گوێزو كیعاب دەیكەن.

ڕەنگە شتێك بێ منداڵ لەسەر گوێز بیكەن، ئەو چەند گوێزان بەرێتەوە، وەك كەلایەنێی خۆمان لە كوردەوارییدا، یان بن دەستە لگاوو ئەو شتانە هەبوون، طاووس دەڵێ: هەموو ئەوانە لە (مَيْسر)ن، واتە: قەدەغەن.

من وا لەو فەرمایشتانەی پێغەمبەر ﷺ تێدەگەم کە ئەو کاتە دیارە ئەو یارییانە هەموویان لەسەر پارەو شت بوون، تەنیا بۆ سەرگەرمیی نەبوون، بۆیە پێمڤایە ئەگەر لەسەر پارەبن قەدەغەو حەرامن، هەرچەندە لە دەقەکەدا دیار نیە بڵێ لەسەر پارەیە، یان لەسەر پارە نیە، بۆیە هەندێك لە زانایان گوتوویانە: ئەو یارییانە بە رەهایی (مُطْلَق)ی حەرامن، هەر یارییەك لەسەر شانسەو لەسەر هەڵدانی مۆرە، یاخود بن دەستەو ئەو شتانەی کە هەڵدەدرێن، کامەت دەوێ شێر یان خەت؟ ئەوانە هەندێ لە زانایان هەموویان بە قەدەغە داناون، چونکە ڕواڵەتی فەرمایشتەکانیان وەرگرتوە.

هەندێکیش دەڵێن: لەبەرئەوەی عادەت وابووە کە لەسەر پارەو شت کراون، بۆیە پێغەمبەر ﷺ قەدەغەی کردوون، لەبەرئەوەی هەموویان هەر لەسەر شت بوون، یانی: گرەوکردن بوون، لەسەر پارەو شت بردنەوەو براوەو دۆڕاویان تێدا هەبووە، بەڵام ئەگەر هەر بۆ سەرگەرمیی بن، ئەوە قەدەغە نین، ئەوەش ڕایەکی زانایانە.

دیارە من ڕای دووەمم پێ ڕاستە، بەڵام بەو مەرجە کە:

یەکەم: نەبێتە هۆی چواندنی نوێژو لە خوا بێئاگابوون.

دووەم: نەبێتە هۆی دوژمنایەتییو ڕقو بوغز لە نێوان ئەو گەمەکەرانەدا کە یاریی بەو شتانە دەکەن، وَاللَّهُ أَعْلَم.

هەڵبەتە من بە قەتعیی ناڵێم ڕەوان، دەڵێم: بۆچوونم وایەو پێمڤایە ئەوە کە ئەو بەردە نەقڵ بکرێ لەوێ بۆوێ، تەصەووڕ ناکەم تەنیا لەبەر ئەوەندە قەدەغەبێو پێمڤایە لەبەرئەوە بووە کە لەسەر پارەو شت کراون، دەشگونجێ ڕایەکەی دیکەش ڕاست بێ، بە هەر حاڵ لەو شتانەدا کە ڕاجیایی هەیە، ئینسان نابێ بڵێ بە تەئکید هەر ئەو ڕایە ڕاستە.

## ٤) حیکمەتی قەدەغە بوونی قومار:

ئەوە خوای پەروەردگار ڕوونی کردۆتەوە، دەفەرمویّ: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاءَ فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلَاةِ

﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ ﴾، ئایەتەكە ئاماژە دەكات بە كۆمەڵێك حیكمەتی مەعنەویی‌و كۆمەڵایەتیی، كە دەفەرمویٚ شەیتان دەیەویٚ بە هۆی شەڕاب‌و قومارەوە لاتان بدات لە نوێژو لە یادی خوا، وە دوژمنایەتیی‌و ڕق‌و بوغز لە نێوانتاندا پەیدا بكات، دیارە لەم ڕۆژگارەماندا زەرەرو زیانەكانی قومار باشتر ئاشكرابوون، هەمووومان ڕەنگە بیستمان كە چەندان خێزان بە هۆی قومارەوە لێك هەڵوەشاون، هەبووە خێزانەكەی خۆی دۆڕاندوە لە قوماردا، هەبووە خانووەكەی خۆی دۆڕاندوە، هەبووە بە ملیۆنانی دۆڕاندوە، جاری وا بووە كە خەڵكی تێدا كوژراوە، ئەوەی ئایەتەكە دەیفەرمویٚ: دوژمنایەتیی‌و ڕق‌و بوغز لە نێوانتان پەیدا دەكات، زۆر ڕوون‌و ئاشكرایە چونكە كابرا یەك ملیۆن دۆلار یان زیاتر بەوی دیكە بدۆڕێنێ، چۆن ڕقی لێ هەڵناسیٚ؟! بە سەعاتێك یان بە چەند سەعاتێك، یان بە چەند دەقەیەك خانووەكەی بدۆڕێنێ، موڵك‌و ماڵەكەی هەمووی بدۆڕێنێ، حەتمەن ڕق‌و بوغزی دەچێتە دڵ، وە هەندێك لەوانە دوایی خۆشیان دەكوژن، كەسی وا هەبووە خۆی كوشتوە، كەواتە: ڕاستە قومار زیانی كۆمەڵایەتیی هەیە، زیانی خێزانیی هەیە، زیانی ئەخلاقیی هەیە، ئنجا هەیە لە ئەنجامی ئەوەدا كە پارەی لێ دەبڕیٚ، جا چ بۆ شەڕاب چ بۆ قومارو، چ بۆ تلیاك، تەنانەت بۆ جگەرەش، ڕەنگە شتی سووك بكات، من لە زیندانی ئەمریكاییەكان لەگەڵمدا هەبوون، قونچكە جگەرەی سەربازە ئەمریكییەكانی هەڵدەگرتەوە، كابرای سەربازی ئەمریكی نیوە جگەرەكەی فڕیٚ دەدا، لەو بەرپرسانەی سەردەمی ڕژێمی بەعس هەبوو، ئەو قونچكە جگەرانەی هەڵدەگرتنەوە! پێمدەگوتن: هەر ئەوەندە بەسە بزانن كە حەرامە، خۆتان زەلیل‌و زەبوون بكەن بۆ قونچكە جگەرەیەكی دوژمنەكەت! بەڵێ ئەو شتانەی كە خوا قەدەغەی كردوون، دوای ئەوەی كە خەڵك عادەتیان پێوە دەگریٚ، دوایی خۆیانیان بۆ زەلیل‌و زەبوون‌و شەرمەزار دەكەن.

وە لە ڕووی ئابوورییەوە وەك گوتم زیانی زۆر بە ئابووریی وڵات دەگات بەتایبەتی ئەوانەی كە بەرپرسن ئەگەر ئەوانە قومار بكەن، ئەوە دیارە بەرپرسەكان حوكمڕانەكان هەوڵدەدەن پارەو ئیمكانیاتی خەڵك خەزێنەی دەوڵەت بە هەر شێوەیەك لە شێوەكان بیٚ بۆخۆیان بدزن، بۆئەوەی قوماری پیٚبكەن، دوایی بدۆڕێنن، یان بیبەنەوە.

لە کۆتایی باسی شەڕاب‌و قوماردا دوو تێبینی دەخەمە ڕوو:

یەکەم: هیچ زانایەکم نەدیوە باسی سزای قومارکردنی کردبێ، لەو تەفسیرانەدا کە سەرنجم داون، یانی: سزای دنیایی، ئەگەرنا سزای قیامەتیی ئەوە هەر هەیە، بەڵام من پێموایە دەگونجێ دەوڵەت سزای جۆراو جۆر بۆ جۆرەکانی قومار دابنێ، واتە: مەجالی تێدا هەیە، وەك چۆن بۆ شەراب هیچ سزایەك دانەنراوەو، دەقێکی شەرعیی لەسەر نیە، بەڵام پێغەمبەرو ﷺ هاوەڵان‌و خەلیفە ڕەشیدەکان سزای شەراب خۆرانیان داوە، پێموایە ئەگەر ئەو کاتە قومارکردنیش زۆر باو بووایە لە کۆمەڵگای پێغەمبەردا ﷺ ڕەنگە سزایەکیان دانابووایە بۆ ئەوانەی قومار دەکەن، چونکە زۆرجار قومارکردنیش زیانەکانی کە لێی دەکەونەوە کەمترنین لە هی شەراب، لەبەرئەوە دەگونجێ دەوڵەت لەو بوارەدا ئیجرائات بکات‌و سزا دابنێ‌و یاسا دابنێ بۆ ڕێگرتن لە قومارکردن.

دووەم: ئەو یارییانەی لەسەر پارەو سامان ناکرێن، وە نابنە مایەی دوژمنایەتیی‌و ڕق، وە خەڵك گێڕانەوە لە یادی خواو لە نوێژ، بە بۆچوونی من لەسەر ئەسڵی خۆیان کە ڕەواییە دەمێننەوە، بەڵام بە مەرجێك ئەو دەرهاوێشتە خراپانەیان نەبن، دیارە وەك پێشتریش باسمکرد، هەندێك لە زانایان دەڵێن: بە هەر جۆرێك بێ، هەر قەدەغەن، کە من پێموایە ئەوانەی کە دەڵێن: بە هەر جۆرێك بێ هەر قەدەغەن، بەڵگەیەکی وایان بە دەستەوە نیە، چونکە ئەگەر بڵێن ئەوە نیە پێغەمبەر ﷺ وا دەفەرموێ، دەڵێین: ڕاستە، بەڵام تۆ دەبێ بزانی ئەو یارییەی کە بە (نەرد) کراوە چۆن بووە؟ لەسەر پارە بووە یان نا؟ لەبەرچی پێغەمبەر ﷺ بۆ ئەوەیان وایفەرمووە؟ ئەگەرنا ئەوکاتە شەترەنجیش هەبووە، بۆچی باسی شەترەنجی نەکردوە؟ ئایا چونکە لەسەر پارەو شت نەیانکردوە، بەڵام (نەرد) دیارە لەسەر پارەو شت بووە، یان هۆکارەکە ئەوەیە کە نەرد (زار) پەیوەندیی بە شانس‌و بەختەوە هەیە، بەڵام شەترەنج پەیوەندیی بە عەقڵ‌و فیکرەوە هەیە؟! بەڵام وەك گوتم ڕایەکەی دیکەش بە هەر حاڵ مادام ڕواڵەتی فەرمایشتەکان دەیگەیەنن، ئەوانیش هەر بواری قسەیان هەیە.

**مەسەلەی سێیەم:** خوای پەروەردگار بە دوازدە شێوە تەئکیدی قەدەغەبوونی شەڕاب و قوماری کردۆتەوە، لەم سێ ئایەتەدا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ ٩١ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحۡذَرُواْۚ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ٩٢﴾، هەڵبەتە دەگونجێ دوازدە شێواز زیاتریش هەبن، بەڵام ئەوەندەی تەماشای تەفسیرەکانم کردووە تەماشای قسەی شارەزایانی زمانم کردوە، دەڵێن: بە دوازدە شێواز خوای پەروەردگار لەم سێ ئایەتەدا خستوویەتە ڕوو، کە شەڕاب و قومار حەڕامن، بۆیەش وا دەڵێم، چونکە جار جار کە موناقەشەم بووە لەگەڵ ئەوانەدا کە شەڕاب دەخۆنەوەو خۆشیان بە مسوڵمان دەزانن، گوتوویانە: هیچ بەڵگەیەکی ڕوون نیە لەسەر ئەوە کە شەڕاب حەڕامە، یان قومار حەڕامە، بە بەڵگەی ئەوە کە خوا نەیفەرمووە شەڕاب مەخۆنەوەو نەشیفەرمووە: قومار مەکەن، بەس فەرموویەتی: خۆتانیان لێ بە دوور بگرن! بەڵام لەڕاستیدا ئەوە هەڵەیە، بگرە خۆ هەڵخەڵەتاندنە، ئەگەرنا تۆ بە کەسێك بڵێی: لە فلان شتە دووربە، ئەوە لە پێشترە لەوەی بڵێی: مەیخۆ، یان مەیکە، چونکە لێی دووربە! یانی: هەر توخنی مەکەوە، ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: خوای بەرز دەیتوانی بفەرموێ: مەیخۆنەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی، بەڵام بۆچی نەیفەرمووە: مەیخۆنەوە؟ چونکە ئەگەر فەرمووبای مەیخۆنەوە، بەس خواردنەوەکەی قەدەغە دەبوو، بەڵام ئێستا کە دەفەرموێ: لێی دووربن، هەموو شێوە مامەڵەیەك لەگەڵ شەڕابدا، وە هەموو شێوە مامەڵەیەك لەگەڵ قوماركردندا دەگرێتەوە، واتە: دانیشتن لەگەڵیان، هاوکاریی کردنیان، ئەو شتەی قوماری پێ دەکرێ، بۆیان بێنی، ئەوانەی شەڕاب دەخۆن، مەزەیان بۆ دروست بکەی، لەگەڵیان دابنیشی، پێیان بفرۆشی، ... هتد، هەموو جۆرە مامەڵەیەك لەگەڵ قومارچییان و شەڕاب خۆراندا قەدەغەیە، ئنجا با تەماشا بکەین:

**شێوازەکانی دەلالەتی ئەوە کە شەڕاب و قومار قەدەغەن، ئەوانەن:**

**شێوازی یەکەم:** کە خوا دەفەرمویٚ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ﴾، (إِنَّمَا) ئامرازی چەسپاندنو کورت هەڵهێنانە (أداة الحصر والإثبات) وەك فەرموویێتی (مَا الخَمر والميسر والأَنْصَاب والأَزلام إلا رجساً من عمل الشيطان) یانی: مەشرووب خۆرییو قوماركردنو بتەكانو زەلەمەكان، جگە لە كردەوەی شەیتانو پیسیی هیچی دیکە نین.

**شێوازی دووەم:** کە خوای پەروەردگار شەڕابو قوماری بەراورد کردوونو جووتی کردوون، لەگەڵ (أنصاب) کە جۆرێك بوون، لە بتو صەنەمەكان، وە (أَزلام) کە جۆرێك بووە لەوەی یانسیبی پێكراوە، مانای وایە شەڕابو قومارێك لەگەڵ بتو صەنەم، لەگەڵ یانسیبدا بەراورد بكرێن، كەواتە: دیارە حوكمی وانیان هەیەو لەوان نزیكنو لە یەك جینسن.

**شێوازی سێیەم:** کە دەفەرمویٚ: (رِجْس) واتە: پیس، جا خوای پەروەردگار لە سوورەتی (الحج)دا دەفەرمویٚ: ﴿فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ ٣٠﴾، واتە: دەجا دووریی بكەن لە بتە پیسەكانو خۆتان لە قسەی درۆ دووربگرن، هەروەها لە سوورەتی (الأنعام)دا گۆشتی بەراز بە (رجْس) ناوبردوە، ﴿... أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ ... ١٤٥﴾ الأنعام، ئنجا کە لێرەشدا شەڕابو قومارو ئەنصابو ئەزلامی بە (رجْس) ناوبردوون، (رجْس) مانای وایە وەك وان پیسو خراپو گڵاوو قەدەغەن.

**شێوازی چوارەم:** کە دەفەرمویٚ: ﴿مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ ١٥﴾ القصص، واتە: لە كردەوەی شەیتانن، ئەگەر شتێك كردەوەی شەیتان بیٚ قەدەغە نەبیٚ، دەبیٚ چ شتێك قەدەغە بیٚ ! دیارە شەیتانیش خراپەو شەڕ نەبیٚ لێوەی پەیدا نابیٚ.

**شێوازی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱجۡتَنِبُوهُ ﴾، واتە: لێیان دووربن، توخنیان مەکەون، واتە: نەك هەر مەیانکەن، هەر توخنیان مەکەون، هەر خۆیان لە قەرە مەدەن، کە وەکو گوتم، بۆیە وایفەرمووە، تاکو شتەکانی دیکەش بگرێتەوە: دروستکردنی شەراب، کڕینی، فرۆشتنی، هەڵگرتنی، بردنی، دانیشتن لە کۆڕی شەراب خۆراندا، هەروەها بەنسبەت قوماریشەوە بە هەمان شێوە هەمووی دەگرێتەوە.

**شێوازی شەشەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، بەڵکو سەرفراز بن، کەواتە (الإجتناب عَنِ الخمر والمَيسر= الفلاح)، ئەگەر دەتەوێ سەرفرازبی، شەراب مەخۆو قومار مەکە، بت مەپەرستەو یانسیب مەکە، وە ئەگەر بە پێچەوانەوە بیکەینە هاوکێشەیەکی بیرکاری (إتيان الخمر وَالمَيسر = الخيبة والخُسْران) چونکە پێچەوانەی سەرفرازیی پەشێمانییو زەرەرمەندییە، کەواتە: هەر کەسێك شەراب بخواو قومار بکات، مانای وایە زەرەرمەندەو پەشێمانە، بەدبەختەو ماڵ وێرانە.

**شێوازی حەوتەم**: خوای زاناو شارەزا زۆر بە روونییو ڕاشکاویی ئامانجی شەیتان لە ڕەواج پێدانو پەرەپێدانی قومارو شەرابو ئەنصابو ئەزلامدا، وە هاندانی خەڵك بۆیان، ڕوون دەکاتەوە: ﴿ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ ﴾، بێگومان شەیتان دەیەوێ بە هۆی شەرابو قومارەوە، دوژمنایەتییو ڕقو کینەتان بخاتە نێوان، کەواتە: ئامانجی شەیتان ئەوەیە، ئنجا شەرابو قومار ئامرازی شەیتانن بۆ پەیداکردنی دوژمنایەتیو بوغز لە نێوانانداو ئاشکراشە: (مَا يُؤَدِّي إلَى الحرَامِ فَهُوَ حَرَامٌ) شەیتان بەهۆی چییەوە دوژمنایەتیو ڕقو کینە لەنێو خەڵکدا پەیدا دەکات؟ دیارە بەهۆی شەرابو قومارەوە، ئنجا مادام دوژمنایەتییو ڕقو قین حەرامن، دیارە هۆکارەکەشیان حەرامە، بە پێی ئەو بنچینەیەی کە زانایانی (أصول الفقه) دایاننـاوە: (مَا يُؤَدِّي إلَى الحرَامِ فَهُوَ حَرَامٌ) هەر شتێك سەربکێشێ بۆ حەرام، ئەویش حەرامە.

**شێوازی هەشتەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، شەیتان دەیەوێ بەهۆی شەڕاب و قومارەوە، ئێوە لە یادی خواو لە نوێژ، لابدات، هەڵبەتە دووركەوتنەوە لە یادی خواو لە نوێژ قەدەغەیە، وە هەر شتێكیش سەر بكێشێ بۆ ئەو قەدەغەیە، ئەویش قەدەغەیە.

**شێوازی نۆیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾، هەندێکیان گوتوویانە: خوا نەیفەرمووە وازبێنن، هەر پرسیار دەكات! دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾، ئایا دەست هەڵدەگرن؟ ئێمەش یان دەڵێین: بەڵێ (نَعَم)، یان دەڵێین: نەخێر (لا)، جارێ دەست هەڵناگرین! بەڵام بێگومان ئەو قسەیە وانیە، چونکە ئێمە بەهۆی ڕەوانبێژیی و زانینی شێوازەکانی دەربڕینەوە، لە قورئان تێدەگەین، لێرەدا کە دەفەرموێ: ﴿ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴾، ئایا دەست هەڵدەگرن؟ ئەوە کاتێك کە تۆ گلەیی زۆر لە کەسێك بکەی و شتی بۆ باس بکەی، ئنجا بڵێی هەر وازناهێنی؟! هەر ئەوە ناکەی؟! یان هەروا دەکەی؟! ئەوە پێی دەگوترێ: (الإستفهام الإنكاري) پرسیارکردنێکی نکوولیی کەرانە، کە ئەوە زۆر لەوە بە قوەتترە بڵێی: مەخۆ، مەیکە، چونکە کە دەفەرموێ: هەر دەیکەی؟ هەر وازناهێنی؟ یانی: هەڵوێستەکەی جێی سەرسورمانە!

**شێوازی دەیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَٱحْذَرُواْ ﴾، فەرمانبەریی خوا بکەن و فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن و وریابن، واتە: فەرمانبەریی خوا بکەن، وە فەرمانبەریی پێغەمبەر ﷺ بکەن لە نەکردنی خراپەدا، وە لە سەرپێچیی نەکردنیاندا، کە ئەو خراپەیە بریتیە لەچی؟ بریتیە لە مەیخۆریی و قومارکردن.

**شێوازی یازدەیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ ﴾، ئەگەر پشتتان هەڵکرد، کەواتە: ئەم کارانە واتە: شەڕاب خۆریی و قومارکردن و بت پەرستی و بەکارهێنانی زەلەمەکان بۆ دابەشکردنی شت، ئەوانە هەموویان پشت لە خوا

کردنـــن، چونکـــە دەفـــەرموێ: ﴿ فَإِن تَوَلَّيۡتُمۡ ﴾، واتــە: ئەگــەر پابەنــد نــەبوونو پشــتتان هەڵـکردو هەر لەســەر ئـەو شــتانە بـەردەوام بـوون، مانــای وایـە کردنـی ئەو شتانە، پشت لە خوا کردنـە، پشـت لە خـوا کردنـیش دیارە گونـاهـەو تاوانـە.

**شـــێوازی دوازدەیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّمَا عَلَىٰ رَسُولِنَا ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴾، بـزانن کـە لەســەر پێغەمبـەرمان ﷺ تـەنیا گەیانـدنی ڕوون هەیـە، واتــە: ئەگـەر ملکـەچ نـەبوون، ئـەوە هـیچ بیانووتـان نیـە، وە بـە ڕوونیـی پێتـان گـوتراوە، بۆیـە گونـاهی خۆتـان لـە ئەستۆی خۆتـان، کەواتـە: ڕاگەیانـدنی حـوکمی قەدەغـەکرانی مەیخـۆرییو قومـارکردنو بتپەرسـتییو یانسـیب لەو ئایەتـانەدا زۆر ڕوونـە.

ئەمـــە دوازدە شـــێوازی تـــەعبیریی بـــوون وەك بەڵگـــە لەســـەر قەدەغـــەبوونی شـەڕابـخۆریی، کـە ئـەم ئایەتـە موبارەکانـە دەیگەیـەنن، دیارە مـن تەماشـای زۆر لـە تەفسیـــرەکانم کـــردوە بەتایبـــەت: (محاسـن التأويـل)و (مفـاتيح الغيـب)، و (روح المعـاني)و (التحرير والتنوير)و لە هەموویان ئەو خاڵانـەم وەرگرتـوون.

**مەسـەلەی چـوارەمو کۆتـایی:** کە لەم ئایـەتی کۆتـایی وەردەگیرێ: ﴿ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، ئـــەم ئایەتـــە زانایانو توێژەرەوان مشتومڕی زۆریان لەبارەیەوە بووە، وە قسەو باسی زۆریان لەسەر کـردوە، دەفـەرموێ: ئەوانـەی ئیمانیـان هێنـاوەو کـردەوە باشـەکانیان ئەنجامـداوە، گوناهیـان لەسەر نیە، لەسـەر ئەوەی کە خـواردوویانەتەوە لە ڕابردوودا، ئەگەر پارێز بکەنو ئیمـان بێنن، وە کردەوە باشـەکان ئەنجام بدەن، پاشـان پـارێز بکەنو ئیمـان بێنن، پاشان پارێز بکەنو چاکە بکەن، وە خـوا چاکەکـارانی خۆشـدەوێ.

ئەوە مانـای ڕواڵـەتیـی ئایەتەکـەیە، بۆیە زانایـان کەوتوونەتـە مشـتومڕەوە، وە زۆر قسـەو باسـیان کـردوە، دیارە لـە هـۆی هاتنـە خـوارەوەکەیدا پێشـتـر باسمان کـردوە، کـە ئـەو هاوەڵـەی بـە هەڵـە لێـی تێگەیشـتبوو، وای زانیبـوو مەبەسـت پێـی ئەوەیـە کـە ئەوانـەی ئیمـانیان هێنـاوەو کـردەوەی باشـیان ئـەنجام داوە، ئەگـەر

بشخۆنەوە لەمەودوا زەرەری نیە، بەلاّم ئایەتەکە مەبەستی پێ ئەوەبوو کە ئەوەی لە ڕابردوودا خواردوویانەتەوە زەرەری نیە، کەواتە: مەبەست پێی ڕابردوویە، بەلاّم شوێنی ئیشکالو مشتومڕ بۆ زانایان ئەوەیە کە دەڵێن: خوای کاربەجێ پێشی دەفەرموێ: ﴿إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ﴾، دوایی دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْ﴾، واتە: وشەی (تقوی) جارێك لەگەڵ ئیمانو کردەوەی باشدا هاتوە، جارێك لەگەڵ ئیماندا هاتوە، جارێك لەگەڵ ئیحساندا هاتوە، ئایا دەبێ حیکمەتی ئەوە چی بێ؟!

لەوبارەوە زۆر سەرنجی تەفسیرەکانم داوەو خۆشم زۆری لێ ورد بوومەوە، ئنجا پێشی ڕای ئەوان دێنمو دواییش بۆخۆم چیم بە دڵە، ئەویش دەڵێم:

١) (الطَّبَري) لە تەفسیرەکەی خۆی (جامع البيان)دا دەڵێ: (فَالإتِّقَاءُ الأَوَّل: هُوَ الإتْقَاءُ بِتَلَقِّي أَمْرِ اللهِ بِالقَبُولِ وَالتَّصْدِيق، وَالدينونَةِ بِهِ والعَمَل، وَالإتِّقَاءُ الثَّانِي: الإتِّقَاء بِالثَّبَاتِ عَلَى التَّصْدِيق، وَتَرْكِ التَّبْدِيل وَالتَغْيير، والإتِّقَاءُ الثَّالِثُ: هُوَ الإتِّقَاء بِالإحْسَان، وَالتَقَرُّبِ بِنَوَافِلِ الأَعْمَال)[1] دیارە (سید قطب)یش لە (في ظلال القرآن)ەکەی خۆیدا ئەوە پەسەند دەکات، دەڵێ: هەرچەندە تەواو دڵێشم لێی دانەمرکاوە، بەلاّم ئەو ڕایەم پێ لە هەمووان باشترە[2]، دیارە (طَبَري) دەڵێ: تەقوای یەکەم (کە لە ڕستەی یەکەمدا هاتوە) بریتیە لە پارێزکردن بەوەی کە فەرمانی خوا وەربگیرێو قبووڵ بکرێو بە ڕاست دابنرێو ملکەچیی بۆ بکرێ، تەقوای دووەم بریتیە لە پارێزکردن بەوە کە لەسەر بە ڕاست دانانی شەریعەتی خواو حوکمی خوا، وە وازهێنان لە گۆڕینو لە جێگۆڕکێ پێکردنی بەردەوام بین، تەقوای سێیەم: بریتیە لە پارێزکردن بە چاکەو لە خوا نزیکبوونەوە بە هۆی ئەو کردەوانەوە کە سوننەتن.

٢) وە هەندێکیان دەڵێن: ئەوە تەنیا بۆ داکۆکیی لەسەر کردنە، وەك خوا کە دەفەرموێ: ﴿كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ۝٣ ثُمَّ كَلَّا سَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ۝٤﴾التكاثر،

---

١) ج٥، ص٣٩.

٢) في ظلال القرآن، ج ٢، ص ٩٧٨.

واتە: نەخێر وانیە لەمەودوا دەزانن، جارێکی دیکەش نەخێر وانیە لەمەودوا دەزانن، وەك چۆن خوا لەوێ بۆ جەختت لەسەرکردنەوەو داکۆکیی ئەوەی دووبارە کردۆتەوە، لێرەش هەر وایە کە سێ جار باسی تەقوا کراوە.

٣) وە هەندێکی دیکەش دەڵێن: لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە کە تەقوا سێ پلەی هەیە، پلەیەکی نزم، پلەیەکی نێوەڕاست، پلەیەکی سەروو:

أ/ تەقوای یەکەم/ نزمترین پلەی تەقوا ئەوەیە کە ئینسان بەبێ وی نابێتە مسوڵمان، ئەویش ئەوەیە کە خۆی لە شیرکی گەورەو لە کوفری گەورەو لە نیفاقی گەورەو لە بێبڕوایی (إلحاد) بپارێزێ، ئنجا دەبێتە پارێزکارو بڕوادار (متقي و مؤمن).

ب/ تەقوای دووەم/ پلەی دووەمی تەقوا، ئەوەیە کە ئینسان ئەگەر ئەو حاڵەتە تەقوایەی بوو، لە گوناهە گەورەکان دەپارێزرێ، واتە: نە واجبێك دەچووێنێ و نە قەدەغەیەك دەشکێنێ.

ج/ تەقوای سێیەم/ پلەی هەرە بەرزی تەقوا، ئەوەیە کە ئینسان ئەگەر ئەو حاڵەتە تەقوایەی هەبوو، نە گوناهی گچکە دەکات، نە شتی ناپەسەندیش دەکات، وە سوننەتەکانیش بە پێی توانا جێبەجێ دەکات.

٤) ڕای بەندە:

منیش دەڵێم دەگونجێ ئەو ڕایانەش وەربگیرێن، بۆیەش هێناومن، بەڵام پێموایە لێرەدا خوای پەروەردگار دەیەوێ بە ئیمانداران بفەرموێ: ئەگەر لە ڕابردوودا لە سەردەمی نەفامییدا، شەڕابتان خواردۆتەوەو قومارتان کردوەو بتتان پەرستووەو یانسیبتان کردوە، چیتان کردوە، ئێستا کە خوا هیدایەتی داونو بەهرەمەندی کردوون لە ئیمان، دەبێ بەردەوام بە پەیژەی ئیماندا لە هەڵکشان دابن، وە لە پارێزکارییدا بەردەوام لە بەرەو پێشچوون دابنو بەردەوام لە بەرزبوونەوە دابن، هەڵبەتە ئەوەش وە نەبێ تەنیا ڕای خۆم بێ، بەڵکو بەگشتی لە هەموویان وەرمگرتوەو بە شێوازی خۆم دامڕشتوە، ئەمەش ڕوونکردنەوەی ئەو ڕایە، جاری یەکەم کە دەفەرموێ ﴿إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾، واتە: پارێزیان کردووە ئیمانیان هێناوەو کردووە

باشەكانیان ئەنجامداوە، (إذا ما اتقوا)، واتە: كە تا ئێستا شەڕابیان خواردووەو قوماریان كردوە، لەمەودوا خۆ دەپارێزن لە شەڕابو قومارو لە هەر گوناهێكی دیكەش، (وآمنوا) یانی: ئیمانیش دێنن، واتە: ئیمانێكی تەواوتر لەوەی پێشێ، بۆچی؟ چونكە بەئەندازەی ئەوە كە ئینسان كە پابەند دەبێ بە شەریعەتەوە، ئیمانەكەشی زیاد دەكات، كاتی خۆی خوا شەڕابی قەدەغە نەكردوە، مسوڵمانان پێوەی پابەند نەبوون، بەڵام ئێستاكە ئەو حوكمە هاتۆتە خوارێو مسوڵمانان پێوەی پابەند دەبن، مانای وایە ئیمانیان زیادی كردوە طاعەتو بەندایەتییان بۆ خوا زیادی كردوە، ﴿ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ﴾، لەسەر كردەوە چاكەكانیش بەردەوام دەبن.

دوایی كە بۆ جاری دووەم دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ﴾، واتە: دوایی پارێزیان كردووەو ئیمانیان هێناوە، هی جاری یەكەم یانی: خۆیان دەپارێزن لە هەموو گوناهەكان، لە نێویاندا شەڕابو قومارو چیو چی، ئنجا پارێز دەكەن لە خوای پەروەردگار بەوە كە لەمەودوا هیچ موخالەفەیەك ناكەن، وە هیچ واجبێك نەچووێنن، ئنجا كە بۆ جاری دووەم دەفەرموێ: ﴿ وَّءَامَنُواْ ﴾، دیارە پێشێ ئیمانیان هێناوە، ئەدی بۆچی دووبارە دەفەرموێ: ﴿ وَّءَامَنُواْ ﴾؟ ئەوە وەك ئایەتەكەی سوورەتی (النساء)ە، كە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ... ﴿١٣٦﴾ ﴾، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئیمان بێنن بە خواو پێغەمبەرەكەی، واتە: ئیمانی واجبتان هێناوە، ئەمجار ئیمانی موستەحەب بێنن، ئیمانێكی نزمتان هێناوە، ئیمانێكی سەرووتر بێننو، ئیمانەكەتان كامڵتر بكەن، چونكە ئیمانیش زیاد دەكاتو كەم دەكات، وە ئیمانیش لەڕاستیدا یەك حاڵەتی نیە مەعقووڵ نیەو بڵێی ئیمانی پێغەمبەر ﷺ وەك ئیمانی مسوڵمانێكی سادەیە، كە ئیمانەكەی لە گوناهان نایگێڕێتەوە!

دوایی كە بۆ جاری سێیەم دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْ ﴾، واتە: پاشان پارێزیان كردووەو چاكەیان كردوە، وەك دەبینین ئەمجارە باسی ئیمانی نەكردوە،

بۆچی؟ چونکە وەك بڵێی ئیمانەکە بۆتە شتێکی دامەزراوو پێویستی بەوە نەکردوە دووبارەی بکاتەوە، بەڵام تەقوا هەمیشە لە بەرزبوونەوە دایە، دوایی کە ئیمان دەچەسپێ، ئنجا ئینسان دەبێ لە تەقوا زیاد بکات، دیارە بە ئەندازەی زیادبوونی تەقوا، ئیمانەکەش کامڵتر دەبێ، وە ئەمجارە وشەی ﴿ وَّأَحۡسَنُواْ ﴾ی هێناوە، واتە: لە تەقوایەکەیاندا چاکەکار (مُحْسِن)ن، چونکە وشەی (إحسان) بۆ زانیاریتان هەندێك وادەزانن کە (إحسان) لە هەر سیاقێك دا بێ، هەر بە مانای چاکەکردنە لەگەڵ خەڵك، بەڵام وا نیە، بە بەڵگەی ئەو فەرمایشتەی کە بە (حدیث جبریل) مەشهوورە، کە لە (جبریل) پێغەمبەر ﷺ دەپرسێ: ﴿ما الإحْسَانُ؟ قَالَ: أَنْ تَعْبُدَ اللهَ كَأَنَّكَ تَرَاهُ، فَإِنْ لَمْ تَكُنْ تَرَاهُ فَإِنَّهُ يَرَاكَ﴾ {رَوَاهُ أَحْمَدُ برقم: (٣٦٧)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٥٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٩٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٦٤) وَابْنُ خُزَيْمَةَ برقم: (٢٢٤٤)، وَغَيْرهُم عَنْ عُمَرَ بْنُ الْخَطَّابِ رَضِيَ اللّهُ عَنْهُ}، واتە: ئیحسان چیە؟! فەرمووی: ئیحسان ئەوەیە کە بە جۆرێك خوا بپەرستی وەك ببینی، وە بێگومان ئەگەر تۆش نەیبینی ئەو دەتبینێ.

لێرەدا پێغەمبەر ﷺ (إحسان)ی تەفسیر کردوە بە چاك بەندایەتیی بۆ خوا کردن، نەك چاکە لەگەڵ خەڵك کردن، لێرەشدا دیارە وشەی ﴿ وَّأَحۡسَنُواْ ﴾، دەگونجێ وێڕای چاکەکاریی لەگەڵ خەڵکدا، چاك بەندایەتیی بۆ خوا کردنیش بگەیەنێ، وە دواییش دەفەرموێ: بێگومان خوا چاکەکارانی خۆشدەوێ، بەکورتیی: من پێمواپە، ئەو ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوە کە مسوڵمانەتیی‌و دینداریی پلە پلەییە، وا مەزانن کە ئیمان‌و تەقوا وەك سەکۆی شەمەندەفەر وایە، کە کەوتنە سەری، تازە دەڕۆن تاقیامەتێ! نا، بەڵکو وەك پەیژە وایەو دەبێ بەردەوام پێیدا سەربکەوی، وە لە جۆرێك لە ئیمانەوە بگوازیەوە بۆ ئیمانێکی دی، وە لە جۆرێك لە تەقوا بۆ تەقوای زیاتر، وە لە جۆرێك لە ئیحسان بۆ ئیحسانێکی باشتر.

ماوەتەوە بڵێم: کە ئەو ئایەتە بەڵگەی ئەو یاسایەیە کە دەڵێ: (لَيْسَ للقَانُون أَثَرٌ رجْعِيّ) واتە: یاسا کاریگەریی بۆ ڕابردوو نیە، یان (یاسا شوێنەواری گێڕراوەی نیە)، کە ئەوە کۆدەنگیی هەموو زانایانی یاساناس‌و شەرعزانانی لەسەرە، خوای پەروەردگار ئەو حەقیقەتەی لەو ئایەتەدا بەیان کردوە، چۆن؟ چونکە دەفەرموێ:

﴿ لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴾، مانای وایە ئێستا مەی (خمر)و قومار قەدەغە دەکرێن‌و، ئەوانەی کە وەختی خۆی مەییان خواردۆتەوەو قوماریان کردوە، گوناهیان لەسەر نیە، کاتی خۆی کە شتێك قەدەغە نەکراوە، ئێستا بۆت نیە بڵێی: تۆ گوناهبار بووی، چونکە وەختی خۆی شەرابت خواردۆتەوە، یان گوناهبار بووی، مامەڵەت بە ڕیبا کردوە، یان گوناهبار بووی، قومارت کردوە! یان کەسێك کە نەیزانیبێ فلاَن شت قەدەغەیە، وە کەمتەرخەمیش نەبووبێ لە نەزانینەکەیدا، واتە: (معذور) بێ بە (جهل)ەکەی، ئەوە ئەویش بە هەمان شێوە گوناهی لەسەر نیە، لەسەر شتێك کە بە نەزانیی‌و بە بێئاگایی دەیکات، چونکە لە سەردەمی پێغەمبەریشدا ﷺ شتی وابووە، جاری وابووە شتێك کراوە، نەزانراوە کە قەدەغە کراوە، مانای وایە لەسەری گوناهبار نەبوون، یا شتێك کە پێشێ واجب نەبووبێ‌و دوایی خوا واجبی کردبێ، گلەییان لێ نەکراوە، کە بۆچی فلاَن شتتان نەکردوە؟ هەڵبەتە زانایانی یاساناس لێرەدا شتێکی دیکەش دەڵێن: (یاسای شوێنەواری گێڕراوەی نیە) لە حاڵێکدا بۆ تاوانباران‌و خەتاباران بەکاربهێنرێ، بەوبارەیاندا تەفسیر دەکرێ، کە لە مەصڵەحەتیان بێ، منیش پێموایە زیاترو لەو دەقەیان وەرگرتوە: (إِدْرَءُوا الْحُدُودَ بِالشُّبُهَاتِ)[١]، واتە: سزایەکان بە شوبهەکان دووربخەنەوە، واتە: کەسێك کە خەتایەکی کردوە، یاسایەك کە دەردەچێ با شوێنەواری ڕەجعیی هەبێ، ئەگەر ئەو شوێنەوارە ڕەجعییە بۆ وی قازانج بێ، بەڵام ئەگەر لە زەرەری بێ‌و تووشی سزابێ، ئەوە دەبێ شوێنەواری ڕەجعیی نیە.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) کە ئەمە دەقەکەیەتی بە تەواویی: (إدرؤوا الحدود بالشُّبهات، وإنَّ الإمامَ أن يُخْطيءَ في العَفو خيرٌ من أن يخطيء في العقوبة) رواه الترمذي والحاكم والبيهقي عن عائشة رض الله عنها مرفوعاً.

# دەرسی بیست و یەكەم



## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە حەوت ئایەت پێكدێ (٩٤ - ١٠٠)، لەو حەوت ئایەتە موبارەكەدا خوای كاربەجێ دووجاران بە نازناوی ئیمان مسوڵمانان دەدوێنێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾، وە لەبارەی ڕاووشكاركردن لە كاتی ئیحرام بەستنیاندا بە حەجو عومرە، یان بە عومرە، كە قەدەغەیەو مایەی پێ تاقیكرانەوەیانە، ئاگاداریان دەكاتەوەو، لەبارەی چۆنیەتی كەفارەتی نێچیر كوشتنەوە لە كاتی ئیحرامدا ڕێنمایی دەكات، كە یان ئاژەڵێكی وەك خۆیەتی، یان خواردن دان بە نەدارانە، یان ڕۆژووگرتنە.

پاشان بۆیان باسی ڕەوایی نێچیرو خواردنی دەریایی دەكات، لە كاتی ئیحرامداو قەدەغەبوونی ڕاو لە وشكانییدا، ئنجا خوا باسی هەر كام لە كەعبەو مانگە حەرامەكان واتە: (ذُو الْقَعْدَةِ، ذُو الْحِجَّةِ، مُحَرَّمُ، رَجَبٌ)، وە ئاژەڵی نیشانەداركراو بۆ قوربانیی، دەكات، وەك چەند دروشمو نیشانەیەكی دینداریی، وە پاشان خوای دادگەر مسوڵمانان ئاگادار دەكاتەوە لە چەند شتێك، یەكەم: خوا نهێنییەكانی ئاسمانەكانو زەوی دەزانێ، واتە: نێهێنی نێو دڵی ئێوەش لە خوا شێراوەنیەو پەنهان نیە، دووەم: وە ئاگاداریان دەكاتەوە كە سزاو تۆڵەی خوا توندو لێبوردنو بەزەییشی زۆرە. سێیەم: وە ئاگاداریان دەكاتەوە كە پێغەمبەر ﷺ تەنیا گەیاندنی لەسەرە، وە خوای پەروەردگاریش ئاگاداریی ئاشكراو پەنهانە هەمووی دەزانێ.

وە لە كۆتایی دا ئاگاداریان دەكاتەوە كە پاكو پیس یەكسان نین، هەرچەندە پیسەكە، واتە: بێكەڵكەكە، یان خراپەكە، لە ئینسانانو لە فیكرو كردەوەو جلو بەرگو ... هتد، هەرچەندە زۆریش بێو زۆرییەكەی سەرسامیشت بكات، بەڵكو كەمی پوختی لە زۆری بۆر چاكترە، وە سەرەنجام خوا بە نازناوی خاوەن عەقڵان مسوڵمانان بانگ دەكات، وە فەرمانیان پێدەكات كە پارێز لە خوا بكەن، كە دەبێتە هۆی سەرفرازییان.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ
ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٤﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞۚ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحۡكُمُ
بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا
لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦۗ عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَۚ وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُۚ وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو
ٱنتِقَامٍ ﴿٩٥﴾ أُحِلَّ لَكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَحۡرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِۖ وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ
صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِيٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٩٦﴾ جَعَلَ ٱللَّهُ
ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ قِيَٰمٗا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَٰٓئِدَۚ ذَٰلِكَ لِتَعۡلَمُوٓاْ
أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴿٩٧﴾
ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٩٨﴾ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا
ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ﴿٩٩﴾ قُل لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوۡ
أَعۡجَبَكَ كَثۡرَةُ ٱلۡخَبِيثِۚ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿١٠٠﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بێگومان خوا بە شتێك لە نێچیر کە لە ژێر ڕکێفی دەستو نێزەکەکانتاندان، تاقیتان دەکاتەوە، تاکو خوا (لە واقیعداو بە بەرجەستەکراویی) بزانێ کێ بە پەنهانیی لێی دەترسێ، ئنجا هەر کەسێك دوای ئەوە دەستدرێژیی بکات، ئەوە ئازارێکی بە ئێشی هەیە (٩٤) ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بە ئیحرامەوە نێچیر مەکوژن، وە هەر کامێکتان بە ئانقەست بیکوژێ، ئەوە لەسەریەتی قەرەبوویەکی هاوتای ئەوە کە کوشتوویەتی لە ئاژەڵان بدات، کە دوو کەسی خاوەن دادگەریی لە ئێوە بڕیاری لەسەر بدەن، بکرێتە قوربانیی و بگەیەنرێتە (سنووری) کەعبە، یان خواردن پێدانی نەداران بکرێتە کەفارەت، یان بارتەقای ئەوە ڕۆژووگرتن، ئەو (قەرەبوو و کەفارەت)ەش بۆئەوەیە تاکو سزای کاری خۆی بچێژێ، خوا لە (هەڵەی) ڕابردوو بووردوە، وە هەر کەس بگەڕێتەوە (سەر گوناهی نێچیر کوشتن) ئەوە خوا تۆڵەی لێ دەستێنێ، وە خوا زاڵی خاوەن تۆڵەیە (٩٥) (ڕاوکردنی) نێچیری دەریاو خواردنەکەیتان بۆ حەڵاڵ کراوە، وەك سوودو مەدارسازبوونێك بۆ ئێوەو بۆ ڕێبواران، بەڵام هەتا لە ئیحرام دابن (ڕاوکردنی) نێچیری وشکانییتان لێ قەدەغە کراوە، وە پارێز لەو خوایە بکەن کە بۆ لای وی کۆدەکرێنەوە (٩٦) خوا کەعبەی ماڵی حەرامی گێڕاوە بە مایەی ڕاوەستانی خەڵكو بەرێوەچوونی کاروباریان، هەروەها مانگی حەرامو ئاژەڵە (بێ نیشانە) دانراوەکان بۆ قوربانیی و ئاژەڵە گەردنبەنددارەکان، ئەوەش (ڕوونکرایەوە) تاکو بزانن کە خوا هەرچی لە ئاسمانەکانو لە زەوی دایە دەیزانێ، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە (٩٧) بزانن کە خوا تۆڵەی توندە، وە (بزانن) کە خوا لێبووردەی بەزەیی یە (٩٨) پێغەمبەر جگە لە گەیاندن (ی پەیامی خوا) هیچی دیکەی لەسەر نیە، وە خوا دەزانێ چی ئاشکرا دەکەنو چی پەنهان دەکەن (٩٩) بڵێ: پیسو پاك یەکسان نین، هەرچەندە زۆریی پیس سەرسامیشت بکات، دەجا ئەی خاوەن عەقڵان! پارێز لە خوا بکەن، بەڵکو سەرفرازبن (١٠٠))).

## شـیکردنـەوەی هـەندێـك لە وشــەكان

(لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ ): ئـەو (ل) لامـە، بـۆ سـوێند پێخـواردنو (ن) نوونەكـەش بـۆ تەئكیـدە، واتـە: سـوێند بـە خـوا، بـە تەئكیـد خـوا تاقیتـان دەكاتـەوە، لـە زمـانی عەرەبیـدا دەگوترێ: (بَلَـوْتُ فُـلانـاً، خَبَرْتُـهُ، وَبَلَوتُـهُ: إخْتَبَرتُـهُ) بـە دوو واتـا دێ: (بَلَوْتُ فُلانَاً) واتـە: شــارەزای فــلان كــەس بـووم، چــۆن؟ كە تاقـیم كردەوە، شـارەزای بـووم، هــەردوو واتـاكــەی هــەن، كەواتــە: واتایــەكی (لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ ) یـانی: خــوا تاقیتـان دەكــاتەوە، واتــایەكی دی یــانی: خــوا لــە ڕێــی كردەوەكانتانــەوە ئێــوەی بــۆ دەردەكـەوێ، خۆی دەتانناسـێ، بەڵام دەیـەوێ بە كردەوەی خۆتان شارەزاتان بێ.

(ٱلصَّيْدِ ): وشــەی: (صَيد) بە دوو واتـا دێ:

بە مانای ڕاوكـردن دێ، دەڵـێ: (الصَّيْدُ: مَصْـدَرُ صَادَ، صَادَ يَصـيدُ صيداً، وَهُوَ تَنَاوُلُ مَا يُظْفَرُ بِهِ مِمَّا كَانَ مُمْتَنِعاً، والصَّيد المَصِـيدُ)، چاوگــە، ڕاوی كـرد، ڕاو دەكات، ڕاوكردن، وە ڕاوكــردنیش بریتیــە لــەوە كە بــۆت ناگیــرێ بیگری، واتـە: ئەو ژیـاندارو ئـاژەڵانەی كە لە حـاڵەتی ئاسـاییدا زەفەریان پێنـابردرێ، وەك كـەو، كـۆتر، قـاز، مراویـی لـە پـەڕەوەران، وە بزنـە كێـویو مـامزو كەروێشــكو سـیخورو ئەوانەی گۆشــتیان دەخــورێ لە ئــاژەڵان.

وە بە مانـای (الـمصید)یش دێ، واتە: نێچیـر، ئەو نێچیـرەی كە ڕاودەكـرێ.

(وَرِمَاحُكُمْ ): كــۆی (رُمْـح)ە، ئێمـە بـە كـوردی (نێـزە)ی پـێ دەڵـێین، وە (ڕم)یشـی پـێ دەڵـێین، بــەڵام ڕم درێــژتر بووە، نێـزە كورتتـر بووە، هاوێشـتوویـانە.

(حُرُمٌ ): (جَمْـع مُحْـرِم، عَكْس مُحِلّ، وَحـرام عكس حـلال)، (حُـرُم) كـۆی (مُحْـرِم)ە، وە (مُحْـرِم) كەسێكە چـۆتە ئیحرامـەوەو ئیحرامـی بەسـتوە، وە پێچـەوانەی (مُحِـلّ)ە، (مُحِـلّ) كەســێكە نەچــۆتە ئیحرامــەوەو ئیحرامــی نەبەســتوە، واتــە: هــەموو كردەوەكــانی بــۆ حــەڵاڵــن، بــەڵام كەســی (مُحْـرِم) خــۆی بــێ بــەش دەكـات لــە

کۆمەڵێك شت، وەك: خۆ بۆنخۆشکردن، نینۆك کردن، وە هەندێ شتی دی کە لە کاتی ئیحرام دا لێی قەدەغە دەبن، وە حەرامیش عەکسی حەلاڵە، دەگوترێ: (فُلَانٌ حَرَامٌ) واتە: لە ئیحرام دایە، وە کە گوترا: (حلال) واتە: لە ئیحرام دانیە.

(فَجَزَآءٌ): (الجزاء: وَهُوَ الغَنَاءُ والكِفَايَةُ، وَالجَزَاءُ مَا فِيهِ الكِفَايَةُ مِنَ المُقَابَلَةِ خَيْرًا أَو شَرًا)، (جَزَاء) واتە: بڕێتیی، یان بەرانبەر، یان شتێك بارتەقای شتێك بێ، دەڵێ: (جَزَاء) هەر شتێکە کە بۆ شتێك بەس بێ، یاخود لە بەرانبەریدا بێتەوە، واتە: بارتەقاو هاوتا، جا بۆ چاکە بێ، یان بۆ خراپە.

(ٱلنَّعَمِ): (جَمْعُهُ: أَنْعامٌ، وأَناعِيمُ: المَالُ السائم ويُطلَق على الإبل أكثر...) وشەی (نَعَم) بە (أَنْعامٌ وأَناعِيمُ) کۆدەبێتەوە، (المَالُ السائم) هەر ئاژەڵێکە بلەوەڕێ، هەمووی پێی دەگوترێ (أَنْعَام)، بەڵام بە زۆری بۆ حوشترو ئاژەڵی ورد (مەڕو بزن)و ڕەشەوڵاخ واتە: مانگاو گا، بەکاردێ، بەڵام من پێموایە بۆ جیا لەوانەش بەکاردێ، هەرچەندە وشەی (خیل) واتە: وڵاخە بەرزە، کە ئەسپو ماینو ئەوانە دەگرێتەوە، بەڵام واپێدەچێ وشەی (أَنْعَام) ئەوانیش بگرێتەوە، هەرچەند جاری وایە بە پێی عورف وشەیەك تایبەت دەکرێ بە بەشێك لە چەمكو واتایەکەیەوە، بۆ وێنە: وشەی (ثواب) لە عورفی زمانی عەرەبیدا زیاتر بۆ چاکە بەکاردەهێنرێ، بەڵام لە ئەسڵی زمانی عەرەبی بۆ خێرو شەڕ بەکاردێ، ئێستاش ئێمە بە کوردی هەر دەڵێین: خوا جەزات بداتەوە، (جَزَاكَ اللّهُ خَيْرًا) بەڵام وشەی (جَزَاء) ئەویش لە ئەسڵی زمان بۆ پاداشتو سزاو تۆڵەش بەکاردێ، کەچی بە پێی عورف جاری وایە ماناکەی تایبەت دەکرێ.

(هَدْيًا): (الهدْيُ مُخْتَصٌّ بِمَا يُهْدَى إِلى البَيْت، الواحدة: هدية، والأنثى: هَدي)، (هَدي) تایبەتە بەوەی کە دەکرێتە دیاریی بۆ ماڵی خوا (بيت)، واتە: لە کاتی حەجو عومرەدا، سەرببڕدرێ، تاکەکەی (هَدِية)یە، واتە: ئاژەڵێك کە دەکرێتە خەڵاتو دیاریی لە سنووری حەرەمدا سەرببڕدرێ، وەك ئەوەی یەکێك لە مەناسیكو خواپەرستییەکانی حەج، وە مێینە پێی دەگوترێ (هَدي)، نێرینەش پێی دەگوترێ: (هدية).

(عَدۡلٍ ): (العَدْل: رجُلٌ عَدْلٌ، وَعادِلٌ وَرِجالٌ عدلٌ، ذَوَي عَدْلٍ: أَي عَدالَةٍ، عَدْلُ ذَلِكَ: مُعادِلُ ذَلِكَ) وشەی: (عَدْل) ئێمە بە كوردی پێی دەڵێین: دادگەریی، بەڵام (رجُلٌ عَدْلٌ) واتە: پیاوێكی ڕێكو ڕاست، كە شایەدیی لێ وەربگیرێ، دیارە ئینسانیش كە دادگەر بوو شایەدیی لێوەردەگیرێ، جا لە زمانی عەرەبیدا دەڵێ: (رَجُلٌ عَدْلٌ، وَعادِلٌ وَرِجالٌ عَدلٌ) وشەی (عَدْل) بۆ هەموویان بەكاردێ، (ذَوَي عَدْلٍ) واتە: خاوەن دادگەریی، (عَدْلُ ذَلِكَ: مُعادِلُ ذَلِكَ) بار كە لێدەنرێ دوو لای هەیە، هەركامێكیان پێی دەگوترێ: (عِدْل)، وە هەندێكیان دەڵێن: (عَدْل) و (عِدْل) بە هەردووكیان هاتوە، چونكە هەردووكیان وەك یەكن یەكسانن، دیارە هەردوو تای بارێك دەبێ هێندەی یەك بن، ئەوجار بارەكە ڕادەوەستێ، ئەگەرنا لاتەڵو لاسەنگ دەبێ.

(وَبَالَ ): (الوَبْلُ: والوابِلُ: المَطَرُ الثَّقيلُ القطار)، (وَبل، وابل) بە بارانێك دەگوترێ كە دڵۆپەی گەورەو گرانی لێ دروست بێ، دەڵێ: (الوبال: الفساد، الشدة الثقلُ، سوء العقابة..)، (وبال) واتە: خراپە، یاخود سەرەنجامی خراپ، قورسییو زەحمەتو نارەحەت، ﴿ لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦ ﴾، بۆئەوەی كە سەرەنجامی خراپی، وە ئاكامی شووەمی خۆی كە سزایە، بچێژێ.

(سَلَفَ ): (السَّلَفُ: المتقدِّم، ﴿ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ ﴾: أَي يُتجافَى عمّا تَقَدَّم مِن ذَنبِهِ)، (سَلَف) ئەوەیە تێپەڕیوەو ڕۆیشتوەو ڕابردوە، كە دەفەرموێ: ﴿ فَلَهُۥ مَا سَلَفَ ﴾، واتە: ئەوەی ڕابردوە بۆخۆیەتی، بەو واتایە كە ئەگەر بڵێ (علیه) واتە: لێی دەپرسرێتەوە، وە ئەگەر بڵێ: (لَهُ) واتە: لێی ناپرسرێتەوە، (يُتجافَى عمّا تَقَدَّم مِن ذَنبِهِ) چاوپۆشیی دەكرێ لەوەی كە تێپەڕیوە.

(مَتَٰعًا ): لە قورئاندا وشەی (مَتاع) زۆر هاتوە، وەك دەفەرموێ: ﴿ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٞ ﴿٢٦﴾ ﴾الرعد، یان دەفەرموێ: ﴿ ... إِنَّمَا هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا

مَتَٰعُ ...﴿٣٩﴾ غافر، (المَتَاعُ: كُلُّ مَا يُنتَفِعُ بِهِ عَلَى وَجْهٍ مَا فَهُوَ مَتَاعٌ وَمُتْعَةٌ)، (مَتَاع) هەر شتێكە سوودی لێ وەربگیرێو بەهرەی لێ وەربگیرێ، بە شێوەیەك لە شێوەكان، بەلاّم بە زۆری بۆ شتی كەم بەكاردێ، واتە: شتێك كە كەم دەوام بێ، یاخود كەم بایەخ بێ، یاخود تەمەنی كەم بێ.

(وَلِلسَّيَّارَةِ): (سیارة) لێرە بە مانای كاروان، كۆمەڵێك ڕێبوار دێ، (السير: المضيُّ في الأَرْض وَرَجُلٌ سَائِر وَسَيّار والسيارة: الجَمَاعَة)، (السَّير) واتە: بە زەویدا ڕۆیشتن، (سَارَ يَسِيرُ سَيراً)، دەگوترێ: (وَرَجُلٌ سَائِر وَسَيّار) پیاوێك كە دەڕوات بە ڕێدا، كە دیارە (سَائِر) واتە: ڕۆیشتوو، بەلاّم (سَيَّار) واتە: زۆر ڕۆیشتوو، صیغەی موبالەغەیە، (والسيارة الجَمَاعَة) واتە: كۆمەڵە خەڵكێك كە پێكەوە دەڕۆن، جا چ بە بارو سوار، چ پیادە بن.

(قِيَٰمًا): چاوگە، واتە: ڕاوەستان، لێرەدا دەڵێ: (قَامَ يَقُومُ قِيَاماً فَهُوَ قَائِمٌ وَجَمْعُهُ قيام، وَالقِيام والقِوَام: اسم لما يقوم ويثبتُ بە الشيء كالعِمادِ وَالسِّنادِ) لە زمانی عەرەبیدا (قَامَ يَقُومُ قِيَاماً) هەڵسا، هەڵدەستێ، هەڵسان، یاخود ڕاوەستان (فَهُوَ قَائِمٌ وَجَمْعُهُ قيام) ئەو ڕاوەستاوە، وە بە (قیام) كۆدەكرێتەوە، وە هەروەها (قِيام و قِوَام)یش ناون بۆ هەر شتێك كە ئەو شتەی پێوەڕادەوەستێ، وەك (عِمادِ و سِنَادِ) ڕەشماڵ كە هەڵدەدرێ ئەو ئەستوندەگەی دەدرێتە بەری، پێی دەگوترێ: (عِماد) یان (سِنَادِ)، لەبەرئەوە كە ڕەشماڵەكە بەهۆی ئەوەوە ڕاوەستاوە، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: (كَعبَة) و (هَدي)و (قَلائِد)و مانگی حەرامم كردوون، بە مایەی ڕاوەستان، ڕاوەستانی خەڵك، واتە: كاروباری دینداریی و دنیادارییان وەك دوایی باسی دەكەین.

(ٱلْبَلَٰغُ): (البَلاَغُ) واتە: گەیاندن، (البلوغُ وَالبَلاَغُ: الإِنْتِهَاءُ إِلى أَقْصَى المقصِد وَالمُنْتَهى والبلاغ التبليغ)، (بلوغُ، بَلاَغُ) ئەوەیە كە بگەیە كۆتایی، سنوورێك ئامانجێك دیاری كرابێ، پێی بگەی، وە (بَلاَغ) بە مانای گەیاندنیش دێ، وە بە مانای خودی گەیشتن دێ، وە بە مانای گەیاندنی پەیامێك، یان گەیاندنی

شــتێك دێ، كـە دەفـەرموێ: ﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ﴾، واتـە: پێغــەمبەر ﷺ تەنیا گەیاندنی لەســەرە، ئەوەی دیكـە دەكەوێتە سەر خۆتان، دوای ئەوەی كە پێتـان ڕاگەیەنـدرا.

(ٱلْخَبِيثُ): (الخُبْــثُ والخَبيــثُ مَـا يُكْـرَهُ رِدَاءَةً وَخسَاسَــةً، وَأَصْـلهُ الــرَّدِيُّ الدُّخْلَـةُ الجَارِي مَجْرَى خَبَثِ الحَدِيدِ) وشـەی: (خُبْثُ، خَبيـثُ) هەر شـتێكە كە ئینسـان كـەیفی پـێ نەیــێ لەبـەر خراپیــیو كـەم بایەخیــی، یـان لەبـەر پیســییان، وە لـە ئەسڵدا لە (الـرَدِيءُ الدُّخْـلَةُ) شــتێكی خـراپ، كـە ڕەگەڵ شتی بـاش كـەوتوە، وەك زیـوانو بنــژیل كە ڕەگــەڵ گــەنمو جـۆ دەكــەوێ، یـان هـەر شــتێك كـە ڕەگــەڵ برنـجو كونجـی دەكـەوێ، وەك بەردو شـتی دیكـە، ئــەوە پێی دەگوتـرێ (الدُّخْلَـةُ)، (الجَـارِي مَجْـرَى خَبَثِ الحَدِيـد) وەك ئـەو ژەنگــەی كە لەســـەر ئاســن دەكەوێ، دیــارە ژەنگــەكە ئاسنەكە دەڕزێنـێ، بۆیــە دەبـێ لێـی بكەیــەوە، ئەسـڵی مـاددەی ئاســنەكە جیــایەو ئـەو ژەنگــەی كـە لەســەری دەكـەوێ، ئـەوە شـتێكی خراپـەو كەوتۆتــە ســەری.

(وَٱلطَّيِّبُ): (أَصْلُ الطَيِّبِ: مَا تَسْـتَلِذُّهُ الحَوَاسُّ، وَمَا تَسْتَلِذُّهُ النَّفسُ، وفـي الشَّـرْعِ: مَـا كَـانَ مُتَنَـاوَلاً مِـنْ حَيْـثُ مَـا يَجُــوزُ) واتــە: ئەســڵی (طَیِّــب) هــەر شــتێكە كــە هەســـتەكان چـێژی لێـوەرگرن وە نەفســـی ئینسـان چـێژی لێـوەربگرێ، (الطَيِّـب) لــەڕووی شــەرعەوە هــەر شــتێكە كــە شــەرع ڕێپێــدابێ، ئــەو شــتە وەربگیـــرێو بەكـاربهـێنرێ.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەكان

هـۆی هاتنــە خـــوارەوەی ئــەو ئایەتــەی كــە دەفــەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ٩٤ ﴾، {قَـالَ مُقَاتِـل بـن حَيَّـان: أنزِلَـت هَـذِهِ الآيَـةُ فِي عُمْـرة الحُدَيْبِـيَّة، فَكَانَتِ الوُحش وَالطَّير وَالصَّـيْد تغشاهم فـي رِحَالِهم، لَمْ يَروا مِثلَهُ قَطُّ فِيمَا خَـلا، فَنَهَاهُم اللّه عَـن قتلـه وَهُمْ مُحرِمون} (محاسن التأويل: ج٤، ص٩٤)، واتـە: موقاتلـیی كـوڕی حـەییان دەڵـێ: ئـەم ئایەتـە لـە كـاتی عـومرەی حودەیبییـەدا دابـەزی، ئـاژەڵی كێـوی‌و پـەڕەوەرو نێچیـر دەهـاتن بەسـەر هاوەڵانـدا دەگـەڕان، لەو شـوێنانەی بارگـەوبنەیان لـێ خسـتبوو (دەهاتنـە دەوروبـەریان)، كـە لـە ڕابردوودا هەرگـیز شـتی وا نەبـووە، خـواش لێـی قەدەغـە كـردن، كـە هەتـا لـە ئیحـرام دابن ئەو نێچیرانە بكوژن.

دیـارە ئـەوكات وەك ئێسـتا نـەبووە، هـەموو دەمـێ گۆشـت هـەبێ‌و خـواردنی خـۆش هـەبێ، زۆریـش حەزیـان لـە گۆشـت بـووە، ئنجا ئـەو مەسـەلەیە بەسـەرهاتو ڕووداوی زۆری تێـدان، بـۆ نموونـە: یەكێـك لـە هـاوەڵان ئیحـرامی نەبەسـتبوو بـە عـومرە، ئاژەڵـێكی زۆر قەڵـەو بەوێـدا هـات، هـاوەڵانیش ئاماژەیـان بـۆ كـرد، ئـەویش بـە تیـرو كەوانەكەی، یان بـە هـەر شـتێكی دی كە پێـی بـوو، ئـەو كـەرە كێویـەی ڕاو كـرد، ئنجا سـەری بـڕی‌و دوایـی گـوتی: هـاوكارییم بكـەن، ئـەوانیش گوتیـان: ئـاخر ئەگـەر هاوكارییـت بكـەین ئێمـە گوناهبـار دەبـین، (بـە حیسـاب ئـەوان ڕاویـان نـەكردووە هاوكارییشـیان نەكردوە) هاوكارییشـیان نەكرد، دواییش ئەوانەی ئیحرامیشـیان هـەبوو زۆر حەزیـان لـە گۆشـت بـوو، لێیـان خـوارد، (جـا زانایـان دەڵـێن: ئەگـەر بـە ئاماژەكردنیش، بێ هەر جۆرێكـە لە هاوكاریی‌و گوناهباریی، بە هەر حاڵ دیارە ئەوە تاقیكردنەوەیـەك بـووە)، ئنجـا ئێمـە ئێسـتا تێدەگـەین لـەو ئایەتـە كـە دەفـەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ لِيَعۡلَمَ

﴿ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِۚ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٩٤﴾﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتان هێناوە! بێگومان خوا بە شتێك لە نێچیر کە لە ژێر ڕکێفی دەستو نێزەکانتاندان، تاقیتان دەکاتەوە، تاکو خوا (لە واقیعداو بە بەرجەستەکراویی) بزانێ کێ بە پەنهانیی لێی دەترسێ، ئنجا هەر کەسێك دوای ئەوە دەستدرێژیی بکات، ئەوە ئازارێکی بە ئێشی هەیە.

خوای بالادەست ئاوا بەندەکانی خۆی تاقی دەکاتەوە، ئەوان لە تامەزرۆیی گۆشت لە چ میحنەتێکدا بوون، خوای بەرزیش ئەو نێچیرانەی ناردوونە دەور، لە کاتێکدا کە زۆریش حەزیان لە گۆشت بووە، تا خوا لە واقیعی خۆیاندا بۆی دەربکەوێو، بزانێ تا چەند پابەند دەبن بە شەریعەتەوە، پارێزکار دەبن، یان ئارەزوویان بۆ گۆشت وایان لێدەکات کە فەرمانی خوای پەروەردگار بشکێنن!!.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکــان

خـوا ﷻ لەم سـوورەتە موبارەکەدا بۆ جاری دوازدەیـەم بـانگی مسـولّمانان دەکـات، کە ئاشـکرایە یەکەمین مسـولّمانانێك کە دوێنـدراو بوون بەم ئایـەتەو بانگـکراو بـوون، هـاوەڵانی بەڕێز بـوون، بـەڵام لـە دوای وانـیش هـەموو جیلـەکانی مسـولّمانان پشـتاو پشـت تـا ئێسـتاو دوای ئێسـتاش ئـەو دواندنـانەی خـوای پەروەردگـار دەیانگرێتـەوە، وەك پێشـتـر باسـمان کـردوە، ئـەم سـوورەتە لـە قـەدەر قـەبارەی خـۆی بـە بـەراورد لەگـەڵ سـوورەتەکانی دیکـە، سـوورەتێکە زۆرتـرین یاسـای شـەرعیی تێـدان، وە شـازدە جـاریش بـە نازنـاوی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئیمانـداران دەدوێنـێ، لێرەشـدا خـوای پەروەردگار بۆ جاری سێزدەیەم دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَيَبۡلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلصَّيۡدِ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمـانتان هێنـاوە! بـە تەئکـید خـوا بـە شـتێك لـە نێچیـر واتـە: مـەرج نیـە زۆریـش بـن، بـەڵام بـە شـتێك لـە نێچیـر تاقیتــان دەکاتــەوە، دەســتتان دەیانگــاتــێ، ئـەوەی بـە دەسـتیش نەگیـرێ بـە ڕمو نێزەکـانتـان ڕاویان دەکەن، ﴿ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، تاکو خـوا بزانـێ کـێ بـە پەنهـانیی لـێی دەترسـێ؟ وە کـێ لێـی ناترسـێ؟ (واتـە: بـە بەرجەستەکراویـیو لـە دنیـای واقیعـدا خـوای پەروەردگـار بـۆی دەربکـەوێ، ئەگـەرنا وەك زانیـاریی بـێ سـنووری خـوا، هـەموو شـتێك دەزانـێ)، ﴿ فَمَنِ ٱعۡتَدَىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴾، هـەر کەسـێك دوای ئـەوەی کـە خـوا ئاگادارتـان دەکاتـەوە بۆتـان ڕوون دەکاتـەوە، دەستدرێژیی بکاتو بە ئیحرامەوە ڕاو بکات، ئەوە ئەو کەسە ئازارێکی بەئێشـی هەیە.

ئنجـا بۆ جاری سـێزدەیـەمین بانگی مسـولّمانان دەکـاتو دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! هـەر دەربـارەی هـەمان بابـەت هـی پێشـێ فەرمـووی: بۆیـە ئـەو نێچیـرانە دێنـە دەوروبەرتـان تـاکو تاقیتـان بکاتـەوە، بـەڵام

ئەمجارە حوکمەکەی ڕادەگەیەنێ: ﴿ لَا تَقۡتُلُواْ ٱلصَّيۡدَ وَأَنتُمۡ حُرُمٞ ﴾، نێچیر ڕاومەکەن‌و مەکوژن لە کاتێکدا ئێوە لە ئیحرام دان، چونکە بابای ئیحرامدار چ پیاوبێ، چ ئافرەت، کۆمەڵێك شتی لە خۆی قەدەغە کردوون، بۆئەوەی خۆی یەکلا بکاتەوە، بۆ بەندایەتی بۆ خواو، زیکرو یادی خوا، ڕازونیازو موناجات لەگەڵ خوا، دووعاو پاڕانەوە لە خوا، کە ئەوانە لەگەڵ ڕاوکردن‌و دوای نێچیر کەوتن‌و کوشتن‌و کوشتار، وە خۆ بۆنخۆشکردن‌و خۆ ڕازاندنەوەو سەرجێیی کردنی ئافرەت‌و... هتددا، ناگونجێن ئەوانە هەموویان قەدەغەن بۆ کەسێك کە دەچێتە ئیحرامەوە، ئنجا حوکمەکەی بەیان دەکات، کاتێك کەسێك نێچیرێکی کوشت، ئەوە بەشەرە، هەڵە دەکات، دەفەرموێ: ﴿ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدٗا ﴾، هەر کامێك لە ئێوە بە ئانقەست بیکوژێ، بە ئانقەست دوو شتی لە بەرانبەردا هەن، هەڵەو لەبیرچوون (خطأً ونسیاناً)، ئایا ئەگەر بەهەڵە بیکوژێ، یان بە لەبیرچوون بیکوژێ سزایەکەی ناکەوێتە سەر؟ ئەوە دوایی باسی دەکەین‌و ڕاجیایی زانایانی لەسەرە، بەڵام گرنگ ئەوەیە لێرەدا دەفەرموێ: هەر کامێك لە ئێوە کە لە ئیحرام دان، بە ئانقەست نێچیرێك ڕاو بکاو بیکوژێ ﴿ فَجَزَآءٞ مِّثۡلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ ﴾، پاداشتێکی لەسەرە وەك ئەوەی کە کوشتوویەتی لە ئاژەڵ، چ ئاژەڵێکی کوشتوە، هاووێنەکەی دەبێ بکڕێ‌و بیکاتە قوربانیی، ﴿ يَحۡكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ ﴾، دوو کەسی خاوەن دادگەریی لە ئێوە بڕیاری لەسەر دەدەن، دوو نەفەری بە ئینصافی دیندراری ڕێك‌و ڕاست، بۆ وێنە: ئەگەر گاکێوی کوژراوە، دەبێ حوشتر بکاتە خێر، ئەگەر بزنە کێوی بێ، دەبێ بەرانێك بکاتە خێر، ئەگەر باڵندەیە دەبێ حوشترمەل (نعامة)، یان مەڕێك بکاتە خێر، ﴿ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ ﴾، ئەو ئاژەڵە کە سەردەبڕدرێ، وەکو قەرەبووو پاداشت لەجیاتی ئەو نێچیرەی کە کوشتوویەتی، دەبێ بکرێتە دیاریی، وە بگەیەندرێتە لای کەعبە، کە دەفەرموێ: ﴿ هَدۡيَۢا بَٰلِغَ ٱلۡكَعۡبَةِ ﴾، هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، مەبەست پێی ئەوەنیە کە بچێتە لای کەعبە، چونکە ئەو ئاژەڵە ناگونجێ لە نێو کەعبەدا سەرببڕدرێ، وە جێشیان نابێتەوە، ئەدی مەبەست پێی

چییە؟ مەبەست پێی دەوروبەری كەعبەیە، واتە: بچێتە سنووری حەرەمەوە، ئەوە كە پێغەمبەر ﷺ دیاری كردوە كە فلان شوێن تا فلان شوێن، بە هەر چوار دەوری مەككەدا، بە ئەندازەی ئەوەندە دووریی، ئەوەندە كیلۆمەترە، ئەوە پێی دەگوترێ حەرەم، بگاتە نێو ئەو سنوورە، وە هەندێك دەڵێن: هەر تەنیا بگاتە نزیك سنووری حەرەم، تەواوە ﴿أَوۡ كَفَّٰرَةٞ طَعَامُ مَسَٰكِينَ﴾، یاخود ئەگەر ئاژەڵەكەی چنگ نەكەوت، ئاژەڵێكی بارتەقای ئەوە بە پارەكەی خواردن دەكڕێ‌و دەیدات بە نەداران ﴿أَوۡ عَدۡلُ ذَٰلِكَ صِيَامٗا﴾، یان "ئەگەر پارەی نەبوو" بە ئەندازەی ئەوە ڕۆژووگرتن، واتە: خواردنەكە چەند بووە، بۆ وێنە: دەگوترێ ئەوەندە كیلۆیە ئەوەندە ڕبە (صاع)یە، لە جیاتی خواردنی هەر ژەمێك لە ڕۆژێكدا، بۆ هەر نەدارێك ڕۆژوویەك دەگرێ، ﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦ﴾، بۆ ئەوەی سزای هەڵەو خراپەكەی خۆی بچێژێ، ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ﴾، خوا چاوپۆشیی لە ڕابردوو كردوە، كە لە ڕابردوودا نەتانزانیوە حەرامە، بە ئیحرامەوە نێچیرتان كوشتوە، خوا چاوپۆشیی لە هەمووی كردوە، ﴿وَمَنۡ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنۡهُ﴾، وە هەر كەسێك بگەڕێتەوە، دوای ئەوەی كە دەزانێ خوا قەدەغەی كردوە، پێشتر ئەگەر نەیزانیبێ، یان بە دڵنیاییەوە نەیزانیبێ، چونكە ڕەنگە بایی هەندێ بەهۆی ئەوەوە كە شارەزای دینی ئیبراهیم بوون، ئەوەی كە بۆیان بەجێماوە، هەندێك هەر زانیویانە، بەهەر حاڵ دوای ئەوەی خوای كاربەجێ لە دوا نوسخەی وەحی خۆیدا بۆی دیاریی كردن، هەر كەسێك بگەڕێتەوە سەر ئەوە، ئەوە خوا تۆڵەی لێ دەستێنێ، ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٞ ذُو ٱنتِقَامٍ﴾، وە خوا زاڵی خاوەن تۆڵەیە.

ئەوە بەنسبەت ڕاوكردن لە وشكانیی دا.

ئنجا خوای پەروەردگار باسی ڕاووشكار دەكات لە دەریادا، دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَحۡرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾، ڕاوكردنی دەریاتان بۆ حەڵاڵ

کراوە، سوودو مەدار سازکردنە بۆخۆتانو بۆ ڕێبوار، یاخود نێچیری دەریا، چونکە وشەی: (صید) چاوگە، دەگونجێ بە مانای ڕاوکردن بێ لە دەریادا، دەشگونجێ بە مانای خودی نێچیرەکە بێ، واتە: نێچیری دەریاتان بۆ حەڵاڵ کراوە،

﴿وَطَعَامُهُۥ﴾، وە خواردنی دەریاشتان بۆ حەڵاڵ کراوە، نێچیری دەریا چییە؟ وە خواردنی دەریا چییە؟ ئەوە دوایی لە مەسەلە گرنگەکاندا باسی دەکەین، واپێدەچێ مەبەست لە (صید) ئەوە بێ ئینسان زەحمەتێکی پێوە بکێشێ، تا ڕاوی دەکات، (طعام)یش ئەوەیە کە زەحمەتێکی وای پێوە نەکێشێو بە ئاسانیی بێتە دەستی.

﴿مَتَٰعٗا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِۖ﴾، ئەوە ڕابواردنێکی کەمەو خۆشگوزەرانییەکی کەمە، مەدار سازبوونێکە بۆخۆتان، وە بۆ ڕێبوارانیش، واتە: خواردنی دەریاو نێچیری دەریا، هەم ئێوە کە لە ئیحرامدان بۆتان حەڵاڵەو، هەم خەڵکی دیکەش کە لە ئیحرام دانیە، ئەو ڕێبوارانەی کە بە دەریادا دەڕۆن، بۆیان هەیە ڕاو بکەن لە نێچیری دەریاو لە خۆراکی دەریا بەهرەمەند بن، ﴿وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗاۗ﴾، وە ڕاوی وشکانیی، یاخود نێچیری وشکانییتان لێ قەدەغە کراوە تاکو لە ئیحرام دابن، بەڵام ئەگەر ئیحرامتان شکاند، بۆتان هەیە، وەك لە سەرەتای سوورەتی (المائدة)دا باسمان کرد، خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ﴾، دەفەرموێ: وە هەرکاتێ ئیحرامتان شکاند، ڕاوێ بکەن، یەکێك هەبوو هەر ئاوا تەماشای ڕواڵەتی قورئانی دەکرد، هەمیشە دەیگوت: ئەمر بۆ پێویست بوون (وجوب)ە، منیش گوتم: ئاخر مەرج نیە هەمیشە وابێ، جاری وایە بۆ ڕێ پێدانە، گوتی: نەخێر حەتمەن لە هەر شوێنێکی قورئاندا ئەمر هەبێ، بۆ فەرز بوونە، منیش گوتم: ئایا حەجت کردووە؟ گوتی: نەخێر، گوتم: إن شاء اللّٰه بە خێر ئەگەر حەجت کرد، یان عومرەت کرد، پاشان کە ئیحرامت شکاند، ئەوە واجبە ڕاوێ بکەی بە پێی قسەی تۆبێ؟ گوتی: بۆچی؟ گوتم: خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْ﴾، واتە: وە هەرکاتێ ئیحرامتان شکاند، ڕاوێ بکەن، کەواتە: دەبێ

بکەویە دوای مامزو کەروێشـكو ئاژەڵـی کـێوی، لەو دەشتەی عەرەبستاندا تا شتێك دەگری خۆتو ئەو چەند حاجییە کە لە وێـن! گوتـی: ئاوایـە؟ گوتم: بـە پێی قسـەی تۆبـێ بەڵـێ، بـەڵام لەڕاستییدا نەخێر وانیە، بەڵکو خوا کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْ ﴾، دەڵـێن: ئەم ئەمرە لـێرەدا بۆ ڕێ پێدانە، چونکە ئەمر لە دوای تەحریم مانـای ڕێ پێـدان دەگەیـەنێ (الأَمْرُ بَعْدَ التَّحْرِيمِ يُفِيدُ الإِبَاحَةَ)، پێشـێ خـوا فـەرمووی: ڕاوێ مەکـەن بـە ئیحرامـەوە، دوایـی دەفـەرموێ: کـە ئیحرامتـان شـکاند ڕاوبکەن، مانـای وایـە ئـەوەی پێشـێ لێتـان قەدەغـە بـوو، ئێسـتا بۆتـان حـەڵاڵە، نـەك ئێسـتا لەسـەرتان واجب بـێ، جا ئـەو بابەتـانە بەهـۆی زانسـتی (أصول الفقه)ەوە دەزانـرێن، ئەگـەرنا ئینسـان هـەر لەخـۆوە تەماشای ڕواڵەتی قورئـانو سوننەت بکات، تووشـی حـوکمی زۆر غەڵـەت دەبـێ، کـە خـواو پێغەمبـەری خـوا مەبەسـتیان نـەبوون، ﴿ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، وە پـارێز لـەو خـوایە بکـەن کـە بـۆ لای ئـەو کۆدەکرێنـەوە، واتـە: پـارێز لـە خـوا بکـەن لـەو شـتانەدا لـە ئیحـرامدا ڕاووشکار مەکەن، لە وشکانییدا شتێك مەکەن پێچـەوانەی فـەرمانی خـوابێ، هەرچـەندە وشـەی: تەقوا مەفهوومو ماناکەی گشـتییە، بـەڵام لـێرەدا تایبەتـە بـەوە کـە ڕاووشـکار نەکـرێ لـە کاتی ئیحـرام هەبووندا، چونکە جـاری وایە بە پێی سـیاقەکەی تایبـەت دەبێتـەوە بەو شـتەی کە لە سـیاقەکەدا هـاتوە، ئنجـا خوا چوار شـتان بـاس دەکات، دەفەرموێ: ﴿ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلْكَعْبَةَ ٱلْبَيْتَ ٱلْحَرَامَ قِيَـٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ وَٱلْهَدْىَ وَٱلْقَلَـٰٓئِدَ ﴾، خوا ئەو چوار شـتانەی کردوون بە مایەی ڕاوەسـتانی خەڵك، دینـداریو دنیـاداریی بـەو شتانەوە بەندە، دەفەرموێ: خوا کەعبـەی بەیتی حـەرامی گێڕاوە بە مایەی ڕاوەسـتانی خەڵك، هەروەهـا مانگی حـەرام، هەروەهـا (هدي) و (قلائد)یـش، پێشـتـریش گوتمان: کەعبە ئەو چـوار دیوارەیـە کە بەیتیشـی پـێ دەگوترێ، جاری وایـە بـەو مزگەوتـەش دەگوترێ کە لە دەوری کەعبـەیە، بەڵام کەعبـە بـە خودی ئـەو چـوار دیـوارە دەگوترێ کـە پـەردە ڕەشـەکەی بـۆ دەکـرێو دەرگـای هەیـەو، گۆشـەی بـەردە ڕەشـەکە (الحجر الأسود)و گۆشـەی یەمانیـی (الـركن اليمـاني) تێدایـە... هتـد، وەك دەیبینـین، خـوا ئەوەی کردوە بە مایەی ڕاوەسـتانی خەڵك، واتـە: بەهـۆی کەعبـەوە خەڵـك دینـدارییان

ڕادەوەستێ، وە هەروەها دنیادارییشیان، چونکە کاتی خۆی هەر کەسێك چووبێتە لای کەعبەو، چووبێتە دەوروبەری مزگەوتی حەرام، کەس بۆی نەبووەو دەستی لێ بدات، بۆ وێنە، ئەگەر کەسێکی کوشتبا کە دەچووە لای کەعبە، خاوەن کوژراو بۆی نەبوو بیکوژێ، ئەگەر لە هەموو دنیا شەڕو ئاژاوە بووبێ، لەوێ خەڵك هێمن بووە لە ئاشتییو ئارامیی دا ژیاوە، (والشهر الحرام) ئەو مانگانەی کە حەرامن، واتە: حەرامن جەنگیان تێدا بکرێ، ئەوانیش چوار مانگن، (رجب) بە تەنیا ئنجا (ذُو الْقَعْدَةِ، ذُو الْحِجَّةِ، مُحَرَّمُ) بە دوای یەکدا، ئەو چوار مانگەدا کاتی خۆشی وا بووە، جەنگیان تێدا قەدەغە کراو بووە، بە لای کەمەوە یەك لەسەر سێی ساڵ خەڵك لە هێمنیی دا ژیاوە، ئەگەر دوژمنی یەکدی بووبان، لەو چوار مانگە جەنگیان نەدەکرد، ئنجا (والهدي) واتە: ئەو ئاژەڵانەی کە دەکرێنە دیاریی و خەڵات، وە بەرەو لای کەعبە، بەرێ دەکرێن، لە کاتی خواپەرستییەکانی حەجو عومرەدا سەردەبڕدرێن، (قلائد) کۆی (قِلادة)یە، واتە: گەردنبەند، وە (قلائد) واتە: ئەو ئاژەڵانەی کە گەردنبەندیان لە مل کراوە، جا عەرەب عادەتیان وابووە، ئێستاش هەروایە ئەو ئاژەڵەی کە بردوویانە سەری ببڕن، جاری وا بووە نیشانەداریان نەکردوە، جاری واش بووە نیشانەداریان کردوەو گەردنبەندێکیان لە مل کردوە، یان درەختو گەلایەك کە بۆیان چنیوە، یان دونگەکەیان بریندار کردوە، ئیدی خەڵك زانیویانە ئەوە دیاریی کراوە بۆئەوەی لەوێ سەرببڕدرێو، کەس دەستی لێنەداوە، ﴿ذَٰلِكَ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾، بۆیەش خوا ئەوەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، تاکو بزانن کە خوا دەزانێ چی لە ئاسمانەکانو زەوییدا هەیە، وە خوا بە هەموو شتێك زانایە، واتە: خوا دەزانێ کە چی لە ئاسمانەکانو زەوی دا هەیە، ئێوە ژیانتان ئاوا نابێ بەڕێوە ناچێ، دەبێ دین هەم لە ڕووی شوێنەوە، هەم لە ڕووی کاتەوە، هەم لە ڕووی هەڵسوکەوتەوە، سنوورتان بۆ دابنێ، کە بە هۆی ئەو سنوورانەوە هەست بە ئارامییو هێمنییو ئاساییش بکەن، ژیانی دنیاو دینداریشتان بگوزەرێنن.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿ اعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ وَأَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾، بزانن كە خوا تۆڵەی توندە، وە بشزانن كە خوا لێبوردەی بە بەزەیی یە، تۆڵەی توندە بۆ كەسانێك كە سنوورەكانی خوا دەبەزێنن، لێبوردەو بە بەزەیی یە بۆ كەسانێك كە بە هەڵە، یان بە لەبیرچوونەوە شتێك دەكەن، یاخود بە ئانقەست خراپەو تاوان دەكەن، بەڵام دوایی پەشێمان دەبنەوە، دوایی دەفەرموێ: ﴿ مَّا عَلَى الرَّسُولِ إِلَّا الْبَلَاغُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴾، پێغەمبەری خوا ﷺ تەنیا گەیاندنی لەسەرە، دوای ئەوەی پێغەمبەر دەیگەیەنێ و ئاگادارتان دەكاتەوە، هیچی لەسەر نەماوە، پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەری پێویست نیە بە دەست بتانگرێ رێگا نەدات گوناهێ بكەن، دوای ئەوەی كە رایگەیاند، گوناح دەكەوێتە سەرخۆتان، ﴿وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا تَكْتُمُونَ ﴾، خوا دەزانێ ئەوەی كە ئاشكرای دەكەن و ئەوەی كە دەیشارنەوە.

لە كۆتایی دا حەقیقەتێكی زۆر گرنگ بە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ، كە رایبگەیەنێ: ﴿ قُل لَّا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ ﴾، دەگونجێ دواندن لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ بێ، بەڵام، هیچ نیشانەیەك نیە تایبەتی بكات بەوەوە، بۆیە ئێمەش دەگرێتەوە، تۆ بڵێ: ئەی ئەو كەسەی قورئان دەخوێنی! ﴿لَّا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ ﴾، پیس و پاك وەك یەك نین، یاخود خراپ و چاك وەك یەك نین، چونكە (طيب) دەگونجێ بە مانای پاك بێ، وە دەشگونجێ بە مانای چاك، یان سوودبەخش بێ، وشەی (خبيث)یش دەگونجێ بە مانای پیس بێ و، دەگونجێ بە مانای خراپ یان زیانبەخش بێ، جا زانایان زۆر شتیان گوتوە، دەڵێن: دەگونجێ ﴿الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ ﴾، مەبەست پێی كەسەكان بێ، وە دەگونجێ مەبەست پێی كردەوەو هەڵسوكەوتەكان بێ، یان مەبەست پێی شتەكان بێ، كەواتە: كەسەكان و لە كردەوان و لە هەڵسوكەوتان و لە شتان: پیس و پاك، خراپ چاك، زیانبەخش و سوودبەخش، وەك یەك نین، ﴿وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ ﴾،

هەرچەندە زۆریی پیس یاخود زیانبەخش، یاخود خراپ، تۆ سەرسام بكات، هەرچەندە زۆر زۆریش بێ، وەك كوردەواریی خۆمان دەڵێ: (پاكو پوخت نەك زۆرو بۆر) ﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾، ئەی خاوەن عەقڵان پارێز لە خوا بكەن بەڵكو سەرفرازبن، كەواتە: كێن شایستەی ئەوەن كە پارێزكاربن؟ خاوەن عەقڵان، چونكە جاری وایە وەك لەنێو كوردەواریی خۆشماندا باوە، ئەگەر كەسێك گێلو حۆل بێ، شێتۆلكە بێ، دەڵێن: ڕەنگە ئەوە وەلی خوابێ!! نەخێر دۆستانی خوا هەموویان دەبێ زۆر عاقڵ بن، شێتۆڵكەو خەڵكی فەقیر حاڵو بەستەزمان، نابنە دۆستی خوا، دەگونجێ خوا لێی خۆشبێ، گوناهی كەم بێ لەبەرئەوەی خوای دادگەر عەقڵو هۆشی كەم داوەتێ، بەڵام ناگونجێ دۆستانی خوا شێتو حۆل بن، پاكو پیسیی خۆیان نەزانن، كە بەداخەوە زۆرجار لە مامۆستایانیش ڕەنگە كە شێتێك دەبینن بڵێن: ڕەنگە ئەوە دۆستی خوابێ، نەخێر دۆستانی خوا هەموویان دەبێ زۆر عاقڵ بن، ئەوەتا خوای زاناو كاربەجێ لێرەدا فەرمان بە خاوەن عەقڵان دەكات كە ئەهلی تەقوابن.

## چەند مەسەلەیەكی گرنگ

**مەسەلەی یەكەم**: كە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلصَّيْدِ تَنَالُهُۥٓ أَيْدِيكُمْ وَرِمَاحُكُمْ لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾، ئێمە دەبێ شەش هەڵوەستە لە بەرانبەر ئەو ئایەتەدا بكەین:

**هەڵوەستەی یەكەم**: كە دەفەرموێ: ﴿لَيَبْلُوَنَّكُمُ ٱللَّهُ﴾، ئەو (ل)ە، لامی قەسەمە، واتە: سوێند بە خوا، (ن) نوونەكەش نوونی تەئكیدە، یانی: بە مسۆگەری، خوا تاقیتان دەكاتەوە، جا تاقیكردنەوەی خوا بۆ ئینسانەكان لە قورئاندا لە زۆر شوێندا باسكراوەو دووبارە كراوەتەوە، هەر بۆخۆی ئەو دنیایە وەك گوتراوە: (الدنيا دار الإبتلاء والإختبار، والآخرة دار البقاء والقرار) ئەم دنیایە جێی تاقیكرانەوەیە، دوارۆژ جێی تێدا مانەوەیە، جا یەكێك لەو شتانەی كە ئێمە پێی تاقی دەكرێینەوە، ئەوەیە كە لەكاتێكدا كە سەرگەرمی خواپەرستیی، شتێكت بێتە پێش، پێچەوانەی خواپەرستیی بێ، بۆ وێنە: لە ئیحرامدای، نێچیرت دێتە بەردەست، بە ڕۆژووی، خواردنێكی خۆشت دێتە بەردەست، خەریكی تاعەتێكی، لەولا گوناهێك دێتە بەرچاوت و دەبێ خۆتی لێ بپارێزی، ئەوە یەكێكە لە تاقیكردنەوەكانی خوا.

**هەڵوەستەی دووەم**: كە دەفەرموێ: ﴿بِشَىْءٍ مِّنَ ٱلصَّيْدِ﴾، بە شتێك لە نێچیر، یاخود بە شتێك لە ڕاوكردن، ئەوە بۆ كەمییە، یانی: با شتێكی كەمیش بێ، دەبێ خۆتانی لێ بپارێزن، ئەوەی خۆی لە كەم نەپارێزێ، خۆی بۆ لە زۆریش ناپارێزرێ، بەڵكو كەم واتلێدەكات دوایی تووشی زۆریش ببێ.

**هەڵوەستەی سێیەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ ٱلصَّيۡدِ ﴾، وشەی (صید) بە ئاژەڵ واتە: چوارپێ، وە بە پەڕەور، واتە: باڵندەو ئەوانەی دەفڕن، دەگوترێ، وە دەبێ كێوی بێو گۆشتی حەڵاڵ بێ، وەك مامز، بەڵام ئەگەر كێوی بێ، بەڵام گۆشتی حەڵاڵ نەبێ بە (صید) دانانرێ، وەك: گورگ پڵنگو چەقەڵ، وە دەبێ كێوی بێو كەویی نەكرابێ، وە هەم گۆشتەكەشیان دەبێ حەڵاڵ بێ لە خودی خۆیاندا، زۆربەی زانایان وادەڵێن، هەندێكیشیان دەڵێن: ئەگەر گۆشتەكەشی حەڵاڵ نەبێ، مادام كێوی بێ، هەر دەگوترێ (صید).

بەڵام واپێدەچێ ئەو ڕایەی دیكە ڕاستتر بێ، چونكە خەڵك گورگو چەقەڵی بۆچییە؟ بۆچی ڕاویان دەكات؟ خەڵك شتێك ڕاو دەكات كە سوود لە گۆشتەكەیان ببینێ.

**هەڵوەستەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ ﴾، هەندێك لە زانایان ئاوایان لێكداوەتەوە: ﴿ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ ﴾، واتە: نێچیری بچووك كە بە دەست دەگیرێ، ﴿ وَرِمَاحُكُمۡ ﴾، ئەوەی كە بە چەك دەگیرێ، بەڵام من وای تێدەگەم ﴿ تَنَالُهُۥٓ أَيۡدِيكُمۡ وَرِمَاحُكُمۡ ﴾، واتە: بەرپەلتان دەكەون، جا چ بەدەستی ڕووت بێ، چ بە هۆكارێك بێت، تەڵەو داوی بۆ دابنێی، تەپكەی بۆ دابنێی، یان بە چەك ڕاوی بكەن، ئەوەی كە وەبەر پەلتان دەكەون، جا چ بە ئاسانیی، چ بە زەحمەت.

**هەڵوەستەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: ﴿ لِيَعۡلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلۡغَيۡبِ ﴾، یەكێك بۆی هەیە پرسیار بكات، بڵێ: باشە ئەدی خوا بۆخۆی نازانێ كێ لە خوا دەترسێ، مادام وایە بۆ تاقیمان دەكاتەوە؟ بۆیە زانایان ئاوایان لێكداوەتەوە، دەڵێن: (لِيَعْلَمَ اللهُ مشاهدةً مَا عَلِمَهُ غَيْبَاً مِن امْتِثَالِ مَنْ امتثل وَاعتِداءِ مَنِ اعْتَدَى)، واتە: تاكو خوا بە بینین ببینێ، ئەوەی كە بە پەنهانیی زانیویەتی بە زانیاری خۆی زانیویەتی لە دنیایی واقیعدا ببینێ، كە داخۆ كێ فەرمانی جێبەجێ دەكاو كێ دەستدرێژیی دەكات، وەك من لە (مانای وشە بە وشەی

ئایەتەکان)دا گوتوومە، واتە: خوا لە دنیای واقیعداو بە بەرجەستەکراویی بزانێ، ئەگەرنا لە زانیاریی بێسنووری خۆیدا هەموو شتێك دەزانێ، جا ئەوە لە زۆر شوێندا لە قورئان دووبارە بۆتەوە، با لێمان تێکنەچێ!

کە دەفەرموێ: ﴿لِيَعْلَمَ ٱللَّهُ مَن يَخَافُهُۥ بِٱلْغَيْبِ﴾، ئەوەنیە کە خوا هەتا ئینسان شتێك نەکات نەیزانێ! خوا پێشئەوەی ئەو شتە ئەنجامیش بدرێ دەیزانێ، بەڵام دەیەوێ بە بەرجەستەکراویی‌و، بە کردەوەی ئینسانەکە بیزانێ.

**هەڵوەستەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُۥ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾، واتە: دوای ئەوەی بۆتان ڕوون کراوەتەوە، هەر کەس دەستدرێژیی بکات، ئازارێکی بە ئێشی هەیە، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە بەر لەوەی ئێمە حوکمی شەرعیی شتێك بزانین کە قەدەغەیە ئەگەر بیکەین، مادام بە نەزانییە، گوناهی لەسەر نییەو، سزاو ئازار ڕوومان تێناکات، مادام نەمانزانیبێ، بەڵام ئەوە دەبێ یەك قەیدی بخەینە سەر، واتە: نەمانزانیبێ، وە لە نەزانینەکەشدا کەمتەرخەم نەبووبین، چونکە زانایان دەڵێن: هەموو کەس پاساو بۆهێنراو (مَعْذُور) نیە بە نەزانین (جهل)، واتە: شتێك بکاو دوایی بڵێ: نەمزانی، ئایا هەموو کەس لێی وەردەگیرێ، هەموو کەس پاساوی لێ قبوول دەکرێ؟ نەخێر، دەبێ لەو جۆرە بێ کە پاساودار (مَعْذُور) بە نەزانین (جهل)ەکەی، یانی: هیچ ڕێگەیەکی نەبووبێ تاکو بیزانێ، وە کەسی دەستنەکەوتبێ‌و، هیچ دەرفەتی نەبووبێ کە حوکمی ئەو شتە بزانێ، ئەوجار ئەگەر بیکات، گوناهبار نیە.

**مەسەلەی دووەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْتُلُوا۟ ٱلصَّيْدَ وَأَنتُمْ حُرُمٌ ﴾، دەربارەی وشەی: (صید) هەرچەند پێشتریش باسمان کرد، زانایان سێ ڕایان هەن:

١) هەندێــك دەڵــێن: (صــید) هــەر شــتێكە ڕاوبكــرێ، جـا گۆشـتی بخـورێ یـان نەخــورێ، وە چ ماڵــیی بــێ، واتــە: دەســتەمۆ كرابــێو، ڕام كرابــێ، وەك ئــەو ئاژەڵانــەی لەگــەڵ خەڵكــدا دەژیــن، هــەر چــوار جــۆرە ئاژەڵــەكان: حوشتــرو ڕەشــەوڵاخو مەڕو بــزن، چ كــێوی بــێ، كە ئەو ڕایــە زۆر بێهــێزە.

٢) هەندێكــیش دەڵـێن: (الصَّـیدُ: كُـلّ مـأكول اللّحـم سِوَى الفَوَاسِـق الخمـس) نێچیــر هــەموو شــتێكە كــە گۆشــتی بخــورێ، جگــە لــە پێــنج فاسـقەكان، هــەر لــە كوردەواریــی خۆشــماندا دەڵـێن: فاسـقی خەمســە، جـا دوایـی باسـی (الفَوَاسِـق الخمس) دەكەین، دەڵێن: هەر ژیــانداریكە كە گۆشتی بخورێ: ئـاژەڵو چـوارپێ بێ، یان پەلەوەر بــێ، بچــووك بــێ، یـان گــەورەبێ، مـادام گۆشتی بخورێ، جگـە لـە پێنج ژیانداره فاسـقەكان.

٣) هەندێكــی دیكــە دەڵێن: نێچیـر هـەر شـتێكە كـە گۆشـتی بخـورێ، واتـە: مـەرج نیــە تــەنیا ئــەو پێــنج فاســقە، لــە چــەمكی نێچیــر هــەڵاوێرراین، هــەر شــتێكی دیكــەش كە گۆشــتی نەخــورێ، بە نێچیــر دانانرێ.

هەڵبــەتە هەندێكیش گوتوویـانە هەر شـتێكی دیكـەش وەكو ئـەو پێـنج فاسقانە بـێ حوكمــی وانی هەیــە، هەندێكــیش دەڵـێن: نەخـێر هەر ئەو پێنجــەن.

ئنجـا كــە خــوا دەفــەرمووێ: ﴿وَأَنتُمۡ حُرُمٞ﴾، واتــە: ئێــوە لــە ئیحــرامدا بــوونو ئیحــرامتان بەســتبوو، كــەی ئینســان ئیحــرام دەبەســتێ؟ یــان بــۆ حــەج، یــان بــۆ عــومرە، هەڵبەتــە جــاری واش هەیــە حــەج عومرەشــی لەگەڵــدا دەكــرێ، ئــەوە پێــی دەگوتــرێ حەجــی (قــران)، یــان حەجــی (تَمَتّـع)، وە جــاری وایــە بــە تەنیــاش دەكرێو پێی دەگوتــرێ (إفـراد)، وە جاری واشــە عـومرە بـە تەنیــا دەكـرێ، بـەڵام گــرنگ ئەوەیــە ئیحــرام تــەنیا لــە حاڵەتێكــدا دەبەســترێ، كــە ئینســان خـواپەرســتییەكانی حــەج جێبــەجــێ دەكــات، یــان عومــرە، یـان هـەردووكیان پێكـەوە، لـە زمـانی عەرەبیـدا دەڵـێ: (رَجُـلٌ حَـرَامٌ وَامْـرَأَةٌ حَـرَام) (رجـالٌ حُـرُم وَنسَـاء حُـرُم) پیـاوێكی حـەڕام، واتـە: پیاوێـك لـە ئیحـرامدایە (إمْـرَأَةٌ حَـرَام) ئافرەتێـك لـە حەڕامدایــە، پیاوانێــك كــە ئیحرامیــان بەســتووە، ئافرەتانێـك كــە ئیحرامیـان بەسـتووە، هەروەهــا دەگـوترێ (رَجُـلٌ حَـلال وَامْـرَأَة حَـلال) (وَرجَـالٌ حَـلال وَنسَـاء حَـلال) هــەموو ئەوانە بەكـاردەهێنرێن.

ئەمما ئەو پێنج زیندەوەرە ژیاندارەش کە هەڵاوێـردران بابـای ئیحـرام بە حـەجو عـومرە، یـان بـە عـومرە، یـان بـە حـەج بەسـتوو، بـۆی هەیـە بیانکـوژێ، با لـە ئیحـرامیش دابـێ، ئەو پێنجـەن: ﴿عَن عَائِشَـةَ رَضِـيَ اللهُ عَنْهَـا، أَنَّ رَسُولَ اللهِ ﷺ، قَـالَ: خَمْسٌ مِـنَ الـدَّوَابِّ، كُلُّهُـنَّ فَاسِـقٌ، يُقْـتَلْنَ فِـي الْحَـرَمِ: الْغُـرَابُ وَالْحِـدَأَةُ وَالْعَقْرَبُ وَالْفَـأْرَةُ وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٤٦١٣) وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٣١٤)، وَمُسْـلِمٌ بِـرقم: (٢٨٥٣)، وَالتِّرمِـذِيُّ بِـرقم: (٨٣٧) قَـالَ: حَسَـنٌ صَـحِيحٌ، وَالنَّسَـائِيُّ بِـرقم: (٢٨٨٧)، وَالطَّبَرَانِـيُّ فـي الأوسـط بِـرقم: (٥٤٨٠)}، واتـە: عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: پێـنج ژیـاندار، {پێنج شـت کـە دەڕۆن، (دواب) کۆی (دابة)یـە واتـە: هـەر شـتێك کـە لەسـەر زەوی بـڕوا} هـەر پێنجـیان فاسـیقن، واتـە: خـراپن، وە خوێنیـان حـەڵاڵە لـە حەرەمـدا دەکوژرێن، یاخود لە کاتێك ئینسـان لە ئیحرامدایە بۆی هەیـە بیانکوژێ، ئەوانیـش: ١/ (الْغُـرَابُ) قەلەڕەشـە، ٢/ (وَالْحِـدَأَةُ) قەلـە بەڵەکـە، دیـارە ئـەویش دەنـدووکی بـە قولابـە، ٣/ (وَالْعَقْرَبُ) دووپشـك، ٤/ (وَالْفَأْرَةُ) مشـك، ٥/ (وَالْكَلْبُ الْعَقُورُ) سـەگی هـار، یان سـەگێك کە خەڵك بگـرێ، لە صەحیحی موسـلیم دا لـە جیـاتی (الْعَقْرَبُ) گوتـراوە (الحية) مار، با لە ئیحرامیش دابـێ، مار بـۆت دێ، دووپشـك ئەوانی دیکـە بۆت هەیـە بیانکـوژی، وە زەرەریشی نیە بۆ حـەجو عومرەو ئیحرامەکـەت، دیـارە لە کاتێکدا کە پێویسـتە بیانکوژی. ئەگەرنا لە ئیحـرام دابی، بکەویـە دەشـتو دەرێ، بە دوای دووپشـكو مارو ئەوانە بکـەوی! ئەوە شـتێکی تەواو نیـە.

{وَقَـالَ سُـفيان بـن عُيَينـة وزَيـد بـن أسْـلَم: الْكَـلْبُ الْعَقُـورُ يَشْـمُل هَـذِهِ السِّـبَاعَ العَـادِيَة كُلّها. بدليل قَولِـهِ: ﷺ لَمَّا دَعَا عَلَى عُتْبَةَ بْنِ أَبِي لَهَبٍ قَالَ: اللَّهُمَّ سَلِّطْ عَلَيْـهِ كَلْبَـكَ فَأَكَلَـهُ السَّبْعِ بِالزَّرْقَـاءِ} (محاسـن التأويـل: ج٤، ص٣٧١) سـوفیانی کـوڕی عویەینـەو زەیـدی کـوڕی ئەسـلەم خـوا لێیـان ڕازی بـێ، گوتوویانـە: کـە دەفەرمـوێ (الْكَـلْبُ الْعَقُـورُ) سـەگی هـار، یـاخود سـەگێك کـە خەڵـك دەگـرێ، هـەموو جـۆرە دڕنـدەکان دەگرێتـەوە (واتـە: پڵنگو شێرو چەقەڵو کەمتیارو ئـەو شـتانەی کـە پـەلاماری خەڵـك دەدەن) بـە بەڵـگەی فەرمایشـتی پێغەمبـەر ﷺ کـە دوعای لە عوتبـەی کوڕی ئەبو لـەهەب کرد، کە پێغەمبـەری خـوای ئەزیـەت دابوو،

ئەویش فەرمووی: خوایە لە سەگەکەی خۆتی بەسەردا زاڵبکە، (لە ڕیوایەتێکدا فەرموویەتی: ﴿اللَّهُمَّ سَلِّطْ عَلَيْهِ كَلْبًا مِنْ كِلَابِكَ﴾ {أَخْرَجَهُ البيهقي في (سنن الكبرى) برقم: (٩٨٣٢)}، واتە: ئەی خوایە! سەگێك لە سەگەكانی خۆتی بەسەردا زاڵ بكە)، ئەوە بوو شێر خواردی لە زەرقا (السبع: لێرەدا یانی: شێر) لە زەرقا لەگەڵ كاروان بوو، زۆر لەخۆی دەترسا، لەنێو خۆیانەوە گرتبوو، شێر هات بۆنی پێوەكردن تا هاتە سەر ئەوو خواردی دووعای پێغەمبەر ﷺ لێی قبووڵ بوو، كەواتە وشەی (كلب) هەموو دڕندەیەك دەگرێتەوە، شێر بێ، پڵنگ بێ، هەرچی بێ، منیش ئەو ڕایەم پێ ڕاسترە.

**مەسەلەی سێیەم:** كە خوا دەفەرموێ: ﴿ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ مِنَ ٱلنَّعَمِ يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ مَسَٰكِينَ أَوْ عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا ﴾، ئەمەش دەبێ چەند هەڵوەستەیەكی لە بەرانبەردا بكەین:

**هەڵوەستەی یەكەم:** كە دەفەرموێ: (مُّتَعَمِّدًا ) هەر كەسێك بە ئەنقەست نێچیرێك بكوژێ، ئایا كەسێك كە لەبیری بچێ، یاخود بە هەڵە، شتێك بە نێچیرێكەوە بنێ، زامن دەبێ، قەرەبووەكە بداتەوە؟

زانایان ڕاجیاییان هەیە، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: بەڵێ سزایەكە لەسەر هەمووانە، منیش ئەو ڕایەم پێ ڕاستە، یەكێك بۆی هەیە بڵێ: بۆچی خوا دەفەرموێ ﴿ وَمَن قَتَلَهُۥ مِنكُم مُّتَعَمِّدًا ﴾، كەسێك بە ئانقەست؟ وەڵامەكەی ئەوەیە وەك (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە كتێبەكەی خۆی (تيسير الكريم الرحمن في تفسير الكلام المنان)دا جوانی دێنێت، دەڵێ: هۆی كە خوا وایفەرمووە ئەوەیە (وَإِنَّمَا نَص الله عَلَى الـمُتَعَمّد لِقَتْل الصَّيد، مَعَ أَن الجَزَاءَ يلزم الـمُتَعَمّد وَالمُخطيء، "كَمَا هُوَ القَاعِدَة الشرعية" أن المتلفَ للنفوس والأموال المحترمةِ، فَإِنَّهُ يضمنها على أي حَال كَان، إِذَا كَانَ إِتْلافُهُ

بغَير حَق، لأَنَّ الله رَتَّبَ عَلَيْهِ الجَزَاء والعقُوبة والإنتقام، وَهَذَا للمُتَعَمِّد، وَأَمَّا المُخْطِيء فَلَيْسَ عَلَيْهِ عقوبةُ، إنَّمَا عَلَيْهِ الجَزَاء)[1]، واتە: بۆیە خوا دەفەرمویّ: هەر کەسێك بە ئانقەست نێچیرێك بکوژێ، ئەوە سزاو تۆڵەکەیەتی، بۆیە خوا باسی بە ئانقەستی کردوە، بۆ کەسێك کە نێچیرێك بکوژێ، لەگەڵ ئەوەشدا کە سزاو قەرەبووەکە دەکەوێتە سەر، هەر کەسێك بە ئانقەست یان بە هەڵە بێ، یان بە لەبیرچوونەوە بێ، وەك چۆن بنچینەی شەرعیی وایە هەر کەسێك نەفسێك بفەوتێنێ، یاخود ماڵو سامانێکی موحتەرەم بفەوتێنێ، ئەوە زامینی دەبێو دەکەوێتە سەری، دەبێ بیبژێرێ، بە هەر شێوەیەك لە شێوەکان فەوتاندبێتی، مادام بە ناهەق بێ، بەڵام ئایا بۆچی خوا، وشەی: (مُتَعَمِّد)ی بەکارهێناوە؟ چونکە خوای کاربەجێ لەسەر ئەو نێچیر کوشتنە، باسی قەرەبووی کردوە، باسی سزاو تۆڵەی کردوە، وە دیارە بابای کە بە هەڵە بیکات، سزای ناکەوێتە سەر، خوا تۆڵەی لێ ناستێنێتەوە، بەڵکو تەنیا قەرەبووی دەکەوێتە سەر بۆیە وشەی: (مُتَعَمِّد)ی لێرەدا هێناوە.

**هەڵوەستەی دووەم:** کە دەفەرموێ: (فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ) بەو چوار جۆرە خوێندراوەتەوە:

١- (فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ).

٢- (فَجَزَآءٌ مِّثْلِ مَا قَتَلَ).

٣- (فَجَزَآءٌ مِّثْلَ مَا قَتَلَ).

٤- (فَجَزَآءُ مِّثْلِ مَا قَتَلَ).

مەبەست لێرەدا ئەوەیە کە ئایا: ئەو نێچیرە دەبێ قەرەبووەکەشی وەك خۆی بێ، لە نرخ دا، یان لە قەبارەو (حجم)دا؟ لێرەش دوو ڕا هەن لە نێوان زانایان هەر کامێکیان بێ، دەیگرێتەوە، بە پێی ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ، ﴿عَنْ جَابِرٍ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ: (فِي الضَّبُعِ إِذَا أَصَابَهُ المُحْرِمُ كَبْشٌ،

---

١) ص٢٤٤.

وَفِي الظَّبْيِ شَاةٌ، وَفِي الأَرْنَبِ عَنَاقٌ، وَفِي الْيَرْبُوعِ جَفْرَةٌ) {أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ في (سنن الكبرى) برقم: (٩٦٦٠)، وَالدَّارَقُطْنِي برقم: (٤٩) وَصَحَّحَهُ الألباني في (إرواء) برقم: (١٠٥٣)}، واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ، فەرموویەتی: بابای ئیحرام بەستوو ئەگەر كەمتیاری كوشت، دەبێ بەرانێك بدات لە بەرانبەریدا، وە لە بەرانبەر بزنەكێوییەكدا مەرێك بدات، وە لە بەرانبەر كەروێشكێك كاریلەیەك بدات، وە لە بەرانبەر بزن مژەیەك (كە خشۆكێكە لە شێوەی جرجە، بەلام گۆشتی دەخورێ) جەفرەیەك بدات، (واتە: بێچووی بزن، كاریلەیەكی زۆر بچووك، (جفرة) ئەوەیە كە لە شەش مانگ كەمتر بێ، یانی: سێ چوار مانگە بێ).

جا كە دەفەرموێ: ﴿ فَجَزَآءٌ مِّثْلُ مَا قَتَلَ ﴾، ئایا لە نرخەكەیدا یاخود لە خیلقەتو قەبارەكەیدا؟ ئەبو حەنیفە دەڵێ: لە نرخەكەیدا، بەلام زۆربەی زانایان دەڵێن: لە قەبارەو چۆنیەتییەكەیدا، منیش پێموایە هەردووكی دەگرێتەوە، بە یەكسانیی.

**هەڵوەستەی سێیەم:** كە دەفەرموێ: (يَحْكُمُ بِهِۦ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ) دوو نەفەری دادگەر لە ئێوە بڕیاری لەسەر دەدەن، واتە: دەبێ دوو مسوڵمان لە خۆتان كە دادگەربن، بە ئینصاف بن، بڵێن: (أَشْهَدُ بِاللَّه) ئەو نێچیرە كە كوژراوە، ئەوە بارتەقایەتی لە ئاژەڵان، ئەو ئاژەڵە بكرێتە قەرەبوو و سەرببڕدرێ و بكرێتە فیدیەی.

**هەڵوەستەی چوارەم:** كە دەفەرموێ: (هَدْيًۢا بَٰلِغَ ٱلْكَعْبَةِ) هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن وەك كە مەبەست لە (الكعبة) واتە: حەرەمی مەككە (الحرم المكي)یەو، دەبێ ئەو فیدیەیە ببردرێتە سنووری حەرەمەوەو لەوێ سەرببڕدرێ.

**هەڵوەستەی پێنجەم:** كە دەفەرموێ: (أَوْ كَفَّٰرَةٌ طَعَامُ مَسَٰكِينَ) كەسێك لە ئیحرام دایە، نێچیرێك ڕاو دەكاو دەیكوژێ، بە ئانقەست بێ یان بە هەڵەو لەبیرچوون بێ، لەسەر ڕای زۆربەی زانایان ئەو كەسە پێویستە قەرەبوو بدات، لە چ جۆرە ئاژەڵێك، یان لە چ جۆرە پەلەوەرێك ڕاوی كردوە، پێویستە وێنەی

ئـەوە بــدات، جـا ئـەبو حەنیفــە دەڵــێ: نرخەکـەی لەبەرچـاو دەگیــرێ. بـەڵام زۆربـەی زانایـان دەڵێن: قـەبارەو شـێوەی ئـەو نێچیــرە لەبەرچاو دەگیــرێ، ئـەوە ئەگـەر ئـەو کەسـە لـە توانـای دا هـەبوو، ئەگـەرنا ﴿أَوْ كَفَّـٰرَةٌ طَعَـامُ مَسَـٰكِينَ ﴾، هەڵبــەتە لێـرەدا دیســان دەربـارەی وشـەی: یـان (أو) وەك لـە کـەفارەتی سـوێندەدا باســمان کرد، زانـایـان دوو ڕایـان هــەن:

١/ هەندێکیان دەڵـێن: بۆ ڕیزبـەندییـە، واتە: تا هـی یەکـەمی لەتوانادا هـەبێ، نابێ هی دووەم بکـات، وە تا هـی دووەمی لەتوانادا هەبێ، نابێ هی سێیەم بکـات.

٢/ زۆربەشــیان دەڵــێن: نــەخێر، ئـەوە بـۆ سـەرپشـککردنــە (التخيير)، واتـە: هەرکـام لەوانەی باسـکران، دەتوانـێ بیدات، دەگونجـێ ئاژەڵێك، یـان پەلـەوەرێك بکاتە قەرەبــوو، یاخود خــواردن بـە نەدارێـك بدات، ئنجا ئایا ئـەو خــواردنە چۆنـــە مەزەنـــدە دەکـــرێ؟ ئـــەو ئاژەڵـــە کـــە وێنەکــــەی دەســـت ناکـــەوێ قەرەبووەکـەی دەسـت ناکـەوێ، تەماشـا دەکـەی قەرەبووەکـەی بایـی چــەندە؟ بایـی ئەوەنـدە نرخەکــەی دەدەی، بـۆ وێنـــە بـایی سـێ سـەد هـەزار دینـاری عیـراقییە، بـەو بـڕە پـارە دەکـاتە چەند ژەمـە خــواردن دەیدا بـە نــەدار، جا هەنـدێك لـە زانایــان دەڵــێن: ژەمێـك، هەندێــك دەڵــێن: دوو ژەم، (يُغَـدِّيهم ويُعشِّيهِم) ئیـدی دەکاتە چـەند ڕۆژ خــواردن بـۆ نـەداران، ئەوەنـدە خــواردنەی پێ دەکـرێدرێو تەسـلیمیان دەکـرێ، لەجیـاتی قەرەبـووی ئاژەڵەکـە.

**هەڵوەســـتەی شــەشــــەم:** کـە دەفـەرموێ: (عَدْلُ ذَٰلِكَ صِيَامًا ) ئنجا ئەگـەر ئـەو خــواردنەشی نــەبوو بیــدات بــە نــەداران، ئــەوە بــە ئەنــدازەو بارتــەقای ئــەوە ڕۆژووگـرتنی دەکەوێتـە سـەر، وشـەی (عَـدل) کـە بـە (عِـدل)یـش خوێندراوەتـەوە (عَـدل، عِـدل) واتـە: (مِـثل) وێنـە، جا زانایـان دەڵێن: ئەگـەر (عِـدل)بـێ، واتـە: لـە جینســی خــۆی، دەگوتـــرێ: (هَـذَا القلـم عِـدلُ ذلـك القلـم) مـادام ئـەو شـتە لـە جینسـی ئـەو شــتە بــێ، بـەڵام کە گوتـت (عَدْلُـهُ) مـەرج نیــە لـە جینســی بــێ، بــەڵام گرنگ ئەوەیە لە نرخیــدا، یاخود لە شــێوەیدا هاوتایـەتیو بارتەقایـەتی، با لە جینسـی خۆشــی نەبــێ.

ئیمام مالیك ڕەحمەتی خوای لێ بێ قسەیەكی جوانی هەیە، بۆ چۆنیەتی مەزەندە كردنی ڕۆژووەكان، وەك (قرطبي) لە (الجامع لأحكام القُرآن)دا هێناویەتی: (قَالَ يَحْيَى قَالَ مَالِك أَحْسَنُ مَا سَمِعْتُ فِي الَّذِي يَقْتُلُ الصَّيْدَ فَيُحْكَمُ عَلَيْهِ فِيهِ أَنْ يُقَوَّمَ الصَّيْدُ الَّذِي أَصَابَ فَيُنْظَرَ كَمْ ثَمَنُهُ مِنَ الطَّعَامِ فَيُطْعِمَ كُلَّ مِسْكِينٍ مُدًّا أَوْ يَصُومَ مَكَانَ كُلِّ مُدٍّ يَوْمًا)[1]، واتە: یەحیا دەڵێ، مالیك گوتوویەتی: باشترین شتێك لەبارەی ئەو كەسەوە كە نێچیرێك دەكوژێ، وە وێنەی ئەوی دەستناكەوێ تاكو قەرەبووی بدات، ئەوەیە كە بەو شێوەیە بڕیاری بەسەردا بدرێ: نێچیرەكە دەنرخێندرێ، وە تەماشا دەكرێ نرخەكەی چەندە، وە پاشان تەماشا دەكرێ، بە نرخەكەی چەند خواردن دەكڕدرێ، هەر نەدارەی ڕۆژە خواردنێكی یان مستە خواردنێكی دەدرێتێ، یان لەجیاتی هەر مستە خواردنێك ڕۆژێك دەگرێ، (واتە: ئەگەر خواردنەكەی نەدا، تەماشا دەكەین، چەند مستە، ئنجا لەجیاتی هەر مستە خواردنە ڕۆژێك بە ڕۆژوو دەبێ).

بەڵام بە بۆچوونی من چەند ڕۆژە خواردنە، جا دوو ژەمە، ژەمێكە، لە جیاتی هەر ڕۆژێك، خواردنی ڕۆژێك بەڕۆژوو دەبێ، چونكە ئایەتەكە باسی مست (مُدّ) ناكاتو باسی خواردنی نەدارێك، (طعام مسكين) دەكات، كە دیارە خواردنی ڕۆژێكە: ژەمێك یان دووان.

**هەڵوەستەی حەوتەم:** كە دەفەرموێ: (لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمۡرِهِۦ)، پێشتر باسمان كرد، (الوبالُ: سُوءُ العَاقِبَةِ والمرعى الوبيل: الَّذِي يَتَأَذَّى بِهِ بَعْدَ أَكْلِهِ وَطَعَامٌ وبيل: إِذَا كَانَ ثَقِيلاً) لە ئەسڵدا (وبال) بە بارانی دڵۆپە زلو دڵۆپە قورس دەگوترێ، ئنجا (وَبَالَ) واتە: سەرەنجامی خراپ، (والمرعى الوبيل) واتە: لەوەڕگایەكی بە دەرد، كە وڵاخێك لەو لەوەڕگایە بخوات، ئازاری پێ بگات، دوای ئەوەی كە دەخوات تووشی ناڕەحەتیی ببێ، (وَطَعَام وبيل: أَي ثَقِيل)، خواردنێكی قورس كە ببێتە هۆی ئازاردانی ئینسان، لێرەدا كە دەفەرموێ:

---

[1] ج٤، ص٢٧٤.

﴿لِّيَذُوقَ وَبَالَ أَمْرِهِۦ﴾، واتە: ئەو قەرەبووە، جا لە ئاژەڵ یاخود لە خواردن، یان لە ڕۆژووگرتن، دانراوە، بۆ كەسێك كە لە ئیحرامدایەو نێچیر ڕاو دەكات، با ئەو سزایە بچێژێ، تاكو تەمبێ بێ، وە خەڵكی دیكەشی پێوە تەمبێ بێ، وە ببێتە كەفارەتیو پاكبوونەوەی لەو گوناهەی كە كردوویەتی.

**هەڵوەستەی هەشتەم:** كە دەفەرموێ: (عَفَا ٱللَّهُ عَمَّا سَلَفَ)، خوا بوردوە لەوەی تێپەڕیوە، چاوپۆشیی كردوە، واتە: ئەگەر لە سەردەمی نەفامییدا واتانكردبێ، ئەوە واتایەكی، واتایەكی دیكەی هەیە كە پێم باشترە، واتە: پێش ئەوەی كە قەدەغە بكرێ، ئەگەر كەسێك حەجی كردوە، عومرەی كردوە، بەڵام نێچیری كوشتوە با لە ئیحرامیشدا بووبێ، خوای پەروەردگار لێی بوردوە، چونكە هەتا یاسای خوای پەروەردگار نەیەتە خوار ئەو شتەی كە قەدەغەیە، خەڵك مولزەم پێی نیە.

**هەڵوەستەی نۆیەم:** كە دەفەرموێ: (وَمَنْ عَادَ فَيَنتَقِمُ ٱللَّهُ مِنْهُ ۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ ذُو ٱنتِقَامٍ)، وە هەر كەسێك گەڕایەوە بۆئەوەی كە قەدەغە كراوە، واتە: گەڕایەوە بۆ قەدەغە شكاندنو بۆ ئەو گوناحكردنە، خوا تۆڵەی لێ دەستێنێ، بێگومان خوا زاڵی تۆڵەستێنە.

**مەسەلەی چوارەم:** كە خوا دەفەرموێ: ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ مَتَٰعًا لَّكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ ۖ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا ۗ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ﴾، مانا ڕواڵەتییەكەی ئەوەیە كە ڕاوكردنی دەریا یاخود نێچیری دەریاو خواردنی دەریاتان بۆ حەڵاڵ كراوە، وەك ڕابواردنو مەدار سازكردنێك بۆ خۆتانو بۆ ڕێبواران، واتە: بۆخۆتان وەك مسوڵمانانێك كە ئیحرام دەبەستنو دەچن بۆ حەجو عومرە بە دەریادا تێدەپەڕن، بۆتان هەیە سوود ببینن لە نێچیری دەریا، وە لە خواردنی دەریا، وە بەگشتیش بۆ خەڵكی ڕێبوار كە بە دەریادا سەفەرو هاموشۆ دەكەن، ﴿وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ ٱلْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا﴾،

بەڵام تا لە ئیحرام دابن، نێچیری وشکانییتان لێ قەدەغە کراوە، یاخود ڕاوکردنتان لە وشکانییدا لێ قەدەغە کراوە، ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ٱلَّذِىٓ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴾، وە پارێز لەو خوایە بکەن، کە بۆ لای ئەو کۆدەکرێنەوە.

وشەی (صید) بە مانای ڕاوکردن دێ، واتە: (مصدر الإصطیاد)، وە بە مانای (مصید)یش دێ، واتە: ڕاوکراو، نێچیر، دیارە زۆربەی هەرە زۆری زانایان دەڵێن: مەبەست لە نێچیری دەریا (ماسی)یە، دیارە ئەو کاتە بە زۆری ماسی خوراوە، زانایان ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، هەر کامێکیان بە پێی پاشخانی کلتووریی خۆی و فەرهەنگو شارەزایی خۆی، تەماشای ئایەتەکانی کردوە، ئەگەرنا لێرەدا خوا دەفەرموێ: ﴿ أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ ﴾، واتە: نێچیریی دەریاو خواردنەکەیتان بۆ حەڵاڵ کراوە، کە دیارە (نێچیر) و (خواردن) گشتیین، بۆیە قورئان دەبێ بە پێی ڕۆژگارو سەردەمەکان تەفسیر بکرێ، وە ئەوەش گەورەترین ڕووی ئیعجازی قورئانە، کە خوا چەند وشەیەك بەکاردێنێ، دەستی خەڵك نابەستێ کورتهەڵاتوو (حصر)یان بکات لەسەر واتایەکی دیاریکراو، ئێستا بەنسبەت ئەو ئایەتەوە، ئەگەر فەرموویای: (أُحِلَّ لَكُم سَمْكُ البَحْرِ، أَو حُوتُ البَحْرِ)، وە لە جیاتی (وَطَعَامُهُ)ش، (وَنَبَاتُهُ) یان (وَبَقِیةُ حَیوَاناتهِ) بووایە، تازە مانایەکەی دیار دەبوو، بەڵام خوای زاناو شارەزا دوو وشەی بەکارهێناون، ﴿ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ ﴾ و ﴿ وَطَعَامُهُۥ ﴾، کە وەك ئێستا ئێمە تێی دەگەین، واتاکەیان زۆر گشتییە، بەڵام ئەوکاتە لە سەردەمی ئەواندا هەر ماسی سوودی لێ بینراوە، ڕەنگە ژیاندارەکانی دیکەی دەریایان نەخواردبێ، بەتایبەتی لەنێو عەرەبو ئەو ناوچانەدا کە عەرەبنشینن، بۆیە خوا بەشێوەیەك فەرمایشت دەفەرموێ کە بەکەڵکی خەڵك بێ بەگشتی لە هەموو وڵاتانی دنیادا، چونکە لە وڵاتانی دیکەدا ڕەنگە غەیری ماسیش خورابێ، بۆیە ئێستا زانایان دەربارەی نێچیری دەریاو خواردنی دەریا چەند ڕایەکیان هەن، کە هەموویان لەگەڵ ئایەتەکە دەگونجێن، لەبەرئەوەی خوای پەروەردگار وشەی وای بەکارهێناوە، هەموو

مانایەکان دەگەیەنێ، چونکە ئێستا لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو لە زۆربەی وڵاتانی دنیادا، ئەوەندەی ژیانداری دیکەی دەریایی دەخورێن، وەك: ڕۆبیانو قرژاڵو بۆقو ژیانداری وا دەخۆن، کە ڕەنگە ئێمە هەر ناویان نەزانینو، ڕەنگە لەلای ئێمە هەر نەخورێن، یان هەر نەبن، وە هەندێك لەو ژیاندارانە زۆر زۆر بە نرخترن لە گۆشتی ماسی، جا ئایەتەکە هەموویان دەگەیەنێ، لەوبارەوە ئەم دەقە هەیە: ﴿عَنْ سَعِيدِ بْنِ جُبَيْرٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا قَالَ: صَيْدُهُ مَا اصْطِيدَ وَطَعَامُهُ مَا لَفَظَ بِهِ الْبَحْرُ﴾ {أَخْرَجَهُ البيهقي في سننه الكبرى برقم: (١٨٧٦٤)، والدَّارَقُطني برقم: (٢٠)}، واتە: سەعیدی کوڕی جوبەیر دەڵێ: عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس خوا لێیان ڕازی بێ، دەربارەی تەفسیری ئەو ئایەتە ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ ٱلْبَحْرِ وَطَعَامُهُۥ﴾، گوتوویەتی: (صَيْدُهُ مَا اصْطِيدَ) ئەوەی کە تێیدا ڕاوکراوە، وە خواردنی دەریا ئەوەیە کە بەحر فڕێی دەداتە دەرێ.

هەر لە (ابْنِ عَبَّاسٍ) خوا لە خۆیو بابی ڕازی بێ، گێڕدراوەتەوە گوتوویەتی: {صيده ما اصطيد، وطعامُهُ مَا مُلِحَ مِنْهُ وَبَقِيَ}، واتە: (صَيْدُهُ) مەبەست پێی ئەوەیە کە تێیدا ڕاو دەکرێو دەگیرێ، ماسیو غەیری ماسی ئەوەی بە تەڕو تازەیی دەخورێ، ئەوە نێچیرەکەیە، خواردن (طَعَام)ەکەشی ئەوەیە کە سوێر دەکرێ، هەڵدەگیرێ، وەك ئێستا کە لە نێو قوتوودا هەڵدەگیرێ، گۆشتی ماسیو گۆشتی غەیری ماسیش، دیارە ئەوکاتیش بە شێوەیەك لە شێوەکان توانیویانە گۆشتی ماسی هەڵبگرنو دوایی بیخۆن، (وَقَالَ قَوْمٌ: طَعَامُهُ المِلحُ الَّذِي يَنْعَقِدُ مِنْ مائِهِ وَسَائِرُ مَا فيهِ مِنْ نَبَاتٍ وَنَحوه)[1] هەندێکیش گوتوویانە مەبەست لە خواردنی دەریا، خوێکەیەتی کە تێیدا دروست دەبێ، چونکە ئاوی دەریاو زەریاکان خۆی سوێرە، وە هەر شتێکی دیکە کە لە دەریاکاندا هەیە لە ڕووەكو لە غەیری ڕووەکیش، کە ئێمە ئێستا بۆخۆمان لەم سەردەمەدا لە سەدەی بیستو یەکەمدا دەزانین کە چەمكو واتای ﴿صَيْدُ ٱلْبَحْرِ﴾ و ﴿وَطَعَامُهُۥ﴾، زۆر زۆر فراوانە.

١) الجامع لأحكام القرآن: ج٦، ص٢٧٧.

ئنجا با بزانین زانایان سەبارەت بە نێچیری دەریاو خواردنی دەریا چییان گوتوە، وە پێیان وایە چیو چی دەگرێتەوە؟ سەرەتا ئەم فەرمایشتانەی پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە دێنینەوە:

یەكەم: ﴿عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِاللهِ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ: أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ سُئِلَ عَنِ الْبَحْرِ؟ فَقَالَ: (هُوَ الطَّهُورُ مَاؤُهُ الْحِلُّ مَيْتَتُهُ)﴾ {أَخْرَجَهُ الْبَيْهَقِيُّ في (سنن الكبرى) برقم: (١٩٤٣٨)، وَابنُ خُزيمة في (صحيحه) برقم: (١١٢) قال الأعظمي: إسنادُهُ صَحيح إذ له شاهد من رواية أبي هريرة عند ابن ماجه في الطهارة، وَصَحَّحَهُ الألباني من رواية (أبي هريرة) في صحيح الجامع برقم: (٢٨٧٧)}، واتە: جابیری كوڕی عەبدوڵلا خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پرسیار كرا دەربارەی دەریا لە پێغەمبەری خوا ﷺ؟ فەرمووی: دەریا ئاوەكەی پاككەرەوەیە، وە مردارەوەبووەكەی حەڵاڵە، واتە: هەرچی تێیدایە حەڵاڵە، چ بە زیندوویەتی بیگری، وە چ لەوێدا بیكوژیو بمری، بە مردار لە قەڵەم نادری.

دووەم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێ: ﴿أُحِلَّتْ لَنَا مَيْتَتَانِ: الْحُوتُ وَالْجَرَّادُ، ودَمَانِ: الْكَبِدُ وَالطِّحَالُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٥٧٢٣)، الدارقطني برقم: (٤٦٨٧)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٣٣١٤)، عَنْ ابْنِ عُمَرَ رضي الله عنه، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١١١٨)} واتە: دوو مردارمان بۆ حەڵاڵن: ماسیو كوللە (كە سەرنابڕدرێن با بشمرن حەڵاڵن، مەگەر بۆگەن بووبن، یان لەڕووی تەندروستییو پزیشكییەوە زیانیان هەبێ)، وە دوو خوێنیش: جگەرو سپڵ (ئەوانیش لەڕاستییدا جۆرێكن لە خوێن، بەڵام دیارە پێكهاتەكەیان جیایە، لە خوێنی دی).

ئنجا (القرطبي)[1] دەڵێ: (وَقَالَ مَالِكٌ والشَّافِعِي وابْنُ أَبِي لَيلَى والأَوزَاعِي والثَّوري في رواية الأشجعي: يُؤكل كُلّ مَا في البَحْرِ مِنَ السَّمك والدّواب، وَسَائِر مَا فِي البَحْرِ مِنَ الحيوَان، وَسَوَاء اصطيد أو وجد مَيتاً) واتە: (مَالِك والشَّافِعي وابْنُ أَبِي لَيلَى والأَوزَاعِي والثَّوري) كە هەموویان سەر مەزهەبن، بەڵكو زۆر لە زانایانی دیكەش، گوتوویانە: هەرچی لە دەریا دایە لە ماسیو لە

١) الجامع لأحكام القرآن: ج٦، ص٢٧٨.

ژیانـدارانی دیكـە، وە لـە هەرچـی ژیانـدارەو لـە دەریـادا هەیـە، چ ڕاوبكـرێ، چ بـە مردوویـی وەدەسـت بـێ، (دیارە بە مەرجێـك كە نـەگۆڕابێت‌و بۆگـەن نـەبووبێ، وە لـە ڕووی تەندروسـتیەوە زیـانی نەبـێ)، ئـەوە لـە ڕووی شـەرعییەوە هـەمووی حـەلاڵـە، بەڵـگەش بـەوە دێننـەوە، دەڵێن: ﴿والدلیلُ مَا قَالَهُ الرسول الله ﷺ فـي الحوت الَّـذِي يُقَالُ لَـهُ العَنْـبَرَ: (هُـوَ رِزْقٌ أَخْرَجَـهُ اللهُ لَكُمْ فَهَـلْ مَعَكُـمْ مِـنْ لَحْمِهِ شَـيْءٌ فَتُطْعِمُونَـا مِنْـهُ) فَأَرْسَـلْنَا مِنْـهُ إِلَـى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَكَـلَ﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـــرقم: (١٤٣٧٧)، وَمُسْـــلِمٌ بـــرقم: (٤٩٧٤)، وَأَبُـــوداوُد بـــرقم: (٣٨٤٢)}، ئـــەوە بەسـەرهاتێكە كە كۆمـەڵێك لـە هاوەڵان خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەچـن بـەرەو دەریـای سـوور، لـە ڕیوایەتێكـدا دەڵـێ: ژمارەیـان سـێ سـەد كـەس بـووە، دیـارە زۆریـان برسی دەبـێ (أَبَا عُبَيْـدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ) ئەمیـریان بـووە، تـا وای لێهات یـەكی ڕۆژێ دوو خورمـا دوو خورمـای دەدانـێ، دەیانمـژی‌و ئاویـان لەسـەر دەخـواردەوە، ئنجا دوایـی یەكی ڕۆژێ یـەك خورمـای دەدانـێ، جا یـەكێك دەپرسـێ، ئایا یـەك دەنكە خورما چ سـوودی هـەبوو؟ دەڵـێ: سـوودی باشـی پێدەگەیانـدین، وە كاتێـك قـەدری ئـەو دەنكـە خورمایـەمان زانـی كـە ئـەویش نـەما، پاشان تینیـان زۆر بـۆ دێ‌و دەستیشیان ناگاتـە ئاوەدانیـــی، ژمارەشـــیان زۆر بـــووە، دوایـی لـە كـەناری دەریـای سـوور دەبـن، تەماشـا دەكـەن ژیـــاندارێكی گـەورە كـە دیـــارە (عنبـــر)ی پـێ دەڵێن، ڕەنگـە جۆرێـك بـێ لـە ماســی، جـۆرە حـووتێكی گـەورە بـووە، دەڵـێ: مانگێـك ئـەو سـێ سـەد كەسـە لێیـان خـــواردوە، ئنجـــا گۆشـــتی زیادەشـــیان لەگـەڵ خـــۆ بردۆتـــەوە بـــۆ مەدینـــە كـــە بردوویـــانەتەوە، وە بۆ پێغـەمبەری خـوایان ﷺ گێڕاوەتـەوە، پێغەمبەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی: ﴿هُـوَ رِزْقٌ أَخْرَجَـهُ اللهُ لَكُـمْ فَهَـلْ مَعَكُـمْ مِـنْ لَحْمِـهِ شَـيْءٌ فَتُطْعِمُونَـا مِنْـهُ} واتـە: ئـەوە ڕۆزییـەكە خـوا بـۆی نـاردوون، لـە گۆشـتەكەی هیچتان پێنـەماوە ئێمـەش تـۆزێكی لـێ بخـۆین؟ دیارە بـە تەئكیـد مەبەسـتی ئـەوە بـووە كـە دڵنیایـان بكاتـەوە، شـتێكی حـەڕامیان نەخـواردوە، دەڵـێ: {فَأَرْسَـلْنَا مِنْـهُ إِلَـى رَسُولِ اللهِ ﷺ فَأَكَـلَ} هەندێكمان لەو گۆشـتەی بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ نـارد، لێـی خـوارد، ئنجا دەڵـێ: دوو ئێسـكە گـەورەكەیمان پێكـەوەنان، دەڵـێ: ئەمیـرەكەمان (أَبَا عُبَيْـدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ) فەرمـانی كرد كێمان لـە هەمووومان بـە كەڵەگەتتـرە، بـە سـواری وڵاخەكەی بەبـن ئەو دوو ئێسـكەدا ڕۆیـی، كە پێكمـان وەنابوون، سـەری نەگەیشـتێ، دەبـێ بـە

قەد گردێك بووبێ، دیارە حەیوانێكی زۆر زۆر گەورە بووە، كەواتە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە كە هەرچی لە دەریادا هەیە دەخورێ.

مەگەر شتێك لە ڕووی پزیشكی (طب)یەوە، دەربكەوێ كە زیانی هەیە، یان نەخۆشی بلاودەكاتەوە، میكرۆبێكی تێدایە، ئەوە جیایە، بەلام لە ڕووی شەرعییەوە، هەرچی بەشەر پێی چاك بێ‌و بۆ بەشەر باش بێ‌و بەرژەوەندیی تێدابێ، حەلاڵە، وە لەڕاستیدا هەر ئەوەش لەگەڵ ڕووحی شەریعەتدا دەگونجێ، چونكە ئێستا هەمووومان دەبینین زۆر لە چێشتخانەكانی دنیا خواردنی ڕووەكیی‌و بەتایبەتی دەریاییان هەیە، ئەوەی بچێ بۆ هیندستان‌و چین‌و یابان‌و كەمبۆدیاو مالیزیاو ... هتد، دەبینێ شتی سەیر سەیر دەخۆن، بۆ وێنە: مار، بۆق، قرژاڵ، وەك گوتم ژیانداری وا هەیە ئێمە هەر ناوەكانیشیان نازانین، هەمووشیان دەخۆن، هەڵبەتە ئەوان وەنەبێ پرس بكەن بە شەریعەتی ئیسلامیی، ئایا ڕێی داون، یان نا؟ بەلام ئەگەر مسوڵمانێك ڕێی كەوتە وێ، مادام خواردنێكە ژیانداری دەریایی بێ، بۆی هەیە بیخوات، مەگەر لە ڕووی تەندروستییەوە خراپ بێ، یان بێزی لێ بكات‌و پێی نەخورێ.

ئێمە ساڵی (٢٠١١) چووین بۆ كەمبۆدیاو مالیزیا، بۆ بەشداریی كردن لە كۆنگرەیەك دا كە بۆ پەرلەمانتارانی ئاسیا لە پایتەختی كەمبۆدیا بەسترابوو، ژمارەیەكی كەم مسوڵمانی لێبوون، ئنجا لەبەرئەوەی خەڵكەكە بەگشتی بتپەرست (وثني) بوون، كە سەربڕاویان ناخورێ، ئێمە هەرچی گۆشتی ئاژەڵ بووایە، نەماندەخوارد، تەماشامان دەكرد چی دەریاییان هەیە، ئەوەی تەبیعەتمان بردبایە، دەمانخوارد.

ئنجا كە دەفەرموێ: ﴿مَتَٰعًا لَّكُمۡ وَلِلسَّيَّارَةِ﴾، وەك پێشتریش باسمان كرد، واتە: ئەوە مەدار سازكردنێكەو ڕابواردنێكە، بۆ ماوەیەك سوودی لێ دەبینن، بۆ خۆشتان، وە بۆ ڕێبوارانیش بەگشتی، ﴿وَحُرِّمَ عَلَيۡكُمۡ صَيۡدُ ٱلۡبَرِّ مَا دُمۡتُمۡ حُرُمٗا﴾، وە ڕاوی یاخود نێچیری وشكانییتان لێ قەدەغەكراوە، تاكو لە ئیحرام دابن، واتە: كە لە ئیحرامدا نەبوون، ڕەوایە ڕاویان بكەن.

**مەسـەلەی پێنجـەم:** کـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ قِيَٰمٗا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَٰٓئِدَۚ ذَٰلِكَ لِتَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ ﴾، ئەسـڵی وشـەی (الكَعْبَة) لـە چییـەوە هـاتوە؟ (القرطـبي)[1] دەڵـێ: (سُمِّيت الكَعْبَة كَعْبَةً لأَنَّهَا مربعَةٌ وَأَكْثَر بيوت العَرَبِ مدوَّرَةٌ وَقِيلَ: لِنتوئِهَا وبروزِهَا، فَكُلُّ نَاتِئٍ بَارِزٍ كَعْبٌ، وَمِنْهُ كَعْب القَدَمِ وَكعُوب القَنَاة، وَكَعَبَ ثَدي المَرأَةِ إذَا ظهر في صدرها)، واتـە: کەعبـە، بۆیـە ئـەو نـاوەی لێنـراوە، چونکە چوار گۆشـەیە، (با تـەواو چوار گۆشـەش نـەبێ) وە زۆربـەی ماڵەکـانی عـەرەبان کـاتی خـۆی بازنـەیی بوون، وە دەشـگوترێ: لەبەرئـەوە نـاوی لێنـراوە کەعبـە، چونکە بەرزبۆتـەوەو لەسـەر زەوی دیارە، وە هـەر شـتێك کـە بەرزبێتـەوە، پێـی دەگوترێ: (كَعْب) وەك گوێزینگـە پێـی ئینسـان، دوو گوێزینگی هەن، ئەمـلاو ئـەو لای لـە پـێ دەردەچن، وە دەگوتـرێ: (كَعَبَ ثَديها) واتـە: مەمکی دەرکـەوت، واتـە: لە ئاسـتی سـینگی بەرز بـووەوە.

مەبەستیش لەوە کە دەفەرموێ: ﴿ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ ﴾، ئایا بۆچی زەوی مەککەو دەوروبەری حەرامەو پێی دەگوترێ: (الأَرْض الحَرَام)؟ چونکە قەدەغەیە لە مەککەو لە دەوروبـەری مەککە، هیـچ گوناهێـك بکـرێ، ئنجـا وەنەبـێ گوناهەکان لە شـوێنی دیکـە حـەڵاڵ بن، بەڵام لـەوێ حەرامتـرن، پاشـان لـە کاتێکـدا کە لە ئیحـرام دای، ئەو شتانەی کە لە کاتی ئاسایی دا حـەڵاڵـن، لێـت حـەرام دەبـن، پێغـەمبـەری خـواش ﷺ فەرموویـەتی: ﴿إِنَّ مَكَّـةَ حَرَّمَهَـا اللهُ وَلَـمْ يُحَرِّمْهَـا النَّـاسُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بـرقم: (١٦٤٢٠)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (١٣٤٩)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (١٨٣٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٨٠٩)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٨٧٦)، عَنْ أَبِي شُرَيْحٍ العَدَوِيِّ}، واتـە: مەککـە خـوا حـەرامی کـردوە، وە خـەڵك حـەرامیان نـەکردوە، واتـە: خـوا گونـاهی تێـدا حـەرام کـردوە، یـان ئـەو شـتانەی تێـدا قەدەغـە کردوون، لەسـەر ئەوانەی کە لە ئیحـرام دان کـە لـە حاڵەتی ئاسـایی دا بۆیـان ڕەوان،

---
١) الجامع لأحكام القرآن: ج٦، ص٢٧٩.

جـا كـە خـوا دەفـەرموێ: ﴿ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ ﴾، ﴿ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ ﴾، وەك بلێی تەفسیری ﴿ ٱلۡكَعۡبَةَ ﴾، دەكات، ئەو ماڵە حەرامە لەگەڵ (كَعْبَة) هەر یەكن، دەفەرموێ: خـوا كەعبەی گێڕاوە بە: ﴿ قِيَـٰمًا لِّلنَّاسِ ﴾، كردوویەتی بە مایەی ڕاوەستانی خەڵك، (أي صَلاحًا وَمَعَاشًا لأمن النَّاسِ بِهَا) لەبەرئەوەی خەڵك لەوێدا ئارام دەگرێ‌و هێمن دەبێ، كەس دەستدرێژیی ناكاتە سەر كەس، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی كە هەم دینداریيان لە جۆوێكی ئارامدا بەڕێوەبەرن، بەتایبەتی (مناسك)ی حەج‌و عومرە، وە هەم ژیان‌و گوزەرانیشیان لەو ناوچەیەدا بە هێمنیی‌و ئارامیی بەسەربەرن، دیارە خوێندراویشەتەوە: (قِياماً لِلنَّاس، قَيِّماً لِلنَّاس، قِوَاماً لِلنَّاس)، هەر سێ قیرائەتەكەی هاتوون، خـوای پەروەردگار لە چەند شوێنێك لە قورئاندا ئاماژە بەوە دەكات، وەك منەتێك لەسەر عەرەبەكان، كە كەعبەی بۆ گێڕاون بە مایەی هێمنیی‌و ئاسایش، بۆ وێنە لە سوورەتی (العنكبوت)دا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّا جَعَلۡنَا حَرَمًا ءَامِنًا وَيُتَخَطَّفُ ٱلنَّاسُ مِنۡ حَوۡلِهِمۡۚ أَفَبِٱلۡبَٰطِلِ يُؤۡمِنُونَ وَبِنِعۡمَةِ ٱللَّهِ يَكۡفُرُونَ ﴿٦٧﴾ ﴾، واتە: ئایا نابینن؟! ئێمە حەرەمێكی دڵنیاكەرو جێی دڵنیاییمان بۆ ڕەخساندوون، وە خەڵكی لە دەوری واندا دەڕفێندرێ، وەك گوتم كەعبەو ئەو زەوییەی دەوروبەری پێی گوتراوە: سەرزەمینی حەرام، كە خەڵك لەوێدا لەخۆی ئەمین بووە، بەڵام لە دەرەوەی ئەو بازنەیە، خەڵك ڕفێندراوە، ڕێگریی لێكراوە لەلایەن چەتەوە، وە كوژراوە، كەواتە: كەعبە چاكەو منەتێكی گەورەی خوایە لەسەر عەرەب، ئنجا خـوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ جَعَلَ ٱللَّهُ ٱلۡكَعۡبَةَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ قِيَـٰمًا لِّلنَّاسِ وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ وَٱلۡهَدۡيَ وَٱلۡقَلَـٰٓئِدَ ﴾، دیارە ﴿ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ ﴾، هەیە، بەڵام لێرەدا فەرموویەتی: ﴿ وَٱلشَّهۡرَ ٱلۡحَرَامَ ﴾، مانگی قەدەغەكراو، وەك بلێی ئەوە پێی دەگوترێ جینسی مانگەكانە، كە ئەو چوار مانگەن: (ذُو الْقعْدَةِ، ذُو الْحِجَّةِ، مُحَرَّمٌ، رَجَبٌ)، سێ مانگ لە دوای یەكن، (رَجَب)یش بە تەنیایە، لەو چوار مانگەدا

عەرەب عادەتیان وابووە ئەگەر شەڕیشیان بووبێ، ڕایانگرتووەو وەستاندوویانە، تا مانگەکان تەواو بوون، وەك لە سوورەتی (التوبة)دا خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ عِدَّةَ ٱلشُّهُورِ عِندَ ٱللَّهِ ٱثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِى كِتَٰبِ ٱللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ...﴿٣٦﴾ ﴾، جاری واش هەبووە پاشو پێشیان بە مانگەکان کردوە، ئەگەر زۆر پەکیان لەسەر شەڕێ کەوتبێ، گوتوویانە: لەو مانگەدا شەڕێ دەکەین، قەیناکە مانگێکی دیکە لە جێی ئەو دادەنێین، کە پێی گوتراوە: (نَسِيء)، بۆیە خوای بالادەست دەفەرموێ: ﴿ إِنَّمَا ٱلنَّسِىٓءُ زِيَادَةٌ فِى ٱلْكُفْرِ ﴿٣٧﴾ ﴾التوبة، (نَسِيء) واتە: دواخستن، دواخستنی یەکێك لە مانگەکان کە پێویستیان بووە، لەو مانگەدا شەڕی تێدا بکەن، خوا دەفەرموێ: بەو ڕەفتارە زیاتر کوفریان کردوەو خۆیان کافر کردوە، ئنجا ﴿ وَٱلْهَدْىَ ﴾، پێشتریش باسمان کرد (هَدي) ئەو ئاژەڵانەن کە بردوویانن بۆ حەج، تاکو سەریان ببڕن لە لای مزگەوتی حەرام، یان لەو دەوروبەرە، ئنجا حوشتر بووبێ، ڕەشەوڵاخ بووبێ، یاخود مەڕو بزن بووبێ، ﴿ وَٱلْقَلَٰٓئِدَ ﴾، ئەمیش ئەو ئاژەڵانە بوون کە گەردن بەندیان لە مل کردوون، خوا دەفەرموێ: ئەوانە هەموویان دروشمی دینداریی‌و مایەی ڕاوەستانی خەڵکن، وە ئەوانەی خوای کاربەجێ دایناون، بۆیە دەبێ ڕێزیان لێ بگیرێو حورمەتیان لێ بگیرێ.

<u>مەسەلەی شەشەم</u>: کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ لِتَعْلَمُوٓا۟ أَنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ وَأَنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌ ﴾، واتە: خوا ﷻ کە ئائەوەتان بۆ ڕوون دەکاتەوەو، ئەو یاسایانەتان بۆ ڕوون دەکاتەوە، ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە خوای پەروەردگار نهێنییەکانی ئاسمانەکانو زەوی دەزانێ، وە دەزانێ ئێوە پێویستیتان بەوە هەیە کە چەند وێستگە (محطة)یێکی کاتییو شوێنییتان هەبن، کە بتوانن تێیاندا ئارام بگرن، وە دینداریی‌و دنیاداریی خۆتانیان بە هێمنیی تێدا بکەن.

**مەسەلەی حەوتەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ ٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ وَأَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾، بزانن کە خوا تۆڵەو سزای توندە، وە بزانن کە خوا لێبوردەی بە بەزەییە، واتە: لەبەرئەوە کە تۆڵەو سزای توندە، سەرپێچیی مەکەن، وە ئەگەر غەڵەتو گوناهێکیشتان کرد، نائومێد مەبن، بزانن کە خوا لێبوردەیەو بە بەزەییشە.

**مەسەلەی هەشتەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ مَّا عَلَى ٱلرَّسُولِ إِلَّا ٱلۡبَلَٰغُۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُبۡدُونَ وَمَا تَكۡتُمُونَ ﴾، واتە: پێغەمبەر ﷺ تەنیا گەیاندنی لەسەرە، وە خوا دەزانێ چی ئاشکرا دەکەنو چی پەنهان دەکەن، کەواتە: کاتێك پێغەمبەر ﷺ پەیامی خواو حەڵاڵو حەرامێك کە خوا دایناون، پێتان دەگەیەنێ، ئەرکی سەرشانی خۆی ئەنجامداوەو ئەمجار خۆتان بەرپرسیارن، لەبەرئەوە لە خۆتان وریابن، پێغەمبەر ﷺ دوای ئەوەی پێتان ڕادەگەیەنێ: ئەوە حەڵاڵەو ئەوە حەرامە، ئەوە چاکەو ئەوە خراپە، وا بکەن، وا مەکەن، ئەوە ئەرکی خۆی بەرانبەر بە ئێوە ئەنجام داوە.

**مەسەلەی نۆیەمو کۆتایی:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ وَلَوۡ أَعۡجَبَكَ كَثۡرَةُ ٱلۡخَبِيثِۚ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴾، ئێمە دوو هەڵوەستەی لە بەرانبەردا دەکەین:

# دوو هەڵوەستەی پێویست لە بەرانبەر ئایەتی

## ﴿ قُل لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ.... ﴾

**هەڵوەستەی یەکەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قُل لَّا يَسۡتَوِي ٱلۡخَبِيثُ وَٱلطَّيِّبُ ﴾، واتە: ئەی موحەممەد! ﷺ، یان هەر کەسێك کە قورئان دەخوێنێ! بڵێ: پیس و پاك یەکسان نین، یاخود خراپ و باش یەکسان نین، یان زیانبەخش و سوودبەخش یەکسان نین، هەرچەندە زۆریی پیس یاخود خراپ، یاخود زیانبەخش، تۆش سەرسام بکات، خوای کاربەجێ ئەم دوو وشەی: (خبیث) و (طیب)ی بەکارهێناون، کە چەندان مانا هەڵدەگرن، دەگونجێ:

١) حەڵاڵ و حەرام بن.

٢) یان مەبەست پێی کافرو مسوڵمان بێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿إِنَّمَا ٱلۡمُشۡرِكُونَ نَجَسٞ ﴿٢٨﴾﴾ التوبة، وە لە فەرمایشتی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە، فەرموویەتی: «إِنَّ الْمُؤْمِنَ لا يَنْجُسُ» {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٧٢١٠)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٢٨٤)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٣٧١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٣١)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٢١) وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، وَالنَّسَائِيُّ برقم: (٢٦٩)، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٥٣٤)}، واتە: بێگومان ئیماندار پیس نابێ.

٣) وە دەشگونجێ مەبەست پێی شتی خراپ و شتی باش بێ.

٤) وە دەگونجێ مەبەست پێی شتی زیانبەخش و شتی سوودبەخش بێ. کەواتە:

٥) یاخود مەبەست پێی کردەوەکان بن.

٦) یان مەبەست پێی گوفتارەکان بن.

٧) یان مەبەست شتەکان بن لە شتەکانیش مەبەست پێی خواردنەکان بن،

پۆشاكەكان بن... هتد، تەماشا دەكەین چەمك و واتاكەی زۆر فراوانە.

خوا لە پشت ئەو ئایەتەوەو لە سێبەریدا پێمان دەفەرموێ: ئەی خەڵكینە! ئەو شتانەی كە پاك و چاك و حەڵاڵ و سوودبەخشن، با كەمیشتان لەوانە چنگ بكەوێ، لە شتە پیس و حەرام و زیانبەخشەكان، چاكترن و لەگەڵیان یەكسان نین، بۆیە هەمیشە چاو بۆ كەمە پاك و سوودبەخشەكان بگێڕن، چونكە هەمیشە حەڵاڵ بە زەحمەت دەست دەكەوێ، وە زۆریش نیە، سوننەتی خوا وایە حەرام زۆر ئاسانتر دەستدەكەوێ[1]، وە زۆر جار ئەوەی كە دەربەستی حەڵاڵ و حەرام نەبێ، دەتوانێ لە حەرام زۆر بەسەر یەكەوە بنێ، بۆیە هەر كەسێكتان بینی بە پەلە دەوڵەمەند بوو، مەگەر تاك تاك، ئەگەرنا بزانن لە رێیەكی حەرامەوەیە، دەڵێن: عەبدولقادری گەیلانی رەحمەتی خوای لێ بێ لەم شارەی بەغدایە[2]، لە كتێبی: (الفتح الرباني والفيض الرحماني)دا لە یەكێك لە مەجلیسەكانیدا دەڵێ: ئەی خەڵكی بەغدادا! وا مەزانن نازانم ماڵ و سامانەكەتان چۆن پەیدادەكەن! كە تەماشا دەكەم چۆنی سەرف دەكەن، دەزانم ئاواشتان پەیداكردوە، دوایی دەڵێ: وا مەزانن عەبدولقادر ئیددیعای عیلمی غەیب دەكات، غەیب هەر خوا دەیزانێ، بەڵام كە تەماشا دەكەم چۆنی سەرف دەكەن، دەزانم چۆنیشتان پەیداكردوە، ئەوەی ماڵەكەی خۆی لە حەڵاڵدا، وە لە واجباتی شەرعیی داو لە رێی شەرعییەوە سەرف بكات، ئەوە دیارە بە شێوەیەكی حەڵاڵیش پەیدای كردوە، وە ئەوەی ماڵ و سامانەكەی لە رێی ناشەرعیی دا سەرف بكات، ئەوە دیارە بە شێوەیەكی حەرام و ناشەرعیی پەیدای كردوە، ئەوە تا رادەیەكی زۆر بنچینەیەكی راستە، بە زۆری وایە كە ئینسان بە ئارەقی نێوەچەوانی رزقی پەیداكردوەو زەحمەتی پێوەكێشاوە، دین و ویژدانی رێی نادات لە حەرام و ناشەرعیی دا بەكاری بێنێ و سەرفی بكات، بەڵام ئەگەر پشتی پێوە نەئێشا بوو، ئەوە دەربەست نیە چۆنی سەرف دەكات.

---

١) لە ئەنجامی ئەوەدا كە هەلومەرج و واقیعی ئێستای دنیاو هی رابردووش بە زۆریی وایە كە لە ئەنجامی بەرنامە مرۆڤكردو نەفامییەكانەوە پەیدابووەو شكڵی گرتوە.

٢) ئەم دەرسانەم لە بەغداد گوتوونەوە، لە كاتی دەوامم لە (ئەنجوومەنی نوێنەران)دا.

لێرەدا خوای کاربەجێ دەیەوێ سەرنجمان ڕابکێشێ کە ئێمە لە شتەکاندا، لە قسەکاندا، لە شەخصەکاندا، لە کردەوەکاندا، سەرنجی چۆنیەتی بدەین، نەك چەندێتی، چونکە چەندێتی سەنگی مەحەك نیە، بەڵکو چۆنیەتی سەنگی مەحەکە، چەند نوێژان دەکەی، چەند ڕکاتان دەکەی، گرنگ نیە، ئەوە گرنگە چۆنیان دەکەی؟ یان چەند ڕۆژووان دەگری، چەند قسەی خێر دەکەی، چەند خێرو صەدەقە دەکەی... هتد، باشە، بەڵام گرنگ ئەوەیە چۆنیشیان ئەنجام دەدەی؟ جاری وایە یەکێك دینارێك دەکاتە خێر بە دڵێکی ئەوەندە سافو ساغەوە، خوا پاداشتی زۆر گەورەی دەداتەوە، وە جاری وایە بە پێچەوانەوە کەسێكماڵێکی زۆر دەکاتە خێر، بە منەتو ئازاردانی بابای خێر پێکراوەوە، لەجیاتی ئەوەی خێری بگاتێ، لەسەریشی سزا دەدرێ، یان جاری وایە کەسێك یەك قسەی خێر دەکات، بەڵام زۆر بە ئیخلاصو زۆر بە دڵەوە، پاداشتێکی زۆر گەورەی هەیە، کەسی واش هەیە زۆر قسەی خێرو چاك دەکات بەڵام چونکە مەبەستی پێی ڕیابازیە نەك هەر پاداشتی نیە، بگرە ڕەنگە لەسەریشی سزا بدرێ، کەواتە: نەك تەنیا لە عیبادەتدا، لە هەڵسوکەوتەکاندا، لە ڕەوشتەکاندا، لە قسەکاندا، وە پاشان لە ماڵو سامانیشدا، بەس سەرنجی زۆریی مەدەنو هەر خەریکی ئەوە مەبن، بۆ وێنە: سامانی زۆر پەزمەندە بکەن! بەڵکو بزانن ئەو ماڵو سامانە جۆرەکەی چۆنە؟ حەڵاڵە؟ لە ڕێی شەرعییەوە بەسەر یەکەوە نراوە یان نا؟

**هەڵوەستەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، پارێز لە خوا بکەن ئەی خاوەن عەقڵان! بۆئەوەی سەرفرازبن، لێرەدا دەمەوێ سەرنجتان بۆ شتێك ڕابکێشم، ئەویش ئەوەیە زۆر کەس هەن شارەزان لە زانستی شەرعییو قورئانو سوننەت، بەڵام زۆر بە داخەوە عەقڵو حیکمەتو داناییو لێزانیی لەگەڵ بەکارناهێنن، من بینیومە مامۆستای ئایینی ئایەتێك، یان فەرمایشتێك لە شوێنێك دەخوێنێتەوە، یان حوکمێکی شەرعیی بەیان دەکات، کە جێی خۆی نیەو لە جیاتی قازانج، تەنیا زەرەری دەبێ، بۆیە خوا سەرنجمان ڕادەکێشێ، بۆ بەکارهێنانی عەقڵو دەفەرموێ: ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾، پارێز لە خوا بکەن ئەی

خاوەن عەقڵینە! بەڵێ بەڕاستیی پارێز لە خوا كردن بە عەقڵ دەكرێ، بە تێگەیشتن دەكرێ، با عیلمیشت زۆربێ، با شارەزاییت لە حوكمی شەریعەتیشدا هەبێ، بەڵام ئەگەر نەزانی لە شوێنی خۆیدا بەكاری بێنی، زۆرجار زەرەر دەدەی، با وێنەیەك بێنینەوە:

لە ساڵی (١٩٨٣)دا لە ئۆردوگای بەستەستێن بووم، مەلایەك وتاری بۆ خەڵك دەدا، بابەتی وتارەكەشی ئەم فەرمایشتە بوو كە لە (صحيح البخاري ءصحيح موسلم)دا هاتوە، پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿كَانَ فِيمَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وتِسْعِينَ نَفْساً، فَسَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أهْلِ الأرْضِ، فَدُلَّ عَلَى رَاهِبٍ، فَأَتَاهُ، فَقَالَ: إنَّهُ قَتَلَ تِسْعَةً وتِسْعِينَ نَفْساً فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوبَةٍ؟ فَقَالَ: لا، فَقَتَلَهُ فَكَمَّلَ بِهِ مِئَةً، ثُمَّ سَأَلَ عَنْ أَعْلَمِ أَهْلِ الأَرضِ، فَدُلَّ عَلَى رَجُلٍ عَالِمٍ، فَقَالَ: إنَّهُ قَتَلَ مِئَةَ نَفْسٍ، فَهَلْ لَهُ مِنْ تَوْبَةٍ؟ فَقَالَ: نَعَمْ، ومَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وبَيْنَ التَّوْبَةِ؟ انْطَلِقْ إِلَى أرضِ كَذَا وكَذَا، فإنَّ بِهَا أُناساً يَعْبُدُونَ الله تَعَالَى فاعْبُدِ اللهَ مَعَهُمْ، ولاَ تَرْجِعْ إِلَى أَرْضِكَ فَإِنَّهَا أَرضُ سُوءٍ، فَانْطَلَقَ حَتَّى إِذَا نَصَفَ الطَّرِيقَ أَتَاهُ الْمَوْتُ، فاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ ومَلائِكَةُ العَذَابِ، فَقَالَتْ مَلائِكَةُ الرَّحْمَةِ: جَاءَ تَائِباً، مُقْبِلاً بِقَلْبِهِ إِلَى اللهِ تَعَالَى، وقالَتْ مَلائِكَةُ العَذَابِ: إنَّهُ لمْ يَعْمَلْ خَيراً قَطُّ، فَأَتَاهُمْ مَلَكٌ فِي صُورَةِ آدَمِيٍّ فَجَعَلُوهُ بَيْنَهُمْ (أيْ حَكَماً) فَقَالَ: قِيسُوا مَا بَيْنَ الأرضَينِ فَإلَى أيّتهما كَانَ أدنَى فَهُوَ لَهُ، فَقَاسُوا فَوَجَدُوهُ أدْنَى إِلَى الأَرْضِ الَّتِي أَرَادَ، فَقَبَضَتْهُ مَلائِكَةُ الرَّحمةِ﴾{مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ البُخَارِيُّ برقم: (٣٤٧٠)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٦٩٣٩)}، واتە: كابرایەك هەبوو لەوانەی پێش ئێوە نەوەدو نۆ كەسی كوشتبوو، (ویستوویەتی تۆبە بكاو بگەڕێتەوە بۆ لای خوا)، پرسیاری كرد دەبێ كێ زاناترین كەسی دنیابێ (ڕێنمایی بكات لەوبارەوە)؟ پێی دەڵێن: خواپەرستێك (عابد)ێك لە شوێنێك هەیە دەچێتە لایو بەسەرهاتەكەی بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: من حاڵو حیسابم وایە، هیچ چاكەم نەكردوەو نەوەدو نۆ كەسیشم كوشتوە، دەمەوێ بگەڕێمەوە، دەرفەت هەیە بگەڕێمەوەو تۆبە بكەم؟ پێی دەڵێ: نەخێر، ئەویش ئەویش دەكوژێو سەد تەواو دەكات (بەڵام دیارە هاتۆتە دڵی هەر تۆبە بكات)، دوایی پرسیار دەكات دەربارەی زاناترین كەسی دنیا ڕێنمایی دەكەن بۆ لای زانایەك

بەسەرهاتەکەی خۆی بۆ دەگێڕێتەوە، دەڵێ: دەرفەت هەیە بگەڕێمەوەو تۆبە بکەم؟ دەڵێ: بەڵێ، (ڕەحمەتو بەزەیی خوا زۆر زۆر فراوانە) دوایی پێی دەڵێ: کێ ڕێی گەڕانەوەی لێدەگرێ؟ (وَمَنْ يَحُولُ بَيْنَهُ وبَيْنَ التَّوْبَةِ) وە پێی دەڵێ: لێرە مەمێنە، بڕۆ بۆ فلان شوێن، چونکە لەوێ خەڵکەکەی خواپەرستنو ئینسانی باشن، تۆش لەگەڵ ئەوان خوا بپەرستە، وە هەرگیز نەگەڕێیەوە بۆ شارو شوێنی خۆت، چونکە شوێنێکی خراپە، (ئامۆژگارییەکی باشی دەکاتو مەبەستی خراپیی خەڵکەکەیە، نەك خودی سەرزەمینەکە) ئەو کابرایە بەرەو ئەو شوێنە دەچێ، بەڵام لە نیوەی ڕێگادا دەمرێ، (لە ڕیوایەتێکدا دەڵێ: لە کاتی سەرەمەرگیشدا سینگی خۆی بۆ ئەو شوێنە دەکوتا کە دەیویست بۆی بچێ، تاکو طاعەتی خوای لێبکات) فریشتەی ڕەحمەتو سزا، (فریشتەی بەهەشتو دۆزەخ دێن) دەبێتە موناقەشەیان، ئەوانەی بەهەشت دەڵێن: تۆبەی کردووەو بە دڵێکی ساغەوە گەڕاوەتە لای خوای بەرز، ئەوانەی دۆزەخیش دەڵێ: ئەو هەرگیز کاری چاکی نەکردووە، دوایی فریشتەیەك لەسەر شێوەی ئینسان دێ بۆ لایان، دەبێتە حەکەم لە نێوانیانداو، دەڵێ: نێوان ئەو دوو زەوییە بپێون لە کام لایە نزیکتر بوو، با بۆ ئەوێ بێ، کە دەیپێون، لەو شوێنە نزیکترە کە مەبەستی بووە بۆی بچێ، بۆیە فریشتەی بەهەشت ڕووحەکەی دەکێشنو دەیبەن.

ئنجا ئەو مامۆستایە کە ئەو فەرمایشتەی خوێندەوە، چ کاتێك بوو؟ کاتێك کە چەکداری ڕژێم قاچاغچییان دەکوشتن، ئەوانەی کە چەکداری ڕژێم بوون کەمینیان دادەناو قاچاغچییان دەکوشتن، جاری وابوو دەیانگرتنو تەسلیمی ڕژێمیان دەکردن، من مەلایەکم بینی ناوی (حەمەدەمین) بوو خەڵکی گوندی (میر شێخ حەیدەر)ی نزیك سەردەشت بوو، گوتی: نۆ ساڵان لە موسڵ گیرام، ئەو کاتی کاروانچیی بووم، نوێژنەکەر بووم، خوام نەدەناسی، وە نەخوێندەواریش بووم، جاش گرتییانم بۆ پارەو خەڵات، وەك پاسدار تەسلیمی ڕژێمییان کردم، گوتی: لەوێدا (واتە: لە سجن) خوای پەروەردگار خەڵکێکی باشی لێ ڕاست هێنام، گەڕامەوەو فێری زمانی عەرەبی بوومو قورئانم لەبەرکرد، (أصول الفقه)م خوێند ...هتد، بە نەخوێندەواریی چوومە سجنو بە مەلایەتیی هاتمە دەرێ، نۆ ساڵ لەوێدا مامەوە.

ئنجا من كە گوێم لە قسەی ئەو مەلایە بوو كە وتاری دەداو، ئەو چەكدارانەی بەو كەسە دەشوبهاند، كە نەوەدو نۆ كەسی كوشتوەو دوایی كردوویەتی بە سەد، ئنجا شایانی چوونە بەهەشتیش بووە! گوتم: بزانن چەند بە هەڵە دەیخوێنێتەوە، چونكە ئێرە شوێنی ئەو فەرموودەیە نیە! چونكە چەكدارو سەرۆك جاشی وا هەیە دەڵێ: جا ئەوە سەد كەسی كوشتوەو خوا لێی خۆش بووە، من جارێ هەر دە پازدە كەسم كوشتوون، هێشتا زۆرم ماوە، یان تەنیا سی چل كەسێكم ڕووت كردۆتەوە...! بە هەر حاڵ دەبێ بزانرێ، كە ئەو فەرمایشتەو وێنەكانی وەك دەرمانەو خۆراك نیە بۆ هەموو كەس ببێ، ئەوە دەرمانە بۆ كەسێك كە دەیەوێ بگەڕێتەوە، بەلام تووشی نائومێدیی بووەو پێی وایە خوا لێی خۆشنابێ، ئەو فەرمایشتەی بۆ بخوێنەوە بڵێ: ئەگەر بەڕاستیی بگەڕێیەوە، خوا لێت خۆش دەبێ، بەلام ئەوە بۆ كەسێك نیە كە ئێستا لەسەر گوناهان بەردەوامە، تۆش ئەو فەرموودەیەی بۆ بخوێنیەوە، تاكو دڵنیای بكەیەوە، ئەویش بڵێ: كەواتە: ئەگەر زیاتریش خەڵكی بكوژم تا دەگاتە نەوەدو نۆ كەس جارێ زۆری ماوە! بۆیە دەبێ بە حیكمەتو عەقڵ مامەڵە لەگەڵ دەقەكانی قورئانو سوننەتدا بكەین، ئەگەرنا وەك گوتم با فەرمایشتەكان ڕاست بن، بەلام ئەگەر لە شوێنی خۆیاندا بەكاریان نەهێنی زەرەر دەدەن، چونكە بە نەزانیی و بە ناشێیی ئەوەت كردوە، نەك لەبەرئەوەی كە ئایەتەكان یان فەرمایشتەكانو یاسا شەرعییەكان لە شوێنی خۆیاندا نەبن.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و دووەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان چوار ئایەت دەگرێتە خۆی (١٠١ تاکو ١٠٤)، وە لەم چوار ئایەتەدا خوای کاربەجێ بۆ جاری چواردەیەم بە نازناوی ئیمان مسولمانان دەدوێنێ، وە ڕێگرییان لێدەکات لە پرسیارکردنی ناپێویست، وە ڕێنماییان دەکات کە لەمیانەی دابەزینی قورئاندا، هەوڵی زانینی وەڵامی پرسیارەکانیان بدەن، تاکو لە ژێر ڕۆشنایی قورئاندا وەڵامی پرسیارو ئیشکالەکانیان بزانن، ئەگەرنا بە موناسەبەو بەبێ موناسەبە سەرو دڵی پێغەمبەر ﷺ نەگرن، وە دوایی سەرەنجامی شوومی ئەو عادەتە خراپەی میللەتانی پێشوویان پێ ڕادەگەیەنێ، کە پرسیاری بێجێیان کردوە، دواییش بەهۆی وەڵامی پرسیارەکانیانەوە تووشی کوفر بوو ون، هەندێك شتیان داوا کردوە، دواییش بۆیان جێبەجێ نەکراوەو ئیمانیان پێ نەهێناوە، سەرەنجام بۆتە هۆی ئەوە کە خوا لێیان توورەبێو سزایان بدات.

پاشان خوا ڕایدەگەیەنێ کە ئەو چوار جۆرە ئاژەڵەی کە کافرەکان ئیددیعای قەدەغەبوونیان دەکەن، خوا قەدەغەی نەکردوون، کە بریتین لە: ﴿بَحِيرَةٍ، سَآئِبَةٍ، وَصِيلَةٍ، حَامٍ﴾، کە دوایی پێناسەیان دەکەینو چەمكو ماناکەیان ڕوون دەکەینەوە، وە پاشان خوا دەیخاتە ڕوو کە ئەوە کافرەکانن بە ناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن، ئەگەرنا خوا ئەو شتانەی قەدەغە نەکردوون.

ئنجا لە کۆتایی ئەم دەرسەدا خوا باسی هەڵوێستێکی زۆر خراپی کافرە بتپەرستەکان دەکات، کە ئەو هەڵوێستەیان لە چەند شوێنێکی دیکەی قورئاندا دووبارە بۆتەوە، ئەویش بریتیە لەوە کە بە دەم بانگی داواکردنی فەرمانبەرییکردنی خواو پێغەمبەری خواوە نەچوون، بە بیانووی شوێنکەوتنی باب و باپیرانیانەوە،

کە لەڕاستیدا ئەوە ئێستا بۆتە عادەتێکی زۆر خراپ لەنێو مسوڵمانانداا، ئەگەر ئێستا ئێمە تەماشای خۆمان بکەین، دەبینین زۆر شت کە خوای پەروەردگار ڕەخنەی پێ لە کافران‌و بتپەرستەکان دەگرێ، لەنێو مسوڵماناندا هەیە، زۆرجار پێیان دەڵێی: خوشکێ یان برای مسوڵمان! ئەو شتە حەرامە، ناپەسندە بە پێی فلان ئایەت‌و فلان حەدیس، لە وەڵامدا دەڵێ: باب‌و باپیرانمان تا ئێستا هەر وایان کردووە‌و عادەت هەر وا بووە، ئنجا وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێ کافرەکانیش دەیانگوت: ﴿ ... قَالُوٓاْ إِنَّا وَجَدۡنَآ ءَابَآءَنَا عَلَىٰٓ أُمَّةٖ وَإِنَّا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم مُّهۡتَدُونَ ﴿٢٢﴾ ﴾الزخرف، بە هەمان شێوە ئێستاش هەندێك لە مسوڵمانان هەن هەر وا دەڵێن.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسْـَٔلُواْ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ وَإِن تَسْـَٔلُواْ
عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴿١٠١﴾ قَدْ
سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَـٰفِرِينَ ﴿١٠٢﴾ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ
وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ ۙ وَلَـٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ
وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴿١٠٣﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ
قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا
يَهْتَدُونَ ﴿١٠٤﴾ ﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ئـەی ئەوانـــەی بڕواتـــان هێنـاوە! لـەبارەی شـتانێکەوە پرسـیار مەکـەن کـە ئەگـەر بۆتـــان دەربکـــەون، نارەحـــەتتان بکـەن، وە ئەگـەر لـە کـاتی دابـەزێنرانی قورئانـدا پرسـیاریان لەبارەوە بکـەن، بۆتـان دەردەکەون، خـوا چاوپۆشـیی لێیان کـردوە، وە خـوا لێبـوردەی هێـــدی مەنـدە ﴿١٠١﴾ پـێش ئێـوە کۆمـەڵێك ئـەو جـۆرە پرسـیارانەیان کـردن (بـەڵام) دوایـی پێیـان بێبـڕوا بـوون ﴿١٠٢﴾ خـوا هـیچ (ئـازەڵێکی) بـە حیـرەو سـائیبەو وەصـــیلەو حـــامی دانەنـــاوە، بەڵـــکو ئەوانـــەی بێبـــڕوان بـــە نـــاوی خـــواوە درۆ هەڵدەبەســـتن، وە زۆربـــەیان نافـــامن ﴿١٠٣﴾ وە ئەگـــەر پێیـــان بگـــوترێ: وەرن بـــۆ (شـوێنکەوتنی) ئـەوەی خـوا ناردوویـەتە خـوارو بـۆ لای پێغەمبـەر، دەڵێن: ئـەوەمان بەسـە کە بابو باپیرانمان لەسـەر بینیوە، ئـەدی ئایا ئەگەر بـابو باپیـرانیان هـیچ شـتێك نـەزانن‌و بەڕێگـاش نـەزانن (هـەر پەیـڕەوییان لـێ دەکـەن‌و کوێرانـە دەکەونـە دوایـان؟!) ﴿١٠٤﴾)).

## شـیکردنـەوەی هـەندێـك لە وشـــەكان

(تُبۡدَ لَكُمۡ ): واتە: بۆتـان دەربكـــەون، (بَـدَا الشَّـيءُ بَـدوا وَبَـدَاءً، أي ظهـر ظهُورَاً بَيّـناً) لە عەرەبیــدا دەڵــێ: ئـەو شـــتە دەركـــەوت زۆر بـە ئاشــكرا دەركەوت، دەگـوترێ: (بَـدَا الشَّـيءُ بَـدوا وَبَـدَاءً).

(تَسُؤۡكُمۡ ): (السُّـوءُ: كُلُّ مَـا يغُـمُّ الإِنْسَـانَ مِـنَ الأمُورِ الدُّنيَـويّة وَالأُخْرَوِيَـة) هـەر شـتێك كـە ببێتـە هـۆی خەفـەت خـواردنی ئینسـانو نارەحەتـكردنی ئینسـان لـە كـاروباری دنیـــایيو قیـامەتیـــی ئـەوە پێـی دەگـوترێ: (سُوء)، (تَسُـؤكُم) واتـە: بۆتـان خراپــەو نارەحەتتـان دەكـاتو پێتـان ناخـۆش دەبـێ.

(عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَا): واتـە: خـوا چاوپۆشـی لێكـردوون، لێیان بـوردوە، لەچـی؟ لـەو شـتانە: (العَــفْوُ: هُـوَ التَّجَـافِي عَـنِ الذَّنْــبِ، عَفَــا الشَّـيء: كَثُـرَه وأطَالَـهُ...)، (عَفـو) بریتـیە لـە خۆدووركـــرتن لـە گونـاح، واتـە: خـۆ لێـی نادیدە بگریو چاوپۆشـیی لێبكـــەی، وە دەگـــوترێ: (عَفَــا الشَّــيء) ئەگــەر زۆری كــرد، درێـــژی كـــرد، لــە فەرموودەشـــدا هــاتوە، پێغەمبــەر ﷺ فەرموویــەتی: ﴿وَأَعْفُـوا اللِّحَـى﴾(أَخْرَجَـهُ البُخَـارِيُّ برقم: (٥٥٥٤)، عن ابْنِ عُمَر)، واتە: ڕیشـتان درێـژ بكەن.

(بَحِيرَةٍ): (النَّـاقَـةُ إِذَا وَلَـدَت خَمْسَـةَ أَبطـن شـقُّوا أُذُنها وَأَعفوهـا عـن الإنتفَـاع بِهَـا)، (بَحيـرة) بـەو حوشـتـرەیان گوتـوە كـە پێـنج زگـی بووبـــێ، واتـە: پێـنج بەچكەی بووبـێ، دوایی گوێیـــان شـــەق دەكـرد، وەك بلــێی خـانەنشـــینیان دەكـرد، سـوودیان لــێ نەدەبیـــنی، نـــە ســـەریان دەبـڕی گۆشـتی بخـۆن، نـە باریـان پـێ دەبـرد، نـە دەیاندۆشـی.

(سَآئِبَةٍ ): (المُهْمَلَـةُ الَّتي كَانَـت تُسَـيَّبُ فـي الجَاهِلِيّة لِنَـذْرٍ وَنَحْوه، والبَعيـرُ الَّذِي يُدرِك نِتَـاجَ نتـاجِهِ)، (سَـائِبَة) بەو حوشـــترەیان گوتـوە لـە ســـەردەمی نەفامیـــیدا

کە بەهـۆی لـە خۆگرتـــن (نَـذْر)ەوە، وێڵـیان کـردوە، وە هـەروەها بـەو حوشتــرەش دەگوتـــرێ کـە بەچـکەی بەچـکەکەی ببینێتــەوە، واتــە: هێنـدە تەمـەنی هەبــێ بەچکەی هەبـێ، وە بەچکەکەشـی بەچکـەی ببـێ، ئەوە وێڵـیان کردوە، وەك بلـّێی خانەنشـینیان کردوەو سـوودیان لـێ نەبینـیوە.

(وَصِيلَةٍ ): (الوَصِـيلة: النـاقَةُ الَّتـي وَصَلَـتْ بين عَشْـرَةَ أبْطُن، وَمِـنَ الشَّـاة: الَّـتي وَلَـدَت سَـبْعَةَ أَبْطُـن)، (وَصِـيلة)ش ئـەو حوشــتــرە بـووە کـە دە زگـی کـردبن، وە ئەگـەر مەڕیـش بووبـێ حەوت زگی کردبن، واتە: هەر حوشـتــرێك دە جارو هـەر مەڕێــك حــەوت جــار زابــێ، ئەوە وێڵـیان کـردوەو سـوودیان لــێ نەبینــیوە.

(حَامٍ): (الفَحْل إذَا ضَـرَبَ عَشْـرَةَ أبطـن قَالوا: قَـد حَمَـى ظَهـرَه فَلاَ يُرْكَـبُ)، (حـام) ئەو حوشـــتـرە نێرە بـووە کـە دەجـاران لەگـەڵ حوشـتـری مێیــە جـووت بووبـێ، نــەك لەگــەڵ دە حوشـتــران لێــکــرا، دیــارە حوشتــر بـە دەمانگـان دەزێ، جـا حوشـترێك کـە دە ســاڵان بووبێتــە هــۆی ئـەوەی بەچکــەی ببــێ لـەدوای یــەك، ئەوە گوتوویــانە: (حَمَـى ظَهـرَه) پشــتی خـۆی پاراسـتوە، کاریـان پێنـەکردوە، وەك بلـّێی وێڵـیان کردوەو خاتریــان گرتـــوە.

(حَسْبُنَا ): (الحَسْـبُ: الكِـفَايَةُ، حَسْـبُنَا كَافِـينَا)، واتە: بەسـمانە، ئەومان بەسـە.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەكان

١) دەربـارەی هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئەو ئایـەتە كە دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٠١ ﴾ : سـێ گێڕانـەوە هـەن:

أ- ﴿عَـنْ ابْـنِ عَبَّـاسٍ رَضِـيَ اللّٰهُ عَنْهُمَـا، قَـالَ كَـانَ قَـوْمٌ يَسْـأَلُونَ رَسُـولَ اللّٰهِ ﷺ، اسْـتِهْزَاءً فَيَقُـولُ الرَّجُـلُ: مَنْ أَبِي؟ وَيَقُـولُ الرَّجُـلُ: تَضِـلُّ نَاقَـتُهُ، أَيْنَ نَاقَتِي؟ فَـأَنْزَلَ اللّٰهُ فِـيهِمْ هَـذِهِ الآيَـةَ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ﴾﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٤٦٢٢)}، واتـە: عەبدوڵـڵای كـوڕی عەببـاس خـوا لێیـان ڕازی بـێ، دەڵـێ: كۆمەڵێـك هـەبوون پرسـیاریان لـە پێغەمبـەر ﷺ دەكـرد وەك گاڵـتەپێكردن (دیـارە دەبـێ مونـافیق بـووبن، یـان مسـوڵمانی دڵنـەخۆش و سـادەو نەزان و كەم ئـەدەب بـوون) پیـاوێك دەیگوت: كـێ بابـی منـە؟ وە پیاوێكی دیكـە حوشـترەكەی ون دەبـوو، دەیگوت: حوشـترەكەم لەكـوێیـە؟ خـواش ﷻ ئەم ئایـەتەی دەربـارەیان نـاردە خـوارێ.

ب- ﴿عَـنْ أَنَـسٍ ﷺ، قَـالَ: خَطَـبَ رَسُـولُ اللّٰهِ ﷺ، خُطْبَـةً، مَا سَـمِعْتُ مِثْـلَهَا قَطُّ قَـالَ: لَـوْ تَعْـلَمُونَ مَـا أَعْلَمُ لَضَـحِكْتُمْ قَلِيـلاً وَلَبَكَـيْتُمْ كَـثِيرًا، قَـالَ: فَغَطَّـى أَصْحَابُ رَسُولِ اللّٰهِ ﷺ، وُجُوهَهُمْ، لَـهُمْ خَنِينٌ، فَقَالَ رَجُلٌ: مَنْ أَبِـي قَـالَ: فُـلَانٌ، فَنَزَلَـتْ هـذِهِ الآيَـةُ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ﴾﴾ {أَخْرَجَـهُ الْبُخَارِيُّ برقم: (٤٦٢١)}، واتـە: ئەنەسـی كوڕی مالیك خـوا لێی ڕازی بـێ، دەڵـێ: پێغـەمبەری خـوا ﷺ ڕۆژێـك وتـارێكی دا، هەرگیـز گوێم لـە وتـاری وا نـەبووە، {واتـە: هـەرگیز وتـاری وای لـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ نەبیسـتوە، دیـارە ئەنـەس زۆر كـارتێكراو بـووە بـەو وتـارەو كەوتۆتـە ژێـر

کاریگــەریی) پێغــەمبەری خــوا ﷺ (لــە نێــو وتارەکــەیدا) فــەرمووی: ئەگــەر ئــەوەی مــن دەیــزانم ئێــوە بیــزانن، کــەم پێدەکــەنن‌و زۆر دەگــریێن، هــاوەڵانی پێغــەمبــەری خــوا ﷺ دەموچــاوی خۆیــان داپۆشــی‌و شــتێکیان بەســەر ســەری خۆیان داداو سەریان خوار کردەوە، گریـان، (خَنِينٌ) بـە دەنگی گریانی بـە نرکە نــرك دەگوتــرێ}، پیاوێـك لەوکاتـەدا گــوتی: بـابی مـن کــێیە؟ پێغەمبـەر ﷺ فەرمووی: فـلان کەسـە، ئیـدی ئەو ئایـەتە هاتـە خوار.

دوایــی باســی دەکەین‌و ناوی ئەو هـاوەڵەش دێنـین خـوا لــێی ڕازی بــێ، دیارە لـە نێـو خەڵــکدا تۆمەتبــار کــراوە بـەوە کـە کــوڕی بـابی خـۆی نیــە، ئــەویش لەوکـــاتەدا دەرفــەتی دەســـت کــەوتوە، گوتوویــــەتی: بــابم کێیــە؟ ئــەویش فەرموویەتــی: فلان کەسە، کە هـەر بـابی خۆشـی بووە، جا دوایـی دەڵێن: دایکـی گوتــی: بــێ‌قــەزابی! یان مــالٚ خراپ! ئەوەت بۆ کـرد؟ تۆ دڵــنیا بووی لـەوەی کە دایکــت لــە ســەردەمی نەفــامیی دا گونـاهێکی کردبــێ، دوایـی منیشــت عەیبـدار دەکـرد! ئەو هاوەڵەش دەڵــێ: وەڵاهـی ئەگـەر پێغەمبـەر ﷺ نەسەبو ڕەچەڵەکی منــی پاڵدابایــە لای کۆیلەیــەکی ڕەش، خــۆم دەکــردە کــوڕی وی، کــاتی خــۆی لــە ســەردەمی نەفــامیی دا ئــەو شــتانە بوون، بۆ وێنــە: (زیـاد بـن أبیــە) کە دوایـــی ئــەبو ســـوفیان کردیــە کــوڕی خــۆی (اسْتَلْحَقَهُ أبـو سُـفیان) دیـارە ئـەو جـۆرە پیـاوانەش بە دەوری موعـاویەوە هەبوون خـوا لێیـان ببووریٚ، کە پێشــتــر پێیـان گوتــوە (زیــاد بـن أبیــە) واتـە: زیــادی کوڕی بابــی خـۆی، بابــی کێیـە؟ دیارنیـە، دوایــی لــە ســەردەمی ئیســلام دا، ئــەبو سـوفیان گــوتی: کــاتی خــۆی مــن لەگــەڵ ســومەییەی دایکــی ڕابــواردوە، ســومەییە کۆیلــەی بـووەو لەگــەڵی ڕابـواردوە، دوای ئـەوە ئـەو زیـادەی بـووە، ئیــدی ئــەوجار بــە زیــاد دەگـوترا (زیـاد بـن أبي سفیان) لـە ســەردەمی نەفــامیی دا ئــاوا بـووەو پێشــیان عــەیب نــەبووە، بەڵکــو لەلایــان ئاســایی بــووە، وەك چۆن ئێســتا لــە ڕۆژئـاوا وایــە، زۆر لـەلایان ئاسـاییە، کــوڕە، کچە بـابی خـۆی ناناســێ، یـان دایکی ناناسـێ، چونکە ژن لـەوێ مێردیشــی هەیــەو دۆستیشــی هەیـە، لەلاشـیان ئاساییە، چونکە ئەگـەر دیـن نـەبوو غیــرەت

نامێنـــێ، غیـــرەتو جـوامێریـیو شـەڕەفو... هتـد هـەمووی لـە ئیمـانی ڕاسـتو دروســتەوە پەیـدا دەبـن.

ج- ﴿عَـنْ عَلِـيٍّ ﷺ، قَـالَ لَمَّـا نَزَلَـتْ هَـذِهِ الآيَـةُ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ۚ ﴿٩٧﴾﴾ آل عمـران، قَـالُوا يَـا رَسُـولَ اللهِ! أَفِي كُـلِّ عَـامٍ؟ فَسَكَتَ، فَقَالُوا: أَفِي كُلِّ عَامٍ؟ فَسَكَتَ، قَالَ: ثُمَّ قَالُوا: أَفِي كُلِّ عَامٍ؟ فَقَالَ: لاَ، وَلَـوْ قُلْتُ نَعَـمْ لَوَجَبَـتْ، فَأَنْزَلَ اللهُ تَعَـالَى ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسْـَٔلُواْ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴾﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْمَـد بـرقم: (٩٠٥)، وَالتِّرمِـذِيُّ بـرقم: (٨١٤)، وَابْنُ مَاجَهْ بـرقم: (٢٨٨٤)، وَالحَـاكِمُ بـرقم: (٣١٥٧)، قَـالَ الحَـافظ ابْـنُ حَجَـر: لَـمْ يَتَكَـلَّم الحـاكم عليـه وفـي إسنادِهِ ضـعف وانقطـاع، وضـعَّفه الألبـاني فـي (ضـعيف سـنن إبـن ماجـه) بـرقم: (٦٢٨)، تعليـق شـعيب الأرنـؤوط: إسناده ضـعيف} ، واتە: عەلـی خوا لـێی ڕازی بـێ، دەڵـێ: لـە کاتێکدا ئـەم ئایەتـە هاتــــە خـــــوار: ﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾، گوتیـان: ئەی پێغـەمبەری خوا ﷺ هـەموو سـاڵـێ حـەجمان لەسـەر پێویســتە؟ بێدەنگ بـوو، دوایـی گوتیـان: هــەموو سـاڵـێ؟ هــەر بێــدەنگ بـوو، دوایـی بۆ جـاری سـێیەم گوتیـان: هــەموو سـاڵـێ؟ فـەرمووی نـەخێر، وە ئەگـەر گوتبـام بەڵـێ پێویســت دەبــوو، نەشــتانــدەتوانی، ئیــدی خــوای بــەرز ئـەو ئایــەتەی نــاردە خوار.

# مانـای گـشــتـی ئایەتەکـــان

خوا ﷻ ڕوو لە ئیمانداران دەکات بۆ جاری چواردەیەم، لەم سوورەتە موبارەکەدا بە نازناوی ئیمان دەیاندوێنێ، ئەم سوورەتە هەمووی بریتییە لە دواندنی ئیمانداران، وە خستنەڕووی حوکمە شەرعییەکان لە زۆر ڕووەوە، لێرەشدا خوای پەروەردگار جارێکی دیکە دەیاندوێنێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسْـَٔلُواْ عَنْ أَشْيَآءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە چەند شتێك پرسیار مەكەن، کە ئەگەر بۆتان دەربکەون، بۆتان خراپ بن، ئەوە واتایەکی، دەشگونجێ مەبەست پێی ئەوەبێ: شتانێك داوا مەکەن کە ئەگەر ئەو شتەی داوای دەکەن داواکارییەکەتان بێتە دی، بۆتان خراپ بێ، بەڵام مادام (تَسْـَٔلُواْ) بە (عن) تەعەددای کردوە، زیاتر ئەوەیان دەگەیەنێ، بەڵام ئەوەی دیکە کە دەفەرموێ: ﴿ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَـٰفِرِينَ ﴾، ئەو مانایەی دیکە بەقوەت دەکات، کە دەفەرموێ: لە پێش ئێوەدا کەسانێك شتێکیان داواکرد، کە بۆشیان هاتە دی، پێی بێبڕوابوون، وەك دوایی باسی دەکەین، کە مەبەست لە پێغەمبەرانی پێشوویە (عليهم الصلاة والسلام) گەلەکانیان داوای هەندێك شتیان لێکردوون، ئەوانیش کە داوایان لە خوا کردووە شتەکان هاتوونە دی، خەڵکەکە پێی بێبڕوابوون، خوای دادگەریش لە بەینی بردوون، وەك حوشترەکەی صالح‌و (خوان)ی مەسیح‌و موعجیزەکانی مووسا سەلامی خوایان لەسەر، دەربارەی موعجیزەکانی موسا خوا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾الإسراء، خوا نۆ موعجیزەی بە مووسا دان، دوویان دەست‌و گۆچانەکەی بوون، حەوتەکانی دیکە ئەو شتانە بوون کە خوای بەرز لە سوورەتی (الأعراف)دا باسیان دەکات.

پاشان خوا ئامۆژگارییان دەکـات چ کاتێك ئەو پرسیارانە بکەن، ﴿ وَإِن تَسْـَٔلُواْ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ ﴾، وە ئەگـەر کاتێك ئـەو پرسـیارانە بکـەن، کـە قورئـان دێتە خـوار لە میـانەی هاتنە خـواری قورئـاندا، ئەوە بۆتـان ئاشـکرا دەبـن، ﴿ عَفَا ٱللَّهُ عَنْهَا وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٌ ﴾، لەوەی ڕابردووە خـوا چاوپۆشـی کـردووەو بـوردووە، وە خـوا لێبـوردەی هێـدیو مەنـدە، کـە سـزای نـەداونو چاوپۆشـیی لێکـردوون، بـەڵام لەمـەودوا شتێك کە پەکتان لەسـەری نەکـەوتوە مەپرسـنو داوای مەکـەن، ﴿ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَـٰفِرِينَ ﴾، بێگـومان لە پێـش ئێـوەدا کۆمـەڵێك داوای ئـەو جـۆرە شـتانەیان دەکـرد، دوایـیش پێـی بێبـڕوابوون، ﴿ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَـٰفِرِينَ ﴾، واتە: بەرانبـەری بێبـڕوا بوون، یان بەهـۆی شـتەکـانەوە بێبـڕوا بـوون، هەردوو واتـاکـەی هـەن.

ئنجـا خـوای بێهـاوتا باسی ئـەوە دەکـات کـە هـاوبەش بـۆ خـوادانەرەکـان چەند جۆرە ئاژەڵێکـیان لـە خۆیـان قەدەغـە کردبـوون، هـەروا لەسـەر بناغـەی درۆ بـە نـاوی خـوا هەڵبەسـتن، کـە: (بَحِيرَةٍ، سَآئِبَةٍ، وَصِيلَةٍ، حَامٍ) بـوون، کـە ئێمـە لـە مەسـەلە گرنگـەکاندا چەمـكو واتاکـەیان زیاتر ڕوون دەکەینـەوە، خـوا دەفـەرموێ: ﴿ مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٍ وَلَا سَآئِبَةٍ وَلَا وَصِيلَةٍ وَلَا حَامٍ وَلَـٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ ﴾، واتە: خـوا هیچ بەحیـرەو سائیبەو وەصیلەو حامی دانەنـاون، بەڵام ئەوانەی بێبـڕوان، درۆ بە ناوی خـواوە دەکەن، وە زۆربەشـیان نافامنو نـازانن، ئنجـا لـە کۆتاییـدا دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ

وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُواْ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾، ئەگەر پێیان بگوترێ وەرن بۆ لای شتێك كە خوا ناردوویەتە خوار كە قورئانە، وە بۆ لای پێغەمبەری خوا ﷺ دەڵێن: ئەوەمان بەسە كە باب‌و باپیرانمان لەسەری بوون، ئەدی ئەگەر ئەو باب‌و باپیرانەیان هیچیان نەزانیبێ‌و بە ڕێشیان نەزانیبێ، دەبێ هەر شوێنیان بكەون؟! نەخێر دەبێ بە دوای پێشینانێك بكەون كە بە ڕێی ڕاستدا بیانبەن، بەڵام كەسانێك كە بۆخۆیان بەڕێ نەزانن، چۆن ڕێ پێشانی ئێوە دەدەن؟!!

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە چەند شتێك پرسیار مەکەن، (واتە: لەبارەی چەند شتێکەوە پرسیار مەکەن) کە ئەگەر بۆتان دەربکەون، ببێتە مایەی ناڕەحەتییتان، واتە: پێتان ناخۆش بن، لێرەدا زانایان، وە توێژەرەوانی قورئان زۆر باسوخواسیان کردوە، دەربارەی ئەوە کە ئایا خوا ﷻ بۆچی لەو ئایەتە موبارەکەدا فەرمان بە ئیمانداران دەکات، کە دەربارەی شتانێك پرسیار نەکەن، لەبەرئەوەی کە وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارانە، یاخود دەرکەوتنی ئەو شتانە، دەبێتە هۆی ناڕەحەتییان؟ وە ئایا ئەو شتانە چین؟ وە ئەو جۆرە پرسیارکردنە چییە؟

## باسێك لە بارەی ڕەوایی و ناڕەوایی پرسیارکردنەوە لە شەریعەتدا

سەرەتا دەڵێین: لە ئیسلامدا ڕێ لە مسوڵمانان نەگیراوە پرسیار بکەن، بە پێچەوانەوە بەڵکو فەرمانیان پێکراوە، پرسیار بکەن، بەڵام پرسیاری بە ڕێوجێ، وە لە کەسانی شارەزا، وەك خوا ﷻ لە دوو ئایەتی موبارەکدا، لە سووڕەتی (الأنبياء)، وە لە سووڕەتی(النحل)دا، دەفەرموێ: ﴿ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾، واتە: لە شارەزایان بپرسن، ئەگەر نازانن، لە زانایان بپرسن، شتێك کە نازانن بە نەزانی مەیڵێن، یان دوای مەکەون، تاکو لە زانایان نەپرسن، پاشان ئێمە دەبینین بەس لە سووڕەتی (البقرة)دا حەوت جار مسوڵمانان

پرسیاریان کردوە لە پێغەمبەر ﷺ دەربارەی چەند شتێك بۆ وێنە:

١/ دەفەرموێ: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْأَهِلَّةِ ۖ قُلْ هِىَ مَوَٰقِيتُ لِلنَّاسِ وَٱلْحَجِّ ﴿١٨٩﴾﴾ البقرة، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی (أَهِلَّة) {کۆی (هلال)ە، واتە: مانگی یەك شەوو دوو سێ شەوە}، کە مانگ تازە دەردەکەوێ بڵێ: ئەوە خوا دایناوە بۆ دیاریکردنی کاتی عیبادەتو خواپەرستییەکانو کاتی حەج.

٢/ دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ ﴿٢١٥﴾﴾ البقرة، واتە: پرسیارت لێدەکەن، چی ببەخشن؟.

٣/ دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلشَّهْرِ ٱلْحَرَامِ قِتَالٍ فِيهِ ﴿٢١٧﴾﴾ البقرة، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی مانگی حەرام، جەنگ تێدا کردنی چۆنە؟

٤/ دەفەرموێ: ﴿ يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ ﴿٢١٩﴾﴾ البقرة، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی شەڕابو قومار.

٥/ دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلِ ٱلْعَفْوَ ﴿٢١٩﴾﴾ البقرة، واتە: (جارێکی دیکە) پرسیارت لێدەکەن چی ببەخشن؟ بڵێ: ئەوەی کە زیادە لەخۆتان.

٦/ دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْيَتَـٰمَىٰ ۖ قُلْ إِصْلَاحٌ لَّهُمْ خَيْرٌ ﴿٢٢٠﴾﴾ البقرة، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی هەتیوان، بڵێ: چۆن بۆ ئەوان چاکەو دەبێتە مایەی چاکسازیی ماڵو سامانەکەیان، ئاوا مامەڵە بکەن.

٧/ دەفەرموێ: ﴿ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ﴿٢٢٢﴾﴾ البقرة، واتە: پرسیارت لێدەکەن دەربارەی حەیز، (ئافرەت کە دەکەوێتە بێنوێژییەوە) چۆن مامەڵەو ڕەفتار لەگەڵ ژندا بکەن؟

ئەوە حەوت جار، ئەو وشە موبارەکە بەس لە سووڕەتی (البقرة)دا دووبارە

بۆتەوە، کەواتە: ڕێ لە مسوڵمانان نەگیراوە پرسیار بکەن، چ لە پێغەمبەر ﷺ کە کاتی خۆی تەشریفی بووە، چ لە زانایانێك کە جێگرو میراتگری پێغەمبەرن ﷺ پرسیاریان لێبکەن، وە چ لە زانایانی دیکە کە لە بوارەکانی دیکەی زانستە جۆراوجۆرەکاندا، زانستە دنیایەکاندا شارەزان، بەڵکو فەرمان کراوە، (وەك گوتمان) هەم لە سوورەتی (النحل)دا هەم لە سوورەتی (الأنبیاء)دا خوا دەفەرمویٚ: ﴿فَسْئَلُوٓاْ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾، شتێك کە نایزانن لە زانایان بپرسن، وە لە سوورەتی (النساء)دا دەفەرمویٚ: ﴿وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ ﴿٨٣﴾﴾، واتە: (ئەو هەواڵە کە پێیان دەگات) ئەگەر گێڕابایانەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و بۆ لای کاربەدەستان، ئەوانەی کە شارەزاو توانای هەڵهێنجانیان هەیە، دەیانزانی ئایا چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو هەواڵەدا بکرێ، کەواتە: ئەوە چ جۆرە پرسیارکردنێکە کە قەدەغە کراوە؟

خاوەنی (محاسن التأویل)، واتە: (جمالدین القاسمي) لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1] دە جۆر پرسیارکردنی هێناوە، کە ئەو دە جۆر پرسیارکردنەن کە خراپو ناڕەوان و نەهییان لێکراوە، ئەگەرنا بەگشتی پرسیارکردن بۆ ئەوە کە ئینسان بگاتە حەقیقەتو بگاتە ڕاستی، وە زانیاری زیاتری دەست بکەویٚ، نەك هەر ڕێ لێگیراو نیە، بەڵکو فەرمان پێکراویشە، بزانین ئەو دە حاڵەتە چین؟ وەك سەرچاوەی ناوبراو هێناویەتی، کە من بە ڕوونکردنەوەو وێنە هێنانەوەوە قسەکانی دێنم:

## یەکەم: پرسیارکردنێك کە لە بواری دینداریی دا سوودی نەبیٚ:

ئینسان شتێك بپرسیٚ کە لە بواری دینداریی دا سوودی نەبیٚ، (ئەو وێنەی نەهێناونەوە من دەیانهێنمەوە)، بۆ وێنە: گۆچانەکەی مووسا علیه السلام چ جۆرە دارێك بووە؟ کەشتیەکەی نووح چەند قات بووە؟ چەند مەتر بەرز بووە؟ چەند

١) ج٤، ص٣٩٢، ٣٩٦.

درێــژ بووە؟ چەنــد پان بوو؟ چــەند کــەس لەگــەڵ نــووح ســواری کەشتیەکە بــوو ون؟ حوشــتــرەکەی صــالّح ﷺ ڕەنگــی چی بــوو؟ قــەدو قیافــەی چــەند بــوو؟ تــا کۆتــایی، ئەو شــتانە کە قورئان باســی نەکــردوون، دیارە ئینســان پێویســتی پێیــان نیە، جا ئێمە لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باســمان کرد، کە پێغەمبەری خــوا ﷺ وتــار دەدا وتــارێکی زۆر کاریگــەر، وە پاشــان دەفــەرموێ: پرســیارم لــێ بکــەن، هــەر پرســیارێکــم لــێ بکــەن، وەڵامتــان دەدەمــەوە، (عَبْدِ اللهِ بْنِ حُذَافَةَ) یــەکێك لــە هــاوەڵان دەبــێ، بــەوە تۆمــەتبارکراوە کــە کــوڕی بــابی خــۆی نیــە، لــە ســەردەمی نەفــامییدا خــەڵك داوێــن پیســیی و غەڵــەتو پەڵەتیــان بــووە، هەرچــەندە ئــەو کاتەش خەڵــکی ڕەسەنو خێــزانو عائیلــەی ڕەســەنو داوێــن پــاك هــەر هــەبوون، بــەڵام خەڵــکی دیکــەی بــێ بەنــدوباریش هــەبووە، جــا (عَبْدِ اللهِ بْنِ حُذَافَةَ) لــە پێغــەمبــەر ﷺ دەپرســێ: ﴿مَنْ أَبِي؟ قَــالَ: أَبُوكَ حُــذَافَةُ﴾، بابــم کێیــە؟ پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: بابت حوزافەیە، واتــە: کــوڕی بــابی خــۆتی، دوایــی دایکــی عەبدوڵــلا کە دەبیســتێتەوە دەڵــێ: ڕۆڵــە تــۆ زۆر وەك بــلــێی مندالــێکی ناصالّح بــووی بەرانبــەر بــە مــن، ئــەدی باشــە دڵنیا بــووی دایکت لــە ســەردەمی نەفامییــدا غەڵەتێکــی کردبــێ، بابت نەفەرێکــی دیکــە بــێ؟ ئــەویش گوتوویــەتی: وەڵڵاهــی ئەگــەر پێغــەمبەری خوا ﷺ پــاڵی دابامــە لای هــەر کەســێك، ئەگــەر کۆیلەیەکی ڕەش پێســتیش بووایــە، ئــەوم بــە بــابی خــۆم دادەنــا، بــە هــەر حــاڵ ئــەو جــۆرە پرســیارەی کە لە ڕووی دینــدارییــەوە پێویســت نیە، نــابێ بکــرێ.

## دووەم: پرســـیاری زیـــادو ناپێویســـت:

واتە: باسی مەســەلەیەکی دینــیی دەکرێ، ئەوەندە بەســە کە شــەرع باسیکردوە، ئەو دەچــێ زیاتر هەڵی دەکۆڵــێ، بــو وێنــە: پرسیارکردنەکەی بــەنی ئیسرائیل کــە مووســا ﷺ پێیــان دەفــەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تَذۡبَحُواْ بَقَرَةً ﴿٦٧﴾﴾ البقـــرة، واتــە: بێگومــان خــوا فەرمانتــان پــێ دەکــات مانگایــەك ســەربڕن، دیــارە هــۆی ئــەو فەرمانە ئەوە بووە کە نەفــەرێك کــوژراوە، نەیانزانیوە بکوژەکەی کــێیــە؟ چوونە لای مووســا ﷺ ئــەویش لــە خــوای پــەروەردگار پاڕاوەتــەوە چــی بکــەن؟ خــواش

فەرموویەتی: با مانگایەك سەرببڕن، ئەندامێكی ئەو مانگا سەربڕاوە لە لاشەی ئەو جەنازەیە بدەن، زیندوو دەبێتەوەو لێی بپرسن: كێ كوشتوویەتی؟ دەڵێ فلان كەس، وەك موعجیزەیەك بۆ مووسا ﷺ، دەڵێ: مانگا سەربڕن، دەڵێن: چۆن بێ؟ دوایی دەڵێن: ئەدی ڕەنگی چۆن بێ؟ ئنجا دوایی ئیشی كردبێ، یان ئیشی نەكردبێ؟ ئاوی كێشابێ؟ یان نەكێشا بێ؟ هەموو جارێك كە پرسیار دەكەن، زیاتر لەسەریان قورس دەبێ، ئەگەر پێشێ هەر مانگایەكیان سەر بڕیبا تەواو بوو، مووسا ﷺ پێیان دەڵێ: با ڕەنگەكەی زەردێكی وەها بێ كە هیچ پەڵەی دیكەی تێدا نەبێ، وە نابێ ئیشی كردبێ، وە لە ڕووی تەمەنەوە دەبێ مام نێوەندیی بێ، نێنگوون (نێوان) بێ، نە زۆر بە ساڵ دا چوو بێ، نە كەم تەمەنیش، هەموو جارێ لەسەریان قورستر دەبێ، سەرەنجام لە هەموو ناوچەی ئەوان دا یەك مانگای لەو جۆرە هەبووە، بەڵام مانگای دیكەو جۆری دیكە زۆر بوون، بەڵام بەو مواصەفاتە هەر ئەو مانگایە هەبوو، كە هی پیرەژنێك بووە، ئەو پیرە ژنەش گوتی: من ئەو مانگایەتان نادەمێ بە نرخێكی زۆر نەبێ، تا لە هەندێك ڕیوایەتدا دەڵێ: دەبێ پێستەكەیم بۆ پڕ بكەن لە زێڕ، ئەگەرنا ناتاندەمێ، ئەوانیش ناچار بوون هەر بیكڕن، پێشتریش لە هۆی هاتنە خوارەوەكەیدا باسمان كرد، كە ڕۆژێك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: ﴿(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّ اللهَ كَتَبَ عَلَيْكُمُ الْحَجَّ)، فَقَامَ الأَقْرَعُ بْنُ حَابِسٍ فَقَالَ: أَفِي كُلِّ عَامٍ يَا رَسُولَ اللهِ؟ قالها ثلاثا قَالَ: (لا، ولَوْ قُلْتُهَا لَوَجَبَتْ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢٣٠٤)، تعليق شعيب الأرنؤوط: صحيح، وَالحَاكِمُ برقم: (٣١٥٥) وَقَالَ: صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ}، ئەی خەڵكینە! بێگومان خوا حەج كردنی لەسەر پێویست كردوون، ئەقرەعی كوڕی حابیس گوتی: هەموو ساڵێك بیكەین؟ سێ جاران دووبارەی كردەوە، جاری سێیەم پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: نەخێر، هەموو ساڵ نا، بەڵام ئەگەر گوتبام بەڵێ، واجب دەبوو لەسەرتان و نەشتان دەتوانی، خوا دەفەرموێ حەجێ بكەن، ئیدی بۆچی لە خۆڕا دەڵێن: هەموو ساڵێك؟ یانی: ئەو جۆرە پرسیارانە كە پێویست نەبن، نابێ بكرێن.

**سێیەم: پرسیار لە بارەی شتێكەوە كە یەك لەسەری نەكەوتبێ:**

شتێك كە ئینسان پەكی لەسەری نەكەوتبێ نەپرسێ باشە، هەڵبەتە لە ڕووی دیندارییەوە زیاتر مەبەستە، لەوبارەوە پێغەمبەر ﷺ چەند فەرمایشتێكی هەن، بۆ نموونە:

١) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿ذَرُونِي مَا تَرَكْتُكُمْ؛ فَإِنَّمَا هَلَكَ مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ بِكَثْرَةِ سُؤَالِهِمْ، وَاخْتِلَافِهِمْ عَلَى أَنْبِيَائِهِمْ، فَإِذَا أَمَرْتُكُمْ بِشَيْءٍ فَأْتُوا مِنْهُ مَا اسْتَطَعْتُمْ، وَإِذَا نَهَيْتُكُمْ عَنْ شَيْءٍ فَدَعُوهُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٧٤٩٢)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٦٠٦٨)، وَالنَّسَائِيُّ بِرقم: (٢٦١٩)، وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٢) عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ}، واتە: شتێك كە من وازم لێ هێناوەو باسم نەكردوە، ئێوەش لێمگەڕێن، (لێم مەپرسن)، چونكە ئەوانی پێش ئێوە بەهۆی زۆر پرسیاركردنیانو ڕا جیاییانەوە لەگەڵ پێغەمبەرانیان (علیهم الصلاة والسلام) لەبەین چوون (واتە: بوونە بەش بەشو پارچە پارچە)، هەر كاتێك فەرمانم بە شتێك پێكردن، بەپێی توانا لێی ئەنجام بدەن، وە هەر كاتێك شتێكم لێ قەدەغەكردن، وازی لێ بێنن.

٢) پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ حَدَّ حُدُودًا فَلَا تَعْتَدُوهَا، وَفَرَضَ فَرَائِضَ فَلَا تُضَيِّعُوهَا، وَحَرَّمَ مَحَارِمَ فَلَا تَنْتَهِكُوهَا، وَسَكَتَ عَنْ أَشْيَاءَ رَحْمَةً بِكُمْ مِنْ غَيرِ نِسْيَانٍ فَلَا تَسْأَلُوا عَنْهَا﴾ {أَخْرَجَهُ الطّبراني في (الكبير) برقم: (٥٨٩)، الدارقطني برقم: (٤٢)، المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير، ص: (١٦٧)، وَصَحَّحَهُ إِبْنُ كَثِير}، واتە: بێگومان خوا چەند سنوورێكی دیاری كردوون مەیانبەزێنن، وە چەند شتێكی فەرزكردوون مەیان فەوتێنن، وە چەند شتێكی قەدەغە كردوون، توخنیان مەكەون، وە لە هەندێ شت بێدەنگ بووە لەڕووی بەزەیی پێداهاتنەوەتان، بێئەوەی كە لەبیری چووبێ، لێیان مەپرسن.

٣) هەروەها ئەو دەقەش هەیە: ﴿سُئِلَ رَسُولَ اللّٰهِ ﷺ عَنِ السِّمنِ وَالجُبنِ وَالفَرَاءِ؟ فَقَالَ: الحَلَالُ مَا أَحَلَّ اللّٰهُ فِي كِتَابِهِ، وَالحَرَامُ مَا حَرَّمَ اللّٰهُ فِي كِتَابِهِ، وَمَا سَكَتَ عَنْهُ فَهُوَ مِمَّا عَفَا عَنْهُ﴾ {أَخْرَجَهُ التِّرمِذِيُّ بِرقم: (١٧٢٦)،

وَابْنُ مَاجَهْ بِرقم: (٣٣٦٧)، وَالطَّبَرَانِي فِي (الكبير) بِرقم: (٦١٢٤)، وَالحَاكِمُ برقم: (٧١١٥)، عَنْ سَلْمَانَ الْفَارِسِيِّ ﵁، وَحَسَّنَهُ الألباني في (المشكاة) برقم: (٤٢٢٨)}، واته: پرسیار له پێغەمبەر ﷺ كراوە دەربارەی ڕۆنو پەنیرو فەروە (كە لەبەردەكرێ) فەرمووی: حەڵاڵ ئەوەیە كە خوا لە كتێبی خۆیدا حەڵاڵی كردبێ‌و، قەدەغە ئەوەیە كە خوا لە كتێبی خۆیدا قەدەغەی كردبێ، وە ئەوەی لێی بێدەنگ بووە، ئەوە لەوەیە كە بە ڕەوایی هێشتوویەتەوە.

ئەو شتەی كە خوای زانا حەرامی نەكردبێ، مانای وایە حەڵاڵە، ئەو شتانەش كە حەڵاڵی كردوون، ئەوە دیارە حەڵاڵن، ئەوی دیكە كە حەرامی كردوە، حەرامە، غەیری حەرامەكە مانای وایە ئەگەر دەقیشی لەسەر نەبێ، ئەسڵ لە شتەكاندا حەڵاڵیی‌و ڕێ پێدرانە، مادام دەقێك لەسەر قەدەغەكرانی نەبێ، وەك من زۆر لە كتێبەكانی خۆمدا ئەو بنچینە شەرعییەم باسكردوە، كە لەڕاستییدا ئەو بنچینە شەرعییە، زۆر گرنگە بۆئەوەی كە دین‌و دینداریی لە خەڵك تەسك نەكەینەوە، وە دنیایان لێ نەكەینە چەرمی چۆلەكە.

## چوارەم: پرسیاركردن لە بارەی مەسەلە قورس‌و ئاڵۆزەوە:

هەندێك مەسەلەی قورس‌و ئاڵۆز هەن، وەك مەتەڵ وان، كەسێك ئەو پرسیارە لە مامۆستایەك، لە زانایەك بكات، هەر بۆئەوەی بیبەستێتەوەو، عاسێی بكات، ئەوەش نەهی لێكراوە، لەوبارەوەش ئەو فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ مُعَاوِيَةَ ﵁ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْغَلُوطَاتِ﴾{أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٣٧٣٨)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٣٦٥٦) وَضَعَّفَهُ الألباني في (ضعيف المشكاة) برقم: (٢٤٣) وفي (ضعيف سنن أبي داود)}، واته: موعاویە خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەری خوا ﷺ ڕێگری كردوە لە پرسیاركردن دەربارەی ئەو شتانەی كە خەڵك تێیاندا بەهەڵەدا دەچێ، (غَلوطات) دەڵێ: (جَمْعُ غَلُوطَة أو أُغلُوطَة)، واته: بۆ وێنە ئەگەر لە مامۆستایەك بپرسی: (أَنَّ مُحَمَّدٌ) چۆن ئیعراب دەكرێ؟ ئەویش وا دەزانێ (أَنَّ) ئەداتی تەئكیدەو (حرف مشبه بالفعل، ينصب الإسم ويرفع الخبر)ە، بەڵام نا، (أَنَّ)، لێرەدا، واته: ناڵاندی، (أَنَّ مُحَمَّد) یانی: موحەممەد ناڵاندی، كەچی مامۆستایەكە فكری بۆ شتێكی دیكە دەچێ،

ئـەو جـۆرە پرسـیارانەی کـە وەك مەتـەڵ وان، واباشـە ئـەو جـۆرە پرسـیارانە نەکرێن لە زانایان، بۆئەوەی کە پرسیاکەر جەربەزەیی خۆیو پاشان نـەزانیی ئـەو مامۆسـتاو زانـایە دەربخـات!! کە دیارە هـیچ کەسێکیش وەڵامـی هەموو پرسـیارێك هـەر نازانـێ، بەس خـوای پەروەردگـار هـەموو شـتێك دەزانـێ.

## پێـنجـەم: پرسـیارکردن لە بـارەی عیللـەتو حیکمـەتی عیبـادەتەوە:

هـەر شـتێك کـە خـوا دایـنـاوە وەك عیبـادەت، بـێ حیکمـەت نیـە، خـوا دەفـەرموێ: ڕۆژوو بگـرن، دیـارە حیكمـەتی تێدایـە، دەفـەرموێ: نوێـژ بکـەن دەفـەرموێ: دووعـا بکـەن، دەفـەرموێ: زیکـر بکـەن، دەفـەرموێ: قوربـانیی سـەربڕن، هەمووی حیکمـەتی هەیـە، بـەڵام زۆرجار خـوا ﷻ حیکمەتەکـەی بـۆ ئێمـە دەرناخـات، بۆچـی؟ بۆئەوەی مانای بەندایەتیی لە ئێمەدا باشـتر بێتـە دی، کاتێـك بـەو ئەرکـانە هەڵدەستین، بـە پێچـەوانەی بـواری هەڵسـوکەوتەکـانەوەو ئـەو یاسا شـەرعییانە کە پەیوەندییان پێیـانەوە هەیە، کـە مەگـەر چـۆن دەنا خـوای پەروەردگـار ئامـاژە دەکـات بـە حیکمەتەکـەیان، لەوبارەشـەوە ئـەم فەرموودەیـە هەیـە: ﴿عَنْ مُعَاذَةَ قَالَتْ: سَأَلْتُ عَائِشَةَ فَقُلْتُ مَا بَالُ الْحَائِضِ تَقْضِي الصَّوْمَ وَلاَ تَقْضِي الصَّلاَةَ؟ فَقَالَتْ: أَحَرُورِيَّةٌ أَنْتِ؟ قُلْتُ لَسْتُ بِحَرُورِيَّةٍ، وَلَكِنِّي أَسْأَلُ، قَالَتْ: كَانَ يُصِيبُنَا ذَلِكَ فَنُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّوْمِ، وَلاَ نُؤْمَرُ بِقَضَاءِ الصَّلاَةِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَدُ برقم: (٢٥٩٩٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٣٢١)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧٥٩)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٦٢)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٣٠)}، واتـە: موعـاذە (ئافرەتێکـە دیـارە دەبـێ لـە جیلـی دوای هـاوەڵان بـێ خـوا لێیـان ڕازی بـێ) دەڵـێ: پرسـیارم لـە عائیشـە کـرد خـوا لێـی ڕازی بـێ، گـوتم: بۆچـی ئافـرەتی حەیـزدار ڕۆژوو دەگێڕێتـەوە لـە کـاتی کەوتنـە حەیـزەدا، بـەڵام نوێـژەکان ناگێڕێتـەوە؟ عائیشـە گوتی: تۆ حەڕووریـی؟ (خەواریج ئەو کاتە حەڕوورییان پـێ گوتـوون، کـە هەنـدێك بیـروبۆچوونی سـەیرۆکەیان هـەبوون) منـیش گوتـم: نـەخێر، حەڕووریی نـیم، بەڵام پرسـیار دەکەم (پێشـێ وایزانی لە خەواریجـە) ئنجـا عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بێ، گوتی: لە سـەردەمی پێغـەمبەردا ﷺ ئێمە دەکەوتینـە حەیـزەوە، فـەرمانمان پـێ دەکـرا ڕۆژوو بگـێڕینەوە، بـەڵام فەرمانمـان پـێ نەدەکـرا نوێـژ بگێڕینـەوە.

تـەواو، ئەو عیبـادەتە، حیکمەتەکەی چیـەو بۆچی وایـە؟ خـوا بۆخـۆی دەیزانـێ، کە دیـارە خۆ دایکمـان عائیشـە خـوا لێـی ڕازی بـێ زۆر شـارەزا بـووە، وە دەیتـوانی بڵـێ لەبەر ئـەوە کە ڕۆژووەکـان کـەمن، وە ڕۆژوو گـرتن لـە سـاڵێکدا مانگێکە، بـەڵام نوێـژکردن هـەموو ڕۆژێیـە، پێـنج فـەرزەو مەشـەققەتو مانـدووبوونی زۆری تێـدایە، بـەڵام لەڕاستیدا پێویسـت بـەوەش ناکـات، عیبادەتـەو خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ وا بکـەو دەفەرموێ: وا مەکـە، ئەوەیان بگـێڕەوەو ئەوەیان مەگێڕەوە.

**شـەشەم: پرسـیارکردنێک کە سـەر بکێشـێ بـۆ تەکەللوف:**

واتە: زۆر قووڵبـوونەوەو زۆر شـت لەخـۆ بـە زەحمـەت خسـتن، وەك خـوا ﷻ بـە پێغـەمبەر دەفـەرموێ: ﴿ قُلْ مَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُتَكَلِّفِينَ ﴿٨٦﴾ ﴾ص، واتە: بڵێ: من هیچ کرێتـان لـێ داوا ناکەم، هیـچ پاداشـتم لێتان نـاوێ، وە من لەوانە نیـم کە شـت وەزەحمەت بخـەم، (مُتَکَلِّف) واتە: شت بە زەحمەتخەر، چونکـە (كُلْفَة) یـانی: قورسـایی و مەسـرەفو شـتێك کـە بـاری شـانی ئینسـان قـورس بکـات، دەگوترێ: (الجُنـدِيُّ الـمُكَلَّف) لەبەرئـەوە ئـەرکێکی لەسـەر دانـراوە، (مُتَكَـلِّف) واتـە: کەسێك کە شت لەسـەر خۆی، یـان لەسـەر خـەڵکی قـورس دەکـات، جـا لەوبارەشـەوە ئـەم شـوێنەوارە هەیـە: ﴿عَنْ يَحْيَـى بْـنِ عَبْـدِ الـرَّحْمَنِ بْـنِ حَاطِبٍ: أَنَّ عُمَرَ بْـنَ الْخَطَّابِ خَـرَجَ فِي رَكْـبٍ، فِيهِمْ عَمْرُو بْـنُ الْعَاصِ حَتَّـى وَرَدُوا حَوْضاً، فَقَالَ عَمْرُو بْنُ الْعَاصِ لِصَـاحِبِ الْحَوْضِ: يَا صَـاحِبَ الْحَوْضِ! هَـلْ تَـرِدُ حَوْضَـكَ السِّبَاعُ؟ فَقَالَ عُمَرُ بْـنُ الْخَطَّابِ: يَا صَاحِبَ الْحَـوْضِ! لاَ تُخْبِرْنَا فَإِنَّا نَـرِدُ عَلَـى السِّـبَاعِ وَتَـرِدُ عَلَيْنَـا﴾ {أَخْرَجَـهُ مالـك بـرقم: (٤٣)، والبَيهَقـيّ فـي (الكبرى) بـرقم: (١١١٤)}، واتە: یەحیـایی کـوڕی عەبـدوڕڕەحمان کـوڕی حاطیب، دەڵـێ: عومەری کوڕی خەتتـاب خـوا لـێی ڕازی بـێ، ڕۆژێـك لەگـەڵ کاروانێـك چـووە دەر، عەمری کوڕی عاصیش لەگەڵ ئـەو کاروانـە بـوو، هـەتا چـوونە سـەر حـەوزێك (سـەر گـۆمێکی ئـاو)، عەمـری کـوڕی عـاص بـە خـاوەنی گۆمەکـەی گـوت، ئایـا دڕنـدەکان دێنـە سـەر ئـەم ئاوانـە، دێـن ئـاوی لـێ دەخۆنـەوە؟ عومـەری کـوڕی خەتتـابیش خـوا لێـی ڕازی بـێ، گـوتی: ئـەی خـاوەنی حەوزەکـە! پێمـان مەڵـێ،

هەوالْمـان پـێ مـەدە، (مەڵـێ دێـن یـان نایـەن)، هەنـدێك درِنـدە لـە ئاوێـك دەخۆنـەوە، ئێمـەش بەسـەریان دەچیـنو ئـەوان ڕادەكـەن، ئێمـە ئاوەكـە بەكاردێنیـن، وە دوای ئێمەش درِندەش دێنە سەر ئاوەكە (واتـە: ئـەوە تەكەللوفو هەڵقوڵێنێكی بێ پاسـاوە).

## حەوتـەم: پرسـیاركردنێك كە ڕەخنــە گرتن لە قورئـانو سـوننەت بگەیـەنێ:

لەوبـارەوەش ئـەم شـوێنەوارە هەیـە: {قِيلَ لِمَالِكِ بْنِ أَنَسٍ الرَّجُلُ يَكُونُ عَالِمًا بِالسُّنَّةِ أَيُجَادِلُ عَنْهَا؟ قَالَ: لا، وَلَكِن يخبر بالسُّنَّةِ فَإِن قبلت مِنْهُ وَإِلاَّ سَكَتَ}[1]، واتـە: بـە مالیكـی كوڕی ئەنـەس گوتـرا: پیاوێك شارەزای سوننەتە؟ (یـانی: دەقەكـانی سـوننەتی پێغەمبـەر ﷺ) ئایـا موناقەشـە بكـات لەسـەر دەقەكـانی سـوننەت، گوتـی: نا، با بڵێ: ئاوای كردوە، یان ئـاوای فەرمـووە، ئەگەر لـێی وەرگیـرا باشـە، ئەگـەرنا بـا بێـدەنگ بـێ، (پێویسـت ناكـات موناقەشـەو مشـتومڕ بكـات).

## هەشـتەم: پرسـیاركردن لە بـارەی ئایـەتە موتەشـابیهەكـانەوە:

واتـە: ئـەو ئایەتـانەی كـە چـەند مانایـەكی وێكچـوویان هەیـەو مانایـەكی ڕۆشـنیان نیـە، بەڵـكو چەند مانایـەك دەگەیـەنن، یـاخود ماناكـەیان بـۆ ئێمـە زۆر ڕۆشـن نیـە، چونكە خـوا ﷻ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ ۗ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ ۗ وَالرَّاسِخُونَ فِي الْعِلْمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ ۝٧﴾ آل عمران، واتە: ئنجـا ئەوانـەی دڵیان لادانی تێدایە، بـە دوای ئـەوە دەكەون كـە مانـای وێكچـووی هەیـە، (چـەند مانـایەك هەڵدەگـرێ)، بـۆ ئـاژاوە گـێڕییو بۆئەوەی (كە بە حیسـاب) ماناكـەی بزانـن، كەواتـە: ئەوە شـتێكی بـاش

---

١) محاسن تـأویل: ج٤، ص٣٩٥.

نیـه، لـەوبارەوە ئـەم شـوێنەوارە هەیـە: کـە (الذهبـي) لـە کتێـبی (العلـو)دا هێناویەتی دەڵێ: {جَاءَ رَجُل إِلى مَالِكِ بْنِ أَنَسٍ، فَقَالَ: يَا أَبَا عَبْدِ اللهِ! ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝٥﴾ طـه، كَيْفَ اسْتَوَى؟ قَالَ: فَمَا رَأَيْتُ مَالِكاً وَجَدَ مِنْ شَيْء كَمَا وجدته مِن مَقَالَتِهِ، وعلاه الرَّحضـآء (يَعني العرق) وأطرق القوم وجعلوا ينتظرون ما يأتي منه فيه، قال فَسُرِّي عَن مَالِك، وَقَالَ: الكَيف غَيْر مَعْقُول والإِسْتِوَاء مِنْهُ غَيْر مَجْهُولٌ، وَالإِيمَانُ بِهِ وَاجِبٌ، وَالسُّؤَالُ عَنْهُ بِدْعَـةٌ، وَإِنِّي أَخَافُ أَن تَكُون ضَالاً وَأَمَرَ بِهِ فَأُخرِج}، واتە: پیاوێك هات بۆ لای مالیکی کوڕی ئەنەس (کە دیارە یەکێك لە زانا سەر مەزهەبەکانە، وە ئیمامی ئەهلی مەدینە بووە)، پیاوەکە گوتی: ئەی ئەبا عەبدوڵلا (کونیەی مالیکە) ﴿ٱلرَّحْمَٰنُ عَلَى ٱلْعَرْشِ ٱسْتَوَىٰ ۝٥﴾، خوای خاوەن بەزەیی چووە سەر عەرش، چۆن چووە سەر عەرش؟ دەڵێ: قەت مالیکم نەبینی تووڕە ببێ بە ئەندازەی ئەوە لە قسەی ئەو پیاوە تووڕە بوو، (زۆر پێی تێکچووو پێی نارەحەت بوو) وە ئارەقەی دەردەکرد، خەڵکەکەش هەموو سەریان دانەواندو بێدەنگ بوون، داخۆ مالیك چی دەڵێ! دوای ماوەیەك مالیك ڕاما، (ڕەنگە یەکەم جار بووبێ پرسیاری لێکرابێ لەوبارەوە) دوایی مالیك گوتی: چۆنیەتی (لەسەر عەرش بوونی خواو بەرزبوونەوەی خوا بۆ سەر عەرش) ناچێتە عەقڵەوە، (یانی: ئێمە نازانین چۆنە؟ ناچێتە عەقڵەوە بەو مانایەی نازانین چۆنە، ئێمە نازانین زاتی خوا چۆنە؟ سیفەتەکانی خواش بە هەمان شێوە، چوونە سەر عەرشیش یەکێکە لە سیفەتەکانی خوا، کەواتە: ئێمە نازانین چۆنە) ئنجا گوتی: لەسەر عەرش سەقامگیر بوون، یان بەرزبوونەوە بۆ سەر عەرش نەزانراو نیە، (واتە: مانای ئەو وشەیە بۆ ئێمە زانراوە کە بۆ خۆمانی بەکاربێنین، بەڵام کاتێك بۆ خوا ﷻ بەکاری دێنین، چۆنیەتییەکەی نازانین)، {(إِسْتوى) یانی: (إرتفع، أو علا، أو صعد، أو استقر)، ئنجا کاتێك بۆ خوا بەکاری دێنین، هەر بەو واتایانەیە، بەڵام چۆنیەتییەکەی نازانین؟} وە ئیمان پێهێنانی واجبە، وە پرسیار لەبارەوە کردنیشی بیدعەتە، (مەبەستی ئەوە بووە کە شتێکە پێشتر

نەبـووەو تازە داهێنـراوە)، وە من مەترسـیی ئەوەم هەیـە کە تۆ بابـایەکی گومـڕا بی، وە فەرمـانی پێکرد، کابرایان لە مەجلیسـەکە کـردە دەرێ.

کە دیـارە مـن لـەوەدا هەڵوێسـتی ئیمـام مالیکـم پـێ ڕاسـت نـەبووە، چونکە بەڵـێ کاتی خـۆی پرسـیار لـەوبارەوە نـەکراوە، بـەڵام خـەڵکی دوایـی کـە تێکـەڵ بـە میللـەتانی دیکـە بـوون، وەك فـارسو یۆنـانو هینـدو .... هتـد، ئـەو پرسـیارانەیان کردوە: خـوا چۆن چۆتـە سـەر عـەرش؟ یـانی مـەرج نیـە ئـەوە لەبەرئـەوە بـێ کـە کابرا گومڕایە، بەڵـێ ئیمام مالیك یەکەم جـار بـووە بیبیسـتـێ، وە ڕەنگە بۆیـەش وەڵامێکـی ئامـادەی پـێ نـەبووەو بیـری لێکردۆتـەوە، وە وەڵامێکـی حەکیمانەشـی داوەتـەوە، بـەڵام بـە بۆچـوونی مـن نـەدەبوو کـابرا تۆمـەتبار بکـرێ بـەوەی کـە گومڕایـەو، وە دەریـش بکـرێ لـە مەجلیسـەکە! بـە هـەر حـاڵ ئـەو وایـکردوە، پێشـەوایەکی گەورەیـە، بـەڵام مانـای وانیـە کـە مەعصـوومە، هـەر پێغەمبـەران مەعصـوومن لـە هەڵـەو کەموکـوڕیی، مەبەسـتم ئەوەیـە ئەگـەر یـەکێك لـە ئێمـەش، یان مامۆسـتایەك پرسـیارێکی لێکـرا، پرسـیارەکەی پـێ شـتێکی سـەیر بـوو، بـە کـابرا نەڵـێ گومڕایـەو دەریشـی نـەکات! بڵـێ: ئیمـام مـالیکیش خـەڵکی دەرکـردوەو منیش دەری دەکـەم، لـەوەدا ئیمـام مالیـك تەماشـای نـاکرێ، چونکە یـان هـەلومەرجەکـەی وای خواسـتوە، یـان بـە هـەر حـاڵ وەك گوتـم: ئـەو ڕەفتـارەی هەڵـە بووە، لەگـەڵ ڕێـزی زۆریشـمان بۆ ئیمـام مالـیك.

**نۆیـەم: پرسـیارکردن لە بارەی مشـتومڕی نێوان زانایانی پێشـین (سلف)ەوە:**

لەوبارەشـەوە ئـەم شـوێنەوارە هەیـە: {سُـئِلَ عُمَـر بـن عَبـد العَزِيـز عَـن قِتَـالِ أَهْـل صـفِّين، فَقَـالَ: تِلْـكَ دِمَـاء كَـفَّ اللهُ عَنْهَـا يَـدِي، فَـلاَ أَحـب أَنَ أُلَطِّـخ بِهَـا لِسَـانِي}[١]، واتە: پرسـیار لـە عومـەری کوڕی عەبدولعـەزیز خـوا لـێی ڕازی بـێ کـرا (کـە بـە پێنجـەم خەلیفـەی ڕاشـید نـاوزەد کـراوە) دەربـارەی جـەنگی خـەڵکی صـیففین (کـە لـە نێـوان عەلـی خـوا لـێی ڕازی بـێ خەلیفـەی مسـوڵمانانو موعـاویـە خـوا لـێی خۆشـبێ کە لە عـەلی هەڵگەڕابۆوە لەگـەڵ ئەهلـی شـام، وە هەڵەش بوو لە هەڵوێسـتەکەیـدا) عومـەری کوڕی عەبدولعەزیز، گوتی: ئەو خوێنە

١) محاسـن تأويل: ج٤، ص٣٩٦.

کە ڕژاوە لەو جەنگەدا، خوا دەستی منی لێ پاراستوە، ئێستا حەز ناکەم زمانی خۆمی پێ پیس بکەم، واتە: حەز ناکەم بچمە نێو ئەو باس و خواسانەوە.

کە لێرەدا دیارە ئەو هەڵوێستەی عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە حاڵێکدا ڕاستە، بەڵام بۆ حاڵێکی دیکە مەرج نیە ڕاست بێ، لە حاڵێکدا ڕاستە کە قسەکردن لەوبارەوە سەربکێشێ بۆ زەمکردنی هاوەڵان خوا لێیان ڕازی بێ و شکاندنیان، وەك شیعە دەیکەن، بەڵام لەلایەکی دیکەوە ڕاست نیە، ئەگەر قسەکردن لەو جەنگانەو لەو ڕووداوانەدا، بۆ ئەوە بێ کە پەندیان لێ وەربگرین، وە کێ لەسەر هەق بووە؟ وە کێ لەسەر ناهەق بووە؟ چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُولِي الْأَلْبَابِ ...﴿١١١﴾ ﴾یوسف، واتە: لە بەسەرهاتی پێشووواندا پەند هەیە بۆ خاوەن عاقڵان، جا پێشووان هاوەڵان بن خوا لێیان ڕازی بێ، میللەتانی پێشوو بن، ئەوانی دیکە بن، ئێمە پێویستە لە بەسەرهاتەکانیان دەرس و پەند وەربگرین: ﴿ وَكُلًّا نَّقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُؤَادَكَ ...﴿١٢٠﴾ ﴾هود، واتە: بەسەرهاتی پێغەمبەرانت بۆ دەخوێنینەوە، تاکو دڵتی پێ بچەسپێنی، واتە: بزانی ئەوان چییان کردوە، ئەو هەڵە کەموکوڕییانە کە قەومەکانیان کردوویانە، وە خاڵە ئیجابییەکانیان چی بوون و بیزانی.

## دەیەم: پرسیارکردنی عینادیی و بەزانەدن:

واتە: پرسیار بکرێ بەس بۆ ئەوە کە کەسی بەرانبەر دەستەوستان بکەی و بیبەزێنی و بێ قسەی بکەی، خوای کاربەجێ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُعْجِبُكَ قَوْلُهُ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيُشْهِدُ اللَّهَ عَلَىٰ مَا فِي قَلْبِهِ وَهُوَ أَلَدُّ الْخِصَامِ ﴿٢٠٤﴾ ﴾البقرة، واتە: لە خەڵکی هەیە کە وەختێ باسی ژیانی دنیا دەکات، قسەکەی سەرسامت دەکات، وە خواش بە شایەد دەگرێ لەسەر ئەوەی کە لە دڵیدایە، هەرچەندە درۆش دەکات، وە ئینسانێکی زۆر موناقەشەکەرو زۆر

نەسەلمێنو سەرخەرە.

جا پێغەمبەر ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿أَبْغَضُ الرِّجَالِ إِلَى اللهِ الأَلَدُّ الْخَصِمُ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد بِرقم: (٢٥٧٤٥)، وَالبُخَارِيُّ بِرقم: (٣٤٥٧)، وَمُسْلِمٌ بِرقم: (٦٧٢٢)، وَالتِّرمِذِيُّ بِرقم: (٢٩٧٦) وَقَالَ: حَدِيثٌ حَسَنٌ، وَالنَّسَائِيّ بِرقم: (٥٤٢٣)، وَابْنُ حِبَّانَ بِرقم: (٥٦٩٧)}، واتە: بوغزێنراوترینی پیاوان لەلای خوا، ئەوانەن کە زۆر موناقەشە دەکەنو، زۆر بە دوای شت دەکەون، ناسەلمێنو کەللە ڕەقن، هەندێ کەس هەیە کە شتێك باس بکرێ، هەمیشە لای عەکسەکەی دەگرێ، بڵێی ماست سپییە، دەڵێ: ڕەشە! بڵێی: ئەم زستانە باران زۆرە، دەڵێ: نەخێر زۆر کەم باریوە، ئاوا هەمیشە پێی خۆشە لای عەکس بگرێ، ئەو جۆرە کەسانە نەگونجاون لەنێو کۆمەڵگاداو، خەڵك کەیفی پێیان نایەت، بۆیە پێغەمبەریش دەفەرموێ: ﷺ ئەوانەی خوای بەرز زۆر دەیانبوغزێنێ، ئەو جۆرە کەسانەن.

ئنجا لە کۆتایی ئەو مەسەلەیەدا دەڵێم: فەرموودەیەکمان هەیە کە بە ڕاستی بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئینسان شارەزای شتێك نەبوو، دەبێ بپرسێ فەرموودەکەش ئەوەیە: ﴿عَنْ جَابِرٍ قَالَ خَرَجْنَا فِي سَفَرٍ فَأَصَابَ رَجُلاً مِنَّا حَجَرٌ فَشَجَّهُ فِي رَأْسِهِ، ثُمَّ احْتَلَمَ فَسَأَلَ أَصْحَابَهُ فَقَالَ: هَلْ تَجِدُونَ لِي رُخْصَةً فِي التَّيَمُّمِ؟ فَقَالُوا: مَا نَجِدُ لَكَ رُخْصَةً، وَأَنْتَ تَقْدِرُ عَلَى الْمَاءِ فَاغْتَسَلَ فَمَاتَ، فَلَمَّا قَدِمْنَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ أُخْبِرَ بِذَلِكَ، فَقَالَ: (قَتَلُوهُ قَتَلَهُمُ اللهُ أَلاَّ سَأَلُوا إِذْ لَمْ يَعْلَمُوا فَإِنَّمَا شِفَاءُ الْعِيِّ السُّؤَالُ إِنَّمَا كَانَ يَكْفِيهِ أَنْ يَتَيَمَّمَ وَيَعْصِرَ، عَلَى جُرْحِهِ خِرْقَةً ثُمَّ يَمْسَحَ عَلَيْهَا وَيَغْسِلَ سَائِرَ جَسَدِهِ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُد بِرقم: (٣٣٦)، وَقَالَ الشيخ الألباني: حسن}، واتە: جابیر خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ: کۆمەڵێك بووین بە سەفەر چووین، پیاوێك لە ئێمە بەردێکی بەسەری کەوت (ئایا لە جەنگدا بووە، ئایا بەردێك بەربۆتەوە، یەکێك بەردی هاوێشتوە سەری شکا بێ، دیارە سەر شکانەکەی زۆر بووە) دواییش ئیحتیلامی بوو، (دیارە شەوی بەسەردا هاتوە، هەر بەسەر شکاویی ئیحتیلامی بووە) پرسیاری لە هاوەڵەکانی کرد: ئایا مۆڵەت هەیە تەیەمموم بکەم؟ ئەوانیش

گوتیـان: مادام توانای بەکـارهێنانی ئاوت هەیــەو ئاوی لێیە، پێمان وانیـە مۆڵــەتی تەیەممومــت هەبـێ، ئـەویش خـۆی شـۆرد بـۆ (ئـەوەی بـێ نوێژییەکــەی لـەخۆی دەربکـات)، لە ئەنجامدا مرد، کاتێك چووینەوە لای پێغـەمبەری خـوا ﷺ هـەواڵی پێـدرا لەوبـارەوە، فـەرمووی: کوشـتیان، خـوا بیانکـوژێ، ئەگــەر نەیانـدەزانی بـۆ نەیانـدەپرسـی، (کـە نەیانـدەزانی دەبـوو بـە نەزانیی فتوایـان بـۆ نەدابـا، لـە ئەنجـامی فتواکـەی ئەوانـدا ئـەویش بمـرێ) چارەسـەری نـەزانین بریتیــە لـە پرسـیارکردن، ئنجا دوایـی باسـی کـرد فـەرمووی: ئەوەنـدەی بـەس بـوو، تەیەممـوم بکـات، وە برینەکـەی ببێچـێ بـە پەڕۆیـەك، دوایـی دەسـتی تـەڕی پێـدا بێنـێ، وە بەدەنی دیکەی کە زەرەری نیە شۆردبای، بەوەنـدە شـتەکەی تـەواو دەبـوو، کەواتـە: پێویسـتی بەوە نەدەکرد کە خۆی بشـواتو برینـەکـەی تــەڕ بــێو لــێی ئـاوەدز بـێو سـەرەنجـام بمـرێ.

**مەسـەلەی دووەم:** کــە دەفـــەرموێ: ﴿وَإِن تَسْـَٔلُوا۟ عَنْهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلْقُرْءَانُ تُبْدَ لَكُمْ﴾، ئەو شـتانەی کە دەتانەوێ لەبارەیانـەوە بپرسـن، یان ئـەو پرسیارانەی کە هەتانن، ئەگــەر لـە کاتێکدا کە قورئان دێتـە خـوار، پرسیارەکانتان بکــەن، بۆتـان ڕوون دەبێتــەوە، ئەمـە چـی لـێ وەردەگیـرێ؟ ئەمـە لێـی وەردەگیـرێ کـە هەرچی ئێمە پەکمـان لەسـەری کـەوتوە، لـە بـواری دینـداریی‌و دنیـاداریی دا، قورئـان لـە دوو توێی خۆیـدا ڕوونی کردۆتــەوە، یاخود قورئـان حەواڵەی پێغەمبـەری ﷺ کـردوە، بەڵام کێ دەتـوانێ ئـەوە لـە قورئان تێبگـات؟ بێگومـان زانایـان دەتوانـن، بۆیــەش خـوا دەفــەرموێ: ﴿فَسْـَٔلُوٓا۟ أَهْلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٤٣﴾﴾ النحل، واتـە: لە شارەزایان بپرسـن ئەگەر نـازانن، لە زانــایان بپرســن، بـەڵام گـرنگ ئەوەیـە ئـەو ڕسـتە قورئـانییە، ئـەوە دەگــەیەنێ کـە مسـوڵمانـان دەبـێ هەوڵــبدەن لەبــەر ڕۆشـنایـی قورئانـدا وەڵامـی پرسـیارەکانیان دەسـتکەوێ، وە ئـەوەی کـە قورئـان فەرموویەتی، ئیکتیفـای پـێ بکـەن، قورئـان چەنـدی فـەرمووە، ئـەوانیش بەوەنـدە واز بێنـن، بـۆ وێنــە: خــوای پەروەردگــار باسـی دەسـتنوێژ دەکـات، وەکـو لـە دەرسـەکانی ڕابـردوو باسـمان کـرد، هـەر لـەم سـوورەتی (المائدة)دا دەفـەرموێ:

ئەگەر هەڵسان بۆ نوێژێ دەموچاوتان بشۆن، لەگەڵ ئانیشکتان، مەسحی سەرتان بکەنو، پێیەکانتان بشۆن تەواو، ئیدی ئەوانەی زۆر وردی دەکەنەوەو زۆر قووڵی دەکەنەوەو بە زەحمەتی دەخەن، لەڕاستییدا پێچەوانەی ئەوەیە کە خواو پێغەمبەری خوا ویستوویانە، یانی: خوای پەروەردگار باسی دەستنوێژی کردوە، لە ئایەتێکدا بەڵکو لە بەشێك لە ئایەتێکدا، بەڵام ئێستا زانای وا هەیە موجەللەدێکی گەورەی دەربارەی دەستنوێژ داناوە، بەڵێ ئەو شتەی زۆر پێویستی بە لێکۆڵینەوە نەبووە، زۆریان لێکۆڵینەوە دەربارە کردوە، وە ئەوەی کە پێویستی بە لێکۆڵینەوەو توێژینەوە هەیە، کە ئەو شتانەن شەریعەت بە هێڵی گشتیو بە ئاماژە باسیکردوون، دەبوو ئەوانە زۆریان لێ بکۆڵرێتەوە، بۆئەوەی ئێستا مسوڵمانان پەکیان نەکەوێ لە بواری دەوڵەتدارییو حوکمڕانیی دا.

**مەسەلەی سێیەم**: کە دەفەرموێ: ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَا﴾، خوا چاوپۆشیی لەو شتانە کردوە، ئایا ئەو شتانە مەبەست پێیان چییە؟ سێ واتای هەن:

١/ (عَنِ الأَسْئِلَة) واتە: ئەو پرسیارانەی پێشێ کردووتانن، خوا چاوپۆشیی لێیان کردووەو لەسەر ئەوە سزاتان نادات، چونکە پێش ئەوەی ئەم ئایەتە بێتە خوارێ، ئەو پرسیارانەتان کردوون، بەڵام لە دوای ئەوەی کە خوا فەرموویەتی: شتێك مەپرسن کە پێویستتان پێی نیە، یاخود پرسیاری بێجێ مەکەن، لەمەودوا هەر کەسێك پرسیاری بێجێ بکات، ئەوە دیارە لێبوردنی خوا نایگرێتەوەو، هەڵەیەکەو گوناهێکەو لەسەر تۆمار دەکرێ.

٢/ (عَنِ الأشياء) ﴿عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَا﴾، ڕاناوەکەی دەچێتەوە بۆ (أشياء) واتە: ئەو شتانەی کە پرسیارتان لەبارەوە کردوون، خوای بەرز چاوپۆشیی لەوانە کردوە، بەڵام لەمەودوا دەربارەی شتی دیکە مەپرسن.

٣/ (أي تركها عفواً) واتە: خوا ئەو شتانەی چاوپۆشیی لێکردوەو ڕوونی نەکردوونەوەو لێیان گەڕاوە، ئێوەش لێیان گەڕێنو، هەڵیان مەکۆڵن، لەوبارەوە ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿إِنَّ أَعْظَمَ الْمُسْلِمِينَ جُرْماً مَنْ سَأَلَ عَنْ شَيْءٍ لَمْ يُحَرَّمْ فَحُرِّمَ مِنْ أَجْلِ مَسْأَلَتِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بِرقم: (٧٢٨٩)}، پێغەمبەر ﷺ

دەفەرموێ: مسوڵمانێك كە گوناهی لە هەموو كەس گەورەترەو مەزنتـرە، كەسێكە كە پرسـیار دەربارەی شـتێك دەكات كە پێشـتر قەدەغە نەكـراوە، بـەڵام بەهـۆی پرسـیاركردنەكەی ئەوەوە، قەدەغـە دەكرێ، یانی: شـتێك هەیە خوای پـەروەردگار لێی گەڕاوە، مسوڵمانێك دەپرسێ: ئەو شتە چۆنە؟ هێندەی هەڵدەكۆڵـێ، شـەریعەت دەڵـێ قەدەغەیـە، بـەهۆی پرسـیاركردن‌و لێكۆڵینـەوەی ئـەوەوە قەدەغــە دەكـرێ، ئـەوە گونـاهێكی زۆر گـەورەی كـردوە، بۆچـی؟ چـونكە شـەریعەت پێـی خـۆش نیـە ژمـارەی قەدەغـەكراوان زۆر بـێ، پێـی خۆشــە ژمـارەی حــەڵاڵەكان‌و ژمــارەی ڕێ پێدراوەكان زۆر بێ، بۆئـەوەی دینداریی‌و دنیـاداریی بۆ خـەڵك ئاسـان بێ.

**مەسـەلەی چـوارەم**: كـە دەفـەرموێ: ﴿ قَدْ سَأَلَهَا قَوْمٌ مِّن قَبْلِكُمْ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴾، كۆمەڵێك لە پێش ئێوەشدا ئەو پرسیارانەیان كردن، یاخود ئـەو شــتانەیان پرسـین، یـان ئـەو شــتانەیان داوا كـرد، چـونكە ﴿ قَدْ سَأَلَهَا ﴾، دەگونجـێ بە مانـای داوایانكرد (طَلَبَهَا)بـێ، وە دەشـگونجێ بـە مانـای: لەبارەیانـەوە پرسـیان: (سَأَلَهُ عَنْهَا)بـێ، واتـە: شـتەكانیان داوا كـرد، یـاخود ئـەو پرسـیارانەیان لەبارەیانــەوە كــرد، ﴿ ثُمَّ أَصْبَحُواْ بِهَا كَٰفِرِينَ ﴾، دوایـیش بــە وەڵامــەكان كـافر بـوون، واتە: بڕوایان پـێ نەكردن، یاخود بـە هــۆی ئـەو شــتانەوە كە بۆیـان ئاشكرا كــرا، یـان ئـەو شـتانەی كـە داوایـان كردبـوو، داواكارییـەكانیان كـە جێبـەجێ كـران، ئەوانیـش بڕوایان پـێ نەهێنـان، بەهــۆی ئـەوەوە كــافر بوون، وەك قـەومی صــاڵح داوا لــە پێغــەمبــەر صـاڵح ﷺ دەكـەن كـە حوشـتــرێكیان بـۆ لــە شـاخێكی ڕەق دەربهێنـێ‌و بەچكەیەكیشـی لەگەڵـدابێ! ئـەویش لـە خــوا دەپاڕێتـەوە حوشـترێك لـە بـەردێك دێتـە دەرێ، وە بەچكەیەكیشــی لەگەڵـدا دەبـێ، دوایـیش لەجیـاتی ئـەوەی ئیمــانی پێبێنــن، كـە ئــەوە موعجـیــزەی صـاڵح ﷺ پێغــەمبەری خــوایە (لــە بەردێكــی ڕەق حوشــتــرێك بێتــە دەرێ بــە بەچــكەوە، كــە هــەموو خــەڵكی ئــەو عەشــیــرەتە دەیاندۆشــی‌و بـایی هــەموویان شـیری تێدا بـوو، بــەڵام یــەك ڕۆژیـش

دەبووایە تەنیا ئەو لە ئاوی کانیەکە بخواتەوە، وەك لە ئایەتەکاندا باس دەکات)[١] کەچی هەڵسان ڕۆژێك پەل بەستیان کردو سەریان بڕی، خوای دادگەریش غەزەبی لێگرتن، کە ئەو موعجیزەیە کە خوای باڵادەست دابووی بە صالح، لەجیاتی ئەوەی ڕێزی لێبگرن، وە ئیمانی پێ بێنن، هەڵسان ئاوایان لێکرد، هەروەها ئەو سفرە (مائدة)یەی کە دوایی لە دەرسەکانی داهاتوودا باسی دەکەین، ئەو سفرەو خوانە پڕخواردنەی کە حەوارییەکان داوایان لە عیسا ﷺ کرد بۆیان لە خوا بپاڕێتەوە: سفرەیەکیان لە ئاسمانەوە پڕ لە خواردن بۆ بێتە خوارێ، ئەویش داوای کردو بۆیان هاتە خوار، هەندێك لە زانایان دەڵێن: دوایی بڕواشیان پێ نەکرد، ئەوە مانای وایە بووە هۆی کافربوونیان، یاخود ئەو موعجیزەو نیشانانەی کە بە مووسا ﷺ درابوون ﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ ﴾ الإسراء، ئەو نۆ موعجیزەو نیشانانەی بە مووسا درابوون، کە حەوتیان لە سوورەتی (الأعراف)دا باسکراون، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَـٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ ۗ أَلَآ إِنَّمَا طَـٰٓئِرُهُمْ عِندَ ٱللَّهِ وَلَـٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٣١﴾ وَقَالُوا۟ مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَـٰتٍ مُّفَصَّلَـٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟

---

١) وەك خوا ﷻ فەرموویەتی: ﴿ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَـٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ ﴾ الشعراء.

قَوۡمٗا مُّجۡرِمِينَ ١٣٣﴾الأعراف، دووانیشیان گۆچانەکەیو دەستی ڕاستی بوون، کەچی دوایی ئەوە بووە هۆی ئەوە کە ئالی فیرعەون بڕوایان پێ نەکردن، خوای بالادەستیش بە هۆی ئەوەوە غەزەبی لێگرتن.

کەواتە: ئێوەش هەندێك داواکاریی مەکەن، کە دوایی شتەکانتان بۆ بێنە دیو ئێوەش پێوەیان پابەند نەبن، ئەوەش ببێتە هۆی کافربوونتان، یاخود هەندێك پرسیار مەکەن کە ئەگەر وەڵامەکەتان دەستکەوێتەوە بۆتان خراپ بێ، واتە: بە دوای شتێك مەکەون کە پەکتان لەسەری نەکەوتوە.

**مەسەلەی پێنجەم**: کە دەفەرموێ: ﴿مَا جَعَلَ ٱللَّهُ مِنۢ بَحِيرَةٖ وَلَا سَآئِبَةٖ وَلَا وَصِيلَةٖ وَلَا حَامٖ﴾، دیارە ئێمە پێشتر باسمان کرد، کە ئەو شانە لە چییەوە هاتوون: ﴿بَحِيرَةٖ، سَآئِبَةٖ، وَصِيلَةٖ، حَامٖ﴾، کە ئەوانە چوار جۆرە ئاژەڵ بوون، بە زۆریی حوشتر بوون، وە دەگونجێ ئاژەڵی دیکەش بووبن، مانگاو مەڕو بزن، کافرەکان بە چەند وەسفێکەوە ئەو چوار جۆرە ئاژەڵەیان لەخۆیان قەدەغە کردبوون، بێئەوەی هیچ بەڵگەیەکیان لەوبارەوە هەبێ.

دیارە ئەو قەدەغەکردنەش بەبێ بەڵگە خوای پەروەردگار زۆر زۆری پێ ناخۆشە، وەك لە چەند شوێنان ئەوە لە قورئاندا هاتوە بۆیە لێرەشدا دەفەرموێ:
﴿وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ وَأَكۡثَرُهُمۡ لَا يَعۡقِلُونَ﴾، بەڵام ئەوانەی بێبڕوان درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، وە زۆربەیان نازانن‌و نەفامن، ئەگەرنا دەبوو شتێك کە خوا حەلاڵی کردوە، لەخۆیانی قەدەغە نەکەن.

لەوبارەشەوە ئەم فەرموودەیە هەیە، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: ﴿رَأَيْتُ عَمْرَو بْنَ عَامِرٍ الْخُزَاعِيَّ يَجُرُّ قُصْبَهُ فِي النَّارِ وَكَانَ أَوَّلَ مَنْ سَيَّبَ السَّوَائِبَ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٨٧٧٣)، وَالبُخَارِيُّ برقم: (٤٦٢٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٧١٢٢)}، واتە: عەمری کوڕی عامیری خوزاعییم بینی لە ئاگری دۆزەخدا، ڕیخۆڵەکانی لە دوای خۆی ڕادەکێشان، یەکەمین کەس بوو کە (سائبة)ی دانا،

(واتە: ئەو جۆرە حوشترانە كە دەبێ وێڵ بكرێن‌و بەكارنەهێنرێن‌و، سوودیان لێ نەبینرێ، بە بڕو بیانووی نامەنتیقیی).

**مەسەلەی شەشەم**: كە دەفەرموێ: ﴿وَلَٰكِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ وَأَكْثَرُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ﴾، بەلام ئەوانەی بێبڕوان درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، وە زۆربەشیان نافامن، ئەمە ئەوەی لێ وەردەگیرێ كە حەرامكردن بە ناوی ئایینی خواوە، بە ناوی خواوە، شتێك كە خوا حەڵاڵی كردوە، قەدەغە بكەی ئەوە درۆ هەڵبەستنە بە ناوی خواوە، وە نیشانەی نەفامیی‌و نەزانییشە، كەواتە: مسوڵمانان دەبێ وریا بن، هەندێ كەس هەر لەخۆوە زۆر لەوزەت لەوە دەكات هەمیشە بڵێ: ئەوە حەرامە، ئەوەش حەرامە، دەوری خەڵكی بە حەرام دەتەنێ، وادەزانێ ئەوە دینداریی‌و تەقوایە، دوایی خەڵك بڵێن: ماشاء الله زۆر بە تەقواو دیندارە! حەڵاڵی نەهێشت، هەمووی حەرام كرد! بەلام نا، ئەوە لەڕاستییدا نیشانەی نەفامیی‌و نەزانییە، چونكە خوا ﷻ عەبدەكانی خۆی عاسێ ناكات، وە خوا هیچ شتێكی لە خەڵك قەدەغە نەكردوە، مەگەر لەبەر ئەوە كە زیانی لێ دەكەن، ئەگەرنا هیچ شتێكی بەكەڵكی لە خەڵك قەدەغە نەكردوە، هەرچی خوا قەدەغەی كردوە، یان بۆ جەستەیان زەرەری هەیە، یان بۆ عەقڵیان، یان بۆ ڕووحیان، یان بۆ تاك، یان بۆ خێزان، یان بۆ دنیا، یان بۆ قیامەت، یان لە هەموو ڕووەكانەوە زیانبەخشە، وە هەرچی كە بۆی حەڵاڵ كردوون هەموو ئەو شتانە سوود بەخشن، كەواتە: نە دینداریی‌و پارێزكاریی‌و نە عەقڵ‌و مەنتیقە، كە لەخۆڕا بازنەی قەدەغەكان لە خەڵك فراوان بكەین، بە بیانووی ئەوەی كە دەمانەوێ خەڵك خوا لێی ڕازی بێ‌و دینداریی باش بكەن، بۆیە خوای پەروەردگار لە زۆر شوێنان لە قورئاندا باسی ئەوە دەكات، بۆ وێنە دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُواْ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾﴾ النحل، واتە: وە بەوەی كە زمانتان وەسفی دەكات هەر لەخۆوە مەڵێن: ئەمە حەڵاڵەو ئەمە حەرامە! بۆئەوەی كە بە ناوی خواوە درۆ هەڵبەستن، بێگومان

ئەوانەی کە درۆ بە ناوی خواوە هەڵدەبەستن، سەرفراز نابن.

یان لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرموێ: ﴿ قُلْ أَرَءَيْتُم مَّآ أَنزَلَ ٱللَّهُ لَكُم مِّن رِّزْقٍ فَجَعَلْتُم مِّنْهُ حَرَامًا وَحَلَٰلًا قُلْ ءَآللَّهُ أَذِنَ لَكُمْ ۖ أَمْ عَلَى ٱللَّهِ تَفْتَرُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾، واتە: بڵێ: ئایا ئەو ڕزقە دەبینن کە خوا بۆی ناردوونە خوار، ئێوەش لە خۆوە هێندێکی بە حەڵاڵو هێندێکی بە حەرام دادەنێن، بڵێ: ئایا خوا فەرمانی پێکردوون؟ یان بە ناوی خواوە درۆ هەڵدەبەستن؟ یانی: لە خۆڕا شت لە خەڵك قەدەغەکردن، درۆ بە ناوی خواوە هەڵبەستنە، وەك من لە کتێبی: (جەژنو یادو بۆنەکانو هەڵسەنگاندنێك)دا باسم کردوە، کە گوتت: ئەوە حەرامە، دەبێ بەڵگەیەکت هەبێ، لە قورئانو لە سوننەتدا، دەبێ بەڵگەیەکی ڕوونو بێ چەندو چوونت هەبێ، ئەمما لەبەرئەوەی لەگەڵ میزاجی تۆ نایەتەوە، یان تۆ پێت چاك نیە، دەتوانی بڵێی پێم باش نیە، بەڵام ناتوانی لە خۆڕا بڵێی: ئەوە شتێکی حەرامو خراپە، چونکە ئەوە عادەتی بێبڕوایەکانە، وە نیشانەی نەفامیی و نەزانییشە.

**مەسەلەی حەوتەمو کۆتایی:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا۟ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ قَالُوا۟ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ۚ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾، واتە: وە ئەگەر پێیان بگوترێ: وەرن بۆ لای شتێك کە خوا ناردوویەتە خوار، واتە: بۆ لای قورئان ﴿ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ ﴾، وە وەرن بۆ لای پێغەمبەر، ﴿ قَالُوا۟ حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ ﴾، دەڵێن: ئەوەمان بەسە کە بابو باپیرانمان لەسەر بینیوە، ئێمە لەسەر ڕێی پێشینانی خۆمان دەڕۆینو نایەین بۆ شوێنکەوتنی وەحی بەرجەستە لە قورئانی خواو لە سوننەتی پێغەمبەری خوادا ﷺ و هەر لەسەر ڕێچکەی پێشینان دەڕۆین، ئنجا خوا دەفەرموێ: ﴿ أَوَلَوْ كَانَ ءَابَآؤُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴾، ئەدی ئەگەر

باب‌و باپیرانیان‌و پێشینانیان هیچیشیان نەزانیبێ‌و بە ڕێشیان نەزانیبێ، دەبێ هەر كوێرانە بە دوایان بكەون؟ ئایا ئەگەر بۆخۆشیان بە ڕێیان نەزانی بێ، دەبێ تۆ هەر بەدوایان بكەوی؟ بۆ زانیارییتان ئەو حەقیقەتە لە چوار شوێنان لە قورئاندا هاتوە:

١) لە سوورەتی (البقرة)دا هاتوە كە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّبِعُوا مَا أَنزَلَ اللَّهُ قَالُوا بَلْ نَتَّبِعُ مَا أَلْفَيْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا أَوَلَوْ كَانَ آبَاؤُهُمْ لَا يَعْقِلُونَ شَيْئًا وَلَا يَهْتَدُونَ ﴿١٧٠﴾﴾.

٢) وە لە سوورەتی (المائدة)دا ئەوەی كە ئێستا خوێندمانەوە: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ قَالُوا حَسْبُنَا مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ آبَاءَنَا﴾.

٣)- وە لە سوورەتی (الزخرف)دا دەفەرموێ: ﴿بَلْ قَالُوا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّهْتَدُونَ ﴿٢٢﴾﴾.

٤)- وە هەر لە ئایەتی لە دوای ئەودا دەفەرموێ: ﴿وَكَذَٰلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءَنَا عَلَىٰ أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَىٰ آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ ﴿٢٣﴾﴾، لەو چوار شوێنەدا ئەم بابەتە هاتوە، كەواتە: شوێنكەوتنی كوێرانەی پێشینان ئاستەنگ‌و لەمپەرێكی گەورەی ڕێگای دینداریی‌و مسولْمانەتییە، وە عادەتی كافرەكانیشە، جا ئەوە بۆیە وادەڵێم، چونكە زۆرجار گەنجێكی عاقڵی ڕووح سووكی پاك، پیاوێكی بەتەمەن، یان مەلایەك، یان شێخێك، یان حاجییەك دەبینێ شتێك دەكات، پێی وایە سوننەتە، ئەو گەنجەش دیارە شارەزایە‌و شتێكی خوێندۆتەوە دەڵێ: ئەوە سوننەت نیە، بۆ وێنە: بە دەستی چەپ تەسبیحات دەكات، لە حەدیسی پێغەمبەردا ﷺ هاتوە

كە پێغەمبەری خوا دەستی ڕاستی بۆ شتە پاكەكان بەكارهێناوە، شتێكی بە كەسێك دابێ یان لێی وەرگرتبێ، یان بۆ تۆقەكردن، بۆ سەلام كردن، بۆ شتی موحتەرەم دەستی ڕاستی بەكارهێناوە، وە بەپێچەوانەوە دەستی چەپی بەكارهێناوە بۆ تارەتگرتن، بۆ لووت سڕین، بۆ ئەو شتانە بەكارهێناوە، بۆیە تەسبیحاتو زیكری خوا ژماردن بە دەستی چەپ گونجاو نیە، چونكە من زۆر ئەوەم بینیوەو جاری وابووە بیستوە، كە گەنجێك ئاوا گوتوویەتی: خاڵە گیان! مام حاجی گیان! فلان شتە مەكە، چونكە ئەوە پێچەوانەی سوننەتە، كەچی ئەو تووڕە بووە، بۆچی؟ چونكە وای بینیوەو لە ڕابردوودا هەر وابووە، زۆر لە خەڵكی مسوڵمان ئێستا ئەو عادەتە غەڵەتەی كافرەكانیان كردۆتە عادەتی خۆیان، شتێكیان پێ بگوترێ، تەماشا ناكەن داخۆ چی گوتراوە، وەك عەرەب دەڵێن: (أُنظُروا إِلى مَا قِيل وَلاَ تَنْظُروا مَنْ قَالَ) واتە: تەماشا بكەن چی دەگوترێ، تەماشا مەكەن كێ دەیڵێ، گەنجێكە هەرچەندە لە تۆ كەم تەمەنترە، بەڵام ئەگەر قسەكەی هەقە، لێی وەربگرە! بەڵام ئەگەر ئەوە بكرێتە بەڵگەو بیانووی وەرنەگرتنی شتێكی هەقی بەڵگەدار كە: وەختی خۆی وابووەو پێشینان وابوون!! بێگومان عادەتی كافرەكان بووە، بەڵام مسوڵمانان هەمیشە عەقڵیان كراوەیە، وە عەقڵیان ئازادە، وە ئازان، چ شتێ تازەیە، مادام بەڵگەدار بێ، وە بە سوودو بە كەڵك بێ، بەرژەوەندیی تێدابێ، وەری دەگرن، با پێشتریش ئەو شتە نەبووبێو خەڵك پێوەی ڕانەهاتبێ، بەڵێ لەبەرئەوەی كە پێشینان وایانكردوە، با غەڵەتیش بێ، هەر شوێنیان بكەون، مسوڵمانان بەو شێوەیە نین، ئەوە عادەتی موشریكەكانو كافرەكانە كە خوا ڕەخنەیان لێدەگرێ، لە چوار ئایەتان لە قورئاندا.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

# دەرسی بیست و سێیەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسەمان لە ئایەتی ژمارە (١٠٥ تا ١٠٨) واتە: چوار ئایەتی موبارەك دەگرێتەوە، لەو چوار ئایەتەدا خوا ﷻ سەرەتا بۆ جاری پازدەیەم لەم سورەتەدا، دیارە پاشان بۆ جاری شازدەیەمیش بانگی مسوڵمانان دەكات، بە نازناوی ئیمان، وە پێیان دەفەرموێ: كە لەخۆیان وریا بن، چونكە ئەگەر خۆیان ڕێی ڕاستگرتوو بن، گومڕابووان زیانیان لێ نادەن، پاشان خوا ﷻ دوای ئەوەی كە بۆ جاری شازدەیەمو كۆتایی لەم سورەتەدا دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾، باسی وەصیەتكردنی كەسێك دەكات كە ڕێبوارەو سەرو حەدی مەرگیەتی، وە نیشانەكانی مەرگ لێی دەركەوتوون، كە دەبێ وەصیەت بكات بۆ دوو شایەدی مسوڵمانی دادگەر، دوو كەس بە شایەد بگرێ، مسوڵمانو دادگەر بن، دوایی باسی دادگەریی دەكەین، یانی چی؟ بەڵام ئەگەر مسوڵمانی چنگ نەكەوتن، شوێنەكەی وابوو مسوڵمانی لێ نەبوونو هەر كافری لێبوون، وەسیەتەكەی بۆ دوو كەسی دیكەی نامسوڵمان دەكات، وە پێیان ڕادەگەیەنێ (واتە: خوای پەروەردگار بە ئیمانداران ڕادەگەیەنێ) ئەگەر لەبارەی شایەدییدانی ئەو دوو نامسوڵمانەوە كەوتنە دوودڵییەوە، ئەوە با سوێندیان بدەن دوای نوێژ (هەندێك دەڵێن: نوێژی عەسرە، هەندێك دەڵێن: نوێژی بەیانیە)، بە هەر حاڵ لە دوای نوێژ ڕایاندەگرنو سوێندیان دەدەن، كە ناپاكییان نەكردوە لەو شتەدا كە ئەو كەسەی وەصیەتی بۆ كردوونو دوایی مردوە، ئەو شتانەی پێی داون، هەر ئەوەندە بوونو خیانەتو ناپاكییان نەكردوە، بەڵام كە دوایی دەركەوت خیانەتیان كردوە، ئەوە دەبێ دوو كەسی دیكە لە خزمانی مردووەكە شایەدیی بدەن، یاخود سوێند بخۆن كە شایەدییو سوێندی ئەوان لە هی پێشووەكان ڕاستترە، ئنجا دوای ئەوە ئەو هەقەی

کە خزمانی مردووەکــە داوای دەکــەن، دەبــێ لـەو دوو نەفەرەی دیکە وەربگـیرێتەوە، مادام بە بەڵگـە لەسـەریان ئیسـپات بـێ.

وە پاشـان خـوای پـەروەردگار باســی حیکمـەتی ئـەو حوکمـە شـەرعییە دەکـات، کـە بریتیـە لـە شـایەدییـدانی ڕاســتو ڕێـك، وە ترسـان لـە ڕەتکــرانەوەی شایەدیی، وە ســویند خــواردنی ئەوانــەی کــە بــە ناڕاســتیی شـایەدیی دەدەنو، وەصـیەتەکە چـاك جێبـەجــێ ناکــەن، بەهــۆی ئــەوەوە، کــە بەڵگــەو نیشــانە لەســەر ناڕاســتییان دەرکەوتــوە، وە ئـەو چـوار ئایەتـە، بەتایبــەتی ئـەو ســێ ئایەتـەی کـە باسـی وەصـیەت دەکــەن، زۆر لـە زانــایانو توێــژەرەوانی قورئـان دەڵێن: قورسـترین ئایـەتن لـە ڕووی مانــاوەو ئاڵـۆزییەکی زۆر هەیــە لە شـێوەی ماناکردنیــاندا، کـە ئێمـە خـوا پشـتیوان بـێ، وای ڕوون دەکەینــەوە، ئەو ئاڵـۆزییــە بەو شێوەیە نەمێنــێ.

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ إِلَى
ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٠٥﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ
بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ
مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ تَحۡبِسُونَهُمَا
مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ
وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ ﴿١٠٦﴾ فَإِنۡ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسۡتَحَقَّآ
إِثۡمٗا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَحَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلۡأَوۡلَيَٰنِ فَيُقۡسِمَانِ
بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعۡتَدَيۡنَآ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿١٠٧﴾ ذَٰلِكَ
أَدۡنَىٰٓ أَن يَأۡتُواْ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجۡهِهَآ أَوۡ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيۡمَٰنُۢ بَعۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ
وَٱسۡمَعُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾

# ماناى وشه به وشەى ئايەتەكان

((ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! وریای خۆتان بن، (خۆتان ڕێکوپێكو چاك بکەن) ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاستگرتوو بن، ئەوانەی گومڕا بوون، زیانتان لێ نادەن، گێڕانەوەی هەمووانتان بۆ لای خوایە، ئنجا بەوەی کردووتانە هەواڵتان پێدەدات ﴿١٠٥﴾ ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! چۆنیەتی شایەدیی دانی نێوان خۆتان لەکاتێکدا یەکێکتان مردنی دەگاتە سەری، لە کاتی وەصیەت کردندا، ئەوەیە کە دوو کەسی خاوەن دادگەرییتان، یان دووانی دیکە لەوانی دیکە (نامسوڵمانان) شایەدیی بدەن، لە کاتێکدا کە بە زەویدا دەڕۆن و بەڵای مردنتان تووش دەبێ، ئنجا هەر کات لێیان دوودڵ بوون (کە لە شایەدیی دانەکەیاندا ڕاستیان نەکردبێ) پاش نوێژ ڕایانبگرن (وسوێندیان بدەن) با سوێند بە خوا بخۆن کە بەو شایەدییدانەمان نرخێکی کەم ناکڕین، هەرچەندە بابای شایەدیی لەبارەوەدراو خزمیش بێ، وە شایەدییدانی خوا (شایەدییەك کە خوا فەرمانی پێکردوە بدرێ) نایشارینەوە، ئەگەرنا بێگومان ئێمە لە گوناهبارانین ﴿١٠٦﴾ ئنجا هەر کات پێی زانراو دەرکەوت کە ئەو دوو (نامسوڵمان)انە گوناهو خیانەتیان کردوە (و وەصیەتو شایەدییدانەکەیان بەڕاستیی نەبووە)، ئەوە دووانی دیکە لەوانەی دووەکانی پێشێ ناهەقییان لەگەڵ کردوون، لە جێی ئەوان شایەدیی دەدەن، وە سوێند بە خوا دەخۆن، دەڵێن: شایەدیی دانی ئێمە بە خوا، (یان سوێند پێخواردنیمان) لە شایەدییدانی ئەوانی دیکە ڕاستترو شایستەترەو سنوورشکێنییمان نەکردوە، چونکە ئەگەر وابکەین ئەوا ئێمە لە ستەمکاران دەبین ﴿١٠٧﴾ ئا ئەوە نیزیکترە بۆ ئەوەی شایەدیی یەکە وەك خۆی بدەن، یان بترسن کە پاش قبووڵنەکرانی سوێندەکەیان سوێند بگێڕرێتەوە (بۆ لای کەسوکاری مردووە وەصیەتکەرەکە) وە پارێز لە خوا بکەن و ببیستن، وە خوا ڕێنمایی کۆمەڵی لاڕێ بووان ناکات ﴿١٠٨﴾)).

## شیكردنەوەی هەندێك لە وشەكان

(عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡ ): (عَلَيْكُم) (إسْم فِعْل)ە، واتە: لە خۆتان وریا بن، (إلْزَموهَا أَوْ أَصْلِحوهَا) لە خۆتان وریا بن، یان خۆتان چاك بكەن.

(ٱلۡوَصِيَّةِ ): بە كوردیش دەڵێین: وەصیەت، واتە: ڕاسپاردن، (الوَصِيَّةُ: التَّقَدُّمُ إلى الغَيْرِ بِمَا يَعْمَل بِهِ مُقْتَرِنًا بِوَعْظٍ) ئەوەیە كە شتێك بە كەسێك بڵێی لەگەڵ ئامۆژگاریی كردندا بۆئەوەی بیكات.

(ذَوَا عَدۡلٍ ): واتە: دوو كەسی دادگەر، (أي: العَدَالَة) (العَدلُ: الإنْصَافُ وهو إعطاء المرءِ مالَهُ وأخْذِ ما عَلَيْهِ)، (عَدل)یش بریتیە لە ئینصاف، واتە: ئەوە كە هەر كەسە هەقی خۆی بدرێتێ، وە ئەوەشی كە لەسەریەتی لێی وەربگیرێ.

(ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ ): واتە: پێتان بە زەوی دادا، بەڵام لێرەدا مەبەست پێی بە سەفەر چوونە، لەبەرئەوە كە ئینسان وەختێ كە بە ڕێ دا دەڕوات، پێی بە زەوی دادەدا، وایانگوتوە.

(عُثِرَ): واتە: پێی زانراوو ئاشكرا بوو، دەڵێ: (عَثَرْتُ عَلى كَذَا) واتە: پێمزانی، وە ئەسڵی وشەی (عَثَر)، واتە: (سَقَط)، لەبەرئەوەی كە كەسێك بە شتێك دەزانێ بەسەری دا دەكەوێ.

(ٱلۡأَوۡلَيَٰنِ ): یانی: (الأقْرَبَان) واتە: ئەو دوو كەسەی كە نزیكترن لە مردووە وەصیەتكەرەكان.

(ٱسۡتَحَقَّ ): یانی (إستَوجَبَ) (إسْتَحَقّ الإثْمَ، وَجَبَت عقوبته)، واتە: سزایەكەی لەسەر پێویست بووە.

## هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئایـەتـەکان

هـۆی هاتنـە خـوارەوەی ئـەم ئـایەتە کـە دەفـەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ ١٠٦ ﴾، ﴿عن ابْنِ عبَّاسٍ رَضِيَ اللهُ عنْهُما، قَـالَ: كَانَ تَمِيمٌ الـدَّارِيُّ وَعَـدِيُّ بْنُ بَدَاءَ يَخْتَلِفَانِ إِلَـى مَكَّـةَ فَخَرَجَ مَعَهُمَا فَتًـى مِنْ بَنِي سَهْمٍ، فَتَوفِّي بِأَرْضٍ لَيْسَ بِهَا مُسْلِمٌ فَأَوْصَى إِلَيْهِمَا فدفعا بِتَرِكَتِهِ إِلى أَهْلِهِ وَحَبَسَا جَامًا كَانَ مَعَـهُ مِـنْ فِضَّـةٍ مُخَوَّصـاً بِالـذَّهَبِ، فاسْـتَحْلَفَهُمَا رَسُولُ اللهِ بِـاللهِ مـا كـتمتما ولا اطلعتما، ثُمَّ وُجِـدَ الْجَـامُ، بمكـة فقَالُوا: اشْتَرَيْنَاهُ مِنْ عَدِيِّ بْنِ بَـدَاءَ وَتَمِيمٍ فَجَاءَ رَجُـلَانِ مِـنْ وَرَثَـةِ السَّـهْمِيِّ فَحَلَفَـا أَنَّ هَـذَا الْجَـامَ لِلسَّـهْمِيِّ وَشَـهَادَتُنَا أَحَـقُّ مِـنْ شَـهَادَتِهِمَا، وَمَـا اعْتَدَيْنَـا إِنَّـا إِذًا لَـمِنَ الظَّـالِمِينَ، فأخـذوا الجـام، وفيهم نَزَلَـتْ هَـذِهِ الآيَـــــــــــة: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ... ١٠٦ ﴾﴾ {أَخْرَجَـهُ أَبُـو دَاوُدَ بِـرقم: (٣٦٠٨)، والتِّرمِـذِيّ بِـرقم: (٣٠٦٠) وَصَحَّحَهُ الألبـاني فـي (صحيح سُـنَن أبي داود)}، واتـە: عەبدوڵـڵای کوڕی عـەبباس خوا لـە خـۆی و بـابی ڕازی بـێ، دەڵـێ: ئـەم ئایـەتە لەوبـارەوە هاتـە خـوار، کـە دوو کـەس هەبوون بە ناوی تەمیمی داریی و عەدی کـوڕی بـەداء (دیـارە نەصـرانیی بوون)، هامووشـۆی مەککەیـان دەکـرد، جارێـك گەنجـێك لـە بـەنی سـەهم لەگـەڵیان دەچـێ و نـەخۆش دەکـەوێ، لـە شـوێنێك کـە هـیچ مسـوڵمانی لێنـابن، دەمـرێ، گەنجـەکە وەصـیەت دەکـات بـۆ ئـەو دوو کەسـە نەصـڕانییە، دەڵـێ: ئـەو کـەلوپەلـەم هەیـە تەسـلیمی خزم و کەسـمی بکەنـەوە، دوایـی کـە دەمـرێ جـامێك، (قاپێـك) کـە لـە زیـو بووەو بە زێڕ چنـدراوە (نـەخش و نیگاری لەسـەر بـووە) ئـەوە دەشارنەوە، پێغەمبـەری

خـوا ﷺ سوێندیان دەدات: ئایا هیچـتان نەشـاردۆتەوە؟ ئەوانیـش سـوێند دەخـۆن {ئەو قاپـە، (جـامە) دیـارە دەبێ قـاپێکی نایـاب بووبـێ و مەشـهوور بووبـێ} دوایـی ئـەو جـامە لـە مەککـە دەدۆزرێتـەوە، کەسـوکاری گەنجـەکە جامەکـەی خۆیـان دەناسـنەوە، وە ئەوانـەی کـە قاپەکـەیان لـەلا دەبـێ دەڵـێن: ئێمـە ئـەو قـاپەمان لـە عـەدی کوڕی بـەداءو تەمیم کڕیوە، دوو پیاویش لە هـۆزی ئـەو گەنجـەی کـە مـردووە، دێن سوێند دەخۆن دەڵێن: ئەو قاپە هی ئـەو خزمـەی ئێمـەیە، وە شـایەدیی ئێمـە لـە شـایەدیی ئـەوان باشـتـرەو ڕاسـتـرە، سـوێندەکەی ئێمـە لـە هـی ئـەوان هەقـتـرە، وە سـتەمیشـمان نەکردوە، (واتە: بەڵگەیان دەبێ لەسەر ئەوە کە ئەو قاپە هی مردووەکەی ئەوانـە، وە ئـەو دوو نەفـەرە شـاردوویانەتـەوە، ئیـدی قاپەکـە وەردەگرنـەوە)، وە لەوبارەوە ئـەم ئایـەتـە هاتۆتە خوار.

جـا لـە ڕیوایـەتی دیکـەدا هـاتوە: کاتێـك ئـەو گەنجـە دەکەوێتـە حاڵـەتی سـەرەمەرگ، لـە نامەیەکـدا هـەموو کەلوپەلەکـانی خـۆی تێـدا دەنووسـێ، نامەکـە دەخـاتە نێـو کەلـوپەلەکانیو تەسـلیمی ئـەو دوو نەصـرانییەی دەکات، کـە وەصیەتی بـۆ کـردوون، ئـەوانیش نامەکـە نـابینن، کـەلـوپەلەکانیش تەسـلیمی ماڵـێیـان دەکەنـەوە، بـەڵام قاپەکـە دەشـارنەوە، دوایـی کـە خـزمو کەسـەکەی کەلوپەلەکـان دەکـەنەوەو نامەکـە دەخوێننـەوە، دەڵێن: ئـەو نامەیـە ئـەو قاپەشـی تێدایە، کوا ئـەو قاپـە، دوو نەصـڕاییەکەش ئینکـاریی دەکـەن، بەهـەر حـاڵ دوایـی قاپەکـەش دەدۆزرێتـەوە، کڕیـارەکانیش دەڵێن: لـەو دوو نەصـڕانییەمان کڕیـوە. کەواتـە: دیـارە ئـەوان دزیویـانە، وە لـە ڕیوایەتێکـی دیکـەدا کـە (ترمـذي: ٣٠٥٩) هێناویانـە هاتوە کـە (الطبـري: ١٢٩٧) دوای ئـەوەی مسـوڵمان بـووە هـەواڵەکـەی بـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ داوە. ئەگەرنا هەر لەبەرئـەوەی دوو نەفەر لە خزمانی مردوو سوێند دەخـۆن، بەوەنـدە ئەو هەقـە نـادرێ بـەوان، ئەگـەر بەڵگەیەکیان نەبـێ.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەكـان

خـوا ﷻ لـەم چـوار ئایەتـەدا، واتـە: لـە ئایەتـەكانی (١٠٥ تاكـو ١٠٨) بـۆ جـاری پازدەیـەم و شـازدەیەم، واتـە: بـۆ دواجـار لـەم سوورەتەدا، بانگی مسـوڵمانان دەكـات، بـە نازنـاوی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، كـە لـەم سوورەتەدا بـەم دووجارەشـەوە شـازدە (١٦) جـار ڕسـتەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ی دووبـارە كردۆتـەوەو، ئـەم سـوورەتی (المـائدة)یە زۆرترین جار ڕسـتەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ی تێدا هـاتوە، وە كـە لەقـەدەر قـەبارەی خۆشـی زۆرتـرین حـوكم و یاسـای شـەرعیی تێـدان، چـونكە وەك پێشـتـریش باسـمان كـرد، هـەر كاتێـك ڕسـتەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾، دێ، بـە مسـۆگەریی حـوكمێكی شـەرعیی بـەدوادا دێ، یـان واجبێكـە، یـان قەدەغەیەكـە، یـان سوننەتێكـە، یـان شـتێكی ناپەسـندە، جـا چ پەیوەنـدیی بـە ئیمـان و عەقیـدەوەبێ، چ پەیوەندیی بە عیبـادەتەوەبێ، چ پەیوەندیی بە ڕەوشـت و ئاكـارەوەبێ، چ پەیوەنـدیی بە حـەڵاڵ و حەرامـەوەبێ، چ پەیوەنـدی بـە بازرگـانی و ئابوورییـەوەبێ، چ پەیوەنـدیی بە حوكم و سیاسـەت، یان جەنگ و جیهـادەوەبێ، بە دڵنیـایی یـەوە حـوكمێكی شـەرعیی لە دوای ڕسـتەی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ﴾ هەیـە، جا لێـرەدا بـۆ جـاری پازدەیـەم خـوا دەفـەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡ ﴾، ئـەی ئەوانـەی بڕواتـان هێناوە! وریای خۆتـان بن، وشـەی: (عَلَيْكُـم) (إسْم فِعْل)ە، واتـە: لـە خۆتـان وریا بـن، (إلْزَموها أَوْ أَصْلِحوها) لـە خۆتـان وریـا بـن، یـان خۆتـان چـاك بكـەن، ﴿ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴾، ئەگەر ئێـوە ڕێی ڕاسـت بگـرن، ئـەوەی كـە گومڕابـووە زیانتـان لـێ نـادات، واتـە: مسـوڵمانان بەهـۆی كـەموكـوڕیی خۆیانـەوە، دوژمنانیـان زەفـەریان پێدەبەن، ئەگـەر خۆیـان مسـوڵمانی باشـبن، وە پابەندبن بە شەریعەتەوە، ئەوانەی كە ناحەزیـانن، لـە گـومڕاو سـەرلێشـێواوان، زیانیـان پێناگەیـەنن، ﴿ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ

﴿جَمِيعًا﴾، گەڕانەوەی هەمووتان بۆ لای خوایە، بۆ لای خوا دەچنەوە، خوای بالادەست هەمووتان کۆدەکاتەوەو لێتان دەپرسێتەوە، ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ﴾، وە هەواڵتان پێدەدات بەوەی کە دەتانکرد، واتە: ئەگەر دەتەوێ خوای پەنهانزان هەواڵی ناخۆشت پێنەدات، لێرە کردەوەی خراپ مەکە، ئەگەرنا ئەوەی لە دنیادا کردەوەی خراپ بکات، لە قیامەتێ هەواڵی ناخۆش دەبیستێ، بۆچی؟ چونکە هەر کردەوەکانی خۆتن تۆمار دەکرێن، وە خوای دادگەر لە ڕۆژی دواییدا پێت دەفەرموێ: ئەوەت کرد! ئەوەت کرد! بۆیە ئەوەی دەیەوێ لە قیامەتێ هەواڵی ناخۆش نەبیستێ، لەلایەن خواو فریشتەکانەوە، کە کردەوەکانی دەخەنەوە بەرچاوی، با لێرەدا ئاگاداری کردەوەکانی خۆی بێ.

ئنجا خوای پەروەردگار بۆ جاری شازدەیەمو کۆتایی لەم سوورەتەدا بانگی مسوڵمانان دەکات، دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! بڕوایان بە چی هێناوە؟ بە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە بڕوایان پێ بهێنرێ، بە خوای بێوێنە، بە ناوو سیفەتە بەرزەکانی، بە پەروەردگارێتیی، بە بەدیهێنەرایەتیی، بە فریشتەکانی، بە کتێبەکانی، بە پێغەمبەرانی (علیهم الصلاة والسلام) کە ڕەوانی کردوون، وە ڕۆژی دوایی و بەهەشت و دۆزەخ، وە هەموو ئەو شتانەی پێغەمبەر هەواڵی پێداون، ئەوجار دوای ئەوەی بانگی کردین، ئنجا پێمان ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێ: ﴿شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾، بۆ زانیارییتان زۆربەی توێژەرەوانی قورئان گوتوویانە: ئەو سێ ئایەتە ئاڵۆزترین ئایەتن لە ڕووی مانا و ئیعرابکردنەوە، وە وردەکاریی زۆر زۆریان دەوێت، بەڵام من زۆرم بیر لێکردەوەو لەبەر ڕۆشنایی قسەی زانایان دا تارادەیەکی باش ماناکەیانم ڕۆشن کردۆتەوە، وەك هەم ئێستا لە مانای گشتی ئایەتەکاندا باسی دەکەم، وە هەم لە مەسەلە گرنگەکانیشدا.

خوا ﷻ لێرەدا باسی مەسەلەیەکی گرنگ دەکات، کە لە ژیانی ئینساندا دێتە پێش، ئەویش ئەوەیە کە کەسێك بە سەفەر دەچێ، وە تووشی ڕووداوێك دەبێ، یان

تووشــی نەخۆشــییەك دەبــێ‌و، دەســت لــە خــۆی دەشــواو دەزانــێ خــەریکی مردنێیــە، لەوکــاتەدا پێویســتە وەصــیەت بکــات بــۆ دوو کــەس، واتــە: دوو کەســان بــە شــایەد بگــرێ‌و بیانکــاتە وەصــیەتکاری خــۆی لــە مســولْمانان، وە دەبــێ دادگــەرییش بــن، واتــە: دوو کەســی وابــن، کــە خۆیــان لــە گونــاهی گــەورە بپــارێزن، ئەهلــی درۆ نــەبن، دەبــێ دەســتپاك‌و زمان پــاك بن، ئەمیــن بــن، ئــەوە ئەگــەر شوێنەکە وابــێ مســولْمانی لێبن، بەلاّم جاری وایە ئینســان بۆ بازرگانیی‌و ســەفەر دەچێتە شــوێنێك، مســولْمانی لــێ نیــە، لەوکــاتەدا دەبــێ دوو کەســی دیکــەی نامســولْمان بکــات بــە وەصــیەتکاری خــۆی‌و بــە شــایەد، وە ئــەو شــتەی کــە بــە پێویســتی دەزانــێ، یــاخود کەلــوپەلێکی هەیــە مــاڵ‌و ســامانێکی هەیــە، بیــدا بــەوان‌و تەسلیمی وانــی بکــاو بــەوانی بســپێرێ، ئــەم ئایەتانــە باســی ئــەوە دەکــەن، خــوا دەفــەرموێ: ئــەی ئەوانــەی بڕواتــان هێنــاوە! ﴿شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ﴾، شــایەدیی دانــی نێوانتــان، واتــە: لــە نێــو خۆتــاندا دەبــێ بــەو شــێوەیە شــایەدیی بــدەن، لــە چ کاتێکــدا؟ ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾، ئەگــەر یــەکێك لــە ئێــوە مردنــی لــەلا ئامــادەبوو، خــۆ مــردن خــۆی نایــەت‌و دیــارنیە، واتــە: هۆکارەکــانی مردن‌و دنیا بەجێهێشــتنی دەرکەوتن، یانی: زۆر نــەخۆش بــوو، هەرچــەندە جاری واش هەیە یەکێــك زۆر نەخۆش دەبــێ‌و دەست لە خۆی دەشــواو، دەســت لــە کراسی دەردێنــێ، دوایــیش نــامرێ، بــەلاّم ئــەوە حاڵــەتە، دەبینــی مرۆڤــ تووشــی بەســەرهاتێکی قــورس دەبــێ، یــان برینێکــی زۆر ســەختی دەبــێ، لــەو حاڵەتانــەدا وەصــیەت دەکــات، ﴿حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ﴾، لە کــاتی وەصــیەت کردنــدا.

شایەدیی دانەکەتان ئەوەیــە کــە: ﴿ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾، دوو کەســی خــاوەن دادگــەریی لــە خۆتــان، کــە دوایــی بــاس دەکــەین مەبەســت لــە دادگــەریی چییە، کــە بــە کــورتیی واتە: بەردەوامیی لەســەر پابەندیی بە شــەریعەتەوە، کەســێك ڕێــك‌و ڕاست بێ‌و درۆ نەکات، وە دەستپاك بــێ، وە پارێزکــاربێ، خۆ لە گونــاهە گەورەکــان بپــارێزێ، ئــەوە پێــی دەگــوترێ: کەسێکی دادگــەر، واتــە: بــەو شــێوەیە لــەنێو ئێــوەدا شــایەدیی بەڕێــوە دەچــێ، کە دوو کەســی خــاوەن دادگەریی لــە خۆتــان وەصیەتتان بــۆ بکات،

﴿أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ﴾، یاخود دوو کەس لە غەیری خۆتان، واتە: لە نامسوڵمانان، هەندێك گوتوویانە: ﴿غَيۡرِكُمۡ﴾، واتە: لە غەیری خزمەکانی خۆتان، بەڵام ڕاستییەکەی وانیە، ڕاستە ماناکەی واتە: لە غەیری مسوڵمانان، چونکە لێرەدا قسە لەگەڵ مسوڵمانانە: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وە غەیری ئیماندارانیش کافرانن، جا چ جوولەکە بن، نەصڕانیی بن، ئێزیدیی بن، ... هتد، کە دوو مسوڵمان دەستنەکەوتن، دوای هەوڵدانی زۆر، دەبێ هەوڵبدرێ دوو کەسی نامسوڵمانی ساغ و ساف و بێ فرت و فێڵ بێنێ، بەپێی توانا، ﴿إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَـٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِ﴾، وەختێك ئێوە بە زەویدا ڕۆیشتن، یانی: سەفەرتان کرد، دەڵێ: بۆیە بە سەفەر گوتراوە: (ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ) چونکە ئینسان کاتێك کە بەڕێ دا دەڕوات، پێی بە زەوی دا دەکوتێ، لەبەرئەوە خوای زاناو شارەزا ئەو وشەیەی بەکارهێناوە، واتە: کاتێك ئێوە بە سەفەر چوون و بەڵای مردنتان گەیشتێ، ئەوە پێویستە وەصیەت بکەن بۆ دوو نەفەر لە مسوڵمانان، ئەگەر مسوڵمان دەست نەکەوتن، دوو نامسوڵمان، ﴿تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾، ئەگەر لەو دوو نامسوڵمانە کەوتنە گومانەوە، چونکە دوایی دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ﴾، ئەگەر لێیان کەوتنە گومانەوە، کە ڕاست بکەن، دوایی کە نوێژ کرا ڕایانگرن، ئەو نوێژە کام نوێژە؟ زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: نوێژی عەسرە، هەندێك دەڵێن: هەر نوێژێك بێ، نوێژی مسوڵمانان، وە هەندێك دەڵێن: نوێژی خۆیان، بەڵام زیاتر واپێدەچێ لە نوێژەکانی مسوڵمانان مەبەست بێ، لە دوای نوێژ ڕایاندەگرن، ﴿فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ﴾، سوێند بە خوا دەخۆن، واتە: سوێندیان دەدەن، ئەگەر لێیان کەوتنە گومانەوە، بەڵام ئەگەر ڕێك و ڕاست ئەمانەتەکەیان تەسلیم کردن، وەصیەتەکەیان بە ڕێك و ڕاستی کردو لێیان دڵنیا بوون، پێویست ناکات سوێندیان بدەن، یانی: ئەگەر لێیان کەوتنە گومانەوە، سوێندیان دەدەن، سوێندەکە

چـۆن دەخـۆن؟ ﴿ لَا نَشْتَرِي بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ﴾، سـوێند بـە خـوا دەخـۆن، جـا با ئەو كەسـە خزمیش بـێ، واتە: ئەو كەسـە كە وەصیەتەكەی كردوە، یاخود ئـەو كەسـە كـە شـتەكەی تەسلیم دەكـرێ، خـزم بـێ، یـان بێگانـە، واتـە: تەنانـەت ئەگـەر خزمیش بـێ، خیـانـەتی پـێ ناكـەین، یان خیانـەتی بـۆ ناكـەین، چ جای ئەگـەر بێگانـە بـێ، هەرچـەندە خـاوەنی خزمـایەتییش بـێ، ئێمـە بـەو سوێندو بـەو شـایەدییەی خۆمـان، نرخێكـی كـەم ناكـڕین، ﴿ وَلَا نَكْتُمُ شَهَـٰدَةَ ٱللَّهِ ﴾، شـایەدیی دانێك كە دەبـێ بۆ خـوا بدرێ، نایشـارینەوە، ﴿ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْـَٔاثِمِينَ ﴾، ئەگـەر وابكـەین ئێمـە لـە گوناهبـارانین، واتـە: ئەگـەر شـایەدیی بشـارینەوە، لـە گوناهبـارانین، ئـاوا سـوێند دەخۆن، ﴿ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا ﴾، دوایـی ئەگـەر پێـی زانـرا، كە ئەوانـە گوناهێكـیان كـردوە، واتـە: شـتێكیان شـاردۆتەوە، باسـیان نـەكردوە، ئـەوە گوناهێكیـان كردوە، ﴿ فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا ﴾، دووانی دیكە لە شوێنی ئـەوان دێتـە شـوێنی ئـەوان، ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَـٰنِ ﴾، لەوانـەی كـە ماڵەكـەیان لـێ زایـە كراوە، واتـە: لـە خزمـانی مردووەكـە، كـە ماڵـەكەیان لـێ فـەوتاوە، دووان لـەوان دێـن سـوێند دەخـۆن، ﴿ ٱلْأَوْلَيَـٰنِ ﴾، واتە: ئەوانـەی كـە نـزیكـتڕن لـە مردووەكـە، واتـە: بـە خزمـایەتی لـێی نـزیكـتڕن، لێی لە پێشـتڕن، ئـەوان دێـن سـوێند دەخـۆن، ﴿ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَـٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَـٰدَتِهِمَا ﴾، سـوێند بـە خـوا دەخـۆن كـە شـایەدیی دانـی ئێمـە ڕاسـتتڕەو شـایسـتەترە لـە شـایەدیی دانـی ئـەوان، یـاخود سـوێندی ئێمـە لـە سـوێندی ئـەوان ڕاستتڕە، ﴿ وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ ﴾، وە ستەمیشمان نـەكردوە، دەسـتدرێژییمان نـەكردوە، ﴿ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّـٰلِمِينَ ﴾، ئەگـەر زوڵـم بكـەین، بـە درۆ سـوێند بخـۆین، بـۆ ئەوەی شـتێكیان بخـەینە سـەر، كە هـەق نەبـێ، ئـەوە ئێمـە سـتەممان كـردوە، واتـە: ئەو دوو نەفـەرە نامسـوڵمانە كە دەكرێنـە وەصیەتكار دوایـی كـە سـوێند دەخـۆن، دوای نوێـژ ئەگـەر خەڵـكەكە لێیـان كەوتنـە گومانـەوە، كەسـوكاری مردووەكـە لێیـان

کەوتنە گومانەوە، سوێندیان دەدەن، ئنجا ئەگەر دوای سوێند خواردنی وان، زانرا کە شتێکیان پەنهان کردووەو شتێکیان شاردۆتەوە، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، لەو حاڵەتەدا چۆن بکرێ؟ وە کەسیشی لێ نەبوو، لەوکاتەدا دوو کەس لە خزمەکانی مردووەکە کە لێی نزیکن دێن، ئەوانیش سوێند دەخۆن، بەڵام کاتێك خزمەکانی مردووەکە سوێند دەخۆن، دەبێ بەڵگەو نیشانەیەکیان بەدەستەوە هەبێ، نەك هەر لەخۆوە سوێند بخۆنو بڵێن: وەڵڵا ملیۆنێك دۆلاریشی پێبوو!! نەخێر دەبێ ئەوانیش بەڵگەیان پێ بێ، بەڵام تەنیا بە بەڵگەو نیشانەکە ئەو هەقە وەرناگیرێتەوە، دەبێ دوو کەس لە خزمە نزیکەکانی مردووەکە سوێند بخۆن، وە بڵێن: ئەوەش بەڵگەمانە، ئنجا لەو حاڵەتەدا، ئەو هەقەی کە داوای دەکەن، بۆیان دەگێڕدرێتەوە.

وە لە کۆتاییدا خوای کاربەجێ حیکمەتی ئەوە ڕوون دەکاتەوە، دەفەرموێ: ﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُوا۟ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ ﴾، ئەوە نزیکترە لەوەی کە شایەدیی یەکە وەك خۆی بدەن، واتە: درۆ نەکەن لە شایەدیی دانەکەدا، ئەو دوو کەسە نامسوڵمانە کە بزانن دوایی خزمەکانی مردووەکە بۆیان هەیە ئەوانیش سوێند بخۆنو شایەدیی بدەن، کە تەنیا بە سەرزارەکیی سوێندیان خوارد، دەرناچن، ئەوە دەبێتە پاڵنەریان بۆ ڕاستبێژیی و ئەمانەت پارێزیی، ﴿ أَوْ يَخَافُوٓا۟ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ﴾، وە هەروەها ئەوە نزیکترە بۆئەوەی بترسێن لەوەی کە دوای ئەوەی سوێندی ئەوان ڕەت دەکرێتەوە، پاش ئەوەی تەرەفی بەرانبەر سوێند دەخۆن، ئەو کاتە هەقەکەیان لەسەر دەچەسپێ، ﴿ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾، وە پارێز لە خوا بکەنو ببیستن، وە خوا ڕێنمایی کۆمەڵی لارێبووان ناکات، ئەوە کورتەی مانای گشتی ئایەتەکان بوو، وەك گوتم زانایان گوتوویانە: ئەم ئایەتانە ماناکەیان تاڕادەیەك قووڵیی و وردەکاریی دەوێ، بۆئەوەی کە ئینسان ماناکەی بۆ بێتە دەست، وە لە مەسەلە گرنگەکانیشدا زیاتر تیشکی دەخەینە سەر.

# چـەند مەسـەلـەیـەکی گرنــگ

**مەسـەلەی یەکـەم**: کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴾، ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! وریای خۆتـان بـن، ئەگـەر ئێـوە ڕێی ڕاسـتگرتووبن، ئەوانـەی کە گومـڕان، زیانتـان لـێ نـادەن، ئـەم ڕستەیە سـێ مانـای هـەن:

١) واتـە: هەر کامێك لە ئێوە با هەوڵبـدات ئیمـانداری چاك بـێو پارێزکاری باش بـێ، ئنجـا ئەگەر وابووی لـە زاتی خۆتــدا، لـە پەناتـەوە نامسـوڵمانێك هـەبێ، جا خـزم بـێ، دۆسـتو بـرادەر بـێ، بێگانـە بـێ، هـەر کەسـێك بـێ، مـادام تـۆ بۆخـۆت دینــداریی بــاش بـووی، بێدینــیی‌و خراپەکـاریی ئـەو زیـانت لێنــادات، بــە مەرجـێك کەمتـەرخەمییــت نەبــێ بەرانبـەر ئـەو، کوردەواریی خۆشـمان دەڵێن: (مەڕ بە پێی خـۆی، بزنیش بە پێـی خۆی)! وە خوای بەخشـندە لـەوبارەوە زۆر بە ڕوونیی فەرموویەتی: ﴿ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ ﴿١٥﴾ ﴾الإسـراء، واتـە: هـیچ گوناهبــارێك گونــاهی کەســێکی دیکــە هەڵنـاگـرێ، بـە مـەرجێك کەمتەرخـەم نەبـێ لە بەرانبـەریدا، بـۆ وێنــە: ئەگـەر بـاب بەرانبـەر منداڵەکانی کەمتەرخـەم بــێو، کـچو کوڕەکــانی دوایــی گونـاح بکـەن، ئـەوە ئـەو بابــە دوایــی تووشــی لێـپرسینەوەو سـزا دەبـێ، بۆچـی؟ چـونکە کەمتەرخــەم بـووە لــە ئامۆژگـاریی کردنیانـدا، یـاخود هـەر کەسـێك بەرانبـەر خـزمو کەسـی، هـاوەڵو بـرادەری، دەورو دراوسێی کەمتەرخـەم بـێ، لە ئـەنجامی ئـەو کەمتــەرخەمییەدا هـەر یـەك لەوانـە تووشــی هەڵــەو گونــاح بــێ، ئـەویش بـە ئەنــدازەی خـۆی تووشـی لێپرسـینەوە دەبــێ، بـەڵام ئەگـەر هــەقی خـۆی جێبــەجێ کردبـێ، وە لـە زاتـی خۆیشــی بـاش بووبـێ، ئەوە زیـانی بۆ ئەو نابـێ.

٢) واتــە: ئێــوە ئــەی مســـوڵمانینە! هەمووتـــان وەك کۆمەڵــگای مســـوڵمان، وەك خـەڵـکی مسـوڵمان پابەنــدبن بە شـەریعەتەوە، ئـەو کاتـە پـیلانو فێـڵو دژایـەتیی کـافران، زیــان لـە ئێـوە نــادات، واتــە: مســوڵمانان لـە ئەنجــامی کەمتەرخـەمیی

خۆیاندا دوژمن زەفەریان پێ دەبات، ئەگەر خۆیان مسـوڵمانی باش بن، پابەنـدبن بە شـەریعەتەوە، دوژمنان زیانیان لێنادەن، وە لە شوێنی دیکەدا خـوا دەفەرموێ:

﴿... وَأَنتُمُ ٱلْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾﴾ آل عمـران، واتە: وە ئێوە لەسەرەوە دەبن ئەگـەر ئیمانـداربن، کەواتـە: هـەرکاتێك کافر زەفـەر بـە مسـوڵمانان دەبـەن، دەبـێ چاو بەخۆیـاندا بگـێڕنەوە، دیـارە کـەموکوڕیی لە خۆیـاندا هەیـە.

٣) مانـای سـێیەمیش ئەوەیە کـە لـە کـاتی تێکچـوونی کۆمەڵـگاو زۆربـوونی گونـاحو تاواندا، ئینسـان دوای ئـەوەی نائومێـد دەبـێ لـەوەی کە بتوانـێ کۆمەڵـگا بگـۆڕێو خەڵـك چـاك بکـات، لـەو کـاتەدا لەسـەری پێویسـت نیـە، خـۆی لەگـەڵ خەڵـکی ماندوو بکـات، مـادام کە بزانـێ هیچـت بـۆ لەگـەڵ وان ناکرێ، بۆخـۆت دینـداریی خـۆت بکـەو واز لـە خـەڵکی بێنـە، وەك لەوبـارەوە ئـەم (أثَـر)ەش هەیـە: {فَعَلَيْكَ بِخَاصَّةِ نَفْسِكَ وَدَعْ الْعَوَامَّ}، واتـە: خـەریکی دینـداریی خۆتبـەو واز لە خەڵکی بێنـە، دیـارە ئەوە لە حاڵـێکدا کە دنیـا زۆر تێکـدەچێو زۆر ئـاڵۆزە.

## مانا لێکدانەوەیەکی هەڵە

لێـرەدا هەنـدێك لـە زانایـان ئـەو ئایەتـەیان بـە مانایـەکی نەرێنـیی (سلبي) وەرگرتـوەو گوتوویـانە: لێرەدا خـوا دەفەرموێ: ئـەی مسـوڵمانینە! بۆخۆتـان بـاش بـن، ئەگـەر لـە پەنـای ئێـوەدا خـەڵك خـراپ بـێ، زوڵـم بکـاو، بێـدینی بکـا، زەرەری بۆ ئێوە نیـە، بەڵام بێـگومان ئـەوە وانیـە، بۆچـی؟ چونکە خـوا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهْتَدَيْتُمْ ﴾، ئەی ئەوانـەی بڕواتـان هێـناوە! وریـای خۆتـان بـن، ئەگـەر ئێـوە ڕێـی ڕاسـتـگرتوو بـن، ئەوەی گومڕایـە زەرەرتـان لـێ نادات، ئنجـا یەکـێك لـەو شتانەی کـە ئینسـان ڕێـی ڕاست بگـرێ، دەبـێ بیکات، ئەوەیە کە فەرمـان بە چـاکەو نەهـی لە خراپـە بکـات، کەواتـە: کەسـێك کـە گـوێ نـاداتـە دەوروبـەری خـۆی، مانـای وایـە ڕێ ڕاسـتگرتوو

(مُهْتَدِي) نیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەوانەی گومڕان زیانتان لێنادەن، ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاستتان گرتبێ، دیارە بەشێك لە گرتنی ڕێی ڕاست، ئەوەیە كە ئینسان لە بەرانبەر ناشەرعیی دا هەڵوێستی هەبێ، وە فەرمان بە چاكە بكاتو، ڕێگرییش لە خراپە بكات، وە لەوبارەوە ئەم دەقانە هەن:

١- ﴿عَنْ قَيْسِ بْنِ أَبِي حَازِمٍ خَطَبَنَا أَبو بَكْرٍ الصِّدِّيقِ فَقَالَ: أَيُّهَا النَّاسُ! إِنَّكُمْ تَقْرَءُونَ هَذِهِ الآيَةَ وَتَتَأَوَّلُونَهَا عَلَى غَيْرِ تَأْوِيلِهَا: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ﴾، وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللهُ سُبْحَانَهُ بِعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ)﴾ {أَخْرَجَهُ أَبُو دَاوُدَ بِرقم: (٤٣٣٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (٢١٦٨) وَقَالَ: صَحِيح، وَابْنُ مَاجَهْ برقم: (٤٠٠٥)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٥٦٤)}، واتە: قەیس (یەكێكە لە هاوەڵان خوا لێی ڕازی بێ)، دەڵێ: بیستم ئەبو بەكری صیدديق خوا لێی ڕازی بێ (ئەو كاتەی خەلیفەی مسوڵمانان بوو) وتاری بۆ داین، گوتی: ئەی خەڵكینە! ئەم ئایەتە دەخوێننەوەو ماناكەی بە هەڵە لێكدەدەنەوە، (وەك گوتم هەندێك زانا بە هەڵە مانای ئەو ئایەتەیان كردوە، واتە: ئێوە وای تێدەگەن كە ئەگەر بۆخۆت مسوڵمان بی، هەقی كەست نەبێ، دنیا ئاو بیبات گوناهبارنی، مادام نوێژو ڕۆژووی خۆت بكەی! بەڵام ئەو مانایە هەڵەیەو خوا مەبەستی ئەوە نەبووە)، بۆیە دەڵێ: {وَإِنِّي سَمِعْتُ رَسُولَ اللهِ ﷺ يَقُولُ: (إِنَّ النَّاسَ إِذَا رَأَوْا الظَّالِمَ فَلَمْ يَأْخُذُوا عَلَى يَدَيْهِ أَوْشَكَ أَنْ يَعُمَّهُمْ اللهُ سُبْحَانَهُ بِعَذَابٍ مِنْ عِنْدِهِ)}، واتە: من گوێم لە پێغەمبەری خوا ﷺ بووە دەیفەرموو: هەركاتێك خەڵك ستەمكاریان بینی، دەستیان نەگرت بیگێڕنەوە لەو ستەمە، ئەوە زۆر نزیكە خوا لەلایەن خۆیەوە سزایەك بنێرێ بۆ هەموویان.

كەواتە: ئەم ئایەتە مەبەست پێی ئەوە نیە كە ئەگەر بۆخۆت نوێژو ڕۆژووی خۆت، طاعەتی خۆت لە ماڵی خۆت كرد، مادام مسوڵمان بووی، هەقی خەڵكو دەوروبەرو كۆمەڵگات نەبێ، چونكە ئەوەتا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ:

ئەگەر خەڵك ستەمكار ببینن كە ستەم دەكات، ئەوانیش دەستی نەگرن‌و بەرپەرچی نەدەنەوە، نزیكە خوا بەهۆی ئەو ستەمەوە سزایەك بنێرێ، هەمووان بگرێتەوە، ستەمكاران‌و ئەوانەش كە لە بەرانبەر ستەمدا هەڵوێستیان نەبووە.

٢- ﴿أَخْرَجَ ابْنُ جَرِيرٍ أنَّهُ قِيلَ لابن عُمَرَ: لَوْ جَلَسْتَ فِي هَذِهِ الأَيَّامِ فَلَم تأمر وَلم تنه، فَإِنَّ اللّه قَالَ: ﴿ عَلَيۡكُمۡ أَنفُسَكُمۡۖ لَا يَضُرُّكُم مَّن ضَلَّ إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡۚ ﴾؟ فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: إنَّهَا لَيْسَتْ لِي وَلا لأَصْحَابِي لأَنَّ رَسُولَ اللّه ﷺ قَالَ: (ألا فَلْيُبَلِّغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ)، فَكُنَّا نَحْنُ الشّهود وَأَنْتُمْ الغُيّب، وَلَكِن هَذِهِ الآيَة لأَقْوَامٍ يجيئون من بَعْدِنا، إن قَالوا لَمْ يُقْبَلْ مِنْهُمْ﴾ {تفسير الطبري: رقم: (٢٨٥١)}، واتە: ئیبنو جەریر دەڵێ: ڕۆژێك بە عەبدوڵڵای كوڕی عومەر (خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ) گوترا: ئەگەر لەم ڕۆژانەدا لە ماڵی خۆت دابنیشی، فەرمان بە چاكەو ڕێگریی لە خراپە نەكەی؟ چونكە خوا دەفەرمویٚ: وریای خۆتان بن، ئەگەر ئێوە ڕێی ڕاستگرتوو بن، ئەوەی گومڕایە زەرەرتان لێ نادات، عەبدوڵڵای كوڕی عومەریش (خوا لە خۆی‌و بابی ڕازی بێ) گوتی: ئەم ئایەتە مەبەستی پێی من‌و هاوەڵانم نیە، چونكە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: {ألا فَلْيُبَلِّغْ الشَّاهِدُ الْغَائِبَ}، واتە: ئاگاداربن! ئەوەی كە ئامادەیە با بەوانە ڕابگەیەنێ كە لێرە ئامادە نین، ئنجا ئێمە ئامادەبووەكانین، كە لە خزمەت پێغەمبەری خوا ﷺ ئامادە بووین، وە ئێوەش كە لە دوای هاوەڵان هاتوون غائیبەكانن كە لەوێ نەبوون، دەبێ ئێمە هەرچییەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووبێتی پێتان ڕابگەیەنین، بەڵام ئەوە بۆ كەسانێكە كە لە دوای ئێمەوە دێن، وەختێك قسەی هەقیش بكەن، لێیان وەرناگیرێ (فەرمان بە چاكەو نەهی لە خراپەش بكەن، لێیان وەرناگیرێ‌و هیچ سوودی نیە)، واتە: بۆ كاتێكە كە دنیا بە تەواویی تێكچووبێ، خەڵكیش زۆر خراپ بووبێ‌و وەزع ئاڵۆزبێ، وە ئامۆژگاریی‌و بانگەواز بۆ شتی چاك‌و ڕێگریی لە شتی خراپ، هیچ سوودێكی نەبێ.

هەڵبەتە من پێموایە ئەوکاتیش دەبێ ئینسان تەواو بگاتە دڵنیایی کە قسەکەی هیچ سوودی نیە، ئەوجار واز لە قسەی هەق و فەرمان بە چاکەو نەهی لە خراپە بێنێ، واتە: دڵنیابی کە هیچ سوودی نیە، ئەگەرنا مادام مەزەندەی ئەوە بکەی و ئەگەری ئەوە هەبێ کە سوودی هەیە، دەبێ هەر پێی هەڵسی وەك خوا دەفەرمویٚ: ﴿ فَذَكِّرۡ إِن نَّفَعَتِ ٱلذِّكۡرَىٰ ۝٩ ﴾الأعلى، واتە: بیریان بخەرەوە، ئەگەر سوودی هەبوو، واتە: ئەگەر چی بڕ گومانت هەبێ کە سوودی دەبێ، نابێ واز لە قسەی هەق و فەرمان بە چاکەو ڕێگریی لە خراپە بێنی، وە ئایەتەکەش وەك گوتمان کە دەفەرموێ: ﴿إِذَا ٱهۡتَدَيۡتُمۡ ﴾، بەشێك لە هیدایەتدرانی ئینسان و ڕێی ڕاست گرتنی ئینسان، ئەوەیە کە لە بەرانبەر خەڵکدا، لە بەرانبەر کۆمەڵگاکەیدا هەست بە بەرپرسیارێتیی بکات، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: ﴿كُلُّكُمْ رَاعٍ، وكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٤٤٩٥)، وَالْبُخَارِيُّ برقم: (٨٩٣)، وَمُسْلِمٌ برقم: (٤٧٠١)، وَأَبُو دَاوُدَ برقم: (٢٩٢٨)، وَالتِّرمِذِيُّ برقم: (١٧٠٥)، وَقَالَ: حَسَنٌ صَحِيحٌ، عَنِ ابْنُ عُمَرَ رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا}، واتە: هەر کامێکتان چاودێرەو هەر کامێکتان بەرانبەر بە خەڵکەکەی بەرپرسیارە.

**مەسەلەی دووەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَأَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِۚ تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلۡأٓثِمِينَ ﴾، دیارە پێشتر بەگشتی مانامان کرد، بەڵام لێرەدا بەتایبەت چەند وشەیەك مانا دەکەینەوە:

١) کە دەفەرموێ: ﴿ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ ﴾، وشەی (شَهَادَة) چییە؟ (الشَّهَادَة: هِيَ فِي الشَّرِيعَة إِخْبَارٌ عَنِ عيان بِلَفْظ الشَّهَادَة فِي مَجْلِس القَاضِي، بحق للغير على آخر) (التعريفات للجرجاني، ص١٣١)، واتە: (شَهَادَة) لە شەریعەتدا بریتییە لە هەواڵ دانێك بەوەی تۆ ئاگات لەو شتە بووەو بینیوتە لە کۆڕو مەجلیسی قازیی دا، {وە ئێستا کە دەگوترێ: ئامادەی شایەدیی بدەی، لەوەوە هاتوە، (رَأَى) یانی: (حَضَرَ)، واتە: ئامادەبوو، یاخود بینی، شایەد کەسێکە شتێکی دیبێ، یاخود تەواو ئاگاداری بێ، وە کە بە یەکێك دەگوترێ: شایەدیی بدە، واتە: دەبێ بچێتە مەجلیسی قازییەوەو، بڵێ: من شایەدیی دەدەم، سوێند دەخۆم، من پێتان ڕادەگەیەنم ئاگام لەو شتە بووە، یان ئەو شتەم بیستە، یان ئەو شتەم بینی بەو شێوەیەو بەو شێوەیە، ئەوە مانای شایەدیی} ، شایەدییەك بەوەی کە فلان کەس فلان هەقەی هەیە، ئەوە پێی دەگوترێ شایەدیی، واتە: یەکێك کە شایەدیی دەدات دەبێ بڵێ من شایەدیی دەدەم کە هەقی فلان کەسە لەسەر فیسار کەس، ئنجا (الجرجاني) دەڵێ: (فَالإِخْبَارات ثَلاثة: إمَّا بِحَق للغير على آخر، وهو الشهادة، أو بحق للمخبر على آخر، وهو الدعوى، أَو بِالعَكسِ وَهُوَ الإقْرَار)، واتە: هەواڵ پێدانەکان سێ جۆرن: یان هەواڵ پێدانێکی بە هەقە، هەواڵ پێدانێکە بە ئەوەی کەسێك هەقی لەسەر کەسێکی دیکە هەیە، ئەوە شایەدیی پێ دەڵێن، {بۆ وێنە: ئەحمەد ئەوەندە هەقەی لەسەر عەبدوڵڵا هەیە} یاخود هەواڵ پێدانێکە بەوەی ئەو کەسەی کە هەواڵ دەدات، دەڵێ: من هەقم لەسەر فلان کەس هەیە، ئەوە پێی دەگوترێ: دەعوا، (فلان کەس دەعوای هەیە لەسەر فلان کەس، واتە: داوای هەقێکی لێدەکات)، یان بە پێچەوانەوە ئەگەر کەسێك شایەدیی بدات، بەوەی کە هەقێکی کەسێکی لەسەرە، ئەوە پێی دەگوترێ: (الإِقْرَار)، دانپێداهێنان بە هەقی غەیر لەسەر خۆت.

٢) کە دەفەرموێ: ﴿ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ ﴾، یەکێك بۆی هەیە بڵێ: هیچ کەس مردن نابینێ! ڕاستە، بەڵام لێرەدا مانای ئاوایە: (أَي ظَهَرَت أَمَارَاتُهُ) واتە: ئەگەر نیشانەکانو هۆکارەکانی مردنی دەرکەوتن.

٣) کە دەفەرموێ: ﴿ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ﴾، واتە: لە کاتی وەصیەت کردنـدا.

٤) کـە دەفـەرموێ: ﴿ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٍ مِّنكُمۡ ﴾، واتـە: دوو کەسـی خـاوەن دادگـەریی لـە ئێـوە، دادگـەریی یـانی چـی؟ (الجرجـاني) دەڵـێ: (العَـدَالَة: فـي اللغـة: الإسـتقامة وفـي الشـريعة عبـارة عـن الإسـتقامة علـى طريـق الحـق بالإجتنـاب عمـا هـو محـظور دينـاً، والعـدل: فـي اصطلاح الفقهـاء مَـنِ اجتنـب الكبـائر ولم يصـر علـى الصـغائر، وغلـب صـوابه واجتنـب الأفعـال الخسيسـة كالأكـل فـي الطريـق والبـول) (التعريفـات للجرجـاني، ص١٤٨)، واتـە: (العَدَالَة) لە زماندا واتە: ڕێکو ڕاستیی، بەڵام لـە شـەریعەتدا دادگـەریی بریتیە لە ڕاوەستاویی لەسەر شـەریعەت، لەسـەر ڕێـی هـەق، ئەویش بـەوە کە خۆ دوور بگـرێ لـەو شـتانـەی کـە لـە دینـدا قەدەغـەن، دادگەر (العدل أو العادل)یش لـە زاراوی شەرعزاناندا کەسێکە خۆی لە گوناهە گەورەکان بپارێزێ، وە لەسـەر گوناهـە گچـکەکانیش بـەردەوام نـەبـێ، (گونـاهی گـەورە وەك: درۆ، غەیبـەت، بوختـان، قـەتڵ، زینـا، دزیـی... هتـد، ئەوانـە گونـاهی گەورەن، چونکـە گونـاهی گـەورە گوناهێکـە کـە سـزای دنیـایی هـەبـێ، یـان هەڕەشـەی قیـامەتیی لەسـەر بـێ، ئێسـتا غەیبەت سزای دنیـایی نیـە، بەڵام هەڕەشـەی قیامەتیی لەسـەرە، هـەروەها درۆ سزای دنیـایی نیـە، بەڵام هەڕەشـەی قیـامەتیی لەسـەرە)، وە گونـاهی گچـکە جـار جـار لێـی ڕوودەدەن، بـەڵام بـەردەوام نـابێ، (گونـاهی گچـکە وەك: نـەزەر، تۆقـەکردنی پیـاو لەگـەڵ ئافرەت، ئـەو گوناهانـەی کـە سـزای دنیـاییو هەڕەشـەی قیامـەتییان لەسـەر نەبـێ) وە ڕاسـتیی تێـدا زیـاتر بـێ، بـا هەڵـەش بکـات {مەبەسـت لـە (ڕاسـتیی) (صـواب) لێـرەدا پێچـەوانەی درۆ نیـە، واتـە: زۆر بـە کەمیی شتی لە بیـر بچـێو پێکـانی زیـاتر بـێ لـە نـە پێکـانیو بەهەڵـەداچوونی} وە خۆشـی لـە کـردەوە نـزمو پەسـتەکان بپـارێزێ، (کـردەوەی نـزمو پەسـت وەك: بەپێوە شـت خـواردن لەبەرچـاوی خەڵـك، یـان بـە پێـوە تـارەت گـرتن، یـانی: بـا گونـاهیش نەبـێ، بەڵام دادگـەریی ئەو کەسـە پێی دەڕووشـێ).

هەڵبەتـە بـە بۆچوونـی مـن ئـەوە بـە پێـی عـورفو عـادەتو کـاتو شـوێنی ژینگـەکان دەگـۆڕێ، بـۆ وێنـە لـە وڵاتـانی دنیـادا بـە شـێوەکی گشـتی وایـە کـە

خەڵك بە پێوە نان دەخوات، مەرجیش نیە عەدالەتیان بڕووشێ، یان یەکێك لە سەفەرە، یان شوێنەکەی وایە لە پەنایەك تارەت دەگرێ، با خەڵکیش چاوی لێبێ، مەرج نیە دادگەریی پێ بڕووشێ، کەواتە: ئەوە پەیوەندیی بە عورف و عادەتەوە هەیە، ئەگەر عورف و عادەتی ئەو کۆمەڵگایە ئەو شتەیان پێ پەست و نزم بوو، ئەوە دیارە کاریگەریی لەسەری دەبێ، ئەگەرنا هیچ شوێنەوارێکی نابێ.

٥) کە دەفەرموێ: ﴿أَوۡ ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ﴾، واتە: غەیری مسوڵمانان، جا خاوەن کتێبەکان بن، یاخود غەیری ئەوان، هەندێکیش گوتوویانە: واتە: لە غەیری خزمەکانتان، بەڵام لەڕاستییدا ئەو مانایە بەهێز نیە، چونکە ئایەتەکە بە: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾، دەست پێدەکات، غەیری ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ﴾ش، نامسوڵمانانن.

٦) کە دەفەرموێ: ﴿إِنۡ أَنتُمۡ ضَرَبۡتُمۡ فِى ٱلۡأَرۡضِ ﴾، واتە: ئەگەر ئێوە سەفەرتان کرد، جا لە قورئاندا لە زۆر شوێنان وشەی (ضَرَبَ) بە مانای لێدان هاتوە، بەڵام (ضَرَبَ فِي الأَرْضِ) واتە: پێی بە زەوی دادا، کە هەر کاتێك ئینسان بە سەفەر چووە دەرێ، وەختێ بە زەوی دا دەڕوات، دەبێ پێی بە زەوییدا بکوتێ.

٧) کە دەفەرموێ: ﴿فَأَصَـٰبَتۡكُم مُّصِيبَةُ ٱلۡمَوۡتِ ﴾، واتە: بەڵای مردنتان تووش بوو، واتە: پێشەکی نیشانەکانی دەرکەوتوون، وەك پێشتریش گوتمان.

٨) کە دەفەرموێ: ﴿تَحۡبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ ﴾، واتە: ڕایاندەگرن، دوای ئەوەی کە نوێژ کرا، زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست پێی نوێژی عەسرە، هەندێکیش دەڵێن: نوێژی نیوەڕۆیە، هەندێك دەڵێن: نوێژی بەیانییە، ڕایاندەگرن، دوای ئەوەی کە نوێژ کرا، سوێندیان دەدەن، حیکمەتی ئەوەش کە دوای نوێژە، لەبەرئەوەی خەڵك کۆدەبێتەوە، وە کاتێکی موبارەکەو فەریزەیەکی گەورەی خوای پەروەردگار جێبەجێ کراوە، کاتەکەو شوێنەکە هەیبەتی ڕووحییان زیاترە، بۆیە لەو کاتەدا کە سوێند دەدرێن، نزیکترە لەوەی بە درۆ سوێند نەخۆن، هەندێکیش گوتوویانە:

﴿مِنۢ بَعۡدِ ٱلصَّلَوٰةِ﴾، دیاریی نەکردوە چ نوێژێك، بۆیە مەبەست پێی نوێژی خۆیانە، واتە: ئەگەر جوولەکەیە، نەصرانییە، کاتی نوێژیان کەنگێیە؟ دوای نوێژەکەی خۆیان کە ئەو عیبادەتە ئەنجام دەدەن، سوێند دەدرێن، بەڵام زیاتر واپێدەچێ مەبەست پێی نوێژی مسوڵمانان بێ.

٩) کە دەفەرموێ: ﴿فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ﴾، یانی: (يَحْلِفَان) واتە: سوێند بە خوا دەخۆن، کەواتە: بابای نەصرانیی‌و جوولەکە نابێ بە غەیری خوا سوێند بدرێ، یانی: گریمان ئەگەر ئەو پێشی وابێ بۆی هەیە سوێند بە عوزێر بخوات، بە مووسا، بە عیسا، بە مەریەم بخوات، دروست نیە، تۆ بە غەیری خوا سوێندی بدەی، دەبێ بەس بە خوا سوێند بدرێ.

١٠) کە دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ﴾، واتە: ئەگەر کەوتنە گومانەوە، لەوەی کە ڕاست دەکەن، ئەدی ئەگەر نەکەوتنە گومانەوە؟ دیارە ئەو کاتە پێویست ناکات سوێندیان بدەن، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ﴾، ئەگەر کەوتنە گومانەوە، یانی: ئەگەر نەکەوتنە گومانەوە، پێویست ناکات سوێند بدرێن.

١١) کە دەفەرموێ: ﴿لَا نَشۡتَرِي بِهِۦ ثَمَنٗا﴾، واتە: بەو سوێندەمان هیچی پێناکڕین، هیچ نرخێکی پێناکڕین، یانی: هیچ مەبەستێکی خۆمانی پێ جێبەجێ ناکەین، بەڵکو حەقیقەتەکە چۆنە ئاوای ڕادەگەیەنین.

١٢) کە دەفەرموێ: ﴿وَلَوۡ كَانَ ذَا قُرۡبَىٰ﴾، واتە: ئەو کەسەی کە سوێندی بۆ دەخۆین، یاخود سوێندی لەسەر دەخۆین‌و شایەدیی لەسەر دەدەین، با خزمیشمان بێ، ئێمە شایەدییەکە ناگۆڕین، چۆن هەقە وای دەڵێین، واتە: ڕەچاوی ئەوە ناکەین خزمە یان بێگانەیە، دەیناسین، یان نایناسین.

١٣) کە دەفەرموێ: ﴿وَلَا نَكۡتُمُ شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ﴾، واتە: ئەو شایەدییەی کە خوا فەرمانی پێکردوە جێبەجێ بکرێ نایشارینەوە، بۆیە دەفەرموێ: (شَهَٰدَةَ ٱللَّهِ) چونکە ئەو سوێندەی کە دەخورێ خوا فەرمانی پێکردوە، وە سوێندەکەش بە

خوا دەخورێ، وە شایەدییەکەش بە ناوی خوا دەدرێ، دەگوترێ: (أَشْهَدُ بالله) ئەو شتە وایە.

١٤) کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْأَثِمِينَ ﴾، واتە: ئێمە ئەگەر شایەدیی بشارینەوەو سوێندی بە درۆ بخۆین، مانای وایە ئێمە لە گوناهبارانینو لەو گوناهەدا غەرق بووین.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴾، پێشتریش باسمان کرد، ئەو دوو کەسەی کە دەکرێنە وەصیەتکار، وە دوایی کە دێنەوە کەلوپەلی مردووەکە تەسلیمی کەسوکاری مردووەکە دەکەن، ئەگەر لێیان کەوتنە گومان سوێندیان دەدەن، ئەگەر سوێند دران، دوایی دەرکەوت کە شتێکیان پەنهان کردووەو شاردۆتەوەو دزیوە، ئەوە باسی ئەوە دەکات، ﴿ فَإِنْ عُثِرَ ﴾، تەماشا بکەن! خوای کاربەجێ چەند بە وردیی و بە گرنگیی و بایەخ پێدانەوە بە تەنگ ماڵو سامانی خەڵکەوەیە، مرۆڤێك کە دەمرێو خەریکی مردنێیە، ئەگەر مسوڵمانی چنگ کەوتن وەصیەتیان بۆ دەکات، دوو مسوڵمانی دادگەر، ئەگەر ئەوە نەبوو، ئەوە دوو کافر دەکرێنە وەصیەتکار، وە ئەگەر خزمی مردووەکە متمانەیان پێکردن باشە، ئەگەر متمانەیان پێنەکردن، سوێندیان دەدەن، وە ئەگەر سوێندیشیان دانو دوای سوێنددانیش دەرکەوت خیانەتیان کردوە، ئەوەش خوای کاربەجێ چارەسەری بۆ داناوەو دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا ﴾، ئەگەر پێزانرا، دۆزرایەوەو ئاشکرا بوو کە ئەوانە گوناهێکیان لەسەر خۆیان پێویست کردوە، چونکە ﴿ ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا ﴾، واتە: گوناهێکیان لەسەر خۆیان پێویست کردووەو خیانەتیان کردوە، لەو حاڵەتەدا ﴿ فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا ﴾، دووی دیکە دێن لە شوێنی ئەوان سوێند دەخۆن، ﴿ مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ ﴾،

لەوانەی کە گوناهەکەیان بەرانبەر کراوە، واتە: ئەو میراتە میراتی بابای مردووە بۆ خزمەکانی دەچێتەوە، کەواتە: ئەوانەی خیانەتیان لێکراوە، دوو نەفەر لەوان دێن شایەدیی دەدەن، ئنجا ئەوە خوێدراویشەوە: (مِنَ الَّذِينَ اسْتُحِقَّ عَلَيْهِمِ) ئەوانەی ستەمیان لێکراوە لەلایەن دوو وەصیەتکارەکەی پێشوو، ﴿ٱلۡأَوۡلَيَٰنِ﴾، واتە: دوو کەسی کە نزیکترن، کێ و کێ خزمی زۆر نزیکی مردووەکەن، ئەو دووانە دێن سوێند دەخۆن، دەڵێن: ئەوانە ئەوەیان شاردۆتەوە، ﴿فَيُقۡسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ﴾، سوێند دەخۆن شایەدیی دانی ئێمە ﴿أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا﴾، راستترەو شایستەترو هەقترە لە شایەدییدانی ئەو دووانە، کە سوێندتان داون، ﴿وَمَا ٱعۡتَدَيۡنَآ﴾، وە ئێمە دەستدرێژیی ناکەین، ﴿إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴾، ئەگەر دەستدرێژیی بکەین، ئێمە لە ستەمکارانین، دەڵێ: ﴿فَإِنۡ عُثِرَ﴾، واتە: دوای ئەوەی کە سوێنددراون و پێی زانرا، کە پێی دەزانرێ دەبێ شتەکە هەبێ، وەك لە هۆی هاتنە خوارەوەکەیدا باسمان کرد، جامێکی زیو بووە، بە زێڕ نەخشێنراوە، وە دیارە جامێکی مەشهووریش بووە، دوایی لەلای کەسانێی دیکە دۆزراوەتەوە، ئەوانیش گوتوویانە: لەو دوو کەسەمان کڕیوە، ئەوانیش دوایی دانیان پێداهێناوە، ئاوا دەبێ نیشانەو بەڵگەیەك هەبێ، ئەگەرنا هەر لەخۆوە بابای گومانلێکراو تۆمەتبار بکرێ، ئەوە گوناهە، چونکە دوایی رێ دەکرێتەوە بۆ خەڵك وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەری خوا ﷺ هاتووە دەفەرمویێ: ﴿الْبَيِّنَةُ عَلَى مَنِ ادَّعَى، وَالْيَمِينُ عَلَى مَنْ أَنْكَرَ﴾ {أَخْرَجَهُ البَيهَقِيّ فِي (الكبرى) برقم: (٢٠٣٢٤)، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ رَضِيَ اَللّٰهُ عَنْهُمَا، وَصَحَّحَهُ الأَلبَانِي فِي (إرواء الغليل) برقم: (٢٦٨٥)}، واتە: کەسێك ئیددیعایەك بکات دەبێ بەڵگەیەکی روون بێنێ، (واتە: دوو شایەد)، وە ئەوەش کە نکووڵیی لێدەکات سوێند خواردنی لەسەرە، ئەگەرنا کەسێك هەر لە خۆڕا بڵێ سوێند دەخۆم کە ئەو ئەندازەیەم لەسەر فلان کەسە، یەکسەر هەقەکەی بچێتە سەری، ئەوە دەبێتە زوڵم! نەخێر، دەبێ بەڵگەی بەدەستەوە هەبێ، بەس سوێند خواردنەکەی پاڵپشتە بۆ بەڵگەکەی، ئەگەرنا بەبێ بەڵگەو بەس بە سوێند، کەس هیچ دەعوایەکی بۆ ناچەسپێ، کەواتە: سەرەڕای هەبوونی بەڵگە، ئنجا دەبێ

سوێندیش بخورێ، چونکە خوا دەفەرموێ: ئەو دوو شایەدەی کە وەصیەتیان بۆ کراوە، ﴿ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا﴾، واتە: گوناهێکیان لەسەر خۆیان پێویست کردوە، (فَعَلوا مَا يُوجَبُ إِثماً من خِيَانَةٍ أو غلولِ شَيءٍ مِنَ المَالِ المُوصَى بِهِ إليهِ) واتە: کردەوەکیان کردوە وەك خیانەت یان شاردنەوە لەو ماڵەی کە وەصیەتیان بۆ کراوە، جا کە دەفەرموێ: ﴿فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا﴾، دوو پیاوی دیکە لە جێی ئەو دووانە دێن کە خیانەتەکەیان ئاشکرا بووە، سوێند دەخۆن بۆ دەرخستنی ئەو هەقەی کە بەڵگەیەکیان بە دەستەوەیە لەسەری، کە دەفەرموێ: ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَٰنِ﴾ (أي من ورثة استُحِقَ من بينهم الأَوْلَيان)، واتە: لە خزمانی مردووەکە کە گوناهێکیان بەرانبەر کراوە، خیانەتێکیان لێکراوە، دوو کەسی کە نزیکتربن لە مردووەکە، واتە: میراتگربن، یاخود شایستەتربن، بۆئەوەی کە سوێند بخۆن، وە شایەدیی بدەن، وە هەروەها خوێندراویشەتەوە (الأَوَّلَيْنِ) واتە: دوو کەس کە ئەوەڵ بن لە ڕیزبەندیی خزمەکاندا، ﴿فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعْتَدَيْنَآ﴾، واتە: سوێند بە خوا دەخۆن کە شایەدییدانی ئێمە ڕاستترە لە شایەدییدانی ئەو دووانەی کە درۆیان کردوەو خیانەتیان کردوە، وە ئێمە سنوورمان نەبەزاندوە.. ئنجا (ابن جرير) لە (ابن عباس و ابن جُبير)و غەیری ئەوانیش دێنێ و تەفسیری ئەو ئایەتە دەکات دەڵێ: {إن الرجل إذَا حَضرتهُ الوفاةُ في سفر، فَلْيشْهِدْ رجلين من المسلمين، فإن لم يجد فرجلين من أهل الكتاب يوصي إليهما، ويدفعُ إليهما ميراثهُ، فإذا قدما بتركته، فإن صدّقهما الورثة وعَرَفُوا ما لصاحبهم، قُبِل قولُهما وتركا، وإن اتهموهما رفعوهما إلى السلطان فحلفا بعد صلاة العصر: بالله ما كتمنا ولا كذبنا ولاخُنَّا ولا غيَّرنا، فإن اطَّلَع الأولياء على أن الكافرين كَذِباً في شهادتهما، قام رجلان من الأولياء فحلفا بالله: (إن شهادة الكافرين باطلة، وإنا لم نعتد) فتردُّ شهادة الكافرين، وتجوزُ شهادة الأولياء} (تفسير الطبري رقم: (١٢٩٧٩))، واتە: دەڵێن: ئەگەر پیاوێك لە سەفەرێ مردنی گەیشتە سەر، با دوو پیاوی مسوڵمان

بكاتە شایەد، وە ئەگەر دوو پیاوی مسولّمانی دەست نەكەوتن، با دوو پیاو لە خاوەن كتێبەكان (ئەو دەڵێ خاوەن كتێب واتە: جوولەكەو نەصرانیی، چونكە ئەو كاتە هەر ئەوان لە كۆمەڵگای ئیسلامیی ئەوسادا زیاتر هەبوون، ئەگەرنا غەیری ئەوانیش دەگرێتەوە، ئەگەر خاوەن كتێبیش نەبن، با بتپەرستیش بن) وەصیەتیان بۆ دەكات وە میراتەكەی خۆی تەسلیمی ئەو دووانە دەكات، ئنجا هەر كاتێك ئەو دوو نەفەرە هاتنەوە، (جا چ دوو مسولّمانەكە بن، چ دوو نامسولّمانەكە بن)، وە میراتەكەیان هێنایەوە، بۆ لای خزمەكانی، ئەگەر میراتگرەكان بە ڕاستیان دانان‌و زانییان مردووەكە ئەوەندە ماڵ‌و كەلوپەلەی هەبووە، ئەوە قسەكەیان وەردەگیرێ‌و وازیان لێ دەهێنرێ، (ماڵتان ئاواو خوا پاداشتتان بداتەوە، كە میراتەكەتان هێنایەوە)، بەڵام ئەگەر تۆمەتباریان كردن (واتە: لێیان كەوتنە گومان) ئەوە دەیانبەن بۆ لای حوكمڕان، بۆ لای قازی لەوێ دوای نوێژی عەسر سوێند بە خوا دەخۆن، دەڵێن: نە شاردوومانەتەوە، نە درۆمان كردووە، نە خیانەتمان كردووە نە گۆڕیمانە، ئنجا دوای سوێندەكەش ئەگەر خزمە نزیكەكانی مردووەكە پێیانزانی، كە ئەو دوو كافرە درۆیان كردووە لە شایەدیی دانەكەیاندا، دوو پیاو لە خزمانی مردووەكە هەڵدەستن سوێند بە خوا دەخۆن كە شایەدیی دانی ئەو دووانە بە تاڵ (باطل)ە، بەو بەڵگانە، وە ئێمە سنوورشكێنییمان نەكردووە، لەو كاتەدا شایەدییدان‌و سوێندی دوو كافرەكە كە خیانەتیان كردووە، بە پووچ دادەنرێ، یاخود ڕەت دەكرێتەوە، وە شایەدییدانی دوو خزمی مردووەكە جێی خۆی دەگرێ.

**مەسەلەی چوارەم:** كە دەفەرمووێ: ﴿ ذَٰلِكَ أَدْنَىٰٓ أَن يَأْتُواْ بِٱلشَّهَٰدَةِ عَلَىٰ وَجْهِهَآ أَوْ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيْمَٰنٌۢ بَعْدَ أَيْمَٰنِهِمْ ۗ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسْمَعُواْ ۗ وَٱللَّهُ لَا يَهْدِى ٱلْقَوْمَ ٱلْفَٰسِقِينَ ﴾، ئا ئەمە، ئەو حوكمە شەرعییە نزیكترە لەوەی كە شایەدییەكە وەك خۆی بدەن، مرۆڤ ئەگەر بزانێ لێی ناپرسرێتەوەو بە دوای داناچن، وە دین‌و تەقواشی نەبێ، بە كەیفی خۆی قسان دەكات‌و نیوەی ماڵەكەش ڕەنگە بەلاوە بنێ، بڵێ: ئەوەندە بوو، بگرە ڕەنگە بڵێ: مردووەكە قەرزداری منیشە! بەڵام ئەگەر بزانێ لێی دەپرسرێتەوە، وەك حوكمە شەرعییەكە دەفەرموێ: ئەوە نزیكترە لەوەی كە شایەدییەكە وەك خۆی بدات، یاخود بۆ ئەوە كە بترسێن كە

ســـوێندەکانیان ڕەت بکرێنــــەوە، ﴿أَوۡ يَخَافُوٓاْ أَن تُرَدَّ أَيۡمَٰنُۢ بَعۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ﴾، دوای ســوێنددانی ئــەوان کــە خزمــانی مــردوو ســوێند دەخــۆن بــە بەڵــگەوە، ئــەو کاتــە سوێندەکەی وان بــە پــووچ دادەنــرێ، چــونکە دەرکــەوتوە کــە ســوێندەکەیان بــە درۆ خــواردوە، لەو ئامانجە نــزیکتــرە، چونکــە دوایــی دەفــەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡمَعُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ﴾، وە پــارێز لــە خــوا بکــەن و ببیســتن، وە خــوا ڕێنمــایی لاڕێبوان ناکــات.

## چەند حوکمێکی شەرعی کە لەم ئایەتانەوە وەردەگیرێن

١/ ڕەوایی وەصــیەت و پێویســتبوونی لەسەر کەسێك کە لــە مــەرگ نــزیك دەبێتــەوە، کەســێك کــە زانــی دەمــرێ بــۆی هەیــە، بەڵــکو زۆربــەی زانایان دەڵێن: لەســەری فەرزە وەصــیەت بکــات، چونکــە لێــرەدا دەفــەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَٰدَةُ بَيۡنِكُمۡ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ حِينَ ٱلۡوَصِيَّةِ ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾، وەك هــەواڵ پێــدان دەفــەرموێ، بــەڵام وەك فــەرمان وایــە، واتــە: ئەگــەر زانیــت دەمری، وەصــیەت بکــە!

٢/ بابــای نزیکــە مــەرگ، مادام عەقڵــی چەسپاوبێ، وەصیەتەکەی ئیعتیبــاری پــێ دەکــرێ، چــونکە دەفـــەرموێ: ﴿إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلۡمَوۡتُ﴾، بــەڵام هـــەندێ کـــەس هەیـــە دەکەوێتـــە گیـــانەڵاو کـــەس لـــێی تێنـــاگات، هۆشـــی لـــەلای خـــۆی نەمــاوە، ئەوە وەصــیەتەکــەی ئیعــتیبــاری پێنــاکرێ.

٣/ شــایەدییــدانی وەصــیەت پێویســتی بە دوو کــەس هەیە، وەك ئایەتەکە دەفــەرموێ: ﴿ٱثۡنَانِ ذَوَا عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾، یــان ﴿ءَاخَرَانِ مِنۡ غَيۡرِكُمۡ﴾، واتــە: دوو کەســی

دادگەرو جێی متمانە بن، ئەگەرنا نابێ ئەوەی وەصیەتی بۆدەکرێ، یەك کەس بێ.

٤/ ڕەوایی شایەدییدانی کافران لەو جۆرە وەصیەتەدا، لەبەر پێویستیی (ضرورة)، وە ئەوانەش کە دەڵێن: نەسخ کراوەتەوە، لەڕاستییدا هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نیە، بەڵکو دروستە کافر لەو حاڵەتانەدا بکرێنە شایەد، مادام مسوڵمان چنگ نەکەون، وەك لە ئایەتەکەدا دەفەرموێ: ﴿أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾.

٥/ لەو ڕستەیە وەردەگیرێ کە بەگشتی شایەدییدانی کافران لە کاتی پێویستییدا وەردەگیرێ، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾، مانای وایە لەو جۆرە حاڵەتانەدا وەك چۆن شایەدیی لە مسوڵمانان وەردەگیرێ لە کافرانیش وەردەگیرێ، کە ئەوە ڕای (إبن تیمیة)و کۆمەڵێك لە زانایانی دیکەشە، وە هەر ئەو ڕایەش ڕاستە، چونکە ئەگەر مسوڵمان لەوێ نەبوون، خۆ نابێ ئەو ماڵە زایە ببێ!

٦/ ڕەوایی سەفەرکردنی مسوڵمان لەگەڵ کافراندا، چونکە ئایەتەکە دەفەرموێ: ﴿أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ﴾، واتە: ئەو دوو نەفەرە لە نامسوڵمانان کە لەگەڵ ئەو مسوڵمانەن، کەواتە: دروستە مسوڵمان سەفەر لەگەڵ نامسوڵماناندا بکات، سەفەری بازرگانیی، سیاسیی، گەشتو گەڕان ... هتد، مادام متمانەی پێیان هەبێ.

٧/ ڕەوایی سەفەر بۆ بازرگانیی، چونکە دەفەرموێ: ﴿إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ ئەگەر ئێوە بەسەفەر چوون، دیارە بۆ بازرگانیی، کەواتە: دروستە ئینسان بۆ بازرگانی سەفەر بکات، هەتا بۆ وڵاتی کافران، بۆ شوێنی دوور.

٨/ کەوتنە گومان لە شایەدییدان دا، پاساوی سوێند دانی شایەدەکانە، کاتێك کەسێك شایەدیی دەداتو لێی دەکەویە گومان، دروستە بڵێی: سوێندیشم بۆ بخۆ! چونکە دەفەرموێ: ﴿تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ﴾، ئەگەر لێیان کەوتنە گومان لە دوای نوێژ سوێندیان بدەن،

هەڵبەتە وەك گوتم لە دوای نوێژ مەبەست پێی ئەوەیە زیاتر حاڵەتێكی ڕووحیی دروست بێ، وە ئەو كەسە هەست بە ترس و سامو هەیبەتێك بكات، بۆئەوەی شایەدییەكەی چاكتر بدات، سوێندەكەی ڕاستتر بخوات.

٩/ بەڵام ئەگەر گومان لە گۆڕێ دا نەبوو، تۆمەت لە ئارادا نەبوو، پێویست بە سوێندان ناكات، چونكە ئایەتەكە دەفەرموێ: ﴿ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ ﴾، ئەگەر كەوتنە گومان، ئەدی ئەگەر نەكەوتنە گومان؟ ئەوە پێویست ناكات.

١٠/ شایەدییدان شتێكی زۆر گەورەیە، چونكە ئایەتەكە دەفەرموێ: ﴿وَلَا نَكْتُمُ شَهَـٰدَةَ ٱللَّهِ ﴾، وە شایەدیی خوا ناشارینەوە، جا چ مەبەست پێی سوێند خواردن بە خوا بێ، چ مەبەست پێی شایەدیدان بێ، كە هەردووكیشیان تێكهەڵكێشن، جاری وایە كەسێك دەبێتە شایەد، سوێندیشی دەخرێتە سەر، شایەدیی و سوێند شتێكی گەورەیە، بۆیە خوای بەرز پاڵی داوەتە لای خۆی.

١١/ دروستە شایەدەكان تاقیبكرێنەوە لە كاتی گوماندا، وە لە یەك جیابكرێنەوە، بە جیا لێیان بپرسرێ، ئەوەش دروستە، بۆئەوەی زیاتر حەقیقەت دەربكەوێ.

١٢/ هەبوونی نیشانەو قەرینە جێداریی بەڵگەیە، واتە: نیشانە (قرينة) ئەوەیە شتەكە تەواو نەچەسپێ، بەڵگە ئەوەیە شتەكە تەواو بچەسپێ، ئەگەر قەرینەو نیشانەیەكیش هەبێ لە شوێنی بەڵگە دادەنرێ لە حاڵەتی درۆكردنی وەصیەت بۆ كراوەكاندا، وە پاش سوێند خواردنی دوو كەسی نزیكی مردووەكە، ئەو كاتە شایەدییەكەیان لێ هەڵدەوەشێتەوە[1].

---

١) تيسير كريم الرحمن في تفسير كلام المنان: ص٢٤٧.

# ئایا ڕاستە ئەم ئایەتە نەسخ کراوەتەوە؟!

زەیـــدی کوڕی ئەسلەمو نەخەعییو مالیكو شافیعییو ئەبو حەنیفە ڕەحمەتی خـوایان لـێ بـێ، ئـەم ئایەتـە بـە مەنسـووخ دادەنێن، وە بەڵـگەش بـەو ئایـەتـەی سوورەتی (البقرة) دێننەوە، کە دەفەرموێ: ﴿مِمَّن تَرْضَوْنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴿٢٨٢﴾﴾، دەڵێن: کەواتە: کافر لەو شایەدانە نین کە مسـولمانان لێیان ڕازی بن، ئایەتەکەش دەفـەرموێ: لەو شـایەدانەی کە لێیـان ڕازیـن، هـەروەها کە دەفەرموێ: ﴿ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾، دوو کەسی دادگەر لە خۆتان بە شایەد بگرن، کەواتە: دەبـێ لە مسـولمانان بن، وە لە سـوورەتی (الطلاق)دا دەفەرموێ: ﴿وَأَشْهِدُواْ ذَوَىْ عَدْلٍ مِّنكُمْ﴾، واتە: وە دوو کەسـی خـاوەن دادگـەریی لەخۆتـان بە شـایەد بگـرن، بـەڵام (أبي موسـى الأشـعري، وسعيد بن المسيب، ويحيى بن يعمر؛ وسعيد بن جبير وأبي مجلـز وإبـراهيم وشـريح وعبيـدة السـلماني، وابـن سـيرين ومجاهـد وقتـادة والسدي وابن عبـاس وغيرهم. وقال به من الفقهاء: سفيان الثوري؛ ومال إليه أبو عبيد القاسم بن سلام) هەموویان گوتوویانـە: ئـەم ئایەتـە موحکەمـەو مەنسـووخ نیە، وە شـایەدییدانی ئەهلی زیممـە، واتە: نامسـوڵمانێك کە هـاوپەیمانن لـە وڵاتـی مسـوڵماناندا دەژیـن، دروسـتە لـە سـەفەردا، مـادام مسـوڵمانان لـەوێ نـەبن، وە کـە دەشـفەرموێ: ﴿مِّنكُمْ﴾، واتـە: لـە ئیمانـداران، بـەڵام کـە دەفـەرموێ: ﴿مِنْ غَيْرِكُمْ﴾، واتە: لە نامسـوڵمانان.

وە (القُرطُـبي) دەڵـێ: (وما ادعوه من النسخ لا يصحُّ فإن النَّسخ لابُد فيه من إثبات الناسخ على وجه يتنافى الجمع بينهما مع تراخي الناسخ؛ فما ذكروه لا

يصح أن يكون ناسخاً؛ فإنّه في قصة غير قصة الوصية لمكان الحاجة والضرورة؛ ولا يمتنع اختلاف الحكم عند الضرورات؛ ولأنّه ربّما كان الكافر ثقة عند المسلم يرتضيه عند الضرورة؛ فليس فيما قالوه ناسخ)[1]، واتە: ئەوەی کە گوتوویانە: ئەو ئایەتە نەسخ بۆتەوە، ڕاست نیە، چونکە کە دەگوترێ نەسخ، دەبێ لابەر (ناسخ)ی زۆر ئاشکرابێ، بەڵام لێرەدا دیارنییە، وە پێکەوەش دژنین، ئایەتەکانی دیکە کە دەفەرموون: دوو نەفەر با لەخۆتان شایەدبن، ئەوەی سووڕەتی (البقرة)و (الطلاق)، واتە: لە کاتێکدا کە مسوڵمان هەبن، ئەدی ئەگەر مسوڵمان نەبوون؟ لە سەفەر کابرا لێی قەوماوەو لە غەریبایەتییەو بەس کافری لێن، ئەو ئایەتە باسی ئەو حاڵەتە هەڵاویردراو (إستثناء)یە دەکات، کە لە کاتی ناچاریی دایە، وە بەتایبەتی ئەگەر کافرەکان جێی متمانەی ئەو مسوڵمانە بن، وە لێیان ڕازی بێ، ئەوەش کە دەفەرموێ: ﴿مِمَّن تَرۡضَوۡنَ مِنَ ٱلشُّهَدَآءِ ﴿٢٨٢﴾﴾، کابرا لە شایەدییدانی ئەو کەسە ڕازییە، با کافریش بێ، مادام متمانەی پێی هەیە، ئەوە دروستە وەصیەتی بۆ بکاتو دروستە بیکاتە شایەد.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

١) الجامع لأحكام القرآن: ج٦، ص٣٠٦.

# دەرسی بیست و چوارەم

## پێناسەی ئەم دەرسە

ئەم دەرسە حەوت ئایەت دەگرێتە خۆی لە سوورەتی (المائدة) ئایەتەکانی (١٠٩ تاکو ١١٥)، دیارە لە ئایەتی یەکەمیاندا خوا ﷻ باسی ئەو کاتە دەکات کە تێکڕای پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کۆدەکاتەوە، واتە: لە ڕۆژی دوایی دا، وە لێیان دەپرسێ: ئایا چیتان وەڵامدراوەتەوە لەلایەن ئۆممەتەکانتانەوە؟ ئەوانیش دەفەرموون: ئێمە بە تەواوی نازانین هەر خۆت زانای نهێنییەکانی، واتە: هەر بۆخۆت بە تەواویی حاڵو باڵی میللەتانو ئۆممەتانی ئێمە دەزانی، کە چۆن بوونو چۆنیان وەڵام داوینەوە؟

پاشان خوای زاناو شارەزا ئەو کاتە دەخاتەوە یاد، کە چاکەو نیعمەتەکانی خۆی خستۆتە بیر عیسای کوڕی مەریەم سەلامی خوایان لێبێ، لە پشتگیرییکرانی بە (روح القدس)، بەوە کە لە بێشکەدا قسەی لەگەڵ خەڵکدا کردوە، هەروەها لە حاڵەتی کامڵییشدا، وە ئەوە کە خوا کتێبو حیکمەتو تەوراتو ئینجیلی فێر کردوە، وە ئەوە کە یارمەتی داوە لە قوڕ باڵندە دروست بکات، وە پاش ئەوەی کە فووی پێدا کردوە، ئەو باڵندەیە شێوە ژیانێکی بە بەردا کراوەو فڕیوە، وە پاشان ئەوە کە کوێری زگماكو بەڵەکی زگماکی چاك کردۆتەوە، وە مردووی زیندوو کردوونەوە، وە لە دەستی جوولەکەکان چەپاڵەی داوە.

وە پاشان خوای پەروەردگار باسی ئەوە دەکات کە وەحی ناردوە بۆ حەوارییەکان، کە دیارە لێرەدا وشەی وەحی بە مانای ئیلهامو خستنە نێو دڵ دێ، کە ئیمان بە خۆیو بە پێغەمبەرەکەی بێنن، کە عیسایە ؑ.

وە لە چوار ئایەتی کۆتایی ئەم دەرسەماندا خوای پەنهانزان باسی سێیەمین بەسەرهات دەکات، کە لەم سوورەتەدا هاتوە، وە سوورەتەکەش هەر بەناوی ئەو

بەسەرهاتەوە ناونراوە، ئەویش بەسەرهاتی سفرەو خوانە، سفرەیەك كە خواردنی لەسەر بێ، كە حەوارییەكان داوایان لە عیسا ﷷ كردوە، بۆیان لە خوا بپاڕێتەوە، سفرەو خوانێكیان لە ئاسمان بۆ بنێرێتە خوار، وە ئەویش دیارە داواكەی ئاراستەی خوای پەروەردگار كردوە، بە ئەدەبو ڕێزێكی زۆرەوە، وە خوای پەروەردگاریش وەڵامەكەی ئەرێنیی بووەو فەرموویەتی: بەڵێ، من ئەو سفرە پڕ خواردنە دەنێرمە خوار، بەڵام بە مەرجێك هەر كەسێك پاش دابەزینی ئەو سفرەیە بێبڕوابێ، ئەوە بە شێوەیەك سزای دەدەم، كە هیچ كەس لە جیهانییانم بەو شێوەیە سزا نەداوە.

﴿يَوْمَ يَجْمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبْتُمْ ۖ قَالُوا۟ لَا عِلْمَ لَنَآ ۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ
ٱلْغُيُوبِ ﴿١٠٩﴾ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِى عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ
إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِى ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ۖ وَإِذْ عَلَّمْتُكَ
ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ۖ وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ
بِإِذْنِى فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى ۖ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ۖ
وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم
بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴿١١٠﴾ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى
ٱلْحَوَارِيِّۦنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾
إِذْ قَالَ ٱلْحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيْنَا
مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۖ قَالَ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾ قَالُوا۟ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ
مِنْهَا وَتَطْمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعْلَمَ أَن قَدْ صَدَقْتَنَا وَنَكُونَ عَلَيْهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴿١١٣﴾
قَالَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلْ عَلَيْنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا
لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَ ۖ وَٱرْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴿١١٤﴾ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مُنَزِّلُهَا
عَلَيْكُمْ ۖ فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّىٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ
﴿١١٥﴾﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((ڕۆژێـــك كـە خـوا پێغەمبـەران كۆدەكاتـەوە، دەفـەرموێ: بـە چـی وەڵامدرانـەوە لەلایـــەن ئۆممەتەكانتانـــەوە؟ گوتیـان: زانیارییمـان نیـە، بێگومـان هـەر تـۆ زانـای نهێنییـەكانی، ﴿١٠٩﴾ یادبكـــەوە كاتێـك خـوا فـەرمووی: ئـەی عیسـای كـوڕی مەریـەم! چاكـەی من بەسەر خۆتو دایكـتەوە یادبكـەوە، كە بە گیـانی پاك پشـتم گرتی، لـە لانكـداو، بـە كامڵـیی قسـەت لەگـەڵ خـەڵكی دا دەكرد، وە كاتێك كتێبو حیكمـەتو تـەوراتو ئینجیلـم فێـركردی، وە كاتێك بـە مۆڵـەتی مـن شـێوەی باڵنـدەت لـە قـوڕێ دروسـت دەكرد، ئنجا فووت پێـدا دەكردو بە مۆڵـەتی من دەبوو بـە باڵنـدەی زینـدوو، وە كوێـری زگمـاكو بەڵەكـت بە مۆڵـەتی مـن چـاك دەكـردەوە، وە كاتێك بـە مۆڵـەتی مـن مردووانـت بـە زینـدووكراوەیی لـە گۆڕەكانیـان دەردەهێنـا، وە كاتێك دەسـتی بـەنی ئیسـرائیلم لـە تـۆ گێـڕایەوەو نەمهێشـت زیـانت لێبـدەن، كاتێـك بـە بەڵـگە ئاشـكرایەكانەوە هاتیـە لایـان، ئنجا ئەوانـەیان كـە بێبـڕوا بـوون، گوتیـان: ئەمـە بـەس جـادوویەكی ئاشـكرایە ﴿١١٠﴾ وە كاتێـك سرووشـم بـۆ حەوارییـەكان كـرد، (خسـتمە دڵیانـەوەو خورپـەم بـۆكردن) كـە بـڕوا بـە خـۆمو بـە پێغـەمبەرەكەم بهێنـن، گوتیـان: ئیمـانمان هێنـا، شـایەدبە كـە ئێمـە گەردنكەچیـن ﴿١١١﴾ كاتێـك حەوارییـەكان گوتیـان: ئـەی عیسـای كـوڕی مەریـەم! ئایـا پـەروەردگارت دەتوانـێ خـوانێكی خـواردنمان لـە ئاسـمانەوە بۆ دابەزێنـێ، عیسا گوتی: ئەگەر ئیمانـدارن پارێز لـە خـوا بكـەن، (وە داوای وامەكـەن) ﴿١١٢﴾ گوتیـان: دەمانـەوێ لـەو سـفرەو خـوانە بخـۆین، وە دڵمـان بـەهۆی زیـادبوونی ئیمـانەوە ئـارام بگرێ، وە بزانینو دڵنیـابین كـە ڕاسـتت لەگـەڵ كـردووین، وە لەسـەری ببینـە شـایەد، ﴿١١٣﴾ عیسـای كـوڕی مەریـەم! گـوتی: ئـەی خـوایە، پـەروەردگارمان! خـوانێكمان لـە ئاسـمانێوە بـۆ دابەزێنـە، بۆمـان ببێتـە جـەژن بـۆ هـی سـەرەتاو كۆتـاییمان، وە ببێتـە بەڵگـەو نیشـانەیەك لـە تـۆوە، وە بـژیومان بدەیـە، بێگومـان تـۆ باشـترینی بـژیودەرانی ﴿١١٤﴾ خـوا فـەرمووی: بێگومـان مـن ئـەو خـوانە دادەبەزێنمـە سـەرتان، بـەڵام هـەر كەسـێك دوای ئـەوە لـە ئێـوە بێبـڕوابێ، ئـەوە بـە مسۆگەریی ئازارێكی دەدەم، هیـچ كەس لە جیهـانییان وا سـزاو ئـازار نـەدەم ﴿١١٥﴾)).

## شـیکردنــەوەی هــەندێك لە وشــەکان

(﴿إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ﴾): (أَي: قَوَّيْتُكَ، أَسْنَدتُكَ) واتە: پشتم گرتی، پاڵپشتت بووموو بەهێـزم کـردی، (رُوحُ القُدس)، (رُوح) واتـە: گیـان، ئـەو حەقیقــەتەی کە ئێمـە نایزانین چییە؟ یاخود دەڵـێ: (الـرُّوحُ إسْمٌ للـنَّفْس) رووح نـاوە بـۆ نەفـس، بـەڵام لێـرەدا بـە مانــای گــیان دێ، چونکە (رُوحُ القُدس) واتـە: گیـانی پـاك، یـان پیــرۆز، کـە مەبەسـت پێـی جبـریلـە ﷺ، هەندێکـیش گوتوویانـە: مەبەسـت پێـی رووحــی عیســایە، کــە رووحێکـی پـاکی هــەبووە، هەنــدێکی دی گوتوویانـە: ئــەو ئیمـانەیە کـە لـە دڵو دەروونـی عیسـادا چەسـپاوە، بـەڵام ڕای بـەهێزتر ئەوەیـە کە مەبەست لە (رُوحُ القُدس) جبـریلە ﷺ، چونکە خـوا دەفەرموێ: ﴿نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلۡأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلۡبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلۡمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيّٖ مُّبِينٖ ﴿١٩٥﴾﴾ الشُعَراء، لە شـوێنی دیکە فەرموویەتی: ﴿قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ ... ﴿١٠٢﴾﴾ النحـل. (رُوحُ القُـدس) واتە: جبـرىـل.

(﴿ٱلۡمَهۡدِ﴾): واتە: بێشکە، لانکە، (المَهْدُ: مَا تُهَيَّأُ لِلْصَّبِيِّ، وَالـمَهْـدُ وَالـمِهَادُ: الـمَكَـانُ الـمُمْــهَّدُ الــمُوطَّأ) وشــەی: (مَهْـد، مِهَـاد) بــە شـــوێنێك دەگوتـــرێ: کـــە خۆشکـــرابێو ئامادەکرابـێ، بـەڵام ناویشــە بـۆ ئـەو بێشــکەو لانکـەی کـە منـداڵی گچکـەو شـیـرەخـۆرەو مەلۆتکـەی تێدەهاوێشـترێ.

(﴿وَكَهۡلٗا﴾): (الکَهْل: أي الکامل) کەهل، واتە: کامڵ ، (الکَهْل: مَن وَخَطَهُ الشَّـيب، أي: شَابَهُ، اسـتوى بَيَاضــهُ وَسَوَادُهُ) کـەهل بـە کەســێك دەگـوترێ: بڵـێ ڕیشـــی ماش و برنج بووە، مووی سپی لـە سەرو ڕیشـی پەیدابووبـێ، یـاخود مـووە سپیو ڕەشـــەکەی تێکـەڵ بووبـێ وەك یـەك بـێ، ئەگـەر پێهــەڵاتر چـوو، ئـەوە پێـی دەگوتــرێ: (شیخ) واتە: بە تەمەن، بەڵام لەوە خـوارتر بوو، پێی دەگوتـرێ: (شـاب) واتـە: گـەنج، هەڵبەتـە ئـەو قۆناغانـەش بـە پێـی هەنـدێ لـە کەســەکان دەگـۆڕێن،

کەسـی وا هەیە هەر لە سی ساڵییەوە دەیداتە دەم پیـرییەوە، بـەڵام جۆرێـك لە گەنجـیی هەر پێـوە دیارە، وەك پێغەمبـەری خـوا ﷺ بـەو شـێوەیە بـووە، ئـەوەی کـە جەسـتەی ساغ و سەلامەتتـر بـێ، یـان جەسـتەی بـە شـێوەیەك بـێ کـە زوو تەمـەنی لـێ دیـار نـەدات ئاوایـە.

(تَخۡلُقُ): (خَلـق) واتـە: هێنانـە دی لـە نەبوونـەوە، هـەروەك (خَلَـق) بـە مانـای دروسـتکرد (صـنع)یش دێ، واتـە: مـەرج نیـە لـە نەبوونـەوە بیهێنێتـە دی، واتـە: (خَلَـق) مانـای (صَنَعَ)ەش دەگەیـەنێ، شـتێك لـە شـتێك دروست بکـەی، (الخَلْقُ: أَصْلُـهُ التَّقْـدِيرِ الـمُسْتَقِيمُ، وَيُسْـتَعْمَلُ فـي إِبْـدَاعِ الشَّـيءِ مِـنْ غَيْـرِ أَصْـلٍ وَلا احْتِـذَاءٍ)، (خَلْق) بە مانای ئەندازەگیـرییەکـی رێـك و راست و پەیداکردنی شتێکە، کـە ئـەو شـتە بنچـینەیەکی نەبووبـێ، وە تێیـدا چـاو لە کەس نـەکرابێ، واتـە: شـتێك پەیدابکـەی وێنـەی نەبووبـێ.

(ٱلۡأَكۡمَهَ): (الأَكْمَـهُ: الَّـذِي وِلِـدَ مَطْمُـوسَ العَـيْنِ)، (أَكْمَه) کەسـێکە کـە بـە کوێریـی لەدایـك بووە، کوێـری زکمـاك.

(وَٱلۡأَبۡرَصَ): واتـە: بەڵەك، بـەڵام لە زمـانی عەرەبیـدا دەڵێ: (وَقِيـلَ لِلْقَمَـرِ أَبْـرَص لِلْنُكْتَةِ الَّتِي عَلَيْهِ)، مانگ پێی دەگوتـرێ ئـەبرەص لەبەرئـەوەی خـاڵێکی پێوەیـە، هـەروەك چۆن کەسـێك کە بەڵەکی پێوەبێ، پێـی دەگوتـرێ ئەبـرەص.

(كَفَفۡتُ): ئەوانـەم لە تۆ گێڕایـەوە، (الكَفُّ: كَفُّ الإِنْسَـان) کەف بریتیـە لە لەپـەدەسـت بـە پەنجـەکانەوە، (وَكَفَفْتُـهُ أَصَبْتُهُ بِالكَف وَدَفَعْتَهُ بِهَا)، واتـە: بـە لەپـەدەست لـێمـدا، یاخود بـە لەپەدەسـت لامبـرد، پاڵـمپێوەنـا کـە نەبـێ، یـان نەیـەتە پێـش.

(ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ): کـۆی حـەوارییە، کـە بـە مانـای هـاوەڵـێکی تایبـەت دێ، وە لـە فەرمایشـتی پێغەمبـەری خـوادا ﷺ هـاتوە، فەرموویـەتی: ﴿لِكُلِّ نَبِـيٍّ حَـوَارِيٌّ وَحَـوَارِيِّ الزُّبَيـرُ﴾ {أَخْرَجَـهُ أَحْـمَد بـرقم: (١٤٦٧٥)، وَالبُخَـارِيُّ بـرقم: (٢٨٤٧)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦١٩٣)، وَابْـنُ مَاجَـهْ بـرقم: (١٢٢) عَـنْ جَـابِرَ بْـنَ عَبْـدِ اللهِ}، واتـە:

هـەموو پێغـەمبەرێك هاوەڵـێكی زۆر دانسـتەو تایبـەتیی هـەبووە، هـاوەڵی زۆر دانسـتەو تایبـەتیی مـن زوبیـری كوڕی عەوامـە، كـە كوڕە پووریشـی بـووە، واتـە: كـوڕی خوشـكی بـابی بـووە، كـوڕی صـەفییە بـووە، صـەفییەش كچـی عەبدولموتتەڵیـب بووە، ئنجا حـەواریی یەكـان لێرەدا واتـە: پشـتیوانانی عیسـا، ئایـا بۆچـی پێیـان دەگوتـرا حەواریـی؟

١) هەندێك گوتوویـانە: لە (حَوْر)ەوە هـاتوە، واتە: گـەڕانەوە، لەبەرئـەوەی بـۆ لای خـوا گەڕاونـەوە.

٢) وە هەندێكـیش گوتوویانـە: لـە حەورائـەوە هاتوە، (حوراء) واتـە: ئافرەتێك كـە چـاوی زۆر سـپیو زۆر ڕەش بێ، واتـە: ڕەشو سـپییەكەی چـاوی زۆر دیـاربێ.

٣) وە هەندێكیان گوتوویـانە: (كَـانُوا قَصَّـارِين) بەرگ سـپیكەرەوە بوون، دیـارە وەختـی خـۆی، وەك چـۆن ئێسـتا ئوتـوو هەیـە، شـوێنی جـل شـۆریی و ئوتووكردنە، كاتی خۆی (قصّـار) هەبوون، كەسێك بـەرگێكی بووبێـت داویـەتی بـەوان، بۆیـان سـپیو جـوانو خاوێـن كردۆتـەوە.

٤) هەندێكـیش گوتوویـانە: (كَانُوا صَيَّادِين) ڕاوچـیی بـوون، ئنجـا لەبەرئـەوەی كە ڕاوچـیی بوون، هەمیشـە لە ئـاودا بوون، پـاكو خـاوێن بوون.

٥) هەندێكـیش گوتوویـانە: بۆیـە پێیـان گـوتراوە: (حوارییـن)، چـونكە دڵو دەروونـی خەڵـكیان لـە شـیـركو بتپەرسـتی پـاك كردۆتـەوە، وە ئیمـانو تەوحیـدیان خسـتۆتە نێو دڵـیان بە فەرمـانی خـوا.

(يَسْتَطِيعُ ): (أَي: يَقْدِر) واتـە: دەتوانـێ، (الطَّوْعُ: الإنقِيـادُ، يَسْتَطيعُ: يُجيـبُ، أَو هَـلْ تَقْتَضِـي الحِكْـمَةُ أَنْ يَفعـل ذلـكَ؟) دوایـی زیـاتر ڕوونـی دەكەینـەوە، چـونكە بەكـارهێنـانی ئـەو وشـەیە بـۆ خـوای بـەرزو بێوێنـە نەگونجـاوە بـە پێـی ڕواڵەتەكـەی، بۆچـی؟ چـونكە حەوارییـەكان دەڵـێن: ئایـا پـەروەردگارت دەتوانـێ سـفرەیەكمان لـە ئاسـمان بـۆ دابـەزێنێ؟ هەنـدێك دەڵـێن: (يَسْتَطيعُ) بـە مانـای (يُجِيبُ) دێ، واتە: ئایـا پەروەردگـارت وەڵامـت دەداتـەوە، ئـەو سفرەیە دابـەزێنێ لە ئاسـمانەوە؟ هەنـدێكیش گوتوویانـە: (يَسْتَطيعُ) هـەر بـە مانـای (دەتوانێ) دێ،

واتە: ئایا حیکمەتی خوا ئەوە دەخوازێ ئەوە بکات؟ نەك گومانیان هەبووبێ لە توانای خوا.

(مَآئِدَةً ): (المَائِدَة: الطَبَق الَّذِي عَلَيهِ الطَّعَام، والمَيْدُ: الإضْطراب)، سینییەك، یان سفرەیەك كە ڕادەخرێ، ئەگەر خواردنی لەسەر نەبێ، پێی دەگوترێ: (طَبَق)، ئەگەر لەسەری بێ، پێی دەگوترێ: (مَائِدَة)، ئەویش لە ئەسڵدا لە (میـد)ەوە هاتوە، دەڵێ: (والمَيْدُ: الإضْطراب) لەبەرئەوەی سفرەو خوان دەجووڵێنرێ و لادەبردرێ و هەڵدەگیرێ.

(عِيدًا ): {العِيدُ: مَا يُعَاود مَرَّة بَعْد أُخْرَى، وخُصَّ فِي الشريعة بيَوم الفِطرِ وَيَوم النَّحْر، وَلَمَّا كَانَ ذَلِكَ اليَوم مجعولاً للسرور فِي الشريعة، كَمَا نبّه النَّبي بقَولِهِ: ﴿أيَّامُ أكْلٍ، وَشُرْبٍ، وبِعَالٍ﴾ صَارَ يُستَعْمَلُ العِيدُ فِي كُلِّ يَوْمٍ فِيهِ مسرَّة، وَعَلَى ذَلِكَ قولهِ تَعَالَى: ﴿رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا﴾}، واتە: وشەی (عید) جەژن ئەو بۆنەیەیە كە جار لە دوای جار دەگەڕێتەوە، دووبارە دەبێتەوە، جەژن لەبەرئەوەی ساڵانە دووبارە دەبێتەوە، یاخود لەو ڕۆژەدا دووبارە دەبێتەوە، بەڵام لە شەریعەتدا تایبەتكراوە بە ڕۆژی ڕۆژوو شكاندن كە یەكی شەووالە لە دوای ڕەمەزان، وە ڕۆژی قوربانیی سەربڕین، واتە: جەژنی ڕەمەزان و قوربان (راغب الأصفهاني) وایگوتوە.

بەڵام وانییە، چونكە هەر لە حەدیسدا هاتوە ڕۆژی جومعەش بە جەژن (عید) ناوبراوە، هەروەها (أيَّام التشريق)یش ئەو سێ ڕۆژانەی كە قوربانییان تێدا سەردەبڕدرێ، ئەوانیش بە جەژن (عید) ناوبراون، وە (راغب الأصفهاني) دەڵێ: (عید) مەرج نیە هەر بۆنەیەكی ئایینیی بێ، بەڵكو هی نەتەوەیی و نیشتیمانیش هەر پێی دەگوترێ: (عید)، كە ئەو دەڵێ: (وَلَمَا كَانَ ذَلِكَ اليَوم مجعولاً للسرور فِي الشريعة) وە لەبەرئەوەی وشەی (عید) لە شەریعەتدا بۆ دڵخۆشیی و شادیی بەكارهێنراوە، {كَمَا نبّه النَّبي بقَولِهِ: ﴿أيَّامُ أَكْلٍ، وَشُرْبٍ، وَبِعَالٍ﴾}، هەروەك پێغەمبەری خوا ﷺ ئاگاداری كردووینەوە،

فەرموویەتی: ڕۆژانی جەژن ڕۆژانی خواردنو خواردنەوەو جووتبوونن، (صَارَ يُسْتَعْمَلُ العِيدُ فِي كُلّ يَوْمٍ فِيهِ مسرة) وشەی (عید) بۆ هەر ڕۆژێك بەکارهاتووە کە دڵخۆشییەکی تێدابێ، بەو پێیە جەژنی نەورۆز، یادی ڕاپەڕین... هتد، هەر بۆنەیەك شادییەکی تێدابێ پێی دەگوترێ (عید)، ئەو لێرەدا وادەڵێ، بەڵام لەڕاستییدا لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا وەك من لە کتێبی (جەژنو بۆنەو یادەکانو هەڵسەنگاندنێك)دا باسمکردووەو ساغم کردۆتەوە: وشەی (عید) بە هەر بۆنەیەك دەگوترێ کە دووبارە بێتەوە، ئەگەر بۆنەیەکی ناخۆشیش بێ، واتە: لەو ڕۆژەشدا شتێکی گەورە ڕوویدابێ، مادام یاد بکرێتەوە پێی دەگوترێ (عید)، بەڵام زۆرجار لە بەکارهێنانی عورفدا (عید) زیاتر بۆ کاتی خۆشیی بەکارهێنراوە، ئەگەرنا لە ئەسڵی زمانی عەرەبیدا وانیە، (راغب) بەردەوام دەبێو دەڵێ: (وَعَلَى ذَلِكَ قَولُه تَعَالَى): ﴿رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدٗا﴾، لەسەر ئەو بناغەیە فەرموودەی خوای بەرز کە عیسا ﷺ داوا لە خوا دەکاتو دەفەرموێ: پەروەردگارمان سفرەیەکی پڕ خواردنمان بۆ بنێرە خوارێ لە ئاسمانێوە، کە بۆمان ببێتە جەژن.

## مانـای گـشـتـی ئایەتەکـان

خـوا ﷻ لـەم حـەوت ئایـەتـەدا، هەروەهـا لـە ئایەتـەکـانی دیکەشـدا کـە دێـن، واتـە: پێنـج ئایـەتی کۆتـاییش، کە دەبنە دەرسی کۆتایی تەفسیری ئەم سـوورەتە موبـارەکە، جگـە لـە ئایـەتی یەکـەم کـە باسـی پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) دەکـات بەگشـتی، ئەوانی دیکـە هـەموویان باسـی عیسا ﵇و دایکـی (مەریـەم) خـوا لـێی ڕازی بێو حـەوارییـەکـانو ... هتـد دەکـەن.

وە لێـرەدا خـوا ﷻ هەنـدێك حەقیقـەتی زۆر گـەورەو گرنگمـان بـۆ دەخاتـە ڕوو، وە کۆمەڵێـك ئەفسـانەو بیـروبۆچوونی هەڵـەو پەڵـەی نەصـرانییەکان هەڵدەوەشـێنێتـەوە، وە هـەندێکی دیکـەش دەخاتـەوە بیـر نەصـرانییەکان، کە ڕەنگە بۆخۆشـیان فەرامۆشـیان کردبێو لەبیـریان چووبێتـەوە:

سـەرەتا خـوا ﷻ دەفـەرموێ: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡ﴾، ڕۆژێـك کـە خـوا پێغەمبـەران کۆدەکاتـەوە، دەفـەرموێ: بـە چـی وەڵامدرانـەوە لەلایـەن ئۆممەتەکانتـانەوە؟ هەندێك لە توێژەروان دەڵێن: ئـەوە پەیوەسـتە بـەوەی پێشـیەوە کـە دەفـەرمووێ: ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡمَعُواْۗ وَٱللَّهُ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡفَٰسِقِينَ ١٠٨﴾، واتـە: پارێـز لە خوا بکـەنو ببیسـتن، خوا ڕێنمـایی کۆمەڵی لارێبـوان ناکـات، واتـە: پارێـز لـە خـوا بکـەنو فـەرمانی خـوا ببیسـتن، بۆئـەوەی لـە ڕۆژێکـدا کـە خـوا پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) کۆدەکاتـەوە، ئێـوە سـەربەرز بـن، دەشـگونجێ ئـەو ڕسـتە سـەربەخـۆ بـێ: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ﴾، واتە: یاد بکەنـەوەو بیهێنـنە بەرچاوی خۆتان ئەو ڕۆژەی کـە خـوا هەموو پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) کۆدەکاتـەوە ﴿فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡ﴾، پێیـان دەفـەرموێ: بەچـی وەڵامتـان دراوەتـەوە؟ واتـە: ئۆممەتـەکانتـان چیـان وەڵامدانـەوە؟ دیارە خـوا ﷻ یـەك بـە یـەك لێیـان دەپرسـێ ئەگـەرنا وەك لـە حەدیسـی پێغەمبـەری خـوا ﷺ هاتوە، وە (أحمد) لـە (المسند)دا هێنـاویـەتی، کـە سـەدو بیسـتو چوار هـەزار (١٢٤٠٠٠) دانـە پێغەمبـەر هەبوون، ئنجا

ئەگەر خوای پەروەردگار لێیان بپرسێ هەموویان پێکەوە وەڵام نادەنەوە، بەڵکو یەك یەك، لە هەر پێغەمبەرێك دەپرسێ: تۆ کە ڕەوانەم کردی وەحیو پەیامی خۆمم پێدا ناردی، ئایا قەومەکەت، کۆمەڵگاکەت چۆنیان وەڵام دایەوە؟ ئنجا بۆ زانیارییتان لە حەدیسی پێغەمبەر ﷺدا هاتوە: کە پێغەمبەری وا دێ کەسی لەگەڵ دا نیە، کەس ئیمانی پێ نەهێناوە، هی وا هەیە سێ چوار کەس ئیمانیان پێهێناوە، وە هی وا هەیە کۆمەڵێکی زۆر، هی وا هەیە کۆمەڵێکی کەم، یانی: پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) زۆر تووشی نارەحەتیی و گرفتاریی بوو ون، کە پێغەمبەرێکی پایە بەرزی خوا یەك نەفەر ئیمانی پێ نەهێنێ، ئەوەی دیکە یەکێك، ئەوەی دیکە دووان، ئەوەی دیکە سێ!! بەڵام گرنگ ئەوەیە خوا لە هەموویان دەپرسێتەوە، دیارە خوای زاناو شارەزا کە لە پێغەمبەران دەپرسێتەوە بێگومان بۆ سەرزەنشتکردنو سەرکۆنەکردنی قەومەکانیانە، ئەگەرنا خوا دەزانێ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کەمتەرخەمییان نەکردوە، چونکە پێغەمبەران پارێزراو بوون لە هەڵەو کەموکوریی، بەڵام دەیەوێ لەوان ببیستێ، کە دەفەرموێ: چۆن وەڵامدراونەوە؟ کۆمەڵگایەکانیانی پێ سەرزەنشت دەکات ﴿ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآ ﴾، ئەوانیش دەڵێن: ئێمە هیچ زانیاریمان نیە، ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴾، بێگومان هەر تۆ زۆر زانای نهێنییەکانی (عَلاَّم) صیغە موبالەغەی (عَالِم)ە، (عالم) واتە: زانا، (عَلاَّم) واتا زۆر زانا، ﴿ٱلۡغُيُوبِ ﴾یش کۆی (غَيْب)ە، (غَيْب)یش، واتە: نادیار، پەنهان.

لێرەدا توێژەروانی قورئان دەڵێن: باشە یانی چی پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) دەڵێن: زانیاریمان نیە گەلەکانمان میللەتەکانمان چۆنیان وەڵامداینەوە؟ بۆچی وایان فەرمووە؟ سێ مانایان بۆ ئەو ڕستەیە لێکداوەتەوە:

ڕای یەکەم: هەندێکیان گوتوویانە: ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی هێندە بە ترسە، وەك کوردەواریی خۆمان دەڵێن: مرۆڤ ناوی خۆشی لەبیرچۆتەوە، ئەوەندە بە سامو هەیبەتو هەژمەتە! پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) لەو کاتەدا لە

ترسانو لەبەر بەرزیی و گەورەیی خواو لە حەژمەتی ئەو ڕۆژە، هەندێکیان زانیارییان نامێنێ، کە دەڵێن: ﴿قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾، دیارە خۆیان هیچیان لەبیر نامێنێ لەو کاتەدا، بەڵام من ئەو مانایەم پێ بەهێز نیە.

ڕای دووەم: ئەو ڕایە دەچێتە عەقڵمەوە، لایەنگرانی دەڵێن: ﴿قَالُواْ لَا عِلْمَ لَنَآ﴾، واتە: زانیارییەکمان نیە کە تۆ نەتبێ، هەرچی ئێمە دەیزانین تۆ زیاتری دەزانی، واتە: شتێکمان لەلا نیە بە تۆی ڕابگەیەنین، وە خوای گەورەش کە دەفەرموێ: ﴿مَاذَآ أُجِبْتُمْ﴾، مەبەستی ئەوە نیە کە نەزانێ، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە ئەوانی دیکە سەرزەنشت بکات، ئەوانیش دەڵێن: خوایە تۆ لە ئێمە چاکتر دەزانی بۆخۆت دەزانی چۆنیان وەڵامداینەوە.

ڕای سێیەم: وە دەشگونجێ ماناکەی ئاوابێ: خوایە! ئەوەی کە ئێمە دەیزانین لەچاو زانیاری بێسنووری تۆ، وەك نەبوون (عدم) وایە، وە ئێمە زانیارییەکمان نیە شایانی باس بێ، لەچاو زانیاری تۆ. ئەو سێ مانایەی بۆ لێکدراونەوە، کە من زیاتر مانای دووەمو سێیەمم بەدڵن.

ئنجا دێتە سەر باسی عیساو مەریەمی دایکی، بۆ بەرپەرچدانەوەی نەصرانییەکان، وە لەم سوورەتەدا زۆر باسی خاوەن کتێبەکان بەتایبەتی نەصرانییەکان کراوە، وەك چۆن لە سوورەتی (النساء)دا زۆر باسی خاوەن کتێبەکان، بەتایبەتی جوولەکەکان کراوە: ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ﴾، یاد بکەوە ئەو کاتەی کە خوا فەرمووی: ئەی عیسای کوڕی مەریەم! یادی چاکەی من بکەوە بەسەر خۆتو بەسەر دایکتەوە، چاکەیەکی زۆر گەورەم لەگەڵدا کردوون، چاکەی خوا لەسەر عیسا ئەوەیە کە کردوویەتی بە پێغەمبەری خۆی، بەبێ باب دروستی کردوە، ئەو هەموو موعجیزانەی پێداون، ڕووحێکی زۆر پاکی پێداوە، وە چاکەی خوا لەسەر دایکی عیسا ئەوە بووە کە

ئافرەتێکی زۆر پاکیزە بووە، خوا بەسەر هەموو ئافرەتانی دنیادا هەڵیبژاردوە، وە پاشان عیسا بەبێ باب لە زگیدا بۆتە کۆرپە، کە ئەوە موعجیزەیەکی زۆر گەورە بووە، وە دوایش خوای پەروەردگار عیسای هێناوەتە گۆو قسە لە کاتێکدا کە مەلۆتکە بووەو لەسەر قۆنداغێ بووە، ئنجا کاتێك لەگەڵ خۆیدا بردوویەتەوە، بۆ لای گەلەکەی، ئەو بەرگریی لە دایکی کردوە، وەك لە شوێنی دیکەدا فەرموویەتی:

﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ﴾ مریم، واتە: (عیسا ﷺ) گوتی: من بەندەی خوام کتێبی پێداوەو کردوومی بە پێغەمبەر (یانی: چی کردوومی بە پێغەمبەرو کتێبی پێداوم؟ واتە: دەمکاتە پێغەمبەرو کتێبم پێدەدا، کەواتە: ئەو دایکەی من خراپەکار نیە)وە خوا منی بە موبارەك دروستکردوە، وە فەرمانی پێکردووم نوێژ بکەم، وە زەکات بدەم، وە لەگەڵ دایکمدا چاك بم، وە من خۆ بەزلگرو بەدبەخت نیم، وە سەلامم لێ بێ ئەو ڕۆژەی کە لە دایك دەبمو، ئەو ڕۆژەی کە دەمرمو، ئەو ڕۆژەی کە زیندوو دەبمەوە، ئاوا عیسا ﷺ بەرگریی لە دایکی کردوە.

ئنجا خوای پەروەردگار دێتە سەر باسی سەرژمێری ئەو چاکانەی کە لەگەڵ عیسادا کردوونی، دەفەرمووێ: ﴿ إِذْ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلْقُدُسِ ﴾، کاتێك کە پشگیریی تۆم کردو تۆم بەهێز کرد، بە (روح القدس)، واتە: بە جبریل، ﴿ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ﴾، لەگەڵ خەڵك قسەت دەکرد کە لە بێشکەدا بووی، وە بە کاملییش، هەڵبەتە هەموو کەس بە کاملیی قسان دەکات، کە دەکەوێتە تەمەنی پەنجاو شەست ساڵیی، هەموو کەس قسان دەکات! ئەدی بۆچی خوای کاربەجێ وەك چاکەیەك لەسەر عیسا باسی دەکات؟ واتە: قسەکردنت کاتێ کە لەسەر قۆنداغ بووی و لە بێشکەدا بووی، وەك قسەکردنی کاتی کامڵ بوونت، وەك یەك بوون، چونکە منداڵ ئەگەر هەر بزیقێنێو بزیرێنێ، هەموو منداڵێك زیقە

زیقی هەیە، وە هەموو منداڵێك هەندێ وشەو دەنگی نامەفهوومی دەبێ، بەڵام منداڵێك مەلۆتکەبێو وەك پیاوی گەورە قسان بکات، ئەوە موعجیزەیە، بۆیەش خوای کاربەجێ قۆناغی کامڵێتیی (كهولة)ی لەگەڵ قۆناغی نێو بێشکەی دا باسکردوە، بۆ قسەکردنی عیسا ، ئنجا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ عَلَّمْتُكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَٱلتَّوْرَىٰةَ وَٱلْإِنجِيلَ ﴾، وە یاد بکەوە کە من کتێبو حیکمەتو تەوراتو ئینجیلم فێر کردی، ئنجا ئایا تەوراتو ئینجیلیش هەر کتێبو حیکمەت نین؟

زانایان هێندێکیان گوتوویانە: کیتاب لێرەدا بە مانای نووسین دێ، حیکمەتیش واتای هۆش و گۆش و وریاییەکی زۆرم دابوویە، ئنجا تەوراتیشم فێرکردی کە شەریعەتێکە بۆ مووسا هاتوە، هەروەها نەصرانییەکانیش لەسەری دەڕۆن، وە ئینجیلیش تەواوکەری تەوراتە، هەندێك شت لە تەوراتدا هەبووە لای بردوە، وە هەندێکی دیکەی تازەشی هێناوە، یەکێکی دیکە لە چاکەکانی من لەسەر تۆ ئەی عیسا! ئەوە بووە کە ئەو موعجیزەیەشم پێدای: ﴿وَإِذْ تَخْلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيْـَٔةِ ٱلطَّيْرِ بِإِذْنِى ﴾، وە یاد بکەوە کە لە قوڕێ شێوەی باڵندەت دروست دەکرد بە مۆڵەتی من، واتە: لە قوڕێ شێوەی باڵندەت دروست دەکردو دەبوو بە باڵندە، جا ئەوە چ جۆرە باڵندەیەك بووە؟ هەندێك دەڵێن: شەمشەمە کوێرە بووە، هەندێك دەڵێن: کۆتر بووە، بەڵام خوا باسی نەکردوە، گرنگ ئەوەیە عیسا شێوەی باڵندەی لە قوڕێ دروست کردوە ﴿فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيْرًۢا بِإِذْنِى ﴾، فووت پێدا دەکردو دەبو بە باڵندە، گوتوویەتی بە ناوی خوا، یەکسەر بۆتە باڵندەو فڕیوە، ﴿وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِى ﴾، وە کوێری زگماك لەگەڵ بەڵەکت چاك دەکردنەوە، بە مۆڵەتی منو بە فەرمانی من، فووی لێ دەکردنو دوعای بۆ دەکردنو چاك دەبوونەوە، ﴿وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِى ﴾، وە کاتێك مردووەکانت دەردەهێنایەوە بە فەرمانی من، دیارە هەموو کەس دەتوانێ مردووان دەرهێنێتەوە

ئەگەر هەر جەنازەکانیان بێ، بەڵام لێرەدا مەبەست ئەوەیە مردووەکانت بە زیندوویی دەردەهێنایەوە، دەڵێ: مردووی وا هەبووە چەند هەزار ساڵ بووە مردوە، عیسا ﷺ چۆتە سەر قەبرەکەی و فەرموویەتی: فلان کەس من عیسای کوڕی مەریەمم پێغەمبەری خوام تۆ کێی؟ مردووەکەش بە قسە کەوتوە، گوتوویەتی: منیش فلان کەسم، گوتوویەتی: دە بە فەرمانی خوا زیندوو ببەوە، زیندووبۆتەوە دەریانهێناوە، قسەی کردوەو پرسیاریان لێکردوە، دوایی فەرموویەتی: بە فەرمانی خوا بچۆوە شوێنی خۆت، شایانی باسە ئەوە لە ئینجیلەکاندا نیە کە مردووی چەند هەزار ساڵ لەوەو پێش زیندوو کرابێتەوە، هەروەها دروستکردنی باڵندەش لە شێوەی قوڕو پاشان فووپێداکردنی و بوونی بە باڵندەی زیندوو، ئەوەش لە ئینجیلەکاندا نیە، ئەوەی لەوێدا هەیە، بۆ وێنە: گەنجێك تازە مردوە، دایکی هاتوە داوای لە عیسا کردوە، دوعای بۆ بکات، ئەویش دوعای بۆ کردوەو لەسەر شوێنی خۆی هەڵساوەتەوە، بەڵام لێرەدا خوای باڵادەست دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِي ﴾، یانی: مردوو کە لە قەبرێ دابوون، زیندووت دەکردنەوە، ئنجا دێتە سەر باسی نیعمەتێکی دیکەی و دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ كَفَفْتُ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ ﴾، وە یاد بکەوە کاتێك وەچەی ئیسرائیلم لە تۆ دوور خستەوە، واتە: جوولەکەکانم لە تۆ دوور خستەوەو تۆم لەوان چەپاڵەدا، کاتێك بە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرایەکانەوە هاتیە لایان ﴿ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ﴾، ئنجا ئەوانەی بێبڕوابوون لە کافرەکان، لە وەچەی ئیسرائیل گوتیان: ئەوە جادوویەکی ئاشکرایە، بەڵام من تۆم لەوان پاراست، دیارە کە دەفەرموێ: تۆم لەوان پاراست، ئاشکرایە دوایی هەر بە جاسووسیی و بە پیلانی جوولەکەکان عیسا ﷺ گیرا، بە حیسابی نەصرانییەکان گیراو لە دار درا، (لە خاچ درا)، بەڵام ئێمەی مسوڵمان دەزانین لە خاچ نەدراوە، بەڵام بۆچی لێرەدا خوای توانا دەفەرموێ: لەوانم پاراستی؟ دیارە واتە پاراستمی کە بتکوژن، کەواتە: ئەم ئایەتە ئەوەی نەصرانییەکان دەیڵێن بە درۆی دەخاتەوە، چونکە ئەگەر عیسا لە خاچ

درابێ، مانای وایە خوای باڵادەست نەیپاراستوە! هەروەها ئەوەش بە درۆ دەخاتەوە کە عیسا خوای پەروەردگار مراندبێتی، ئنجا بەرزی کردبێتەوە، چونکە مەبەستی جوولەکەکان و ڕۆمەکان ئەوە بووە عیسا بکوژن، ئنجا ئەگەر خوا هەر مراندبێتی و دوایی بەرزی کردبێتەوە بە مردوویەتی، مانای وایە ئامانجی جوولەکەکان و ڕۆمەکان هاتۆتە دی، بەڵام کاتێك ئامانجی ئەوان نەهاتۆتەدی کە بە زیندوویی بەرز کرابێتەوە، وەك عەقیدەی ئەهلی ئیسلام وایە، وە لە سووڕەتی (آل عمران)، لە سووڕەتی (النساء)یشدا لە بەرگی دووەم و سێیەمی ئەم تەفسیرەدا، بە تەفصیل ئەو مەسەلەیەمان باسکردوە.

ئنجا دێتە سەر بابەتێکی دی، دەفەرموێ: ﴿ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ أَنْ آمِنُوا بِي وَبِرَسُولِي قَالُوا آمَنَّا وَاشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴾، وە کاتێك سرووشم بۆ حەوارییەکان کرد، (یانی: خستمە دڵیانەوە خورپەم بۆ کردن) کە بڕوا بە خۆم و بە پێغەمبەرەکەم بێنن، گوتیان: ئیمانمان هێنا، شایەدبە کە ئێمە گەردنکەچین، وەحی لێرەدا بە مانای خستنە دڵ و خورپە (إلهام) دێ، نەك بە مانای ئەو وەحییەی کە بۆ پێغەمبەران دێ، چونکە حەوارییەکان پێغەمبەر نەبوون، وە هەندێك گوتوویانە: دەگونجێ حەوارییەکان پێغەمبەر بووبن، بەڵام ئەوەی کە گوتمان لە هەموویان ڕاستترە، چونکە وەحی لە بەکارهێنانی قورئاندا بە چەند مانایەك هاتوە:

١) بە مانای ئاماژە، دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوْمِهِۦ مِنَ ٱلْمِحْرَابِ فَأَوْحَىٰٓ إِلَيْهِمْ أَن سَبِّحُوا۟ بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿١١﴾ ﴾ مريم.

٢) بە مانای ئیلهامی غەریزیی دێ، وەك خوا دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحْلِ ...﴿٦٨﴾ ﴾ النحل، واتە: وە پەروەردگارت سرووشی کرد بۆ هەنگ.

٣) وە بە مانای فێرکردن دێ، وەك دەربارەی سرووش کردن بۆ دایکی مووسا عليه السلام دەفەرموێ: ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ ...﴿٧﴾ ﴾ القصص، واتە: وەحیمان نارد بۆ دایکی مووسا عليه السلام، کە ئەویش لێرەدا مەبەست پێی خستنە دڵە، کە بە عەرەبی

(إلهام) و بە کوردی (خورپە)یە، لێرەشدا بە هەمان شێوە کە دەفەرمویٚ: کاتێك وەحیم نارد بۆ حەوارییەکان کە ئیمان بە منو بە پێغەمبەرەکەم بێنن، گوتیان: ئیمانمان هێنا، وە تۆش شایەد بە کە ئێمە مسوڵمانین، یاخود ئێمە گەردەنکەچین.

ئنجا خوا ﷻ باسی ئەو بەسەرهاتە گرنگە دەکات کە بریتیە لە دابەزینی سفرەو خوانێکی پڕ لە خواردن لە ئاسمانەوە، دەفەرمویٚ: ﴿ إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، یاد بکەوە کاتێك حەوارییەکان گوتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم! ئایا پەروەردگارت دەتوانیٚ سفرەو خوانێکی پڕ خواردنمان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنیٚ؟ دیارە برسی بوون، پێویستییان پێی بووە، وەکو دوایی خۆیان پاساویان داوەتەوە بە چەند شتێك، سەرەتا عیسا دەفەرمویٚ: ﴿ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، گوتی: پارێز لە خوا بکەن ئەگەر ئیماندارن، ئەگەر ئیماندارن پارێز لە خوا بکەن کە ئەو جۆرە داوایەی لیٚ بکەن، خوا سفرەو خوانتان لە ئاسمان بۆ دابەزێنیٚ، نابێت داوای وا لە خوا بکەن، ئنجا دوای ئەوەی حەوارییەکان ئامانجەکانی خۆیانو پاساوو بەڵگەکانی خۆیان بۆ دابەزینی ئەو سفرەیە دەخەنەڕوو، عیسا قەناعەت دەکات، کەواتە: ئەمە ئەوەی لیٚ وەردەگیریٚ کە ئینسان دەبیٚ ئامانجو مەبەستی خۆی باش بخاتە ڕوو، زۆرجار خستنە ڕووی ئامانجو مەبەست بە شێوەیەکی جوان دەبێتە هۆی ئیقناعکردنی لایەنی بەرانبەر، ئنجا حەوارییەکان دەڵێن: ﴿ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، گوتیان: دەمانەویٚ لێی بخۆین، دیارە برسی بوون، وە دڵیشمان ئارام بگریٚ، وە بشزانین کە تۆ ڕاستت کردوە لەگەڵمان، وە شایەدیش بین لەسەری، کەواتە: چوار پاساو دێننەوەو دەیخەنەڕوو، ئنجا عیسا ﵇ داوا لە خوای پەروەردگار دەکات ﴿ قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ﴾، عیسای کوڕی

مەریەم گوتی: ئەی خوایە پەروەردگارمان! خوانێکمان لە ئاسمانێوە بۆ دابەزێنە، عیساش ﷺ سێ پاساو دێنێتەوە:

﴿تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَ﴾، بۆمان ببێ بە جەژن بۆ هی یەکەممان یانی: هی ئێستامانو هی دواییمان، واتە: ئەو ڕۆژە بۆ هەمووانمان ببێتە جەژن، وە ببێتە نیشانەو بەڵگەیەك لە تۆوە کە عیسا پێغەمبەری خوایەو لەسەر ڕێبازی خوایە، ﴿وَٱرْزُقْنَا وَأَنتَ خَيْرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾، بژێوو ڕۆزییشمان بدەیە، تۆ باشترینی ڕۆزیدەرانی، واتە: عیسا ﷺ مەسەلەی خواردن دەخاتە کۆتایی، ئەوان خستوویانە سەرەتا، گوتیان: ﴿قَالُوا۟ نُرِيدُ أَن نَّأْكُلَ مِنْهَا﴾، بەڵام عیسا دەیخاتە دوایی، دیارە هەر کەسێك لەقەدەر خۆی شت داوا دەکات هی عیساش ئەوە لە مەقامو پایەی بەرزی ئەو دەوەشێتەوە، ئنجا بزانین خوا چی فەرمووە:

﴿قَالَ ٱللَّهُ إِنِّى مُنَزِّلُهَا عَلَيْكُمْ﴾، خوا فەرمووی: من ئەو سفرەیە دادەبەزێنمە سەرتانو بۆتان دەنێرمە خواری، ﴿فَمَن يَكْفُرْ بَعْدُ مِنكُمْ فَإِنِّىٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ﴾، هەر کەسێك دوای ئەوەی ئەو سفرەو خوانە دەنێرمە خوار کافر بێو بێبڕوا بێ، بەجۆرێك سزای دەدەم هیچ کەسم لە جیهانیان ئاوا سزا نەدابێ، جا وەك دوایی باسی دەکەین، زانایان باسی ئەوەیان کردوە، کە ئایا ئەو سفرە دابەزیوە، یان دانەبەزیوە، وە ئەو سفرەیە چی لەسەر بووە؟ ئەوانەی کە لەگەڵ عیسا بوون چەند کەس بوون؟ ئەوە زۆر لە زانایان لەوبارەوە مشتومڕیان هەیە، کە لە مەسەلە گرنگەکاندا ئاماژەی پێ دەدەین.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** یەکەم کە دەفەرمویٚ: ﴿يَوۡمَ يَجۡمَعُ ٱللَّهُ ٱلرُّسُلَ فَيَقُولُ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡۖ قَالُواْ لَا عِلۡمَ لَنَآۖ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾، دیارە بە تەئکید ئەو ڕۆژە کە خوا هەموو پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) کۆدەکاتەوە ڕۆژی قیامەتە، چونکە خوا لە دنیادا هەر پێغەمبەرێکی لە کاتی خۆیدا ناردوە، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە هەمووان پێکەوە کۆدەکاتەوە، هەڵبەتە لەگەڵ ئۆممەتەکانیشیان، ڕۆژی قیامەتە، جا ئینسان ئەگەر بێنێتە بەرچاوی خۆی (١٢٤٠٠٠) دانە پێغەمبەر هەریەکە ئۆممەتی خۆی لەگەڵدایە چ عەرزێك هەڵی دەگری، بە ملیاران ملیار بەشەر؟! بە تەئکید ئەم سەر زەویەی ئێمەش هەڵی ناگری، بۆیە خوا دەفەرمووی: ﴿يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ٤٨﴾ إبراهيم، ئەوە بۆیە بۆتان باس دەکەم، چونکە ڕەنگە خەڵکی عەلمانییو کۆڵکە خوێندەوار، ئەو پرسیارەتان لێ بکەن، بڵێن: جا باشە ئێستا نزیکەی حەوت ملیار بەشەر لەسەر زەوی دا هەیە، خۆ ئەگەر هەتا سەد ساڵی دیکە، دوو سەد ساڵی دیکە نازانی چەندی دیکە بەشەر لەسەر زەوی هەبێ، ئەو حەوت ملیارە ڕەنگە ببێتە هەشت ملیارو بیست ملیارو چل ملیاریش، لە ئادەمەوە کە ئەمە نازانین، تاکو ئێستا دەبێ چەند ملیار بەشەر تێپەڕی بن، ئەو هەموو ملیار ملیار بەشەرانە ئەگەر لەسەر زەوی دایانبنێی، یەکی هەر پێنج سانتیم جێگا بگرن جێیان نابێتەوە، چونکە تۆ وەرە بە مەترو سانتیم حیسابی بکە، ئەو هەموو ملیار بەشەرانە ئەگەر دەریاکانیش ببنە وشکانیو هەموویانی لەسەر دابنێی، جێیان نابێتەوە، ئەی ئەدی چۆن ئەم سەر زەویە جێی ئەو هەمووە خەڵکەی تێدا دەبێتەوە؟

ئێمە لە وەڵامەکەی دا دەڵێین: خوای پەروەردگار دەفەرمویٚ: ﴿يَوۡمَ تُبَدَّلُ ٱلۡأَرۡضُ غَيۡرَ ٱلۡأَرۡضِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُۖ وَبَرَزُواْ لِلَّهِ ٱلۡوَٰحِدِ ٱلۡقَهَّارِ ٤٨﴾ إبراهيم، واتە:

ئـەو ڕۆژە کـــە زەوی وەك خــــۆی نامێنێتـــەوەو ئاســـمانەکانیش وەك خۆیـــان نامێننـەوە، هـەمووی دەگـۆڕێ، وەك پێغەمبـەر ﷺ دەفـەرموێ: ﴿يُحْشَرُ النَّاسُ يَوْمَ الْقِيَامَـةِ عَلَـى أَرْضٍ بَيْضَـاءَ عَفْـرَاءَ كَقُرْصَـةِ نَقِـيٍّ لَـيْسَ فِيهَـا مَعْلَـمٌ لأَحَـدٍ﴾ {أَخْرَجَهُ الْبُخَارِيُّ بـرقم: (٦٥٢١)، وَمُسْلِمٌ بـرقم: (٦٩٨٦)، وَابْنُ حِبَّان بـرقم: (٧٣٢٠) عَنْ سَهْلِ بْنِ سَعْدٍ رَضِيَ اللهُ عَنْـهُ}، واتـە: لـە ڕۆژی دوایـی خـەڵك لەسـەر زەویەکی سـپی کۆدەکرێنـەوە، وەك نانێکـی سـپی لێـدێ گوناحی لەسـەر نـەکراوە. ئـنجا نانێکـی سـپی کە گوناحی لەسەر نەکرابێ، مانای وایە ئـەم زەویـەی ئێمـە نیـە، بە شێوەیەکی دیکە خـوای پـەروەردگار هەیئەتەکەی دەگـۆڕێ، نـازانین چۆنە؟ دیارە زۆر فـراوان دەبـێ، وە تەشـکیلەی دنیـا کـە ئێسـتا زەویـەو کۆمەڵـەی خـۆرەو کەهکەشانەکانو کەونو کائینات خـوای کاربەجێ بـە جۆرێکـی دیکە دایدەڕێژێتـەوە کـە بـەس خـوا بۆخـۆی دەزانـێ چۆنـە، ئـنجا کـە خـوا پێیـان دەفـەرموێ: ﴿ مَاذَآ أُجِبۡتُمۡ ﴾، چیتان وەڵام درایـەوە؟ ئـەوانیش دەڵـێن: زانیاریمـان لـەلا نیـەو هـی ناتـەواویش لایقـی ئـەوە نیـە بـۆ تـۆی بخەینـە ڕوو، ئـەوە یـەك، یـاخود ئـەو زانیـارییەی کـە تـۆ لـە لاتـە، هـی ئێمـە لـە بەرانبەریـدا شـتێك نیـە، کەواتـە: پێویسـت ناکـات ئێمـە بـۆ تـۆی بخەینـە ڕوو، هەڵبـەتە خـوای پەروەردگـاریش مەبەسـتی ئـەوە نـەبووە، کـە ئـەوان لێـرەدا قسـە بکـەنو زانیـارییـەك بخەنـە ڕوو، بەڵـکو مەبەسـتی ئـەوە بـووە کـە سەرزەنشـتی کۆمەڵـگا کـافرەکانیـان بکـات، کـە ئیمانیان پێیان نەهێنـاوە، تـاکو پێغەمبـەران (علیهم الصلاة والسلام) بڵـێن: ئێمـە پێمـان ڕاگەیـاندن، بـەڵام خـوایە چـۆنیان وەڵام دایـەوە؟ تـۆ باشـتـر دەزانـیو فریشـتەکان نوسـیوویانەو تۆمـارکراوە، با بخـرێتـە ڕوو.

**مەسـەلەی دووەم:** خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿ إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ٱذۡكُرۡ نِعۡمَتِي عَلَيۡكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗاۖ وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَۖ وَإِذۡ تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِيۖ

وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِي ۖ وَإِذْ تُخْرِجُ ٱلْمَوْتَىٰ بِإِذْنِي ۖ وَإِذْ كَفَفْتُ
بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذْ جِئْتَهُم بِٱلْبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِنْهُمْ إِنْ هَٰذَآ
إِلَّا سِحْرٌ مُّبِينٌ ۝ وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى ٱلْحَوَارِيِّـۧنَ أَنْ ءَامِنُوا۟ بِى وَبِرَسُولِى قَالُوٓا۟
ءَامَنَّا وَٱشْهَدْ بِأَنَّنَا مُسْلِمُونَ ﴿١١١﴾، کاتێـك خـوا فـەرمووی: ئەی عیسـای کوڕی مەریـەم! چاکـەی من بەسەر خۆتو دایکـتەوە یاد بکـەوە... لەم دوو ئایەتەدا خـوای زاناو توانـا (١٠) لە موعجیزەکانی خۆی کە بە عیسـای ﷺ داون، دەخـاتە ڕوو:

# باسی (١٠) لە موعجیزەکانی عیسا عليه السلام

یەکەم: ﴿إِذۡ أَيَّدتُّكَ بِرُوحِ ٱلۡقُدُسِ﴾، یاد بکەوە کە تۆم بەهێز کرد بە (روح القدس)، دیارە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: (روح القدس) واتە: جبریل، وە هەندێك گوتوویانە: (روح القدس) ئەو ئیمانەیە کە عیسا عليه السلام هەیبووە، وە هەندێك گوتوویانە: (روح القدس) ئەو ڕووحە پاکەیە کە عیسا عليه السلام هەیبووە، بەڵام نەصرانییەکان بۆخۆشیان نازانن (روح القدس) چییە؟ دەڵێن (روح القدس) شتێکە لە نێوان خواو عیسادا هاتووەو چووە، ناڵێن جبریل، بەڵام زانایانی ئیسلام دەڵێن: یان مەبەست پێی جبریلە، کە ئەو ڕایە بەهێزترە، چونکە خوای بەرز دەفەرموێ:﴿ قُلۡ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلۡقُدُسِ مِن رَّبِّكَ ﴿١٠٢﴾﴾ النحل، بڵێ: (روح القدس) لە پەروەردگارتەوە ئەم قورئانەی دابەزاندوە..، کەواتە: (روح القدس) یانی: جبریل، چۆنیەتی بەهێزکردنی عیسا عليه السلام بە (روح القدس) چی بووە؟ ئەوە بووە کە جبریل هەمیشە لەگەڵی بووەو هاوکاریی کردووەو فێری کردوە، پشتی گرتووەو دڵی ڕۆشن کردۆتەوەو پاراستووشیەتی.

دووەم: ﴿تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلۡمَهۡدِ وَكَهۡلٗاۖ﴾، خەڵکی دەدوێنی کە لە بێشکەدای، وە کاتێك کە دەکەویە تەمەنیشەوەو کامڵ دەبی، پێشتریش ئایەتەکانی سوورەتی مەریەممان هێنایەوە، کە خوای پەروەردگار لە سوورەتی مەریەم دا باس دەکات، چۆن جبریل دەنێرێ بۆ لای مەریەم، لە کاتێکدا مەریەم خەریکی خۆشۆردن دەبێ، جبریل لە شێوەی پیاوێکی تێرو تەواودا خۆی بۆ دەنوێنێ، وەك دەفەرموێ: ﴿...فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرٗا سَوِيّٗا ﴿١٧﴾ قَالَتۡ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحۡمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيّٗا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمٗا زَكِيّٗا ﴿١٩﴾ قَالَتۡ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٞ وَلَمۡ يَمۡسَسۡنِي بَشَرٞ وَلَمۡ أَكُ بَغِيّٗا

﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ ... ﴾، واتە: (جبریل) بۆی چووە سەر شێوەی بەشەرێکی ڕێکوپێك، ئەویش (مەریەم) گوتی: من پەنا بە خوای بە بەزەیی دەگرم لە تۆ، ئەگەر تۆ کەسێکی پارێزکاری، (جبریل) گوتی: من تەنیا نێردراوی پەروەردگارتم، هاتووم منداڵێکت پێبدەم، گوتی: جا من چۆن منداڵم دەبێ، کە هیچ بەشەرێك دەستی نەگەیاندۆتە من (بە حەلاڵیی)، وە داوێن پیسیش نیم، (مەریەم گومانی خراپی لێ دەکات)، گوتی: پەروەردگارت وایفەرمووە، کە ئەوە بۆ من شتێکی ئاسانە...، جا دوایی دەفەرموێ: ﴿فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ ۖ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾﴾مریم، واتە: (دوای ئەوەی مەریەم عیسای دەبێ) کۆرپەکەی بەدەستەوە دەبێ دەیباتەوە بۆ لای قەومەکەی، گوتیان: ئەی مەریەم! شتێکی خراپت کردوە، (ئەو منداڵەت لە کوێ بوو، کە مێردت نەکردووەو هەر کچی؟!) مەریەمیش خوای پەروەردگار پێشتر پێی دەفەرموێ: ﴿فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِىٓ إِنِّى نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾﴾مریم، واتە: ئەگەر بەشەرێکت دی بڵێ: من ئەمڕۆ ڕۆژووم بۆ خوای خاوەن بەزەیی لە خۆم گرتوە، قسە لەگەڵ کەس ناکەم، دیارە ڕۆژووگرتنی ئەو کاتە قسە لەگەڵ نەکردنیشی تێدا بووە، نەدەبوو قسەش بکەن، ئیدی کە دەڵێن: ئەی مەریەم! ئەوەت لە کوێ بووە؟ ﴿يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾﴾مریم، واتە: ئەی خوشکی هاروون! (دیارە مەریەم دەبێ برایەکی هەبووبێ ناوی هاروون بێ، یاخود مەبەستیان ئەوەبووە کە مەریەم لە تاعەتدا وەك هاروونی برای مووسا بووە، هاروون زۆر پیاوێکی نەرمو نیانو مەندبووەو بە شەرمو شکۆ بووە) واتە: مەریەم! تۆ کە لە شەرمو شکۆ هێدیی و مەندییدا وەك هاروونی برای مووسا بووی، تۆ نە بابت پیاوی خراپ بووە، نە دایکت داوێن پیس بووە، ئێستا ئەوەت لە کوێ بووە؟! ﴿فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ ۖ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾﴾مریم، واتە: (دیارە کە بۆخۆی ئاماژەی کردوە کە من

قسە ناکەم بەڕۆژووم) ئاماژەی بۆ کۆرپەکەی کرد، گوتیان: جا چۆن لەگەڵ منداڵێکدا قسە بکەین، کە جارێ لە بێشکە دایەو لەسەر قۆنداغەو مەلۆتکەیە؟ دیارە پێیان سەیر بووە، ئنجا عیسا یەکسەر دێتە وەڵام: ﴿ قَالَ إِنِّي عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِيَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِي نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِي مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِي بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمْ يَجْعَلْنِي جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَيَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ﴾ مریم، واتە: (عیسا ﷺ گوتی: من بەندەی خوام، کتێبی پێداوم، وە کردوومی بە پێغەمبەر (ئنجا جارێ کە لەسەر حاڵەتی قۆنداغ دایەو مەلۆتکەیە، یانی چی: کردوومی بە پێغەمبەرو کتێبی پێداوم؟!! واتە: دەمکاتە پێغەمبەرو کتێبم پێدەدا، کەواتە: ئەو دایکەی من خراپەکار نیە، ئنجا دەڵێ:) خوا منی بە موبارەك دروستکردوە، وە فەرمانی پێکردووم نوێژ بکەم، وە زەکات بدەم، وە لەگەڵ دایکم چاك بم، وە من خۆ بە زلگرو بەدبەخت نیم، وە سەلامم لێ بێ، ئەو ڕۆژەی کە لەدایك دەبمەو، ئەو ڕۆژەی کە دەمرمەو، ئەو ڕۆژەی کە زیندوو دەبمەوە، (ئاوا عیسا ﷺ بەرگریی لە دایکی کردوە).

ئاوا عیسا سەلامی خوای لێ بێ بەرگریی و موڕافەعەیەکی باش دەکات لە دایکی، کە مەرج نیە تەنیا یەك جاریش بووبێ، ڕەنگە هەر جارێ پێویست بووبێ و، مەجلیس گیرابێ، دیسان عیسا قسەی کردبێ، ئایەتەکەش نافەرموێ یەك جار بووە، دوورنیە چەندان جار گوتبیان: کوا دەبا ئەو منداڵە قسان بکات، ئەی مەریەم! داخۆ ئەو منداڵەت لە کوێ بووە؟ چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿ تُكَلِّمُ ٱلنَّاسَ فِي ٱلْمَهْدِ وَكَهْلًا ﴾، لە لانکەداو بە کامڵیی قسە لەگەڵ خەڵکدا دەکەی، نافەرموێ: یەك جار، بەڵکو ڕەنگە چەند جاران پێویستی بووبێ، عیسا ﷺ قسەی کردبێ، وە پێشتریش باسم کرد، بۆیە باسی کامڵیی (کهلاً)یش دەکات، واتە: قسەی سەر قۆنداغیی و حاڵەتی کە لە لانکە دابووە، لەگەڵ قسەی قۆناغی کامڵییت، وەك یەك بووەو بەرێوجێ بووە.

سـێیەمو چـوارەم: کـە دەفـەرموێ: ﴿ وَإِذۡ عَلَّمۡتُكَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ ﴾، دەگونجـێ بڵـێین: موعجیـزەی سـێیەمی عیسـا ئەوەبووە کە خـوا کیتـابو حیکمـەتی فێرکـردوە، وە موعجیزەی چوارەمیشـی ئـەوەبوو کـە تـەوراتو ئینجـیلی فێرکـردوە، لـەم تەفسـیـرەدا زۆرجـار باسـی کیتابو حیکمەتمان کردوە، دەگونجـێ مەبەسـت لـە کیتـاب، (حـەڵاڵو حـەرامو یاسـا شـەرعییەکان بێ)، حیکمـەتیش مەبەسـت پێـی ڕەوشـتو بـەها بـەرزو جوانـەکان بـێ، وەك بـە تەفصـیل لـە دەرسـەکانی دیکـەدا باسـم کـردوە، وە دەشـگونجێ مەبەسـت لـە (کتـاب) لێـرەدا نووسـین بـێ، (حکمـة)یـش عـەقـڵو هـۆشو شـارەزایی بـێ، دیـارە خـوای پەروەردگار یەکسـەر ئینجیلو تەوراتیشـی فێـری عیسـا ﵇ کـردوەو خـۆی خوێنـدەواریی (خوێنـدنو نووسـین)ی نـەبووە، دیـارە ئەوانـەش موعجیـزەی گـەورە بوون.

پێنجـەم: ﴿ وَإِذۡ تَخۡلُقُ مِنَ ٱلطِّينِ كَهَيۡـَٔةِ ٱلطَّيۡرِ بِإِذۡنِي فَتَنفُخُ فِيهَا فَتَكُونُ طَيۡرَۢا بِإِذۡنِيۖ وَتُبۡرِئُ ٱلۡأَكۡمَهَ وَٱلۡأَبۡرَصَ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ تُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِيۖ وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡهُمۡ إِنۡ هَٰذَآ إِلَّا سِحۡرٞ مُّبِينٞ ﴾، وە یـاد بکـەوە کاتێـك کـە بـە مۆڵـەتی من لە قوڕ شـێوەی باڵـندەت دروسـت دەکـردو، فـووت پێـدا دەکـردو بـە مۆڵـەتی من دەبووە باڵـندە، لـێرەدا (تخلُق) یـانی: سـاز دەکەی، دروسـتی دەکـەی، (تُـهَيِّءُ، تَصْنَعُ) دێ، نـەك پەیـدا دەکـەی (تُوجِدُ)، چـونکە خـوای باڵادەسـت دەفەرموێ: ﴿ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ١٧ ﴾النحـل، واتە: ئەو کەسـەی بەدییدێـنێ وەك ئـەو کەسـە وایـە کـە بەدیناهێنـێ؟ ئایا بیـرناکـەنـەوە! یـان دەفـەرموێ: ﴿ ... ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖ وَهُوَ ٱلۡوَٰحِدُ ٱلۡقَهَّٰرُ ١٦ ﴾الرعـد، (خلـق) لـەم ئـایەتـانەدا بـە مانـای بـە دیهێنـان دێ، واتـە: شـتێك لـە نەبوونـەوە پەیدا

بکرێ، کە بەس بە خوا دەکرێ، بەڵام شتێك بۆ شتێك بگۆڕرێ، ئەوە لەڕاستییدا تەنیا مانایەکی (خلق) دەیگرێتەوە، کە بریتیە لە ئەندازەگیریی کردن، کە لێرەدا بە مانای ئەندازە گۆڕینە لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێك، یانی: قوڕەکە هەیە وەك کەرەسەی خاو، بەڵام قوڕەکە کێ دروستی کردوە؟ بێگومان خوا، بەڵام لە قوڕەکە کێ شێوەی باڵندەکەی ساز کرد؟ عیسا ﷺ، ئنجا کە فووشی پێدا کردوە، یەکسەر خوای بەدیهێنەر ژیانی خستۆتە بەر ئەو قوڕە، وە بۆتە باڵندەیەکی زیندوو، بۆیەش ناڵێم ڕووح، چونکە من پێموایە ڕووح تایبەتە بە ئینسانەوە، بەڵام زیندەوەر جا هەر لە ڤایرۆس و میکرۆب و ژیانداری یەك خانەیی یەوە، بگرە هەتا کرم و زیندەوەرانی دیکەو، تاکو پەلەوەرو، تاکو ئاژەڵ و ئەوانە هەموویان من پێموایە ژیانیان هەیەو ژیاندارن، ئەگەرنا گیان وەك ڕووح تایبەتە بە ئینسانەوە، ئەو ڕووحەش شتێکی خواییە کە بە بەر ئینسانی دا دەکات، بەڵام باقی زیندەوەرانی دیکە ژیانیان هەیە، بەڵام هەموو جارێ دەفەرموێ: ﴿ بِإِذْنِي ﴾، کە (إذن) بە مانای مۆڵەت دێ، وە بە مانای فەرمان دێ، بە مانای ڕێگە پێدان دێ، وە بە مانای ئیرادەو ویست دێ، چەند واتایەکی هەن.

شەشەم و حەوتەم: ﴿ وَتُبْرِئُ ٱلْأَكْمَهَ وَٱلْأَبْرَصَ بِإِذْنِي ﴾، موعجیزەی شەشەم ئەوە بووە کە کوێری کە هەر بە زکماك کوێر بووە، چاکی کردۆتەوە، بۆیەش دەڵێین: زگماك، چونکە ئەوی دیکە کە ڕەنگە هەر چاوی نەخۆش بووبێ، یاخود چاوی زەرەرێکی پێ گەیبێ، چاوی چاك کرابێتەوە، زۆرجار ئەوە بە غەیری عیساش کراوەو دەکرێ، پزیشکەکان ڕەنگە بتوانن ئەو حاڵەتانە چارەسەر بکەن، بەتایبەت ئێستا ئەوە دەکرێ، کە کەسێك شەبەکەی چاوی پچڕاوە، شتێکی دیکەی لێهاتوە دەگونجێ پزیشك چاکی بکاتەوە، بەڵام کەسێك هەر لە زگماك چاوی هەر کوێر بووبێ، یان هەر شوێنی چاوی قەپات بووبێ، عیسا ﷺ توانیویەتی دوعای بۆ بکاتو خوا چاوی چاك بکاتەوە، یان بۆی پەیدا بکات.

موعجیـزەی حەوتـەم: ﴿ وَٱلۡأَبۡرَصَ ﴾، (أبـرص)یش یـانی بەڵـەك واتـە: عیسـا بەڵەکیشـی بـە مۆڵـەتی خـوا چـاك کردۆتـەوە، دیـارە ئێسـتاشی لەگەڵـدابێ نەخۆشی بەڵـەك هـەر چـاك نـابێ.

هەشـتەم: ﴿ وَإِذۡ تُخۡرِجُ ٱلۡمَوۡتَىٰ بِإِذۡنِي ﴾، ئەوەی کە زۆر جێی سـەرنجە ئەوە کە دەفـەرموێ: کاتێـك کـە بـە مۆڵـەتی مـن مـردووت دەردەهێنـان، ئـەوە نـابێ یەکسـەر مانـا ڕواڵەتییەکـەی لـێبگـری، چونکە کاتی خۆی مردوو دەرهێنانەوە لـە گۆڕسـتانان هەبووە، بۆ کفـنو شـتی وا، یـان وایانزانیوە شتی لەگەڵ نێژراوە، مردوو دەرهێنـانەوە لە گـۆڕ، هیچ نیـە، مردوو بە زینـدوویی دەربێنیـەوە، گرنگە، کە تەنیا عیسـا ﷺ ئەوەی کردوە، دوعـای کردووە، ئەو مـردوە بـە زینـدوویی لـە قەبرەکـەی هاتۆتـە دەر، پرسـیاریان لـێکـردوە، هـەتا گێڕراوەتـەوە کـە یـەکێ لـە کوڕەکانی ئادەمی زینـدوو کردۆتـەوەو هەنـدێك پرسـیاری لێکـردوون، بـە هـەر حاڵ ئەوانـە ئێمـە لـە ڕێیەکـی ڕوونـەوە پێمان نەگەیشـتوون، گـرنگ ئەوەیـە خـوا بەگشـتی دەفـەرموێ: کاتێـك مـردووت زینـدوو دەکردنـەوە، ئنجا مـادام بـە کـۆ (جمـع) هـاتوە: (الـموتی)، دیـارە یـەکـێ زیـاتر بـووە، ئنجا سـێ، چوار، پێـنج ... چـەند بوون؟ نازانیـن، بـەڵام کە مردووەکانی زینـدوو کردۆتـەوە، مانـای وانیـە دوایی هـەر زینـدوو بوون، بەڵـکو هـەتا ئـەو کاتـەی خـەڵك پرسیارو وەڵامێکیـان لێیـان بووبـێ، مـاونو دوایـی فەرموویـەتی: بـە فـەرمانی خـوا وەك خۆتـان لـێبێتـەوەو، وەفاتیـان کردۆتـەوە.

نۆیـەم: ﴿ وَإِذۡ كَفَفۡتُ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ عَنكَ إِذۡ جِئۡتَهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِ ﴾، وە یادبکـەوە کاتێك کە وەچەی ئیسـرائیلم لـێ دوورخسـتیەوەو تۆم لـە شـەڕو زیانی وان پاراسـت، کاتێـك کـە بـە بەڵگە ڕوونو ئاشکراکانەوە هاتی بۆ لایان، ئـەوەش شـتێکی زۆر سـەیر بـووە! عیسـا ﷺ پیـاوێکی بـێ پشـتو پـەناو بـە تـەنیا، ئنجا جوولەکەکـان هێنـدە دژایـەتییان کـردووە، سـەرباره ڕۆمەکانیشیان بـە پشـتەوە بـووە، بـەڵام بـە هـەموویان زەفـەری پـێ نابـەن، ئـەوەش دیـارە کـە خـوا پاراسـتوویەتیو موعجیـزەیەکی دیکـەیەتی.

دەیـــەم: ﴿ وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ﴾، واتـە: وە یادبکـەوە کاتێـك کـە وەحیـیم نـارد بـۆ حەوارییـەکانو پـێم ڕاگەیانـدن (خسـتمە دڵیانـەوە)، کـە ئیمـان بـە مـنو بـە پێغەمبەرەکـەم بێـنن، ئـەوانیش گوتیـان: ئیمانمـان هێنـاو شـایەدبە کـە ئێمـە مسـوڵمانین، ئـەوە دە مـوعجیزەو دە نیعمـەتی ناوازە، کـە خـوای پـەروەردگار بـە عیسای ﷺ داون.

**مەسـەلەی سـێیەم:** ئنجا خـوای پـەروەردگار دێتـە سـەر باسـی ئـەو خـوانەی کـە پێشـتـر باسمان کرد، دەفەرموێ: ﴿ إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ﴾، لێـرەدا ﴿ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ ﴾، بـە دوو شـێوە خوێندراوەتـەوە ﴿ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ ﴾، ئایـا پەروەردگـارت دەتوانێ خـوانێکمان لـە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنـێ پڕ بـێ لە خـواردن؟! ئەویش دەفەرموێ: پـارێز لـە خـوا بکـەن ئەگـەر ئیماندارن، هەروەها خوێندراویشـەتەوە: (هَلْ تستطيعُ رَبَّـك) یـانی: (هَلْ تَسْتَطِيعُ سؤالَ رَبِّـك) واتە: ئایا دەتوانی داوامان بۆ لە پەروەردگارت بکەی، ئەوەمان بۆ بکات، عیساش ﷺ کە جارێ باش لـە نیازو مەبەستەکەیان حالّی نـەبووە، فەرموویـەتی: پارێز لە خـوا بکەن، ئەگەر ئیماندارن ئەو جۆرە داوایانە لە خـوا مەکـەن.

دیارە بە پێی خوێندنەوەی دووەم: (هَلْ تستطيعُ رَبَّـك) هیچ ئیشکالێك نیە، بەڵام بە پێی خوێندنەوەی یەکەم: ﴿ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ ﴾، ئیشکال هەیە، کە بریتیـە لەوەی حەوارییەکان نەزانن، کە ئایا خوای باڵادەست فلاّن کارەی پێـدەکرێ یـان نـا؟! منیـش پێمـوایە بە دوو شـێوە ئەو ئیشـکالە لادەچـێ:

١- مەبەسـت لـە: ﴿ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ ﴾، توانینـــی ئەنجامـدان (قـدرة التنفيـذ) نیـــە، بەڵـــکو مەبەست ئەوەیـە کـە ئایـا حیکمـــەتی خـــوای کاربەجـێ ڕێگـــا بـــە

کارێکـــی وا دەدات، یـان نـا؟! کـە ئـەو شـێوازە دەربڕینـەش شـتێك بـاوە لـە زمـانو عورفـی گەلانـدا.

٢- وادیـــارە حەوارییەکـــان ئـەو کـــاتە ســـەرەتای هیدایـەتو خـواناســـیی یـان بـووەو مەرج نیـە هـەموو سـیفەتەکـانی خـوایـان ناســیبـێو زانیـبـێ.

**مەســـەلەی چـــوارەم:** حەوارییەکـان پاســاوو بەڵگەکـانی خۆیـــان دەخەنــە ڕوو، کـە بۆچی داوا دەکـەن سـفرەو خـوانێکـیان لـە ئاســمان بـۆ بێتـە خــوار: ﴿ قَالُواْ نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ ﴾، چـوار پاسـاو دێنـنـەوە:

١/ دەڵـێن: (نُرِيدُ أَن نَّأۡكُلَ مِنۡهَا ) دەمانــەوێ لـەو سـفرەو خـوانە بخـۆین، دیـارە برســییان بووەو پێویســتییان پێـی بووە.

٢/ ﴿ وَتَطۡمَئِنَّ قُلُوبُنَا ﴾، وە دڵیشـمان ئارام بگرێ، سفرەو خوانێکی گەورە بـووە، چونکــە وەك لــە ئینجیلەکـــاندا باســکراوە هەنــدێکیان گوتوویانــە: چـوار هــەزار (٤٠٠٠) کـەس لێیان خواردوە، بەڵـکو زۆربـەیان دەڵێن: پێـنج هـەزار (٥٠٠٠) کـەس لــەو ســــفرەیان خــــواردوە[1]، ئنجـــا دوایـــی چـــەند ســەبەتەیەکیشــــیان لـــێ هەڵگرتۆتـــەوە هـەر لـەو ســـفرەیەو، چـەندان خەڵـــکی دیکــە لێیـان خـــواردوە، کەواتــە: شـتێکی زۆر گـــەورەو ســەرســـوڕهێنەر بـــووە، واتــە: تــاکو بەهــۆی ئــەو ســفرەوە، ئیمــانمـان زیــاد بکـاتو دڵـمان زیــاتر ئــارام بگـــرێ.

---

١) التفسـير التطبيقـي للكتـاب الـمقدس، العهـد الجديـد، إنجيـل: مَـرقُسْ، الأصـحاح: ٦، (يسـوع يطعــم الخمســة الآف)، ص ٢٠٠٢، وإنجيــل: مَتــَّى، الإصــحاح: ١٤، (يســوع يطعــم الخمســة الآلاف)، ص ١٩١٩.

بەڵام باسی هاتنە خـوارەوەی سـفرە لە ئاسمان نەکراوە، بەڵکو باسـی ئەوە کراوە کـە عیسـا ﷺ تەماشـای ئاســمانی کـردوەو دوعـای کـردوەو پێـنج نـانو دوو ماســی یەکـە بەرەکـەتیان کـەوتۆتێو زیادیان کردوە.

٣/ ﴿وَنَعۡلَمَ أَن قَدۡ صَدَقۡتَنَا﴾، سێیەمیش ئەوەیە کە بزانین تۆ ڕاست دەکەی لەگەڵمان، وە بەڕاستی پێغەمبەری خوای.

٤/ ﴿وَنَكُونَ عَلَيۡهَا مِنَ ٱلشَّٰهِدِينَ﴾، وە پاساو بەڵگەی چوارەممان ئەوەیە کە ئێمەش دەبینە شایەد کە تۆ پێغەمبەری خوای، ئەو شتە گەورەیەت کردوە، لێرەدا (سید قطب) ڕەحمەتی خوای لێ بێ لە تەفسیرەکەی خۆیدا[1]، قسەیەکی جوان دەکات، دەڵێ: تەماشای ئەو هەڵوێستەی حەوارییەکان بکەن (حەوارییەکان واتە: برادەرە دانستەو تایبەتییەکانی عیسا کە زۆر لێی نزیك بوون و زۆر ئینسانی چاك و بە ئیمان بوون) حەوارییەکان داوای سفرەو خوان لە عیسا دەکەن بۆیان دابەزێنێ، دەڵێ: بەڵام هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ هەرگیز ڕۆژێك لە ڕۆژان داوایەکی وایان لە پێغەمبەری خوا ﷺ نەکردوە، ڕاستیش دەکات، هەرگیز هاوەڵانی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ داوایان لێ نەکردوە شتێکی وایان بۆ بکات، بەڵێ جاری وا هەبووە خواردنیان کەم بووە، پێغەمبەر ﷺ دوعای لێ خوێندووە زۆر بووە، یاخود ئاویان لێبڕاوە لەنێو پەنجە موبارەکەکانی دا ئاو هەڵقوڵاوەو شتی دیکەش، بەڵام هەرگیز ئەوان داوایان لێ نەکردوە شتێکی وایان بۆ بکات، کەواتە: هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر ﷺ هەردەم ئیمانەکەیان تەواوتر بووەو، عەقڵەکەیان کاملتر بووە، بێگومان ئەوانیش عاقڵ و بە ئیمان بوون، بەڵام پلەی هاوەڵان بەرزتر بووە لە پلەو پایەی حەوارییەکان.

<u>مەسەلەی پێنجەم</u>: ئنجا با بزانین عیسا ﵇ چی دەفەرموێ: ﴿قَالَ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ ٱللَّهُمَّ رَبَّنَآ أَنزِلۡ عَلَيۡنَا مَآئِدَةً مِّنَ ٱلسَّمَآءِ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا وَءَايَةً مِّنكَۖ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ﴾، عیسای کوڕی مەریەم فەرمووی: ئەی خوایە پەروەردگارمان! خوانێکی پڕ لە خواردنمان لە ئاسمانەوە بۆ دابەزێنە، ئنجا ئەویش سێ بەڵگەو پاساو دێنێتەوە بۆ دابەزاندنی ئەو خواردنە:

١) في ظلال القرآن، ج٢، ص٩٩٨.

١) ﴿ تَكُونُ لَنَا عِيدًا لِّأَوَّلِنَا وَءَاخِرِنَا ﴾، بۆمان ببێ بە جەژن بۆ پێشین و پاشینمان، تەماشا بکەین! پێغەمبەران چەند فراوانتر دەبینن، حەوارییەکان یەکسەر گوتوویانە: (نأكل منها) لێی دەخۆین، ئەو جارێ باسی خواردنێ هەرناکا دەڵێ: تاکو ئەو خوان دابەزینە، ببێتە بۆنەیەکی گەورەو جەژنێك بۆ هەموو لایەکمان.

٢) ﴿ وَءَايَةً مِّنكَ ﴾، وە ببێتە نیشانەو موعجیزەیەك لە تۆوە، تاکو ئەو خەڵکە زیاتر ئیمانیان دابمەزرێ.

٣) ﴿ وَٱرۡزُقۡنَا وَأَنتَ خَيۡرُ ٱلرَّٰزِقِينَ ﴾، ئەوان گوتیان: لێی دەخۆین، ئەو دەفەرموێ: ﴿ وَٱرۡزُقۡنَا ﴾، وە بژێومان بدەیە! ئەو خەڵکە ئاتاجو برسییە، دیارە لە شوێنێکی چۆڵ بوون، وەك لە ئینجیلەکاندا هاتووە دەستیان لە هیچ خواردنێك گیرنەبووە.

**مەسەلەی شەشەم و کۆتایی:** ئەوەیە کە خوا وەڵام دەداتەوە: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدًا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، وەك پێشتریش تەفسیرمان کرد، خوا دەفەرموێ: دایدەبەزێنم بۆتان، بەڵام هەر کەسێك لە ئێوە دوای دابەزینی ئەو سفرەو خوانە، بێبڕوابێ بە جۆرێك سزای دەدەم، کەسم وا سزا نەدابێ لە جیهانییان، بۆچی؟ چونکە سوننەتی خوایە هەر کەسێك خوا نیعمەتی زیاتری بداتێ، دوایی توندتریش لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات، وەك دەفەرموێ: ﴿ ثُمَّ لَتُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَئِذٍ عَنِ ٱلنَّعِيمِ ۝٨ ﴾التكاثر، ئەوەی عەقڵی بەقوەتتر بێ، لێپرسینەوەی قورسترە، ئەوەی زانیاری زیاتربێ، لێپرسینەوەی گرانترە، ئەوەی دەسەڵات، یان پارەو ماڵ و سامانی زیاتربێ... هتد، ئەوەی خوا نیعمەتی زیاتری بداتێ، زیاتری

لێدەپرسێتەوە، خوا چەندت بداتێ، ئەوەندەشت لێدەپرسێتەوە، ئەوەی کەمتری بداتێ، کەمتر لێی دەپرسێتەوە، ئنجا عیسا ئەو موعجیزە گەورەیە پێشانی وان بدات و دوای ئەوەش هەر بێبڕوابن! مانای وایە شایستەی ئەوەن بە جۆرێك سزا بدرێن، كە هیچ كەس لەمەو پێش بەو شێوەیە سزا نەدرابێ، چونكە دوایی خەڵك دەڵێن: ئەوانە ئەوەشیان دیوە، ئیمان ناهێنن، ئێستا ئێمە بۆچی و چۆن ئیمان بێنین؟! وە سەرەنجام دەبنە ڕێ شكێن بۆ ئەوە كە خەڵك بیانوویان بەدەستەوەبێ بۆ كافربوون.

**جا ئایا ئەو سفرەیە دابەزیوە، یان دانەبەزیوە؟! دوو ڕا هەن:**

ڕای یەکەم: هەندێك لە زانایان دەڵێن: ئەو سفرەیە دوایی كە عیسا پێی فەرموون، خوا ئاوا دەفەرمویێ: هەر كەسێك كافربێ لەمەودوا بەو جۆرەی عەزاب دەدەم، گوتیان: نە سفرەمان دەوێ و نە ئەو عەزابەشمان تووشبێ، هەر لێیگەڕێ.

ڕای دووەم: بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: ئەو سفرەیە دابەزیوە، چونكە خوا دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ إِنِّي مُنَزِّلُهَا عَلَيۡكُمۡۖ فَمَن يَكۡفُرۡ بَعۡدُ مِنكُمۡ فَإِنِّيٓ أُعَذِّبُهُۥ عَذَابٗا لَّآ أُعَذِّبُهُۥٓ أَحَدٗا مِّنَ ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴾، بێگومان من دای دەبەزێنم، كەواتە: سفرەكە دابەزێندراوە، منیش ئەم ڕایەی دووەمم پێ ڕاستە.

**ئنجا ئایا ئەو سفرەو خوانە چی لەسەر بووە ؟**

هەندێك گوتوویانە: ماسی بووە، هەندێك گوتوویانە: كولێرەو ماسی بووە، هەندێك گوتوویانە: میوەی بەهەشت بووە، هەندێك گوتوویانە: ... هتد، زۆر شتیان گوتوە، بەڵام هیچی بەڵگەیەكی وای لەسەر نیە، بۆیە (طبري) لە (جامع البيان)ەكەی خۆیدا قسەیەكی زۆر جوان دەكات، كە دیارە نازناوی پێشەوای توێژەروانی هەیە، پێموایە نازناوەكەی پڕ بە پێستی خۆیەتی، بەڕاستی هەندێ بنچینەی داناون بۆ تەفسیری قورئان، زۆر بەجێن، یەكێك لەوانە ئەوەیە كە دەڵێ: ئەو شتانەی كە خوا دەری نەخستوون، پێویست ناكات بەدوایان

دابچـین، ئـەو سـفرەیە چی لەسـەر بـوو؟ چـەند كـەس لێیـان خـوارد؟ چـۆن بـوو؟ پێویسـت ناكـات، مادام خـوا باسی نەكردوەو، پێغـەمبەریش باسی نـەكردوە، كەواتـە: نابـێ بـە دوای بكـەوی، چونكە ناگەیـە هـیچ ئەنجـامێك، بـۆ وێنـە: گۆچانەكـەی مووسا لـە چ دارێـك بـوو؟ كەشـتییەكەی نـووح لـە چی دروسـت كـرا بـوو؟ چـەند مەتـر بوو؟ چەند كەسـی تێدا بوون؟ مـادام خـوا باسی نـەكردوەو پێغەمبـەر ﷺ باسـی نەكـردوە، بێگومـان لـە ڕێگـای وەحییـەوە نـەبێ پـەنهان (غیـب) نـازانرێ، هەركـەس بەدوایـدا بگـەڕێ، غەڵـەتە، (طبري) دەڵـێ: (وَأَمَّا الصَّوَاب مِن القَوْل فِيمَا كَانَ عَلَى الـمَائِدَة، فَأَن يقـال: كَـانَ عَلَيْهَا مأكـول، وَجَائز أَن يكون كـان سمكًا وخُبزًا، وَجَائزٌ أَن يَكون كَانَ ثَمرًا مِن ثَمر الجَنَّة، وَغَير نَافع العِلم بِهِ، وَلا ضارّ الجَهْل بـه، إِذَا أقرَّ تَـالي الآيـة بظـاهر مَا احْتَمله التنزيل)[1]، چـەند جوان دەڵـێ، واتە: قسـەی ڕاسـت ئەوەیە دەربـارەی ئـەوەی كـە لەسـەر ئـەو خـوانە بـووە، كـە بگـوترێ: خـواردنێكی لەسـەر بـووە، ئنجا دەگونجـێ ماسـیو نـان بووبـێ، وە دەگونجـێ میـوەی بەهەشـت بووبـێ، وە دەگونجـێ هەرشـتێكی دیكـە بووبـێ، وە زانیـاری هـەبوون بـەوەی كـە چی لەسـەر سـفرەكەی بـووە، هـیچ سـوودێكمان پـێ ناگـەیەنـێ، وە كـە نەشـزانین چی لەسـەر بـووە، چ شـتێك بـووە، دیسـان هـیچ زەرەرێكمـان لـێ نـادات، مـادام ئـەو كەسـەی كـە قورئانـێ دەخوێنێتـەوە، ئایەتەكـە دەخوێنێتـەوە، ئیمـانی هەبـێ بـەوەی كـە خـوای پـەروەردگار فەرموویـەتی، كـە ڕواڵـەتی ئایەتـەكە هەڵیدەگـرێ.

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

---

١) ج٥، ص١٤٢.

# دەرسی بیست و پێنجەم

## پێناســەی ئەم دەرسە

لەم دەرسەماندا پێنج ئایەتی كۆتایی سوورەتی (المائدة) تەفسیر دەكەین، كە ئایەتەكانی (١١٦، ١١٧، ١١٨، ١١٩، ١٢٠)ن، لەو پێنج ئایەتە موبارەكەدا چوارەمین بەسەرهات، وە كۆتا بەسەرهاتی نێو ئەم سوورەتە خراوەتە روو، كە بەسەرهاتەكە بریتیە لە رووداوێكی رۆژی دوایی، واتە: ئەم بەسەرهاتە پەیوەندیی بە دنیاوە نیە، بەڵكو وتووێژێكی خوایە ﷻ لە قیامەتدا لەگەڵ عیسا ﷺدا، ئەویش لەبارەی پەرستراوانی عیساو دایكی لەلایەن نەصرانییەكانەوە، كە خوا ﷻ لە عیسا ﷺ دەپرسێ: ئایا تۆ بە خەڵكت گوتوە: خۆمو دایكم بپەرستن، بمانكەنە دوو پەرستراو؟ عیساش ﷺ نكووڵیی لەوە دەكات، كە بە هیچ كەسی گوتبێ خۆیو دایكی بپەرستن، وە ئەو راستییە رادەگەیەنێ، كە من تەنیا بە خەڵكم گوتوە: خوا كە پەروەردگاری خۆمو ئێوەشە، بیپەرستن، وە هەتا لە نێویشیاندا بووم، بەسەریانەوە چاودێر بوومو ئاگام لە خەڵكەكە بووە، كە تووشی شیركو لادانو غەیری خواپەرستن نەبن، بەڵام دوای ئەوەی كە منت بەرزكردۆتەوە، ئەی خوای پەروەردگار! بۆخۆت ئاگاداری داخۆ چییان كردوە؟! ئنجا خوا ﷻ رایدەگەیەنێ كە ئەمرۆ (واتە: رۆژی قیامەت) راستان لە راستییەكەیان بەهرەمەند دەبن، ئەوانەی كە راستیان كردوە: دڵیان راست بووە، زمانیان راست بووە، كردەوەیان راست بووە، لەگەڵ خۆیان، لەگەڵ خەڵك، لەگەڵ خوادا راست بوون، ئەمرۆ بەهرەمەند دەبن لەو راستییەی خۆیان، ئەویش ئەوەیە كە بە بەهەشتی خوای بەخشەر، وە بە رەزامەندیی یەكەی شاد دەبن، وە سەرفرازو بەختەوەر دەبن.

ئنجا لە كۆتاییدا خوای باڵادەست خاوەنداریێتی رەهاو بێسنووری خۆی رادەگەیەنێ، كە ئاسمانەكانو زەویو هەرچی تێیاندایە، تەنیا موڵكی خوای پەروەردگارن، وە خوا بە هەموو شتێك زاناو ئاگادارە.

﴿وَإِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ ءَأَنتَ قُلۡتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَٰهَيۡنِ
مِن دُونِ ٱللَّهِۖ قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ
فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ١١٦
مَا قُلۡتُ لَهُمۡ إِلَّا مَآ أَمَرۡتَنِي بِهِۦٓ أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمۡۚ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا
مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ ١١٧
إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ١١٨ قَالَ ٱللَّهُ
هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۚ
رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ١١٩ لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا
فِيهِنَّۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ ١٢٠﴾.

## مانای وشـــە بە وشـەی ئایەتەکـان

((وە (یـاد بکـــەوە) کاتێـــك خـــوا فـەرمووی: ئـەی عیسـای کـوڕی مەریـەم! ئایـا بـە خەڵکـت گوتـوە: منو دایکـم لە جیـاتی خـوا بکەنـە دوو پەرسـتـراو؟ (عیسـا) گـوتی: پـاکیی بـۆ تـۆ، مـن بـۆم نیـە شـتێك بڵـێم کە بـۆم ڕەوا نەبـێ، ئەگـەر گوتبێتـم تـۆ زانیوتــە، تـۆ نهێــنی نێـو دەروونـی مـن دەزانـی، بەڵام مـن نهێنـی زاتـی تـۆ نازانـم، بێگومــان هـەر تــۆی زانــای نهێنییــەکان ﴿١١٦﴾ جگــە لــەوەی تـۆ فـەرمانت پێکـردووم بیڵــێم، کــە خـــوای پــەروەردگاری مــنو پەروەردگــارتان بپەرسـتن، هیچـی دیکـەم پێنەگوتـوون، وە هەتــا لـە نێویـاندا بووم، بەســەریانەوە چاودێر بـووم، بـەڵام پـاش ئەوەی منـت بە تەواویـی وەرگـرتو منت لەنێویـاندا نەهێشـت، (و بەرزت کردمەوە بۆ ئاســمان) هـەر خـۆت بەسـەریانەوە چـاودێر بـووی، وە تـۆ ئاگـاداری هـەموو شـتێکیو بەسـەریەوە چـاودێری ﴿١١٧﴾ ئنجـا ئەگـەر سزایان بـدەی، ئـەوە بێگومـان ئـەوان بەنـدەی تـــۆن، وە ئەگــەر لێیــان ببـــووری، بێگـــومان هــەر تـــۆی زاڵــی کاربــەجێ ﴿١١٨﴾ خـــوا فەرمـــووی: ئەمـە ئـەو ڕۆژەیـە کـە ڕاسـتیی ڕاسـتان سـوودیان پێدەگەیـەنێ، چـەند باغێکیان هـەن، ڕووباریـان بەژێـردا دەڕۆن، بـە هەمیشـەیی تێیانـدا دەمێننـەوە، خـوا لـەوان ڕازییـەو ئـەوانیش لـەو ڕازیـین، ئـا ئـەوە بردنـەوەی مەزنـە ﴿١١٩﴾ خاوەنداریێتـیی ئاسـمانەکانو زەویو هەرچی تێیاندایـە هـی خـوایە، وە ئـەو لەسـەر هـەموو شـتێك بـە توانـایە ﴿١٢٠﴾)).

## شیکردنەوەی هەندێك لە وشەکان

(إِلَٰهَيْنِ ) واتە: دوو پەرستراو، (إِلـه) واتە: پەرستراو، (إِلهان) یان (إِلهَين) واتە: دوو پەرستراو، وشەی (إِلە) یانی: (مَعْبُود) بە کوردی دەڵێن: پەرستراو، لە چییەوە هاتوە؟ زانایانو شارەزایانی زمانی عەرەبی سێ ئەگەریان داناوە:

١) هەندێکیان دەڵێن: وشەی (إِلە) لە (أَلَهَ، يَأْلَهُ، إلاهةً)ەوە هاتوە، واتە: (عَبَدَ، يَعْبدُ، عِبَادَة) کەواتە: (إِلە) بۆیە وای پێدەگوترێ، چونکە دەپەرسترێ.

٢) وە هەندێکیان گوتوویانە: وشەی (إِلە) لە (أَلِهَ، يألَهُ، أي: تَحَيَّر،)ەوە هاتوە، واتە: سەرسام بووم، سەرسام دەبێ، لەبەرئەوەە کە لە ناسینی پەرستراوی بە هەقدا، کە خوای بێوێنەیە، سەرسام دەبێو خوا لە عەقڵو خەیاڵی ئێمەدا جێگای نابێتەوە، وەك حەقیقەتەکەی، بەس وەك سیفەتو ناوەکانی دەیناسین.

٣)- وە هەندێکی دیکەش گوتوویانە: وشەی (إِلە) لە (لاهَ، يَلُوه، لِيَاهاً، أي: احْتَجَب)ەوە هاتوە، واتە: پەنهان بوو، لەبەرئەوەی خوا پەنهانەو ئێمە بەهەستەوەرەکانمان بە چاوو بە بیستنو بە بۆنکردنو بە تامکردنو بەدەست لێدان، ناتوانین پەی بە خوا ببەین، بەڵکو دەبێ بە عەقڵ شوێنەوارەکانی ببینینو، سیفەتەکانی کە لە شوێنەوارەکانیدا دەدرەوشێنەوە، بناسین.

(سُبْحَٰنَكَ ): واتە: پاکیی بۆ تۆ، یانی: (أُنزِّهُكَ) واتە: تۆ بە پاك دەگرم، جا وشەی (سبحان) لە (سَبْح)ەوە هاتوە دەڵێ: (ئەسڵی وشەی (تَسْبِيح) لە (سَبْح)ەوە هاتوە: (السَّبْحُ: المَرُّ السَّرِيعُ في الماءِ، أو في الهَوَاءِ)، (سَبْح) واتە: تێپەڕینی خێرا لە ئاودا یاخود لە هەوادا، وەك چۆن ماسی لە ئاودا دەڕۆن، یان مراویو ئەو باڵندانەی کە بە هەوادا دەفڕن، (يَسْبَحُ) واتە: مەلە دەکات، یان بە ئاودا دەڕوات، یان بە هەوادا دەڕوات، خوای پەروەردگار باسی خڕۆکەکان دەکات دەفەرموێ: ﴿كُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسۡبَحُونَ ٣٣﴾الأنبياء، ئنجا (التَسبيح:

التَنْزِيـه) بەپـاكـگرتن، ئەمـە لـەوەوە هـاتوە كـە كەسـێك بەڕاسـتیی خـوای پەروەردگـار بناسـێ، بـە پاكـیی دەگـرێ، وە زۆر خێرایـی دەكـات لـە بەندایـەتیی بۆكردنیـدا، وە خـوا بـەدوور دەگـرێ لـە هـەرچی كەموكوڕیـی هەیـە، لـە هەرچی هەڵـەو پەڵـە هەیـە.

(وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَ ) واتە: مـن نایـزانم چـی لـە لای تـۆ پەنهـانو شـێردراوەیە، (نَفْـسُ اللهِ: ذَاتُـه)، (نَفْـس) بـە مانـای زات بـەكاردێ، ئـەوە بۆیـەش زانایـان وایانـگوتـوە، چونكـە خـوا وشـەی نەفسـی بۆخـۆی بـەكارهێناوە، بـەڵام نـەفس بەمانـای ڕووح دێ بۆ ئێمـە، بەڵام بۆ خـوای پـەروەردگار بـە مانـای زاتـی خـوا دێ، هـەروەك چـۆن دیتـنی خـوا، بیسـتنی خـوا، دەسـەڵاتی خـوا، بـەزەیی خـوا، حیكمـەتی خـوا، چـوونە سـەر عەرشـی خـوا، لـە سیفەتەكانی ئێمـە جیـان، دیارە نەفسی خـوا، زاتـی خـواش، لە نەفسو زاتـی ئێمـە جیایە.

(شَهِيدٌ ): واتـە: چـاودێر، یاخـود شـایەد، دیارە شـایەدیش بۆیـە دەتوانـێ شایەدیی بـدات، چونكـە چـاودێر بـووە، ئاگـای لـە شـتەكە بـووە، یاخود شـایەد بـەمانای ئامـادە بـوو دێ، دەڵـێ (مِـن الشُّـهُودِ والشّـهادَةِ: الحُضُورُ مَـعَ الـمُشَـاهَدَةِ، إمَّـا بالبَصَـرِ أو البَصِـيرَةِ) واتـە: (شَـهيد) لـە (شُـهُودُ) و (شَـهَادَة)ەوە هـاتوە، كـە بەمانـای ئامـادەبوون دێـت لەگەڵ بینینـدا، چ بینـینی بـە چـاو چ بینینـی بـە عەقـڵ، وە (الشَّـهَادَة: قَـوْلُ صَـادِرٌ عَـنْ عِلْـمٍ حَصَـلَ بِمُشَـاهَدَةِ بَصِـيرَةٍ أو بَصَـرٍ)، (شَـهَادَة) بریتـیە لـە قسـەیەك كـە دەردەچـێ لـە كەسێكەوە كـە عیلـمێكی هەیـە، بەهـۆی ئـەوەوە كـە بەچاو شـتی بینیـوە، یـاخود بـە عـەقڵ دەركـی پێكـردوە، بـۆی پەیـدابـووە.

(تَوَفَّيۡتَنِي ) واتـە: منـت وەفـات پێكـردوە، وشـەی وەفـات جیایـە لـە وشـەی (مـوت) (أماتـهُ) لـە (توفـاهُ) جیـایە، چونكـە ئەگـەر بڵـێی: (أماتـهُ) واتـە مراندوویـەتی، بـەڵام (توفَّـاهُ)، واتـە: بـە تـەواویی وەریگرتـوە، چونكە وەك دوایی باسـی دەكـەین، خـوا كە باسی وەفاتی عیسا دەكات، كە بێگومان عیسـا نـەمردووەو خـوا نەیمرانـدوە، بەڵـكو بـە ڕووحو جەسـتەوە وەریگرتـووەو بـەرزی كردۆتـەوە بـۆ ئاسـمان، وەك لـە

سورەتی (آل عمران) و سورەتی (النساء)دا هاتوە، لە بەرگی دووەمو سێیەمی ئەم تەفسیرەی خۆماندا باسمان كردوە، ئنجا دەڵێ: (وتوفية الشيء بَذْلُهُ وافياً، واستيفاؤُهُ تناولهُ وَافِياً) كە بگوترێ: ئەو شتەی تەوفیە كرد، واتە: بەتەواویی بەخشی، وە ئەگەر بڵێی: (استیفاؤُهُ) یانی: ئەوە كە بەتەواویی وەریبگرێ.

(ٱلرَّقِيبَ): (الرَّقِيبُ الحَافِظُ، وَرَقَبْتُهُ: حَفِظْتُهُ والـمَرْقَبُ: الـمكان العَالِي الَّذِي يُشْرِفُ عَلَيْهِ الرَّقِيب) وشەی (رقیب) بە مانای پارێزەر دێ، یان چاودێر، (الـمراقب) واتە: چاودێر، (رَقَبْتُهُ) واتە: پاراستم، ئاگام لێی بوو، (مرقب) بەو شوێنە بەرزە دەگوترێ كە كەسێك لەوێوە چاودێریی شتێك بكات، ئەو بورجو شتانەی دادەنرێن بۆ حەرەسیاتو ئێشككگرتن، پێیان دەگوترێ (مَرْقَبْ) كۆیەكەی (مراقیب).

(صِدۡقُهُمۡ ): (صِدق) واتە: ڕاستیی، دەڵێ (الصِّدْقُ مُطَابَقَةُ القَوْلِ الضَّمِير والـمخبر عَنْهُ مَعَاً) (صدق) بریتیە لەوە كە قسەیەك كە دەیكەی هەم لەگەڵ نێو دڵتدا ڕاست بێ، هەم لەگەڵ ئەوەدا كە هەواڵی پێدەدەیو هەواڵی لەبارەوە دەدەی.

## مانــای گــشــتــی ئایەتەکــان

خــوا ﷻ لــە کۆتــایی ئــەم ســـوورەتە موبارەکــەدا، کــە ســـوورەتی (الـمـائدة)یــە وتوویژێکــی خــۆی لەگــەڵ عیســادا ؑ بــۆ ئێمــە بــاس دەکــات، کــە ئــەو وتوویــژە لــە قیامەتــدا بــووە، واتــە: ئــەم بەســەرهاتی چــوارەمە کــە لــەم ســوورەتی (الـمـائدة) دایــە پەیوەنــدیی بــە دنیــاوە نیــە، بەڵــکو لــە قیامەتدایــە، ئەگــەرنا ئــەوانی دی هــەموو دیــارە پەیوەندییـــان بـــە دنیـــاوە هـــەبوو، پێشـــتـــر باســـمان کـــرد: لـــە ئایەتـــەکانی پێشـــیدا فــەرمووی: ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ٱذْكُرْ نِعْمَتِي عَلَيْكَ وَعَلَىٰ وَٰلِدَتِكَ ... ⑪⓪ ﴾، لــەم کۆمەڵــە ئایەتــەدا کــە ئایەتــەکانی (١١٠) تــا (١٢٠)ن، واتــە: یــازدە ئایــەتن هــەموویان باســی بەرپەرچــدانەوەی بیــرۆکەی نەصــرانییەتە، کــە عیســا ؑو دایکــی (واتە: مەریــەم) خــوا لــێی ڕازی بێ، دەپەرستن، لەگەڵ خــوای پاك و تاك، خــوای بێهاوتا بەرپەرچــی ئــەو بیــرۆکەیە دەداتــەوە، وە چــەند ڕاســتییەك دەخاتــە ڕوو، دەربــارەی ئەوە کە عیســا ؑ بەندەیەکــی خــوا بــووە، وە خــوا کۆمەڵێــك موعجیزەو نیعمــەتی خــۆی پێــداون، ئنجــا لێــرەدا باســی ئــەو وتوویــژە دەکــا کــە لــە نێــوانی خــوا ﷻ و عیســـا ؑدا لــە ڕۆژی قیامەتــدا ڕوودەدات، دەربــارەی ئــەوە کــە ئایا عیســا ؑ بــە خەڵــکی گوتــوە، کــە خــۆی و دایکــی بپەرســتن؟ یــان نەصــرانییەکان هــەر لەخــۆوە ئــەو ســـەرگەردانیی و سەرلێشـــێواوییەیان بۆخۆیــان پەیــداکردوە، بــەبێ ئــەوەی کــە ئــەو بیــرۆکەیە هــیچ ڕەگ و ڕیشــەیەکی ڕاســتی هــەبێ و، هــیچ پەیوەندییــەکی بــە وەحــی و دینــی خــواوە هەبــێ.

دەفـــــەرموێ: ﴿ وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِي وَأُمِّيَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ﴾، وە یـــاد بکـــەوە! کاتێـــك خـــوا ﷻ فـــەرمووی: ئـــەی عیسای کــوڕی مەریـــەم! ئایـــا تــۆ بــە خەڵکــت گوتــوە کــە بەندایەتیــی بۆخــۆت و بــۆ دایکت بکەن، واتە: وەکو پەرســتـــراو مامەڵەتـــان لەگـــەڵدا بکـرێ؟ ﴿ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِي بِحَقٍّ ﴾، عیســا ؑ گوتــی: پاکــیی بــۆ تــۆ، مــن تــۆ

بە پاك دەگرم، بۆم نیە كە شتێك بڵێم، بۆم هەقو شایستە نەبێ، یانی: ئەوە كە من بپەرستن، یان دایكم بپەرستن و بمانكەنە دوو پەرستراو، شتێكی ناهەقە، وە شتی ناهەق گوتنیش لە من ناوەشێتەوە، ﴿إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ﴾، ئەگەر گریمان گوتبێتیشم، ئەوە تۆ زانیوتە، واتە: كە تۆ بۆخۆت دەزانیو زانیاری تۆ ئەوەی تێدانیە كەواتە: نەمگوتوە، هەڵبەتە لێرەدا مەبەست ئەوەنیە كە خوای پەنهانزان پرسیاری ڕاستەقینە لە عیسا بكات، كە ئایا واتگوتوە؟ چونكە كەسێك پرسیاری ڕاستەقینە دەربارەی شتێك دەكات، كە نەیزانێ، بەڵام ئایا ئەگەر عیسا ﷺ گریمان گوتبێتی: منو دایكم بكەنە پەرستراو، خوا نەیزانیوە؟ با، كەواتە: پرسیارەكە مەبەست پێی چییە؟ مەبەست پێی سەرزەنشتكردنی نەصرانییەكانە، وە خوا دەیەوێ عیسا ﷺ لە ڕۆژی قیامەتدا ڕایبگەیەنێ كە شتی وایەنەگوتوە، كەواتە: ئەی نەصرانییەكان! ماڵی قەڵب سەربەخاوەنیەتی، ئێوە ئەو قسەیەو ئەو بیرۆكەیەی پەیداتان كرد، كە بریتیە لە پەرستنی سێیەكان (ثالوث)، وەك خوا لەبارەیانەوە دەفەرموێ: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ...﴿٧٣﴾﴾ المائدة، واتە: ئەوانە بێبڕوان كە گوتیان: خوا سێیەمی سێیەكانە، یانی: خوا بۆخۆیو عیسا ﷺ و مەریەم، یاخود: خواو عیسا ﷺ و جبریل، مانای وایە ئەو بیرۆكەیە ئەصڵو بناغەیەكی نیە، تەنیا لێرەدا مەبەست پێی ئەوەیە، ئەگەرنا بێگومان خوا ﷻ پرسیار لە عیسا ﷺ ناكات، ئایا وایگوتوە، یان نا؟ چونكە كەسێك بە كەسێك دەڵێ: واتگوتوە، یان نا؟! كە بۆخۆی نەزانێ، ئەوە دیارە خوا ﷻ هەموو شتێك دەزانێ، بۆیە عیساش سەلامی خوای لەسەر بێ دەڵێ: ئەگەر گوتبێتم زانیوتە، ﴿تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ﴾، تۆ دەزانی چی لە نێو دەروونی مندا هەیە، چی لە پەنهانی مندا هەیە، چ لەلای من شێردراوەیە، بەس من نازانم چی لەلای تۆ شێردراوەیە، واتە: تۆ نهێنیی من دەزانی، بەس من نهێنی تۆ نازانم، هیچی من لە تۆ شێردراوە نیە، ﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلْغُيُوبِ﴾، بێگومان هەر تۆی هەرە زانای نادیارەكانو پەنهانەكانو، ئەو شتانەی كە

کەس نایانزانێ، تۆ زۆر زۆر پێیان زانای ﴿ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِي بِهِۦٓ ﴾، هیچم پێ نەگوتوون: جگە لەوەی کە تۆ فەرمانت پێکردووم کە بیڵێم، ئەویش بریتیە لەچی؟ ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ﴾، پێم گوتوون کە خوا بپەرستن پەروەردگاری منیش و پەروەردگاری خۆشتانە، پەیداکەری منیش و پەیداکەری خۆشتانە، خاوەنی منیش و خاوەنی خۆشتانە، ﴿وَكُنتُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا مَّا دُمْتُ فِيهِمْ ﴾، وە من بەسەریانەوە چاودێر بووم کە نەهێڵم بەلاڕێدا بڕۆن و بەهەڵەدا بچن و غەیری خوا بپەرستن، ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيْتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ﴾، کاتێك منت وەرگرت بەتەواویی هەر خۆت بەسەریانەوە چاودێربووی، لێرەدا وشەی: ﴿تَوَفَّيْتَنِى ﴾، بەمانای (منت مراند) نیە، چونکە عیسا عليه السلام نەمردوە، بۆیەش خوای پەروەردگار وشەی (أَمَاتَهُ)ی بۆ بەکارنەهێناوە، چونکە وشەی (وەفات) مانای مردن دەگەیەنێ، بەڵام ئەوەش دەگەیەنێ کە شتێك بە تەواویی وەربگری، لەبەرئەوەی عیسا عليه السلام خوا بە ڕووح و بە جەستەوە، بەهۆی فریشتەکانەوە وەریگرت و، بە کلاو ڕۆژنەدا بەرزی کردەوەو بردی بۆ ئاسمان، کەواتە: ﴿تَوَفَّيْتَنِى ﴾، یانی (أَخَذتَنِي وَافِياً، أَخَذتَنِي كَامِلاً) واتە: بە تەواویی وەرتگرتم، وە منت لەنێو ئەواندا نەهێشت، ﴿كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيْهِمْ ﴾، هەر تۆ بەسەریانەوە چاودێر بووی، هەر تۆ ئاگات لێیان بوو، من لەنێویاندا نەمابووم، هەتا ئاگام لێیان بێ، ﴿وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ شَهِيدٌ ﴾، وە تۆ بەسەر هەموو شتێکەوە چاودێری، وە ئامادەی هەموو شتێکی، وە ئاگاداری هەموو شتێکی.

ئنجا عیسا عليه السلام ڕوو دەکاتە خوای پەروەردگارو دەفەرموێ: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ﴾، ئەگەر سزایان بدەی، ئەوە بەندەی خۆتن و، بۆت هەیە سزایان بدەی، لەسەر هەڵە و کەموکوڕییەکانیان، چونکە

خـوا ﷻ کاربەجێیـەو دادگـەرە، بـە ناهـەق کـەس سـزا نـادات، وەك دەفـەرموێ: ﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّٰمٖ لِّلۡعَبِيدِ ﴿٤٦﴾﴾ فصـلت، واتـە: پـەروەردگارت سـتەمکار نیـە لـە بەندەکانی، وە لە شوێنی دی دەفەرموێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ ﴿٤٠﴾﴾ النساء، واتـە: خـوا بـە قـەدەر قورسایی گەردیلەیـەك زوڵـم لـە کـەس ناکـات، کەچـی ئەگـەر چاکەیـان هەبێ پاداشـتەکەیان بۆ چـەند قـات دەکـاتەوە، بەڵام زوڵـم ناکـات.

کەواتـە: ئەگـەر سـزایان بـدەی، ئـەوە بەنـدەی خـۆتن‌و، دیـارە هەڵەیان کـردوە بۆیـە سـزایان دەدەی، ﴿وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ﴾، وە ئەگـەر لێشـیان ببـووری، ئـەوە لـێبوردنەکەت لەبـەر بێدەسـتەڵاتیی نیـە، بێگومـان هـەر تـۆی زاڵـی کاربـەجێ، تـۆ باڵادەسـتی‌و زاڵی، وە کاربـەجێشـی، کەسێك سـزای بـدەی دەزانـی بۆچی سـزای دەدەی، وە کەسێك لـێی ببووری، دوای ئـەوەی لە شـیـرك‌و کوفر تۆبـە دەکات، دیـارە تۆ تۆبـە وەرگـری، جا لێرەدا مەبەست ئـەوە نیـە کە خـوای پـەروەردگار لەوانە دەبووری کە گوتوویانە عیسا کوڕی خوایە، وە عیسا دەپەرستن، بەڵکو مەبەست ئەوەیـە، عیسا ﷺ ویستوویەتی ڕایبگەیەنێ، کە ویسـتی خـواو سـەرجەم سـیفەتەکانی خـوا ڕەهاو بێسنوورن، هەر کەسێکی بیـەوێ سزای دەدات، وە هـەر کەسێکیشـی بیـەوێ لێـی دەبـووری، بـەڵام چ سـزادانەکەی، چ لێبوردنەکـەی، لەسـەر بنـاغەیە، وەك خـوای دادگـەر لەسـەر زمـانی شـوعەیب دەفـەرموێ: ﴿إِنَّ رَبِّي عَلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ﴿٥٦﴾﴾ هـود، واتـە: بێگومـان پەروەردگاری من لەسەر ڕێیەکی ڕاستە، واتە: خـوای پەروەردگـار بـە ڕێیـەکی ڕاسـتدا مامەڵە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، چونکە هەنـدێ مەلاو زۆر لە خەڵکی خـەڵکی مسـوڵمان‌و عەوام پێیانـوایە، کە خـوا هەر لە بەهـانەیە!! نەخێر خـوا لە بەهـانە نیـە، یـان بـە شـێوەیەك خـوای کاربەجـێ وێنـا دەکـەن، کـە خـوا بەبـێ بنچـینەو بەبـێ حیسـاب‌و کیتـاب خەڵك سزا دەدات، ئەوی دەباتە بەهەشتێ‌و، ئـەوی دی دەباتـە دۆزەخ!! وانیە خـوا زاناو کاربەجێیە، وەك پیـرەمێردی شـاعیـر دەڵـێ:

کاکـە خـوا کـاری نـابەجـێ ناکـا      تا کێـو نەبینـێ بەفـری تێناکـا

خـوای پەروەردگـار مامەڵـەی حەکیمـانە لەگـەڵ بەندەکـانیدا دەکـات، بەڵـێ ڕەحمـەتو بـەزەیی بـە پـێش تـووڕەیی کەوتۆتـەوە، بـەڵام ئـەوی لێـی ببـووڕێ، لەسـەر بنـاغەیـەك لێـی دەبووڕێ، ئەوەش کە سزای بدات، لەسەر بنـاغەیەك سـزای دەدات.

ئنجـا خـوا ﷻ لـە کۆتـا قسـەیدا دەفـەرموێ: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡ ﴾، خـوا فـەرمووی: (واتـە: لـە ڕۆژی قیامەتـدا خـوا ڕایگەیانـد) ئەمـە ئـەو ڕۆژەیە ڕاسـتان لە ڕاسـتییەکەی خۆیـان بەهرەمەنـد دەبـن، ڕاسـتیی ڕاسـتان سوودیان پێ دەگەیـەنێ، جا وشـەی (صـادقین) واتـە: (ڕاسـتان) نـەك (ڕاسـتگۆیان) چونکـە گوتن بەشـێکە لە ڕاسـتیی، بەڵام (صدق) تەنیـا لـە ڕاست گوتنـدا خوڵاصـە نەبۆتـەوە، دەبێ دڵـت ڕاسـت بێ، زمانـت ڕاسـت بێ، کردەوەکانـت ڕاسـت بـن، دیـوی پـەنهانت ڕاسـت بێ، لەگـەڵ خـوا ڕاسـت بـێ، لەگـەڵ دۆسـتو لەگـەڵ دوژمـن... هتـد، ئـەوە مانـای ڕاسـتیی (صـدق)ە، ئـەوی دیکـە ڕاسـت گـوتن (صـدق القـول)ە، خـوا دەربـارەی ئیسـماعیل دەفـەرموێ: ﴿ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ٥٤ ﴾ مریـم، یـانی: قسـەی ڕاسـت بـوو، بەڵـێنی ڕاسـت بـوو، بـەڵام لێـرەدا کـە دەفـەرموێ: ئـەمڕۆ (واتـە: ڕۆژی قیامـەت) ڕاسـتان لـە ڕاسـتیی خۆیان بەهرەمەنـد دەبـن، مەبەسـت پێـی ڕاسـتییە بـە مانـای فـراوانو تـەواوی وشـەی: (صـدق)، ئەویش ئەوەیە کە (صادقین) ڕاستان لێرەدا مەبەسـت پێـی ئەوانـەن کـە بەندایـەتیی ڕاسـتیان بـۆ خـوا کـردوە، بـە دڵ وەك لـە خـوا ترسـاون، ئاوا لە هیـچ شـتێك نەترسـاون، وە وەك خـوایان خۆشویسـتوە، هیـچ کـەسو هـیچ شـتێکیان ئـاوا خۆشـنەویسـتوە، وە هـەر پشـتیان بـە خـوا بەسـتوەو بـۆ خـوا ملکـەچبوون، خوایان بە گـەورە گرتـوەو تا کۆتـایی.

هـەروەهـا بـە دوای پێغـەمبـەری خـوا ﷺ کـەوتوون، وە بـە شـەریعەتی خـواوە پابەنـد بـوون، بـە ڕێـكو ڕاسـتیی بـە سـاغیی ڕواڵـەتو پەنهـانیان ڕاست بـووە، ئـا ئەوانـە لـەو ڕاسـتییەی خۆیـان بەهرەمەنـدنو، چـۆنیەتی بەهرەمەندبوونەکەشـیان ئەوەیـە کـە دەفـەرموێ: ﴿ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ ﴾، چـەند باغێکیـان هـەن کـە ڕووبـاریان بەژێـردا دەڕۆن ﴿ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ ﴾، بـۆ هەمیشـەیی تێیانـدا

دەمێننــەوە. ﴿ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ﴾، خـواش لەوان ڕازییـەو ئەوانیش لە خـوا ڕازییـن، هەمیشـە خـوا ﷻ ڕەزامەنـدیی خـۆی پـێش دەخـات، چونکە دەبێ ئینسـان وابێـت کە خوا لـێی ڕازی بێـت، ئنجا خـوا ﷻ ئـەویش وای لـێ دەکات کـە لـە خـوای خـۆی ڕازی بـێ، تـۆ دەبـێ کارێـکی وابکـەی خـوا لـێت ڕازی بـێ، ئنجا دوایـی وات مامەڵـە لەگـەڵدا دەکات، کە تۆ لە خۆی ڕازی بکـا، دوایی زیـاتر ئـەوە ڕوون دەکەینـەوە، لــە مەســەلە گرنگەکــاندا، ﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴾، خــوا ﷻ دەفــەرموێ: ئــا ئــەوە ســەرکەوتنو بردنـەوەی مەزنـە، ئـەو بەهرەمەنـدبوونە لـەو ڕاستییە، وە شـادبوونە بـە خـواو دیداری خـواو، بەهەشـتەکانی خـوا، ئەوە بردنـەوەو سـەرکەوتنی گەورەیـە، ئـەوە بە مراد گەیشـتنی هەرە مەزنـە، لە کۆتـایی دا خـوای بـەرزو مـەزن دەفـەرموێ: ﴿ لِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَمَا فِيهِنَّۚ ﴾، مـوڵکی ئاسـمانەکانو زەویو هەرچـی تێیانـدایـە هـەمووی خـوا خاوەنیـەتی، ﴿ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرُۢ ﴾، وە خـوا لەسـەر هـەموو شـتێك بەتوانــایە، جگـە لــەوەی کـە ئاسمانـەکانو زەویو هەرچـی تێیانـدایـە، هـەمووی هـی خوایـەو، لە ژێر ڕکێفو حوکمڕانیی دەسـتەڵاتی خـوادایە، دیسان خـوا لەسـەر هـەموو شـتێك بەتوانایە، لـە غـەیری ئاسمانـەکانو زەویشــدا، ئـەو بـوون (وجـود)ە کـە دروستی کردوە، لەسەر هەموو شتێکی بەتوانـایە، کە هەر جۆرە تەصـەڕروفێکی تێدا بکـات.

## چەند مەسەلەیەکی گرنگ

**مەسەلەی یەکەم:** کە خوا دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ...﴾، هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەوە لە دنیادا بووە، بەڵام ڕای ڕاست ئەوەیە، نەك هەر ڕای ڕاستتر، بەڵكو ڕای ڕاست ئەوەیە، كە ئەم وتووێژەی هی قیامەتە، خوای پەروەردگار لێرەدا بۆمان دێنێتەوە، جا ڕەنگە یەكێك بڵێ: خۆ خوا ﷻ جارێ قیامەتی نەهێناوە، چۆن وا دەفەرموێ‌و بە كرداری ڕابردووش دەیهێنێ؟ وەڵامەكەی ئەوەیە: لەڕاستیدا كات (زمن) بۆ ئێمە دابەش دەبێ بۆ سێ حاڵەت: ڕابردوو (ماضي)، ئێستا (حال)، داهاتوو (استقبال)، ئەوە بۆ ئێمە وایە، بەڵام بۆ خوای پەروەردگار كات وا نیە، جارێ ئەگەر بە قووڵیی سەرنجدەین (كات) بوونی هەر نیەو شتێكی ئیعتیباریی‌و وەهمیی ئینتیزاعییە[1] ئەگەرنا زەمان بەمانای هەبوو (موجود) بوونێكی سەربەخۆو ڕاستەقینەی هەرنیە، ئەوەی كە هەیە درێژبوونەوەی ماددەیە كە شوێن (مكان) پێكدەهێنێ، وە جووڵەی ماددەیە كە لە مێشكی ئێمەدا، پێی دەڵێین: كات، ماددەیە كە دەجووڵێ، ئێستا ئەگەر زەوی نەخولابایەوە بە دەوری خۆیداو، بە دەوری ڕۆژدا، نە شەوو نە ڕۆژ پەیدا دەبوون، نە ساڵ‌و وەرزەكان پەیدا دەبوون.

ئنجا بەنسبەت خوای پەروەردگارەوە كە لە دەرەوەی كات‌و شوێن (زمان‌و مكان)ە، چونكە خوا لەسەر عەرشی خۆیەتی، لە دەرەوەی دروستكراوەكانی خۆیەتی، بەو شێوەیە كە بۆ خوا شایستەیە، بۆ خوای پەروەردگار ئێستاو ڕابردوو داهاتوو، وەك یەكن.

---

١) واتە: مرۆڤ بە خەیاڵ‌و وەهم كات (زمن) وەك هەبوو (وجود)ێكی سەربەخۆ وێنا دەكات، ئەگەرنا لەڕاستیدا لە جووڵەی ماددەو ڕووداوەكان دایدەنێ‌و بەرهەمی دێنێ!

پاشان خوا ﷻ لە شوێنی دیکەشدا لە قورئاندا کە باسی بەهەشت دەکات، بە ڕابردوو باسی دەکاتو دەفەرموێ: ﴿وَإِذَا ٱلْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ ﴿١٣﴾﴾التكوير، واتە: بەهەشت نزیك خرایەوە، یان ڕازێنرایەوە بۆ پارێزکاران، یاخود دەفەرموێ: ﴿وَبُرِّزَتِ ٱلْجَحِيمُ لِلْغَاوِينَ ﴿٩١﴾﴾الشعراء، واتە: وە دۆزەخ هێندرایە دەرێو بەرجەستە کرا بۆ سەرگەردانان، دیسان بە ڕابردوو دەیفەرموێ، لەبەرئەوە کە خوا ئەوەندە بەسەر ئەو شتانەدا دەستڕۆیشتوو و زاڵە، وەك چۆن جاری وا هەیە تۆ بەڵێنی شتێك بە کەسێك دەدەی دەڵێی: ئاخر ئایا دەبێ؟! تۆش دەڵێی: بوو بوو، عەرەبیش دەڵێن: (صار صار) یانی: وا بزانە شتەکە بووە، یاخود یەکێك بەڵێنیێك بە کەسێك دەدات، دەڵێ: یانی ئەو شتەم دەدەیە؟ دەڵێ: وا بزانە لە گیرفانت دایە، خوای بێوێنەش دیارە بەسەر هەموو شتێکدا بالادەستە، بۆیە بەشێوەی ڕابردوو دەیهێنێ، وەك ئەوەی کە بووبێ وایە.

ئنجا ئەوە کە خوا دەفەرموێ: وە یادبکەوە کاتێك خوا فەرمووی: ئەی عیسا کوڕی مەریەم! ئایا تۆ بە خەڵکت گوتوە منو دایکم لە جیاتی خوا بکەنە دوو پەرستراو، ئەم پرسیارە وەك لە مانا گشتییەکەشدا باسمان کرد، بۆ سەرزەنشتکردنی نەصرانییەکانو بۆ سەرکۆنەکردنیان وە بۆ بە درۆ خستنەوەیانە، نەك پرسیارکردنی ڕاستەقینە بێ لە عیسا ؊، چونکە پرسیارکردنی ڕاستەقینە کەواتە: خوای زاناو پەنهانزان ئاگاداری لێی نەبووە، داخۆ عیسا ؊ وایگوتووە، یان واینەگوتووە؟ شتی وانیە خوا ﷻ دەزانێ عیسا ؊ واینەگوتووە، بەڵکو نەصرانییەکان لەخۆوە ئەوەیان هەڵبەستووە، لەڕاستیدا ئەصڵو ڕیشەیەکی نیە، ئنجا پرسیارەکی دیکە لێرەدا دەکرێ ئایا نەصرانییەکان کە عیسا ؊ وەك پەرستراو تەماشا دەکەنو دەیپەرستنو دەڵێن: عیسا کوڕی خوایە، وەك لە دەرسەکانی ڕابردوودا لە (التفسير التطبيقي للكتاب المقدس[1]) لە چەند شوێنێکدا هێناmان، دەڵێن: عیسا خوایە، نەك هەر بڵێن: پەرستراو،

١) بڕوانە: ص ٢٠٧٤، کە گوتوویەتی:
(فإن الله واحد في ثلاثة أقانيم لكنّهم جوهر واحدٌ متساوون منذ الأزل والى الأبد...).

بەڵکو دەڵێن: بەشێکە لە خوا، بەڵام ئایا بۆ مەریەمیش هەروا دەڵێن؟ ئەم ئایەتە وادەگەیەنێ، بەڵام نەصرانییەکان ڕەنگە نکووڵیی لەوە بکەن، ئێمەش لە وەڵامدا دەڵێین: نەصرانییەکان دەڵێن: مەریەم دایکی خوا (أُمّ إلـهِ)یە! مانای وایە ئەویش هەر خوایە (إِلَـه)ە[١]، پاکیی و بەرزیی بۆ خوا.

پاشان ئێمە نەصرانییەکان دەبینین وەك چۆن پەیکەری عیساو وێنەی عیسا لە پەرستگاکانیان و لە کەنیسەکانیاندا هەڵدەواسن و کڕنووشی بۆ دەبەن و گەورەی دەکەن و بە گەورەی دەگرن، بە هەمان شێوە وێنە و پەیکەری مەریەمیش هەمان مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن، کەواتە: ئەوەی خوا فەرموویەتی وایە، بە حەقیقەت ئەوان وەك دوو پەرستراو مامەڵە لەگەڵ عیساو لەگەڵ مەریەمدا سەلامی خوایان لێ بێ، دەکەن.

**مەسەلەی دووەم:** ئنجا عیسا ﷺ وەڵام دەداتەوە، دەڵێ: ﴿قَالَ سُبۡحَٰنَكَ مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّۚ﴾، عیسا لە وەڵامی پرسیارەکەی خوای پەروەردگاردا کە دەزانێ پرسیارکردنەکەی بۆ سەرزەنشتکردن و سەرکۆنەکردن و بەدرۆخستنەوەی نەصرانییەکانە، کە بە هەڵە عیساو مەریەمیان کردوە بە دوو پەرستراو، دەزانێ خوای پەروەردگار دەیەوێ ئەوان سەرزەنشت بکات، نەك بیەوێ پرسیارێك لەو بکات، کە ئایا ئەو شتە بووە، یان نەبووە؟ ئەو شتەی گوتوە، یان نەیگوتوە؟ بۆیە عیسا ﷺ پێش هەموو شتێك دەڵێ: پاکیی بۆ تۆ، یاخود تۆ بە پاك دەگرم[٢].

---

١) ئەوان وشەی (إلـه) بۆ خوا (الله) بەکاردێنن، کە ئەوە هەڵەیە، وەك پێشتر باسمان کردوە.

٢) (التَّسْبِيحُ تَنْزِيهُ اللهِ تَعَالَى وَأَصْلُهُ المَرُّ السَّرِيعُ فِي عِبَادَةِ اللهِ تَعَالَى وَسُبْحَانَه، مَصْدَرٌ نَحو غُفْرَان) وشەی (التَّسْبِيحُ) واتە: بە پاکگرتنی خوای بەرز، خوا بە پاکدەگرم بە دووری دەگرم، وە ئەصڵی وشەی تەسبیح لە (سبح)ەوە هاتوە، (سبح) بریتیە لە ڕۆیشتنی خێرا کە لێرەدا مەبەست پێی خێراییکردنە لە بەندایەتی خوادا، وە وشەی (سبحان) لە ڕیشەدا چاوگە وەك (غُفْران). کەواتە: (سبحان الله) واتە: من خوا بە پاك دەگرم.

ئنجا دەفەرموێ: ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّ﴾، نالێ نەمگوتوە، بەڵام ئەو بە شێوەیەکی دیکە نەفییەکە دەخاتە ڕوو، دەڵێ: ﴿مَا يَكُونُ لِيٓ أَنۡ أَقُولَ مَا لَيۡسَ لِي بِحَقٍّ﴾، بۆم نیە شتێك بڵێم کە هەق نەبێ، بۆچی؟ چونکە پێغەمبەرانی خوا (علیهم الصلاة والسلام)، ناگونجێ شتی ناهەق بڵێن، بەتایبەتی ناهەقی هێندە گەورە، چونکە ئامانج لە ناردنی پێغەمبەراندا بە پلەی یەکەم ئەوە بووە کە خەڵك فێری بەندایەتییکردن بۆ خوا تەنیا خواپەرستن‌و خوا بە یەك گرتن (توحید) بکەن، ئنجا بێن شتێکی وا بڵێن! ئەوە شتێکی زۆر زۆر ناهەقە، بۆیە عیسا ﷺ دەڵێ: ناگونجێ من شتی وا بڵێم‌و شایستە نیە، واتە: لێرەدا عیسا ﷺ، ئەو قسەیە بە شێوەیەك بەرپەرچ دەداتەوە کە هەر ڕێی تێناچێ، وە هەر ناگونجێ شتی وا گوترابێ‌و بگوترێ، نەك هەر نەگوتراوە، هەر ڕێی تێناچێ بگوترێ.

**مەسەلەی سێیەم:** کە دەفەرموێ: ﴿إِن كُنتُ قُلۡتُهُۥ فَقَدۡ عَلِمۡتَهُۥۚ تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ﴾، عیسا ﷺ دیارە بە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ئەگەر من ئەو قسەیەم گوتبێ، ئەوە تۆ زانیوتە، واتە: مادام تۆ دەپرسی: ئایا وابووە یان وانەبووە؟ کە دیارە پرسیارکردنەکە پرسیارکردنی ڕاستەقینە نیە، کەواتە: دیارە ئەو مەسەلەیە لە زانیاریی تۆدا نیە، ئنجا ئەی خوایە! مادام ئەو شتە لە زانیاریی تۆدا نیە کەواتە: نیە، چونکە هەر شتێك هەبێ لە زانیاری خوادا هەیە، ئنجا کە دەفەرموێ: ﴿تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَ﴾، تۆ دەزانی چی لە دڵی مندا هەیە، لە دەروونی مندا هەیە، لە پەنهانی مندا هەیە، بەڵام من نازانم چی لە زاتی تۆدا هەیە، وشەی نەفس کە بۆ خوای پەروەردگار بەکاردەهێنرێ، واتایەکەی غەیری ئەوەیە کە بۆ ئینسان بەکاردەهێنرێ، نەفسی ئینسان دیارە دروستکراوێکی خوایە، واتە: ڕووحی ئینسان، بەڵام نەفسی خوا واتە: زاتی خوا، دوایی دەفەرموێ:

﴿إِنَّكَ أَنتَ عَلَّٰمُ ٱلۡغُيُوبِ ﴾، بێگومـــان هـــەر تــۆی زانـــای پەنهانــەکـــان، واتــە: پەنهان‌و نهێنییەکـان تـۆ زۆر زۆر پێیـان زانـای، هیچ شتێکی نهێنییەکان لە تۆ شێردراوە نیـە.

زانایان سـەبارەت بـە وشــەی نەفـس کـە فـەرمووی: ﴿تَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِي وَلَآ أَعۡلَمُ مَا فِي نَفۡسِكَ ﴾، بە چەند شـێوەیەك تەعبیریان لـێکردوە:

یەکـەم: (تَعْلَمُ مَـا أُخْفِـيَ وَلا أعْلَـم مَـا تُخْفِي)، واتـە: تۆ دەزانـی مـن چـی پەنهـان دەکـەم، بەڵام من نازانـم تۆ چیت پەنهان کـردوە، یان چی پەنهـان دەکـەی!

دووەم: (تَعْلَـمُ مَـا عِنْـدِي وَلا أَعْلَـم مَا عِنْـدَكَ)، واتــە: تـۆ دەزانـی چـی لـەلای منــە، بـەڵام من نـازانم چی لـەلای تۆیــە!

سێیەم: (تَعْلَمُ مَا فِي غَيْبِي وَلا أعْلَمُ ما فِـي غَيْبِـكَ) تـۆ دەزانـی چی لە نهـێنیی‌و پەنهـانی منـدا هەیـە، بـەڵام من نازانـم چی لە نهێنیی‌و پەنهـانی تۆدا هەیـە.

چوارەم: (تَعْلَمُ مَا كَانَ مِنِّي فِي الدُّنيا، وَلا أعْلَمُ مَا كَانَ مِنْكَ فِي الآخِرَة) تـۆ دەزانـی لە دنیـادا چـی لـەلای من هـەبووە، بـەڵام مـن نازانــم لـە دواڕۆژدا چی لـەلای تۆ هەیـە.

پێـنجـەم: (تَعْلَمُ مَا أَقُولُ وَأَفعَل، وَلا أعْلَمُ ما تَقُولُ وَتَفعَل) تـۆ دەزانـی مـن چـی دەڵێم‌و چی دەکەم، بەڵام من نازانـم تۆ چـی دەفـەرمووی‌و چـی دەکـەی.

ئنجـا وشـەی نەفـس لـێرەدا مانای زاتـە، کەواتـە: (تَعْلَـمُ مَا فِـي ذَاتِي وَلا أَعْلَمُ ما في ذَاتِكَ) تـۆ دەزانـی چ لـەزاتی منـدا هەیـە، بـەڵام مـن نـازانم چـی لـە زاتـی بێ وێنـەی تـۆدا هەیـە، ئەی پەروەردگـار.

وشــەی ﴿عَلَّٰمُ ﴾، پێشـتـریش باسـمان کـرد، صیغە موبالەغـەی (عَالِـم)ە، واتـە: هــەرە زانـــا، زۆر زانـــا، ﴿ٱلۡغُيُوبِ ﴾، کـۆی (غَیْـب)ە، (غَیْـب)یـش واتـە: پەنهـان، نادیـار، کەواتـە (غُـیُوب)، واتـە: پەنهـانەکـان، نادیـارەکـان.

**مەسەلەی چوارەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ مَا قُلْتُ لَهُمْ إِلَّا مَآ أَمَرْتَنِى بِهِۦٓ أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ﴾، عیسا ﷺ دەفەرموێ: پێم نەگوتوون جگە لەوەی تۆ فەرمانت پێکردووم، واتە: جگە لەوەی کە تۆ فەرمانت پێکردووم، بیڵێم، هیچی دیکەم پێ نەگوتوون، لە بواری ئەوەدا کە کێ بپەرستن، ئنجا ئایا ئەوەی کە خوا فەرمانی پێکردوە بیڵێ: چییە؟! ﴿أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبَّكُمْ ﴾، ئەویش ئەوەبوو کە تۆ بە منت فەرمووە، پێیان بڵێم: خوا بپەرستن، پەروەردگاری منیش و پەروەردگاری خۆشتانە، ئنجا ئەمە دوو شتی لێوەردەگیرێن:

١) کەواتە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) بە موو، وە بە تۆزقاڵێك لە فەرمانی خوا ﷻ لانادەن، هەرچی بیفەرموون وەك دین، ئەوە دیارە وەحی خوایەو فەرمایشتی خوایە، نە هیچ شتێك لەوەی کە خوا پێی فەرموون، کەم دەکەن، نە لێی دەشارنەوە، وە نە هیچ شتێك لەوەی کە خوا پێی فەرموون، زیاد دەکەن.

٢) ئەوەی کە لەم رستە قورئانییە وەردەگیرێ، ئەوەیە نەصرانییەکان کە بەرنامەو بیرۆکەیان بریتییە لە سێ پەرستراوێتیی (تثلیث)، ئەو سێکوچکە (ثالوث)ە، شتێکی پووچو بۆشەو هیچ بناغەیەکی نیە، ئەو حەقیقەتەش خوای تاك و پاك جگە لێرە، لە سێ شوێنی دیکەی قورئاندا، ئەوەندەی ئێستا لە یادم بێ، فەرموویەتی کە عیسا ئاوای فەرمووە:

یەکەم: لە سوورەتی (آل عمران) ئایەتی (٥١)دا، عیسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۗ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، واتە: بێگومان خوا پەروەردگاری منیش و ئێوەشە هەر ئەو بپەرستن، ئا ئەمە رێی راستە.

دووەم: لە سوورەتی (مریم) ئایەتی (٣٦)دا، عیسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّى وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ ۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴾، واتە: وە بێگومان خوا پەروەردگاری منیش و پەروەردگاری ئێوەشە، ئەمە رێی راستە.

سێیەم: لە سوورەتی (الزخرف) ئایەتی (٦٤)دا، عیسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسۡتَقِيمٌ ﴾، واتە: بێگومان خوا هەر خۆی پەروەردگاری منیشو پەروەردگاری ئێوەشە، هەر ئەو بپەرستن، ئا ئەمە ڕێی ڕاستە.

کەواتە: عیسا ﷺ ئەو ڕاستییە مەزنە، یەکتاپەرستیی (توحید)ی، بە نەصرانییەکان گوتووەو پێی ڕاگەیاندوون، بەڵام ئەوان لایانداوەو عیسایان وەك پەرستراو مامەڵە لەگەڵدا کردوە، وە دایکیان وەك پەرستراو مامەڵە لەگەڵدا کردوە، وە ئەو هەڵوێستەیان هیچ بەڵگەیەك پشتڕاستی ناکاتەوە، بەڵکو شتێکە لە گیرفانی خۆیان دەریانهێناوەو وەکو پێشینانیش دەڵێن: (مالی قەڵب سەر بە خاوەنیەتی) چونکە عیسا ﷺ لە هەرسێ شوێنەکان {واتە: لە سوورەتەکانی: (آل عمران و مریم و الزخرف)دا} داکۆکیی دەکاتو جەخت دەکاتەوە لەسەر پەروەردگاریتیی خوا، بۆخۆیو، بۆ ئەوان: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ رَبِّى وَرَبُّكُمۡ فَٱعۡبُدُوهُۚ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسۡتَقِيمٌ ﴿٦٤﴾ ﴾، بۆچی؟ چونکە نەصرانییەکان پێیانوایە عیسا پەروەردگارە لەگەڵ خواداو، دایکیشی بەشی هەیە لە پەروەردگاریتییو لە پەرستراویتیی دا، بۆیە عیسا ﷺ لەو شوێنانەدا کە خوا ئەو بەسەرهاتەی باس دەکات، لە سوورەتەکانی (آل عمران و مریم و الزخرف)دا، زۆر جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوە، کە هەر خوا پەرستراوو پەروەردگارە، پەروەردگاریش سەییدو خاوەنو گەورەیە، وە بەدیهێنەرو مشوورگێڕو پەرستراو هەر خوایە، وە هەموو ئەو شتانەی خۆیشیو هی خەڵکەکەش، هی خوان، بۆیە دەبێ هەر ئەو بەندایەتیی بۆ بکرێ.

**مەسەلەی پێنجەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ وَكُنتُ عَلَيۡهِمۡ شَهِيدٗا مَّا دُمۡتُ فِيهِمۡۖ فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِى كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٖ شَهِيدٌ ﴾، عیسا ﷺ بە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: وە من بەسەریانەوە چاودێر بووم، هەتا لە

نێویـاندا بووم، یـانی: كە لەنێـو نەصــرانییەكاندا بـووم، ئاگـام لێیـان بـوو، یەكـتایی تـۆو خـوا بـە یەكـگرتنم پـێ ڕاگـەیاندن، وە ئاگــام لێیــان بـوو كـە لانــەدەن و لـە غـەیری تـۆ نەپەرستن، ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي كُنتَ أَنتَ ٱلرَّقِيبَ عَلَيۡهِمۡۚ﴾، ئنجا كاتێك منـت وەرگـرتو بەرزتكردمـەوە بـۆ ئاسمـان، هـەر تـۆ بەسـەریانەوە چـاودێر بـووی، ﴿وَأَنتَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدٌ﴾، وە تـۆ لەسـەر هـەموو شـتێك چـاودێری و ئاگـاداری و ئامادەی، واتـە: تـا لـە دنیـا بـووم و لـە ژیـاندا بـووم ئاگــام لێیـان بـوو، بـەلام پــاش وەفـاتم، تـۆ بۆخـۆت دەزانـی چییـان كـردوە! تـۆ چاودێریــان بـووی، ئنجـا رسـتەی: ﴿فَلَمَّا تَوَفَّيۡتَنِي﴾، هەندێك لە زانایانی ئیسلام گوتوویانە: ئەمـە ئـەوە دەگەیـەنـێ كە عیسـا ﷵ خـوا مراندوویـەتی و دوایی جەسـتەكەی بەرز كـردۆتەوە، كـە دیـارە ئێمـە لـە سـوورەتی (آل عمـران) ئایـەتی ژمـارە (٥٥)دا، وە لـە سـوورەتی (النسـاء) ئایەتـەكانی ژمـارە: (١٥٦ و ١٥٧)دا، لـە بـەرگی دووەم و سـێیەمی ئـەم تەفسیـرەدا بـە تەفصـیلێ باسـی ئـەوەمان كـرد، بـۆ وێنـە: لـە سـوورەتی (آل عمـران)دا كـە خـوا دەفــــــــەرموێ: ﴿إِذۡ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّي مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَيَّ وَمُطَهِّرُكَ مِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَجَاعِلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّبَعُوكَ فَوۡقَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ ثُمَّ إِلَيَّ مَرۡجِعُكُمۡ فَأَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ فِيمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ ۝٥٥﴾، واتـە: كاتێك خـوا ﷻ فـەرمووی: ئـەی عیســا! مـن تـۆ وەفـات پێدەكـەم، وە بـۆ لای خـۆم بـەرزت دەكەمـەوە، وە لەوانــەی بێبــڕوان پاكت دەكەمـەوە، لـە وێـدا بـە تەفصــیلێ باســمان كـردوە، كـە لـێرەدا (مُتَوَفِّيـكَ) (أَي: آخِـذُكَ كـامِلاً) بـە تــەواویی وەرت دەگـرم، نەك دەتمرێنـم، خـوا نەیفـەرمووە: (مُمِيتُـكَ) دەتمرێنـم، وە لـە هـەموو شــوێنەكاندا خــوای پـەروەردگار بـۆ ئـەو حاڵـەی عیســا بــەس وشـەی وەفـاتی بەكارهێنــاوە، بـەلام لـە شـوێنی دیكـەدا وشـەی (أَمَـاتَ) و (يُمِيـتُ)ی بەكـارهێنــاوە، ﴿فَأَمَاتَهُ ٱللَّهُ مِاْئَةَ عَامٖ ثُمَّ بَعَثَهُۥۖ ۝٢٥٩﴾البقــرة، ﴿يُحۡيِۦ وَيُمِيتُ ۝٢٥٨﴾البقــرة، ﴿وَٱلَّذِي يُمِيتُنِي ثُمَّ يُحۡيِينِ ۝٨١﴾الشـعراء، چونكە مرانـدن ئـەوە دیـارە، بـەلام

وەفات پێکردن، هەم بە مانای مراندن دێ، هەم بە مانای ئەوەش دێ کە شتێك بەتەواویی وەربگریو مەرج نیە بیمرێنی، بەڵگەمان لەسەر ئەوە چیە؟ بەڵگەمان ئەو ئایەتەی سوورەتی (الزمر)ە، خوا دەفەرمویٚ: ﴿ ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَٱلَّتِى لَمْ تَمُتْ فِى مَنَامِهَا ۖ فَيُمْسِكُ ٱلَّتِى قَضَىٰ عَلَيْهَا ٱلْمَوْتَ وَيُرْسِلُ ٱلْأُخْرَىٰٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٢﴾ ﴾، واتە: خوا نەفسەکان وەفات پێدەکات لە کاتی مردنیاندا، وە ئەوانەش کە نەمردبن لە کاتی خەوتنیاندا... کەواتە: دیارە وەفاتکردنی کاتی خەوتنو وەفاتکردنی کاتی مردنیش هەیە، وەفاتکردنی کاتی مردن، یانی: خوا ئەو کەسە دەمرێنێ، ڕووحەکەی بەتەواویی وەردەگرێ، کەواتە: ئینسانی خەوتووش خوا ڕووحەکەی وەردەگرێ کە نەشمردووە، واتە: دەگونجێ بەبێ مردنیش خوای پەروەردگار ڕووحی ئینسان وەربگرێ، بەڵام دیارە ئەو وەرگرتن (وفاة)ە بەتەواویی نیە، بۆیەش پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: ﴿النَّوْمُ أَخُو المَوْتِ﴾ {أَخْرَجَهُ البَيْهَقِيُّ فِي شعب الإيمان برقم: (٤٧٤٥)، وَالديلمي برقم: (٦٩٠٧)، وَصَحَّحَهُ الألباني في (السلسلة الصحيحة) برقم: (١٠٨٧)}، واتە: نووستن برای مردنە! ئنجا لەوێدا کە دەفەرمویٚ: ﴿ إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ ﴾، ئەی عیسا ! من وەرت دەگرم بە تەواویی و بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوە، دیارە ڕووحەکان هەموویان دەچنەوە بۆ لای خوا، ئەو شوێنەی کە خوا دەیەوێ، کەواتە: لێرەدا کە بەتایبەت بە عیسا ﷺ دەفەرمویٚ: بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوە، واتە بە ڕووحو جەستەوە بەرزت دەکەمەوە، ئەگەرنا هیچ جیاوازییەك لە نێوان کافرو مسوڵماندا نیەو ڕووحەکەیان هەر بۆ لای خوا بەرز دەبێتەوە، بۆ لای ئەو شوێنەی کە خوا دەیەوێ، کە ئەگەر مەبەست ئەوەبێ: ئەی عیسا دەتمرێنمو ڕووحەکەت بۆ لای خۆم هەڵدەکێشم، ئەوە هیچ جیاوازییەك نیە لە نێوان عیساو غەیری عیسادا، کەواتە: لێرەدا ﴿إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ ﴾، یانی: بە جەستەو ڕووحەوە، وەرت دەگرمو بۆ لای خۆم بەرزت دەکەمەوە، وە

ئێستا عیسا ﷺ لە ئاسمانە، وەك لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەریش ﷺ دا هاتوە، وە لە سووڕەتی (النساء)دا کە بەرگی سێیەمی ئەم تەفسیرەیە، بە تەفصیلْ باسمان کردوە، لەو ئایەتانەدا کە خوا باسی جوولەکەکان دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَانًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا الْمَسِيحَ عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ اللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُوا فِيهِ لَفِي شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا اتِّبَاعَ الظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ ﴾، واتە: بە هۆی کوفریانەوەو بە هۆی ئەو قسەو بوختانەیانەوە کە بۆ مەریەمیان کرد، (کە گوتیان: مەریەم عیسای بە شێوەیەکی ناشەرعیی بووە، واتە: زۆڵە)، وە ئەو قسەیان کە گوتیان: ئێمە عیسای کوڕی مەریەمی پێغەمبەری خوامان کوشتوە، (دوایی خوا بە درۆیان دەخاتەوە دەفەرموێ:) وە نە کوشتوویانەو نە هەڵیشیان واسیوە، بەڵکو وێنەی عیسایان بۆ برا سەر یەکێکی دیکەو، ئەوویان لە جیاتی عیسا هەڵواسیو کوشتیان... دوایی دەربارەی عیسا دەفەرموێ: ﴿ بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ ﴾ النساء، واتە: بەڵکو خوا بۆ لای خۆی بەرزی کردەوە، واتە: بە ڕووح و جەستەوە، بۆ لای خۆی بەرزی کردۆتەوە.

دیارە لە بەرگی سێیەم دا بە تەفصیل باسی چۆنیەتی بەرزکرانەوەی عیسامان کردوە، وە لە ئینجیلی بەرنابادا هێناومانە، هەروەها زانایانی ئیسلام چۆن ئەو ئایەتەیان تەفسیر کردوە؟ هێناومانە، بۆیە لێرە نایهێنین.

**مەسەلەی شەشەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ ۖ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾، ئەگەر سزایان بدەی، ئازاریان بدەی، ئەی خوایە! ئەوانە بەندەی تۆن، لەسەر ئەوە سزایان دەدەی کە منیان پەرستوەو دایکمیان پەرستوە، ئەوە بەندەی خۆتن، کە سزایان دەدەی، هەقی خۆتە، ﴿ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ

﴿ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، وە ئەگەر لێیان ببووری، بێگومان تۆی زاڵی كاربەجێ، هەندێك لە زانایان گوتوویانە: چۆن عیسا ﷺ لێرەدا دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ ﴾، ئایا دەگونجێ خوا لە كەسێك ببووری، كە عیسا بە كوڕی خواو بە پەرستراو دادەنێ‌و مەریەم دەپەرستێ؟ لە وەڵامدا دەڵێین: نەخێر، عیسا مەبەستی شتێكی دیكەیە، جارێ ئەم ئایەتە ئەوە دەگەیەنێ كە: ئەگەر بە هۆی كوفرەكەیانەوە سزایان بدەی، ئەوە بەندەی خۆتن، وە ئەگەر پاش تۆبەكردنیان لەو كوفرە (هەر لە دنیا) لێیان ببووری، ئەوە تۆ زاڵ‌و كاربەجێی، ئەوە ماناكەیەتی، ئەدی بۆچی عیسا ﷺ دەفەرموێ: ﴿ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، لێرەدا مەبەست دەرخستنی ڕەهایی ویستی خوایە، نەك ئەوە كە خوا لێیان دەبووری، مەبەست ئەوەیە كە خوایە! تۆ هەرچی بتەوێ دەیكەی، ویستی تۆ ڕەها (مطلق)ە‌و، هیچ سنوورێكی نیە، دەتوانی سزایان بدەی لەسەر كوفرەكەیان، وە دەشتوانی لێیان بووری، دیارە لێبوردنی تۆش بە حیساب‌و كیتابە، بۆیە لێیان دەبووری لەبەرئەوەی وازیان هێناوە لە كوفرو شیرك، ئەگەرنا هەر كەسێك واز لە كوفرو شیرك نەهێنێ، خوا لێی نابوورێ، كەواتە: لێرەدا تەنیا مەبەست ئەوەیە كە ڕەهایی ویستی خوامان بۆ دەربخات، ئەگەرنا لە شوێنی دیكەدا خوای كاربەجێ فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ ... ﴿٤٨﴾ ﴾ النساء، واتە: خوا لەوە نابوورێ هاوبەشی بۆ پەیدا بكرێ، بەڵام جگە لەوە خوا لە هەر كەسێك یان لە هەر شتێك بیەوێ دەبووری، ئنجا لەبارەی ئەم ئایەتەوە، ئەم فەرموودەیە هەیە: ﴿عَنْ أَبِي ذَرٍّ رَضِيَ اللهُ عَنْهُ، قَالَ: صَلَّى رَسُولُ اللهِ ﷺ ذات لَيْلَةً فَقَرَأَ بِآيَةٍ حَتَّى أَصْبَحَ يَرْكَعُ بِهَا وَيَسْجُدُ بِهَا: ﴿ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، فَلَمَّا أَصْبَحَ قُلْتُ: يَا رَسُولَ اللهِ! لَم تزلْ تَقْرَأُ هَذِهِ الآيَةَ حَتَّى أَصْبَحْتَ، تَرْكَعُ بِهَا وَتَسْجُدُ بِهَا، قَالَ: إِنِّي سَأَلْتُ رَبِّي عَزَّ وَجَلَّ الشَّفَاعَةَ لِأُمَّتِي فَأَعْطَانِيهَا وَهِيَ نَائِلَةٌ إِنْ شَاءَ اللهُ لِمَنْ لا يُشْرِكُ بِاللهِ عَزَّ وَجَلَّ شَيْئًا﴾ {أَخْرَجَهُ أَحْمَد برقم: (٢١٣٦٦)، قال الشيخ شعيب الأرناؤوط:

إسناده حسن} ئەبو زەڕ خوا لێی ڕازی بێ، دەڵێ پێغەمبەری خوا ﷺ هەتا ڕۆژ بووەوە شەونوێژی کرد، یەك ئایەتی دەخوێند، ئایەتەکەی دەخوێند چەندان جار دووبارەی دەکردەوەو، دووبارەی دەکردەوە، دوایی دەچووە ڕکووع، وە دەچووە سەجدە، دووبارە هەڵدەستایەوە، لە ڕکاتەکانی دیکەشدا هەر ئەو ئایەتەی دەخوێند، ئەویش ئەمەیە: ﴿ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، ئەگەر سزایان بدەی، بەندەی خۆتن‌و ئەگەر لێشیان ببووری تۆ زاڵ‌و کاربەجێی، (یانی: پێغەمبەر ﷺ لە شەو نوێژەکانیدا جا سەعاتێك بووە، دوو سەعات بووە، چەند بووە، هەر ئەو ئایەتەی خوێندوە، لە هەموو ڕکاتەکاندا)، کاتێك بەیانی کردەوە، گوتم: ئەی پێغەمبەری خوا! ﷺ تۆ ئەم ئایەتەت دەخوێندەوە، هەتا بەیانیت کردەوە، هەر دوای خوێندنی ئایەتە کە تۆ ڕکووعت دەبردو سەجدەت دەبرد، واتە: تەنیا ئەو ئایەتەت دەخوێند لە دوای سووڕەتی فاتیحە، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: من داوام لە پەروەردگاری زاڵ‌و مەزنم کرد، کە ڕێگام بدات تکا بۆ ئۆممەتەکەم بکەم‌و داوای لێبوردنیان بۆ بکەم لە قیامەت، خوای پەروەردگاریش ئەو هەقەی پێدام کە من بۆم هەیە لە قیامەت داوا بۆ ئۆممەتەکەم بکەم، وە ئەو شەفاعەتەی من ئەگەر خوا بیەوێ بە نسیب هەر کەسێك دەبێ، کە هیچ شتێك نەکاتە هاوبەشی خوا، (واتە: بە نسیب هەموو ئیمانداران دەبێ، مادام تووشی شیرکی گەورە نەبووبن).

هەروەها دەشگونجێ مەبەست لە ڕستەی: ﴿ إِن تُعَذِّبۡهُمۡ فَإِنَّهُمۡ عِبَادُكَۖ وَإِن تَغۡفِرۡ لَهُمۡ فَإِنَّكَ أَنتَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡحَكِيمُ ﴾، ئەوەبێ کە بە ڕەحمەت‌و لێبووردنی فراوان‌و بێسنووری خوا ئومێدەواریان بکات‌و، تەماعی لێبووردنیان وەبەربنێ، ئەگەر دەست لە کوفرو شیرکەکەیان هەڵگرن‌و بگەڕێنەوە بۆ لای خوا!

**مەسەلەی حەوتەم:** کە دەفەرموێ: ﴿ قَالَ ٱللَّهُ هَٰذَا يَوۡمُ يَنفَعُ ٱلصَّٰدِقِينَ صِدۡقُهُمۡۚ لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ رَّضِيَ ٱللَّهُ عَنۡهُمۡ وَرَضُواْ عَنۡهُۚ ذَٰلِكَ

ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴾، خوای پەروەردگار دوای ئەو وتوویژە لەگەڵ عیسادا، ڕایگەیاند: ئەم ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستان لە ڕاستیی خۆیان بەهرەمەند دەبن، چەند بەهەشتێکیان هەن، چەند باغێکیان هەن ڕووباریان بەژێردا دەڕۆن، بە هەمیشەیی تێیاندا دەمێننەوە، خوا لەوان ڕازییە، ئەوانیش لە خوا ڕازیین، وە ئەوەش بردنەوەی مەزنە.

ئەوەی لێرەدا پێویستە باسبکرێ، ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ: ﴿ يَوْمُ يَنفَعُ ٱلصَّـٰدِقِينَ صِدْقُهُمْ ﴾، ئەمڕۆ ئەو ڕۆژەیە کە ڕاستان لە ڕاستیی خۆیان بەهرەمەند دەبن، وشەی (صادق) ئەوە نیە کە تەنیا قسەی ڕاست بێو زمانی ڕاست بێ، بەڵکو دەبێ دڵی ڕاست بێ، قسەی ڕاست بێ، کردەوەی ڕاست بێ، لەگەڵ خۆی ڕاست بێ، لەگەڵ خەڵکی ڕاست بێ، لەگەڵ خواش ڕاست بێ، پەنهانی ڕاست بێ، ئاشکرای ڕاست بێ، لەگەڵ دۆست ڕاست بێ، لەگەڵ دوژمن ڕاست بێ، ڕاستیی (صدق)یش ئەوەیە کە ئەو قسەیەی ئینسان دەیکات، لە دڵیشی دابێ، وە کردەوەشی پێی بکات، وە ڕواڵەتو پەنهانی وەك یەك بێ، ئاشکراشە کە کاتێ ئینسان لەگەڵ خوادا ڕاست دەبێ، واتە بەندەیەکی ڕێكو ڕاستی خوا دەبێ، وە شوێنکەوتوویەکی ڕێكو ڕاستی پێغەمبەر ﷺ دەبێ، وە پابەندێکی ڕێكو ڕاستی شەریعەتو قورئانو سوننەت دەبێ، ئینسان ئەگەر لەگەڵ خوادا ڕاست بوو، لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ، لەگەڵ ئیسلام دا، لەگەڵ شەریعەتدا ڕاست بوو، ئەوکاتە لەگەڵ خەڵکیشدا ڕاست دەبێ، پێچو پەنای نابێ قۆرتو گرێو درۆو دەلەسەی نابێ، ڕواڵەتو ئاشکرای پێچەوانەی یەکدی نابێ، قسەو کردەوە، یاخود قسەی زارو دڵی لە یەك جیا نابن.

کە دەفەرموێ: ﴿ رَّضِىَ ٱللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا۟ عَنْهُ ﴾، لە قورئاندا هەمیشە ڕەزامەندیی خوا پێش خراوە، خوا لەوان ڕازییەو، ئەوانیش لە خوا ڕازین، بۆچی؟ چونکە دەبێ ئینسان بۆخۆی پێشێ وابێ کە خوا لێی ڕازی بێ، شایستەی ئەوەبێ خوا لێی ڕازی بێ، ئنجا دوایی خوای پەروەردگار ئەویش لە خۆی ڕازی دەکات، خوا بە چی لە ئێمە ڕازی دەبێ؟ بەگشتی بە یەك شت، ئەویش ئەوەیە دەفەرموێ:

﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا ۝٣﴾ المائـــدة، واتــە: ئیســـلامم بــە دیــن، بــە بەرنـــامە بـۆ پەســـەندکردن، هـەر کەســێك بـەدوای ئـەو بەرنـــامە پەسـەندکـــراوە بکـەوێ، کە خـوا لـێی ڕازییـــە، کە ئیسـلامە، خـواش لێی ڕازی دەبێ، ئەو ئیسـلامەش دیـارە ئیمـــانو عەقیـــدەو، عیبـادەتو تـەقواو، حـوکمو سیاسـەتو هـەموو ڕەهەنـدو لایەنەکـــانی ژیـــان دەگرێتـــەوە، هـەر کەسێك بـەدوای بەرنامـە پەسـەندکراوەکـەی خـــوا، ئـەو بەرنامەیـەی کـە خـــوا لـــێی ڕازییـــە، بکـەوێ، خـــوا لێـی ڕازی دەبـێ، هـەر کەســێکـــیش لــە دنیـــادا وایکـــرد، خـــوا لـــێی ڕازی بــێ، لــە قیـــامەتدا خـــوای پەروەردگـــار ئــەو لــە خـــوێ ڕازی دەکـــات، بەڵکـــو مــن دەڵـێم هــەر لــە دنیاشــدا ڕازیـبـوونی خوا لە ژیانی ئینسـاندا دەردەکـەوێ، وە ڕازیبوونی ئینسـانیش لـە خــوا، دەردەکەوێ، ئەویــش ئەوەیــە کــە ئەهلــی تەصـــەووفو عیـــرفان، دەڵێن: بــەرزترین مەقامی مامەڵـەی ئینسـان لەگـەڵ خــوادا، ئەوەیـە کـە لـە خــوا ڕازی بـێ، بەڵــێ پلـە ڕازیبوون (مقـام الرضا) بەرزترین پلـەیە، ئەویش ئەوەیە بە جۆرێك بــی کـە: خــوا هەر شتێکت بەسەربێنـێ‌و، هـەر چۆنێکـت مامەڵــە لەگەڵـدا بکــات، ڕازی بــیو لــە خـوا تووڕە نــەبی، گلـەییت نەبێ، لە دڵـدا گلــەییت نەبــێ، ئەگەرنا هونــەر نیـە بـە زمان دەرینەبڕی، بەڵام دڵــت پڕبــێ لـە گلــەییو ڕەخنـــە لـە خــوای پەروەردگـــارو کـــاربەجـــێ!! بەڵکو دەبێ بە دڵـیش هیچ ڕەخنـــەو گلـــەییو گـرژییەکــت لەگـــەڵ خـوای پەروەردگـــاردا نەبــێ.

**مەســـەلەی هەشــتـەمو کۆتــایی:** کە خـوا دەفـەرمـوێ: ﴿لِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا فِيهِنَّ ۚ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌۢ ۝١٢٠﴾، مولـــکی ئاســـمانەکانو زەویو هەرچـــی تێیـانـدایـە هــی خـوایە، وە خـوا ﷻ بەســـەر هـەموو شـــتێکدا بـە توانــایە، کەواتـــە: عیساو مەریـــەم دوو بەندەی خـــوانو لـە سنووری مـولکی خـــوادان، وە خـاوەنی هیـچ شـــتێك نـــین، تـــەنیا بەنـــدەی خـــوان، کەواتــە: ئــەی نەصـــرانییەکان! ئێـوە بەهەڵـەدا چـــوون، وە ئــەی بتپەرســـتەکان! هـــەموو ئـــەو شـــتانەی کــە لــە جیـــاتی خـــوا دەیانپەرسـتن، هـەموویان مولـکی خـــوانو، دروستـــکراوی خـــوانو، بەنـــدەی خـــوان، ئەگەر فریشـتـەو جنـدو ئینســـان بـن، یـاخود مولـکی خـوان، ئەگـەر شتـەکان بــن، وە

هەموویـــان خـــوا هێنـــاونیـــە دی، کەواتـــە: شایـــستەی پەرستـــران نـــین، ئـەو کەسـە بپەرســـتن خـــاوەنی هـــەموو شـــتێکەو بەدیهێنـــەری هـــەموو شـــتێکە، پـــەروەردگارو مشـــوورگێڕی هـــەموو شـــتێکە، وە لەســـەر هـــەموو شـــتێکیش بەتوانـــایە.

لێرەشـــدا دێیـنـە کۆتـایی تەفسـیری سـوورەتی موبـارەکی (المائدة).

سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ.

دوا پێداچوونەوەی، شەوی : ٢٦ - رمضان - ١٤٣٥ ك

بەرانبەر شەوی ٢٤/٢٥- تەمووزی – ٢٠١٤ ز

والحمد لله الّذي بنعمته تَتِمُّ الصالحات

# سەرچاوەکان

١) تفسير الطَّبَرِي الْمُسمى جامع البيان في تأويل القُرآن لأَبي جَعفَر محمد بن جرير الطَّبَرِي، تحقيق: هاني الحاج، عماد زكي البارودي، خَيْرِي سعيد، المكتبة التوفيقية، ٢٠٠٤ القاهرة.

٢) المِصبَاحُ الْمُنِير في تَهْذِيب تفسير ابن كثير للإمام الجليل عِماد الدِّين أَبي الفِداءِ إسْماعيل بن عُمَر بن كَثير القرشي الدمشقي، إعداد جماعَة مِنَ العُلَمَاء، بإشراف الشيخ صَفي الرحمن المباركفوري، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٢١هـ - ٢٠٠٠ م).

٣) التفسير الكبير أَو مَفَاتيحُ الغَيْب للإمام فَخْرَالدِّين محمد بن عُمَر بن الحسين بن الحسن ابن علي التميمي البكري الرازي الشافعي، حَقَّقَهُ وَعلَّق عَلَيْهِ وَخَرَّجَ أَحَاديثهُ عِماد زكي البارودي المكتبة التوفيقية.

٤) الجامع لأحكام القُرآن، تفسير القُرطُبي لأبي عبدالله محمد بن أحمد الأنصاري القُرطُبي، حَقَّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ عماد زكي البارودي، خَيْري سعيد، المكتبة التوفيقية.

٥) أَحْكَام القُرآن لأبي بَكر محمد بن عبدالله المعروف بابن العربي، راجع أصولهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ محمد عبدالقادر عطا، الطبعة الأولى (١٤٠٨هـ - ١٩٨٨م).

٦) فتح القدير، الجامع بين فني الرواية و الدراية من عِلم التفسير (تفسير الشوكاني) تأليف: الإمام العلامة محمد بن علي بن محمد الشوكاني، تحقيق: عبدالرزاق الْمَهدي، دار الكتاب العربي، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

٧) تفسير القاسمي الْمُسمى محاسن التأويل، تأليف: علامة الشام محمد جمال الدين القاسمي، دار الفكر الطبعة الأولى (١٣٩٨هـ - ١٩٧٨م).

٨) تفسير المراغي تأليف أحمد مصطفى المراغي، دار الفكر، بيروت.

٩) تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام الْمَنان، تأليف: العلامة الشيخ عبدالرحمن بن ناصر السعدي، تحقيق: عبدالرحمن بن معلا اللويحق مؤسسة الرسالة، الطبعة الأولى (١٤٢٠هـ - ١٩٩٩م).

١٠) صفوة البيان لِمَعَاني القُرآن، تأليف: الشيخ حسين محمد مخلوف الطبعة الثالثة.

١١) صفوة التفاسير، تأليف: العلامة محمد بن علي الصابوني، مكتبة الهداية، أربيل/ العراق، الطبعة الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤م).

١٢) تفسير القُرآن الحكيم الشهير بـ (تفسير المنار) تأليف: محمد رشيد رضا، دار المعرفة، الطبعة الثالثة.

١٣) الأساس في التفسير، تأليف: سعيد حوى، دار السلام، الطبعة الثانية (١٤٠٩ هـ - ١٩٨٩م).

١٤) في ظِلال القُرآن، تأليف: سيد قطب دار الشروق، الطبعة الشرعية الخامسة والعشرون (١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م).

١٥) التفسير الْمُنير في العَقِيدة والشَّريعَة والْمَنْهَج، تأليف: الأستاذ الدكتور وهبة الزحيلي، دار الفكر الطبعة الثالثة (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٥م).

١٦) مُفرَدات ألفاظ القُرآن، تأليف: العلامة الراغب الأصفهاني، تحقيق: صفوان عدنان داوودي، دار القلم، الطبعة الثالثة (١٤٢٣ هـ - ٢٠٠٢م).

١٧) المعجم الوسيط، دار الدعوة، الطبعة الثانية.

١٨) لُباب النقول في أسباب النزول، للإمام الحافظ جلال الدين عبدالرحمن بن أبي بكر السيوطي خَرَّجَ أَحاديثهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ عبدالرزاق الْمَهْدِي، دار الكتاب العربي (١٤٢٦ هـ - ٢٠٠٦م)، (أسباب النزول) للنيسابوري.

١٩) الْموطأ للإمام مالك بن أنس برواية يحيى بن يحيى الليثي، تحقيق: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ - ٢٠٠٨ م)، (أسباب النزول) للواحدي.

٢٠) الْمُسنَد للإمام أحمد بن محمد بن حنبل، الناشر مؤسسة قرطبة، القاهرة، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأنؤوط عليها.

٢١) صَحِيح البُخَارِي للإمام أبي عبدالله محمد بن إسماعيل البُخَارِي، تحقيق: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٢٢) صَحِيح مسلم للإمام الحافظ مسلم بن الحجاج النَّيسابوري، حقوق أصولهُ و خَرَّجَ أَحاديثهُ على الكتب الستة: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار المعرفة، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٢٣) سُنَن أبي داود للإمام أبي داود سُليمان بن الأشعث السجستاني، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٢٤) سُنَن التِّرمِذِي للإمام الحافظ محمد بن عيسى بن سورة التِّرمِذِي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٢٥) سُنَن النَّسَائي للإمام أبي عبدالرحمن أحمد بن شعيب بن علي الشهير بـ(النَّسَائي)، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨م).

٢٦) سُنَن ابْنُ مَاجَهْ، للإمام أبي عبدالله محمد بن يزيد القزويني الشهير بـ (ابْنُ مَاجَهْ)، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، مكتبة الْمعارف، الطبعة الثانية (١٤٢٩هـ – ٢٠٠٨ م).

٢٧) سُنَن الدار قُطني، للإمام الحافظ علي بن عُمر الدار قُطني، تحقيق: مجدي بن مَنصور بن سي الشورى، دار الكتب العلمية، الطبعة الثانية (١٤٢٤هـ - ٢٠٠٣ م).

٢٨) الْمُستَدرَك على الصحيحين للإمام الحافظ أبي عبدالله الحاكم النَّيسابوري، تحقيق: صالح اللحَّام، دار ابن حزم، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م).

٢٩) صَحِيح ابْنُ حِبَّان للإمام أبي حَاتِم محمد بن حِبَّان الخُراساني، تحقيق: حقوق أصولهُ وخَرَّجَ أَحاديثه: الدكتور الشيخ خليل مأمون شيحا، دار الْمعرفة، الطبعة الأولى (١٤٢٥هـ - ٢٠٠٤ م).

٣٠) الْمُعجم الكبير للحافظ أبي القاسم سُليمان بن أحمد الطَّبَراني، حَقّقَهُ وَخَرَّجَ أَحاديثهُ حمدي عبدالمجيد السلفي، مكتبة الأصالة والتُّراث، الطبعة الأولى ( ١٤٣١هـ - ٢٠١٠ م).

٣١) سُنَن الدَّارمي للإمام أبو محمد بن عبدالرحمن بن الفضل بن بهرام الدَّارمي، حَقَّقَهُ وَشَرَحَ ألفَاظَهُ وَجُمَلَهُ وَعَلّقَ عَلَيهِ وَوَضَعَ فَهارسَهُ: الأستاذ الدكتور مصطفى ديب البغا، دار المصطفى، الطبعة الأولى (١٤٢٨هـ – ٢٠٠٧ م).

٣٢) مشكاة المصابيح، تأليف: محمد بن عبدالله الخطيب التبريزي، تحقيق: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٣٣) إرواء الغليل في تخريج أحاديث منار السبيل، تأليف: محمد ناصر الدين الألباني، المكتب الإسلامي، الطبعة الثانية (١٤٠٥هـ - ١٩٨٥ م).

٣٤) السراج الْمُنير في ترتيب أحاديث صحيح الجامع الصغير، للحافظ جلال الدين السيوطي، العلامة محمد ناصر الدين الألباني، رتبهُ وَعَلَّقَ عَلَيْهِ: عصام موسى هادي، دار الصديق، الطبعة الثانية (١٤٣٠هـ - ٢٠٠٩م).

٣٥) السنن الكبرى تصنيف: الامام أبي عبد الرحمن أحمد بن شعيب النسائي، تحقيق: دكتور عبدالغفار سليمان البنداري، وسيد كسروي حسن، دار الكتب العلمية بيروت – لبنان، الطبعة الاولى (١٤١١ هـ - ١٩٩١ م).

٣٦) سلسلة الأحاديث الصحيحة، تأليف: مُحَمَّد ناصر الدّين الألباني، رحمه الله، مكتبة المعارف للنشر والتوزيع، الرياض، الطبعة الأولى.

# نیوەڕۆك